# ئینسکلۆپیدیای هەولێر ٧



- شوێنەوار و کەلەپوور
- هەولێر لە ئینسکلۆپیدیای جیهاندا



- ناوی کتێب: ئینسکلۆپیدیای هەولێر «ئەربیل»
- ئامادەکردنی: لیژنەی باڵای ئامادەکار:
د. عەبدوڵڵا عەلیاوەیی، د. مەولود ئیبراهیم حەسەن، فەرید ئەسەسەرد،
د.ئومێد جۆزەلی، حەمید ئەبوبەکر بەدرخان.
- سەرپەرشتیاریی هونەریی و خۆشنووسی: محەمەد زادە.
- دەرهێنانی هونەری: عوسمان پیرداود.
- جێبەجێکردنی هونەری: عصام موحسین نادر، رزگار موحسین نادر.
- نەخشەکان:سەردار محەمەد - وشیار حەمەدەمین
- هەڵەبڕی و پێداچوونەوە: شێرزاد فەقێ ئیسماعیل، عەبدولڕەحمان مەعرووف، ڕەحیمی سورخی.
- هەڵەبڕی کۆمپیوتەر: مەسعود ئیبراهیم، ئەیوب یوسف.
- سکەنەری وێنەکان و ڕێکخستن: بەدرخان یوسف.
- سەرپەرشتیاری گشتیی چاپ: حەمید ئەبوبەکر بەدرخان.
- چاپ: چاپی یەکەم ٢٠٠٩ لوبنان
- چاپخانە: گرین گالۆری- لوبنان
- تیراژ: ٢٥٠٠ دانە.
- ڕۆژی دەستپێکردن: ٢٠٠٥/١٢/٢٦ - ڕۆژی تەواو بوون ٢٠٠٩/٩/٢٥
- لە کتێبخانەی گشتی ژمارە «١٨٣٢» ساڵی ٢٠٠٩ی دراوەتێ.

- نرخ: (١٥٠٠٠٠) دیناری عیراقی

**لە بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی بەدرخان**



# زەکی بارۆخ و خۆڵی هەولێر

**نەژاد عەبدوڵڵا عەزیز**

(جوولەکەی ئێرە - هەولێر - شتێکی دیکەش هەبوو بۆ مێژوو ئەوەت بۆ دەڵێم: کوردپەروەر بوون، بڕوابکە لە وێستگەی شەمەندەفەر، کە چووین مامۆستاکانمان بەڕێ کرد، زەکی بارۆخ هەبوو، ئەویش رەسام و مۆسیقاژەن بوو، پیاوێکی قەڵەو بوو، ئەو گەڕایەوە وتی: نەژاد نەژاد، شەمەندەفەرەکەش وا خەریکە بڕوا، بەپەلە زەرفێکی دامێ، گوتی: لە خۆڵەکەی تەنیشت شەمەندەفەر ئەو زەرفەم بۆ پڕکە، منیش زەرفەکەم بۆ پڕکرد لە خۆڵەکە و شەمەندەفەریش وا وردە وردە دەڕوا، ئەمنیش خۆم بە شەمەندەفەرەکەوە کرد، زەرفە -خۆڵەکەی- وەرگرت و ماچی کرد و دەستی کردە گریان، خۆڵەکەی کوردستانی لەگەڵ خۆی برد).



# دەروازەیەک بۆ شوێنەوار و کەلەپوری هەولێر

دیارە کۆکردنەوەوی بابەتەکانی ئینسایکلۆپیدیای هەولێر کارێکی گران بوو، چونکە زۆرێک لەو بابەتانە بەتایبەت بۆ ئینسایکلۆپیدیا نەنووسراون، بەڵکو بابەت و توێژینەوە و بڵاوکراوە بوون و لە رابردوودا لە گۆڤار و رۆژنامەکان و کتێبەکاندا بڵاوکراونەتەوە، یان لە کۆڕ و کۆنفرانسەکاندا وەک بابەتی تایبەت پێشکەش کراون، و بێگومان کەمێک لە بابەتەکان تایبەت بۆ ئینسایکلۆپیدیا نووسراون، ئەوەی کە ئەرکی ئێمەی گران کرد بابەتە بڵاوکراوەکان بوون کە لە گۆڤار و رۆژنامەکان و کۆڕ و سیمینارەکاندا بڵاوکرابوونەوە، لە لایەک دەبوو هەموویان کۆبکەینەوە لە لایەکی دیکە دەبوو وابکەین کە ئەم بابەتانە لە رووی ناوەڕۆکەوە تا ڕادەیەک شێوەیەکی زانستی وەربگرن و یەکگرتوویییەکیش لە رووی ناوەڕۆک و زاراوەکانەوە لە بابەتێکەوە بۆ بابەتێکی دیکە هەبێت، و هەندێک کاتیش بۆچوونی جیاواز دەبینین کە ئەمەش هەڵە نییە بە تایبەت لەو بابەتانەی دەربارەی تەمەنی قەڵای هەولێر نووسراون، چونکە تا ئێستا کنەوپشکنینی شوێنەواری لە گردی قەڵای هەولێر(شاری ئوربیلیوم)دا نەکراوە.

دەربارەی بابەتەکان و چۆنێتی ریزبەندی کردنیان دەمانەوێت ئاماژە بەوە بکەین کە ئەم بەشەی ئینسایکلۆپیدیا تایبەت بوو بە شوێنەوار و ناوی شوێنەواری لێندرا، بەڵام دوای ئەوەی چەندین بابەتی کەلەپوری کۆکرایەوە، بڕیارماندا کە ئەم بەشە ناوبنێین بەشی(شوێنەوار و کەلەپور) و بێگومان شوێنەوار لە کەلەپور جیانابێتەوە و هەر کەلەپورە ئەگەر کۆنتربوو دەبێتە شوێنەوار، هەروەها ئەگەر ئێمە ئێستا توێژنەوە لەسەر کەلەپوری خۆمان نەکەین پاش چەندین ساڵی دیکە دەفەوتێن و هیچ لەبارەیانەوە نازانین.

گرنگی ئەم بەشە لەوەدا دەردەکەوێت کە تایبەتە بە شوێنەوار و کەلەپوری شارێک و پارێزگایەکی وەک هەولێر کە بە کۆنی ناسراوە و شوێنەوارەکانی قەڵا و منارە هێما و رەمزی ئەم شارە دێرینەن و یەکێکە لە شارە کۆنەکانی کوردستان و جیهان کە هەر لە سەردەمی سۆمەرییەکانەوە ناو و ناوبانگی هەبووە.

دەربارەی دابەشکردنی بابەتەکان و ریزبەندییان هەوڵمانداوە کە بە پێی کۆنی شوێنەوارەکان بابەتەکان ریزبەندی بکەین هەر لە ئەشکەوتەکان و چاخی بەردینی کۆنەوە بۆ سەردەمی سۆمەری و خوری و ئاشوری... و ئەسکەندەر و ئەشکانی و ساسانی و سەردەمی شارستانییەتی ئیسلامی ئەمەوی و عەباسی و پاشان سەردەمی عوسمانی و پاشان بیناسازی و خانووە کەلەپورییەکان و مافور، و لە کۆتاییدا چەند بابەتێکمان لەسەر داهاتووی گەشت و گوزار لە قەڵای هەولێر داناوە.

دەبێت ئاماژە بەوەبکەین کە تا ئێستا کنەوپشکنینێکی شوێنەواری زۆرکەم لە پارێزگای هەولێر ئەنجام دراون، کە تا ئێستا زۆربەی ناوچە شوێنەوارییەکانی کنەوپشکنینی تێدا ئەنجام نەدراوە، و کنەوپشکنینە شوێنەوارییەکانی داهاتووش شارستانییەت و شوێنەواری ئەم شارە زیاتر روون دەکاتەوە و دەردەخات، جگە لەوەی چەندین بابەتی گرنگ هەبوون دەربارەی ناوچە شوێنەواری و کەلەپورییەکانی پارێزگای هەولێر بەزمانی عەرەبی و بیانی نووسرابوون و دەرفەت نەبوو وەریانبگێڕین بۆ سەر زمانی کوردی.

لە کۆتاییدا هیوادارین توانرابێت بە خستنەرووی ئەم بابەتانە خزمەت بە شوێنەوار و کەلەپوری دێرینترین شاری دونیا کرابێت، کە ئەویش هەولێرە، و خوێنەران و توێژەرانیش سوود و چێژ لە بابەتەکان وەربگرن و ئەم بابەتانە ببنە ئەرشیف و دۆکۆمێنتێک دەربارەی شوێنەوار و کەلەپوری ئەم شارە دێرینە.

**دڵشاد عەزیز زامدا**
**سەرپەرشتیاری بەشی شوێنەوار و کەلەپور**



# کرۆنۆلۆژیای هەولێر لە ٦٥٠٠٠پ.ز - ٢٤٢ی زایینی

## (لەژێر رۆشنایی کنە و پشکنینە شوێنەوارییەکاندا)

دڵشاد عەزیز زاموا

هەولێر بەم تەمەنە درێژەی کە هەیەتی و بەو دەوڵەمەندییەی لەڕووی شوێنەوارییەوە پێی ناسراوە، نێوەندێکی گرنگی مرۆڤایەتی، بەداخەوە وەکو پێویست هەڵکۆڵین و گەڕانی تێدا نەکراوە، دەنا هێشتا زۆر بەڵگە و رووداوی مێژوویی و نهێنی گرنگ لەژێر خاکی لەمێژینەدا چاوەڕێی دەستی زانا و دڵسۆزانە، ئەوەی کە مامۆستا دڵشاد عەزیز زاموا کۆی کردووتەوە، بەشێکی کەم و گرنگی ئەو شوێنەوارە زۆرەو ئەم مێژووە دوور و درێژ و دەوڵەمەندیە، کە شاری هەولێریان گەیاندووتە ئەمڕۆ، زاناکان دەڵێن: (ئەشکەوتی شانەدەر ئەرشیفێکی دەوڵەمەندی مرۆڤایەتییە.) ئەگەر شانەدەر بە تەنیا ئەرشیفێکی دەوڵەمەندی مرۆڤایەتییە! ئەی باشە هەولێر بەم هەموو دەوڵەمەندییەی خۆی لەڕووی شوێنەوارەوە، دەبێ چی بێ!؟ لەم ساڵانەی دوایی بەهۆی بیناسازی زۆرەوە لە هەر شوێنێکی ناو شاری هەولێر زەویان بۆ بیناسازی هەڵکۆڵیوە، لەپڕ پاشماوەی کۆن و جۆراو جۆر دۆزراوەتەوە! کە دیسان بەداخەوە!! وەکو پێویست سوود لەم

شــوێنەواره دۆزراوانە نەبینراوە و کەمتر جۆر و زەمەنیـان دەستنیشـان کراوە. (ئـ. ه).

**چاخەبەردینەکان**
**لە پارێزگای هەولێر**

ئەم چاخانە ناودەبردرێن بە چاخە بەردینەکـان چونکە مـرۆڤ زۆربەی پێداویستـیـەکـانی خـۆی لە بەرد دروست دەکــرد. بەڵام ئەمـە واتای ئەوەنادات کە مرۆڤ هیچ کەلوپەل و ئامـرازێکیـدیکەی بەکـارنەهێناوە بەڵکو کەلوپەل و ئامرازی لە پێستە و ئێـسک و دارو تەختــە دروست دەکـرد، بەڵام زۆرێک لەو ئامـراز و کەلوپەلانە، بەهۆی تێپەڕبوونی کات و گـۆڕانی پلەکـانی گـەرمـاو باران و بەفرو تیشکی خۆرەوە لەناوچوون.

**چاخی بەردینی کۆن لە پارێزگای هەولێـر (٦٥ تا ١٥) هەزارســاڵ پ.ز:**

١- شـوێنەواری مـرۆڤی چاخی بەردینی کـۆن لە ئەشکەوتی شانەدەر دۆزرانەوە، مـرۆڤـەکـانی شـانەدەر دەرکەوتن لە شاخەکانی برادۆست ، کـۆنتـرین شـوێنەواری ئەم مـرۆڤـانە دەگەڕێتەوە بۆ ٦٥ هەزارساڵ پ.ز، و ژیان لەم ئەشکەوتەدا بەردەوام بوو، ئێسکبەندی نۆ مـرۆڤ دۆزرایەوە ئەم ئێــسـکبــەندانە دەگــەڕێنەوە بۆ٦٥هەزارســاڵ تا ١٠ هەزارســاڵ پ.ز.

سەردەمی موستیری کە ناوەڕاستی چاخی بەردینی کـۆن دەگـرێتـەوە لە لایەن شــوێنەوارناســانەوە پێی دەگـوترێت ســەردەمی برادۆســتی، چونکە شوێنەواری چاخی موسـتیری (٦٥-٣٥ هەزار ســـاڵ پ.ز) لە شـاخـاکـانی برادۆست لە ئەشکەوتی شانەدەر دۆزرایەوە.

٢- لە چل و پێـنج هەزار ســاڵ پ.ز لە شانەدەر مرۆڤی چوارەم نێژراو گـوڵ لەســەر گـۆڕەکـەی دانرا.ئەم مـرۆڤـانە هاوســەردەم بوون لەگـەڵ نیـاندەرتاڵەکـانی ئەوروپا، بەڵام لە رووی شـێـوەی لاشـە و شـێـوازی ژیانیـانەوە پێـشکەوتوو تر بوون لە نیاندەرتاڵەکانی ئەوروپا.

لەم سەردەمەدا مرۆڤ بەراوکردن و کۆکردنەوەی خۆراک خەریک بوو.

وێنەی مـرۆڤی (نیـاندەرتاڵ)








لەئەشکەوتی شانەدەر (٤٦ هەزار ساڵ پ.ز)، لە ژێر رۆشنایی ئێسکەپەیکەرەکانی شانەدەر لە ئەمریکا تیمێکی زانستی وێنەی مرۆڤی شانەدەریان دروست کردەوە، و لە گۆڤاری (SCIENTIFIC AMERICAN) ژمارە ٨١، ساڵی ١٩٧٩ بلاوکرایەوە، شایەنی باسە مرۆڤی شانەدەر یەکەم مرۆڤی ئەم چاخەیەکە لە لایەن زاناکانەوە وەک مەیمون وێنە نەکراوە.

**چاخی بەردینی ناوەڕاست (١٥٠٠٠-١٠٠٠٠پ.ز):**

پاش ئەوەی مرۆڤ ئەشکەوتەکانی بەجێهێشت ورووی کردە دامێنی شاخەکان و سەر رووبارەکان ونشینگەی کاتی (المستوطنات الوقتیة)ی بو خوی دروستکرد لە چاخی بەردینی ناوەڕاستدا (١٥٠٠٠-١٠٠٠٠پ.ز). لە بەهار و هاویندا لەوێ دەژیا بەلام لەزستاندا دەگەڕایەوە ئەشکەوتەکان، ئەم چاخە پانزە هەزار ساڵ پێش زایین دەستی پێکرد و دە هەزار ساڵ پێش زایین کۆتایی هات.لەم چاخەدا ئامرازە بەردینەکان پێشکەوتن و شێوەیەکی تیژو رێکیان وەرگرت پێیان دەوترێت ئامرازی بەردینی رێک (Microlithic). ئەم چاخە لە کوردستاندناونراوە بە چاخییان شارستانیەتی (زەرزی)، چونکە شوێنەواری ئەم چاخە لە کوردستاندا بۆ یەکەم جار لە ئەشکەوتیزەرزی (لە نزیک شاخی پیرەمەگرون لە چەمی رەزان)دۆزرایەوە، لەم سەردەمەدا مرۆڤەکان بەشێوەیەکی کاتی دەستبەرداری ئەشکەوتەکان دەبوون و لە دەشتەکاندا دەژیان، و هەندێک ئاژەڵیان ماڵی کرد کە کۆنترینیان سەگ بوو، هەروەها بەروبوومی رووەکیان کۆدەکردەوە و چەند کەلوپەل و ئامرازێکی تایبەتیان دروستکرد، بۆ بڕینی و هاڕینی رووەک و دانەوێڵە، بەلام مرۆڤ لەم چاخەدا فێری کشتوکاڵکردن نەبوو.

- دەربارەی شوێنەوارەکانی ئەم چاخە لە پارێزگای هەولێر، بەڵگە شوێنەوارییەکان دەریانخست کە ژیانی مرۆڤ لە ئەشکەوتی شانەدەر بەردەوام بوو، شوێنەواری ئەم چاخە لە(ئەشکەوتی هاودیان) و (ئەشکەوتی خەرواتان/نزیک حەریر) و (ئەشکەوتی کاوانیان/نزیک شەقلاوە)دەژیان و شوێنەوار و پاشماوەی ئامرازە بەردینەکانیان لەم ئەشکەوتانەدا بەجێماوە.

**چاخی پرۆتۆنیۆلیتیک (عصر الشبیە بالعصرالحجري الحدیث Protoneolithic) (٩٥٠٠-٩٠٠٠پ.ز):**

کۆتایی هاتنی چاخی پلایستۆسین: لە دەهەزارساڵ پ.ز چاخی سەهۆڵی پلایستوسین کۆتایی هات و پلەی گەرمای زەوی بەرز بووەوە و ناوچە سەهۆڵیەکانی نیوەگۆی باکووری زەوی (ئەوروپا و باکووری ئەمریکا و ئاسیا) سەهۆڵەکانیان توایەوە و بووە ناوچەیەکی سەوزایی وەک ئەمڕۆ، هەروەها ناوچەکانی باکوری ئەفریقا و جەزیرەی عەرەبی و ناوچەکانی ناوەڕاست و باشوری رۆژهەلاتی ئێران و ناوەڕاستی ئاسیا کە لەوەو پێش دارستان و سەوزایی بوو لە چاخی پلایستوسین (لە چاخی بەردینیکۆن و ناوەڕاست) بە کۆتایی هاتنی چاخی پلایستوسین بووە ناوچەیەکی وشک و بیابان (وەک ئەمڕۆ دەیبینین).

هەروەها ناوچەکانی کوردستان ئاوهەواکەی گۆڕا و بەرەو گەرمتر چوو و وەک ئاو هەوای ئەمڕۆی لێ هات بێگومان گۆڕانی پلەکانی گەرما و ئاووهەوا کاری کردە سەر گۆڕانی شێوەی ژیانی مرۆڤ لەم چاخەدا، لەم سەردەمەدا مرۆڤ رووی کردە دۆڵ و دەشتەکانی نزیک رووبارەکان، بەلام ئەمە سەرەتایەک بوو کە پێی دەوترێت(Proto-Neolithic فترة الشبیە بالعصر الحجري الحدیث) سەردەمی هاوشێوەی چاخی بەردین، واتە سەرەتای چاخی بەردین کە دەستپێدەکات لە ١٠٠٠٠و بەردەوام دەبێت تا ٩٥٠٠پ.ز، لەم سەردەمەدا مرۆڤ کوخ ی دروست دەکرد کە چاڵێکی هەڵدەکەند نیو مەتر قوڵ بوو چەند بەردێکی بەشێوەی بازنەیی بەدەوریدا ریز دەکرد و لەناوەڕاست دا دارێکی دەچەقاند و بە گەلا و پوش و دار دایدەپۆشی، باشترین نمونەش بۆ ئەم سەردەمە لە کوردستاننشینگە(مستوطنة Settlement)ی (زاوی چەمی)یە- کە ناوەڕاستییەکەی زەڤیاچەمێیە- لە نزیک ئەشکەوتی شانەدەر لە سەر زێی گەورە، کە لەم شوێنە مرۆڤەکان چەندین جۆر ئاژەڵیان راو دەکرد، جگە لەوەی کە بەروبوومی رووەک و میوەیان کۆ دەکردەوە، و کەلوپەلی بەردینیان بۆ هاڕینی دانەوێڵە بەکاردەهێنا.

بەڵام پاش ئەم سەردەمە مرۆڤ هەوڵی دروستکردنی خانووی دا و سەرەتا لە قوڕلە سەر بناغەی بەردین دروستی دەکرد و دیوارەکانی بازنەیی بوو، پاشان چەندین گوند دەرکەوت کە خانووەکان شێوە لاکێشەیی بوون و دیوارەکان ڕێک بوون. و مرۆڤ بەتەواوی فێری کشتوکاڵ و بەخێوکردنی ئاژەڵ بوو، و گوندە راستەقینە دەرکەوتن.

ئەم نشینگەیە لە لایەن مرۆڤەکانی شانەدەرەوە دروستکرا، ئەوان لە بەهار و هاویندا لەوێ دەژیان بەڵام لە وەرزی پاییز و زستان دا دەگەڕانەوە ئەشکەوتی شانەدەر، بە پێی بۆچوونی شوێنەوارناسان لەم سەردەمەدا مرۆڤەکان (ئەشکەوتی شانەدەر)یان کردبووە گۆڕستانی خۆیان و مردووەکانیان تێدا دەناشت، بەڵام لە راستیدا ئەمە ناتوانرێت بسەلمێنرێت، چونکە تەنها چەند گۆڕێک دۆزراوەتەوە، ئەمە ئەوە ناگەیەنێت کە ئەشکەوتەکان گۆڕستان بووبن، بەڵکو هەندێک لە زانایان پێیان وایە مرۆڤەکان زۆربەی مردووەکانیان لەدەرەوەی ئەشکەوتەکان ناشتووە، بەڵام لەبەرئەوەی کە تا ئێستا هیچ کارێکی کنەوپشکنین نەکراوە لەدەرەوەی ئەشکەوتەکان، هەروەها گۆڕانکارییەکانی کەش و هەوا و سەرما و بەفرو باران... بووەتە هۆی لەناوچوونی ئێسک و گۆڕەکان...، بەم شێوەیە مرۆڤاکانی ئەم سەردەمە زۆربەی کاتەکانی ساڵ لە نشینگەی زاوی چەمی دەژیان لە سەر کەناری رووباری زێ، بەڵام لەکاتی زستان دا دەگەڕانەوە ئەشکەوتی شانەدەر.

لەم سەردەمەدا بۆ یەکەم جار ڕێوڕەسمی ناشتنی باڵندەگۆشتخۆرەکان لە دەوری ئاگردانێکدا بە ڕێوەچوو لە زاوی چەمی...کە نزیکەی حەڤدە جۆر باڵندە لە دوای راوکردن لە ڕێوڕەسمێکدا باڵەکانیان بۆ ئەو ڕێوڕەسمە بەکارهێنرابوو، شایەنی باسە کە نشینگەی زاوی چەمی بە کۆنترین نشینگە دادەنرێنرێت لە جیهاندا کە بۆ (٩٥٠٠-٨٥٠٠پ.ز) دەگەڕێتەوە.

## چاخی بەردینی نوێ (٦٠٠٠پ.ز):

ئەم سەردەمە مرۆڤ هەوڵی دروستکردنی خانووی دا و سەرەتا لە قوڕلە سەر بناغەی بەردین دروستی دەکرد و دیوارەکانی بازنەیی بوو، پاشان چەندین گوند دەرکەوت کە خانووەکان شێوە لاکێشەیی بوون و دیوارەکان ڕێک بوون. و مرۆڤ بەتەواوی فێری کشتوکاڵ و بەخێوکردنی ئاژەڵ بوو، و گوندی راستەقینە دەرکەوتن.

## سەردەمی شارستانیەتی حەسونە(٦٠٠٠پ.ز):

لە ساڵی (٢٠٠٢) لە لایەن بەڕێوەبەرایەتی شوێنەواری هەولێر و مامۆستایانی بەشی شوێنەواری زانکۆی سەلاحەدینەوە لە ناوچەی بەردحوشتر (گردی وەستا عەرەب)لە باکووری رۆژئاوای شاری هەولێر شوێنەواری نشینگەیەک دۆزرایەوە، کە دەتوانرێت بە کۆنترین نموونەی چاخی بەردینی نوێ دابنرێت کە تا ئێستا لە سنووری پارێزگای هەولێر دۆزراوەتەوە، و گڵێنەو گۆزەکانی ئەم نشینگەیە هاوشێوەی گڵێنەی گوندی چەرمۆ (هەزارەی حەوتەمی پ.ز) بوون، ئەم جۆرە گڵێنەیە بە کۆنترین نموونەی گڵێنە دادەنرێت لە پارێزگای هەولێردا گلێنەکان نارێکن و یانیش سوورنەکراونەتەوە، و ئێستا ئەو جۆرە گڵێنانە لە مۆزەخانەی هەولێر نمایش کراون.

گڵێنەکانی سەردەمی شارستانیەتی حەسونە (٦٠٠٠-٥٥٠٠پ.ز) بەڵگە شوێنەوارییە دۆزراوەکانی (ئەشکەوتی بەستوون) و (ئەشکەوتی دیان و شانەدەر)ئەوەیان سەلماند کە لەم سەردەمەدا راوچییە گوند نشینەکان بۆ راوکردن ڕوویانکردۆتە شاخەکان و لە گوندەکانەوە (کە لە رۆخی رووبار و لە ناو دۆڵەکاندا بوون) بەڕێکەوتوون بەرەو شاخەکان، **بنوارە وێنەی ژمارە(١)**

بۆ ماوەی چەند رۆژێک لە ئەشکەوتەکاندا ماونەتەوە و خواردن و خواردنەوەیان لە ناو گۆزەدا بردووە لەگەڵ خۆیان پاشان پارچە گۆزە و سواڵەتە شکاوە بە جێماوەکان بەڵگەبوون بۆ ئەوەی کە مرۆڤ بە شێوەیەکی کاتی لەکاتی راوکردندا رووی کردۆتە ئەشکەوتەکان، و ئەم بەڵگانە لە لایەن تیمێکی ئەمریکی لە لایەن (هنری فیلد) لە ١٩٥١دا دۆزرایەوە.

## شارستانیەتی سامەڕا (٥٥٠٠پ.ز - ٤٩٠٠پ.ز):

لەم سەردەمەدا چەندین گوند و



**وێنەی ژمارە(١) وێنەی ئەشکەوتی بەستون**

نشینگە دەرکەوتن لە دەشتی هەولێر، و یەکێک لەو گوندانە کە ئێستا لەناو شاری هەولێرە و گردی (کلک مشک)ی پێدەڵێن، بەڵگە سەرەتاییەکانی سەر ئەم گردەشوێنەوارییە و چەندین گردی دیکە ئەوە دەسەلمێننکە مرۆڤ لەسەردەمی شارستانیەتی سامەڕادا لەم ناوچەیەداژیاوە...

**سەردەمی شارستانیەتی حەلەف(٤٩٠٠-٥٤٠٠پ.ز):**

گرنگترین بەڵگەی شارستانیەتی حەلەف لە کنەوپشکنینەکانی تیمێکی ئەمریکی دەرکەوت لە نزیک گوندی (بانە هێلک) ڕۆژئاوای دیانا لە سەر ڕووباری جوندیان، ئەم گوندە بە یەکێک لە گوندە نموونەییەکانی سەردەمی شارستانیەتی حەلەف دادەنرێت، بەتایبەت کە جوانترین نموونەکانی گڵێنەوگۆزەی ئەم سەردەمە لە بانە هێلک دۆزرایەوە.....

- گوندی قالینج ئاغا لە ناوشاری هەولێر (١کم باشوری قەڵای هەولێر) لەسەردەمی شارستانیەتی حەلەفدا ئەم گوندە دروستکراوە، و مرۆڤەکان تێیدا نیشتەجێ بوون و ژیانیان بەردەوام بوو.

**چاخی بەردینی کانز (٤٩٠٠-٣٥٠٠پ.ز):**

ئەم چاخە لە ٤٩٠٠پ.ز دەست پێدەکات و لە ٣٥٠٠پ.ز کۆتایی دێت، پێی دەوترێت چاخی بەردینی کانزایی چونکە لەگەڵ ئەوەی کە بەردەوام بوون لە بەکارهێنانی ئامراز و کەل و پەلی بەردین، و توانییان ئامراز و کەلوپەل لە کانزای مس دروست بکەن.

**- سەردەمی شارستانیەتی عوبەید (٤٥٠٠-٣٥٠٠ پ.ز):**

- ژیان بەردەوام بوو لە قالینج ئاغا، لەم سەردەمەدا مرۆڤەکان لە گوندەکانی دەشتی هەولێر و هەموو ناوچەکانی پارێزگای هەولێر دەژیان، و ئەو گوندانە ئێستا زۆربەیان پاشماوەکانیان لەژێر گردەشوێنەوارییەکاندا بەجێماون، شایەنی باسە پاشماوەی ڕاوچییەکانی گوندەکانی ناوچە شاخاوییەکان کە چوونەتە ڕاوکردن و چەند شەو و ڕۆژێک لە ئەشکەوتەکانی (بەستوون) و (دیان) ماونەتەوەلە شاخەکانی برادۆست خەریکی ڕاوکردن بوون، و خواردن و خواردنەوەیان لە ناو گۆزەکاندا بردووە پاشماوەی ئەو گۆزانە لە لایەن تیمێکی ئەمریکییەوە لەو ئەشکەوتانە دۆزرایەوە، و بوونە بەڵگەی ئەوەی کە لە دەشت و دۆڵەکانی نێوان شاخەکاندا چەندین

گوندی کشتوکاڵی هەبووە لەوسەردەمەدا لە سنووری پارێزگای هەولێر.

**شارستانیەتی سەردەمی وەرکا (ئوورک) ٣٥٠٠-٣١٠٠پ.ز**

- شارستانیەتی سەردەمی وەرکا (دەرکەوتنی شارستانیەتی سۆمەری لە باشوری میسۆپۆتامیا و دەرکەوتنی نووسین) پاش ئەوەی کە لە ماوەی هەزار ساڵی رابردوودا بە شێوەی کۆچێکی هێواش هەندێک لە مرۆڤەکانی گوند و نشینگەکانی کوردستان روویانکردە باشوری میسۆپۆتامیا و کوردستانیان بەجێهێشت بە هۆی زۆربوونی ژمارەی دانیشتوان و کەمی بەرهەمی کشتوکاڵییەوە چونکە کشتوکاڵ لە کوردستان دێمی بوو.....

- ژیان بەردەوام بوو لە قالینج ئاغا، و کنەوپشکنینەکانی ساڵانی ١٩٦٧ و ساڵانی دوایی بەڕێوەبەرایەتی گشتی شوێنەواری عێراقی ئەودیان سەلماند کە ئەم گوندە:

١- لە چەند کۆڵانێک پێکهاتبوو نێوان کۆڵانەکان خشتڕێژکراوە و هاتووچۆکردن ئاسانە.

٢- چەند پەرستگایەکی تێدا دۆزرایەوە، لە یەکێک لە پەرستگاکاندا پەیکەری خواوەندی چاو EYE IDOL (معبود العین) دۆزرایەوە، کە خواوەندێکە لە قوڕ و بەرد دروستکراوە و چاوەکانی گەورەیە بۆ ئەوەی بەردەوام چاودێری مرۆڤەکان بکات و بیان پارێزێت بە پێی باوەڕی ئەوان. **بنوارە وێنەی ژمارە(٢)**

ئەم جۆرە پەیکەرە لە چەند شوێنێکی دیکە دۆزرایەوە (لە کوردستانی رۆژئاوا لە تەل براک و لە ناوچەکانی دیالە)، جگە لەوەی کە لە سەر چەندین مۆر وێنەی چاوەکانی ئەم خواوەندە کێشراوە.

- بە پێی پشکنینەکانی بەشی شوێنەوار- زانکۆی سەلاحەدین) لە ساڵانی ٢٠٠٤-٢٠٠٧، مرۆڤی سەردەمی عوبەید (٤٠٠٠پ.ز) و سەردەمی وەرکا (٣٥٠٠-٣١٠٠پ.ز) لە تەل قەصرا (لە عەینکاوە)ژیاوە و، هەروەها مرۆڤ لە گردی عەوێنە و دەیان گوندی دیکە دەژیان، کە ئێستا پاشماوەکانیان لە ژێرگردە شوێنەوارییەکانی ناو شاری هەولێر و دەوروبەرییەتی...

- لە سەردەمی وەرکا ٣٥٠٠-٣١٠٠پ.ز دروستکردنی کۆنترین ملوانکەی زێڕ لە قالینج ئاغا کە بە کۆنترین ملوانکەی زێڕین دادەنرێت لە جیهاندا... **بنوارە وێنەی ژمارە(٣)**

دۆزینەوە و داهێنانی نووسینی وێنەیی لە شاری وەرکا کە هاوسەردەمە لەگەڵ قالینج ئاغا، شوێنەوارناس (بەهنام ئەبوصوف) کە (پشکنەری قالینج ئاغا بوو لە ١٩٦٧ز) پێی وابوو کە دەبێت سۆمەرییەکان نووسینیان لە قالینج ئاغا داهێنا بێت، ئەو پێی وابوو کەئەگەر کنەوپشکنینەکانی بەردەوام بێت ئەوا کۆنترین نووسین دەدۆزرێتەوە لە قالینج ئاغا، بەڵام ئەوەی جێگەی باسە کە تائێستا ٣٠٪ ئەم نشینگە گەورەیە کە لە گوندێکی ئاسایی گەورەترە کنەوپشکنینی تێدا کراوە، کە پێدەچێت لە داهاتوودا شتی زیاتر بدۆزرێتەوە، ...

منداڵەکان لە گۆزەدا دەنێژران کە نیشانەی باوەڕبوونە بە جیهانی دوای مردن، گۆزەکان هێمایەک بوون بۆ رەحمی دایک بۆ ئەوەی دووبارە منداڵەکان لە دایک ببنەوە لە جیهانی دوای مردن...

**- شارستانیەتی نەینەوا ئایف (٥) و جەمدەتنەصر (٣١٠٠-٢٩٠٠پ.ز)**



وێنەی ژمارە(٢)



وێنەی ژمارە(٣)

پاشماوەی ئەم شارستانییەتە لە چەند ناوچەیەک بە پەرش و بڵاوی دۆزرایەوە.بە پێی بەڵگە شوێنەوارییەکان و نووسراوە مێخییەکان تۆفانی (نوح) لەم سەردەمەدا روویداوە...لەگەڵ ئەوەی بەڵگەی تۆفانەکە و پاشماوەی لیتەی تۆفانەکە لەسەر شاری نەینەوا و شاری ئۆر دۆزرایەوە بەڵام لە سنووری پارێزگای هەولێر تا ئێستا هیچ بەڵگەیەک نەدۆزراوەتەوە.

### قەڵای هەولێر (قلعة أربيل(Urbilium)):

لەگەڵ ئەوەی کە تا ئێستا هیچ کنەوپشکنینێک لە قەڵای هەولێر نەکراوە، بەڵام ئەوەی کە باس دەکرێت کە قەڵات کۆنترین شاری جیهانە کە تا ئێستا ژیانی تێدا بەردەوام بێت، تەنها بە بەراوردکردنە بە گوندی قالینج ئاغا کە تەنها یەک کیلۆمەتر لە قەڵاتەوە دورە، و ئەوان پێیان وایە کە قالینج ئاغا نزیکەی حەوت هەزار ساڵ پێش ئێستا دروستکراوە و ئەمە راستە و بەڵگە مادییە شوێنەوارەکانیش ئەوەیان سەلماند، بە پێی بۆچوونی ئەوان کەواتە دەبێت گردی قەڵات بە هەمان شێوەی قالینج ئاغا لەو سەردەمەوە مرۆڤ لەسەری ژیابێت.

گردی قەڵات سەرەتا تەنها چەند مەترێک بەرزبووە بەڵام بە تێپەڕبوونی رۆژگاردەمەکان هێدی هێدی بەرزبووەتەوە چونکە چەندین پەرستگا و خانوو و شورای تێدا دروستکراوە، بەو شێوەیە بەرزییەکەی گەیشتووەتە زیاتر لە سی مەتر........بەڵام ئێمە پێمن وایە کە خەڵکی قالینج ئاغا لە ۳۰۰۰پ.ز قالینج ئاغا چۆڵ دەکەن و دەچنە شوێنی قەڵات و یەکەم شار دروست دەکەن....... و لە داهاتوودا ئەگەر پشکنین کرا ئەوکاتە دەردەکەوێت کە قەڵات کۆنترە یان پاش ئەو بەروارە دروستکراوە، بەڵام لە راستیدا ئەوەی گومانی تێدانییە ئەوەیە کە قەڵاتی هەولێر کۆنترین شاری جیهانە کە تا ئێستا ژیان تێیدا بەردەوام بێت.

### سەردەمی بنەماڵە سۆمەرییەکان (۲۹۰۰-۲۳۵۰پ.ز):

سۆمەرییەکان دەسەڵاتی سیاسییان دامەزراند و دەوڵەتە شار لە باشوری میسۆپۆتامیا دەرکەوت کە هەر شارێک بنەماڵەیەک فەرمانڕەوایەتی دەرکرد و فەرمانڕەوایەکی هەبوو کە پێی دەوترا (ئێنسی) واتە میر، و هەر شارێک پەرستاگا و خواوەندی سەرەکی خۆی هەبوو، هەروەها زەوی کشتوکاڵی و سوپای تایبەتی خۆی هەبوو...لەم سەردەمەدا گەلە کۆنەکانی کوردستان دەرکەوتن کە کۆنترینیان گوتییەکان و لولوبییەکان و سوبارییەکان بوون و لە ناوچە جیاوازەکانی کوردستاندا بڵاوبوونەوە، ئەم گەلە کۆنانە لە ئەنجامی زۆربوونی ژمارەی دانیشتوانی گوندەکانی چاخی بەردینی نوێ و چاخی بەردینی کانزایی دروست بوون و لە شوێنێکی دیکەوە نەهاتوون بۆ کوردستان....

سوبارییەکان شوێنی قەڵای هەولێر کە گوندێک بووە دەیکەنە شار و ناوی دەنێن شاری ئوربیلوم:

سوبارییەکان یەکێن لە کۆنترین گەلەکانی کوردستان و ناوچەکانی کوردستان لە نووسینە مێخییەکاندا سۆمەرییەکان باسی وڵاتی سوبارتویان کردووە و بە کوردستانی ئەمڕۆیان دەگوت سوبارتو. **بنوارە وێنەی ژمارە(٤)** ئەکەدییەکان هەولێر داگیردەکەن....




**وێنەی ژمارە (٤) نەخشەی وڵاتی سوبارتو و ناوچەکانی کوردستان چوار هەزار ساڵ پێش ئێستا و شاری هەولێر دەکەوێتە سوبارتوی بنە**

نەرامسینی پاشای ئەکەدی هەولێری داگیر کرد؟:

نەرامسین پاشای ئەکەدی چەند سەرکەوتنێکی تۆمارکرد بەسەر لولوبییەکان (لە پارێزگای سلێمانی)و هێرشی کردە سەر نۆ پاشا لە ناوچەی ولاتی سنەوبەر (لە ناوچەکانی دهۆک) و هێرشی کردە سەر ناوچەکانی دیاربەکر(میلێکی نەرامسین کە وێنەی نەرامسینی لەسەرە و نووسینی مێخی لەسەرە لە شاخی پیرحەسەن نزیک دیاربەکر دۆزرایەوە)، جگە لەوەی کە نەینەوا و ناوچەکانی خابووری کوردستانی رۆژئاوای داگیرکرد، بەم شێوەیە دەتوانین بڵێین کە دەوروبەری هەولێری داگیرکردبوو لە هەرچوارلاوە کە ئەمە بەڵگەی ئەوەیە کە پێدەچێت ئوربیلۆمی داگیرکردبێت و کنەوپشکنینەکانی داهاتوو ئەو راستییە پێچەوانەکەی دەسەلمێنێن.

لە کۆتایی حوکمی نەرامسین دەسەلاتی ئەکەدییەکان کزبوو و سوبارییەکان و گوتییەکان و لولوبییەکان و خورییەکان و....هێرش دەکەنە سەر سوپای ئەکەدی و شەڕ بەردەوام دبێت، تا لە کۆتاییدا گوتییەکان بە یارمەتی لولوبییەکان ئیمپراتۆریەتی ئەکەدی دەروخێنن، بەم شێوەیە هەموو میسۆپۆتامیا و هەولێریش دەکەوێتە ژێردەسەلاتی گوتییەکانەوە بۆ ماوەی سەد ساڵ (لە ۲۲۳۰-۲۱۲۰پ.ز).

لەسەدەی ۲۳ی پ.ز دا گوتییەکان بۆ یەکەمجار لە مێژوودا ناوی هەولێریان بە شێوەی (ئوربیلیوم)هێنا لە دەقێکی مێخیدا لە سەردەمی پاشای گوتی(ئیریدوپزر)دا(م.کۆزاد ئەحمەد).

**دەوڵەتی سۆمەری نوێ (۲۱۱۳-۲۰۰۶پ.ز):**

شولگی کوڕەزای ئورنەمو کە یەکێک بوو لە بە هێزترین پاشا سۆمەرییەکان، زیاتر لە دەجار هێرشی کردە سەر کوردستان و لە ساڵی ۲۰۹٤پ.ز شاری ئوربیلیوم(قەلات) داگیردەکات و فەرمانڕەوایەکی سۆمەری دادەنێت)((ئوربیلوم، ئەربیلوم UR-BI-LUM) AR-BI-LUM)، پاش ماوەیەک سۆمەرییەکان دەردەکرێن لە ئوربیلیوم بەلام شولگی دووبارە داگیری دەکاتەوە، شولگی خۆی بە خواوەند دەزانی و مانگانە دووجار قوربانی بۆ پەیکەرەکانی دەکرا لە هەموو شارەکاندا...

دەرکەوتنی شانشینی سیمورووم لە رۆژهەلاتی هەولێر کە خورییەکان دایان مەزراند، دەرکەوتنی هۆزەکانی توروککو کە سەر بە خورییەکان بوون لە دۆڵی خۆشناوەتی...لەسەرەتای هەزارەی دووەم پ.ز.

رۆژهەلاتی هەولێر کەوتە ژێر دەسەلاتی شانشینی سیمورووم کە دەتوانین بڵێین پایتەختەکەی ناوچەی بێتواتە بوو.

ناوی ئوربیلیۆم ناوێکی زۆر کۆنە و واتاکەی نازانرێت...، بەلام ناوی ئەربائیلو (چوار خواوەند) تەنها لێکدانەوەیەکە بۆ ناوی ئوربیلیوم و پەیوەندی بەناوی ئوربیلیومەوە نییە بەڵکو لە دەنگەکەیەوە وەرگیراوە و ئەو شێوەیەی وەرگرتووە لە سەردەمی ئاشوریدا.

ئاشورییەکان لەسەرەتای هەزارەی دووەمی پ.ز هەولێر داگیردەکەن:

دوای ئەوەی ئاشورییەکان لە جەزیرەی عەرەبییەوە لە رێگەی ولاتی شامەوە هاتنە ولاتی سوبارتو و داگیریانکرد...بەلام بە هاتنە سەر حوکمی پاشای ئاشوری شەمشی ئەدەدی یەکەم، گۆڕانکاری روویدا چونکە شەمشی ئەدەد هێرشی کردە سەر ناوچەکانی کوردستان و زۆربەی داگیرکردن بەتایبەتی ناوچەی هەولێر و قوشتەپە، کە بە پێی رای شوێنەوارناسی کورد (رافیدە قەرەداغی) شاری کاشتاپیوم (گردی قوشتەپەی ئێستایە) کە لە لەشکرکێشییەکانی شەمشی ئەدەدی یەکەم باسکراوە.، لەسەردەمی پاشای ئاشوری شەمشی ئەدەدی یەکەم (۱۸۱۳-۱۷۸۱پ.ز) دا کە بە هاوکاری دادوشای پاشای شانشینی ئەشنونا (ناوچەی دیالە) هێرشیان کردە سەر شاری ئەربیل و داگیریان کرد، ئەوکات فەرمانڕەوایەک حوکمی ئەربیلی دەکرد ناوی (بونو-عشتار)بوو...

**شاری ئوربیلیوم لە سەردەمی خورییەکاندا ۱۷۰۰-۱۳۰۰پ.ز:**

لە ناوەراستی هەزارەی دووەی پێش زایینەوە ناوچەکانی هەولێر کەوتە ژێر دەسەلاتی میتانی و خورییەکانەوە و فەرمانڕەواییان دەکرد، گرنگترین بەڵگە بۆ بوونی خورییەکان. خورییەکان وەک گەلێک دەردەکەون و لە زۆربەی ناوچەکانی کوردستانی گەورەدا بلاو دەبنەوە و لە ناوچەکانی هەولێر و لە شاری

ئوربیلیوم (قەلات) نیشتەجێ دەبن، لە ناوچەکانی خۆشناوەتی بە چڕی بڵاودەبنەوە...لە ناوچەکانی هەولێر لە پشکنینەکانی بەشی شوێنەوارناسی زانکۆی سەلاحەدین (٢٠٠٤-٢٠٠٥ز) گوندێک دۆزرایەوە لە شوێنەواری گردی (تەل قەصرا) لە عەینکاوە کە شوێنەواری ئەم سەردەمەی تێدا بوو، و چەندین گۆزە و گڵێنەی نەخش و زەخرەفەی ئەندازەیی رەنگا و رەنگ دۆزرایەوە، هەروەها گۆڕی چەند منداڵێک دۆزرایەوە کە لەناو گۆزەدا نێژرابوون، جگە لەوەی چەند ئامرازێکی برۆنزی دۆزرایەوە. **بنوارە وێنەی ژمارە(٣و٤)**

سەردەمی ئاشوری ناوەڕاست (١٣٠٠-٩١پ.ز): لەنووسینەکانی سەردەمی ئاشوری ناوەڕاستدا بەشێوەی (ئەربائیل) هەولێر باسکراوە...

لەسەردەمی ئاشوری نوێ (٩١٢-٦١٢پ.ز) ئەربائیلو سەنتەرێکی کارگێڕی گرنگی ناوچەکەبووە و نوسینەکانی ئەم سەردەمە باس لە ناوی سێ فەرمانڕەوا دەکەن، کە بە پێی رۆژمێری (لیمو)ی ئاشوری هەر فەرمانڕەوایەک لەفەرمانڕەوای شارەکان، هەر یەکێک لە ساڵەکانی حوکمی پاشای ئاشوری بەناوی حاکمەکانەوە ناو دەنرا، واتە هەر ساڵێک بەناوی حاکمێکی تایبەت ناودەنرا و رۆژمێر و ساڵنامەکان مێژوویان بەناوی ئەو حاکمەوە تۆمار دەکرد........ بەم شێوەیە بۆ ماوەی سێ ساڵی جیاواز لە سەردەمی ئاشوری نوێ دا، ساڵی فەرمانڕەوایی پاشای ئاشوری بە ناوی فەرمانڕەوای



**وێنەی ژمارە (٣)**



**وێنەی ژمارە(٤)**

شاری ئەربائیلو ناونراوە.

لەم سەردەمەدا گەلێکی بەهێز لە باکووری هەولێر پەیدا دەبن کە ئەوانیش ئۆرارتیەکانن، ئۆرارتییەکان لە بنەڕەتدا خەڵکی ناوچەکانی (وان) بوون لە باکووری کوردستان، شوێنەوارناسان و پسپۆڕانی بواری زمانە کۆنەکان پێیان وایە کە ئۆرارتییەکان و خورییەکان یە گەلی هاوبەشن و پاشان لەیەک جیابونەتەوە، تەنانەت کە ئێستا توێژینەوە کراوە دەربارەی هەردوو زمانە دەرکەوتووە کە هاوبەشییەکی زۆر لە نێوان زمانی ئۆرارتی و خوریدا هەیە و پەیوەندیشی بەزمانی کوردییەوە هەیە، ئۆرارتییەکان

دەسەڵاتیان زیادی کرد لە کوردستانی باکور و دەسەڵاتیان گەیشتە ناوچەکانی رەواندوز، پایتەختە ئاینییەکەیان لە ناوچەی موصاصیر (مەجێسیر) ینزیک سیدەکان - رەواندوز، کە لەوێ خواوەندی نەتەوەیی ئۆرارتییەکان خواوەند (خالدی) دەپەرسترا، هەر لەبەر ئەمەش بوو کە ئورارتییەکان پێیان دەگوترا خالدییەکان بە ناوی خواوەندەکەیانەوە.

شاری ئێوربیلوم لە شێوەزاری ئاشووریدا (کە سەر بەزمانی ئەکەدی کۆنە هاوشێوەی زمانی بابلی کە ئەویش شێوەزارێکە لە زمانی ئەکەدی) بوو بە (ئەربا ئیلو) بە واتای (چوار خواوەند) لە مانگی تشرینی دووەمی ساڵی ٢٠٠٨ گۆڕێک لە باکووری رۆژئاوای قەڵای هەولێر دۆزرایەوە لە گەڕەکی عەرەب ئەم گۆڕە پێکهاتبوو لە ژوورێک کە قوبەی هەبوو مردووەکان لەناو تابوتی گلێنەییدا نێژرابوون چەندین گلێنەی تێدا دۆزرایەوە گلێنەکان خواردن و خواردنەوە و بۆن (عەتر)یان تێدا دانراوە بۆ ئەوەی مردووەکان لە ژیانی دوای مردن بەکاری بهێنن شایەنی باسە گۆڕەکان تووشی دزی و تالانی هاتبوون و ئێسکەکان بڵاوکرابوونەوە و هەندێکیان دووبارە نێژرابوونەوە، چونکە زێڕ و زیوی ناو گۆڕەکان لە سەردەمە کۆنەکاندا دزرابوو تەنها یەک گوارەی زێڕی تێدامابوو.

شوێنەوارناسانی کوردستان و پەیمانگای رۆژهەڵاتی ئەڵمانی بۆ شوێنەوار بۆ کۆتایی هەزارەی دووەمی پ.ز و سەرەتای هەزارەی یەکەمی پ.ز دەگەڕێننەوە بۆ سەردەمی خورییەکان و ئاشوورییەکان دەگەڕێتەوە. **بنوارە وێنەی ژمارە (٥)**

ئەربائیلو(قەڵات) بووە یەکێک لەشارە گرنگەکانی بن دەسەڵاتی ئاشوورییەکان و بووە مەڵبەندی ئاینیی و بنکەی سەرەکی هێرشەکانیان چونکە پەرستگای خواوەند (عەشتاری جەنگی لێبوو، کە بە عەشتاری ئەربائیلو (عەشتار ئەربیلا) ناسراوە، ئەم عەشتارە جیاواز بوو لە عەشتاری خۆشەویستی کە پەرستگاکەی لە شاری نەینەوا بوو.

پاشا ئاشوورییەکان پێش ئەوەی بچنە هەر شەڕێک و هێرش بەرنە سەر دوژمنەکانیان دەهاتنە پەرستگای عەشتاری ئەربائیلو و لەوێ شەو لە پەرستگای خواوەند عەشتار دەمانەوە و دەپاڕانەوە بۆ ئەوەی سەرکەوتنیان پێببەخشێت.

باسکردنی وڵاتی کیروری کە شوێنێکی جوگرافی بوو دەکەوێتە باکوری شاری هەولێر لە ناوچەی کۆیە و شەقڵاوە و بالیسان، ئەم وڵاتە زیاتر بە ناوچەیەکی جوگرافی دەچێت وەک لەوەی بنکەیەکی سیاسی و وڵاتێک بێت، ئاشوورییەکان بەردەوام باسی دەکەن کە سەرانەیان وەرگرتووە و مەڕو ماڵات و دەغڵ و دانیان لێسەندوون.



وێنەی ژمارە (٥) گۆڕەکە

بەهێزبوونی پاشایانی ئورارتو، ئورارتییەکان لەسەردەمی مینوا و رۆسا دا هێرش دەکەن سەر ئاشورییەکان لە باکوری هەولێر، تۆمارکردنی سەرکەوتنی ئۆرارتییەکان بەسەر ئاشورییەکاندا لە سەر دوومیلەکەی تۆپزاوا و کێلەشین.

موصاصیر کەوتەوە بن دەستی ئۆرارتییەکان ئورزانای فەرمانڕەوای موصاصیر کە پیاوێکی ئۆرارتی بوو و سەربە ئاشورییەکان بوو، پەیمانی دایە رۆسا و موصاصیر کەوتە بن دەستی ئۆرارتییەکان و سوپای ئاشوری لەوێ دەرکران.

سالانە قوربانی و دیارییەکی زۆر لە زێر و زیو پێشکەش بە موصاصیر دەکرا، موصاصیر بووە دەولەمەنترین شارەکانی ئورارتو، پاشاکان لەوێ تاجی شاهانەیان دەکرایە سەر و سالانە پەیمانیان دووبارە دەکردەوە.

سەرجۆنی دووەمی ئاشوری لە سالی (٧١٤پ.ز) لە هێرشی هەشتەمیدا شاری موصاصیر (پایتەختی ئاینی ئۆرارتییەکان) وێران دەکات و تالانییەکی زۆر لە زێرو زیو و چەک دەهێنێت بۆ ئاشور............

لە پاش سەرجۆن سەنحاریب (ی کوری سەرجۆن) هاتە سەرتەختی ئاشور (٧٠٥-٦٨١پ.ز) سەنحاریب لەگەل ئەوەی کە لە شەڕ بەردەوام بوو هێرشی کردە سەر ناوچەکانی شام و هێرشی کردە سەر عیلام، بەلام لەگەل ئەوەشدا زۆرگرنگی بەلایەنی بیناسازی و ئاودێری دا...

سەنحاریب لە بەستۆرەوە بەرێگەی کارێز ئاوی گەیاندە شاری ئەربائیلو،

ئەسەرحەدۆن (٦٨١-٦٥٨پ.ز) جێگەی سەنحاریب باوکی گرتەوە، ئەسەرحەدون پێش ئەوەی میصر داگیربکات هاتە پەرستگای عەشتاری جەنگ لە ئەربائیلو بۆ ئەوەی سەرکەوتنی پێببەخشێت.....

میدیەکان گەیشتنە سنوری پارێزگای هەولێر بەلام لەگەل ئاشوریەکان رێکەوتبوون،

کاتی سەردەمەرگی ئەسەرحەدون بڕیاریدا کە کوڕەگچکەکەی (کە ناوی ئاشوربانیپال بوو) بکرێتە ئیمپراتۆری ئاشور و کوڕەگەورەکەی (کە ناوی شەمش شەمئۆکین بوو) بکرێتە فەرمانڕەوای بابل و لەژێر دەسەلاتی برا گچکەکەیدا بێت، بۆ ئەم مەبەستە پەیمان نامەی لە فەرمانڕەوای هەموو شارەکان وەرگرت و لێپرسراوی هەموو هەرێمەکانی سوێند دا، و یەکێک لەوانە فەرمانڕەوای میدییەکان بوو، لە پەیمان نامەکەدا هاتووە کە سوێند بە خواوەندەکان دەخورێت بۆ ئەوەی ئەو پەیمانە جێبەجێ بکرێت، و یەکێک لەو خواوەندانەی سوێندی پێدەخورێت خواوەند (عەشتار ئەربائیلو)یە،

ئاشوربانیپال بووە پاشای ئیمپراتۆریەتی ئاشوری(٦٥٨-٦٢٦پ.ز)، پەیوەندی لە گەل ماد باش بوو ناوچەی هەولێر ئارام بوو..........

لە دوای مردنی ئاشوربانیپال میدییەکان بەسەرکردایەتی کەیئەخسار (کەیخوسرەو) گەیشتنە هەولێر لە دوای ٦١٥پ.ز لەگەل ئەوەی سەرچاوەکان باس گرتنی ئەربائیلو ناکەن، و پێدەچێت لە داهاتوودا بەلگەی گرنگ لەو بارەوە دەربکەوێت، بەلام ئێستا نازانین ئایا میدییەکان (ئەربائیلو) یان بە شەڕ گرت یان (ئەربائیلو) خۆی بەدەستەوەدا؟، لە سالی ٦١٤پ.ز شاری ئاشور لە لایەن میدییەکانەوە گیرا، میدیا و بابل رێکەوتن کە پێکەوە لە ئاشورییەکان بدەن، زەواجی سیاسی لە نێوان کوڕی پاشای بابل و کچی پاشای ماد روویدا، .........

لە سالی ٦١٢پ.ز نەینەوا سووتێنرا لە لایەن میدی و بابلییەکان و ئیمپراتۆرییەت ئاشوری رووخا، و هەولێر و هەموو ناوچەکانی باکوری میسۆپۆتامیا (کوردستانی گەورە) هەتا باشوری سامەڕا کەوتە دەستی میدییەکان و ئیمپراتۆریەتی ماد دامەزرا.

دەولەتی ماد بەردەوام بوو تا ٥٥٠پ.ز.........

فارسە هاخامنشییەکان دەوڵەتی ماد دەڕوخێنن و بە سەرکردایەتی کۆرشی گەورە(٥٥٠-٥٢٨پ.ز) دەگەنە هەولێر، لە ٥٥٠پ.ز تا ٣٣١پ.ز حوکمی هەموو کوردستان و ناوچەی هەولێردەکەن.

کۆرش ولاتی دابەشکرد بۆ چەند ولایەتێک (هەرێمێک وەک هەرێمی میدیا، هەرێمی ئاشور.........) پێدەچێت ئەربێلا سەر بە ولایەتی ئاشور بوو بێت،

دوای کۆرش (کامبیسی دووەم) دێتە سەرتەختی فارس (٥٢٨-٥٢٢پ.ز).

کامبیس دەمرێت و راپەڕین دەست پێدەکات و فەرمانڕەوای ماد و هەموو ناوچەکانی دیکە سەربەخۆیی رادەگەیەنن...........

داریوشی یەکەم(٥٢٢-٤٠٥ ؟پ.ز) دەبێتە پاشای فارس و هەموو ناوچەکان دەخەتاوە ژێر دەسەلاتی فارس و هەموو سەرکردەکان بەدیل دەگرێت و وێنەیان دەکێشێت بە کۆت کراوی لەبەردەم خۆیدا لەشاخی بێستون سەرکەوتنەکانی تۆماردەکات بە خەتی مێخی و بە زمانی فارسی کۆن و عیلامی و بابلی، ............

داریوش گرنگی زۆری دا بە ولایەتەکانو ئەوکاتە ئەربێلا سەر بە ولایەتی ئاشور بوو....

لەم سەردەمەدا هەولێر و ئەربائیلو دەورێکی گرنگی هەبوو بۆ فارسەکان و یەکێک بوو لەشارە گرنگەکانی ئیمپراتۆرییەتی فارس........

حوکمی فارس بەردەوام دەبێت بێئەوەی کە رووداوێکی گرنگی ئەو تۆ رووبدات لە هەولێر.....ئەم سەردەمە بە سەردەمی ئازادی بیروڕاکان ناسراوە ولەم سەردەمەدا ئاینی رەسمی زەردەشتی بوو، بەلام رێگە بە جولەکە و بە هەموو ئاینەکانی دیکە درابوو بەئازادی پەرستنی تایبەت بە خۆیان بکەن.

لە ١تشرینی یەکەمی ساڵی ٣٣١پ.ز ئەسکەندەر گەیشتە زێی گەورە لە باکوری هەولێر گەورەترین و بەناوبنگترین شەڕی جیهانی کۆن روویدا کە پێی دەگوترێت شەڕی ئەربێلا(جەنگی گەوکەمێلا)چونکە لە نزیک شاری ئەربێلا بوو، لەم شەڕەدا ئەسکەندەر سەرکەوت و زۆرێک لە سوپایفارس کوژران و داریوشی سێیەم خۆی گەیاندە ئەربێلا(قەلات) و بۆ رۆژی دوایی پێشئەوەی ئەسکەندەر بگاتە قەلات داریوش لە رێگەی گەلی عەلی بەگەوە خۆی گەیاندە هەمەدان، و بەم شێوەیە ئیمپراتۆرییەتی فارس رووخا و هەولێر بوو بەبەشێک لە ئیمپراتۆرییەتەکەی ئەسکەندەر، ئەسکەندەر تەنها چەند رۆژێک لە ئەربێلا مایەوە پاشان بەرەو بابل کەوتە رێ.

بۆ ماوەی دەساڵ ئەربێلا کەوتە ژێر دەسەلاتی ئەسکەندەر........

پاش مردنی ئەسکەندەر لە حوزەیرانی ٣٢٣پ.ز لە بابل...

بۆ ماوەی زیاتر لە دەساڵ جەنگ روویدا لەنێوان سەرکردە یۆنانییەکانی ئەسکەندەردا لەسەر دابەشکردنی ئیمپراتۆرییەتەکەی ئەسکەندەر.....

پاشان لە ٣١٠پ.ز هەولێر و هەموو میسۆپۆتامیا و ئێران و بەشێک لە ولاتی شام کەوتە ژێر دەسەلاتی سەلوقس کە یەکێک بوو لە سەرکردەکانی سوپای ئەسکەندەر و دەوڵەتی سەلوقییەی دامەزراند ٣١٠-١٣٨پ.ز) بەو شێوەیە ولات کەوتە ژێر دەستی یۆنانییەکان و شارستانییەتی هیلینستی بلاوبووەوە کە تێکەڵەی شارستانیەتی یۆنانی و رۆژهەلاتی بوو کاریگەری لەسەر بیناسازی و جل و بەرگ و زمان و زۆر لایەنی ژیانکرد.

ئەشکانییەکان (فرثییەکان) ١٣٨پ.ز - ٢٢٦ز)

لەم سەردەمەدا ئەشکانییەکان یۆنانییەکانیان دەرپەڕاند لە ئێران و میسۆپۆتامیا، و حوکمێکی لامەرکەزییان هێنایە کایەوە، و کوردستان بوو بە چەند هەرێمێکەوە، یەکێک لەو هەرێمانە پێی دەگوترا ئەدیابین کە سەرەتا پایتەختەکەی لە شاری ئەربێلا بوو، ئەدیابین سنورەکەی لە نێوان هەردوو زێی گەورە و

بچووکدا بوو هەندێک جار سنوری ئەدیابین دەگەیشتە شاری هەترا (حەضر)، و لە رۆژهەڵاتیشەوە دەگەیشتە چیای پیرەمەگرون. ئەدیابین حوکمی زاتی وەرگرتبوو لە دەوڵەتی ئەشکانی، لەم سەردەمەدا ئازادی بیروباوەڕەئاینییەکان لەوپەڕی بردودا بوو.

نەخشێک لە حەریر لە شاخەکە هەڵکەندراوە شوێنەوارناسان هەندێکیان پێیان وایە کە ئەمە بە بۆنەی سەرکەوتنەکانی ئەشکەکانییەکانە بەسەر ئەنتیۆخۆس دا هەڵکەندراوە.

ئەربێلا لەم سەردەمەدا پیرۆزییەکی تایبەتی هەبوو، لە لای پاشایانی ئەشکانی و زۆرێک لە پاشاکانی ئەشکانی لە ئەربێلا نێژران، بە بۆ چوونی ئێمە ئەم پیرۆزییەی ئەربێلا پەیوەندی بە خواوەند عەشتاردوە هەبوو چونکە ئەشکانییەکان زۆر گرنگییان بەم خواوەندە دەدا و تەنانەت لە سەر تابوتەکانیان وێنەی خواوەند عەشتار لە شێوەی کچێکدا دروست دەکرا.

ئەم سەردەمە بە سەردەمی ئاژاوە و ناکۆکی نێوان یۆنانییەکان و ئەشکانییەکان ناسراوە و کوردستانی باکور کە پێی دەگوترا (کوردۆئین) لە ژێردەسەڵاتی یۆنانییەکاندا بوو، (ئەدیابین) لە ژێردەسەڵاتی ئەشکانییەکاندا بوو، زۆربەی کات هێرشەکان دەگەیشتنە ئەدیابین و وێراندەرکرا لە لایەن ئەرمەنییەکانەوە.

لە دوای سالّی ٦٥پ.ز دەسەڵاتی یۆنانی لە ناوچەکانی سوریا و ئەنادۆڵ و کوردستانی باکور نەما و رۆمانییەکان ناوچەکەیان داگیرکرد.

بەم شێوەیە شەڕی توند لە نێوان رۆمانی و ئەشکانییەکاندا دەستی پێکرد، و زۆربەی کات ئەدیابین و پایتەختەکەی ئەربێلا دووچاری شەڕ و وێرانکردن بووە وە، و چەندین جار ئیمپراتۆردکانی رۆمان قەڵایان وێرانکرد و شوراکانیان دەردەهێنا بۆ ئەوەی جارێکی دیکە بەرگری نەکەنەوە،

بنەماڵەی فەرمانڕەوای ئەدیابین بوونە جولەکە، و پاشماوەیەک لە سەرەتای سەدەی یەکەمی زاینیدا بوونە مەسیحی...

بۆ ماوەیەک پایتەختی ئەدیابین چووە حەزە کە ئێستا پێی دەگوترێت (عەزە و قونیان) و چەندین شوێنەواری یۆنانی و ئەشکانی لێیە.

گردی سەعداوە یەکێکە لە مەڵبەندە گرنگەکانی ئەدیابین و چەندین شوێنەواری گرنگی تێدا دۆزرایەوە، بۆ ماوەیەک پایتەختی ئەشکانییەکان بوو کە پێدەچێت گردی سەعداوە بووبێت یان ناوچەی پیرەمەگرون....

لە سەرەتای سالّی٦٩ز هێرشی ئەرمەنییەکان بەسەرکردایەتی تیگرانی پێنجەم بۆ سەر ئەدیابین بەڵام نەیتوانی داگیری بکات

١١٥ز هەولێر بووە گۆڕەپانی جەنگی نێوان رۆم و ئەشکانییەکان و تەراجانی ئیمپراتۆری رۆمانی هەولێری داگیرکرد

دەوڵەتی ئەرمەن هێرشی کردە سەر ئەدیابینو (زاربیۆنیس) ی پاشای ئەدیابین کوژرا.

٢١٦ز داگیرگردنی هەولێر لە لایەن کراکلای ئیمپراتۆری رۆمانییەوە و قەڵای هەولێری رووخاند و گۆڕی پاشایانی ئەشکانی دەرهێنا و بڵاوی کردنەوە.

٢١٩ز دوای راپەڕینی خەڵکی هەولێر دووبارە کراکلا هەولێری داگیر کردەوە، بەڵام ئەشکانییەکان هەولێریان گرتەوەوپارەیەکی زۆریان لە رۆمانییەکان سەند دژی شکاندنی پیرۆزی گۆڕی پاشاکانیان، ئەوکات هەولێر بە شوێنێکی پیرۆز دادەنرا و گۆڕی پاشایانی ئەشکانی لەوێ دەنێژرا.

دۆزینەوەی ژمارەیەک گۆڕ لە گردی کلک مشک و گەڕەکی عەرەب کە بۆ ئەم سەردەمە دەگەڕێتەوە،

ناونانی هەولێر لە سەرچاوە سریانییەکاندا بە حەدیاب هاتووە.

شاپووری یەکەم ٢٤٢هەولێر داگیر دەکات.

چەندین شەڕ و کێشە لەنێوان مەسیحییەکانی هەلێر و زەردەشتییەکاندا روویداوە.

# ناوی ئەشکەوتی شانەدەر

رەشید حوسێن خۆشناو

شوێنەواری (شانەدەر) دەکەوێتە قەزای (مێرگەسوور) و ١٦٢ کیلۆمەتر لە پارێزگای هەولێرە و ٤٣ کیلۆمەتر لە شارۆچکەی خەلیفانەوە دوورە، شانەدەر مەزنترین و کۆنترین ئەشکەوتی ناوچەکەیە و کەوتۆتە بەشی خوارووی چیای برادۆست، لە نزیک زێی سەروو (الزاب الاعلى)، ٧٦٥ مەتر لە ئاست رووی دەریاوە بەرزە، دەریچە و دەروازەی ئەشکەوتەکە پێوانەکانی بەم شێوەیەی خوارەوەیە:

پانییەکەی: ٢٥ مەترە
درێژییەکەی: ٤٠ مەترە
بەرزییەکەی: ٨ مەترە

تێبینی/ سەبارەت بە رەگوریشە و بنچینەی ناوی ئەشکەوتەکەش ئەوا پسپۆران و توێژەران لە نێوخۆیاندا بوونە سێ کۆمەڵە:

**کۆمەڵەی یەکەم**: پێیان وایە کە (شانەدەر) لە وشەیەکی لێکدراوی کوردی وەرگیراوە، ئەویش وشەی (شاهان - دەر)ە، واتە پەناگە و حەشارگەی پادشاکان، گوایە لەبەر فراوانی ئەشکەوتەکە و بەرزیی و سەختی شوێنەکەی، لە سەردەمەکانی رابردوو پادشا و سەرکردەکانیان بە خۆیان و هێزەکانیان روویان تێ کردووە و پەنایان بۆ بردووە.

**کۆمەڵەی دووەم**: پێی دەڵێن (شانیدار) واتە لاتەنیشتی چیا یاخود دارستان.

کۆمەڵەی سێیەم: پێیان وایە ناوی ئەشکەوتەکە لە (شاه نقر) بووە، گوایە پادشایەک بەم ناوە دەستی بەسەر ئەم ناوچەیەدا گرتووە و یەکەم کەس بووە ئەشکەوتەکەی دۆزیوەتەوە، بەڵام لەبەر قورسی و گرانی ناوەکە لەمەڕ زمان، بە تێپەڕبوونی کات سووک کراوەتەوە و گۆڕاوە بۆ (شانەدەر).

تێبینی: رای خەڵکی ناوچەکە بۆ ناوی شانەدەر ئەوەیە، کە دەڵێن: لەم دۆڵ و ئەشکەوتە مێشەنگین زۆر بووە و بەهاران (شانە) هەنگ دەری داوە و بەناوچەکەدا پەرت بووە، بۆیە پێیان گوتووە: شانەدەر- واتە شانەی هەنگ لێرەوە دەردەبێ.و دێتە دەرەوە.

سەرچاوەکان:

* کتێبی (أصول أسماء المدن والمواقع العراقية) المحامي جمال بابان، الجزء الاول، مطبعة الاجيال - بغداد ١٩٨٩.
* گۆڤاری (شانەدەر) ژمارە ٨، کانوونی دووەمی ١٩٩٨.


ئەشکەوتی شانەدەر لە ناوەوە





# ئەشکەوتی شانەدەر

زوبێر بیلال ئیسماعیل

پاش ئەوەی شـــوێنەوارناسـان، لەمـــیـــانەی کنەو پشکنینە زانستییەکانیاندا گەیشتنە راستی و دروستی شوێنەوارییەتی کۆنی ئەشکەوتی شانەدەر، ئەم ئەشکەوتە ناوبانگێکی بەر فـرەوانی دەرکـرد. وشەی شانەدەر وشەیەکی کوردییەو مانای (شانەی هەنگ دەگەیەنێت)، چونکە دەرگـای ئەشکەوتەکـە یان دەروازەکـە لە زاری شـانەی هەنگ دەچێت، ناوەکەش لەوەوە هاتووە کە هەنگ لەو ئەشکەوتە (شـانە)ی داناوە و کە زۆربوونە شانەیان دەرداوە و پێـیـان گـوتووە (شـانەدەر) و ناوچەکەش هەنگی زۆر بووە. شایانی باسە زۆر لەناوی گوندو دۆڵ و چیاو دەشت و ناوی کـوردسـتـان لەرووی زمانەوە، نیشانەیەکی مێژوویی یان جوگرافیی تایبەت بەخۆی هەیە، بۆیە هەڵەیە ئەگەر بێتوو ناودکان بگۆڕین یان بەناوێکی دیکە ناوی بنێین.

**شوێنی جوگرافی ئەشکەوتەکە:**

ئەشکەوتی شـانەدەر ١١٢کم لەباکـووری هەولێـر دوورە و بەتێپەڕبوون لە هەریر سپیلک بەلای چەپ رێگەیەک دەڕوات بۆ ناحیـەی شـانەدەر پاشـان بۆ گـوندی ئەشکەفـتـەشـانەدەر. لەوێ ئەشکەوتێکی شوێنەواریی ناسـراو بەئەشکەوتی شانەدەر هەیە. رێگاکە بەزنجیـرە چیـایەک سـەردەکـەوێت لەبەرامبەر چیای برادۆست. نزیکە لە گـــوندێکی گـــەورە بە نـاوی (سرێشمە)و ٦کم لەخەلیفان دوورە و بەلای چەپی رێگاکـە تێپـەڕ دەبێت. هەروەها بەدووری ١١ کم پـردێک لەسەر رووباری (خەلان) دەپەڕێتەوە، کـە لقـێکە لەزێی گـەورەو هەرسێ رووباری رواندزو دیاناو خـەلیـفـان تێکەلی دەبن. هەروەها ئەو ناوچەیە ناسـراوە بە خـەلان. لەنزیک پردی خەلان پردێکی کۆن دەبینرێ، زەمەن و مـێـژووەکـەی نازانرێ. دووری نزیکەی ٣ کم لەوپردە گـوندێکی

بچووک و رەز و باغ دەبینرێ و بەئەشکەوتی خەلان ناسراوە. بەدووریێکی کەم زارگەی بێخمە دێت کە لەمیانەی زنجیرە چیاکان ئاوی رۆیشتووی زێی گەورە پێکدێنێت. لێرەوە رێگاکەی بەردەوام دەبێت بە نێوەندی دەشتێکی تەنگی لوول پێچ (دەشتی شانەدەر)و بەدووری ٢٦کم لەپردی خەلان یان بەدووری ٤٣ کم لەخەلیفان رێگاکە دەگاتە گوندی شانەدەر. لەوێ دەگەینە ئەشکەوتی شانەدەر.

ئەو ئەشکەوتە گەورەیە کەوتۆتە لای باشووری چیای برادۆست بە بەرزی ٢١٠٠ پێ لەسەر ئاستی دەریا. بەماوەی نیو میل لای چەپی زێی گەورە دوورە. واتە لەگەڵ دۆڵی زێی گەورە لەنزیک ناحیەی شانەدەر درێژ دەبێتەوە. لە گوندەکەوە کە بەناوی گوندی ئەشکەفتەکە ناسراوە بگەینە ئەشکەوتەکە. بەماوەی میل و نیوێک بەلای باکووری رۆژئاوا بەسەر لوتکەی چیا دەکەوێت و دەگەیتە زاری ئەشکەوتەکە. بەبەرزی ٩٠٠ پێ لەسەر رێگا. ماوەی ئەم سەرکەوتنەش ٤٠ خولەک دەخایەنێت.[١١]

### وەسفی ئەشکەوتەکە

ئەشکەوتی شانەدەر پەناگەی بەردێکەو کەوتۆتە کەمەری چیای برادۆست، لەسەر دۆڵی زێی گەورە درێژ دەبێتەوە. لەشاری رەواندز زۆر دوور نییە. ئەم چەند ساڵەی رابردوو ئەو ئەشکەوتە لەلایەن شوانانی کورد لەوەرزی زستاندا بەکار دەهێنرێت.

زاری ئەشکەوت رووی لە باشوورە، بۆیە رۆژانە بۆ ماوەی چەند کاتژمێرێک نەخوازە لەزستان هەتاو لەئەشکەوتەکە دەدات. ئەو ئەشکەوتە هەر لەچاخی بەردینی کۆن تا ئەمڕۆی لەگەڵدابێت باشترین پەناگە بووە بۆ مرۆڤ و پاشانیش شوان و رەوەندەکان لەوەرزی زستاندا تیایدا دەمانەوە.

ئەو ئەشکەوتە هەڵکەوتێکی دیکەشی هەیە، ئەویش لەنزیک سەرچاوەی ئاوە هەمیشەییەکانە. ئەو ئاوەی لەسەر ئەشکەوت تنۆک تنۆک لە بنمیچەکەی ئاوێکی سازگارو شیرن بۆ خواردنەوە دێتە خوارێ. لەسەر شێوەی سێگۆشەیەکی پان هەڵکەوتووە. بەرینی زارەکە ٨٢ پێیە و بەرزاییەکەی ٢٦ پێیە. لەژوورەوە پانایییەکەی بەرفراوان دەبێت و دەگاتە ١٧٥ پێ. بەرزی سەری ئەو ئەشکەوتە لەناوڕاست دەگاتە نزیکەی ٤٥ پێ. سەری ئەشکەوتەکە لەکۆتاییەکەی بەدرێژی ١٣٠ پێ لەزارەوە کۆتایی پێدێت. لەساڵی ١٩٦٠ لەمیانەی گەڕانێکدا دەرکەوت لەکۆتایی ئەشکەوتەکە زارێکی دیکەی داخراو هەیە بۆ ئەشکەوتێکی فراوانتر دەچێت، بەڵام تا ئێستا پشکنینی تێدانەکراوە.

### پشکنین و لێکۆڵینەوە لە ئەشکەوتەکە

لەساڵی ١٩٥١ لەلایەن بەڕێوەبەرایەتی شوێنەواری گشتی عێراقی بەماوەیەکی کەم ئەو ئەشکەوتە دۆزرایەوە. پاشان رێگەدرا بە "رالف سولیکی"، بە نوێنەرایەتی زانکۆی میشیگانی ئەمریکی و بەنوێنەرایەتی پەیمانگای سمسونی ئەمەریکی لێکۆڵینەوەی تێدا بکات. ئەوەبوو لەساڵی١٩٥١ تا ساڵی ١٩٦١ بەردەوام بوو لە هەوڵەکانی و تا ئێستاشی لەگەڵ بێت هێشتا کەموکورتی ماوە لە گەڕان و پشکنین ئەشکەوتەکە بەتەواوی قووڵ نەکراوە. بەڵام سولیکی توانی بەهۆی هەڵکەندنی زەوی بگاتە قووڵایی ٤٥ پێ لە ناو ئەشکەوتەکەدا.

ئەو چینانە بەپیتی لاتینی رەنووس کراون، لەسەرەوە دەستی پێکرد: چینی aوbو b-1.b-2 و c و d و چینی d جیا دەکرێتەوە بەوەی کە زۆر ئەستوورە، کە لە ٢٨ پێ لە پاشماوە پێکهاتووە. شوێنەوارەکەی دەگەڕێتەوە بۆ چاخی بەردینی کۆنی ناوەڕاست ناسراو بە دووری موستیری، کە مرۆڤی جۆری نیاندرتاڵ لەو ئەشکەوتە نیشتەجێ بووە. بەدرێژایی سەدان سەدە زەمەنی ئەو خولە دەستنیشان بکرێ لە رێگای پشکنینی کاربۆنی[١٤] لە نێوان ٤٥- ٦٠ هەزارساڵ، تا ئەو ژمارە لەگەڵ ئەوەی مەزندە کراوە، لەخولی (اللفالوازی – المستری) دەگونجێ، بەتایبەتی لە بەشەکانی دیکە لە رۆژهەڵاتی، (٥) سولیکی، کە بوونی ئەوپەڕ چوار ئاستی نیشتەجێبوونی. ئێسکەکانیش دەگەڕێنەوە بۆ گا و بەرخ و بزن، کە ئەمەش ئەو گۆشەنیگایە دەخاتە روو، کەش و هەواکەی لەرووی ساردییەوە مامناوەندی بووە. هەر چوار پەیکەری

ئێسکی مرۆڤ بایەخێکی تایبەتیان هەیە. ئەو پەیکەرانەش لە چینی d دۆزراوەنەتەوە.

**چینەکانی ئەشکەوتەکە**

١- چینی a ئەستوورییەکەی نزیکەی پێنج پێیە. دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی بەردی نوێ. لەوانەیە بۆ پێش ٧٠٠٠ ساڵ بگەڕێتەوە. لەگەڵ ئەو چینە بڕێکی زۆر لە ئێسکی ئاژەڵی خۆماڵی هاوەنی لەبەرد دروستکراو دۆزراونەتەوە. تەها باقر مێژووی کەرەستەی دیوارەکانی و شوێنەوارەکەی بۆ سەرەتای یان دەستپێکی چاخی بەردینی نوێ پێش نزیکەی دە هەزار ساڵ گەڕاندۆتەوە. نموونەی ئەوە لە پێگەی زاوی چەمێ دۆزراونەتەوە. هەروەها لە بەشەکانی سەرووی ئەم چینە ئاسەواری سەردەمەکانی بەجێماو بوونیان ماوە.[8]

٢- بەڵام چینی b راستەوخۆ لەژێر چینی a دەرکەوت، ئەمەش مێژووەکەی بۆ چاخی بەردینی ناوەڕاست دەگەڕێتەوە، میسۆلیثەک دپسخمهفاهۆ واتە، نزیکەی ١٢ هەزار ساڵ. لەم چینە کەرەستەی سەرەتایی خەڵکانێک دۆزراوەتەوە کە هێشتا فێری کشتوکاڵ نەبووبوون. هەروەها فێرنەبووبوون چۆن ئاژەڵ خۆماڵی بکەن[9].

٣- لە ژێر چینی b چینێک دەرکەوت، کە مرۆڤ تیایدا نیشتەجێ نەبووە. مێژووەکەی بۆ نزیکەی ١٧ هەزار ساڵ دەگەڕێتەوە. بەڵام ئەو چینەی لەدوای هات، چینی دووەمە. مێژووەکەی بەنزیکەی ٢٩ هەزار ساڵ خەمڵێنراوە، بگرە زێتر، تا ٣٤ هەزار ساڵیش. ئەستوورییەکەی نزیکەی هەشت پێیە. لەم چینە پاشماوەی خەڵووزی بەردین ئامێرەکانی شارستانییەتی چاخی بەردینی کۆنی لە ئەورووپا ناسراو بە (ئۆر گەتیش)ی. ئەو شارستانییەتە لەهیچ شوێنێکی دیکەی عێراق دەر نەکەوتوون تەنیا لە ئەشکەوتی شانەدەر نەبێت. بۆیە شارستانییەتی چینی ٢ ناونرا بەشارستانییەتی برادۆستی لە چیای برادۆست. سولیکی دەڵێت: پیشەسازی برادۆستی بە پیشەسازییەکی تاک لە رۆژهەڵاتی کۆن دادەنرێت [11].

٤- چینی d قووڵایی ئاستەکانی بەچینێکی ئەستوور دەرکەوت و ئەستوورییەکەی بەنزیکەی ٢٩ پێ خەمڵێندرا (لەپاش ماوە). مێژووەکەی بە ٤٥- ٧٠ هەزار ساڵ خەمڵێنراوە. شوێنەواری ئەم چینە بۆ سەردەمی بەردینی کۆنی ناوەڕاست لە خولی موستیریدا دەگەڕێتەوە. لەو چینەدا پەیکەری ئێسکی مرۆڤی نیاندرتاڵ دۆزراوەتەوە، کە جیاوازە لەگەڵ جۆری مرۆڤی نوێ کە بە "هۆمۆساپێنس" ناسراوە، واتا مرۆڤی ئاقڵ. تەها باقر سەردەمی موستیری کە لە شانەدەر دۆزراوەتەوە دەگەڕێنێتەوە بۆ پێش ٥٠- ٧٠ هەزار ساڵ[13]. بەڵام کەرەستەی بەردینەکان کە لەو ئەشکەوتە لە سەردەمی موستیری دۆزرانەوە ناسراوەکانیان کونکەری بەرد، کە نیمچە سێگۆشەیە. (مەقاش - کەوان)[14].

**بەکورتی چینەکانی شوێنەوار لە شانەدەر ئەمانەن:**

چینی a سەرەتای چاخی بەردینی نوێ.

چینی b چاخی بەردینی ناوەڕاست.

چینی c چاخی سەرووی بەردینی کۆن لە کوردستان و عێراق پێی دەوترێت برادۆستی.

**ئەو ئێسک بەندانەی لە شانەدەر دۆزراونەتەوە**

چوار پەیکەری ئێسکی مرۆڤ لەچینی d لە شوێنەواری ئەشکەوتی شانەدەر دۆزراونەتەوە. هەروەکو وتمان سەردەمی موستیری، لەجۆری مرۆڤی بەناوبانگی نیاندەرتاڵ. یەکێ لە پەیکەرەکان کە بە هی منداڵێکی تەمەن شەش مانگ دانراوە لە ساڵی ١٩٥٢ دۆزراوەتەوە. هەرسێ پەیکەرەکەی دیکە هی مرۆڤی پێگەیشتوون و لەساڵی ١٩٥٦-١٩٥٧ دۆزراونەتەوە. کەللەی مرۆڤی چوارەم، بە هی کەسێکی تەمەن ٣٥ ساڵ دادەنرێت[15]. مێژووی سێ لەو پەیکەرانە بۆ سنووری ٤٥ هەزار ساڵ دەگەڕێنەوە. لە کاتێکدا پەیکەری چوارەم مێژووەکەی بۆ سنووری ٦٠ هەزار ساڵ دەگەڕێتەوە. بەڵگەی تەمەنی چینەکە لە ئەشکەوتەکەدا هەیە[16].

**گرنگیی پەیکەرە ئێسکییە دۆزراوەکان**

ئێسکە پەیکەرە دۆزراوەکان لە

ئەشکەوتی شانەدەر تا ڕێژەیەکی زۆر، گرنگ و پڕ بایەخن، چونکە دۆزینەوەی پاشماوەی ئەو ئێسکانە، مرۆڤی چاخی بەردینی کۆن لە عێراق دەدۆزێتەوە، کە پێش ٦٠ هەزار ساڵ لە کوردستانی باشوور دا ژیاون. ئەوەش کۆنترین جۆر نییە لە بەشی ئادەمیزاد، کە لەچاخی بەردینی کۆن ژیابێ[١٧]. شایانی باسە لەچینی سەروو لەو ئەشکەوتە کۆمەڵێ پەیکەری ئێسک هی سەرەتای چاخی بەردینی نوێ دۆزراونەتەوە، کە جیاوازییەکی ئێکجار زۆریان هەیە لەگەڵ پەیکەری مرۆڤی نیاندەرتال.

### چۆنیەتی زانینی تەمەنی ئەشکەوتەکە

زانینی تەمەنی ئەشکەوت بەهۆی دەرەنجامی لێکۆڵینەوەکان لەسەر باری دیاریکراو وەک دروستکردنی بەرد و چۆنیەتی گوزەران دیار کرا[١٨]. هەروەها بەهۆی بەکارهێنانی ڕێگای کاربۆنی ١٤، واتە شیکردنەوەی کەرەستە ئەندامییەکان لە تاقیگەدا. هەروەها بەهۆی پێوانە کردنی شوێنەوارە دۆزراوەکان لەگەڵ شوێنەکانی دیکەدا[١٩].

### زاوی چەمێ و پەیوەندیی بە ئەشکەوتی شانەدەر

زاوی چەمێ بەکۆنترین نشینگە دادەنرێت. مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ چاخی بەردینی ناوەند. بە ئاقاری زۆر سەرەتایی گواستنەوەی بەرهەمییەکان گوزەری کردووە. پاشماوەی ئەم نشینگە پێی دەوترێت زاوی چەمێ، بە کۆنترین شوێنی نیشتەجێبوون لە کوردستان و یەکەم نشینگە لەو جۆرە لە جیهان دادەنرێت.

زاوی چەمێ کەوتۆتە سەر کەناری زێی گەورە، بۆیە ناونراوە بە زاوی چەمێ (زەوی چەمێ). بەنزیکەی ١٠٠ یارد لەکەناری زێی گەورە دوورە. بەنزیکەی ٤٢٥ م لەسەر ئاستی دەریا. چیای برادۆست نزیکەی ١٨٠٠ م. ڕووبەری گردەکە نزیکەی ٢٧٥ =٢١٥ مەترە.

سولیکی لە میانەی دواکاری گەڕان و پشکنیندا لە ئەشکەوتی شانەدەر شوێنەواری کۆنترین نیشتەجێی دۆزییەوە، کە مەترێک یان دوو مەتر قووڵاییەتی، کە لە کەلاوەی داڕووخاوی نیشتەجێی لەو گوندە لەدیوار و قوڕی نارێک پێکهاتووە و بە بەردی گەورە دروست کراوە. لەڕووی ڕۆڵگێڕانی دروستکردنی خانوودا لەگەڵ سادەیی ئەو خانووە نیشتەجێیانە، وێنەی کۆنترین خانوومان بۆ دەکێشێت کە مرۆڤی سەرەتایی لە جێگیربوونی ژیانیدا دروستی کردووە و گوندی پێکهێنابێ. لە نێو کەلوپەلی ناوماڵ دۆزراونەتەوە، کە بەکاریان هێناوە بریتین لە، کەلوپەلی سادە، وەک: دەستاڕ - بەردی بەکارهێنراو بۆ وردکردن و هاڕین و هاوەن. نیشتەجێبوون لەو نشینگەیەدا بۆ ماوەیەکی درێژخایەن بەردەوام بووە، ڕاوکردنی ئاژەڵ پیشەی سەرەکی دانیشتوانی ئەو نیشتەجێیە بووە. بەڵگەش بۆ ئەمە پاشماوەی ئێسکێکی زۆرە، کە زۆرینەیان هی ئەو ئاژەڵانەن کە لەلای خواروو لە مامزی سوور دەکەن و ڕاوکراون. هەروەها ئێسکی مەڕو بزنیشیان تێدا هەیە. ئەو ئێسکانەش لە جۆری ئاژەڵی کێوی بووە. ئەمانە لای سەرووەوە بەزوویی ماڵی کراون. بەڵام بزن بە کێوی نامالی ماوەتەوە.

کەلوپەلی ناو ماڵ بۆ ئامادەکردنی خواردن وەک دەستاڕ و وردکەرو هاون لەگەڵ داسەکانیان کە لە ئێسقان دروست کراون خۆی لەخۆیدا ئاماژە بەفێربوونی سەرەتای کشتوکاڵییان دەدات[٢١]. بەڵام لە مەسەلەی خەملاندنی مێژووی زاوی چەمێ لە پشکنینی (کاربۆنی ١٤) لەسەر پاشماوەی چینەکانی خواروو دەرکەوت، کە دەشێ ئەو ڕۆژگارە بەڕەوشێکی گرنگ دابنرێت لە چاخەکانی پێش مێژوو لە کوردستانی- عێراقدا، بەسنووری دەیان هەزار ساڵ لە پێش زاین یان و سەرەتای هەزارەی نۆیەمی پێش زایین.

بەڵام پەیوەندی ئەشکەوتی شانەدەر زاوی چەمێ کە لێیەوە نزیکە، سەرچاوەکان بەزۆری دەڵێن ئەو ئەشکەوتە لە زەمەنی چینی b1 نشینگەیەکی زستانی بووە بۆ خەڵکی زاوی چەمێ کە بارەگای هاوینەیان بووە. لە چینی b1 دا هەروەکو باسمان کرد هاوچەرخی نزیک زەمەنی زاوی چەمێیە و چەند گۆڕێک هەیە، کە خۆی لەنزیکەی ٢٦ گۆڕ دەدات. ئەوانەش گۆڕی خەڵکی زاوی چەمێن. هەروەها لەگەڵ

ئەو گۆڕانە هەندێ کەلوپەل و پێویستیی دۆزراوەتەوە کەخۆی لەخۆیدا دەبنە بەڵگەی گرنگ. یەکێ لەو گۆڕانە ئافرەتێکی گەنجە، ملوانکەیەک، کە لە مۆری بچووک دروستکراوە دۆزراوەتەوە. لەگۆڕێکی دیکەدا چەقۆیەک دۆزراوەتەوە، کە لەناودایە. هەروەها ژمارەیەک سەکۆی بچووک کە لەدار دروستکراون دەبینرێن، یەکێکیان بەشێوەی کەوان لە رۆخی دیواری کەوانەکە دەچێت، لە زاوی چەمێ دۆزراوەتەوە.

شایانی باسە هەموو ئەو جۆرە کەلوپەل و کەرەستە تایبەتیانەی نێژراون، بەپێی مەزندەکان بۆ کۆنترین سەردەمی نیشتەجێی بوون دەگەڕێنەوە. وێڕای ئەوە هەندێ شتی دیکە لە ئەشکەوت و زاوی چەمی دۆزراونەتەوە، ئاماژە بەوە دەدەن کە پەیوەندی بازرگانی دووریان هەبووە، وەک بەردی ئۆپسیدی[22] و[23] کە لە ناوچەکانی (وان)ەوە هێنراوە..

## کوردستان

## پێگەی مرۆڤی نیاندرتاڵ

ئەگەرچی تاکو ئێستاش تەمەنی یەکەم مرۆڤی سەر گۆی ئەو زەوییە بەڕوونی نەدۆزراوەتەوەو بەتەواوی یەکلا نەکراوەتەوە، ئەوەش لەبەر ئەوەی کە مرۆڤ تاماوەیەکی دوورو درێژ هۆشی بەسەر ئەوەدا نەچووە و نەپرژاوەتە سەر ئەوەی بیر لەنووسینەوەی مێژووی خۆی بکاتەوە. بەڵام زانستی نوێ، شوێنەوارزانی ئەرکیۆلۆجیا چالاکانە لەو بوارەدا، دوای هەوڵ و تەقەلایەکی زۆر و شەونخوونی و بەدوادا چوونەوەی چۆنیەتی دەرکەوتنی یەکەم مرۆڤ و پەرەسەندن و گەشەکردنی ئەو گۆڕانکاری و شۆڕشە کۆمەلایەتی و سیاسی و تەکنەلۆژیانەی لەژیاندا روویداوە، توانی، دوای لێکۆڵینەوەی وردو بەردەوام مێژووی سەرهەڵدان و لەدایکبوونی یەکەم مرۆڤی بیژەندە و ئامێر دروستکەر[24] بۆ دوو ملیۆن ساڵ لەمەوبەر بگەڕێنێتەوە[25] ژیانیش بەچەند قۆناغ و چەرخێک دابەش بکات، وەک چەرخی پێش مێژوو چەرخی مێژوویی، کە هەر یەکەشیان دابەش دەکەن بۆ چەند قۆناغێکی تەمەن جیاجیاو لەیەکتر دوور.

کوردستانیش وەک یەکەم پێگەی ژیان و لانکەی ژیارە مرۆڤایەتییەکان[26] ئەگەر ساکاریش بێت، چەندین کاری پشکنینی شوێنەواری تێدا ئەنجام دراوە کە گەلێک لاپەڕەی شاردراوە و نەزانراوی چەرخەکانی بەر لە مێژووی کوردستانی بۆ خستووینە روو[27]. شوێنەوارناس "گارود" لە سالی (١٩٢٨ ز) لە ئەشکەوتی "زەرزری" لە ناوچەی سلێمانی و برید وود wood braid ی ئەمریکی لە سالی ١٩٤٨ ز لە دەوروبەری "قەلاچەرمۆ"، شوێنەوارەکانیان پشکنیوە.

هەروەها لە سالی (١٩٥١-١٩٦٠ ز) کۆمەڵێک توێژەر لەزانکۆی شیکاگۆ لەسەرووشیانەوە "برید وودی"و "هاو" (Howe) لە ئەشکەوتەکانی کوردستان دەستیان بەهەڵکۆڵین و پشکنین کردووە، وەک ئەشکەوتی "هەزار مێرد وشانەدەرو بێخاڵ و بێستوون". دەرکەوتووە کە جۆرە ئادەمیزادێکی هەرە کۆن بەناوی نیاندرتاڵ Neanderthal man بەزاراوە زانستییەکەش Homo neanderthal لە ٤٥-٦٠ هەزار ساڵ لەمەوبەر لە کێوەکانی کوردستان ژیابن. کە ئەوانەش دوابەرەی مرۆڤی کۆنن لەسەر زەویدا ژیاون و فەوتاون و دوای ئەوان جۆری مرۆڤی ژیر دەرکەوتووە. سەرەڕای ئەو دۆزینەوانەی شوێنەوارناسەکان لە ئەنجامی پشکنین و لێکۆڵینەوەکانیان لە کوردستان بەدەستیان هێناوە و هێشتا ئەگەر بوار بڕەخسێ لێکۆڵەرەوەکان لە هەڵکۆڵین و پشکنینەکانیان بەردەوام بن، زۆری بەبەردەوە ماوە بۆ وەدەستهێنانی زانیاری نوێترو بەکەڵکتر.

ئەشکەوتی شانەدەریش لەوانەیە گەورەترین ئەشکەوتی کوردستان بێت تاکو ئێستا دۆزرابێتەوە کە دەکەوێتە لای خوارووی زنجیرە چیای برادۆست و دەڕوانێتە دۆلی زێی گەورە و نزیکی ناحیەی شانەدەر. لەو ئەشکەوتەشدا چوار ئێسک بەندی مرۆڤی نیاندرتاڵ دۆزراونەتەوە و سێ ئێسکبەندەکەی تریش هی سێ کەسی گەورەن لە ١٩٥٦ - ١٩٥٧ دۆزراونەتەوە. مامۆستای پسپۆڕ

(ستیوارت Stewart) لێکۆڵینەوەیەکی لەسەر ئەو پاشماوانە کردووە و ئەنجامەکەشی لە گۆڤاری سۆمەر بەرگی چوارەم ١٩٥٨ بەشی ئینگلیزی لە لاپەرە ٩٠ بەدواوە بڵاوکردۆتەوە. هەروەها لە گۆڤاری (الاخبار المصورة اللندنية) Ill Ustrated London news. Nos 5. 1960. y هەر بۆیە سۆلیکی (Solecki) کە هەڵکۆڵینی ئەو ئەشکەوتەی پێ سپێردرابوو ناوی چاخی بەردینی کۆنی ناوەڕاستی، بە چەرخی برادۆستی ناو بردبوو، چونکە ئەو ئەشکەوتە لە چیای برادۆستە[29].

دەبێ بڕواشمان بە وردیی ئەنجامەکەی کاربۆن ١٤ هەبێ لەگەڵ ڕاستی سپۆرە ڕووەکییەکان. هەروەها بەوەی کە مرۆڤی نیاندرتال ٤ لە ئەشکەوتی شانەدەر لەگۆڕ نراوە بەر لە ٥٠٠٠٠ پێنج هەزار ساڵ لەمەو بەر لەنێوان کۆتایی مانگی مایس و سەرەتایی مانگی تەمووزدا.

### سەرچاوەو پەراوێز

١- طه باقر و فؤاد مطر/ المرشد الي مواطن الاثار والحضارة - الرحلة الخامسة بغداد، ص١٧٧٥.

٢- الدكتور جورج روو: العراق القديم- ترجمة حسين علوان بغداد ١٩٨٤، ص٧٢.

٣- طه باقر و فؤاد سفر/ المرشد، ص١٧.

٤- طه باقر/ مقدمة من تأريخ الحضارات القديمة ط٣ بغداد ١٩٧٣، ص١٨٠ والمرشد، ص١٩.

٥- طه باقر/ المقدمة ص١٨١ وعصور ماقبل التاريخ في وادي الرافدين مجلة المجمع العلمي الكردي العدد الاول ١٩٧٢ ص٥٨٩.

٦- جورج روو/ المصدر السابق ص٧٢.

٧- سعدي الرويشدي/ الكهوف في الشرق الادني: سومر ٢٥ ١٩٦٩ ص٢٦١.

٨- طه باقر/ عصور ماقبل التأريخ ص٥٨٩.

٩- سعدي الرويشدي/ المصدر السابق و طه باقر / عصور ماقبل التأريخ ص٥٨٩.

١٠- طه باقر/ المقدمة ص١٥٤.

١١- جورج روو/ المصدر السابق ص٧٣-٧٤ وأنظر/بريدو ودسومر ١٠ ١٩٥٤ ص١٢-٣٨.

١٢- مهدي الرويشدي المصدر السابق ص٣٦١ وجورج روو ص٧١-٧٥.

١٣- ١٤- طه باقر و فؤاد سفر/ المرشد ص١٩ وسعدي الرويشدي/سەرچاوەیپێشوو.

١٥-١٦ طه باقر/المرشد ص١٩ وعصور ماقبل التأريخ ص٥٨٩ والمقدمة، ص١٨١ والمقدمة ص١٥٢-١٧٥ وعصور ماقبل التأريخ، ص٥٨٩.

١٧- نسبة الي موقع في المانيا اسمه نياندرتال بالقرب من درسلدووف اكتشف في نماذج من هياكله العظمية لاول مرة. طه باقر/ عصور ماقبل التأريخ ص٥٩٠ الحاشية والمقدمة ص١٨٢-١٨٣ وحاشيتها.

١٨- درس هذه البقايا العظمية الاستاذ المتخصص ستيوارت. ونشر نتيجة دراسته في مجلة سومر ١٤ ١٩٥٨ بالقسم الانكليزي ص٩٠ وما بعد - وكذلك لجنة المنشور بحث المنشور في مجلة الاخبار اللندنية العدد ٥-٧ لسنة ١٩٦٠.

١٩ - طه باقر عصور ماقبل التاريخ، ص٥٩٠.

٢٠ - طه باقر المرشد ص١٩

٢١ - ٢٢-٢٣- طه باقر/ عصور ماقبل التاريخ ض٥٩٠ -٥٩١ والمرشد ص٢٠ وسعدي الرويشدي، ص٢٦١

٢٤- فرج بهمضى/ كنوز المتحف العراقي. مديرية الاثار العامة بغداد ١٩٧٢، ص١٥.

٢٥- ٢٦- طه باقر عصور ماقبل التأريخ ص٥٩٥-٥٩٧ اربيل ١٩٩٧/١/٨.

* کوردستان پێش مرۆڤایەتی نیاندرتال، کاکل حەمەد بەهرام گۆڤاری شانەدەر، ژ ١٣ ساڵی چوارەم، (٢٠٠٠) ل ١٣- ١٤ بەدەستکارییەوە.

* گۆڤاری شانەدەر گۆڤارێکی زانستی وەرزییە و بایەخ بەشوێنەوارو مێژوو دەدات - بەڕێوەبەرایەتی گشتی شوێنەوار لە وەزارەتی ڕۆشنبیری حکومەتی هەرێمی کوردستان دەری دەکات.

# ئەشکەوتی شانەدەرو مرۆڤی نیاندرتاڵ

**ئەیهان محەمەد قادر ئامێدی**
**کۆلیژی ئاداب- زانکۆی سەلاحەددین**

**بەشی یەکەم**

لێکۆڵینەوەی جیۆ مێژوویی لە شاخەکانی زاگرۆس و باسکردنی چینە شوێنەوارییەکانی ئەشکەوتی شانەدەر و ئامێر و کەلوپەلە بەردینەکان:

لە بەشی یەکەمی ئەم لێکۆڵینەوەیەدا سەرەتای دروستبوونی شاخەکانی زاگرۆس و تۆپۆگرافییەکان خراوەتە روو، یەکێ لە لایەنەکانی بریتییە لە ئەشکەوتی شانەدەر کە بابەتی لێکۆڵینەوەکەمانە و سەردەمی دروستبوونی و گۆڕانکارییە جیومورفۆلۆجییەکان و بەرزی و نزمییەکان و زانینی ئاووهەوای ناوچەکە لە ئێستادا و ناونانی ئەشکەوتەکە و شوێنی جوگرافیایی و باسکردنی سەرجەم بەشەکانی بە شێوەیەکی ورد بە تایبەتیش بەشی دواوەی ئەشکەوتەکە، چونکە ئەم بەشەی ئەشکەوتەکە لەکاتی خۆیدا لە لایەن هەڵکۆڵەرەکەوە نەدۆزراوەتەوە و لەو بلاوکراوانەش کە لەسەر ئەم ئەشکەوتە بلاوی کردوونەتەوە ئاماژەی پێ نەکردووە و باسکردنی ژینگەی ئەشکەوتەکانی دەوروبەری ئەشکەوتی شانەدەر و خستنەرووی مێژووی هەڵکۆڵین و چینە شوێنەوارییەکانی و باسکردنی شتومەکە دۆزراوەکانی.

**بەندی یەکەم:**

لێکۆڵینەوەی جیۆمێژوویی و دروستبوون و ئاووهەوای شاخەکانی زاگرۆس و باسکردنی ئەشکەوتی شانەدەر و ئەشکەوتەکانی دەوروبەری دروستبوون و تۆپۆگرافیای شاخەکانی زاگرۆس:

بەگوێرەی ئەو دابەشبوونەی بۆ عێراق کراوە ئەشکەوتی شانەدەر دەکەوێتە چوارچێوەی ناوچە بەرزەکانەوە (HIGH FOLDED ZONE)، لەبارەی پێکهاتەی ڕەوەزەکانی ئەشکەوتەکە لە رەوەزی جۆری نیشتەنی دروست بووە لەرێگای کیمیاوییەوە کە هاوشێوەی رەوەزی و کلسی شعابییەیە و بە شێوەیەکی بەرفراوان بلاوبوونەتەوە لە دروستبوونی (عەقدە/ بنجمە) هێڵکاری ژمارە (٢)، ئەمانە پێکهاتوون لە رەوەزی دلەماتی چر و مارلی کلسی و سلیکیە، کە خاوەنی ئەستووریێکی زۆرن کە دەگاتە زیاتر لە هەزار مەتر، ئەم پێکهاتانە گیانەوەرانی بە بەردبوو بە درێژایی سەردەمە جیۆلۆجییەکان لەخۆ دەگرێ و لەم بە بەردبووانەش رودست (RUDIST) و کاستروبودل (castropodal)، ئەم پێکهاتانەش بە هەبوونی چاڵی فورامنیفرای گەورە ناونراوە بە لوفتوسیا (loftusia) جیا دەکرێنەوە، سەرەڕای هەبوونی ئوربیتوس (orbitoides)، ئەم پێکهاتانە ماددەی قیری (bituminous) لە چینەکانی سەروویدا هەیە، تەمەنی ئەم پێکهاتانە دەگەرێتەوە بۆ چاخی کریتاسی سەروو، لە قۆناغی ماسترخنی (masterchtian) بەو واتایەی کە تەمەنەکەیان نزیکەی (٧٣) ملیۆن ساڵە هێڵکاری ژمارە (١).

پێکهاتەی ماددەی ئەم پێکهاتانە لە زۆر ناوچەی تری کوردستان

بەدەردەکەوێ لەوانەش لە سلێمانی و کۆیە و رواندوز و زێبار و عمادیە و هدنییە.

بەرەو پێشچوونی حەوزی جیوسینکلاینی لە چاخی کریتاسی سەروو لەو کاتەدا دەریا زۆر بەرفراوان بوو کە زۆربەی ناوچەکانی عیراقی گرتەخۆ هەروەها سەردەمەکە بە سەردەمێکی ناجێگیری تکتونی جیا دەکرێتەوە لەگەڵ سەرەتای کاریگەری جوولەی ئەرامایدیە کە ئەوە لە کۆتایی چاخی کریتاسی (ماسترختیان- بالیوسین) گەیشتۆتە لووتکە، کە ئەمەش بووەتە هۆی بەرزبوونەوەی ناوچەکە بەشێوەیەکی گشتی و کشانەوەی دەریاو رووتانەوەیەکی تەواوی زۆربەی ناوچەکان، بەشێکی لە میانەی ئەلب جیاکراوەتەوە لە ترشیری کۆتاییدا بە تایبەتیش لە سەردەمی بلایوسین لە میانەی جوولەی ئەلبی گەورەدا (alpine arage ncy) کە ئەوە بووەتە هۆی بەرزبوونەوەی شاخەکانی زاگرۆس لە ناوچەی دەوروبەری لەسەر سنووری نێوان عێراق و ئێران ئەم ناوچەیەش راستەوخۆ کەوتۆتە ژێر کاریگەری ئەو جوولە بەهێزەی زەوی کە بووەتە هۆی دروستکردنی شاخەکانی ئەلب و ئەو نزیکییەی هەیبووە لە مەلبەندی پاڵنەری هێزەکەوە.

ئەم زنجیرە شاخە درێژ و سەختە پێکدەهێنێ بە ئاراستەی باکووری خۆرئاواو باشووری خۆرهەڵات، کە ئەوەش بووەتە جیاکەرەوەیەک لەنێوان دەشتەکانی عیراق و زوورگەکانی ئێران لەگەڵ بەجێمانی چەندان دۆڵ وەک رێگای سەرەکی لەنێوان هەردوو ناوچەکەدا، لەوانەش خانەقین و هەڵەبجە و رەواندز لەنزیک رایات و درێژبوونەوەی هەمان ئەو ناوچەیەی کە ئەشکەوتی شانەدەری تێدایە ئەم رێڕەوە بە رێگایەکی سەرەکی دادەندرێ کە مرۆڤ لە چاخەکانی پێش مێژوو بەکاری هێناوە بۆ کۆچکردن و هاتوچۆ، هەروەها گەلان لە چاخە جیاوازەکانی پێش مێژوو ئەم رێڕەوەیان بەکارهێناوە بۆ کۆچکردن و بازرگانی و هێرشی سەربازی.

دۆڵی شانەدەر دەکەوێتە دواوەی لایەنی دووەمی شاخەکانی زاگرۆس لە چوارچێوەی ئەو ناوچەیەی کە زۆر بە پتەو بە کەوانی بەپیت (الهلال الخصیب) دەناسرێ.

لە نزیک شانەدەر بەرزاییەکانی تورکیا لەگەڵ کەوانی رۆژئاوای شاخەکانی زاگرۆسی باکوور یەکانگیر دەبن، شانەدەر دەکەوێتە بەرزایی ١١٤ پێ لەنێوان شاخەکانی (نیفاخین) یان شاخی (برادۆست) لە ناوچەی باکووری خۆرهەڵات و شاخی بدات داغ لە ناوچەی باشووری خۆرئاوا.

شاخی برادۆست لەلای باشووری خۆرئاوای بنارێکی هەورازی هەیە بە ئاراستەی بدات داغ، بەرزترین خاڵی لەلای باشووری خۆرهەڵاتی دەگاتە ١٨٣٠م، بە ئاراستەی خوارووی باکووری خۆرئاوا شۆڕدەبێتەوە کە بەرزییەکەی دەگاتە نزیکەی ١٤٥٠م لەدووری میل و نیوێک لە خۆرهەڵاتی ئەشکەوتەکە.

زێی گەورە دۆڵەکە دابەش دەکات و پانییەکەی دەگاتە هەزار یارد کە خاوەنی رووبەکی بەرزی و نزمییە، بانی رووباری زێی گەورە لەنێوان ٢٠٠-٣٠٠ یارد دەخولێتەوە، لافاوی گەورەش روونادات لەم بەشە گەوردیەی زێی گەورەدا.

### ئاووهەوای شاخەکانی زاگرۆس

شاخەکانی زاگرۆس دەکەوێتە چوارچێوەی هەرێمی دەریای ناوەڕاست کە هاوینەکەی وشک و گونجاو، زۆر بە کەمی پلەی گەرما لە هاویندا بەرزدەبێتەوە بۆ سەرووی ٣٥، بەلام لە وەرزی بەهار و پایزدا پلەی گەرمی لەنێوان وەرزی هاوین و زستاندایە، لە وەرزی زستاندا پلەی گەرما نزم دەبێتەوە لەم ناوچەیەدا کە هەندێ جار پلەی سفری سەدی تۆمار دەکات.

بەرێژەیەکی زۆر بەفری لێ دەبارێ و بە سەربەکەوە لە بناری شاخە بەرزەکان کەڵەکە دەبێ. دۆڵی شانەدەرێ تۆزێ گەرمترە لە دۆڵی مێرگەسۆر کە دەکەوێتە رۆژهەڵاتی دۆڵی شانەدەر و دۆڵی زێباری دەکەوێتە باکووری دۆڵی شانەدەر زۆربەی جاران کاتێ بەفر لەم دۆڵە دەبارێ، لە هەمانکاتدا لە دۆڵی شانەدەر تەنیا باران دەبارێ، لەوانەیە ئەوە هۆکاری یارمەتیدەر بووبێ بۆ ئەوەی مرۆڤ لەکۆن و نوێشدا ئەم ئەشکەوتەی دیاری کردبێ بۆ نیشتەجێبوون بە بەراورد لەگەڵ ئەو ئەشکەوتانەی کە دەکەونە دۆڵەکانی دەوروبەری.

بەڵام بەرێژەیەکی زۆر بارانی تێدا دەبارێ کە دەگاتە نزیکەی ١٠٠٠ ملم لە ساڵێکدا. لە دۆڵی شانەدەر دیاردەیێ روودەدات بە تایبەتی لە وەرزی پایزدا کە تەمومژێکی زۆر لە بەیانیان زوودا بە درێژایی رێرەوی رووبارەکە بەدەر دەکەوێ، هۆکاری ئەمەش بۆ بەیەکگەیشتنی دوو رووبار دەگەرێتەوە، کە ئەوانیش رووباری زێی گەورەو رووباری رواندزن و هەروەها زۆری دار لە دۆڵەکەو بەرزی شاخەکان ئەو شێیە بە هەڵمبووە گەمارۆدەدەن لە ماوەیەکی بەرزدا کە ئەمانەش هۆکاری تری تەمەکەن.

بەڵام رووەکەکانی ئەم ناوچەیە لەجۆری رووەکی دارستانی شاخاوین و بەسەر گردەکاندا بڵاوبوونەتەوە، دارەکان بە شێوەیەکی زۆر چڕ لە لێواری رووبار و جۆگەکاندا بڵاوبوونەتەوە و، باوترین داری ئەو ناوچەیەش داری بەرووە.

**ناونانەکەی:**

شانەدەر ناوێکی لێکدراوی کوردییە کە لە دوو ناوی سادە پێکهاتووە ناوی یەکەمیان (شان)ە کە چەند مانایەکی لە یەکتر جیاوازی هەیە لەوانەش (شانە، شان)، بەڵام ناوی دووەم (دەر) بە واتای (دەرچە یان دەرگا) دێ، بەهۆی ئامرازی پەیوەندی (ە)وە دراونەتە پاڵ یەکتری.

ئەم بارە لە رێزمانی زمانی کوردیدا هەیە لە چوارچێوەی پێکهاتنی ناوی لێکدراو کە دوو ناوی سادە بەهۆی ئامرازی پەیوەندی (ە)وە دەدرێنە پاڵ یەکتری و لە ئەنجامدا ناوێکی لێکدراومان دەست دەکەوێ.

کەواتە وشەی شانەدەر بە واتای دەرچەی کوورەی هەنگ دێ، لەوانەیە هۆکاری ئەمەش لەبەرئەوە بێ کە ناوەوەی ئەشکەوتەکە لە شێوەدا هاوشێوەی کوورەی هەنگە (غەریفە)یە کە لە ناوچەکە لە شۆرکی داری درێژ لەسەر شێوەی قووچەکی دروستی دەکەن، لەوانەشە لە سەردەمێکدا شانەی هەنگ لە ئەشکەوتەکە هەبووبێ و تا ئێستاش شوێنی بەخێوکردنی هەنگ لە خوارەوەی ئەشکەوتەکە هەیە.

بۆچوونێکی تری لاواز هەیە سەبارەت بە بنچینەی ناونانی شانەدەر کە پێی وایە لە وشەی لێکدراوی کوردی (شاهان- دەر) وەرگیراوە بە واتای (پەناگای پادشا) دێ، بەرچاوکردنی کارناسانی و مقاوەتەکانی.

لەوانەیە ناوی شانەدەر هیچ پەیوەندییەکی نەبێ بەشێوەی ئەشکەوتەکە یان دەرچەکەی یان بەکارهێنانەکانی، بەڵکو لەوانەیە هەمان ئەو ناوە بێ کە بەکاردێ بۆ گوندێکی نزیک ئەشکەوتەکەو بەهۆی نزیکی ئەشکەوتەکە لەو گوندەی کە بە شانەدەر ناسراوە هەمان ئەو ناوەش بۆ ئەشکەوتەکە بەکارهاتبێ. کە ئەمەش کارێکی گونجاوە بۆ ناونانی هەر شوێنێ یان ناوچە بەگوێرەی نزیکترین گوند یان خاڵێکی دیار.

ئەوەی شایانی باسە ئەوەیە کە ناوی ئەم ئەشکەوتە لە سەرچاوە ئینگلیزییەکاندا بە شێوەی (Shanidar) هاتووە، وەرگێردراوە لە سەرچاوە عەرەبییەکاندا بۆ شێوەی (شانیدار) کە ئەمەش خوێندنەوەیەکی هەڵەیە بۆ ئەو ئەشکەوتە، ناوە راستەکەی ئەوەیە کە دانیشتوانی ناوچەکە بەکاری دێن بە شێوەی (شانەدەر).

**ناوچەکەی:**

ئەشکەوتی شانەدەر دەکەوێتە شاخی برادۆست لە چوارچێوەی زنجیرە شاخەکانی زاگرۆس لە رۆژهەڵاتی هەرێمی کوردستانی عێراق لە نزیک ئەو شوێنەی کە عێراق بەرانبەر هەریەکە لە تورکیا و ئێران لە هێڵی پانی ٣٥.٥٠ باکوور و، هێڵی درێژی ١٣.٤٤ی خۆرهەڵات، دووری ئەشکەوتەکە لە هەولێر نزیکەی ١٥٥ کم و بە دووری ١٢٠ کم ی ئاسمانی لە شوێنەواری چەرمۆ دوورە لە باشووری خۆرهەڵاتی گوندی شانەدەر کە ئەشکەوتەکە ناوەکەی لێ وەرگرتووە، کە لە ئەشکەوتەکە ٤کم دوورەو ئەشکەوتەکە نزیکەی ٤٦کم لە خەلیفانەوە دوور و ٤٢٦م لە ئاستی زەوی دۆڵەکە کە بە (گەلی شکەفتی) ناسراوە بەرزە کە بە واتای دۆڵی ئەشکەوت دێ کە بەو دۆڵەدا دوو رووبار دەروات، رووباری زێی گەورە لە باشووری خۆرهەڵاتەوە دێ و رووباری رەواندزیش لە باکووری خۆرئاواوە دێ و ئەم دوو رووبارە لە دووری (١٣,٥کم) لە باشووری خۆرئاوای رووبارەکە بەیەک دەگەن و

گوندی (شکەفتێ) بە واتای گوندی ئەشکەوت دەکەوێتە خوارووی ئەشکەوتەکە بەدووری (٧.٠کم)[٩] و، ئەشکەوتەکە دەکەوێتە چوارچێوەی ئازاری ئەو گوندە. بەرزی ئەشکەوتەکە لە ئاستی رووی دەریا (٧٣١م)ە کە لە چوارچێوەی شاخەکانی برادۆست کە نزیکەی (١٨٣٠م) لە ئاستی رووی دەریا بەرزن و، بە دووری نزیکەی (٥.٢کم) دەکەوێتە کەناری لای چەپی زێی گەورە، نەخشەی ژمارە (١).

بۆ یەکەم جار ئەشکەوتەکە لە میانەی رووپێوی شوێنەواری کە لەلایەن (Ralph.S.solecki) ئەنجامدرا دۆزراوەتەوە لە ساڵی ١٩٥١ز لەوکاتەی ئەشکەوتەکانی ناوچەی رەواندزی لە چوارچێوەی پارێزگای هەولێر رووپێو کردووە.

بەڵام رێگا بۆ شانەدەر، لقێکی رێگا لە خەلیفانەوە دەگاتە گوندی شانەدەر، رێگاکە بەسەر زنجیرە شاخەکەدا دەڕوات لە بەرانبەر شاخەکانی برادۆست و لەدەستە چەپەوە گوندێکی گەورە هەیە بەناوی (سرێشمە) کە (٦کم) لە خەلیفانەوە دوورە و لەدوایی بەدووری ١١کم رێگاکە بەسەر پردێکدا دەڕوات لەسەر رووباری (خەلان) کە یەکێکە لە لقەکانی زێی گەورە و لەدووری ٣کم لە جسرەکەوە گوندێکی بچووک هەیە بەناوی (خەلان)، لەدوای ئەوەش دەگەینە دەروازەی بێخمە کە زێی گەورەی پێدا دەڕوات و رێگاکە بە ناوەڕاستی هێڵێکی دەشتایی تەسک و بەرزی و نزمیدا دەڕوات کە بە دەشتی شانەدەر دەناسرێ، لەدواییدا رێگاکە دەگاتە گوندی شانەدەر کە ٢٦ کم لە پردی خەلانەوە دوورە، نەخشەی ژمارە ١.

رێگایەکی تریش هەیە کە دەمانگەیەنێتە گوندی شانەدەر، ئەو رێگایەش لە شارۆچکەی حەریرەوە دەردەچێ و بەسەر شاخی سپیلک دەکەوێ و لە دواییدا لقێکی لێ جیادەبێتەوە بەرەو چەپ کە دەگاتە ناوچەی سورچیایەتی و لەدواییدا بەردەوام دەبێ بەناو شاخ و دۆڵەکاندا و رێگاکە لە نزیک بێخمە دەردەچێ و لەدواییدا دەگاتە گوندی شانەدەر ئەم رێگایەش کورتترین رێگایە وەک ئەوەی تێبینیمان کردبێ.

رێگایەکی تریشمان هەیە لە لایەکی تر لە ئامێدی و دێرەلووک و بارزان و بلێوە دەگەنە گوندی شانەدەر.

بەڵام بۆ گەیشتن بە ئەشکەوتی شانەدەر لە گوندی شانەدەرەوە رێگایەکی نوێی سەیارە هەیە کە دەگاتە خوارووی ئەشکەوتەکەوە لەوێوە دەتوانرێ بەپێ بەهۆی ئەو قادرمە نوێیەی کە تازە دروست کراوە پێی بگەن وێنەی ژمارە (٣).

**باسکردنی ئەشکەوتەکە (وەک ئەوەی سۆلیکی بینیویە):**

ئەشکەوتی شانەدەر ئەشکەوتێکی سروشتییە و لەچوارچێوەی زنجیرە لە کلس دروستبووەکانە، و بەسەر دۆڵی شانەدەردا دەڕوانێ و بە یەکێ لە ئەشکەوتە گەورەکانی کوردستان دادەندرێ[٥].

دەروازەکەی شێوەیەکی سێگۆشەی بەرفراوانی هەیە، وێنەی ژمارە (١)، پانییەکەی نزیکەی (٢٥م)ە و بەرزییەکەشی ٧,٩٠م، وێنەی ژمارە (٣)، لەدوای دەروازەکەیەوە پانییەکەی زیاد دەکات کە دەگاتە ٥٣,٣٠ لە دواییدا لە هەموو لایەکەوە بەرە بەرە تەسک دەبێتەوە بەرەو کۆتایی ئەشکەوتەکە، کە شێوەی سێگۆشەیەک پێکدێنێ بەجۆرێ کە بنکەکەی لەلای پێشەوەیە و سەرەکەشی لە قووڵییەکەیەتی، هێڵکاری ژمارە (٦)، بەڵام سەقفەکەی لەسەر شێوەی گومبەتێکی نارێکدایە بەرزترین خاڵی سەقفەکەش لە زەوی ئەشکەوتەکە لەو کەلەکەیە کە لە سەقفی ئەشکەوتەکەدا هەیە لەنزیک دەروازەکەیدا کە بەرزییەکەی لەو خاڵەدا دەگاتە نزیکەی ١٣,٧٠م، هۆکاری دروستبوونی کەلەنەکەش بەهۆی کەوتنەخوارەوەی رەوەزەوە بووە لە سەقفی ئەشکەوتەکە لە چاخەکانی کۆندا، لەدوای کەلێنەکەوە بەرزی ئەشکەوتەکە راستەوخۆ نزم دەبێتەوە بۆ بەرزی ٧,٦٠م و لەدواییدا بەرە بەرە بەرزدەبێتەوە زەوی ئەشکەوتەکە بە ئاراستەی دواوە تا کۆتاییەکەی کە نزیکەی ٤٠م لە دەروازەی ئەشکەوتەکە دوورە کە قووڵترین خاڵی ئەشکەوتەکەیە.

بڕێکی زۆر بورغی رەش بە سەقفی ئەشکەوتەکەوە نوساوە کە ئەستوورییەکەی دەگاتە ١,٨ ئینج، ئەمەش لە ئەنجامی هەڵکردنی ئاگرە

لە ئەشکەوتەکەدا لە کۆنترین چاخەوە تا ئێستا، تێبینی دەکرێ کە زەوی ئەشکەوتەکە وشکە جگە لە بەشی دواوەی ئەشکەوتەکە کە شێدارە، هەروەها سەقفەکەشی شێدارە کە لە وەرزی بەهاردا دڵۆپە ئاوی لێ بەردەبێتەوە.

پێش کەمتر لە مانگێ لە ئەشکەوتەکەدا ماڵی دروستکراو لە چڵی دار هەبوو کە لە یەکتری جیاکرابوونەوە و شوانکارەکان تێیدا نیشتەجێ دەبوون، لە وەرزی زستاندا و بۆ گیاندارەکانیشیان حەوشەیان لە هەمان چڵی ئەو دارانە دروست کردبوو و بەشێوەی تانۆک و، خێزان رووبەرێکی دیاریکراو نەگۆڕ بۆ خۆی بەکاردێنێ کە ئەم رووبەرانە لە یەکتری جیاوازن. بەڵام ئێستا ئەم حەوشەیە نەماوە و فڕێدراوە بۆ دەرەوەی ئەشکەوتەکە.

لەبەردەم ئەشکەوتەکەدا بەرزیێکی گەورە هەیە کە بەرەو خوار شۆڕ دەبێتەوە بە ئاراستەی دۆڵەکە بە درێژی ٤٢.٥٠ م. ئەشکەوتی شانەدەر بە ئەشکەوتێکی نموونەیی دادەنرێ بۆ نیشتەجێبوون، لەبەرئەوەی دەروازەکەی گەورەیە و ئاراستەکەشی بەرەو باشوورە، کە ئەمەش بووەتە هۆی ئەوەی کە رووی لەرۆژ (بەرۆچک) بێ بۆ ماوەیەکی درێژ لە رۆژدا بە تایبەتی لە وەرزی زستاندا لەوکاتەی کە تیشکی خۆر لاوازە، کە ئەمەش رێگا بە چوونە ناوەوەی تیشکی خۆر دەدات بۆ ناو ئەشکەوتەکە و رووبەرێکی زۆری ئەشکەوتەکە تیشکی خۆری بەردەکەوێ، کە ئەمەش بڕێکی گونجاو لە گەرمی و رووناکی بۆ دانیشتوانی ئەشکەوتەکە دابین دەکات، کە ئەمەش بە بەراورد لەگەڵ ئەو ئەشکەوتانەی کە لە ناوچەکە هەن جۆرە باشییەکی بەو ئەشکەوتە بەخشیوە، کە ئەمەش پاڵنەرێکی باش بووە بۆ هەڵکۆڵ کە پێی وابووە ئەگەر هەڵکۆڵین لەم ئەشکەوتە ئەنجام بدات ئەوە ئەنجامێکی باش بەدەست دەهێنێ.

چەند هۆکارێکی تر هەن کە شوێنێکی نموونەییان بە ئەشکەوتەکە بەخشیوە بۆ نیشتەجێبوون، لەوانەش: ئەشکەوتەکە بە شێوەیەکی سروشتی لەو گەردەلوولە ساردانەی زستان پارێزراوە بەهۆی ئەو لووتکە چیایەی کە لە باکوورەوە دەیپارێزێ و لووتکە چیایەکی تریش هەیە دەروازەی ئەشکەوتەکە لە باشووری خۆرهەڵاتەوە دەپارێزێ.

هۆکاری تریش هەن کە گرنگی ئەشکەوتەکەی زیادکردووە ئەویش نزیکی ئەشکەوتەکەیە لەسەرچاوەی ئاوی هەمیشەیی کە لەوێدا کانییەکی ئاو بەدووری ١٣٥م لە سەرووی ئەشکەوتەکە بەناوی (کانی بەتکا) هەیە کە لە سێ ماقۆر (چاڵە ئاو) پێکدێ کە تیردی هەریەکەیان نزیکەی مەترێکە. ئەم سەرچاوە ئاوە هەمیشەییە و دەتوانرێ لە وەرزی وشکی لە هاویندا سوودی لێ ببینرێ. بەڵام لە بەهاردا خڕێکی پڕئاو لە خوارووی ئەشکەوتەکە هەیە.

**باسی ئەشکەوتی ناوەوە لە روانگەی توێژەرەوە:**

لە کۆتایی ئەشکەوتی خواروو دەرچەیەکی بچووک هەیە لە سەرشێوەی مەمەڕێکی کورت کە لاکانی رێکن و بەشی خوارووشی لەگەڵ زەوی ئەشکەوتەکەدا رێکە و بەرزییەکەی ٨٠سم و درێژییەکەشی ١.١٠م، بەڵام ئەم دەرچەیە دەمانگەیەنێتە کونە ئەشکەوتێکی تر.

سلوکی ئاماژەی بە هەبوونی ئەم ئەشکەوتە نەکردووە، بەڵام لەهەمان کاتدا ئاماژەی بەوە کردووە کە رێڕەوێ هەیە، بەڵام بەهۆی ئەو بەرد و گڵەی هەڵوەریوە داخراوە، ئەگەر هەڵسابا بەلابردنی ئەو پاشماوە هەڵوەریوە ئەوە ئەم ئەشکەوتەی دەدۆزییەوە.

لێکۆڵەر هەڵساوە بە سەردانی کردنی شوێنەکە و پشکنینی و توانیویە بگاتە دواوەی مەمەڕەکە بەخشاوی تا گەیشتۆتە ئەشکەوتێکی بەرفراوان و توانیویە ناوچەکە بپشکنێ و رووپێوشی کردووە، بەپشت بەستن بەو قیاسانەی کە لە هێڵکاری ژمارە (٧) بلاوکراوەتەوە.

دەگەیە قووڵایی ئەم ئەشکەوتە لە بەرانبەر ئەو دەرچەیەوە بە درێژایی نزیکەی ١٢.٦٥م و بەرینییەکەشی نزیکەی ٢٨.٧٥م بە ئاراستەی رۆژهەڵات بۆ رۆژئاوا، شێوەی ئەشکەوتەکە نارێک و پێچاوپێچە کە ژمارەی پەناگەییێک دەهێنێ و کە رووبەرەکەیان دەگاتە نزیکەی

٩٧٤.٣٥ و، سەقفێکی نەوی هەیە و شۆڕ دەبێتەوە بە ئاراستەی دەرچەی دەروازەکە بەڵام بە ئاراستەی کۆتاییەکەی بەرزدەبێتەوە، بەرزی سەقفەکەشی ٨٠کم لەلای دەرچەی دەروازەکە لە ناوەڕاستیشیدا بەرزییەکەی دەگاتە ١.٥، بەڵام لە کۆتاییەکەیدا کە بەرزترین خاڵییەتی بەرزییەکەی دەگاتە ١.٦٥م. بە هەردوو ئاراستەی دەستەڕاست و چەپیشدا بەرە بەرە سەقفەکەی نزم دەبێتەوە کە ئەم نزمە لەلای راستەوە دەگاتە ١.١م، لەلای خاڵی (١) لەسەر هێڵکاری ژمارە (٧) و لەلای چەپیش دەگاتە ١.٢٠م لەلای خاڵی (٣) لەسەر هێڵکاری ژمارە (٧).

ئەگەر بمانزانیایە خۆڵی کەڵەکەبوو لە زەوییەکەی هەیە و ئەو خۆڵەشمان لابردایە ئەوە بەرزییەکی زیاتر لە ١٨٥سم پێ دەداین بەپشت بەستن بەو چاڵە بچووکە نوێیەی کە لەلای راستی ئەشکەوتەکەدا هەیە کە لێکۆڵەرەکە توانی قووڵییەکەی وەرگرێ کە نزیکەی ٢٠ سم بوو، بەڵام قووڵایی چاڵەکەش پڕبووە لەگڵ تا قووڵاییەکی نادیار کە لەوانەیە لە کۆتایی ئەشکەوتەکە بەرزییەکەی زیاتر لە سەرووی ١٨٥سم پێ ببەخشێ، بەڵام ئەوەی تێبینیمان کرد ئەوە بوو لە سەقفەکەی رەنگێکی سووری هەبوو، بەهۆی هەبوونی رەگەزی مەگنیسیۆم یان ئاسن لە پێکهاتەی بەردەکانی ئەشکەوتەکە و بەهۆی هەبوونی ئۆکسجینیش لە سروشتدا ئەوە گۆڕاوە بۆ رەگەزی ئۆکسیدی و ئۆکسیدەکانی ئاسن و مەگنیسیۆمی رەنگ سووریان پێکهێناوە.

برێکی زۆر ئەستەلەک تایبەت بە سەقفی ئەشکەوتەکەوە هەن، وێنەی ژمارە (٦) و، هەروەها لەسەر زەوییەکەشی ژمارەیەکی زۆر ئەستەلەک مایت بە شێوەی دینگەی قووچەکی بە بەرزی جیاواز کە بەرزی هەندێکیان دەگاتە ٤٠سم بڵاوبوونەتەوە، وێنەی ژمارە (٥). ئەم ئەستەلەک تایت و ئەستەلەک مایتانە لە ئەنجامی شیبوونەوەی کاربۆناتەکانی کالیسیۆم و لەدەستدانی ئەو گازە دووەم ئۆکسیدەی کە لە پێکهاتەکەیاندا هەیە ئەو کاربۆنە کالسیۆمانەش نیشتوون یان هەڵچوون بەو هۆیەوە و ئەم دیاردەیەیان پێکهێناوە. لەناو ئەم ئەشکەوتەدا شەش پێکهاتەی ستوونی لەسەر شێوەی دینگەکە رووبەرەکەیان لە یەکتری جیاوازە کە لەنێوان ٢٥ سم تا مەترێکن.

وێنەی ژمارە (٥و٧)، سەقفەکە لەسەر ئەم بەردانەیە و برێکی زۆری خوێی نیشتوو لەسەر ئەم بەردانە هەیە کە بە شێوەی ئەستەلکمایتی گەورە دەردەکەوێ کە رووبەکی لووس و سپی هەیە وەک پیست. وا پێدەچێ هۆکاری گەورەی قەبارەکەیان بۆ ئەوە بگەڕێتەوە کە رێژەی شێداری زۆرەو هەروەها سەردەمێکی زۆری خایاندووە تا دروست بوون، کرۆکەکەی لە بەردی سروشتی پێکهاتووە و خوویە نیشتووەکەش ئەستووری و قەبارەکەی زیادکردووە.

ئەم ئەشکەوتە بە شێوەیەکی گشتی شێدارییەکەی لە وشکی ئەشکەوتە سەرەکییەکە زیاترە تا رادەیێ کاتێ دەست لە سەقفی یان لێوارەکانی یا زەوییەکەی دەدەی هەست بە تەڕی دەکەی و، دڵۆپە ئاو لە سەقفی بەردەبێتەوە و لە زەوی ئەشکەوتەکە لە چاڵی بچووک کۆدەبێتەوە، کە لەو زەوییە قوڕەدا گۆماوی تر پێکهاتووە، وێنەی ژمارە (٨).

لە سەر زەوییە قوڕاوییەکەی ئەم ئەشکەوتە هەندێ ئێسکی گیانداران هەیە کەوا پێدەچێ ئەو ئێسکانە نوێ بن، وێنەی ژمارە (٩و ١٠)، کە لەیەک شوێن کۆبوونەتەوە کە ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە یەکێ لە گیاندارە دڕندەکان هاتووە و نێچیرەکەی لەم شوێنە خواردووە و ئێسکەکانیش لەوێ بەجێماوە، یان یەکێ لە گیانداران لەوێدا مردووە، داوابکرێ بۆ شیکردنەوەی جۆرێکیان لەلایەن زانایانی گیانداران. بردنە سەری ژیانی رۆژانە لەم شوێنەدا کارێکی ئاڵۆزە، چونکە سروشتی پێکهاتەکەی جووڵەی مرۆڤ کۆت دەکات، بەڵام بەهۆی هەڵکۆڵینەوە لەوانەیە ئەوەمان بۆ روون بێتەوە کە ئەم ئەشکەوتە لە لایەن مرۆڤی شانەدەرەوە بە درێژایی سەردەمی نیشتەجێبوونی تا چ رادەیێ بەکاری هێناوە(١).

### باسکردنی ئەشکەوتەکانی تری دەوروبەری شانەدەر:

ئەشکەوتی شانەدەر دەکەوێتە چوارچێوەی ئەو ناوچەیەی کە بە

(هلال الخصيب) ناودەبرێ کە لە چاخەکانی پێش مێژوودا بە نیشتمانی ئەژدادی خەڵک دادەندرێ کە کارئاسانییان کردووە لە شارستانییەتە جیاوازەکانی وڵاتی دوو رووبار. ناتواندرێ وا دابندرێ کە ئەشکەوتی شانەدەر ناوچەیەکی دانیشتوانی دابڕاو بووبێ، بەڵکو بەشێک بووە لەو یەکە نیشتەنییەی کە لە ژینگەیەکی پەناگاو ئەشکەوتەکاندا هەن، چەندان ئەشکەوتی تریش هەیە لە ناوچەکەدا کە مرۆڤ تیایاندا ژیاوە لە چاخەکانی پێش مێژوودا بە بەڵگەی ئەوەی کە ئامێری بەردەستێ لە هەندێ لەو ئەشکەوتانەدا دۆزراوەتەوە. وەک ئەشکەوتی هاودیان کە ئامێری وردی میکرۆلیسی تێدا دۆزراوەتەوە کە دەگەڕێتەوە بۆ چاخی بەردیی ناوەند، هەروەها دوو ئەشکەوتی تریش هەن لە دەوروبەریدا (دیان و باستوون) کە هنری فیلد لە ساڵی ١٩٣٤ز سەردانی کردوون، بەڵام سەردانەکەی هیچ نەتیجەیەکی نەبووە لەسەر چاخە بەردینییەکان و، لە بەهاری ساڵی ١٩٥٠ز هنری فیلد لەگەڵ نوێنەری مۆزەخانەی (PEABODY) لە زانکۆی هارفرد و نوێنەری بەڕێوەبەرایەتی گشتی شوێنەوار خوالێخۆشبوو فوئاد سەفەر هەڵساون بە سەردانێکی تر بۆ ئەشکەوتەکانی ناوچەی برادۆست، ئەنجامی سەردانەکەش بریتی بووە لە دیاریکردنی ئەو چینانەی کە گڵێنەی تێدابووە کە مێژووەکەیان دەگەڕێتەوە بۆ چاخی بەردینی نوێ و هیچ ئامێرێکی بەردەستیشی تێدا نەدۆزراوەتەوە[٤]. ئەشکەوتی بێخاڵ دەکەوێتە باکووری گوندی هاودیان، کە شاندێکی زانکۆی شیکاغۆ لە ساڵی ١٩٥٥ز کەشف کردنیان تێدا ئەنجامداوە کە دوو چینی شوێنەواریان تێدا دۆزیوەتەوە، چینی یەکەم سەردەمەکەی نوێترەو دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی زرزی و چینی دووەمیش دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی موشیری.

ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ئەشکەوتی شانەدەر لە ناوچەکەدا تاکە ئەشکەوت نەبووە کە لەلایەن مرۆڤەوە بەکارهاتووە لە چاخەکانی پێش مێژوو بۆ نیشتەجێبوون، چەندان ئەشکەوتی تر لە ناوچەکە هەن کە مرۆڤ بۆ نیشتەجێبوون بەکاری هێناون کە ژمارەکەیان پازدە ئەشکەوتە کە لێکۆڵەر سولکی سەردانی کردوون لەمیانەی دەرخستنە شوێنەوارییەکانی کە وەک نوێنەری زانکۆی میشیگان پێی هەڵساوە لە ناوچەکەدا پێش دەستپێکردنی کاری هەڵکۆڵین لە ئەشکەوتی شانەدەر. نەخشەی ژمارە (٢) و لە سەرجەم ئەو ئەشکەوتانەدا نموونەی وەرگرتووە، بەڵام لە کۆتاییدا ئەشکەوتی شانەدەریان بەباشتر زانیوە بە بەراورد لەگەڵ ئەشکەوتەکانی تر بەگوێرەی ئەو ماددانەی لێی دەرکەوتووە ئەم ئەشکەوتە زۆر گونجاو بووە بۆ ئەنجامدانی کاری هەڵکۆڵین، کە قووڵاییەکەی تارادەیێ زۆری پاشماوەی هەیە کە سەردەمێکی دوور و درێژی نیشتەجێبوون لەخۆ دەگرێ.

**بەندی دووەم**

مێژووی هەڵکۆڵین و چینە شوێنەوارییەکانی ئەشکەوتی شانەدەر

**مێژووی کنەوپشکنین:**

هەڵکۆڵین لە ئەشکەوتی شانەدەر لە ماوەی چوار وەرزی جیاوازی لە ساڵەکانی (١٩٥١، ١٩٥٣، ١٩٥٦، ١٩٥٧، ١٩٦٠) ئەنجامدراوە، لە ئەنجامی ئەم هەڵکۆڵینەدا قووڵایی ئەو چاڵەی هەڵیانکەندبوو، دەگەیشتە (١٤م)، ئەم قووڵاییەش چوار چینی شوێنەواری لەخۆدەگرێ کە لە سەرەوەدا بۆ خوارەوە دەست پێدەکات و بەم شێوەیە ناونراون (c، d، b، a).

چینەکانیش بەهۆی ئەو ئامێرە دەستکردانەی کە لە هەر چینێک دۆزراوەتەوە جیادەکرێتەوە، بەم شێوەیەی خوارەوە:

چینی A: ئەم چینە پاشماوەی نوێ و چاخی بەردینی نوێ (NEOLITHIC) لەخۆ دەگرێ.

چینی B: دابەش دەکرێ بۆ دوو چینی لاوەکی تر:

چینی B1: ئەم چینە پاشماوەی ئەو ماددانە لەخۆدەگرێ کە دەگەڕێنەوە بۆ چاخی پێش چاخی بەردینی نوێ (proto Neolithic)، یان سەردەمی گواستنەوە بۆی.

چینی B2: ئەم چینە دەگەڕێتەوە بۆ چاخی بەردینی ناوەند (Mesolithic).

چینی C: ئەم چینە دەگەڕێتەوە بۆ چاخی بەردینی کۆنی سەروو (upper palaeolithic)، کە ئامێری

بەردەستێی لەجۆری ئورغنیشی (Aurignacian) لێ دۆزراوەتەوە و لە ناوچەکانی وڵاتی دوو رووباردا شوێنەوارەکانی بە برادۆستی ناودەبرێ.

چینی D: دەگەڕێتەوە بۆ چاخی بەردینی کۆنی ناوەڕاست (Middle palaeolitnic)، کە ئامێر و کەرەستەی موستیری (Mousterian) لەخۆ دەگرێ.

لە پێش ئەنجامدانی هەڵکۆڵین لێکۆڵەر سولکی بۆ یەکەم جار بە یاوەری بەڕێز مەحمود ئەمین نوێنەری بەڕێوەبەرایەتی گشتی شوێنەوار لە ١٠/تەمموزی ساڵی ١٩٥١ز لە میانەی سەردانەکەیان بۆ ئەشکەوتەکانی ناوچەی رواندز سەردانی ئەو ئەشکەوتەشیان کردووە، هەڵکۆڵەر لەم سەردانەیدا هەڵساوە بە ئەنجامدانی لێکۆڵینەوەیەکی خێرا لە ئەشکەوتەکەدا و، ئەم لێکۆڵینەوەش وای لێکردووە کە زۆر پێی سەرسام بێت و پێشبینی ئەنجامێکی باشیشی کردووە کە ئەگەر بێت و کاری هەڵکۆڵینی تێدا ئەنجام بدرێ.

لە دوابیدا هەڵکۆڵەر لە ٦/١٠ی هەمان ساڵدا گەڕاوەتەوە بۆ ئەنجامدانی کاری هەڵکۆڵین، هەڵساوە بە هەڵکەندنی چاڵی پێش وەختە لە زەوی ئەشکەوتەکە لە باکوورەوە بەرەو باشوور، بە مەبەستی دەستنیشان کردنی باشترین شوێن بۆ هەڵکۆڵین، رووبەری ئەو چاڵەش (٢×٤٢) پێ بووە، بەڵام قووڵییەکەی لە خاڵێکەوە بۆ خاڵێکی تر جیاواز بووە، کە قووڵترین خاڵی گەیشتۆتە شەش پێ.

سێ پێی سەرووی چاڵەکە بریتییە لە پاشماوەی ئاگردانی گەورە و خۆڵ و خەڵووز دەگرێتەوە، بەڵام گڵێنە لە چینی سەروو لە قووڵایی ٨ ئینج لەژێر ئاستی یەک پێ دەرکەوتووە، بەڵام بەردەستێ لە قووڵایی پێنج بۆ شەش پێی دەرکەوتووە، یەکەم پارچە بەردەستێش لە قووڵایی ٣١ ئینج دۆزراوەتەوە لە قووڵایی پێی شەشەمدا گڵەکەی نەرمە و تێکەڵە لە قوڕ و لم و ماددەی ئەندامی کە لە چینەکانی سەرووتر لووستر و شێدار ترە.

لە دوابیدا سولکی هەڵساوە بە لێدانی دوو چاڵی چوار گۆشە بەرووبەری ٥×٥ پێ لە کۆتایی باکووری چاڵە پێشبینیکەرەکە، کە دەرکەوت ئەم ناوچەیە بەردی گەورەی تێدانییە بە پێچەوانەی کۆتایە باشوورەکەی لەنزیک دەروازەی ئەشکەوتەکە[٣].

لەبەرئەوەی لەلای هەڵکۆڵ ئەشکەوتەکە و پاشماوە شوێنەوارییەکانی وێنەیەکی روونیان هەبووە، لە سەردانی کۆتاییدا بۆ ئەشکەوتەکە لە (١٤-١٩٥١/١٢/٢٧) هەڵساوە بە چاڵ لێدان لە زەوی ئەشکەوتەکە بە شێوەی چوار گۆشات(٤)، لە دووری دە پێ لە هێڵی (B-A) کە ئەمە نوێنەرایەتی بەشە ستوونییەکەی کۆتایی ئەشکەوتەکە دەکات بەرەو رووەکەی و بەردەوامی لە شۆڕبوونەوەی بۆ خوارووی دۆڵەکە، وێنەی ژمارە (٢).

دوای داخستنی هەردوو چاڵە پێشبینی کەرەکە کە پێشتر لێ درابوون، سولکی هەڵساوە بە نەخشەکێشانی ناوچەکە بەرووبەری ١٥×٢٠ پێ و دابەشکردنی بۆ چوار گۆشات بە رووبەری ٥×٥ پێ.

خاڵی روکنی باکووری خۆرهەڵاتی چاڵەکە بە (WOSO) ناونراوە و خاڵەکانیش بۆ خۆرئاوا و باشوور دابەشکراون و هەموویان بە تەواوی بە زنجیرە خاڵبەند و دیاریکراون بەپێیت، کە ژمارەی چوارگۆشەکان بە ئاراستەی خۆرئاوا چوار چوارگۆشە بووە کە رووبەرەکەیان دەکاتە (٢٠) پێ. بە ئاراستەی باشووریش ژمارەیان سێ چوارگۆشەیە کە رووبەرەکەیان (١٥) پێ دەکات، چاڵ لێدانەکە لە چوار گۆشە دیاریکراوەکان بەهێما دەستی پێکردووە و سەرجەم زانیارییەکانیشی تۆمارکردووە سەبارەت بە قووڵایی و ماددەی دۆزراوە لە سەرجەم چوارگۆشەکاندا، تا گەیشتنە قووڵایی شەش ئینج لە سەرجەم چوار گۆشەکاندا.

ئەو ماددانەی لە قووڵایی شەش ئینجەکەدا دۆزراونەتەوە بە جیا خراونەتە ناو کیسە و سەرچاوەکەی و قووڵی و مێژووەکەی و سەرجەم ئەو گۆڕانانەش کە لە رەنگی خۆڵەکە و دۆزراوەکان هەبووە لەسەری نووسراوە.

کاتێ هەڵکۆڵ هەستی کرد کە ناتوانێ چین بە چین لە لاکێشەکەدا بە تەواوی (١٥×٢٠پێ)

پاشماوەکان لاببات، لەجیاتی ئەوەش هەستا بە تەرکیزکردن لەسەر ناوچەیەکی دیاریکراو لەو ناوچەیەی کە لە بەشی درێژی باکوور بۆ چاڵ لێدان تەرخان کرابوو بەڕووبەری درێژی بیست پێ و پانی پێنج پێ.

قوولی چاڵەکە لەم بەشەیدا گەیشتە نزیکەی ٢٥ پێ، بەڵام لە بەشی باشووری چاڵەکەدا قوولییەکەی گەیشتە ٧-٩ پێ، کە لەم قوولییەدا بەردی زۆر گەورە دەرکەوتن کە ئەم بەردانەش بەشێ بوون لەو دارمانەی کە لە سەقفی ئەشکەوتەکەدا روویدابوو، تا لابردنی بەردەکان بەهۆی تەقاندنیانەوە بووبوونە گرفت لەبەردەم کارەکەدا.

وەرزی دووەمی هەڵکۆڵین بە یارمەتیدان و پشتگیری دەزگای سمیسۆنیە بە بەشداری بەڕێوەبەرایەتی گشتی شوێنەوار دەستی پێکردووە، کارکردن تێیدا بەردەوام بووە بۆ ماوەی دە هەفتە لە هاوینی ساڵی ١٩٥٣ز، لەگەڵ بەرفراوان کردنی ناوچەی هەڵکۆڵینەکە لەسەر بنچینەی رووبەری پێشووتر بەڕووبەری (٢٠×٤٠ پێ) (٩×١٢م)، بەڵام سەرجەمی ئەم رووبەرە نەگەیشتۆتە زەوی ساغ، تەنیا چاڵێ بە رووبەری (٢٠×١٣پێ) لە قوولایی (٤٤پێ) (١٣.٥م) گەیشتۆتە زەوی ساغ لەبەشی خۆرئاواشدا لار دەبێتەوە بە ئاراستەی رۆژهەڵات کە قوولییەکەی دەگاتە (٣١پێ) (٩.٤٥م)، هێڵکاری ژمارە (٣ و ٤).

گرنگترین ئەنجامی ئەم وەرزەی هەڵکۆڵینە دۆزینەوەی ئێسکە پەیکەری منداڵێکی شانەدەرە کە بە یەکەم ئێسکە پەیکەری مرۆڤی نیاندرتاڵ دادەنرێ کە لە عیراقدا دۆزراوەتەوە.

لەمیانەی وەرزی سێیەمی هەڵکۆڵیندا لە ساڵی (١٩٥٦-١٩٥٧ز) هەڵکۆڵ لەگەڵ خێزانەکەیدا رۆز سولکی (Rose sdecki) هەڵساوە بە رووپێوکردن و هەڵکۆڵین لە دوو ناوچەی تر لە دۆڵی شانەدەر کە ئەوانیش (گوندی شکفتێ) و (زاوی چەمی- شانەدەر)، کە لەلایەن هەڵکۆڵەوە دۆزراونەتەوە لە ساڵی ١٩٥١ز، بەڵام هەڵکۆڵینیان تێدا ئەنجام نەدراوە تا ساڵی ١٩٥٦ز، هۆکاری دیاریکردنی ئەم دوو ناوچەیەش هەڵکۆڵین بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە بەندیوارێکی شارستانییان هەیە لەگەڵ ئەشکەوتی شانەدەر.

لەگەڵ بەردەوامی کاری هەڵکۆڵین لە ئەشکەوتەکە لە هەمان کاتدا، کە کارەکە جەختی کردۆتە سەر دوو چین، چینی یەکەم (A)ە کە هەڵکۆڵ لە ساڵی ١٩٥٦ جەختی کردۆتە سەر، بەڵام لە بەهاری ساڵی ١٩٥٧ز هەڵکۆڵین لە چینی (D) دابووە، کە سێ ئێسکە پەیکەری مرۆڤی نیاندرتالی پێگەیشتوویان دۆزیوەتەوە.

لە ئەنجامی باشی ئەم وەرزەی هەڵکۆڵین وای لە سولکی کردووە کە لە ساڵی ١٩٦٠ز جارێکی تر لەگەڵ شاندێکی شوێنەواری و ئەنسرۆپۆلۆجی گەڕاوەتەوە بۆ ئەشکەوتەکە، کە لەم وەرزەی هەڵکۆڵینەدا پاشماوەی پێنج ئێسکە پەیکەری مرۆڤی نیاندرتاڵ دۆزراوەتەوە هەروەها برێ لە تۆوی گوڵ لەگەڵ پاشماوەی یەکێ لە ئێسکە پەیکەرەکاندا دۆزراوەتەوە، ئەم دۆزینەوەیەش ئاردەزوویەکی گەورەی لە ناوەندی شوێنەواری دروست کرد، کە زانا شوێنەوارییەکان ئەمە بە چەندان بیرۆکەی لە یەکتر جیاواز شی دەکەنەوە.

### چینە شوێنەوارییەکانی ئەشکەوتی شانەدەر:

لە قوولایی دوو ئینجەوە (٥.٠٨سم) لە ئاستی گڵە رەشەکەوە قوولایی ئەشکەوتەکە لە چوار چین پێکدێ کە لەم چینانە دەتوانرێ بە ئاسانی لەیەکتر جیابکرێنەوە و هەرچینە و ژمارەیەکی ئینگلیزی بۆ دانراوە کە ئەوانیش (D،C،B،A) هەروەکو ئەوەی لەپێشدا ئاماژەمان بۆ کرد.

چینی A:

ئەم چینە راستەوخۆ لە قوولایی (٥.٠٨سم) لەژێر ئەو توێژاڵەی کە لەخۆڵ و پاشماوەی وشکبووی گیانداران پێکهاتووە دەردەکەوێ. ئەمە توێژاڵێکی ئەندامییە لەسەر رووی ناوچەی هەڵکۆڵینەکە، کە ئەستوورییەکەی لەلایەکەوە بۆ لایەکی تر جیاوازە، ئەم ئەستوورییە لە بەشی خۆرهەڵات دەگاتە دوو پێ (٦٠.٩سم) بەڵام تا بەرەو خۆرئاوا بڕۆین ئەم ئەستوورییە زیاد دەکات تا دەگاتە هەشت پێ (٢.٤٨٤م)، کە

ئەمەش بە پێچەوانەی مەیلانی ڕووی زەوییەکەیە کە مەیلانی هەیە بە ئاراستەی ڕۆژهەڵات و هەروەها بەردێکی زۆر و بەشەکانی ئاگردان لە هەموو ناوچەکانی ئەم چینەدا بڵاو بوونەتەوە لە قووڵایی (٤،٥پێ) (١،٣٧م) و بەردەکانیش لەسەر شێوەی شوێنی ئاگردانەکان پێکهاتبوون.

چینی A لە سەرەوەڕا بە ئاراستەی خواروو پێکهاتووە، کە بەگڵێکی ڕەش داپۆشراوە لەژێر ئەم گڵەشدا زەوییەکی نەرمی تۆخ و چینێک خۆڵی ڕەنگ پرتەقاڵی زەردباو هەیە کە پاشماوەی ئاگردانەکانە، کە ئەستوورییەکەی نزیکەی (٧،٦سم) و لەژێر ئەم خۆڵەشدا پاشماوەی خەڵووز و گڵێکی ڕەنگ کای (بنی) تۆخ و خۆڵەمێشی هەیە، و لەدواییدا بە ئەستووری (٦،٧- ١٦. ١٠سم) گڵێکی پرتەقاڵی سوورباو هەیە و لەژێر قووڵاییێکدا گڵێکی تۆخ و خۆڵی بەکلس بوو لەگەڵ چینێکی گڵی خۆڵەمێشی هەیە و، لە قووڵایی ٥.١ پێ ئاورگانێ دۆزرایەتەوە کە تیرەکەی لە سەرووەوە نزیکەی دوو پێیە و قووڵییەکەشی یەک پێیە، وا دەردەکەوێ کە پلەی گەرمای ناو ئەم ئاگردانە بەرز بووبێ، بەڵگەشمان لەسەر ئەوە ئەو خۆڵە سپییە کلس بووەیە کە لە ناوەڕاستی ئاگردانەکە هەیە.

ئاگردانەکە دەکەوێتە قووڵایی نزیکەی ٥١سم لە چوارگۆشەکانی (S1W3، S1W4) و شەش بەردی گەورە لە دەوری مەڵبەندی ئاگردا کۆبوونەتەوە و، بڕێک قوڕی زەردباوی ناسووڕکراوە کە لەگەڵ کا تێکەڵ کراوە لە دەرەوەی ئاگردانەکەیە لە بەشی باشووری بەردە گەورەکانەوە کەوا پێدەچێ ئەم قوڕیە ئامادەکرابێ بۆ دروستکردنی گڵێنە.

لە بەشی خۆرئاوای ناوچەی هەڵکۆڵین، لە قووڵایی (٦١-٧٤سم) گڵێکی تۆخ هەیە کە ڕێژەی خۆڵ و خەڵووز تێیدا کەمە، بەڵام لە قووڵایی (١-١،١٧م) گڵێکی (بنی) نەرم هەیە کە خەڵووز و خۆڵەمێشی تێدایە، کە ئەمە لەچوار گۆشەی (S1S4) لە قووڵایی (١،٤٧م) دۆزراوەتەوە. پاشماوەکانی چینی A لە چوار گۆشەکانی (S1W3، S2W4، S3W3، S3W4) کتومت هاوشێوەی پاشماوەی چوارگۆشەکانی (S1W3، S1W4)ن هەروەک چۆن ئەوە لە بەشەکانی درێژی لای ڕۆژئاوا و باشووری خۆرئاوای ناوچەی هەڵکۆڵین ڕوون کراوەتەوە.

لە چوارگۆشەی (S3W3، S1W4) لە قووڵایی (١،٠٥م) گڵەکەی خاوەنی ڕەنگێکی کای (بنی) تۆخە. بەڵام کاری هەڵکۆڵین لەم چوارگۆشەیەدا لە قووڵایی (٢،١٢م) بەهۆی هەبوونی ڕەوەزی کلسی ئاسان نەبووە، کە لەم قووڵاییەدا ڕەنگی گڵەکە (بنی) تۆخ بووە لەچوار گۆشەکانی کە بڕێک خەڵووز و خۆڵەمێشیش دۆزراوەتەوە و لەناو پەناگەیەکی بچووکدا ملی سپی پاک لە هەمان قووڵاییدا دۆزراوەتەوە واپێدەچێ کە ئەمە لە ئەنجامی هەڵوەشانەوەی ئەو بەردی کلسییەوە دروست بووبێ کە ئەم بەردانە بە ڕێژەیەکی زۆر لەم چوارگۆشەدا لە قووڵایی خواروو دۆزراونەتەوە.

بەشی خوارووی چینی (A) لەگەڵ بەشی سەرەوەی چینی (B) تێکەڵ بەیەکتر بوون، کە ئەمەش لە بەشی پانی لێواری باکووردا ڕوون و ئاشکرایە، هێڵکاری ژمارە (٥).

زۆربەی پارچە گڵێنەکانیش لەم چینەدا دۆزراوەتەوە بە تایبەتی لەبەشی نیوەی خواروویدا و، هەندێ پارچە گڵێنەش هەیە کە بە قووڵایی دوو پێ چوونەتە ناو چینی (B)، کە زۆربەیان پارچەی قاپی شێو لێنان و دۆزینەوەی بڕێکی زۆری تیشاڵ و پارچە ئێسکی گیاندارانی شیردەر و لەچوارچێوەی ئەو کەلوپەلانەی دۆزراونەتەوە بەشەکانی هاڕەری خڕی تێدایە بە تایبەتی لەبەشی سەرەوەی چینی (A) و هەروەها ئاون و بڕەڕیش دۆزراونەتەوە، کە سەرجەم ئەمانەش بەڵگەن لەسەر ئەوەی کە ژیانێکی جێگیر هەبووە و پشتیشیان بە کشتوکاڵ بەستووە لە دانەوێڵە و بەرو هاوشێوەکانی تریان.

بەڵام بەردەستی لە قاعەی چینی A لەو شوێنەی کە بە چینی B دەگات دەردەکەوێ و لەنێو ئەو دۆزراوانەشدا ئەمانەن نووکەی تەڵاش یان نووکەی سادەی بەکارهاتووە نووکەی زۆر و نووکەی بچووک و مەقاشی تیژ، بەڵام لەم چینەدا نووکەداس نەدۆزراوەتەوە و هاڕێنەری بەرد و بەردی ڕووشێنەر و هێماتایت و

ئێسک لەسەر شێوەی کونکەر و دەمبوس کە بەوردی دروست کراون و دەسکە بەردی نەخشکراو یان پارچەی وەک مبرد کە لەوانەیە بەکارهاتبێ بۆ تیژکردنی ئامێری بەردی، هاوشێوەی ئەوەی کە لە ئەشکەوتی زرزی لەلایەن گەرۆد (GARROD) دۆزراوەتەوە، سەرجەم ئەم ئامێرانەی پێشەوە دۆزراونەتەوە.

هەروەها لە قاعەی چینی A پاشماوەی دوو ئێسکە پەیکەری چاخی بەردینی نوێ لە وەرزی دووەمی هەڵکۆڵیندا دۆزراونەتەوە کە یەکێکیان تەمەنی منداڵە و نزیکەی شەش مانگانە، بەڵام ئەوی تریان گەنجە و تەمەنەکەی نزیکەی شازدە ساڵانە، لەسەر کەلەکەی چەپی ئێسکە پەیکەری گەنجەکە بۆیەی سووری لەسەر بووە و لەسەر گەردەنی گەردنەیەکی سەدەفی شکاو دۆزراوەتەوە و هەروەها لەسەر پێیەکانی پارچەیەکی کەمی رووشێنەر یان سەدەفاتی هاڕاو دۆزراوەتەوە و لەژێرپێیەکانی دوو بەرد دۆزراونەتەوە کە شوێنەواری بۆیەی سووریان لەسەرە، وا دەردەکەوێ کە ئەم بەردانە و هاڕدرانە بە مەبەستی هاڕینی کانزا بەکارهاتوون، کە ئەم بۆیەیان لێ دەرهێناوە کە لەوانەیە ئەمانە بە مەبەستی ڕێوڕەسمی ئایینی لەگەڵ ناشتنی کەسەکە بەکارهاتبێ.

چینی B:

ئەم چینە ئەستوورییەکەی کەمترە لە چینی A و ئامێرە دەستکردەکانی تری کەمتر تێدا دۆزراوەتەوە بە بەراورد لەگەڵ چینی A، ئەستوورییەکەی لە بەشی خۆرهەڵات نزیکەی (٦٠سم) و لە بەشی خۆرئاواشدا دەگاتە (١.٥م)، ئەم چینە لە بنچینەدا یەک چینە، بەڵام بەهۆی تایبەتمەندی ڕەنگی گڵەکەی و پێکهاتەکانی و ئامێرە دەستکردەکانی و مێژوویییەوە بە کاربۆنی (١٤) دابەش دەکرێ بۆ دوو بەشی تر ئەوانیش (B1B2)[3].

بە پشت بەستن بە پاشماوە شارستانییەکانی بەشی سەرەوەی ئەم چینە (B1) مێژووەکەی بۆ ئەو سەردەمە دەگەڕێتەوە کە بەپێش چاخی بەردینی نوێ (-PROTO NEOLITHIC) ناسراوە کە ئەمەش کتومت هاوسەردەمە لەگەڵ چینی خوارووی زاوی چەمی شانەدەر، کە مێژووەکەی بە کاربۆنی (١٤) دیاری کراوە کە دەگەڕێتەوە بۆ نزیکەی (١٨٧٠٠-+ ٤٠٠) ساڵ، بەڵام بەشی خوارووی ئەم چینە (B2) دەگەڕێتەوە بۆ چاخی بەردینی ناوەند (MESOLITHIC) یان سەردەمی دوای چاخی بەردینی کۆن (-EPI PALAEOLITHIC)، کە مێژووەکەی نزیکەی (١٢٠٠٠-+ ٤٠٠).

چوار چاڵەکەی ئەوێ لە بەشی خۆرئاوای هەڵکۆڵین چوونەتە خوارەوە و جۆرە تێکەڵاوییەک لەنێوان چینی C،B دروست بووە، کە چەند پارچە گڵێنەیێ لە چینی B دۆزراونەتەوە کە لە بنچینەدا ئەمانە هی چینی A، کە ئەمەش بووەتە هۆی ئەوەی هەندێ پارچە گڵێنە لەهەمان ئەو چینەدا بدۆزرێنەوە کە پارچە بەردەستێی لە جۆری مێلدولیسی تێدا دۆزراوەتەوە.

لە کاتی هەڵکۆڵین لەم چاڵەدا مەترسییەکی زۆری دارمان هەبووە، هەر لەبەرئەمەش هەڵکۆڵ هەڵساوە بە فراوانکردنی ناوچەی هەڵکۆڵین لە ترسی ئەوەی نەبادا دارمانەکە رووبدات، کە تیرەی ئەم چاڵە نزیکەی مەترێ بووە و قووڵییەکەشی (٦٠سم) بووە.

## چاڵی (تێکەڵی):

ئەم چاڵە دەکەوێتە بەشی باکووری چوارگۆشەی (S1W1) و دەرچەکەی دەکەوێتە ژێر رووەکە پانییەکەی نزیکەی (٧٥سم) و قووڵییەکەشی نزیکەی (٧٥سم)، ئەم چاڵە لە قووڵایی (٤٥سم) چووەتە ناو چینی (C)، گڵی ناو چاڵەکەش تێکەڵە لە گڵی ڕەنگ (بنی) تۆخ لەگەڵ گڵی لمین، لەگەڵ هەبوونی پاشماوەی خەڵووز، هێڵکاری ژمارە (٣) لە قووڵایی (١٥سم) لە سەرووی چاڵەکەوە بەشی لە کەللە سەرێکی دۆزراوەتەوە و لە ژێرییەوە بە نزیکی ٨سم بەردەستێکی لووس دۆزراوەتەوە.

## چاڵی (تێکەڵی):

ئەم چاڵە دەکەوێتە رۆژهەڵاتی چاڵی یەکەمەوە بە دووری نزیکەی (٤٠سم)، ئەم چاڵەیە شێوەیەکی سەتڵی وەرگرتووە لەتێکەڵ بوونیدا بە چینی تر لە سەرووییەوە نزیکەی مەترێکە و قووڵییەکەشی نزیکەی

(٦٠سم) و دەرچەکەی لە قوولاییی نزیکەی (٦٧سم) لە سەردەوەرا و، لەسەر دەرچەی ئەم چاڵەدا چینێ لە گڵی نەرمی رەنگ (بنی) تۆخ بە ئەستوورایی (١٥سم) هەیە، هێڵکاری ژمارە (٣)، بەڵام گڵەکەی ناو چاڵەکە رەنگی (بنی) ناوەندە لەگەڵ دۆزینەوەی پاشماوەی خەڵووز.

**چاڵی (تێکەڵی):**

ئەم چاڵەیە دەکەوێتە رووی خۆرهەڵاتی چوارگۆشەی (S1W1)، دەرچەکەی بە قوولایی نزیکەی (٧٥سم) لەژێر رووەکەیە و پێوانەی دەوروبەری سەرووی نزیکەی مەترێکە و دەوروبەری خوارووشی (٦٠سم)ە، قوولییەکەشی نزیکەی (٦٠سم)و بنکەکەشی رێکە و ئەو گڵەی کە تێشیدایە تۆخ و نەرمە.

**چاڵی (تێکەڵێ):**

ئەم چاڵە دەکەوێتە رووی خۆرهەڵاتی چوارگۆشەی (S1W1) بە دووری نزیکەی (٢.٩٠م) لە چاڵی (٣)وە دووره، دەرچەکەش لە قوولایی (٩١سم) لەژێر رووەکەدا، بەڵام دەوروبەری سەرووی نزیکەی مەترێکە و دەوروبەری خوارووشی (٦٠سم) بنکەکەشی تەختە و قوولییەکەشی (٦١سم) پێکهاتەکانی ناو چاڵەکەش بریتین لە گڵی تۆخ و لووس و چەند بەردێ، کە یەکێ لەو بەردانە تارادەیێ گەوردیە. کە لەوانەیە ئەم چاڵە بۆ هەڵگرتنی خۆراک بووبێ.

ئەم ئامێرە دەستکردانە کە لە چینی **B1**ی ئەشکەوتی شانەدەر هەن لەگەڵ ئەوانەی کە لە چینی خوارووی زاوی چەمی شانەدەر هەن کە لەیەک دەچن، لەوانەیە شوێنەکە هەوارگەیەکی تری هاوینەی دانیشتوانی ئەشکەوتەکە بووبێ لەوکاتەدا.

ئامێرە دەستکردە بەردینییەکانی لەم چینە لەسەر هەمان شێوازی دروستکراوە بەردینییەکانی ئەشکەوتی زرزین. ئەم دروستکراوانەش بریتین لە دەستارو ئاون کە ئاونەکان لەسەر شێوەی پیتی (v) لە گوندی زاوی چەمی شانەدەر دەردەکەوێ کە هاوکاتە لەگەڵ چینی **b1** لە ئەشکەوتی شانەدەر، چوار قەدکەر دۆزراوەتەوە کە رووێکی رێکیان هەبووە سێیان نووکیان هەبووە، کە قەبارەکەیان بەقەد قەبارەی دەست دەبێ کە لە مروی محبب و بەردی لمین دروست کراون. رووشێنەریش لە چینی **b1** دۆزراوەتەوە کە لە بەردی لمینی سوور دروست کراوە لەسەر شێوەی پیتی (u) کە بەوە جیادەکرێتەوە بەرە بەرە تەسک دەبێتەوە و لکانیشی ئەستوورە و بنکەکەشی بازنەیە. رووشێنەرەکە دادەندرا و بەهۆی دەسکەوە جوولەی بۆ پاش و پێش پێدەکرا و بەهۆیەوە دانەوێڵەکە دەهاڕدرا. کە ئەمەش ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە پشتیان بە رووەک و دانەوێڵە بەستووە لەخۆراکیاندا بە تایبەتیش دانەوێڵە و بەروبوومی کێوی وەک جۆی کێوی و بەروو هیتریش، لەبەرئەوەی مرۆڤ لەوکاتدا کشتوکاڵی بەباشی نەدەزانی.

بەڵام لەچینی **b2** و دا هیچ ئاماژەیەک نییە بۆ زانینی هاڕین یان وردکردنی بەروبووم و دانەوێڵەی رووەکی کێوی بە ئاون و دەستاڕ، ئەو کەلوپەلانەی لەم چینە دۆزراونەتەوە ئەو کەلوپەلانەن کە لەحسا (حصى) دروست کراون، ئامێری وردی وەک نووکەکان و ئامێری ئەندازەی و نووکی گر گر و ئامێری تیژ، شێوەی ژمارە (١٠) و سەرەتیر، شێوەی ژمارە (٣) و مقاشی کۆتایی تیژ و لاتیژ.

لەم چینەدا کەلوپەلێکی زۆر دۆزراوەتەوە کە لە ئێسک دروست کراون لەسەر شێوەی تیشاڵ و کونکەر.

دروستکراوەکانی چینی **B2** تا رادەیەکی زۆر هاوشێوەی ئەو ئامێرانەن کە لە ناوچەی (کبارە) لە فەلەستین و ناوچەی (هلال حلوان) دۆزراونەتەوە، هەروەها لێکچوونێکی بەهێزیش هەیە لەرووی دیزاینی دروستکراوی بەردە ستێکانی ئەم چینە لەگەڵ دروستکراوەکانی ئەشکەوتی (کەمەربەند) و (هوتو) لە ئێران.

لە گرنگترین شتە دۆزراوەکانی چینی **B** لە بەشی سەردەویدا **B1** دۆزینەوەی گۆڕستانێکە کە بەشەکانی بیست و شەش ئێسکە پەیکەر لەخۆدەگرێ کە زۆربەیان منداڵی شیرەخۆرن لە قوولایی مەترێکدا نێژراون، سەردەرای دۆزینەوەی دوو ئێسکە پەیکەری تر کە لە وەرزی پێشووتر دۆزراونەتەوە، ئەم ئێسکە

پەیکەرانەش پاشماوەی ئێسکە پەیکەری ئەو چینە شارستانییەن کە دەگەڕێتەوە بۆ شارستانییەتی نتوفی.

لەم گۆڕستانەدا لەگەڵ ئێسکە پەیکەرەکاندا چەند سەکۆیەکی بچووکی لە بەرد دروستکراو دۆزراونەتەوە، یەکێ لەم سەکۆیانە لەسەر شێوەی کەوانی لار بووە ڕێکخراوە، ئامێرە بەردینییە دۆزراوەکانی ئەم گۆڕستانە هاوشێوەی دروستکراوەکانی گوندی زاوی چەمی شانەدەر، لەوانەش نووکە بەردەستێکە کە بەهۆی قیرەوە لەو دەرزەی کە لە پارچە ئێسکەکەدا هەیە چەسپێنراوە کە بۆ پارچەکردنی گیانداران بەکارهاتووە. بە گوێرەی وتەی هەڵکۆڵ نزیکترین سەرچاوەی قیر لە شانەدەر کەرکووکە کە بەدووری (١٠٠میل) دەکەوێتە باشووری شانەدەر، بەڵام لەراستیدا لەناوچەکەدا لە دۆڵی بێخمە بەڵگە هەیە لەسەر هەبوونی قیر تێیدا کە بە شێوەیەکی سروشتی لە لێواری شاخەکان دێتەدەرێ، کە لەوانەیە ئەم شوێنە ژێرەوەی قیرەکە بووبێ بۆ دانیشتوانی ئەشکەوتی شانەدەر تا بەهۆیەوە بتوانن سوودی لێ وەرگرن بۆ چەسپاندنی نووک و سەرەتیر لە ئێسک و دار.

لەنێو دۆزراوەکانی ئەم چینە بەردی ئۆبسیدی هەیە، ئەم جۆرە بەردانەش لەو ناوچانە نین کە دەکەونە نزیک ئەشکەوتەکە بوونی ئەم بەردانە لەو ناوچانە بەرچاو دەکەون کە بورکانیان تێدا ڕوودابێ، نزیکترین شوێنیش لە شانەدەرەوە کە ئەم جۆرە بەردانەی تێداهەبێ لەنزیک دەریاچەی وانە کە بە دووری (١٢٥میل) دەکەوێتە باکووری شانەدەرەوە. هەبوونی ئامێری ئۆبسیدی لە شانەدەر بەڵگەیە لەسەر هەبوونی پەیوەندی بازرگانی لەوکاتدا لەنێوان شانەدەر و نیشتنگەکانی ناوچەی وان.

چینی C:

ئەم چینە لە بەشی سەروویدا تێکەڵ بەچینی B دەبێ، کە ئەمەش بووەتە هۆی ئەوەی کە ئامێرە دۆزراوەکانی هەردوو چینەکە تێکەڵاوی یەکترین، بەڵام قووڵایی ئەم چینە بە ئاراستەی ڕۆژئاوا زیاد دەکات، کە ئەمەش هاوتەریبە لەگەڵ ئەو مەیلانەی کە چینی B هەیەتی بە ئاراستەی ڕۆژئاوا، بەڵام ئەستوورایی ئەم چینە لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر جیاوازە ئەم ئەستوورییەش لەخۆرهەڵات دەگاتە نزیکەی (٤م) بەڵام لە خۆرئاوادا دەگاتە (٣،٠٥).

گڵی ئەم چینە لمینی نەرمە و ڕەنگەکەشی (بنی) زەردباوە کە بڕێکی زۆر حەسوی کلسی و ڕەوەزی قەبارە جیاوازی تێدایە. دارمانێکی کەمی بەردی کلسی لەبەشی سەرووی لای ڕۆژئاوای ئەم چینە ڕوویداوە و دارمانێکی تر لەخوارووی لای خۆرهەڵات بووە، بەڵام لە قاعەی ئەم چینەدا دارمانێکی گەورە ڕوویداوە هۆکاری سەرجەم ئەم دارمانانەش بەهۆی دەرهێنانی ئەو بەردانەوە بووە کە هەڵکۆڵ لەکاتی چاڵ لێداندا دەری هێناون، بەڵام کاری هەڵکۆڵین لەم چینەدا بە بەراورد لەگەڵ چینەکانی تری پێشوو زۆر گرانترو هەستیارتر بووە.

لەم چینەدا خەڵووزی تێکەڵ لەگەڵ لمینی نەرم دۆزراوەتەوە و هەروەها چەندان ئاگردان دۆزراونەتەوە کە قەبارەکەیان نزیکەی (٣٠سم) لە تیرەدو (٥سم)ی ئەستووری تا (٣م)ی تیرەکە و (١٥سم)ی ئەستووری، بەڵگەش لەسەر ئەوە هەیە کە سەرجەم ئەم دارمانانە هەموویان لەیەک کاتدا ڕوویان نەداوە، لەوانەش هەبوونی شوێنەواری خەڵووز و گڵی سووتاو کە بەیەکێ لە بەردە گەورە کەوتووەکانەوە نووساوە و لە کاتێکی تری درەنگتر بەسەریدا دارمانێکی تر ڕوویداوە بە دڵنیاییەوە ئەم دارمانانە ژیانی دانیشتوانی ئەشکەوتەکەی خستۆتە مەترسییەوە لەوکاتدا کە لەوانەیە کوتایی بەژیانی هەندێ لەوانە هێنابێ کە لە دەوری ئەو ئاگردانە بوون کە ڕاستەوخۆ کەوتۆتە ژێر یەکێ لەو ڕەوەزە کلسییە گەورانەی کە لە سەقفەکەوە کەوتۆتە خوارەوە کە دەکەوێتە قووڵایی (٣،٥م) لە چوارگۆشەی (S1W1)، تیرەی ئاگردانەکەش (٦٢سم)ە، مادە شوێنەوارییەکانیش بە ئاراستەی خوارەوو کەم دەبنەوە لە قووڵایی (٦٥.٣م) و بە بەراوردکردن لەگەڵ قووڵایی (٣،٦٥- ٤.٢٥م).

لەم چینەدا هیچ پارچە گڵێنەیەک نەدۆزراوەتەوە، سەرجەم دۆزراوەکانی ئەم چینە بریتی بوون لە ئامێری بەردین و ئێسکی.

شیکردنەوە لەسەر دوو نموونەی ئەم چینە بەهۆی کاربۆنەوە لەلایەن دکتۆر سویس (SUESS) ئەنجامدراوە، ئەم دوو نموونەیەش لە ئاگردانی سەرەکی وەرگیراون.

نموونەی یەکەم (W-178) لەنزیک بەشی سەرەوەی چینی C لە چوارگۆشەی (S3W1) لە قوولایی نزیکەی سێ مەتر وەرگیراوە، ئەم نموونەیەش مێژووی نزیکەی (٢٧٥٠٠پ.ز) لە ڕێگای کاربۆنی (١٤)وە پێ دەبەخشێ.

بەڵام نموونەی دووەم (W18) لەنزیک بەشی خوارووی چینی C لە چوارگۆشەی (S2W4) لە قوولایی نزیکەی (٥٧.٤م) وەرگیراوە، ئەم نموونەیەش بەهۆی کاربۆنی (١٤) و مێژووی (٣٤٠٠٠) ساڵمان دەداتێ.

ئامێرە بەردییە دروستکراوەکانی کە لەم چینە دۆزراونەتەوە لەجۆری (ئورغانیشی)ن، بەڵام بە بەراوردکردنیان لەگەڵ ئەو ئامێر و کەلوپەلە بەردینییانەی کە پێشتر لە عیراقدا دۆزراونەتەوە و لەگەڵ نموونەکانی تری هەمان کەلوپەل کە لە ئەوروپا دۆزراونەتەوە. دۆزراوەکانی چینی C لە ئەشکەوتی شانەدەر تایبەتمەندن و دروستکردنیشیان نوێیە و جیاوازن لە دروستکردنی ئورغنیشی لە ئەوروپا، لە دروستکراوەکانی ئۆرغنیشی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستیشدا هاوشێوەیان نییە، بە تایبەتیش لە عیراقدا و بەهۆی تایبەتمەندی دروستکراوەکانی ئۆرغنیشی لە چینی C ئەشکەوتی شانەدەر ئەم شوێنەوارە دروستکراوانە بە دروستکراوی (برادۆستی) ناونراوە ئەمەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە ئەشکەوتەکە دەکەوێتە شاخی برادۆست.

بەشێوەیەکی گشتی شوێنەوار و دروستکراوە بەردییەکان لە بەشی سەرووی چینی C بە بەراورد لەگەڵ قاعەی لەم چینە کەمن.

ئەم چینە ڕێژەیەکی زۆر کونکەری بچووکی لێ دۆزراوەتەوە کە بە شێوەیەکی باش دروستکراون کە بۆ کونکردنی دارو خواردنیان بەکارهاتوون کە جۆرەها کونکەری لەیەکتر جیاواز لەم چینەدا دۆزراونەتەوە لەوانەش: کونکەری لاتیژ (AngleGraver)، کونکەری هەردوو کۆتایی تیژە و بڕەر کە هەندێ جار بە (مفک) دەناسرێ، ئەمەش بەهۆی پیاکێشان بەکۆتایی نووکەکە کاردەکات کە هاوشێوەی شەفرە یان لووتە لە کونکەری لێوار تیژ و زاویە تیژیش جیاوازە. شێوەی ژمارە (١١).

لە چوارچێوەی دروستکراوە بەردینییەکانی ئەم چینە، چەندان جۆری مقاشات دەگرێتەوە لەوانەش: مقاشی لێوار تیژ، مقاشی کۆتایی تیژ، مقاشی بازنەیی، مقاشی یەک لای هاوشێوەی لووتە و بنکەکەشی تەختە، شێوەی ژمارە (٦) کە لێوارەکانی تیژە و شێوەکەشی وەک کەوانی مانگە بەڵام ناوەڕاستەکەی تیژ نییە، جۆری مقاشی تریش هەیە کە پێشەوەی قووچەکییە و شێوەی نیوەبازنەیە یان هاوشێوەی پیتی D و لارییەکەیشی تیژە، هەروەها مقاشی شێوە لبیش هەیە.

لەنێو دروستکراوەکان نووکیش هەیە، کە ئەمە یەکێکە لە گرنگترین ئەو تایبەتمەندانەی کە چاخی بەردینی کۆنی پێ دەناسرێتەوە، کە شێوەو تایبەتمەندی جیاوازیان هەیە، لەوانەش: نووکی لێوار تیژی دواوە، نووکی مسلوم، نووکی کەوانەیی.

بەرهەمێکی تری ئەم چینە ئەو سەرە تیژانەیە کە لە بەردی بەردەستێ و شرت (CHERT) لەسەر شێوەی سێگۆشە کە شانەکەی تیژە و سەرەکەشی مودەبەبە لێوار و بنکەکەشی مهزبە.

هەروەها دۆزینەوەی ژمارەیەکی کەمی ئەو کەلوپەلانەی کە لە ئێسک دروستکراون و بەکارهاتبن و چەند نووکێ لەبەشی سەرووی ئەم چینەدا دۆزراونەتەوە کە لەوانەیە لەگەڵ قاعەی چینی B تێکەڵ بووبێ، هەروەها سەرەتیر و ئامێری هاوشێوەی دروستکراوەکانی موستیری لەنزیک قاعەی ئەم چینە دۆزراونەتەوە کە لەوانەیە ئەمانە لە بنچینەدا هی چینی D بن و لەگەڵ ئەم چینە تێکەڵ بووبن. هیچ پاشماوەی ئێسکەپەیکەری مرۆڤ لەم چینەدا نەدۆزراپەتەوە، بەدڵنیاییەوە ئەگەر ئێسکە پەیکەری مرۆڤیشی تێدا دۆزرابایەوە ئەوە لە جۆری مرۆڤی (SOPINS HOME) دەبوو.

چینی D:

هێڵی بەیەکگەیشتنی هەردوو چینی C،D لەڕووی لای باشووری

هەڵکۆڵینەوە، بەڵام لەلای باکووری هەڵکۆڵینەوە ئەم هێڵە بەباشی دەرناکەوێ بەهۆی ئەو بەردانەی کە تێیدا هەن، هێڵکاری ژمارە (٣).

گڵی ئەم چینە رەنگەکەی (بنی) کراوەیە و گڵە لمینە نەرمەکەش رەنگەکەی (بنی) زەردباوە، لەم چینەدا ژمارەیەکی زۆر ئاگردانی بچووک و هەروەها ئاگردانە گەورە رەئیسییەکەش لە بەشی خۆرهەڵات لە قووڵایی (٨،٥٣- ٩،٧٥م)، کە تیرەکەی نزیکەی (١،٥م) و قووڵییەکەشی نزیکەی (١،٢٠م)، دۆزراونەتەوە.

دۆزینەوەی چینێکی کلسی بە ئەستووری نزیکەی (١٢،٧٠- ١٥،٢٠سم) لە قووڵایی (٨،٢٣- ٨،٥٣م) بە شێوەیەکی لاربۆوە لەچوارچێوەی ناوچەی نیشتەجێبوون، کە ئەمە تاکە پاشماوەی کلسییان ستلک تایتە لە هەڵکۆڵین کە نوێنەرایەتی سەردەمێکی زۆری شێدار دەکەن یان زنجیرەیەک سەردەمی جیۆلۆجی (geochrondogical) لەدوای یەک لە شانەدەردا دەکەن.

چینێ بە ئەستووری (٢،٧٤م) لە چوارچێوەی چینی d هەیە کە دەکەوێتە قووڵایی (٦،٩٩- ٧،٧٩م) کە ژمارەیەکی زۆر ئاگردانی تێدایە کە شێوەیەکی وەک چاڵمان پێ دەبەخشێ و هەروەها ئەم بەشە بە پاشماوەی شوێنەواری چینی D دەوڵەمەندە، لەم ناوچەیەدا پاشماوەی بەشەکانی ئێسکە پەیکەری منداڵی شانەدەر لە چینێکی نەرمی رەنگ تۆخ دۆزراوەتەوە و ماوەی ئامێری دەستی لە دوو ئاستی ناوچەی دانیشتوانی چینی D کۆکراونەتەوە. یەکەمیان دەکەوێتە قووڵایی نزیکەی (٧،٨٠- ٨،٢٥م) و ئەوی تریشیان دەکەوێتە قووڵایی نزیکەی (٩،١٥- ٩،٤٤م) لە ئاستی سەرووەدا.

ئەشکەوتی شانەدەر دەکەوێتە چوارچێوەی ناوچەی پشتێنەی بوومەلەرزەکە و کە ئەمەش بەدڵنیاییەوە بووەتە هۆی روودانی دارمانی رەوەزەکانی ناو ئەشکەوتەکە لەدوای یەکتری، کە لە میانەی هەڵکۆڵینەوە دەتوانرێ چوار دارمانی سەرەکی دیاری بکرێ، کە هەرە کۆنەکەیان لە قووڵایی نۆ مەترە، دووەمیشیان لە قووڵایی شەش مەترە سێیەمیشیان دەکەوێتە قووڵایی چوار مەتر و چوارەمیشیان لەنزیک سەرووەدایە. هەروەها بەردی گەورە لەسەر رووەکە نوێیەکەی ئەشکەوتەکە هەیە کە ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە دارمانەکان نەوەستاون و بەردەوام بوون تا سەردەمانێکی نوێ لەمێژووی ئەشکەوتەکە، لە ساڵی ١٩٥٣ز لەکاتی کاری هەڵکۆڵین لە ئەشکەوتەکە بوومەلەرزەیەک لە ناوچەکە روویدا، بەڵام خۆشبەختانە هیچ دارمانێ لە ئەنجامی ئەم بوومەلەرزەیە لە ئەشکەوتەکە رووی نەدا.

بەدوور دەزانرێ کە سەرجەم دانیشتوانی ئەشکەوتەکە لە ئەنجامی یەک دارماندا مردبن، بەڵگەی روون هەیە لەسەر ئەوەی کە دانیشتوان دوای هەر دارمانێک دووبارە بە ماوەیەکی کورت گەراونەتەوە ئەشکەوتەکە.

تێبینی ئەوە دەکرێ کە پەیوەندییەکی شارستانی و سەردەمییانە لەنێوان هەردوو چینی D،C هەیە، کە قاعەی چینی C بەهۆی کاربۆنی (١٤) مێژووی (٣٤٠٠٠ پ.ز) دەداتێ هەروەک پێشووتریش ئاماژەمان بۆ کرد، بەڵام سەرووی چینی D بەهەمان رێگای کاربۆنی (١٤) مێژووی (٤٦٠٠٠- + ٥٠٠پ.ز) پێدەدات.

ئەو ئامێرە دەستییانەی کە لەم چینە دۆزراونەتەوە لەجۆری موستیرین، لەوانەش مقاشی بەردییە کە بۆ داماڵینی پێستی گیانداران لەدوای کوشتنیان بەکارهاتووە، لەوانەش کە لایەک و کۆتاییەکەی تیژ بووە و هەروەها سەرەتیر، زۆربەی تیرەکانیش یەک شێوەیان هەبووە کە سەرەکانیان مودەبەب بووە و بنکەکەشیان تەخت بووە و لێوارەکانیشیان تیژ بووە، هەروەها کونکەر و مزارفی جۆراوجۆر لەیەکتر جیاواز دۆزراونەتەوە.

تا رادەیەکی زۆر دروستکراوە بەردینەکانی ئەم چینە و چینی C لە ئەشکەوتی هەزارمێرد بەیەک دەچن جگە لە بیووری دەستی کە لە ئەشکەوتی هەزارمێرد دۆزراوەتەوە، بەڵام لە ئەشکەوتی شانەدەر نەدۆزراوەتەوە، بەڵام لە ئەشکەوتی هەزارمێرد ئەو کەلوپەلانە دۆزراونەتەوە کە لە کرۆکی بەردەستی دروستکراون کە ئەم جۆرانە لەچینی

Dی ئەشکەوتی شانەدەر دۆزراونەتەوە ئەم کەلوپەلانەش بەوە جیادەکرێنەوە کە نارێکن و قەبارەکەشیان لەنێوان ناوەند و بچووکدایە و زۆربەشیان خاوەنی پانییەکی کەمن کە لەوانەیە ئەمەش لەبەر کەمی ماوەکە بووبێ و لێکچوون لەنێوان دروستکراوەکانی ئەم چینە و دروستکراوەکانی ئەشکەوتی بێستوون لە رۆژئاوای ئێران لەرووی دروستکردنەوە هەیە.

یەکێ لە دۆزراوە هەرە تایبەتییەکان کە نە لە ئەشکەوتی هەزارمێرد و نە لە ئێراندا نەدۆزراودتەوە ئەو سەرە تیرەیە کە لەجۆری ئەمیرەیە (Emireh) کە بۆ یەکەم جار ئەم جۆرە لە ئەشکەوتی ئەمیرە لە لوبنان دۆزراوەتەوە، ژمارەی ئەو سەرە تیرانە کە لە شانەدەر دۆزراونەتەوە چوار سەرە تیرە کە سێیان لە قوولایی (٧.٦٢-٧.٩٢م) لە ناوچەی نیشتەنی چینی D دۆزراونەتەوە، بەلام چوارەمیان لەقوولایی (٨.٥- ٨.٨م) دۆزراوەتەوە.

ئەم جۆرە سەرە تیرانە لە بنچینەی چینی چاخی بەردینی کۆنی سەروو لە شاخی کرمل لە فەلەستین دۆزراوەتەوە، ئەم سەرەتیرانە بە بەشێ لە دروستکراوی گواستنەوە لەنێوان (Levalloiso- Mousterian) لیڤلوازی و موستیریان لە دروستکراوەکانی چاخی بەردینی کۆنی سەرو دادەندرێن. سەرەرای ئەوەی کە ئەم سەرە تیرانە لە قوولایی (٢.٧٤م) لە هێلی پەیوەندی نێوان چینی c براردۆستی و چینی d موستیری دۆزراونەتەوە.

ئاماژەو بەلگە لەسەر ئەوە هەیە کە ئەم سەرە تیرانەی شانەدەر و شاخی کرمل، هی یەک سەردەمن، ئەم سەرە تیرانەی جۆری ئەمیرە کە لە چینێکی کلسی توندا لە قوولایی (٨.٥٣م) لە چینی D دۆزراونەتەوە کە ئەوەش ئاماژە کردنە بەو سەردەمەی کە شێ و بارانی زۆر بووە و هەروەها لەشاخی کرمل کەلوپەلی جۆری ئەمیرە راستەوخۆ لەژێر ئەو چینەدا دۆزراونەتەوە کە شێ و بارانی زۆر بووە.

هەمان جۆری کەلوپەل بە ناوچەی کسری ئەکیل (KSER AKIL) لە لوبنان دۆزراونەتەوە، بەلام ئەو چینە بە تەواوی وێران بووبوو بەهۆی ئاودوە، بەلگەی کلسی ئاماژە بە سەردەمی باران و شێ دەبەن.

لە چوارچێوەی دروستکراوە دەستییەکانی ئەم چینە ژمارەیەکی کە ئێسکی گیانداران بەکارهاتوون بۆ دروستکردنی ئێسکی تیژ و تیشالی ئێسکی. بەلام سەبارەت بە مێژووی چینی D شیکردنەوە لەسەر نموونەیەکی ئاستی سەرەوەی ئەم چینە بەهۆی کاربۆنی (١٤) ئەنجامدراوە کە مێژووی نزیکەی (٤٦٠٠٠+-٥٠٠) سالمان دەداتێ، بەلام نیوەی چینەکە وا پێشبینی دەکرێ کە بگەرێتەوە بۆ سەردەمی نێوان (٦٠٠٠٠- ٧٠٠٠٠) سال، بەلام بنکەکەی بە واتای زەوی ساغ نزیکەی (١٠٠٠٠) سال بەر لە ئێستایە.

**بەشی سێیەم**

تایبەتمەندییەکانی مرۆڤی شانەدەر

ئەم بەشە لێکۆلینەوەیەکی تەواو لەسەر مرۆڤی شانەدەر لەخۆ دەگرێ، کە لە سێ بەند پێکهاتووە، بەندی یەکەم پێکهاتووە لە ئاماژەکردن بەمێژووی دۆزینەوەی ئێسکە پەیکەرەکان و دووری جەسەبیان و باسکردنی ئەو گولانەی کە لەگەل ئێسکە پەیکەری چوارەمدا دۆزراونەتەوە و وەرزی روانییان و شیکردنەوەی لایەنی پزیشکییان، بەندی دووەم پێکهاتووە لە باسکردنی بەشەکانی ئێسکە پەیکەرەکان c دۆزراوە لە ئەشکەوتەکەدا بە گوێرەی زنجیرەی تۆمارکراو لە تۆمارەکانی مرۆڤی بە بەردبوو لە جیهاندا و ئەنجامدانی سەرژمێری بۆ ئێسکە دۆزراوەکانی چوار ئێسکە پەیکەری یەکەم و تۆمارکردنیان لە خشتەیەکی تایبەتدا، بەلام بەندی سێیەم تەواوکەری باسکردنی پێنج ئێسکە پەیکەرە ماوەکەن.

**بەندی یەکەم**

مرۆڤی شانەدەر دوری جەسەدی و بنیادنانەوەی رووی نیاندرتال و ئەو تۆوە گولەی کە لەگەل مرۆڤی شانەدەری چوار دۆزراوەتەوە

دۆزینەوەی یەکەم ئێسکە پەیکەری مرۆڤی نیاندرتال لە کوردستان:

یەکەم: ئێسکە پەیکەری مرۆڤی نیاندرتال لە ولاتی دوو رووبار، لە ئەشکەوتی شانەدەر لە کوردستانی

عیراق لە چینی موستیریدا لەساڵی ١٩٥٣ز دۆزراوەتەوە کە هی منداڵێکی شیرە خۆرە بووە، بەڵام تا ساڵی ١٩٥٧ز هیچ زانیارییەکی لەسەر بڵاونەکرایەوە کە لە هەمان ساڵدا سێ ئێسکە پەیکەری مرۆڤی پێگەیشتوو دۆزرایەوە، دوای بڵاوکردنەوەی زانیاری لەسەر ئەم ئێسکە پەیکەرانە لەلایەن سەرۆکی شاندی هەڵکۆڵینی ئەمریکی لە زانکۆی کۆڵۆمبیا بەڕێز راڵف سولکی لەهەردوو گۆڤاری سۆمەر (scientific American) کە ئەمەش بووە هۆی بەدەستهێنانی ناوبانگێکی جیهانی.

لە میانەی هەر چوار وەرزی هەڵکۆڵیندا لە ساڵی (١٩٥١-١٩٦٠ز) نۆ ئێسکە پەیکەری مرۆڤی نیاندرتاڵ لە چینی موستیری D دۆزراونەتەوە، ئەم ئێسکە پەیکەرانە لە مۆزەخانەی عیراقی و پێی بۆدی (PEA BODY) لە کامبریدج پۆلێن کراون، لەم نۆ ئێسکە پەیکەرە حەوتیان مرۆڤی پێگەیشتوون کە ئەوانەش مرۆڤەکانی شانەدەری (١،٢،٣، ٤، ٥، ٦، ٨) بووە و دووشیان هی منداڵ بوون کە ئەوانیش شانەدەری (٩،٧) بوون.

ئێسکە پەیکەرەکانی شانەدەری (١،٢،٣، ٥،٧) بەشێوەی بەش بەش و لەیەکتر جیا دۆزراونەتەوە، لەبەرئەوە بنیادنانەوەی پاشماوەی ئێسکی هەر تاکێک ئاسان و روون بووە، بەڵام پاشماوەی ئێسکەکانی ئێسکە پەیکەری شانەدەری (٤،٦،٨، ٩) بەشێوەی تێکەڵ لەگەڵ یەکتری دۆزراونەتەوە، لەبەرئەوە ئەو پارچە گەورەیەی کە ئێسکە پەیکەرەکانی تێدابوو لە زەوییەکە کراوەتەوە و بردراوە بۆ مۆزەخانەی عیراق، لەوێدا پۆلێن کراوە.

بەڵام پاشماوەی ئێسکە بەردبووە داڕزاوەکان و کەللەسەرەکان و بڕبڕەکان و ئێسکە درێژەکانی وەک ئێسکی بازوو ئێسکی ران و ئێسکی لاق لە زۆربەی نموونەکاندا شکاون و هەندێکیشیان رزیون و ناتوانرێ چاک بکرێنەوە، ئەو ئێسکانەی کە بە باشی ماونەتەوە ئەوانە کە قەبارەکەیان بچووکە وەک ئێسکەکانی جومگە و ئەو ئێسکانەی کە تارادەیەک داڕێژن و تیرەکەشیان بچووکە وەک ئێسکی زەندو کەوەرە و ئێسکی قامیش و ئێسکەکانی مەچەکی دەست و پێ و پەنجەکان، کە لەوانەیە بەهۆی هۆکاری سروشتییەوە رزیبن، بە تایبەتیش پاڵەپەستۆیان بەهۆی پارچەی گیانداران.

دوای ئەوە تواندرا ئەو ئێسکە پەیکەرانە بنیاد بنرێنەوە بە پشت بەستنی ددانەکان و یەکسانکردنی ئێسکەکانی کەللەی سەر لەگەڵ ئەوانی تر و ماوەی بەیەک گەیشتنی جومگەکان، بەشێوەی گەورە بۆ بچووک نوژەن کراونەتەوە بەم شێوەیە (٥،١،٤،٣،٦، ٢،٨، ٩،٧).

## ژمارەکردنی مرۆڤی شانەدەر

لە سەرەتای دۆزینەوەی ئێسکە پەیکەری منداڵەکە لە ساڵی ١٩٥٣ز، وا داندرا کە ئەو منداڵە بە تەنیایە و هیچ جۆرە هێمایەک یان ژمارەیەکی بۆ دانەندرا. دوای ئەوە و لە وەرزی دواتر لە ساڵی ١٩٥٧ لەکاتی دۆزینەوەی سێ ئێسکە پەیکەردا، کە بۆ هەریەکەیان ناوی شانەدەری١، شانەدەری ٢، و شانەدەری ٣بەکارهاتووە و هەمان شێواز بەکارهات لەکاتی دۆزینەوەی ئێسکە پەیکەرەکانی تر لە وەرزی ساڵی ١٩٦٠ز و بە شانەدەری (٤،٥،٦) ناونران و ستیوارت (STEWART) توانی لە تاقیگەدا ئێسکەکانی کەسێکی تر جیابکاتەوە کە بە شانەدەری ٧ ناونا، هەڵکۆڵ لەسەر ناونانەکەی بەم ناوە رازی بوو. سەرەڕای ئەم ئێسکە پەیکەرانە ئێسکی منداڵێکی تری شیرەخۆرە لەگەڵ ئێسکەکانی شانەدەری (٤،٥) دۆزراوەتەوە و ئەوەش بە شانەدەری (٨) دانرا. بەم شێوەیە ژمارەکردنی ئێسکە پەیکەرەکانی مرۆڤی نیاندرتاڵ لە ئەشکەوتی شانەدەر بە (١-٨) بووە بەشێوەی زنجیرە هەروەک لە پێشدا روونمان کردەوە، سەرەڕای هەبوونی ئێسکە پەیکەری ئەو منداڵەی کە یەکەمجار دۆزرایەوە کە ئەمەش بووە هۆی بڵاوکردنەوەی زانیارییەکان بەشێوەیەکی تێکەڵ لە خشتەی بەبەردبووەکاندا.

لەبەرئەوە منداڵەکە هاتە ناو بابەتەکە و لە پێشتریش هیچ ژمارەیەکی بۆ دانەندرا بوو لە چوارچێوەی ژمارەکردنی ئێسکە پەیکەرەکاندا، لەبەرئەوە جارێکی تر ئێسکە پەیکەرەکان ژمارە کرانەوە، ژمارەی ئێسکە پەیکەرەکانی (١-٦) هیچ گۆڕانێکیان بەسەردا نەهاتو

هەروەک خۆیان مانەوە، ئەو منداڵەی کە لە وەرزی هەڵکۆڵینی ١٩٥٣ز دۆزرایەوە بووە شانەدەری (٧) و شانەدەری (٧)یش بووە شانەدەری (٨) و منداڵی دووەمیش بووە شانەدەری (٩).

ئەم نیزامەش لە تۆماری مرۆڤە بەبەردبووەکاندا چەسپێندرا و لە سەرجەم لێکۆڵینەوەکان پشتی پێ دەبەستریێ کە لەسەر ئێسکە پەیکەرەکانی شانەدەر و لێکۆڵینەوە بەراوردکارییەکان ئەنجام دەدرێ.

ئێمەش لەم لێکۆڵینەوەیەدا لە باسکردنی ئێسکە پەیکەرەکان ئەممەمان بەکارهێناوە.

**دووری جەسەدی:**

لەکۆی شەش ئێسکە پەیکەرە پێگەیشتووەکە، پێنجیان تەواون جگە لە شانەدەری (٨) ئەمەش بەسە بۆ زانینی درێژی بالآیان، بە لایەنی کەمەوە ئێسکێکی درێژیان سەلامەتە کە بەهۆیەوە دەتوانرێ درێژییەکانیان بخەملێندرێ کە ئەمەش رێگایەکی گونجاوە بۆ بەشە سەرەکییەکانی ئێسکە پەیکەرەکە، ئەم لەیەکتر نزیکییە لە پاشماوەی ئێسکە پەیکەرەکانی نیاندرتاڵ لە ناوچەکانی تر کەمە لەنێو هەموو نیاندرتاڵەکانی رۆژهەڵاتی ناوەراست دوو ئێسکەپەیکەر هەیە (عامود ١) و (تایون ٢١) ئەو توانایەیان تێدایە کە بتوانرێ درێژی بەشەکانی جسمیان بخەملێنرێ، بەڵام لەنێو نیاندرتاڵەکانی ئەوروپادا دە ئێسکە پەیکەر هەیە کە ئەم توانایەیان تێدا هەیە.

بە شێوەیەکی گشتی ئێسکە پەیکەری مرۆڤ لەچوار بەشی سەرەکی پێکدێ: سەر، بالآ، بەشەکانی سەروو خواروو بەشەکانی هاوشێوەی ئێسکەکانی عەزەڵات و پاژنەپێ و مەچەک و پەنجەکان.

دەتوانرێ بەراورد لەنێوان بەشە نزیکەکانی مرۆڤی نیاندرتاڵی شانەدەر لەگەڵ مرۆڤی ئێستادا بکرێ، بۆ زانینی رێژەی نزیکیان، وا دەردەکەوێ کە سەرجەم نموونەکانی شانەدەر کە دەموچاوێکی درێژیان هەیە و تەختە بە بەراوردکردن لەگەڵ مرۆڤی نوێدا، جیاوازییەکی دیار هەیە لەنێوان شەویلگەی مرۆڤی شانەدەر و سەرجەم نموونەکانی نیاندرتاڵ لەگەڵ شەویلگەی مرۆڤی نوێ جگە لەوە جیاوازییەکی زۆریان نییە لە پاشە سەریان و کەللەی سەردا.

بەڵام سەبارەت بەباڵا زۆر زەحمەتە بگەینە قەبارەیەکی ورد بۆ باڵای نموونە بە بەردبووەکانی شانەدەر لەبەرئەوەی ئێسکەکانی پەراسووەکان و بڕبڕەکان بەشێوەیەکی تەواو لە ئێسکە پەیکەرەکاندا نەپارێزراون بەو واتایەی زۆربەی بەشەکانی قەفەسی سنگ و عامودی بڕبڕە لەناوچوون و رزیون لەزۆربەی ئێسکە پەیکەرەکانی شانەدەر و ئێسکە پەیکەرەکانی مرۆڤی نیاندرتاڵی تر. لەبەرئەوە دەتوانرێ درێژی باڵای ئەو ئێسکە پەیکەرانە لەرێگای بەراوردکردنی ئێسکەکانی درێژی بزانرێ. سەرەڕای ئەوەی کە بارودۆخی ئێسکە پەیکەرەکانی مرۆڤی شانەدەر رێگا بەوە نادەن کە درێژی باڵایان بزانرێ، بەڵام ئەوانە تاکە نیاندرتاڵن کە دەتوانرێ بەشەکانی عامودی بڕبڕەیان لەگەڵ یەکتری بەراورد بکرێ، جگە لە بڕبڕەکانی مل.

لەهەریەک لە شانەدەری (١و٣) وا دەردەکەوێ کە عامودی بڕبڕەی هاوشێوەی مرۆڤی نوێیە، سەرەڕای ئەوەی کە بڕبڕەکانی مل و سنگی شانەدەری (١) هاوشێوەی مرۆڤی ژیرە (٢)، سەرەڕای ئەوەی کەوا پێشبینی دەکرێ کە مرۆڤی شانەدەری (١) لەوانەیە گەردنێکی تارادەیەک کورتی هەبێ بە بەراورد لەگەڵ بەبەردبووەکانی مرۆڤی نوێی (هوموسابینس) بەڵام ئەم جیاوازییە لەچوارچێوەی سنووری جیاوازی درێژییەکانی ملی مرۆڤی نوێ مایەوە.

لەکاتی بەراوردکردنی بڕبڕەکانی مل و کلێنە لەمرۆڤی شانەدەری (٤،٣،٢،١) لەگەڵ ئێسکی قامیش، بە تایبەتیش بەراوردکردنی بڕبڕەی مل لە دووەمەوە تا حەوتەم لەگەڵ درێژی ئێسکی قامیش لەمرۆڤی شانەدەری (٢) و درێژی کلیزەی مرۆڤی شانەدەری (٣،١) لەگەڵ درێژی ئێسکی ران، لەمەوە دەردەکەوێ کە بەشەکانی عامودی بڕبڕەیان درێژییان زۆر کورت نییە بە بەراورد لەگەڵ بەشەکانی خواروو لە مرۆڤی نوێدا. بەم شێوەیە درێژی باڵای مرۆڤی شانەدەر بزانرێ، درێژی ئێسکی چەڵەمە لەلای مرۆڤی شانەدەری (٣،١) بەڵگەیە لەسەر

پانی قەد. بە شێوەیەکی گشتیش بەو مانایە دێ کە مرۆڤی شانەدەر خاوەنی شانێکی پان بووە.

بەڵام سەبارەت بە بەشەکان (دەست و لاق) جیاوازییەکی بچووک هەیە لەپێوانەی ئێسکەکانی پەنجەکان، بەڵام وادەردەکەوێ کە درێژی باسک و لاقی مرۆڤی شانەدەر نزیک بووە لەدرێژی باسک و لاقی مرۆڤی نوێ.

**بنیادنانەوەی رووی مرۆڤی نیاندرتاڵ:**

زانستی نوێ بە تایبەتیش زانستی ئەنسروپۆلۆجیا یارمەتیدەر بووە بۆ دەرخستنی زۆر راستی لەسەر مرۆڤی نیاندرتاڵ لەرووی دیمەنی دەرەوەی و پێکهاتەی ئێسکە پەیکەرەکەی، کە زانایان توانیویانە لێکۆڵینەوە و پێوانەی بەشەکانی ئێسکە پەیکەرەکەی بکەن و هەوڵدان بۆ بنیادنانەوەی کەللەی سەر بەپشت بەستن بە ئێسکەکانی تری ئێسکە پەیکەرەکەی سەرەڕای هەوڵدان بۆ گونجانی ئەو پێوانە و بڕە دیاریکراوە لەگەڵ بارودۆخی و ژیانی سروشتی ئەوکاتی بۆ کەللەی سەری بۆ ئەوەی بتوانرێ روویەکی تۆکە تا دەکرێ لە رووە راستەقینەکەی مرۆڤی نیاندرتاڵ نزیک بێ پێکبهێندرێ.

لێکۆڵەر جای ماتیر نیس (JAY MATTERNES) توانی رووی مرۆڤی نیاندرتاڵ بەپشت بەستن بە پێوانە زانستییە وردەکان بنیاد بنێتەوە، دوای ئەنجامدانی کاری نۆژەنکردنە لە تاقیگەو هێڵکاری رووجسمی بە چەند قۆناغێ و بنیادنانەوەی رووەکەی و جەسەدەکەی بەشێوەیەکی زانستی ورد. لە ئەنجامی ئەو هەوڵدانانە رووەکەی نزیک بووە لە رووی مرۆڤی نوێ و جەسەدەکەشی رێک بووە، شێوەی ژمارە (١٩،١٨) کە ئەوەش بووە هۆی گۆڕانی ئەو بیرۆکە هەڵەیەی کە مرۆڤی نیاندرتاڵی بە بوونەوەرێکی درندە و وەحشی لەقەڵەمدابوو، ئەنجامی ئەو هەوڵدانانە و هەڵکۆڵینە شوێنەوارییەکان لەو ناوچانەی کە مرۆڤی نیاندرتاڵی تێدا ژیابوو کارئاسانی کرد بۆ دروستبوونی بیرۆکەیەکی نوێ کە زیاتر مرۆیە لەسەر نیاندرتاڵەکان.

**تۆوی گوڵەکانی شانەدەر:**

لە چەند ئاستێکی جیاواز چەندان نموونەی گڵ وەرگیراوە بە تایبەتی لەنزیک ئێسکە پەیکەرەکان، کە لە ئەنجامدا بووە هۆی دۆزینەوەی ژمارەیەکی زۆری تۆوی گوڵەکان لە چوارچێوەی ئەو نموونانەی کە وەرگیرابوون، ئەشکەوتی شانەدەر لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاست بە تاکە ئەشکەوت دادەندرێ کە تۆوی گوڵی تێدا دۆزرابێتەوە.

وا دەردەکەوێ کە تۆوی گوڵەکان بە شێوەیەکی سروشتی و لەخۆوە نییە کە گەیشتۆتە ناخی زەوییەکەی، بەڵکو ئەوانە بەشێوەی گوڵ لەوێ دانراون. کە هەندێکیان تا ئێستاش بەیەکترییەوە نووساون، کە بە شێوەیەکی تایبەتی هاوشێوەی کەڵەکەبوو رێکخراون. ئەگەر ئاوابێ ئەوا چۆن ئەم گوڵانە گەیشتوونەتە ئەو قووڵییەی ناخی زەوی؟ بەدڵنیاییەوە مرۆڤ هەڵساوە بەم کارە.

لەنێو ئەم نموونانەی کە وەرگیراون نموونەی ژمارە (٣١٥)یە کە لە چاڵێکی ژێر یەکێ لەو بەردانە کە تۆزێ دەکەونە دەرەوەی گۆڕەکە وەرگیراوە، نموونەی ژمارە (٢٧١) لەسەر رووی ئێسکە پەیکەرەکە وەرگیراوە، لەخاڵی ناوەندەوە، بەڵام نموونەی ژمارە (٣٢٦) لە خاڵێکی دوورتری رۆژهەڵات لەهەمان ئاستدا وەرگیراوە. بەڵام هەردوو نموونەی (٣١٣) و (٣١٤) کە بەزۆری گوڵ دەوڵەمەندن لەهەمان ئاستی ئێسکە پەیکەرەکە وەرگیراون لەلایەکی ئێسکە پەیکەرەکە کە یەکێکیان لەوی تر نزیکەی (٦٨سم) دوور بووە، بەڵام لە ئێسکە پەیکەرەکەوە نزیکەی (١٠-١٢ سم) دوور بووە.

ئەو گوڵانەی کە تۆوەکانیان لەچوارچێوەی ئەم نموونانەدا دۆزراوەتەوە:

١- گوڵە هێرۆ: ناوە زانستییەکەی (ALTHA OFFICINALIS) کە لەخێزانی خبازیە (العائلة الخبازية) (malvacea)، ئەوە گوڵێکی تێکەڵە لە دەوری تۆبێ کە لاچکێکی درێژی هەیە، کە درێژییەکەی دەگاتە (٢٠٠سم)، بە باشی گەشە دەکات و لیشی کەم لێ دەبێتەوە و گەڵای گەورە و پلە پلەی هەن کە (٣-٤) پلە لەخۆدەگرێ کە شێوەیان دڵیە و بەتووک داپۆشراون و گوڵەکانی گەورەن و خاوەنی رەنگی جیاوازیشن

و بەرەکەی کەپسوولییە لە شێوەدا کە تارادەیەکیش گەورەیە کە درێژییەکەی (٢-٣سم) دەبێ پانییەکەشی (١-٢سم)ە، کە لەناوەڕا چەندان تۆوی تێدایە کە شێوەکەیان خوار و لە یەک جیان و ڕەنگەکەشیان (بنی) تۆخ یان خۆڵەمێشێکی تۆخە.

٢- گوڵە بەیبوون (چاوە پشیلە) ناوە زانستییەکەی (matricaria-chamomilla) ئەوە ڕووەکێکی تێکەڵاوە کە گەڵاکانی ڕیشاڵییە و لەیەکتریش جیان، کە ڕووەکێکی بۆندار و تۆبیە.

٣- ڕویتە (الرویطه) ناوە زانستییەکەی (liium temulentom)، کە سەر بەخێزانی نجیلیە (العائله النجیلیه) (gramineae) و بەرزییەکەی لە (٤٠- ١٠٠سم) دەبێت، لاچکەکەی زۆرەو گەڵاکانیشی ریشاڵەیین. کە ڕووەکەیان زۆرە و بەرزبشن.

٤- ئەخیلیا (الاخیلیا)، یان هەزار گەڵا (الف ورقه): ناوە زانستییەکەی (achillea millefolium)، کە ئەوە لەخێزانی تێکەڵی ئەشیلیا (عائله مرکبه اشیلیا) لەناو ئەم نموونانەدا چەند جۆرە گوڵێکی تریشمان هەن لەوانە قنتریون یان عەرتب (القنطریون او العرطب) و زنبق یان سوسنی بچووک (الذنبق او السوسن الصغیر)، هەروەها خشخاش (الخشخاش) و ناوە زانستییەکەی (papaver l rhoeas)، کە لەجۆری خشخاشیە.

بە شێوەیەکی گشتی لە چوارچێوەی ئەو نموونانەی کە لە ئەشکەوتی شانەدەر وەرگیراون تۆوی هەشت جۆرە گوڵیان تێدایە کە تاکو ئێستاش ئەم جۆرە گوڵانە لە شاخەکانی زاگرۆس و شاخەکانی تری کوردستان لە وەرزی بەهاران دەڕوێن، بەڵام ئاووهەوای ناوچەکە لەوکاتدا زۆر جیاوازتر بووە لەکاتی ئێستا، چونکە پێش (٦٠٠٠٠ساڵ) ناوچەکە لەچاخی سەهۆڵیدا بووە کە دەکەوتە چوارچێوەی ئەو ناوچانەی کە بەفرێکی زۆری تێدا باری لە وەرزی زستان، لەبەرئەوە وەرزی شین بوونی ئەو گوڵانە درەنگتر بووە لە وەرزی کاتی ئێستا کە گوڵەکانی تێدا دەڕوێ، بەو واتایەی کە لە مانگی حوزەیران یان سەرەتای مانگی تەمووز شین بوون. کە ئەمەش یارمەتیمان دەدات بۆ دیاریکردنی کاتی مردنی هەندێ لە کەسەکانی شانەدەر بە تایبەتیش شانەدەری (٤) کە تۆوی ئەم گوڵانەی لەنزیک ئێسکە پەیکەرەکەی دۆزراوەتەوە.

لە هەموو جۆری گوڵەکاندا کە ئاماژەمان پێدان لە تۆوەکانیاندا سوودی تەندروستی لەو ماددە کیمیایە تایبەتییانەدا هەیە لە هەموو بەشەکانی ڕووەکەکەدا، بەڵام وانازانرێ مرۆڤی نیاندرتاڵ لە شانەدەردا ئەوەی زانیبێ تا بیروێنێ بۆ ئەو سوودانە و وەک چارەسەرێکیش بەکاری بهێنێ. بەڵام بەکارهێنانیان تەنیا لەڕووی خۆشەویستی و جوانی بووە یان لەوانەیە لەڕووی گیانی و بیروباوەڕێکی تایبەت بە ناشتن بووە(١). لەبەرئەوە هەروەک ئاماژەمان پێدا ئەمە تەنیا لەلایەن مرۆڤەوە بەکار هاتووە، بەشێوەی گوڵ، لەبەرئەوەی بەباشی ڕێکخراون و ناتوانرێ بگەنە ئەو قووڵییەش بە تەرتیبی لە ڕێگای تەسادوفەوە.

هەروەها لەوێدا تۆوی خورما دۆزراوەتەوە، لە چینی موشیری d لە ئەشکەوتی شانەدەر. بڕوا وایە کە ئەم جۆرە ڕووەکە لەوێدا نەبووە و هیچ جۆرە شیکردنەوەیەکیش بۆ ئەوە نییە بەڵکو ئەمە تەنیا لە ڕێگای گیانەوەرانی هەڵکۆڵەوە لە ئاستی زەوی ئەشکەوتەکەوە گەیشتۆتە ئەوێ. هەروەک دەزانین کە ئەم چینە قووڵترین و کۆنترین چینی ئەشکەوتەکەیە کە دەگەڕێتەوە بۆ نزیکەی (٦٠٠٠٠ساڵ)، لەو کاتیشدا دونیا لە سەردەمی چاخی سەهۆڵیدا بووە و ئاووهەواش زیاتر سارد بووە لە ناوچەکە بەبەراورد لەگەڵ ئێستایدا، ڕواندنی داری خورماش پێویستی بە پلەیەکی گەرمی تارادەیێ بەرز هەیە، کە ناتوانرێ پێشبینی هەبوونی دارخورما بکرێ لەو ناوچەیە لەو کاتیشدا تەنانەت ئێستاش کە پلەی گەرمی لەو ناوچەیەدا بەرزترە لەوکات، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ناگاتە ئەو پلە گەرمییەی کە پێویستە بۆ ڕواندنی دارخورما.

## بەندی دووەم
### یەکەم چوار ئێسکە پەیکەرەکەی شانەدەر:

لەم بەندەدا قسە لەسەر چوار ئێسکە پەیکەری مرۆڤی نیاندرتاڵ

| ڕیزبەندی ئێسکە پەیکەرەکان | مێژووی دۆزینەوەی | قۆناغی ژیانی | ڕەگەز | تەمەنی نزیکی |
|---|---|---|---|---|
| شانەدەری (١) | ١٩٥٧ز | پێگەیشتوو | نێر | ٤٥ساڵ |
| شانەدەری (٢) | ١٩٥٧ز | پێگەیشتوو | نێر | ٢٠ساڵ |
| شانەدەری (٣) | ١٩٥٧ز | پێگەیشتوو | نێر؟ | ٤٠ساڵ |
| شانەدەری (٤) | ١٩٦٠ز | پێگەیشتوو | نێر | ٤٠ساڵ |
| شانەدەری (٥) | ١٩٦٠ز | پێگەیشتوو | نێر؟ | ٥٠ساڵ |
| شانەدەری (٦) | ١٩٦٠ز | پێگەیشتوو | مێ | ٢٥ساڵ |
| شانەدەری (٧) | ١٩٥٣ز | منداڵی شیرەخۆرە | ........ | ٩ مانگ |
| شانەدەری (٨) | ١٩٦٠ز | پێگەیشتوو | مێ؟ | ٢٠ساڵ |
| شانەدەری (٩) | ١٩٦٠ز | منداڵی شیرەخۆرە | ..... | یەک ساڵ |

**خشتەی ژمارە (١)**

**مێژووی دۆزینەوەی ڕەگەز و تەمەنی نزیکی ئێسکە پەیکەرەکانی شانەدەر**

دەکەین کە لە ئەشکەوتی شانەدەر دۆزراونەتەوە لەرووی مێژووی دۆزینەوەیان و ئێسکە دۆزراوەکانیان و دیاریکردنی تەمەنیان بەنزیکی و ڕەگەزەکەشیان: بڕوانە خشتەی ژمارە (١)

**شانەدەری (١):**

لەکاتی هەڵکۆڵین بەدرێژایی دیواری خۆرهەڵاتی ناوچەی هەڵکۆڵین، لە ڕۆژی (٢٧ی نیسانی ١٩٥٧ز)، لە چوار گۆشەی (ب٧) کرێکارانی هەڵکۆڵین لەچینی موشیری D لە قووڵایی (٤،٣٤) لە ئاستی ڕووەوە گەیشتنە ئێسک. لەژێر هێڵی جیاکەرەوەی نێوان چینی C و D.

کە ئێسکە پەیکەرەکە لەژێر چینێکی بەرددا دۆزرایەوە کە ئەم بەردانە دارمانی سەقفی ئەشکەوتەکەمان بۆ بەدیار دەخات کە بەهۆی بوومەلەرزەوە ڕوویداوە. بەڵام مێژووی ئێسکە پەیکەرەکە لەبەرئەوەی لەژێر چینی C وە بووە ئەوە مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ پێش ٣٤٠٠٠ ساڵ هەروەک لەبەشی یەکەمدا ئاماژەمان پێکرد، لەبەرئەوەی هەڵکۆڵ هێڵی جیاکەرەوەی نێوان هەردوو چینەکەی دیاری کردووە، ئێسکە پەیکەری مرۆڤی شانەدەری (١) نزیکەی پێش (٤٥٠٠٠- ٥٠٠٠٠) ساڵە.

ئێسکە پەیکەرەکە بەشێوەی لەسەر پشت ڕاکشاو دۆزراوەتەوە کە هەندێ بەرەو دەستە ڕاستە، کە دەستەکانی لەسەر سنگە بەڵام لاقەکانی بەتەواوی ڕاکشاون ئاراستەی ئێسکە پەیکەرەکەش (ڕۆژئاوا- ڕۆژهەڵاتە) بەڵام کەللەی سەری بە ئاراستەی ڕۆژئاوایە، ڕووەکەشی بەرەو باشوورە.

یەکەم بەشی ئێسکە پەیکەرەکەش کە دەرکەوتووە ئێسکی کاسەی سەر بووە، دوای ئەوەی لە دەوریدا چاڵ لێدرا ئێسکەکانی دەموچاوی دەرکەوت و شەویلگە و بڕبڕەکانی ملیش دەرکەوتن، کەللەی سەری لە عامودی بڕبڕە جیابووە و بەرەو ناوەوە پاڵدرابوو، شەویلگەی خواروو لەجێگای خۆی نەماوە و دوورە لە کەللەی سەرەکە کە ئەمەش لەوانەیە بەهۆی هێزی دارمانی ڕەوەزەکەوە بووبێ. هەروەها ئێسکەکانی هەردوو کولمەکە تارادەیەک تێکشکاون.

بەڵام ئێسکی سەرووی برۆ کە یەکێکە لە تایبەتمەندییە جیاکەرەوەکانی مرۆڤی نیاندرتاڵ، لە دۆخێکی باشدایە و زۆر تووشی دارزان نەبووە، بابەتی کەللەی سەر سەبارەت بە جەسەدەکەی لە بارودۆخێکی سروشتیدا نییە، بەردێ لەسەر ئێسکەکانی گەردەنە کەوا پێدەچێ ئەوە هۆکاری جیابوونەوەی سەرەکەی بێ لە جەسەدەکەی.

هەڵکۆڵ باوەڕی وایە کە ئەم کەسە بەهۆی دارمانەوە مردبێ، لەدواییدا پارچە بەردی کلسی بچووکی لەلایەن تاکەکانی کۆمەڵەکەیەوە بۆ دانراوە، پاشماوەی ئێسکەکانی مرۆڤی شانەدەری (١) وەک هەموو ئێسکە پەیکەرەکانی تری شانەدەر ڕەق نییە و دارزاوە و پارچە پارچە بووە بە تایبەتیش ئێسکە گەورەکانی کە خاوەنی تویکڵە ئێسکێکی ناسکە. هەر لەبەر ئەوەیە کە چەندان ئێسکی بچووک و بەشەکانی ئێسکی شەویلگەکە ڕەقن وەک ئێسکەکانی دەموچاو ماونەتەوە، لە دۆخێکی باشدا، بەڵام ئێسکەکانی ران و قامیش و کاسەی سەرو زۆربەی عامودی بڕبڕەش پارچە پارچەبوون و ڕزیبوون.

دووبارە بنیادنانەوەی ئێسکە پەیکەری مرۆڤی شانەدەری (١) لەلایەن ستیوارت (steqart) لە ساڵی ١٩٥٧- ١٩٥٨ز بووە، کە تەرکیزی کردۆتە سەر کەللەی سەر و تەواوکردنی بنیادنانەوەی ئێسکەکانی دەموچاوی، کە ئێسکەکانی دەموچاو شەویلگە ئاسانبوون بۆ بنیادنانەوە، بەڵام زۆربەی ئێسکەکانی کاسەی سەر لەناوچوون، لەبەرئەوە بەیەک گەیشتن لەنێوان لاچەنەگەی چەپ و کاسەی سەردا نییە، لەبەرئەوە هەڵساوە بە نزیکەی بەشەکانی لاچەنەگەی چەپ و ئێسکی دیواری و ئێسکی دوایی بنیاد ناوەتەوە، کە توانیویە کەللە سەرەکە بە شێوەیەک بنیاد بنێتەوە کە نزیک بێ لە شێوە ئەسڵییەکەی.

لە خوارووی ئێسکە پەیکەرەکەدا شوێنەواری چینێکی دانیشتوان دۆزرایەوە، کە ئەمەش بەڵگەیە لەسەر هەبوونی دانیشتوان لەکاتی ڕوودانی دارمانەکەدا. گڵی ئەم شوێنەش ڕەنگەکەی مەیلەو ڕەشە و پارچەی بچووکی خەڵووز و خۆڵەمێشی تێدایە و دوو پارچە بەردەستی دۆزراوەتەوە کە پەیوەندییان بەم ئێسکە پەیکەرەوە هەبووە. پارچەی یەکەم، تەنکە و ڕەنگەکەشی خۆڵەمێشییە کە درێژییەکەی (٣.٣سم) و پانییەکەی (٣.١سم) و ئەستوورییەکەشی (٣.سم)، کە لەدووری (١٥سم) لە باکووری شانی چەپی دۆزرایەوە، بەڵام تیشاڵی لەبەردی ڕەش دروست کراو لەلای ڕاستی ئێسکە پەیکەرەکەدا لەنێوان ئێسکەکانی پەراسوویدا دۆزراوەتەوە.

ئێسکەکانی پێ کە بە تەواوی پارێزرابوون و بەهۆی دارمانەکەوە ورد نەبووبوون، تەنها ئەوە نەبێ کە لەلاق جیابووبوونەوە، بەڵام ددانەکان و شەویلگەکانی کە بەگرنگترین بەشەکانی ماوەی مرۆڤی ئەنسرۆپۆلۆجی کۆن دادەندرێ بەباشی پارێزرابوون.

بروانە خشتەی ژمارە (٢)

**شانەدەری (٢):**

لەمیانەی هەفتەی کۆتایی هەڵکۆڵین، لە (١٩٥٧/٥/٢٣ز) کاتێ یەکێ لە کرێکارەکان هەڵساوە بەخاوێنکردنەوەی دیواری ڕۆژئاوای چاڵی هەڵکۆڵینەکە بۆ وێنەگرتنی ناوچەکە لەڕووی پانییەوە کە ئەمە کارێکی گرنگە لە پێش داخستنی چاڵی هەڵکۆڵین کە کرێکارەکە هەڵساوە بە خاوێنکردنەوە و داماڵین و ڕێکخستنی دیوارەکانی هەڵکۆڵین بۆ زانینی ئەو گۆڕانانەی کە لەڕەنگی گڵی چاڵەکەدا هەیە بە مەبەستی جیاکردنەوەی چینە شوێنەوارییەکان، لەدوای کاری داماڵینی گڵەکە کرێکارەکە تێبینی کرد کە چەند ددانێ بەدەرکەوتن و دوای ئەنجامدانی کاری شیکردنەوە بۆیان وادەرکەوت کە ئەوانە هی مرۆڤێکی پێگەیشتوون، ئەم ددانانە دەکەونە قووڵایی ناستەکە، لە چوارگۆشەی (د٨) لە چینی d موستیری، لەدواییدا دەرکەوت کە ددانەکان بە شەویلگەکەوە چەسپیون و کارەکە بەدەرخستنی کەللە سەرەکە تەواو بوو. دەرکەوت کە ئەم ئێسکە پەیکەرە دەگەڕێتەوە بۆ مرۆڤی نیاندرتاڵی پێگەیبیو، لەبەر ئەوە بە شانەدەری (٢) ناونرا، بەڵام شوێنەکەی سەبارەت بە شوێنی ئێسکە پەیکەری مرۆڤی شانەدەری (١)، دەکەوێتە دووری (٧م) بە

| ئێسکەکانی کەللەی سەر | ژمارەیان | ئێسکەکانی قەد | ژمارەیان | ئێسکەکانی پەلەکانی سەروو | ژمارەیان | ئێسکەکانی پەلەکانی خواروو | ژمارەیان |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| کاسە | | بڕبڕەکانی مل | ٤ | ئێسکی چەنەمە | | ئێسکی حەوز | |
| شەویلگەی خواروو | | بڕبڕەکانی سینگ | ١٠-١١ | دەفەی شان | | رانی راست | |
| ددانەکانی شەویلگەی سەروو | ١٦ | بڕبڕەکانی سێ بەندە | ٥ | بازوو | | کولاوە چۆک | |
| ددانەکانی شەویلگەی خواروو | ١٤ | پەراسووەکان | ١٤ | کەوەرەی چەپ | | لاق | |
| | | کەلەکە | | زەندی چەپ | | قامیش (تەلەزم) | |
| | | | | ئێسکەکانی مەچەک | | ئێسکەکانی پاژنە و قولە پێ ئێسکەکانی جومگەی پێشەوە | ٨ |
| | | | | | | ئێسکەکانی شانەی پێ | ٨ |
| | | | | | | پەنجەکانی نزیک | ١ |

**خشتەی ژمارە (٢)**

**سەرژمێری ئەو نیشانەی کە لەمیانەی هەڵکۆڵینی شانەدەری (١) دۆزراونەتەوە**

ئاراستەی رۆژئاوا لەگەڵ چەند میلێ لە باشووری شانەدەری (١)، کە دەکەوێتە ژێر هێڵی پەیوەندی نێوان چینەکانی D،C بە قووڵایی (١,٥م)، کە ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە سەردەمەکەی لە شانەدەری (١) کۆنترە، سەرەڕای قووڵی شوێنەکەی، دیزاینی ئامێرە بەردینییە هاوکاتەکانیش ئەوە دووپات دەکەنەوە، سەرەڕای ئەو مێژووەی کە بەهۆی کاربۆنی (١٤) دەستمان دەکەوێ کە مێژووی ئەم ئێسکە پەیکەرە دەباتەوە بۆ نزیکەی پێش (٦٠٠٠٠) ساڵ.

کەللەی سەرەکەی لەسەر لای راستی بووە کە زۆر بە خراپی رازی بوو هەڵکۆڵ ئەو دارزانە و بارە خراپەی کەللە سەرەکەی بۆ ئەوە گەڕاندۆتەوە کە بەرد بەسەریدا بەربۆتەوە کە هەر ئەمەش بووەتە هۆی مردنی کەسەکە و لەهەمان ئەو شوێنەی کە ئێسکە پەیکەرە بە بەردبووەکەی لێ دۆزراوەتەوە و کۆمەڵە بەردێکی گەورەش لەسەر سەری دۆزراوەتەوە، لەسەرووی بەرزی (١٢سم) لەسەریەوە، لە ئەنجامی قورسایی ئەو پاشماوەیەی سەری نێو چاوانی تێکشکابوو کە ئەمەش بووبووە هۆی ئەوەی کە شێوەیەکی پانبووەوەمان پێ ببەخشێ کە ئەستوورییەکەی لەلایەکەوە بۆ لاکەی تر (٥-٦سم) بووە. دۆزینەوەی ئێسکە پەیکەرەکە لە هەفتەی کۆتایی ئەم وەرزەی هەڵکۆڵین بووە هۆی ئەوەی کە هەڵکۆڵ بڕیاری ئەوە بدات کە کەللە

سەرەکە لەنێو پاشماوەکاندا لەگەڵ هەندێ لەو ئێسکانەی کە لەگەڵی بوون وەک ئێسکەکانی (دەفەی شان و بڕبڕەکانی مل) بێنێتە دەرێ و بیانخاتە ناو کیسەی و بیانگوازێتەوە بۆ مۆزەخانەی نیشتمانی لە بەغداد، لەبەرئەوەی نەیتوانی پاشماوەکانی تری ئێسکەکانی عامودی بڕبڕە و ئێسکەکانی باڵەکان بێنێتە دەرێ، لە شوێنی خۆیان لەدیواری رۆژئاوای چاڵی هەڵکۆڵین تا وەرزی هەڵکۆڵینی ساڵی ١٩٦٠ز لێیانگەڕا.

دوای گەڕانەوەی شاندەکە بۆ ئەشکەوتەکە لە ساڵی ١٩٦٠ز دوو هەفتەی یەکەمیان بۆ دەرهێنانی پاشماوەی ئێسکەکانی ئێسکە پەیکەری مرۆڤی شانەدەری (٢) تەرخان کرد، بەڵام ئێسکە بە بەردبووە ماوەکان زۆر نەبوون، کاری دەرهێنانی سێ بڕبڕەی سنگ و چوار بڕبڕەی کەلەکە و بەشەکانی بە سێ پەراسووی قەفەسەی سنگ و ئێسکی قامیش و ئێسکی تەڵەزمی چەپ تەواو بوو، خشتەی ژمارە (٣).

لە تایبەتمەندییەکانی کەللەی سەرو ئێسکە پەیکەری ئەو کەسە وادەردەکەوێ کە تایبەتمەندییەکانی نیاندرتاڵی کلاسیکی هەبێ.

بڕوانە خشتەی ژمارە (٣)

**شانەدەری (٣):**

بەشەکانی یەکەمی ئەم ئێسکە پەیکەرەی شانەدەری (٣) لە (١٦/٤/١٩٥٧ز) دۆزرایەوە، لەپێش شانەدەری (١و٢)، بەڵام گرنگییەکەی دەرنەکەوت بەهۆی دڵنیانەبوون لە ناسنامەکەی، بەڵام دوای دۆزینەوەی هەردوو ئێسکە پەیکەری مرۆڤی شانەدەری (١و٢)، کاتێ شاندی هەڵکۆڵین زانییان کە ئەم ئێسکە پەیکەرە هی مرۆڤی نیاندرتاڵی پێگەییوە، گرنگی پێدرا، پاشماوەکانی یەکەمی ئەم ئێسکە پەیکەرە لەکاتی پاککردنەوەی دیواری رۆژهەڵاتی چاڵی هەڵکۆڵین دۆزرایەوە، کە شوێنەکەی (٥,٤٠م) قووڵ بوو لە دیواری رۆژهەڵاتی هەڵکۆڵین، لە رۆکنی باکووری خۆرهەڵاتی چوارگۆشەی (ب٩)، لەو روکنەی کە چوار گۆشەکانی (ا٨، ا٩، ب٨) تێیدا بەیەک دەگەن[1]، هێڵکاری

| ئێسکەکانی کەللەی سەر | ژمارەیان | ئێسکەکانی قەد | ژمارەیان | ئێسکەکانی پەلەکانی سەروو | ژمارەیان | ئێسکەکانی پەلەکانی خواروو | ژمارەیان |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| کاسە | | بڕبڕەکانی مل | ٧ | دەفەی شان | | لاقی چەپ | |
| شەویلگەی خواروو | | بڕبڕەکانی سنگ | ٨ | | | تەڵەزم (قامیش)ی چەپ | |
| ددانەکانی شەویلگەی سەروو | ١٦ | بڕبڕەکانی سێ بەندە | ٤ | | | | |
| ددانەکانی شەویلگەی خواروو | ٥١ | | | | | | |

**خشتەی ژمارە (٣)**

**سەرژمێری ئێسکە دۆزراوەکانی شانەدەری (٢) لە هەڵکۆڵیندا**

ژمـــــارە (١١) لەدووری نزیکەی (٢.٧٥م) لە باشـــوور و (٥.٠م) لە رۆژئاوای و (٠.٧م) لە خـــــوارووی ئێسکە پەیکەری مرۆڤی شانەدەری.

لەدووری مـەترێ بە ئاراسـتـەی باشوور پەناگەیەکی بچووک لەنێوان پاشماوەی دوو ئاگردان کە یەکێکیان لەسـەر ئەوی تریان بووە دۆزرایەوە، کـە دەکـەوێتـە سـەرووی ئاسـتی ئێـسکەکـانی شـانەدەری (٣) بە نزیکەی (١٠سم)، درێژی تیــردی هەردوو ئاگــردانەکـــە (٧٠سم) و ئەســتـووردکەشـیـان (٥سم) لەژێر پاڵەپەســتـۆی بەردی کـەوتوودا، وا پێـدەچێ مـرۆڤی شـانەدەری (٣) هاوزەمــــان بێ لەگـــەڵ هەردوو ئاگردانەکە.

لەمـیـانەی وەرزی سـێـیـەمی هەڵکۆڵین لەســـاڵی ١٩٥٧ز، ئێسکەکـانی پراس و، پێنج برِبرِەی سێ بەندە و برِبرِەکـــانی سنگ و ئێـسکەکـانی کـەلەکـە و ئێـسکی چەلەمـە و ئێـسکەکـانی دەست و ئێـسکەکـانی پێ لەگـەڵ چوار دانی لەیەک جیا دۆزرانەوە.

لەوەرزی چوارەمــدا لە ســاڵی (١٩٦٠ز)، هەندێ ئێـسـکی تری شـانەدەری (٣) دۆزرانەوە لەوانەش بەشـــەکـــانی برِبرِەی سنگ و پەراسووەکان و دەفەی شان و بازوو، ئێسکەکانی زەند و کەوەرە.

هەندێ ئێــــسکیش لەدووری شوێنی ئێسکە پەیکەرەکە دۆزرانەوە، بەشـەکـانی ئێـسکەکـانی براس و لەدووری (٣٥سم) لە عـــامـــوودی برِبرِەوە دۆزرایەوە هیچ ئێـسـکێکی بەشەکانی سەروو لە برِبرِەکانی مل لە شـوێنی خـۆیان نەدۆزرانەوە، ئێـسـکە پەیکەرەکـــە بەپشت بەستن بەلای راست دۆزرایەوە کە لاقـەکـانی بەرەو سنگ بە ئـاراســتـــەی رۆژئاوا نووشتابوونەوە، بەڵام دەستەکانی بە شـێـوەیەکی لاربوو بەرەو ئاراسـتـەی رۆژهەڵات بوون.

کـاری بنیـادنانەوەی ئێسکەکـانی ئێـسـکە پەیکەرەکـە لە پەیمانگای سیـمـسـونیـا (SIMTHSONIA) لە ئەمریکا ئەنجامدرا، لەدوایـیدا نێردرا بۆ زانکۆی هارفـــرد بۆ لێکۆڵینەوە، هەوڵدرا بۆ زانینی رەگەزی ئەم کەسە لەمیانەی پێوانە و شێوەی مۆرفۆلۆجی لە ئێسکەکانی حەوز و ئێسکی سمت و بەتایبـەتی شـێـوەی قـووڵایی و پێچاوپێچەکەی.

درێژی ئێـسکی عـانە و ئەوەی تایبـەتە بە زاویەی ئێـسـکی عـانە، دەتوانرێ پشت بە قەبارە و ئەستووری و زۆری ئێـسـکەکـان ببەسـترێ بۆ دیاریکردنی رەگـەز بە تایبــەتی لەمرۆڤی نیـاندرتاڵ کە ئێسکەکـانی نێرینەیان قـەبارەی گـەورەیە و زۆر و ئەسـتـووریشـە بە بەراورد لەگـەڵ ئێسکەکانی مێینەیدا.

حـــەوزی شـــانەدەری (٣) لە دۆخـێکی باش نیـیـــە لەبەرئەوە دەتوانرێ بەهۆی شـێـوەی چاڵی و پێچەکەی رەگەزی ئەم کەسە دیاری بکرێ، ســەرەرای هەبوونی هەندێ بەڵگە کـە وای نیشـان دەدەن کە ئەم مرۆڤە نێرینەیە.

بەڵام سـەبارەت بە تەمـەنەکـەی، بەڵگەی وەک داپۆشینی ئەسـتووری ددانەکـان و شـێـوەی کـۆنی سـەر برِبرِەکـان و جـیـاکـەرەوەکـان وای دەردەخـەن کـە تەمـەنی ئەو کـەسـە نزیکەی (٣٥) ساڵ بووە.

شتێکی گرنگ لە شانەدەری (٣) هەیە کە ئەویش برینداربوونی پراس و نۆیەمـیـەتی بە ئامـێرێکی تیـژ، کـە لەوانەیە ئەمـە راسـتـەوخـۆ یان ناراستەوخۆ بووبێتە هۆی مردنی، کە ئەمــەش یەکــەم بەڵگەیە لەســەر هەبوونی توند و تیـژی لەنێـــوان نیاندرتاڵەکاندا.

بروانە خشتەی ژمارە (٤)

**شانەدەری (٤):**

لــە بــەرواری ٤/٨/١٩٦٠ز، لەکـاتی هەڵکۆڵین لە ئەشکەوتی شانەدەر، سەرۆکی شاندەکە فەرمانی کـــرد بە برینی دیواری رۆژهەڵاتی ناوچەی هەڵکۆڵین، لە ئەنجـامـدا هەندێ ئێسک لەچوار گۆشەی (ب٧) لە قـووڵایی (٧.٤٩م) لەرووی زەوی ئەشکەوتەکـە دۆزرایەوە، کـە یەکـەم جار ئێـسکەکانی قامیش و تەڵەزمی لاق لەناو کــۆمــەڵە رەوەزێکدا دۆزرانەوە، بارودۆخی ئەم ئێـسکانە باش نەبوو لەبەرئەوە لەکاتی هەوڵدان بۆ دەرهێنانیـــان پارچە پارچە بوون لەبەرئەوەی دەرهێنـانی ئێـــسـک پێـویسـتی بەئاگـایەکی زۆر هەیە، گـرفـتـێکی تر هەبوونی کلس بوو لەسەر ئێسکەکان، کە لابردنی دەبووە هـۆی لەبەریەک هەڵوەشـــــانی ئێسکەکـان، کە ئەمـەش ئەوەمـان بۆ دەردەخـات کە ئەو چینەی شانەدەری (٤)ی تێـدا دۆزراوەتەوە هاوکـات

| ئێسکەکانی کەللەی سەر | ژمارەیان | ئێسکەکانی قەد | ژمارەیان | ئێسکەکانی پەلەکانی سەروو | ژمارەیان | ئێسکەکانی پەلەکانی خواروو | ژمارەیان |
| --- | --- | --- | --- | --- | --- | --- | --- |
| ددانەکانی شەویلگەی سەروو | ٢ | بڕبڕەکانی سنگ | ١٢ | ئێسکی چەناگە | | ئێسکی حەوز | |
| ددانەکانی شەویلگەی خواروو | ٢ | بڕبڕەکانی سێ بەندە | ٥ | دەفەی شان | | ڕان | |
| | | کەنەکە | | بازوو | | لاق | |
| | | پەراسووەکان | ٢٠ | کەوەرەی چەپ زەند | | تەنەزم (قامیش، ئێسکی پاژنە و قولەپێ | |
| | | | | ئێسکەکانی جومگەی دەست | ٦ | ئێسکەکانی جومگەی پێی پێشەوە | ٩ |
| | | | | ئێسکەکانی مەچەك | ٤ | ئێسکی سمسمی | ٢ |
| | | | | پەنجەکانی نزیك | ٣ | ئێسکەکانی مەچەکەپێ | ٧ |
| | | | | پەنجەکانی ناوەند | ٤ | پەنجەکانی نزیك | ٢ |

**خشتەی ژمارە (٤)**

**سەرژمێری ئەو ئێسکانەی لەمیانەی هەڵکۆڵینی شانەدەری (٣) دۆزراونەتەوە**

بووە لەگەڵ پێکهێنانی چینێکی کلسی (ئەستەلک مایت) لەسەر زەوی ئەم چینە.

ئێسکە پەیکەرەکە دەکەوتە نێوان چاڵێکی قووڵ لە باکوورییەوە و دوو بەردی گەورەش لە باشوورییەوە کە ئەمەش بووبووە هۆی ئەوەی کە مەودایەکی تەواو نەبێ بۆ دەرهێنانی ئێسکەکان بە ئاسانی، بەڵام گڵەکەی دەوری ئێسکە پەیکەرەکە نەرم بووە و هیچ ڕەوەزێکی گەورەشی تێدا نەبووە کە ئەمەش کارئاسانی دروست کرد کە گڵەکە دەوری ئێسکە پەیکەرەکە دەرهێنراوە و ئێسکە پەیکەرەکەش بەرە بەرە دەرکەوتووە کە تەواو بووە و زۆربەی ئێسکەکانیشی پارێزرا بوو، بەڵام بەشێوەیەکی گشتی ئێسکەکانی داڕزابوون.

ئێسکە پەیکەرەکە لەسەر لای چەپی ڕاکشاوە بەشێوەی کۆرپەلەی ناوزگی دایک، شێوەی ژمارەی (٤) کە لاقەکانی چەماونەتەوە بەئاراستەی حەوز بەشێوەیەکی یەکسان لەگەڵ دیواری ڕۆژهەڵاتی ناوچەی هەڵکۆڵین کە چۆکەکانی بە ئاراستەی باشوورن و پێیەکانیشی بە ئاراستەی باکوورن. ئەم بارەشی ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە کەللەی سەری بە ئاراستەی باشوورە و باڵەکانیشی لار بوونەتەوە بۆ ئەو بۆشاییەی کە لەنێوان ڕانەکان و قەفەزەی سنگدا هەیە، دەستی چەپیشی لەسەر نێوچاوانی داناوە و دەستی ڕاستیشی لەنزیک ئەژنۆی چەپیەتی. ئێسکی باڵەکانی لەو ئێسکانەن کە لەبارێکی باشدان و لەپێش دەرهێنانیان هەندێ

پێـوانەیان بۆ کـرا ئەم پێـوانانە تۆمارکراون، درێژی پێوانەی دەفەی شانی راست لەسەر ئاستی پشتی:

ماوەی نێوان جوفی عنابی بۆ بنکەی لووتکەکانی بڕبڕە یەکسانە بە ١١٥ملم

ماوەی مەلبەندی جوفی عنابی بۆ روکنی خواروو یەکسانە بە ١٥٠ ملم

درێژترین درێژی ئێسکی بازووی راست یەکسانە بە ٣٠٥ ملم

پانتـرین خـاڵی کـۆتایی دوور ٦٧ملم

درێژترین خـاڵی ئێـسکی زەندی چەپ یەکسانە بە ٢٦٢ملم

دوای ئەوەی ئێسکە پەیکەرەکە لە شـوێنەکـەیدا دەرکـەوت دوای ئەنجامدانی هەندێ پێوانەی گرنگ و وێنەگـرتنی و کـێشـانی هێـڵکاری گشـتی بۆ دۆخـەکەی و بردنی چەند نموونەیێ لەهەمـان ئەو ئاسـتەی کـە ئێسکە پەیکەرەکـەی تێـدابوو بەمـە بەشی ئەنجامـدانی شیکاری بۆیان، هەڵـسان بە برینی ئەو پارچە زەوییەی کـە ئێـسکە پەیکەرەکـەی تێـدابوو، خسـتـیـانە ناو سندوق و ئێـسکە پەیکەرەکـەی ناو سندوقـەکـەشـیـان بەلۆکە رووپۆش کرد و گواستیانەوە بۆ مـۆزەخـانەی عـیـراقی، تا سـاڵی ١٩٦٢ز لەوێ مـایەوە تا هەڵکۆڵەکە جـارێکی تر گـەڕایەوە عـیـراق کـە هەڵـسـا بە کـردنەوەی سندوقـەکـە و ئێـسـکە پەیکەرەکـەش لەلایەن ستیوارت بنیاد نراوە.

ئەنجـامی ئەو نموونانەی کـە بۆ شیکاری بردرابوون لەهەمـان ئاسـتی ئێسکە پەیکەرەکە لەدووری جیـاواز لە ئێسکە پەیکەرەکەوە بلاوکرایەوە، کە ئەنجـامـەکـەی دەرکـەوتنی چەندان تۆوی گـوڵـی جـیـاواز بوو لەم نموونانەدا، کـە ئەمـەش بووە هۆی دەرکەوتنی چەندەها شیکاری لەسەر هەبوونی تۆوی گـوڵ لەگـەڵ ئێـسکە پەیکەری مـرۆڤی شـانەدەری (٤) و جـیـاوازی بۆچوونەکـان لەم بارەیەوە، کـە ئەمـە لە بابەتێکی تایبـەتی و شـوێنێکی تری ئەم بەندە تاوتوێ دەکرێ.

بەڵام سـەبارەت بە دیاریکردنی تەمەنی شانەدەری (٤)، بەڵگەی زۆر لە ئێسکە پەیکەرەکە هەیە کە ئەمە لە تەمـەنێکی وەناوکـەوتوودا بووە، هێـڵی نێوان بەشـەکـانی کـاسـەی سـەری، درزی پێـشـەوە کـە تۆزێ کـراوەیە، سـەرەڕای رزینی زۆربەی مـینای سـەر خـرێنە و هاڕاوەکـانی شانەدەری (٤)، هەروەها هەڵـوەرینی چەند دانێکی پێش مـردنی بەڵگەن لەسەر ئەوە. هەمـوو ئەم زانیـارییـانە بەتایبـەتیش رزینی زۆربەی ددانەکان بەڵگەن لەسـەر ئەوەی کـە تـەمـەنی کەسەکە لەنێوان (٣٠-٤٥) ساڵاندا بووە.

ئەو پارچەیەی کـە لە ئێـسـکی حـەوز و سـمت مـاونەتەوە، وا دەردەخـەن کـە ئەم کـەسـە نێـرینەیە لەبەرئەوەی حەوز و کەوانی ئێسکی سـمت هاوشـێـوەی حـەوزی پیـاون، هەروەها پانی نێـوچاوان بەڵگەیە لەسەر ئەوە و بەرزی شەویلگەکانیش بەڵگەیەکی ترە، بەڵام بەشەکانی تری ئێـسکە پەیکەرەکـە بەشـێـوەیەکی راسـتـەوخـۆ لایەنی رەگـەزی دیاری ناکـەن، بەڵام درێژی کـەوەرەی شـانەدەری (٤) لەچوارچێـوەی درێژترین ئێسکی کەوەرەی پیاوە لە مرۆڤی نیاندرتاڵەکاندا(٤).

بڕوانە خشتەی ژمارە (٥)

**بەندی سێیەم**

ئێسکە پەیکەرەکانی پێنجەم و شـەشـەم و حـەوتەم و هەشـتـەم و نۆیەمی شانەدەر:

**شانەدەری (٥):**

بەشەکانی ئەم ئێسکە پەیکەرە لە رێـکـەوتـی (١٩٦٠/٨/٧ز) دۆزراوەتەوە دوای تێپەڕینی سێ رۆژ بەسـەر دۆزینەوەی شـانەدەری (٤)، ئەم ئێسکە پەیکەرە لەهەمان درێژایی دیواری رۆژهەڵاتی چاڵی هەڵکۆڵین لەنزیک شـوێنی دۆزینەوەی هەردوو شـانەدەری (١و٣) دۆزراوەتـەوە لەوکـاتەی کـە هەڵکۆڵ ئەم ناوچەیەی دەپشـکنی بەهیـوای دۆزینەوەی بەشـەکـانی تری ئێـسکە پەیکەری مـرۆڤی شـانەدەری (٣)، بەڵام لەبری ئەوە لە قـووڵایی نزیکەی (٤.٤٨م) لە ئاسـتی ئەشکەوتەکـە ئێـسکە پەیکەرێکی تری مـرۆڤی نیـاندرتاڵ دۆزرایەوە، کـە بە شـانەدەری (٥) ناونرا(١).

شـانەدەری (٥) هەروەک ئێـسکە پەیکەرەکـانی تر لەنێـو رەوەزەکـان دۆزرایەوە، وا دەردەکـەوێ کـە ئەمـە بەهۆی روودانی داڕمـانی بەردەکـانی سـەقـفی ئەشکەوتەکـە مـردبێ کـە بەهۆی ئەو داڕمـانەوە پاشـمـاوەی ئێسکەکانی لەو سینەکەیدا وردبوون.

| ئێسکەکانی کەللەی سەر | ژمارەیان | ئێسکەکانی قەد | ژمارەیان | ئێسکەکانی پەلەکانی سەروو | ژمارەیان | ئێسکەکانی پەلەکانی خواروو | ژمارەیان |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| کاسە | | بڕبڕەکانی مل | ٤ | دەفەی شان | | ئێسکی حەوز | |
| شەویلگەی خواروو | | بڕبڕەکانی سنگ | ٧ | بازوو | | ران | |
| ددانەکانی شەویلگەی خواروو | ٣ | بڕبڕەکانی سێ بەندە | ٤ | کەومرە | | کلاوەچۆکی چەپ | |
| ددانەکانی شەویلگەی خواروو | ٩ | بڕبڕەکانی کلێنجە | ١ | زەند | | لاق | |
| | | پەراسووەکان | ٢٠ | ئێسکەکانی جومگەی دەست | ١٠ | تەنەزم (قامیش) | |
| | | کەلەکە | | ئێسکەکانی مەچەك | ١٠ | قولە پێ | |
| | | | | پەنجە نزیکەکان | ٨ | پاژنە | |
| | | | | پەنجەکانی ناوەند | ٦ | ئێسکەکانی جومگەی پێشەوە | ٥ |
| | | | | پەنجە دوورەکان | ٥ | ئێسکی سمسمە | ١ |
| | | | | | | پەنجە نزیکەکان | ٩ |
| | | | | | | پەنجەکانی ناوەند | ٥ |
| | | | | | | پەنجە دوورەکان | ٤ |
| | | | | | | ئێسکەکانی مەچەکی پێ | ٧ |

**خشتەی ژمارە (٥)**

**سەرژمێری ئەو ئێسکانەی لەمیانەی هەڵکۆڵینی شانەدەری (٤) دۆزراونەتەوە**

لاقەکانی لەگەڵ رووەکە خوار بوونەتەوە و حەوزەکەشی لەژێر رەوەزێکی قەبارە مام ناوەندی دایە، لایەکەی تری حەوز بەکەللەی سەرەوە نووساوە، پەلەکانی سەروو ئێسکەکانی قەدی ماوە لە دەرەوەی چوارچێوەی ئێسکە پەیکەرەکە لەدواوە دۆزراونەتەوە هەر لەبەر ئەوەیە کە کەللەی سەر لە تەنیشت حەوزە، وا دەردەکەوێ دوای مردنی کەسەکە بە رووداوەکە لەم شوێنەشدا ناشتوویانە.

کەللە سەری شانەدەری (٥) بەرەوەز تێکشکاوە، کەللە سەر و رەوەز و حەوز وەک یەک پارچە دەرهێنراون، بەڵام ئێسکی پەلەکان بەشێوەی یەک پارچە دەرهێنراون و لەساڵی ١٩٦٧ز بنیاد نراوەتەوە، دەموچاوی شانەدەری (٥) تێکچووە، ئێسکی لاچەنەگەی چەپ و ئێسکی دیواری چەپ لەژێر ئێسکی

نێوچاواندا نووشتاونەتەوە، بەڵام دەتوانرێ ئێسکەکانی شەویلگەی سەروو کولمە و نێوچاوان و دیواری چەپ و لاچەنەگەی چەپ کۆبکرێنەوە، بەدەستهێنانی ئەوە داوایەکی قورسە بۆ تەواوبوون سەرەڕای ماددەی بوترار (Butrar)، و کحول (play-vinyl-butry1) و دووبارە بنیادنانەوەی لەگەڵ چیمەنتۆ (duco) و سمغی حامزی هەیە (صمغ حامض الخليك).

ئێسکەکانی کەللەی سەریش ئەمانەن: ئێسکی نێوچاوان، ئێسکەکانی کولمە، شەویلگەی سەروو، ئێسکەکانی لووت، لاچەنەگەی چەپ، کە نزیکەی شێوەیەکی تەواوی هەیە بەڵام ناتوانرێ پارچەی نێوچاوان رێکبخرێ. بەشێ لە ئێسکی پشتە سەر لەگەڵ تەپڵە سەری پێشەوە و بەشێ لەدرزی ئەمی، بەشە بچووکەکانی ئێسکی دیوار و ئێسکی ئەلوەندی و بنکەی پێشەوەی سەر.

شانەدەری (٥) تاڕاددەیەکی زۆر هاوشێوەی شانەدەری (٤،٢،١)ە، لەڕووی مۆرفۆلۆجیەوە، کە نێوچاوانی درێژ و نزمە و برۆکانیشی بەرەو پێشەوە دەرپەڕیون.

پەلەکانی سەرووی لەدۆخێکی باشدان سەرەڕای کەمی هەندێ ئێسکی و هەروەها هەبوونی هەندێ ئێسکی پەلەکانی خواروو وەک ئێسکەکانی ران و کلاوە چۆک و لاق و تەڵەزم.

ئەو ئێسکانەی بەڵگەمان دەدەنێ لەسەر تەمەنی شانەدەری (٥) بریتین لە ئێسکەکانی کەللەی سەر و ددانەکان، ئێسکەکانی کاسە بە خەیاتەی درزی تاجی چەپ بە شێوەیەکی تەواو بەیەکەوە نووساون، کە درزی خەیاتەکەی کراوەیە کەوا پێدەچێ ئەوە پێکەوەنووساو بووبێ، بەڵام دوای ئەوەو لەکاتی بە بەردبووندا جیابووبێتەوە. سەرەڕای ئەوەی کە ئێسکی کاسەی سەر شکاوە کە ئەستوورییەکی زۆر لەچینی نێوان هەردوو بەشی کاسەی سەردا دەردەکەوێ، ئەستووری ئێسکی نێوچاوان (٢.١٠-١٠ملم) ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە تەمەنی وەناوکەوتووە و جومگەکانیشی دەرکەوتوون. ئەم هەموو بەڵگانە ئاماژە بەوە دەکەن کە تەمەنی شانەدەری (٥) نزیکە لە شانەدەری (٣) کە نزیکەی (٣٥-٥٠) ساڵ دەبێ.

بەڵام بۆ دیاریکردنی رەگەزی شانەدەری (٥) کە بەشێکی کەمی ئێسکی حەوز بەبێ لێوار لە حەوز ماونەتەوە، کە ئەمەش کافی نییە بۆ دیاریکردنی رەگەز، لەبەرئەوە پشت بە قەبارەی ئێسکەکانی سەروو پەلەکان دەبەستین.

کەللە سەری شانەدەری (٥) بە یەکێک لە گەورەترین ئەو کەللە سەرانەی مرۆڤی نیاندرتاڵ دادەنرێ کە تا ئێستا ناسراون، کە تەنیا کەوانی لووتی یەکسانە لەگەڵ (عامود)، کە گەورە لە هی شانەدەری (١) و سەرجەم نیاندرتاڵەکانی ئەورووپا، زۆربەی ئێسکەکانی کەللەی سەری گەورەترە لە بەشەکانی ئێسکەکانی منازر (المناظرة) لە سەرجەم کەللە سەری نیاندرتاڵە ناسراوەکان. لە راستیدا ئێسکانی واهەن کە سیفاتی نێرینە دەدەن، بەڵام لەهەمان کاتدا سیفاتی مێینەش دەدەن، بەڵام بەپشت بەستن بە دووری ئێسکەکانی برِبرِە و ئێسکی ران و قامیش دەتوانرێ شانەدەری (٥) بە نێرینە دابنرێ.

بروانە خشتەی ژمارە (٦)

**شانەدەری (٦):**

بەشەکانی ئەم ئێسکە پەیکەرە لەرۆژی (١٩٦٠/٨/٩ز) دۆزراونەتەوە، کە دۆزینەوەی ئەم ئێسکە پەیکەرە لە دۆخێکی ئاڵۆزدا بووە لەبەرئەوەی ئێسکەکانی لەگەڵ ئێسکەکانی ئێسکە پەیکەری شانەدەری (٤) و شانەدەری (٨)ی پێگەیبو و شانەدەری (٩) منداڵدا تێکەڵ بووبوو.

ستیوارت توانی ئێسکەکانی کەسێکی بچووک لەژێر ئێسکەکانی شانەدەری (٤) کە لەو شانەدەرە بچووکتر بووە دیاری بکات لەبەرئەوەی لەم کاتەدا ئێسکە پەیکەرێکی تر لە سەرووی ئاستی شانەدەری (٤) دۆزرایەوە کە بە شانەدەری (٥) ناونرا، هەر لەبەر ئەوە ئەم ئێسکە پەیکەرە بە شانەدەری (٦) ناونرا، کە ئێسکەکانی لە مۆزەخانەی عیراق لە تاقیگەدا لە کوتلەیەکی گڵدا دەرهێنران، وادەرکەوت کە ئەم ئێسکە پەیکەرە بەهەمان شێوازی ئێسکە پەیکەری شانەدەری (٤)

| ئێسکەکانی کەللەی سەر | ژمارەیان | ئێسکەکانی قەد | ژمارەیان | ئێسکەکانی پەلەکانی سەروو | ژمارەیان | ئێسکەکانی پەلەکانی خواروو | ژمارەیان |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| کاسە | | بڕبڕەکانی مل | ١ | دەفەی شان | | ئێسکی حەوز | |
| ددانەکانی شەویلگەی سەروو | ٢ | پەراسووەکان | ٨ | کەوەرەی ڕاست | | ران | |
| | | | | زەند | | کلاوە چۆك | |
| | | | | ئێسکەکانی جومگەی دەست | ٢ | لاقی چەپ | |
| | | | | پەنجە نزیکەکان | ٢ | تەنەزم (قامیش)ی چەپ | |
| | | | | پەنجەکانی ناوەند | ٢ | | |
| | | | | پەنجە دوورەکان | ٢ | | |
| | | | | مەچەك | ٢ | | |

**خشتەی ژمارە (٦)**

**سەرژمێری ئەو ئێسکانەی لەکاتی هەڵکۆڵین لە شانەدەری (٥) دۆزراونەتەوە**

ئێژراوە، کە لەسەر لای چەپی درێژ کراوە کە هەندێ بەشی بە ئاڕاستەی باشووری خۆرئاوایە لە دۆخێکی شێوە نووشتاوە لەژێر شانەدەری (٤).

زۆربەی پاشماوەکانی ئێسکی ئەم ئێسکە پەیکەرە لەبارێکی باشدایە کە لە ئێسکەکانی شانەدەری (٤) باشترە سەرەڕای ئەوەی کە هەندێ بەشی ئێسکە درێژەکانی نەماون، هەندێ ئێسکی ئەم ئێسکە پەیکەرە لە سەرەتادا درابوون بە شانەدەری (٤) بە تایبەتیش ددانەکان و ئێسکی ران، بەڵام دوای ئەنجامدانی شیکاری و بەراوردکردن لەنێوان بەشەکانی ئێسکەکانی کە بەهۆیەوە توانرا ئەم پارچە ئێسکانە دیاری بکرێن بەوەی کە بەشێکن لە ئێسکە پەیکەری شانەدەری (٦)، بەهۆی بچووکی شانەدەری (٦) کە بەتەمەن لە شانەدەری (٤) بچووکترە کە ئەمەش کارئاسانی کردووە بۆ گێڕانەوەی ئێسکەکان بۆی، لەو ئێسکانەش ددانەکانی شەویلگەی سەروو، (٥) ددانی شەویلگەی خواروو و زۆربەی ئێسکەکانی پەلەکانی سەروو دەست و ئێسکی کەلەکە و ئێسکەکانی پەلەکانی خواروو بێ. خشتەی ژمارە (٧).

لەو ددانانەی کە ماون وا دەردەکەوێ کە ئەمە گەنجێکی پێگەیوە لە تەمەندا و ناوکەوتوونییە کە ئەمە لە پاشماوەی ئێسکەکانی تر دەردەکەوێ لە جومگەکانی پەلەکانی سەروو و خوارەوە هەروەها وادەردەکەوێ کە ئەوە دانەڕێژراوە و جومگەکانیشی دەرکەوتوون، هەموو بەڵگەکان ئاماژە بەوە دەکەن کە ئەمە لە مرۆڤی شانەدەری (٢) بەتەمەن گەورەتر بێ، کە لە سەرەتای بیستەکانی تەمەنیدا بووە کە مردووە، لەبەرئەوە لەوانەیە تەمەنی مرۆڤی شانەدەری (٦)

| ئێسکەکانی کەللەی سەر | ژمارەیان | ئێسکەکانی قەد | ژمارەیان | ئێسکەکانی پەلەکانی سەرەوە | ژمارەیان | ئێسکەکانی پەلەکانی خوارەوە | ژمارەیان |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| کاسە ددانەکانی شەویلگەی خواروو | ٥ | ئێسکی سنگ برِبرِەکانی سێ بەندە | | بازوو کەوەرە | | ئێسکی حەوز ران | |
| ددانەکانی شەویلگەی سەروو | ١١ | | | زەند | | کلاوەچۆکی راست | |
| | | | | ئێسکەکانی جومگەی دەست | ٢ | لاق | |
| | | | | ئێسکەکانی مەچەك | ٥ | تەنەزم (قامیش) | |
| | | | | پەنجەکانی ناوەند | ٤ | ئێسکەکانی جومگەی پێشەوە | ٢ |
| | | | | پەنجە دوورەکان | ٢ | ئێسکەکانی مەچەکی پێ | ٤ |
| | | | | | | پەنجە دوورەکان | ١ |

**خشتەی ژمارە (٧)**

**سەرژمێری ئێسکە دۆزراوەکانی شانەدەری (٦) لە هەڵکۆڵێندا**

بیست و پێنج ساڵان بوویێ کاتێ مردووە.

بەڵام بۆ دیاریکردنی رەگەزەکەی پشت بەقەبارەی ئێسکەکانی تر دەبەستین وەک هەموو نیاندرتاڵەکانی تر، شانەدەری (٦) تاکە شانەدەرە کە درێژایی هەر چوار پەلەکان و دووری جومگەکانمان دەداتێ. کە ئێسکی ران و لاقی کورتترە لە ئێسکەکانی پەلەکانی خواروو لە نیاندرتاڵەکانی تر و ئێسکی بازوو کەوەر یان تۆزێ درێژترە لە نیاندرتاڵی رۆژهەڵاتی ئەوروپا، لەژێر هەمان دووری ئێسکەکانی نێرینەی نیاندرتاڵ بەپشت بەستن بەم زانیارییانە وا داندراوە کە شانەدەری (٦) مێینەیە. بروانە خشتەی ژمارە (٧)

**شانەدەری (٧):**

ئەوە یەکەم ئێسکە پەیکەری مرۆڤی نیاندرتاڵە کە لە هەرێمی کوردستانی عێراق و عێراقدا دۆزراوەتەوە لە بەرواری (٢٢/٦/١٩٥٣ز) لە سەرەتادا کەللە سەری دۆزراوەتەوە لەدواییدا هەڵکۆڵ توانی پاشماوەی ئێسکەکانی ئێسکە پەیکەرەکە بدۆزێتەوە، وادەرکەوت کە ئەم ئێسکە پەیکەرە هی منداڵێکی شیرەخۆرەیە، کە لەقووڵایی (٨،٧٨م) لە ئاستی زەوی ئەشکەوتەکە لە چوار گۆشەی (ب٦) لەنیوەی چینی D موستیری، تۆزێ لە

سەرووی چینی ئەستەلکمایت و لەژێر ئاستی گۆڕستانە بەکۆمەڵەکە کە ئێسکە پەیکەرەکانی شانەدەری (٩،٨،٦،٤)ی تێدا دۆزراوەتەوە کە ئەمەش کۆنترین ئێسکە پەیکەری دۆزراوەی شانەدەرە.

ئێسکە پەیکەرەکە لەسەر لای راستییەو لە دۆخێکی چەماوەیە، زۆربەی ئێسکەکانی وردبوون، بەڵام وردبوونیان زۆربەی ئێسکەکان ماون و تواندراوە بە تەواوەتی بەهۆی هەڵکۆڵینەوە بهێنرێنە دەرێ، ئێسکەکانی ئەم ئێسکە پەیکەرەش لەلایەن (SENYUREK) لە زانکۆی ئەنقەرە لێیان کۆڵدراوەتەوە و لە گۆڤاری (ANATOLIA)ش بڵاوکراوەتەوە. بۆ دیاریکردنی تەمەنی شانەدەری (٧) بەشێوەیەکی ورد، زۆربەی بەشەکانی ئێسکە پەیکەرەکە ئاماژە بەوە دەکەن کە ئەمە هی منداڵێکی شیرەخۆرەیە، بەتایبەتی ددانەکانی شیری کە ناتەواون و کە ئەوەش جەخت لەوە دەکاتەوە کە تاجی برِبڕەکانی شیری تەواون و هەروەها تاجی خڕینەکانی شیری یەکەم و دووەم بەتەواوی هاتوونەتە دەرێ، بەڵام ریشاڵەکان تا قووڵایی ریشەکە پێکهاتوون، تاجی کرکراگەیی بۆڕی شیری تەواوە، بەڵام هیچ بەڵگەیەک لەسەر هەبوونی ریشاڵەکان نییە، تاجی خڕینەی شیری دووەم لە سێ چارەک پێکهاتووە بەبێ رەگ. لەبەرئەوە بارودۆخی ددانەکان وای دەردەخەن کە تەمەنی ئەم منداڵە نزیکەی نۆ مانگە.

بەڵام ناتوانرێ رەگەزی شانەدەری (٧) دیاری بکرێ بە شێوەیەکی ورد چونکە تەمەنەکەی زۆر بچووکە و ئێسکەکانیش تایبەتمەندی نێرومێ نابەخشن.

**شانەدەری (٨):**

لەکاتی دەرهێنانی ئێسکەکانی شانەدەری (٦،٤) لە (٤-١٦/٨/١٩٦٠ز)، هەندێ ئێسکی تر کۆکرایەوە و لەگەڵ ئێسکەکانی تر لە مۆزەخانەی عێراق لە بەغداد دانران(١). لە کاتی لێکۆڵینەوە لە ئێسکەکانی شانەدەری (٦،٤) لەلایەن ستیوارت لە ساڵی (١٩٦٢ز)، هەستی بەوە کرد کە لەناویاندا ئێسکی قەبارە بچووک هەیە کە بەشانەدەری (٧)ی ناونا لەو کاتدا، بەڵام دوای ئەوەی ئێسکە پەیکەری منداڵی شانەدەر هاتە ناو کایەکەوە لە چوارچێوەی ئێسکە پەیکەرەکاندا ئەم ئێسکە پەیکەرە نوێیەیان بە شانەدەری (٨) ژمارە کرد.

باسکردنی ئێسکە پەیکەری شانەدەری (٨) زەحمەتە لەبەر کەمی دۆزراوەکانی ئەم ئێسکە پەیکەرە جگە لە ئێسکی زروقی لە ئێسکەکانی جومگەی دەست و ئێسکەکانی پێ.

| ئێسکەکانی کەللەی سەر | ژمارەیان | ئێسکەکانی قەد | ژمارەیان | ئێسکەکانی پەلەکانی سەروو | ژمارەیان | ئێسکەکانی پەلەکانی خواروو | ژمارەیان |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| کاسە | | | | بازوو | | تەلەزم (قامیش) | |
| | | | | کەوەرەی راست | | تەلەزم (قامیش) | ١ |
| | | | | ئێسکەکانی جومگەی دەست | ١ | ئێسکەکانی مەچەکی پێ | ٦ |
| | | | | | | ئێسکەکانی سمسمی | ١ |
| | | | | | | پەنجە نزیکەکان | ٤ |
| | | | | | | پەنجەکانی ناوەند | ١ |

**خشتەی ژمارە (٩)**

**سەرژمێری ئەو ئێسکانەی لە شانەدەری (٨) دۆزراونەتەوە**

| ئێسکەکانی کەللەی سەر | ژمارەیان | ئێسکەکانی قەد | ژمارەیان | ئێسکەکانی پەلی سەروو | ژمارەیان | ئێسکەکانی پەلی خواروو | ژمارەیان |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | | بڕبڕەکانی مل | ٢ | | | | |
| | | بڕبڕەکانی سنگ | ٦ | | | | |

**خشتەی ژمارە (١٠)**

**سەرژمێری ئەو ئێسکانەی لەمیانەی هەڵکۆڵین لە شانەدەری (٩) دۆزراونەتەوە**

ناتوانرێ بەشێوەیەکی ورد تەمەنی شانەدەری (٨) دیاری بکرێ بەهۆی کەمی ئێسکە دۆزراوەکانی، بەڵام لە ئێسکەکانییەوە وا دەردەکەوێ کە ئەو بریندار نەبووە و جومگەکانیشی دەرکەوتووە، کە ئەمەش ئەو بەڵگەیەمان دەداتێ کە ئەوکەسە لەکاتێ کە مردووە گەنج بووە.

هەندێ ئێسکی شانەدەری (٨) ماون کە زانیاری بەسوودمان دەدەنێ لەسەر دیاریکردنی رەگەزەکەی، لەوانەش بەشەکانی کەللەی سەر، بەڵام هیچ ئێسکێکی حەوز یان ددان نەماوە، یان نەبوونی ئێسکەکانی تەواو درێژ کە ئەوە بەسە بۆ زانینی درێژییەکەی، بەڵام دەتوانرێ تیرەی سەرە ئێسکی کەوەرەو درێژی مەچەکی پێ بەهەمان درێژی ئێسکەکانی نیاندرتاڵانی تر بەراورد بکرێ.

تیرەی سەرە ئێسکی کەوەرەی شانەدەری (٨) زۆر نزیکە لەحەدی خوارووی ماوەی تیرەی مێینەی نیاندرتاڵ و کەمترە لە نێرینەی نیاندرتاڵ وەک شانەدەری (٣،١) لە شانەدەری (٦)یش نزیکە، هەروەها درێژی مەچەکی پێی شانەدەری (٨) یەکسانە بە درێژی مەچەکی مێینەی نیاندرتاڵ و لەوانەش شانەدەری (٦) و تابوون C1 و کەمترە لە نێرینەی نیاندرتاڵ وەک شانەدەری (١)، لەو دوو بەراوردەی پێشەوە ئەوە دەردەکەوێ کە شانەدەری (٨) مێیینەیە.

بڕوانە خشتەی ژمارە (٩)

**شانەدەری (٩):**

شانەدەری (٩) بەدووەم منداڵی نیاندرتاڵ دادەنرێ کە لە ئەشکەوتی شانەدەر دۆزراوەتەوە، هەندێ بەشی ئێسکەکانی لە هەمان ئەو ناوچەیە دۆزراوەتەوە کە ئێسکە پەیکەرەکانی شانەدەری (٤،٦،٨)ی تێدا دۆزراوەتەوە لە مانگی ئابی ساڵی (١٩٦٠ز) کە بە پێنجەمین ئێسکە پەیکەر دادەندرێ کە لەو وەرزەدا دۆزراوەتەوە، ئەوە چوارەم ئێسکە پەیکەرە کە لەهەمان شوێن لە گۆڕێکی بەکۆمەڵدا دۆزراوەتەوە، بەهۆی بچووکی بەشەکانی ئێسکی هەڵکۆڵ توانیویە ئێسکەکانی جیا بکاتەوە، کە ژمارەیان زۆر کەمە لە نۆ بڕبڕە پێکهاتووە، سێ بڕبڕدیان هی ملن کە ئەوانیش بڕبڕەکانی (پێنجەم و شەشەم و حەوتەم)ن، لەگەڵ شەش بڕبڕەی سنگ لە بڕبڕەی (یەکەمەوە تا شەشەم)، خشتەی ژمارە (١٠).

لە پاشماوەی نۆ بڕبڕەکە وا دەردەکەوێ کە ئەو کەسە منداڵێکی شیرەخۆرە بێ، بەڵام سەبارەت بە دیاریکردنی تەمەنەکەی کە کەوانی عەسەبی بڕبڕەکانی مل و سنگی سەر و یەکگرتوون یان نووساون بە پشتەوە کە ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە تەمەنی ئەم منداڵە لە نیوەی کۆتایی ساڵی یەکەمیدا بووە.

بەڵام سەبارەت بە رەگەزی شانەدەری (٩) ناتوانرێ رەگەزی منداڵی شیرەخۆرە تەنیا لە رێگای چەند بڕبڕەیەکەوە دیاری بکرێ.

بڕوانە خشتەی ژمارە (١٠)

(١)- ئەم نووسینە کورتکراوەی نامەی ماستەری ئەیهان محەمەد قادر ئامێدییە، کە بە زمانی عەرەبی، لە بەشی شوێنەواری کۆلیژی ئادابی زانکۆی سەلاحەددین لە ساڵی ٢٠٠٧ وەرگیراوە.

و: ئەردەلان عوسمان حەسەن

# مرۆڤی نیاندرتال (٤) لە ئەشکەوتی شانەدەر

ئارلیت لوروا - گورهان

لەمیانەی ئەو پشکنینانەش ١٦ مێژوو دیاری کرا بە هۆی کاربۆن ١٤، لەگەڵ دەستنیشانکردنی پیشەسازییە جۆر بە جۆرەکان بەگوێرەی بەدوایەکداهاتنیان (لە چوارچێوەی چەرخی بەستەڵەکی چوارەم). لەم بارەوە زۆر بڵاوکراوەی تایبەت بەزانیاری پشکنینەکان چاپ کراوە، بەتایبەتی لەسەر پەیکەرە ئێسکانەکان. چەند نموونەیەکی پاشماوە ئەندامییەکان گەیشتە لامان بەمەبەستی شیکردنەوەی وردی سپۆرە رووەکییەکان (pollens).

وێڕای کەمی ئەو جۆرە سپۆرانە لە چینەکانی شانەدەر و قورسی لێکۆڵینەوەی چینەکانی زاوی چەمی، توانرا هەندێ زانیاری لە بارەی کەش و هەوا بەدەست بهێنێت (سولیکی- لوروا- گورهان، ١٩٦١). لەگەڵ ئەوەشدا بەرامبەر ئەو ئەنجامە ناتەواوانە، ئەستەمی گەیشتن و شیکردنەوەی کۆتایی، لێکۆڵینەوەی تەواومان بڵاونەکردەوە بە ئومێدی دەستکەوتنی بەڵگەی نوێ لەم بارەوە پێشتر پێمان وابوو شوێنێکی تر هەیە لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاست، کە هەمان بەدوایەکهاتنی زەمەنی تێدابێت، بەڵام سپۆرە رووەکییەکانی زیاتر بێت، ئەو کاتەش دۆخی کارکردن باشتر دەبێت، بەڵام بەداخەوە لە ماوەی دە ساڵدا ئەوە بەدیار نەکەوت، لە کاتێکدا کۆمەڵەی نوێی سپۆرە رووەکییەکان زیاتر بوو، هەروەها رێگاکانی ئامادەکردن پێشکەوت، سپۆرەکانی شانەدەر و زاوی چەمی بەتەنیا مایەوە لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا، کە پەیوەندی بە پیشەسازی چەرخی بەردینی کۆن (Paleolithic) هەبێت، بەم جۆرە بڕیارماندا تاقیکردنەوەیەکی نوێ بکەین. ئەشکەوتی شانەدەر لە ١٤ مەتری چینی شوێنەواری پێک دێت، ٨ مەتری بۆ ماوەی موستیری دەگەڕێتەوە، لەو تایبەتە بە چەرخی بەردینی کۆن، کە لەم شوێنە پێی دەگوترێت چاخی (برادوستی)، لە سەرووی هەموو ئەوانەش چینەکانی چەرخی بەردینی ناوەند و پێش چەرخی بەردینی نوێ بەدیار دەکەوێت پاشان تێکەڵاوێکی بەردەوام، کە چەرخی بەردینی نوێ بە چەرخی ئێستا دەبەسترێتەوە. ئەو بە دوای یەکدا هاتنە رێک و جوانە وای لێکردین، کە ئامادەکردنێکی نوێ، هەموو ئەو نموونانەی بە دەستەوە بدەین. هەندێ لەو نموونانەش بێ کەڵکن زۆربەی ئەوانی تریش کەڵکی کەمیان هەیە، بەڵام هەمووی زیاتر لە ٣٠ نموونەی کۆکراوە لە شوێنی جیاجیا، کە تێکڕای بەرزی بڕگەیەکی شانەدەر دەگرێتەوە.

سەبارەت بە ئامادەکردنە نوێیەکان، کە لەگەڵ ئەنجامەکانی پێشوو بەراورد کرا، هەروەها لەگەڵ هەندێ شیکردنەوەی دیکەی تایبەت بە دەنکە خورما، ئەوانە پشتگوێ خران بەهۆی نەبوونی بەڵگەی پێویست. پاشانیش زانیاری دی لەسەر ئەو مەسەلەیە بڵاو دەکرێتەوە، بەڵام لەم لێکۆڵینەوەدا مەسەلەکە پەیوەندی بە ئەنجامێکە کە هەرگیز چاوەڕوان نەدەکرا.

ئەشکەوتی شانەدەر زۆر گەورەیە (پانی ٥٣ مەترە، قووڵایی ٤٠ مەترە)، ئەو پشکنینانەی تێیدا کراوە تەنها یەک لەدەی رووبەرەکەی گرتۆتەوە، ئەو پارچە بەردە گەورانەی لە ناویدا کەوتبوو کارکردنی یەکجار قورستر کردبوو، بۆیە پرۆفیسۆر سولیکی جێگای رێزە، چونکە سەرەڕای ئەو گرفتانە توانی نموونەکان کۆبکاتەوە ئەوەش یەکجار گرنگە بۆ لێکۆڵینەوەکە.

ئەو ئەنجامانەی تایبەتن بە

رووەکە لێکچووەکان لە نێوان یەکتردا لە برگەیەکی بە دوای یەکدا هاتنی زەمەنی، کە سەردەمەکە دەگەڕێتەوە بۆ چەرخی بەردینی کۆن لە سەرەوەی تاوەکو خوارەوەی لەگەڵ بوونی چەند خاڵێکی شێدار، کە ئاماژەیە بە هەبوونی دار و درەخت بەشێوەیەکی تایبەت.

پێویستە ئەوە بگوترێ کە نارێکییەکی بچووک لە (گیا لێکچووەکان) هەیە، بەڵام کۆمەڵەی گشتی بەیەکەوە بەندن لەگەڵ ئەوەشدا لە سەرەتادا دوو نموونە بە وەسفی تایبەت جیا کراوەیەوە. ئەویش ئەوەیە رووەکەکان هەمان رووەکی جێگای ترە، بەڵام دەکرێ بەراوردی جۆری بەبەردبوونی بکرێت و رێژەی ژمارەکانیش زۆر جیاوازە لەگەڵ نموونەکانی تر. یەکەم جاریش وا بە دیارکەوت، کە ئەو سپۆرە رووەکییانە بە شێوەیەکی رەمەکی نەگەیشتۆتە قووڵایی زەوی، بەڵکو بەشێوەی تۆو دانراوە. هەندێکیان تاوەکو ئێستا بەیەکەوە بەندن، بە هەندێ ئامادەکراوەکانیش بەتەواوی هەندێ لەو کیسانەی سپۆرە رووەکییەکانی لێ دەڕوێت بەدیار دەکەوێت، هەشت جۆر رووەکی جیاجیا بەلایەنی کەم بۆ ئەو کۆمەڵەیە دەگەڕێتەوە. لێرەدا پرسیارێک سەر هەڵدەدات ئەویش چۆن ئەو نەمامانە بۆ قووڵایی ١٥ مەتر چوونەتە ناو خاکی ئەشکەوتەکە؟

ناتوانرێت هۆکارەکە بۆ کرداری باڵندە یاخود ئاژەڵی دی یان پاشماوە بەردبووەکان بگەڕێنینەوە، بۆیە تەنها بیر لە مرۆڤ دەکرێتەوە کە توانیویەتی ئەو کردارانە بکات.

مەبەستیش لە لێکۆڵینەوەکە دوو خاڵ بوو: دیاری تەواوی شوێنی نموونەکان لەگەڵ شیکردنەوەی رووەکی بەشێوەیەکی زانستییانە، هەردوو نموونەش دەگەڕێتەوە بۆ کۆمەڵێک، کە لە شەش بەش پێک بێت لە (نیاندرتال ٤).

تاوەکو ئێستاش هەشت پەیکەری ئێسکی نیاندرتال لە شانەدەر دۆزراوەتەوە بە بەرزایی جیا جیا لە چینە موستیریەکاندا. ئاستەکانی ٣.٥.١ نزیک لە بەرزترین چین بەگوێرەی کاربۆن ١٤ تەمەنەکەی بە (٤٤٠٠٠ ساڵ پ.ز) دیاری دەکرێت، بەڵام مرۆڤی نیاندرتال ٤ و نیاندرتال ٦ کۆنترین و بەدوو مەتریش لە شوێنەکەدا قووڵترن.

ئەو بیردۆزەی دەڵێ: نیاندرتاڵەکان دانیشتووی ئەشکەوتی شانەدەر بەهۆی زەمین لەرزەیەک کە بۆتە هۆی دارمانی بەرد مردوون لەلایەن، (ئار. سولیکی) بانگێشتی بۆ کرد، بەڵام دوای ماوەیەک چەند گۆڕێک دۆزرایەوە، کە بە بەرد داپۆشرابوون لەگەڵ چەند ئامێر و ئێسکی ئاژەڵ تەنانەت هەندێ رەژووی داریشی لەگەڵدا بوو، ئەو ئێسکە پەیکەرانەی گەورەن لەناو بازنەیەک جێگیر دەبێت، کە دەوروبەری بەردە، ئەوەش بەتەواوی لەسەر نیاندرتال (٤) بەدیار دەکەوێت، لە نێوان ئەو ئێسکە بچووکانەی کە ناوی (ئێسکی ئاژەڵی) لێ نراوە لە پاشماوەی منداڵێکی گچکە و پاشماوەی چەند ئێسکانێک دۆزراوەتەوە، کە مەزەندە دەکرێت نیاندرتال ٦ بێت، کە ئەویش بە تەواوی نەدۆزراوەتەوە. شێوازی ئەو گۆڕەش (ئار. سولیکی نیگەران کرد، کە چەندین نموونەی لێ وەرگرت. پەیکەرە ئێسکانەش لەنێو خاکێکی قاوەیی تۆخە، کە بریتییە لە قوڕێکی توند، لەهەمان کاتدا ئەو چینەی دەورەی ئێسکانەکەی داوە بریتییە لە خاکێکی رەنگ کاڵتر.

بەگوێرەی شیکردنەوەی تایبەت بەسپۆرەکان، کە لەسەر سێ نموونەی خۆڵی بەشی سەرەوە ئەنجامدرا هیچ جیاوازییەکی دیار لەنێوان چینەکان و لە سەرەوە و ژێرەوە دەرنەکەوت. ئەو نموونانەش یەکەمیان نموونەی ژمارە (٣١٥)یە کە لەناو قوڕتێکی دەرەوەی گۆڕەکە وەرگیرا، پاشان نموونەکانی ژمارە (٢٧١) و (٣٢٦) ئەوەی دووەمیش لە خاڵێکی ناوەندی سەر رووی پەیکەری ئێسکانەکەوە گیراوە، بەڵام نموونەی ژمارە (٣٢٦) لە خاڵێکی دوورتر بەرەو رۆژهەڵات لەهەمان ئاست وەرگیراوە، پێشتریش ئەو پاشماوانەی کە نموونەکانی لێ پێک دەهات لەسەر رووی تەرمەکە کۆبێوەوە و ئێسکانەکەی داپۆشیبوو.

ئەو دوو نموونەی تۆوی زۆری تێدا بوو نموونەی ژمارە (٣١٣) و نموونەی ژمارە (٣١٤)، کە لە هەمان ئاستی جێگیربوونی پەیکەرە ئێسکان لە چینێکی قاوەیی تۆخ وەرگیرابوو.

هەروەها نموونەیەکی سێیەم (ژمارە ٣٠٤) هەرچەندە وەکو ئەوانی تر نییە، بەڵام تۆوی رووەک و گوڵ تێدایە، بەتایبەتی لە جۆری ژمارە (٣١٣). دوورییەکەشی لە ٢٥سم زیاتر نەبوو، بەڵام دوو نموونەکەی تر دەکەوێتە دوو لای تەرمەکە بۆ ٦٨سم لەیەکتر دوورن.

هەندێ لە رووەکەکان کە دۆزراونەوە تەنها قەدێکی کورتیان هەبوو، بۆیە دەبوایە چەند توخمێک هەبێت بۆ ئەو جۆرانە تاوەکو تۆوەکەی کۆ ببنەوە و کۆمەڵێ سپۆر لە شوێنەکە دروست بکەن.

ئەو خاکە شێدارە نزیکەی ئاسۆ (بنمیچێکی بەردی خوار بۆوە) یاخود (ستالاکمایت)، بریتییە لە چەند بەشێکی رووەکی، کە دەتوانرێت بناسرێت، ئەویش چەند پارچەیەکی گچکەی دار لەوانەیە سنۆبەر بێت.

ئەو نموونانەش بەزۆری لە جۆرەکانی سەردەمی موستیری دیار دەکەوێت، بەڵام زۆربوونی لێرەدا دەگەڕێتەوە بۆ سەرچاوەیەکی گرنگ یاخود تایبەتمەندییەکانی زەوی بۆ پاراستنی.

هەبوونی رێژەیەک لە رووەکەکان لە ژێر پاشماوەکانی مرۆڤی نیاندرتال (٤)، لەگەڵ بوونی پاشماوەی منداڵێکی گچکە وای کرد، کە قووڵ بوونەوە لە لێکۆڵینەوەی شیکردنەوەی رووەکی سوودبەخش بێت.

ئەو کردارەش ئەنجامدانی ئاسانە بەهۆی بوونی ژمارەیەکی زۆر سپۆرە رووەکییەکان، کە ژمارەی ئامادەکراوی لە هەزار زیاتر بوو. ئەو لێکۆڵینەوە بە پێزەش لەلایەن دکتۆر (دەبلیو. فان تسایت) ئەنجامدرا، زانیارییەکانیشی لە بواری کشتوکاڵیدا لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا یارمەتی ئەوەی دا لە (گرونگن) بگاتە شیکردنەوەی تایبەت بەو جۆرە سەردکییانەی لەسەر شێوەی نەمام دۆزراونەتەوە، ئەوانیش:-

- ئەخیلیا- یان حزنیل- یان هەزار گەڵایی (جۆری رووەکی ئەشیلیا).
- بابونج- نەمامەکەی رەنگی زەردە.
- قەنتەرییەکان- یان عرتب- پێی دەگوترێت (شێخی بەهار) بەهۆی زۆری.
- زنبق یاخود سومنی گچکە (جۆری مسکاری)، نەمامەکەی رەنگی شینە.

ئەو رووەکانەش نەمامی گچکەی رەنگ بریقەداریان هەیە، ئەوەش جیاوازە لەگەڵ جۆری شەشەم، کە بریتییە لە (ئیفیدرا- مانای ترێی دەریایە) نەمامەکەشی زۆر گچکەیە و زۆریش گرگ نییە هەروەها زۆر ئەستەمە بیروڕا یاخود شیکردنەوەی دیار سەبارەت بەهۆی هەبوونی لەم شوێنەدا، بەڵام دەتوانرێت بگوترێت کە سەرچاوەکەی، کە شوێنێکی تایبەتە بە ئاژەڵ، ئەوەی ئەو رایەش دەسەلمێنێ بوونی قەدی زۆر و خواربۆوەیە. هەروەها سپۆری رووەکی دوو جۆری تر نەتوانرا دیاری بکرێت، پێویستە ئاماژە بە هەبوونی ژمارەیەکی زۆری سپۆری maluacees بکرێت وێڕای ئەوەی رەگەزەکە ناگەڕێتەوە بۆ کۆمەڵەی، بەڵکو دەگەڕێتەوە بۆ گوڵی (القنب) یان (الزوان).

ئەو رووەکە جیاجیایانەی لەسەرەوە باس کرا تاوەکو ئێستاش لە چیاکانی زاگرۆس لە دوو مانگی مایس و حوزەیران دەڕوێن، بەڵام دەبێ ئەوە بزانین، کە جیاوازییەکی کەش و هەوا هەبوو لە میانی چەرخی بەستەڵەکی، بەتایبەتی سەبارەت بە بەرزایی ئەشکەوتەکە، کە دەگاتە ٨٢٢ مەتر.

دەبێ بڕواشمان بەوردی ئەنجامەکانی کاربۆن ١٤ هەبێت لەگەڵ راستی سپۆرە رووەکییەکان. هەروەها بەوەی کە مرۆڤی نیاندرتاڵ ٤ لە ئەشکەوتی شانەدەر لە گۆڕ نراوە بەر لە پەنجا هەزار ساڵ لەمەوبەر لە نێوان کۆتایی مانگی مایس و سەرەتای مانگی تەمموز.

### سەرچاوەکان

١- سوليكي أر. أس (١٩٦٠)، ثلاثة هياكل عظمية لاناس بالغين من كهف شاندر- شمال عراق، التقرير ألسنوي لمعهد سمث سونيا (١٩٥٩ ص٦٠٣-٦٣٥).
٢- سوليكي أر. أس (بالاشتراك مع لوروا گورهان أرليت ١٩٦٠)، ألباليو كليماتولوجي أو دراسات المناخية للعصر الحجري القديم في الشرق الاوسط التقرير السنوي لاكاديمية نيويورك المجلد ٩٥ ص٧٢٩-٧٣٩.
٣- سوليكي أر. أس (١٩٦١)، أكتشافات أنثروبولوجية جديدة في شاندر، أكاديمية نيويورك، السلسلة الثانية، المجلد ٢٣ ص٦٨١-٦٩٩.
٤- سوليكي أر. أس (١٩٦٣)، التاريخ في وادي شاندر، شمال عراق مجلة العلم الامريكية، المجلد ١٣٩، العدد ١٥٥١ ص١٧٩-١٩٣.
* نشرة الجمعية القبتاريخية الفرنسية، العدد ٣ آذار ١٩٩٨، باريس.

و: یوسف ئەحمەد



# مرۆڤی ئەشکەوتی شانەدەر و گوڵ

وەرگێڕان و ئامادەکردنی: عومەر ڕەسول

بۆ یەکەمجار لە ئەپریلی ساڵی ١٩٥٧دا شوێنەوارناسی ئەمریکی دکتۆر ڕاڵف سۆلسکی **ralph solecki** گەتێکی بە کوردستان بە گشتی و ئەشکەوتی شانەدەر بە تایبەتی کرد (وێنەی ژمارە ١) لە ئەنجامی گەشتەکەیدا دکتۆر ڕاڵف پاشماوەی "٩" مرۆڤی نیاندەرتاڵی لە ئەشکەوتی شانەدەردا دۆزییەوە، کە دووانیان زۆر گرنگ و جێی بایەخ بوون لەلای و یەکێکیانی لە قووڵایی ٧ مەتر و ئەویتریانی لە قووڵایی ٥ مەتر دۆزیەوە.

پاشماوەی یەکێک لەو دوو مرۆڤە پیاوێکی تەمەن ٤٠ ساڵ بووە "وێنەی ژمارە ٢" کە دەستێکی شکێنراو و چاوی چەپی کوێر بووە و لای چەپی زیانی پێگەیشتووە لەگەڵ پەراسووی لای چەپی و ئەوەشی گەڕاندۆتەوە بۆ ئەوەی کە لەوانەیە بەردی ئەشکەوتەکە کەوتبێت بەسەریداو وادیارە کە هەر لە ئەشکەوتەکەدا جێنشین بووبێت و نەچووبێتە دەرەوە بۆ ڕاوکردن و پێدەچێت ئەو مرۆڤانە لە خوارووی ئەفریقیاوە هاتبن و لە ئەشکەوتی شانەدەردا جێنشین بووبن، کە مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ "٦٠٠٠٠" ساڵ لەمەوبەر "وێنەی ژمارە ٣ و ٤".

پاش شیکردنەوەو لێکۆڵینەوەی ئەو شتانەی لەچوار دەوری پاشماوەی لاشەکەدا دۆزرانەوە لە تاقیگە و لەژێر میکرۆسکۆپدا دکتۆر ڕاڵف بۆی دەرکەوت ئەو جۆرە مرۆڤانە هەشت جۆر گوڵیان بەکارهێناوە بۆ لەگۆڕنانی مردووەکانیان و ئەو مرۆڤانە ڕاخەری گوڵینیان بۆ مردووەکانیان ڕاختووە و بەگوڵیش دایانپۆشیون.

جێی بایەخە ئەو هەشت جۆر گوڵە کە (گوڵی چەق چەق، گوڵەگەنم، پتازین دۆرگ، بێژنە بۆژنە، ملەوێچە، هێرۆ، گیا مایەسیری، گوڵەگەنمی سوور) "وێنەی ژمارە ٥" هەمان ئەو گوڵانەن کە بۆ دەرمانسازی و چارەسەرکردنی





نەخۆشییەکانیان بەکارهاتووە. لێکۆڵەرەوەکان دەڵێن سەرسامین بەرامبەر بە باسکردنی رادەی هوشیاری ئەو مرۆڤانە کە لەو سەردەمەدا ئەوەندە وریا بوون توانیویانە گوڵ بەکاربهێنن بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشی و لەگۆڕنانی مردووەکانیان، پێدەچێت ئەو پیاوە تەمەن ٤٠ ساڵە گەورەی کۆمەڵەکەی بووبێت و شارەزایی لە گوڵناسیدا هەبووبێت و لەوانەشە پزیشک بووبێت و ئەمەش گومان لە ئاستی تێگەیشتندا نییە.

ئەم گوڵانەی کە بوونە سەرچاوەی دەرمانسازی تا ئێستاش دەرمانیان لێ دروست دەکرێت و هەروەها تێبینی ئەوە دەکرێت پەیوەندی رۆحی توند و پتەو هەبووبێت لەنێوان ئەندامانی ئەو کۆمەڵەدا ئەوەش لە ڕێزگرتن و خزمەتکردنی ئەو پیاوە تەمەن ٤٠ ساڵەوە دیارە لەکاتی لەگۆڕنانیدا "وێنەی ژمارە ٦".

شوێنەوارناسێکی تر بەناوی گارگێت "garget" دەڵێت ئەو مرۆڤانەی لە ئەشکەوتی شانەدەردا ژیاون مردووەکانیان بەو شێوەیە نەناشتووە بەڵکو هۆکارەکەی گەڕاندۆتەوە بۆ کاریگەری ئاووهەواو ئاژەڵ کە رۆڵێکی سەرەکیان هەبووە لە کۆکردنەوەی تۆوی گوڵەکاندا لە ئەشکەوتەکەدا، بەڵام وادیارە مەبەستی گارگێت کەمکردنەوەی ئاستی شارەزایی و وریایی مرۆڤی نیاندەرتاڵ بێت، بەڵام شوێنەوارناس "arlette leroi-gourhon" زۆر بە پەلەو لەکاتی خۆیدا وەڵامی دایەوە و وتی جێی داخە کە گارگێت ئەم راوبۆچوونەی هەیە کە دەڵێت ئاووهەواو ئاژەڵ رۆڵی سەرەکیان



هەبووە بەبێ لەبەرچاوگرتنی چۆنیەتی کۆکردنەوەی تەنها ئەو هەشت جۆر گوڵە لە ئەشکەوتەکەداو بەبێ گەڕانەوەی بۆ نووسینێکم لە گۆڤاری "gurrent anthropology" لە ساڵی ۱۹۸۹دا بڵاوکراوەتەوە و دەربارەی ناشتنی مردووی لای مرۆڤی نیاندەرتاڵ بەگشتی و لە ئەشکەوتی شانەدەر بە تایبەتی... لە کۆتاییدا ئەوانەی پەیوەندیان هەبوو بەم بابەتی لێکۆڵینەوەیە گەیشتنە ئەو خاڵەی کە گەشەکردن و گۆڕانی مێشکی مرۆڤ لە ئەشکەوتی شانەدەرەوە دەستی پێکردووە و وشیاری مرۆڤ لەوێوە دەستیپێکردووە، تەنانەت دکتۆر رالف سۆلکی لە یەکێک لە راپۆرتەکانیدا دەڵێت: هەموو شارستانیەت و پێشکەوتنێک لەدەمی ئەشکەوتی شانەدەرەوە هاتۆتە دەرەوە.

لێرەدا نامەوێت درێژە بە هەموو لایەنەکانی ژیانی مرۆڤی نیاندەرتاڵ بدەم بەڵام ئەوەی لەلای من زۆر گرنگە، گرنگیدانە بە شێوەی ناشتنی مردووەکانیان، بزانین تا چ رادەیەک گرنگیان داوە بە مردووەکانیان و چۆنیان ناشتون، ئەوەی شایانی باسەو وەک لێکۆڵەرەوەکان باس لە چەند شوێنێک دەکەن کە مردووەکانیان تیادا دۆزیوەتەوە، بۆ نموونە لە رووسیا مردووەکانیان بە بنمیچی ئەشکەوتەکەدا هەڵواسیوە لە هەندێ شوێنی تردا گۆشتەکانیان لە مردووەکانیان کردۆتەوە و ئێسقانەکانیان فڕێداوە و لە هەندێ شوێنی تردا رم و کەرستەی تری راوکردنیان لای مردووەکانیانەوە داناوە، بەڵام ئەوەی لە ئەشکەوتی شانەدەردا دۆزراوەتەوە تا ئێستا جێی سەرسوڕمانە و وتووێژی لەسەر دەکرێت، هەندێک لەوانە تاکو ئێستا باوەڕ ناکەن کە مرۆڤی نیاندەرتاڵ ئەوەندە زیرەک بووبن.

ئەو مرۆڤانەی لە ئەشکەوتی شانەدەر ژیابوون پێیان دەگوترا هۆمۆساپینس نیاندەرتاڵ و پێیان دەگوتن مرۆڤی مۆدێرن وەک لە وێنەی ژمارە "۷"دا هاتووە.

شوێنەوارە گرنگەکانی جیهان کە مرۆڤی نیاندەرتاڵی تیادا ژیاوە ئەمانە بوون:

١- لائەتولی، ئۆلدۆڤای، نیدتۆ، تاترۆن، نیاسی.
٢- هادار، بۆدۆ، بلۆهێدیلی، ماکا.











٣- کۆبی فۆرا، ئۆمۆ، نارنۆکۆتومە، لۆتاگام، تابارین، بارینگۆ.
٤- ستێرکۆفۆنتاین، سوارتس کرانس، کرۆم درایی، توانگ، ماکابانساگات.
٥- سانێران، تنیل، میوکۆرتۆ، نگاندۆنگ، کێدینوک بیروبوس، سامیونگماگان، واپاک.
٦- گۆنگیوانگیلین، یانایۆ.
٧- زهاوکۆدن، یەتوشان.
٨- هێکسان، دالی، مایا، لیونانگ
٩- هاتنۆرا.
١٠- پێترالۆنا.
١١- ماور، ستانهایم، نیاندەرتاڵ، هاهانرفەرستاد، ئیهرنگسل دۆرف.
١٢- مۆنتاماورین، ئاراگۆ، فیراسی، بیچ، کرۆ، ماگنۆن، دۆردۆنە، فیندپلاتسن، ستی، سیساری.
١٣- سوانساکۆمبە.
١٤- گیبرالتار، ئاتاپیورکا.
١٥- مۆنتەسیرکۆ، ساکۆپاستۆرە.
١٦- بیل ایرهاود/ کاسابلانکا، رایات سالە.
١٧- تیگینیف
١٨- یایۆ
١٩- زایتو، تایون، سیکویل، کافز، ئامود
٢٠- شانیدەر
٢١- تیشک- تاش
٢٢- کلاسیس- سالدانا
٢٣- کابو

لێرەدا خۆشبەختانە دەڵێم گەلێکی وەکو گەلی کورد درێژبوونەوەی ئەو جۆرە مرۆڤانە بووبێت کە بەو شێوەیە بیریان لەجوانی کوردستان و گوڵەکانی و ئاووهەواکەی کردۆتەوە، هەر بۆیە دەڵێم کورد شەیدای جوانی و پاکی و خۆشەویستی بۆ یەکتربوون و رێزی یەکتریان لەلا هەبووە و گەلێک درێژبوونەوەی ئەو مرۆڤانە بێت چۆن هونەرمەند نابێت چۆن هەموویان تینووی هونەر نابن

سەرچاوەکان

١- نەشوناکردنی مرۆڤی تازە لە لایەن rogen lwen ١٩٩٣.
٢- زانیاری دەربارەی سەرهەڵدان و نەشوناکردنی مرۆڤەوە لەگەڵ R-E rogen lewin.
٣- مرۆڤ لە چەرخی بەردیندا peter rowlay.
٤- سەرەتای سەرهەڵدانی مرۆڤ Richard E.leaky.

تێبینی: سوپاسی کاک عەلی عەبدولکەریم خاوەنی دەرمانخانەی شیفا بۆ چارەسەرکردن بە گژوگیا لە شاری سلێمانی دەکەم، کە هاوکاریکردم و ناوی گوڵەکانی بۆ ساغکردمەوە.

ئەم بابەتە لە گۆڤاری هەزار مێرد وەرگیراوە.

# ئەشکەوتەکانی پارێزگای هەولێر شوێنەواری چاخی بەردینی کۆن و ناوەڕاست (٤٠٠٠٠-١٠٠٠٠پ.ز)

دڵشاد عەزیز زاموا
کۆلیژی ئاداب - زانکۆی سەلاحەددین

**١- ئەشکەوتی بەستون و دیان:**
هێنری فیلد (Dr. Henry Field) لە ساڵی ١٩٣٤ سەردانی (ئەشکەوتی دیان)و (ئەشکەوتی بەستون (Bastoon)ی کرد لە زنجیرە چیای برادۆست، لەسەر راسپاردەی زانکۆی هارڤەرد، و زانکۆی پیبۆدی (Peabody).

ئەم دوو ئەشکەوتە کە زۆر نزیکن لەیەکتری، و نزیکترین گوند لێیانەوە گوندی هاودیانە، هێنری فیلد بۆ ماوەی ١٠رۆژ کنەو پشکنینی تێدا کردن، لە ١٨ نیسانەوە بۆ ٢٧ نیسان، لە کنەو پشکنینەکاندا ژمارەیەک ئێسک و بەردەئەستێ و پارچە گڵێنە دۆزرانەوە، و هەموو ئەمانە بۆ کۆتایی چاخی بەردینی نوێ (٦٠٠٠پ.ز) و چاخی بەردینی کانزایی (٤٩٠٠-٣٥٠٠پ.ز) و سەردتای چاخی برۆنزی (٣٥٠٠-٢٩٠٠پ.ز) دەگەڕێنەوە.

پشکنینەکان دەریانخست کە مرۆڤ لە چاخی بەردینی کۆن و ناوەڕاستدا لە ئەشکەوتی دیان و بەستون نەژیاوە، چونکە لە ناوچەکە حەشارگەی باشتر هەبووە، وەک ئەشکەوتی شانەدەر، هەروەها بەفری زۆری زستان و تەڕی و مانەوەی ئاو لەناو ئەشکەوتەکەدا لە زستاندا و کەمی ئاوی خواردنەوە لە هاویندا و دووری لە رووبارەکانەوە، هۆکاربوون بۆ ئەوەی کە مرۆڤ لە چاخی بەردینی کۆن و ناوەڕاستدا رووبکەنە ئەشکەوتەکانی دیکەی ناوچەکە کە تارادەیەک گونجاوتر بوون بۆ ژیان.

هێنری فیلد لەناو چوار چاڵی (دوو چاڵ لە هەر ئەشکەوتێکدا) کنەو پشکنیندا تەنیا پارچە گۆزەی دۆزییەوە کە راوچییەکانی (کۆتایی چاخی بەردینی نوێ و چاخی کانزایی و سەردتای چاخی برۆنزی) بەکاریان هێنابوو، چونکە ئەوان لە گوندەکانی نزیک رووبارەکانەوە روویان دەکردە ئەشکەوتەکان و بۆ ماوەی چەند رۆژێک دەمانەوە بۆ راوکردن و خواردن و خواردنەوەیان لەناو گۆزەدا دەبرد بۆ ئەشکەوتەکان و گۆزەکان بەجێ دەهێڵدران و دەشکان چونکە ئەوان چەندین نێچیریان راو دەکرد لەبەرئەوە گۆزەکانیان بەجێ دەهێشت و دەشکا.بڕوانە وێنەی ژمارە(٢،١).

**چاڵی یەکەم:** لەئەشکەوتی دیان، لەلای خوارووی ئەشکەوتەکەدا چاڵێکی چوارگۆشە بوو درێژی لایەکی ١١پێ بوو، و قووڵایی ٩پێ بوو.

**چاڵی دووەم:** لە تەنیشت چاڵی یەکەمەوە بوو، هیچی تیادا نەدۆزرایەوە،

**چاڵی سێیەم:** لە ئەشکەوتی بەستون، چاڵەکە لە شێوەی پیتی ئینگلیزی(U) هەڵکەندرا، بەپانی شەش پێ و قووڵی ١٠پێ، هەتا بنکی ئەشکەوتەکە.

چاڵی چوارەم: خەندەقێک بەناخی تاوێرە بەردینەکاندا تا قووڵایی ١٤پێ.

**سواڵەت و پارچە گڵێنەکان:**
زۆربەی پارچە گۆزە دۆزراوەکان ئەوە نیشان دەدەن کە گۆزەکان



**وێنەی ژمارە (٢،١) ئەشکەوتی بەستون یەکێکە لە ئەشکەوتە گەورەکانی کوردستان و جیاواز لە هەموو ئەشکەوتەکانی دیکە جوانترین دیمەنەکانی ستەلکتایت و ستەلەکمایتی تێدایە.**

بەناڕێکی دروست کراون، لە قوڕێکی خۆڵەمێشی، و گڵێنەی شارستانیەتی سەردەمی حەسونەی کۆن (٦٠٠٠پ.ز) (گڵێنەی زۆر سادە) دۆزرایەوە، و هەندێک لە گۆزەکان رەنگ کراون بەڵام رەنگەکەی بەشۆردن لێ دەبێتەوە. واتە دوای رەنگکردن نەخراوەتە کووردەوە بۆ ئەوەی رەنگەکەی بچەسپێت و بە شۆردن لێنەبێتەوە، گڵێنەکانی ئەشکەوتی دیان سەردەمی حەسونەیە و رەنگێکی قاوەیی کراوە.

هەروەها گڵێنەی (سەردەمی شارستانیەتی عوبەید (٤٥٠٠-٣٥٠٠پ.ز)یش هەیە...هەروەها هەندێک لە گڵێنە و پارچە گۆزە دۆزرایەوە کە بۆ سەردتای سەردەمی شارستانیەتی وەرکا (٣٥٠٠پ.ز) دەگەڕێتەوە و ئەم گڵێنانە لە قوڕەسوورە دروست کراون.

هەروەها گڵێنەی سەردەمی شارستانیەتی جەمدەتنەسر- تەپە گەورە (٣١٠٠-٢٩٠٠پ.ز) دۆزرایەوە، کە لە گڵێکی پاکی بێژراوە دروست کراوە،و لە پلەیەکی گەرمی بەرزدا سوور کراوەتەوە، بەڕەنگی سوور بۆیە کراوە و نەخش کراوە، جگە لەوەی کە چەند پارچە گڵێنەیەکی سەردەمە مێژووییەکانیش دۆزرایەوە. هەروەها ٣٥ دەنک مورووی خڕ و درێژکۆڵەی ملوانکەیەک دۆزرایەوە.

**٢- ئەشکەوتی بابەخەل (هاودیان):**

ئەم ئەشکەوتە لە باکووری گوندی هاودیانە و بەرامبەر (دیانا)یە، و تیمێکی ئەمریکی پشکنینی تێداکرد و شوێنەواری سەردەمی موستێری (چاخی بەردینی کۆن)و چاخی بەردینی ناوەڕاستی تێدا دۆزییەوە.بڕوانە وێنەی ژمارە(٣،٤).

**٣- ئەشکەوتی سپیلک:**

ئەم ئەشکەوتە لەلایەن تیمێکی ئەمریکی لە بەهاری ١٩٥٥پشکنینی تێداکرا، و شوێنەواری چاخی بەردینی کۆن/ سەردەمی موستێری (٤٠٠٠٠پ.ز) ی تێدا دۆزرایەوە، کە هاوکاتە لەگەڵ ئەشکەوتی هەزارمێرد مرۆڤەکانی (نیاندەرتاڵەکانی) ئەشکەوتی شانەدەر.

**٤-ئەشکەوتی حاجییە:**

دەکەوێتە گەرووی بێخمە، لە نزیک گوندی بێخمە و رۆژهەلاتی گوندی بییە. پشکنینەکانی تیمە ئەمریکییەکە تەنها چەند پارچە بەردە ئەستێیەکی چاخی بەردینی ناوەڕاستیان دۆزییەوە، لەگەڵ هەندێک لە پارچە سواڵەت و گڵێنەی سەردەمی ئیسلامی و پێش ئیسلام.

**٥- ئەشکەوتی خەرواتان:**

لە ئەشکەوتی خەرواتان (لە باشووری رۆژهەلاتی حەریر) نزیک گوندی خەرواتان مرۆڤی چاخی بەردینی ناوەڕاست (١٥٠٠٠-١٠٠٠٠پ.ز) ژیاوە.


وێنەی ژمارە (٣)


وێنەی ژمارە (٤)

و لەئەنجامی سەردانێکی مەیدانیدا بۆ ئەشکەوتەکە سەردتیری بەردین و بەردە ئەستێی چاخی بەردینی ناوەڕاستمان دۆزییەوە. بڕوانە وێنەی ژمارە(٦،٥).

**٦- ئەشکەوتی کاوانیان:**

لە کۆتایی زنجیرە چیای سەفین لە لای باکوور، لە نزیک شەقلاوە ئەشکەوتێک هەیە کە ئێستا لە ڕێگای شەقلاوە، پێش ئەوەی بگەیتە ناو شەقلاوە لە دووری میلێک لە باکووری ڕۆژئاوای شەقلاوە، لە لای ڕاستی ڕێگاکەوە دیارە و ئەشکەوتەکە ڕووی لە باکوورە و لە ناوەوە فراوان دەبێت. بڕوانە وێنەی ژمارە(٨،٧). لە لایەن تیمێکی ئەمریکی زانکۆی (شیکاگۆ)وە پشکنینێکی کەمی تێدا کرا بۆ ماوەی شەو و ڕۆژێک تەنها لەبەردەم ئەشکەوتەکە شوێنەواری مرۆڤی چاخی بەردینی ناوەڕاستیان دۆزییەوە کە چەند پارچە بەردەستێیەک بوو هاوشێوەی ئامرازەکانی ئەشکەوتی زەرزی لە سلێمانی.

**٧- سەرەندور (بەستۆرە):**

لە ڕۆخی ڕاستی بەستۆرە لە دووری میلێک لە ڕێگای کۆنی هەولێر- شەقلاوە شوێنەواری پارچە بەردی سەردەمی موستێری (٤٠٠٠٠پ.ز) لە کۆتایی گردێکی بچووکدا دۆزرایەوە لە گەلەری سەرەندور.

**٨- ئەشکەوتی شانەدەر:**

ئەشکەوتی شانەدەر لە هەموو ئەشکەوتەکانی ناوچەکە گرنگترە، بەڵام لەبەرئەوەی لە پێشەوە باسکراوە، لێرەدا باسی ناکەینەوە.


وێنەی ژمارە (٥)



# قەڵاتی هەولێر

خالید جوتیار

مێژووی دروستبوونی هەولێر تا ئێستاش روون نەبۆتەوە. بۆ یەکەمجار لە نووسراوەکانی سۆمەری ناوی بە (ئوربیللوم) تۆمار کراوە و بە شوێنێکی پیرۆز دانراوە و رەنگە هەر بەرزکردنەوەی ئەو قەڵاتە لەو دەشتاییە بۆ بەرز و پیرۆزی خواوەندەکان و بەرگری لێ کردنیان بوو بێ. دەستەی کنە و پشکنینی ئەمریکی ساڵی ۱۹٦٠ لە ئەشکەوتی (شانەدەر) سەلماندیان، کە ئەو شوێنە لە کۆنترین چاخی مرۆڤی لێ ژیاوە و حەفتا هەزار ساڵ بەر لە زایین ئاوەدان بووە. بە درێژایی مێژوو چەندان رووداوی مێژوویی مەزن لە ناوچەی هەولێر قەوماوە، هەندێک لەمانە بوونەتە مێژوویەکی دیار وەکو شەڕی ئەربێللا لەدوای ئەو شەڕە هەولێر کەوتۆتە بەر فەرمانڕەوایی یۆنانییەکان. لە سەردەمی عومەری کوڕی خەتاب لە ١٦ی کۆچیدا هەولێر کەوتە دەست موسڵمانەکان. سەردەمی درەوشاوەی هەولێر زەمانی مزەفەرەددین بووە، کە بە هێمنی و خۆشی و ئارامی ئەو شارەی بەرەو جوانی بردووە و لە هەموو لایەکی جیهاندا زاناو بلیمەت و پسپۆڕەکانی بواری زانست و زمان و ئەدەبیات روویان تێکردووە و بووەتە بنکەی رووناکبیری بە پێی تێبینی و نووسراوەکانی مێژووناسان لە سەردەمی سوڵتان موزەفەر، کە زاوای سەلاحەددین بووە. گۆڕانکاری و جوانکاری گەشەی سەندووە و رەنگە قەڵاتیش لەو کاتیدا نۆژەن کرابێتەوە، ئاکرێ بیناسازی قەڵات لە هونەری بیناسازی کوردەواری دوور بخەینەوە، مێژوونووسان سەرنجی جوانیان داوەتە قەڵاتی هەولێر و زۆر لایەنیان باسکردووە، ئەگەرچی دەتوانین گلەییەکی زۆریش ئاراستەی ئەو هەموو زانایە بکەین، کە ئیبن ئەلمستەوفی لە کتێبی (تاريخ أربل) باسیان دەکات و لەو شارە پەروەردە بوون یان ماوەیەکی زۆر لێی ژیاون و فێری زانیاری زانستەکانی سەردەمیان بوون، کە لە کتێبەکانیان یان لە یادگارێکیان ناوی هەولێریان نەهێناوە.

کەچی یاقووتی حەمەوی لە کتێبی (معجم البلدان) لاپەڕە ١٨٦دا دەڵێ: "هەولێر قەڵاتێکی مەحکەم و شارێکی گەورەیە لە فەزای زەوی فراوان و لە دەوروەیدا خەندەقێکی قووڵ و شوورەی قەڵاتیش لە نیوەی دەبڕێتەوە لەسەر گردێکی سەر فراوان، لەسەر قەڵاتیش بازاڕ و ماڵ و ئاوەدانییە و مزگەوتێکی هەیە و بە قەڵاتی حەلەب دەچێ، بەڵام لەو گەورەتر و فراوانترە و..... خەلکەکەی کوردن". هەروەها لە کتێبی (الخلافة الإسلامية)، کە بەزمانی ئینگلیزی دەرچووە، دەڵێ شاری هەولێر پێشان پێی دەگوترا ئەربیللا دەکەوێتە دەشتایی بەینی هەردوو زێی گەورە و گچکە، یاقووتی حەمەوی دەڵێ شارێکی بازرگانی بووە، مەڵبەنی بازرگانان بووە، دەوری قەڵا خەندەقی هەبووە لەو قەڵاتە بازاڕێکی بازرگانی گەورە هەبووە، مزگەوتی قەڵا ناوی مزگەوتی ناو ئەپ بووە، لەسەر بەردێکی دیوارەکە ناو لەپی ئینسان هەبووە، ئیبن ئەلمستەوفی زۆر مەدحی کشتوکاڵی هەولێر دەکات و بەتایبەتیش پەمۆ.



# سەرەتای سەرهەڵدانی هونەری بیناسازی لە ناوچەی هەولێر

ئاری خەلیل کامل
کۆلێژی ئاداب - زانکۆی سەلاحەددین

ئەوە زانراوە کە هونەری بیناسازی، بەربڵاوترین هونەرەو باڵاترینیانە و تەمەن درێژتریشیانە، ئەم هونەرە بەردەوام بوو لە پێشکەوتن و فراوان بوون و مامەڵەکردن لەگەڵ ڕۆژگار لە سەرەتاوە تا گەیشتە ئەو ئاستە داهێنراوە لە ئەندازیاری بیناسازی نوێی.

بەرهەمی ئەم هونەرە، بەرهەمی دەستی کارکردنی دانیشتوانی ئەم ناوچە کۆنەیە، کۆنی بوونی مرۆڤ لەم سەر زەوییەدا، هەروەها گرنگترین بوارە داهێنراوەکانی هونەر، ئەو هونەرەی ڕۆژ بە ڕۆژ مرۆڤ تێیدا پێش دەکەوێ لەو ڕۆژەوە کە دەستیان داوەتێ...

بیناسازی لە سەرەتاوەو تا ئێستاش لەگەڵ بەردەوامی ڕۆژگار تۆماری ڕاستەقینە و دەربڕی شارستانیەتی مرۆڤ و پێشکەوتنەکەیەتی.

هەروەها هونەری بیناسازی ناوچەی هەولێر لە ڕاستیدا تۆمارێکی مێژوویی شارستانییەتێکی ڕەسەنە، کە لەسەر ئەم خاکە چاوی کردووەتەوە، لەو ڕۆژگارەی کە مرۆڤ لەنێو کەڵە شاخ و پەناگە و ئەشکەوتە بەردینییەکانەوە ژیاوە. کە لە ترسان پەنای بۆ بردوون ترسی دەوروبەر، لەگەڵ ڕۆژگار ئەمریی بە پاشماوەی بەخشی تا لە سایەیانەوە دەستمان بەو ڕاستییە ڕوون و بەرچاوە گەیشت.

پاشماوە بیناسازییەکانی ئەم ناوچەیە دەتوانین بە سەرقافڵەی بیناسازییە داهێنراوە پەلهاوێشتووەکانی دابنێین، کە لە شار و ناوچەکانی تری ئەم وڵاتە بڵاو بوونەتەوە.

هەر بۆیە پێش ئەوەی بچینە نێو بابەتە ورد و باریکەکانی ئەم هونەرە، وا پێویست دەکات ئەوە بزانین کە چەند هۆکارێک هەن کە کاریگەریان لە چۆنیەتی بیناو ساختمانەکان کردووە و شێوەکەیان دیاری کردوون لە پێکهاتەی دروستکردنیاندا.

مێژووی شارستانیەتی مرۆڤایەتی ناسراوە و زانراوە و ئاگاداری سەرهەڵدان و دەستپێکردنین لە باکووری دوو ئاوان لە کوردستان لەنێو

پێچاوپێچی چیا سەختەکانیدا لەو ڕۆژەوە لە چەرخی بەردینی کۆن.

هەولێر لە کۆنترین ڕۆژگاری پەیدابوونی مرۆڤ و نیشتەجێبوونی لەم دەوروبەرەو پەیدابوونی کشتوکاڵ لە چەرخی بەردینی نوێ[١]. شارستانیەتێکی پێشکەوتوو و گەشەکردووی تەواو لە زۆر ڕووەوە سەری هەڵدا[٢].

هەر بۆیە مەرجە بنەڕەتییەکانی سەرهەڵدانی شارستانیەت و پێشکەوتنی لە هەر ناوچە و وڵاتێک لەسەر ئەم زەوییە. پشتی بەوە دەبەستا کە سروشت چی پێ بەخشیوە و چ زەمینەیەکی گەشەکردن و پێشڤەچوونی بۆ دەڕەخسێ. کاریگەری سروشت زۆرەو جیا جیایە و ڕەگەزی تریش هەن کە ڕۆڵی بەرچاویان هەیە لە دیاریکردنی جۆری شارستانیەتەکە. ڕەگەزی سەرەکی و کاریگەر مرۆڤە کە کۆشاوە لە پێناو مانەوە و سوودی لە سروشت و دەوروبەر و خێر و بێرەکەی بینی و بۆ ئەوەی ئەوە بپارێزێ کە دەستی بەرهەمی هێناوە لەگەڵ درێژایی ڕۆژگار.

ئەم ناوچەیە لە کۆنترین چەرخی بەردینییەوە بنەماکانی سەرهەڵدانی شارستانیەتی تێدابوو، ئەوەش ناشاردرێتەوە کە هەر شارەو شێوەی تایبەتی خۆی هەیە و جیایە لەگەڵ شارەکانی تر.

ساختمان لە زۆر ڕووەوە کاریگەری تێ دەکرێ و زۆر هۆکار و شێوە و وردەکارییەکەی ئاراستە دەکەن، سەرەڕای چوارچێوە گشتییەکەی.

**یەکەم: هۆکاری جوگرافی:**

پەیوەندی مرۆڤ لەگەڵ جوگرافیا پەیوەندییەکی دوو لایەنە بوو لەگەڵ دۆزینەوەی سەرچاوەی تر کە بۆ مانەوە سوودی لێ بینی و شارستانیەتی دامەزراند بە جوانترین شێوە، لە ماوەی ژیانی دەم ڕووبار پاش هاتنە دەر لە ئەشکەوت و دەستکردن بە دروستکردنی پەناگە و خانوو پاش ئەوەی فێری کشتوکاڵ و نیشتەجێبوون بوو[٣].

**دووەم: هۆکاری جیۆلۆجی:**

سەرچاوە سروشتییەکان و کەرستە بەردەستەکان بۆ هەموو وڵاتێک و شارێک شێوەی گشتی بیناسازییەکەی دیاری دەکات. هەولێر بەوە ناسراوە کە لەڕووی کەرەستەی سروشتییەوە دەوڵەمەندە. لەوانە بەرد و دار و خۆڵی چاک. بۆیە خەڵکەکە پەنایان بۆ بردو بەپێی توانا بەکاریان هێنا، کەچی دارستانەکان بیرۆکەی ئەوەیان پێدا کە خانووی سادە و سەرەتایی هەڵبنێ لەو ڕۆژەی لە ئەشکەوت هاتە دەرەوە، پاش ئەوەی ئاووهەوا گۆڕاو پلەی گەرما بەرەو سەرەوەتر چوو لە نزیک ڕووبارەکان و سەرچاوە ئاودکان خەریکی کشتوکاڵ بوو لە چەرخی بەردینی نوێ نزیکەی دە هەزار ساڵ پێش ئەمڕۆ[٤].

بەڵام ئەو کەرەستەی کە لە هەمووان پتر بەکاردەهات و لەبەردەست بوو ئەوە "قوڕ" بوو. زانراوە قوڕ بەزۆر شێوە و بۆ زۆر کار بەکاردەهات، سەرەتا وەک "تەپکەقوڕ" بەکاری هێنا، پاشان توانای ئەم کەرەستەیەی زانی و دەستی لێی ڕاهات، خشتی وشککراوەی بەر هەتاوی لێ دروستکرد، دواتر خشتی بە ئاگر سووردەکراوی بەرهەم هێنا، سەرەڕای بەکارهێنانی بۆ سواقدان و سەربان داپۆشین[٥].

**سێیەم: هۆکاری ئاووهەوا:**

وا دیارە بیناسازەکان لەوەدا سەرکەوتن کە بیناکان لەگەڵ سروشت و ئاووهەوای ناوچەکە بگونجێنن، ئاووهەوا ئەخشی خۆی خستە سەر جۆری بیناسازی لە ناوچەکەدا، بارانی زۆر وای لە بیناکارەکان کردووە کە بە جۆرێک بیناکان ڕێکبخەن تا لەگەڵ ئاووهەوای باراناوی بسازێ، نموونەش بۆ ئەوە کە سەربانی بیناکانیان لێژ کردووە، لەو شوێنانەی کە بارانی زۆر لێ دەبارێ، هەروەها ساردو گەرمی و شێداری وایانکرد گۆڕانکاری و زێدەکاری لە پێکهاتەی بیناکاندا بکرێ. هەروەها کاریگەری هەردوو هۆکاری جوگرافی و ئاووهەوا بەسەریەکەوە و لەیەکتر بە خانوودکانەوە دیارە[٦].

**چوارەم: هۆکاری ئایینی:**

سەیر دەکەین کاریگەری ئەم هۆکارە ئایینییە زۆر ئاشکراو بەرچاوە بەسەر بیناکانی هەولێر و دەوروبەری. چونکە هۆکاری ئایینی جێگای گرنگی پێدانی بیناسازانی بینا ئایینییەکان بووە، بە تایبەت بیناکانی ئایینی و پەرستگاکان.

هەروەها هەندێک هۆکاری تر هەن کە لەکاتی شیکردنەوە و گفتوگۆکردن لەسەر بیناکان بەدەر دەکەوێ، وەک هۆکاری داهێنان و کاریگەری دەوروبەر، هەر بۆیە لە کاتی پەردەلادانی سەر بیناکان بە لێکۆڵینەوە ورد و باریکی کاریگەری جۆری بیناکان و شێوەی هاتنی کاریگەرییەکان بۆ ناوچەکە بەدەر دەکەوێ، ئەوەش کارێکی سەیر نییە. "سەیر!" وەک ئەوەی بیروڕای هاتووی دەوروبەر دەبینین لەسەر گەلانی ناوچەکە، هەر بۆیە ئەمەش سەیر نییە کە کاریگەری دەوروبەر لە سەر



بیناسازی ناوچەکەدا هەبێ، هەرچەندە شوێنی کۆن و رەسەنی سەرهەڵدانی بیناسازی و بیناکانی ئێرە خۆیەتی.

**شێوەی بیناسازی:**

سەرەتا لەوەوە دەست پێ دەکەین کە یەکەمین بیناکاری لەم ناوچەیەوە سەری هەڵدا، ناوچەی هەولێر، گەشەی کرد و پێشکەوت و بە ناوچەکانی تردا بڵاو بووەوە، لە راستیدا بە کۆنترین شێوە جۆری بیناکاری ناوچەکە دەژمێردرێ.

پێشتر باسی ئەوەمان کرد کە مرۆڤ لە چەرخی بەردینی کۆنەوە، لە سەرەتا لە نێو ئەشکەوت و پەناگە بەردینییەکان دەژیا.

بەهۆی تێپەڕبوونی رۆژگار و گۆڕانی ئاووهەوا تا کۆتایی سەردەمی بەستەڵەکی لەسەر گۆی زەوی، دیارترین تایبەتمەندی شارستانی سەردەمی دوای چەرخی بەردینی کۆن، سەرهەڵدانی کشتوکاڵ و نیشتەجێ بوونی مرۆڤ لە نزیک زەوییە کشتوکاڵییەکەی لە سەردەمی بەردینی نوێ و دروستکردنی خانوو و ماڵ، کە کۆنترین ماڵ لەسەر شێوەی هێلکەیی بوو لە بەرد و چەو دروست کرابوو، خۆڵیشی وەک هۆی پێکەوە نووسان بەکارهێنابوو، ئەم خانووانە قۆناغی گواستنەوەی مرۆڤن لە ئەشکەوت و کەلەنە شاخەکانەوە بۆ خانووی دروستکراو و نیشتەجێبوون[٧]، دیارترین ئەو شوێنانەش کە پاش دەرچوون لە ئەشکەوت مرۆڤ تێیدا نیشتەجێ بوو "زاوی چەمێ- زەڤیا چەمێ"یە[٨] لەسەر کەناری رۆژهەڵاتی زابی سەروو لە نزیک ئەشکەوتی شانەدەر، هەروەها "کەریم شایەر"[٩] نزیک چەمچەماڵ لە پارێزگای کەرکووک، هەروەها مولەعفات لەسەر رۆژئاوای شانی رووباری خازر نزیک رێگای هەولێر- موسڵ، لە پارێزگای هەولێر و جێگای تر لە ناوچەکانی کوردستان.

هەوەڵین بینای خانوو بە شێوەیەکی سادە لە هەولێر، کە لێکۆڵەران بە کۆنترین بیناکاری دادەنێن و لەنێو پسپۆڕان ناسراوە، گوندی "زەڤیا چەمێ"یە کە لە ئەنجامی هەڵکۆڵینی شوێنەوارناسی کە بەشێکی دەرکەوتووە شێوەی هێلکەیی هەبووە، لە بەردی قەبارە جیاواز دروستکراوە و بەردی تێکەڵ کراوە، بەداخەوە وێنەی ئەو خانووانەمان لەدەست نییە! بەڵام ئەگەر بمانەوێ وێنەکە لە زیهنی خۆمان نزیک بخەینەوە، ئەوا دەڵێین ئەم شێوە خانووە ئێستاش لە ناوچەکە بەردەوامە، بەڵام بە گۆڕانێکی کەم لە وردەکاریدا، سەیری وێنەی ژمارە "١" بکە.

بەڵام شوێنی تر لە هەمان ناوچەی هەولێر ئەوا شوێنی "ملعفات"ە لە پشکنینرا دەرکەوت پاشماوەی دیواری ئەم خانووە لە بەردی دڕ و بچووک دروستکراوە، کە ئەستوورایی بەردێک نزیکەی ١٥کم[١٠]ە، هەرچەندە ئەمە ئەنجامی پشکنینی تەواو نییە و بڵاو نەکراودتەوە، بەڵام بە بەراورد لەگەڵ شوێنی تری کوردستانی گەورە لە بەشی باکوور و رۆژئاوا کە خانووی نزیک بەم خانووانە دۆزرایەوە، کە بەشێوەی بازنەیی لە "قرمزدەرە" نزیک "تەلەعفەر" و "حالان چەمی" کە دەکەوێتە سەر یەکێ لە چاوگەکانی رووباری دیجلە لەنێو سنووری تورکیا، کە مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ هەزارەی دەیەمی پێش زایین. سەیری وێنەی "١-٢" بکە، کە خانووەکان خڕ و بازنەیین لە خانووەکانی زەڤیاچەمێ و ملعفات دەچن[١١].

ئەگەر بمانەوێ نەخشەی پێ بەپێی گۆڕانی ئەو یەکەی خانووانەمان دەست کەوێ، دەگەینە ئەو ئەنجامەی کە بیرۆکەی خانووی خڕ و بازنەیی لە دەستکار و داهێنانی خەڵکی ناوچەکە خۆیەتی، کە لەوانەیە شێوەی خڕ و بازنەیی ئەشکەوت رۆڵی هەبووە لەم شێوە و نەخشەیە[١٢] یان لەوانەیە ئەم بیرۆکەی لە ئاگردانەوە بۆ هاتبێ لە

کاتێکدا بە بازنەیی لە دەورەی ئاگر کۆدەبوونەوە، خۆ لەوانەشە ئەم شێوە بازنەییە بەهۆی ئەو بارە دەروونییە بێت، کە مرۆڤی سەرەتایی تێدا بووە، شێوەی "بازنەیی" لەوە هاتبێ کە دەورە درابوو بە مەترسییە سروشتییەکان، وەک لافاو و لێمشت و گیاندار، درندەکان، چونکە بەرگری لەخۆکردن لەم شێوەیەدا لە هەموو شێوەکانی تر باشتر بوو، بەدووریشی مەزانە کاریگەری هەندێ دیاردەی سروشتی بێ وەک مانگ و رۆژ کە کاریگەرییان بەسەر مرۆڤەوە هەبووبێ و خانوودکانیان بەم شێوەیە بیناکردبێ و بەرجەستەکردنی دیاردەکان بێت لە شوێنی ژیانیان[١٣].

ئەم شێوەیە هاوکار بوو بۆ نەخشەسازی خانوودکان بۆ ئەوەی پەیوەندی دەروونی کۆمەڵایەتی لەنێوان دانیشتوانەکان زیاد بکات و بتوانن هەست بەو پەیوەندییە کۆمەڵایەتییە بکەن و بۆ ئەوە بەرەو پێشەوە بچن ئەگەر ئەوەمان زانی کە ئەم گۆڕانە لە چەرخی بەردینی نوێ و لە سەردەمی فێربوونی کشتوکاڵ بووە.

بەڵگەکان کە لە پاشماوە شوێنەوارییەکان دەست کەوتوون، کە سەرەتای نشینگەی بە کۆمەڵ پاش ئەوە دێت کە مرۆڤ خانووی بازنەیی دروست کرد، هەرچەندە هەر خانوودە و بە تەنیا بوو، بەڵام لەیەک جێگا کۆبوونەتەوە.

ئەنجامی پشکنینەکان ئەوەیان سەلماند ئەو پێشکەوتنە بیناکارییەی کە هێزی کشتوکاڵ لە کوردستان پێشی خست. لە شێوەی دروستکردن و جۆری دروستکردن پەیوەست بوو بە ئاستی ئابووری خەڵکەکە لە ناوچەکەدا لەم قۆناغە، ئەم گۆڕانەی کە بەسەر بیناکاری داهاتووە، شایەنی ئەو گۆڕانەیە کە لە باری ئابووری روویداوە کە ئابوورییەکی کشتوکاڵی بوو، دواجار شێوەی چوارگۆشەیی و لاکێشەیی کە بەسەر خانوودکاندا هات لە کاتێکدا کە شێوە بازنەییەکە هەر مابوو، ئەمە گۆڕانێکی خۆجێیی بوو نەک کاریگەری دەرەکی، ئەمەش جۆری بەرهەم و پیشەسازی رۆژانە و ئامێرە گۆڕاوەکان و ئەو کەرەستەیەی کە لە سروشتدا هەبوون دەیسەلمێنێ[١٤].

بە تێپەڕبوونی رۆژگار نەخشەسازی بیناکاری خانووەکان گەشەی کردووە، بە جۆرێک نەخشەی بازنەیی بۆ خانووی نیشتەجێبوون لە "زەڤیا چەمێ و ملعفات" بووە ئەو بناغەیەی کە بیر و شێوەی تازە لەسەر نەخشەسازی کە سوودی پتر بێت و بگونجێت لە چەرخی دوای چەرخی بەردینی نوێ سەری هەڵدا. بە هاتنی ئەم چەرخە شێوەی بیناکردنی بازنەیی بەرە بەرە کەم بوودوە، لەبەرئەوەی نەدەگونجاو رێک نەدەکەوت لەگەڵ ئەو گۆڕانە ئابوورییە لەلایەک و هەروەها لەرووی خزمەتگوزاری و بیناکارییەوە. لەگەڵ رۆژگاردا پێویستییەکانی تاک و خێزان لەنێو خانوودا لە ژوورە جۆراو جۆرەکاندا ئەمەش بووە هۆی ئەوەی کە بیر لە نەخشەو شێوەی تر بکەنەوە بۆ بیناکردنی خانوو، لەم روانگەوە نەخشەی تازە سەری هەڵدا بۆ ئەوەی لەگەڵ پێویستییەکانی رۆژانەی تاک بگونجێ، ئەمەش وایکرد بە یەکجاری واز لە شێوەی بازنەیی بێنن، شێوەی چوارگۆشە و لاکێشەیی پەرە پێ بدەن.

**ئەنجامی لێکۆڵینەوەکە:**

١- مرۆڤ لە کۆنەوە لە نێو ئەشکەوتەکاندا دەژیا، ئەو ئەشکەوتانەی ناوچەی هەولێر، لەگەڵ رۆژگار و گۆڕانی ئاووهەوا لە ئەشکەوت هاتە دەرەوە و ژووری سادەی دروستکرد.

٢- پێشکەوتنی شارستانیەت لە چەرخی بەردینی نوێ، پاش سەرهەڵدانی کشتوکاڵ و ژیانی جێگیر.

٣- لەگەڵ نیشتەجێبوون و فێری خانووی سادە بوو ئەوەی بە شێوەی



بازنەیی و خڕ دروستی دەکرد.

٤- بەکارهێنانی کەرستەی سادەو بەردەست بەپێی ئەو جوگرافیایەی تێیدا دەژیا وەک بەرد و چەو و دار ســەرەڕای خۆڵیش.

٥- لە شێوەی بازنەییەوە خانووی گۆڕی بۆ چوارگۆشە و شێوەی لاکێشەیی و چوونە پێشی بیناکاری بەهۆی گۆڕانی ژیان و گـوزەران و پێـویسـتی ڕۆژانە و گونجان.

٦- ئەم گـۆڕانە بیناکارییە هۆیەکی ناوخـــــۆیی بوو نەک دەرەکی وەک هەندێک باسی دەکەن.

**پەراوێزەکان:**

١- سكلز، هاري: عظمة بابل، ترجمة عامر سليمان، (الموصل ١٩٧٩) ص ٢٥.

٢- باقر، طه، مقدمة في تأريخ الحضارات القديمة، ج١، ص٣، (بغداد ١٩٧٣)، ص ٧١.

٣- الدباغ، تقي: العراق في العصور ما قبل التأريخ، العراق في التأريخ، (بغداد- ١٩٨٥) ص ٥٣.

٤- المتحري، ناري خليل، العوامل المؤثرة في العمارة القديمة لبلاد وادي الرافدين، گۆڤاری سوبارتو، ژ ١، هەولێر ٢٠٠٨

٥- المتحري- المصدر السابق.

6- marcel,j.p: traaittional building material ancient Mesopotamia architecture, sumar, vol 47, 1979, p130-132.

7- liyod, s: bulding in brickand stone, history, technical, 3rd, ed, vol I (oxford- 1955), p. 462.

٨- زاوي جمي: او (زەڤیا چەمێ) لعل اسمه يعني "شاطئ الزاب" وقد دلت التحريات الاثرية التي اجريت في الموقع على وجود اقدم اطوار العصور الحجري الحديث وهو بذلك اقدم قرية فلاحية في العصر الذي تعلم فيه الانسان تدجين الحيوان ولعل هذه القرية تمثل لنا اول اطوار هذا الانقلاب العظيم الذي حدث في حياة الانسان، وهو انتقاله من طور جمع القوت وسكنى الكهوف الى طور انتاج القوت بزرع الحقول وتربية الماشية، للمزيد انظر: باقر طه وسفر، فؤاد: المرشد الى مواطن الآثار والحضارة، المرحلة الخامسة "بغداد- ١٩٦٦" ص٢٠.

٩- كريم شايەر: عبارة عن موقع يقع في الهضبات الغربية من جرمو، على بعد "٣ كم" من الجهة الشمالية الشرقية وجدت فيه بعثة امريكية في جامعة شيكاغو على آثار اقدم من مستوطنة جرمو اذ يرجع عصرها الى نهاية العصر الحجري القديم للمزيد ينظر: باقر طه وسفر، فؤاد: المرشد الى مواطن الآثار والحضارة، الرحلة الرابعة، "بغداد- ١٩٦٦) ص ١٦.

10- matthews, R: the archaeologg of Mesopotamia, clondon- 2003) b.20-29.

11- brid wood, r: the iraq- jarmo project of oriental in statute of the university of Chicago, summer, vol, 10 (1954), p.120-138.

12- mattheus, r. op. cit, p. 89-90.

١٣- ابراهيم، نعمان جمعة: حضارة العصر الحجري في كردستان العراق، رسالة ماجستير غير منشورة- جامعة صلاح الدين- اربيل ٢٠٠٣- ص ٤٥-٥٤.

14-moretl, t.p .op.cit, p 130-b2.

١٥- الجادر، وليد: العمارة في عصر حجر السلالات: موسوعة حضارة العراق، ج٣، (بغداد- ١٩٨٥) ص ٧٨-٧٩.

**سەرچاوەکان:**


١- ابراهيم: نعمان جمعة: حضارة العصر الحجري في كردستان العراق- رسالة ماجستير غير منشورة: جامعة صلاح الدين (كلية الآداب- ٢٠٠٣).

٢- باقر، طه: مقدمة في الحضارات القديمة، ج١، ط٣، (بغداد- ١٩٧٣).

٣- باقر، طه وسفر، فؤاد: المرشد الى مواطن الآثار والحضارة، الرحلة الرابعة (بغداد- ١٩٦٦).

٤- الجادر، وليد: العمارة حتى عصر فجر السلالات، موسوعة حضارة العراق، ج٣ (بغداد- ١٩٨٥).

٥- الدباغ، تقي: العراق في عصور ما قبل التأريخ، العراق في التأريخ.

٦- ساكز، هاري، عظمة بابل، ترجمة عامر سليمان (الموصل- ١٩٧٩).

٧- المتحري، ناري خليل: العوامل المؤثرة في العمارة القديمة لبلاد وادي الرافدين، گـۆڤـاری ســوبارتو، ژ ١، (هەولێـر- ٢٠٠٨).

8- bridwood, r: the iraq jarmo project of oriental institute of the university of chicogo, summer, vol, 10 (1954).

9- marcel. J.p: traohitional building matrial ancient maspotomia archit ecture, summer, vol.41 (1979).

10- mattrews, r: the archeology of Mesopotamia, London- 2003.

11- liyod, s: building in brich and stone, history rechnicol, 3ed. Vol, (oxford- 1955).


و: ئینسکلۆپیدیای هەولێر

# گۆڕەکانی گردی قالینج ئاغا

شاە الصیوانی: پشکنەری شوێنەوار

لە ئەرکە سەرەکییەکانی پشکنینی وەرزی سێیەم (هاوینی ١٩٦٨) لە گردی قالیج ئاغا، کە دەکەوێتە ناو شاری هەولێر تەواو کردنی پشکنین بوو لەو گۆڕستانەی، پاشماوەی شوێنەواری بە نرخی تێدابوو، ئەنجامەکانیشی لە وەرزی دووەمی هاوینی ١٩٦٧ دیار کەوتبوو، بۆ تەواو کردنی لێکۆڵینەوەی دکتۆر (بەهنام ئەبو ئەلصوف) سەرۆکی دەستەی پشکنین بوو لە گردەکە - لە بارەی ئەنجامی هەڵکۆڵینەکانی گردی قالیج ئاغا، لێرەدا دەمانەوێ لێکۆڵینەوەیەکی کورت لە بارەی ئەو کۆمەڵە گۆڕەی کە دۆزراوەتەوە پێشکەش بکەین[1].

لە میانی پشکنیندا[2] لە دیوی ژێرەوەی شوێنە نیشتەجێ بووەکان توانیمان کۆمەڵە گۆڕێک بدۆزینەوە و ناومان لێنا کۆمەڵە گۆڕی قالیج ئاغا، ژمارەشیان ٤٩ گۆڕ بوو[3]. بەسەر سێ چین دابەش ببوو، چینی یەکەم ١٣ گۆڕ بوو، چینی دووەم ٣٢ گۆڕ بوو، چینی سێیەم ٤ گۆڕ بوو.

پێش ئەوەی باس لە ناوەڕۆکی ئەو گۆڕانە بکەین، کە پاشماوەی شوێنەواری تێدا بوو، چەند تێبینییەکی گشتی لە بارەیان روون دەکەینەوە:

أ- هەموو تەرمەکان لە ناو ئەو گۆڕانە نەبوون، کە لە گۆزەی گەورە دروست کرابوون، بەڵکو بەشێکی لەناو ئەو گۆڕانە بوون، کە لە پارچە خشت دروست کرابوون، بە تایبەتی گۆڕەکانی ژمارە ٩، ١٣، ١٨، ٢٧، ٤٣، زۆربەشیان پاشماوەی شوێنەواری زێڕ و بەردی بەنرخی تێدابوو.

ب- ناشتن بە زۆری لەبن زەوی ژوورەکان بووە، بە تایبەتی ئەو گۆڕانەی کە تەرمی منداڵانی تێدابوو، ئەوەش بە ئاشکرا لە چینی دووەم بەدیار دەکەوێت.

ج- گۆزەکانی ناشتن: زۆربەیان رەنگیان زەرد یاخود زەردی









چەند وێنەیەک لەگۆڕەکانی گردی قالینج ئاغا

تۆخ، کەسک، قاوەیی، مەیلەو کەسک، قوڕەکەشی بۆریکی کراوەیە لەگەڵ بۆریکی تۆخ، (٣٤ گۆڕ) بەم قوڕەیە، یانیش تێکەڵاویەکی رەش، ئەو ماددەی لەگەڵی تێکەڵ کراوە، بریتییە لە کای ورد و بلورەی وردی کلس، سووتاندنەکەشی لە ژێر پلەی گەرمای زۆر نەبووە، ئەم جۆرە گۆزانە لە جۆری گۆزەی شارستانییەت (ئورووک)ە، کە بۆ ٣٥٠٠-٣١٠٠پ.ز دەگەڕێتەوە، ئەستوور و دڕە و بەدەست دروست کراوە، زۆریشی بایەخ پێ نەدراوە، بۆ مەبەستی جیاجیا بەکار هاتووە، وەکو شت لێنان یاخود بۆ ئاو خواردنەوە یان بۆ ناشتن بەکار هاتووە، ئەو جۆرەی لە کوردستان بە زۆری هەیە، دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی (الورکاء)، هەروەها لە تەپە گەورە و نەینەوا و شوێنی تری شوێنەوارەکانی باکووری میسۆپۆتامیا دۆزراوەتەوە[٤].

د- ڕێگای ناشتن: ناشتن بە زۆری ڕووەو لای باکووری ڕۆژهەڵات یاخود باشووری ڕۆژئاوا بووە، شێوەی ناشتنی مردووەکان بە جۆرێکە هەروەکو دۆخی کۆرپەلەیە لەناو منداڵدان (بە تایبەتی تەرمی منداڵی گچکە). ناشتنیشیان لە گۆزەی قەبارە مام ناوەندی بووە، بەڵام ئەو منداڵانەی تەمەنیان ٢-٥ ساڵ بووە، ئەوا لەناو گۆزەی گەورە یەک لەسەر ئەوی تر دانراوە، ئەگەر مردووەکەش تەمەنی لە ٥ ساڵ زیاتر بوو بێت، ئەوا لە گۆڕێک دەنێژرا کە لە پارچە خشت دروست دەکرا.

ه- گۆڕەکان چەند شوێنێکی یەکە بیناکانی ژێرەوەی تێکداوە، کە لە چەند چینی شوێنەکە دۆزراوەتەوە، بەتایبەتی چینی سێیەم.

و- لەوانەشە بەکارهێنانی کۆمەڵە مۆر و خشڵەکان دیاری بکرێت بە گوێرەی بوونی و شوێنەکەی لەناو گۆڕەکان، ئەو کۆمەڵانەی لەسەر مل و سینگ دۆزراوەتەوە بۆ جوانکاری جل و بەرگ بوو، قۆپچەی جل، ئەویش نزیک دەستەکان دۆزراوەتەوە بریتییە لە بازنی مورودار، ئەوانەش هەموو بۆ جوانی بەکار هاتووە، هیچ



چەند ملوانکەیەک کە لەناو گۆڕەکاندا دۆزراونەتەوە

پەیوەندی بە مەراسیمی ئایینی نەبووە.

ز- لەوانەش گرنگتر ئەوەیە، دۆزینەوەی پارچە زێڕ لە هەندێ لەم گۆڕانە کە بە دۆزینەوەی شوێنەواری گرنگ دادەنرێت لەم سەردەمە مێژووییەدا[٥]. ئەوەش رادەی تێگەیشتنی مرۆڤ بۆ ئەم کانزایە روون دەکاتەوە و توانیوبەتی بەدەستی بکەوێت و بەو جۆرە دایڕێژێت کە بیەوێت بۆ بەکارهێنانی جیاجیا بەتایبەتی جوانکاری.

**وەسفی هەندێک لە گۆڕەکان و ناوەڕۆکەکانیان[٦]:**

**گۆڕی ژمارە (١):** گۆزەیەکی رەنگ بۆری تۆخ، قوڕەکەی رەشە تێکەڵاوە بەکای درشت، تیرەی دەمەکەی ١٧سم دەبێت، لەناویدا برێکی زۆر لە موورو سەدەف دۆزراوەتەوە، لەوانەیە خەناوکە بێت، لەگەڵ دوو موورو رەشی بەنرخ و خەناوکەیەکی سەدەف[٧].

**شوێنی دۆزینەوە:** بن ژووری ژمارە (١) چینی یەکەم.

**گۆڕی ژمارە (٢):** گۆزەیەکی قاوەیی، قوڕەکەی لەگەڵ کای ورد تێکەڵاوە رەنگی زەردی تۆخە، تیرەی دەمی ٢٤سم و تیرەی قەپاغەکە ٢٥سم، لە ناویدا کۆمەڵێ لە موورو سەدەف و ئێسک و کلس دۆزراوەتەوە[٨].

**شوێنی دۆزینەوە:** بن ژووری (٣) چینی یەکەم.

**گۆڕی ژمارە (٥):** گۆزەیەکی گەورەی رەنگ تۆخ، قوڕەکەی بۆری کراوەیە لەگەڵ بلورەی کلسی ورد تێکەڵ کراوە، لە دوو گۆزەی گەورە پێکهاتووە یەک لەسەر ئەوی

تر، تیـــردی دەمی خـــوارەوە ٦٠سم و ئەوەی ســـەرەوەش شکاوە، لەناویدا کۆمـەڵێ مورو سەدەفی ورد و دوو مورو عەقیقی سۆر و خەناوکەیەکی مورو شین دۆزراوەتەوە[٩].

**شوێنی دۆزینەوەی:** چینی یەکـەم، بن ژووری یەکـەم بە ٤٠سم.

**گـۆڕی ژمـارە (٩):** بە پارچە خـشت دروست کـراوە، نزیک گـۆشەی رۆژئاوای ژووری ژمـارە ٤ چینی دووەم[١٠]، کۆمـەڵێ خشت بەرێکی بە شێـوەیەکی ســتوونی دانراوە بەجۆرێک سەرنج رادەکێشێ لە سەرەتا وا دیارکەوت، کە بەشـــێکی رمـــاوی دیوار بێت بەهۆی نـارێکی دانانی خشـتـەکـان، بەڵام دوای خـاوێن کـردنەوەی ناو ژووردکـە پارچەیەک خشت دۆزراوە کە بریتی بوو لە دیوی سەرەوەی ئەو گۆڕەی بە خشت دروست کرابوو.

**دوای خاوێن کردنەوەی ناو گۆڕەکە تێبینی کرا کە:**

أ- ئێسکە پەیکەرێکە لە ئێسکی حەوزیدا دەردەکەوێت کە ئێسکی ئافرەتێکە.

ب- چۆنیـەتی دروست کـردنی گـۆڕەکـە هەروەکـو دروست کـردنی ئەو گـۆڕەیە کـە خـەناوکـەیەکی زێڕی تێـدا لە بەهاری ١٩٦٧ لە قالینج ئاغا دۆزرایەوە.

ج- پێـوانەی خشـتـەکـە کـە ٢٤× ١٣× ٨سم، هەمـان پێـوانەی خشـتی چینی یەکەمە، ئەوەش مـانای ئەوەیە گۆڕەکە لە هەمان سەردەمی چینی یەکەمە، بوونیشی لە چینی دووەم بەهۆی دارمانی چینی یەکەم بووە بۆ سەر ئەم چینە.

د- کـۆمـەڵێ مـورو رەشی نیـوە روون لەگـەڵ خـواربوونەوەی بـەردێکی بەرەو رەنـگی ســـــپی بە درێژی ٣.٥سم دۆزراوەتەوە لە دەورەیدا پشـتـێـنی زێڕ بە پانی ٤ملم هەیە لە کۆتایی پان بۆوەی خواربوونەوەکە کونێک هەیە کە کۆتاییەکەی تۆزێک تیژە[١١]. لە هەمـان شێـوەش لە تەپە گەورە دۆزراوەتەوە، بەڵام کۆتایی تیژ نییە[١٢].

شـوێنی دۆزینەوە: لە چینی یەکـەم هاتۆتە خـوارەوە بۆ سەر زەوی چینی دووەم لە ژووری (٤).

**گۆڕی ژمارە (١٠):** گۆزەیەکە قوڕەکەی بۆرە تێکەڵاوی مـاددەیەکی وردە، بەشکاوی دۆزراوەتەوە لە ناویشـیـدا کـۆمـەڵێ مـورو هەیە (حـەفت مـورو رەش، مـورێیکی سپی)[١٣].

**شوێنی دۆزینەوە:** چینی یەکەم، هەیوانی (١٢).

گـۆڕی ژمـارە (١٣): بە خـشـت دروست کـراوە، بەشی سەرەوەی لابردراوە بە هۆی گـۆڕێکی نوێ، تەنها ئێـسکی ســەر و ســینگ لەناویدا مـاوە، رووی تەرمـەکـە بەرەو باکووری رۆژهەڵاتە، پاشماوە شوێنەوارییەکانی ئەم گۆڕە بریتـیـیـە لە مـورو هەمـەجـۆر لەسـەر مل و سـینگ دۆزراوەتەوە.

ئەم کۆمەڵەش پێکدێت لە[١٤]:

أ- کۆمەڵەیەکی زۆر لە مورو سەدەفی ورد.

ب- کۆمەڵەیەکی زۆر لە مورو سەدەفی ناوەندی.

ج- کۆمەڵەیەکی زۆر لە مورو رەش.

د- مـوروویەکی زێڕی گـچکە (بە مـورو ئەو خـەناوکـەیە دەچێت، کـە لە وەرزی دووەمی سـاڵی ١٩٦٧ لە قالینج دۆزراوەتەوە).

هـ- مورویەکی شین.

و- قاپێکی پێچاوپێچی گەورە.

ز- مورویەکی گەورەی رەش.

ح- مورویەکی گچکەی سپی روون.

**گۆڕی ژمارە (١٥):** گۆزەیەکی قاوەیی مەیلەو کەسکە، قـوڕەکـەی بۆرێکی کـراوەیە لەگـەڵ کـای ورد تێکەڵاوە، گـۆڕەکـە تێکشکاوە، تیـرەکـەی ٤٤ سم و قـووڵیـیـەکـەی ٣٢سم، قەپاغێکی هەیە.

١٥ مـورو رەشی تێـدا دۆزراوەتەوە لەگـەڵ مـوورویەکی عەقیق[١٥] مێژووی ئەم گۆڕە وەکو ئەوەی چینی دووەمە، لە ژووری (٣) لە چینی سێیەم دۆزراوەتەوە.

**گۆڕی ژمارە (١٦):** گۆزەیەکی قاوەیی مەیلەو کەسک، قـوڕەکـە بۆرە، قـەپاغی رەنگی تۆخـە. تیـرەکـەی ٣٨سم و

قوولی ٤٤سم، دەمێکی گەورەی هەیە تیرەکەی ٣.٥سم و درێژییەکەی ٨.٥ سم.

لە ناویدا کۆمەڵێ مورو سەدەف و سێ مورو سوور[١٦] و کـۆمـەڵێ ئێسـکی پەرت و بڵاو دۆزراوەتەوە. شـوێنی دۆزینەوەی ژووری (٣) چینی III لە چینی II لەسـەرەوە هاتۆتە خوارەوە.

**گۆڕی ژمارە (١٧):** گۆزەیەکی خاکی تۆخە، قوڕەکەی تێکەڵاوە بە کای ورد، تیـرەکـەی ٢٥سم و قـوولـیـیـەکـەی ٣٠سم، لە ناویدا کۆمەڵێ مورو سەدەف لەگەڵ موورویەکی سۆر دۆزراوەتەوە[١٧].

شوێنی دۆزینەوە: چینی سـێـیەم ژووری (٦) لە چینی دووەم هاتۆتە خوارەوە لە سەرەوە.

**گۆڕی ژمارە (١٨):** بە خشت دروست کراوە و قـەبارە بچـووکـە شـێـوەی لاکـێـشـەیە، پانی ٤٤سم لە باکـووری رۆژئاوا و ٣٠سم لە رۆژهەڵات.

درێژی ١.٣٠مـەتر و قـوولـیـیـەکـەی ٢٦سم، نەتوانرا دۆخی تەرمـەکـە دیار بکرێت بە هۆی پەرت و بڵاوی پارچە ئێسکەکان. ئەم شوێنەوارانەی تێدا دۆزراوەتەوە[١٨]:

أ- پارچە زێرێکی بازنەیی تەنک لە ناوەندی دوو کونی تێـدایە، کـە لەوانەیە مـادەی بە نرخی تێـدا بووە: (ئەو شـێـوە زێرینانە لە گـۆڕەکـانی تەپە گـەورە لە هەمان سەردەمدا دووبارە دەبێتەوە).

ب- بازنەیەکی زێڕ، لەسەر شێوەی گوارە، کۆتاییـەکەی لاکێشەیەکی کونە.

ج- سێ مورو سۆر.

د- کۆمەڵەیەکی زۆر لە مورو سەدەف.

هـ- کۆمەڵە موورویەکی ئێسکی درێژ.

و- کۆمەڵە موورویەکی رەشی روون.

ز- موورویەکی شین.

شـوێنی دۆزینەوە: ئەم گـۆڕە لە دیواری نێـوان ژووری ٣.٦ لە چینی سـێـیـەم دۆزراوەتەوە، بەڵام سـەر بەچینی دووەمـە بەهۆی شکاندنی لەم دیوارەی دوو چینەکـە جـودا دەکاتەوە.

**گـۆڕی ژمـارە (٢٠ - ٢١ - ٢٣):** بریتین لە گـۆزەی شکاو، لە ژمارە (٢٠) پێنج مورو بچووک لە سەدەف و لە ژمـارە (٢١) شـەش مـورو بچـووکی سـەدەف و لە ژمـارە (٢٣) مـوورویەکی رەشی گەورە و دوو مـورو سـەدەفی ورد هەیە.

**گـــۆڕی ژمـــارە (٢٧):** لە خـــشت دروست کـــراوە بەشـێـوەیەکی شـاقوولی، بەشـێکی زۆری تێکچووە بەهۆی گـۆڕێکی نوێ بەشـەکـەی تری درێژییـەکـەی ٧٦سم و پانییـەکەی ٣٥سم، تەنهـا دوو ریزی بیناکـە مـاوە، دۆخی تەرمـەکـە وەکو دۆخی (کـۆرپەی نـاو منداڵدانە)، هەروەها روی بەرەو رۆژئاوایە. کۆمەڵێ مورو سەدەف لەناویدایە لە نزیک سەر و لەسەر سینگ[١٩].

شـوێنی دۆزینەوە: لە چینی دووەم بەرەو چینی سێـیەم هاتۆتە خوارەوە.

**گۆڕی ژمارە (٣٠):** کۆمەڵە موورویەکی سەدەفی ورد، لەگـەڵ مـوورویەکی سـپـی روون[٢٠] لەناو خـشـتـێکدا دۆزراوەتەوە، بەڵام بەهۆی گـۆڕێکی نوێ تێکچـووە، کـە کۆمەڵێ خشتی نوێی تێدا دۆزراوەتەوە.

**گۆڕی ژمارە (٣٣):** گۆزەیەکە، قوڕەکەی بۆرێکی تۆخە لەگەڵ کای ورد و بلوراتی کلس تێکەڵ کراوە.

دوو لێـــواری هەیە، تیـــرەی دەرەوەی ٦١سم ناوەوەی تیـرەکـەی ٤٠سم لە لێواری ناوەوەی چوار کونی بەرامبـەر هەیە، قوولی گۆزەکە ٤٠سم، (لە مۆزەخانەی هەولێر نمایش کراوە)، لەناویدا کۆمـەڵەیەکی گەورە لە مـورو سـەدەف و مورو رەشی نیوە روون و ١٦ مورو عەقیقی مۆر هەیە[٢١].

شـوێنی دۆزینەوە: چینی سێیەم ژووری ٤٤، بەڵام سـەر بەچینی دووەمـە بەهۆی شکانی لای باشـووری ژوورەکـە و ناوەوەی.

**گۆڕی ژمارە (٣٤):** گۆزەیەکی رەنگی قاوەیی مەیلەو کـەسکە، قـوڕەکـەی بۆرێکی کـراوەیە، تیـرەکـەی ٣٥سم، لەناویدا کـۆمـەڵە مـوورویەکی سـەدەفی ورد و (١٠) مـورو

رەش و دوو مورو عەقیقی سۆر هەیە[22].

شوێنی دۆزینەوە: چینی سێیەم ژووری ٤٤، بەڵام سەر بەچینی دووەمە بە هۆی شکانی لای باکووری ژوورەکە و بەرزبوونەوەی لەسەر زەوییەکەی بە بڕی ٢٠سم.

**گۆڕی ژمارە (٣٦):** گۆزەیەکی رەنگ تۆخە، قوڕەکەی بۆڕێکی کراوەیە، لەناویدا خاڵی بە خەڵووز بوو هەیە لەگەڵ سێ مورو عەقیقی سۆر[23].

شـوێنی دۆزینـەوە: چینی سـێیـەم ژووری ٤٥، بەڵام گـۆزەکــە سـەر بەچینی دووەمــە بەهۆی شکانی دیواری رۆژئاوای و بەرزبوونـەوەی لەســەر زەوی ژوورەکــە بەڕادەی ٣٥سم.

**گۆڕی ژمارە (٣٩):** قوڕتێکی ناشتنە لەناو ژووری ٥٦ دۆزراوەتەوە لە چینی سێیەم، لەناویدا ئێسکی منداڵێک هەیە لەگەڵ کـۆمـەڵێ مـورو سـەدەف[24] لە نزیـک سـەر و ملیدا.

**گۆڕی ژمارە (٥٠):** لە خشت دروست کراوە لەناویدا دوو جەرە هەیە یەکێکیان نزیک هەردوو پێی و ئەویتریان لەسەر ملیـدا، دۆخی ئێسکەکـەش رووەو رۆژهەڵاتە، لەناو گۆزەی دووەم کۆمەڵێ مورو زێڕ و مورو کە خەناوکەیەکی زۆر جـــوانی زێڕ و عـــەقـــیق و ســـەدەف پێکدێنێت دۆزراوەتەوە، وا پێدەچێت ئێسکی ئافرەتێکی دەوڵەمەند بێت، ئەو خەناوکەیەش لەوانەیە بە یەکەمین ئەو خشڵ و زێڕانە دادەنرێت، کە لە عێراق دۆزراوەتەوە[25].

**پێکهاتووەکانی خەناوکەکە ئەمانەن:**

أ- ٧ بازنەی زێڕی جوان دروستکراو.
ب- ٨ مورو زێڕی گەورە.
ج- ١٤ مورو زێڕی ناوەندی.
د- یەک مورو زێڕی لوولەیی.
هـ- ٣٤ مورو زێڕی گچکە.
و- ١٥ مورو زێڕی عەقیقی سۆر.
ز- ١٥ مورو شینی جۆراوجۆر.
ح- ٣ مورو سەدەفی ناوەندی.
گ- کۆمەڵە موورویەکی سەدەف.

(*) قـالەننجـە: واتە قـەڵای گـچکە، بە بەراورد لەگـەڵ قـەڵای هەولێر. (نووسەر)
قـالجـە: بە قـەڵا دەچێت، بە بەراورد لەگـەڵ قـەڵای هەولێـر. (نووسەر).
١- گۆڤاری سۆمەر: بەرگی ٢٥، ساڵی ١٩٦٩، ل٣ - ١٤.
٢- یاریدەدەری سەرۆکی دەسـتـەیەک بووم لە وەرزی سـێـیـەم، هاوینی ١٩٦٨. (نووسەر).
٣- لەگـەڵ ئەو گـۆڕەی کـە لە وەرزی دووەم سـاڵی ١٩٦٧ دۆزیمانەوە، لە هەمـوو گـۆڕەکـان زیاتری شت تێـدابوو، لە کۆمەڵە موورو زێڕ و بەردی بە نرخ، کە خەناوکەیەکی زێڕیان پێکهێنابوو (سومەر: بەرگی ٢٢، ساڵی ١٩٦٦، وێنە ٨، پێشەکی ل١٠).
٤- تەپە گـەورە: لە چینەکـانی VIII-B XI-A لە نەینەوا لە چینەکانی III-IV.
٥- نێردەی ئەمریکایی سەر بە زانکۆی پنسلڤانیا کە گردی تەپە گەورە - پارێزگای موسڵی هەڵکۆڵی موورو و پارچە زێڕی لە چینی دەیەمدا دۆزیوەتەوە.
٦- وەسفەکە تەنها بۆ ئەو گۆڕانەیە کە پاشماوەی شوێنەواری تێدا دۆزراوەتەوە.
٧- سـۆمەر: بەرگی ٢٥ی سـاڵی ١٩٦٩، بەشی ئینگلیـزی، نەخشەی تایبەت بە چینەکانی گردەکە و شوێنی گۆڕەکان.
٨- زێڕەکانی تەپە گەورە T.G PL.CIV.FIG.20I.I.X
٩- گۆڤاری سۆمەر: بەرگی ٢٢ ساڵی ١٩٦٦

**سـەرچاوە:**

گۆڤاری (شانەدەر) ژمارە (٣) ئەیلوولی ١٩٩٧، ٢٦٧ - ٣١.



# پارێزگای هەولێر لە سەرچاوە مێخییەکاندا

ئەردەڵان عوسمان حەسەن

لە چوارچێوەی ئەم راپۆرتەدا هەوڵماندداوە گرنگترین و دیارترین ئەو ناوچانە بخەینە روو، کە لە سەرچاوە مێخییەکاندا بایەخێکی زۆریان پێدراوە و کەوتوونەتە سنووری پارێزگای هەولێر لە ئێستادا، هەرچەندە گەلێ ناوچەی تریش هەن لە سنووری ئەم پارێزگایەدا، کە لە سەرچاوە مێخییەکاندا ئاماژەیان بۆ کراوە و لەمیانەی ئەو راپۆرتەدا نین، بەڵام ئەم ناوچانەی لەم راپۆرتەدا ئاماژەیان پێ کراوە رۆڵێکی گرنگیان لە سەردەمانی کۆندا بینیوە.

### ١- هەولێر:

هەولێر یەکێکە لەشارە گرنگەکانی باشووری کوردستان، لە رۆژگاری ئێستا و کۆندا بایەخێکی زۆری هەبووە، لە هەموو لایەنە جیاوازەکانی ژیاندا. ئەم شارە دەکەوێتە پێدەشتێکی بەرفراوان و بەپیت بۆ کشتوکاڵکردن، بە تایبەتیش رواندنی دانەوێڵە، کە پشت بە ئاوی باران دەبەستێ، دەتوانین بەسەرچاوەی دابینکردنی دانەوێڵەی دابنێین. لەکۆن و ئێستادا بۆ دانیشتوانی دەوروبەری ئەم شارە، هەر لەبەر ئەوەش بووە ئەو شارە لەدونیای کۆندا هەمیشە رووبەرووی داگیرکردن بووەتەوە لەلایەن زلهێزەکانی وڵاتی دوو رووبار، بۆ گەیشتن بە دانەوێڵەیەکی زۆرتر.

بەڵام لەرووی جوگرافییەوە ئەم شارە لە باکوورییەوە زێ (زاب)ی گەورەیە و، لە باشوورییەوە زێی (زاب) بچووکە، کە ئەم دوو زێیە بە شێوەیەکی بەردەوام لە سەردەمە جیاوازەکاندا ناویان لە سەرچاوە مێخییەکاندا هاتووە، بە شێوەی زابا (zaba). لە بەشی باکووری خۆرهەڵاتییەوە زنجیرە چیاکانی زاگرۆسن، کە تا بەرەو باکوور و خۆرهەڵات برۆین بەرزایی ئەو چیایانە بەرز دەبێتەوە، لە خۆرئاوایەوە رووباری دیجلەیە. بەم شێوەیەش سنوورێکی دەوردراوی سروشتی دەوری ئەم شارەی داوە. کە بە دڵنیاییەوە ئەمەش

خۆراگری بەم شارە بەخشیوە، لەبەردەم داگیرکەران، بەڵام ئەوەی جێگای باسە ئەم شارە لە سەردەمانی کۆندا، بە چەند شێوەیەکی جیاواز ناوی هاتووە، لە تێکستە مێخییەکاندا بە شێوەیەکی بەرفراوان ئاماژە بەم شارە کراوە، سەرەڕای گرنگی ئەم شارە لە دونیای کۆندا، بەڵام تا ئێستا زانیاری کەمی لەسەر هەیە بە بەراوردکردن لەگەڵ گرنگی ئەم شارە، کە ئەمەش هۆکارەکەی بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە تا ئێستا نەتواندراوە هەڵکۆڵینی شوێنەواری تێدا ئەنجام بدرێ، بەهۆی هەڵکەوتی شوێنی قەڵاکەی و نەگونجانی بۆ هەڵکۆڵین. ئێمە بۆ زانیاریمان لەسەر ئەو شارە تەنیا دەتوانین پشت بەو تێکستە مێخییانە ببەستین کە ئاماژەیان بەو شارە کردووە لەسەردەمە جیاوازەکاندا، لەگەڵ دۆزینەوەی هەندێ هەڵکەندراو لە قەڵای ئەو شارە کە لێرەدا دەیانخەینە روو.

ئەم شارە لە کۆندا تەنیا ئەو قەڵایە بووە کە لەکاتی ئێستادا دەکەوێتە سەنتەری شارەکە.

دوای تەواوبوونی سەردەمی دەوڵەتی شار، لە باشووری وڵاتی دوو رووبار، سۆمەرییەکان لە سەردەمی (فجر السلالات الثالث)، هەندێ لە پادشایانی شارەکانی باشووری وڵاتی دوو رووبار، هەوڵیان داوە دەسەڵاتی خۆیان بەرفراوان بکەن و دەست بگرن بەسەر زەوییەکانی دەوروبەریاندا، تەنانەت هەندێ لەوانە ناوی پادشای چوار هەرێمیان لەخۆ ناوە، بە دڵنیاییەوە هەندێ لەو پادشایانە توانیویانە دەسەڵاتی خۆیان بگەیێننە کوردستانی باشوور.

یەکێ لەو پادشایانە کە خۆی بە پادشای هەر چوار لای جیهان ناساندووە (لوگال ئەننیموندو lugalannemundu)ە پادشای شاری (ئەداب adab)ە کە لە سەدەی (٢٦پ.ز) فەرمانڕەوا بووە، توانیویە لە هێرشەکانیدا دەست بگرێ بەسەر هەریەکە لە (ئیلام elam، و مارهاشی marhashi، گوتیوم gutium، سوبیر subir، مارتو martu.....) کە بە دڵنیاییەوە ناوی سێیەم و چوارەم دەکەونە خاکی باشووری کوردستان، بەڵام لەوانەیە بتوانین شوێنەکەیان لە دەوروبەری کەرکوکەوە تا گۆمی حەمرین دیاری بکەین. لەو سەردەمەدا، سەرەڕای هەبوونی واتایێکی زۆر بەرفراوانتر، بۆ ناوی چوارەم کە هەندێ جار یەکسان دەکرێ بە هەموو خاکی کوردستانی گەورە. پادشایێکی تر کە باسی لە داگیرکردنی باشووری کوردستان کردبێ (یاناتوما e-ana-tuma) (٢٤٥٤-٢٤٢٥ پ.ز) پادشای شاری (لگش) و زۆر لە پادشای تری سۆمەری لەو سەردەمەدا توانیویانە دەسەڵاتیان بگەیێننە ئەو هەرێمە.

بەدووری نازانین کە یەکەم ناوهاتنی شاری هەولێر لەو سەردەمەدا بووبێ. کە بەشێوەی (وربیلوم) هاتبێ ئەویش لەو تێکستەدا کە پەیوەندی هەبووە لەنێوان شاری (ئیبلا) و (وربیلوم). لەسەردەمی بنەماڵەکانی سێیەمدا، بەڵام نەمانتوانی ئەو سەرچاوە بەدەست بخەین، کە ئەم دەقەی تێدا بلاوکراوەتەوە لەبەر ئەوە ناتوانین شیکردنەوەیەکی زیاتری پێ بدەین لەڕووی چۆنیەتی نووسینی ناوەکە و چۆنییەتی پەیوەندییەکە. هەروەها شاری (ئیبلا) پەیوەندی و هاوپەیمانی لەگەڵ شاری (خەماز)یشدا هەبووە کە ئەم شارەش دەکەوێتە خوار رۆژهەڵاتی هەولێرەوە، بەڵام لەکۆتاییدا ئەم هاوپەیمانییە کۆتایی پێ هاتووە بەهۆی هێرشی سۆمەرییەکان کە پادشای سۆمەری (می سالیم me-salim) (٢٥٥٠ پ.ز) توانیویە دەست بەسەر شاری (ئیبلا)دا بگرێ و کۆتایی بە هاوپەیمانەتییەکە بێنێ. کە پادشای شاری (لگش) بووە. بەدووری نازانین ئەگەر هەڵمەتی پادشایانی سۆمەری لەو سەردەمەدا گەیشتبێتە کەناراوەکانی دەریای ناوەڕاست کە شوێنی شاری (ئیبلا)ی لێ دیاری کراوە، ئەوە هەمان هەڵمەتی ئەو پادشایانە شاری (ئەربیل)یشیان گرتبێتەوە، بەڵام ئەمە تا ئێستا نەتواندراوە بسەلمێنرێ بەهۆی نەبوونی بەڵگەی نووسراوی ئەو سەردەمە لەبەر دەستمان کە ئەو گرفتەمان بۆ روون بکاتەوە.

بەکۆتایی هاتنی سەردەمی دەرکەوتنی بنەماڵەکانی سێیەم لە وڵاتی سۆمەردا، سەردەمێکی تر دەست پێ دەکات. کە ئەویش بە دەرکەوتنی دەوڵەتێکی زۆر بەهێزتر دەبێ بە بەراوردکردن لەگەڵ پێش خۆیدا، کە ئەویش دەوڵەتی (ئەکەدی)یە، یەکەم پادشای ناسراوی ئەو دەوڵەتە (سەرجون)ی ئەکەدییە (٢٣٣٤-٢٢٧٩ پ.ز). دوای ئەوەی ئەم پادشایە توانیویە دەست بگرێ بەسەر وڵاتی سۆمەر و هێرشی بردۆتە سەر وڵاتی ئیلام و سیمورووم، کە ئەوەش ئەوەمان بۆ روون دەکاتەوە کە ئەم پادشایەش توانیویە بگاتە کوردستان چونکە (سیمورووم) دەکەوێتە کوردستان و لەدوای ئەو دوو پادشای تری ئەکەدی فەرمانڕەوایی دەگرنە دەست کە ئەوانیش (ریموش)

(٢٢٧٨-٢٢٧٠پ.ز) و (مانیشتوشو) (٢٢٦٩-٢٢٥٥ پ.ز).

لەدوای ئەم پادشایە پادشای بەهێزی ئەکەدی (نارام-سوین) (٢٢٥٤-٢٢١٨ پ.ز) فەرمانڕەوایی لەوڵاتی ئەکەد دەگرێتە دەست کە توانی دەست بەسەر هەموو ناوچەکانی دەوروبەریدا بگرێ، کوردستان بەشێ بوو لەو ناوچانەی کەوتە ژێر دەسەڵاتی ئەو پادشایە، بەشێوەیەک کە دەسەڵاتی لە باشوورەوە تا کەنداوی عەرەبی و لەرۆژهەڵاتەوە تا وڵاتی ئیلەم و لە باکوورەوە تا نزیک شاری (ئامەد)ی ئێستا و لە رۆژئاواوە تا دەریای ناوەڕاست بووە، بەڵام لە ناوهێنانی ساڵەکانی فەرمانڕەوادا، هیچ ساڵێکی ناونەناوە بەناوی داگیرکردنی (وربیلوم) و هیچ ئاماژەیەکی بەو شارە نەکردووە، بەڵام لەدوای ئەم پادشایە، پادشایەکی تری لاوازی ئەکەدی دەسەڵات دەگرێتە دەست بەناوی (شارکەلیشاری) (٢٢١٧-٢١٩٣پ.ز) کە لەو سەردەمدا دەوڵەتی ئەکەدی بەرەو نەمان دەچوو بەدەستی (گوتییەکان و لولوبییەکان) کە بە بەردەوامی لە باکوورەوە هێرشیان دەکردە سەر، ئەمە سەرەڕای ئەوەی کە دوو پادشای تر لەدوای ئەو پادشایە دەسەڵاتی ئەکەدییان گرتۆتە دەست، بەڵام لە کۆتاییدا ئەم دەوڵەتە بە دەستی (گوتییەکان) کۆتایی دێ و بەو شێوەیە (گوتییەکان) نزیکەی ١٠٠ ساڵ دەسەڵاتی وڵاتی دوو رووبار دەگرنە دەست.

بەڵام ئەوەی جێگای بایەخە هاوکات لەگەڵ سەردەمی فەرمانڕەوایی ئەکەدیدا، ناوێکی خوری بەرچاو دەکەوێ کە فەرمانڕەوایی شاری (وربیلوم)ی کردووە کە ناونرابوو (تالپوزاتیلی talpuzatili) کە ئەو بەدڵنیاییەوە (نیریشخوخا nirshuqha)یە، وەک لەم تێکستە مێخییەدا باسی دەکرێ (NI-RI-IS-HU-HA-EN-(SI) ur-bi-lumki) بە واتای (نیریشخوخە فەرمان (ڕەوای) شاری وربیلوم). زۆر ناوی تری هاوشێوەی ئەو ناوە خورییە دەبینرێ، لە سەردەمە جیاوازەکاندا لەوانەش (نیشخوخە NI-IS-hu-ha) لەشاری (نوزی)، لە سەردەمی (سەرجوونیدا) بەشێوەی (ئەریخوخە A-RI-HU-HA) دەردەکەوێ، لە سەردەمی بنەماڵەی ئوری سێیەم بەشێوەی (شوبیشخوخا SU-BI-IS-HU-HA) دەردەکەوێ و زۆر شێوازی تر لە سەردەمەکانی تر.

لێرەدا ئەوەمان بۆ دەردەکەوێ لە سەردەمی (ئەکەدی) شاری (وربیلوم) شارێکی (خوری) نشین بووە و هەر لە لایەن ئەوانیشەوە فەرمانڕەوایی کراوە کە ئەمەش بەڕوونی لەو دێرە مێخییەی سەرەوەدا بەدەردەکەوێ، کە مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی ئەکەدی.

ئەگەر ناونانی (تالبوزاتیلی talpuzatili) هەر هەمان ناوی (نیریشخوخا nirishuha) بێ، ئەوە ناودکە و سەردەمەکەش یەکانگیر دەبێ لەگەڵ سەردەمی ئەو فەرمانڕەواییەی کە (ئەریدو- بزر)ی پادشای گوتی لەشاری (نەفر)ی سۆمەری ناوی بردووە، کە هاوکات بووە لەگەڵ سەردەمی ئەکەدی، کە لە تێکستێکیدا باس لە سەرکەوتنی بەسەر ئەو پادشایەدا دەکات، یان دەشێ ناوێک چەند جارێ دووبارە بێتەوە کە ئەمەش بەزۆری لەمێژووی کۆنی پادشایاندا دەبینرێ، بەڵام ئێمە لێرەدا ئەو بەشە تێکستەی، کە پەیوەندی هەیە بە شاری (وربیلوم) دەیخەینە روو، کە بەڕێز مامۆستا (رافدە) لە کۆنفرانسی نوژەنکردنەوەی قەڵای هەولێر تێکستەکەی بە کاملی خستۆتە روو.

**ئەمە ئەو بەشەیەتی کە تایبەتە بەشاری (ئەربیل):**

(لەرۆژی داگیرکردنی قەڵای وربیلوم، لە شاخی موما، لەدوای نیریشخوخای فەرمانڕەوای ئوربیلوم گرت).

واپێ دەچێ ئەو ناوانە هەردووکیان یەک کەس بن، لەیەک سەردەمدا، بەڵام لەدوای رووخانی دەوڵەتی ئەکەدی و هاتنە سەر تەختی گوتییەکان کە چەندان پادشای گوتی فەرمانڕەواییان گرتۆتە دەست لە وڵاتی دوو رووباردا و لەدوای فەرمانڕەوایی گوتییەکان، سەردەمێکی نوێ دێتە ئاراوە کە ئەویش سەردەمی بنەماڵەی ئوری سێیەمە کە دوایەمین فەرمانڕەوای سیاسی سۆمەرییەکانە لەوڵاتی دوو رووباردا، کە هەندێ پادشای بەهێز لەناو ئەو بنەماڵەیەدا دەسەڵاتیان گرتە دەست و توانییان دەست بگرن بەسەر هەموو بەشەکانی وڵاتی دوو رووباردا. بەناوبانگترینیشیان (شولگی)یە (٢٠٩٤- ٢٠٤٧پ.ز) کە ئەم پادشایە توانیوبە دەسەڵاتی خۆی بە شێوەیەکی بەرچاو بەرفراوان بکا، کە (هەولێر) یەکێک بووە لەو شارانەی کە توانیویە دەسەڵاتی خۆی بەسەردا بسەپێنێ. کە لەناونانی ساڵەکانی فەرمانڕەوای لە دوو ساڵدا ئاماژەی پێکردووە کە لێرەدا

دەیانخەینە روو. ئەو هەڵمەتەی کە لە ساڵی (٤٥)ی فەرمانڕەوایی ئەنجامداوە بەم شێوەیە:

**Mu (d) szul- gi- nita- kalag- galugal- ur2i (ki)- ma- lugal- an- ub- da- limmu2- ba- ke4- ur- bi2- lum (ki) / ar- bi2- lum (ki)- si- mu- ru- um (ki)- lu- lu- bu (ki) u3 kara2- har (ki)- 1- sze3/ asz- sag- du- bi- szu- bur2- a- bi2- ra- a/ im- mi- ra)**

بە واتای (ئەو ساڵەی شولگی پیاوی بەهێز بوو، پادشای شاری (ور)، پادشای هەر چوار لای جیهان، لەناوی بردن، سەرکردەکانی ئوربیلوم، سیموروم، لولوبو، کاراخار، لە یەک هێرشدا)

لە ساڵی (٤٦)ی فەرمانڕەوایشدا ئاماژەی بە (ئوربیلوم) کردووە، بەم شێوەیە:

**(mu- us2-sa- ur-bi2- lum- ki-ba- hul)**

بە واتای (ساڵی دوای ساڵی وێرانکردنی ئوربیلوم).

بەم شێوەیە لەو سەردەمەدا زۆر جاران ناوی ئەم شارەمان بەرچاو دەکەوێ بەشێوەی (ئوربیلوم)، کە ئەمە نەک تەنیا لە تێکستە سەربازییەکان بەرچاو دەکەوێ، بەڵکو لە زۆر تێکستی کارگێری و ئابووریشدا بەرچاو دەکەوێ، لەگەڵ داگیرکردنی ئەو شارەشدا باس لە داگیرکردنی زەوی (شاشروم sasrum)یش دەکات، کە دەکاتە گردی (شمشارە)ی ئێستا لە خوارووی شاری (رانیە).

پادشایێکی تری ئەو بنەماڵەیە، کە باسی (ئوربیلوم)ی کردبێ (ئامار سوینا) (٢٠٤٦-٢٠٣٨پ.ز) کە لە ساڵی دووەمی فەرمانڕەواییدا باس لە داگیرکردنی شاری (بیلوم) دەکات بەم شێوەیە:

**(mu- (d)- amar- (d)en- zu- lugal- e- ur- bi2- lum(ki)- mu- hul).**

بەواتای (ساڵی پادشا ئامارسین وربیلومی وێران کرد).

لە ساڵی سێیەمی فەرمانڕەواییدا باسی لە ئوربیلوم کردووە، بەم شێوە:

**(mu-us2 sa(d) amar (d)en-(zu) lugal-e- ur- bi2- lum (ki)-mu- hul.**

بە واتا (ساڵی دوای ساڵی وێرانکردنی وربیلوم لەلایەن پادشا ئامارسیەوە).

هەندێ نووسراوی تری مێخی ئەم پادشایەمان لەبەر دەستە کە ئاماژە بە شاری (وربیلوم) دەکات کە لێرەدا دەیانخەینە روو: بڕوانە نووسراوی تابلۆی (١، ٢).

بەڵام بە پێویستی دەزانم، کە مانای گشتی هەریەکە لەم دوو تابلۆیە لێرەدا بخەمە روو بۆ ئەوەی واتای تابلۆکان روونتر دەربکەوێ، چونکە وەرگێرانی سەرەوە، وەرگێرانێکی وشەییە:

**مانای گشتی تابلۆی یەکەم:**

(پێنج چێڵی هەراش بۆ لودینگرەی کوڕی یدخولە،

تابلۆی(١)

مانای نووسراوەکە تابلۆی (١)
رووی پێشەوە
١- ٥ چێڵی هەراش
٢- بۆ لودینگرەی کوڕی یدخولە.
٣- شولگی- نەیەمو رازی بوو بوو.
٤- مانگ لە ٢٨ مین رۆژیدا بوو

رووی دواوە
١- نووسینی لەسەر نییە
٢- مانگی (خواردنی قەرخە بەرازەکە).
٣- ساڵی ئامار سوێن ئوربیلومی وێران کرد.

خوێندنەوەی نووسراوە مێخییەکە
رووی پێشەوەی تابلۆکە
1-5ab2-mah2.
2- ki-lu2-dingr-ra-dumu-ir11-hul3-la-ta.
3-dsul-gi-a-mu-i3-dab5
4-iti-u4-28ba-zal

رووی دواوەی تابلۆکە
١- نووسینی لەسەر نییە.
2-iti-ses-da-gu7.
3-mu-damar-dsuen-ke4-ur- bi2-lumki-mu-hul.

تابلۆی(٢)

مانای نووسراوەکە
رووی پێشەوە
١- نێرییەک، لە (٢٥)ەمین رۆژ
٢- (١٤٦) مەڕ و بزنی جۆراو جۆر
٣- لە (٢٦)ەمین رۆژدا
٤- دەیداتە
٥- ورکونونا

رووی دواوە
١- رازی بوو بوو
٢- نووسینی لەسەر نییە.
٣- مانگی فێستیڤاڵە مەزنەکە.
٤- ساڵی ئامارسوین ئوربیلومی وێران کرد.

لێواری چەپی تابلۆکە
١٤٧ -١

خوێندنەوەی نووسراوە مێخییەکە
رووی پێشەوە
1-1mas2- u4- 25- kam
2-2.26 udu- mas2hi-a
3- u4- 26- kam
4- MU-DU.
5- UR-KU3- NUN- NA.

رووی دواوەی تابلۆکە
1- i3- dab5.
٢- نووسینی لەسەر نییە
3- iti- ezen- mah
4- mu- damar- dsuen- lugal. E- ur- bi2- lumki- mu- hul.

لێواری چەپی تابلۆکە
١-٢،٢٧.

شولگی- ئەیەمو لە بیست و هەشتەمین رۆژی مانگەوە رازی بووە. مانگی خواردنی فەرخە بەرازەکە، ئەو ساڵەی ئەمارسن شاری ئوربیلوم وێران کرد).

**مانای گشتی تابلۆی دووەم:**

(نیریک لەبیست و پێنجەمین رۆژ و سەد و چل و شەش مەڕ و بزنی جۆراو جۆریش لە بیست و شەشەمین رۆژدا دەدرێتەوە ورکونونە. رازی بوو بوو لە مانگی فێستیڤاڵە مەزنەکە لەو ساڵەی ئەمەرسوین وربلومی وێران کرد. سەد و چل و حەفت).

زۆر هاتنی ناوی هەولێر بەشێوەی (وربیلوم urbilum) لە سەردەمی سۆمەری نوێدا گرنگی ئەو شارەمان بۆ دەردەکەوێ لەو سەردەمەدا. بەڵام ئەوەی جێگای بایەخە کە ئەم شارە هەندێ جار کەوتۆتە ژێر دەسەڵاتی ئەو هێزانەی فەرمانڕەوا بوون لەوڵاتی نێوان دوو رووباردا، ئەمە لەکاتی بەهێزی ئەو دەسەڵاتانەدا، بەڵام هەر کاتێ ئەو هێزانە بەرەو کزبوون دەچوون، ئەوە ئەو شارە وەک یەکەیەکی سیاسی و رامیاری سەربەخۆ دەسەڵاتی خۆی بەڕێوە بردووە.

لەدوای کۆتایی هاتنی دەسەڵاتی بنەماڵەی ئوری سێیەم، بۆ ماوەیەک بێ دەنگی لە باکووری وڵاتی نێوان دوو رووبار دەبینرێ، بە تایبەتیش زەوییەکانی خۆرهەڵاتی رووباری دیجلە، بەڵام دوای ماوەیەک دەوڵەتێکی دیکە لەم ناوچەیەدا سەر هەڵدەدا بەناوی دەوڵەتی (ئاشووری)، کە بە سەردەمی ئاشووری کۆن ناسراوە، یان بەناوی پادشا بەهێزەکەیەوە (شمشی- ئەدەد) دەناسرا، ئەو دەوڵەتە لە سەرەتای دروستبوونی دەوڵەتی (ئاشوور) دەوڵەتێکی بێ هێز بوو، بەشێوەیەک، کە هەریەک لە شارەکانی دەوروبەری سەربەخۆ بوون و فەرمانڕەوایەتی خۆیان دەکرد، لەوانەش هەریەکە لە شارەکانی (گاسور، ئەراپخا، ئاشوور، وربیل) بەشێوەی دەوڵەتە شار فەرمانڕەواییان تێدا بەڕێوە دەچوو، بەڵام لە دواییدا لەسەر تەختی دەوڵەتی ئاشووری چەند پادشایەکی بەهێز دەرکەوتن، کە بەهێزترینیان (شمشی- ئەدەد)ە، (١٨١٤-١٧٨٢ پ.ز) ئەم پادشایە توانی بەرادەیەک دەسەڵاتی فەرمانڕەوایی دەوڵەتەکەی خۆی بەرفراوان بکات، کە دەسەڵاتی بەسەر هەموو زەوییەکانی دەوروبەردا گرت. شاری (ئیکالاموی)ی لە رۆژئاوای رووباری دیجلە کردە پایتەختی خۆی، توانی دەسەڵاتی خۆی بسەپێنێ بەسەر هەریەکە لە شارەکانی (ئاشور، نەینەوا، وربیل، ئەراپخا، گاسور....).

ئەوەی شایەنی باسە داگیرکاری ئاشوورییەکان لە زەوییەکانی خۆرهەڵاتی رووباری(دیجلە) بە هاوپەیمانی بووە لەگەڵ شانشینی (ئەشنونا)، کە هەردوو پادشای دەسەڵاتدار (شمشی- ئەدەد)ی ئاشووری، لەگەڵ پادشا (دادوشا) پادشای (ئەشنونا) کە هاوزەمانی یەکتری بوون، بەیەکەوە توانیویانە ناوچەیەکی بەرفراوان داگیر بکەن.

ئەم دوو هاوپەیمانە توانیویانە، سێ دەوڵەتە شاری سەربەخۆی زۆر بەناوبانگ داگیر بکەن، کە ئەوانیش (ئاشوور، نەینەوا، وربیل)ن، (دادوشا) لەو هەڵکەندراوەی، کە بەبۆنەی ئەو سەرکەوتنانەی لە زەوییەکانی خۆرهەڵاتی رووباری (دیجلە) بەدەستی هێناون دروستی کردووە، باسی سەرجەم ئەو شارانەی کردووە، کە داگیری کردوون، لەدوای ئەوەی لەماوەی (١٠) رۆژدا شاری (قەبرا)ی، داگیر کردووە، باس لە کەسێ دەکات بەناوی (بوونو-یشتەر bunu-istar)، کە پادشای شاری (وربێل urbel) بووە.

لەو هەڵکەندراوەی کە بە هەڵکەندراوی سەرکەوتنی (شمشی- ئەدەد) ناسراوە، کە ئێستا لە مۆزەخانەی (لۆڤەر)ە لە پاریس، تێیدا باس لە داگیرکردنی هەموو ئەو شارۆچکە قایمکراوانە دەکەن لە زەوی (وربیل) لە مانگی (مەقرەنو)دا. کە لێرەدا ئەو بەشەی باس لە شاری (وربێل) دەکات دەیخەینە روو لە ستوونی سێ لەدێڕی حەوتەوە دەست پێ دەکات تا دێڕی پازدە:

ئەمەش دەقی خوێندنەوە مێخییەکەیەتی:

**7- Oa- la- ni-da-an- na- ti- 8- sa- ma-a-at- ur- be2- e-el. 9-ka-va- su- nu. 10 i-na- iti- ma- aq- ra- nim. 11- u2- sa-ab- bi- it- ma 12- bi-ra- ti-ia. 13- lu- u2- as2-ta- ak- ka- an.14- qa- ab- ra- aki).**

بە واتای:

(هەموو شارۆچکە شووردراوەکانی زەوی وربێل (urbel)م، لە مانگی مەقرانو داگیر کرد، لە هەموو شوێنێکدا قەڵاکانی خۆمم لێ دامەزراند. شاری قەبرە....). کە لێرەدا ئەوەمان بۆ روون دەبێتەوە، کە شاری (هەولێر) بەشێک بووە لە دەسەڵاتی فەرمانڕەوای ئاشوورییەکان، بەڵام لەدوای مردنی (شمشی- ئەدەد)

دەسەڵاتی ئاشوورییەکان بەرەو کزبوون چوو تا وای لێ هاتبوو دەسەڵاتەکەیان لە شاری (ئاشوور) زیاتر بڕی نەدەکرد. کە لەو کاتەدا شارەکانی (وربێل و نەینەوا) سەربەخۆ بووبوون لە دەستی دەسەڵاتی ئاشوورییەکان.

لە بەشی ناوەڕاستی وڵاتی نێوان دوو رووبار پادشایەکی بەهێز دەردەکەوێ کە ئەویش (حامورابی)یە، (١٧٩٢-١٧٥٠پ.ز). ئەم پادشایە توانیویە دەسەڵاتی خۆی بگەیێنێتە ناوچەکانی باشووری کوردستانی ئەمڕۆ، کە تێیدا ناوی ئەو ناوچانەی هێناوە کە هێرشی کردوونەتە سەر، لەوانەش (گوتییەکان، لولوییەکان، سیمورووم، سۆبارتۆ....) و بەم شێوەیەش توانیویە بگاتە رووبەرێکی بەرفراوانی باشووری کوردستان.

لە دوای کۆتایی هاتنی دەسەڵاتی سەردەمی ئاشووری کۆن، لە باکووری وڵاتی نێوان دوو رووباردا دەسەڵات دەکەوێتە دەست (خورییەکان) کە بە دەوڵەتی (میتانی) ناسراوە، کە ئەو شارانە هەموویان دەکەوتنە ژێر دەسەڵاتی ئەو دەوڵەتەوە، کە شارەکانی (گاسوور، ئەراپخا، ئاشوور، نەینەوا، وربیل) لەو دەسەڵاتە بەدەر نەبوون، بەڵکو مەرکەزی کارگێری ئەو دەوڵەتە بوون. لەو سەردەمەدا شاری وربیل گرنگی ئایینی زۆری هەبووە، زۆر پیرۆز بووە بەجۆرێ کە چۆن ئێستا شاری (مەکە) پیرۆزە لای موسڵمانان. پاشایانی مەزن مەزن بۆ حەجکردن روویان لەشاری (وربیل) دەکرد، هەروەک چۆن (موسایسر)ی بووبووە قیبلەی (خالیدییەکان)،ماڵی خوداوەندی (عشتار) لەو شارەدا بووە، کە لەلای خورییەکان بە (شاوشکا) ناسرابوو.

جارێکی تر سەرهەڵدانی دەسەڵاتی ئاشووری دەست پێدەکاتەوە، کە لەو سەردەمەدا گرنگی زیاتر بە شاری (ئەربیل) دراوە، بە شێوەیەک کە بە شاری دووەم، یان دەتوانین بڵێین بە پایتەختی دووەمی ئاشووری دانراوە لە سەردەمە جیاوازەکانی ئەو ماوەیەی ئاشووری، کە بە شێوەیەکی روون لە سەردەمی پادشای ئاشووری (ئەشوور-ئوبالت) (١٣٦٥-١٣٣١پ.ز) دەست پێدەکات تا کۆتایی هاتنی یەکجارەکی دەسەڵاتی ئاشووری لە ساڵی (٦١٢ پ.ز) بەدەستی (میدییەکان و بابلییەکان)، بەڵام لە ماوەی ئەو سەردەمە دوور و درێژەدا، هەندێ جاران ئەو دەوڵەتە بەهێز و هەندێ جارانیش بێ هێز بووە، بەڵام لەهیچ یەکێ لەم بارانەدا شاری (ئەربیل) گرنگی خۆی لەدەست نەداوە، مەڵبەندێ بووە بۆ رێکخستنی سوپای ئاشووری و ئامادەکردنیان بۆ هێرشبردنە سەر دوژمنان، بە تایبەتیش بۆ ناوچەکانی باکووری خۆرهەڵات، چونکە ئەم شارە مەڵبەندی خوداوەندی شەڕ (عەشتار) بووە، کە پێش ئەنجامدانی هەر هێرشێک لەلایەن پادشایانی ئاشوورەوە بۆ سەر دوژمنەکانیان دەهاتن لەبەردەمی ئەو خوداوەندە دەپاڕانەوە بۆ ئەوەی لە شەڕەکەدا سەریان بخا کە ئەمەش لە (ئاشوور-پانیپال) بە دەردەکەوێ کاتێ بەرەو شەڕکردن دەڕوا دژی پادشای (ئیلامی) (تیومان). هەروەها ئەم شارە گرنگترین شاری پێشبینی کردن بووە، کە لەسەر جەرگی گیانەوەران ئەنجام دەدرا کە لە سەردەمی کۆندا گرنگییەکی زۆری پێدراوە لە پەرستگای (ئێگاشانکالاما)ی پەرستگای خوداوەند (عەشتار).

ئەوەی شایەنی باسە کە پادشایانی ئاشوور زۆر بە کەمی باسی داگیرکردنی شاری (ئەربیل) دەکەن، کە ئەمەش ئەوەمان بۆ روون دەکاتەوە کە ئەو شارە لەو سەردەمەدا مەڵبەندێکی گرنگی ئاشوورییەکان بووە کە بە بەردەوامی لەژێر دەستی خۆیاندا بووە. پادشای ئاشووری (ئاشوور ناسربالی دووەم) (٨٨٣-٨٥٩پ.ز) ئەم پادشایە بۆ داگیرکردنی ناوچەکانی باکووری- خۆرهەڵات هەریەکە لە شارەکانی (ئەربیل و نەینەوا و ئاشووری) وەک بنکەیەکی سەربازی بەکارهێناوە، بەڵام لە کۆتایی فەرمانڕەوای (شلمنسری سێیەم) لەسەر دەسەڵات گرتنە دەست ناکۆکی کەوتۆتە نێوان کوڕەکانی، بەوەش زۆربەی شارەکانی ژێر دەسەڵاتی ئاشووری سەربەخۆییان راگەیاندووە، بەڵام لەدواییدا پادشای ئاشووری (شمشی-ئەدەدی پێنجەم) (٨٢٣-٨١١پ.ز) توانیویە هەموو شارەکان بگەڕێنێتەوە ژێر دەسەڵاتی ئاشووری: وەک شارەکانی (نەینەوا، ئەربیل، ئاشوور، ئاراپخا).

پادشای ئاشووری (شلمنسری سێیەم) (٨٥٨-٨٢٤پ.ز) لەکاتی هێرشەکانیدا باسی لە شاری (ئەربیل) کردووە بەم شێوەیە:

**(kur- kir3- ru- ri- ina- sag- uru- arba- ilu- u- si-a).**

بە واتای:

(هاتمە دەرێ لە زەوی کێروری لە سەرووی ئەربەیلو)، وە لەو سەردەمەدا وەک هەموو سەردەمەکانی تر (هەولێر)

بنکەیەکی سەرەکی ئاشوورییەکان بووە.

سەردەمی پادشایەکی تر دەردەکەوێ کە توانی هەموو ناوچەکانی رۆژهەلاتی ناوین بخاتە ژێر رکێفی دەولەتەکەی کە ئەویش (سەرجونی دووەمە) کە بە یەکێ لە هەرە پادشا بەهێزەکانی (ئاشووری) لە قەلەم دەدرێ، توانی ئیمپراتۆرییەتی ئاشووری دابمەزرێنێ. (سەرجون) لە ماوەی سالانی (٧٢١- ٧٠٥پ.ز) فەرمانڕەوایی ولاتەکەی کردووە، کە لە چەندان تێکستدا باسی (ئەربیلی) کردووە کە لێرەدا هەولدەدەین هەندێ لەو تێکستانەی پەیوەندییان بەو شارەوە هەیە بیخەینە روو:

**(sa-tas- pur- an- ni- ma- a- lu- a- sip- ri- sa-(m)ur- r-bal-a).**

بە واتای (تۆ چیت بۆم نووسیوە، نامەکەم لە وربالا بۆ سەرۆکەکە بێنە).

لە دێرێکی تردا دەلێ:

**(sa-tas- pur- an- ni- ma-a- (m)ur- bal- a- ina- u (gu-s)a- uru a- tu2- na- a-a)**

بە واتای (وەک تۆ کە چیت بۆ نووسیوم، بلێ وربالا (بنووسە؟) بۆم لەبارەی راستی ئەو پیاوەی ئەتونا).

سەرجونی پادشای ئاشووری هەولێری بەکارهێناوە بۆ رێکخستنی سوپاکەی بۆ هێرشکردنە سەر ناوچەکانی ژێر دەسەلاتی دەولەتی (ئۆرارتۆ) لەباکووری ولاتی ئاشوور، بەلام لەدوای کۆتایی هاتنی سەردەمی ئەو پادشایە کورەکەی (سەنحاریب) (٧٠٤- ٦٨١پ.ز)ەوە، دەسەلاتی ئاشوور دەگرێتە دەست، لە سەردەمی ئەم پادشایەدا، هەولێر گرنگییەکی لەرادەبەدەری پێ دراوە و دووەمین شاری گرنگی ئاشوورییەکان بووە، پرۆژەی ئاوی بۆ شاری (ئەربیل) راکێشاوە کە ئەم پرۆژەیە بابەتێکی بە کاملی لە لایەن شوێنەوار ناسی عێراقی (فوئاد سەفەر)، لە گۆڤاری سۆمەر لەژمارە (٣) بەشی یەکەمدا لەسەر نووسراوە، بەلام بەداخەوە نەمتوانی ئەم بابەتە بەدەست بخەم بۆ ئەوەی لەم بابەتەدا سوودی لێ وەرگرم بە تایبەتی لە نووسینە مێخییەکەی.

(ئەسەرحەدون) (٦٨٠-٦٦٩ پ.ز) لەدوای باوکی دەسەلاتی گرتۆتە دەست، بەخۆی پرۆپاگەندەی ئەوەی بۆ خۆی کردووە کە گوایە لەنێوان براکانیدا بەرز کراوەتەوە بۆ فەرمانڕەوایی دەولەتی ئاشووری لە لایەن خوداوەندەکانەوە کە خوداوەندەکانیش ئەمانەن (ئاشوور، سن، شمش، بعل، نابو، عەشتاری ئەربیل) کە لێرەدا گرنگی خوداوەندی (عەشتاری ئەربیل)مان بۆ دەردەکەوێ مادام دەسەلاتی هەبووبێ لە دانانی فەرمانڕەوایی ولاتدا.

پادشایەکی تر کە بەناوبانگی ئاشووری بەناوی (ئاشوور پانیپال) (٦٦٨- ٦٢٧پ.ز) دەسەلات دەگرێتە دەست ئەم پادشایە کاتێ لە (ئەربیل) دەبێ لە کۆتایی هاوینی سالی (٦٥٣پ.ز) هەوالێکی ناخۆشی پێ دەگات لەبارەی هێزەکانی پادشای ئیلامی (تیومان) کە لەشکرکێشی دژی (ئاشوور پانیپال) دەست پێ کردووە، ئەم پادشایەش پەنا دەباتە بەر خوداوەندی (عەشتار) لە (ئەربیل) کە خوداوەندی جەنگ بووە، کە ئەم خوداوەندە (ئاشوور پانیپال)ی لە جەنگەکە سەر خستووە. بەم بۆنەیەوە (ئاشوور پانیپال) هەلکەندراوێکی بۆ ئەمە تەرخان کردووە کە سەرە لێکراوەکەی (تیومان)ی بەدارەوە هەلواسیوە، کە ئەم نەخشەیە لە (نەینەوا) دۆزراوەتەوە، ئێستا لە(پاریس)ە. کاتێ ئەم پادشایە پێشوازی لە(روسا)ی دووەمی پادشای (ئۆرارتۆ) کردووە، لەوانەیە هەر لە شاری (ئەربیل) پێشوازی لەم پادشایە کردبێ.

لەدوای مردنی ئەو پادشایە دەولەتی ئاشووری بەرەو هەلوەشان و لەناوچوون دەچوو بەجۆرێ کە راپەڕین لە هەموو هەرێمەکانی ژێر دەسەلاتی ئەم دەولەتە دەستی پێکرد، کەوا پێدەچێ لە سالی (٦١٥ پ.ز) شاری (ئەربیل) کەوتێتە دەستی (میدییەکان) کە (کیاکسەر) پادشای (میدی) توانیبێتی دەسەلاتی بگەیێنێتە ئەو شارە.

هەروەها هەندێ تێکستی تری مێخیمان لەبەر دەستن کە بە شێوەیەکی دەقیق مێژووەکانیان نازانرێ، بەلام وا پێ دەچێ مێژووەکەیان بگەڕێتەوە بۆ سەردەمی فەرمانڕەوایی (ئاشوور پانیپال) کە لێرەدا دەیانخەمە روو:

ئەم تێکستەی خوارەوە ئەو شتومەکانە دەگرێتەوە کە پێشکەشی پەرستگای خوداوەندی (عەشتار)یان کردووە لە (ئەربایلو): تابلۆی (٣):

**(1- (aban) kunukku(m) sa2- kil-ia 2- 1/2 ma- na- 1seqel- kaspi 3- sag- mes- sa- istar (al) arba- ilu. 4- sa (m) iz- bu. 5- ina- pani- (m) sa2 kil- ia. 6- ina- pu-u- hi- it- ti- si. 7- a- na rabu- tu2- su2- irabi (bi).**

بە واتای (١/٢ مەنەوییەک شیکیلی زیوی پایتەخت؟ بۆ ئیشتاری ئەربەیلو، بۆ خاوەنێتی بزبو، بەسەرپەرشتی شەگیلییە، ئەو وەریگرتووە بەگۆڕینەوە. ئەو چوارییەکی زیاد دەکات).

لە دەقێکی تردا باس لە (ئەربیل) کراوە، کە ئێمە تەنیا ئەو دێڕەی دەخەینە روو، کە پەیوەندیدارە بە (ئەربیل)، ئەویش دێڕی (١٠)یە لە تێکستەکەدا بۆ نووسینە مێخییەکەشی بڕوانە تێکستی (٣). ئەمانەی خوارەوەش دەقە مێخییەکەیەتی:

**10- (....?) (d) nabu (d) istar- sa- (al) arba- ilu)**

(خوداوەندی نەبوو، خوداوەندی ئیشتەر لە شاری ئەربەیلو (arbailu).

لە دوای سەردەمی ئاشووریش (هەولێر) گرنگی خۆی لە دەست نەداوە کە بە دڵنیاییەوە لەسەردەمی میدییەکان یەکێ لە مەڵبەندە گرنگەکانی کارگێڕی بووە، لەسەردەمی ئەخەمینیشدا هەر هەمان گرنگی خۆی لەدەست نەداوە، لەم سەردەمەدا رێگایەکی گرنگی هەبووە بە ناوی (رێگای پادشای) کە (ئەربیل) شوێنێکی گرنگی ئەم رێگایە بووە، لە دوای هاتنی (ئەسکەندەری مەقدۆنی) بۆ رۆژهەڵات لە شەڕێکدا لەنزیک (ئەربیل) لەگەڵ (داریوشی سێیەم) بەشەڕ هاتووە، کە ئەو شەڕە بەشەڕی (ئەربیلا) یان (گوگامیلا) ناسراوە، کە لەم شەڕەدا (ئەسکەندەر) سەرکەوتنی بەدەست هێناو توانی کۆتایی بە فەرمانڕەوایی (ئەخەمینییەکان) بێنێ کە ئەمەش لە ساڵی (٣٣١پ.ز) روویداوە. لەدوای لە وڵاتی نێوان دوو رووبار سەردەمی سەلجوقی دەست پێدەکات. لەدواییدا هاتنی (فرسییەکان/ئەشکانییەکان) دەست پێدەکات، کە هەولێر لە هەموو فەترەکان گرنگی خۆی پاراستووە لەناوچەکەدا. لەسەردەمی سەلجوقی لە سەدەی دووەمی پێش زایینی (ئەربیل) لەژێر دەسەڵاتی فەرمانڕەوایانی (سکسییەکان) بووە، کە بەناوبانگترینیان (ئیزاتیس)ە و کەسێکی تر ناسراو (مونابازوس)ە کە لەو سەردەمدا میرنشینێ بەناوی (حەزیبا) یان (حەدیبا) کە لەلایەن ئەوانەوە بەرێوە دەبرا. ئەوەی شایانی باسە لەو سەردەمدا ئایینی (یەهودی) لەپاڵ ئایینەکانی تر لەو شارەدا هەبووە، لەکاتی بڵاوبوونەوەی ئایینی (مەسیحی) لەناوچەکەدا (هەولێر) یەکێک بووە لەو شارانەی کە ئەم ئایینەی تێدا بڵاوبووەتەوە، بەڵام ئەوەی جێگای باسە لە سەردەمی ساسانیدا هەر بەو شارە وتراوە (ئەربیرە arbira)، تەنانەت لە سەرچاوە ئیسلامییەکانیشدا لە زۆر جاردا هەر بە (ئەربیل) ناوبراوە.

بەڵام سەبارەت بەو گۆڕانکارییانەی، کە بەسەر ناوی ئەو شارەدا هاتووە بە پشت بەستن بە تێکستە مێخییەکان ئەو گۆڕانکارییانە لێرەدا دەخەینە روو:

یەکەم ناوهاتنی هەولێر بە شێوەی (وربیلوم urbilum) بووە کە ئەم ناو هاتنە لە سەردەمی کۆتاییەکانی ئەکەدی و سۆمەری نوێدا بەرچاو دەکەوێ، بەڵام ئەم شێوازە لە سەردەمی ئاشووری کۆندا بەشێوەی (وربیل urbel= urbe-e-el) دەردەکەوێ، کە ئەگەر بە سەرنجەوە بڕوانینە گۆڕانکارییەکانی ئەم ناوە، لە سەردەمی سۆمەری نوێوە بۆ سەردەمی ئاشووری کۆن گۆڕانێکی ئەوتۆی بەسەردا نەهاتووە کە بەپێی ئەو تێکستانەی لەبەر دەستماندان تەنیا یـ (i) گۆڕاوە بۆ (ێ (e)) لەگەڵ نەمانی پاشگری (um)، کە ئەمەش ئاساییە پاش ئەو فەترە دوور و درێژە ئەم جۆرە گۆڕانانە روودەدەن، بە تایبەتی گۆڕان لە زمانێکەوە بۆ زمانێکی تر. بەڵام دەشێ زۆر دەقی سەردەمی دووەمیش هەبن هەر بە هەمان نووسینی دەقی سەردەمی یەکەم بن. لەسەردەمی ئاشووری نوێیدا ئەو ناوە بە شێوەی (وربەلە urbala) دەردەکەوێ کە بە بەراورد لەگەڵ سەردەمی ئاشووری کۆن گۆڕان لە (ێ (e))وە بووەتە (ئە (a))، بەڵام لە فەترەیەکی درەنگتردا گۆڕانەکە بە شێوەیەکی تر دەبینرێ و ناوەکە بە شێوەی (ئەربەیلو arbailu) دەردەکەوێ، کە ئەویش بە گۆڕینی برگەیەکی سەرەکی ناوەکە و پیتی یەکەم لە (و (u)) و بۆ (ئە (a)) لەگەڵ زیادبوونی (یـ (i)) لەنێوان پیتی چوارەم و شەشەمدا، بەڵام گۆڕانی دواهەمین پیت لەو زمانەدا کارێکی ئاساییە، چونکە بەپێی حاڵەتی ئیعراب لە رستەدا ئەو پیتە گۆڕانی بەسەردا دێت.

گۆڕانەکە بەم شێوەیەی خوارەوە دەبینین:

**(urbilum urbel urbala arbailu arbira arbl aruil aulira hulera hauler)**

دەشێ دوای تێپەڕبوونی ئەو ناوە لە زمانێکەوە بۆ زمانێکی تر و گۆڕانی لە کۆتاییدا لەزمانی کوردیدا بۆ (هەولێر) بەکارێکی تا رادەیەک رەنگە سروشتی بزانین.

بەڵام سەبارەت بە واتای ناوەکە سەرەڕای هەبوونی بیروبۆچوونی جیاواز کە هەندێ پێیان وایە ئەو ناوە بەواتای چوار خوداوەند (arbailu) ) بێ، بەڵام من ئەم واتایە ڕەت دەکەمەوە، چونکە ئەو ناوە ڕیشەیەکی سامی نییە تا (arbailu) ) بە واتای (چوار خوداوەند) بێ، بەڵکو پاش چەند گۆڕانێ ئەو ناوە بووەتە (arbailu) )، کەواتە ئەگەر ئێمە بمانەوێ واتای ئەو ناوە بەدروستی بزانین دەبێ بگەڕێینەوە بۆ ئەو سەرچاوانەی، کەوا یەکەم جار ئەو ناوەیان بەکارهێناوە، کە ڕەنگە ئەوەش نەمانگەیەنێتە واتایەکی دروست، یان دەتوانین ئەوە دەستنیشان بکەین کە واتای وشەی (arbailu) لە زمانی ئەکەدی (ئاشووری) ئەوا واتای سەرەوە بگەیەنێ، کە بە واتای (چوار خوداوەند)ە بەم شێوەیە (arba) بە واتای (چوار) (ilu) بە واتای (خوداوەند)، بەڵام ئەمە بنەچەی ناوەکە نییە، بەڵکو ئەم ناوە لە سەرچاوەیەکی تر هاتووە، کە ڕیشەیێکی هەیە لەبەر ئەوە زانینی ئەو ناوە بەو واتایە بەهەڵەی دەزانم.

ئەگەر ناوەکە ناوێکی سۆمەری بێ، ئەوە بەپێی ئەو وشانەی ناوەکەیان پێکهێناوە، لەگەڵ واتاکەی ئەو سەردەمەدا گونجاوبێ، دەتوانین بەپێی واتای وشەکان مانای ناوەکە بزانین: بەم شێوەی خوارەوە بڕگەی یەکەم (ur) بە سۆمەری زۆر واتا لەخۆ دەگرێ، وەک (شەڕانگێز، پاڵەوان، پیاو، سەگ، کارەکەر، شەڕکەر...) بڕگەی دووەم (bi2) بە هەمان شێوە زۆر واتا لەخۆ دەگرێ، وەک (مەشخەڵی ئاگر، ئاگر) بڕگەی سێیەمی ناوەکە (lum) کەوا پێدەچێ کاریگەری زمانی ئەکەدی لەسەر بێ، بەزۆر واتا دێ، لەوانە (بەپیت، هەور، پڕ، هەبوون...).

هەریەکە لەو سێ بڕگانەی سەرەوە کە ناوەکەیان لێ پێکهاتووە چەند مانایەکی لە یەکتر جیاوازیان هەیە کە دەبێ بتوانین لە هەریەکەیان مانایەکی گونجاو هەڵبژێرین بۆ ئەوەی واتایەکمان دەست بکەوێ کە لەگەڵ بارودۆخی سروشتی ناوچەی هەولێر بگونجێ کە ڕەنگە مانای ناوەکە بەیەکەوە بە واتای (ناوچەی پڕ لە هەڵگیرسانی شەڕانگێزی) بێ یان بەواتای (زەوی شەڕانگێز) بێ، کە ڕەنگە هۆکاری ئەم ناوەش بۆ ئەوە بگەڕێتەوە، کە سۆمەرییەکان بە بەردەوامی تووشی شەڕکردن و بەرگرییەکی توند بووبن لە ناوچەکەدا، یان بە واتای (زەوی پاڵەوانان) بێ، کە ئەمەش شتێکی نەگونجاوە، چونکە کەس بە دوژمنەکەی خۆی نالێ پاڵەوان. کە ڕەنگە ئەگەر ناوەکە سۆمەری بێ، بەواتای یەکەم دروستتر بێ لە واتای تر، بەڵام لەوانەیە ناوەکە ناوێکی ناوچەیی بێت، کە تا ئێستا ماناکەی نەزانرابێ، یان ڕیشەی ناوەکە بگەڕێتەوە بۆ سەردەمانێکی زۆرکۆن، کە واتاکەی نازانرێ، خۆ ئەگەر وابێ ئەوا ئەوەی لە سەرەوە ئاماژەمان پێ کرد، بەلێکدانەوەی واتای ناوەکە بە سۆمەری ئەوە هەڵەیە و لەڕاستییەوە دوورە، چەندان ئەگەری تر هەڵدەگرێ واتای ئەو ناوە مێژووییە.

**٢- ئەخازوم:**

یەکێکە لە میرنشینەکانی بناری زاگرۆس، کە لە سەردەمی ئاشووری کۆندا دەورێکی زۆر کاریگەری لەململانێ سەربازییەکانی لەگەڵ دەوڵەتی ئاشووردا گێڕاوە، پایتەختی ئەم میرنشینە ناوی (شێکشا بوم) بووە، ئەم شارە لە سەردەمی بنەماڵەی ئوری سێیەمدا بەشێوەی (شیگشابی sigsabi) ناوی هاتووە، هەروەها لە نووسراوەکەی هەڵەدنشین لەدێری (٦٠) ناوی هاتووە بە شێوەی (شیکشامبی siksambi)، بەڵام لەم نووسینەدا هێمای (mat)ی لەپێشە کە لەپێش ناوی وڵاتدا دێ، هەروەها لە کۆتاییدا هێمای (ki) هاتووە کە لەدوای ناوی (شار یا شوێن) دێ (ma -at -si2 -ik -sa -am -bi -ki)، دەشێ هۆکاری هاتنی هێمای (mat) لەپێش ناوی ئەم شارە بۆ ئەوە بگەڕێتەوە، کە لەو سەردەمدا شارەکە ئەوەندە گرنگ بووبێ کە هەموو وڵاتەکە بە ناوییەوە ناسرابێ.

ئەم ناوە لە تێکستە مێخییەکاندا بەچەند جۆرێک نووسراوە، کە هەندێ جیاوازی بەسیت لە نێوانیاندا هەیە کە ئەمەش دیاردەیەکی ئاساییە. ئەم ناوە پێ دەچێ ناوێکی خوری بێ و بەم شێوەیە شی کراوەتەوە، (-SIKS AmBI) کە بە واتای (ستوونێ لەداری ئەمبی) دێ. لە تێکستەکانی (شمشارە)دا لەزۆر نامە ناوی هاتووە کە دەشێ بوترێ لەم نامانەدا پشکی شێر بەر ئەم میرنشینە کەوتووە، ئەم میرنشینە لەنێوان بەرژەوەندی ئاشوورییەکان لە خۆرئاواوە گوتییەکان لەخۆرهەڵاتدا بووە، بە بەردەوامی کەوتۆتە بەر لێشاوی ئاشوورییەکان و، مەترسییەکی گەورەشی لەسەر ئاشوورییەکان دروست کردووە، بۆ

پاراستنی خۆی هاوپەیمانی لەگەڵ چەندان هێزی ئەو سەردەمەدا دروست کردووە، کە بە بەردەوامی ئەم هاوپەیمانەتییە گۆڕانی بەسەردا هاتووە.

بەهۆی تێکستەکانی (شمشارە) دەتوانین شوێنی ئەم میرنشینە و پایتەختەکەی تا رادەیەک دیاری بکەین، بەپێی ئەم تێکستانە شوێنەکەی دەکەوێتە نێوان (رانیە) و (هەولێر) لەنزیک شاری (کۆیە)، لە خوارووی زێی بچووک، لەخوار شاری (شوشارە)، لەدامێنی شاری (دوکان)ی ئێستاوە تا شارۆچکەی (تەق تەق) لەسەر کەناری زێی بچووک لەنزیک (تەق تەق). کە بە دووری نازانم یەکێ لەو تەپۆڵکە شوێنەوارییانەی کە دەکەونە نزیک شارۆچکەی (تەق تەق)، شاری (شیکشا بووم)ی کۆن پێک بێنێ کە ئەمەش بە هەڵکۆڵینی شوێنەواری لەو ناوچەیەدا، دەتوانرێ بسەلمێنرێ، ئەم میرنشینە سنووری کۆنی ولاتەکەی بەم شێوەیە بووە، تورکییەکان لەباکووری خۆرهەلاتی، شیمورووم لەباشووری خۆرهەلاتی ئاشوورییەکان لە خۆرئاوای، هەروەها کاکەمومیش کەوتۆتە بەشی باشووری خۆرهەلاتی.

لە سەردەمی ئاشووری کۆندا ئالۆزییەکی زۆر زەوییەکانی رۆژهەلاتی رووباری دیجلەی گرتبووەوە، کە تێیدا شەڕ و شۆڕێکی بەرفراوانی لە ناوچەکەدا بلاو کردبۆوە، کە ئەمڕش بووبووە هۆی دروستکردنی هاوپەیمانی لەنێوان ئەو هێزانەی کە لە ناوچەکەدا بوون بەپێی بەرژەوەندی ئەو هێزانە هاوپەیمانەتییەکە دروست بووبوو، کە ئەمە لە هەندێ نامەی (شمشارە)دا بەڕوونی دەردەکەوێ.

دوو هێزی سەرەکی ئەو ناوچەیە بریتی بوون لە (ئاشوورییەکان) و (ئەشنونایەکان)، کە ئاشوورییەکان بە سەرۆکایەتی (شمشی- ئەدەد) و ئەشنوناش بە سەرۆکایەتی (دادو- شا)، هاوپەیمانیەتییان لەگەڵ یەکتر بەستووە. دژ بە میرنشینەکانی (خوری و گوتی و لولوبی) لە خۆرهەلاتی رووباری دیجلە، کە ئەم دوو هێزە هاوپەیمانە توانیویانە ناوچەیەکی زۆر لەم ناوچەیە داگیر بکەن لەوانەش (ئەراپخا، قەیرا، نور و گوم...)، (شمشی- ئەدەد) (یتلیوم)ی ناردووە بۆئەوەی لەگەڵ (کوارێ)دا دژی (یاشوب- ئەدو)ی پادشای ئەخازوم بجەنگن و لەزۆربەی ئەو نامانەی کە (شمشی- ئەداد)ی پادشای ئاشووری، بۆ (کوارێ)ی فەرمانڕەوایی (شوشارە- شمشارە) باس لە هێرشکردنە سەر ولاتی (ئەخازوم) دەکات، بەلام گوتییەکان لەم ململانێیەدا هاریکاری ئەخازومیان کردووە دژ بە ئاشوورییەکان.

یاشو ئەدوی پادشای ئەخازوم لە هاوپەیمانیەتی بەستندا پیاوێکی هەوادار بووە، بە جۆرێ زوو بەزوویی هاوپەیمانییەتی خۆی دەگۆڕی یان ئەم هاوپەیمانیەتی گۆڕینە رەنگە هۆکارەکەی بۆ بەرژەوەندی دەوڵەتەکەی بگەڕێتەوە. یاشوب ئەدو هاوپەیمانی لەگەڵ شمشی ئەدەد بەستووە، بەلام زۆری پێ نەچووە ئەو هاوپەیمانەتییەی هەڵوەشاندۆتەوە و، سەر لەنوێ توانیویە هاوپەیمانی لەگەڵ هەریەکە لە (گوتییەکان و کاکموم و سیموروم..) ببەستێ، لەدژی شەڕانگێزی (شمشی- ئەدەد) و (کوارێ)ی فەرمانڕەوای (شوشارە) و (دادوشا)ی پادشای (ئەشنونا)، لە نامەیەکیدا کە شمشی ئەدەد بۆ کوارێی دەنێری نیگەرانی خۆی لەمەڕ زوو گۆڕینی هاوپەیمانییەتی یاشوب ئەدو بەکوارێ رادەگەیەنێ، بەلام گوتییەکان شاری (شێکشابوم)ی پایتەختی (ئەخازوم) وا پێدەچێ لەشکرکێشی گوتای لێ بووبێ، چونکە (ئیندوشێ)ی پادشای گوتی فەرمانی لەوێوە بۆ گوتییەکان دەرکردووە، کاتێ شمشی ئەدەد ویستوویەتی گفتوگۆ لەگەڵ گوتییەکان بکات داوای کردووە کە نوێنەری (ئیندوشێ)ی پادشای گوتی بێتە (شیکشا) بۆ ئەوەی کۆتایی بە ناکۆکی نێوانیان بێنێ، ئەمەش ئەوەمان بۆ روون دەکاتەوە کە لەو سەردەمەدا ئەو شارە بووەتە بنکەی پەیوەندی لەنێوان ئەو دوو هێزەدا.

دوای ئەوەی (یاشوب- ئەدو) هاوپەیمانی لەگەڵ ئاشوورییەکان دەشکێنی، هاوپەیمانییەتی تر دەبەستێ، ئەمە هانی ئاشوورییەکانی داوە بە هاوپەیمانییەتی (ئەشنونا)، دوای داگیرکردنی (ئەرابخا و قەیزا) پاش ساڵێک شاری (نوروگوم)یان داگیر کردووە، هەر لە هەمان کات و ساتدا (شمشی ئەدەد) بڕیاری داگیرکردنی ولاتی ئەخازومی داوە، هەر یەکە لە (نوروگوم، ئەخازوم، قاتنا) لەلایەن شمشی ئەدەدەوە لەساڵی (١٧٨٥ پ.ز) داگیر کراون، کە دەکاتە (٢٩) ساڵەی فەرمانڕەوایەتییەکەی.

لێرەدا تێکستێک دەخەمە روو کە باس لەم ولاتە دەکات.

تابلۆی (١)

رووی پێشەوەی تابلۆکە:

1- a-na- ku-wa-ri
Qi2- bi2- ma
Um- ma- dutu- si- dim- ma
wu- d(i) ni- ku- ur2- ti- ia- su- ub- dim
5- lu2- ah- za- a- jiki- te- es- me
Pa- na- nu- um- wa- ar- ki- lu2- si- mu- ur- ri- iki
Il- li- ik- lu2- si- mu- u- ri- iki
i- zi- ib- ma- wa- ar- ki- lu2- ti- ru- ki- iki
il- li- ik- lu2- ti- ru- ki- iki
10- i- zi- ib- ma- wa- ar- ki- ia8- i- la- nim
Il- li- ik- ia8- i- la- nim- i- zi- ib- ma
Wa- ar- ki- ia- il- ik- i- ia- ia- ti
i- zi- ba- an- ni- ma- wa- ar- ki- lu2- ka- a (k-m)I (ki)
it- ta- la- ak- u3- a- na- ka- al- lugal- mes
15- an- nu- tim- ni- is- dingir- mes- iz- za- ka- ar
Is- tu- it- ti- lugal- MES- AN- NU- TIM- IS3- (li-mn) LI- MU)
U3- IK- KI- RU- MU- 3- KAM- MA- I- MA- SI2
I- NU- MA- IT- TI- IA- IS3- LI- MU
I- NA- E2- DIM- AR- RA- AP- HI- IMKI
20- NI- IS- DINGIR- MES- IZ3- KU- RA- AM
I- TU- UR2- MA- I- NA- A- AH- ZA- I- BI- IM
I- NA- A- I- NI- IMKI- NI- IS- DINGIR- MES- IZ3-KU- RA- (A) M
U3- A- NA- KU- NI- IS- DINGIR- MES- AZ2- KU-UR- SUM
2- SU- NI- IS- DINGIR- MES- IZ2- KU- RA- AM
25- IS- TU- U4- MI- IM- SA- QA- RA- AN- SU2-BA- TI- IA
IS- BA- TU- MA- TI- MA- I- NA- MA- TI- SU
KU3- BABBAR- GU4- HA2- U3- SE- EM
MI- IM- MA- U2- UL- LA- QU2- UT
A- LAMKI- IS- TE- EN- I- NA- MA- TI- SU
30- U2- UL- AS- (B)A- (AT)

رووی دواوەی تابلۆکە:

i- na- an- na- it- ti ia- ik- k[1- ir ma]
U3- wa- ar-[ki]- lU2- ka- ak- m[iki]
it- ta- la- [ak]
it- ti- lugal- i- sa- li- im- [ma]
35- U3- ni- is- dingir- mes- i- zaka- ar
it- ti- lugal- i- sa- lim- ma
U3- ni- is- dingir- mas- i- za- ka- ar
U3- it- ti- lugal- ma- a[h-r]- i- im- ma
Sa- [I- sa]- li- mu- [I- n] a- ki- ir
40- U3- i[t]- ti-lugal- [sa] [i]- sa- [l]i- mu
Sa- la- am- su- U3- na- ka- [ar- s] u
i- na- bi-ri- it- iti- 2[(tx)- kam......]
[i]t- ti- ia- iti- 1[tx- kam- is3- li- im- am]
i- tu- ur2- ma- [it- t]a- ki- [ir]
45- I- na- an- na- i[ti- xt] 1kam- na- nu- tim- ka- a[s-su2- u2]
U2- qa- ti- u2- u1- ub- ba- a[l- sum]
Is- tu- u4- mi- i- ti4- bu- ma- li- [i]- [na] ma- a- ti [su]
e- pe2- su- te- se- [em- me]
ku- si- ia- as- ra- nu- um- am- mi- n[im- wa]- si- [ib]
50- wu- e- ra- as- su- um- ma- a- d[i]- [U4]- [x]- kam
iti- an- ni- im- a- na- [s]e- ri- ia- tu2- ur- da- sum
la- ma- k[ur]- ha2- U3- kaskal- ha2- [su- ri]- pa- am
[i]- sa- ba- tu- a- na- se- ri- ia
Tu2- ur- da- sum- is- tu- za- as- liki
55- a- na- se- gi- ib- bu ki- is- tu- se- gi- ib-n buki
a- na- zi- kumki- is- tu- zi- kumki
a- na- u2- [ra] u2ki- is- tu- u2- ra- u2ki
a- na- lu- ut- pi2- iski- is- tu- lu- ut- pi2- iski
a- na- ma- a- [at]- ha- bu- ra- timki
60- sum- ma- la- ki- am- ma- kur- ha2- kaskal- ha2
Su- ir- pa- am
Sa- ab- tu- a- la- kam- u2- u1- I- le- i
Ma- ah- ri- ka- [ma]- li- si- ib
Lu- u2- ri- tu- ka- ma- i- na- ninda- u3- kas
Pa- ni- [s]- u- [u2]- pa- an- [lu2]- tur- mes- su

65- [lu- u2]- t[a- s] a- ab- ba- [a] t

لێواری سەرووی تابلۆكە:

[lu2- w]- a- bi- il- tup- pi2- ia- an- ni- [im]

[ni- s] i- su- wa- as- se- er

بەواتای:

بە كواریێ بڵێ: شمشی ــ ئەددد ئەوها (دەڵێ)

بە دڵنیاییەوە تۆ گوێبیستی شەڕانگێزییەكەی اشوب- ئەدوی ئەخزبان بووی. پێشتر ئەو فەرمانڕەوای شیموروومی بەدوادا دەهات. لەدوای فەرمانڕەوای شیموروم، فەرمانڕەوای تیروركییەكان هاتووە. لەدوای فەرمانڕەوای تیروركییەكانیش، یایلانومی بەدوادا دەهات، لەدوای یایلانوم، منی بەدوادا هاتووە، ئێستاش دەگەینە فەرمانڕەوای كاكموم. سەرجەم ئەو پادشایانە بەڵێن و سوێندیان خواردبوو!

ئەو هاوپەیمانەی كە ئەو لە ماوەی سێ ساڵدا پێكی هێنابوو لەگەڵ ئەو پادشایانە بە تەواوی تێكشێندرا........

و لەزۆر نامەی تردا ئاماژە بەم وڵاتە كراوە كە نزیكەی (١٧) نامە دەبن، لە نێو نامەكانی شمشارەدا.

### ٣- قوشتەپە (كاشتاپوم kastppum)

ئەو ناوچەیە یەكێكە لەو شوێنانەی كە لە تێكستە مێخییەكانی (شمشارەدا) ئاماژەی پێ كراوە، كە مێژوودكەیان دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی ئاشووری كۆن. ئەم ناو هاتنەش بەشێوەی (كاشتاپوم) بووە، كەوا پێدەچێ هەر هەمان (قوشتەپە)ی ئێستا بێ، وەناوە نوێیەكەی ئێستای لە ناوە كۆنەكەوە وەرگیرابێ.

لە یەكێ لەو نامانەی كە (شمشی - ئەددد)ی پادشای ئاشوور بۆ (كواریێ)ی ناردووە كە فەرمانڕەوای شاری (شوشارا) بووە لە دەشتی (بیتوێن). زۆر بەروونی ناوی (كاشتاپوم)ی بردووە. كە دەقی ناوەڕۆكی نامەكە داوا لە (كواریێ) دەكات كە (١٠٠٠) جەنگاوەری بۆ بنێرێتە (كاشتاپوم). بەڵام ئەگەر سەرنج بدەینە لایەنی جوگرافیای نێو ناوەڕۆكی نامەكە تا رادەیەكی زۆر لە رووی جوگرافیشەوە ناوەكەی (كاشتاپوم) لە هەمان شوێنی (قوشتەپە)ی ئێستاوە زۆر نزیكە، چونكە باس لەوە دەكات كاتێك هێزەكانی (ئیشمی - داگانی) كوری لەگەڵ هێزەكانی (ئەشنونا) زێ دەبڕن، ئەوا ئەو لە (كاشتاپوم)ی كۆن هەر هەمان (قوشتەپە)ی ئێستا بێ، ئەمەش لەبەر دوو هۆكار:

یەكەمیان: تا رادەیەكی زۆر هەردوو ناوەكە لە یەكترەوە نزیكن.

دووەمیان: لە رووی جوگرافییەوە ناوچەی (كاشتاپوم)ی كۆن كەوتۆتە هەمان شوێنی دەوروبەر یان خودی شوێنی (قوشتەپە)ی ئێستاوە.

وە لێرەشدا دەقی ئەو نامە مێخییە دەخەینە روو كە باسی ئەو شوێنەی كردووە:

رووی نامەكە:

1- a [n] a- ku- w[a-r]i

Qi2- b[i] 2- ma

Um- ma- be- e- [I- ka- a]- ma

Sa- bu- um- sa- it- ti- i[s- me-dd] a- g[an]

5- ik- ta- as- [d] am

U4- um- tup- pi2- an- ni- e- em

U2- sa- bi- la- kum

Sa- bu- um- sa- it- ti- is- me- dd[a]- g[an]

[ka]- lu- su

رووی دواوەی نامەكە:

10- u3- sa- bu- um- lu2- es3- nuN- na- [ki]

Id2- zA- [i]- ba- am- i- te- bi- r[u]

U3- a- na- ku- a- na- ka- as- tap- pi2- i[m][ki]

ak- ta- as2- dam

u4- um- tup- pi2- an- ni- e- em- te- se- mu- u2

15- I- na- sa- al- si- im- u4- mi- im

a- na- ka- as- tap- pi2- imki

a- na- se- ri- ia

1li- im- sa- bu- ka

[li- riL- dam]- ma

20- 1gAl- mar- tu- ka

It- ti- sa- bi- im

[I]I- li- kam

بەواتای:

بە كواریێ بڵێ: گەورەت ئەوها (دەڵێ):

ئەو هێزەی لەگەڵ ئیشمی - داگانن گەیشتوون لە رۆژی

ئەم نامەیەت بۆ دەنێرم هێزی ئیشمی - داگان و ئەشنونا لە زاب پەڕیونەتەوە من گەیشتوومە کاشتاپوم. ڕۆژی ئەم نامەیە گوێبیست دەبی - لە ڕۆژی سێیەمیندا ۱۰۰۰ جەنگاوەرم بۆ بنێرە کاشتاپوم، یەکێ لە جەنەراڵەکانت با لەگەڵ جەنگاوەرەکان بێت..

**٤- وڵاتی کیرووری kirruri**

یەکێکە لەو ناوچانەی کە لە سەرچاوە مێخییەکاندا ئاماژەی پێ کراوە، بەتایبەتی لەسەردەمی ئاشووری نوێدا، سەرەڕای هەبوونی بیرو بۆچوونی جیاواز لەسەر دیاریکردنی شوێنی ڕاستەقینەی ئەم ناوچەیە، بەڵام هەرچۆنێ بێ لەگەڵ هەبوونی بۆچوونە جیاوازەکانیش، هیچ یەکێ لەم بۆچوونانە لەوە بەدەر نین کە ئەم ناوچەیە لە دەردوەی سنووری پارێزگای هەولێر دابنێن. وە لێرەدا ئەم بۆچوونانە بەوردی دەخەینە ڕوو.

یەکەم ئاماژە کە لەبەر دەستمان بێ کە بۆ ئەو ناوچەیە کرابێ لەسەردەمی پادشای ئاشووری (ئەداد - نیرار) ی دووەم (۹۱۱ - ۸۹۱ پ.ز).

لەکاتی هێرشی ئەم پادشایە بۆ سەر ناوچە چیاکانی باکووری خۆرهەڵات لە ساڵی (۸۸٦ پ.ز)، ئەم پادشایە لەگەڵ هێزەکانی بەو ناوچەیەدا تێپەڕیوە، بەرەو خواروو تا گەیشتۆتە ڕووباری (زاب)ی زێی بچووک، توانیویە شاخەکانی سەر زێ ببڕێ، ئەم پادشایە لە نووسراوەکانیدا باس لەوە دەکات، کە لە ئاشوور بەڕێ کەوتووە و لە کیرورییەوە بەرەو ناوچەکانی (وروبانو urrubnu، یشرون ishrun)ڕۆیشتووە تا گەیشتۆتە (لادەنو ladanu)ی لولوبی، و لەکاتی هێرشەکەیدا بۆ سەر ناوچەی (یشرون ishrun) دانیشتوانی ئەم ناوچەیە بۆ ئەوەی ژیانی خۆیان لە دەستی ئاشوورییەکان ڕزگار بکەن، لەناوچەکەی خۆیان هەڵاتوون بەرەو زابی بچووک و لە زابی بچووک پەڕیونەتەوە، وە ئەوەی جێگای ئاماژە پێکردنە ئاشوورییەکان هەر لە (یشرون)ەوە تا خوارووی زێی بچووک هەموو شارەکانی لەو دەڤەرەدا داگیر کردووە، بەڵام کاتێ دانیشتوانی (لادەنۆ) لەترسی ئاشوورییەکان هەڵاتوون و لە زێ پەڕیونەتەوە، دەبێ ئەم خەڵکانە دەربەندی ڕەمکان (ڕانیە)یان بڕیبێت و بەرەو ناوچەی قەڵادزێ بەڕێ کەوتبن کە ئەمەش لەلایەن (ربد read) بە (سیمێشی) (قەزای پشدەری ئێستا) تۆمارکراوە، واتە دەتوانین ئەوە دەستنیشان بکەین کە ئەو خەڵکانە زێیان لە بەشی سەرەوودا بڕیوە، نەک بەشی خوارووودا، چونکە ئاشوورییەکان توانیویانە لە بەشەکانی خوارووودا لەزێ بپەڕنەوە.

پادشایەکی دیکەی ئاشووری کە ئاماژەی بەو ناوچەیە کردووە (ئاشوور - ناسربالی دووەم)ە (۸۸۳- ۸۵۹ پ.ز) کە ئەم هێرشەی لەساڵی (۸۸۳ پ.ز) ئەنجامداوە،

**1- ap- pul2- aq- qur- ina- IZI- MES- GIBIL- up- is- tu- KUR- tum4- me- at- tu- mus- ana- KUR- kir3- ru- ri.**

**2- KUR- si- me- si- KUR- si- me- ra- KUR- ul- ma- ni- a- KUR- a- da- us- KUR- har- ga- a- a- KUR- har- ma- sa- a- a- ANSE- KUR- ra- MES- ANSE- Gir3- NuN- NA- MES.**

**3- GU4 MES- UDU- MES- GESTIN- MES- UTUL2- MES- ZABAR- MA- da- ta- su2- nu- am-hur- lu2- za- bil2- ku- du- ri- UGU- su2- nu- u2- kin2- ki- i- ina- KUR- Kir3- ru- ri.**

**4- Us- ba- ku- ni- KUR- gil2- za- na- a- a- KUR- hub- us- ka- a- a- me- lam- me- sa2- as- sur- EN- ia- is- hup- su2- nu- ANSE- KUR- RA- MES- KU3- BABBAR- mES.**

بەواتای:

(لە زەوی تومو (TUMMU)) مەوە ڕۆیشتم بەرەو ناوچەی کیروری، لەوێدا باج و سەرانەم وەرگرت لە هەر یەک لە (کیروری، سیمێسو، سیمێرا، ولمانیە، ئەدەوش، خەرگەیە، خەرمەسەیە) کە پێک هاتبوو لە (ئەسپ، ئێستر، گا، مەڕ، شەراب، (وە) لەگەنی برۆنز). و زەربیەم بەسەردا سەپاندن بەبێ هیچ مەرجێ. لەکاتێکدا لە کیروری و ئاشوور دەرچووم، گەوردم چووە ناو گیلزەن و خوبوشکو (وە) ئەوان باجی ئەسپ و زیو و زێڕو تەنەکە و برۆنزو (وە) لەگەنی برۆنزییان بۆ هێنام).

**5- KU3- GI- MES- AN- NA- MES- ZABAR- MES- UTUL2- MES- ZABAR- ma- da- ta- su2- nu- a- na- muh- hi- a- ub- lu- ni- TA- KUR- Kir3- ru- ri- at- tu- mus.**

6- a- na- KUR- ne2- reb- sa2- URU- hu- lu- nu- a- na- KUR- hab- hi- sa2- be2- ta- a- ni- ku4- ab- URU- ha- tu- URU- ha- ta- ru- URU- ni- is- tu- nu- URU- sa- bi- di.

7- URU- met- qi- a- URU- ar- sa- ni- a- URU- te- e- la- URU- ha- lu- a- URU- MES- ni- sa2- KUR- hab- hi- sa2- ina- bi- rit- KUR- u2- su- KUR- a- ru- a.

8- KUR- a- ra- ar- di- KUR- MES- e- KAL- MES- GAR- nu- KUR- ud- GAZ- MES- su2- nu- HI- A- MES- a- duk- sal- la- su- nu- NIG2- su- MES- su2- nu- as2- lu- la-.

بەواتای:

(لە کیروریبیەوە بەرێ کەوتم و بەناویدا رۆیشتم (بەئاراستەی) شاری خولون و بۆ ناودوەی زەوی خایخو. و شارەکانی خاتوو خەتە روو نیشتوون و سابیدی و میتقیا و ئەرسەنیەو تیڵە و خەڵودو شاردکانی زەوی خەیخووە هەموو ئەوانی تر لە نێوان شاخەکانی وسووئەرودو (و) ئەرەردی و شاخە بەهێزەکانم داگیر کردن. من زۆرم لەوان سەربڕی (و) سجنم کردن و دوورم خستنەودو (و) هێنامنە ژێر دەسەڵاتی خۆمەود).

9- LU2- GAL- MES- SU2- TA- nu- ud- ni- si- na- ma-a- di- am- hur-(m) as- sur- PAB- A- MAN- GAL- U2- MAN- dan- nu- MAN- su2- MAN- KUR-as- sur- A- TUKUL- MAS- MAN- GAL- e- MAN- dan- ni.

10- MAN- su2- MAN- KUR- as- sur- A- U- ERIN- TAH- MAN- GAL- e- MAN- dan- ni- MAN- su2- MAN- KUR- as- sur- ma- ct- lu- qar- du- sa2- ina- GIS- tukul- ti- as- sur- EN- su2- DU- DU- KU- ma- ina- mal- ki- MES.

11- sa2- kib- rat- 4- ta- sa2- nin- su2- la- a- I- su2- u2- MAN- sa2- is- tu- e- ber- ta- an- ID2- IDIGNA- A- DI- KUR- lab- na- na- u- A- AB- AB.

12- GAL- ti- KUR- la- qe- e- ana- si- hir- ti- sa2- KUR- su- hi- a- di- URU- ra- pi- qi- ana- GIR3- 2- MES- su2- U2- sek2- ni- sa2- is- tu- SAG- ID2- e- ni.

13- ID2- su- ub- na- at- a- di- KUR- ni- rib- sa2- bi- ta- ni- su- su- KUR- ud TA- KUR- ne2- re- be- sa2- KUR- kir2- ru- ri-a- di- KUR- gi i2- za- ni- TA- e- ber- ta- an- ID2- za- ba.

14- KI- TA- a- di- KUR- DU6- ba- a- ri- sa2- el- la- an- KUR- za- ban- ta- URU- DU6sa2- ab- ta- ni- a- di- URU- DU6- sa2- za- ab- da- ni- URU- hi- ri- mu- URU- ha- ru- tu- KUR- bi- ra- a- te.

بەواتای:

(ئاشوور ناسرپاڵ، پادشای مەزن، پادشای بەهێز، پادشای جیهان، پادشای ئاشوور، کوڕی توکولتی، نینورتا (دووەم)، پادشای مەزن، پادشای بەهێز، پادشای جیهان، پادشای ئاشوورییە، کوڕی ئەددد - نەراری (دووەم) (کێ) هەرودکو پادشای مەزن، پادشای بەهێز، پادشای جیهان، پادشای ئاشوورییە، پیاوی ئازا، کە سەرکەوتنەکانت لە ئاشوور دەرددکەون، ئەو گەوردیە، لەنێو سەرکرددکانی هەر چوار لای جیهاندا هاوشێودت نییە، ئەو پادشایەی، کە ملکەچت دەبن (هەرێمی ستراتیجی) لە کەنارەکانی رووباری دجلەود تا شاخی لێبانوون و دەریای گەورە، لە زەوی لەقو، (و) زەوییەکەی سوخو شاری رەپێقو پێک دێنێ. کە سەرچاوەی رووباری سوبنەتی تا ناو زەوی نیرنوی داگیر کرد. من سنوورەکانیم خستە سەر سنووری ولاتەکەم (هەرێمی ستراتیجی) لە ولاتی کیروریبەود رۆیشتین بۆ ولاتی گیلزەنو، لە بەرامبەر کەناری زابی بچووک و لەوێود بۆ شاری تیل - بەری لەسەرووی ولاتی زەبەن، وە لەشاری تیل - شە - ئەبنەتی وە بۆ شاری تیل - شە- زەبدنی، (و) لە شارەکانی خیریمو (و) خەروتو (هەرودک) شوورە بەندەکانی کاردونیاش. لە کۆتاییدا، دەسەڵاتم سەپاند بەسەر زۆر ناوچەی بەرفراوانی نەیری.

15- TA- ne2- re- bi- sa2- KUR- Kir3- ru- ri -a- di- KUR- gil2- za- ni- ta-ne2- re - be- sa2- URU- ba- bi- te- a- di- KUR- nam- ri.

بەواتای:

(لەولاتی کیروریبەود رۆیشتین بۆ گیلزەن و (وە) لەشاری بە بیتوودود رۆیشتین بۆ ولاتی نەمری)

ئەم پادشایە لەزۆر جێگای تردا ئاماژەی بە کیروری کردوود، بەڵام بە زۆری شتەکان لەیەک دەچن و دووبارەن.

پادشایەکی تری ئاشووری ئاماژەی بەو ناوچەیە کردوود،

کە ئەویش (شلمنسری سێیەمە) (٨٥٨ - ٨٢٤ پ.ز)، ئەم پادشایە لەکاتی گەڕانەوەی لە هێرشەکەی، کە لەساڵی (٨٥٦ پ.ز) بۆ سەر وڵاتی ئۆرارتۆی ئەنجامداوە، بە کیروریدا گەڕاوەتەوە شاری ئاشوور، لەو هێرشەدا باس لەوە دەکات، کە خەڵکانێکی زۆری کوشتووە و مەڕو ماڵاتێکی زۆری بە تاڵان بردووە، کە گەیشتۆتە نزیکەی (٣٠٠٠) سەر، لەم هیرشەیدا باس لە ڕێڕەوێکی تر دەکات کە پێیدا تێپەڕیوە بەجۆرێ کە ئەم ڕێڕەوەی لەسەرەتای هێرشەکەیدا داناوە، ئەم ڕێڕەوەش بەناوی (ێنز یتێ) یە، یەکێ لەو نووسراوانەی ئەم پادشایە کە باسی کیروری دەکات لێرەدا دەیخەینە روو:

**(a- na- tam- di- sa- KUR- na- I- ri- lu- al- lik- kak- ke2- [ gis- tulkul- mes ] a- I- na- tam- di- u2- lil- udu- niqe- [mes] a- na- ilani3- [DINGIR- MES- ni]- la- aqqi- [bal- qi2]- I- na- ta- ia- ar- ti- ia- sa- tam- di- ma- da- tu- sa- (m)a- su- u2- u2- KUR- gil2- za- na- a- a- am- hur- a- na- ali3- ia- as- sur- ub- la- istu- KUR- gil2- za- a- ni- a- di- URU- hub- us- ki- a- kima - [gim]- til2- a- bu- <bi> as2- pu- um- ina- KUR- ni- ri- bi- sa- KUR- kir3- ru- ri- ina- put3 [sag] URU- arba- ilu- u- si-a- adi- URU- ar- za- as2- ku- un- istu- URU- ar- za- as2- ku- un- a- di- KUR- gil2- za- a- ni- istu- KUR- gil2- za-a- ni- a- di- URU- hub- us- ki- a- ki- ma- til2- a- bu- bi- as2- pu- un )**

بەواتای:

(لەزەوی نەیری گەیشتمە دەریا، چەکەکانم لە دەریا شووشتەوە، قوربانیم پێشکەش بە خواوەندەکانم کرد، لەسەر ڕێگای گەڕانەوەم باجێکی زۆریان پێدام، پیاوی زەوی گیلزەن، هێنایان بۆ شارەکەم ئاشوور، وەک ڕەشەبا هەڵی کردبێ زەوی گیلزەنوم ویران کردووە، بەو قەبارەیەش لەزەوی خوبوشکی (و) لەزەوی کیروری هاتمە دەرێ، لەبەردەم ئەربیل (لە دەیەینی) بۆ شاری ئەرزەشکون، لە ئەرزەشکونەوە بۆ شاری گیلزانو، لە گیلزانووەوە بۆ خوبوشکیە، وەک و شکیوە (بۆئەوە ئەوان پیکێن) وەک گەردەلوول ویرانییەکەی داپۆشیوە)

بۆ دیاریکردنی شوێنی کیروری بەشێوەیەکی دەقیق و راست دەبێ پشت بە جوگرافیای سەربازی ئاشوورییەکان ببەستین، کە لە هێرشەکانیان بۆ سەر دانیشتوانی زاگرۆس و تۆرۆس ئاماژەیان بەم ناوچەیە کردووە، چەندان بۆچوونی جیاوازی پسپۆڕانی شوێنەواری هەیە لەسەر دیاریکردنی شوێنی کیروری، کە (بیلیربیک) ئەم شوێنەی بە سەنتەری کێلە شین لەقەڵەم داوە، بەڵام (هیلست ستریک) ئەم ناوچەیەی لەگەڵ زەوییەکانی باشووری خۆرئاوای گۆمی ورمێ گیرکردووە، (فۆرەر) کیروری لە نزیک پایتەختی ئاشوورییەکان داناوە، لەناوچەی دەشتی هەریر لە باکووری شەقڵاوە، (لیڤینگ) تا رادەیەک بۆچوونەکانی (فۆرەر) ی پەسند کردووە، (ریدا) کیروری بە ناوچەی نێوان رانیەو کۆیێ زانیوە لە نزیک زابی بچووک. بەڵام (سپایزەر) کیروری بە دەڤەری نێوان هەولێر و رواندزی زانیوە بەو واتایەی کە هەریەک لە دەشتی هەریرو چیای سەفین و سپیلک و پیرمام دەگرێتەوە، کە ئەم بۆچوونەش تا رادەیەک لەگەڵ بۆچوونەکەی (فۆرەر، لیڤینگ) لەیەک نزیکە.

بە پشت بەستن بەو تێکستە مێخییانەی، کە خستوومانەتە روو دەتوانین تا رادەیەک شوێنێکی وردو راست بۆ ئەو ناوچەیە دیاری بکەین، ئەگەر سەرنج بدەینە تێکستەکانی (شلمنسەر)، ئەوا بەروونی ئەوەمان بۆ دەردەکەوێ کە ئەم ناوچەیە دەکەوێتە نزیک شاری (هەولێر)، بەڵام ئەوەی جێگای سەرنجە، کە زۆربەی لێکۆڵەرەوەکان چەمکی (sag) یان بە (بەرامبەر) یان (بەردەم) لێکداوەتەوە، بەڵام مانایەکی زۆر نزیک و راستەقینەی ئەو چەمکەیە بە واتای (سەروو) دێ. خۆ ئەگەر سەرنج بدەین بە پێی تێکستی ئەم پادشایە، ئەوە دوور نییە ئەو زوورگە سروشتییانەی، کە دەکەونە باکووری خۆرهەڵاتی هەولێر یان ئەو دۆڵانە دەگرێتەوە کە دەکەونە باکووری شاری (هەولێر)، بەڵام ناتوانین ئەوە دیاری بکەین یان بەڕاستی بزانین کە ئەم ناوچەیە بکەوێتە دەوروبەری شاری (کۆیێ)، چونکە بەپێی ئەو تێکستانە لە بەرامبەر یا بەردەم یان لەسەرووی هەولێر دەبێ بۆی بگەڕێین. یان لەوانەیە ئەم ناوچەیە کتومت لەگەڵ دۆڵی (هەنارە)دا یەک بگرێتەوە، یان ڕێڕەوەکەی (سپیلک) بێ لە دەشتی هەریر، کاتێکیش (توکولتی ننورتا) لە هێرشەکانیدا بۆ سەر ناوچەی زاگرۆس، کە گەیشتۆتە کیروری، ئەو بەو شاخانەدا رۆیشتووە، کە کەوتوونەتە

ڕۆژهەڵاتی (شەقڵاوە)، لە کاتێکدا بەرەو باشوور شۆڕبووەتەوە، بە ناوچەیەکدا ڕۆیشتووە، کە کەوتووەتە نێوان هەردوو زابەکەوە، کە دۆڵی (بالیسان) یەکێکە لەو دۆڵانەی کە دەکەوێتە ئەو ڕووبەرە دیاریکراوەی لە دەشتی هەریرەوە تا دەشتی بیتوێن بۆ سەر زابی بچووک درێژ دەبێتەوە.

کاتێ (توکولتی - ننورتا) لە ئاشوورەوە دەستی بە جووڵان کردووە، گەیشتۆتە کیروری لە دوایی دوو شاخی بەناوی (روربنو، ئیشرون) بڕیوە تا گەیشتۆتە زابی بچووک، بە پێی ئەم جووڵانە سەربازییە دەتوانین ئەوە دەستنیشان بکەین، کە لە ئاشوورەوە بەرەو سەروو هاتبێ لە پاڵ زێی گەورەدا، تا گەیشتۆتە دەشتی (هەریرو باتاس) لەوێشەوە بە دۆڵی (بالیسان)ی ئەمڕۆدا بەرەو باشوور کشابێ، لەدوای تێپەڕینی لە هەردوو ناوچەی (روربنو، ئیشرون) ڕاستەوخۆ گەیشتۆتە زابی بچووک کە لێرەدا ڕەنگە بگەینە ئەو ڕاستییەی کە لە دۆڵی (بالیسان)ی ئیمڕۆ هەمان کیروری کۆن بێ، کە لە هەریەکە لە (د.جەمال ڕشید، سەگس) پشتگیری لەم بۆچوونە دەکەن. بەڵام سەبارەت بە یەکسان کردنی هەریەکە لە دۆڵی (هەنارە، هیران) بە (کیروری)ی بە پێی نەخشە سەربازییەکەی (توکولتی ننورتا) تا ڕادەیێ یەکانگیرییەکەیان بە بەراورد لەگەڵ بالیسان لاوازترە، چونکە هەریەکە لەم دوو دۆڵەی پێشەوە، ڕاستەوخۆ نامانگەیننە سەر زابی بچووک، بەڵام ئەوەی زیاتر پشت ڕاستمان دەکاتەوە، کە هەر هەمان دۆڵی (بالیسان) کیرورییە، ئەوەیە کاتێ دانیشتوانی (ئیشرون) هەڵاتوون و لە دەربەندی ڕەمکان (ڕانیە) پەڕیونەتەوە بەرەو دەڤەری پشدەر، زیاتر نزیک دەکاتەوە لە هەریەک لە (هەنارە، هیران)، چونکە ڕاستەوخۆ دۆڵی (بالیسان) دەمانگەیێنێ بە دەربەندی ڕەمکان بەبێ هیچ ماندووبوونێکی ئەوتۆ، بە بەراورد لەگەڵ هەریەک لە (هیران، هەنارە) چونکە ئەمانە تا ڕادەیەک لاپەڕن، ڕاستەوخۆ ناتوانن بمانگەیننە دەشتی بیتوێن.

تێکستەکانی (ئاشوور ناسربال) ئەوەمان بۆ ڕوون دەکاتەوە، کە ئەم پادشایە لە ئاشوورەوە دەستی بە جووڵە کردووە و لە کیرورییەوە گەیشتۆتە وڵاتی گیلزانو و لە بەرامبەر زابی بچووک، کە ئەمەش تا ڕادەیەک بە پێچەوانەی بۆچوونەکەی (د.جەمال ڕەشید)ە کە پێی وایە لە ئاشوورەوە جووڵاوەو بە (نومی) تێپەڕیوە لە نزیک شاخی (ئیتینی) لە وڵاتی (زاموا) لە ڕێگای دوکانی ئەمڕۆوە بەرەو کیروری و لەوێشەوە بەرەو زێی گەورە، چونکە بەڕوونی تێکستەکانی ئەم پادشایە باس لەوە دەکەن، دوای کیروری گەیشتۆتە وڵاتی گیلزانو لە بەرامبەر زابی بچووک، دەبێ ئەوەشمان لە یادبێ ئەگەر ئەو بۆچوونەی سەرەوەمان ڕاست بێ ئەوە دەبێ ئەوەمان لە یاد نەچێ کە دەبێ شوێنی وڵاتی (گیلزانو) ئەو شوێنە نەبێ، کە شوێنەوارناسان لە باشووری خۆرئاوای گۆمی ورمێ ئەم ناوچەیەیان دیاری کردووە، بەڵکو بەپێی تێکستەکانی ئەم پادشایە شوێنی گیلزانو دەبێ کتومت لەگەڵ دەشتی بیوتینی ئەمڕۆ یەکسان بێ، کە ئەمەش لەگەڵ زۆر بۆچوونی لێکۆڵەرەوان پێچەوانەیە، بەڵام ئەگەر ئەو بۆچوونە ڕاستبێ، کە کیروری هەر هەمان دۆڵی بالیسانی ئێستا بێ، ڕەنگە وڵاتی (گیلزانو) دەشتی (بیتوین) لەگەڵ یەکتر یەکسان بن، چونکە ئەو پادشایەی دوای کیروری ڕاستەوخۆ گەیشتۆتە گیلزانو لە بەرامبەر زابی بچووک، کە ئەوەی جێگای سەرنجە ئەوەیە، کە لەناو جەرگەی دەشتی بیتوێن گوندێ هەیە بەناوی (گرجان) کە تا ڕادەیەک ناوەکەی لە (گیلزانو) نزیکە، کە دوور نییە هەر هەمان ناوی (گیلزانو) بێ گۆڕانی بەسەرداهاتبێ بە پێی تێپەڕینی کات بووبێتە (گرجان).

نووسراوەکانی (شلمنسر) کە لەکاتی گەڕانەوەی، لەشەڕدا بەو شوێنەدا ڕۆیشتووە، لەبەردەم (ئەربیل) هاتووەتە دەرێ، بەڵام چەمکی (sag) وایان لێک داوەتەوە بە مانای (لەبەردەم یان لەبەرامبەر)، بەڵام مانایەکی تری گونجاوی ئەم چەمکە بەواتای (سەروو) دێ، کە ئەو کاتی دەقی وەرگێڕانی دێری (kir3- ru- ri- ina- sag- Arbo- ilu) بەواتای (کیروری لە سەرووی ئەربایلۆ) یان بەواتای (لەبەرامبەر یان بەردەم ئەربیل) دێ، کە ئەو کاتەش ئەوەمان بۆ ڕوون دەکاتەوە، کە یەکێ لەو دۆڵانەی باسمان کرد دەیگرێتەوە، چونکە هەموویان دەکەونە سەرووی شاری (هەولێر) دوە، بەپێی شیکردنەوەی ئەم دێرە جا چ بەواتای (لە بەرامبەر یان بەردەم یان سەرووی ئەربیل) بێ ئەوەی لە هەموان شانسی زیاتر بێ بۆ یەکسانکردنی لەگەڵ کیرور بێگومان دۆڵی (هەنارە)ی ئێستایە لە بناری شاخی پیرمام، کە ئەم دۆڵە درێژ دەبێتەوە بەرەو دەربەندی

گۆمەسپان لەوێشەوە بەرەو دۆڵی سماقوڵی لەوێشەوە بەرەو هیزۆپ، کە بەئاسانی دەتوانێ بمانگەیێنێتە زابی بچووک، کە ئەم ڕێڕەوە ڕێڕەوێکی زۆر لەبارو گونجاو بووە بۆ پێدا تێپەڕینی گالیسکە جەنگییەکانی ئاشووری، بەرەو ناوچەکانی ناوەوەی زاگرۆس، دەکرێ هەمان بارودۆخیش بەسەر هەریەک لە دۆڵی (هیران، بالیسان) دا گونجاو بێ.

### ٥- شاری بارزانیا

ئەم ناوچەیە لە سەردەمی ئاشووری نوێدا لە تێکستە مێخییەکاندا ناوی هاتووە، لەلایەن (ئاشوور ناسرپاڵی دووەم) دوە (٨٨٣ - ٨٥٩ پ.ز) ئەم ناوە لە تێکستەکانی ئەو پادشایە بە دوو شێوە ناوی هاتووە (uru- bar- za- ni- is- tu- un6- uru- bar- za- ni- a.) بەڵام ئەم جۆری ناو هاتنە تا ڕادەیەکی زۆر لەیەکەوە نزیکن، کە ڕەنگە هەردوو چەمکەکە بۆ یەک شوێنی جوگرافی یان بۆ یەک شار بەکار هاتوون، کە دەکەوێتە بەشی سەرووی کوردستانی باشوور لە نزیک سنووری تورکیا، کە بەدووری نازانم ئەم ناوە لەگەڵ دەڤەری بارزانی ئەمڕۆ یەکانگیر بێ، لەوانەیە هەر هەمان ناوی بارزانی ئەمڕۆ لە هەمان ئەو دوو چەمکەی ئەو سەردەمەوە هاتبێ و بەکار هێنرابێ، بە گۆڕانکارییەکی کەمەوە، کە ئەمەش شتێکی سروشتییە، چونکە دوای تێپەڕینی ئەم هەموو ساڵە گۆڕانێکی ئەوها بەسیت شتێکی ئاساییە، بۆ ئەوەی بیسەلمێنین کە ناوی (بارزانیا) لەگەڵ ناوی بارزانی ئێستا هەر هەمان ناوە پشت بەم دوو هۆکارە دەبەستین:

یەکەم: ئەم دوو ناوە لە کۆن و ئێستادا لە ڕووی زمانەوانییەوە هەردوو چەمکەکە زۆر لە یەکترەوە نزیکن و جیاوازییەکی ئەوتۆ لە نێوانیاندا نییە.

دووەم: لایەنی جوگرافیای شاری بارزانیای کۆن لەهەمان یان لە نزیک دەڤەری بارزانی ئێستا دیاری دەکرێ.

لێرەدا هەندێ لەو تێکستانەی پەیوەندیدارن بەو ناوچەیە دەخەینە ڕوو.

1- is- bat- li- ti2- su2- nu- as- bat- lu2- GAR2- nu- sa2- ra- ma- ni- A- A- NA- MUH- HI- SU2- NU- AS- KUN- ina- ne2- re- be- sa2- KUR- a- ma- da- ni- a- na- URU- bar- za- ni- is tu- un- ti- a.

بەواتای:

(دەست بەسەرەکانم هێنانە (وە) ژێر فەرمانڕەوایی خۆم وە بوومە خاوەنیان. وە لە شاخی ئەمادانۆ ڕۆیشتم و هاتمە دەرێ بەرەو شاری بارزانیشتون)

2- [..] x KUR- e- dan- ni- 5- ak- [..] URU- bar- za- ni- a-URU- di- ku- un [..]

3- [..] mar- Si- su- nu- [...a]p- pul2- a- qur [..]

بەواتای:

(شاخی بەهێز، پێنج [ ... ] شاری بارزانیا، شاری دیکون [.... من دەستم گرت بەسەر] مەڕو ماڵاتیاندا [ ] لەناوم بردن و، دام پلۆسین [ ... ]

1- [....]x sa2 TA tar- si- m[....]

2- [....] sa- lam- mu- sa2- mGIS-tukul- ti- A(?)- [....]

3- [....n]a- I- re- a- lik- URU- bar- za- ni- is- tu- [ (un)]

4- [....NIG2- s]u mes- su2- nu- nig2- ga- mes- su2- nu- gu4- mes- su2- nu- udu- (senisunu).

5- [....]kar- me- u2- ter- sag- du- muq- tab- 1[I- su2- nu....]

6- [....] sa2- KUR- KUR-

7- [....]- [a]- ni- ina- IZA- GIBIL- ap- pul2--A- QUR- ANA- DU6- (ukarme uter). MES- ANSE- [MES....]- NA- I- RI- ANSE- KUR- RA- [u karme- uter]

بەواتای:

(لەو کاتەی [....] لەگەڵ پەیکەرەکەی بەناوی ئیگلاتیپ تێگلاتیپی [الیسر....بۆ زەوییەکانی ن]1 یری پێشڕەویم کرد، شاری بارزانیشتو (ون) داگیرم کرد.......... بۆیان هێنام و (بوومە خاوەنی)، دەستم گرت بەسەر، گا، مەڕ، (وە) گەڕامەوە (ئەو) بۆ وێرانکردنی تەپۆڵکەکان، سەری (ئەوان) شەڕکەرەکانم [بڕی لە........] لە زەوییەکانی نایری، ئەسپەکان و، ئێسترەکان، [....] ئاگرم دان، دام پلۆسین، وێرانم کردن، (وە) [گەڕامەوە ] بۆ وێرانکردنی تەپۆڵکەکان)..

**٦- موساسیر**

یەکێکە لەو ناوچانەی کە لەتێکستە مێخییەکانی ئاشووری، زۆرجار ئاماژەی پێکراوە، بەزۆر ناو ئەم ناوچەیە تۆمارکراوە، کە ئەمەش بەپێی سەردەمەکان گۆڕان بەسەر ناوەکەیدا هاتووە، کە لەسەردەمی ئاشووری ناوەڕاست بە (ئەردینی) ناوبراوە، بەڵام لە سەردەمی ئاشووری نوێدا ئەم چەمکە بە (موساسیر)ی ناسراوە، ئەم ناوچەیە شوێنێکی زۆر پیرۆز بووە لە لایەن (ئۆرارتییەکان)، چونکە مەڵبەندی خوداوەندی نەتەوایەتی ئۆرارتییەکان (خالدی) لەم شوێنە بووە، خێزانی ئەم خوداوەندە ناوی (ئاروبانی) بووە، ساڵانە، دانیشتوانی وڵاتی ئۆرارتۆ بۆ حەجکردن روویان لەم شوێنە دەکرد و چەندان کەلوپەلی گرانبەهایان پێشکەش بە خوداوەندەکەیان دەکرد. بەڵام ئەم ناوچەیە بە بەردەوامی لەنێوان ململانێی ئاشوورییەکان و ئۆراتییەکاندا خولاوەتەوە، بەجۆرێ کە زۆرجاران ئەم ناوچەیە لەلایەن پادشایانی ئاشووردوە تالان کراوە، یەکێ لەو پادشایەی ئاشووری کە ئەم ناوچەیەی تالان کردبێ (ئیگلا تیپلاسەری یەکەمە) لە ساڵی (١١٠٠ پ.ز) هەروەها ئەم ناوچەیە لەلایەن (شلمنسری سێیەمیشەوە) داگیر کراوە، بەڵام دوای هاتنە سەر تەختی (ئشبوینی) (٨٣٠- ٨١٠ پ.ز) بۆ سەر تەختی پادشایەتی ئۆرارتۆ لەگەڵ کوڕەکەیدا (مینوا) (٨١٠- ٧٨٦پ.ز)، توانیویانە ئەم ناوچەیە لە دەسەڵاتی ئاشوورییەکان رزگاربکەن. بەم بۆنەیەوەش هەڵکەندراوێکیان بۆ خۆیان هەڵکەندووە کە بە (کێلەشین) ناسراوە، هەروەها لەلایەن (مینوا) زۆر قەڵای بەهێز لەو دەڤەرەدا دروست کراوە، کاتێ پادشای ئۆرارتی (روسای یەکەم) هاتۆتە (موساسیر= ئەردینی) کەلوپەلێکی زۆری پێشکەش بە خوداوەندی (خالدی) کردووە، هەر بەم بۆنەیەوەش هەڵکەندراوێکی بۆ خۆی تۆمار کردووە، کە بە هەڵکەندراوی (تۆپزاوە) ناسراوە. ئەم ناوچەیە زۆر بەتوندی لەلایەن پادشای بەهێزی ئاشوورییەوە (سەرجوونی دووەم) تالان کراوە، لەمیانەی هێرشی ساڵی (٧١٤پ.ز) کە توانیویە دەوڵەتی (ئۆرارتۆ) لەو هێرشەدا بە تەواوی کۆتایی پێ بێنێ، لەکاتی گەڕانەوەیدا بووە کە (موساسیر)ی داگیر کردووە، کاتی (روسا)ی پادشای ئۆرارتی هەواڵی داگیرکردنی (موساسیر) دەبیستێ خۆی دەکوژێ، (ئەرزانا)ی فەرمانڕەوای (موساسیر)یش نەیتوانیوە خۆی دەرباز بکات، بەڵام سەرجوون باس لەوە دەکات، کە ئەم شارۆچکەیە شارۆچکەیەکی بچووک بووە و دانیشتوانی بە (٦٠٠٠) کەس داناوە.

دەقی تێکستێکی سەرجوون لێرەدا دەخەینە روو، کە باسی ئەم داگیرکارییەی دەکات. تەنیا دێڕی (٢٣)ی دەقەکە باسی (موساسیر)ی دەکات، جا لەبەر ئەوە ئێمە تەنیا ئەو دێڕە وەردەگرین:

**23- (ALU) MU- SA- SI- RI- (MAT) AN- DI- IA- U- (MAT) ZI- KIR- TI- SA2- (M) RU- SA- A-A- (MAT) U2- RA- AS2- TU- A- A.......**

بە واتای:

(شاری موساسیر، زەوییەکانی ئەندیە و زیکیرتو، لەکوێیە روسای ئۆرارتی..)

بەو واتایەی کە هەموو ئەو شوێنانەی داگیرکردووە، بەڵام روسای پادشای ئۆرارتی خۆی شاردۆتەوە، هەروەها کەلوپەلێکی یەجگار زۆری لە (موساسیر) بەتاڵان بردووە، کە لە چەندەها مەوادی جۆراو جۆر دروست کرابوو، لەوانەش (١٠٨ تەن برۆنز، ٢٥,٢١٢ دەرعی بچووک و گەورە لەمس دروستکراو، ٣٠٥,٤١٢ شیر و خەنجەری لە مس دروستکراو، ٦٠٧ لەگەنی گەورە و بچووکی مسی، ٣ لەگەنی گەورەی مسی، یەک جەرەی گەورەی مسی، ٤ پەیکەری لەمس دروستکراو، ٤ کوپ، یەک پەیکەر کە ساردووری پێشکەشی کردبوو، یەک پەیکەری مسی گاوچیرکە روسا پێشکەشی خوداوەندی خالدی کردبوو، یەک پەیکەری مس، کە ئارگشتی پێشکەشی کردبوو، ١١ شیری زیوی کە ناوی روسایان لەسەر هەڵکەندرابوو، چەندان مەوادی تر، کە نزیکەی (٥) تەن زیو دەبوو.

سەبارەت بە دیاریکردنی شوێنی ئەم شارە بیروبۆچوونی جیاواز هەیە، (لویس لیڤاین) پێی وایە، کە سنووری (موساسیر)ی لە کێلەشینەوە تا گوندی سیدەکانە، ئەم شارەیە کەوتۆتە باکووری خۆرهەڵاتی وڵاتی ئاشوور، بەواتای هەر لە کێلەشینەوە تا شارۆچکەی رواندز درێژ دەبێتەوە، دەکرێ بڵێین، کە خودی (رواندز) شاری (موساسیر)ی کۆن بێ، چونکە بەگوێرەی وەسفکردنی

شاری موساسیری کۆن بەوە ناسرابوو، کە شارێکی زۆر توندکراو بووە، کە ئەم بارەش لەگەڵ سروشتی ئەمڕۆی شاری رواندز گونجاوە. واتای ناوی (موساسیر)ی بە ئاشووری بەواتای شوێنێکی وەک (دۆڵ) یان (بازنەیی) کە بەشاخ دەوردەدرابێ، (هاوبت) پێی وایە کە واتای ناوی موساسیری کتومت وەک سروشتی پاشماوەی ئەو شوێنەیە، کە هەڵکەندراوەکەی تۆپزاوەی لێ بووە وایە، کە دوور نییە شارەکەش هەر لە هەمان شوێن بووبێ، لە بەشی رۆژهەڵاتیدا دۆڵێکی لێیە کە بە (شکینا) ناسراوە، پاشماوەی قەڵایەکی کۆنی لێیە. کە نزیکەی نیو کیلۆمەتر لە هەڵکەندراوەکەوە دوورە، لەسەر گردێکی بەرز بە بەرزی نزیکەی (٣٠م)، کە دیوارەکانی ئەم قەڵایە لەبەرد دروست کراوە، کە ئەم شێوازە لەلایەن ئۆرارتییەکان لە بیناسازی پەیڕەو دەکرا، لەناو قەڵاکە وا پێ دەچێ پەرستگای تێدابووبێ. یان دەکرێ یەکێ لەو گردە شوێنەواریانەی کە کەوتوونەتە قەزای سۆران، هەمان شاری موساسیری کۆن بێ، کە ئەمەش تەنیا بە هەڵکۆڵینی شوێنەواری دەتوانرێ بسەلمێنرێ یان رەت بکرێتەوە، یان دەکرێ شاری موساسیری کۆن هەر هەمان (موجیسیری) ئێستابێ، کە بەدووری (١٨)کم دەکەوێتە باکووری رواندز لە رۆژئاوای (تۆپزاوە). کە تا رادەیەکی زۆر ناوەکانیشیان لە یەکترییەوە نزیکن.

### ٧- بەردە هەڵکەندراوەکەی (میلەکەی) کێلەشین

ئەم هەڵکەندراوە بە یەکێک لە گرنگترین شوێنەوارەکانی کوردستان دادەندرێ، چونکە بووە دەروازەی زانینی زمانی ئۆرارتۆ، ئەم هەڵکەندراوە شوێنەکەی خۆی دەکەوێتە ناحیەی سیدەکان لە قەزای سۆران، لەکۆتایی دۆڵێک یان سەرەتای دۆڵەکە لەلایەکەی دیکەیەوە، لەبناری چیای (سیکاو) لەنزیک (قادرچای) لەسەر سنووری (عێراق- ئێران)، ئەم هەڵکەندراوە لە شوێنێکی تارادەیەکی کەم بەرز داندرابوو، لە ناوەڕاستی پانتاییەک هەڵکەندراوە کە لەلایەن خەڵکەوە بە (کێلەشین) ناسراوە، کە ئەمەش ناوێکی کوردییە (کێل) بەواتای (کێل)ی قەبر دێت و، (شین)یش ناوی رەنگێکە، رەنگە وشەی یەکەمی مەسەلەکە هۆکارەکەی بۆ ئەوە بگەڕێتەوە کە ئەم هەڵکەندراوە، هاوشێوەی (کێل)ی قەبرە، بەڵام وشەی دووەم رەنگە هۆکاری ئەم ناونانەی بۆ ئەوە بگەڕێتەوە، کە بەهۆی باران و بەفری زۆر کە لەناوچەکە دەبارێ، بووبێتە هۆی ئەوەی بەردەکە بە (قەوزە) داپۆشرێ، کە رەنگێکی شینی پێ بەخشیبێ، چونکە رەنگی ئەم بەردە لە بنەڕەتدا رەنگی رەشە، ئەم هەڵکەندراوە لە بەردی بازلتی رەش دروست کراوە، کە سەرچاوەی ئەم بەردەش لەناوچەکەیدا نییە، بەڵکو وا پێدەچێ ئەم بەردەیە لە دەوروبەری گۆمی ورمێوە هێنرابێ، بەڵام لە موساسیردا نووسینەکەیان لەسەر تۆمار کردبێ، لە شوێنەکەیاندا رۆیانبێ، کە درێژییەکەی نزیکەی (٢م) و پانییەکەی (٦٠سم) و ئەستوورییەکەی (٣٠سم)، کە لەسەر چوارچێوەیەکی تارادەیەک چوار گۆشە بنیات نراوە، کە وەک ئەو رێسمانانەی دەرگا وایە کە لە کۆندا بەکارهاتووە. بەرزی ئەو شوێنەی هەڵکەندراوەکەی لێ بووە لە ئاستی رووی دەریا (٩٤٢٥پێ)یە و لەو شوێنەدا پاشماوەی بینا دەبینرێ، کەوا پێدەچێ پەرستگای ئۆرارتی بێ، ئەم هەڵکەندراوە لەکۆندا کەوتۆتە سەر رێگایەکی گرنگ کە موساسیری بەوڵاتی ئۆرارتۆ بەستووەتەوە.

مێژووی ئەم هەڵکەندراوە دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی پادشای ئۆرارتی (ئشبوینی) و کوڕەکەی (مینوا)، کە بەبۆنەی بەدەست هێنانەوەی موساسیری و ئازادکردنی لەدەستی ئاشوورییەکان ئەم هەڵکەندراوەیان دروست کردووە.

بۆ یەکەم جار ئەم هەڵکەندراوە لەلایەن راهیبەیەکی ئەڵمانی بەناوی (شولتس) دۆزراوەتەوە، لە ساڵی (١٧٨٠ز) سەردانی ئەم هەڵکەندراوەی کردووە، کە نووسینەکەی سەری کۆپی کردووە، بەڵام لەلایەن خەڵکی ناوچەکەوە دەکوژرێ، هەر لەبەر ئەم هۆکارە هەموو کۆپیکراوەکانی لەدەست دەچن و دەفەوتێن، پرۆفیسۆر (م. شولتز) یەکەم کەسە کە لەبارەی ئەم هەڵکەندراوەوە دواوە، لە کۆڕێکی زانستیدا لەلایەن حکومەتی فەرەنساوە رادەسپێردرێ بۆ گەڕان بەدوای شوێنەواردا لە ئێران، دوای ئەوەی لەساڵی (١٨٢٩ز) دەگاتە (تەورێز)، لەمیانەی سووڕانی لە ناوچەی هەکاری لەلایەن خەڵکەکەوە دەکوژرێ، لەساڵی (١٨٤١ز) جەنەڕاڵ (ولنسۆن) سەردانی ئەم

هەڵکەندراوەی کردووە، کە باسی ئەو هەڵکەندراوەی بڵاوکردۆتەوە، گەریدەی رووسی (خانیکۆف) لەساڵی (١٨٥٢ز) سەردانی ئەو هەڵکەندراوەی کردووە، کە نووسینەکەی سەری کۆپی کردووە، کەسێکی تر بەناوی (د.بلاو) لەساڵی (١٨٥٨ز) سەردانی ئەم هەڵکەندراوەی کردووە. زانای زمانە کۆنەکان (سایس) لێکۆڵینەوەی لەسەر نووسینەکە ئەنجامداوە، (دی مورگان) لەساڵی (١٨٩٠ز) لەگەڵ خێزانەکەی نووسینەکەی کۆپی کردووە و لەلایەن (شیل) بڵاو کراوەتەوە، (لیمان هاوبت) سەردانی هەڵکەندراوەکەی کردووە و لێکۆڵینەوەی لەسەر ئەنجامداوە، چەندان شوێنەوارناسی دیکە سەردانی ئەم هەڵکەندراوەیان کردووە و لێکۆڵینەوەیان لەسەر ئەنجامداوە.

ئەم هەڵکەندراوە لەلایەن حکومەتی ئێرانەوە دەبردرێ، کە ئێستا لە مۆزەخانەی ورمێیە. نووسراوی سەر ئەم بەردە بە دوو زمان نووسراوە، کە ئەویش ئۆرارتی و ئاشوورییە، کە ئەوەش یارمەتیدەربوو بۆ تێگەیشتن لەزمانی ئۆرارتی و زانینی. کە نووسینە ئۆرارتییەکە لە (٤١) دێڕ پێکهاتووە، بەڵام نووسینە ئاشوورییەکە لە (٤٢) دێڕ پێکهاتووە.

لەژێر رۆشنایی دەقە ئاشوورییەکە ئەمەی خوارێ وەرگێرانی دەقە خلدییەکەیە:

(پادشا ئشبونی کوڕی سردور، پادشای مەزن، پادشای جیهان و گەورەی شاری تشپامل کەچن ئەو و کوڕەکەی لەبەردەم خوداوەندی خالدیا لەشاری موساسیر (لەدەقە خلدییەکە بەناوی ئەردینی ناوبراوە) بنیادی نانۆی (بۆ خوداوەندی خالدیا) ماڵی (پەرستگا) لەگەڵ بنیادنانی ئەم هەڵکەندراوە کە نووسینەکەی گەواهیدەرە لەسەر ئەوەی ئشبوینی و کوڕەکەی پەرستگایان بنیاد ناوە. دیاری گرانبەهایان لەچەکی جوان و قاپوقاچاغ لەجۆری (قبدکو)ی دروستکراو لە مس و قاپوقاچاغی مسی تر پێشکەشی کرد و لەگەڵ پێشکەشکردنی زیو و دیارییەکی زۆری دیکە لەبەردەم دەروازەی پەرستگای خوداوەند خالدیا، خوایە، بۆ ئەوەی رۆژگاری ژیانیان درێژبکەی.

لەگەڵ پێشکەشکردنی قوربانی بۆی ١١١٢ گوڵک و ٩١٢٠ کاوڕ و ١٢٤٨٠ مەڕ، ئامادەبوونی لە شاری موساسیری رۆیشت ئشبوینی کوڕی ساردور، پادشای مەزن، پادشای جیهان، پادشای وڵاتی نائیدی و گەورەی شاری تشپا بۆ پەرستگای خوداوەند خالدی و پێشکەشکردنی قوربانی بۆی و قوربانی بەناویەوە بۆ دانیشتوان و لێدانی رێگا لەکن دەرگاکانی پەرستگای خوداوەند خالدی، بۆ ئەو سەرکەوتنەی کە پێشکەشی نەوەکانی دەکات لەژیانی دنیادا. هەموو ئەوانەی ئەو نووسراوە تێکدەدەن، کە لەسەر ئەم هەڵکەندراوەیە بەهیلاک دەچێ، چونکە خوداوەند خالدیا و خوداوەند ئەداد و خوداوەند شمشاش خوداوەندەکانی شاری موساسیری لەناو دەبات نەوەکانی لەسەر زەوی).

### ٨- میلەکەی تۆبزاوە:

ئەم میلەکە دەکەوتە نزیک هەڵکەندراوی کێلەشین، لەناحیەی سیدەکان، لەو شوێنە بووە، کە پێی دەوترێ (تۆبزاوە)، کە لەبەردێکی لاکێشەیی پێکهاتووە لە هەمان جۆری بەردی کێلەشین دروست کراوە و هەمان ئەو بارودۆخەی بەسەردا جێبەجێ دەبێ، کە بەسەر کێلەشیندا جێبەجێ کراوە، لەبواری هێنانی جۆری بەردەکە و دروستکردنی، کە لەسەر چوارچێوەیەکی چوارگۆشە چەسپێنراوە، کە لەهەمان جۆری بەرد دروست کراوە، تارادەیەکی زۆر لە هەموو لایەنەکانەوە لێکچوون، لەنێوان ئەم دوو هەڵکەندراوەدا هەیە، سەرەڕای ئەوەی، کە ناگەڕێتەوە بۆ یەک سەردەمیش. بەرزی ئەم هەڵکەندراوە (١.١٦م) و پانییەکەی (٩٢سم)ە، ئەستوورییەکەی (٣٣سم)ە.

ئەم میلەکە لەلایەن خەڵکی ناوچەکەوە بە (کێلی گاور) ناسراوە، کە ماناکەی بە واتای (کێلە کافر) دێ. ئەم هەڵکەندراوە لەسەر رێگایەکی سەرەکی دانراوە، ئەو رێگایە (سیدەکان) بە کێلەشینەوە دەبەستێتەوە. ئەو رێگایە هەمان ئەو رێگایەیە کە ئۆرارتییەکان بەکاریان هێناوە بۆ گەیشتن بەوڵاتی موساسیری.

بەشی سەرووی ئەم هەڵکەندراوە تووشی شکان بووە، کە شوێنەوارناس (لیمان هاوبت) پێی وایە، ئەو بەشەی هەڵکەندراوەکە بە ئەنقەست شکاوە لە سەردەمی داگیرکردنی ئەو ناوچەیە لەلایەن (سەرجوونی دووەم)ی ئاشوورییەوە، چونکە پێی وایە لەوانەیە نووسینێکی لەسەر

بووبێ كە ئیهانەكردن بێ بەكەرامەتی ئاشوورییەكان و یان لەقەبی خوداوەندی (خالدی)، كە بە گەورەی جیهان داینابێ، بەڵام ئەم لەقەبە لای ئاشوورییەكان تەنیا تایبەت بووە بە خوداوەندی (ئاشوور)، سەبارەت بە تێكدانی دیوی كۆتایی كە رەنگە هۆكارەكەی بۆ ئەوە بگەڕێتەوە كە (روسا)ی پادشای ئۆرارتی، ئاماژەی بە سەركەوتنی كردبێ بەسەر پادشایەكی ئاشووریدا.

زۆر لە رۆژهەڵاتناسان و شوێنەوارناسان سەردانی ئەم هەڵكەندراوەیان كردووە و لێكۆڵینەوەیان لەسەر ئەنجامداوە و، بۆ یەكەم جار جەنەراڵ (ولنسۆن) بووە لە ساڵی (١٨٤١ز) و هەریەكە لە (ئیلزیمینی، بلا، دی مورگان) سەردانی ئەم هەڵكەندراوەیان كردووە، لەوكاتەی كە سەردانی (كێلەشینیان) كردووە لەساڵی (١٨٩٤ز) شوێنەوارناس (لیمان) سەردانی ئەم هەڵكەندراوەی كردووە و ئەو نووسینەی سەری بلاوكردۆتەوە. زۆر لە شارەزایانی زمانە كۆنەكان هەڵساون بە لێكۆڵینەوە لەسەر نووسینی ئەم هەڵكەندراوە.

ئەم هەڵكەندراوە هەروەك (كێلەشین) بەكلیلی چارەسەر و زانینی زمانی ئۆرارتی دادەندرێ، چونكە لەسەر ئەم هەڵكەندراوە بەدوو زمان نووسراوە، ئەوانیش (ئۆرارتی و ئاشوورییە)، كە هەردووكیان یەك تێكستن و لەناوەڕۆكەوە لەیەكتر جیاوازنین، بەهۆی زانینی زمانی ئاشوورییەوە توانرا ئۆرارتییەكەش بخوێندرێتەوە و واتای لێكبدرێتەوە، ئەم نووسینانە هەریەكەی لەلایەكی بەردەكە هەڵكەندراوە، ئەو لایەی كە بەئاشووری نووسراوە رووەكەی لەرێگاكە بووە، كە وا پێدەچێ ئەمە لە سەرەتای دروستكردنیدا بەو شێوەیە نەبووبێ چونكە خالدییەكان ئەم هەڵكەندراوەیان بەخۆ دروست كردووە، كە ئەمەش دەبێ بە شێوەیەك بووبێ كە نووسینە خالدییەكە رووەكەی لەرێگاكە بووە، بەڵام بەهۆی داگیركردنی ئەم ناوچەیە لە سەردەمی (سەرجوون)دا رەنگە ئەم باردی بە شێوەیەكی تر گۆڕیبێ، بەو شێوەیە ماوەتەوە تا كاتی دۆزینەوەی.

سەرەڕای ئەوەی كە لەسەر رووی هەڵكەندراوەكە تێكچوون هەبووە، بەڵام ئەمە نەبووەتە گرفت لەبەردەم پسپۆڕان، بۆ ئەوەی رێیان لێ بگرێ لە شیكردنەوەی نووسینەكەی سەری. مێژووی ئەم هەڵكەندراوە دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی پادشای ئۆرارتی (روسای یەكەم) (٧٣٥-٧١٤پ.ز) كە ئەم هەڵكەندراوەی لە ساڵی (٧١٥ پ.ز) دروست كردووە، بە بۆنەی ئازادكردنی موساسیری لەدەستی ئاشوورییەكان و ماوەی (١٥) رۆژ لە موساسیری ماوەتەوە و قوربانییەكی زۆری پێشكەش بەخوداوەند خالدی كردووە.

پوختەی وەرگێڕانی دەقە ئاشوورییەكە بۆ دەقی خالدی كە (٣٧) دێڕە:

(ئەرزانا پادشای شاری موساسیری داوای بەهاناهاتنی لە روسا كرد، كوڕی پادشای خالدی سردور بۆ پارێزگاری كردن لەژیانی و قورتاركردنی لەدەستی ئاشوورییەكان و بەستنی هاوپەیمانی لەگەڵی، فەرمانی كردووە بە بەهێزكردنی سوپاكەی و لەخوداوەندەكان خێری خواستووە بۆ پادشای موساسیر- ئەرزانا. گوێ بیستی بۆ قسەكانی خوداوەند خالدی و خێرای لە پاڵپشتیكردنی روسا و روساش هاوپەیمانی ئەرزانای قبوڵ كرد و چەسپاندی بە پادشا لە موساسیری و پاڵپشتی كردنی مەڵبەندەكەی لەم ساڵەدا؟ لەوكاتەدا روسا لە موساسیری لەگەڵ پادشاكەی ئەرزانا رۆیشتووە بەرەو پەرستگای خوداوەندەكان وەستاوە ئەرزانا لەبەردەمیدا و هاوپەیمانی راست و دڵسۆز و پاكی لەگەڵ پادشای خالدی روسا بەستووە و پێشكەشكردنی قوربانییەكان و پێشكەشكردنی كانزا بۆ خوداوەندی خالدی. روسا پەرستگایەكی بۆ خوداوەندی خالدی دروست كرد لە موساسیری ئەرزانا لەگەڵ سوپاكەی لەلای دەرگای پەرستگا وەستاوە و ئەرزانا هەموو ئەو هێزەی هەیبوو دای بەپادشا روسا و خوداوەند خالدی فەرمانی پێكرد بەهێرشكردن، روسا بەناو شاخەكانی وڵاتی ئاشووردا رۆیشت، كۆتایی هێنا بەهەر بەرگرێكی دیفاعی ئاشووری لە شاخەكانی موساسیری و، پێشكەشكردنی قوربانی و دەست پێكردنی خۆشی لەوڵاتی موساسیری بۆ ماوەی ١٥ رۆژ و، چەسپاندنی فەرمانڕەوایی ئەرزانا و پاراستنی ژیانی و لەدوای روسا گەڕاوەتەوە بۆ وڵاتەكەی و نووسینەكە بەم چەمكە كۆتایی دێت: (من ئەرسا خزمەتكاری خوداوەندی خالدی شوانێكی دڵسۆز بۆ خەڵك، سەركەوتنم بەدەست هێناوە بەهاوكاری خوداوەند خالدی و هێزەكانی سوپام كە ترس ناناسن و سەركەوتن

دژی داگیرکەران و خوداوەند خالدی هێز و سەروەری پێ بەخشیم و پێداوم سالآنی فەرمانڕەوایی بەخۆشی و پتەوکردنی وڵاتی ئۆرارتۆ و بەشبەشکردنی وڵاتی شەڕانگێزی و خوداوەندەکان رۆژانی خۆشییان زۆر کردم و رۆژانی خۆشی نزیک کردەوە بۆم و خۆشی لە دڵمدا بڵاوکردەوە، دوای سەرکەوتنێکی تەواو تەئمین بوونی ئاشتی و جێگیربوونی پێ بەخشیم. هەریەکێ رەشی دەکاتەوە یان تێکی دەدا و هەریەکێ لەم کارانە بکات، ئەوا خوداوەندی خالدی و خوداوەندی ئەداد و خوداوەندی شماش و هەموو خوداوەندەکان، نەوەکانی لەناو دەبات و ناوەکەی ئیبادە دەکات).

*** سەرچاوەکان**

١- ئەحمەد کۆزاد محەمەد، کوردستانی ناوەڕاست لەنیوەی یەکەمی هەزاری دووەمی (پ.ز)دا، سلێمانی، ٢٠٠٧ ز.
٢- ئەحمەد، جەمال رەشید، لێکۆڵینەوەیەکی زمانەوانی لەبارەی مێژووی وڵاتی کوردەواری، بەغداد ١٩٨٨.
٣- دیاکۆنۆڤ، ئی.م، میدیا، و. بورهان قانع، چاپی دووەم، مەکتەبی ناوەندی راگەیاندنی (ی.ن.ک)، ٢٠٠٥.
٤- قەرەداغی، فازڵ، مێژووی دێرینی کوردستان، سلێمانی، ٢٠٠٤.
٥- لیسۆ، یورگین، خشتەکانی شمشارە، و. عەزیز گەردی، هەولێر ١٩٩٨.
٦- احمد، جمال رشيد، ظهور الكرد في التاريخ، ج١، اربيل، ٢٠٠٣.
٧- ئەحمەد جەمال رەشید، لقاء الكرد واللان في بلاد الباب وشدون، اربيل، ٢٠٠١.
٨- احمد، جمال رشيد، كركوك في العصور القديمة، اربيل، ٢٠٠٢ ز.
٩- احمد، جمال رشيد، تاريخ الكرد القديم، اربيل، ١٩٩٠ز.
١٠- رو، جورج، العراق القديم، ت. حسين علوان حسين، الطبعة الثانية، بغداد ١٩٨٦.
١١- باقر، طه وسفر، فؤاد، المرشد الي مواطن الاثار والحضارة (الرحلة الخامسة)، بغداد- اربيل، بغداد، ١٩٦٦ ز.
١٢- سليمان عامر و الفتيان، احمد مالك، محاضرات في التاريخ القديم، بغدا، ١٩٧٨ز.
١٣- ساكز هاري، عظمة بابل، ت. عامر سليمان، ١٩٧٩.
١٤- ساغز، هاري، عظمة اشور، ت. خالد اسعد عيسى و احمد غسان سبانو، دمشق، ٢٠٠٣.
١٥- لابات، رينية، قاموس العلامات المسمارية، ت. الاب البير ابونا واخرون، مطبعة المجمع العلمي، ٢٠٠٤.
١٦- الامين، محمود، مسلتا طوبزاوه وكيلەشين، سومر، مجلد ٨، ج١، بغداد، ١٩٥٨، ص٥٣-٧١.
١٧- عبدالصمد، رافدة عبدالله، اربيل في المحاد، المسمارية، استعض من تاريخي للادوار التاريخية، اعمار قلعة اربيل حماية للتدان الانساني، هەولێر، ٢٠٠٤، ص٩٨-١٠٢.
18- comeron. George.o , the annals of shalmanser iii king of Assyria. A new text, sumer, vol. vi, Baghdad, 1950, pp. 11-24.
19- eidem, jesper and laessoe, jorgen, the she mshara archives 1 the letters, Copenhagen, 2001.
20- eidem, jesper, the shemshara archives2 the administrative texts, Copenhagen, 1992.
21- eidem, jesper, news from the eastern front the evidence from tell shemshara, iraq, vol: xlv ii, London, 1985, pp. 83-109.
22- englund. Robert. K, the ur iii collection of the cma, university of California, 2001.
23- grayson. A. kirk, Assyrian rulers of the early first millennium b. c. I (1114- 859 b.c), London.
24- gadd C.j, inscribed prims of sargon ii from nimrud, iraq, vol. xvi, London, 1958. pp. 173- 201.
25- halloran. John. A, Sumerian lexicon.
26- kupper. Jean. Robert, inscriptions royales sumeriennes et akkadiennes, paris, 1971.
27- Kramer. Samuel. Noah, the Sumerians, university chi cago, 1963.
28- laesseo. Jorgen, people of ancient Assyria, t, f.s. leigh- browne, 1963.
29- postgate. J. n, Assyrian texts and fragments, iraq, vol. xxxv, London, 1973, pp. 22-23.
30- parker. B. the nimrud tablets, 1952, business documents, iraq, vol. xvi, London, 1958. pp. 29-58.
31- sags. H.w.f, the land of kirruri, iraq, vol. xlii, London, 1986, pp. 79-83.
32- steinkeller. Piotr, the history background of urkesh and the hurrian beginnings in northern Mesopotamia, vol. 26, 1998, pp. 75-85.
33- van loon. Maurits nanning, urartian art, Istanbul, 1966.
34- Wilhelm. Gernot, the hurrians, t. Jennifer barnes and Diana l. stein, England, 1988.

# هەولێر لە سەرچاوە مێخییەکاندا

دکتۆر رافیدە عەبدوڵڵا عەبدولسەمەد

**یەکەم: جوگرافیای هەولێر**

هەولێر دەکەوێتە نێوان هەردوو زێ (زاب)، زێی گەورە لەباکوورەوە زێی بچووک لەباشوورەوە، هەروەها زێی دیجلە لەرۆژئاوایەوەو زنجیرە چیایەک لەرۆژهەڵاتدا دەوریان داوە، ئەم زنجیرە چیایانە هەرچەندە بەرەو رۆژهەڵات دەچێ بەرزتر دەبێتەوە، هەولێر لەو ناوچانە دەژمێردرێت، کە بەئاوی باران کشتوکاڵی لێ دەکرێت، بەبێ ئەوەی پشت بەئاودێری ببەستێت، بەدەوڵەمەندترین ناوچەکانی عێراق دادەنرێ لەرووی بەرهەمهێنانی دانەوێڵە، بەتایبەتی گەنم و جۆ.

لەبەر ئەوەی هەولێر زەوییەکەی دەشتێکە بۆ کشتوکاڵ گەلێ سوودمەندەو ئاوو هەوای گەرمەو گەلێ سەرچاوەی ئاوی لێیە، ئەمانە بوونەتە هۆکار کە لەبەرەبەیانی مێژوودوە، لەسەردەمی چاخی بەردینی کۆنی ناودراستەوە لەدەوروبەری (٦٥٠٠٠) ساڵەوە تاکو ئێستا بەبێ پچڕان مرۆڤ لێی نیشتەجێ بووبێ.

نەک هەر ئەوەندە ژمارەیە هەبن و هیچی تر نا، بەڵکو بۆ نموونە تێکرای ئەو شوێنەوارانەی دەستنیشان کراون و لەفەرمانگەی شوێنەواردا تۆمارکراون کە بەپێی ئەتڵەسی جێگای شوێنەوارەکان لەساڵی ١٩٧٦دا چاپ کراوە، ئەوا سەنتەری شاری هەولێر -بەبێ قەزاو ناحیەکانی سەر بەشاری هەولێر- نەوەدو شەش شوێن دەستنیشان کراوەو لەفەرمانگەی شوێنەواری عێراقیدا هەر یەکەیان فایلی خۆیان هەیە، کە هەموو زانیارییەکی سەرەتایی لەخۆ گرتووە، تیایدا باس لەشوێنی شوێنەوارەکە کراوە، نەخشەی تایبەت بەخۆی هەیەو ناوی شوێنەوارەکەو نزیکترین شوێن لێی و نزیکترین سەرچاوەی ئاوو رێگای گەیشتن بۆی و ئابووری ناوچەکەی دەوروبەری شوێنەکەو رێژەی دانیشتوانی شوێنەکەی تێدا تۆمار کراوە[1].

هەرچی لەبارەی هەردوو زێیەکەوە، ئەوا لەسەرچاوە بزمارییەکاندا بەشێوازی (zaban) ناویان هاتووە، ئەم ناونانەش ناونانێکی کۆنە، وەکو ناونانی رووباری دیجلەو فورات، کە لێکۆڵەران پێیان وایە ئەم ناونانە لە سۆمەرییەکانەوە سەرچاوەی نەگرتووە، بەڵکو نوێش نییە، بۆیە دەگەرێتەوە بۆ زمانی دانیشتوانی سەرەتاییەکانی سەردەمی پێش مێژوو، هەروەک چەندەها ناوی دیکەی شارو شوێنە جوگرافییەکان[2] کە ئەمەش بەپێچەوانەی بۆچوونی (مامۆستا تۆفیق وەهبی)ی خوالێخۆشبووە، کە پێی وابوو واژەی (زاب) لەواژەی (الذهب)ی عەرەبییەوە سەرچاوەی گرتووە، بەو پێیەی بەزەحمەت واژەی (الذهبي)ی گۆ کردووە، لەبەر ئەوە گۆڕیویە بۆ (زاب) ئەمەش لەوەوە بووە کە زێ گرنگییەکی زۆری هەبوودو خێرو بێری زۆری داوە.

**دووەم: هەولێر لە سەرچاوە مێخییەکاندا:**

تائێستا لێکۆڵینەوە لەبارەی مێژووی دێرینی شاری هەولێرد بەئەنجام نەگەیەندراوە، بەو پێیەی هەولێر لەرووی جوگرافییەوە کەوتۆتە ناوچەیەکی دەشتایی و دەکرێ بەشێوەیەکی باش ئاودێری بکرێ، هەروەها بەچاکترین ناوچەی عێراق دەژمێردرێت لە بەرهەمهێنانی

دانەوێڵەدا، ئەمە جگە لەوەی لە جەرگەی قەڵەمڕەوی (ئاشوور)ەوە نزیک بووە، کە ڕۆژەڕێیەک بەپێ لێی دوور بووە، هەروەها تائێستاش دانەوێڵەی (البریسە)ی لێ گەشەدەکا، بۆیە بەپێی ئەم سەرنجانەوەو جێگەی خۆیەتی، کە لێکۆڵەران هەولێر بەیەکێک لەکۆنترین نیشتەجێبوونی کشتوکاڵی و بەردەوامی خەڵکان بژمێرن، ئەم هۆکارانەش وای کردووە کە خەڵکانی لێ نیشتەجێ بێ و لێی بێننەوە، بەجۆرێک لەدامەزراندنییەوە، تا ئێستاکە خەڵکی نیشتەجێی لێ بێت.

هەولێر بۆ خۆشی گردۆڵکەیەکی گەورەی تێدایە، کەتا ئەمڕۆش ماوەتەوە، لەبەر ئەوەی لەسەر ڕووی گردۆڵکەکەوە بۆ قووڵایی، واتا تاکو ڕووی زەوی گەلێ فرەوانە، بۆیە کاری هەڵکۆڵین لەچینەکانی ژێر زەوی ئەستەم بووەو تائێستا بەئەنجام نەگەیەندراوە[٣] هەرچۆنێک بێت ناوی هەولێر لەسەرچاوەی بزمارییەکاندا بەدوو دارشتنی جودا هاتووە. کە ئەمانەن (erbailam-arbilam) برگەی (il) کە پێکهاتەیەکی سەرەکییە بۆ دارشتنی ناوەکانی هەندێ لەشارەکان کە لەماوەیێکدا لەهەزارەی سێیەمی پ.ز دامەزراون، ئاماژە بۆ زمانێکی کۆن دەکا، کە نە زمانی سۆمەرییە نە ئەکەدییە، ڕەنگە زمانی خۆری بێت وەک (ئەربیل و کاربیل) هەندێ لەلێکۆڵەران بەهەڵە مانای (il)یان لێکداوەتەوە، کە (il) واتای (ئیلە) دەگەیەنێ، ئەمەو بەر لەوەی ڕۆشنبیری سۆمەری و ئەکەدی بەسەر ناوچەکەدا زاڵ بێ، شاری ئاشوور لەهەزارەی سێیەمی پ.زدا بەشێوازی (til-bal) ناسراوە[٤]، ئەم برگەیەش ناوەکانی پاشا یەکەمەکانی خورییەکانمان بەبیر دێنێتەوە، وەکو کیکلیب-ئاتل، شاری ئورکیش کە لەماوەی گوتی (٢٢٣٠-٢١١٦ پ.ز) حوکمی گێڕاوە و ئاتل شین شای ئورکیش و ناوا لەماوەی ئوری سێیەم لە ٢١١١-٢٠٠٤ پ.ز حوکمی گێڕاوە، هەرچی تیش ئاتلە کە نازناوی نەینەواو کارخاری لەخۆ نابوو، لەماوەی ئامارسین و شورسین ژیاوە[٥].

ناوی هەولێر لەگەلێ لەدەقە مێژووییەکان و زیاتر لەشێوازێکی مێژوویی لەهەزارەی سێیەمی پ.ز لەگەڵ ناوی وڵاتی سیمورم و کارخارو خمورتوم و شاشروم هاتووە، بێگومان هەڵمەتەکانی شاو ئیمپراتۆرە ئەکەدییەکان لەنێوان (٢٣٥٠-٢١٥٩) پ.ز دەشتی هەولێری گرتۆتەوەو بەرەو باکوور تاکو چیاکانی کوردستان کشاوە.

هەروەک لەمێژوودا زانراوە سەرجۆن ئەکەدی پاش ئەوەی دەسەڵاتی بەسەر تەواوی دەشتەکانی باشووری عێراق سەپاند، هەموو چالاکییە سەربازییەکانی بەرەو خاکی کوردستان برد، نەینەواو ئاشووری داگیرکرد، پاشان ڕووی لەناوچەکانی دراوسێی کردو بەرەو باکوورو باکووری ڕۆژهەڵاتی چوو تا گەیشتە وڵاتی لولوبیەکان لەئاورونا-سینو[٦] لەگەڵ داگیرکردنی عیلام کۆتایی بەحوکمیان هێنا، دەقە مێژووییەکانی ئەم دواییەو ئەو دەقانەی پێشبینیان تێدا نووسراوەتەوە، ئاماژە بەشڵەژان و شۆڕشی ناوخۆیی و دەرەکی دەکەن، کەوا لە دوا دوایی حوکمیدا ڕوویداوە، لەبەر ئەوەی سەرگۆن لەناوی بردوون و دیلەکانی لەپێناو خواوەند -خودای جەنگ-پارێزەری شاری ئەکەد کردۆتە قوربانی[٧].

دوای سەرگۆن هەردوو کوڕی لەدوای یەک جێگەیان گرتۆتەوە، هەردووکیان بەپیلان لەنێو کۆشکی پادشایی کوژراون، ریموش (٢٣١٥-٢٣٠٧)، کە شانازی بەوە دەکرد لەپێناو خوادادا دەریای خوارو و (کەنداو) و دەریای سەروو (دەریای ناوەڕاست) و تەواوی چیاکانی رزگار کردووە)[٨]، هەروەها مانیشتوسو (٢٣٠٦-٢٢٩٢ پ.ز) تەواوی ماوەی حوکمڕانێتی بەداپلۆسینی شۆڕشەکانی هەرێمەکانی ڕۆژهەڵات و باشووری ڕۆژهەڵات تەرخان کردووە، کەچی نەرام سین (٢٢٩١-٢٢٥٥ پ.ز) نەوەی سەرگۆن حوکمڕانێکی بەهێزو بەتوانا بووەو حوکمڕانییەتی ئەو گەشانەوەو بووژانەوەی بەرچاوی بەخۆوە دیوەو توانیویەتی هەرێمی کوردستان داگیر بکا، بەتایبەتی ناوچەی سلێمانی و دەوروبەری، کە سەنتەری شەڕی لولوبیەکان بووە، پاشان هەڵمەتێکی فرەوانی بۆ ناوچەکانی سەرووی دیجلەو فورات دەست پێکرد، تاکو گەیشتنە ناوچەی (البلخ) و خابور، ئینجا بەرەو ئاسیای بچووک کشاو لەو شوێنانەی، کە داگیری دەکردن شوێنەواری جێهێشتووە، هیچ بەدوور نازانرێت کە هەولێر کەوتبێتە نێو

سنووری ئەم هەڵمەتەی نەرام سین، چونکە هەولێر کەوتۆتە نێوان سلێمانی و سەرووی رووباری دیجلەو لەهەموو بارێکدا گران نییە هێزەکانی نەگەیشتبنە هەولێر.

دەقە بزماریبەکان ئاماژە بەوە دەکەن، کە لەکۆتاییدا دوژمنەکانی یەکیان گرتووەو ماوەی نەرام سین بەشڵەژانی سیاسی تەواو بووە، سەرباری ئەوەی گەلێ کارەساتی سروشتی، وەکو وشکەساڵی و قاتوقڕی و تاعون بڵاوبۆتەوەو تۆفان هەستاوە[9]، هەروەها هەندێ پێیان وایە، کە هاتنی گوتییەکان و پاشان کەوتنی ئەکەد تۆڵە سەندنەوەیەکی خودایی بووە، بەمەش مەملەکەتەکەی تەفرو توونا بووە، چونکە پەرستگای ئایکوری پەرستگای ئانیلی خودای لەشاری نەفەر پێشێل کردووە، بەمەش دەسەڵاتی مەردۆخی خودای بەسەرکەوتووە[10].

ئەفسانەی کوسیس[11] ئاماژە بەو ماوە کەمە دەکات، کە هەر چەندە واقیعێکی تاڵ بووەو نەرام سین کەوتۆتە ژێر حەتمییەتی قەدەر، دواجار ملکەچی نواندووە، ئەوەی ئەم حەقیقەتە دەسەلمێنێ ئەوەیە، کە لەهەمان سەردەمدا ئاریدۆ-بزری پادشای گوتی حوکمی کردووەو هاوسەردەمی سێ لە نەرام سینەکان بووە و ماوەیەکی کەم حوکمی شاری نەفەری کردووە و ناوی لە خۆی ناوە مەلیکی گوتیوم و چەند دەقێکی لەدوای خۆی جێهێشتووە بەپادشای هەر چوار لا خۆی ناساندووەو، ئەوەی زانراویشە دەوڵەتی ئەکەدی لەدوادواییەکانی حوکمی نەرام سین دا لاواز بووەو لولوییەکان و گوتییەکان روویان لە وڵاتی ئەکەدیبەکان کردووە، دوای نەرام سین جێگرەکانی نەیانتوانیوە بارودۆخەکە کۆنترۆڵ بکەن، تاکو رەوشەکە لەخراپەوە بۆ خراپتر چووە، پاش نەرام سین شارکالی شاری وایگیگی نانیئوم و رایمی و دودو حوکمیان گێڕاوە، تاکو لە کۆتاییدا لەلای شودو رول (٢١٦٨-٢١٥٤ پ.ز) دەسەڵات لەوپەڕی خراپیدا بووە، بەجۆرێ ئەو نووسەرەی، کە ناوی پادشا سۆمەریبەکانی نووسیووە بەم شێوەیە ئاماژە دەدا:

"کێ پادشایەو کێ پادشا نییە؟"

هەر چۆنێک بێت پادشای گوتی ئایدۆ-بزر سێ دەقی جێهێشتووە، لە یەکێکیاندا (کە لەسەر پەیکەرێکی ناو پەرستگای ئانیلی خودا لەشاری نەفەر نووسراوە) دەنگ و باسی سەرکەوتنە سەربازییەکانی دەگێڕێتەوە، کە چۆن لەناوچەی هەولێرو دەوروبەریدا بەسەر یاخیبوواندا زاڵ بووە.

جێگەی باسە ئەم شۆڕشە لەلایەن کارنیشبای پادشای سیمورم و لولوبیە هاوپەیمانەکانی رێبەری کراوە، لەوانە نیشخوخای حوکمداری هەولێر، لەبەر گرنگی ئەم دەقە مێژووییە بەباشمان زانی بەم جۆرە لێی وەرگێڕین:

"کانیشا پادشای سیمورم"

دانیشتوانی سیمورم و لولوبومی بۆ شۆرش هان داو... خودای گوتیوم... کاتێ ئامنیلی... سەرکردە وای کرد وڵات... یاخیبوون رابگەیەنن و.... ئاردیۆ-بزری پاڵەوان.... پادشای گوتیوم و هەر چوارلا خێرا (تەحەددای کرد).

بەرەو لووتکەی چیاکانی نیشبا پێشڕەوی کرد تەنگەرێی چیای خامەمە-لاپیری بەشەش رۆژ داگیرکردو چووە ناو تەنگەرێکەیەوە.

ئاردیۆ-بزری پاڵەوان دوای کەوت پاشان ئامنیلیی تەفروتوونا کرد لە... لەسەر لووتکەکەی لەیەک رۆژدا قەڵای هەولێری داگیرکرد لەسەر چیای موما پاشان نریشخوخای حاکمی هەولێری دەستبەسەر کرد....

(ئەم پەیکەرە)ی بۆ خودای ئانەلیلی لەنەفەر تەرخان کرد. ئەوەی ئەم نووسینە بسڕێتەوە، نەفرەتی ئانەلیلی خوداو شەشمی خودای بەردەکەوێ و لەنێو دەچێ.

ئاریدۆ-بزر پادشای گوتیوم و هەر چوارلا پەیکەرێکی بۆ خودای ئانەلیلی لەنەفەر تەرخان کرد.[12] لەراستیدا هەر یەک لەنەینەواو هەولێر لەهەزارەی سێیەمی پ.ز لەبنچینەدا لەلایەن ئەو نەتەوە و کۆمەڵانەوە نیشتەجێ بوون، کە لەچیاوە لە رۆژهەڵاتی دیجلەوە هاتوون و پەیوەندییەکی ئایینی و ئیداری بەهێز لەنێوانیاندا هەبووەو، خودای سەرۆکی هەردوو شار بریتی بوون لەعەشتاری هەولێرو عەشتاری نەینەوا، هەروەها لەگەڵێ باردا بەدوو خودای نەتەوەیی هەردوو شار ناسراون[13]. لەگەڵ ئەمانەشدا رەنگە هەولێر لەماوەی پچڕ پچڕدا هەندێ سەربەخۆیی خۆی هەبووە، بەڵام دووبارە بەهۆی جەنگەکانەوە کەوتۆتە و ژێر دەسەڵاتی پادشا بەهێزەکانی بنەماڵەی ئوری سێیەم (٢١١١-

٢٠٠٤ پ.ز) كە لەوانە شولكی لەساڵی چل و پێنجی حوكمڕانیدا ئۆربیلم و لولوبوم و سیمورم و كارخاری داگیركردووە، دواتر ئامارسین لەساڵی دووەمی حوكمیدا ئۆربیلی داگیركردووەو لەم رووەوە گەلێ دیكۆمێنتی ئابووری هەن كە رێكەوت و مێژووی ئەو ساڵەیان لەسەر تۆماركراوە، كە تێدا ئۆربیلم تالآن كراوە[١٤].

لەهەزارەی دووەمی پ.ز دا لەگۆڕەپانی سیاسی وڵاتی میسۆپۆتامیادا كۆمەڵێ هێز هاتنە كایەوە، كە لەپێناو زیادكردنی قەڵەمڕەوەكە بووە ناكۆكیان، جاری واهەبووە لەگەڵ یەكدا هاوپەیمان دەبوون و جاری واش هەبووە دەكەوتنە شەڕەوە.

لەناوچەكانی حەوزی دیالەو دەوروبەریدا مەملەكەتی ئاشنونا سەری هەڵداوە، كە هاوسەردەمی بنەماڵەی (بل)ی یەكەم بووە دادوشا یەكێك بووە لەپادشا بەهێزەكانی، كە هەڵمەتێكی فرەوانی بۆ قبارا (لەهەولێر) بردووە، و دادوشا هەولەكانی ئەم هەڵمەتەی لەسەر میلێكی بەردین تۆمار كردووە، كە حاڵی حازر لەمۆزەخانەی عێراق پارێزراوە. بەشی سەرەوەی بەگەورەیی دیمەنی هەڵمەتەكەی لێ هەڵكۆڵراوەو بەوردی باس لەسەركەوتنەكانی دەكا، هەروەها گرتنی مەملەكەتی قبارای لەخۆ گرتووە، تیایدا شوورە بەرزەكان رووخێنراون و هەڵۆو باڵندەكان گۆشتی مردووەكان دەخۆن (دكتۆر لەمیا ئەلگەیلانی لەسەر ئەم میلە تویژینەوەی كردووە)، هەرچی بەشەكەی دیكەیە، كە نووسینی بزماری لێ هەڵكۆڵراوە. بریتییە لەوردەكاری هەموو هێرشەكە لەسەرەتاوە تاكو كۆتایی (ئەویش دكتۆر بەهیجە خەلیل ئیسماعیل توێژینەوەی لەسەر كردووە)، بەڵام تائێستا نەگەیشتۆتە زانیارییەكی دڵنیاكەرەوە.

لەهەزارەی دووەمی پ.ز دەتوانین بگەین بەزانیارییەكی راست و دروست، كە حەمورابی (١٧٩٤-١٧٥٠ پ.ز) پاش سێیەمین ساڵ لەحوكمی بەهێرشێكەوە رووی لەزەوییەكانی كوردستان كردووەو توانیویەتی هاوپەیمانی عیلامی-سوباری-گوتی تێكبشكێنێ و سەرباری ئەوە ئاشنوناو مالیگوم داگیر بكاو سەركەوتن بەدەست بێنێ[١٥].

لەهەمان سەردەمدا-سەردەمی هەزارەی دووەمی پ.ز-لەباكووری میسۆپۆتامیادا هێزێكی دیكە سەری هەڵداو لەگەڵ ماری و بابل و ئاشنونا كەوتە ناكۆكییەوەو لەسەردەمی شاشمس-ئاددی یەكەم (١٨١٢-١٧٨٢ پ.ز) و هەردوو كوڕی شا ئاشمس-دگان و یسمح ئادد هەولیاندا قەڵەمڕەوەكەیان فراوان بكەن و بچنە ئەودیو سنووری خۆیانەوە، كە مەملەكەتی بەهێزی ئاشووری لێ بوو[١٦].

شمس ئادد لەلكاندنی ماری و ناوچە گرنگەكانی سووریاو لوبنان و كەنارەكانی دەریای ناوەڕاست سەركەوتنی بەدەستهێنا، پاشان كوڕەكەی یسمح ئاددی لەماری كردە حوكمڕان و كوڕەكەی تریشی ئاشمس-دگانی كردە جێگری خۆی لەبەڕێوەبردنی هەرێمەكانی رۆژهەڵاتی دیجلە، كە خۆی داگیری كردبوون و خستبوونییە ژێر قەڵەمڕەوەكەی، دەقەكانی (خشت)ی شمشارە (لەدەشتی رانیە) ئاماژە بەسروشتی بارودۆخی شڵەژاوی كوردستانی كۆن دەكەن، كە لەو رۆژگارەدا شەڕو یاخیبوون دژی قەڵەمڕەوی بەهێزی ئاشووری لەئارادا بووە كە لەرووی جەنگ و ئیدارەوە گەلێ بەتوانا بووە، هەروەها لەم دەقانەدا باس لەشاری هەولێر نەكراوە، بەڵام وڵاتی قبارا ئاماژەی پێدراوە، كەئەو شوێنە بووە بزاڤی سوپای ئاشووری لەوێوە رێكخراوە[١٧].

گومان لەوەدانییە كە شمس-ئادد هەولێری خستۆتە ژێر دەسەڵاتی خۆی و كردوویەتییە بەشێك لەدەوڵەتی ئاشووری، بەبەڵگەی ئەوەی دووبارە پەرستگاكەی لەنەینەوادا دروست كردۆتەوەو تێدا داگیركردنی هەموو شارە گرنگەكانی لێ تۆماركردووە، وەكو هەولێر، هەروەها شاری ئەرابخاشی خستۆتە سەر مەملەكەتەكەی[١٨].

جێگەی سەرنج و ئاماژە پێدانە كە ناوی (قوش تەپە) لەیەكێك لەدەقەكانی شمشارە بەشێوازێكی بەم جۆرە هاتووە:

**Ka-as-tap-pi-imki** (لاسو) و (ئیدیم) پێیان وایە ئەو گردۆڵكەیە، كە دوو كیلۆمەتر لەزێی گەورە دوورە، بەڵام ناوەڕۆكی نامەكە ئاماژە بەوە دەكا (كاشی تەپە) كە ناوچەی

(قوشتەپە)یە پەسەندترە، چونكە تێكەڵكردن هەبووە لەنێوان ئەو هێزەی لەئاشنون هاتووە لەگەڵ ئاشوور، كە دوای ئەوەی زێی گەورەی بڕیوە، پاشان لە (كاشی تەپە) بەیەكگەیشتن و چاودێری كواری حوكمداری شمساریان كردووە، ڕەنگە بۆ ئەوە بێ، كە خۆیان ئامادە بكەن، تاكو شوێنێكی تر لەهەرێمی كوردستان داگیر بكەن.

نامەكە دەڵێ: "بەكواری بڵێ گەورەت بەم جۆرە دەدوێ، ئەو سوپایەی كە لەگەڵ شمس-دگان دایە گەیشت، ئەو ڕۆژەی كە نامەكەم بۆ ناردی، تەواوی ئەو سوپایە لەگەڵ شمس دگان دایەو هەروەها ئەو سوپایەی، كە هی ئاشنونایە دەبێ زێیان بڕیبێ، من گەیشتمە (كەشی تەپە) و پاش ڕۆژی سێیەمی گەیشتنی نامەكەم، ١٠٠٠٠ لەچەكدارەكانت با لە (كشای تەپە) پێم بگەن و، با یەكێك لە ئەفسەرەكانت هاوڕێی سوپاكە بێت[19].

پادشا ئاشوورییەكان لەهەزارەی یەكەمی پ.ز بەشێوەیەكی سەرەكی گرنگی شارەكانیان زانیوە، چونكە قەڵاو عەمبارو بەڕێوەبەرایەتی لەخۆ گرتووە، لەوانە وەك شاری (شخان) (ڕەنگە قەزای شێخانی ئێستا بێت) و هەولێر، كە زۆربەی هەڵمەتەكانی ئاشوور ناسربالی دووەم (٨٨٣-٨٥٩پ.ز) بۆ ئەم شارە بووە، كە لەنەینەواو بگرە لەهەولێریش كە كەوتۆتە باشووری ئاشوور هەڵمەتەكانیان دەستی پێكردووە[20]. لەڕاستیدا پادشا ئاشوورییەكان لەهەولێردا ڕێورەسمی پەرستنی عەشتاری هەولێریان سازكردووەو قوربانییان بۆ ئامادە و پێشكەش كردووەو ڕاوێژیان بەعەشتار كردووە تاكو پێشنیازێكی باشیان بۆ بەدەست بێنێ و مژدەیان پێبدا، تا لەهەڵمەتە سەربازییەكاندا سەر بكەون[21].

ئاشوربانیبال لەهاوینی ساڵی ٦٥٣پ.ز لەهەولێر كاتێ زانیویەتی كە سوپای تیومانی عیلامی لەدژیدا دەستی بەجموجۆڵ كردووە، پەنای بۆ عەشتاری خوداوەندی هەولێر (خوداوەندی جەنگ) بردووەو لەوەوە بەخت و شانسێكی باشی دەستكەوتووەو پاشان بەسوپاوە بەرەو عیلام پێشڕەوی كردووەو توانیویەتی لەناوی ببا، ئەم سەركەوتنانەشی لە تابلۆیەكی دیواری تۆمار كردووە، كە ئێستا لەمۆزەخانەی بەریتانیا پارێزراوە[22].

باسكردنی گرنگی مێژووی هەولێر گەلێ هەولی دەوێ و توێژینەوەی لەباری شارستانی و مێژووی هەولێر پرۆژەیەكی گەورەی مەبەستە، كە خۆی چەندان تێزی ماستەرو دكتۆرا لەخۆ دەگرێ، ڕەنگە هەڵكۆڵین لەقەڵاو هەولدان لەپێناو چوونە نێو چینەكانی خوارەوەی گەلێ زانیاری گرنگمان بۆ بدۆزێتەوە.

## سەرچاوەكان:

١- أطلس المواقع الاثرية، بغداد، ١٩٧٦.
٢- هاري ساكز: قوة اشور، ترجمة عامر سليمان، بغداد، مطبعة المجمع العلمي ١٩٩٩-ص١٤.
٣- هاري ساكز: قوة أشور، ص٢٧.
٤- نفس المصدر السابق ص٤٤.
٥- د.فوزي رشيد، و د.جمال رشيد، تاريخ الكورد القديم، أربيل، ١٩٩٠، ص٧١.
٦- تاريخ الكورد القديم، ص٤٣.
٧- طه باقر، نفس المصدر السابق، ص٣٦٧-٣٦٨.
٨- طه باقر، ص٣٧٣.
٩- هاري ساكز، عظمة بابل، ترجمة عامر سليمان، مطبعة جامعة الموصل، ص٧١.
10-O.R. Gwny. The Saltam Tepe Tablets The Legerd of Naron-sim. Vol.5 1955 p93-109.
١١- ئەم وتارە لەلایەن هاوڕێم كۆزاد محەمەد ئەحمەد لەزانكۆی لایدی پێگەیشتووە، من هیچ زانیارییەكم لەبارەی سەرچاوەكەیەوە نییە.
١٢- هاري ساكز: قوة أشور، ص٤١-٤٢.
13- W, Hallo Simurram and Hurasm Fromtier R.A. vol. xxx vl p. 71-83.
١٤- هاري ساكز: قوة أشور، ص٥٠.
١٥- محمد طه الاعظمي: حمورابي، بغداد، ١٩٩٠، ص٦٦.
16- Jesper Ei de-amd Jorgean Lassae. The Shimshara Archive L. Demmank 2001 p. 92-93.
١٧- هاري ساكز: قوة أشور، ص٦١.
18- The shim shara Archivee L. p. 81.
١٩- هاري ساكز: قوة أشور، ص١١١.
٢٠- نفس المصدر السابق، ص١٥١.
٢١- هاري ساكز: قوة أشور، ص.١٦٤

# ئاربائیلو/ئوربلیوم/هەولێر

و: لە ئەڵمانییەوە: فازڵ قەرەداغی

**پێشەکی وەرگێر**

ئەم باسە لە نووسینی (ئێکهارت ئونگەر)ە لە allexikon der ASSYRIOLOGIE-RE بەرگی یەکەم (١٩٢٨) باسەکەش وەک هەموو بابەتەکانی تری سەرچاوەکە مێژوویەکی دوور و درێژی نییە، بەڵکو تەنیا باسێکی کورتە.

بە پێویستیشمان زانی کە:

١- پەراوێز بۆ روونکردنەوە و تێبینی خۆمان دابنێین.

٢- لەپاڵ ئەو وێنەیەی کە لە سەرچاوەکەدا هەیە وێنەی تر و نەخشەیەکی جوگرافی زیاد بکەین. ئەو وێنەیە زۆر روون نەبووە بۆیە وێنەیەکی باشترم لە سەرچاوەیەکی تردوە وەرگرت، جگە لەوەش بە پێویستمان نەزانی سەرچاوەکانی باسەکەی (ئونگەر) بنووسینەوە.

نووسەریش ناوی (ئاربائیلو)ی بە بەردەوامی بەکارهێناوە، ئێمەش هەر ئەو ناوەمان بەکارهێناوە و چەند جارێکیش ناوی (هەولێر)مان بەکارهێناوە.

یەکێکیش لەو شتانەی کە دەمێننەوە باس بکرێن، دانیشتووانی هەولێرە، کە رێی تێدەچێت لە رەگەزی (خووری) بووبن، چونکە خوورییەکان لە کوردستاندا زۆر بڵاو بوون و نیوەی کوردستانی ئەمڕۆ، وڵاتی خوورییەکان بوو، بەڵکو لەنیوەیش زیاتر. تەنانەت لە سەردەمی حوکمی (میتانی)دا خەڵکانێکی زۆری (خووری) لە شاری ئاشووردا دەژیان.

ڕۆژهەڵاتی هەولێریش دیسان لە خووری نشین دەچێت. لە کاتێکدا (خووری)ییەکان لە سەردەمی (میتانی)دا بە ئاشکرایی لە کەرکوک و دەوروبەریدا دەردەکەون. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا و لەبەر نزیکی هەولێر لەوڵاتی ئاشوور و لەبەر بایەخی شارەکە لای ئاشوورییەکان دیارە کە ئاشوورییەکان کاریگەرییەکی گەورەیان هەبوو لەسەری، بەڵام تا پشکنین لە قەڵای هەولێر نەکرێت هیچ شتێک لەم بارەیەوە بە روونی ئاشکرا نابێت.

***

١- (ئاربائیلو) کە پایتەختێکی ئاشووری و جاروبار بارەگای پادشا بوو، لە هەزارەی سێیەمەوە (پێش زایین) ناسراوە و تا ئەمڕۆ ماوەتەوە کە شاری هەولێر (ئەربیل)ە، لەسەر هێڵی ١١,٣٦ باکوور و ١,٤٤ ڕۆژهەڵات و لە تەنیشت و سەر رووی گردێکدا بیناکراوە[1]. ئاربائیلو کەوتۆتە دەشتە بە پیتەکەی نێوان زێی سەروو و زێی خواروو.

٢- لە سەردەمی نوێی سۆمەریدا (دەوروبەری ٢٥٠٠پ.ز)[2] ناوی ئاربائیلو بریتی بوو لە ئوربلیوم هەروەها ئوربیلیوم[3]، کە لەسەر دوو تابلۆی قورینی جیا لەکاتی بنەماڵەی سێیەمی (ئور) نووسراوە. یەک جاریش شێوەی نووسینی ئاربلیۆم. لە سەردەمی ئاشووریشدا فێر ببوون بۆ خۆشی شێوەی ئاربا- ئیلو بنووسن کە (ئاربا) واتای چوار دەدات و (ئیلۆ) واتای خواوەندی هەیە، وەک چۆن ئاربائیلو لە چوار خوداوەندەوە ناوی وەرگرتبێت. گەمەی هاوشێوەی وا لەناوی شاری (ئاراپخا)دا دەبینرێت.[4] بەپاڵ ئەمەش شێوەی نووسینی (ئار-با-ئیلو) یان (ئار-با-ئیل) هەیە (کاری برۆنزەکەی ئاشووردان- بڕوانە برگەی -٥- لە خوارەوەدا.

٣- مێژووی ئاربائیلو لەکاتی

بنەماڵەی سێیەمی (ئور)ەوە دەست پێ دەکات. (٤٦)ەم ساڵی حوکمی شولگی[٥] (پادشای بنەماڵەکە کە دەکاتە ٢٠٥٠ پێش زایین/ وەرگێر) و ساڵی دووەمی (ئامار-سین) (٢٠٤٦ پێش زایین/ وەرگێر) هەولێر وێران کرا. بەڵام پاشان دەوڵەتی نوێی سۆمەری (دەوڵەتەکەی بنەماڵەی ئور/ وەرگێر) خستییە پاڵ خۆی چونکە ئاراد- ناننار ئێنسی (فەرمانڕەوای... (ئونگەر) وشەی کۆنی (پاتیسی) بەکار دەهێنێت/ وەرگێر)ی شاری لاگاش (ی سومەر/ و.) هەروەها ئێنسی (میر)ی هەولێر بوو. لە سەردەمێکی نەختێک درەنگتردا، بەپێی میلەکەی (پاریس)لەشکر کێشییەکی میرێکی لوللوبی (؟)[٧] دژی هەولێر بەرپاکراوە.

هەولێر هەمیشە وەک شارێکی سەر بە دەوڵەتی ئاشووری دەردەکەوێت، چونکە هەرگیز تەنانەت یەک جار باسی داگیر کردنی شارەکە نەکراوە. لە (سەدەی نۆیەمی پ.ز)دا هەولێر خاڵی دەرچوونی لەشکرکێشییە ئاشوورییەکانی پێک دەهێنا بەرەو رۆژهەڵات و لەرێگەی دەربەندە نزیکەکەی (کیروری)یەوە. شامشی ئادادی پێنجەم (٨٢٣-٨١١پ.ز/و) هەولێر وەک شارێکی یاخیبوو ناودەبات. (٨).

لە فەرمانڕەوا و (ئیپۆنیم)ەکان [٩] ئەمانە دەناسین: سیل ئیشتار (ساڵی ٧٨٧)، پان- ئاششور- لامور (٧٥٩)، نابو- لیئو (٧٠٢)، پێشتریش ئاغای ناوچەیەک ناوی (مێسو) و کابرایەکی تر کە ناوی نەبراوە.

رەنگە لە ساڵی (٦١٥پ.ز/و) بووە کە هەولێر لەلایەن میدییەکانەوە بە سەرکردایەتی ئوماکیشتار (کیا کساریس)[١٠] داگیر کرا کە دەبێت لێرەدا ساگارتییەکانی[١١] جێنشین کردبێت. لە سەردەمی فارسەکاندا هەولێر پێی گوتراوە (ئاربیرا).

٤- لە هەولێردا ئیشتار و ئاشوور دەپەرستران. لە سەرووی هەموو شتێک پەرستنی ئیشتاری هەولێر (١٢) لە پەرستگای (ئیگاشا نکالاما)[١٣] دەکرا، کە گرنگترین شوێنی پێشبینی و شوێنی (خوێندنەوەی جگەر)[١٤] لە وڵاتی ئاشووردا و کە ئەوپەڕی رێز و ئیعتباری هەبوو لای ئەسەرحەدون و ئاشوور پانیپاڵ (سەدەی حەوتەم).

سەبارەت بە پەرستگاکەش، باب- خامری (= دەرگای خوداوەند خامری) هەبوو، کە لەلایەن (هۆمل)ەوە ئەمیان پەیوەست کراوە بەشاری تابریسی و میلکیا و بە جەژنێکی گەورەوە.[١٥].

٥- تا ئێستا تەنیا کەمێک پەیکەر و لەوح لە ئاربائیلو دەرهێنراون، چونکە شارە نوێیەکە لەسەر وێرانەکە دروست کراوە. نووسراوێکی سەر تاسولقە (قوری سوورەوەکراو)[١٦] هەیە، کە دەبێت لە هەولێرەوە هاتبێت. بە دڵنیاییشەوە لە هەولێردا ئەو پەیکەرە بچووکە برۆنزییە (کە ئێستا لە پاریسدایە) دۆزراوەتەوە، کە هی کابرایەکە بەناوی شامشی- بێل (= خوداوەند بێل خۆری منە/ وەرگێر) و کە خۆی بە ئا-با (نووسەر) وەسف کردووە (بڕوانە وێنەکە).

ئەمەش ئیشتاری هەولێرە لە پەرستگاکەیدا کە پیرۆزی بەژیانی پادشای ئاشووری (ئاشووردانی سێیەم) (٧٢٢- ٧٥٤ پ.ز/و) دەبەخشێت. پێشکەشکەری ئەم پەیکەرە برۆنزییە ناوی (شامشی بێل)ە، کاهینی (=ئا-با)ی ئاربائیلو، کوڕی نێرگال( نادین) ئاخی[١٧]ی کاهن. ئاماژەش بۆ ئەوە کراوە کە کێشی پەیکەرەکەش نزیکەی (؟) مینە[١٨] ناوی پەرستگاکەی ئیشتاربش (ئێ- گاشان- کالام- ما)یە. ناوی کارە برۆنزییەکەش ئەمەیە: «ئەی ئیشتار، گوێی خۆم رووەدەکەمە تۆ». جێماوی تری هەولێریش لە لایەن (لێمان- هاوپت)ەوە باس کراون.

٦- شاری هەولێر لەسەر نەخشێکی هەڵکەندراوی ئاشوور پانیپال (کە لە نەینەوادا دۆزرابوەوە و ئێستە لە پاریسدایە) وێنە کراوە. رەنگە لای چەپ نەخشەکە لکابووبێت بە نەخشە هەڵکەندراوەکەی (لەندەن) و کە تیایدا ئاشوور پانیپاڵ پێشوازی لە وەفدەکەی (روسا)ی دووەم، پادشای ئورارتو دەکات و کە بەهۆی نووسینێکی سەری ئەمە وتراوە. لەو نەخشەش کە هەولێر پیشان دەدات ئاشوور پانیپاڵ سەرە لێکراوەکەی (تیومان) پادشای عیلام بە کەوان (بەدرەختێکی هەڵواسیوە ورگێر) و کە ئەم باسە بەهۆی نووسینێکی ترەوە پشتگیریی لێ کراوە[١٩]...

## پەراوێزەکانی وەرگێڕ

١- خەڵک بە هەڵە وا دەزانن خۆڵی قەڵاکەی هەولێر بەکۆڵ هێنراوە.
لە راستیدا قەڵای هەولێر وەک هەزاران گردی تر ئەنجامی ئەوەیە کە لەهەر سەردەمێکدا چینێک هەبووە و کە چینەکە رووخا چینێکی تری بەسەردا بیناکرا تا وردە وردە بەرز بووەوە.
شوێنەوارناسانیش لەرێگەی پشکنینەوە دەتوانن ئەم چینانە جیا بکەنەوە.

٢- ئەم مێژووە هەڵەیە راستتر دەوروبەری (٢١٠٠-٢٠٠٠)پ.ز

٣- بە ئوربیلیوم (بای درێژ)یان ئوربیئیلوم دەخوێندرێتەوە.. جگە لەوەش شێوەی ئوربیللوم هەیە. برگەی (کی) نیشانکەرەوەی وڵاتە.
هەروەها شێوەی ئوربێل (تپی درێژ) کە لەو مێلەی (پاریس)دا هاتووە کە نووسەر ناوی بردووە.

٤- نووسەر ئەمەی لە بابەتی (ئاراپخا)دا- لە هەمان سەرچاوەدا- باس کردووە.
نووسەر باسی شێوەی ARAB II (=چوار- خا) کردووە (ال ١٥٤) بەڵام ناوی ئوربلیوم پێوەندی بە (چوار خوداوەندەوە) نییە.
هەرچەندە لەوانەیە برگەی (ئیل) لەناوەکە واتای (خودا) بدات.
- نووسەر بەهەڵە ساڵی (٤٣)ەمی نووسیوە و راستەکەش (٤٦)ە. بڕوانە:
REALLEXIKON DER ASSYR OLOGIE, 2,S. 142

٥- لەم مێلەدا ناوی پادشا نەهێنراوە بۆیە ئەم چەند بۆچوونە هەبوون لەم بارەیەوە:

٦- زوو (فۆرەر) بە شامشی ئادادی یەکەمی ئاشووریی زانیبوو (١٨١٤-١٧٨٢پ.ز) بڕوانە،
1- A- GOETZE. INIREVUE DAS- SYRIOLOGIE. (RA), 46, 1950, P. 156.
2- REALLEXILCON DER AS- SYRIOLOGIE, 1, 1928,S.244.
کە بابەتێکی تری سەرچاوەکەی خۆمانە)
هەروەها (فۆن زۆدن):
VON SODEN, INL: ORIENTALIA CNOVA SERIESL, 22, 1953, 256.
هەروەها (کوپپێ):
-J-R KUPPER, ORIENTALIA, 27 158, 442
بەڵام (گوتزە) بەهی دادوشا پادشای ئێشنونا (نزیک باقووبە) و دوژمن و هاوچەرخی شامشی ئاداد.,U6, P. RA 157
رایەکی نوێتریش بەهی (نارام سین)ی برای دادوشا و کەبەر لەو حوکمی کردبوو (نارام سینی ئەکەدی نییە):
W.NAGEL, IN: ZEITSCHRIFT FUR ASSYRIOLOGIE, 53,1959, S. 135.
مێلەکە لە (سنجار)یان لە (ماردین) دۆزرابووەوە. دەقی نووسینەکەی سەریشی لەم سەرچاوەیەدا هەیە:
G.A. BARTON, ROYAL INSCRIPTION OF SUMER AND AKKAD, 1929, P.334

٨- ئەویش چونکە هەولێر یەکێک لە (٢٧) شار بوو (بەکالخوو ئاشوورەوە کە دوو پایتەختی دەوڵەتەکەن) لەماوەی دوایەمینی حوکمی شالمانیسەری سێیەم و لەژێر سەرکردایەتی کوڕێکی یاخی بوو.
کوڕێکی تری شەلما نەسەریش (واتە: شامشی ئادادی پێنجەم) چوار ساڵی پێویست بوو (٨٢٧-٨٢٤پ.ز) تا یاخیبوونەکە سەرکوت بکات: بڕوانە
D.D. LUCKENBILL, ANCIENT RECORDS OF AS -SYRIA AND BABYLONIA,1,1926, S715

٩- عادەتێکی پادشایانی ئاشوور بوو کە هەر ساڵێک ناوی فەرمانبەرێکی گەورەی لێ بنێن. لێکۆڵەرەوە رۆژئاواییەکانیش بەمانە دەڵێن ئیپۆنیم.

١٠- لای خۆمان بە (کەیخەسرەو) ناسراوە. (ئومارکیشتار) ناونانی بابلییەکانە و (کیا کساریس) هی یۆنانییەکانە.

١١- ساگارتییەکان: لە ئێراندا دەژیان.

١٢- ئیشتاری هەولێر ناودار بوو، لەبەر ئەوەی کە خوداوەندێکی جەنگاوەر بوو پادشایانی ئاشوور هانایان بۆ دەبرد.

١٣- ئیگاشانکا لاما: وشەیەکی ئاوێتەی سۆمەرییە و واتای (مالی) یان (پەرستگای ئاغاژنی زەوی).

١٤- خوێندنەوەی جگەر: ئاژەڵێک سەردەبڕدراو پسپۆڕی تایبەت تەماشای جگەرەکەی دەکرد تا بزانێت خواستی خوداوەند چییە لەبارەی مەسەلەیەک.
ئەمەش جگە لەعێراق، لە تورکیای کۆندا هەبووە و رەنگە لەوێوە بۆ (ئەتروسکان)ی ئیتاڵیاوە چووبێت و رۆمانەکان لەمانەوە وەریانگرتبوو.

١٥- سەرچاوەی وام لا نییە لەبارەی ئەم دوو شارە.

١٦- نووسینی سەر قوڕ بەزۆری بەهەتاو وشک دەکرایەوە، جگە لە هەندێک لەوحی گرنگ کە بە کوورە دەسووتێنرا تا زیاتر بەرگە بگرێت (تاسولقە).

١٧- ناوێکی ئاشوورییە.

١٨- یەک (مینا): نزیکی نیو کیلۆگرام.
دیارە جیاوازی نێوان کێشی راستەقینەی پەیکەرەکە و ئەوی کە بە گومانەوە نووسراوە (٢) مینایە دەگەڕێتەوە بۆ نووسینەکەی سەر پەیکەرەکە.

١٩- بڕوانە وێنەکە. بەڵام لەو سەرچاوەیەی خوارەوە نووسراوە کە ئەو نەخشەیە ئەوەکەی لەندەنە (مۆزەخانە بەریتانی) نەک پاریس: اندریە پارو، اشور، ل ٦٧، ٦٨.

* ئەم بابەتە لە گۆڤاری رامان ژمارە (٣٠)ی (٥)ی کانوونی یەکەمی ١٩٩٨ بلاوبۆتەوە.



# هەولێر

## دکتۆر نائل حەنون

کۆنترین ناوی شاری هەولێر کە بە تۆمارکراوی دۆزرابێتەوە بۆ سەردەمی ئوری سێیەم "٢١١٢- ٢٠٠٤ پ.ز" دەگەڕێتەوە. ئەم ناوە لەو دەقە مسمارییەی ئەو سەردەمە بە دوو شێوازی جیا جیا هاتووە: "ئوربیلم و ئاربیلم". بە دوو شێوازی برگەیی کە بەم جۆرە دەخوێندرێتەوە "ئور-ب-لوم" یان "ئار-ب-لوم". ئەم ناوەش واتا نادیارە هەروەکو زۆربەی شارەکانی نێوان دوو زێ، بەڵام ئەم واتایەی کە بۆ ناوی ئەم شارە لێکدراوەتەوە "چوار خودت"یە. ئەو ناوەش نزیکە لە شێوازی دەربڕینی ئەکەدی "ئاربا- ئیلی" واتە چوار خودا. ئەم واتایەش لە نزیکی پێچووی وشەکەوە دێت. وەک ناوی "سامەڕا" کە بە واتای زمانی عەرەبییەکەی "وەرگێڕ"، سەرسامی ئەو کەسەی بەدی دەکات" لە کاتێکدا کە ئەم ناوە دەگەڕێتەوە بۆ چەرخی شارستانی دێرین. "واتە پێش هاتنی زمان و خەڵکی عەرەب بۆ عێراق (وەرگێڕ)". لە دەقەکانی چەرخی بابلی کۆن "٢٠٠٤- ١٥٩٥ پ.ز" ناوی ئەم شارە بەشێوەی ئوربیل هاتووە بە برگەیی "ئور-بی-یل". شێوازی نووسینی ئەربائیل و نووسینی شێوازی سۆمەری ٤ دنجر. واتە "چوار خودا". لە دەقەکانی سەردەمی ئاشووری ناوەڕاست "لە نیوەی دووەمی هەزارەی دووەمی پێش زایین" بەکارهێنانی ئەم شێوازە لە دەقە ئاشوورییەکانی سەردەمی نوێ بەکارهێنانی بەردەوام بوو.

هەولێر، پێش نزیکەی چوار هەزار ساڵ، پایتەختی وڵاتێک بووە. تاوەکو سەردەمی پاشای ئاشووری شەمشی. ئوری یەکەم "١٨١٣- ١٧٨١ پ.ز" دەستی بەسەرداگرت دوای ئەوەی بە هاوکاری داودشا ئەم هێرشەی ئەنجامدا. ئەوکات سەردەمی دەسەڵاتی پاشای هەولێر "بونو" عەشتار. هەولێر مەڵبەندی کارگێڕی ئەم هەرێمە بووە لە "هەزارەی یەکەمی

پ.ز". بە تایبەتی لە سەردەمی نوێی ئاشوورییەکان. ناوی "٣" لە پارێزگارەکانی ئەو سەردەم تۆمار کراوە، کە لەو سەردەم پارێزگاری ئەم شارە بوون. بەپێی ئەو لیستانەی کە لە رۆژژمێری ئاشووری تۆمارکراوە. ناوی پاشاو کاربەدەستە گەورەکانی دەوڵەت و بەرپرسی هەرێم و پارێزگارەکانی سالانە یەک لەدوای یەک تۆمارکراوە. پارێزگارە دەسەلاتدارەکانی شاری هەولێر، کە ناوەکانیانمان بەپێی ئەو لیستانەی کە پێمان گەیشتووە بریتین لە: سلّ. عەشتار "٧٨٧پ.ز" کانی. ئاسوور. لامور "٧٥٩ پ.ز" نەبوو. لینی "٧٢٠ پ.ز".

ئەوەی گرنگە لەم لێکۆڵینەوەیە ئەوەیە کە بزانین قەڵەمڕەوی ئەو کارگێڕییەی کە لەسەردەمی ئاشووری نوێ ئەم ناوچەیە بەڕێوە دەچوو شاری هەولێر سەنتەرەکەی بووە تا کوێ گەیشتووە. شوێن بڕواترین بەڵگەنامە کە بەدەستمان گەیشتووە و پەیوەستە بەم بابەتە ئەم بەڵگەنامەیەیە کە شلمەنسەری سێیەم پاشای ئاشوورییەکان "٨٥٨-٨٢٤پ.ز" بۆی جێهێشتووین. بەردە هەڵواسراوێکی دۆزراوەی ئەو سەردەم دۆزراوەتەوە کە پاشا "فیکۆرخ" دەسەلاتدار بووە. لە شوێنێک کە نزیکەی ٢٠ کیلۆمەتر لە خوارووی شاری "دیاربەکر" بووە لە تورکیا. لەسەر ئەم بەردە هەڵواسراوە دەقێک نەخشراوە کە زانیاری فراوانی لەسەر هێرشە جەنگییەکەی سێیەمی شلمەنسەری سێیەم لەسەر تۆمار کراوە کە لە ئاسیای بچووک بەریا

کراوە. شلمەنسەری سێیەم لەم دەقەی کە پەیوەستە بەم لێکۆڵینەوەیە دوای کۆتایی هێنانی بەم هێرشە بۆ ولاتی ئاشوور گەڕاوەتەوە لە رێگای هەرێمی "خوبشکایا". دواتر لە دەربەندی هەرێمی "کەرور" لە سەرووی هەولێر دەرچووە. "بە زمانی ئەکەدی: ئین ریشی ئەربا- ئیلی" ئەم ئاماژەیە هاوکاری ئەوەمان دەکات، کە بزانین قەڵەمڕەوی هەولێر لەرووی کارگێڕییەوە تا کوێ گەیشتووە لە رۆژهەلاتییەوە. شلمەنسەری سێیەم لە کۆتایی هێرشەکەی سێیەمی لە ناوچەکانی رۆژهەلاتی کوردستانەوە بەرەو هەولێر هاتووە. بەپێی دەقە تۆمار کراوەکەی سەر بەردە هەڵواسراوەکەی "کورخ" کە پێشتر باسمان کردووە. گەشتی گەڕانەوەکەی لە دەریاچەی "ڤان"ەوە دەستی پێکردووە، کە ئاشوورییەکان "دەریای ولاتی نائیر"یان پێ وتووە. دواتر لە بەشی باکووری رۆژئاوای ئێرانی ئێستا پەڕیوەتەوە. ئەم گەشتە بە درێژترین گەشتی سەربازی شلمەنسەری سێیەم دەژمێردرێت. کە لە ولاتی ئاشوور دەستی پێکرد و بەرەو سوریا کشاوە. کە شاری بارسب "گردی سووری ئێستا"ی لێ بووە لە رۆژهەلاتی زێی فورات. لەوێوە رووی بەرەو باکوور وەرگێڕاوە بەرەو بەرزاییەکانی فورات پێش ئەوەی روو بەرەو رۆژهەلات وەرگێڕێت بەرەو دەریاچەی ڤان.

لە گەشت و گەڕانەوەیدا لە هێرشی سێیەمی شلمەنسەر باس لە بەرێکردنی لە هەرێمی "خوبشکایا" دەکات و لێرەدا گرنگی دەستنیشان

کردنی پێگەی ئەم هەرێمە دەردەکەوێت. لێرەدا پێویستە سەرەتا ئەوە روون بکەینەوە کە "خوبشکایا" ناوی شارێکە پایتەختی هەرێمێک بووە کە هەمان ناوی هەبووە لە سەردەمی چەرخی ئاشووری نوێ. هەندێ لە لێکۆڵەران بۆ ئەوە دەچن، کە ناوی پاشاکانی هەرێمی "خوبشکایا" ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کە ناوەکانیان حووری بووە تاوەکو سەردەمی پاشای ئاشوورییەکان بەناوی شەمشی- ئەدد "٨٢٢-٨١١ پ.ز" کە لە دوای شلمەنسەری سێیەم هاتووە لە پادشایەتی ئاشوورییەکان.

لێرەوە ئەم رایە دروست بووە، کە "خوبشکایا" مەڵبەندی حوورییەکان بووە و بۆ ماوەیەکی درێژ ئاوەدان بووە. ئەوە هەیە کە ناوچەیەک بووە بۆ لەخۆگرتنی حوورییە هەلاتووەکانی ناوچە دەشتاییەکان لەژێر فشاری ئاشووری و ئارامییەکان. نامەیەکیشی هەیە "abl197" ئاماژە بۆ ئەوە دەکا، کە ئەوکاتە هاوپەیمانییەک لەنێوان خوبشکایا و ئورارتییەکان مۆرکراوە. ئەم نامەیە جێنشینی ئاشووری سەنحاریب بۆ پاشای سەرجوونی دووەمی باوکی ناردووە. هەمان نامە ئاماژە بۆ بەشداری هەرێمی مەساسیر "کە ئێستا مەجێسیری ناوەو کەوتۆتە نزیک سیدەکان لە هەرێمی کوردستانی عێراق" دەکات لەم هاوپەیمانەتییە. نامەکەی سەنحاریب جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە "خەلسۆ"ی پارێزگار ئەرکی چاودێری لایەنە هاوپەیمانەکانی کەوتۆتە ئەستۆ

بەو پێیەی کە بەشێک بووە لە سنووری قەڵەمڕەوی دەسەڵاتی ئاشوورییەکان. پێگەی "خەلسۆ" دەستنیشان کراوە بەو پێیەی کە کەوتۆتە بەری راستی زێی زابی گەورە لە خوارووی سنووری عێراق- تورکیا، وەک دانەری ئەم کتێبە ئاماژەی بۆ کردووە. ئەم پێگەیە توانای ئەوەی بە پارێزگای "خەلسۆ" بەخشیوە کە بتوانێت چاودێری لایەنە هاوپەیمانەکان بکات، کە لەوبەری زابی گەورە بوون. کە "مەساسیر"ی لێ بووە. لە بەری باکوورەوەش کە وڵاتی "ئۆرارتۆ" ناو بووە.

بەم جۆرە پێگەیەک بۆ "خۆبشکایا" ماوەتەوە لەنێوان هەرێمی "مەساسیر" و سنووری "عێراق- تورکیا"ی ئێستا. لەبەری رۆژهەڵاتی زابی گەورە. واتە هەرێمی "خۆبشکایا" درێژبۆتەوە لە بەری رۆژهەڵاتی زابی گەورە لە سنووری "عێراق- تورکیا" بۆ هەرێمی "مەساسیر- سیدەکانی ئێستا" یاخود باکووری رۆژهەڵاتی پارێزگای دهۆک و قەزای زێبار لە سەردەمی ئێستادا.

بەپێی دەقەکەی "شلمنسەر"ی سێیەم ئەم پاشایە هەڵساوە بە دەرچوونی لە هەرێمی "خۆبشکایا" بە دەربەندی چیای ئەنزیت تاوەکو گەیشتۆتە هەرێمی "کیرەوەر"، کە ناوچەیەکی کارگێڕی بووە، یان پارێزگایەک بووە لە تەنیشت پارێزگای هەولێر. لێرەوە گرنگە کە پێگەی ئەم "کیرەوەر"ە بناسین و دەستنیشان بکەین. بەپێی ئەو زانیارییەی کە هەمانە کەوتۆتە نێوان "خۆبشکایا" لە باکوور و هەولێر لە رۆژئاوا و خوارووی رۆژئاوا. کۆنترین دەق کە ناوی "کیرەوەر"ی تیا هاتبێت دەگەڕێتەوە بۆ ئەم دەقانەی کە تاوەکو ئێستا دۆزراونەتەوە بۆ سەردەمی پاشای ئاشووری تجلات- بلاسەری یەکەم "١١١٥- ١٠٧٧ پ.ز".

ئەم ناوە بەپێی برگەو بە نیشانەی "مسمار"ی نووسراوە، کە بەم جۆرە دەخوێندرێتەوە "کیر-ڕ-و-ڕ"دوای نزیکەی دوو سەدە لەو کاتەوە ناوی "کیرەوەر" دێتەوە لە دەقی پاشاکانی ئاشووری "ئاشوور-دانی دووەم ٩٣٤-٩١٢ پ.ز" کە ناوی دوو شار لە شارەکانی ئەم هەرێمە دەهێنێت بەناوی "شۆخۆ و سمیرا". لە چەرخی ئاشووری نوێ ناوی "کیرەوەر" لە دەقی سێ لە پاشاکانی ئەو سەردەم دێت. بەناوی توکلتی- ننورتای دووەم "٨٩٠- ٨٨٤ پ.ز" ئاشوور- ناسربالی دووەم "٨٨٣-٨٥٩ پ.ز" و شلمنسەری سێیەم. ناوەکە بە برگە لە دەقەکاندا بەم جۆرە هاتووە "کیر- رو-ری". لەو چەرخەدا ناوی شەش لە دەسەڵاتدارانی هەرێمی "کیرەوەر" هاتووە لە شەش ساڵ لە رۆژژمێری ئاشووری "لەممۆ".

ئەوانەش ناوی ئەم دەسەڵاتدارانەن کە بەرامبەر ساڵانی دەسەڵاتدارێتییانە: شیپا- شەر "٨٥٣"، موشیکنس "٨١٣". ئاشوور- بیل- ئوسر "٧٩٦"- ننورتا- موکین- نشی "٧٦٥"، لیخور- ئیل "٧٢٩"، شمەشی- ئۆیەخیر "٧٠٨".

لەبەر رووناکی ئەو زانیارییانەی کە دەقە مێخییەکان "مسمارییەکان" بەر دەستیان خستووە. "ئەمیل فۆرەر" سەلماندوویەتی کە هەرێمی "کەرور" هەمان دەشتی "هەریر"ەو کەوتۆتە باکووری رۆژهەڵاتی ناوچەی هەولێر لەسەر رێگای رواندز. هەروەها "فۆرەر" گەیشتە ئەو ئەنجامەی کە شاری "هەریر"ی ئێستا مەڵبەندی کارگێڕی ئەم هەرێمە بووە لە سەردەمە کۆنەکان. ئەم رایە ژمارەیەک لە لێکۆڵەرەوەکان پەسندیان کردووە، ئەگەرچی جیاوازییان هەیە لە بارەی فراوانی ئەم هەرێمە کۆنە. هەندێکیان بۆ ئەوە دەچوون کە هەرێمی "کەرور" کەوتۆتە نێوان هەردوو چیای سەفین داغ و رواندز لەگەڵ ئەگەری ئەوەی کە دۆڵی شەقڵاوەش بگرێتەوە، کە شەقڵاوەش کەوتۆتە نێوان هەردوو چیای خاتی داغ و سەفین داغ. "جۆلین رید" نارازی خۆی نیشاندا لەسەر چەسپاندنی "کەرور" لەگەڵ دەشتی هەریر، ئەم بۆچوونەش بۆ ئەوە دەگەڕێنێتەوە، کە گرنگی هەرێمی "کەرور" لە مێژووی کۆن لەگەڵ بچووکی دەشتی هەریر لێک ناوەشێنەوە. سەرەنجام ئەو بۆچوونە پەسند دەکات کە دەستنیشان کردنی ئەم هەرێمەی ناوچەی کۆیە "کۆیسنجق" یان ناوچەی رانیە دەگرێتەوە، لەرووی باکووری رووباری زابی خواروو، بەڵام هنری ساجز لەگەڵ بۆچوونی "جۆلیان رید" یەک ناگرێتەوە و ئەو بۆ ئەوە رۆیشتووە کە پشتگیری لە "ئەمیل فۆرەر" بکات دەربارەی چەسپاندنی "کەرور" لەگەڵ دەشتی "هەریر" بەو پێیەی کە هنری ساجز بۆی چووە دەشتی دیانا، کە کەوتۆتە رۆژئاوای رواندز، بەشێک

نەبوود لە هەرێمی "کەرور" بەهۆی بوونی بەربەستێکی جوگرافی، کە ئەویش گەلی عەلی بەگە، هەردوو دەشتی "هەریر و دیانا" لێک جیادەکاتەوە.

نووسینەکانی پاشایەتی ئاشووری و ئەو زانیارییانەی لەخۆوەیان گرتووە پتر ئەو راستییە دەسەلمێنن کە هەرێمی "کەرور" هەمان دەشتی "هەریر"ە. ئەو نووسینانە ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن، کە ئەم هەرێمە لە ناوچەیەکی شاخاوی پێکهاتووە و کەوتۆتە رۆژهەلاتی هەولێر و هەندێ دەربەندی چیایی دەگرێتە خۆی. دەشتی هەریر ناوچەیەک دەگرێتەوە چیا سەرکەشەکان دەیپارێزن لە رۆژهەلات و رۆژئاوادا.

سێ هۆکار پشتگیری لەوە دەکەن کە ناوچەی "کەرور" هەمان دەشتی هەریر و چیاکانی دەوروبەری دەگرێتەوە. ئەم هۆکارانەش بریتین لە:

یەکەم: لێکچوویی هەردوو ناوی کۆن و نوێ، ئەگەر ئەوە هەیە کە پیتی "کاف" بۆ "خاء" گۆڕابێت یان بۆ "حاء" و بە درێژایی کات ناوەکە گۆڕابێت بۆ "حەریر".

دووەم: دەشتی هەریر لە سەردەمی کۆن و ئێستادا ناسراوە بە بەرهەمهێنانی دانەوێڵە و رەزگەری بە پلەی یەکەم. ئەمەش یەک دەگرێتەوە بەو ناوبانگەی کە لە سەردەمە کۆنەکان هەیبوو بە بەرهەمهێنانی "نبیذ". لەم بارەیەوە لە یەک لە دەقە "مسمارییەکان" هاتووە کە پەرستگای ئاشووری لە سەردەمی ئاشووری نوێ برێکی زۆری لە "نبیذ"ی کەروری بۆ هاتووە.

سێیەم: ئێستا دەشتی هەریری بەپێت نزیکەی ۳۹ شوێنەواری لەخۆ گرتووە، کە کاری شوێنەواری لەسەر نەکراوە. ئەم شوێنەوارانە بۆ پاشماوەی چەرخە کۆنەکانی سەردەمی ناوەراستی هەزارەی سێیەمی پێش زایین دەگەرێتەوە تاوەکو سەردەمە ئیسلامییەکان. تیایاندا پتر لە (۹) لەم شوێنەوارانە پاشماوەی هەردوو چەرخی ئاشووری ناوەراست و نوێ دەگرێتەوە.

گەر هەرێمی "کەرور" بە ناوچەیەکی چیایی ناسرابێت، ئەوە دەگەیەنێت ئەو چیایانە دەگرێتەوە کە دەوری دەشتی هەریریان داوە، کە مەڵبەندی هەرێمەکەی لێ بووە. ئەم چیایانە رۆڵی بەرگرییان دیوە لە هەموو چەرخەکاندا بۆ پاراستنی هەریر. ئەگەر لەگەڵ ئەو ئاماژەیە بەراورد بکەین کە شلمەنسەری سێیەم لەسەر بەردە هەڵواسراوەکەی، هەروەکو پێشتر ئاماژەمان بۆ کرد، دەقەکەی تۆمار کردووە. ئەو دەڵێت لە دەربەندە چیاییەکانی هەرێمی "کەرور" بەدەرکەوتین لە سەرووی "هەولێر". ئەوەمان بۆ روون بۆوە کە ئەم هەرێمە لەو شوێنەوە دەست پێدەکات، کە چیایەکان دەست پێدەکەن لە رۆژهەلاتی هەولێرەوە. ئەمەش دەمانگەیەنێت یەکسەر بۆ چیای پیرمام داغ "سەلاحەددین". بە دووری نزیکەی ۳۰ کم لە رۆژهەلاتی هەولێر. واتە بەرایی ناوچەی کارگێری سەر بە هەولێر لە رۆژهەلاتەوە لە دامێنی رۆژئاوای پیرمام داغ دەست پێدەکات. بۆیە شلمەنسەری سێیەم ئەم ناوچەیە وا دەناسێنێت کە "سەری هەولێر"ە.

ئەم گوزارشتە لە ناساندنە تاوەکو ئیمرۆش پەیرەو دەکرێ لە سوریا و عێراق وەک ئاماژەیەک بۆ سەرەتای جوگرافی پێگەی وەک رووبارێک یان دۆڵ یا شارێک. بۆ نموونە ناوی جوگرافی "سەری چاوەکە" لە رۆژهەلاتی عەرەبی. لێرەوە وا بەدروست دەزانین کە پەیوەستی زنجیرە چیاکانی پیرمام داغ، خاتی داغ و سەفین داغ بە هەرێمی "کەرور"ەوە بێت.

قەڵەمرەوی ناوچەی کارگێری هەولێر لە رووەکانی دیکەی، لە سەردەمە کۆنەکان، دەتوانرێت دەستنیشان بکرێت بەپێی بوونی کەرتە کارگێرییەکان یان پارێزگاکانی دیکە، کە پێوەی لکاون. لێرەوەش دەتوانین تێبینی ئەوە بکەین کە هیچ مەڵبەندێکی کارگێری لە لایەکانی باکوور و خوارووی شاری هەولێر نەبووە بە پانتایی ئەم ناوچەیەی کە لە باکوورەوە تا دەگاتە زێی گەورە و لە خوارەوەش تا دەگاتە زێی بچووک. لە هەمان کاتدا چەندین مەڵبەندی کارگێری دیکە بەدرێژایی هەردوو زێی گەورە و بچووک هەبووە. نزیکترینیان بۆ رووبارەکە، لەرووی دیکەی کە کەوتۆتە لای شاری هەولێر، سنوورەکەی بە رۆخی رووبارەکە گەیشتووە. لەلای باکووری رووباری زێی گەورە شاری "کەلەخ"ی لێ بووە "ئێستا بە نەمروود ناسراوە و حەوت کیلۆمەتر لە رووبارەکە دوورە" مەڵبەندی کارگێری کەرتی یان هەرێمی، کە بە درێژایی سەردەمی ئاشووری نوێ تاوەکو ئەو

سەردەمانەی کە "کەلەخ" پایتەختی دەوڵەتی ئاشووری بووە، ئێستا ناوی حەوت لە پارێزگارەکانی ئەم شارە زانراوە، کە بە حەوت ساڵی جیا جیای رۆژژمێری ئاشووری لکاوە بە درێژایی ساڵانی نێوان ٨٦٤ تاکو ٧١٢پ.ز. لەلای خوارووی زێی بچووک پارێزگای "ئەرزۆخینا" و مەڵبەندەکەی شاری هەر ئەو شارەیە کە هەمان ناوی هەبووە. کۆنترین ئاماژە بۆ "ئەرزۆخینا" لە دەقەکانی پاشای ئەکەدی نرام سین "٢٢٥٤-٢٢١٨پ.ز" لە هەزارەی سێیەمی پێش زایین هاتووە. مێژووی یەک لە ساڵەکانی دەسەڵاتداریێتی ئەو پاشایە بە هێرشێکی سەربازی ئەو بەسەر شوبەر و ئەرزۆخینا کە ناوەکەی بە گوزارشتی ئەزۆخینوم نووسراوە. بە درێژایی هەزارەی دووەمی پێش زایین ناوی "ئەرزوخینا" لە دەقەکاندا هاتووە. لە دەقەکانی سەردەمی بابلی کۆن و دەقەکانی پاشای ئاشووری تەجلات هاتووە. بلاسەری یەکەم "١١١٥- ١٠٧٧ پ.ز" لە چەرخی ئاشووری ناوەڕاست و لە چەرخی ئاشووری نوێ ناوی پێنج لە پارێزگارەکانی لە رۆژژمێری ئاشووری و لە ساڵەکانی "٨٦٢، ٨٣٩، ٧٦٧، ٧٢١، ٧١٠ پ.ز" هاتووە.

ئۆلبرت ئۆلمستید توانی شوێن و پێگەی ئەرزوخینا لە ناوچەی درێژبۆوە بۆ خوارووی شارۆچکەی پردێ "ئاڵتون کۆپری"ی ئێستا دەستنیشان بکات، بە تایبەتی پێگەی شوێنەواری "کوک تەپە"، کە نزیکەی ١٠ کیلۆمەتر لە زێی بچووک دوورە. ئەم دەستنیشانکردنە لە لایەن هەریەک لە ئەفرایم شبایزر، ئەلبەرت کیک جریسن، جولیان رید شوێنی رەزامەندییە، لە کاتێکدا "هنری ساجز" لەگەڵ رای ئەو کۆک نییە و ئەو پێگەی ئەرزوخینیا دەگەڕێنێتەوە بۆ شاری چەمچەماڵی ئێستا. لە لایەکی دیکەوە "هلد جارد" پێگەی ئەرزوخینیا دەگەڕێنێتەوە بۆ شاری "لەیلان"ی ئێستاو ئەو رایەی "سیمۆپار پۆلا" پشتگیری لێ دەکات. بەڵگەی سەلمێندراو لەسەر دروستی رای ئۆلمستید بۆ پێگەی "ئەرزوخینیا" لە گردی کوک تەپە لە دەقی ئەو نامەیەوە دێت، کە "شمشی- بیل- ئۆسر" پارێزگاری ئەرزوخینیا ناردوویەتی بۆ پاشای ئاشووری سەرجوونی دووەم "٧٢١-٧٠٥ پ.ز". ئەم نامەیە "ABL-408" سێ ئاماژە لەخۆوە دەگرێت بەڵگەی ئەوە دەهێنێتەوە کە "گردی کوک تەپە" شیاوترە بۆ چەسپاندنی لەگەڵ پێگەی شاری "ئەرزوخینیا"ی کۆن، ئاماژەکانیش بریتین لە:

١- ئەرزوخینیا کەوتۆتە سەر رێگای نێوان هەولێر و ئەربخا "کەرکووکی ئێستا".

٢- رێبوارەکان دەیانتوانی لە "ئەرزوخینیا"وە بەرەو زاموا "دەشتی شارەزووری ئێستا" گەشت بکەن، یان بەرێگای ئەربخا لە سەرەتادا ئینجا پەڕینەوەی زنجیرە چیای بازیان. یان لەرێگایەکی دیکەوە، کورتتر، بەڵام سەختتر، لەرێگای شاری "دور-ئەتانات"ی کۆن.

٣- شاری ئەرزوخینیا کەوتبووە نێوان چەند سەرە رێگایەک "بە ئەکەدی: ئینە لب ئیسپیلوروتی".

گردی "تل کوک تەپە" کەوتۆتە بەری راستی رێگای "کەرکووک-هەولێر"ی ئێستا. بەرزترین گردی شوێنەوارە لە ناوچەکەدا، کە چەندین پێگەی شوێنەواری لێک نزیکی لەخۆوە گرتووە، ئەم ناوچەیە، لە کاتی ئێستاشدا، کەوتۆتە نێوان رێگاکانی هاتوچۆی نێوان ناوچەکانی کەرکووک، هەولێر، سلێمانی و زێی بچووک. گردەکە خۆی ناوچەیەکی فراوانی بە بەردەوەیە لە دەوروبەریدا شوێنەواری شوورەیەکی شیاو بۆ شارێکی گرنگ بەدیار دەکەوێت. سەرەڕای ئەوەی ئەو پارچە کوورە "فخار"انە لەسەر رووی گردەکە دیارن ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە بۆ سەردەمانی زۆر کۆن دەگەڕێتەوە. بەم جۆرە بوونی دوو مەڵبەندی کارگێڕی لە دەوروبەری هەریەک لە زێی گەورە و زێی بچووک، لە باکووری شاری هەولێر و خوارووی ئەم شارە و نەبوونی هیچ مەڵبەندێکی کارگێڕی گرنگ لەنێوان ئەم شارەو هیچ لەم دوو زێیە، ئەوە دەگەیەنێت کە سنووری باکووری پارێزگای هەولێر پێش پتر لە دوو هەزار و پێنج سەد ساڵ رێڕەوی زێی گەورە بووە و سنووری باشووری ئەم پارێزگایە زێی بچووک بووە.

لە رۆژئاوای هەولێر دەشتی دیبەگە- شەمامک لە سەردەمە کۆنەکان سەر بە شاری "کیلیز" بووە. ئەم شارە لە ئاستی پارێزگا بووە و تاوەکو سەردەمی ئاشووری نوێ ئاوەدان بووە. ناوی پارێزگار "کیلیز-شیئی- ئاشوور" لە رۆژژمێری

ئاشووری بە ساڵی "٩١٠ پ.ز" لکێنراوە. رۆڵی ئەم شارە کیلیز تاوەکو ساڵەکانی دوایی دەوڵەتی ئاشووری هەر مابوو. پاشماوەکانی ئەم شارە لە پێگەیەکی شوێنەواری ناسراو بە کۆشکی شەمامک دۆزراوەتەوە، ئەویش لە باکووری دەشتی دیبەگە- شەمامک، لەنێوان هەردوو چیای ئاوانەداغ لە رۆژهەڵاتەوە و قەرەچووغ داغ لە رۆژئاواوە. دەتوانین چیایەکەی یەکەم بە سنووری نێوان هەردوو پارێزگای هەولێر و کیلیز دابنێین. واتە پارێزگای هەولێر کەوتۆتە رۆژئاوای کیلیز. دەگەینە ئەو ئەنجامەی کە شاری هەولێر لەنیوەی هەزارەی یەکەمی پێش زایین، بەلای کەمەوە مەڵبەندی هەرێمێکی کارگێری بووە لەنێوان ئەو زەوییە فراوانەی کە درێژ دەبێتەوە لەنێوان هەردوو زێی گەورە و بچووک و لەنێوان رۆژهەڵاتی زێی دیجلە لە رۆژئاوادا و چیای زاگرۆس لە رۆژهەڵات. سنووری کارگێری بەپێی زاراوە جوگرافییەکانی ئێستا رووباری زێی گەورە لە باکوور و رووباری زێی بچووک لە خوارووە و چیای پیرمام داغ لە رۆژهەڵاتی و ئاوانەداغ لە رۆژئاوا.

دوای ئەوەی هەولێرمان ناسی وەک مەڵبەندی کارگێری و پارێزگایەک، ئێستا دێینە سەر شاری هەولێر و قەڵاکەی با بزانین لە سەردەمە دێرینەکان چۆن بووە، ئەم بابەتە پێویستی بە لێکۆڵینەوەیەکی ورد هەیە، لەگەڵ گرنگی مێژوویی هەولێر و رۆڵی بەپێی دەقە مسمارییەکان. پشکنینی زانستی رێکوپێک لە قەڵاکەی و دەوروبەری ئەنجام نەدراوە تەنیا "گردی قالینج ئاغا" نەبێ، کە مێژووەکەی بۆ سەردەمەکانی پێش زایین دەگەڕێتەوە. بە مەبەستی چارەسەرکردنی ئەم بابەتە کە بمان گەیەنێت بە باشترین ئەنجام. ئەوەمان بە باش زانی کە رێڕەوێکی نوێ پەیڕەو بکەین. ئەنجامی ئەو پشکنینانە بەکاربێنین کە بۆ پێگە شوێنەوارییەکانی ئەو شارانە بەکارهاتووە نزیکن لەرووی جوگرافی و مێژوویی لە هەولێر. جۆرێک لە تۆپۆگرافی بوونی قەڵا لەو شوێنانە هەبووە، پەنا بۆ ئەو رێڕەوە ببەین کە زۆرترین زانیاریمان دەستکەوتووە لە ماوەی پشکنینە شوێنەوارییە زانستییەکان کە ئامانجێکی ئاشکراو دیاریکراوی هەبووە. ئەم شارە دێرینانەی کە شوێن و پێگەیان لەرووی ئەم رێڕەوەوە دەگونجێن شاری نەینەوا، کەلەخ، دور- شروکین و ئاشوور، واتە چوار پایتەختەکەی دەوڵەتی ئاشووری. هەروەکو هەولێر ئەم چوار شارە مەڵبەندی کارگێری پارێزگای گرنگ و هاوچەرخی هەولێر بوون.

نەینەوا: پێگەی نەینەوا لەکاتی ئێستادا کە شێوازێکی ئەندازەیی نییە چیوەیەکی هەیە درێژییەکەی نزیکەی ١٢ کیلۆمەترە. ئەم چیوەیە لە زنجیرە گردۆڵکە پێکهاتووە بەیەکەوە بەستراوەتەوە کە پاشماوەی شوورەی شارە کۆنەکەی لەخۆوە گرتووە. ئێستا نەینەوا یەک کیلۆمەتر یان تۆزێک پتر لە بەری رۆژهەڵاتی رووباری دیجلە دوورە، بەڵام ئەم رووبارە لەرۆخی شوورەی شاری نەینەوا لە سەردەمی ئاشووری نوێ دەڕۆیشت. لەم پێگەوە دوو گردی سەرەکی بەرز دەبنەوە، "قوینجق" و "نەبی یونس" کە وەک دوو قەڵای شارەکە وان و پاشماوەی کۆشکی شاهانە، کۆشکی فەرمی و ئایینی ئەوسا لەخۆ دەگرن.

کاری گەڕان و پشکنین لە گردی "قوینجق" ئەنجامدراوە، کە ئەویان بڵندترە و گەورەترە لە ئەوی دیکەیان، لە سەدەی نۆزدەهەمەوە، ئەو پشکنینانە بەو ئەنجامە گەیشت کە شوێنەواری دوو کۆشک یەکێکیان پاشای ئاشووری سەنحاریب و ئەوی دیکەش نەوەکەی ئاشوور پانیپال. سەرەڕای پاشماوەی دوو پەرستگای عەشتار گونبوو" لە چینەکانی سەرەوەی ئەم گردە. کە بەرزییەکەی لە ٣٠ مەتر پترە. پاشماوەی شوێنەواری دۆزراوەتەوە کە بۆ چەرخی ئەخمینی و گریکی و فرسی و ساسانی و رۆمانی دەگەڕێتەوە.

گردی "قوینجق" قەڵایەکە لە نەینەوا، ئەو کۆچکردنەی کە ئەم شارە دووچاری بۆوە کاری کردۆتە سەر دابڕانی ئەم گردە لە دانیشتوانەکەی و ئەو بوارەی رەخساند کە کاری شوێنەواری تیادا بکرێ، ئەم پشکنینانە ئەوەیان سەلماند کە گردی "قوینجق" پاشماوەی ئەو چەرخانەی کە "نەینەوا"یان پیادا تێپەڕیوە هەر لە سەردەمی دامەزرانیدا لەخۆوە گرتووە. دەستە نێردراوێکی شوێنەوارناسی بەریتانی لە دەیەی چوارەمی سەدەی بیست هەڵسان بە دابڕینی رووبەرێک لە گردەکە بە

پێوەری "٧٥م×٥٠م" و بۆ قوولایی ١٠٠ پێ لە پێگەکە چوونە خوارەوە. مێژووی کۆنترین چین لە زەوییەکە کە پێی گەیشتن ئەم شوێنەوارناسانە بۆ مێژووی "٦٠٠٠پ.ز" گەڕاوەتەوە.

کەلەخ: لە دەقەکانی پاشای ئاشووری "ئاشوور- ناسرپالی دووەم ٨٨٣- ٨٥٩پ.ز" ئەوە دەزانین کە کەلەخ "نەمروودی ئێستا" بۆ یەکەم جار لە سەردەمی ئاشووری ناوەڕاست لەسەر دەستی پاشا شلمنسەری یەکەم "١٢٧٤- ١٢٤٥پ.ز" دروست کراوە. بەڵام لەدوای ماوەیەک دانیشتوانەکەی چۆلیان کردووە و دووچاری کاولکاری هاتووە. شارەکە بەم جۆرە ماوەتەوە تاوەکو ئاشوور- ناسر- پالی دووەم هاتە سەر کار و بڕیاری دووبارە ئاوەدانکردنەوەی داوە و کۆشکە پاشاییەکەی تیادا دروست کردووە. لە سەردەمی دەسەڵاتدارێتی ئەم پاشایە "کەلەخ" فراوانی بەخۆوە دیوە تاوەکو رووبەرەکەی بە نزیکەی سێ کیلۆمەتر و نیو دووجا گەیشتووە. بە شوورەیەک دەورە دراوە درێژییەکەی بە ٨ کیلۆمەتر گەیشتووە. مێژووی کەلەخ بۆ سەردەمێکی کۆنتر لەو ماوە دەگەڕێتەوە کە دەقە پاشاییە ئاشوورییەکان ئاماژەی بۆ دەکەن. ناوی "کەملخ" بووە. ئەم شێوە ناوە بۆ دەقەکانی سەردەمی بابلی کۆن دەگەڕێتەوە. ئەوەی ئەم رایە پشتڕاست دەکاتەوە دۆزینەوەی پاشماوە بەردییەکانە لە خوارووی رۆژهەڵاتی ناوچەی پرۆژە ناوەندییەکان "قەڵای نەمروود" ئەویش لە قوولایی نزیکەی ١٧ پێ لەژێر ئاستی زەوی هۆڵی "عەرشی" لە کۆشکی پاشایی کە لەسەر قەڵاکە دروستکراوە. مێژووی تۆماری ئەم پاشماوانە بۆ سەدەی هەژدەهەمی پێش زایین دەگەڕێتەوە. واتە بۆ چەرخی بابلی کۆن.

پاشماوەی شاری کەلەخ لەکاتی ئێستا شێوەیەکی نا ئەندازەیی وەردەگرێت. درێژاییەکەی لە باکوورەوە بۆ خواروو ١٥٠٠ مەترە و لە رۆژهەڵاتەوە بۆ رۆژئاوا ١٨٠٠ مەتر. ئەوەش وا دەکات بە دووەم لە گەورەترین شارەکانی دوای نەینەوای دەوڵەتی ئاشووری بژمێردرێت لە رووی رووبەرەوە. لەگرنگترین شوێنەواره دیارەکانی ئەم پێگەیە کە ئەمڕۆ دەبینرێت شوورەکەی دەرەوەیەتی کە بازنەی شارەکە پێکدەهێنێت. لە ناوەوەی شارەکە دوو شوێنی بەرز جیا لە بەشەکانی دیکە دیارن.

دووەمیشیان گردەکانی ئەلعازر. قەڵای نەمرود لە لای باکووری رۆژئاوای شارەکەیەو لە ١٥٪ی رووبەرەکەی داگیر دەکات. بەرزییەکەی لەنێوان ١٠-١٤ مەتر لەسەر رووی زەوی دەوروبەری بەرزترە. گۆشەی خوارووی رۆژئاوای قەڵاکە راستەوخۆ بەسەر ڕێڕەوی کۆنی رووباری دیجلەدا دەنوارێت. پاشماوەی سەکۆیەکی بە پانایی ٩ مەتر کە لەلای رۆژئاوای قەڵاکە درێژ دەبێتەوە بەرچاو دەکەوێت کە قەڵاکە خۆی بە شوورەیەک پاناییەکەی پتر لە ٢٠ مەترە دەورە دراوە، بۆی هەیە بەرزییەکەی بگاتە ٣٠ مەتر لە کاتی دروستکردنیدا.

ئەو پشکنینانەی لە قەڵای نەمرود ئەنجامدراوە بە دۆزینەوەی چەندین خانوو گەیشت کە لە کۆشکی باکووری- رۆژئاوا کە کۆشکی سەرەکی پێکهاتووە ئاشوور- ناسر پالی دووەم دروستی کردووە و کوڕەکەی شلمەنسەری سێیەم تەواوی کردووە. دوورایییەکانی ئەم کۆشکە ٢٠٠×١٢٠ مەترە. هەروەها پاشماوەی کۆشکی ئەدد- نرای سێیەم و کۆشکی خوارووی رۆژئاوا کە ناسراوە بە کۆشکی سووتاو سەرەڕای کۆشکی پارێزگار. لە خانووە ئایینییەکان پەرستگای ئزیدا بۆ پەرستراو نەبوو کە پاشای ئاشووری خاتوو سەممو- رومات "سەمیر ئەمیس لە سەرچاوە کلاسیکییەکان" دروستی کردووە. لەم پەرستگایە کۆمەڵێک دەقی ئایینی و سیحربازی و ژمارەیەک لە دەقی رێککەوتننامەیی تیا دۆزراوەتەوە. لە گۆشەی باکووری رۆژئاوای قەڵاکە "زەققورە"ی قوللەی قادرمەیی و لە خوارووی‌دا و لە خوارووی پەرستگای "نەنورتا" هەیە. لەلای خوارووی رۆژهەڵاتی "زەققورە" کە پەرستگای عەشتار دۆزراوەتەوە. دوور لە قەڵاکە لە گۆشەی خوارووی رۆژهەڵاتدا، لە شارەکە دوو گرد هەیە ناسراون بە گردەکانی ئەلعازر. پێگەیەکی پادشایی تیادا دۆزراوەتەوە.

شوێنەوار ناسەکان بەناوی "قەڵای شلمنسەر" ناسیویانە. ئەویش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە شلمنسەری سێیەم دامەزرێنەری بووە. پاشا ئەسەرحەدون هەڵساوە بە نوێکردنەوەی ئەم کۆشکە

و پێگەیە لە سەردەمی خۆیدا. دوورایییەکانی "قەڵای شلمنسەر ٣٥٠×٢٥٠ مەترە" لە سەرانسەری شاری ئەوەی کە جیای دەکاتەوە شوورەیەکی پارێزراوی تایبەت بە خۆیەتی دوو دەرگا ئەو شوورەیە دەکاتەوە. یەکێکیان لەلای باکوورە و ئەویتر لای رۆژئاوایەتی. دەرگایەکەی دیکە، سێیەمین کە بەرەو دەرەوەی شار دەردەچێ لەلای خوارووی- رۆژهەڵاتدا.

دور-شروکین: کە پاشای ئاشووری سەرجوونی دووەم "٧٢١-٧٠٥پ.ز" بڕیاریدا پایتەختی نوێی دەوڵەتی ئاشووری دروست بکات پێگەیەکی بۆ هەڵبژارد نزیکەی ٢٠ کم لە باکووری رۆژهەڵاتی نەینەوا دوور بێت. ئەم پێگەیە نزیک بوو لە باکووری چیای بەعشیقە. ئیمڕۆ ئەم شوێنە بە فرسباد ناسراوە. لە سەردەمی سەرجوونی دووەم لەم شوێنە گوندێک هەبوو ناسرابوو بە "مەجنوبا" بەو پێیەی کە دەقەکانی سەردەمی ئەم پاشایە ئاماژەی بۆ دەکات. ئەو پاشایە هەڵسا بە قەرەبوو کردنەوەی دانیشتووانانی ئەم گوندە بەرامبەر بە لیرەی زیو یان بە کێڵگەی نوێ. بەو پێیەی کە خەڵکەکە خۆیان کامیان هەڵدەبژێرن. دواتر شارێکی نوێی دامەزراند و ناوی لێ نا دور- شروکین.

دور-شروکین لەسەر رووی زەوییەکی پان و پۆڕ دروستکراوە. بە شوورەیەکی دەرەوە گەمارۆ دراوە پانایییەکەی ٢٨ مەتر بووە، نەخشەی سەر زەوییەکەی چوارگۆشە بووە. درێژی هەر لایەکی لەنێوان ١٦٠٠- ١٧٥٠ مەتر بووە. گۆشەکانی ڕێک و ئەندازەیی بووە. لە شوورەکەی ٧ دەرگای لە سەرەوە بووە. یەکێکیان لەلای باکووری رۆژئاوا بووە. دوو دەرگاش لە دوو لایەکەی دیکە بووە. لە دیواری باکووری رۆژئاوای شارەکە قوللەیەک دروست کراوە بە بەرزایی ١٥ مەتر و پانایی نزیکەی ٣٠٠ مەتر. بەشێک لەم قوللەیە بەدرێژایی ١٤٠ مەتر لەرووی دەرەوەی شوورەی شارەکە بە دەرەوەیە. لەسەر ئەم قوللەیە کۆشکی پاشایی و زەقۆرەیەک و کۆمەڵگای پەرستگا سەرەکییەکان دروست کراوە و هەموو ئەم کۆشک و خانووانە بە شوورەیەکی دروست دەورە دراوە. ئەم "دەککە"یە بە "دەککە"یەکی دیکە دەورە دراوە کە بەرزاییەکەی کەمترە. شوورەیەک بە پانایی ٦ مەتر دەورەی داوە. لە ناوەوەیدا پەرستگایەک بە ناوی "نەبوو"وە چەند کۆشکێکی تیایە. "دەککە"یەکی دیکە لە باشووری شوورەکە دروستکراوە بەلای رۆژئاواوە، لە نزیک گۆشەی خوارووی شارەکە. لە سەریدا تەلانێک هەیە کۆشکێکی پاشایی لەسەر دروست کراوە، ئەم گردە لە شێوەی گردەکەی شلمنسەرە لەگەڵ جیاوازی رووبەرەکەی کە لە "کەلەخ"دا.

ئاشوور: ئاشوور "قەڵای شەرگاتی ئێستا" یەکەم پایتەختی دەوڵەتی ئاشوورییەکان بووە. مەڵبەندی کارگێڕی پارێزگای ئاشووری بووە لە هەردوو سەردەمی ئاشووری نوێ و ناوەڕاست. دەکەوێتە رۆخی رۆژئاوای رووباری دیجلە لە دوورایی نزیکەی ١٠٠ کیلۆمەتر لە خوارووی شاری موسڵ. مێژووی شاری ئاشوور بۆ هەزارەی سێیەمی پێش زایین دەگەڕێتەوە، لەو کاتەی کە پەرستگای "عەشتار" لە سەردەمی "سلالات" دروستکراوە، لە سەردەمی ئیمپراتۆریەتی ئەکەدی ئاشوور مەڵبەندێکی گرنگی کارگێڕی بووە و بەردەوام بووە لە سەردەمی "سلالە"ی ئوری سێیەم. بەڵام رۆڵی ئەم شارە وەک پایتەختی دەوڵەتی ئاشووری هەر لە دامەزراندنییەوە بەردەوام بووە تاوەکو سەردەمی ئاشوور- ناسرپالی دووەم، کە ئەوەبوو "کەلەخ"ی بە پایتەختی خۆی هەڵبژارد، بەڵام گواستنەوەی بارەگای پایتەخت لە شاری ئاشوور ئەوە ناگەیەنێت، کە ئەم شارە کۆتایی هاتووە وەک مەڵبەندێکی ئایینی کاریگەرییەکەی بۆ وڵاتی ئاشوور هەر مایەوە، هەروەها وەک مەڵبەندێکی کارگێڕی بۆ پارێزگاکەی تاوەکو رووبەرووی کاولکردن هاتەوە لە ساڵی "٦١٤پ.ز" واتە دوو ساڵ پێش کەوتنی نەینەوا لەدوا هێرشی بۆ سەر دەوڵەتی ئاشووری. تەنانەت دوای ئەم هێرشەش شاری ئاشوور تەواو چۆڵ نەکرا. بەڵکو دووبارە ئاوەدان کرایەوە لە سەردەمی بابلی نوێ و هەردوو سەردەمی ئەخمینی و فرسی، کە دواتر هاتن. لە پێگەی ئەم شارە نووسراوی ئارامی دۆزراوەتەوە، کە بۆ سەدەکانی یەکەمی پێش زایین و سەدەی سێیەمی زایینی دەگەڕێتەوە.

شاری ئاشووری لەسەر بەرزاییەک دروست کراوە درێژایی بناری رۆژهەڵاتی چیای "مەکحول"دا. بەرزی ئەم شارە نزیکەی ٢٥ مەترە لەسەر

ئاستی دەشتی تەنیشتییەوە. پێگەکەی شێوەیەکی سێگۆشەیی هەیە بە واژوویی. دوو لایەکەی رووباری دیجلە لە رۆژهەڵات و چیای مەکحول لە رۆژئاوا. بنکەکەش لە باکوورەوە لقێکی رووباری "دیجلە"یە، شارەکە دوو بەشی سەرەکییە هەریەکەو ناوی خۆی هەیە:

١- لیب ئالی: واتە سەنتەری شار، کە باکووری شارەکە دەگرێتەوە، بەشە هەرە کۆن و گەورەترەکەی شار دەگرێتەوە. ئەم ناوە لە چەندین دەقدا دۆزراوەتەوە لە چەرخەکانی ناوەڕاست و نوێ.

٢- ئەلو ئایش: بە واتای شارە نوێیەکە دێت. ئەم ناوە بە بەشی خوارووی شار دەوترا کە لە دواییدا بە مەبەستی فراوانکردنی شارەکە خسترایە سەر شارەکە. لە دەقەکانی پاشماوەی هەندێ لە پاشا ئاشوورییەکاندا ئەوەمان بۆ ئاشکرا بووە کە ئەم بەشە لە لایەن بوزەر-ئاشووری سێیەم ئاوەدان کراوەتەوە. کە یەک لە پاشاکانی ئاشووری کۆن بووە. شایەنی باسکردنە ناوی "ئەلوئایش" بە بەشی رۆژئاوای شاری "بابل"یش دەوترێت. هەروەها بە شارێکی دیکەش لە هەرێمی سوخ لە رۆژهەڵاتی سوریا. زۆربەی کۆشک و خانووە ئایینییەکان و فەرمییە گرنگەکان، لە پەرستگاو کۆشکە پاشاییەکان، لە بەشی باکووری "لیب ئالی" دروست دەکران. ئەم خانوو کۆشکانە پەرستگای ئاشوور، "زەققورە" دوو کۆشکی پاشایی کۆن و نوێ، پەرستگای "ئانود- ئەدد" پەرستگای "سین- شەمشی" و پەرستگای عەشتار. لەگەڵ ئەوەیدا ناوچەی پەرستگاو کۆشکەکان لە سەنتەری شار جیا نەکرابوونەوە بە شوورەیەکی ناوخۆ، بەڵام بەشی هەرە بەرزی شارەکەی دەگرتە خۆی. بە هەڵکەوتە مەزنەکانییەوە بەسەر دەشتی زیوینی درێژبۆوە بۆ باکووری شاری ئاشوورییاندا دەڕوانی. دالانێکی مەزن لەلای باکووری شوورەکەی شارەکە هەبووە، کە لە لای کۆشک و پەرستگاکانەوە بەرەو کەناری رووبارەکەی دەبرد. کۆشک و پەرستگاکان لە مەڵبەندی شار ئەوەی جیای دەکردەوە شەقامێکی سەرەکی بوو لە دەرگای "تابیرا" دەستی پێدەکرد، لە شوورەی رۆژئاوای شارەکە "لیب ئالی" لە رۆژئاواوە بۆ رۆژهەڵات دوو کەرت دەکرد. هەموو ئەو کۆشک و پەرستگایانەی ئاماژەمان بۆ کرد، دەکەوێتە لای باکووری ئەم شەقامە تەنیا پەرستگای "سین- شەمس" و پەرستگای "عەشتار" نەبێ کە کەوتوونەتە لای خوارووی شەقامەکە.

جیا لەم شارانە شاری هەولێر پشکنینی شوێنەواری وای بۆ نەکراوە کە شوێن پێگە کۆنەکانی دیارکەوێت. بەڵام تۆمارکراوەکانی کۆن لاپەرەکانی مێژووی ئەم شارە دێرینەمان بۆ دەگێڕنەوە. لە توێی ئەم لاپەڕانەدا ئەو بیرۆکانە پەیوەستن بە گرنگی هەولێر بۆمان روون دەبێتەوە، ئەو دۆزرانەوەی لە کاتی پشکنینە زانستییەکان بە دەستمان دەگات. لە دەقە مسمارییەکان ئەوەمان زانیوە کە هەولێر سەرەڕای ئەوەی کە مەڵبەندێکی کارگێڕی بووە، مەڵبەندێکی ئایینی گرنگ بووە، لە مێژووی کۆن بە پەرستگای عەشتار ناسراوە، ئەوەش وای کردووە لەم بوارەدا بە یەک لە سێ مەڵبەندە گرنگەکان، سەرەڕای شارەکانی نەینەوا و ئاشوور، بناسرێت.

لەم بوارەدا پەرستگای عەشتار لە هەولێر ناوی "ئی-کاشان- کلاما" بووە. بە زمانی سۆمەری "ماڵی خانمی وڵات" دەگەیەنێت. لە نووسراوەکانی پاشای ئاشووری شلمنسەری یەکەم "١٢٧٤-١٢٤٥پ.ز"دا هاتووە. کە ئەوسا نۆژەن کراوەتەوە لەگەڵ "زەققورە"کەی. ناوی ئەم پەرستگایە لە دەقی پاشای ئاشووری "ئاشوور- دان"ی یەکەم "١١٧٩-١١٣٤پ.ز"دا هاتووە. کە بە هەڵکەندراوی لەسەر پەیکەری برۆنزی بەدیار کەوتووە، کە لە نزیک دەریاچەی "ورمێ" دۆزراوەتەوە. وا دیارە لە سەرەتادا لە شاری هەولێرەوە گوازراوەتەوە بۆ ئەوێ. پەرستگای عەشتار لە هەولێر مەڵبەندێکی گرنگ بووە بۆ پێشبینیکردنی داهاتوو و خوێندنەوەی بەخت و چارەنووسی خوێندنەوە. ئەمە وای کردووە ئەم شارە ناوبانگێکی گەورە پەیدا بکات لە چەرخەکانی کۆنیندا. پاشا ئاشوورییەکان حەزیان دەکرد بەختی خۆیان بخوێننەوە و چارەنووسی خۆیان بزانن. هەروەها هەولێر بە رستن و چنین بەناوبانگ بووە.

دوای رووخانی دەوڵەتی ئاشووری لە ساڵی ٦١٢پ.ز هەولێر وەک مەڵبەندێکی کارگێڕی گرنگ مایەوە.

نامەیەکی مێژوویی کە بۆ کۆتاییەکانی سەدەی پێنجەمی پێش زایین دەگەڕێتەوە و بە زمانی ئارامی نووسراوەتەوە، لە لایەن کەسێک بەناوی عرشام نێردراوە وا دیارە ئەم کەسە لە لایەن دەسەڵاتی ئەخمینییەکانەوە راسپاردراوە، کە کاروباری میسر بەڕێوە ببات. عرشام لەم نامەیەدا داوا لە بەرپرسان لە ٣ کەرتی کارگێڕی دەکات، کەرتی لائیر و ئەرزوخین و هەولێر، کە یارمەتی بە هەڵگری نامەکە بدەن، کە لە ڕێگایدا بەرەو میسر دەڕۆیشت. دوو کەرتی لائیر و ئەرزوخین کە لەم نامەیەدا ناویان هاتووە لەگەڵ "لاخیر و ئەرزوخینا" کە لەگەڵ هەولێر مەڵبەندی کارگێڕی ئاشووری بوون لە ڕۆژهەڵاتی رووباری "دیجلە" کە پێشتر نووسەری ئەم بابەتە پێگەی لاخیری گەڕاندبۆوە بۆ گردی "قەرە ئۆغلان" لە دەوروبەری ڕۆژهەڵاتی شاری کفری ئێستا. "ئەرزوخینیا" کە پێشتر ئاماژەمان پێدا لەم لاپەڕانەی پێشەوە پێگەکەی دەگەڕێتەوە بۆ گردی کوک- تەپە، بە دوورایی دە کیلۆمەتر لە خوارووی شاری پردێ "ئاڵتون کۆپری" ئێستا دەستنیشانکردنی پێگەی هەریەک لە "لائیر و ئەرزوخین" لە هەردوو گردی "قەرەئۆغلان و کوک تەپە" و ڕێککەوتنیان لەسەر ڕێگای بابل- هەولێر. هەر لەگەڵ نامەکەی "عرشام" ڕێکدەکەوێت. جەخت لەسەر ڕۆڵی گرنگی بەردەوامی چوار شارەکە دەکاتەوە لە سەردەمی ئەخمینی.

ناوی هەولێر بەستراوەتەوە بەو جەنگە مێژووییەی کە یەکلاکەرەوە بوو لە نێوان ئەسکەندەری مەقدۆنی و دوا پاشای ئەخمینی داریۆشی سێیەم کە تیایدا داریۆش کە لە جەنگەکەدا تێکشکا لە چەرخی فرسی کە لە وڵاتی دوو زێ بەردەوام بوو لە ساڵی ١٣٠پ.ز تاوەکو ٢٢٧ زایینی هەولێر یەک لە شارە دێرینەکان بوو کە پارێزگاری لە گرنگییەکەی خۆی کرد هەروەکو شارەکانی نەینەوا، ئاشوور و کیلز ئەوسا هەولێر بووە پایتەختی هەرێمی حەدیاب. کە سەرچاوە عەرەبییەکان بەناوی "حزە" ناوی دەبەن. سەرچاوە کلاسیکییەکان بەناوی "ئەدیابینی" ناوی دەبەن. ئەم هەرێمە لە لایەن پاشا خۆجێیەکان بەڕێوە دەچوو. هەندێ جار ئەم قەڵەمڕەوییە فراوانی بەخۆوە دەبینی وەک ئەوەی لە سەردەمی پاشا ئیزاتیسی دووەم تاوەکو "نەسیبەین" گەیشت. بەڵام ناوچەکە لەو سەردەمدا شانۆی چەندین جەنگی نەبڕاوە بوو لە نێوان "فرثییەکان" و "ڕۆمانەکان" ئەرمینیاش دەبوو بە لایەنی سێیەم لەم جەنگانەدا. ئەوەبوو کە هەرێمی "حەدیاب"ی لە ساڵی "٨٢ پ.ز" داگیر کرد و بۆ ماوەی ١٠ ساڵ داگیری کرد، پێش ئەوەی فرثییەکان بیگەڕێننەوە. ئەوەی شایانی باسە ئەوەیە پاشا فرثییەکان گرنگییەکی تایبەتییان بە هەولێر داوە. هەندێکیان هەر لەوێ گۆڕەکانیان بەجێماوە. شارەکە دووچاری هێرشی ڕۆمانەکان بۆتەوە لە سەردەمی بەتریکەکانی، تراجان، سیفرۆس، کاراکالا. هێرشەکەی کاراکالا لە ساڵی ٢١٦ زایین بووە. واتە پێش کەوتنی ئیمپراتۆری فرثی بە دەست ساسانییەکان بە چەند ساڵێک. هەرێمی حەدیاب بەردەوام بووە لە سەروبەندی چەرخی ئیمپراتۆریەتی ساسانی. لە سەردەمی ئیسلامیدا ئاماژە بۆ پتەوی قەڵاکەی هەولێر کراوە و هەروەها بۆ ئەو چاڵەی کە لە شوورەکەی دەوروبەری هەڵکەندراوە. لە کتێبەکەی یاقوت ئەلحەمەوی "معجم البلدان" باسکراوە.

لێرەدا گرنگ ئەوەیە ئاماژە بۆ ئەو پرۆژەیە بکەین کە ئاوی بۆ شاری هەولێر گەیاندووە لە چەرخە کۆنەکاندا لە ڕێگای پرۆژەیەک کە لە سەردەمی پاشای ئاشووری سەنحاریب "٧٠٤- ٦٨١پ.ز" هاتۆتە جێبەجێکردن. ئامانجەکە ئەوەبوو کە ئاو لە رووباری "بەستۆرە" بە شاری هەولێر بگەیەنێت. ئەویش لە ڕێگای کەناڵێک لە ژێر زەویدا "کارێز". شوێنەواری ئەم پرۆژەیە لە ساڵانی چلی سەدەی رابردوو لە سەدەی بیستەم لە خوارووی رووباری بەستۆرە دۆزراوەتەوە. لەدوورایی ٢٠ کم بۆ باکووری ڕۆژهەڵاتی هەولێر لە نزیک گوندی "قلە- مورتکە". شوێنەواری ئەم پرۆژەیە سەکۆیەک و سەرەتای کەناڵێک بۆ گواستنەوەی ئاو لە رووبارەکەوە بۆ هەولێر پانایی ئەم کەناڵە ١.٢٠ مەترە و تیرەی ستوونی ١.٥٠ مەترە. یەک لەم بەردانەی کە لە دروستکردنیدا بەکارهاتووە نووسراوێکی لەسەرە. دەقێکی مسمارییە و هەڵکەندراوە بۆ سەردەمی دەسەڵاتی سەنحاریب دەگەڕێتەوە لە ٨ دێڕ پێکهاتووە.

سەنحاریب لەم دەقەدا نووسیویەتی: سێ "٣" رووباری بۆ

هێنانی ئاو لە چیای خانی هێناوە و هەڵیکەندووە بۆ هەولێری هێناوە. ئەوەی شوێنی گرنگیدانە ئەوەیە کە رووباری بەستۆرە لە سێ رووباری یەکگرتوو کە لە چیای "پیرمام داغ" سەرچاوەیان وەرگرتووە. ئەم سێ رووبارە لە سێ شوێن سەرچاوەیان وەرگرتووە. لە چیای "پیرمام داغ"، "سەفین داغ" و "بنەباوی" ئەمەی دوایی لە کۆتایی چیای "سەفین داغ" سەرچاوەی وەرگرتووە. روون و ئاشکرایە دەقەکەی سەنحاریب بۆ ئەم سێ رووبارە دەکات. لەسەر ئەم بنەمایە دەتوانین چیایەکانی خانی لە دەقە کۆنەکە بەراورد بکەین لەگەڵ ئەم سێ چیایەی ئاماژەمان بۆ کرد. ئەگەری ئەوە هەیە ناوی چیایەکانی خانی کۆن ئەو گردانە بگرێتەوە کە کەوتوونەتە رۆخی چەپی رووباری بەستۆرە لە رۆژهەڵاتی هەولێر. ئەم گردانە ئێستا بەناوی خانی زادە ناسراون لێرەوە ئەگەری ئەوە هەیە کە پەیوەندی بەناوە کۆنەکەوە هەبێت. لە رێگای بەدواداچوون بەرێرەوی ئەو بیرانەی کە لەژێر زەوییەوە هەڵکەندراون دەتوانین ئاراستەی ئەم کەناڵەمان بۆ دیار بکەوێت. ئەم بیرانە بەدووراییی یەک لەدوای یەک و بەرێکوپێکی هەڵکەندراون و ماوەی نێوانیان، واتە نێوان هەر بیر و بیرێکی دیکە، ٤٢ مەترە. تاوەکو ئەم کەناڵە بە هەولێر دەگات. لە ماوەیەکی دواتر پاشماوەی کەناڵێکی کۆن لە یەکێک لە گەرەکەکانی هەولێر دۆزرایەوە کە لە نوێوە ئاوەدان دەکرایەوە. ئەویش لە کاتی لێدانی بیرێک بۆ خوێندنگایەک پتر ئەگەری ئەوە هەیە ئەم پاشماوانە بۆ ئەو کەناڵە "کارێز"ە دەگەرێتەوە کە سەنحاریب کاتی خۆی دروستی کردووە.

لەبەر رووناکی ئەو راستییانەی کە باسمان کردووە سەبارەت بە رۆڵی قەڵاکان و پەیوەندی بە دەوروبەریان لە شارەکانی نەینەوا، کەلەخ، دور-شروکین، ئاشوور رۆڵی قەڵای هەولێرمان بۆ دەردەکەوێ سەبارەت بە پەیوەندی ئەم قەڵایە بەو ناوچەیەی کە لە دەوربەریدایە. بەرزی ئەم قەڵایە لە کاتی ئێستادا پتر لە ٢٦ مەترە لە چاو زەوی دەوروبەری. رووبەرەکەی نزیکەی ١٠٢م٢. تاوەکو ئێستاش شوێنەواری پاراستنی قەڵاکە لە دێر زەمانەوە ماوەتەوە. بەڵام شوێنەواری ئەو شوێنانەی کە لە کۆندا نیشتەجێ بووە و لە دەوروبەری قەڵاکە بووە زانیارییەکی ئەوتۆ لە کاتی ئێستا لەبەر دەستدا نییە هۆکارەکەشی ئەوەیە کە شارەکە فراوان بووە و پشکنینی شوێنەواری کارەکانی بە ئەنجام ناگات. بەڵام دەتوانین دەستمان بە زانیاری گرنگ بگات لە رێگای دەقە مسمارییە کۆنەکان. هەروەکو سەبارەت بە خانووەکانی هەولێر لە چەرخە کۆنەکان ئەنجامان دا. لەم بوارەدا مسماری گرنگ هەیە لە پێگەی شاری "کەلەخ" دەست کەوتووە مێژووەکەی بۆ چەرخی ئاشووری نوێ دەگەرێتەوە. لەم دەقەدا ناوی حەوت شارۆچکە یان شارەدێ یان گەرەک هاتووە واپێناسە کراوە کە هەموویان لە دەوروبەری "قەڵای"ی هەولێرن. ئەم ناوانە بریتین لە رەمتبا، خرو، شسی، ئودوا، جەبەشی، خەسەنا، وەسەخەرونایا.

کاری گەران و پشکنین و وردبوونەوەی شوێنەواری کە لە ساڵی "١٩٤٥ز"یەوە بەردەوامە ئەوەیان سەلماندووە کە لە دەوروبەری قەڵای هەولێر، کە ماوەیەک لە ٧ کیلۆمەتر تێپەڕ ناکات لە قەڵاکەوە. حەوت پێگەی شوێنەواری هەیە مێژووەکەی بۆ سەردەمی ئاشووری نوێ دەگەرێتەوە بەلای کەمەوە.

وا لە خوارەوە ناوی ئەم حەوت پێگەیەو ئەو ئاراستەیەی بەرامبەر بە قەڵا هەڵکەوتووە:

١- گردجنان: باکووری خۆرهەڵات.
٢- گردی رەشکێن: باکووری رۆژئاوا
٣- گردی کۆشکی عەنکاوە: باکووری رۆژئاوا
٤- گردی حاجی لەر: رۆژئاوا
٥- گردی سەید ئەحمەد: خوارووی رۆژئاوا
٦- گردی کلک مشک: خوارووی رۆژئاوا
٧- گردی مەلا خەتیب: خوارووی رۆژهەڵات

ئەم حەوت پێگەیەو رێککەوتنی لەگەڵ ژمارە و پێگەی ئەم شارۆچکەو گەرەکانە گوندانەی کە ژمارەیان "حەوت"ە و لە دەقە مسمارییەکاندا هاتووە. بەو بروایەمان دەگەیەنێت کە بەسەر یەکدا چەسپاون. هەریەک لەم پێگە شوێنەوارییانە پاشماوەی یەک لەم حەوت شوێنەوارە کۆنانەیە. ئەگەر ئەم بۆچوونە راست بێت. قەڵای هەولێر بەرۆڵی شاری سەنتەر هەڵساوە بۆ کۆمەڵێک لە شارۆچکەو گەرەکی سەر بەو قەڵایەو پەیوەست بووە پێی.

سەرچاوە:
حقیقة السومریین ودراسات اخری من علم الآثار والنصوص المسماریة، د. نائل حنون.

# شانشینی ئەخازوم

## لە ژێر روشنایی تێکستەکانی شاری شمشارە (گردی شمشارەی دەشتی ڕانیە) دا

ئا: ئەردەڵان کوێخا عوسمان بێتواتەیی

یەکێ لە میرنیشینەکانی بناری شاخەکانی زاگروس و رۆژهەڵاتی رووباری دیجلە، کە لە سەردەمی ئاشوری کون دا دەورێکی گرنگی گێراوە لە ململانێکانی ناوچەکەدا بە تایبەتیش لەگەڵ ئاشورییەکان دا شانشینی ئەخازوم بووە، ئەم ولاتە لە تێکستەکانی (شمشارە) دا * کە لێردا دیانخەینەروو ئاماژەی پێکراوە، پایتەختی ئەم ولاتەش شاری (شیکشابوم)بووە کە بو یەکەم جار لەسەردەمی بنەماڵەی نوری سێ یەم (٢١١٢-٢٠٠٤ پ.ز) ئاماژە بەپایتەختی ئەم شانشینە کراوە بەشێوەی (شیکشابی؟abi؟ig) ، لە تێکستەکانی (شمشارە) دا بە چەند شێوەیەک ئاماژە بەو شارە کراوە، هەروەها لە نووسراوەکەی(ئیدی سێن کە ناسراوە بە بەردەکەی(غەریب هەڵەدنی) یش دا (کە مێلێکی بەردینە لە گوندی قەردچەتانی بناری چیای پیرەمەگرون لەلایەن شەهید غەریب هەڵەدنی پێشکەش بە مۆزەخانەی سلێمانی کرا کە(١٠٨) دێر نووسینی مێخی لە سەرەوو باس لەسەرکەوتنەکانی ئیدیسنی پاشای شانشینی سیموروم دەکات)، دێری (٦٠) ئاماژە بەم شارە کراوە، ناوی ئەم شارەش بەم شێوەیە شیکراوەتەوە کە لە (ambi-؟ik؟)ییەوە وەرگیرابێ کە بە واتای (ستونێک لە داری ئەمبی) دێت (١) واپێ دەچێ ناوێکی خوری بێ.(٢)

بەڵام سەبارەت بەدیاریکردنی شوێنی جوگرافی ئەم ولاتە، دەتوانین بە پلەی یەکەم پشت بەو نوسراوە مێخییانە ببەستین کە لە (شمشارە) دەست کەوتوون، بەو پێیەش دەتوانین شوێنەکەی لەناو بانەکانی زاگروس لە دامێنی چیاکاندا بدوزینەوە، لەنێوان ئاشوریەکان لە خورئاوای و چیانشینانی زاگروس لە خورهەلات و باکورو باشوریدا (٣) بەو پێیە رەنگە بتوانرێ شوێنەکەی لە نێوانەی (رانیە) و (هەولێر) لە نزیک کویە دیاریبکرێت، لە سەر کەناراوەکانی رووباری (زاب)(زێی بچووک) دا لەخوارووی شاری (شوشەڕرا) ی کوندا، لەنێوان هەردوو شارۆچکەی (دووکان و تەق تەق) دا(٤). بەڵگەی بەهێزیشمان بۆ ئەمە ئەوەیە کاتێ (کوواری) ی فەرمانرەوای (شوشەڕرا) کۆمەڵێ خەڵکی (توروکیTurukki) بو شاری ئاشور دەنێرێ لە نامەکەیدا باس لەوە دەکرێ کە هەندێ لەم توروکییانە لە رێگادا هەڵاتوون و چوونەتە شاری(شیکشابوم) ەوە ئەمەش ئەوە دەگەیێنێ کەئەم ولاتە کەوتووەتە نێوان شاری (ئاشور) و (شوشەڕرا) لە سەر کەناراوەکانی رووباری (زاب) زێی بچووک، گونجاوترین شوێنیش لە وانەیە ناوچەکانی دەوروبەری شارۆچکەی (تەق تەق) بێ،کە بەدووری نازانم یەکێ لەو گردە شوێنەوارییانەی ئەو ناوچەیە شاری (شیکشابوم) ی کونی لەخوگرتبێ، بەم پێیە لە ژێر رۆشنایی ئەم نامەیەدا دەتوانین هاوسێکانی ئەم ولاتە دیاری بکەین بەم شێوەیە، (توروکییەکان) لە باکووری رۆژهەڵاتی و ولاتی (سیموروم) یش لە باشووری رۆژهەڵاتییەوە و (ئاشوریەکانیش) لە روژئاوایدا و (کاکموم) یش لە باشووری روژهەلاتی یەوە (٥)، و(شوشەڕرا) ش لە روژهەڵات و باکوری یەوە بووە.

ئەم ولاتە بەبەردەوامی کێشەی زوری بو ئاشورییەکان

**ڕووی تابلێتەکە**

**1-a-na-ku-wa-ri**
**qi$_2$-bi$_2$-ma**
**um-ma $^{d}$utu-ši-$^{d}$im-ma**
**wu-d[i]-ni-ku-ur$_2$-ti ia-šu-ub-$^{d}$im**
**5-lu-ah-za-a-ji$^{ki}$-te-es-me**
**Pa-na nu-um wa-ar-ki lu$_2$ ši-mu-ur-ri-i$^{ki}$**
**il-li-ik lu$_2$ ši-mu-ur-ri-i$^{ki}$**
**i-zi-ib-ma wa-ar-ki lu$_2$ ti-ru-ki-i$^{ki}$**
**il-li-ik lu$_2$ ti-ru-ki-i$^{ki}$**
**10-i-zi-ib-ma wa-ar-ki ia$_8$-i-la-nim**
**il-il-ik ia$_8$-i-la-nim i-zi-ib-ma**
**wa-ar-ki-ia il-li-ik i-ia-ti**
**i-zi-ba-an-ni-ma wa-ar-ki lu$_2$ ka-a-[k-m]i$^{(ki)}$**
**it-ta-la-ak u$_3$ a-na-ka-al lugal-meš**
**15-an-nu-tim ni-iš dingir-meš iz-za-ka-ar**
**iš-tu it-ti lugal-meš an-nu-tim is$_3$-[li-mu]**
**u$_3$ ik-ki-ru mu-3-kam-ma i-ma-si$_2$**
**i-nu-ma it-ti-ia is$_3$-li-mu**
**i-na-e$_2$-$^{d}$im-ar-ra-ap-hi-im$^{ki}$**
**20-ni-iš dingir-meš iz$_3$-ku-ra-am**
**i-tu-ur$_2$-ma i-na-ah za-i-bi-im**
**i-na a-i-ni-im$^{ki}$ ni-iš digir-meš iz$_3$-ku-ra-[a]m**
**u$_3$ a-na-ku ni-iš dingir-meš az$_2$-ku-ur-šum**
**2-šu ni-iš dingir-meš iz$_2$-ku-ra-am**
**25-iš-tu u$_4$-mi-im ša qa-ra-an su$_2$-ba-ti-ia**
**is-ba-tu ma-ti-ma i-na ma-ti-šu**
**ku$_3$-babbar gu$_4$-ha$_2$ u$_3$-še-em**
**mi-im-ma u$_2$-ul al-qu$_2$-ut**
**a-lam$^{ki}$ iš-ti-en i-na ma-ti-šu**
**30- u$_2$-ul as-[b]a-[at]**

دروووست کـــردبوو بە جـــوریّ کـــە زور جـــاران بووەتـە هوی دروســـتکردنی مـەترسی لە سـەر ئاشـوربیـەکـان، و بە بەردەوامی هاوپەیمانیـەتی پێـک هێناوە لەگـەڵ هێـزەکـانی دەوەروبەری دا دژ بە ئاشـــوربیـــەکـــان،تەنانەت لەگـــەڵ ئاشوربیـەکـانیـش دا هاوپەیمانی پێک هێناوە، بەجـوریّ لە نامـەکـەی دا (شـەمـشی ئەدەد(Adad-shamshi)ی یەکـــەمی ئاشـــوری (١٨١٣-١٧٨١پ.ز) (یاشـــووب-ئەدو) ی پاشـــای (ئەخـــازوە) بەراڕا وەسف دەکات کە بەبەردەوامی هاوپەیمانەکانی دەگوریّ، گرنگترین ئەو هێزانەش کە هاوپەویمانیـتی لەگـەڵ بەستـوون (توروکیەکان،شیموروم،کاکموم(٦)، ئاشوربیەکان) بوون، گوتییەکانیش بە بەردەوامی هاریکاری ئەم وڵاتەیان کـردووە دژ بە ئاشـوربیـەکـان (٧)، هوکــاری پێـکهـێنانی ئەم هاوپەیمانیـیـەتیـە زۆرانەش بو ئەوە دەگـەڕێتـەوە کـە(شـەمشی-ئەددی یەکـەمی ئاشـوری و کـوواری فەرمانڕەوای شوشەڕا) مەترسییان لەسەر وڵاتەکەی دروست کردووە (٨) تەنانەت هەندێ جاریّ لەبەر بەرژەوندی مـانەوەی وڵاتەکەی (یاشوب-ئەدو) ناچاربووە لەگەڵ ئاشوربیەکان بەهەر جوریّ بیّ ڕێک بکەویّت، لە نامەیەکدا ئاماژە بەوە کراوە کە ژمارەیەک گوتی لە شاری (شیکشابوم) دا هەن، (ئەخازوم) یش هاوپەیمانیەتیّکی نویّ لەگەڵ هەریەکە لە (گوتییـەکـان و کاکموم) دا پێکهێنابوو ڕەنگە هەر ئەمەش بوویێتە هوی ئەوەی کە هانی ئاشوربیەکانی دابیّ بو داگیرکردنی ئەم وڵاتە.(٩)

**بەکوواری بلێ: شەمشی- ئەدەد ئەوها (دەڵێ):**

بەدڵنیاییەوە تو گوێبیستی شەرانگێزییەکەی (یاشوب - ئەدو)ی ئەخازوم بووی؟ ئەو وازی لە فەرمان ڕەوای سیموروومی هێناوەو،بەدوای فەرمانڕەوای توروکی یەکانی کەوتووە. ئەو وازی لە فەرمان ڕەوای توروکییەکانی هێناوە، بەدوای (یایلانوم) کەوتووەو وازی لێهێناوەو، یایلانومی بەجێ هێشتووە، بەدوای من کەوت، ئێستاش ئەو منی بە جێ هێشتووە، بەدوای فەرمانڕەوای کاکموم کەوتووە:

ئەو بەڵێنی بە هەموو ئەو پاشایانە دابوو سوێندشی بو خواردبوون؟! ئەو هاوپەیمانیەتیانەی کە لە ماوەی سێ ساڵ دا پێکی هێنابوون لەگەڵ ئەو پاشایانەدا بە تەواودتی تێکشکێنرا؟ لەو کاتەی پەیمانی لەگەڵ مندا بەستبوو، بەڵێنی پێدابووم و سوێندیشی بو خواردبووم لە پەرستگای خوداوەند (تیشوب) لە شاری (ئاراپخا)،(و) جارێکی تریش پەیمانی پێ دابووم و سوێندیشی بو خواردبووم لە سەرکەناری رووباری زاب (زێی بچووک) لە ئینئنوم، و منش پەیمانم پێ دابوو سوێندیشم بو خواردبوو، جارێکی تریش پەیمانی پێدابووم و سوێندیشی بو خواردبووم، لەو ڕوژەی ئەو دەستی گرتبوو بە سەر پوشاکەکانکمدا، من هەرگیز هیچ (زیو) و(گاو)(دانەوێڵەیەکم) لە زەوییەکانی ئەودا کونەکردوتەوە. و لە وڵاتەکەیدا دەستم بەسەر هیچ شاروچکەیەک دا نەگرتووە. ئێستاش ئەو پەیمانی لەگەڵ مندا شکاندووەو، بەدوای فەرمانڕەوای

**لێواری خوارووی تابلێتەکە**

**i-na-an-na it-ti-ia ik-k[i-ir-ma]**
**u$_3$ wa-ar-ki lu$_2$-ka-ak-m[i$^{ki}$]**
**it-ta-la-[ak]**
**it-ti lugal i-sa-li-im-[ma]**

**پشتەوەی تابلێتەکە**

**35-u$_3$-ni-iš dingir-meš i-za-ka-ar**
**it-ti lugal i-sa-lim-ma**
**u$_3$ ni-iš dingir-meš i-za-ka-ar**
**u$_3$-it-ti lugal ma-a[h-r]-i-im-ma**
**ša-[i-sa]-li-mu-[i-n]-a-ki-ir ?**
**40- u$_3$-i[t]-ti lugal [ša] [i]-sa-[l]i-mu**
**sa-la-am-šu u$_3$-na-ka-[ar-š]u**
**i-na bi-ri-it iti-2[(+x)-kam.......]**
**[i]t-ti-ia iti-1[+x-kam-is$_3$-li-im-ma]**
**i-tu-ur$_2$-ma [it-t]a-ki-[ir]**
**45-i-na-an-na i[ti-x+]1-kam an-nu-tim ka-a[s-su$_2$-u$_2$]**
**u$_3$-qa-ti u$_2$-ul ub-a-a[l-šum]**
**iš-tu u$_4$-mi i-ti$_4$-bu ma-li-[i]-[na] ma-a-ti[šu]**
**e-pe$_2$-šu te-še-[em-me]**
**ku-ši-ia aš-ra-nu-um am-mi-n[im wa]-ši-[ib]**
**50- wu-e-ra-aš-šu-um-ma a-d[i]-[u$_4$]-[x] kam**
**iti-an-ni-im a-na [s]e-ri-ia tu$_2$-ur-da-šum**
**la-ma k[ur]-ha$_2$ u$_3$ kaskal-ha$_2$ ⸢šu-ri⸣-pa-am**
**[i]-sa-ba-tu a-na-se-ri-ia**
**tu$_2$-ur-da-šum iš-tu za-as-li$^{ki}$**
**55- a-na še-gi-ib-bu$^{ki}$ iš-tu še-gi-ib-bu$^{ki}$**
**a-na zi-kum$^{ki}$ iš-tu zi-kum$^{ki}$**
**a-na u$_2$-[ra]-u$_2$$^{ki}$ iš-tu u$_2$-ra-u$_2$$^{ki}$**
**a-na lu-ut-pi$_2$-iš$^{ki}$ iš-tu lu-ut-pi$_2$-iš$^{ki}$**
**a-na ma-a[ta] ha-bu-ra-tim$^{ki}$**
**60-šum-ma la ki-am-ma kur-ha$_2$ kaskal-ha$_2$ šu-ri-pa-am**
**sa-ab-tu a-la-kam u$_2$-ul i-le-i**
**ma-ah-ri-ka-[ma] li-ši-ib**
**lu-u$_2$ ri-tu-ka-ma i-na ninda u$_3$ kaš**
**pa-ni-[š]u [u$_2$] pa-an [lu$_2$]-tur-meš-šu**
**65- [lu-u$_2$] t[a-s]a-ab-ba-[a]t**

**لێواری سەرووی تابلێتەکە**

**[lu$_2$ w]a-bi-il tup-pi$_2$-ia-an-ni-[im]**
**[ni-š]i-šu wa-aš-še-er**

کاکموم کەوتووە، ئەو هاوپەیمانی لەگەڵ پاشایەکی تر پێک دەهێنێ و سوێندی بۆ دەخوات و بەڵێنیشی پێ دەدات. بەڵام لەگەڵ ئەو پاشایەی کە جاری یەکەم هاوپەیمانی لەگەڵ بەستبوو پەیمان دەشکێنێ (؟) لەگەڵ پاشایەکی (نوێ) دا هاوپەیمانی بەستووە، ئەو هاوپەیمانییەتی و شەڕانگێزییەکەی (بەتەواوی) لە میانەی مانگەکان دا [دەگوڕێ]. [ ئەو هاوپەیمانی پێک دەهێنێ ] لەگەڵم دا بو [.......] مانگەکان، لەکاتێک دا ئەو جارێکی تر دەگەڕایەوە لای نەیاران،ئێستا بەرەو [......] ١ مانگەکانی ئەو زستانە دەچین، من ناتوانم دەستی بەسەردا بگرم، بەڵام لەو کاتەی ئاوو هەوا بەرەو خوشی چوو، تو گوێ بیستی هەموو شتێکم دەبی لەو زەوییەدا؟.

(دەربارەی) کوشییا، بوچی ئەو لەوێ ماوەتەوە؟ ڕێنماییەکان بەو بدە، بینێرەوە لە پشت... ئەم مانگە، ئەوم بو بنێرەوە پێش ئەوەی بەفر چیا و ڕێگاکان داپۆشێ: لە (ژاژلوم)ەوە بو (شیگیبو):لە شیگیبووەوە بو (زیکوم): لە زیکومەوە بو (وراو): لە وراوەوە بو (لوتپیش): لە لوتپیشەوە بو زەوی (خابوراتوم)، ئەگەر زور دوا بکەوێ، ئەوا چیا و ڕێگاکان بەبەفر دەگیرێن (و) ئەو ناتوانێ گوزەر بکات و، ئەو لەلای تو دەمێنێتەوە. ئەوەش ئەرکی تو دەبێ، کە پێویستە پارێزگاری لێ بکەیت و (بیرە)و (نانیشی) بو دابین بکەی.

(بو ئەوەی) ئەم نامەیەی پێ بدەیت و ئەو خەڵکەش ئازاد- بکات!.

**ڕونکردنەوەی تێکستەکە:**

ئەم نامەیە لەلایەن (شەمشی-ئەدەد) ی پاشای ئاشوردوە بو (کوواری) ی فەرمانڕەوای (شوشەڕا) نێردراوە، بەڵام ئەگەر بەوردی سەرنج بدەینە ناونیشانی تێکستەکە و ناوەڕوکەکەی، ڕەنگە ئەوەمان بو دەرکەوێ کەلەکاتی ناردنی ئەو نامەیە دا، دەسەڵاتی ئاشورییەکان بەسەر شاری (شوشەڕا shusharraki) دا ئەوتونەبووە، بەڵکو لەوانەیە پەیوەندییەکی دوستانە هەبوو بێت لە نێوانیاندا هەر لەبەر ئەمەشە کە دەشێ ئەو سەردەمە لە (شوشەڕا) بەسەردەمی پێش ئاشوری بناسێنین.

لەم نامەیەدا (شەمشی - ئەداد) (کوواری) ئاگادار دەکاتەوە لە مەترسییەکانی شەڕانگێزی یاشوب ئەدوی (ئەخازوم) و هاوپەیمانەکانی، بەڵام سەرجەم ئەو هاوپەیمانییەتیانەی هەڵوەشاندۆتەوە و سەر لەنوێ هاوپەیمانیەتییەکی نوێی لەگەڵ (کاکموم) پێک هێناوە، بەمەش جورە مەترسییەکەی لە سەر دەسەڵاتی ئاشورییەکان لە ناوچەکەو تەنانەت لە خودی (ئاشور) یش دا دروستکردووە، هەر لە بەر ئەمە بووە کە (شەمشی-ئەدەد) بەم شێوەیە هەراسان بووە و هەوڵیداوە بو لە ناوبردنیان ڕوبەڕوویان وەستاوەتەوە، ئاماژەشی بەوە کردووە کەئەو هاوپەیمانیەتیانەی کە لە ماوەی سێ ساڵ دا پێکی هێنابوون بە تەواوی تێکشکێندراون، کە بە دڵنیاییەوە ئەگەر ئەمە زێدەڕۆیی تێدا نەکرابێ، هەر لەلایەنی ئاشورییەکانەوە ئەو هاوپەیمانییەتیانە تێکشکێندراون، باس لەوە دەکات کە پاشای (ئەخازوم) دوو جاران سوێندی خواردووە و بەڵێنشی پێ داوە بەڵام ئەم بەڵێن و پەیمانانەی نە بردوتە سەر، جاری یەکەمیان لە پەرستگای خوداوەند (تیشوپ) لە شاری (ئاراپخا) بوودو جاری دووەمشیان لەسەر کەناراوەکانی ڕووباری زاب (زێی بچوک) بووە لە شاری (ئەیننوم)، و باس لەوە دەکات کە جارێکی تریش سوێندی بو خواردووە پەیمانی پێ داوە بەڵام نەی بردووەتە سەر، ئەوەشی نەشاردوتەوە کە لە بەرانبەردا ئەویش (شەمشی -ئەدەد) بەڵێنی بە پاشای (ئەخازوم) داوەو سوێندیشی بۆ خواردووە، لێرەدا ئەوەمان بو دەردەکەوێ کە هێزی ئاشورییەکان و ئەخازومیەکان هاوسەنگ بووە، بەو پێیەی کە سوێندیان بویەکتری خواردووە و بەڵێنیان بە یەکتری داوە، خو ئەگەر هێزەکانیشیان هاوسەنگ نەبووبێ ئەوا جیاوازیەکی ئەوتویان نەبووە، چونکە ئەگەر کەسێ باڵا دەستر و بەهێزتر بێ چون سوێند بو کەسێکی لە خوی کەمتر دەخوات و بەڵێنشی پێ دەدات، یان وەک ئەوەی زانراوە لە کون و نوێش دا هاوپەیمانی تەنیا لەنێوان دوو هێزی هاوسەنگ دا دەبەسترێ، بەڵام باس لەوە دەکات کە یەکەم جار هاوپەیمانی لەگەڵ (شەمشی-ئەدەد) دا بەستووە، ئەمەش بەپێچەوانەی ئەو ڕیزبەندیەیە کە لە سەردتای نامەکەدا ئاماژەی پێ کراوە، ئەوەی زیاتریش (شەمشی - ئەدەد) ی هەراسان کردووە، ئەو ئاڵوگوریە زورانەیە کە ئەخازوم بەسەر هاوپەیمانەکانیدا دەهێنێ کە زور بەیان دووژمنی ئەون، هەروەها باس لەوە دەکات کە ئەو هیچ کات باجی لە وڵاتەکەی ئەودا وەرنەگرتووە و ئاماژەی بەو

(زیو،گا،دانەوێڵە) مەتریالانکردووە و هەروەها دەستشی درێژ نەکردوتە سەر هیچ شاروچکەیەکی ئەم شانشینە، ئەگەر سەرنجی ئەم دێرە بدەین لەوانەیە وەک جورە پارانەوەیەکی لێ بێ، ئەگەر نا بو ئاماژە ی بەم شتانە نەکردووە کەنەی کردوون؟ یان بوچی؟ (شەمشی-ئەدەد) ئەوەندە نیگەران بووە لە نەمانی هاوپەیمانی لەگەڵ (ئەخازوم)، ئەگەر هێزێکی بالای ناوچەکە نەبووبێ؟ یان دەبێ هوکاری نیگەرانییەکەی بو ئەوە بگەڕێتەوە کە خوی داوەتە پاڵ دوژمنانی؟.

باس لەوە دەکات کە لە ئێستادا بەرەو زستان دەچێ، ئەمەش تەگەرەی بو دروست دەکات لە دەست بەسەرا گرتنیدا، بەلام کاتێ ئاو و هەوا خوش دەبێ دەستی بەسەردا دەگرێ و (کوواری)ش لەو کاتەدا گوێبیستی ئەم دەنگوباسانە دەبێ، لێرەش ئەمەمان بو دەردەخات کە (ئەخازوم) گوتراون (شەمشی-ئەدەد) بە ئاسانی دەیتوانی دەستی بەسەردا بگرێ،بەگوێرەی ئەو قسانەی کە کردونی ئەگەر ئەو وتانەی ڕاستبن و بەخوداهەڵدان نەبن وەک ئەوەی کە لە لایەن زوربەی پاشایانی (ئاشور) ەوە ئەنجام دراوە، ئەوە ئەوەمان بو دەردەکەوێ کە هێزی ئاشورییەکان و ئەخازومییەکان هاوسەنگ نەبوون، ئەوەش کە(شەمشی -ئەدەد) ی هەراسان کردووە ڕەنگە هوکاری دووەم بێ وەک پێشتر ئاماژەمان پێکرد.

بەشێکیتری نامەکەی تەرخان کردووە بەتەتەرەکەی کە ناوی (کوشیا) بووە، بە (کوواری) دەڵێ کە بوچی ئەو لە(شوشەڕرا) ماوەتەوە، داوای لێ دەکات کەرێنمایەکانی پێ بداو لە پێش ئەو مانگەی تێیدایە بوی بنێرێتەوە. بەلام نازانین ئەم رێنمایانە چین؟، کەچی واپێدەچێ زانیاری بن دەربارەی (ئەخازوم) و هاوپەیمانەکانی، داوا دەکات پێش ئەوەی بەفر ڕێگاکان بگرێ، ئەو بگەڕێتەوە، کە ئەمەش سەختی زستانی ئەو ناوچانەمان بو دەردەخات لەو کاتەدا هەروەک دەزانین لەئێستاش دا ئەو ناوچانەی ئاماژەی پێکردوون لە وەرزی زستان دا بەفر دایاندەپوشێ سەرەڕای ئەوە ئەو ڕێگایەشی دیاری کردووە کە تەتەرەکەی پێدا بگەڕێتەوە، بەدڵنیایەوە لە (شوشەڕرا) وە دەست پێ دەکات و لە(ئاشور) یش کوتای دێت بەم شێوەیە (ژاژلوم - شیگیبو-زیکوم-وراو-لوتپیش-خابوراتوم) بەمەش ڕێگایەکی ئەمنی بو تەتەرەکەی دیاری کردووە کە دوور بێ لە دەسەلاتی (ئەخازوم)، ئەمەش تارادەیەک لەوانەیە جوگرافیای ناوچەکەمان بوڕوون بکاتەوە، چونکە شوێنی هەندێکیان زانراوە، سەرەڕای ئەوەی کە بەهوی وەسفی بەفربارینیانەوە دەتوانرێ تارادەیەک ناوچەکان دیاری بکرێ، بەگشتی دەتوانین ئاماژە بەوە بکەین کەئەم ڕێگایە ڕێگایەک بووە لە (شوشەڕرا) وە بەرەو باکوری خورئاوا تا گەیشتوتە (خاپوراتوم) لەسەرڕوووی شاری (نەینەوا) لە ناوچەی خابوور. دورنییە ئەم ڕێگایە یەکێ لەو دولانە لەخو بگرێ کە دەشتی (بتوین) بە (زێی گەورە) وە دەبەستنەوە کە ئەوانیش دوڵەکانی (بالیسان و هیران وهەنارە)ن کە ئەمەش گونجاوە لەگەڵ ئەو سروشتەی کە باسی کردووە، چونکە ئەم دولانە لە زستان دا بەفرێکی زوریان لێ دەبارێ بە تایبەتی هەردوو دولی (بالیسان و هیران).

**تابلێتی دووەم**






**بە کوواری بلێ: پاشا ئەوها دەڵێ:**

[من گوێ بیست بووم] ئەو نامەیەی کە بو منت ناردبوو، دەربارەی دەنگوباسی یا [ شوب-ئەددو]، ئەوەی تو بۆ منت نووسیوە ئەمە نایاساییە! بوماوەی دوو ساڵ بە دوای فەرمانڕەوایی شیمورووم کەوتووە، ئەو وازی لە فەرمانڕەوای شیمورووم هێناوە [ بە دوای تو کەوتوودە]، ئەو وازی لە تۆ هێناوە و هاتۆتە لای من، من ئەوم لەگەڵ یایلانوم داناوە، بەڵام لەبەر ئەوەی ئەو وازی لە یایلانوم هێناوە و هاتوتە لای من! [ئێستاش ] ئەو وازی لە منیش هێناوە فەرمانڕەوای [کاکموم] کەوتووە.

II [ ١٨ - ٢٥ بەشێکی زوری دێڕەکان شکاوە...]

... و هێنانی ئەو بو هەژمارکردن نە [...]. سەرەڕای ئەوەی تو دەچیە سەری و، ئەویش داگیرکردەکەی، و منیش یارمەتیەکی (گەورەت) پێشکەش دەکەم، ئەگەر تو نەچیە سەری و، ئەویش نەهێنیە هەژماردن.[...] من لەگەڵ تەواوی هێزەکەمدا دێمە سەری و ئەویش دەهێنمە داگیرکردن، و [ لە گەڵ تو کاردەکات ] من زورم پێ خوش، بەڵام تو پاداشت دەکرێی بو ئەو هاوکارییەت کە تو بو منت

رووی تابلیتەکە

1-a-na ku-wa-[ri qi$_2$]-[bi$_2$-ma]
um-ma lugal-[ma]
tup-pa-ka ša tu-š[a-bi-lam eš-me]
aš-šum te$_4$-em ia-[šu-ub-$^{d}$im]
5- ša ta-aš-pu-ra-am
sa$_3$-ar-ru-um a-nu-u[m-mu-um]
iš-tu mu-2-[k]am wa-a[r-ki lu$_2$ ši-mu-ur]-[ri$^{ki}$]
il-li-ik-[m]a lu$_2$ ši-[mu-ur-ri-i$^{ki}$]
i-zi-ib-ma wa-a[r-ki-ku-nu il-li-ik]
10- ku-nu-[ti] i-zi-ib-ma]
a-na se-ri-ia it-ta-a[l-ka-am]
[a-n]a-ku a-na qa-at ia$_8$-i-l[a-ni]m ap-q[i$_2$-is-su$_2$]
[i]-na a-wa-tim an-ni-e-[tim]
ia$_8$-i-la-nam i-zi-ib-[ma]
15- a-na [s]e-ri-ia it-ta-al-ka-[am]
[i-na-an-n]a [i]-ia-[ti-i-iz]-ba-an-ni-[ma]
[a-na s]e-er lu$_2$ [ka-ak-mi$^{ki}$ it-ta-la-ak]
[......][x]e[...........]
[......] [xxx] [..........]
20- [.........] [x na] [........]
u$_2$-bi-il-[ma] dumu-mi$_2$-[x]-[............]
[.......a-na se-e] r-[ lu$_2$ ša] – [a-ti........]

لێواری خوارەوەی تابلۆکە

[...........] ma[..............]
[xx] [.........] [x] [.............]
25- [u$_3$ it-ti][.............]

پشتەوەی تابلیتەکە

u$_3$ ša-al š[u][u$_2$-ul-te]-[...............]
u$_2$-lu at-ta bu-ma [š]a-al-š[u]
[u$_3$] du-um-mi-qa-am šum-ma at-t[a]
[l]a ta-bu-ma la ta-ša-al-š[u]
30- سێ دێڕ شکاون
[a-na-ku it-ti-k]a-bi-i[t-t]i um-m[a-na]-[tim]
[a]-[ša-ri-i]š e-l[e]-em-m[a] a-ša-al-[šu]
35- u$_3$ [aš-šum e-p]e$_2$-ši-ka an-ni-[im]
ma-di-iš[ha-de-ku-u$_3$] qi$_2$-iš-ta-ka
[š]a-du-[um]-mi-uq-ti-ka-an-ni-im
[š]a tu-da-mi-qu$_2$-šu-bu-la-am u$_2$-ul i-li-e
[g]e-er-ru ma-ar-su$_2$ u$_3$ dumu-meš ši-ip-ri

40- na-ap-za-ra-am-ma it-ta-na-la-ku
i-nu-ma it-ti-ia ta-an-na-ma-ru qi$_2$-iš-[tam]
ša du-um-mu-uq-ti-ka a-qe$_2$-eš-ša-[kum]
ša-ni-tam ku-ši[x]-la ir$_3$-di am-m[i-n]im-[ka-le]-e[t]
tu$_2$-ur-da-aš-šu ge-er-[ri]
45- ša ku-um-mi$^{ki}$ i-te-eš-ru
ge-er-ri ša ku-um-mi$^{ki}$ ma
tu$_2$-ur-da-aš-šu

گواستووەتەوە کە من نەم دەتوانی بیگوازمەوە، ڕێگاکان مەترسی داربوون، و پێویست بوو نوێنەرەکان بە نهێنییەوە گەشت بکەن، لەو کاتەی تو دێی بو بینینی من، منیش پاداشت دەدەم بە تو (لەبەرانبەر) هاوکاریەکانی تودا.

دووەمین: بوچی تو کوشییای خزمەتکاری منت بەند کردووە؟ ئەو بو من بنێردوە؟ لەرێگای کومێ (چونکە) لە ئێستادا بێ مەترسییە. ئەو بو من ڕەوانەبکەوە لە ڕێگای (کومێ) وە.

**شیکردنەوەی تێکستەکە:**

ئەم نامەیە لەلایەن (شەمشی-ئەدەد)ە وە بو (کوواری) نێردراوە، تێیدا خوی بە پاشای (کوواری) ناساندووە، و باس لەوە دەکات کە ئەو شتانەی (کوواری) بوی نوسیوە نایاسابییە، بەلام ئێمە نازانین ئەو شتانە چین، هەر چونێ بێ شتەکان پەیوەندیدارن بە (یاشوب-ئەددو) ی پاشای (ئەخازوم)، و باس لە داگیرکردنی (ئەخازوم) دەکات کە پێی وایە (کوواری) دەتوانێ ئەم ولاتە داگیر بکات و لە بەرانبەر یش دا (شەمشی-ئەدەد) (کوواری) پاداشت دەکات، کە ئەمەش شتێکی ئاساییە کاتێ ژێردەستەیەک خزمەتێ بەگەورەکەی یان پاشاکەی دەکات ئەویش لە بەرانبەدا پاداشتی دەکات بەلام کاتێ دەلێ (ئەگەر تو نە چی بو داگیرکردنی ئەو) ئەگەر ئەم دێرە لێک بدەینەوە ئەوا ئەوەمان بو دەردەکەوێ کە (کوواری) بەشێوەیەکی ڕەها لە ژێر دەستی (شامشی- ئەداد)دا نەبووە، چونکە هیچ ژێر دەستەیەک ناتوانێ فەرمانی پاشاکەی جێ بە جێ نەکات، و لە بەرانبەر ئەوەی ئەگەر ئەو کارەکە جێبەجێ نەکات، ئەوا (شامشی-ئەدەد) لەگەڵ سوپاکەیدا دێتە سەری و داگیری دەکات، بەلام ئەگەر (شەمشی -ئەدەد) پاشای(کوواری) بوو ئەوا چون توانیویەتی (کوشییا)ی خزمەتکاری پاشاکەی بەند بکات؟ کە داوای لێ دەکات لە ڕێگای (کومێ) وە بوی بنێرێتەوە، چونکە ئەم ڕێگایە بێ مەترسی بووە، لێرەدا ڕەنگە بتوانین ئەوە بلێین کە (کوواری) ی فەرمانڕەوای (شوشەڕرا)ڕاستەوخو نەکەتوتە ژێر دەسەلاتی (شامشی -ئەداد) بە شێوەیەکی ڕەها، بەلکو تەنیا لەوانەیە جورێ لە هاوکاری و پەیمان بەستنێک لەنێوانیاندا هەبووبێ.

باس لەوە دەکات کاتێ (کوواری) دێتە لای (شەمشی -ئەدەد) لە بەرانبەر ئەو هاوکاریانەی پێشکەشی کردووە پاداشتی دەکات،کە بریتی بووە لە گواستنەوەیەک لە (شوشەڕرا) وە بو (ئاشور) کە کەئەمەش تەنیا بە (کوواری) دەکراو لەگەڵ ئەوەی کە نازانرێت ئەو شتە چی بووە بەلام پێویستی بە نهێنیەکی زور هەبووە.

دووبارە هەروەک لەتێکستی (١) ئاماژەی پێکراوە باس لە و هاوپەیمانیەتانە دەکات، کە (یاشوب- ئەددو) پاشای (ئەخازوم) دروستی کردوون، بەشێوەیەک کە دوو ساڵ لەگەڵ (شیمورووم) هاوپەیمانی بووە و لە دوای (شیموروم) یش لەگەڵ(کوواری) هاوپەیمانی پێکهێناوە، دوا بەدوای (کوواری) لەگەڵ (شەمشی-ئەدەد) چووەتە هاوپەیمانیەوە، هەروەها لەگەڵ (یایلانوم) یش هاوپەیمان بووە و لە کوتایش دا لەگەڵ (کاکموم) چوتە هاوپەیمانیەتیەوە.

بەم شێوەیە ئەم تێکستە تەواوکەری تێکستی یەکەمە.

**تابلێتی سێ یەم**

ڕووی تابلێتەکە









روویِ تابلێتەکە

1- [a-na-ku-w]a-ri
   [qi$_2$-b]i$_2$-ma
   [um-ma lu]gal-ši-$^{d}$[.....]-ma
   [aš-šum te$_4$-e]m ma-ri-šu ša i-ba-al-e-ra-ah
2- [ša] ta-aš-pu-ra-am
   [u$_2$-u]l i-di[šu] a-ji-ki-a-am wa-ši-ib
   [i-n]a ma-a-at a[r-r]a-ap-hi-im-⌈ki⌉-[wa]-⌈ši-ib⌉
   a-šar wa-aš-bu š[u]-up-r[a-am-ma]
   lu-mu-ur-[š]u
10- aš-šum sa-ba-a[t] ia-šu-ub-⌈$^{d}$im⌉
   Ša ta-[a]š-pu-ra-am
   dingir-lum li-[i]r-di-ka sa-ba-as-su$_2$
   du-um-mi-qa-am-ma
   a-na iš$_7$-te-et du-um-mu-uq-tim

لێواری خوارووی تابلۆکە

15- ša-tu-d[a]m-ma-qa-am
   10 u$_2$-dam-ma-qa-kum
   u$_3$ aš-šum ma-ti-šu se$_2$-he-e

پشتەوەی تابلێتەکە

   ša ta-[aš]-pu-ra-am
   at-ta u$_3$ lu$_2$ lu-ul-li-im
20-ne-en-mi-da-ma
   ma-as-su$_2$ se$_2$-he-e
   ku-us-su-ma iti-2-kam an-nu-tim ka-su$_2$-⌈tim⌉
   [q]a-tam u$_2$-ul ub-ba-al-[š]um
   [x(x)]⌈x⌉-pa-ak-ka-šu-[ma]
25- [ki]-⌈i⌉ u-1-kam-[ma]
   [iš-tu u$_4$-m]u it-ti$_3$-b[u]
   [it-ti] ka-bi-it-ti sa-bi-im
   [e-l]e-em-ma a-ša-al-[šu]

**به کوواری بڵێ: پاشای ئاوها (دەڵێ):**

[دەربارەی] زانیاری لەسەر ئەم کوڕەی(یبال -یَراخ)، تو ئەوهات بو من نوسیووە دەربارەی: من ئەو ناناسم، ئەو لە کوێ نیشتەجێ یە؟ ئەو لە ئاراپخا نیشتەجێ یە؟ بوم بنووسە ئەو لە کوێ نیشتەجێیە من دەبێ ئەو ببینم.

دەربارەی گرتنی یاشوب -ئەددو، تو ئەوهات بو من نووسیووە دەربارەی: لە وانەیە خوداوەندی گەورەی تو! ئەو بگرێ! من پشتگیری ئەمە دەکەم، بو ئەمەش تەنیا پشتگیری تو منم، من دەبێ ١٠ دیاری تو (بگێڕمەوە)! ئەو نائارامی دێنێت بو ئەو زەویەی دەوڵەت، دەربارەی ئەوە تویومنت نووسیووە: هاوپەیمانی خودی تو لەگەڵ لولوبییەکان، ئەو ئاڵوزی دێنێ بو ئەو وڵاتە!

ئەوە زستانە، و بە هاتنی ئەو دوو مانگە سەرما هەرماوە، من ناتوانم دەست بەسەر ئەو دا بگرم،[... ]، [و لەسەر زوربەی ] یەکەم ڕوژ کە ئاو هەوا خوش بوو، من دەبێ بچمە سەری لە گەڵ تەواوی هێزەکە و دەبێ ئەویش داگیربکرێ.

**شیکردنەوەی تێکستەکە:**

ئەم نامەیە لە (شەمشی-ئەدەد) ەوە بۆ (کوواری) نێردراوە کەتێیدا چەند پرسیارێک ڕوبەرووی (کوواری) دەکاتەوە، دەربارەی کوڕەکەی (یبال-یراخ) ناوێک، وا دیارە (شەمشی-ئەدەد) ویستوبەتی شوێنی نیشتەجێ بوونی ئەو بزانێ، کە وای نیشانداوە بۆ بینینی زۆر بەتاسە بووە، ڕەنگە ئەمەش بۆ ئەوە بگەڕێتەوە کە ناوبراو کارێکی بەو کوڕە هەبووبێ، بۆ دۆزینەوەشی داوای یارمەتی لە (کوواری) کردووە، لە بەشێکی تری نامەکەدا (کوواری) بە پاشاکەی ڕاگەیاندووە، کە خوداوەندی پاشاکەی (یاشوب-ئەددو) دەگرێ، لەم کارەشدا (کوواری) پشتگیری خۆی بۆ پاشاکەی دووپات کردووەتەوە. وەهەروەها ئاماژە بۆ ئەوەش دەکات کە هاوپەیمانی (کوواری) لەگەڵ (لوللوبیەکاندا) ئاڵۆزی بۆ وڵاتەکەی دەهێنێ، باس لەوەش دەکات کە

هێشتا وەرزی زستان ماوەتی، و هەر دوای تەواوبوونی ئەم وەرزەش ڕاستەوخۆ (ئەخازوم) داگیر دەکات.

بەڵام لە شێوازی نوسینی نامەکەدا هیچ جۆرە شێوازێکی فەرمان پێکردن نابیندرێ، کە پاشایەک بەسەر فەرمان ڕەوایەکی ژێر دەستیدا دەیسەپێنێ، سەرەڕای ئەوەی لە ناونیشانی نامەکەدا خۆی بەپاشای (کوواری) ناساندووە، بەڵام پێم وایە لەو کاتەدا (ئاشورییەکان) دەسەڵاتێکی ڕەهایان بەسەر (کوواری) دا نەبووە.

## تابلێتی چوارەم

### ڕووی تابلێتەکە










um-ma lugal-ma
tup-pa-ka ša tu-ša-bi-lam eš-me
a-wa-[t]u-ka ma-al ta-aš-pu-ra-am-sa$_3$-an-qa
5- a-wa-at ia-šu-ub-$^{d}$im li-il
qa-at ⸢dingir⸣ e-li-šu-te$_4$-em-šu ma-qi$_2$-⸢it⸣
a-wa-ti-šu u$_2$-ul i-di
u$_3$ ni-iš dingir ša i-za-ka-ru
u$_2$-ul i-di
10- ki-ma ša i-na šu-ut-ti-šu
ni-iš dingir i-za-ka-ru
i-na-ša li-il-lu u$_3$ te$_4$-em-šu ma-⸢aq⸣-[t]u
Lugal ša x-x-am
ir-x-x u$_2$-ul ib-ši

لێواری خوارووی تابلێتەکە

15-i-na-an-na šum-xx ma
ki-ma ša ta-aš-pu-ra-a[m]
⸢te⸣-le-i
[še-e]m-[k]a aš i-ma-al-lu-⸢u$_2$⸣
⸢a⸣-na lugal šu-ku-un-ma
20- ma-a-tam a-na b[i-i]r-ti-ša te-er
šum-ma la b[e$_2$-r]i-i
[x]-ni-tam a-na ⸢še-a⸣-di iti-1-kam
a-[ša]-ri-[iš$_7$] a-na i-me-ru-tim
ib-ba-aš-šu-u$_2$ qa-du-um-um-ma-n[a]-tim

لێواری خوارووی تابلێتەکە

15-i-na-an-na šum-xx ma
ki-ma ša ta-aš-pu-ra-a[m]
⸢te⸣-le-i
[še-e]m-[k]a aš i-ma-al-lu-⸢u$_2$⸣
⸢a⸣-na lugal šu-ku-un-ma
20- ma-a-tam a-na b[i-i]r-ti-ša te-er
šum-ma la b[e$_2$-r]i-i
[x]-ni-tam a-na ⸢še-a⸣-di iti-1-kam
a-[ša]-ri-[iš$_7$] a-na i-me-ru-tim
ib-ba-aš-šu-u$_2$ qa-du-um-um-ma-n[a]-tim
25- ⸢a⸣-na ma-a-tim ša-a-ti
⸢e⸣-el-l[e-e]m a[t]-ta
a-na pa-ni-ia ⸢ta⸣-la-kam-ma
it-ti-ka lu$_2$-tur
ta-ra-de-em

**بەکوواری بڵێ: پاشات ئەوها (دەڵێ):**

من گوێ بیستی نامەکە بووم کە بومت ناردبوو هەموو ئەو شتانەی کە تو بو منت نووسیوە ڕاستە، قسەی یاشوب -ئەددو شێتانەیە! هێزی خوداوەندەکەی سەر ئەو، ئەو قسەکانی نادرووستە. ئەو نازانێ کە ئەو قسانەی کردووە، و ئەو نازانێ کە ئەو سوێند دەخوا و پەیمان دەدا، و ئەگەر ئەو پەیمان بدات و سوێند بخوات لە خەوندا، ئەو (ئەوە) نازانێ، ئەو شێتە،و قسەکانشی نادرووستە! پاشای ئاوا........هەرگیز هەبووە! ئێستا ئەگەر تو بتوانی ئەوەی بو منت نووسیوە بەرێوەی ببەی،لەو کاتەدا شوێنەکەت بکە بە جو، و ئەوان وەبەرهێنان بخە، و بو پاشایان بگوازەوە، و قەلاک[ان] بو وڵاتەکە دەگەرێندرێنەوە، ئەگەر (وڵاتەکەم) برسی نەبێ،...لە میانەی ئەو مانگەدا بتوانن سود وەرگرن لە بەرفراوان کردنی کێڵگەکە، لەگەڵ ئەمەش دا من لەگەڵ هێزەکانم دێمە سەر ئەم وڵاتە، تو وەرەو پەیوەندیم پێوە بکە،و لەگەڵ خوشت دا لایەنگرەکانت بهێنە.

**شیکردنەوەی تێکستەکە:**

ئەم نامەیەش لە (شەمشی-ئەددەد) وە بو (کوواری) نێردراوە، باس لە وە دەکات کە ئایا ئەو قسانەی (کوواری) کە بو (شەمشی-ئەددەد) ی ناردووە ڕاستە، کە ئەم قسانە دەربارەی (یاشوب-ئەددو) ی پاشای (ئەخازوم) بوون، پێی وایە ئەگەر ئەو قسانە ڕاستنین، ئەوا (یاشوب-ئەدو) شێتە، ئەمەش ئەمەمان بو دەردەخات کە (یاشوب-ئەددو) شتێکی زور نابەجێی کردووە، پێی وایە کە ئەو لە خەو دا سوێند دەخوات و پەیمان دەدات، هوکاری ئەمەش ڕەنگە بو ئەوە بگەڕێتەوە کە بەبەر دەوامی پەیمان دەداو سوێندیش دەخوات بەڵام پەیمان و سوێندەکان دەشکێنێ.

سەرەڕای ئەوەی کە قسەکانی بەشێتانە داناوە لە هەمان کاتدا بە دروزنیشی وەسف کردووە.

لەگەڵ ئەوەدا باس لەوە دەکات ئەگەر ئەو شتەی (کوواری) بو (شەمشی -ئەددەد) ی نووسیوە بەرێوەی ببات ئەوە کارێکی زور باش دەبێ، کارەکەش بریتی بووە لە بەرفراوان کردنی کێڵگەکان و زیادکرنی بەرهەمی جو و وەگەڕخستنی خەڵک بو وەبەرهەم هێنان، و گواستنەوەیان بو پاشا، قەڵاکانش بووڵاتەکە دەگەڕێندرێنەوە، خەڵکەکەش برسی نەبێ، ئەوا (شەمشی-ئەددەد) لەگەڵ هێزەکەی دێت بو داگیرکردنی (ئەخازوم)، داوا لە(کوواری)ش دەکات لەگەڵ لایەنگرەکانی بێتە ئەو وڵاتە.

هوکاری گرنگی دانی (شامشی - ئەددەد) بە دانەوێڵەو جو بو ئەوە دەگەڕێتەوە، ئەگەر (کوواری) نەتوانێ جوی بو دابین بکات ئەوا ئەویش ناتوانێ هێرشی سەربازی دژی (ئەخازوم) ئەنجام بدات، بەمەش لەوانەیە (شوشەڕڕا) بکەوێتە ژێر مەترسی ئەخازومییەکان، لێرەش دا ئەوەمان بو دەردەکەوێ کە ئاشوریەکان بو دابین کردنی دانەوێڵە بو سوپاکەیان، پشتیان بە وڵاتی (شوشەڕڕا) بەستووە.

## تابلێتی پێنجەم

### ڕووی تابلێتەکە









ڕووی تابلێتەکە

1- a-na-ku-wa-ri
qi$_2$-bi$_2$-ma
um-ma lugal-[(   )]-⸢x⸣-ma
tup-pa-ka ša tu-ša-b[i-la]m eš-me
5- mi-im-ma te$_4$-em-ka an-ni-⸢e⸣-e[m]
ku-ši-⸢ia⸣
u$_2$-ul-id[x x] -bu-ba-am
sa$_3$-a-ar ša le-qe$_2$-šu-ma
i-pu-uš
10- u$_3$ te$_4$-em-ka ma-ah-ri-ia
u$_2$-ul iš-ku-un
i-na-an-na a-na ma-a-at ah-[z]i-[i]m$^{ki}$

لێواری خوارەوەی تابلێتەکە

e-li-ti-im

پشتەوەی تابلێتەکە

a-[š]a-ap-pa-ra-kum-ma
15- a-na se-ri-ia
ta-la-kam-ma
[i]t-ti-ia ta-na-am-ma-ar
u$_3$ te$_4$-ma-am ga-am-ra-am
ma-ah-ri-ka a-ša-ak-ka-an

**بەکوواری بڵێ: پاشات ئەوها (دەڵێ):**

من گوێ بیستی نامەکەت بووم کە بو منت ناردبوو، کوشییا هیچ شتێکی ئەم نامەیەی توی پێ گەییود، ئەو دروزنە! ئەو درو دەکات بە مەبەستی وەرگرتنی ئەود، بەڵام ئەو لە پێش منەود نامەکەی توی بە دەست ناگات، ئێستا من دەبێ ئەودت پێ بڵێم کە بێ یە سەر(وڵاتی) ئەخ[ا ]زوم، و وەرە بو لام، و لەگەڵ من دا کوببەوە، و من دەبێ ڕێنماییەکانت بە تەواوی پێ بدەم.

**شیکردنەوەی تێکستەکە:**

لەم نامەیەدا ئەوەمان بو دەردەکەوێ کە (شەمشی-ئەدەد) باوەڕی بە تەتەرەکەی نەبووە کە (کوشییا) بووە، بە دروزن وەسفی دەکات، و پێی وایە بو وەرگرتنی زانیاری درو دەکات، بەڵام (کوواری) ی لەوە دڵنیا کردوتەوە کە تەتەرەکە لە پێش (شەمشی-ئەدەد) نامەکەی (کوواری) ی بەدەست ناگات، داوا لە (کوواری) دەکات کە بێتە سەر (ئەخازوم) بو ئەوەی لەگەڵی کو ببێتەوە و ڕێنمایەکانیشی پێ بدات، ئەمەش دووبارە باوەڕ نەبوونی بە تەتەرەکەی نیشان دەدات، لە وانەیە هوکاری گرتنی (کوشییا) کە لە تێکستی(١و٢) ئاماژەمان پێدا، بو ئەوە بگەڕێتەوە کە زانیاری نێوان (کوواری و شەمشی-ئەدەد)ی بە دوژمنانیان دابێ.

## تابلێتی شەشەم

### ڕووی تابلێتەکە









ڕووی تابلێتەکە

1- a-na-ku-wa-ri
qi$_2$-bi$_2$-ma
um-ma be-el-ka-a-ma
tup-pa-ti-ka ša tu-ša-bi-lam eš-me
5- li-da-e
il-li-kam-ma it-ti-ia
in-na-me-er
a-di sa-ba-at nu-ur$_2$-ru-gi-im$^{ki}$
ma-ah-ri-ia-ma wa-ši-ib
10-iš-tu nu-ur$_2$-ru-gu-um$^{ki}$

لێواری خوارووی تابلێتەکە

it-ta-as-ba-tu
[it-ti] sa-bi-im-ma
[a-na] ma-a-at a-ah-zi-im$^{ki}$

پشتەوەی تابلێتەکە

i-la-kam
15- u$_3$ $^{giš}$di-ma-a-ti
a-na za-as-li-im$^{ki}$
lu-u$_2$ šu-ru-du
ak-ki-ma re-eš sa-bi-im
u$_2$-ka-al-lu
20- i-na u$_4$-mi-šu-[m]a
i-nu-ma [nu-ur$_2$-ru-gu-u]m$^{ki}$
[ittasbattu.......]

2.1 دێڕشکاوە

### بەکوواری: گەورەت ئەوها (دەڵێ):

من گوێ بیستی نامەکانت بووم کە بومنت ناردبوون، لیدایا هاتەئێرە، و لەگەڵ من کوبووەوە، لەکاتی داگیرکردنی نوروگوم ئەو لەپێش منەوە لەوێیە ،ئەگەر نوروگوم داگیر کرابوو، ئەو لەگەڵ هێزەکەی دا دێت بو وڵاتی ئەخازوم، و پێویستیشە قەڵاکان ی سەر ڕووبار لە خوارووی ژاژلوم گەمارو بدرێن، ئەمانە بو هێزەکە ئامادەبکەن، لەو کات [ نوروگوم داگیرکراوە...].

شیکردنەوەی تێکستەکە:

لەم نامەیەدا (شەمشی-ئەدەد) (کوواری) دڵنیا دەکاتەوە لەوەی کەسەرجەم ئەو نامانەی بوی ناردووە بە دەستی گەیشتوون، وە تەئکید لەوە دەکاتەوە کە (لیدایا:پاشایەکی گوتییە!)ی لە گەڵدایە، بو داگیرکردنی شاری (نوروگوم) لە سەر ڕووباری دیجلە لە باکوری شاری(نەینەوا)ئەگەر(نوروگوم)یش داگیرکرابوو ئەوا (لیدایا) بە خویو هێزەکەیەوە دێت بو داگیر کردنی (ئەخازوم)، (لیدایا) یەکێ لە پیاوماقوڵ و بە دەسەڵاتەکانی ناوچەی ڕوژهەڵاتی ڕووباری (دیجلە) بووە،

لە داگیرکاریدا یارمەتی (شەمشی- ئەدەد)ی داوە.
لە بەشێکی تری نامەکەدا داوا لە (کوواری) دەکات قەڵاکانی سەر رووبار لە خوارووی(ژاژلوم) داگیربکات وبۆ هێزەکەیان ئامادە بکات لەدوای داگیرکردنی (نوروگوم)، رەنگە ئەمەشی بو ئەوە بوبێ تا هێزەکانی بو ماوەیەک پشوی تێدا بدەن و خویان ئامادە بکەن بو گەمارودانی (ئەخازوم) و هەروەها لە (شوشەررا) ش نزیک بوبێ چونکە کاتێ لە تێکستی یەکەم دا (شەمشی-ئەدەد) رێگای گەڕانەوە بو تەتەرەکەی دیاریدەکات یەکەم وێستگەی رێگاکەی لە(ژاژلوم)ەوە دەست پێ دەکات لەبەر ئەوە دەبێ شاری (ژاژلوم) کەوتبێتە خوارووی شاری (شوشەررا) لە سەر کەناری رووباری زاب (زێی بچوک) پێش ئەوەی رووبارەکە بێتە ناو دەشتی کویە، بەڵام ئەگەر ئێمە وڵاتی (ئەخازوم) بەناوچەکانی دەوروبەری (تەق تەق)بزانین و شاری (نوروگوم)یش بکەوێتەبەشی سەرووی رووباری (دیجلە)، ئەوا هێزەکانی (شەمشی -ئەدەد) چون توانیان بگەنە سەرووی وڵاتی (ئەخازوم)؟ رەنگە گەیشتنە ئەم ناوچەیە تاکە رێگا کە بەکاریان هێنابێ دولّی (هەنارە) بوبێ کە بە دەربەندی (گومەسپان)دا راستەوخو گەیشتونەتە سەر (زێی بچووک) لە ناوچەی حەوزی (دوکان) کە بەم رێرەوە راستەوخو لە دیجلەوە بە زێی گەورەدا دەگەنە دولّەکەو لە وێشەوە بو سەر زێی بچووک، بێ گومان ئەم رێرەوە شوێنێکی لە بار بووە بو لەشکرکێشی، لە سەردەمی ئاشوری نوێشدا ئەم رێرەودیان بو لەشکرکێشی بەکارهێناوە، بەمەش رەنگە بتوانین شوێنی شاری (ژاژلوم) بەشوێنێکی لە نزیک شاروچکەی (دوکان) ی ئێستا لە ژێر دەریاچە کە دیاری بکەین، یان لەوانەیە خودی شارەکە بکەوێتە سەریەکێ لەم رووبارانە وەک رووباری (قەشان) لە دولّی (بالیسان)، یان رووباری دولّی (هیران)، هوکاری ئەم ئەگەرەشمان بو تێکستی یەکەم دەگەرێتەوە چونکە (شەمشی-ئەدەد) داوای کردووە تەتەرەکەی بەرەو باکوری خورئاوا بەرێ بکەوێ کە یەکەم وێستگەشی شاری (ژاژلوم) بووە.

تابلێتی حەفتەم
رووی تابلێتەکە






**رووی تابلێتەکە**

1-⸢a⸣-na ku-wa-ri
qi$_{2}$-bi$_{2}$-ma
um-ma be-el-ka-a-ma
tup-pa-ti-ka ša tu-ša-bi-[la]m eš-m[e]
2- a[š-š]um li-da-e ta-aš-p[u-ra-am]
u[m]-ma at-ta-a-ma
a-⸢šar⸣ šu-šu-b[i-i]m be-li$_{2}$ l[i-iš-pu-ra-am]
an-ni-tam ta-aš-pu-ra-[am]
[xxx]ša a-na ši-i[k-ša]-bi-[im$^{ki}$]

**پشتەوەی تابلێتەکە**

(دوو) دێرشکاوە
[........]⸢sa⸣-bi-i[m........]
[ša-at-ta$_{3}$-ar]-⸢da⸣-[kum]
⸢xxx⸣-ka[............]
15-⸢a⸣-di te$_{3}$-em ši-⸢ik⸣-ša-[bi-im$^{ki}$]
in-ne-ep-pe$_{2}$-[šu]
⸢i-na⸣ ma-tim ša-a-[ti-li-ši-ib]
[xx]⸢xx⸣-a i-⸢x⸣[......]
[.......]⸢x⸣[.............]

**بە کوواری بڵێ: گەورەت ئەوها (دەڵێ):**

من گوێبیستی نامەکەت بووم کە بو منت ناردبوون، تو دەربارەی لیدایا بەم شێوەیەت نووسی وە (پێویستە گەورەم بوم بنوسی(ئەو)لە کوێ دادەنیشێ)، ئەمەی تو بو منت نووسـیـوە[..............] کێ [لەناو] شیکشابومە[........ چەند دێرێک شکاوە] پلانەکە شیکشابوم و دەردوەشی لە خو گرتووە،[ ئەو بەجێ دەمێنێ و دەمێنێتەوە ] لە وڵاتەدا [......... دوو دێرشکاوە].

شیکردنەوەی تێکستەکە:

بە هەمان شێوەی نامەی پێشوتر(کوواری)ی دڵنیا کردۆتەوە لە گەیشتنی ئەو نامانەی کە بۆ (شەمشی-ئەدەد)ی ناردوون،تێیدا پرسیار لە گەورەکەی دەکات سەبارەت بە شوێنی نیشتەجێ بوونی (لیدایا) وا دیارە(کوواری)شوێنی (لیدایا)ی نەزانیوە و تامەزروی ئەوە بووە کە شوێنەکەی بزانێ.

لەدواییدا (شەمشی -ئەدەد) پرسیا لە (کوواری) دەکات سەبارەت بەوەی بزانێ کە کێ لە ناو شاری (شیکشابوم)ە، دیارە مەبەستەکەی ئەوە بووە بزانێ نەیارانی لەو شارەدا کێن، باس لەوە دەکات کە ئەم پلانەی هەیەتی تەنیا (شیکشابوم) ناگرێتەوە بەڵکو دەرەوەی ئەم شارەش دەگرێتەوە، و باس لە کەسێ دەکات کە لە (شیکشابوم) ماوەتەوە واپێ دەچێت ئەو کەسە (لیدایا) بووبێ، ئەگەر ئەمەش ڕاست بێ ئەوا بەمانای ئەوەی کە(لیدایا) ناپاکی لەگەڵ کردوون.

**تابلێتی هەشتەم**
**رووی تابلێتەکە**

رووی تابلێتەکە

1-a-na ku-wa-ri
qi$_2$-bi$_2$-ma
um-ma be-el-ka-a-am
dumu ši-ip-ri ša qu$_2$-ti-i
5-ša i-na ši-ik-ša-am-bi-im$^{ki}$ wa-aš-bu
a-na se-ri-ia il-li-kam-ma
ki-a-am iq-be$_2$-em um-ma-mi
lu$_2$ qu$_2$-tu-u$_2$-ma en-du-uš-še
ki-a-am iq-be$_2$-em um-ma-mi
10-šum-ma sa-bu-um ša $^{d}$utu-ši-$^{d}$im a-bi-ia
a-na ši-ik-ša-am-bi-im$^{ki}$ is-sa$_3$-an-qa-am
$^{giš}$tukul-ha$_2$ la te-ep-pe$_2$-ša ma-ti-ma a-na a-bi-ia u:
šum-ma wa-sa-am iq-ta-bu-ni-ik-ku-nu-ši-im
si-e šum-ma iq-ta-bu-ni-ku-nu-ši-im-ši-ba
15-an-ni-tam iq-be$_2$-im
a-wa-tu-šu-nu ki-na u$_3$ sa$_3$-ar-ra
ma-an-nu-um lu-u$_2$ i-di
pi$_2$-qa-at te$_4$-em a-lim$^{ki}$ i-mu-ru-ma
it-ti ra-ma-ni-šu-nu-ma

لێواری خوارووی تابلێتەکە

20- a-wa-tim an-ne$_2$-tim uš-ta-as-bi-tu
u$_2$-lu-ma ul-la-nu-um-ma
wa-u$_2$-ru ma-an-nu-um lu-u$_2$ i-di

پشتەوەی تابلێتەکە

u$_3$-aš-ta-al-šu-ma
it-ta-tim ša šu-ut ir$_3$-lugal
25- id-bu-ba-am še-we-ra-am
hu-ul-lam ša a-na mu-tu-šu
dumu ši-ip-ri ad-di-nu a-na it-ti iq-be$_2$-em
u$_3$ ta-ap-pe$_2$-e mu-tu-šu
e-te-el-li-ni i-na ar-ra-ap-hi-im$^{ki}$
30-im-ra-as u$_3$ mu-ru-us-$^{⌈}$su$_2$$^{⌉}$
ša a-wi-lim ša-a-ti iq-be$_2$-em-ma
it-ta-tim ka-la-ši-na id-bu-ba-am
ik-ke-em a-wa-su$_2$-nu a-qi$_2$-ip
u$_3$ aš-šum te$_4$-em ir$_3$-lugal

35- aš$_2$-ta-al-šu-ma
um-ma-a-mi te$_4$-em-šu en-du-uš-še im-hu-ur
um-ma-mi a-na pa-at šu-šar-ra-a$^{ki}$
i-na ma-tim ša qa-at a-bi-ia ša-ak-na-at
u$_2$-ul e-te$_4$-eh-he
40-an-ni-tam iq-be$_2$-em ir$_3$-lugal
te$_4$-ma-am ša ha-di-im ub-ba-lam

لێواری سەرووی تابلێتەکە

an-ni-tamlu-u$_2$ ti-di

**بەكوواری بلێ: گەورەت ئەوها دەڵێ:**

نوێنەری گوتییەكان لە شیكشابوم، هاتوتە لای من، ئەوەی پێ وتم: فەرمانڕەوای گوتییەكان،(یندوشێ)، ئەوەی بە من گوت: ئەگەر هێزەكەی شەمشی-ئەدەد باوكم، لە شیكشابوم نزیک بوونەوە، شەڕ ڕونادات! من هەرگیز هەڵە دژ بە باوكم ناكەم، ئەگەر ئەو داوای لێ كردی لەسنور دوور بكەویتەوە، (ئەوكات)لەسنور دووربكەوە! ئەگەر ئەو داوای لێ كردی بێنیەوە، (ئەوكات) بێنەوە! ئەمەی ئەو پێی ووتی.

كێ دەزانێ قسەكانی ئەوان ڕاستە یان نا (هەڵەیە)؟ لەوانەیە ئەوان لە شوێنی شاروچكەكە بینرابن، خودی خویان ئەمەیان دروست كردووە، یان ئەوان فەرمانەكانیان لە دەرەوە پێ دراوە، كێ دەزانێ؟ من پرسیارم لێ كرد، ئەو زانیاری دا بە من دەربارەی لایەنگرانی (واراد-شاریم)، من ئەو حەلقەیەی(خولوم)دابوو بە (موتوشو)ی تەتەر، ئەو وەک نیشانەیەک بو منی باس كرد، و هاوڕێی(موتوشو) یتلینی،نەخوش كەوتووە لە ئاراپخا، ئەو دەربارەی نەخوشیەكەی ئەم پیاوە پێی وتم، ئەو هەموو نیشانەكانی بو ڕون كردمەوە، من بروام بەنامەكەی ئەو كرد، و پرسیارم لێ كرد دەربارەی دەنگوباسی(واراد-شاریم)، ئەو ووتی:ئەو نامەی یندوشێی پێ داوە وەک ئەوەی هاتووە: سنوری وڵاتی شوشەڕرا لە ژێر كونترۆڵی باوكمە من لێی نزیک نابمەوە! ئەو ئەمەی پێ وتم، واراد-شاریم دەنگوباسی باشم بو دێنێ، ئەمە بزانە.

**شیكردنەوەی تێكستەكە:**

لەم نامەیەدا (شەمشی -ئەدەد) بو كوواری باس لە بارودوخی گوتییەكان دەكات، بەجوری كە نوێنەری پاشای گوتی (یندوشێ) لە شاری (شیكشابوم)، هاتوتە لای (شەمشی-ئەدەد) هەواڵی پاشاكەی پێ ڕاگەیاندووە كە بە گوێرەی ئەم نامەیە(ئیندوشێ)ی پاشای گوتی (شەمشی-ئەدەد) ی پاشای (ئاشوری) بە باوكی خوی داناوە، و دەڵێ هەركاتێ هێزەكانی (ئاشور) لە (شیكشابوم) نزیک كەوتنەوە ئەوا هێزەكانی گوتی شەڕ لەگەڵ (شەمشی-ئەدەد) ناكەن، و هەرچییەک داوا بكات (شەمشی -ئەدەد) ئەوا ئەوان جێبەجێی دەكەن، بەڵام لەهەمان كاتدا (شەمشی-ئەدەد) بڕوای بە قسەكانی نوێنەری پاشای (گوتی) نەبووە، بە جورێ پێی وایە كە ئەو درو دەكات و فەرمانەكانیش لە دەرەوە وەردەگرن هەر لە بەر ئەمە چەند جارێ پرسیاری لە (كوواری) كردووە سەبارەت بەوەی كە قسەكانیان ڕاستن یان نا.

بەڵام لە هەمان كات دا باس لەوە دەكات كاتێ پرسیاری لێ كردووە سەبارەت بە پشتیوانی (وارد-شاریم) زانیاری بە (شەمشی-ئەدەد) داوە لەم بارەیەوە، وا دیارە (شەمشی -ئەدەد) ویستویەتی زانیاری لە سەر (وارد-شاریم) كوبكاتەوە، و باس لەوە دەكات كە(شەمشی -ئەدەد)حەڵقەیەكی وەک نیشانە داوە بە (موتوشو) ی تەتەر ئەم حەڵقەیەی ناسیوەتەوە و بوی باس كردووە، ئەمەش تا ڕادەیەک ڕەنگە وای لە (شەمشی-ئەدەد) كردبێ، بڕوای بە قسەكانی نوێنەری پاشای گوتی هەبێ، هەروەها باس لەوە دەكات (ئیندوشێ) ی پاشای (گوتی) ویستویەتی هێرش بكاتە سەر شاری (شوشەڕرا) بەڵام لەبەر ئەوەی ئەم شارە لەژێر كۆنترۆڵی (شەمشی-ئەدەد) دایە هەرگیز لەسنووری ئەم شارە نزیک نابێتەوە، هەروەها (شەمشی- ئەدەد) باس لەوە دەكات كە گوایە (وارد- شارم)زانیاری پێ دەدات، ئەمەش وەک ئاگاداركردنەوە یەک پێی ڕاگەیاندووە، و باس لەوە دەكات كە هاوڕێی (موتوشو، یتلینی) لە شاری (ئاراپخا) نەخوش كەوتووە، سەرجەم نیشانەكانی نەخوشیەكەی ئەو پیاوەی بو باس كردووە.

بەڵام هەروەک (شەمشی-ئەدەد) بڕوانەبوونی خۆی بەنوێنەری گوتییەكان باس كردووە، بەهەڵەدا نەچووە چونكە گوتییەكان بەبەردەوامی یارمەتی (ئەخازومیان) داوە دژ بە (ئاشورییەكان)، ئەو قسانەی كە بە(شەمشی-ئەدەد)یشیان وتووە تەنیا خەڵەتاندن بووە هەروەک خودی (شەمشی-ئەدەد) یش ئاماژەی پێ كردووە، چونكە لەو شەڕەی لە نیوان (ئاشورییەكان و ئەخازومییەكان) ڕوویداوە (گوتییەكان) دەورێكی سەرەكییان تێدا گێڕاوە لە پشتیوانی وڵاتی (ئەخازوم) هەروەک لە تێكستەكانیش ئەمە بە ڕونی دەردەكەوێ.

## تابلێتی نۆیەم
## رووی تابلێتەکە





### بەکوواری بلی: گەورەت ئەوها دەڵێ:

پێش ئەوەی تو برووی من بڕیاردکەم پێ ووتی – من ئەو فەرمانەم پێ کردی: ئەگەر شیکشابوم داگیر کرابوو، لەو کاتەدا وەرە لام بۆ ئاراپخا، ئەگەر شیکشابوم یش داگیرنەکرابوو، تو لە سەربازگەیەک لە دەردوەی شیکشابوم بمێنەوە دەتوانی بڕیاربدەی و بەرێ بکەوی بو شوشەڕرا بە مەبەستی فەمانڕەوای(و فەرمان رەوایی بکە)، لە ناوچەی شوشەڕرا سەرباز وەرگرەو لەگەڵ خوتدا بۆمیان بهێنە!.

من ئەم فەرمانەم پێ کردی، ئەو فەرمانە! (ئێستا) کاردکە هاو تەریبە لەگەڵ ئەو فەرمانەی پێم کردبووی!



رووی تابلێتەکە

1-a-na ku-wa-ri
qi$_2$-bi$_2$-ma
um-ma be-el-ka-a-am
i-na pa-an wa-se$_2$-e-ka pu-ru-us-sa$_3$-am
5- ad-di-na-kum ki-a-am u$_2$-wa-e-er-ka
um-ma a-na-ku-ma šum-ma ši-ik-ša-ab-bu-um$^{ki}$
it-ta-⸢as⸣-ba-at a-na ar-ra-ap-hi-im$^{ki}$
a-na pa-ni-ia al-kam
šum-[m]a ši-ik-ša-ab-bu-um$^{ki}$ la is-sa-bi-it
10- sa-ba-am bi-ir-tam a-na i-ta-at ši-ik-ša-bi-im$^{ki}$
li-ru-ub-ma at-ta ki-ma pa-ni-ka-ma a-na
šu-ša[r-r]a-a$^{ki}$ a-lik-ma lu$_2$ mu-ki-il [š]u-šar-[r]a-a$^{ki}$
wu-e-[e]r-ma sa-ab-ha al-la-as šu-šar-ra-⸢a⸣ $^{ki}$
it-ti-ka tu-ra-am-ma a-na se-r[i-ia-a]l-kam
15- a[n-n]i-tam u$_2$-wa-e-er-ka wu-u$_2$-ur-tum ši-m[a]
ša pi$_2$-i wu-u$_2$-ur-tim ša u$_2$-wa-e-ru-ka e-p[u-u]š
⸢šum-ma⸣ [ši-i]k-[š]a-am-bu-um$^{ki}$ it-ta-a[s]-ba-a[t]-ma
⸢a⸣-na [m]a-⸢a⸣-[a]t šu-šar-ra-a$^{ki}$ ta-at-ta-la-ak
[a]-di a-na se-ri-ia ta-tu-ra-am
20- [te$_4$-ma-a]m ma-la ta-la-am-ma-du
[a-na-se]-ri-ia ši-ta-ap-pa-ra-a[m]
[šum-ma la-a] ki-a-am-ma a[n-n]i-ki-a-am wa-aš-ba-at
[lu$_2$ mu-ki-i]l šu-šar-r[a-a$^{ki}$] sa-ba-am ša ma-tim e-li-tim

لێواری خوارووی تابلێتەکە

[a-na se]-ri-ia i-š[a-ap-p]a-ra-am-ma
25- [u$_3$ at-ta] ⸢a⸣-n[a-s]e-r[i-i]a ⸢ši⸣-tap-pa-ra-am-ma
[lu-u$_2$] i-di

پشتەوەی تابلێتەکە

[ša]-ni-t[am] a[š-š]um [a-na] lu$_2$ lu-ul-li-im$^{ki}$
[n]a-pi$_2$-iš-ti-ia la-pa-tim
[ša-t]a-aq-be$_2$-[e]m qa-ta-a-ia
30-[u$_2$-u]l me-se-e-ma me-es$_3$-ki-nam
[at-ru]da-ma ⸢u$_2$-ul⸣ u$_2$-ša-az$_2$-ki-ru-šu nu-ši-im
[as-s]u$_2$-[u]r-ri i-na li-ib-bi-šu-nu mi-i[m]-ma i-qa-ab-bu-[u$_2$]
[šu]-⸢pu-ur⸣ lu$_2$-me[š] re-qu-ti-šu-⸢nu⸣ li-il-li-ku-nim-ma
[u ni-i]š dingir-meš [l]u-uz-[k]u-ur-[š]u-nu-ši-im
35-[u$_2$-l]u a-na-ku an-[na]-n[u-u]m ir$_3$-di-ia ⸢lu⸣-uš$_2$-pu-ur-ma
[u$_3$ ni]-iš dingir-meš li-sa-az$_2$-ki-ru-šu-nu-ti

ئەگەر شیکشابووم داگیر کرابوو تو برِو بو ولاَتی شوشەڕڕا، لەو کاتەدا تو زور بەوریایەوە سەرجەم زانیاریە نوسراوەکانم بو بگێرِەوە و توش بگەرِێوە بو لای من، [ ئەگەرنا] تو هەر لەوێ بمێنەوە، بمێنەوە [بە فـەرمـان ڕەوا]ی شـوشـارا و سـەربازەکـانیـشم بو بنێرە ولاَتی سەروو، [و تو] ئاگـادار دەکەمەوە کە ئەوەم زور بەپارێزەوە بو بنووسە.

دووەمـیـان دەربارەی هێـرش کـردنە بو سـەر فـەرمـانڕەوای (لولللومـە ) کـە تو دەربارەی ئەو، ئەوهات بە من وتبـوو: لە ژێر دەسـەلاَتی مندا نەمـابوو، [من ناردم] مـیـسـکینوم، و ئەوان دەیانویست کـە نەمـێنەوە [ئەو] سوێندیان بو دەخوات. من لەوان ترسم هەیە و بە [خراپی] دەربارەی ئەمە بیر دەکەمەوە. [پێیان بلّی ] کە ئەو پیاوانە بێنە لای من و من دەست بەتالّم (هیچ پیـاوم نیـیـە) و ئەتوانم بەلّێنیان پێ بدەم و سوێندشیان بو بخوم، یان من لێرەوە خزمەتکارەکان دەنێرم، و ئەوان دەتوانن بە لّێن بدەن و سوێندیش بخون.

شیکردنەوەی تێکستەکە:

ئەم نامە یە لە ئانوسـاتی داگیـرکردنی (شـیـکشـابوم) نوسـراوە، چونکە (شـەمشـی- ئەدەد ) بە (کـوواری) دەلّێ ئەگەر شیکشابووم داگیرکرابوو وەرە لام بۆ ئاراپخا ئەگەر داگیریش نەکرابوو لە سەربازگەیەک لە دەرەوەی شیکشابوم بمێـنـەوە )وادیـارە پـێـش ئـەوەی(کـــــوواری)بـەرِێ بکەوێ(شەمشی -ئەدەد ) ئەو کاردی پێویست بوو بیکات پێی راگەیاندووە، دیارە داوای لێدەکات کاتێ (کوواری) دێتە لای سەرباز لەگەلّ خویدا بهێنێت، لە لایەکی تریشەوە داوای لێ دەکات،سەرجەم ئەو زانیاریانەی کە پێشوتر بوی نووسیوە زور بە وریاییەوە بوی بگێرِێتەوە، هەروەها داوای لێ دەکات ئەگەر شیکشابوم داگیر کرابوو ئەوا بگەرِێتەوە بو (شـوشـەرِرا) و فـەرمـانرِەوایی بکات، ئەمـەش ئەوە دەگەیێنێ کە (شەمشی- ئەدەد ) تەنیا پێویستی بەوە بووە کە(کـوواری) سـەربازی بو بنێرێ، و زانیـاریەکـانیـشی بو بگێـرِێتـەوە ئەمـەش ئەوە دەردەخـات کـە ئەم زانیـایانە زور گرنگ بوون بەلاَیەوە.

بەلاَم هوکاری داوا کردنی سەرباز لە (کوواری) ئەوەمان بو دەر دەخات، کە (شەمشی-ئەدەد ) بەنیـازی هێرشێکی تری سـەربازی بووە لە دوای داگیـرکردنی (شیکشابوم)، کە ئەویش دژ بە(لوللوبیـەکـان) بووە، لە کـاتێـک دا ئەم (لوللوبیـانە ) هاریکاری (شـامشی -ئەدەد )یان کـردووە لە داگیـرکردنی (شیـکشـابووم) هەروەک لە تێکستـەکـان دا دەردەکەوێ بەلاَم لە دوایدا (شەمشی-ئەدەد ) هەولّیداوە بو لە ناوبردنیان، ئەمەش ئەمەمان بو دەردەخات کە (شەمشی -ئەدەد ) یەک لە دوای یەک هەولّیـداوە بە مـەبەسـتی لە ناوبردنی چیا نشینانی زاگروس و چەسپاندنی دەسـەلاَتی بەسەر ناوچەکەدا، و لە دژی یەکـتریش بەکـاری هێناون، و داوای کردووە کە پیاوی بو بنێرێ بە مەبەستی هێنانی ئەو پیـاوانەش (توروکی) بوون. بە مـەبەسـتی بە هێـزکـرنی سوپاکەی.

**تابلێتی دەیەم**
**رووی تابلێتەکە**




روو‌ی تابلێتەکە

1- a-na ku-wa-ri
qi$_2$-bi$_2$-ma
um-ma be-el-ka-a-ma
aš-šum lu$_2$-meš tu-ru-ki-i$^{ki}$
5- ša qa-du-um ni-⸢ši⸣-šu-nu a-na se-ri-ia
ta-at-ru-dam [ma-l]a lu$_2$-meš tu-ru-ki-i$^{ki}$
qa-du-um ni-[ši-šu-n]u ta-at-ru-dam-ma
⸢a⸣-[......u$_2$-ul] i-ma-as-su$_2$-u$_2$
te$_4$-[em-šu-nu aš-ta-al-m]a ki-a-am iq-bu-nim um-ma-a-mi
10- i-n[a mu-ši-im u$_3$] na-ap-za-ri-im
še-p[e$_2$-ni] ma-ar-sa
u$_3$ sa-bu-um ša a-na ši-ik-ša-bi-[i]m$^{ki}$
ip-zi-ru-ma i-ru-bu ma-li-ni-m[a] ⸢i⸣-ma-as-si$_2$
an-ni-tam iq-bu-nim
15- u$_3$ ki-a-am ta-aq-bi um-ma at-t[a]-⸢a⸣-ma
ka-ar-su$_2$-ia a-na be-li$_2$-ia ak-[lu-nim]
mi-nu-um ka-ar-su$_2$-ka
ša ak-lu-nim
i-na pa-ni-tim-ma ki-a-ma aš-pu-ra-kum
20-um-ma-a-mi lu$_2$-meš tu-ru-ki-i$^{ki}$
[š]a šu-ku-ul-šu-nu la te-le-u$_2$

لێواری خوارووی تابلێتەکە

a-na se-ri-ia tu$_2$-ur-dam-ma
an-[n]a-nu-um a[n-ni-ki]-⸢a⸣-am lu-ša-as-bi-i[s]-su$_2$-nu-ti
a[n-ni-t]am aš-pu-r[a]-kum

پشتەوەی تابلێتەکە

25-i-na-an-na [lu$_2$-meš tu-ru-ki]-i$^{ki}$
ma-la ta-ta$_3$-ra-[dam i-na m]u-š[i-im]
na-ap-za-ra-am ⸢i⸣-[la-ku-nim]
a-ša$_3$ i-na pa-ni-šu-⸢nu⸣ i-ri-⸢šu⸣-[ma]
a-na ši-ik-ša-bi-im$^{ki}$ i-te-ne$_2$-ru-b[u-nim]
30- i-ša-ri-iš ma-a a-ah na-ak-ri-n[i]
nu-ka-ab-ba-ar u$_3$ $^{giš}$sukur-šu nu-da-a[n-na-an]
aš-šum ki-a-am li-ib-bi im-ra-as
i-na-an-na ma-a-tam pu-uh-hi-ir-ma
ki-a-am qi$_2$-be$_2$-[š]u-nu-ši-im um-ma-a-mi
35-ša li-ib-ba-šu an-na-nu-um wa-ša-ba-am li-ši-ib
ša la li-ib-ba-šu an-na-nu-um la wa-ša-ba-am
a-na se-er be$_2$-li-ia li-il-li-ik
an-ni-tam qi$_2$-be$_2$-šu-nu-ši-im-ma lu$_2$-meš tu-ru-ki-i$^{ki}$
ma-la a-na se-ri-ia ta-ta-ra$_3$-dam

40- i-na mu-ši-im na-ap-za-ra-am
la i-il-la-ku-nim-1-lu-tur$_2$-ka
pa-ni-šu-nu li-i[s-ba-tam]ma
a-na ni-e[l..........li-š]a-li-ma-šu-nu-ti
iš-t[u.........]
45-⸢X⸣ [......li-ša-l]i-mu-šu-nu-ti
⸢X⸣ [..............-t]i

لێواری سەرووی تابلێتەکە

aš-šum [a-ša$_3$ i-na pa-ni-šu-nu]
la i-ri-⸢šu⸣-ma ⸢a⸣-[na ši-ik-ša-bi-im$^{ki}$]
la i-ru-bu-ma a-ah na-ak-ri-ni
50-la i-ka-ab-bi-ru u$_3$ $^{giš}$sukur-šu

لێواری چەپی تابلێتەکە

la i-da-an-ni-nu ki-⸢a⸣-am i-pu-uš
u$_3$ lu$_2$ tu-ru-ki-i$^{ki}$ ma-la a-na se-ri-ia
ta-ta$_3$-ra-dam ma-ah-ru-u$_2$-ma
i-na tup-pi$_2$-im lu-u$_2$ šu-ut-tu$_2$-ru









**بە کوواری بڵێ: گەورەت ئەوها (دەڵێ):**

دەربارەی ئەوتوروکییانەی کە لەگەڵ ئەو خەڵکانە بو منت ناردبوون: [ سەبارەت ] بە ژمارەی ئەو توروکیانەی کە تو بو منت ناردبوون لەگەڵ خەڵکەکەدا ئەوان یەکسان نین بە [.............من داوام کردبوون لەگەڵ خەڵکدا] ئەوان ئاوهایان پێ وتم: لە [شەودا بە] دزییەوە [ ئێمە بە پێیان ] توشی ماندووبوون هاتین، ئەو پیاوانەش لە رێگادا زوربەیان لە ئێمە خویان دزیەوە و چونە شیکشابوم! ئەوان ئەوەیان پێ ووتم، توش ئەوهات پێ وتم: ئەوان بوختانیان پێ هەڵبەستوم لە لەلای گەورەکەم! کێ لە وان بوختانی پێ هەڵبەستبووی! پێشوتریش ئەوهام بو نووسیبووی: ئەو توروکیانەی کەتۆیان پاراستبوو و ناتوانی بەرێوەیان ببەی، ئەوانم بۆ بنێرە، دەیان بەم و هەرلێرەش دا چاودێرییان دەکەم، ئەمەم بو نووسیبووی! ئێستا سەرجەم [ توروکییەکان ]م لەشەو بە دزیەوە بو بنێرە، و پێش ئەوەی ئەوان لەو وڵاتە بێننەوە، و ئەوان لە ناو شیکشابوم دەپارێزرێن، ئەوە راستە کە ئەوە دەبێتە هوی بەهێزبوونی شەرانگێزان، و ئەو هێزەش مەزنتر دەکات، من دەربارەی ئەمە نیگەرانبووم! ئێستا لەو وڵاتە گرد دەبنەوە، و ئەوهایان پێ دەڵێم، ئەوەی دەیەوێ دەتوانێ لێرە بێنێتەوە، ئەوەی ناشیەوێ لێرە بێنێتەوە، دەتوانێ بچێتە لای گەوردەم! ئەمەیان پێ دەڵێم، سەرجەم ئەو توروکیانەی بوٚم دەنێری، پێویست ناکا بە شەو بە دزیەوە بێن، یەکێ لە لا یەنگرەکانت بە کرێ بگرە بو هێنانی ئەوان، و[ پێدان]ی ئەوان [بەدڵنییایەوە] بو [...... ]لە کاتی[..... بە کرێ گرتنیان و پێدان ]ی ئەوان.

[..... ]بە حەزەردوە بردنییان لەو[وڵاتە و بەرەوپێشەوەبردنیان] ئەوان داوایان نەکردووە، و ئەوان لە [شیکشابوم] نین، شەرانگێزانمان بە هێز ناکەن و ئەو هێزەش مەزن ناکەن! سەرجەم ئەو توروکیانەی تو بوم دەنێری، لە یەکەمین لیست تومار کراون لە سەر تابلوکە.

شیکردنەوەی تێکستەکە:

لەم نامەیەدا (شەمشی -ئەدەد) رەخنە لە (کوواری) دەگرێ، سەبارەت بەو (توروکیانە) ی بوی رەوانە کردوون، ژمارەیان بە قەد ژمارەی داواکراوان نییە، دەڵێ ئەوان پێیان وتوم گوایا کاتێ لە (شوشەرا) وە بو (ئاشور) هاتوون لە رێگادا توشی ئازارو ماندووبوون هاتوون، لە بەر ئەمەش هەندێ لەو(توروکیانە) خویان گەیاندووەتە (شیکشابووم)و لەوێدا ماونەتەوە.

بەڵام (کوواری) ئەم قسانە بە بوختان دادەنێ کە ئەو (توروکیانە)لە لایەن گەورەکەی پێیان هەڵبەستووە،(شەمشی ئەدەد) داوای لە کوواری کردووە ئەو (توروکیانە)ی کە پێشوو تر(شوشەرایان) پاراستووە لە دوژمنان، ئێستاش ناتوانێ بەرێوەیان ببا ، بوی بنێرێتە(ئاشور)بو ئەوەی سەرپەرشتییان بکات، بەڵام وای بەچاک زانیوە کە ئەوان بە شەو بە دزیەوە بگوێزرێنەوە، بە پەلە پێش ئەوەی پەناببەنە بەر(شیکشابوم) کە بە مەش هێزدکەی ئەو وڵاتە زیاد دەکەن و مەترسی بو سەر (ئاشور) زیاد دەکەن، بەڵام (کوواری) ئەم هەڵوێستەی(توروکییەکان)ی لا سەیربووە، چونکە دەڵێ من ئەوانم سەر پشک کردووە لەوەی هەر کەسێ بیەوێ دەتوانێ لەلای من بمێنێتەوە ئەوەی ناشیەوێ دەتوانێ بڕواتە لای گەورەکەم، بەڵام (شەمشی -ئەدەد) بو ئەوەی بتوانێ رێگا لەو (توروکیانە) بگرێ کە دەچنە (شیکشابووم) داوا لە(کوواری) دەکات، ئەوان بە روژ بنێرێ و یەکێ لەلایەنگرەکانیشی بەکرێ بگرێ بو ئەوەی چاودێریان بکات.

بەڵام بەشێکی تری نامەکەدا (کوواری)باس لەوە دەکات کە ئەو (توروکییانە) لە(شیکشابوم)نین، و نابنە هوی بەهێزکردنی دوژمنان و ژمارەی سەرجەمشییان تومارکراوە لە یەکەمین لیستدا، کە ئەمەش دڵنیایی زیاتر سەبارەت بە ژمارەی (توروکیەکان) بە (شەمشی- ئەدەد) دەدات، بەڵام لەلایەکی تردوە ئەگەر بەوردی سەرنجی ناوەڕوکی تێکستەکە بدەین ئەوا ئەوەمان بۆ دەردەکەوێ کە (شیکشابوم) کەتوتە نێوان (شوشەرا و ئاشور) وە کە رەنگە لەمەش دا بە هەڵەدا نە چووبین کە شوێنی ئەم شارەمان لە دەشتی(کوبە) لە نزیک (تەق تەق)داناوە.

## تابلیتی یازدەیەم
### رووی تابلیتەکە

**بە کوواری بڵێ: گەورەت ئەوها دەڵێ:**
بەم هێزەی لەگەڵ (یتیلوم)م ناردووە بو گەمارودان، هەزار سەرباز کوبکەوە و بینێرە(ئەوان)بو ئەو (لە) شیکشابوم.

**شیکردنەوەی تێکستەکە:**
(شەمشی-ئەدەد) یەکێ لە فەرمان ڕەواکانی ژێر دەستی کە ناوی (یتیلوم) بووە ناردووە بو گەمارودانی

رووی تابلیتەکە

1- a-na ku-wa-ri
   qi2-bi2-ma
   um-ma be-el-ka-a-am
   a-nu-um-ma sa-ba-am
5- it-ti e-te-el-lim
   a-na la-we-e-ki

لێواری خوارووی تابلیتەکە

   at-ta3-ra-ad-ki

پشتەوەی تابلیتەکە

دێرێک سڕاوەتەوە
   1-li-im sa-ba-ka
10- šu-ta-as-bi-it-ma
   a-na [se-ri-šu]
   ši-ik-ša-am-bi[ki]
   tu2-ru-ud-u2

لێواری چەپی تابلیتەکە

   zi-ik-ri-eš4-tar2

(شیکشابووم) بو ئەم مەبەستەش داوای لە (کوواری) کردووە کە هەزار سەربازی بو بنێرێ بو ئەوەی یارمەتی (یتیلوم) بدات لە داگیرکردنی (شیکشابووم) دا.

## تابلیتی دوازدەیەم
### رووی تابلیتەکە



رووی تابلێتەكە

1- a-na ku-wa-ri qi$_2$-bi$_2$-ma
um-ma be-el-ka-a-ma
i-nu-ma am-ah-ri-ia tu-uš-bu ki-a-am aq-be$_2$-kum
um-⸢ma⸣ a-na-ku-ma lu$_2$ tu-ru-ku-u$_2$$^{ki}$
5- ša-⸢ki⸣-ma iš-tu-ul-la-nu-um i-la-ku-nim
ša e-mu-uq šu-ku-li-šu-nu te-le-u$_2$
ma-ah-ri-ka ki-la-ša ki-ma e-mu-uq šu-li-šu-nu
la te-le-u$_2$ a-na se-ri-ia li-ti-qu$_2$-nim
an-ni-tam aq-be$_2$-kum
10- a-na-ku a-na wa-ša-bi-šu-nu aš-ra-nu-um
u$_2$-ul ha-de-ku-u$_2$ u$_2$-ul a-al pa-ti$_3$-i
ma-a sa-bu-um ma-du-um li-ši-ib-ma
ul-la-n[u]-⸢um-ma-li⸣-ta-pa-al
⸢u$_3$⸣ i-na ⸢e⸣-mu-⸢qi$_2$-im⸣ ma-[t]am-š[a-a-t]i lu-u$_2$ he-su$_2$
15- an-ne$_2$-tim sa-ab-ta-ku
i-na-an-na sa-ba-am ša šu-ku-lam te-le-u$_2$
ma-ah-ri-ka ki-la u$_3$ ša šu-ku-lam la te-le-u$_2$
a-na se-ri-la tu$_2$-ur-dam
u-am-mi-nim ba-lum lu$_2$-tur-ka ⸢i⸣-[l]-a[k]u-nim




لێواری خوارووی تابلێتەكە

20- ⸢i⸣-na a-la-ki-šu-nu pa-ga-a[r-šu-nu]
[š]a-r[a]-qum i-ša-ar-ri-qu$_2$-nim-m[a]
[u$_2$-lu] ⸢i⸣-na qa-ab-li-it ge-er-ri
[....i-ma-š]a-hu-šu-nu-ti

پشتەوەی تابلێتەكە




[ša aš-ra-n]u-um u$_2$-ul uš-ša-bu
25- [u$_3$ iš-te-n]i-iš lu$_2$-tur-ka
[u$_2$-ul-u$_2$-š]a-al-la-ma-šu-nu-ti
[i-na bi-ri-t]im-ma i-ha-al-li-qu$_2$
[u$_2$-lu a-na ši-i]k-ša-ab-bi i-la-qu$_2$-s[u$_2$-n]u-ti-ma
[ ...............]⸢pu-ha-tim XX⸣ ha-di-i-im?
30- [u$_3$ aš-ra-nu-u]m ma-tam li-ki-lu




⸢iš-te-ni⸣-iš-ta-ta$_3$-ar-ra-dam
1-lu$_2$-tur-ka pa-ni-šu-nu li-is-ba-tam-ma
a-na se-ri-ia li-ša-al-li-ma-šu-nu-ti-ma
i-na bi-ri-tim-ma la i-ha-al-li-qu$_2$
35- šum-ma la ki-a-am-ma nu-ga-la-at-šu-nu-ti[i-m]a
⸢pa⸣-ni-šu-nu a-šar ša-ni-im u$_2$-ul i-ša-ka-nu-u$_2$
u$_2$ i-ba-aš-šu-u$_2$ ša im-hu-ru-ni-[i]n-ni$_5$
um-ma-⸢mi mu⸣-da-a[r-r]u-um-ma-mi
a-hi ma-ah-ri-šu i-n[a]-⸢an⸣-na a-nu-um-[m]a




40- be-el di-na-tim ša im-hu-ru-ni-ni$_5$
at-ta$_3$-ar-da-kum šu-še-er-šu-nu-ti
ti-ir-we-še-ni u$_3$ zi-li-ia ⸢a⸣-ha-šu
ša ta-ak-lu-u$_2$ a-na se-ri-ia tu$_2$-ur-dam
u$_3$ ša at-ru-da-kum a-na pi$_2$-i-di-ni-šu-nu
45- ap-la-šu-nu-ti




**بە كورتی بڵێین: گەورەت ئەوها دەڵێ:**

لەو كاتەی تو لە پێش منەوە لەوێ دەبی من بەم شێوەیە ڕێنماییەكانم پێ وتی: ئەو توروكیيانەی كە یاخی دەبن - تو دەتوانی سەرپەرشتییان بكەی و ئامادەشیان بكەی و

دەبێ لەگەڵ خوتدا بیان پارێزی: کە تو نەت دەتوانی ئەوان بەرێوە ببەی و ئامادەیان بکەی دەبوا بو منت ناردبان! ئەم کارەی پێم سپاردبووی بو یارمەتیت نەدام بومانەوەم لەگەڵیان دا لەوێ؟ ئەوە سنوری شاروچکەکە نییە؟ لە راستیدا زوربەی سەربازەکان لەوێ دەمانەوە، و چەکدارەکان با لە دەرەوەی ئەوێ بن، هێزەکەی ئەوان ئەو وڵاتە دەپارێزێ، کارەکەشیان من بریارم لێداوە. ئێستا دەتوانی سەربازەکان بپارێزی و بەرێوەیان ببەی و هەر لەگەڵ خۆشتدا ئامادەیان بکەی، ئەوانەی ناتوانی بەرێوەیان ببەی و ئامادەیان بکەی و بو منیان بنێرە، بەڵام بوچی ئەوان لەلایەنگریت دێنە دەرێ، خودی ئەوان بەدەم رێگاوە دزە دەکەن، یان لەنیوەی رێدا (ئەوان) دەرفێندرێن، (ئەوان) ناتونن لەوێ بمێننەوە، بە دڵنیاییەوە هیچ گروپێکی لایەنگری تو نەگەیشتوتە ئێرە، ئەوان (لەرێگادا) بزر دەبن (یان) هێزەکەی ئەوان (بو شی)کشابومە (...) خوشی، (و لەوێدا) ئەوان لەو وڵاتە دەمێننەوە، تو تەنیا گروپێکی ئەوان بنێرە، یەکێ لە لایەن گرانت بەکرێ بگرە، (بو ئەوەی) بچێتە لایان، با دڵنیایان بکە کە من سەرپەرشتیان دەکەم، و ئەوان بەدەم رێگاوە بزردەبن، ئەوها نەبێ، ئێمە ئەوان دەترسێنین، لەو کاتەی ئەوان نەگەرانەوە لە هەر شوێنێک بێ روبەروویان دەبینەوە؟ و لەوێدا هەر کەسێ لێرە داوای کربوو من پێی دەڵێم: (موداروسی) برامە، لەگەڵ ئەو! ئێستا ئەمەی بوم ناردوی، ئەو شکایەتکارانەی داوایان لێم کردووە، ئەوان لەدەرەوە جیادەکاتەوە (بەهوی)! (تیروایش -شینی) و (زیلیا)م بو بنێرە ئەو برایەتی کە تو گرتوتەو لەگەڵ ئەواندا دات ناوە بەپێی بارودوخەکە ئەوانم لەگەڵ ناردووە.

شیکردنەوەی تێکستەکە:

لەم نامەیەدا (شامشی -ئەدەد) بە کوواریی راگەیاندووە، ئەو (توروکییانەی) کە یاخی دەبن، سەرپەرشتیان بکات و ئامادەیان بکات و بیان پارێزێ، و کاتێ تۆ نەت دەتوانی ئەوەیان بو ئەنجام بدەی بو منت ناردبان، و گوایە فەرمانەکەی (شەمشی-ئەدەد) ی جێبەجێ نەکردووە لەم بارەیەوە، و یارمەتیشی نەداوە سەبارەت بەو توروکییانە، دیارە (شەمشی -ئەدەد) گرنگییەگی زوری بە هێزی (توروکییەکان) داوە، هوکاری ئەمەش بو ئازایی ئەوان دەگەرێتەوە، و (بەکوواری)ی راگەیاندووە سەربازەکان با لە (شوشەررا)بمێننەوە، بەڵام لە دەرەوەی شارەکە و دەبێ پارێزگاری لەو وڵاتەش بکەن ئەمەش بە فەرمانی پاشایە، بەڵام نازانرێ ئەم سەربازانە کێن؟ لەوانەیە ئەم سەربازانە (شەمشی - ئەدەد) ناردبنی بو (شوشەررا) ئەمەش دژ بەو کارەی(کوواری) بووە کە فەرمانی پاشای جێ بە جێ نەکردووە.

بە کوواری دەڵێ ئێستا ئەو (توروکییانە) لە گەڵ خوت ئامادە بکەو بیان پارێزە و ئەوانەی ناتوانی ئەو کارەیان بو ئەنجام بدەی بو منیان بنێرە، و تێیدا لە (کوواری)دەپرسێ کە بوچی (توروکییەکان) لە لایەن گریت دێنە دەرێ؟ یان پێی وایە لە نیوەی رێی نێوان (شوشەررا بو ئاشور)دەرفێندرێن، لێرەش دا ئەوەمان بو دەردەکەوێ کە نیوەی دووری نێوان شاری(ئاشور و شوشەررا)بە دڵنیایەوە دەکەوێتە دەشتی کویە.

کە دووبارە ئەوەمان بو دوپات دەکاتەوە کە شاری (شیکشابووم) دەکەوێتە ئەم ناوچەیەوە، و بە کوواری دەڵێ هیچ گروپێکی لایەنگرت نە گەیشتونەتە(ئاشور)، ئەمەش ئەوە دەگەیێنێ کە ئەوان پەنادەبەنە بەر (شیکشابووم) بەمەبەستی پاراستنیان، لێرەش دا دەردەکەوێ کە (توروکییەکان) بە خوشی خویان نەرووێشتون بو (ئاشور)، ئەگەرنا بو لە دەستیان رادەکەن؟ و بو ئەوەی رانەکەن لە دەستیان هەرودک لە تێکستی (١٠) ئاماژەی پێ کراوە، بە (کوواری)ی وتووە دەبێ لایەنگریکی خوی لە گەڵیان بنێرێ لە هەمان کاتدا پێی راگەیاندووە پێویستە لایەنگرێکی خوی بنێرێتە لایان، بو ئەوەی ئەوان دڵنیا بکاتەوە لەوەی کە (شەمشی -ئەدەد) سەرپەرشتییان دەکات، ئەمەش بو ئەوە بووە کە ترسەکەیان بڕەوێنێتەوە کە لە لایان دروست بووە، ئەگەر ئاوا نەبێ ئەوان دەترسێن، و ئەگەر ئەوان ئەوەی (شەمشی -ئەدەد) دەیڵێ جێ بەجێینەکەن روبەروویان دەبێتەوە.

لە بەشێکی تری نامەکەدا ناوی کەسێ بە(موداروم) ناودەبات کە بەبرای خوی دادەنێ، لە هەمان کات دا باس لە دوو کەسی تر بە ناوی (تیوایش - شینی) و(زیلیام) دەکات کە برای (موداروم)ن گوایا لەلایەن (کوواری) وە گیراون و داوای لێ دەکات کە بوی بنێرێتەوە.

### تابلێتی سێزدەیەم
### ڕووی تابلێتەکە



qi$_{2}$-bi$_{2}$-ma
um-ma e-te-el-lum-ma
ši-ik-ša-ab-bu-um$^{ki}$ na-ka-ar-ka
5- a-ka-šu-um u$_{3}$ a-ia-ši-im ma-ru-us
ša ši-ik-ša-ab-bi-im$^{ki}$
la-we-e-em i ni-pu-uš
tup-pi$_{2}$ an-ne$_{2}$-em i-na še-me-e-em

لێواری خوارووی تابلێتەکە



⌈ga⌉-ma-ar-ti
10- sa-bi-ka u$_{3}$ lu$_{2}$ lu-ul-li-im
it-ti-ka u$_{3}$ da e
lu-pu-ut-[m]a

پشتەوەی تابلێتەکە



u$_{3}$ at-la-ka-am
ar-hi-iš
15- ši-ik-ša-ab-ba-am$^{ki}$
i ni-il-we u$_{3}$ šu-ma-am igi be-li$_{2}$-ni$_{5}$
ni-ir-ši
an-na a-na-ku i-na pa-at ta-ri-im$^{ki}$
w[a-aš-ba-k]u u$_{2}$-qa qa ar-hi-iš
20-[al-ka]-am
[u$_{3}$ ši-i]k-ša-ab-ba$_{2}$-am
[i ni-š]a-al la-ma lugal i-ka-aš-ša-dam$_{2}$

لێواری سەرووی تابلێتەکە



[a]-di u$_{4}$-3-kam u-4-kam nu-ru-ga-am-lugal
[i]-sa-ab-ba$_{2}$-at
25-[u$_{3}$] lugal it-ti um-ma-na-tim
[a-n]a [š]i-ik-ša-ab-bi-im$^{ki}$
i-l[a]-ka-am

لێواری چەپ



la-ma lugal i-la-ka-am ni-nu
iš-te-et i nu-da$_{2}$-am-mi-iq
30-[a]-na be-li$_{2}$-ni$_{5}$
[l]a tu-la-ap-pa-at al-ka-am

### بە کوردی بڵێ: یتیللوم ئاوها (دەڵێ):

شیکشابوم دوژمنتە! ئەو بو هەردووکمان هەرەشەیە (من وتو)، کاتێ گوێبیستی ئەم نامەیە دەبێ ئێمە بە خێرایی ئامادە دەبین بو گەمارۆدانی شیکشابوم، پێویستە سەرجەم سەربازەکانت، و لەگەڵ خوت دا لوللوبیەکان (بهێنێ)، و لە دورەوە گوزەر بکەن! زور بەبێ دەنگییەوە گەماروی شیکشابوم دەدەین، بەوەش بەناوبانگتردەبین لە بەردەم گەورەکەمان دا!.

ئێستا من لە سنوری(تاروم) چاوەڕێم، و چاوەڕ[ێی تو] دەکەم، بە بێ دەنگییەوە وەرە و، دەی با ئێمە شیکشابووم بگرین پێش ئەوەی پاشا بگات، سێ چوار رۆژی تر پاشا (نوروگوم) داگیر دەکات، [ لەو کاتە ]دا پاشامان لە گەڵ خویدا هێز بو شیکشابوم دەهێنێ، پێش ئەوەی پاشا بگات، دەی با ئێمە بە یەکەوە خزمەتێکی گەورە پێشکەشی گەورەمان بکەین، دڵخوش دەبم! بە هاتن!.

**شیکردنەوەی تێکستەکە:**

ئەم نامەیە لە (یتیلوم) ەوە بو (کوواری) نێردراوە، تێیدا ئەوەی پێ ڕاگەیاندووە (شیکشابوم) دوژمنی هەردوکمانە، و دەڵێ لەو کاتەی نامەکە دەخوێنیەوە ئێمە ئامادە دەبین بو گەمارودانی (شیکشابوم)، و داوای لە (کوواری) کردووە سەربازەکانی و لوللوبیەکان لەگەڵ خوی بهێنێ، بە مەبەستی گەمارودانی (شیکشابوم)، دیارە (یتیلوم) بە مەبەستی بە دەست هێنانی ناوبانگ لە لایەن پاشاکەی (شەمشی- ئەدەد) ویستویەتی ئەو کارە بکات.

ئەو لە سەر سنوری (تاروم) چاوەڕێی (کوواری) دەکات بە مەبەستی داگیرکردنی (شیکشابوم) بو ئەمەش زور هانی (کوواری)ی داوە، لە هەمان کات دا (شەمشی -ئەدەد) خەریکی داگیرکردنی (نوروگوم) بووە، بەلآم (یتیلوم) بە مەبەستی بەدەست هێنانی ناوبانگ لەلای پاشاکەی ویستویەتی بە هاوکاری (کوواری) (شیکشابوم) داگیر بکات، بەلآم (کوواری) بەم ئاراستەیە هیچ هەنگاوێکی نەناوە سەرەڕای ئەوەی کە (شەمشی -ئەدەد) یش لە تێکستی (١١) داوای لێکردووە کە هەزار سەرباز بو (یتیلوم) بنێرێ بەمەبەستی ئەنجامدانی ئەم کارە.

تابلێتی چواردەیەم
رووی تابلێتەکە









رووی تابلێتەکە

1- a-na ku-wa-ri qi$_2$-bi$_2$-ma
um-ma e-te-el-lum a-hu-ka-a-ma
am-mi-nim a-na ši-ik-ša-bi-im-[$^{ki}$ q]a-ta-li-im
[a]-ah-ka na-di$_3$
5- pa-na-nu-um i-nu-ma ma-a-tum ši-i
na-ak-ru ša u$_4$-mi-šu ta-aš-ta-na-ah-hi-tam-ma
qi$_2$-in-na-az-ka ta-ri-ik e-li
ma-a-tim ša-a-ti u$_3$ na-pa-ša-am
u$_2$-ul ta-na-ad-di$_3$-in ma-tam ša-a-ti
10 - i-na-an-na mi-nu-um i-du-um ša a-ah-ka ta-ad-du-u$_2$
aš-šum giš-ma$_2$ a-na lugal ta-aq-bi um-ma at-ta-ma
a-na lugal giš-ma$_2$ u$_2$-ha-al-la-aq [u$_3$] u$_2$-ul [tu-ha-al-li-iq]
dumu-meš ši-ip-ri [u$_3$ sa]-bu-um [ša] in-du-uš-še i-te-ne$_2$-eb-be$_2$-er
i-na-an-na-2-me sa-b[u]-um lu$_2$ qu$_2$-tu$_3$-u$_2$
15- [u$_3$] ma-tam iš-ta-na-ah-hi-it
[u$_3$] at-ta ši-ip-pa-[a]t
mi-na-am ni-ip-pa-al lugal
sa-bu-um i-na qa-ti-ia u$_2$-ul [i-ba-aš-ši]
sa-bu-um ša 4-šu i-na bad$_2$-ha$_2$ š[a] m[a-at]
20-a-ha-zi-im i-ta-ad-du
u$_3$ iš-tu a-li-im u$_2$-ul us-si$_2$
bad$_2$-šu-ma u$_2$-ka-al
[u$_3$] [š]a-pi$_2$-il-ti sa-bi-i[a]

لێواری خوارووی تابلێتەکە

[i-n]a ma-ha-ar lugal
25- [s]a-bu-um i-na qa-ti-ia
u$_2$-ul i-ba-aš-ši

پشتەوەی تابلێتەکە

at-ta sa-ba-ka pu-uh-hi-ir-ma
u$_3$ lu$_2$ lu-ul-li-im it-ti-ka lu-pu-ut
a-na za-as-li-im al-ka-am-ma
30- šu-ub-ta-am ši-ib-šu-um-ma
u$_3$ šu-pu-ur-ma ka-al ma-tim
li-ig-ru-šu i-nu-ma us-se$_2$-ma
at-ta ti-bi-šum-ma u$_3$ hu-ru-[us-su$_2$]
u$_3$ a-na be-li$_2$-ka [i XX]-[........]
35- du$_2$-um-mi-[iq]
ša-n[i-tam] aš-šum ir$_3$-ar-di$_3$-[ka] ša at-aš-[pu-ra]-am
um-ma at-ta-ma wa-ar-du-ia-mi
i-na ma-a-at ar-ra-ap-hi-im$^{ki}$
wa-ar-di$_3$-ka i-sa-ah-hu-ru a-di u$_2$-ul i-mu-ru

40-wa-ar-di-ni šu-nu-ši i-nu-ma e$_2$-kal$_2$-lum
i-ma-aq-qu$_2$-tu$_3$ u$_3$ sa-bu-um
i-na ši-ik-ša-ab-bi-im$^{ki}$ uš-ša-ab
[i-na u$_4$-mi]-šu wa-ar-di$_3$-ka
[.....] ⸢a X⸣ [.....] ⸢a⸣-ta-ma-ar-šu-nu-ti
45- u$_3$ ⸢uš-ta⸣-[ma-ra-sa]-kum
ki-ma at-ta a-na w[a-ar-di$_3$-ia]
tu-uš-ta-ma-ra-su$_2$ [a-na-ku] [qa]-tam-ma
a-na wa-ar-di$_3$-ka an-nu-tim uš-ta-ma-ra-sa
šum-ma i-na ma-a-at ar-ra-ap-pi$_2$-hi-im$^{ki}$
50- wa-ar-du-ka wa-aš-bu
a-ma-ar-šu-nu-ti-ma u$_2$-ša-ar-ra-kum

دێرێک سڕاوەتەوە

ša-ni-tam šum-ma ši-ik-ša-ab-bu$^{ki}$
e-mu-qa-am i-ra-aš-ši
55- u$_2$-ul a-ka-šum-ma-a
u$_3$ a-ia-ši-im
i-ma-ar-ra-as
an-mi-nim a-ah-ka [n]a-di$_3$
ul-la-nu-um ši-ik-ša-bi-im$^{ki}$ ma-an-nu-um
60- na-k[a]-⸢ar⸣-ka ul-la-nu-uš-šu
na-ka-ar-ka u$_2$-ul i-ba-aš-ši a-ah-ka
la na-de$_4$-es-su$_2$

## بە کوواری بلێ: یتیللومی برات ئاوها (دەڵێ):

بوچی تو هەنگاوت نەنا بو لە ناوبردنی شیکشابوم؟ لە کاتێکدا ئەم وڵاتە پێشوتر دوژمنت بووە، تو هەموو رۆژێ هێرشت کردوتە سەر ئەو، تو لێتداوەو ئەم وڵاتەش لە ژێر دەستی تودا هەرەسی هێناوە، و تو کارەکەت جێ بەجێ نەکرد بەرانبەری ئەم وڵاتە، ئێستا تو بوچی هیچ کارێک ناکەی؟ گواستنەوەی ئەو قسانەی کردوتە بو پاشا وەک خوی: من وێرانی دەکەم و بە پاشاکەشم دەڵێم! بەڵام تو وێرانت نەکردووە (ئەو)، نێردراوە سەربازەکانی یندوشێ (رووبارەکە) لە پەرینەوەدا دەپارێزن، (و) ئێستا (٢٠٠) سەربازی گوتی! ئەوان وڵاتەکە لە هێرش کردن دەپارێزن، توش هەروا بەبێ دەنگی دەمێنیەوە! ئێمە چون وەڵامی پاشامان بدەینەوە؟ من سەربازم نییە. سەربازەکانم بونەتە چوار (بەش) و روویشتون بو گەمارودانی شاروچکەکانی وڵاتی ئەخازوم، و ناتوانن شاروچکەکان بەجێ بهێڵن، (لەو کاتەی) ئەوان شاروچکەکان دەگرن، و سەربازەکانم لەگەڵ پاشا دا پشو دەدەن، من هیچ سەربازم نییە، پێویستە تو سەربازەکان کوبکەیتەوە و سەرجەم لوللویەکانیش لەگەڵ خوت بهێنی و، بێتە (ژاژلوم) و وەک

ناوچەیەکی دژ بە ئەو راستی بکەیتەوە، لە وکاتەی ئەو قسانە دەنێری وڵاتەکە بە تەواوی دەبێتە دوژمنی ئەو، لە کاتی روشتنی ئەودا، تو هێرش بکە سەر ئەو و لەناوی ببە، ئەم خزمەتە پێشکەشی گەورەت بکە!

دووەمیان دەربارەی خزمەتکارەکانتە، تو ئەو هات بو من نووسی و دەربارەیان: چاودێری خزمەت کارەکانم بکە بە خزمەت کارەکانت لە وڵاتی ئاراپخا! لە کاتێکدا ئەوانت نەدوزییەوە ئەوا ئەو خزمەتکارانە هی منن - لەو کاتەی کوشکەکە دەگیرێت و سەربازەکانیش لە شیکشابوم دەمێننەوە، لەم روژەدا خزمەت کارەکانت(...)من ئەوان دەدوزمەوە، بوتان ئامادە دەکەم نیگەرانیان مەبە، تو لە وانەیە نیگەرانی ئەوەبی کە لەگەڵ خزمەت کارەکانی منی،سەرەرای ئەوەی منیش دەبێ لەگەڵ خزمەتکارانی تودا نیگەران بم، ئەگەر خزمەتکارەکانی تو لە وڵاتی ئاراپخا بمێننەوە (ئەوە)، من ئەوان دەبینم و بوتیان دەنێرمەوە، ئەگەر شیکشابوم بە هێز تر بێ، ئەوە بو تو و منیش خراپ نابێ؟ بوچی تو هیچ شتێ ناکەی؟ تەنیا شیکشابومە کێی تر دوژمنی تویە؟ ئەو تەنیا دوژمنی تۆ نیە! راوەستەو هیچ شتێک بەرانبەر ئەو مەکە(بەتەنیا)!

**شیکردنەوەی تێکستەکە:**

ئەم نامەیەلەلایەن (یتیللوم)ەوە بۆ (کوواری) نێردراوە کە تێیدا خۆی بەبرای (کوواری) ناساندووە، پێی رادەگەیێنێ کە بۆچی هیچ هەنگاوێکی نەناوە بەمەبەستی لەناو بردنی (شیکشابوم)، لەکاتێکدا پێشوتر دوژمنی بووە، باس لەوە دەکات کە پێشوتر هێرشی بردۆتە سەرووو بە سەریدا سەرکەوتووە، لێرەشدا ئەوەمان بۆ دەردەکەوێ کە پێشوتر ناکۆکی هەبوە لەنێوان (کوواری) و (شیکشابوم) دا و و (کوواری توانیویە بەسەریدا سەر کەوێ، بەڵام بۆچی لەو کاتەی (یتیللوم) و تەنانەت (شەمشی-ئەدەد) یش دوای لێ دەکەن کە هەنگاو بنێ بەمەبەستی لەناو بردنی (ئەخازوم) هیچ هەنگاوێک نانێ؟) لەوانەیە هۆکارەکەی بۆ ئەوە بگەرێتەوە کە (کوواری) حەزی نەکردووە بە تەواوەتی وڵاتی (ئەخازوم) لەناو بچێ و بکەوێتە ژێر دەسەڵاتی (ئاشورییەکان)، چونکە بەمە ئاشورییەکان بەتەواوی کۆنترۆڵی ناوچەکە دەکەن و بەوەش مەترسی دەکەوێتە سەر فەرمانرەوای ناوچەی(کوواری) وە، وتێیدا بە(کوواری) رادەگەیەنێ ئەو بەڵێنەی کەبە(شەمشی-ئەدەد)ی داوە نەیبردۆتە سەر، کەبەڵێنی دابوو وڵاتی (ئەخازوم) لەناوببات، لە هەمان کاتدا باس لەسەربازەکانی (ئیندوشێ) دەکات کە رووبارەکە دەپارێزن و (٢٠٠) سەربازیشیان وڵاتی (ئەخازوم) لەهێرش کردن دەپارێزن،پێی دەڵێ کەچی تۆ هەر بێ دەنگی، و چۆن وڵامی پاشا بدەینەوە، و باس لەوە دەکات کە ئەو هیچ سەربازی لەبەر دەستدا نییە، چونکە سەربازەکانی ناردووە بەمەبەستی گەمارۆدانی شارۆچکەکانی وڵاتی (ئەخازوم)و کردوونی بەچوار بەشەوە، لێرەشدا ئەوەمان بۆ دەردەکەوێ کە ئەم وڵاتە خاوەنی چەندان شارۆچکەو رووبەرێکی بەر فراوان بووە، هەر لەبەر ئەم هۆکارەیە داوا لەکوواری دەکات کەسەربازەکانی و لەللوبیەکانیش لەگەڵ خۆی بهێنێ بەمەبەستی گەمارۆ دانی ئەو وڵاتە، و هەروەها (ژاژلوم) یش دژی ئەو وڵاتە راست بکاتەوە، لەو کاتەشدا هێرشی بکاتە سەروو لەناوی ببات، بەمەش خزمەتێکی گەورە پێشکەش بە پاشاکەی دەکات.

بەشێکی تری تێکستەکە تەرخان کراوە بۆ خزمەتکارەکانی، تێیدا بە(یتیللوم) ی راگەیاندووە کە خزمەتکارەکانی بۆ بدۆزێتەوە لە (ئاراپخا)، ئەگەر نەشی دۆزینەوە ئەوا لەکاتی داگیرکردنی (شیکشابوم) خزمەت کارەکانی کۆشک دەبنە هی خۆی، (کوواری) نیگەرانی ئەوە بووە کە لەگەڵ خزمەت کارەکانی خۆیدا نەبووە، و (یتیللوم) پێی دەڵێ هەر کاتێ خزمەتکارەکانی لە (ئاراپخا) بینی ئەوا بۆی دەنێرێتەوە، بەڵام نازاندرێ ئایا خزمەتکارەکانی (کوواری) بۆ لە (ئاراپخا) بوون؟ و ئەوەشی پێ رادەگەیێنێ کە وڵاتی (ئەخازوم) بەرەو بەهێزی دەچێ، کە جێگای مەترسییە بۆ ئێمە، و چەند جارێ ئەوەی لێ دووپات دەکاتەوە کە بۆچی دژی ئەو هیچ هەنگاو نانێ، لەهەمان کاتیشدا ئەوەی پێ رادەگەیەنێ کە بەتەنیا هیچ هەنگاو نەنێ چونکە ئەو بەتەنیا دوژمنی تۆ نییە.

## تابلێتی پازدەیەم
## رووی تابلێتەکە















**رووی تابلێتەکە**

**1- ⸢a⸣-[na] k[u-wa-ri]**
**qi$_{2}$-b[i$_{2}$-ma]**
**um-ma ia-d[i-nu-um]**
**ma-ru-ka-a-[ma]**
**2- te$_{4}$-mu-um iš-tu ma-h[a-ar......]**
**im-qu$_{2}$-ta-a-am**
**um-ma-mi sa-bu-um**
**3 me-tim qu$_{2}$-tu-um sa-bu-u[m]**
**a-na e-be$_{2}$-ri-im**
**10- ku-un-ma**

**لێواری خواروو**

**u$_{3}$ a-na uru ši-ik-ša-bi$^{ki}$**
**⸢e⸣-re-ba-am**
**u$_{2}$-ta-⸢a⸣-[a]m**
**a-na e-le-pi$_{2}$-im**
**15- šu-pu-[u]r-m[a]**
**e-le-pa-am ša-a-t[u]**
**li-da$_{2}$-ap-pi$_{2}$-ru**
**ki-ma ia-šu-ub-$^{d}$i[m]**
**e-mu-qa-am la i-[ra-aš-šu-ma]**
**20- ma-ta-am la u$_{2}$-[da-ba-bu-ma]**
**u$_{2}$-ra-⸢am⸣ š[e-ra-am]**
**la ⸢i⸣-m[a-ar-ra-su$_{2}$-ni-a-ši-im]**
**sa-ba-a[m......]**

**لێواری سەرووی تابلێتەکە**

**šu-⸢X⸣ [.........]**
**25- lu-[.........]**
**⸢X⸣ [............]**

**لێواری چەپی تابلێتەکە**

**u$_{3}$ ma-ta-a-am la u$_{2}$-da-ba-bu**
**ša du-pu-ur e-le-pi$_{2}$-i[m]**
**ša-tu e-pu-uš**

### بە کوواری بلێ: یادینومی کوڕت ئەوها (دەلێ):

دەنگوباسم پێ گەیشتووە لە(...) بەم شێوەیە: ٣٠٠ سەربازی گوتییەکان کۆبوونەتەوە بو پەڕینەوە لە(رووبارەکە)، ئەوان دەتوانن ڕێگا بدۆزنەوە بۆ ناو شیکشابوم، هەواڵم پێ بدە ئەو گواستنەوەیە زۆ گرنگە و گواستنەوەکەش نایەڵێت (یاشوب - ئەدو) بەهێزبێ ئەو وڵاتەکە (هەراسان) بکات، و لە ئایندەدا ناتوانێ سەربازەکان(مان هەراسان بکات) (...دوو دێڕ شکاوە) (لە ژێر ئەمەد) بەدڵنیایەوە ئەمانەش گواستراونەتەوە(بەڵام) ئەو ناتوانێ وڵاتەکە هەراسان بکات.

**شیکردنەوەی تێکستەکە:**

ئەم نامەیە (یادینوم) ی ئەفسەر بو (کوواری)ی ناردووە کە تێیدا خوی بە کوڕی (کوواری) ناساندووە، باس لە (٣٠٠) سەربازی گوتییەکان دەکات کە لە سەر رووبارەکە کۆبوونەتەوە، بەمەبەستی چونە ناو(شیکشابوم)ەوە، پێی وایە ئەوان بتوانن بگەنە (شیکشابوم)، گیرخواردنی گوتییەکانیش رەنگە لەبەرئەوە بوبێ لەلایەن هێزی دوژمنەوە رێگایان لێ گیراوە بو ئەوەی نەتوانن بگەنە (شیکشابوم)چونکە ئەمانە دەبنە هۆی بەهێز کردنی ئەو ولاتە، چونکە ناتوانن رێگریان بن بۆ ئەوەی نەتوانن بگەنە ناو (شیکشابوم)، بەلام پێی وایە کە (یاشوب - ئەدو) ناتوانێ ولاتەکەو سەربازەکانیان هەراسان بکات.

**تابلێتی شازدەیەم**
**رووی تابلێتەکە**











رووی تابلێتەکە

1- [a]-na ia-šu-ub-[d][im]
[q]i2-bi2-m[a]
[u]m-ma ta-al-pu-[šar-ri-ma]
[a]-na mi2-ni-im a-[na se-sr]
5- [a-b]i-ka pi3-še-en-de-en
[dumu] ši-ip-ir-ka la t[a-š]a-ap-pa-[ar]
[ki-m]a u4-um-šu-um [......]
[a-b]u-ka u3 a-bi a-bi-ka
[i]t-ti e2-tim an-ni-im
10- [u3] ma-tim ša i-ta-ba-al-hi-im[ki]
[i]d-bu-bu u3 i-na-an-na
[a]t-ta [k]i-a-am-ma
[d]u-bu-ub aš-šu[m.......]
[.....n]a-ak-ru-X[...........]
15- لێواری خوارووی تابلۆکە سێ دێر نەماوە

پشتەوەی تابلێتەکە

[...........]šar—[ri]
[...........][X] i-pa-la-[..........]
20- [........sa-bi-i]m ša-qu2-t[i.........]
[........]-šu [-X]
[........]ma-l[i..........]
[.............][X] [........]

بەیاشوب-(ئەدو) بڵێ: تالپوش -شاری ئەوها (دەڵێ):
بۆچی تۆ تەتەرت نەناردووە بۆ لای(پیـــشـــیـنـدینی) باوکت؟ پێشتر باوک و باپیرت ڕازی بوون و گفتوگۆیان کردووە لەگەڵ ئەم ماڵەو وڵاتی(یتابالخوم)، تۆ ئێستا هەمان ڕێگات بە کارهێناوە بۆ گفتوگۆ(لەگەڵ ئەو)! (...شکاوی).

**شیکردنەوەی تێکستەکە:**

ئەم نامەیە (تالبوش-شاری؟) بۆ (یاشوب -ئەدو)ی ناردووە، لێی دەپرسێ بۆچی تەتەری نەناردۆتە لای (پیشیندین)ی پاشای (یتابالخوم)، کە بەناوی باوکی ناوی بردووە، باس لەوە دەکات باوک و باپیری پێشووتر گفتوگۆیان،لەگەڵ ئەم ماڵەو وڵاتەکەیدا کردووە، دیارە لێرەدا (تالبوش-شاری) ویستویەتی یارمەتی (یاشوب ئەدو) بدات، بەوەی کە لەگەڵ (پیشیندین)ی پاشای (یتابالخوم) گفتوگۆبکات و لەگەڵی ڕێکبکەوێت دژ بە دوژمنانی، چونکە میرنشینی (یتابالخوم) یەکێ لە هێزەکانی ناوچەی زاگرۆس بووە، ئەگەر (یاشوب-ئەدو) لە گەڵیدا ڕێکبکەوێت لەبەرانبەر دوژمناندا خۆی پێ دەگیرێ و دەتوانێ دژیان بوەستێتەوە.

**تابلێتی حەڤدەیە**

**ڕووی تابلێتەکە**











ڕووی تابلێتەکە

1- a-na ia-šu-ub-$^{d}$im
qi$_2$-bi$_2$-m[a]
[u]m-[m]a p[i$_3$-š]e-en-[d]e-en
⸢a⸣-bu-k[a-a]-ma
5- at-ta⸢u$_2$-ul⸣ ta-aš-me-e-ma
a-bi u$_3$ a-bi a-bi-ia [i]t-ti ⸢a⸣-bi-k[a]
u$_3$ a-bi a-bi-ka ⸢at⸣-hu-tam i-pu-šu
i-na-an-na at-ta-[..........]
la ta-a[l]-la-ak-ma ⸢ku-un-šu-um⸣
10- la i-pa-ra-a[s$_2$...........]⸢XX⸣-am
⸢u$_3$⸣ ša-[n]i-ta[m...........]
[a-na] zu-zi-im [u$_3$..........]
⸢X⸣ gun$_2$ 15 ma-[na...........]
[ki-ma]hi-še-eh-t[i-šu-nu........]

لێواری خوارووی تابلێتەکە

15-[li-di-n]u-šu-nu-ši-i[m....]
[..........]im u$_3$ ⸢X⸣ [.........]
[..........-i]m[..........]

پشتەوەی تابلێتەکە

[.......mi]-im-ma ⸢hi-še-eh⸣-[tl-........]
[.........]⸢i⸣-na ku-u[n]ši-i[m$^{ki}$]
20- [...........]⸢XX-di⸣-ma
[............]⸢XXX⸣ na[..........]
[...........]⸢X⸣ -KU-tum 2 me-at ⸢X⸣ [..........]
⸢XX⸣ sa-am-tu[mX] gu$_2$-e$_3$-a
20 ⸢XX⸣ BU 14 ma-[n]a ma-su$_2$-um
25- 10 ma-na ku-ur-bi-a-nu-um
⸢X⸣ i$_3$-du$_8$ ⸢X⸣ [............l]u$_2$-meš
9 su$_2$-ha-ru-[ia š]a de-ku
⸢an⸣-nu-um ⸢e⸣-pe$_2$-eš$_{15}$-ka ⸢da⸣-mi$_3$-iq
[ša t]e-pu-šu-ma
30-šu[m-m]a i-na ki-na-t[im] ma-ri
[a]t-ta i-nu-tum š[i]-i
[l]a i-ha-li-iq a-na-k[am]

لێواری سەرووی تابلێتەکە

u$_3$ we-ri-am ha-aš-⸢ha⸣-ku
a-na ka-ak-ki [a]r-hi-⸢iš⸣
35-ll-ša-ah-mi$_3$-t[u$_2$]-nim-[ma]

لێواری چەپی تابلێتەکە

[u$_3$ i]-nu-tum ši-⸢i⸣ [l]a i-ha-li-iq

بە یاشـــوب -ئەدو بڵێ: پێـــشـــیندینی باوکت ئەوها (دەڵێ):

تۆ گـوێبیـــســـتی ئەمـە نەبووی کـە باوکم و باپیـرم هاوپەیمانیەتیەکی برایانەیان هەبووە لەگەڵ باوک و باپیرت. ئێستـا تۆ (............) پێویست ناکا لەناوی ببەی، وەکو(نشوم) پێویست ناکا دابەش بین (.........) (وە) هەروەهـا (.......بۆ) زوزوم (و........) تـالـینـت ١٥ می(نا لە......دەبەخـشـیـێـتــە ئەوان) لەوانم دەوێ (.........) لە کـــونشـــوم (بگوازیەوە.........) ٢٠٠(.........)، بەردی سور، (.........) باڵتۆکان، ٢٠......، ١٤ مینای کانزای ساف، ١٠مینا کوربیانوم، و.........ڕۆنی باش (........) پیـــاوەکـــان، ٩ لە لایەنگرانم، ئەو بووەتە سـەرباز - ئەمـە بۆتۆی دەنێـرم و تۆش لەگەڵی ڕێکەوە، ئەوە باشە؟ ئەگەر تۆ ڕاست گـۆ بی لەگەڵ کوڕەکەم، ئەوان باشن پێویستە لەدەستیان نەدەی، من پێویستم بەمس و تەنەکەیە بو (دروست کردنی) چەک، ئەوەی هەیە پێویستـە بە خێـرایی بگوازرێتـەوە، بەڵام پێویستە باشەکانمان لە کیس نەچن!

**شیکردنەوەی تێکستەکە:**

ئەم نـامـەیە (پێـشـیندین) ی پاشـای (یتـابالخـوم) بۆ (یاشـوب -ئەدو) ی ناردووە خـۆی بەباوکی ناوبردووە و، پێی رادەگەینێ ئەو پەیوەندیەو هاوپەیمانیەی لە نێوان باوک و باپیـرانمانـدا هەبووە پێویـسـتـە بپارێزرێ، باس لە شـارێ دەکـات بە ناوی (کـونشـوم) کـە ئەم شـارە لە شـاری (شـوشـەڕرا) وە نزیـک بووە و لەچەندان تێکسـتـی تردا ئاماژەی پێکراوە، و بەشێکی زۆری نامـەکە توشی شکان بووە، بەڵام بەگـشـتـی باسکردنە لە مـادەی کـانزای و مادەکانی تر، کە باس لە وە دەکات پێویستی بە کانزایە بەمـــبەســـتی دروست کـــردنی چەک، وا دەردەکـەوی ویسـتـویەتی بە هاوکـاری (یاشـوب- ئەدو) (کـونشـوم) داگیربکات بەمەبەستی دەستە بەرکردنی پێداویستییەکان.

**تابلێتی هەژدەیەم**
**رووی تابلێتەکە**






رووی تابلێتەکە

1-[a-na ........ qi$_2$-bi$_2$-ma]
[um-ma ia]-šu-u[b-$^{d}$im]
[.....]-ka-a-m[a]
[tup-pa-am] ša aš-šum za-ab-[za-bi]
5- [u$_3$ lug]al-⸢ru⸣-um-$^{(d)}$im tu-ša-bi-l[am eš-me]
[ki-a-a]m ⸢ta⸣aš-pu-ra-[a]m um-⸢ma⸣ at-t[a-ma]
[a-nu]-um-mi ⸢e⸣-pe$_2$-e[š-k]a ⸢an⸣-nu-⸢um⸣
[ša t]e-te-ne$_2$-⸢ep-pe$_2$-šu it⸣-ti-ka-ma-mi
[te$_4$]-mu-um ⸢na-ši-iq⸣ u$_3$ it-ti-ka-mi
10- [na-k]a$_3$-ar-ni ⸢za-ab-za-bi
[u$_3$] ⸢lugal-ru-um-$^{d}$im⸣ a-nu-um-ma-nu-um
u$_2$-ul ir$_3$-du-⸢ka a-na-ku an-na-nu-um a-ba-šī⸣
u$_2$-ul ir$_3$-du-⸢ia šu-x-x i-na-an-na⸣
⸢an⸣-na-nu-um a-na-ku lu-ha-⸢li⸣-i[q-šu-n]u-ti
15- ⸢u$_3$⸣ at-ta a-nu-⸢ma⸣-nu-um ⸢hu-ul-li⸣-iq-šu-[nu]
⸢u$_3$⸣ šu-ma-am[ra-be$_2$-e]m ⸢i ni-iš⸣-ku-un
a-na ⸢mi-nim su$_2$-ha-ri-šu⸣-nu
⸢qa-du⸣-um ⸢u$_2$⸣-nu-ti-⸢šu-nu⸣
i-na he-eš-ri-im ⸢šu⸣-ub-⸢tum⸣
20-⸢it-hi-šu-nu-ti x la u$_2$-ha-al-li⸣-qu$_2$-šu-nu-ti
⸢e⸣-pe-⸢eš-ka an⸣- nu-um u$_2$-ul ki-a-am
[a-na]a-ku ⸢an⸣-na-nu-um aš-šu-mi-ka

لێواری خواروی

[k]i-ma mu-⸢ur-si$_2$⸣-ia ma-ar-sal-ku
[.......]⸢x a⸣-lim ša-tim

رووی دواوەی تابلێتەکە

25- [.............t]a-na-ni
[.................]⸢x⸣-ta-at
[................i]G ⸢tu⸣-ša-am-qi$_2$-it
[...............k]a
[.................]⸢x⸣
30- [..............]⸢u$_3$ a-na-ku e-pe$_2$-ša-am⸣
[..............šu]m-⸢ma ma⸣-ha-ar
[.................]⸢i xx⸣
[.................]⸢x⸣
[.................]⸢x⸣-am
35-[x] ⸢x⸣[.....................]
[luga]l-ru-u[m-$^{d}$im.................]
[xx]-⸢xxxx⸣[.................-n]u
[xx]-⸢xxxx⸣[..................]-⸢ri-bi?⸣
[xx]-⸢xxxx⸣[..................]⸢x⸣-nu
40-[........]-⸢ad-di-x⸣-[.............]
[x-a]n-⸢na-nu-um iš-tu] ma-ah-ri-k[a]
[xx]-⸢xxx⸣-a-na-ku an-nu-um-[...........]
[.........]⸢x u$_2$⸣-ul ku$_3$-⸢babbar-xx⸣-[.........]
[.........u$_2$]-ul urudu ša-al-la-ti[m.......]
45- [.........]⸢x⸣[...........]-[xxx]

لێواری سەرووی تابلێتەکە

[...........]⸢x⸣ ša za-ab-za-bi[.........]
[...........]-⸢xx⸣-am-ma
[...........]-⸢x-il⸣-ma
[...........]-⸢xxx⸣

بە...بڵێ: یا(شـــوب-ئـەدو(؟)) ئەوهـا (دەڵێ)، تۆ[...]:

من گوێ بیستی ئەو نامەیە بووم کە تۆ بۆمنت ناردبوو دەربارەی زابزابی و شاروم - تیششوب. تۆ بەم شێوەیەت نوسی بوو: (ئێـــستـــا ئەوەی ئەرکی تۆیە کـە بتـوانی بیپارێزێ، ئەمەش کێشەیە، و یشودانی لەگەڵ تۆیە! ئێمە (بە گـشـتی) توشی شـەڕانگێـزی(زابزابێ) و(شـاروم - تیشـوپ) (بوین) لەوێدا، (ئەوان) خزمەت کاری تۆ نین؟ من لێرەم، (ئەوان) خزمەت کاری من نین، ئێستا من لێرەم (بۆ ئەوەی هەندێک) لەوان لە ناو بیـەم، و تۆش لەوێدا ئەوان لە ناوبە، و ئێـمەش ناوبانگێکی مـەزن دەسـتـەبەر دەکـــەین، بۆچی ئێـــشـکـگرەکـــانی ئەوان لەگـــەڵ کەلوپەلە(قافڵ) کانیاندا دەبین و دەستگیریان ناکەن لە دەرەوەی (هیشرومیش) ئەوان لە ناو دەبەن؟ ئەو کارەی تۆ ئاوا نە (بووە). من لێـــرە لەبەر تۆ توشی ڕاڕایی بووم! (باقی پاشـمـاوەی تابلوکـە توشی شکان هاتووە)، بەڵام ئەوەی باسی (زابزابی و شـاروم-تیـشـشـوپ) دەکـەن لەتابلێتەکە ماوەتەوە، و لەسەر بەشی خوارووی پشتەوەی تابلێتەکە ئاماژەکراوە بە دروستکردنی زیو و مس.

**شیکردنەوەی تێکستەکە:**

ئەم نامـەیە (یاشوب-ئەدو) بۆ کەسێکی ناردووە کە شوێنی ناوەکەی شکاوە، تێـیدا بۆی باسی هەندێ کەس دەکات بە ناوەکانی (زابزابی و شاروم-تیشوپ؟)، توشی شەرانگێزیەکەیان بووە، جا لە بەر ئەوە هەندێکیان لێ لە ناودەبات و ئەویش لەوێدا ئەوانی تر لە ناو ببات.

و هەروەها لە کـۆتایدا باس لە دروست کـردنی (زیو و مس) دەکـات و بەشـێکی زۆری تابلێـتـەکـە توشی شکان هاتووە.

## ژێدەرەکان

(١) أحمـد، کـوزاد مـحـمـد، کـوردسـتـانی ناوەراست لە نیـوەی یەکـەمی هەزارەی دووەمی.پ. ز.دا، سلێـمـانی، ٢٠٠٧، لا ١٨٥-١٨٦.

(٢) لۆسۆ، یورگین، خشـتـەکانی شمشارە، وەرگێرانی: عەزیز گەردی، هەولێر -٢٠٠١.

(٣) سەرچاوەی پێشوتر، لا ٤٨.

(4)- Eidem, Jesper and laessoe, Joren,The Shemshara Archives.I. The Letters, Copenhagen, 1998, p.22-23.

(5)- Ibbid.p.23

(٦) احمد، سەرچاوەی پێشووتر، لا ٢٦٥- ٢٦٦.

(7)- Eidem,,Jesper, The Shemshara Archives.2.The Administrtive Texts, Copenhagen,1992,p.18

(8)- Eidem and laessoe, Ibbid,p.45

(9)- The: Eidem,Jesper,News from The Eastern evidence from TELL Shemshara,Iraq,Vol.XLVII.London,1985,p97.

(10)- Ibbid,p107

تێبینی: سەرجەم ئەم نامانە(تابلێتانە) لەم سەرچاوەیە وەرگیراون:

Joren,The laessoe, and (Eidem,Jesper Shemshara Archives.I.The Letters,Copenhagen, 1998)

تێبینی: ئەم بابەتە لە ژمارە(٣)ی ساڵی (٢٠٠٩)ی گۆڤاری سوبارتو وەرگیراوە.



# وڵاتی کیروری و دەربەندی کۆڕێ لەسەرچاوە مێخییەکاندا

دڵشاد عەزیز زاموا
کۆلیژی ئاداب - زانکۆی سەلاحەددین

تا ئێستا پشکنینی شوێنەواریی لەزۆربەی ناوچەکانی کوردستاندا نەکراوە، لەبەر ئەوە لەباردی ئەو گەل و هۆز و ناوچە و شار و دەوڵەتانەی، کە لە سەردەمە کۆنەکاندا لە کوردستاندا هەبوون، زانیاریمان زۆر کەمە، جگە لە چەند ناوچەیەکی کەم، کە پشکنینیان تێدا کراوە، وەک شاری نوزی و شمشارە کە چەند زانیارییەکیان لەسەر ناوچە، و دەوڵەتۆکەکانی کۆنی کوردستان خستۆتە روو، نووسینە مێخییەکان بەیەکێک لە سەرچاوە گرنگەکان دادەنرێت بۆ زانینی ناو و شوێنی وڵات و گەل و هۆز و شاخ و رووبار و ناوچەکانی کوردستان لە سەدەکانی پێش زایینیدا، چونکە ئەم سەرچاوانە لەنزیکەوە باس لە رووداوەکانی ئەم ناوچانە دەکەن، کاتێک پاشاکانی سۆمەر، ئەکەد، بابل و ئاشوور هێرشیان دەکردە سەر ئەو ناوچانە، دەنگوباسی هێرشەکانیان لەسەر بەرد و تابلێتی قوڕ دەنووسی، ئەم نووسینانە لە پەرستگاکان یان لە کۆشکەکان دادەنران. شوێنەوار ناسەکان بەردەوام توێژینەوە دەکەن لەسەر ئەو ناوانەی، کە لە سەرچاوە مێخییەکاندا باس کراون، ناوەکان دابەش دەکرێن بۆ ناوی (گەل، هۆز، وڵات، ناوچە، رووبار، شاخ، کێو..... و) هەوڵ دەدەن کە ئەو ناوانە بەراورد بکەن لەگەڵ شوێنەکانی ئێستادا بە لەبەر چاو گرتنی لایەنی جوگرافی و تۆپۆگرافی ئەو ناوچانە.

یەکێک لەو شوێنانەی، کە لە سەرچاوە مێخییە ئاشوورییەکاندا ناوی هاتووە و باس کراوە لە سەردتای سەدەی نۆیەمی پێش زایین وڵاتی کیروورییە، کە چەند جارێک باس کراوە، بەتایبەت لە سەردەمی توکولتی نینۆرتای دووەم (٨٩٠-

٨٨٤ پ.ز) و ئاشوور ناسر پالی دووەم (٨٨٠-٨٥٨پ.ز) و شالمانیسەری سێیەم (٨٥٨- ٨٢٨ پ.ز)[1].

کۆنترین ئاماژە بە کیرووری لە دەقێکی مێخی تێگلات پلێسەری یەکەمی ئاشووری (١١١٥-١٠٧٧پ.ز) دا ئاماژەی پێکراوە بە شێوەی (کیریووری)، و پاشان ئاشووردانی دووەم (٩٣٤-٩١٢پ.ز) باس لە ناوی دوو شار لە شارەکانی هەرێمی کیرووری دەکات کە ئەوانیش شاری (سمیرا) و شاری (شوخو)وە کە پێدەچێت پەیوەندی بە ناوی شەقڵاوەوە هەبێت و بە تێپەڕبوونی کات گۆڕاوە (شوخو = شەخلاوە؟- شەقلاوە...)..

لە سەردەمی پاشایانی ئاشووری توکلتی نینورتای دووەم (٨٨٣-٨٥٩پ.ز) و لە باشووری شاری دیاربەکر لە ناوچەی کورخ میلێک دۆزرایەوە کە نووسینێکی شالمانیسەری سێیەمی ئاشووری (٨٥٨-٨٢٤پ.ز) لەسەر بوو بەخەتی مێخی نووسراوە و باسێکی دوورودرێژی لەشکرکێشی سێیەمی دەکات بۆ ناوچەکانی کوردستانی باکوور، شالمانیسەر باس لەرێگەی گەڕانەوەی دەکات دوای لەشکرکێشییەکەی بۆ وڵاتی ئاشوور، لە نزیک دەریاچەی وانەوە دەگەڕێتەوە پاشان بە ناوچەکانی کوردستانی رۆژهەڵاتدا دەگەڕێتەوەو رێگەی هەرێمی خوبشکیا (پایتەخی هەرێمێک بوو لە ناوچەی زێبار و دەوروبەری زێی گەورە تا باکووری رۆژئاوای سیدەکان، ئەوکاتە ئەم هەرێمە خوورییەکان لێی دەژیان) و پاشان بە شاخەکانی(ئەنزیتی)دا تێپەڕی و بە دەربەندی کیرووری (دەربەندی کۆڕێ) کە دەکەوێتە سەروو ئەربیل گەڕایەوە بۆ وڵاتی ئاشوور.

ئاشوور ناصربالی دووەم (٨٨٣-٨٥٩پ.ز)و شالمانیصەری سێیەم، ناوی کیرووری بەشێوەی (کیروری) هاتووە، و لەم سەردەمەدا ناوی شەش فەرمانڕەوای هەرێمی کیرووری هاتووە لە (رۆژمێری لیمو)ی ئاشووریدا (ئەم رۆژمێرە بەهاتنی پاشای نوێ دەستی پێدەکردەوە و هەر ساڵێک لە حوکمی ئەو پاشا ئاشوورییە بە ناوی فەرمانڕەوای یەکێک لە هەرێمەکان یان شارە گرنگەکانەوە ناودەبرا لە رۆژمێری لیمو) ،و لە نووسینە رەسمییەکاندا ئاماژە بەناوی ئەو فەرمانڕەوایە دەکرا بۆ ئاماژەکردن بە بەرواری نووسراوەکە...

ئەمەش ناوی ئەو فەرمانڕەوایانەی هەرێمی کیرووورییە کە رۆژمێری لیموی ئاشووری هەرساڵێک بەناوی یەکێک لە ئەوانەوە ناونراوە:

شیپاشەری (٨٥٣پ.ز)، موشکینس (٨١٣پ.ز)، ئاشوربیل ئەوصەر (٧٩٦پ.ز)، نینورتا موکینیشی (٧٦٥پ.ز)، لیپخورئیلی (٧٢٩پ.ز)، و شەمش ئەوپەخیر (٧٠٨پ.ز).

حنون: نائل، حقيقة السومريين ودراسات أخرى في علم الاثار والنصوص المسمارية، دمشق - ٢٠٠٧)، ص١٦٧،١٦٩.

هەروەها لە سەرچاوە عەرەبی و ئیسلامییەکانی سەردەمی مەغۆلیشدا ناوی هەرێمێک هاتووە کە (فضل الله العمري) باسی دەکات کە پێی گوتراوە وڵاتی (کارکار) (کە نێوان هەولێر و خەفتیان ((رەواندز))و شارەزوور دەگرێتەوە)...(مسالک الابصار/ ج/٣/ل١٢٦-١٢٧) کە بێگومان وڵاتی کارکار لە هەمان ناوچەی هەرێمی کیرووری کۆن بووە و سنوورەکەشی فراوانتر بووە بە بەراوردکردن بە سەردەمە کۆنەکان...

لەبارەی دیاریکردنی ناو و شوێنی وڵاتی کیرووری شوێنەوارناسەکان چەند بۆچوونێکی جیاوازیان هەیە، کە لەم باسەدا دەیانخەینە روو:

١- بەپێی بیللەربێک billerbeck کیرووری دەکەوێتە سەر رێگەی کێلەشین[2].

٢- بەپێی رای شرادەر کیرووری لە کێوەکانی رۆژهەڵاتی هەولێرەوە بەرەو کەنارەکانی دەریاچەی ورمێ درێژ دەبێتەوە، بیللەربێکیش هەمان رای هەبووە.

٣- شترێک streck کیرووری (لەگەڵ گیلزانو) لە هەموو کەناری رۆژئاوای دەریای ورمێ داناوە.

٤- فۆرەر forrer پێی وایە کیرووری تەنها دەشتی حەریرە.

٥- ئۆلمستید پێی وابوو کیرووری دەکەوێتە باشووری

ئامێدی.

٦- سپایزەر وای بۆ چووە کیرووری نێوان هەولێر و رواندزە.

٧- برینکمان **brinkman** وەکو فۆرەر پێی وایە کیرووری تەنها دەشتی حەریر دەگرێتەوە[٣].

٨- **L.d.Levin** پاش ئەوەی ئەو بۆچوونانەی سەرەوە دەگێڕێتەوە، دەڵێت: شوێنی کیرووری لەنێوان هەولێر و رواندزە، لەوانەیە دۆڵی شەقڵاوە و دەشتی حەریری گرتبێتەوە[٤].

٩- **J.E.Reade** بۆچوونێکی جیاوازی هەیە، کە شوێنی کیرووری بەنێوان کۆیە و رانیە لەنزیک زێی بچووک داناوە[٥].

وەک دەبینین جیاوازییەکی زۆر لەنێوان بۆچوونەکاندا هەیە، ئەو بۆچوونانەی، کە کیروورییان بەکێلەشین و رۆژئاوای دەریاچەی ورمێ داناوە، تا رادەیەک زیادەڕەوی پێوە دیارە لە دیاریکردنی شوێنی کیرووری، چونکە کێلەشین و رۆژئاوای ورمێ تا کۆتایی سەدەی هەشتەمی پ.ز بە تەواوەتی نەکەوتە ژێر دەسەڵاتی ئاشووری، هەروەها ئەم ناوچەیە بەتایبەت ناوچەی کێلەشین کە بەموساسیر ناسرابوو لە سەدەی هەشتەمی پ.ز، پایتەختی ئایینی ئورارتییەکانی لێ بوو[٦].

بەڵام لەبارەی بۆچوونەکەی رید **j.e.reade**، کە پێی وایە کیرووری دەکەوێتە نێوان کۆیە و رانیە بەهەمان شێوە رەت دەکرێتەوە، چونکە نووسینەکەی شالمانیسەری سێیەم کاتێک باسی کیرووری دەکات دەڵێت: بەرامبەر (لەسەر) (**ina sag**) (ئەربائیلۆ)یە، واتە بەرامبەر قەڵای هەولێرە ئەمەش تەنها شاخی سەفین و دەربەندی کۆڕێ دەگرێتەوە، چونکە نێوان کۆیە و رانیە زۆر دوورە لە هەولێرەوە بە بەراورد کردن لەگەڵ دەربەندی کۆڕێ و شاخی سەفین، کە لە هەولێرەوە دەبینرێت[٧].

هەروەها پاشای ئاشووری توکولتی نینورتای دووەم لە هێرشەکەی ساڵی ٨٨٦ی پێش زایین، کە کردییە سەر ئەو ناوچەیە باسی ئەوە دەکات، کە بەرێگای دەربەندی کیرووریدا بەرەو شاخەکانی ئوروپنو **urrupnu** (هەیبەت سوڵتان؟) و ئیشرون **isrun** (شاخی کۆسرەت؟)[٨] دا رۆیشتووە لەوێشەوە گەیشتە خاکی لادانی **ladani** (دەشتی رانیە بەپێی فۆرەر)، کە ئەوکاتە لە دەستی لوللوبییەکان و گەلێکی تردا بوو[٩].

لەبەر ئەوە دەردەکەوێت کە کیرووری دەکەوێتە باکووری رۆژئاوای کۆیە. یەکێک لە بەڵگە گرنگەکان بۆ دیاریکردنی شوێنی کیرووری نووسینێکی مێخی پاشای ئاشووری شالمانیسەری سێیەم، کە باسی لەشکرکێشییەکەی دەکات لەساڵی ٨٥٦ پ.ز، کە لەکاتی گەڕانەوەیدا لە هێرشەکەی بۆ سەر میدییەکان لەنێوان هەمەدان و ورمێ بەرەو ئورارتۆ بەرێکەوت[١٠]، پاشان لەوێوە هێرشی برد بۆ **gilzanu** و **hubuskia** (کە دەکەونە بەشەکانی سەرەوەی زێی گەورە) و، لەرێگای **enzite** و بەرەو کیروور هێرشی برد و بە دەربەندی کیرووریدا، کە بەرامبەر هەولێرە **ina sag** بەرەو ئاشوور گەڕایەوە[١١].

بەڵام ئاشوور ناسربالی دووەم (٨٨٣- ٨٥٨ پ.ز) لەکاتی گەڕانەوەیدا لە هێرشەکەی بۆ سەر وڵاتی لوللو لەزێی دوکانەوە بەرەو بالیسان کەوتەڕێ، لەرێی دۆڵی ئالانەوە گەیشتە کیرووری، لە کیروورییەوە گەڕایەوە بۆ نەینەوا، چونکە ئاشوور ناسرپال نەینەوا و هەولێری کردبووە بنکەی سەرەکی بۆ لەشکرکێشییەکانی[١٢]. هەروەها ئاشوور ناسربال بەپێی نووسینەکانی لەساڵی یەکەمی حوکمیدا لەوڵاتی کیروورییەوە رۆشت بەرەو ناوچەکانی باکووری زێی بچووک وەک سیمێسی **simesi** و ئادائوش... تاد[١٣].

هەروەها ئەو نووسینە ئاشوورییانەی باسی باج وەرگرتن دەکەن لەو ناوچانەی، کە دەستیان بەسەردا گرتبوو، چەند جارێک ناوی کیرووری هێنراوە لەم نووسینانەدا، کە زێڕ و زیو و مەڕ و بزن وەکو باجێک ساڵانە لە لایەن ئاشوورییەکانەوە سەنراوە[١٤] شوێنی وڵاتی کیرووری زۆر گرنگ بوو بۆ ئاشوورییەکان، چونکە بە ئەڵقەیەک دادەنرێت لەنێوان ئاشوورییەکان و دوژمنەکانیاندا، هەروەها کیرووری بەستراوە بە هەولێرەوە، چونکە بە یەکێک لەرێگا سەرەکییەکان دادەنرێت بۆ هێرش کردنە سەر ناوچەکانی ناوەوەی زاگرۆس و

پێدەچێت ئەو ڕێگایەی، کە ئێستا هەولێر دەبەستێتەوە بە شەقلاوەوە هەمان ڕێگا لە کۆندا بەکارهێنرابێت، چونکە کاریگەری تۆپوگرافی ناوچەکە تا ئێستاش بەردەوامە لەسەر ڕێگا نوێیەکە، هەروەها نزیکی کیرووری وای کردبوو، کە زۆر گرنگی پێ بدرێت هەروەک دەزانین کە پاشا ئاشوورییەکان لەپێش دەستپێکردنی هێرشەکانیاندا دەهاتن بۆ شاری هەولێر (arba-ilu)، بۆ ئەوەی لە خواوەندی جەنگ عەشتاری ئەربائیلو بپاڕێنەوە بۆ ئەوەی سەرکەوتنیان پێ ببەخشێت لە شەڕەکاندا[15]، ولاتی کیرووری دەکەوێتە نێوان ولاتی ئۆرارتۆ لە باکوور و باکووری ڕۆژهەلات و ولاتی زامووا لە ڕۆژهەلات. ئەربائیلۆ لە باشوور. ولاتی ئاشوور لە ڕۆژئاوا. بەپێی نووسینەکانی ئاشوورییەکان لەسەدەی نۆیەم و هەشتەمی پێش زایین، شوێنی کیرووری دەتوانرێت دیاری بکرێت بەشێوەیەکی گشتی، بەلام دیاریکردنی سنووری ولاتی کیرووری بەشێوەیەکی ڕاست کارێکی ئاسان نییە، چونکە کیرووری ناوی شوێنێکی جوگرافییە نەک ناوێکی سیاسی.

لەکۆتاییدا دەتوانین بلێین کیرووری ولاتێکە یان ناوچەیەکە، کە لە کۆرێیەوە دەست پێدەکات شەقلاوە و دەشتی حەریر و بەشێک لە دۆلی بالیسان دەگرێتەوە. ئەگەر وامان دانا کە ناوی گوند و دەربەندی کۆرێی ئێستا (کە بەدەربەندی قرایر ناوی هاتووە) لە سەدەی پازدەی زایینیدا لە کتێبی «صبح الاعشا في صناعة الانشا»ی قەلقەشەندیدا: بڕوانە قەرەداغی، مێژووی گەلی لوللو پاشماوەی ناوی کیرووری بێت و بە تێپەڕبوونی کات گۆڕانکاری بەسەردا هاتووە و بووەتە کۆری (kirruri-kore، ئەمەش ئەوە ناگەیێنێت کە ناوی کیرووری تەنها گوندی کۆری یان دەربەندی کۆری دەگرێتەوە، بەلکو کیرووری ولاتێکی فراوان بووە، کە دەربەندی کۆری بەشێکی گرنگی ئەم ولاتەی پێک دەهێنا، بەلام ئێمە نازانین کە دەربەندی کۆری دەکەوێتە سەرەتای دەست پێکردنی سنووری ولاتی کیرووری یان ناوەڕاستییەوە. هەروەها بەدووری نازانین، کە ناوی کیرووری بە تێپەڕبوونی کات گۆڕابێت بۆ حەریر (harir-kirruri)، کە ئەمانەش تەنها گریمانێکە، بەلام نابێ ئەوەمان لەبیر بچێت کە ولاتی کیرووری دەشتی حەریر و شەقلاوە و کۆرێ و بەشێک یا هەموو دۆلی بالیسان دەگرێتەوە، هەروەک لەپێشەوە ئاماژەمان پێکرد. بەلام دەتوانین بگەینە ئەوەی کە ناوی دەربەندی کۆرێی ئێستا پەیوەندی بەناوی ولاتی کیروورییەوە هەیە و لە کیرورییەوە وەرگیراوە.

**پەراوێز و سەرچاوە:**

1- saggs,h.w.f, the land of kirruri, iraq, vol 42.part 1, London, 1980, p79.

2-saggs, ibid,p 79.

٣- ئەوانەی سەرەوە لە:

3- Levine, Louis d.; geographical studies in the neo-Assyrian zagros),iran, vol. xi, London, 1973, p 14, n15.

4- Levine, ibid, p.16.

5- sags, ibid, p 79.

٦- الامين: محمود (مسلتا طوبزاوه و كيله شين) سومر مجلد، (١٩٥٢).

7- sages, ibid, p.80.

٨- قەرەداغی، فاضل، مێژووی گەلی لوللو، چاپی دووەم، سلێمانی، ل ٣٤.

٩- هەمان سەرچاوە.

١٠- الهاشمي، رضا جواد و سامي سعيد الاحمد، تاريخ الشرق الادني القديم ايران و الاناضول (بغداد) ص٨٢.

11- saggs, ibid, p.80.

١٢- ساكز: هاري، قوة اشور، ترجمة: عامر سليمان (بغداد-١٩٩٩) ص١١١.

١٣- قەرەداغی، مێژووی گەلی لوللو، ل ٣٧.

١٤- يانكوفسكا، بعض القضايا الاقتصادية في امبراطورية اشور، العراق القديم، دراسة تحليلية للاحوال الاقتصادية والاجتماعية، ت. سليم طه التكريتي، بغداد ١٩٨٦، ص٣٩.

١٥- جميل: فوئاد، ((حدياب.... اربيلا وعشتار... اربيلا) سومر م ٢٥، (١٩٦٩).

* ئەم بابەتە لە گۆڤاری (هەزارمێرد)، ژمارە (٢٦)ی حوزەیرانی ٢٠٠٥ بلاو بۆتەوە.



# هونەری ئۆرارتی لە پارێزگای هەولێر (١٣٠٠-٥٩٠پ.ز)

«توێژنەوەیەکی مەیدانی شیکارییە»

دڵشاد عەزیز زاموا

**ئۆرارتییەکان کێن؟**

لە سەدەی سیازدەی پ.ز بۆ یەکەم جار ناوی ئۆرارتییەکان لە نووسینە مێخییەکانی ئاشورییەکاندا بەرچاو دەکەوێت، ئەم گەلە یەکێکن لە گەلە کۆنەکانی کوردستان و لە سەرەتادا لە هەزارەی سێیەمی پ.ز لەگەڵ خورییەکاندا یەک بنەچە و ئەسڵیان هەبووە، و ژمارەیەک لە توێژەران تێبینی ئەوەیان کرد کە پەیوەندییەکی خزمایەتی و تێکەڵی لە نێوان زمانی خوری و ئۆرارتی هەیە، و بەتایبەت ئەو زمانەی کە لە سەدەی نۆ تا سەدەی شەشی پ.ز بەکارهێنراوە، و (فریدەر)یش جەختی لەسەر ئەوپەیوەندییە کردەوە، و (دیاکۆنۆف)یش ئەمەی سەلماند[1]، و ئەوەش دەرکەوت کە زمانی ئۆرارتی لقێک نییە لە زمانی خوری بەڵکو هەردووکیان سەربە زمانێکی دایک(زمانی خوری - ئۆرارتی سەرەتا)ن و پاشان وەک دوو زمانی سەربەخۆ لە زمانە دایکەکەوە لە (هەزارەی سێیەمی پ.ز)ەوە بە جیا گەشەیان کردووە، و پاشان خورییەکان بۆ ناوچەکانی دیکەی باکووری میسۆپۆتامیا و کوردستان بڵاوبوونەوە و زمانی خوری بووە زمانێکی سەربەخۆ[2].

**شانشینی ئۆرارتو:**

شانشینی ئۆرارتو لە سەرەتادا لەناوچەکانی دەوروبەری دەریاچەی وان سەری هەڵدا و پاشان سنووری دەسەڵاتیان لە دوای سەدەی سیانزەی پێش زایینەوە فراوان بوو، و لە رۆژئاواوە تا ناوچەکانی کوردستانی سوریا و لە باکوورەوە تا نزیک دەریای رەش و لە رۆژهەڵات و باکووری رۆژهەڵاتەوە بۆ ناوچەکانی کوردستانی ئێران و ئەرمینیا، و لە باشوورەوە تا ناوچەکانی دیانا و سیدەکان و ئامێدی و قەڵادزێ فراوان بوو، و دەستیانگرتبوو بەسەر دەروازە دەوڵەمەندەکانی سەرچاوەی کانزاکانی کوردستانی باکور، ئۆرارتییەکان لە (سەدەی سیانزەیەمی پ.ز)ەوە، لە گۆڕەپانی سیاسی و سەربازی ناوچەکانی باکوری میسۆپۆتامیادا دەرکەوتن و لە نووسینە مێخییەکانی پاشای ئاشوری (شالمانیصەری یەکەم ۱۲۷٤-۱۲٤٥پ.ز)دا بە شێوەی (ئۆرارتی) ناویان هاتووە[٣].

**ناوی ئۆرارتییەکان:**

ئۆرارتییەکان بە خۆیان دەگوت خالدی، و بەزمانەکەشیان دەگوت زمانی خالدی، ئەم ناوە لە ناوی خواوەند(خالدی/ هالدی)یەوە هاتووە کە خواوەندی نەتەوەیی ئۆرارتییەکان بوو، بەڵام لە نووسینە مێخییەکانی ئاشورییەکاندا بە (ئۆرارتی)ناویان هاتووە، و بە وڵاتەکەشیان گوتراوە وڵاتی ئورارتو،، هەروەک دیارە پاشگری(تو)لە زمانە کۆنەکانی میسۆپۆتامیادا، بەکاردێت بۆ دیاری کردنی شوێنی وڵات و ناوچە لە هەر چوارلایەکە، هەروەک چۆن دەگوترا(مارتو، سوبارتو)، ئەوەی شایەنی باسە ناوی ئۆرارتۆ تائێستاش بە زیندویی لە ناوی شاخە بەرزەکانی(ئارارات)دا ماوەتەوە، هەروەها(مار) پێی وایە کە کاردۆخییەکان هەمان بنەچەی هاوبەشیان لەگەڵ ئۆرارتییەکان هەیە[٤]، شایەنی باسە زۆرێک لە رۆژهەڵاتناس و نووسەرە بیانییەکان ئەرمەنییەکان بە پاشماوەی ئۆرارتییەکان دەزانن و لە نووسینەکانیاندا لە جێگەی ناوی ئۆراراتو (ئەرمەن) و (ئەرمەنی) بەکاردەهێنن و گەلی ئەرمەن دەبەنەوە سەر بنەچەی ئەم گەلە کۆنە، بەڵام لە راستیدا ئەم بۆ چوونەیان هەڵەیە چونکە ئەرمەن دوای ئۆرارتییەکان دەرکەوتوون و پەیوەندییان بە یەکەوە نییە، بێگومان هۆکاری ئاینی لە پشت بۆچوونی نووسەرە بیانییەکانەوەیە...!.

**هونەری ئۆرارتی لە کوردستانی باشوور:**

لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەوە تا ئێستا زۆر کتێب و بابەت لەسەر هونەری ئۆرارتی بە شێوەیەکی گشتی نووسراون، بەڵام ئەوەی تێبینی دەکرێت لە پەنجاکانی سەدەی بیستەوە تا ئێستا چەندین پارچە شوێنەواری وەک (پەیکەر، نەخش، گڵێنە و گۆزە)ی گەورە و بچووک لە ناوچەکانی کوردستانی باشوور لە ناوچەی حەریر و رەوندوز و سیدەکانەوە گەیەنراونەتە مۆزەخانەکانی هەولێر و سلێمانی و مۆزەخانەی نیشتیمانی عێراقی، و هەندێک کاتیش هەواڵی ئەم شوێنەوارە دۆزراوانە لە گۆڤارە تایبەتەکانی شوێنەوار بڵاوکراونەتەوە، لەگەڵ ئەوەی کە ئەو راپۆرتانەی نووسراون و بڵاوکراونەتەوە زۆر کورت بوون و هەندێک کات واتا دار و گشتگیریش نەبوون، ماوەی چەند ساڵێکە لە هەوڵی زانیاری کۆکردنەوەدابووین لەسەر ئەو شوێنەوارانەی کە لەو ناوچانە دۆزرانەونەتەوە، و چەندین سەردانی مەیدانی شوێنەوارەکانمان کردووە و قەڵاکان و نەخشی چیاکان و میلەکان و مۆزەخانەکانمان بەسەر کردەوە، بۆ ئەوەی بزانین کە ئایا شتێک بەناوی هونەری ئۆرارتی کوردستانی باشوور هەیە؟

**١- هونەری نەحت:**

**أ.پەیکەرەکان:**

لەم پەنجا ساڵەی رابردووەوە تا ئەم چەند ساڵەی دوایی مۆزەخانەی عێراقی و مۆزەخانەی سلێمانی و هەولێر، چەند پەیکەرێکیان لە ناوچەکانی(رەواندوز)و (سیدەکان)و (حەریر)ەوە بە دەست گەیشت، و زۆرێک لەم پەیکەرانە لە لایەن شوێنەوارناسانەوە بە پەیکەری سەردەمی ئۆرارتییەکان دادەنرێن، و پێویستە پێش ئەوەی باس لە سەردەمی ئەم پەیکەرانە بکەین، دەبێت لە رووی هونەری و جۆری نەحتەوە باسی ئەم پەیکەرانە بکەین، بۆ ئەوەی لە رێگەی ئەم باسکردنەوە تایبەتمەندییە هونەرییەکانی ئەم پەیکەرانە بناسین و لەو رێگەیەوە مەبەست لە دروستکردنی پەیکەرەکە و سەردەمەکەی دیاری بکەین.

**٨. پەیکەرەکانی مۆزەخانەی سلێمانی:**

ئەم دوو پەیکەرە لە ناوچەی مجێسیر دۆزرانەتەوە و گواستراونەتەوە بۆ مۆزەخانەی سلێمانی:

**پەیکەری یەکەم:**

ئەم پەیکەرە لە ناو مۆزەخانەی سلێمانی نمایش کراوە، لە بەردێکی لمی(sand stone) سەوزباو بە نەحتی بەرجەستەی بارز (نحت المجسم البارز) نەحت کراوە، پیاوێکی ریشداری راوەستاو نیشان دەدات، پێوانەکەی (درێژی ٢٢٥سم، و ئەستوری پەیکەرەکە لە نێوان (٢٠ بۆ ٢٨سم) بوو، درێژی ریشی(٧٧سم)، و سەری درێژکۆلەیە و درێژی سەری تا شانی (٥٧سم) دەبێت، و ملی کورتە و تەنها(٦سم) دەبێت، دەست و قاچەکانی بە شێوەیەکی روون دەرنەکەوتوون و لە خوار ناوقەدییەوە گرێیەک بۆ پەیکەرەکە کراوە.





کردوون و داخوراون، هونەرمەند پەیکەرەکەی بە شێوەیەکی بەرجەستە دەرنەخستووە و بەڵکو تەنها یەک رووی بەردەکە نەحتکراوە و بەم شێوە نەحتە دەگوترێت نەحتی موجەسەمی بارز.

**پەیکەری دووەم:**

بەڵام ئەم پەیکەرە کە بە هەمان شێوە لەناو مۆزەخانەی سلێمانی نمایش کراوە، پەیکەری پیاوێکی ریشداری راوەستاوە بە نەحتی بارز لە سەر بەردێکی لمی سەوزباو نەحتکراوە و درێژییەکەی (١٨٠سم)، و ئەستوورییەکەی لە نێوان (٢٣سم بۆ ٤٣سم) دەبێت، داردەستێکی بەدەستییەوە گرتووە کە درێژییەکەی (٦٣سم) دەبێت و سەری داردەستەکە وەک چەکوش وایە(١٢سم)، مل و شان و سەری لەیەکتر جیانەکراوەتەوە، قاچەکانیشی دەرنەکەوتوون بەڵکو هەردوو قاچەکانی پێکەوە بەشێوەیەکی درێژکۆلە تێکەڵ بوون.

ئەم دوو پەیکەرە لە رووی شێوازی نەحتەوە زۆر باش نەبوون و گرنگییان پێ نەدراوە، جگە لەوەی مادەی دوو پەیکەرەکە زۆر باش نین و داخوراوە، چونکە بەردی لمییە و هۆکاری ئاوهەوا و باران زۆرکاریگەری لەسەر بەردەکان

ئەم دوو پەیکەرە شێوەیان لە لاشەیەکی کفن کراو دەچێت، و وەک مردوویەک نەحتکراون، و ئەمەش دەمانگەیەنێتە ئەوەی کە مەبەست لە دروستکردنی ئەم پەیکەرانە مەبەستێکی ناشتن بووە و پەیوەندی بە گۆڕی کەسێکی تایبەتەوە هەیە، گومان دەبەین کە کرابێتە کێلی گۆڕ.

**B. پەیکەرەکانی مۆزەخانەی هەولێر:**

پەیکەری یەکەم: ئەم پەیکەرە لە ناو مۆزەخانەی هەولێر نمایش کراوە، و لە بەردێکی لمی سەوزباو، بە نەحتی موجەسەم پیاوێکی ریشداری راوەستاو نەحتکراوە، و بەدەستی راستییەوە کاسێکی گرتووە و دەستی چەپی خستووەتە سەرسکی و زۆرگرنگی بە بەشی خوارەوەی لاشەی نەدراوە، و هەوڵدراوە دەم و چاوو و لوت و برۆکانی دەربخرێت.



**پەیکەری دووەم:**

لە بەرد نەحت کراوە، و پیاوێکی ریشداری راوەستاو نیشان دەدات، کە بە نەحتی موجەسەم نەحتکراوە و بەشێکی سەری شکاوە، دەستی چەپی خستووەتە سەر سنگی، و دەستی راستی خستووەتە سەر بەشی سەرەوەی سنگی، و دەست دەدات لە ملوانکەکەی، بەشی سەرەوەی لاشەی لە بەشی خوارەوەی جیاکراوەتەوە و بە خەتێکی قووڵ



هەڵکەندراوە لەسەر ناوقەدی، و گرنگی بە ئەندامەکانی زاوزێی دراوە بەشێوەکی گۆیی نەحتکراوە و بە رووتی دەرخراوە، هەروەک تێبینی دەکرێت کە دەست و قاچەکانی بە لاشەیەوە بەستراوە، و هونەرمەندەکە گرنگی بە بەشی پشتەوەی پەیکەرەکە نەدراوە کە ئەمەش بەڵگەیە بۆ ئەوەی پەیکەرەکە بە دیوارێکەوە هەڵواسراوە و پشتەوەی دیارنەبووە، شێوازی نەحتی ئەم پەیکەرە بە نەحتی موجەسەمی بارز ناودەبرێت، و پێدەچێت ئەم پەیکەرە یەکێک بێت لە پەیکەری خواوەندەکانی بە پیتی هەیە.

**پەیکەری سێیەم:**

ئەم پەیکەرە لە گۆڕەپانی مۆزەخانەی هەولێر نمایشکراوە، لە بەردی لایمستۆن بە نەحتی بارز نەحتکراوە، بەشێک لە سەری پەیکەرەکە شکاوە و نەحتی پیاوێکی





ریشدارنیشاندەدات، دەستی چەپی خستووەتە سەر سکی، دەستی راستی خستووەتە سەر سنگی و شتێکی بە دەستی راستییەوە گرتووە لە کاسێک دەچێت، ئەوەی ئەم پەیکەرە لە هەموو پەیکەرەکانی مۆزەخانەکانی کوردستان جیادەکاتەوە و جیاوازە لە شێوازی نەحتکردنەکەیەتی، چونکە بەشی خوارەوەی لاشەی بە شێوەی لەسەر لا نەحت کراوە، و قاچەکانی رووی کردووەتە لای چەپ، پێیەکانیشی بەشێوەی لەسەر لا نەحتکراوە و گشت پەنجەکانی پێی بە شێوەی لەسەر لا نەحتکراوە، و ئەندامی زاوزێی لە نێوان قاچەکانی بە شێوەی خەتێکی ئەستوور نیشاندراوە، هەموو پەیکەرەکە لە رووی بەردێکی لاکێشەیی بە نەحتی بارز نەحتکراوە.

**پەیکەری چوارەم:**

بەهەمان شێوە ئەم پەیکەرەش لە گۆڕەپانی مۆزەخانەی هەولێر نمایشکراوە، لە سەر بەردی لایمستۆن بە نەحتی بارز نەحتکراوە، و دیمەنی کەسێکی ریشداری نوک تیژ،

بەشێکی سەری پەیکەرەکە شکاوە، و دەستەکانی خستووتە سەرسنگی بە (شێوەی نوێژی سۆمەری)، و شتێکی بە هەردوو دەستییەوە گرتووە، و گرنگی بە بەشی خوارەوەی لاشەی نەدراوە، شێوازی نەحتەکەی شێوازێکی سەرەتاییە و هونەرمەند گرنگی بە وردەکارییەکان نەداوە و نەیتوانیوە وردەکارییەکان و جوڵەکان بەشێوەیەکی واقعی دەرببڕێت، و ئەم پەیکەرە لە لایەن شوێنەوارناس (د. نوعمان جومعە) لە (گوندی مەکردان)لە رۆژئاوای دەشتی حەریر، لە نزیک گوندی حەریر دۆزراوەتەوە و گەیاندویەتییە مۆزەخانەی هەولێر، ئەم پەیکەرە بە هەمان شێوەی پەیکەرەکانی دیکە گرنگی بە بەشی دواوەی پەیکەرەکە نەدراوە، ئەم پەیکەرە هەرچەندە لە رووی شێوازی نەحتەوە زۆر سادەیە بەڵام ئایکۆنۆگرافی ئەم پەیکەرە هاوشێوەی پەیکەرە سۆمەرییەکانە، لە حاڵەتی نوێژکردن نیشان دەدات، کە دەستەکانیان دەخەنە سەر سنگیان.

ناتوانرێت ئەم پەیکەرە بە پەیکەرێکی ئۆرارتی دابنرێت، بەڵام ئەم پەیکەرە گرنگی خۆی هەیە و لە رووی بابەتەوە بۆ هەزارەی سێیەمی پ.ز دەگەڕێتەوە، و لە رووی شێوازی نەحتەوە شێوازێکی زۆر سادەی هەیە.

### پەیکەرەکانی مۆزەخانەی عێراقی:

لە لایەن تیمێکی بەڕێوەبەرایەتی گشتی شوێنەواری بەغدادەوە دوو پەیکەر لە نزیک گوندی مجێسیر کە دەکەوێتە ناحیەی برادۆست دۆزرانەوە.

### پەیکەری یەکەم:

ئەم پەیکەرە لە بەردێکی لمی سەوزباوی تێکەڵ بە چەو و پارچە بەرد دروستکراوە، کە پێی دەگوترێت (Conglomerate stone)، و درێژییەکەی ١٩٥سم، و تیرەکەی ٩٧سم، کێشی ٢٥٠کگم دەبێت، سەر و دەستەکانی بە شێوەی نەحتی بارز نەحت کراون، دەستی راستی خستووەتە سەر سنگی و دەستی چەپی شۆڕکردووەتەوە، شێوەی پەیکەرەکە لە لاشەیەکی کفن کراو دەچێت، ئەم پەیکەرە لە لایەن شوێنەوارناسی مۆزەخانەی عێراقییەوە نەگواسترایەوە بۆ مۆزەخانە لە بەر قورسی کێشی پەیکەرەکە و سەختی رێگا لە پەنجاکانی سەدەی بیست دا[١٤].



### پەیکەری دووەم:

ئەم پەیکەرە بە هەمان شێوە لە نزیک گوندی مجێسیر دۆزرایەوە، پەیکەری باڵندەیەکە قاچەکانی شکاوە، بەڵام بەهەمان شێوەی پەیکەری یەکەم جۆری ماددەکەی و شێوازی نەحتەکەی کاریگەری لەسەر نارێکی شێوەی پەیکەرەکە هەبووە، و کاریگەری سروشتی بەردەکەی شێواندووە، و زۆرتر لە بەردێکی سروشتی دەچێت و شێوەی باڵندەیەکی وەرگرتووە، ئەم پەیکەرە لە ساڵی ١٩٥٥ لایەن شوێنەوارناس (د.مەحمود ئەمین)دوە گواستراوەتەوە بۆ مۆزەخانەی عێراقی، بە پێی راپۆرتی ئەم شوێنەوارناسە ئەو ناوچەیەی ئەم پەیکەرانەی تێدا دۆزرایەوە ناوچەیەکی شوێنەواری بوو و چەندین پارچە گۆزە و سواڵەت لە ناوچەکەدا بلاوبووبوودوە.

دەربارەی ئەو پەیکەرانەی کە لە سەرەوە باسمانکردن و ئێستا لەو مۆزەخانانەی نمایشکراون تا ئێستا نازانرێت ئەم پەیکەرانە بە چ مەبەستێک دروستکراون، و هەندێک پێیان وایە کە ئەم پەیکەرانە پەیکەری(خواوەند خالدی) خواوەندی نەتەوەیی ئۆرارتییەکانە، بەڵام هەندێکی دیکە پێیان وایە ئەم پەیکەرانە بۆ مەبەستێکی دڵتەنگی و تازیە و مردوو ناشتن بەکارهێنراون، بەڵام پێدەچێت ئەم پەیکەرانە لە شوێنێکی تایبەت چەقێنرابن چونکە

بنکەکەیان تیژە و و قاچەکانی دروستنەکراوە، و بەشێوەکی تیــژی درێژکــۆلە دروســتکراون، و گـرنگی بە پشــتــەوەی پەیکەرەکە نەدراوە، کە پێدەچێت لە شوێنێک دانرابن، و بەدیوارێکەوە چەسپێنرابن، یان لەسەر گۆڕەکان وەک کێلی گۆڕ چەقێنرابن چونکە زۆربەیان بەو شێوەیە دۆزراونەتەوە کە پاشماوەی قوڕ بە بەشی خوارەوەیانەوە هەیە و لە زەوی چەقێنراون و تا ئێســتاش هەست بەو پاشمـاوەیە دەکرێت جگە لەوەی کـە نەحــتکردنی بەشـەکـانی خـوارەوەی ئەم پەیکەرانە بە شێوەیەکە کە ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە لە زەوی چەقێنراون، و بەم شـێـوەیە پێـدەچێت کـە هەندێک لەم پەیکەرانە وەک کــێلی گــۆڕ بەکــارهێنرابن، و چەند بۆ چوونێکی نوێ ئەم پەیکەرانە بە پەیکەری ســەکــیــسی (سکیـــــپی) دادەنێن[٧٤]، هەرچەندە ئەم بۆ چوونەش پێــویــستی بە بەڵگەی زۆر هەیە و کنەو پشکنینەکـانی داهاتوو دەریدەخەن کە ئایا ئەم پەیکەرانە بەرهەمی کاری هونەری ئۆرارتییــەکـانە یان ســەکــیـسی یان هەرگـەلێکی دیکەی کۆنی کوردستانن.

### ب. نەخـــــشی چیــــــای هەریر و پەیوەندی بە ئۆرارتییەکانەوە؟

(مـارگرێت ریمشنایدەر) پێی وایە مەنحوتەی حەریر (پەیکەرێکی ئۆرارتییـــــە)، بەڵام نازانرێت بۆچی ئەم مـەنحـوتەیە بە مـەنحـوتەیەکی ئۆرارتی ناودەبات، بەڵام ئەگەر بێت و لە مەنحوتە بڕوانین دەبینین کە مەنحوتەکە لە رووی شێـوازی نەحت و وەستـان و جل و بەرگـەکـانیــیەوە مــەنحــوتەیەکی ســەردەمی ئەشکانیـــیــە، و پێــدەچێت سەرکردەیەکی جەنگاوەری (شانشینی ئەدیابین)بێت کە پایتەختەکەی قەڵای هەولێر بوو، لەبەرئەوە نەخشی چیای هەریر پەیکەرێکی ئۆرارتی نییە.

### دۆزینەوەی گـــلـــێـــنەی ئۆرارتی لە ناوچەی دیانا لە پارێزگای هەولێر:

کنەو پشکنینە شوێنەوارییەکان دەریان خستووە کە بۆ یەکەم جار گڵێنەکاری لە کوردسـتـان دەرکـەوتووە، ئەم داهێنانە بۆ یەکەم جار لە گوندی (تەپە گۆران)ی نزیک کــرمــاشــان(لە رۆژهەڵاتی کــوردســــتـــان)لە دەوروبەری (٦٨٠٠ق.م) روویداوە، بە پێی رای شــــــوێنەوارناس (جیمس میلارت) گڵێنەسازی لە گوندی (تەپە گۆران)ەوە گواسـتراوەتەوە بۆ(گوندی چەرمـو/لە نزیک چەمچەماڵ) پاش پەنجـا سـاڵێک لە دەوروبەری (٦٧٥٠ق.م) فــێــری گڵێنە دروستکردن دەبن[٥].

هەروەها لە پارێزگای هەولێر پشکنینەکانی رزگارکردنی شوێنەوارێک لە ناوچەی (بەرد حوشتر)جۆرێک لە گڵێنەی دەرخســتــووە کە زۆر سـادە و نارێکە، رووەکـەی زبرە و بە دەست دروســــــتکراوە و لە پلەیەکی گـــــەرمی نزمــــدا ســـورکـــراوەتەوە، ئەم جـــۆرە گـــلـــێـنەیە بە پێی رای ئەو شــوێنەوارناســانەی کــە بەشــداریــیــان کــردووە لە کنەو پشـکنینەکـانی (بەردحـوشـتـر)دا باس لەوەدەکـەن کـە لەم شـوێنەواردەدا نشـیـنگەیەک دەرکـەوت کـە پێکهاتبـوو لە کـوخی بازنەیی و ئەم جـۆرە بینـاسـازییـەش بە یەکـێـک لە کـۆنتـرین شـێـوازەکـانی بیناسـازی دادەنرێت، و ئەم جـۆرە گڵێنەیەش بە هاوشێوە و هاوسەردەمی گڵێنەی چەرمو و حەسونەدادەنێن، و گڵێنەی بەردحوشتر بە کۆنترین جۆری گـــلـــێنە دادەنرێت کـە تا ئێـســتــا لە سنووری پارێزگـای هەولێـردا دۆزراوەتەوە، و جگە لەوەش گـلـێـنەی سـەردەمی حەلەف (٤٩٠٠-٤٥٠٠پ.ز)و گڵێنەی سەردەمی عوبەید (٤٥٠٠-٣٥٠٠پ.ز) و گـــلـــێـنەی ســەردەمی وەرکـــا (٣٥٠٠-٣١٠٠پ.ز) و گـــلـــێـنەی ســەردەمی خـــوری و مــیــتــانی(هەزارەی دووەمی پ.ز) لە ناوچەکـانی دیانا و ئەشکەوتەکـــانی دەوروبەری دۆزراوەتەوە، و گـــلـــێـــنەی سەردەمی ئاشوری و ئەشکانی و سـاسـانی و ئیـسـلامی لە شاری هەولێر دۆزراوەتەوە.

بەڵام دەربارەی دۆزینەوەی گـــلـــێـــنەی ئۆرارتی لە کوردسـتـانی باشوور، تەنهـا لە سنووری پارێزگـای هەولێر دوو نمونەی زۆر گـرنگمـان لەبەردەسـتدایە، کـە لە ناوچەی دیانا دۆزراونەتەوە، و گـــلـــێـنەی ئۆرارتی لە باشـــوری کـوردسـتـان و مـیـسـۆپۆتامـیـا تا ئێـسـتـا هیـچ ئامـاژەیەکی پێنەکـراوە و لە کنەوپشـکنینەکـانیـشـدا نەدۆزراوەتەوە و ئەگەر دۆزرابێتەوە پێی نەگوتراوە گڵێنەی ئۆرارتی، دیارە هۆکـــاری ئەمـــەش پەیوەندی بە سنووری دەســــەڵاتی ئۆرارتیــیــەکـانەوە هەیە لە باشـووری کـوردسـتـان، چونکە سنووری بەردەوامی ئۆرارتییەکان لە باشووری کوردستان لە ناوچەیەکی بەرتەسک دا بوون، شــانشـــینی ئۆرارتو لە باشـووردەوە دەگـەیشـتــە ناوچە سنوورییـەکـانی باشـووری

کوردستـــان لە سـەر سنووری ئێـستـای(تورکـیـا-عـێـراق/ئێـران-عـێـراق) و لە ناوچەکانی بەراواری باڵا، ئامێدی، دیانا، سیدەکان، رواندز، تا ناوچەکانی قەندیل و قەڵادزێ)، دیارە ئەم ناوچانەش هیچ کنە و پشکنینێکی بۆ ئەو مەبەستە تێدا نەکراوە، تاکە پشکنینێک کە ئەنجام درابێت لەگـردی (بانەهێلک) لە نزیک رووباری دیانا لە لایەن تیـمێکی ئەمریکی-بەریتـانییەوە ئەنجامدراوە و گڵێنەی سەردەمی حەلەف (٤٩٠٠-٤٥٠٠پ.ز)ی تێدا دۆزرایەوە، جگە لە کنەوپشکنین لە ئەشکەوتەکـانی (هاودیان، دیان، بەستـوون) کـە شـوێنەواری چاخـە بەردینەکـان و چاخی کـانزایی و برۆنزییـان دەرخست، و شوێنەواری ئۆرارتییـان تێدا نەدۆزرایەوە، و بەهۆی جەنگە بەردەوامەکانی سەدەی بیست و تا ئێستاشی لە گەڵدا بێت ئەو ناوچە سنووریانە ئارام نەبوون و هیچ تیمێکی بیانی و ناوخۆیی بۆ کنەو پشکنین رووی تێنەکردوون،، کە ئەمەش هۆکاری دەرنەکەوتنی شوێنەواری ئۆرارتییە لەم ناوچەیەدا، جگە لەوەی پێویستە خوێندنەوەیەکی دیکە بۆ هەندێک لەو شـوێنەوارانەی هەزارەی یەکـەمی پ.ز بکرێت کـە لە کنەوپشکنینەکانی گردەکانی دەشتی رانیە دا لە پەنجاکانی سـەدەی بیسـت لە کـاتی بنیـاتنانی بەنداوی دوکـاندا دەرکەوتن، چونکە ئەو ناوچانە لەگەڵ ئەوەی لە سەردەمی ئۆرارتییەکان ناوچەیەکی (لولوبی) و (خوری)نشین بوون، بەڵام لێرەدا باس لە کاریگەری شارستانی و گواستنەوەی بازرگـانی دەکـەین و پێـمـان وایە کـە گـڵێنە و هونەری ئۆرارتی لەم ناوچانەدا هەبووە و لە رێگەی پەیوەندی و بازرگانییەوە گواستراوەتەوە بۆ ئەم ناوچەیە.

دوو گـۆزەی ئۆرارتی لە ناوچەی دیانا دۆزراونەتەوە و وەک دوو نمونەی گڵێنەی ئۆرارتی کە تاکە نمونەی گڵێنەی ئۆرارتین کە تا ئێستا لە کوردستانی باشوور دۆزرابێتنەوە:

### گۆزەی یەکەم:

شوێن: لە گردێکی شوێنەواری نزیک گوندی هاودیان لە سـەر رووباری هاودیان دۆزراوەتەوە، و ئێـسـتـا لە مـۆزەخانەی تایبـەتی (ئاڤان شێخ ئاخـر)ە لە هاودیان پارێزراوە کراوە.

گۆزەیەکی قەبارە مامناوەندە، بەدەست دروستکراوە، لە



**ئاژەڵی یەکەم لەسەر رووی گۆزەکە**

پلەیەکی گـەرمـای بەرزدا سـوورکـراوەتەوە، قـوڕەکـەی رەنگێکی قاوەیی هەیە، پاشماوەی سووتان بەسەر رووی دەرەوەیەتی، لێوارەکـەی لارە بۆلای دەرەوە، و بەشێک لە دەمـەکـەی شکاوە و تیـرەی دەمـەکـەی ١١سم دەبێت، و ملێکی کـورتی هەیە، قـوڵـیـەکـەی ١٦سم دەبێت، بەدەن(لاشـە)یێکی شێـوە گـۆیی(شـبـە کـروی) هەیە، لە ناوەڕاسـتی بەدەندا تاڕادەیەک چەمـانەوەیەک هەیە، بنکەکەی نارێکە، رووی دەرەوەی گۆزەکە بە دیمەنی چەند ئاژەڵێک کە شاخێکی چەماوەی درێژ و کلکێکی کورتی هەیە کـە بۆ سـەرەوە چەمـاوەتەوە، و لە بزنێکی کـێـوی دەچێت بە شێوەی بارز لە سەر بەدەنی گۆزەکە دروستکراوە، و هەر چوارپەلەکەی بە شێوەیەکی روون دەرکەوتووە، پاشان دوو ئاسک(بزنە کـێـوی)ی دیکەش لە سـەر رووی گـۆزەکـە دەردەکەون، و هەموویان روویان لە لای راستە بەو شێوەیە بە دەوری یەکـتـردا دە سـووڕێنەوە، هەریەک لەم سێ ئاژەڵە دەمـیـان کراوەتەوە بەڵام دووانیان دەمیـان زۆرتر کراوەتەوە و ئاژەڵی سـێـیـەمـیش سـەری بەرزکردۆتەوە و دەمـیـشـی زۆر کـراوەیە وەک ئەوەی دەنگێک دەربکات(ببـارێت)، و لە نێوان هەریەک لەم سێ ئاژەڵەدا لە سەر رووی گۆزەکە چوار هێڵی ستوونی بارز هەیە، و کۆی گـشـتی هێڵەکان دووانزە



**ئاژەڵی ژمارە دووەم لەسەر رووی گۆزەکە**

هێڵە کە ئاژدڵەکەان لەیەکتر جیادەکاتەوە.

ئەم گۆزەیە لە گۆزەیەکی تایبەتی دەچێت و بۆ مەبەستێکی تایبەتی دروستکراوە و بەکارهێنراوە و زۆربەی کات ئەم جۆرە گۆزانە بۆ مەبەستی جوانی یان ریورەسمی ئاینی و سحری بەکاردەهێنران، بەڵام پێدەچێت لە سەردەمەکانی دواتردا ئەم گۆزەیە بۆ چێشت لێنان(للطبخ) بەکارهێنرابێت چونکە پاشماوەی سووتان بە بەدەنەکەیەوە دیارە.



**ئاژەڵی سێیەم لەسەر رووی گۆزەکە**



**دەمی گۆزەکە لە رووی سەرەوە**

### گۆزەی دووەم:

ئەم گۆزەیە لە (گوندی دێلـزێ)ی تەنیشت گوندی هاودیان نزیک دیانا دۆزراوەتە، و لە لایەن هاوڵاتی (حەسەن مەحمود دێلـزی) لە (لە حوزەیرانی ساڵی ٢٠٠١)دا پێشکەش بە (مۆزەخانەی بەشی شوێنەواری زانکۆی سەڵاحەدین) کراوە.

### وەسف:

پێکهاتووە لە گۆزەیەکی قەبارە مامناوەند، بەدەست دروستکراوە، و لە پلەیەکی گەرمی بەرزدا سوورکراوەتەوە، لێوارەکانی نارێکە و بەشێکی شکاوە، و ملێکی کورتی هەیە، و بەدەنێکی شێوە گۆیی نارێکی هەیە، و چەمانەوەیەکی تیژ لە ناوەڕاستی بەدەنی دا هەیە، بنکەکەی نارێکە، و قوڕەکەی رەنگێکی قاوەیی تۆخی هەیە، پاشماوەی سووتان لەسەر رووەکەیەتی، و پێدەچێن بۆ چێشتلێنان بەکارهێنرابێت و رووی دەرەوەی بەدەنی گۆزەکە رازێندراوەتەوە بە(٢٩) هێڵی بارزی ستوونی لە شانی گۆزەکەوە دەستپێدەکات تا نزیک بنکەی گۆزەکە، ئەم هێڵانە دەوری بەدەنی گۆزەکەیان لە هەموو لایەکەوە داوە.



**هونەری بیناکاری ئۆرارتی لە کوردستانی باشوور:**

وەک لای هەمووان ئاشکرایە تا ئێستا هیچ کنەوپشکنینێک لەناوچەی دەسەڵاتی ئۆرارتییەکان لە کوردستانی باشووردا ئەنجام نەدراوە، بەڵام لەناوچە سنوورییەکانی(تورکیا و عێراق) جۆرێک لە بیناسازی بەرچاو دەکەوێت هاوشێوەی بیناسازی قەڵا ئۆرارتییەکانن کە لە ناوچەکانی پایتەختی ئۆرارتییەکان لە کوردستانی باکوور(لە دەوروبەری دەریاچەی وان) و ناوچەکانی کوردستانی رۆژهەڵات دەرکەوتوون و بە نموونەی هونەری ئۆرارتی دادەنرێن.

**کەلا قومری (کەلا هرور) لە بەرواری باڵا:**

ناوچەی بەرواری باڵا یەکێکە لەو ناوچە سنوورییانەی کە دەکەوێتە باکووری شاری دهۆک، و بەناوبانگە بە دەوڵەمەندی لە رووی بەروبوومی سروشتی و میوە و سەوزە و جوانی سروشتەکەیەوە، لە سەردانێکی مەیدانیدا بۆ ئەو ناوچەیە قەڵایەکی سەختمان لە نێوان گوندی قومری و گوندی هرور لە کۆتا خاڵی سنووری نێوان تورکیا و عێراقدا بەرچاوکەوت، و سەرکەوتن بۆ ئەم قەڵایە زیاتر لە کاتژمێرێک دەخایەنێت و لە لوتکەیەکی زۆر سەخدایە کە زیاتر لە دووسەد مەتر لە ناوچەکانی دەوروبەری بەرزترە، لە



رێگەدا پێش ئەوەی بگەینە قەڵای هرور، لە دۆڵەکەدا گەیشتینە دوو سەرچاوەی ئاو کە ئەوانیش دوو (کانی) بوون و ئاوێکی زۆریان لێدەهاتە دەردەوە، لە نێوان ئەم دوو سەرچاوە ئاوەدا بینایەکی گەورە و چەند شورایەک هەیە کە لە بەردی گەورەی ئەندازەیی رێک دروستکراون، پاشان بە دۆڵەکەدا سەردەکەوێت و دەگەیتە قەڵایەکی سەخت کە بە قەڵای قومری یان (کەلا هرور) ناسراوە، و ئەم قەڵایە یەکێکە لە قەڵا سەختەکانی کوردستان و داگیرکردنی ئاسان نەبووە، چونکە لە سێ لایەوە سەرکەوتن بۆ قەڵا سەخت و مەحاڵە و تەنها لە یەک لایەوە دەتوانیت بگەیتە قەڵا ئەویش تەنها لە دەروازکەیەتی و سەرکەوتن بۆ ئەم دەروازەیەش زۆر سەختە، و شوراکان و بەشێکی زۆر لە دیوارەکانی ئەم قەڵایە وەک خۆی ماوەتەوە و چەندین بیری ئاوی تێدایە، ئەم قەڵایە لە رووی بیناسازی و مادەی بیناوە هاوشێوەی قەڵا ئۆرارتییەکانە، و چەندین چیرۆک و ئەفسانە دەربارەی ئەم قەڵایە هەیە، و باس دەکەن کە پاشایەک لەم قەڵایە ژیاوە و هەموو ساڵێک کچێکی ناوچەکەی بە زۆر هێناوە و دوای ئەوەی کە منداڵەکەی دەبێت ژنەکە دەکوژێت و لە شورای قەڵاکەوە منداڵەکە بە زیندوویی فڕێ دەداتە خوارەوە، لە یەکێک لە ساڵەکاندا لە کاتی فڕێدانە خوارەوەی منداڵەکە لە سەر شوراکەوە باڵندەیەکی گەورە منداڵەکە دەگرێتەوە و لە مردن رزگاری دەکات...، جگە لەمەش باس لەوە دەکرێت کە نەتوانراوە قەڵاکە بگیرێت و ئەم پاشا زۆردارە لە ناوببرێت، بەڵام



**دیواری قەڵای (توشپا) پایتەختی ئۆرارتییەكان، هاوشێوەی دیواری قەڵای (كەلا هرور/كەلا قومری)یە**

جەنگاوەران خۆیان وەك دارتاش نیشان دەدەن و چەك و تیر و شمشێرەكانیشیان لە ناو سندوقەكان دەشارنەوە و بەو شێوەیە پاشا رازی دەبێت كە دارتاشەكان بێنە قەڵا بۆ ئەوەی كەلوپەلی تەختەی بۆ دروستبكەن و ئەوانیش هەموو شتەكانیان لە ناو سندوقەكاندا دەهێننە قەڵا و چەندین جەنگاوەریش بەو شێوەیە لە ناو سندوقەكاندا دێنە قەڵا، و شەو لەیەك كاتدا هێرش دەكەنە سەر پاشای زۆردار و دەیكوژن، شایەنی باسە ئەم قەڵایە لە سەردەمی ئیسلامدا وەك قەڵایەكی بەهێز بەكارهێنراوە و لەسەرچاوەكاندا باسكراوە.

**گەڕان بەدوای شارە ونبووەكەدا- شاری ئەردینی (موصاصیر) پایتەختە ئاینییەكەی ئۆرارتییەكان:**

شاری موصاصیر پایتەختی ئاینی ئۆرارتییەكان بوو، لە لایەن ئۆرارتییەكانەوە بە شاری (ئەردینی) ناوەدبراو، و ئاشورییەكانیش (موصاصیر)یان پێدەگوت، ئەم شارە خواوەندی نەتەوەیی ئۆرارتییەكانی تێدا دەپەرسترا و گەورەترین پەرستگای ئەم خواوەندەی لێبوو، و قیبلە و حەجی ئۆرارتییەكان لەم شارە بوو، و لە جێژنەكاندا بە سەدان دیاری بەنرخ و قوربانی لە لایەن خەڵك و پاشای ئۆرارتییەوە لەم شارەدا پێشكەش بەم خواوەندە و

پەرستگاکەی دەکرا.

ئەم شارە تا ئێستا نەدۆزراوەتەوە، و لەگەڵ ئەوەی کە پێش چەند ساڵێک باس لەوەکرا کە کنەوپشکنینەکانی (قەڵای رەبەت) لە نزیک شاری سەردەشت لە کوردستانی رۆژهەڵات دەریانخستووە کە موصاصیر قەڵای رەبەتە، بەڵام هەر زوو دوای بڵاوکردنەوەی راپۆرتی کنەو پشکنین و وێنەکان دەرکەوت کە راستە ئەو شوێنە شارێکی کۆنی هاوسەردەمی موصاصیرە، بەڵام بە هیچ شێوەیەک موصاصیر نەبوو، چونکە بەڵگە نووسراوە مێخییەکان و نەحتی دیواربەندەکانی ئاشوری بە روونی دەوڵەمەندی ئەم شارە و پێشکەوتنی بیناسازی و کانزاکاری و هەموو لایەنەکانی دیکە نیشان دەدەن.

بۆ دۆزینەوەی ئەم شارە زۆرێک لە شوێنەوارناسان پشت بە رێڕەوی هێرشی هەشتەمی سەرجۆنی دووەمی ئاشوری (ساڵی ٧١٤پ.ز) دەبەستن بۆ دەشتنیشان شوێنی شارەکە، چونکە سەرجۆن لە دەوروبەری ساڵانی (٧١٤پ.ز) هێرشێکی گەورەی دەستپێکرد بۆ داگیرکردنی زۆرێک لە میرنشین و دەوڵەتەکانی ئەو کاتەی کوردستان، و ئەودەبوو کە هێرشێکی توندی کردە سەر سوپای ئۆرارتی و پاشان لە گەڕانەوەیدا رووی کردە شاری موصاصیر و وێران و تاڵانی کرد، و دیمەنی سەرکەوتنەکانیشی لەسەر دیواربەندێک لە کۆشکی شاهانە بەنەحتی بارز و دەقێکی مێخیش باسی ئەم سەرکەوتنە و تاڵانییەکانی ئەم شارەی بەدووروودرێژی تۆمارکردووە، و تاڵانییەکان بە ژمارە باس دەکات.

وەک لە دیمەنی نەحتە ئاشورییەکەدا دەردەکەوێت، پەرستگای خواوەند خالدی لە ناوەڕاستی شارەکەدایە لەسەر سەکۆیەکی بەرز بنیاتنراوە و بینایەکی گەورەی هەیە، سەقفێکی جەملۆنی هەیە کە لوتکەی سەقفەکەی بە شێوەی سەرە رمێکی درێژی پێوەیە کە یەکێکە لە هێماکانی خواوەند خالدی، لە رووی لای دەروازەی پەرستگاکەوە چەند کۆڵەکەیەکی ئەستور دەردەکەون کە پێدەچێت لە هەمانکاتدا بۆ جوانی و پتەوکردنی دیوارەکانیش بێت.

چەندین قەڵغان بە دیوار و کۆڵەکەکانەوە هەڵواسراوە (ئەم شێوازەش لە دواتردا لە زۆرێک لە پەرستگاکانی رۆژهەڵاتی کۆندا باس دەکرێت و دەبینرێت، و جەنگاوەران قەڵغانەکانیان لە پەرستگاکان دادەنا بۆ پیرۆزی و سەرکەوتن لە جەنگدا)، و لە بەردەم دەروازەی پەرستگاکەدا پەیکەری دوو جەنگاوەر هەیە کە هەریەکێکیان رمێکی درێژیان بە دەستی چەپەوە گرتووە( بە بەراورد بە باڵای کەسەکان درێژی هەریەکە لە رمەکان نزیکەی چوارمەتر دەبن)، و بە دەستی راستیان سڵاو لە میوانانی پەرستگا دەکەن، لە لای راستەوە پەیکەری ئاژەڵێکی شیردەر دەردەکەوێت کە بێچووەکەی لە نێوان قاچەکانییەوە شیر دەخوات، ئەمە جگە لەوەی کە لە بەردەم دەرگا(لە حەوشە)ی پەرستگاکەدا دوو گۆزەی گەورە لەسەر بنکە چوارلایەک دانراون، چەند جەنگاوەرێکی ئاشوری بە



**دیمەنێک لە داگیرکردن و تاڵانکردنی شاری موصاصیر لە لایەن سوپای سەرجۆنی دووەمی ئاشورییەوە/ دیواربەندێکی ئاشوری بە نەحتی بارز لە شاری خرساباد دۆزراوەتەوە**



دیواری پەرستگاکەدا بە حەبل سەردەکەون و چەکەکانیان لە پشتیان بەستووە و هەریەکێک لەوانە دوو قەڵغانی پێیە کە پێدەچێت ئەم قەڵغانانە بە سەقفی پەرستگاکەوە هەڵواسرابن و جەنگاوەرەکان وەک تالانی دەیبەن(٦)، قەڵغانەکان رووەکەیان وەک دەمی شێر دروستکراوە...

لەلای چەپی پەرستگاکە بەدووربیەکی کەم قەڵایەکی دووقاتی بەرز دیارە کە لە قاتی خوارەوە دەرگەیەکی لاکێشەیی تێدایە و لە قاتی دووەم چەند دەرگایەکی هاوشێوەی دەرگای یەکەم دیارە، لە سەربانی قەڵا ستارەیەک هەیە و چەند کەسێک کە روویانکردۆتە لای چەپ و پێستی پڵنگیان لە بەردایە دەستەکانیان بۆ ئاسمان بەرزکردۆتەوە و نوێژ و نزا دەکەن(ئەو شێوازە شێوازی نوێژکردنی ئۆرارتییەکانە وەک لە چەندین پەیکەر و کاری هونەریدا دەردەکەون) بۆ ئەوەی رزگاریان بێت لە هێرشی داگیرکەری ئاشوری، و لەبەر ئەوەی شوێنی دەم و چاویان دیارنەماوە و نەحتەکە شکاوە لەبەرئەوە نازانرێت ئەوانە ژن یان پیاوانی ئۆراراتین، بەڵام بەبەراود بە دیمەنێکی دیکەی نەحتی ئاشوری کە هێرشکردن بۆ سەر شارێک نیشان دەدات و ژنان لە سەر شوراکانەوە نزاو



پاڕانەوە لە خواوەند دەکەن بۆ ئەوەی کە لە هێرشی دوژمن رزگاریان بێت، بەهەمان شێوە لەم دیمەنەشدا پێدەچێت ئەمانەی کە پێستی پڵنگیان لە بەردایە ژنانی ئۆرارتی بن، لە لای چەپی پەرستگاکەوە گردێکی بچوک هەیە و لە پشتی گردەکەوە خانووەکانی شارەکە بە قەدپاڵی چیاوە دروستکراون و بەردەم هەر ریزەماڵێک سەربانی ریزەماڵێکی دیکەیە، هەر خانوویەک دەرگایەکی لاکێشەیی و چەند پەنجەرەیەکی بچووکی تێدایە، و لە سەروو ماڵەکانەوە کەسێکی پەلە بەرزی نزیک لە پاشا کە پێدەچێت لە خەسێنراوەکان بێت چونکە ریش و سمێڵی

نییە و قژێکی درێژی هەیە و جلوبەرگەکەشی تایبەتە (ئەم کەسانە هەر لە منداڵییەوە لە کۆشکی پاشادا بەخێودەکران و دەخەسێنران بۆ ئەوەی خیانەت لە پاشا نەکەن، و پاشا بە بێ دوو دڵی لەناو کۆشدا دەیهێشتنەوە، پاشا متمانەی تەواوی بەم کەسانە هەبوو، و لە هێرشەکانیشدا پاشا لەگەڵ خۆی دەیبردن) ئەم خەسێنراوە لەسەر کورسییەک دانیشتووە و دوو نووسەر لەبەردەمیدا وەستاون و یەکێکیان تابلۆیەکی قورینی بەدەستەوە یە و بە خەتی مێخی دەنووسێت و ئەوی دیکە پارچە پێستەیەکی بەدەستەوەیە و بە خەتی ئارامی دەنووسێت، و فەرمان بە دوو نووسەرەکە دەکات کە تاڵانییەکان تۆماردەکەن، چونکە ئەوکات زمان و خەتی ئارامی بەهەمان شێوەی زمانی ئاشوری و خەتی مێخی بلاوبوو و خەلکی لە وڵاتی ئاشور بە زمانی ئاشوری و ئارامی دەدوان.

شوێنەوارناسان پێیان وایە ئەم شوێنەواری ئەم شارە دەکەوێتە یەکێک لە ناوچەکانی(رواندوز - سیدەکان - مجێسیر)، و بۆ ئەم مەبەستەش پشت بە رێڕەوی هێرشەکەی سەرجۆن دەبەستن کە چۆن سەرەتا چووتە کوردستانی ئێران و پاشان لەوێوە گەراوەتەوە و هێرشی کردووەتە سەر موصاصیر، و هەروەها بەلگەی دووەمیشیان ئەوەیە کە هەردوو میلە بەردینە ئۆرارتییەکەی (تۆپزاوە و کێلەشین) کە سەرکەوتنی پاشانی ئۆرارتییان بەخەتی مێخی و زمانی ئۆرارتی و ئاشوری لەسەر تۆمارکراوە، و باس لە جەنگی نێوان ئۆرارتی و ئاشورییەکان دەکەن، لەسەر رێگای شاری موصاصیر دانراون ئەو دوو میلەش پێیان دەگوترێت میلەکەی (تۆپزاوە) کە لە گوندی تۆپزاوە دۆزرایەوە (و ئێستا لە مۆزەخانەی هەولێرە)، و میلەکەی (کێلە شین)کە لە گوندی کێلە شین دۆزرایەوە (ئێستا لە مۆزەخانەی ورمێ یە)، ئەم دوو میلە لە ناوچەکانی سەر سنووری عێراق و ئێران و لە نزیک سیدەکان مجێسیر دانراون، و ئەمەش هانماندەدات کە لەوناوچانە بۆ شاری موصاصیر بگەرێین، جگە لەوەی ئەگەر بێت و سەیری دیمەنی شارەکەبکەین دەبینین کە وەک لە نەحتە ئاشورییەکاندا دەرکەوتووە لە ناوەراستدا پەرستگای گەورەی خواوەند خالدی زۆر بەگەورەیی لەم شارەدا دروستکراوە، و پاشان مالەکان دەردەکەون کە بەقەد پالی شاخەکەوە دروستکراون و سەربانی هەر خانوویەک بووەتە حەوشەی خانوودکەی سەروو خۆی و ئەم دیمەنەش تا ئێستا لە یەکێک لە گوندەکانی ئەو ناوچەیە لە بناری شاخی حەساڕۆست کە پێی دەگوترێت (گوندی رۆستێ) بە هەمان شێوازی کۆنی شاری موصاصیر دروستکراوە و مالەکان بە قەد پالی شاخەکەوە دروستکراون، جگە لەوەی ئەگەربێت و لە ناوی ئەم گوندە وردبێینەوە پێی دەگوترێت (رۆستێ) کە زۆر لە ناوی یەکێک لە پاشا بە هێزەکانی ئۆرارتییەکانەوە نزیکە کە ئەویش (رۆسا)یە، هەروەها بە و شاخە بلندەی پشت گوندەکەش دەگوترێت حەساڕۆست (حەساری رۆست) بەلام ئەم بۆ چوونەی ئێمەش پێویستی



میلەکەی تۆپزاوە

بە توێژینەوەی زیاتر هەیە، و هەروەها (د.رافیدە قەرەداغی پێی وایە: کە ناوی شاخی حەسارۆست کۆنترە و لە نووسینە مێخییەکاندا بە شاخی (حەروسا)ناوی هاتووە) بەهەرحاڵ زۆرێک لە بۆچوونەکان پێیان وایە ئەم شارە گرنگەی هەزارەی یەکەمی پ.ز، هەر لەو ناوچەیەدا و ئەگەر بێت و شوێنەوارناسان ئەم شارە بدۆزنەوە و دەستی تالانچیان و مافیاکانی ئەم سەردەمەی نەگەیشتبێتێ ئەوا زانیارییەکی زۆر دەربارەی هونەری نەحت و بیناسازی و کانزاکاری و گڵێنەسازی ئۆرارتی دەست شوێنەوارناسان دەکەوێت، و مۆزەخانەکانی ئەم ناوچەیەی پێ دەوڵەمەند دەبێت.

**مۆرە لولەییەکانی ئۆرارتییەکان:**

ئۆرارتییەکان بە سێ جۆر مۆریان بەکاردەهێنا:

أ. مۆری رووتەخت SEAL STAMP

ب. مۆری لولەیی SEAL CYLINDER

ج. مۆری لولەیی- رووتەخت STAMP-CYLINDER SEAL

یەکێک لە تایبەتمەندییە گرنگەکانی مۆری ئۆرارتی ئەوەیە کە بەرێژەیەکی زۆر(مۆری لولەیی رووتەخت SEAL STAMP-CYLINDER)یان بەکاردەهێنا، مۆری زۆرێک لە پاشایەکانی ئۆرارتو لەم جۆرە بوو، هۆکارەکەی بۆ ئەوە دەگەڕایەوە کە لەم سەردەمەدا شانبەشانی خەتی مێخی، خەتی ئارامی پەرەی سەند، و بەهۆی ئاسانی خەتی ئارامییەوە بەبەراورد بە خەتی مێخی کە خەتێکی زۆر سەخت و گران بوو، دەوڵەت و شانشینەکانی ناوچەکە هەردوو خەتەکەیان کردە خەتی رەسمی، و بۆ ئەم مەبەستەش خەتی مێخی هەروەک جاران لەسەر تابلێتی قوڕ دەنووسرا و بە مۆری لولەیی مۆردەکرا، و خەتی ئارامیش بە حیبر و لەسەر پێستە دەنووسرا کە نەدەکرا بە مۆری لولەیی مۆربکرێت، لە بەرئەوە مۆری رووتەخت بۆ مۆر کردنی ئەم دەستنووسانە بەکاردەهێنرا، و بۆ ئاسانکردنی بەکارهێنانی مۆرەکان جۆرێکی مۆری نوێیان بەکارهێنا کە پێی دەگوترێت مۆری لولەیی رووتەخت، و لە مۆرێکی لولەیی پێکهاتبوو و لە یەکێک لە سەرە رووتەختەکانییەوە مۆرێکی رووتەختیان هەڵدەکەند کە زۆربەی کات لە نەخشێکی سادە پێکهاتبوو، و مۆرە ئۆرارتییەکان زۆربەیان لەم جۆرەبوون، و پشکنینەکانی داهاتوو لەم جۆرە مۆرانە لەم ناوچەیەدا دەردەخات.

تاکە مۆرێک کە لە لایەن ئۆرارتییەکانەوە لە کوردستانی باشووردا بەکارهێنرابێت و ئێستا دۆزرابێتەوە، بریتییە لە مۆرەکەی فەرمانڕەوای شاری ئەردینی (موصاصیر) ئەم مۆرە لە بەردێکی پەمبەیی لە مادەی یەشب (CHALCEDONY) دروستکراوە،و پێوانەکەی(٤،٨٥×٢،٢ سم).

ئورزانا فەرمانڕەوایەکی ئۆرارتی بوو، سەرەتا سەر بە ئاشوورییەکان بوو، بەڵام بە یارمەتی پاشای ئۆرارتی (رۆسا)توانی سوپای ئاشوری لە موساسیر دەربکات، بەڵام ئەم هەنگاوە ئاشوورییەکانی توڕەکرد و سەرجۆنی دووەمی ئاشوری هێرشی بردە سەر موساسیر لە ساڵی ٧١٤ پ.ز وێران و تاڵانی کرد. لە مۆرەکەی ئورزانا دا، دیمەنەی عفریتێکی باڵدار (Lamassu) کە چواربالی کراوەی هەیە و لە شێوەی پاڵەوانێکدایە، بە دەستەکانی ملی دوونەعامەی گرتووە، و نەعامەکان لاشەیان رووی لە عفریتەکەیە، بەڵام هەردووکیان ئاوڕیان داوەتەوە بۆ دواوە و وەک ئەوەی بیانەوێت خۆیان رزگاربکەن.

لەسەر رووی مۆرەکە نووسینێکی مێخی هەیە کە لە حەوت دێڕی ئاسۆیی پێکهاتووە و نووسینەکە لە ناو دوو چوارچێوەدایە و درێڕی یەکەم تا دێڕی چوارەم لە چوارچێوەی یەکەمدایە، تەنها دێڕی چوارەم نەبێت کە چوارچێوەی بۆ نەکراوە، پاشان دێڕی پێنجەم تا حەوتەم لە چوارچێوەی دووەمدایە، و دێڕی هەشتەم بەتاڵە و نووسینی تێدانییە، و ئەمەش ئەوەدەردەخات کە نووسینەکە لە دوای



مۆرەکەی ئوورزانا

دیمەنەکە نووسراوە و بە پێی دیمەنەکە هەڵکەندراوە، وەک لە دێری چوارەمـدا دەردەکـەوێت کـە چوارچێـوەی بۆ نەکـراوە چونکە کلکی نەعامەکان تێک دەچوو.

دەقی نووسـینی سەر رووی مۆرەکە بەم شێوەیەیە:

١. مۆری ئوورزانا IUr-za-na kunuk
٢. پاشای موصاصیر IMsa-sir ar؟
٣. (شارە ئۆرارتییـەکـە)شـاری وشـتـرمل (قـەلەڕەش) - ab(؟)-ti (khu) ڤا ئەوەی جێگەی سەرنجە دیمەنی دوو وشترمل لەسەر مۆرەکەش دەردەکەون.
٤. بەردی(خواوەند)لاماسـو dLAMA2 ZA
٥. کە وەک مارێک sri kma a
٦. لە کێوە بەدەکان(لە چیاکانی دوژمن)دا na ad lemnti
٧. دەمی کراوەتەوە[٧] pi-tu-u p-u
٨. چوارچێوەیەکی بەتاڵە و هیچی تێدا نەنووسراوە.



مۆرێکی سەردەمی ئاشوری نوێ کە هاوشێوەی دیمەنی مۆرەکەی ئوورزانایە



پێدەچێت ئەو کاتەی ئورزانا ئەو مۆرەی بۆخۆی دروستکردبێت کە سەر بە دەسەڵاتی ئاشوورییەکان بووبێت هەروەک لە دیمەنی هونەری مۆرەکەدا دەردەکەوێت، بەڵام وەک تێبینی دەکرێت کە نووسینی سەر مۆرەکە لە کاتێکی دواتر نووسرابێت ئەمەش لە شێوەی نووسینەکە و دابەشکردن و شوێنی نووسینەکە لەسەر رووی مۆرەکەدا دیارە، جگە لەوەی کە دەقی نووسینی سەر رووی مۆرەکە وادەردەخات کە ئورازانا لەگەڵ ئورارتییەکانە و دژی ئاشوورییەکانە، بەم شێوەیە پێدەچێت ئورزانا کاتێک مۆرەکەی دروستکردووە سەر بە ئاشوورییەکان بووبێت، بەڵام دوای ئەوەی کە چووەتە پاڵ ئۆرارتییەکان ئەو نووسینەی بۆ سەر مۆرەکە زیاد کردووە، چونکە دیمەنی مۆرەکە هاوشێوەی دیمەنی مۆرێکی ئاشوورییە، جگە لەوەی کە نووسینی سەر مۆرەکە نووسینێکی نارێکە و دیارە کە لە لایەن مۆرهەڵکەنێکی شارەزای نووسینەوە هەڵنەکەندراوە.

مۆرێکی ئاشوری هاوشێوەی مۆرەکەی ئورزانا لە شاری نەینەوا دۆزراوەتەوە (IM ٦٨٨٨٠) لەبەردی لازەورد دروستکراوە پێوانەکەی(٤٢ملم×٢٠ملم).

دومینیک کۆڵۆن ئاماژە بە بۆچوونی (واڵکەر)دەکات کە مەبەست لەو مارە شاری موصاصیرە، وەک ئاماژەیەکی شاراوە[٨].

**هونەری کانزاکاری ئۆرارتی:**

کانزاکاری ئۆرارتی زۆر پێشکەوتوو بوو، و بە دەیان پەیکەر و کەلوپەلی برۆنزی و زێڕ و زیو دۆزراوەتەوە، و جگە لەوەی کە ئەگەر بێت و تەنها باسی ئەو تاڵانییانە بکەین کە سەرجۆنی دووەمی ئاشوری لە شاری موصاصیر بە تاڵانی بردوونی و لە تۆماری تاڵانییەکاندا ئاماژەی پێکردوون، ئەوا ئەوکات بۆمان روون دەبێتەوە کە موصاصیر یەکێک بووە لە دەوڵەمەندترین شارەکانی میسۆپۆتامیا لە رووی کەلوپەلی کانزاکارییەوە جا ئایا ئەو کەلوپەلانە لەوێ دروستکرابن یان لەسەرجەم وڵاتی ئۆرارتۆوە وەک دیاری بۆ پەرستگای خواوەند خالدی لە لایەن خەڵک و فەرمانڕەوا و پاشایانی ئۆرارتییەوە هێنرابن، جگە لە دەقە ئاشورییەکان، مەنحوتە ئاشورییەکان دیمەنی تاڵانکردنی چەندین کەلوپەلی کانزایی لە لایەن سەربازانی سوپای ئاشورییەوە نیشانداوە، و دووکەس لە

نزیکانی پاشـــای ئاشـــوری (لە خـــەســـێنراوەکـــان) تەرازوویەکـیان داناوە و تالانییـەکان دەکێشن، و لە خوار ئەم دیمەنەوە لە ناو شاخ و درەختـەکاندا چەند سـەربازێکی ئاشـوری لە قـەتڵ و عـامی خەڵکی شـاری مـوصـاصـیـر بەردەوامن و بەدوای ئەو کـەسـانەدا دەگـەڕێن کـە خـۆیان حەشارداوە.

هەروەک دەبینین سـەربازانی ئاشوری بەتەور پیـاوێک دەکوژن و کەسێکی دیکەش لەناو درەختەکانەوە دەستەکانی بەرزکردۆتەوە و دەپاڕێتەوە بۆ ئەوەی نەیکوژن، بەڵام ئەوان دەیانەوێت بەتەور بیکوژن، لەگـەڵ ئەوەی کـە هەندێک لە شوێنەوارناسە بیانییـەکان پێیان وایە سـەربازانی ئاشوری پەیکەرێکی برۆنزی دەشکێنن نەک پیـاوێک دەکـوژن!، پەیکەرەکە پارچە پارچەی دەکەن، بەڵام لەراسـتیدا دیارە کە ئەوە پەیکەرنییە و کەسێکی شاری موصاصیرە و بە تەور دەیکوژن، جگەلەوەی ئاشورییـەکان پەیکەرەکـانیـان وەک خۆی بەتالانی دەبرد، و پەیکەری خواوەندەکانیـان بە دیلی دەبرد بۆ شارە ئاشورییەکان.

سـەرچاوەکان:

(١) مـینۆرسکی: کورد، وەرگـێرانی: حـەمـە سـەعـید حەمە کەریم،(بەغداد-١٩٨٤)، ل٤٦٧.

(2) Wihelm,Gernort,The Hurrians,translated byL Jennifer Barnes, England,1998.

هەروەها بڕوانە: فـیلهیلم، کیرنورت، الحوريون وتراثهم الحضاري، ترجمة: ص٤-٣.

(٣) ساكز: هاري، قوە اشور، ترجمە: عامر سليمان، بغداد-١٩٩٩، ص٧٧.

(٤) مینۆرسکی: هەمان سەرچاوەی پێشوو.

(٤أ) الحسني: صادق هادي، (تمثالان من مجيسير) مجلة سومر، مجلد١١،(١٩٥٥) ص٢٢٤.

(٤ب) لەکۆتایی نووسینی ئەم بابەتەدا مامۆستا کۆزاد ئەحـمـەد پێی راگـەیاندم کـە چەند بۆ چوونێکی نوێ ئەم پەیکەرانە بە کـێلی گـۆڕی سـەکـیـسی (گـەلێکی کـۆنی کوردستـانن و لە سەردەمی میدییەکان لە سەدەی هەشت و حەوتەمی پ.ز رۆڵی خۆیان بینی لە مێژووی سیاسی و سـەربازی ناوچەکـانی کـوردسـتـاندا) دەزانن، بەداخـەوە سەرچاوەکانیانم بەدەست نەگەیشت، و سوپاس بۆ مامۆستا کۆزاد.

(٥) میـلارت، جیـمس، اقدم الحضـارات في الشرق الادنى، ترجمة: محمد طلب، دمشق، ١٩٩٠.

(٦) عـبـدالله: يوسف خلف، (صناعـة الاسلحـة الاشورية ومصادرها الاولية)، موسوعة الجيش والسلاح، بغداد-١٩٨٨،ص٨٦.

عـبدالله يوسف خلف، الجـيش والسـلاح في العـهـد الآشـــوري الحـــديث (٩١١-٦١٢ق.م)، بغـــداد-١٩٧٩،ط١.

(٧) قەرەداغی: فـاضل، مێژووی دێرینی کـوردسـتـان، کتێبی سێیەم (سلێمانی-٢٠٠٧).

(8) Collon, Domonique, First Impressions Cylinder Seals in the Acient Near East,British Museum, 1987.

(9) Maturits Nanning van LoonURARTIAN ART its distinctive traits in the light of new excavations, Istanbul 1966.

# پەیکەرێکی بەردین لە گوندی مەکردانی ناوچەی حەریر

شانەدەر

لەم دواییانەدا تیمێکی سەر بە بەڕێوەبەرایەتی گشتی شوێنەوار، سەر بە وەزارەتی رۆشنبیری توانی پەیکەرێکی بەردین بدۆزێتەوە کە مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ هەزارەی یەکەمی پ.ز. هەروەها دوو گۆڕیان دۆزییەوە لەناو جەڕڕەیەک لە گوندی مەکردانی سەر بە شارۆچکەی حەریر.

گوندی مەکردان یەکێکە لەجێگە شوێنەوارییە گرنگەکانی کوردستان، کە لە ١٩٥١/١١/٦ دانی پێدانراوە و ژمارە (١٣)ی دراوەتێ، پاش ئەوەی کە رێکخراوی هابیتات پێی راگەیاندین لەکاتی هەڵکۆڵینی بناغەی قوتابخانەیەک بۆ مەکردان ئەو شوێنەوارەیان دۆزیوەتەوە، ئەمەش دەیسەلمێنێ کە مەکردان جێگەیەکی شوێنەوارییە.

لەسەر رێنمایی بەڕێز فەلەکەدین کاکەیی وەزیری رۆشنبیری لەرۆژی ١٩٩٩/٧/١٩ شاندێکی



شوێنەوارناس رووی کردە ئەم شوێنە لە بناغەی قوتابخانەکە دوو گۆڕی جەڕە کە تەرمی دوو منداڵی تێدابوو دۆزییەوە، تەمەنیان لەپێنج ساڵ کەمتر بوو. جەڕڕەکانیش وردو خاش ببوون.

هەر لەم بارەیەوە پێش ماوەیەک هەواڵێکمان پێگەیشت کە پەیکەرێکی بەردین بەدووری ٥کم لە شوێنی کارکردنی پێشوو هەیەو، پەیکەرەکە دەرهێنراو گواسترایەوە بۆ مۆزەخانەی شارستانی لە هەولێری پایتەخت.

شایانی باسە لە گوندی مەکردان شوێنەواری زۆری تێدایە کە کەوتوونەتە ژێر خاک، تیمی کارکردنی بەڕێوەبەرایەتی گشتی شوێنەوار لە ئایندەدا کرداری پشکنینی تێدا ئەنجام دەدات. لەبارەی ژمارەی جێگە شوێنەوارییەکانی کوردستانی عێراق.



# کێلە شین

**عەلی تەتەر نێرووەیی**

کێلە شین، یەکێکە لەو گەرووە ناسراوانەی دەکەوێتە نێوان شنۆ و سیدەکانەوە، ئەم ناوەش دەگەڕێتەوە بۆ بوونی کێلێکی بەردینی شین، کە نیشانەی شوێنەوارێکی کۆنی مێژوویییە لە ناوچەکەدا، هەرچەندە لە رۆژگاری نوێدا ئەم کێلە لە جێگا بنەڕەتییەکەی خۆیدا لابراوە، بەڵام شوێنەکەی تا ئێستاش هەر بەو ناوەوە ناو دەبرێت، لەوەش زیاتر ناوی (کێلە شین) بۆتە ناوی یەکێک لە شاخە بڵندەکانی ناوچەکە، کە بەرزاییەکەی (٢١٨٠) مەترە.

هەر چەندە ئەم گەرووە بە شێوەیەکی گشتی بە ئاستی گەرووەکانی دیکەی باشووری کوردستان، بەتایبەتی گەرووی (خانەقین - کرماشان)، کە توێژەری ئەڵمانی "ئێرنست هرتسفیلد" بە دەروازەی ئاسیا ناوی دەبات، ناسراو و بەناوبانگ نییە، بەڵام لەسەر ئاستی ناوخۆی کوردستان ناوی گەرووی کێلە شین دیارتر و لەبەرچاوترە، ئەو کێلە شینەی سەرنجی زۆربەی ئەو کەسانەی راکێشاوە.

**تەمەنی کێلە شین:**

دەوڵەتی ئۆرارتو لە کۆتایی دەرکەوت و پاشان ئیمپراتۆریەتی شکۆداری ئۆرارتۆ لە سەرەتای هەزارەی یەکەمی پ. ز، لە باکووری کوردستان سەری هەڵدا، ئەم ئیمپراتۆریەتە توانی پاش زنجیرەیەک لە شەڕ و هێرش و پەلاماردان زۆرینەی خاکی کوردستان لەگەڵ ناوچەکانی باشووری قەفقاس و ئاسیای بچووک بخاتە سەر قەڵەمڕەوی ژێر رکێفی خۆیەوە، هەروەها دەوڵەتی ئۆرارتۆ یەکێک بوو لەو حکوومەتانەی سەردەمی خۆی، کە بە پێشکەوتن و شارستانیەت ناوی دەرکردبوو، ئەو شارستانییەتەی خۆی لە کۆمەڵێک پرۆژەی ئاوەدانکردنەوە و جۆگە هەڵبەستن و دروستکردنی بەنداو و کاری بیناسازی دەبینییەوە، ئەوەی شایانی گوتنە کە زۆربەی ئەو پرۆژانەی نووسراوی تایبەتییان لەگەڵدا بەجێماوە، کە جگە لە نووسین بە زمانی ئۆرارتۆ زمانی ئاشووریشی لە پاڵدایە[1].

یەکێک لە بەناوبانگترین شایەکانی ئۆرارتۆ ئیشپوینییە (٨٢٥- ٨١٠ پ. ز)، ئەم شایە سەرەڕای ئەوەی خاوەنی چەندەها

داستانی سەرکەوتنی سەربازی جیاواز و ئەنجامدانی چەندین جۆر لە پرۆژەکانی ئاوەدانکردنەوەیە، کەچی بڵندی و ناوبانگی زیاتر بۆ ئەو نووسراوانە دەگەڕێتەوە، کە بە زمانی ئۆرارتۆیی بۆی بەجێهێشتووین، چونکە هەوڵێکی بێ وچان و مەزنی دا بۆ بەدیهێنانی سەربەخۆیی کلتووری تایبەت بە ئۆرارتۆ[٢].

روون و ئاشکرایە کە نووسینی مێخی (مسماری) ئۆرارتۆیی وەرگیراوی نووسینی میخی ئەکەدییە (ئاشووری - بابلی)[٣]، چونکە هەموو شێوازێکی ئەو نووسینەی بەخۆوە گرتووە، تەنها ئەوە نەبێت، کە بە تایبەتمەندیتی بە سادە و ساکارەکەی دەتوانرێت لە وان جیا بکرێتەوە، جگە لەمەش نووسینی ئۆرارتۆ بە دووبارە بوونەوەی وشە و رستەکانی بە شێوەیەکی یەک لەدوای یەک دەناسرێت، هەر بۆیە ژمارەی ئەو وشانەی، کە لە نووسینی ئۆرارتۆ بەر چاومان دەکەون زۆر کەم و دیاریکراون. شایەنی باسە زۆربەی نووسینەکانی ئۆرارتۆیی زانیاری و هەواڵی ئەم شەڕ و سەرکەوتنە سەربازییانەیە، کە پادشاکانی ئۆرارتۆ لە کاتی فەرمانڕەواییاندا بە ئەنجامیان گەیاندووە و بە شێوەیەکی سادە و لێکچوو داڕێژراون. هەر بە هەمان شێوەش ئەو نووسینانەی کە پاشاکان لەسەر پرۆژەکانی ئاوەدانکردنەوە بۆیان جێهێشتووین سادەیی و ساکارییان پێوە دیارە[٤].

گرنگترین نووسراوی بەجێماوی ئەم سەردەمە ئەو کێلە بەناوبانگەیە، کە بە کێلە شین دەناسرێت و هەڵبەستنەکەی بۆ ساڵی (٨١٤ پ.ز) مەزندە دەکرێت[٥]. هەروەک لە نووسینەکەی سەرێدا بۆمان دەردەکەوێت، ئەم کێلە لەلایەن پادشای ئۆرارتۆوە ئیشپیونی و شازادەی کوڕی (مینیوئا-Menua- ٨٠٩ - ٧٩٠ پ. ز)[٦] لە جێگایەکی بەرز، کە شوێنەوارێکی کۆنی پەرستگایەکی خواوەندی (خالدی) بووە لە شاری ئەربینی (Arbinni)، کە بە زمانی ئاشووری (موساسیر-Musasir)ی پێدەگوترێت هەڵبەستراوە[٧].

یەکێک لەو تابلۆ تابلۆ هونەرییە مێژووییانەی لە شاری وان دۆزراونەتەوە بە (تابلۆی میهر) ناو دەبرێت، کە دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی ئیشپیونی و مینیوئای کوڕی، ئەم تابلۆیە ناوی هەموو خواوەندە خالدییەکانی تێدا هاتووە، خودای (خالدی) لە سەروو هەموو خواوەندەکانەوە و لە پلەی یەکەم دانراوە، دواتریش خودای جەنگ (تیشابا- Teshaba)و خودای خۆر (شیڤینو- Shivini) بە پلەی دووەم و سێیەم دێن، دوای ئەم خواوەندانە ناوی چەندەها خواوەندی دی دێن، کە هەریەکەیان تایبەتن بە شارێک یا وڵاتێک یاخود گەلێکی ژێر دەسەڵاتی ئیمپراتۆریەتی ئۆرارتۆ،[٨] هەروەها ئاماژە بۆ ژمارەی ئەو قوربانییانە کراوە لە (گا و مەڕ)، کە ساڵانە پێشکەشی خواوەندەکان دەکران.

لەگەڵ ئەوەی فەرهەنگی ئۆرارتۆییەکان دەوڵەمەندە بە چەندەها ئەفسانە و خاوەنی گەلێ رووداوەی میتۆلۆژییە، بەڵام تێڕوانینی ئۆرارتۆیەکان بۆ خواوەندی گەورە و بە توانای (خالدی)، کە سەرچاوەی هەموو چاکی و هێز و دەسەڵاتێک بوو، لە سەرووی هەموو ئەوانەوە بوو بە رادەیەکی زۆریش پیرۆزتر بوو، هەر بۆیە شوێنی موساسیر لەلای ئۆرارتۆییەکان بە پیرۆزترین ناوچە دەژمێردرێت[٩].

### پەرستگای موساسیر (کێلە شین):

دروستکردنی ئەم پەرستگایە بۆ سەدەی نۆهەمی پێش زایین دەگەڕێتەوە[١٠]، وێنەکەشی لەلایەن نیگارکێشێکی ئاشوورییەوە کێشراوە، کە دەتوانین وەسفێکی ئاسایی بکەین[١١]، بانێکی شێوە ژمارە هەشتی (٨) و پێشێکی شێوە سێگۆشەیی، کە بە جۆرێکی تایبەت جوانکاری کراوە، سەر خانی پەرستگاکە لەسەر شەش (٦) ستوونی گەورە و بە هێز راگیرکراوە، بینینی ئەم پەرستگایە شێوە و روخساری ئەو پەرستگا یۆنانییانەمان دەهێنێتەوە پێش چاو، کە لە کاتە مێژووییەکانی دواتردا دەبینرێن[١٢]. دیوارەکانی ناوەوەی پەرستگاکە، بە نیگار و وێنەی رەنگا و رەنگ رازێنراوەتەوە، کە شێوەی خواوەندەکان و ئاژەڵە پیرۆزەکان و هەندێ وێنەی تری تایبەت بە ئایین و ژیانی ئۆرارتۆییەکانی تێدا کێشراوە، جگە لەمانە دیوارەکان بە چەندەها نیگاری دیکەی شێوە ئەندازەیی و وێنەی جۆرەها گیا و گەڵاو گوڵی تایبەت نەخشێنراون[١٣]، شایەنی باسە هەر لە ناوەوەی پەرستگاکە

بەردی چوارگۆشەی رەش و سپی لە بنیاتنانی دیوارەکانیدا بەکارهێنراوە، هەروەها زەمینەی پەرستگاکە شێوەی بەردین و کاشیکاری پێوە دەبینرێت، ئەو دارانەشی، کە لە بیناسازییەکەدا بەکار هاتوون، بە مەبەستی جوانی و بەهێز بە فلزی تایبەت رووپۆش کراون[١٤]. ئاشکرایە لەو کارە بەردکاریانە کە لە کۆشکی (سارگۆن)ی پاشای ئاشووریدا کراون دیمەنی شاری موساسیرمان بەرچاو دەکەوێت، کە خانووەکانی ئەم شارە زۆربەیان سێ نهۆمن - و لەدوو ریزی نزیک و بەرامبەر یەکتر درێژ دەبنەوە و لە ناوەڕاستدا دیمەنی پەرستگای خالدی بەجوانی دەردەکەوێت[١٥].

هاوکات لەگەڵ هێرش و پەلاماردانی سارگۆنی ئاشووری (٧٢٢ - ٧٠٥پ. ز)، لە ساڵی (٧١٤ پ. ز) بە مەبەستی تێکشکاندن و هەڵوەشانەوەی هاوپەیمانێتی نێوان ئۆرارتییەکان و میدییەکان و دواتریش بە دیل گرتنی شای میدییەکان (دیاکۆ) و دوورخستنەوەی لەگەڵ خێزانەکیدا بۆ (حەماتی شام)[١٦]، سارگۆن لە گەڕانەوەیدا بۆ وڵاتی ئاشوور شاری موساسیری بە تەواوی تەخت و وێران کرد و پەرستگا پیرۆزەکەشی رمان و تالان کرد[١٧].

**هەوڵدان بۆ گواستنەوەی کێلە شین:**

ساڵی ١٩١٧ز جەنەڕاڵ.... لە نوێنەری کۆنسولی روسی لە ئێران (باسل نیکتین)ی داوای کرد، کە بەپێی فەرمانی دەرکراو لە (گراندۆک نیکۆلا)وە ئەم کێلە بۆ مۆزەخانەی تفلیسی بگوێزرێتەوە، بەڵام نیکتین بەپێی وتەی بەرد لەجێی خۆی سەنگینە ئامادە نەبوو ئەم کێلە لە شوێنە مێژووییەکەی خۆی لابەرێت و چەند بیانووی جیاوازی هێنایەوە بۆ ئەنجام نەدانی فەرمانی جەنەڕاڵ، هەر لە سەرەتاوە بە بیانووی ئەوەی لە وەرزی هاویندا، پێویستە کاری گواستنەوەی کێلەکە دوابخرێت بۆ وەرزی زستان، چونکە لەم وەرزەدا دەشێ کێلەکە بە ئاسانی بەسەر بەفری ناوچەکەدا بگوێزرێتەوە، زۆری نەبرد زستان هات و نیکتین کەوتە دۆزینەوەی بیانوویەکی دی، ئەویش ئەوەدیە گوایە ئەم کێلە خاڵی دیاریکردن و نیشانەیەکی سنووری نێوان هەردوو دەوڵەتی ئێرانی و عوسمانییە و بە هیچ جۆرێک ناشێت لە جێگەی خۆی بجووێنرێت، بەڵام لە کاتێدا کە جەنەڕاڵ پێی لەسەر گواستنەوەی کێلەکە داگرت و بەم بیانووانە قایل نەدەبوو، نیکتین پەنای بردە بەر فێڵێکی تایبەت بەتایبەتی، کاتێک زانی جەنەڕاڵ بڕوای بە ئەفسانە و خورافات هەیە، بۆیە وتی ئەم بەردە بەردێکی نەفرینلێکراوە[١٨] بە جۆرێک نەفرەت دێنێتە سەرشانی هەر کەسێک، کە لە شوێنی خۆی لایبەرێت و بەهەر جۆرێک دەسکاری بکات، ئەم فێڵە بە ئاسانی سەری گرت و جەنەڕاڵ وازی لە بیرۆکەی گواستنەوەی هێنا ئەو بیرۆکەیە کە هەموو هیوایەکی جێبەجێکردنی لە دەستدا لە دوای کودەتای ئۆکتۆبەری بەلشەفی لە ساڵی ١٩١٧دا لە روسیا[١٩].

سەر ئەنجام لەبەر ئەوەی ئەم کێلە لە زۆربەی پەیماننامەکانی دەستنیشان کردنی سنووری دەوڵەتیدا لە نێوان هەردوو دەوڵەتی ئێران و عوسمانی و دواتریش (ئێران و عێراق)دا وەک خاڵێکی سنووری دیاری کرابوو، بۆیە هیچ یەکێک لەم دەوڵەتانە نەیان دەتوانی دەستکاری ئەم کێلە بکەن و بیگوازنەوە بۆ مۆزەخانەکانیان، ئەگەر چی ئێران بانگەشەی ئەوەی دەکرد، کە گوایە ئەم کێلە ٣٠ هەنگاو دەکەوێتە ناو خاکی وڵاتەکەیەوە، بەڵام هەر وەک لە وێنەکەدا دیارە ئەم کێلە دروست لە تەنیشت خاڵی دیاریکردنی سنووری هەردوو دەوڵەتی ئێران و عێراقدایە[٢٠]. دواجار لە کاتی هەڵگیرساندنی جەنگی کەنداوی یەکەمدا و بەتایبەت لە ساڵی ١٩٨٥دا دوای ئەوەی، کە چەندین شەڕی قورس لەم ناوچە سنوورییانەدا روویدا، ئێران بە ناوی ئەوەی، کە ئەم کێلە شوێنەوارێکی مێژووییە و پێویستە دوور بێت لە زیانی پارچە تۆپ و چەکە جیاوازەکانی دیکە کاری گواستنەوەی کێلە شینی ئەنجامدا و ئێستا ئەم کێلە لە مۆزەخانەی شاری ورمێیە.

**لێکۆڵینەوە ئارکیۆلۆژیەکان لەسەر کێلەشین**

(اف. ا. شولتز)ی ئەڵمانی یەکەم کەس بوو لە ساڵی ١٨٢٩دا هاتە ناوچەی کێلەشین و کێلەکەی بینی و نووسینەکانی سەری کۆپی کرد، بەڵام لە بەختی رەشی ئەم شوێنەوارناسە هەر پاش چەند رۆژێک

دوای ســـــازدانی ئەم کـــــارەی لە ناوچەکـــەدا دەکـــوژرێت و هەمـــوو کەلوپەل و ئامرازەکان و کۆپییەکانی بە تالآن دەبرێت[٢١]، دوابەدوای ئەو، ئاشووریناسی ئینگلیزی بەناوبانگ (ســیر هنری راولنســون - ١٨١٠ - ١٨٩٥) هاتۆتە ئەم شوێنە و بەشێک لە نووسینەکانی کێلەشینی کۆپی کـردووە[٢٢]، ئینجــا (خـانیکوف ١٨٢٢ - ١٨٧٨) دوای هاتنی بۆ ئێران و مانەوەی بۆ ماوەی دوو ساڵ ١٨٥٧ - ١٨٥٩ بەشـــێکی لە نووسینەکانی قالبگیری کردووە، کە ئێستا لەبەر دەستدا نەماون[٢٣]، شـوێنەوارناس (بلاو) لە ســاڵی ١٨٥٨دا قــالبــێکی جــوان لە نووسینەکان وەردەگـیرێت، بەلآم لە چارە رەشی ئەمـــیش لە کـــاتی گەڕانەوەیدا و لە رێگا قالبەکانی دەشکێن و ورد دەبن کـــە هەمـــوو هەوڵێکی بۆ لێکدانەوەی پارچە شکاوەکــان و گـەڕانەوەی سیـــما بنەڕەتییەکەی خۆی بە فیڕۆ چوون[٢٤] و هیچ شتێکی نوێیان بەدی نەهێنا، پاش لێکۆڵینەوەیەکی لەو بابەتەی کـە زانای ناسـراو (ا. ها. سایس) لەسـەر ئەم پارچە شکاوە لێکدانەوە ئەنجامی دا[٢٥].

لە دواجـار زانای شـوێنەوارناس (ژاک مـاری مـۆرگــان ١٨٧٥-١٩٢٤ز) توانی لە سـاڵی ١٨٩٠دا کلێشەیەک لە نووسینەکانی کێلەشین وەربگرێت و ردوانەی یەکێک لە هەرە ئاشووریناسە ناسراوەکانی بکات، کە ناوی (پرشایل)ە، ئەمەش یەکەمین جـارە کـە قـالبـێکی تەواو لەم نووســینانە ســاز بکرێت، لە دوای لێکۆڵینەوەیەکی دوورودرێژ لە شێوە ئاشـووریـیـەکـەی کلیلی دەرگـای خوێندنەوەی نووسینەکان دۆزرایەوە و لە رۆژنامـەی (پیکـیـولدســیت ئواکس)ی پاریسـیدا، بەم شێـوەیەی خـــــوارەوە خـــــوێـنـدرایـەوە و بلاوکرایەوە[٢٦].

ئەو کات کە من ئیشپـیـونی کوڕی ساردور[٢٧]
شای مەزن، شای بە توانا
شای جیهان
شای سەر زەمینی ناییری[٢٨]
سەروەری مەزنی شاری توشباشار[٢٩]
منوای کوڕی
لای خواوەندی خالدی
بۆ شاری موساسیر
بۆ پەرستگای بەرز و بڵند
کە بۆ خواوەندی خالدی
دروست کرابوو
هاتن - ئیشپـیـونی نووسینێکی بۆ هەڵبەست
ئیشپیونی کوڕی ساردور
چەکە گرانبەهاکان
و چەند رەوەیەکی جوانی هێناوە
ئیشپیونی کەلوپەلی مەفرەغی*
قاپ و قاچاغی مەفرەغی هێناوە
ئـیـشـپـیـونی چەند رەوەیەکی زۆری هێناوە (کە)
هەموو ئەم دیاریانە
دووبارە سەر لەنوێ
بۆ ئەم پەرستگایە
بریار دراوە
ئیشپیونی هەموو ئەم دیاریانە
بەرامبەر دەروازەی خالدی
بۆ خواوەندی خالدی
بۆ بەردەوامی ژیانی خۆی
بەهەرزان دادەنێت...
ئیشپیونی بۆ لێخۆشبوون
١١١٢ گا
١٢٠بزن و بەرانی قەڵەو
١٢٤٩٠ بزنی قەڵەو
بۆ پەرستگا هێناوە
ئەوکات کە ئیشپیونی کوڕی ساردور
شای مەزن، شای بەتوانا
شای جیهان
شای سەر زەمینی ناییری
سەروەری گەورەی شاری توشباشار
بەرامبەر خواوەندی خالدی
بۆ نیاز
هات......

### * شێوە و روخساری کێلەشین

ئەم کـــێلە بەردینە لە دوولاوە لەســەری نووســراوە، لایەکـــیــان بەنووســینی مـێـخی و بە زمـانی ئۆرارتۆیی، لاکـەی تریشـــیــان بە نووسـینی مـێـخی و بە زمـانی ئاشـــووری، نووســینی ئەم رووەی دوایی هەندێک شێـواندنی بەسەردا هاتووە، چونکە وەک نیـشـانەیەکی دەست راستی لەلایەن کەسانی سادە و ساکاری ناوچەکەوە ژمارەیەکی گـولله لێـدراوە، بەلآم لەگـەڵ ئەم شێواندنەشدا هێشتا نووسینەکەی دەتوانرێت بخـوێندرێتـەوە، بە پێچەوانەی رووە ئۆرارتۆیەکەی، کە زۆربەی بە چاکی مـاوەتەوە و هیچ داخـوران و شـێـواندنێکی بەسـەر نەهاتـووە و بە باشـــــیش دەخوێندرێتەوە.

پێـوانە ئەندازەییەکـانی ئەم کێلە بەم شێوەیەی خوارەوەیە[٣٠]:

بەرزی = ١٦٨سم
پانی بەشی خوارەوەی = ٤٠ سم
پێوانەی ئەندازەیی بنکە=٤٣× ٤٢سم
بنکە لاکێشەیەکەی = ١١٢× ١٤٠سم
دووری ملە باریکەکەی لە بنکەوە=٤٣ سم
بارستایی کێلەکە بە بنکەوە =١٦٠٠کگم

١- پێش ئەوەی ڕێگای هاملتۆنی ستراتیژی دروست بکرێت ڕێگای کێلەشین بایەخێکی زۆری هەبوو، ئێستاش هەمان دەوری هەیە.
٢- تاریخ باستانی ایران بر پایە باستانشناسی، ترجمە علی اصغر حکمت، تهران ١٣٥٥، ص٣٧.
٣- تەنیا ڕەگەزێک کە دەتوانێت خۆی پاشماوەی ئەم شارستانییەتە گەوردیە دابنێت کورد و ئەرمەنن، بڕوانە: اوژن پیتار: نژاد هاو تاریخ، پاریس، ١٩٢٤، ص٣٨٥.
4- Siararpie Nersessian: the Armanians Lodon 1953, P. 760.
- هرزفلد، سەرچاوەی پێشوو، ص٦٩.
٥- سارگیسیان و...: تاریخ ارمنستان، تهران، ص١٨.
٦- سەرچاوەی پێشوو، ص٢١.
٧- سەرچاوەی پێشوو، ص٢٥.
٨- ژاک دومۆرگان: تمدنهای اولیە، چاپ پاریس، ١٩٠٩، ص١٦٣.
٩- مێژوونووسەکانی یەکێتی سۆڤیەت بۆ ئیشپوئینی ٨٢٥ - ٨١٠ و بومنوا ٨١٠ - ٧٩٠ پێشنیار دەکەن، بەلام د. جەمال ڕەشید بۆ یەکەمیان ٨٢٥ - ٨٠٦ وە بۆ دووەمیان ٨٠٥ - ٧٩٠ دادەنێت.
١٠- ئەم شارە لە نووسینی ئۆرارتیدا (ئاربینی) وە لە نووسینی ئاشووریدا (موساسیر) هاتووە.
١١- هەروەک لە ناوەرۆکی نووسینی کێلەکەدا دیارە ئەم شارە لە شوێنێکی بەرز دروست کرابوو.
١٢- سارگیسیان...، ژێدەری پێشوو، ص٣٠.
13- Nersession Ipid P.81.
١٤- سارگیسیان...، سەرچاوەی پێشوو، ص٣٠.
١٥- هرتسفلد، سەرچاوەی پێشوو، ص٧٣.
١٦- سارگیسیان، سەرچاوەی پێشوو، ص٣١.
١٧- سارگیسیان، سەرچاوەی پێشوو، ص٣٢.
١٨- هرتسفلد، سەرچاوەی پێشوو، ص٧٣.
- لوی واندنبرگ: باستانشناسی ایران باستان، ترجمە عیسی بهنام، تهران، ١٣٤٥، ص٥١.
١٩- هرتسفلد، سەرچاوەی پێشوو، ص٧٤.
٢٠- ا. م. دیاکونوف: تاریخ ماد، ترجمە کریم کشاورز، تهران، ٢٥٣٧ شاهنشاهی، ص١٧٥.
٢١- سارگیسیان، سەرچاوەی پێشوو، ص٣٢.
٢٢- دمورگان، سەرچاوەی پێشوو، ص١٦٥.
٢٣- مارف اقای: جغرافیای شنۆ، گۆڤاری (سروە)، سالی سێیەم، ژمارە ١٣ ئۆرمییە، گەلاوێژی ١٣٦٦.
٢٤- کرد در دائرە المعارف الاسلامی، ترجمە اسماعیل فتاح قازی، انتشارات صلاح الدین، ارومیە.
٢٥- سید عبدالله محمدی: کێلەشین، گۆڤاری سروە، سالی سێیەم، ژمارە ١٨ بەفرانباری ١٣٦٦، ص٢٧.
٢٦- آ. سایس: قلمرو وان (اورارتو) تاریخ قدیم کمبریج، جلد دوم، ص١٢٧.
٢٧- دمورگان، سەرچاوەی پێشوو، ص١٧٣.
٢٨- ئەم وەرگێڕانە لەسەر بەلگەنامەکانی بەڕێوەبەرایەتی گشتی شوێنەواری ئازەربایجانی ڕۆژئاواوە مۆزەخانەی ورمێ وەرگیراوە.
٢٩- نائیری، بریتی بوو لە کنفدراسیونی هۆزەکانی باشووری دەریاچەی وان، کە توانیان توکولتی نینورتا Tukulti - Ninucta ١٢٥٥ - ١٢١٨پ. ز شای ئاشوور شکەست پێبێنن.
٣٠- شاری توشپا پایتەختی ولاتی ئورارتو بوو لەسەر دەریاچەی وان یا شاری وانی ئێستا.
٣١- ئەم پێوانە لەسەر کێلە شین لەلای نووسەرەوە بەدەست هاتوون.
٣٢- مەبەستی کوژرانی شولتز یەکەم کۆیی هەلگری ئەم کێلەیە کە لە سالی ١٨٣٩ بە دەستی چەند کەسێکی نەناسراو دەکوژرێت.
٣٣- باسیل نیکیتین: خاترات و سفر نامە، ترجمە علی محمد فرەوشی، چاپ دوم تهران، ٢٥٣٦، ص٢٤٣ - ٢٤٤.
٣٤- یەکێک لە هۆیەکانی کە ئێران بۆ گواستنەوەی ئەم کێلە دیاری کردبوو.
٣٥- ئەم وێنەیە لەلایەن پێشمەرگەکانی کوردستان سالی ١٩٨٥ هەلگیراوە و ژمارەیەک لە پێشمەرگەکانی کوردستان لە وێنەکەدا دیارن.
* ئەم بابەتە لە گۆڤاری شانەدەر ژمارە ٢ی حوزەیرانی سالی ١٩٩٧ بلاوبۆتەوە.



# میلەکەی تۆبزاوە

دکتۆر عەبدوڵڵا خورشید

تۆبزاوە دەکەوێتە ناوچەی برادۆست، بریتییە لە میلێکی بەردین بە خەتی بزماری نەخش کراوە بە هەردوو زمانی ئاشووری و ئۆرارتی کە پێی دەگوترێت ئۆرارتۆ (خالدی)، بۆ گەیشتن بە گوندی تۆبزاوە، لە ڕێگای گوندی (تەیارە)یە ئێستا ئەو ڕێگایە بەرەو سیدەکان دەچێت پاشان بۆ چیای (سەری بەردی) دوایی دەگەیتە گوندی (سیدەکان)، لە دووری (٢٠) دەقیقە لەم گوندە لەلای ڕاستی ڕووباری (بورا) گوندی (تۆبزاوە) دێت، ئەم گوندە ناوێکی تری هەیە، ئەویش (تۆپزاوە جاوە)ی پێ دەگوترێت. میلی تۆبزاوەش لەسەر زەوییەکی ڕاستە، کە دەکەوێتە ناو دۆڵێکی فراوان و دەگەڕێتەوە بۆ سەرەتاکانی چەرخی هەشتەمی پێش زایین لە سەردەمی مەلیکی خولدی (روسا)، کە هاوسەردەمی (سەرجون ئاشووری) بووە (٧٢١-٧٠٥پ.ز).

مەسەلەکەش بریتییە لە پارچە بەردێکی (بازلت)ی شێوەی لاکێشەییە، لەسەر بەردێک دانراوە، کە بنکەکەی ١.١٦ مەترە و پانییەکەی ٩٣ سم و ئەستوورییەکەی ٣٣ سم، خەڵکی ناوچەکە پێی دەڵێن (کێلە گیاور) یاخود (کێلە گاور)، بەشی سەرەوەی بە مەسەلەی (کێلە شین) ناچێت، بەڵکو شێوەی ڕاستە و قوقز نییە لێوارەکانی شکاوە، (لیمان هاویت) وای بۆ دەچێت، کە بەشی سەرەوەی لە ماوەیەک لە ماوەکانی مێژوودا شکاوە، جەنەراڵ (ڕۆلنسون) بە یەکەم کەس دادەنرێت، کە ئەو مەسەلەی لە ساڵی (١٨٤١ز) دۆزییەوە، دوای ئەویش (دی مورگان) لە ساڵی (١٨٩٤ز) پاشان (لیمان) سەردانی کرد و لێکۆڵینەوەی لەسەر کرد. زاناکانی زمانە کۆنەکان لێکۆڵینەوەی زۆریان لەسەر ئەم مەسەلەیە کردووە، بەڵام نوێترین و باشترین لێکۆڵینەوە لەسەر ئەو مەسەلەیە ئەوەبوو لەلایەن مۆرفولۆجی (دی تیسیر تیلی) بڵاوکرایەوە.

### دەقی نووسینی مەسەللەکە

مەسەللەی تۆبزاوە بە خەتی بزماری نووسراوە، بە هەردوو زمانی

ئاشـــووری و ئۆرارتـی لە هەردوو دیوی نووسراوەتەوە و ناوی مەلیک (روسا)ی تیادا نووسراوە کە کاتی خـۆی مـەلیکی (ئۆرارتۆ) بووە و ناوی لە هەواڵەکـانی هەڵمـەتی هەشتەمی سەرجون هاتووە، کە بۆ سـەر وڵاتی ئۆرارتۆ لە سـاڵی (٧١٤)پ.ز ئەنجامیداوە.

دەقی کورتکراوەی وەرگێڕدراوی ئاشـووری بۆ دەقـە خلدییـەکـەی بریتـییـە لە ٣٧ دێڕ، کـە تیـایدا هاتووە:

(ئورزانای مـەلیکی ناوچەی موصاصیر داوای فریاکەوتنی کرد لە روسـا "ئەرسـا"ی کـوڕی مـەلیکی سـەردووری بـۆ ئەوەی ژیـانـی بپـارێزێت و هاوپەیمانی لەگـەڵدا بکات تاوەکـو لە ژێر دەسـەڵاتی ئاشـوورییـەکـان رزگـار بێت، بۆیە فەرمانی دا سـوپاکەی بەهێـز بکا، خـواوەندیش خـێـریان بۆ مـەلیکی موصاصیر "ئورزانا" ویست و گوێی دایە قـسـەی خـواوەند "خلدیا" بە هانای "روسا" هات، "روسا"ش ئەو هاوپەیمانییـەی قـبـوڵ کـرد لەگـەڵ "ئورزانا" و بە مەلیکی موصاصیری دەستنیشـان کرد و شوێن پێی خۆی لەوێدا، ئەو ساڵ جێگیر کرد؟ کاتێ "روسا" لە موصاصیر لەگەڵ مەلیک ئـورزانـا بـەرەو پـەرسـتـگـای خـواوەندەکـان چوون، ئورزانا بەرامـبـەری راوەسـتـا و سـوێندی لایەنگـیـری و دڵسـۆزی خـوارد بۆ مـەلیکی خولدی "روسا"و قـوربانی پێشکەش کرد لەگەڵ رژاندنی ئاوی پیـرۆز لەبەر پێی خـواوەند "خلدیا" پاشـان "روسـا" پەرسـتگایەکی بۆ خـواوەند (خلدیا) لە مـوصـاصـیـر دروست کـرد، (ئورزانا) لەگـەڵ سوپاکەی لەبەردەم پەرستگا پاڕانەوە دوای ئـەو (ئـورزانـا) هـەمـــوو هێزەکانی خۆی خستە ژێر دەسەڵاتی مـەلیـک (روسـا)، کـاتێ خـواوەند (خلدیا) لەگـەڵی هاتە دواندن و فـەرمـانی پێکرد هێـرش بکات، (روسـا) بەرەو چیـاکـانی وڵاتی ئاشـوور چوو، ئەو کـاتە هێـزێکی ئاشـوورییـەکـانی لە چیـاکـانی مـوصـاصـیـر دەرکـرد، قـوربانی پێشکەش کرد و ئاهەنگی بۆ ماوەی (١٥) رۆژ لە موصاصیر گێڕا، بەم جۆرە حوکمڕانی ئورزانا جێگیر بوو و گـیـانی پاراسـترا، دوای ئەوە روسا گـەڕایەوە وڵاتەکـەی خـۆی، دەقی نووسـینەکـەش بەم جـۆرە کـۆتـایی دێت: ...ئـەمـن - ئـەرسـا-م خـزمـەتکاری خـواوەند (خلدیا)ی سەرداری بە بەزەیی هەموو خەڵک، سـەرکـەوتنم بە دەست هێنا بە یـارمـەتی خـواوەند (خلدیا)و هێـزەکانی سـوپای خۆم کـە ترس و مـاندوو بوون نازانن دژی بەرگـری کـاران، خـواوەند (خلدیا) هێـز و دەسـەڵاتی بە من بەخـشی سـاڵانی حوکمڕانی منی کردە خۆشی، حوکمی وڵاتی (ئۆرارتۆ)م کـرد و خـاکی وڵاتی دوژمنم پارچە پارچە کـرد، خواوەندەکان رۆژانی خۆشیمیان زۆر کـرد، ئەو رۆژە شـادیانەی، کـە دڵم دەیەوێت دوای ئەوەی سەرکەوتنم بە دەست هێنا و ئاشتـیم سـەقـامگـیر کـرد، هەرکەسێ ئەوە لابـبات یاخـود بیـشـکێنێت، ئەوا خـواوەند (خلدیا)و خواوەند (اراد)و خواوەند (شماش) لەگەڵ هەموو خواوەندەکان بە رەچەڵەک لەناوی دەبەن و ناوی نامێنێت.

بە گـوێرەی دەقی مـەسـەلەی تۆبزاوە وادەردەکـەوێت کە (ئەرسا) فەرمانی نووسینەوەی دەقەکەی داوە لە مـیـانی ئەو ئاهەنگەی، کـە لە (موصاصیر) بۆ ماوەی (١٥) رۆژ گـێـڕدرا، ئەوەش لە سـاڵی ٧١٥ی پ.ز، کـاتێ (ئەرسـا) دەسـەڵاتی بەسـەر وڵاتی (مـانییـەکـان) لە باشـووری خـۆرهەڵاتی دەریاچەی ورمـێدا گـرت و پێسـتی (ئازا)ی کەوڵ کرد، کە سەرکاری (سەرجون) بوو لەسەر ئەم وڵاتە.

### سەرچاوەکان

* جـمـال بابان: اصـول اسـمـاء المدن والمواقع العراقية. بغداد، مطبعة الاجيال، ١٩٨٩، ج١.
* اربـيـل - هـه ولـيـر- بين الماضي والحاضر. ترجمة محمود الامين (بغداد: ١٩٦٥).
* مـحـمـود حـسين الامين: مـسلتـا طوبزاوة وكيلة شين: سومر (٨، ١٩٥٢).
* محمود الامين: تعليقات تاريخية على حملة سرجون الثانية، سومر (٥، ١٩٤٩).
* طه باقـر وفـؤاد سـفـر: المرشـد الى مواطن الاثارة والحضارة.
* ئەم بابەتە لە گۆڤاری شانەدەر، ژمارە (٢)ی حـوزەیرانی ١٩٩٧ بڵاوبۆتەوە.

# دۆزینەوەی گۆڕێکی سێ هەزار ساڵە لە باکووری قەڵای هەولێر

دڵشاد عەزیز زاموا

هاوڵاتییەکی گەڕەکی عارەبانی شاری هەولێر، لە دووری نزیکەی چوارسەد مەترێک لە باکووری قەڵای هەولێر، لە کاتی هەڵکەندنی حەوشەی ماڵەکەی بۆ لێدانی بیرێک، لە قوڵی چوارمەتر گەیشتبووە ژوورێک کە بە خشت دروستکرابوو، دەرئەنجام ئەو هاوڵاتییە دڵسۆزانە دەزگا حکومییەکانی ئاگادارکردبوودوە و داوای رزگارکردنی شوێنەوارەکەی کردبوو، کەچی وەک خۆی گوتی" دوای چەند رۆژێک چاوەڕوانی هیچ کەسێک بە دڵسۆزانە نەهات بە هانای ئەو شوێنەوارەوە".

پاش ئەوەی هەواڵەکە گەیشتە سەندیکای شوێنەوارناسان، سەندیکاش وەک ئەرکێکی خۆی تیمێکی پێکهێنا و تیمەکە سەردانی شوێنەکەی کرد، و هەر لە هەمان رۆژیشدا تیمەکەی سەندیکا سەردانی پارێزگاری هەولێری کرد، لە لایەن خۆیەوە پارێزگاری هەولێر بڕیاریدا لە رێگەی بەڕێوەبەرایەتی شوێنەواردوە کنە و پشکنین بۆ شوێنەوارەکە بکرێت.

پشکنین بە فەرمی دەستی پێکرد و نوێنەری سەندیکای شوێنەوارناسان ئامادەی پشکنینەکە بوو، ئەوە بوو ژورێک دەرکەوت کە بە خشت دروستکرابوو، و سەقفەکەی بە قوڕ سواغ درابوو، و بەرزی ژوورەکە(٢٢٠سم) دەبوو، و لەو سەری ژوورەکە دەرگایەکی دیکە کە بە خشت داخرابوو، دەرکەوت بەڵام پشکنینەکان تەنها لە ژوورەکەدا ئەنجامدرا و پێدەچێت دەرگاکەی دیکە بگاتە ناو ماڵەکە و پشکنین لەم بەشەدا بۆ وەرزی دووەمی کنەوپشکنینەکان دواخرا.

پشکنینەکان چەند گۆڕێکیان دەرخست کە لە ناو حەوزی گڵێنەیی دروستکرابوون و هەندێکیان سەرقاپیان بۆ دروستکرابوو، و چەندین گۆزەی گڵێنەیی و کوپەی بەردین خواردن و خواردنەوە و بۆنی تیادابووە کە وەک دیاری لە تەنیشت گۆڕەکان دانرابوون، بۆ ئەوەی کە لە جیهانی دوای مردن لە کاتی زیندووبوونەوەدا بەکاریان بهێنێت (بە پێی باوەڕی ئەوان).

جگە لەوە چەند پارچە زێڕێک دۆزرانەوە، شوێنەوارناس(دڵشاد عەزیز)نوێنەری سەندیکای شوێنەوارناسان لەم کنەو پشکنینەدا ئەم ئەنجامانەی خستەڕوو:

١- گۆڕەکە گۆڕێکی بنەماڵەیی بووە، کەسانی دەوڵەمەند و دەسەڵاتدار لە ژێر خانووەکانی خۆیانەوە دروستیان دەکرد لەو سەردەمەدا.

٢- بەڵگە شوێنەوارییەکانی ناو گۆڕەکە دەری دەخەن کە چەند

کەسێک لەو ژوورەدا نێژراون.

٣- گۆڕەکە لە سەردەمی خۆیدا تالان کراوە و خشڵ و زێڕ و شتەبەنرخەکانی دزراون، بە بەڵگەی ئەوەی کە ئێسکەکان لە ناو تابووتەکاندا نەمابوونەوە و پەرش و بلاوکرابوونەوە، هەروەها یەک تاک گوارەی زێڕمان دۆزییەوە و تاکەکەی دیکەی دزرابوو...

٤- لە پاش تالانکردن و دزینی گۆڕەکە کەسانێک هاتوون و دووبارە مردووەکانیان ناشتووەتەوە، بەڵام ئەم جارە لەناوتابووتەکەدا نەبوون، بەڵکو لە گۆشەکانی ژوورەکەدا یان لە ژێر تابووتە گڵێنەییەکەدا.

٥- پاش دووبارە ناشتنەوەی مردووەکان لە لایەن کەسانێکی نەناسراوەوە لە سەردەمە کۆنەکاندا، دەرگای گۆڕەکە کە کەوانێکی ئەندازەیی نزمە بەخشت داخراوە، کە دەتوانی لەو دەرگایەوە بگەیتە ناو ماڵەکە.



٦- دەربارەی سەردەمی ئەم گۆڕانە بەبەراوردکردن بە چەندین دۆزینەوەی لەو جۆرە لە شارە ئاشورییەکاندا بە تایبەت لە (شاری نەمرود و نەینەوا)ی پایتەختی ئاشورییەکان کە چەند گۆڕێکی هاوشێوە دۆزرانەوە، هەروەها لێکچوونی گڵێنەکان بۆمان دەرکەوت کە ئەم گۆڕە بۆ سەردەمی ئاشوری نوێ (سەدەی نۆیەم و هەشتەمی پ.ز)، دەگەڕێتەوە، جگە لەوەی کە کاریگەری ناوچەیی لەسەر گڵێنەکان هەبوون، و هەندێک لە گڵێنەکانیش لە جۆری گڵێنەی کۆشکی ئاشوری (فخار القصر الاشوری)بوون.

٧- کنەوپشکنینەکان لە گۆڕێکدا کە ژوورێکی بچووکە و لە قوڵایی پێنج مەتر لە ژێر زەویدا ترسناکییەکی زۆری هەبوو و تیمە شوێنەوارناساکە ژیانی خۆیان خستبووە مەترسییەوە، جگە لە مەترسی میکرۆب و ڤایرۆس چونکە نازانرێت ئەو کەسانە لە کۆندا بەچ دەردێک مردوون.

تێبینی: ئەم بابەتە لە ژمارە(٣)ی ساڵی (٢٠٠٩)ی گۆڤاری سوبارتو وەرگیراوە.





# قەڵاتی هەولێر

## دکتۆر یوسف خەڵەف عەبدوڵڵا فەهداوی

ئەو پێگەیەی قەڵات بۆی هەڵبژێردراوە بەشێوەیەکی گۆشەنیگا یان هەڕوایی نەبووە، بەڵکو پێگەکە بایەخێکی ستراتیژی لەرووی سەربازی و بازرگانییەوە هەیە. دروستبوونی قەڵات لەو شوێنە گرنگییەک و بازاڕێکی بەردەوامی داوە لەماوەکانی مێژوودا، هەر لەو کاتەی مرۆڤ تیایدا نیشتەجێ بووە تاکو ئێستا. قەڵات بەنزیکەی ٤١٥م لەسەر ئاستی دەریا بەرزەو بڵندیشی سەبارەت بە زەوییەکانی دەوروبەری زیاتر کە (٢٥) مەترە کەوتۆتە سەربانێک لە دەشتی هەولێر، کە ٣٩٠م لەسەر ئاستی دەریاوە بەرزە[١] رەنگە شوێنی گردی قالینج ئاغاش لەو شوێنی نیشتەجێی یەکەم بووبێ یان شوێنی تازەی قەڵات بووبێ، کە دەگەڕێتەوە بۆ ماوە مێژووییەکان کە درێژ دەبێتەوە بۆ سەردەمی عوبێدو وەرکا (٤٥٠٠- ٣١٠٠ پ.ز). بایەخی قەڵات لە بایەخی گردی قالینج ئاغا زیاترە. لەسەردەمی سۆمەرییەکان لە قالیج ئاغا دەودەستی، چونکە بایەخی قەڵا بەرز نرخێندرا. هەر بۆیەشە دەبینین لە سەردەمی وەرکا نیشتەجێ لەگردی قالینج ئاغا، بەوەی کەتێیدا چینی بەرز دەگەڕێتەوە بۆ ئەو سەردەمە. حەزدەکەم باس لەخاڵێک بکەم کە شارستانیەتی شارە مێژووییەکانی کۆن لەزۆرینەی ماوەکان کە پێیدا تێپەڕ بوون جیا دەکرێنەوە. ئەو خاڵەش ئەوەیە: قەڵاتی هەولێریش هەروەکو قەڵاتەکانی دیکە هەمیشە هەڵبژاردەی دەسەڵاتدار لە ناوچەکە تیایدا نیشتەجێ بوون، واتە بۆ تەواوی دانیشتوانی ناوخۆ نەبووە. بەواتایەکی تر شوێنی نیشتەجێی ئەو قەوم و حاکمە مەدەنی یان سەربازی و ئیدارییە خزمەتگوزارییەکانی دیکە بووە. بەڵام تەواوی دانیشتوانە خۆجێیەکان کە زێدەکەیان هەولێر بوو، لە چوار دەوری قەڵاو گوندەکانی دەوروبەری نیشتەجێ بوون و بڵاوبووبوونەوە. بۆیە زۆر گۆڕانکاری، وەک گۆڕانکاری کۆمەڵایەتی و ئابووری لەدەرەنجامی گۆڕانی رەوشە سیاسییەکان هەر لەدەستپێکی نیشتەجێبوون تا رۆژگاری ئەمڕۆکە بەسەر قەڵاتدا هات.

زاراوەی ئوربیلم[٢] **Urbilum** بەکۆنترین ناو گوزارشت دەکرێت، کە بەهەولێر وترابێ، دەشێ بڵێین ئەو دەستەواژەیە لەگەڵ ماناکەی ئەکەدییەکان بۆ شاری ئەربائیلۆ هاوواتایە، کە ئەو زاراوەیە لەنووسینەکانی مسماریدا هاتووە و مێژووەکەی بۆ نیوەی هەزارەی

سێیەمی پ.ز. دەگەڕێتەوە بەتایبەتی سەردەمی شای سۆمەری شولکی، کە یەکێ بووە لەشایەکانی بنەماڵەی ئوری سێیەم[3] ۲۰۹۵-۲۰٤۸ پ.ز. ناوی ئەو شارە لەنووسراوەکانی ئەو شایەدا لەساڵی (٤٥)ەمی حوکمڕانیەکەیدا هاتووە. کە ئۆربیلمی داگیر کردووە. هەروەها شای سۆمەری ئەمارسن ۲۰٤۷-۲۰۳۹ پ.ز لەساڵی دووەمی ماوەی حوکمڕانیەکەیدا ناوی هێناوە[4]. سەرنج دەدەین ئەو ناوە بەزۆر شێوە دووبارە بۆتەوە. بەڵام بەشێوەی ئەکەدی بەتایبەتی لەماوەی ئاشوورییەکاندا بەناوی ئەربائیلۆ هاتووە، کە لەوانەیە ناوی ڕەسەنی قەڵات و هاومانای زاراوەی سۆمەری ئەو ناوە بووبێت. هەروەها وشەی ئەربائیلۆ نزیکە لەوشەی عەرەبی چوار خوا. وشەی (ئەربا) واتە چوار وشەی (ئیلۆ) یان (ئیلاه) بەزاراوەکانی دوورگە، واتە بەزمانی ئەکەدی دایک و ئیشتیقاقە جیاوازەکانی لەئاشووری و بابلی و کلدانی و تادەگاتە دوماهی عەرەبەکان وای پێ وتراوە.

لەوانەیە ئەو ناوە هێمایەک یان ئاکارێک بووبێ لەبوونی پەرستگا سەرەکییەکان وەرگیرابێ، کە تایبەتمەند بوونە بەپەرستنی چوار خوا، کە پایەکی گرینگیان هەبووە لەسەردەمی ئەکەدی و سۆمەرییەکان، لەماوەی ئاشوورییەکانیشدا پایەیەکی بەرزیان هەبووە. هاوکات بنکەو گرنگی ئەو چوار خوایە لەدەستپێکاو لەماوەیەک بۆ ماوەیەکی دیکە جیاوازییان هەبووە. گومان لەوەدا نییە ئەشتاری خوداوەند لەماوەی ئەکەدییەکان و سۆمەرییەکان لەپێشەوەی خواوەندەکان دان. بەڵام لەماوەی ئاشوورییەکان لەوانەیە عەشتار خواوەند لەپێشەوە بووبێ، بەڵام چوار خوا لەوانەیە خواوەند نینورتا یان نرکال یاخود ئدد کە زۆر گرنگ بوون لای ئاشوورییەکان، تا گەیشتە ئەوەی لەو ماوەیەدا بەهۆی ئەوانەوە بایەخ بەشارەکەش درا.

پێدەچێ ئەو ناوە لەگەڵ گۆڕانکارە پەراوێزییەکان لەسەر ناوەکە بەردەوام بووبێ. لە تەورات ناوی ئەربائیلا هاتووە بەفارسی ئەربێرە، عوسمانییەکان پێیان وتووە ئەربیل. هەروەها لەلایەن دانیشتوانی شارەکان و ناوچە دراوسێیەکان بەقەڵاتیان وتووە ئەروبل. ئێستاش لەلایەن کورد پێی دەوترێت هەولێر[5].

قەڵات بەو ئاکارەی ئێستاکە ناتوانێ هیچ مێژوویەکی سیاسی یان سەربازی یاخود شارستانی دیارکراو بەشێوەیەکی زانستییانەو مێژوویەکی ڕەسەن بەدەستەوە بدات. ئەمەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە، کە تائێستاو ئەمڕۆی تیایدا دەژین لێتوێژینەوەیەکی وای تیادا ئەنجام نەدراوە. چونکە زۆری زانیارییەکان لەسەر قەڵات لەنووسینە مسمارییەکان و لەدەردەوەی قەڵات هاتووە، ئەمەش ئەو مافەمان بەدەستەوە نادات بەو گوزارشتەی کە ئەو زانیارییانە بەهەند هەڵگیراون و ڕاستەقینەن، بەڵکو تەنیا ڕێگایەکە دەمانگەیێنێتە سەر ڕاستی بوونی ئەو قەڵاتە، کە ئەمەش ناسەلمێندرێت تەنیا لەرێگای لێتوێژینەوە زانستییەکان نەبێت، بۆ زانینی نهێنییە شاراوەکان، کە لەناو چینە شوێنەوارییەکان، بەبەرزی ئێستاکە زیاتر (۲٥م) دەبێ دانراون. بەگشتی دەشێ بڵێین نیشتەجێبوون تیایدا لەوانە تازە بێ لەگەردی قالینج ئاغا یان ڕاستەوخۆ بووبێ لەپاش ئەو. واتە لەسەردەمی سۆمەرییەکان سەردەمی سەرهەڵدانی بنەماڵەکان، کە لەپاش سەردەمی وەرکادێت هەروەکو پێشتر باسمان کرد. ئیمپراپۆریەتی ئەکەدی، کە دامەزرێنەرەکەی سەرجۆنی ئەکەدی (۲۳۷۱-۱۲۱٦پ.ز) بوو، قەڵاتی هێنایە ژێر دەسەڵاتی خۆی بەمەبەستی دابینکردنی ڕێگای بازرگانی، کە بەقەڵاتدا تێپەڕ دەبوو، لەوێوە بۆ شاری ئەکەد. هەروەها پاش ئەوەی ئیمپراتۆریەت شکستی خوارد، ماوەیەکیش کەوتە ژێر دەسەڵاتی گۆتییەکان[6]. ئەمانە لەناوچە شاخاوییەکانی زاگرۆسن و بەدرێژایی سەد ساڵ (۲۲٥۰-۲۱۲۰ پ.ز) حوکمڕانی وڵاتی میسۆپۆتامیایان کرد. قەڵاتی هەولێر لەشوێنە قایمەکەی خۆی بوو، لەوێوە هێرش و شەپۆلی گۆتییەکان بەرەو ناوەڕاست و باشووری میسۆپۆتامیا، هەڵدەستاو دەست پێدەکرا.

لە نووسراوەکانی ماوەی گۆتییەکان لە سەردەمی شای گۆتی ئەریدۆ- بزر، دەقێکی سۆمەری لەسەر پەیکەرێکی پرکراوە لە پەرستگای خواوەند ئەنلیل لە شاری نفر[7] سەرکەوتنەکانی سەربازی لەهەردوو ڕووی دژی ئەوانەی لە بەرامبەری ڕاپەڕیون لە هەولێرو دەوروبەری لەسەر نووسراوە، لە دەقەکەدا هاتووە:

(ئەریدۆ- بزری پاڵەوان دەربکردن

(واتە دژومنەکانی لەناوچەکە دەرکردن)
گەرووی جەبەل نوخ- بیری کردەوە
پاش ئەوە تێکی شکاند ئەمینلی ئەل....... ی(*)
.... لەسەر ترۆپکی
لەماوەی رۆژێکا قەلاتی هەولێری کۆنترۆڵ کرد
لەچیای موما
پاش ئەوە نریشخوخای حاکمی هەولێری دەستگیرکرد
ئەو پەیکەرە بۆ خواوەند ئەنلیل لە نفر پڕ کراودتەوە(*)
هەر کەسێ ئەو نووسینە لابەرێ خوا ئەنلیل وشەمش دەخوازن لە بنوبۆتکەوە دەری بێنن
ئەریدۆ- بزر شای گوتیوم و چوارلای جیهان پەیکەرەکەی پڕکردووە بۆ خواوەند ئەنلیل لە نفر)[8].

کاتێ سۆمەریەکان گۆتییەکانیان لەسەر حوکم لادا و دووریان خستنەوە لەناوچەکە، قەلات کەوتە ژێر دەسەلاتی سیاسی سەردەمی سۆمەری نوێ[9]. رووداوەکان یەک بەیەک بەسەر قەلاتدا هاتن تا ملکەچ بوو بۆ سەردەمی بابلی کۆن(١٨٩٤-١٥٩٥پ.ز) و خورییەکاندا لەسەردەمی حوکمڕانی شا حامورابیدا (١٧٩٤-١٧٥٠ پ.ز). هەروەها لەماوەی کاشییەکاندان (١٠٩٥-١٢٣٥ پ.ز). لەماوەی ئاشوورییەکانیشدا (١٢٣٥-٦١٢پ.ز) ئەو شارە گەورەییەکی بەرزی بەخۆوە بینی. شا ئاشوورییەکان بایەخێکی یەکجار زۆریان پێدا، تا وای لێهات لەرۆژگاری ئەواندا بەسەردەمێکی زێڕین تێپەڕی. پایەی ئەو شارە لەگەڵ پایتەختەکانی دیکەی ئاشووری هاوشان بوو، وەک: ئاشوور- نەینەوا- کلحو نەمرود).

شایانی باسە هەروەکو باسمان کرد ناوی ئەو شارە لەقەلات وەرگیراوە، کە لەماوەی ئاشوورییەکاندا چوار پەرستگای خواوەندی گەورەی لێ بوو. بۆیە وا پێویست دەکات باسێکی ئەو خواوەندانە بکەین بەپێی ئەو زنجیرەیەی لە لیستی خواوەندی ئاشوورییەکاندا هاتووە:

**١- خواوەند ئاشوور:**

خواوەندی نەتەوەیی ئاشوورییەکانە. ئاشوورییەکان بیروباوەڕیان وابوو، کە سەرکەوتنەکانیان یان ئەنجامدانی ئەو کارە جەنگیانەی پێی هەڵدەستن لە ویستی زیندووی خوایەکەیان بەرجەستە کراوە. خوای دیارکراویان هەبوو، کە ئاکاری سەربازی هەڵگرتووە. ئەمەو لەسەرووی هەموویانەوە خواوەند ئاشوور دێت، خواوەندی نەتەوەییان، کە هەمیشە بەوێنەی کەسایەتییەکی چەکدار بە کەوان ئامادە بوو بۆ هاویشتنی تیر دەبیندرا، کە لەناوەڕاستی تۆپێکی باڵدار بوو[10] لە نووسراوەکانی شای ئاشوورییەکاندا هاتووە کە ئەوان بەمەبەستی وەدیهێنانی سەرکەوتنەکانیان پەنایان بۆ خوا ئاشوور بردووە. شا سەرجۆنی دووەم (٧٢٢- ٧٠٢ پ.ز) لە نووسراوەکانیدا دەڵێت: پەیامێکی ئاراستەی شا ئاشوور کردووەو پەیامی خۆشی بۆ لێدەدا، کە وەدیهێنانی سەرکەوتنی بۆ دیارکردووە. لە پەیامە خۆشییەکەیدا دەڵێت: (ئاشوور ئەی باوکی خوا، ئەی خودای گەورە، ببەخشە، بەخشینێک لەتۆوە بۆ هەمووان)[11]. بەڵام بەتەواوی نازانرێ ئایا ئەو ئاشوورییانەی لە جەزیرەوە هاتوون گوزارشت دەکرێت بەنەتەوەکانی جەزیرە دادەنرێن، کە هەر لەهەزارەی سێیەمی پ.ز.ەوە بوونیان لەناوچەکە هەیەو شارێکیان بەناوی ئاشوور دامەزراند؟ مێژوونووسەکان مەزەندەی ئەوە دەکەن، کە ناو هاتنیان بەئاشوورییەکان لەناوی ئەو شارەوە هاتووە، چونکە ئەو شارە بەو ناوە ناوزەد کراوە لەبەر ئەوەی بنکەو بارەگا بووە بۆ پەرستنی خواوەند ئاشوور، کە خواوەندی گەورەی نەتەوەیی ئاشوورییەکان بووە[12]. دەرکەوتنە سیاسییەکەیان لەدۆڵی رافیدەین لەسەر شێوەی دەوڵەتی بچووک بووەو ناوچە سیاسییەکەیان سنوورەکەی دیار بووە، کە شاری ئاشوورو گوندەکانی دەوروبەری بووە. دراوی ئاشووری کاریگەرییەکی زۆری بەفاکتەری سیاسییەوە هەبووە ولاتی بابل گشتگیری و زۆرینە بووە. زۆر لە ئاشوورییەکان ملکەچی سیاسی باشوور بوون، کاتێ باشوور رەوشی شلەژا بووژاندنەوەی سیاسی لە ولاتی ئاشوور بەردەوام بوو.

سەردەمی بابلی کۆن و نوێ لەسەردەمی شا حامورابی دەسەلاتی سیاسی ئاشوورییەکان دەستی پێکردو شانشینێکی ئاشووری نوێیان بۆ خۆیان دامەزراند. ئەو ماوەیەی درێژ دەبێتەوە لە (٢٠٠٠-١٥٠٠ پ.ز) بەسەردەمی ئاشووری کۆن دادەندرێت. لە ١٥٠٠- تا کۆتایی چاخی (دە) پ.ز بەسەردەمی ئاشووری ناوەڕاست دادەندرێت.

لەساڵی ٩١١ تا رووخانی پایتەختی ئاشوورو نەینەوا ساڵی ٦١٢ پ.ز بەسەردەمی ئاشووری تازە دادەنرێت. خواوەند ئاشوور زەقورەیەکی گەورەی هەیە لەشاری ئاشوورو تائێستاشی لەگەڵدا بێت پاشماوەکەی هەر ماوە. شیاوی باسە گەر سەرنج بدەین هەڵکەنراوەکان شوێنەوارەکانی لەسەر دروست کراوە، لەوێنەی خوا ئاشووردا خواوەند دێتە پێشەوەو پێشوازی لەشای ئاشوور سەنحاریب دەکات (٧٠٤-٦١٨ پ.ز). هەروەها لە دانانێکی دیکەدا لە دهۆک لەگەڵ خواوەندێکی دیکە دەبینین وەک ئەشتارو خواوەندی دیکە کە پێشوازی لەشا سەنحاریب دەکات.

بێگومان پەرستگایەکی گرنگ بۆ ئەو خواوەندە لەقەڵاتی هەولێر دەبیندرێت. جا گەر بێتوو کار راپەراندنی لێکۆڵینەوەکان لەقەڵات تەواو بێت، زیاتر گرنگی و بایەخی ئەو قەڵاتە لەماوە گرنگەکان لەمێژووی سیاسی و سەربازی دەردەکەوێت. ئەو خوایە شوێنی خوا ئەنلیلی گرتەوە. ژمارەی (پەنجا)ش لەژمارە بەهاکان بووە.

**٢- خواوەند ئەشتار:**

خواوەند ئەشتار بەیەکێ لەو خواوەندانەی لەدۆڵی رافیدەین و رۆژهەڵاتی کۆن بەناوی جۆراو جۆر پەرستراوەو بەپیرۆزی راگیراوە گوزارشت دەکرێت، لای سۆمەرییەکان بەناوی خواوەند واتە ننا پەرستراوەو بنکەی پەرستنەکەش لەشاری وەرکا[*] بووە. هەندێ جاریش گوتوویانە کچی خوا ئانو، جاری واش بووە بەهاوسەرەکەیان داناوە (خوای ئاسمان لای عێراقییە کۆنەکان).

رۆڵی گرنگی بینیوە لە ئەفسانەی مردنی خوا تەمووز دایکیشی ناسراو بوو بەخواوەندی ننگال[١٣] (nin-gal) واتە خاتوونی گەورە. پیرۆزییەکی تایبەتمەندی هەبوو لەشاری هەولێر. خوایەکی پیرۆزو پەرستراو بوو لەو شارە، ناوی هەولێر نزیک بۆوە لەپەرستنی ئەو خوایە. هەروەکو زانراوە ئەشتار بەیەکێ لەخوا سەرەکییەکان لەئیمپراتۆریەتی ئاشووری دادەنرێت. ئاڵاکەی لە سەرجەم هەڵمەتە سەربازییەکان لەگەڵ خواوەندی گەورەی تایبەت خواوەند ئاشوور هەڵدەگیرا هەروەکو لەدەقی مسماریدا هاتووە: (پاڵەوان کە بەسەر دوژمنەکانی ئاشووردا زاڵ بوو ناوەکانی سڕییەوە). بەوێنە لەسەر مۆرەکانی لوولەیی، کە دوو تووردەگەی هەڵگرتووە، یەکێ لەسەر شانی راست و ئەوی تر لەسەر شانی چەپ و کەوانێکی بەدەستەوەیە یان شمشێرە تیژەکەی دەردەکەوێت، ئەوا لەیەک کاتدا خواوەندی خۆشەویستی و جەنگە[١٤]. لەم رووەوە سەرنج دەدەین خواوەند ئەشتار دوو ئاکاری دژ بەیەک هەڵدەگرێت خواوەندی خۆشەویستی (ژیان) خواوەندی جەنگ (مردن)، واتە بەخشینی ژیان و بردنەوەی بەدەستە. لە سەرجەم شارە کۆنەکان پەرستگای هەبووە. پەرستگاکانی هەروەک لەنووسراوە مسمارییەکاندا هاتووە بەناوی (ئەی- کشان- کەلاما) واتە ماڵی خاتوونی هەرێم[١٥] خوای گەورەی ئیمپراتۆریەتی ئەکەدییەکان[١٦] (٢٣٧١-٢٢٣٠ پ.ز) بووە.

**٣- خواوەند نابۆ:**

یەکێکە لە خواوەندە گرنگەکانی وڵاتی دۆڵی رافیدەین، بنکەی خوا پەرستنی لە شاری بورسیا بووە، کە نزیک بووە لەشاری بابل. خواوەندی نووسین و چارەنووس بووە. تابلۆ و نووسین و قامیشی تایبەت، کە ئامێری نووسینە هەڵیگرتووە. دروشمەکەی مارێکی خەیاڵییە[١٧]. کە هەمان هێمای خوا مەردۆخی باوکیەتی، خوای نەتەوەیی بابلییەکان بەتایبەتی لەماوەی کلدانییەکان (٦١٢-٥٣٩ پ.ز). خوا نابۆ پەیوەندییەکی پتەوی بەخواوەند مەردۆخ (ئامار- ئوتوک) هەبووە، بەبابلی مانای رووناکی خۆری بچووک دەگەیەنێت. ئاماژە بەو پەیوەندییە دراوە بەخواوەندی شاری بابل لە سەردەمی کۆن بەناوی نیبۆ (Nebo) کە ناوێکی عیبرییە، واتە خواوەند نابۆ[١٨]. ئەو خواوەندە پەیوەندییەکی بەهێزی هەیە بەجەژنەکانی سەری ساڵ و شوێنی خواوەند مەردۆخی گرتەوە لەو تایبەتمەندییە. لەوانەیە پەیوەندیشی هەبووبێ بەجەژنەکانی نەورۆز لەو ماوانەی بەدوایدا هات لەمێژووی شاری هەولێردا. خواوەند نابۆ بەخوای پارێزەری هونەری نووسین دادەنرێت. خواوەندی حیکمە بووە، هاوسەرەکەی ناوی تشمیتم بووە واتە بیستن[١٩].

**٤- خواوەند نینورتا:**

خواوەندی جەنگاوەر، چەکێکی بەدەستەوەیەو بۆ شا حامورابی بەرز کردۆتەوە، کە سەرکەوتنی بۆ هێنا، لە ئەفسانەی کۆندا نینورتا پاڵەوانی خواوەند ئەنلیلە. کە خوای راوە ئەو پایەی لە سەردەمی ئاشووری ناوەراست (١٥٠٠-٩١١ پ.ز)

وەرگرت. پەرستنەکەی لە پایتەختی ئاشووری بڵاوبۆوە وەک کالح (کەلحو) واتە نەمرووەدی ئێستاکە. ئەو ناوە پەیوەندی بەنەمروودی راوچی بەهێز هەیە لەبەردەم خوایەکەی، هەروەکو لە (سفر التكوين- الاصحاح العاشر)[٢٠] دا هاتووە. کوڵا هاوسەری خواوەند نینورتا بوو، کە تێکەڵ بەخواوەند (نن- نبرو **Nin-nibru**)ی گەورەی نبرو شاری نفر) بوو. ئەو روونکردنەوەیە پەیوەندییەکی پتەوی بەنێوان نینورتا یان ئەنلیل (خاتوونی هەوا)وە هەیە.

لەنووشتەیەکی تەلیسماویدا هاتووە خواوەند نینورتا توانای کاولکردن و زیندانیکردنی هەموو ئەو کەسانەی هەیە، کە هەوڵی ئەوە بدەن خراپە بەخەڵکی دیکە بگەیەنن. ئەو (نینورتا) گەورەی گەوران لەتوانایدا هەیە دڵ پارچە پارچە کات، کۆتایی بەژیان بهێنێت، هاوسەر بکوژێت، منداڵەکان و نزیکەکان و ناو و رەگوڕیشەو نەوەی باواخ (ئەدینا)[٢١] نەهێڵێت. لەم دەقەدا وادیارە لەتوانایدا هەبووە بنەماڵەیەک بەتەواوی لەناوبەرێت.

**٥- خواوەند ئەدد:**

خواوەندی بروسک و گۆڵە گۆڵ، خوای کەش و هەواو لافاوەکان. پێدەچێ رەگوڕیشەی پەرستنەکەی بگەڕێتەوە بۆ نەتەوەکانی جەزیرە لە سووریا. لە ژێر ناوی (حدد) پەرستراوە. ئەو خواوەندە پایەکی باشی هەبوو لای ئەمووریەکان لە شانشینی ماری (گردی حەریری لەسەر سنووری سوریا- عێراق) لەماوەی حوکمڕانی شا حامورابی و لای بابلییەکان. تا وای لێ هات ناوی چووە نێو زۆر لەناوی فرمانڕەواکانی ئەو شانشینە. وەک شەمشی ئەدد یان یسمح ئەدد[٢٢]. هەروەها لەشەریعەتی حامورابیشدا هاتووە بەو گوزارشتەی، کە خواوەندی باڵادەست بووە لەسەر دەرگای لافاوەکان لەئاسمان و زەویدا. لای ئاشوورییەکان خواوەند ئەدد بەخوای گەورەی ئاشوورییەکان ناوزەد کرا. ئەمەش لە هەڵکەندراوەکانی (خنسی و معلثایا) دەدۆزینەوە، کە هێمای بەهەورە تریشقەی بروسکی تێر[٢٣]، بۆ کراوە. هێمای ئەو خواوەندە ژمارە دەیە، ئەمەش لەدابەشی سیستەمی شەستییە، کە عێراقییە کۆنەکان پەیڕەوییان دەکردو بەکاریان دەهێنا. زەقوورەیەکی بچووک لە پەرستگاو دوانە لەشاری ئاشوور هەبوو، بەپەرستگاکەیان دەوت پەرستگای ئانۆو ئەدد. لەو پەرستگایە دوو زەقوورەی بچووک بۆ ئەو دوو خواوەندە هەبوو بیروباوەڕیان وابوو خواوەند ئەدد لەسەر لووتکەی چیاکان دەمێنێتەوەو چەکەکەشی هەورە تریشقەو برووسکە. بەڵام ئامارە ئاژەڵییەکەی گایە، کە بۆڕاندنە بەگرمە گرم و هۆڕ دەچێت. (خواوەند شالا)ش هاوسەری بوو.

**٦- خواوەند نرکال:**

ئەو خواوەندە بەهەمیشەیی لە نووسینە مسمارییەکاندا هاتووە، بەتایبەت لەماوەی ئاشوورییەکان، بەوەی کە شای جەنگ و شەڕو کوشتارە. ئەمەو لەو دەقە مسمارییەدا هاتووە: (خواوەند نرکال، گەورەی تیرو کەوان دەخوازێ چەکەکانیان تێک بشکێنێ)[٢٤]. ئەو خواوەندە بەترس بووە، پاسەوانی شاری کوپا (گردی ئیبراهیمی ئێستا)ی کردووە. ئەو شارە هەروەک لەدەقە تەلیسماوییەکان هاتووە ناوی کۆمەڵگای تارماییەکان بووە[٢٥]. هاوسەرەکەی بەناوی لاس ناسراو بوو، هەندێ جاریش بەناوی خواوەندی جیهانی خواروو ئەریش کیگال.

لێرەدا ژمارەیەک لەو دەق و نووسراوە مسمارییانەدا دەهێنینەوە، کە باسیان لەو خواوەندانە بە کۆ یان بە تاک کردووە، لەگەڵ گرنگییان لە دەقەکاندا، کە ناوی شاری هەولێریان بردووە. لەم دەقانەدا دەبینرێ خواوەند ئەشتار پایەکەی لەهەموو خواکانی تر بەرزتر بووە. ئەمەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە، کە شاری هەولێر بۆ ئەشتار رۆڵێکی گەورەی هەبووەو لەهەمان کاتدا بایەخی بەپەرستنی خواوەندەکانی دیکەی شارەکانی تری وڵاتی ئاشوور داوە. هەروەکو ئێمە دەزانین خوا پایەندە لە پشتگیریکردن و زامنیکیش بووە بۆ سەرکردەی سەربازی ئەرکە رێزدارییەکان و پیرۆز راگرتنی خواوەند بەجێ دەگەیەنێ. بەدرێژایی جەنگ هاوڕێ و یاوەری دەبێت. لەدەقێکی مسماریدا دەبینین خواوەند ئەشتار هانی پاڵەوانەکەی شای ئاشووری ئاشوور پانیپال (٦٦٨-٦٢٦ پ.ز) داوە، کە پێی دەڵێ: (نەترسی ئەی ئاشوور پانیپال... شەست خوای گەورە لە تەنیشتم وەستاون (بۆ کۆمەک کردنت)و دەتپارێزن: خوا سن لای راست و شەمش لای چەپ. شەست خوای گەورە لەدەوروەتدا دەبن، ئامادەن بۆ شەڕکردن، خۆت بەدەست

خەڵکەوە نەدەدیت، چاوەکانت روو لە من بن. هەمیشە سەیرم بکە، ئەز ئەشتاری هەولێرم)[٢٦]. ئەمە جۆرێکە لە جۆرەکانی ورووژاندنی پەرۆشی و پاڵنانی سەرکردەو سەربازەکان لەجەنگدا. لەدەقێکی دیکەدا دەبینین باران و لافاوی رووباری ئیدید ترسی بۆ سوپاکە ناوەتەوە، کە بپەڕنەوە لەبەر باران بارینی بەلێزمەو دروستبوونی لافاوی رووبارەکە. سەرنج دەدەین خواوەند ئەشتاری هەولێر لەسەر شێوەی خەون بە شا دەڵێت: (لەپێشەوەیان دەڕۆم ئەی ئاشوور پانیپال ئەو شایەی بەدەستی خۆم دروستم کردووە). شا داوای کرد بەمەوە سەربازەکانی دڵنیابوون، کە ئەو خەونەی دیوە، بە بەختەوەرییەوە لەئاوی رووبارو لافاوەکە پەڕینەوە[٢٧].

جاری واش هەبووە خواوەند ئەشتار شای قەدەغە کردووە لەوەی، کە سوپاکەی لەپێناو جەنگدا بەسەربازگر بکات، بەو گوزارشتەی خەسارەتمەند دەبێ لەهێرشکردنە سەر دوژمن. بەهۆی بڵاوبوونەوەی پەتا یان برسیەتی. لەکاتی یەکێ لەجەمژنەکان لەمانگی ئابدا لەشاری هەولێر خواوەند ئەشتار نەیهێشت شا لە پەرستگا[٢٨] بگەڕێتەوە لەپێناو جەنگدا. بەرێگایەکی دیکە وڵاتی ئیلامی داگیر کرد، واتە کاهین عەزا وڵاتی ئیلامی داگیرکرد. خوا ئەشتار فەرمانی بەعەزا کرد لەجیاتی شا ئەم کارە جێبەجێ بکات.

لە دەقێکی سەردەمی باوکی شا ئاشوور پانیپال، شا ئەسەرحەدون (٦٨٠-٦٦٩ پ.ز) باس لەئەسەرحەدون دەکات، کە لەئاهەنگ گێرانێکدا باوکی سەنحاریب یاوەری خەلافەتەکەی بووە لە کورسی پادشایەتیدا. لەو ئاکارەدا دەتوانین ئەوە وەدەست بێنین کە خواوەند کاساس رازی بووە لەسەر ئەوەی ناوبراو دەسەلات وەربگرێت. تیایدا هاتووە: هەر گەنج بووم کاتێ باوکم بەشێوەیەکی شەرعی سەرمی بەرزکردەوە لەسەر فەرمانی خواوەندەکانی ئاشوورو شەمش و بیل و نابو و ئەشتار نەینەواو ئەشتار هەولێر.. لەبەردەم خواوەندەکان ئاشوور-سن-شەمش-نابو-مردوک خواوەند ئاشوور، ئەو خواوەندەی لەئاسمان و زەویدا دەژی. وای کرد کە سوێند بخۆن لەسەر ئەوەی رێز لە سەرکردایەتییەکەم بگرن. ئەمەش لەمانگی نیساندا بوو[٢٩].

لە دەقێکی تردا کە دەگەڕێتەوە بۆ شا ئاشوور پانیپال، پێدەچێ خواوەند ئەشتار لەسەردەمی ئەودا پایەکی زۆر بەرزی هەبووبێ. چونکە دەبینین کاهین لەپەرستگای ئەشتار لە هەولێر بوونی شای ئاشوور پانیپالی ئیستیغلال کردبێ، کە خەونێکی بۆ پێکهێنێ و لەخەونەکەیدا باس لەپابەندبوونی شا دەکات بەچاکسازیکردنی شای ئیلامی، کە هەوڵی دەدا هەرەشە لەوڵاتی ئاشوور بکات. شای ئیلامییەکان تیومان (تبت هیمان)[٣٠] دەستدرێژی کردە سەر وڵاتی دۆڵی رافیدەین و، خواوەند لەرێگای ئەو کاهینە بەخت گەڕەوە دەڵێت: کات شیاوە بۆ هێرشبردن لەدژیدا، ئەمەش لەساڵی ٦٥٣ پ.ز روویدا. ئەوە بوو کاهین ئەوەی لەخەونی دیبوو سەبارەت ئەو تایبەتمەندییە بەشای راگەیاندووە (کاتێ خواوەند ئەشتار گوێبیستی سورمانیم بوو پێی گوتم: نەترسی... (بەمەوە) دڵم پڕبوو لەدڵنیایی پاشان گوتی: من پێشوازیت لێدەکەم بەرێژەی ئەوەی دەستەکانت بۆ نزاکردن بەرز بکەیتەوە، چاوەکانتم پڕکرد لە فرمێسک). لە شەویشدا کاهین لەبەردەم (ئەشتار) خەوت و لەخەونیدا بینی، کاتێ وەخەبەر هاتەوە (زانی) ئەشتار لەشەودا بەخەون نیشانی دا تا ئەوەی (بینیویەتی) بیگێڕیتەوەو گوتی: (ئەشتار هات کە لە هەولێر نیشتەجێیە، کەنینەکان لای راستی و چەپی کرنۆشیان دەبرد، کەوانێکی بەدەستەوە بووە، شمشێرەکەی تیژ کردووە بۆ جەنگ، لەبەردەمی وەستابووم، قسەم لەگەڵیدا کرد هەروەک دایکت کە تۆی هێناوەتە بوون، ئەشتاری گەورە لەنێو خواوەندەکاندا بانگهێشتی کردی و ئەم راسپاردانەی پێدای (دەسکەوتی فەرمانەکانم بەجێ دەگەیەنیت... ئەو شوێنەی رووی تێ دەکەی لەگەڵتا دێم.. تۆ وتت: ئەی خاتوونی ئاسمان لێم گەرێ با لەگەڵ تۆ بێم بۆ هەر شوێنێک دەچی، پاشان گوتی: تۆ لێرە بمێنەوە شوێنی خواوەند نابۆ، خواردن بخۆ شەراب بخۆوە چێژ لەمۆسیقا وەربگرە، ستایشی خوایەتیم بکە کاتێ رۆیشتم و ئەو دەستکەوتە گرینگەت وەدی هێنا. لەپێناو وەدیهێنانی ئەو خواستانەی دڵت دەیەوێت. ئێستا پێویست بەوە ناکات رووت گرژ بێت، پێیەکانت ماندوو مەکە لەگۆڕەپانی جەنگدا لەهێزت بێئومێد مەبە) (پاشان) لەباوەشی خۆشەویستی گرتی و

جەستەت هەستی پێکرد (بینیت) ئاگرێک لەبەردەمتا دادەگیرسێت. لەبەر رقوکینەی دوژمنەکان بۆ لای تۆ دەکشێت. دوای رووی لەتیومانی شای ئێلام کرد، کە رق و کینەت لێیە)[31].

لەم دەقەدا رۆڵی کاهینمان بۆ روون دەبێتەوە لە پاڵنان بە دامودەزگاکانی سەربازی بۆ هەڵگیرساندنی جەنگ و هەروەها چۆن هەولی داوە شا لەخشتە بەرێ بەسەرکەوتن و ئیستیغلالکردنی ئارەزووی شا لە راگەیاندنی جەنگدا. هەڵبەتە گەر لە جەنگەکەش نشوستی وەدەست هێنابایە بێگومان تیرامانی شا بۆ کاهین ئەوسا نێگەتیڤ دەبوو، یان لەوانە بووایە کاهین بەشێوەیەکی تر ئەو بارەی شرۆڤە بکردبایە.، لەکاتی سەرکەوتنیشدا خێرو فەڕ و دەسکەوت بەسەر شاری هەولێردا دەباری و کاهینەکانیش بەشێکی زۆر لەدەسکەوتەکانیان وەردەگرت.

لە دەقێکی دیکەدا بۆ شای ئاشووری ئەسەرحەدون (٦٨١-٦٦٩ پ.ز) سەرنج دەدەین خواوەند ئەشتاری هەولێر ئامۆژگاری پێشکەش دەکات:

(من ئەشتاری ئەربێلام
چاودێری دوژمنەکانت دەکەم و
تەسلیم بەتۆیانەوە دەکەم
من ئەشتاری ئەربێلام
لەپێش و پشتت دەڕۆم
لەهیچ نەترسی
تۆ لە خۆشیدا دەبی
من لە توندیدا دەبم
من لە پێشتەوە دەڕۆم، لەوێ دەمێنمەوە.
من ئەشتاری ئەربێلام

ئەی ئەسەرحەدون شای ئاشوور لە شاری ئاشوورو نەینەواو کالح و هەولێر
سامانەکەم دەبەخشمە ئەسەرحەدون رۆژانێکی درێژو ساڵانێکی هەتا هەتایی)[32].

لەو دەقەدا دەبینین ناوی شاری هەولێر هاوشان لەگەڵ ناوی سێ پایتەختی دیکەی ئاشووری هاتووە. هەروەها روونی کردۆتەوە، کە کاهینەکانی خواوەند ئەشتار- هەولێر پایەکی بەهێزو کاریگەریان هەبووە لە دیاریکردن و وەدیهێنانی ئارەزووی شا لەهەر جەنگێکدا کە ئارەزووی کردبێ ئەنجامی بدات. لەپێناو زانینی ئەو ئارەزووە لەرێگای ئەو خەونەوە وەدی هێناوە، کە کاهین بینیویەتی یان لەرێگای قوربانییەکان بووە، کە پێشکەش بەنزیکەکانی خواوەند ئەشتار کراون. یان لەرێگای دانانی تابلۆ بووە لای پەیکەری خواوەندەکان لەپەرستگای ئەشتارو ئەوەی ئارەزوویان کردبایە وەدی بهێنن لەسەریان دەنووسی. تاوەکو دواتر لای خواوەند[33] وەلامەکەی وەربگرنەوە. زۆری ئەو وەلامانەش بەجۆرێ لەجۆرەکان هاتووە. یان لەرێگای خەون یانی پەیامبەرایەتی یاخود خوێندنەوەی جەرگی ئەو ئاژەڵەی کراوەتە قوربانی.

بەلام لە سەردەمی نوێی بابلییەکان (٦١٢-٥٣٩ پ.ز) خواوەند ئەشتار دەربارەی خودی خۆی دەڵێت:

(من تۆڕێکی خاوەن گرێ کوێردم لە دەشتا
من ئاگرێکی هەڵگیرساوم کە...
من ئاگرێکی هەڵگیرساوم لە چیا)[34].

ئەو دەقە لە سروودێکی خواوەند واتە ننا (ئەشتار) دزراوە. لەوانەیە ئەوە لێرەدا ئاماژە بەرێگای ئاهەنگێرانەکان بدات بەمامناوەندی بەهار، کە دەکاتە سەری ساڵی سۆمەری و بابلی و ئاشوورییەکان. ئاس لەهەموو ساڵێک لەمانگی نیسان ساز دەدرا. کە دەکەوێتە ٢١ی مانگی ئازاری هەموو ساڵێک لەکاتی ئێستاماندا. هەروەها خەڵکی میسۆپۆتامیای کۆن بەبۆنەی ئەم جەژنەوە ئاهەنگیان دەگێرا بەپێی سووڕانەوەی مانگ نەک خۆر. ئەو هاوکێشەیە سادەیە. خەڵکی میسۆپۆتامیا کۆنەکان هەر سێ ساڵ مانگێکیان دەخستە سەر تا (ساڵی مانگی) بەرامبەر بێت بە(ساڵی خۆری). جا لەبەر ئەوەی ساڵی مانگی ٣٥٤ رۆژەو خۆری ٣٦٥ رۆژە، واتە (مانگی) بەیانزە رۆژ زێترەو بۆ کوژاندنەوەی ئەو رۆژە زیادانە خەڵکی میسۆپۆتامیای کۆن بەبۆنەی سەری ساڵ و بۆ ماوەی یانزە رۆژ ئاهەنگیان ساز دەدا. ئەمەش خۆی لەخۆیدا ماوەی ئاهەنگێرانەکان بەدەستمانەوە دەدات، کە یانزە رۆژ بووە. بەوەش لەساڵی سێیەم ٣٣ رۆژیان کوژاندۆتەوە. بەهۆی ئەمە هەردوو ساڵی مانگی و خۆری بەپێی ئەم هاوکێشەیە دەبێت: گریمان جەژنی ساڵی یەکەم کەوتە ١ی نیسان لەساڵدا؟ بەرامبەر بەکی رۆژی (مانگی)یە لەمانگی یەکەمی ساڵدا کە دەکەوێتە مام ناوەندی بەهار لەساڵی دواییدا، ئاهەنگگێرانەکانی جەژن لە ١٩ی ئادارۆ واتە ١ی ئازار دەست پێدەکات. لەساڵی سێیەم

ئاهەنگگێرانی جەژن پاش تێپەڕبوونی سیانزە مانگ لەساڵی مانگیدا واتە پاش نۆزدە ڕۆژ لەڕۆژی ١٩ی ئادارۆ واتە هەشتەم ڕۆژ لەمانگی تازە[*] واتە لەمانگی نیسان، ئەم ڕۆژە دەبوو بەیەکەم ڕۆژ لەمانگی نیسان و سەردتای ساڵی تازە، بەم شێوەیە مانگەکە دەکوژێندرایەوە.

بەو واتایە جەژنی نەورۆزی ئێستا درێژە پێدانی جەژنی سۆمەرییە کۆنەکانە. ئەوکاتە کتومت دەبێت لەگەڵ کێشە و ململانە چینایەتییەکەی ڕوویدا لەگەڵ کاوەی ئاسنگەرو زوحاکدا. لای هەموو خەڵک زانراوە، کە ناتوانرێ فەرمانڕەوا یان شا ببیندرێ تەنیا لەڕۆژەکانی جەژندا نەبێت. بەمەش دەرفەتێک ڕەخسا کە کاوە بتوانێ بەسەر حاکمی خوێنڕێژ لە ڕۆژی ئاهەنگگێڕاندا زاڵ بێ، کە کتومتە لەگەڵ جەژنی بەهار. ئەمەش خۆی لەخۆیدا ئەوە دەگەیەنێت کە جەژنی نەورۆز دەبێتە درێژە پێدانی جەژنی سۆمەرییە کۆنەکان.

**پەراوێز:**

١-كزنيي، عبدالرحمن احمد: اربيل وماء الشرب في الماضي والحاضر. اربيل ١٩٧٧ ص٨.
٢- باقر طه، وفؤاد سفر: المرشد الى موطن الاثار والحضارة، المرحلة الخامسة، بغداد ١٩٦٦ ص٣. هەروەها بڕوانە اسماعيل، زبير بلال: اربيل في أدوارها التاريخية، النجف الاشرف ١٩٧٠ ص٦١.
٣- عبدالصمد، رافدة عبدالله: اربيل في المصادر المسماريه، ئەم بابەتە لە کۆنفرانسی یەکەمی زانستی بۆ کاروباری قەڵات لە هەولێر پێشکەش کراوە، هەولێر، ٢٠٠٤، ل ١٠٠
٤- سەرچاوەی پێشوو، ل ١٠٠
٥- الجنابي، هاشم خضر: مدينة اربيل دراسة في جغرافية الحضر. الموصل ١٩٨٧ ص٩.
٦- سەرچاوەی پێشوو، ل ١٠.
٧- عبدالصمد: اربيل في المصادر المسمارية، ص٩٩.
* هذه النقاط تعني بان الرقيم الطيني غير صالح وتعذر قراءة النصفي هذا الموضع.
* شارێکی کۆنی سۆمەرییە لە باشووری عێراق، کە شوێنی خواپەرستی (ئەنلیل)ی خواوەند و پەرستگا بەناوبانگەکەی E.KUR
٨- عبدالصمد: اربيل في المصادر المسمارية ص١٠٠.
٩- الجنابي: مدينة اربيل ص١٠. هەروەها بڕوانە: الحيدري، عبدالباقي عبدالجبار امين: التجديد الحضري لقلعة اربيل. الموصل ١٩٨٥، ص٥٨.
١٠- عبدالله، يوسف خلف: الجيش والسلاح في العهد الاشوري الحديث، بغداد ١٩٧٧، ص١٣.
١١- سەرچاوەی پێشوو، ل ١٤.
١٢- باقر، طه: مقدمة في تاريخ الحضارات القديمة، ج١، بغداد ١٩٧٣، ص٤٧١ و دواتر.
* شاری وەرکا: شارێکی شوێنەواری کۆنە، شوێنی خواپەرستی ئاشووری خوداوەند عەشتار بووە، دەکەوێتە ڕۆژئاوای سەماوە.
١٣- علي، فاضل عبدالواحد: عشتار ومأساة تموز، بغداد ١٩٨٦، ص٥٧.
١٤- عبدالله: الجيش والسلاح، ص١٣.
١٥- الجنابي: مدينة اربيل ص١٠. هەروەها بڕوانە باقر: المرشد، ص٣ هەروەها بڕوانە الحيدري: التجديد الحضري ص٥٨.
١٦- علي: عشتار ومأساة تموز، ص٧٣.
١٧- كونتينو، جورج: الحياة اليومية في بلاد بابل واشور. ت: سليم طه التكريتي. بغداد ١٩٧٨، ص٤٢٨.
١٨- ساكز، هاري: عظمة بابل. ت: عامر سليمان. موصل ١٩٧٩ ص٣٩٦.
١٩- سەرچاوەی پێشوو، ص٣٩٧.
٢٠- سەرچاوەی پێشوو، ص٣٩١ هەروەها بڕوانە. عبدالله، الجيش والسلاح ص١٣.
٢١- ساكز، عظمة بابل، ص٣٥٦.
٢٢- باقر، طه واخرون. تاريخ العراق القديم ج٢، بغداد ١٩٨٠ ص١٧.
٢٣- سەرچاوەی پێشوو ص١٧.
٢٤- عبدالله: الجيش والسلاح، ص١٣.
٢٥- ساكز: عظمة بابل، ص٣٩١.
٢٦- الطعان، عبدالرضا: الفكر السياسي في العراق القديم بغداد ١٩٨١، ص٤٧٧.
٢٧- سەرچاوەی پێشوو، ص٤٧٩.
٢٨- سەرچاوەی پێشوو، ص٤٨٠.
٢٩- الطعان: الفكر السياسي في القديم، ص٦٦٧.
٣٠- الدوري، رياض عبدالرحمن امين: آشور بانيبال، سيرته ومنجزاته، بغداد ٢٠٠١، ص١٠١.
٣١- علي: عشتار ومأساة تموز، ص٥١-٥٢.
٣٢- لابات، رينيه: المعتقدات الدينية في بلاد وادي الرافدين. ت: الاب البير ابونا و وليد الجادر، بغداد ١٩٨٨، ص٣٠٩.
٣٣- الطعان: الفكر السياسي في العراق القديم، ص٤٧٥.
٣٤- الابات: المعتقدات الدينية في بلاد وادي الرافدين. ص٢٩٩.
* واتە ئەگەر لە (١٩)ی ئادار (١١) ڕۆژمان کەم کردەوە، ئەوا (٨)ی ئادار دەبێتە کۆتایی مانگی دوازدەهەم، ساڵ مانگێکی دیکەی بۆ درێژ دەبێتەوە، ئیدی (٨)ی نیسان دەبێتە یەکەم ڕۆژی سەری ساڵ و بەم جۆرە.



# خوێندنەوەیەک بۆ قەڵای هەولێر

دکتۆر یوسف خەلەف عەبدوڵڵا ئەلفەهداوی

**قەڵاکان:** بە (ئەکەدی) پێی دەڵێن (خالسی- Halsi)، بەحاکم دەوترێ (ردب خالسی- Rab Halsi)، لەوانەشە ناوی بە (بیل فخناتی- Bel Fhanati) بێت، هەروەها پێی بگوترێ (برتو- Birtu) یان (بشتو- Bistu) قەڵا وەکو داڵدە و پەناگە و ئەنباری چەک و تەقەمەنی و زەخیرەی خواردەمەنییەکان داندراوە، بۆ کۆمەککردن و یارمەتیدانی سوپا و لەشکر، بەوەی پێویستیی خزمەتگوزاری، لەکاتی رۆیشتنی لەشکر بۆ شەڕ و پیاوەکانی سەرپەرشتی ئاسایشی ناوچەکە دابین دەکات، هەروەها سەلامەتی هاتوچوو لەسەر رێگا عەسکەری و بازرگانییەکان و گەیاندنی باج و داهاتەکەی بۆ پایتەخت دەپارێزێ. هەندێ ئەرکی تر وەکو: گوێ بیستبوونی هەواڵەکان، بەتایبەتی هەواڵی دوژمنان و گەیاندنی بۆ پایتەخت. قەڵاو بازگە عەسکەرییەکانی سەر سنوور، هێڵێکی بەرگری یەکەمە بۆ سوپاو لەشکر، هەروەها هێزێکی هێرشبەرە بۆ ئەو سوپایە.

قەڵای هەولێریش هەر بەو شێوە بووە و پێگەی جوگرافی گرنگ و دیارە. ئەگەر هات هەڵکۆڵین لەقەڵای هەولێر بکەین، بۆمان دەردەکەوێ نەخشەی تێدایە، لەوانەیە جیاوازییەکی زۆری نەبێ لەگەڵ ئەوەی لەسەر ئەو پەیکەرە تاشراوانەی لە هەندێ قەڵای کۆنی میسۆپۆتامیا هەیە.

لەو پێداویستییانەی لەکاتی بنیادنانی قەڵاکان دەبێ هەبێ، دەبێ دەورپشتی بە دیوارێکی بڵند، لەگەڵ چەند تاوەرێکی چوارگۆشە یان بازنەیی بگیرێ. قەڵای هەولێر ئەو دیوار و تاوەرانەی تێدایە، بەتایبەتی ئەگەر هاتوو هەڵکۆڵینی لێ کرا.

زۆرجار دەورپشتی قەڵاکە بەکەندێکی ئاو دەگیرا، بەشێوەیەک قەڵاکە جیادەکاتەوە لەوەی لە دەورپشتیدا هەیە. بۆ ئەوەی بپێتە پشتگیرییەکی سروشتی و پاراستنی، کە ناکرێ ئێستا لەسەری راوەستین و قسەی لەسەر بکەین. لەوانەشە، قەڵاکە دەرگایەکی نهێنی هەبێ، بەرەو سەرچاوەیەکی ئاوی بروات، لەوانەشە کارێز بێت، کە لەبن قەڵایەکە بروات، وەکو سەرچاوەیەکی ئاوی بۆ قەڵاکە، بەتایبەتی لەکاتی گەمارۆدانی و فریاکەوتنی خەڵکەکەو یارمەتیدانی بەزەخیرە و ئاگادارکردنەوەی یەکە عەسکەرییەکان لەپشتەوە، لەهەر

هێرشێکی دەرەکی. مەرجی بنەڕەتیی بۆ قەڵا، دەبێ لەجێگای بڵند بنیاد بنرێن و دەوروپشتی دەشتاییەکی کراوە بێت، بۆ ئەوەی ببێتە گۆڕەپانی تێگرتن (رمی) لە دوژمن و نەتوانن بەئاسانی بگەنە لای قەڵاکە. بۆمان دەرکەوتووە کە قەڵای هەولێر جێگەو شوێنی گرنگ و شیاوی هەیە، لەبەر ئەوەش دەبینین جێگای نیشتەجێ و ژیان و حەوانەوە بووە، بەدرێژایی مێژووی کۆن و ئیسلامی.

بێگومان هەڵکۆڵین بۆ دەرخستنی زانیاریی لەبارەی قەڵاوە زۆر گرنگن. ئەگەر هات کۆڵینکاری بۆ ئەنجام نەدرا، ئەوە دەبێتە هەڵەیەکی گەورە و زیانێکی گەورە بەو قەڵا دێرینە دەکەوێ. ئەو ئەژماردانانەی کرا بۆ ئەو خانووە باشانەی ناو قەڵا، دەگاتە نزیکەی (١٠) تا (١٥) خانوو، لەوانەش (حەمام و مزگەوتەکە)، لەکۆی گشتی خانووەکانی قەڵا، (٥٠٦) خانووە، لە هەشتاکانی سەدەی رابردوودا، بەڕێوەبەرایەتی شوێنەوارو شارەوانی نزیکەی (١٤٠) خانووی بەتەملیک کرد.

ڕووبەری گشتی قەڵا (١١٠٠٠٠) هەزار م٢، بڵندایییەکەی لەئاستی ئەو زەوییەی دەوروپشتیێتی کە نزیکەی (٢٥)م. بەوەش ئەو ڕووبەرە گشتییەمان بۆ دەردەکەوێ کە دەتوانین سوودی لێ وەرگرین، بەتایبەتی ئەگەر بەراوردێک کرا لەگەڵ ژمارەی ئەو خانووانەی بەرەو ڕووخان دەڕوات. بۆ ئەوەی بزانین ئەو قەڵایە چی تێدایە لەمیراتی شوێنەواری مرۆڤایەتی، دەکرێ یەکەم جار بۆ دروستکردنی ئامرازی پشکنەر و نەخشەکێشان بۆ هەڵکۆڵین، سوود لە سەکۆ و کۆسەر و سەراسۆی وەرگرین.

کەواتە هەر کارێکی نوێکردنەوە لە قەڵادا و لەو کاتەی ئێستاماندا، هەڵەیەکی گەورەیە لەداهاتوو و ڕێ لە هەڵکۆڵینەوەی زانستییانە دەگرێ، بێجگە لەوەش، هەبوونی پرۆژەکانی گەشت وگوزاری و پارک و باخچە، سەرێپچی لە سروشتی و جێگە و گرنگی شوێنەواری دەکات، کەواتە هەبوونی ئاو و چوواندنی و نەهێشتنەوەی، کارتێکردنێکی خراپ و نەرێنی دەبێ لەسەر بیناو باڵەخانەو ئەو شوێنەوارانەی لەناو نهۆمەکانی خوارووی شوێنەوارەکاندا هەیە و هێشتا نەدۆزراوەتەوە. پرسیارێکی زۆر هەیە، حەز دەکەم ئاراستەی ئەو لایەنانەی کە کاروباری قەڵایان لە دەستە بکەم. بە تایبەتی پسپۆڕەکانی لایەنی شوێنەوار و ئەندازیاری و بەشی چاککردنەوە، لەوانەش ئەوەی لەبارەی شێوازی ڕێگای چالاکی نۆژەنکردنەوەو گەشتوگوزاری و شوێنەواری ئەو قەڵایە بە دیار دەکەوێ لە داهاتوودا.

**پرسیارەکان:**

١- هەندێک هەیە دەڵێن: هەولێر کۆنترین شارە کە بەدرێژایی پێنج هەزار ساڵ و بەردەوامی جێگای نیشتەجێ و ژیان و حەوانەوە بووە... پرسیارەکەش ئەوەیە لێرە:

- ئەو قسانە لەکوێ هاتووە؟ ئایا بەڵگەیەکی ڕاستەقینەو مادیمان هەیە؟ ئایا ڕاستە ئەو قەڵایە نیشتەجێ و جێگای حەوانەوەی مرۆڤ بووە هەر لەکاتی سۆمەرییەکاندا؟ وەڵامەکەش ئەوەیە: هیچ بەڵگەیەکمان نییە، ئایا تابلۆی قورین و دوعاو هیچ وتەیەکی مەلیکەکانی ئاشورییەکانمان هەیە، تیایدا ئەوە پەسند بکەن؟ دەڵێن شاری ئەربائیلۆ (شاری چوار خواوەندەکانە)، ئەو قسانە لەدەرەوەی قەڵای هەولێر هاتووە، لەناو قەڵای هەولێر نەهاتووە.

٢- ئێمە دەزانین نیشتەجێ کۆنەکان، بەدرێژایی مێژوو لەسەر یەک کۆبوونەتەوە، لەشێوەی چەند نهۆمێکی نیشتەجێی زۆر، یەک لەدوای یەک کۆبوونەتەوە، بەپێی بەردەوامی نیشتەجێیبوون، یەکێک لە مەرجەکانی نیشتەجێیە کۆنەکان، دەبێ لەسەر گردێکی سروشتی و تۆزێک بڵندتر بێت لەو دەشتەییانەی دەوروپشتیدا، پرسیارەکەش ئەوەیە لێرە: ئایا بڵندایی گردەکە چەند بووە لەکاتی دەستپێکردنی نیشتەجێبوون لە قەڵادا؟ ئایا (٥) م (١٠)م، یان (١٥)م بووە؟ پرسیارێکی سەرسامکارە وانییە؟

٣- لەبارەی ناوی (أربیل) دەڵێن: لە وشەیەکی بابلییەوە (ئەربائیلۆ) هاتووە، بەمانای (شاری چوار خواوەندەکان)، بەتایبەتی لە سەردەمی ئاشوورییەکاندا، پرسیارەکەش ئەوەیە: ئایا ئەو خواوەندانە کێن؟ ئەوەی زانراوەو دیارە لە نووسینەکانی ئاشوورییەکاندا: (خواوەندی: عەشتار - خواوەندی- شەڕ)، کە لەپێش سوپاو لەشکرەکانی

ئاشوورییەکان دەڕۆیشتن، هەروەها خواوەندی ئاشوور (خواوەندی نەتەوەیی دەوڵەتی ئاشوورییەکان)، بەڵام خواوەندی سێیەم و چوارەم، جیاوازی بیر و بۆچوون هەیە لەسەریان، دەبێ کێ بێت؟ لەوانەیە خوداوەندی (نرکال، خواوەندی شەڕ (حرب) بێت، یان خوداوەندی (نابو، خوداوەندی (الحکمة) بێت..هتد.. لە خوداوەندەکان.

پرسیارەکەش ئەوەیە: کێ لەو خوداوەندانە پەرستگایەکی بۆ خۆی بنیاد نراوە؟ چەندەها خوداوەند هەیە لەوڵاتی (میسۆپۆتامیا) بەسەدەها خوداوەند دەژمێردرێ.

٤- پاشا "سەنحاریب"(٧٠٥-٦٨٩ پ.ز)، دەڵێن: "ئەو پاشایە پرۆژەیەکی ئاوی بۆ شاری هەولێر دروست کردووە، بەناوچەی (بەستۆرە)دا تێدەپەڕێ، هەتا دەگاتە قەڵا، لە ڕێگەی کارێزێکی ئاو، کە لەژێر قەڵادا دەڕوات، دانیشتوانی قەڵا لەو کارێزە ئاویان دەبرد، لەڕێگەی کانییەک، کە لەسەر کارێزەکە هەڵکەندرابوو، پرسیارەکەش ئەوەیە: چەند کارێز هەیە لەناو قەڵادا؟ بڵندایی و پانی هەر کارێزێک چەندە؟

٥- هەندێ لەپسپۆڕانی بنیادنان و گەشتوگوزاری بیر لە دروستکردنی چەند پرۆژەیەکی گەورە، لەسەر ئەو قەڵایە، بەسوود وەرگرتن لەو ڕووبەرەدو جێگایەی کە دەکەوێتە ناوەندی شاری هەولێر، هەروەها بە سوود وەرگرتن لەو دەنگ و سەدایەی قەڵای هەولێر لەجیهاندا هەیەتی، بەوەی شوێنێکی شوێنەواری زۆر کۆنە.

* هەڵوێستی یاسای شوێنەواری چییە بەرامبەر ئەو پرۆژانە؟

* قەڵا کەلەپوورێکی مرۆڤایەتییە، نەک هەر بۆ کوردستان و عێراق، بەڵکو بۆ هەموو جیهان، هەر کارێک یان گۆڕانکارییەک، دەبێ یەکەم جار لێکۆڵینەوەیەکی زۆر وردی لەلایەن پسپۆڕانی شوێنەوارو شوێنەوار ناسەکان بۆ بکرێ.

لەکاتی وەڵامدانەوەی پرسیارەکان، بەتایبەتی بڕگەکان (١-٤) دەبینین وێنەکە دەگۆڕێ بەرەو خراپی و سلبی بەرامبەر جێبەجێکردنی ئەو پرۆژانە، پرسیاری یەکەم ڕێ لە هەموو کارێک دەگرێ، لەبەر ئەوەی ئێمە نازانین ناو ئەو زەوییە چی تێدایەو چی لە شوێنەوارو گەنجینە شاردۆتەوە.

**پرسیاری دووەم** -یش تووشی نارەحەتی و نائارامیمان دەکات، کەواتە ئێمە چۆن بتوانین ئەو پرۆژانە جێبەجێ بکەین لەسەر زەوییەک کە پاشماوەی پەرستگاکان و کۆشکەکانە، لەگەڵ هەبوونی بۆشاییەکی زۆر.

**پرسیاری سێیەم:** داوامان لێ دەکا، بۆ کردنەوە و ئاشکراکردنی هێماکان و (طلاسم) و ئەو ئەفسوونانەی لەدەوروپشتی قەڵا هەیە، ئایا هەر شاری (چوار خواوەندەکان)ە یان نا؟ ئەوەش وامان لێ دەکا زۆر پەلە نەکەین، لەگەڵ هەر هەنگاوێک لەهەنگاوەکان، بۆ ئەوەی نەکەوینە زەلکاوی شاری بابل، کەلەوێ قالبە چیمەنتۆیەکان بەجۆری چیمەنتۆی (موسەلەح) دروست کراون، بۆ ئامانجی شوێنەواری و مێژوویی دروست نەکراون، بەڵکو بۆ ئامانجەکانی سیاسی و ئیعلامی دروست کراون، کە لەدەرئەنجامەکانی بزرکردنی شارێکی مێژوویی بوو، کە لەپێش سەردەمی بابلییەکانی نوێ (٦١٢-٥٣٩) پ.ز دروست کرابوو، بەمانای بزرکردنی شوێنەواری هەزارەی دووەمی پ.ز، بەتایبەتی شوێنەواری کاتی مەلیک (حامورابی) کە ئێستا پێمان ناکرێ هەڵکۆڵین بکەین لە (بابل) لەو جێگایانە کە قاڵبە چیمەنتۆیەکانی لێ دروست کراوە، ئایا ئەوەندە دەهێنێ بۆ ئەوەی ئێمەش بکەوینە ئەو هەڵەیە؟

**پرسیاری چوارەم:** قەبارەی کارەساتەکەمان دەداتێ، ئەگەر هاتوو ئەو پرۆژانە جێبەجێ کران، لە بەرئەوەی ئەو کارێزانە دەبنە هۆی کوشتن و هەرەس هێنانی ئەو پرۆژانە، بە هۆی هەبوونی لە بۆشاییەکی زۆر ناوەوەی قەڵاکە، هەر لە بنەوەی قەڵاکە، وەکو بۆشاییەکی ترسناک.

ئەلێرە ئەو پرسیاردم هەیە: چیمان دەوێ لە قەڵاکە؟ چۆن هەڵسوکەوت بکەین لەگەڵ ئەو کەلەپوورە شارستانییە گرنگە و دەوڵەمەندە؟ ئایا بەچەند قالبێکی کۆنکرێتی موسەلەح پڕی بکەینەوە، یان لەلایەنەکانی زانستی و شوێنەواری و گەشتو گوزاری و ئیعلامی سوودی لێ وەربگرین، هەتا سیاسیش، ئەگەر ئامانجەکەمان دیارکردنی بێت، کەواتە لەسەرمانە بە (سێ قۆناغ لە

قەڵاکە دەست پێ بکەین:

**قۆناغی یەکەم:** کاری رووپێوانی ژیوفیزیکی، بۆ رووبەری گشتی قەڵاکە، لەهەمان کاتدا چۆڵکردنی قەڵاکە لەدانیشتوانی ئێستای، بەتایبەتی زۆربنەی دانیشتوانی ئێستای (یاسایی نین و تەجاوزن)، لەبەر ئەوەی پێشتر ئەم خانووانەیان لەلایەن دەوڵەتەوە پێ نەدراوە. نۆژەنکردنەوەی خانووە کەلەپوورییەکان کە ئێستا هەیەو پێشتر دەستنیشان کرابوون بۆ ئەوەی لە قۆناغەکانی داهاتوو سوودی لێ وەرگیرێ.

**قۆناغی دووەم:** لەسەر رۆشنایی دەرئەنجامەکانی رووپێوانی ژیو-فیزیکەکە، بەرێوەبەرایەتی شوێنەوارو کەلەپوور نەخشەی هەڵکۆڵینی دیاری دەکات، بەپشت بەستن بەبنەمای زانستی و کاریگەر، بۆ گەیشتن بۆ زەوی نۆبەرە، وەکو رێگا خۆشکەر بۆ قۆناغی داهاتوو.

**قۆناغی سێیەم:** لەسەر رۆشنایی دەرئەنجامەکانی هەڵکۆڵین، نەخشەیەک داندرێ بۆ سوود وەرگرتن لەئەنجامەکانی هەڵکۆڵین، نەخشەکە ئەو خاڵانە دەگرێتەوە:

**یەکەم:** سوود وەرگرتن لەو باڵەخانانەی کە دەردەکەون، چ لەسەر شێوەی بناغەی دیوارەکان بێت، بنیادنانەوەی بەپێی بیرکردنەوەکانی زانستی شوێنەواری گونجاو، بۆ سوود وەرگرتن لەو باڵەخانانە لەهەموو لایەکەوە، بۆ نموونە: ئەگەر هاتوو پەرستگایەکی خوداوەندی ئاشووری بەدیارکەوت، دەکرێ بکرێتە مۆزەخانەی شارستانی بۆ ئەو پارچە شوێنەوارانەی دەدۆزرێنەوە لەقەڵادا، ئەوانی تریش دەکرێ بۆ مۆزەخانەکانی کوردستان و عێراقیان بنێرن.

**دووەم:** لەکاتی سوود وەرگرتن لە باڵەخانەکاندا، دەبێ پارێزگاری باشەکان بکەین بۆ هەر سەردەمێکی شارستانی، کە قەڵایەکە تیایدا تێپەڕ بووە، نموونەی ئەوەش، لە سەردەمی سۆمەرییەکان بنیادنانی تایبەتی خۆی هەیە، هەروەها لە سەردەمی بابلییەکان بنیادنانێکی خۆی هەیەو جیاوازە لەگەڵ سەردەمەکانی تر، هەروەها لەسەردەمی ئاشوورییەکان و ئەخمینییەکان و یۆنانییەکان و ساسانییەکان و ئیسلامی و عوسمانی، هەتا دەگاتە ئەو رۆژەی ئێمە، لەگەڵ ئەوانەشدا، سوود وەرگرتن لە کارێزەکان، دوای پاک کردنەوەیان، بەتایبەتی بۆ مەسەلەی گەشتو گوزاری، ئەگەر هاتوو بڵندایییەکەی رێ بداتە مرۆڤ بۆ ئەوەی پێدا بچێ، پێموایە زۆر جوان دەبێ و گەشتیاران بۆ خۆی رادەکێشێ و لەباڵەخانە نوێیەکان سەرنج راکێشتر دەبێ، بەتایبەتی گەشتیاری بیانی کاتێ سەردانی رۆژهەڵات دەکەن، بیانییەکان پێیان خۆشە سیماو جوانی رۆژهەڵات ببینن، زیاتر لەوەی باڵەخانەی نوێ، کە لێی بێزارن.

**سێیەم:** دەکرێ دوای کۆتایی هێنانی هەڵکۆڵینەکان، سوود لە رووبەرە بەتاڵەکان وەرگیرێ، بۆ ئامانج و کاری رۆشنبیری جۆراوجۆر. هەر هەڵسوکەوتێک پێچەوانە بێت، بەپێچەوانەی گرنگی قەڵاکە بێت لەلایەن شوێنەوارەوەیەو، سەرپێچی یاسای شوێنەواری عێراقی بێت، هەروەها یاساکان و رێنماکانی رێکخراوی یونسکۆ بێت، کە یەکێکە لە رێکخراوەکانی نەتەوە یەکگرتووەکان، سەرەڕای ئەوانەش، هەر کارێک ئامانجەکەی پێناسەو دیارکردنی کەلەپووری باپیران نەبێت، کە بۆ هەزاران ساڵ دەگەرێتەوە، ئەوە دەبێتە کارێکی بێ ماناو بێ سوودو دوور لەو بەرپرسیای دەکەوێتە سەر شانمان و سەر ئەرکی شوێنەوار ناسان، ئەوە ئەرکی هەموو بەرپرسیارێکی شوێنەوارییە، هەر چییەک بێت (ئاین و رەگەزنامەو رۆشنبیری ئەو کەسانەو شوێنەوار ناسان).

ئەگەر بمانەوێ تەلار، کۆشکێکی ئەندازیاری، یان باڵەخانەی پێشانگایەکی جل و بەرگی نوێ (معرض أزياء) بنیاد بنێین، دەکرێ دوور لە قەڵا بنیاد بنرێ، لە دەشتاییەکی پان و بەرین، یان ئەو ناوچە شاخاوییانەی لەلامان هەیە.

بەهیوای ئەوەم کە توانیبێتم وێنەیەکی روونم لەبارەی ئەوەی، لەلایەنی شوێنەواری و گەشت و گوزاری دەبێ چی بکرێ لە قەڵادا پێشکەش کردبێ، هەروەها سەرکەوتوو بم لەو بیرۆکەو پرسیارانەی ئاراستەم کردبوو لەو بابەتە گرنگەدا، کە دەبێ بەهیچ شێوەیەک (پەلە) نەکەین لەهەر هەنگاو و بریارێک بێدەین، مەگەر دوای وردبوونەوەیەکی قووڵ لەلایەن کەسانی پسپۆڕ لە شوێنەواری کۆن.

# قەڵای هەولێر
# لە روانگەی شوێنەوارناسییەوە

دكتۆر سەلاح سەلمان ومیض

بێگومان لێكۆڵینەوەو توێژینەوە شوێنەوارییەكانی هەر ناوچەیەك لەباسكردنی لایەنەكانی پەیوەندیدار بەشارستانی و هونەری و بیناسازی جیا ناكرێتەوە، كەوا پاشخانی ژیاری ئەو ناوچەیە یان ئەوی تر دیاری دەكات لەم زانیارییانەوە ئاگاداری سەرەتای پەیدابوون.. دەركەوتن.. كاریگەریی و كارلێكردنی لەسەر دەوروبەری دەبێت.

بەڵێ گەران لەئاكامەكانی رووماڵكردن (مسحی) یان ئەوەی كاری كۆڵینكاری (تنقیبی) لەسەر كراوە، دەتوانین شێوەی ئەو ناوچەیە وێنا بكەین بەپشتگیری كەرستە دزراوەكان چ گوازراوە یان جێگیر، مەبەست لەجێگیر پاشماوە بیناسازییەكانن، كە بۆ وێناكردنی رابردوو یاریدەدەرن.

بەڵگەی مێژوویی زۆرو زەوەندە سەبارەت بەرەسەنی و قووڵی رەگی قەڵای هەولێر بەتایبەتی و ناوچەی جوگرافی دەڤەری هەولێر بەگشتی، شوێنەواری بەرچاو زۆرن چ قەڵات خۆی یان زۆری شوێنەواری دەوروبەری، كە لە نەوەدو پێنج شوێن زیاترن. ئەو شوێنانەش رووماڵكردنی پێشووی مەیدانی ئاماژەیان بەوە داوە، كەوا زۆر دێرین و هەندێكیان دەگەرێنەوە بۆ ماوەی چەرخی حەسوونە (هەزارەی حەوتەمی پێش زایین) وەك شوێنەواری (ئاستە عەرەب). كەوا ئاكامەكانی كۆڵینكاری دەریان خستووە شوێنەواری سەردەمی حەسوونەی تێدایە وەك: گۆزەو گۆسكەی فرە جۆر، سەرەرای ئاكامەكانی هەڵكۆڵین لەناوچەكانی دیكە، پاشماوەی تەلاری خاوەن ئادگاری بیناسازی سەردەمی دواتر كە لەسەرجەم مێزۆپۆتامیا بلاوبۆتەوە.

بۆ نموونە گردی قالینج ئاغا لەنزیك قەڵاتدا، سەرەرای ئەمەش چەندان بەڵگەی تۆماركراوی دیكە هەن بەخەتی مسماری ئاماژە بەگرنگی ئەم ناوچەیە دەكەن بەدرێژایی مێژوو، بەتایبەتی قەڵاتی هەولێر.

ئەو هێڵكارییەی پاشماوەی بیناسازی، كە لە گردی قالینج ئاغا دۆزراوەتەوەو بەشێك بووە لە سەردەمی وەركا لە كۆتایی هەزارەی چوارەمی پ.ز.

ناوی پەرستگاكەش (لە قەڵاتی هەولێردا) لە نووسراوە مسمارییەكاندا بەشێوەی (ئی-گشان- كلاما) (Egashan kalamma) واتە خاتوونی هەرێم[٢]، ناوی پەرستگاكەش لەتەك ناوی پادشا ئاشوور- دان (كەوا لە ١١٧٩-١١٢٤ پ.ز فەرمانرەوایی كرد) لەدەقێكی مسماریدا نیگاری لەسەر پەیكەرێكی برۆنزی كێشرابوو لەنزیك گۆمی ورمێ دۆزراوەتەوە، بەڵام لەبنجدا لەشاری هەولێرەوە هاتووە[٣] شایانی باسە هەولێر لەسەردەمی ئاشوورییەكان شارێكی سەرەكی بوو سەرەرای ئەوەی بنكەی هەرێم بوو (یان پارێزگا لە سیستەمی ئاشووریدا)[٤].

ئاشوور بانیبال (٦٦٨-٦٢٦پ.ز) شووورەی دەرەوەی شارەكەی تەواوكرد، پەرستگەی عەشتاری نۆژەن كردەوە[٥]، كە بنكەیەكی گرنگی پێشبینی و بەخت گرتنەوە بوو لەرێگای پشكنینی جەرگی كوشتیی لەولاتی ئاشووریدا[٦].

لە نەخشە فارسییەكانی كە بەخەتی مسماری نووسراون بە (ئەربیرا Arbera) ناوبراوەو، لە سەرچاوە یۆنانییەكاندا ناوی (ئەربیلا Arbela) هاتووە.[٧]

سەرچاوە عەرەبی و ولاتناسانی عەرەب بە (اربل) ناویان بردووە،

واتە (زەوی سەوز) قەلات ئێستا رووبەری ۱۱۰۰۰۰ مەتر چوارگۆشەیە و زیاتر لە ۲۵ مەتر بەرزە، ئەم بەرزییە چەندان قۆناخی شارستانی دەگرێتەوە، هەر لە سۆمەرییەکانەوە دواتر سووباری و خووری و میتانی و میدییەکان و ئەخمینی و بابلی، ئاشووری، گریکی، پارسی، ساسانییەکان، دواتر سەردەمی ئیسلامی تا ئەمڕۆ.

بەڵێ... چەندان بەڵگەی بەردەست هەیە ئاماژە بەبوونی شوێنەواری شوورەیەک و کەندرێک لەدەورەی قەلاتدا دەکات.

سەرەڕای سێ دەروازەکە. هەبوونی بیناسازی کۆن وەک مزگەوتی قەلا، کەوا کۆنترین مزگەوتی شاری هەولێرە، لەتەک کۆمەڵە خانوویێک و تەکییەیەک، بەلام دیارە بەدەگمەن نەبێت دەستی کۆڵینکارانی نەگەیشتووەتێ، لەتەک بوونی هەندێ ئاماژە، کەوا پێشان دەدات هەندێ زێدەڕۆیی هەن، کە لەراستیدا نۆژەنکردنەوەی هەندێ لە خانووەکانی قەلایە، ئەوەمان پیشان دەدەن کەوا بنچینەی کۆن لەم شوێنانە وا هەیەو دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمانێکی دێرین کە تۆمار نەکراون، بەڵکو هەندێ جار خۆڵی بەسەردا کراوەو خانووی نوێی لەسەر دروست کراوە.

هیچ گومانی تێدا نییە ئەو خانووانەی کە لەقەلاتدا هەن، تۆمارێکی ئاشکرا پیشان دەدەن سەبارەت بەزنجیرە بەندی قۆناغە مێژووییەکان و شارستانییەکان، کە بەسەر قەلاتدا هاتوون. بەلام ئێستا لەبەر چەندان هۆ ئەم ئیشە بەرچاو نییە. باری ئێستاش یارمەتی زیاتر ونبوونی رووە راستەقینەکەی ئەم بیناسازییە دەدات، کە لەئاستەکانی ژێرخانی قەلاتدا لە دێر زەمانەوە بنیات نراون. لەو باوەڕەدام کەوا کۆڵینکاری شوێنەواری ئەگەر بێت و لەم قەلاتە وابکرێت، کەوا تیشک دەخاتە سەر پاشخانی ئەم شوێنەوارە، ئەگەر هاتوو چەندان خاڵ لەچۆلایی قەلات هەلبژێردرێت، وەک لەهێلکاری هاوپێچدا هاتووە، کەوا بەئاسانی لەهەر جێ ژەنەکەک یاخود بلێین لەهەر خاڵێکی هەلکۆلین پاشماوەی خانووی وا دەبینی، کە دەگەڕێتەوە بۆ قۆناغی مێژووی کۆنتر لەچینی سەردەوەی ئەگەر هاتوو ئاستی ئەم جێ ژەنەکانە بەیەکەوە ببەستین، ئەوا وێنەیەکی روون سەبارەت بەقۆناغی مێژووییان دەردەخات، بەم شێوەیە شارەزای کۆی ئەو قۆناغە مێژووییانە دەبین، کە پێیدا رۆیشتووە هەروەها بەڵگەی سواڵەی شوێنەواری و پاشماوەی بیناسازی، کە بەدەست دەکەوێت لەم کۆلینکارییەدا، کە دەشێ هەندێ قۆناغی مێژوویی ماوەیەکی زۆری گرتبێت، کە تیایدا شارستانیەت پێشکەوتووە هەندێ ژمارە هەن بۆ یەکێک لەم قۆناغانە، کە ماوەی شارستانیەتی ئیسلامە کە ماوەیەکی زۆری خایاندو زیاتر لە (١٤) چواردە سەدە بوو هەروەها قۆناغی فارسییەکان، کە رووداوی گرتنی بەخۆیەوە بینی و شەڕی کۆکمیلا کە هەر توێژەرێک دەتوانێت بگاتە ئەو ئاکامەی، کەوا قەلاتی هەولێر رۆلێکی بەرچاوی تێدا بینیوە، ئەوە جگە لەو قۆناغە مێژووییانەی کۆنتر بەتایبەتی هەزارەی چوارەم و سێیەمی پێش زایین هەمووان باش دەزانن، کەوا دەشێ خەرجی ئەم کۆلینکارییە زۆری بوێت، بەلام لەهەمان کاتدا، سوودبەخشە، لەبەر ئەوەی وێنەیەکی تەواومان سەبارەت بەوردەکاری هەر قۆناغێکی مێژوویی شارستانیمان پێدەبەخشێت، کە بەسەر ئەو ناوچانەدا هاتوون، کەوا بە کاکڵی توێژینەوەیەکی دوورودرێژ دادەنرێت سەبارەت بەژیانی رۆژانەی سەرجەم ناوچەکە.

گرنگی پۆلینکاری لەوەدایە تیشک دەخاتە سەر چەندان راستی بەردەست و بەڵگەی بنبڕ لە هەلکەوتدا چەندان نموونەی ئەم کۆلینکارییەمان لەبەر دەستە.

**سەرچاوە وپەراوێزەکان:**

١- طه باقر وفؤاد سفر، المرشد الى مواطن الاثار والحضارة. الرحلة الخامسة. بغداد ١٩٦٦. ص ٣.

2- Donbaz, Vand G, Fiom, The builing actived of Sholwaneser Iin Nothern Mesoptawia I in Anaval Reviw of the Royal Inscriptions of (1983).

٣- نائل حنون. مدن بلاد الرافدين خلد التاريخ ذكرها، مجلة مابين النهرين العدد ٧٥-٧٦ لسنة ١٩٩٢ ص٧.

4- Grayson, A,K, Assyrdin Royal Inscriptions I (Wisbaden,1973) Nos 923-6.

5- Luckenbill, D, Ancient Records of Assyria and Babylonia (Checago7926) No 982.

٧- عبدالباقي عبدالجبار امين التجديد الحضري لقلعة اربيل، بغداد ١٩٨٥.

# پرۆژەی ئاوی سەنحاریب بۆ قەڵای هەولێر (٧٠٥-٦٨١ پ.ز)

دکتۆر ئیبتیهال عادل تائی

**دەروازە:**

هەر لەو کاتەی مرۆڤ لەسەر رووی ئەم زەوییە پەیدا بووە، ئاو رۆڵێکی گرنگی هەبووە لەژیانی ئادەمیزاددا و بگرە بە توخمێکی سەرەکی ژیان دانراوە. بۆیە هەر لەکۆنەوە لە بنکە شارستانییە دێرینەکان بایەخی گرنگی پێدراوە. یەک لەوانە لە وڵاتی میسۆپۆتامیادا. لەشارستانییەتی میسۆپۆتامیای کۆندا ژینگەکەی بەهۆی هەردوو رووباری دیجلەو فورات، ساڵانە رووبەڕووی لافاوی زۆر بۆتەوە. جا لەبەر ئەوەی وا رێککەوتووە کاتی دروستبوونی لافاو لەهەردوو رووباردا لەیەک نزیک بن وای لەخەڵکەکە کردووە خۆیان لەمەترسی لافاو لابدەن. هەر بۆیەش خەڵکی کۆنی میسۆپۆتامیا بە (تۆفان)[1] ناویان بردووە. لەدەرەنجامی ئەوەدە دانیشتوانی میسۆپۆتامیا پشتیان بەدروستکردنی پردوعەمبار و کارێزەکان دەبەست. یەکێک لەوانە پرۆژەی ئاوی سەنحاریب بوو کە شای ئاشووری سەنحاریب (٧٠٥-٦٨١ پ.ز) دایمەزراند بۆ گەیاندنی ئاوی هەر سێ شار (نەینەوا- هەولێر- کەرکوک) پرۆژەی ئاوی هەولێر بە یەکێ لەپرۆژە گرینگەکان دادەنرێت کە بۆ گەیاندنی ئاو بۆ شار، پشتی بە (کارێز) بەستبوو.

***

شا سەنحاریب پاش مردنی شا سەرجۆنی دووەم (٧٢١-٧٠٥ پ.ز) جڵەوی دەسەڵاتی گرتە دەست. هەر چەندە کوڕی گەورەی شا سەرجۆن نەبوو، بەڵام بەهۆی هۆکارێکی نادیار هەڵبژێردرا، بەوەی کە میراتگری شەرعیی شا سەرجۆن بوو،[2]. لەوانەیە لەبەر ئەوەش هەڵبژێردرابێ کە، بۆ وەرگرتنی ئەو پۆستە لێهاتوو و دیپلۆمات و لێزان بوو بێ هەروەها لەتوانایدا بووە ئەرکەکانی پاشایەتی راپەڕێنێ. چونکە لە ناوچەکانی سنووری باکووری شانشینی ئاشووری بەرپرسیارێتی ئیداری و سەربازی لەو ناوچانەدا گرتبووە ئەستۆ، هەر بۆیە شیاوی وەرگرتنی جڵەوی کاروباری سیاسی و ئیدارەیی دەسەڵاتی وڵات بوو[3]. شا سەنحاریب رێچکەی دەسەڵاتی سیاسی باوکی گرتەبەر و وڵاتەکەی تا رادەیەکی زۆر سەقامگیریی بەخۆیەوە بینی، چونکە سەردەمی ئەو لەرووی ئابووری و گەشەسەندنی شارستانی لەبەرەوپێش چووندا بوو. چالاکی سەربازی و سیاسی جیا دەکرایەوە، بەتایبەت لەرووی بیناسازییەوە بەو ئاستەی، کە شار نەبووە لەشارەکانی وڵاتی ئاشور راستەوخۆ دەستی بیناسازی پێرانەگەیشتبێ، کۆشکی گەورە و پەرستگا و شوورەی شاری نەینەوای دروست کردبوو، کە کردبوویە پایتەختی شانشینەکەی[4].

کێشەی ئاو لەشاری هەولێر یەکێکە لەگرفتە کۆنەکان، هەر بۆیەش شای ئاشووری سەنحاریب بایەخی زۆری پێدا و هەوڵ و کۆششی بۆ دا بۆ جێبەجێکردنی پرۆژەی ئاوی دیکە بەمەبەستی گەیاندنی ئاو بۆ نەینەوا تا زەویوزاری کشتوکاڵی پێ ئاو بدات، وێڕای ئەوەی شا ئارەزووی دەکرد ئاوی سازگار بگەیەنێتە دانیشتوانی شار، چونکە ئاوی رووباری دیجلە شیرین نەبوو بەهۆی ئەوەی چاوگی گۆگردی لێ بوو، کە کەوتبووە لایەنی بەرامبەر پایتەخت، کە هەرگیز بۆ خواردنەوە نەدەشیا[5]. جا ئەوە بوو کاری کرد بەجێبەجێکردنی پرۆژەکە بۆ گەیاندنی ئاوی پاک، کە دەست بدات بۆ خواردنەوە. سەرەڕای ئەوە سوودیشی لێ وەرگیرا بۆ ئاودان و کارپێکردنی

ئاشەکان. ئاوی پاکی هێنا بەرێگەی کارێز(٦) لە یەکێ لەدەقەکاندا دەڵێت: (کارێزێکمان لێداو پردێکمان لەبەرد دامەزراند بۆ هێنانی ئاو بۆ نەینەوا)(٧).

شا سەنحاریب هەمان رێگای گرتەبەر بۆ ئاو هێنان بۆ هەولێر. دەشتی هەولێر گەر بیر لێبدەین ئاوێکی زۆری ژێر زەوی هەیە هۆیەکەش بۆ ئەوە دەگەرێتەوە کە ئاوی چیاکانی دەوروبەری هەولێر (پیرمام و سەفین) لەکاتی باران باریندا دەرژێنە خوارێ بەقوولاییەکی زۆر لەژێر زەویدا، ئەمەش لەباشووری رۆژئاوای چیای قەرەچوغ دەردەکەوێت و ئاوی ئەو بارانەش لەژێر زەویدا دادەکرێت(٨).

سروشتی جوگرافیای ئەو ناوچەیە کۆمەکیدەر بوو بۆ جێبەجێکردنی دەستکەوتی پرۆژەی هەولێر. بۆیە لەو سەردەمە کۆنەدا بەگەورەترین دەستکەوتی هایدرۆلیکی دادەنرێت. کە لەسەر ئەندازیاری پرۆژەکە دەوەستا کە یەکەم جار هەڵبستێ بەدۆزینەوەی چینەکانی زەوی کە هەڵگری ئاو بوون بەهەڵکەندنی بیری ئەزموونی. جا کاتێ دەگەیشتە چینی قوڕ ئەوا بیرە سەرەکییەکەیان لێدەداو پاشان بیرێکی دیکەیان بۆ ئاو هەڵدەکەند ئاسا بەقوولایی هەمان بیر، بەڵام بەیەکیان دەگەیاند. ئەم کارە بەم شێوەیە بەردەوام دەبوو ئاسا هەندێ جار بەکەمی بەلای قەدپاڵ لێژ دەبوویەوە، بەو ئاستەی کە ١٪ تێپەری نەدەکرد. بەڵام لەهەندێ جاردا دەگەیشتە ٣٪، لەدەرەنجامی دوومەاهیدا دەبوو بەکارێز(٩). ئاوەکەش بەهەڵقولاوی دەهات و لە بۆ خواردنەوەو کشتوکاڵ بەکار دەهێندرا(١١).

شای ئاشووری سەنحاریب هەڵسا بەئەنجامدانی ئەو پرۆژەیە بەمەبەستی گەیاندنی ئاو بۆ پایتەختی ئاینی (هەولێر)(١٢) پرۆژەکە لای گوندێک بەناوی (موورتکە)، کە کەوتۆتە باشووری دۆڵی بەستۆرە دەستی پێکرد. لەو شوێنە دیوارێکی رووخاو بوونی هەیە کە بەبەرد دروست کرابوو لەسەر بەردێک نووسینی بزماری لەسەر نووسرابوو بە هەشت دێڕ باس لە کاری سەنحاریب دەکا و تیایدا هاتووە: (١٣)

(من سەنحاریب شای جیهانم شای ئاشوور (٣) رووبارم لە چیای خانێ هەڵکەند کە کەوتۆتە بەرزاییەکانی شاری هەولێرو ئاوی کانیاوەکانم خستە سەر، کە کەوتوونەتە هەر دوو لایەنی راست و چەپی رووبارەکان. پاشان کارێزێکم هەڵکەند کە لەناوەراستی شاری هەولێر، نیشتمانی خواوەندی گەورە ئەشتار درێژ دەبۆوە). لەمیانەی ئەو دەقەدا بۆمان دەردەکەوێت کە شا سەنحاریب سێ رووباری لەچیای خانێ هەڵکەندووەو ئاوی کانیاوەکانی کەوتوونەتە لای راست و باکووری رووبارەکان خستوونییەتە سەری و پاشان کارێزی لێداوە بەو ئاستەی تا ئاوەکە گەیشتۆتە ناوەراستی شاری هەولێر. دەزگای گشتی شوێنەوارە کۆنەکان شوێنەواری، ئەو کارێزەی لەساڵی ١٩٤٧ دۆزییەوە کە لەنزیک گوندی موورتکە بە بەرد پڕ کرابۆوە، کە بە (٢٠) کیلۆمەتر لەباکووری هەولێر دوورە(١٤). جۆگەکان و رووباری بەستۆرە کە زۆر گرنگ بوون بۆ سێ رووبارەکە لەگوندەکانی سوسەو زیارەت و مەرزە هەڵدەقولان. رووباری بەستۆرە بەرەو باکووری رۆژئاوا دەکشا بەنزیکەی (٥٠) کیلۆمەتر تا لەباشووری گوندی شەرخانە لەلای چەپی زێی گەورەی دەکردەوە. لەباکووریش لەرووباری خازری دەکردەوە کە لە گەرووەیەک بەناوی دەربەند لەزێی گەورەی دەکردەوە. ئاوی ئەو رووبارانە گەلێ زۆرە لەو سەردەمەدا کشتوکاڵ و کێڵگەیەکی بەرفراوان ئاو دەدا(١٥).

بەڵام ئەو کانییانەی سەنحاریب ئاوی بردوون خستوونییەتە سەر ئاوی رووبارەکان، ئاوی کانیاوی نزیک گوندی خۆران و نزیک گوندی هاڤان و نزیک گوندی دنجیزاوەن. هەروەها زارگەیەکی بەئاستێکی قووڵ و بە نزیکی (٢٠) کیلۆمەتر لەرووباری بەستۆرە کردەوە(١٦).

زارگەی نۆکەند چوارگۆشە بووەو بە بەرد بەدووری ١٢٠×١١٢ مەتر بەپانی ٦ مەتر دروست کراوە. بەرینییەکەی دەگاتە ٢٧٠ مەترو دەوروبەرەکەشی بە بەردرێژ کراوەو. زارگەی ناوەوەی نۆکەندەکە بە بەردی شەش پاڵوو بەقەبارەی مام ناوەندی ٦٢×٣٤×٨٠ سانتیمەترو بەدرێژایی تێکرای نزیکەی ١٥ مەتر دروست کراوە. ئەو زارگەیەی ناوەوە بەپێچەوانەی رێرەوی رووبار دامەزراوە، بەوەی ئاوەکە ناچار بکات بەرەو زارگەی نۆکەندەکە لێژ بێتەوە(١٧) بەڵام شۆستەی دەوروبەری نۆکەندەکە بەرزییەکەی نزمەو لە (٥٠) سانتیمەتر تێپەڕ ناکات.(١٨) ئەو نۆکەندە لە رووی دروستکردن و شێوازی کارکردنی لەکارێز دەچێت، کە لەناوچەی کەرکووک باوەو بەکاردەهێندرێت. ئەم نۆکەندە ئێستا بەنۆکەندی بەستۆرە ناسراوە(١٩).

وردەکاری و پێشکەوتنی ئەندازەیی گەیشتبووە ئەو ئاستەی

ئەو نۆکەندە دروست بکرێت. بەوەی کە ئاستی ئاوی بەستۆرە نزمترە لەئاستی زەوی بەنزیکەی (٢٥) مەتر کە بەنۆکەندەکە دەروات[٢٠]. سیستەمی کاریز ئاسا لەناوچە شاخاوییەکان کاری پێدەکرێت و ژمارەیەک بیر لەخۆ دەگرێت کەماوەی نێوان هەر یەکێکیان (٥) مەتر تا (١٠) مەترە، جاری واش هەیە بۆ (٢٠) مەتر درێژ دەبێتەوە. چونکە بۆ ماوەیەکی درێژ دەروات. شایانی ئاماژە پێکردنە ئەو کاریزەی شا سەنحاریب لەرووباری بەستۆرە دروستی کردبوو زۆر جیاواز بووە لەگەڵ کاریزی ئاسایی. چونکە ئەو کاریزەی سەنحاریب دروستی کردووە لەسەر شێوەی جۆگەلە بووەو ئاو لەناو تونێلێکدا ڕۆیشتووە بەزنجیرە بیرێک وەک کاریز و راستەوخۆ بووەتە رووبار نەک ئاوی ژێر زەوی لەتونێلەکەدا، واتە هەروەکو جۆگەلەیەکی دیکەی ئاسایی کە راستەوخۆ لەسەر زەوی ئاوی رووباری پیایدا بروات[٢١].

شایانی باسە ئەمەش ئاماژە بەوە دەدات، کە ئێستاشی لەگەڵدا بێت زۆر لەو کاریزانە نەماون و هەندێکیان بەهۆی کەمی بایەخ پێدانیان دیوارو سەرەکانیان رووخاوەتە ناویەک و پڕبوونەتەوە. بۆیە بەپێویست دەزانرێت بایەخی پێبدرێ و دووبارە چاک بکرێنەوە.[٢٢]

**پەراوێزو سەرچاوەکان:**

١- الهاشمي، رضا جواد: "تاريخ الري في العراق القديم" مجلة سومر، م٣٩، بغداد ١٩٨٣، ص٦٢.

٢- علي، قاسم محمد: سرجون الاشوري (٧٢١-٧٠٥ ق.م) سيرته ومنجزاته، رسالة ماجستير غير منشورة، جامعة بغداد، ١٩٨٣، ص٢٦-٢٧.

٣- د.جورج: العراق القديم، ترجمة وتعليق حسين علوان حسين، بغداد ١٩٨٤، ص٤٢٦.

4- Beedye, E.A.W. Aguide to the Babylonian and Assyrian Antgiuti, Landon 1922, p. 34.

٥- رويستن بايك، أي: قصة الاثار الاشورية، ترجمة يوسف عبدالقادر، بغداد، ١٩٧٢، ص١١٦.

٦- سوسة، أحمد: "مشروع سنحاريب لارواء منطقة نينوي" مجلة العلمي العراقي، ٩٤، بغداد، ١٩٦١، ص١٧٢.

7-Luckenbill, DD, Ancient Records of Assyrian and Babylonid (ARAB), Chicago1927, vd.2. سلمان عامر: "الاوضاع الاجتماعية" في موسوعة المدينة والحياة المدينة، بغداد- ١٩٨٥، ج/١، ص١٩٠.

٨- الجنابي، صلاح: "جغرافية منطقة" في: موسوعة الموصل الحضارية، جامعة المو صل- ١٩٩١، ج/١، ص١٠.

٩- الكهريز، تسمية محلية أطلقت في العراق على المجري الجوفي. اما العرب فقد اطلقوا عليه اسم "قناة" واطلقوا على الابار على طول القناة فقر مفردها فقير، ينظر: سوسة، أحمد، تاريخ حضارة وادي الرافدين (بغداد، ١٩٨٦) ص١٢١.

١٠- الملائكة، جميل: "روائع الاعمال الهيدروليكية في العراق القديم"، مجلة آفاق عربية، ع١، بغداد، ١٩٧٩، ص٦٠، تجدر الاشارة هنا أنه تم العثور على أحد الرقم الطينية والمحفوظة الآن بالمتحف البريطاني بلندن حلولا لاربع عشرة مسألة عن السدود والجدران السائدة والابار والساعات المائية وأعمال الحفر، مابهمنا المسألة الرابعة التي تغلق بمقاطع السداد علي جانبي القنوات والأنهار وفيها حساب القاعدة العليا A المقطع شبه منحرف متساوي الساقين بمعرفة القاعدة السفلى B وظل زاوية الميل O ومساحة المقطع A كالاتي: a2=b2-4 Atan O، ينظر الملائكة: سەرچاوەی پێشوو، ص٥٨.

١١- الملائكة: سەرچاوەی پێشوو، ص٦٠.

١٢- احتلت أربيل مكانة متميزة عند الاشوريين وخاصة الدينية منها فحظيت باهتمامهم ونالت القدسية الخاصة، بها من بعدعا وآلهتها عشتار، الهة الحرب عند الاشوريين، ينظر: يوسف، شريف: تاريخ فن العمارة العراقية، بغداد، ١٩٨٢، ص١٤٨.

١٣- يوسف، شريف، هەمان سەرچاوە، ص١٤٩، ARAB: vol. 2p.163

١٤- جميل، فؤاد: "حدياب... أربيلا.. وعشتار.. أربيلا، مجلة سومر، م٢٥، بغداد، ١٩٦٩ ص٢٢١، صالح، قحطان رشيد: الكشاف الاثري في العراق، بغداد، ١٩٨٧، ص٧٢.

١٥- الأحمد، سامي سعيد: "الزراعة في العصور التاريخية" في: موسوعة الحضارية ج/١، جامعة الموصل ١٩٩١، ص١٨٣.

١٦- سوسە، سەرچاوەی پێشوو، ص١١٨، الأحمد، سەرچاوەی پێشوو، ص١٨٣.

١٧- سوسە، سەرچاوەی پێشوو، ص١١٩، الأحمد، سەرچاوەی پێشوو، ص١٨٣.

١٨- رشيد، فوزي: "نظم الأرواء في العراق القديم" افاق عربية، ع١. بغداد ١٩٨٥، ص٩٢، حبيب، طالب منعم: سنحاريب سيرته ومنجزاته ٧٠٤-٦٨١ق.م، رسالة ماجستير غير مشنورة، جامعة بغداد، ١٩٨٦، ص١٦١-١٦٢.

١٩- الهاشمي، رضا جواد: "تاريخ الري في العراق القديم" سومر، م ٣٩، بغداد ١٩٨٣، ص٧٨، المؤلف نفسه: "الأفلاج من مشاريع الأرواء العربية القديمة" مجلة كلية الاداب، ع ٢٥، بغداد ١٩٧٩، ص٣٥-٣٦.

٢٠- جميل، فؤاد:سەرچاوەی پێشوو، ٢٢١.

٢١- سوسە: سەرچاوەی پێشوو، ص١٢١.

٢٢- الملائكة: سەرچاوەی پێشوو ص. ٦٠

# گەڕان بەدوای شوێنەواری گۆڕەپانی جەنگی ئەربێلا دا!

دڵشاد عەزیز زامدا
کۆلێژی ئاداب- زانکۆی سەلاحەددین

جەنگی ئەربێلا ئەو جەنگەبوو کە لە ١ی تشرینی یەکەمی ساڵی ٣٣١پ.ز لە نێوان ئەسکەندەری مەکدۆنی و داریوشی سێیەمی ئیمپراتۆری هاخامنشی فارسی روویدا،و لە ئەنجامدا سوپای ئەسکەندەر سەرکەوتن و داریوش گۆڕەپانی جەنگەکەی بەجێ هێشت و خۆی قوتارکرد و بە هەزاران کەس لەو جەنگەدا کوژران و بە کۆتایی هاتنی ئەم جەنگەش کۆتایی بە گەورەترین ئیمپراتۆرییەتی ئەو سەردەمەی جیهان هات کە ئیمپراتۆریەتی هاخامەنشی فارسی بوو، کە لە سنووری هیندستان و ئەفغانستانەوە تا میصر و سودان و کەناراوەکانی یۆنانی لە ژێر



ئەسکەندەری مەکدۆنی لە جەنگی ئەربێلا

دەستدابوو. زۆرێک لە مێژوونووسان و شوێنەوارناسان و پسپۆڕانی بواری جوگرافیای سەربازی باس لە شوێنی رووداني یەکێک لە گەورەترین جەنگەکانی جیهانی کۆن دەکەن، ئەو جەنگەش

(جەنگی ئەربێلا)یە کە بە جەنگی (کەوکەومێلا/گواگەمێلا)ش ناودەبرێت، پسپۆران چەندین لێکدانەوەی زمانەوانییان بۆ ئەو دوو ناوە کردووە بۆ ئەوەی بگەنە بۆچوونێک شوێنی گۆڕەپانی جەنگەکە دیاری بکەن، و بە تایبەت لێکدانەوەی زۆر بۆ وشەی (گواکەمێلا) کراوە،و هەوڵ دراوە لە ڕێگەی ئەو لێکدانەوانەوە شوێنی گۆڕەپانی جەنگەکە دیاری بکرێت، و دیارە تا ئێستا کەس نەگەیشتووەتە ئەنجامێک کە هەموو لایەک قبوڵی بکەن، و هەندێک بەدوای شوێنەواری گۆڕەکەپانی جەنگەکەدا دەگەڕێن... لە ساڵی (٢٠٠٣-٢٠٠٤) لەدوای جەنگی ئازادی عێراق زۆر کەس باسیان لەوە دەکرد کە بەرپرسی سەربازی هێزەکانی هاوپەیمانان لە کوردستان (هاری شۆت) لە هەوڵدابوو بۆ ئەوەی کە شوێنەواری گۆڕەپانی جەنگی ئەربێلا بدۆزێتەوە، و فڕۆکەوانانی ئەمریکی خستبووە خزمەتی ئەو کارەوە، و پرسی بە چەندین کەس کردبوو لە کوردستان بەڵام ئەم هەوڵانە بێ ئەنجام مایەوە، لە ڕاستیدا هیچ سەرچاوەیەکی ڕەسمییەوە ئەم کارە ڕانەگەیەندرا بەڵام ئەو کات ئەو دەنگۆیە زۆربڵاوبوو...

ئەوکات من دوو پرسیارم لا دروست بوو هەوڵیشم دا وەڵامەکانیانم دەست بکەوێت، و پاش ماوەیەک هەرخۆم گەیشتمە ئەنجامێک و ئەو ئەنجامەش لە خوارەوە دەخەمەڕوو:

١- پرسیاری یەکەم ئایا دەبێت سوپای هاوپەیمانان بۆچی بەتەنها بەدوای شوێنی گۆڕەپانی ئەو جەنگەدا بگەڕێن لەکاتێکدا کە چەندین جەنگی دیکەی مێژوویی گرنگ لە کوردستان و میسۆپۆتامیادا ڕوویداوە؟.

بۆ وەڵامی ئەو پرسیارە پێم وایە یەکێک لە وەڵامەکان ئەوەیە کە جەنگی ئەربێلا کۆنترین و یەکەم سەرکەوتنی ڕاستەقینەی ڕۆژئاوایە بەسەر ڕۆژهەڵاتدا و بەسەرەتای زنجیرەیەک هێرش و داگیرکاری دادەنرێت کە دوایی یۆنانییەکان و ڕۆمانییەکان و بێزەنتییەکان و پاشانیش خاچ پەرستان و لەسەدەی بیستدا ئینگلیز و لە سەرەتای سەدەی بیست و یەکیشدا هاوپەیمانان بە سەرۆکایەتی ئەمریکا لە داگیرکردنی ئەم وڵاتەدا بەشداربوون، جا لێرەدا دیارە (هاری شوت) ویستوویەتی گرنگی بەم شوێنەبدات و بیکاتە شوێنێک و دروشمێکی سەرکەوتنی ڕۆژئاوا بەسەر ڕۆژهەڵاتدا، ئەگەرنا خۆ(تەراجان و کراکاڵە) ش دوو ئیمپراتۆری ڕۆمانی بوون و لە سەدەی دووەم و سێیەمی زاینیدا هەولێریان داگیرکردووە و شوراکانی قەڵاشیان ڕووخاندووە!...

٢- پرسیاری دووەم ئەوەیە کە ئایا شوێنەواری گۆڕەپانی جەنگە کۆنەکان دەدۆزرێتەوە و دەبێت چی بکەینە پێوەر بۆ دیاری کردنی شوێنی گۆڕەپانی جەنگێکی سەدەکانی پ.ز؟.

جەنگی ئەربێلا لە سەرەتای مانگی تشرینی یەکەم و سەرەتای پایز ڕوویداوە کە ئەوکات ناوچەی هەولێر و دەوروبەری ناوچەیەکی گەرمە و مرۆڤ زۆر پێویستی بە ئاوی خواردنەوەهەیە و ئێمەش باس لە جەنگێک دەکەین کە مێژوونووسان سوپای داریوش بە چەند سەد هەزار سەربازێک و سوپای ئەسکەندەریش بە نزیکەی چل تا شەست هەزار سەرباز مەزەندە دەکەن، ڕاستە ئێمە دەزانین ئەو ژمارانە جێگەی گومانە، بەڵام نابێت ئەوەش لەبیر بکەین کە ئەو جەنگە گەورە و چارەنووس سازە بەدەیان هەزار سەرباز بەشدارییان تێداکردووە، ئەم ژمارە زۆرەش پێش هەمووشتێک پێویستییان بە ئاوی خواردنەوە دەبێت ئەو ئاوەش لە کانی و کارێزێک بە تەنها دابین ناکرێت لەبەرئەوە پێویستە ئەو جەنگە لە نزیک ڕووبارێکی گەورە ئەنجام بدرێت و دیارە سوپای

ئەسکەندەریش لە رۆژئاوا و باکووری رۆژئاوای ئەربێلاوە هاتوون لە بەرئەوە نزیکترین رووبارەکانی ناوچەکە (رووباری زێی گەورە و رووباری خازر و رووباری گۆمەل) ن، و دەبێت لە نزیک یەکێک لەم رووبارانە ئەم جەنگە روویدابێت.

**بەڵام بۆچی ناونراوە جەنگی ئەربێلا؟.**

دیارە لەبەرئەوەی ئەوکات شاری هەولێر یەکێک بووە لە شارە گرنگ و گەورەکانی ناوچەکە و جگە لەوەی دوای کۆتایی هاتنی جەنگەکە ئەسکەندەر و سوپاکەی روویانکردۆتە شاری ئەربێلا و پاشان بەرەو بابل بەرێ کەوتوون.

٢- جەنگەکانی سەردەمە کۆنەکان بە تیر و رم و شمشێر و خەنجەر و ئەسپ و عەرەبانە بەڕێوە دەچوون، ئێمە ئەگەر بێت و باس لەوە بکەین کە دەبێت شوێنەواری ئەو جەنگە بدۆزینەوە ئەوە تەنها خەیاڵە چونکە:

دوای کۆتایی هاتنی جەنگی ئەربێلا وەک هەموو جەنگەکانی ئەو سەردەمە، تاڵانییەکان کۆکراونەوەتەوە تەنانەت ئەو جۆرە زرێ و کڵاوە و جل و بەرگە جەنگییەی لەبەر کوژراوەکانیشدا هەبوون بە تاڵانی براوە جا لە لایەن سوپای ئەسکەندەر یان لە لایەن تاڵانچییەکان کە لە هەموو سەردەمێکدا لە دوای جەنگەکان هەموو شتێکیان بە تاڵانبردووە، لە بەرئەوە پێناچێت شتێک بدۆزرێتەوە لە شوێنەواری ئەو جەنگە کە شایەنی باسکردن بێت، تەنها شتێک کە رێی تێدەچێت ئەویش بریتییە لەو ژمارە زۆرە خەڵکەی کە لە جەنگەکەدا کوژراون لە هەردوولا، دیارە کوژراوەکانی سوپای ئەسکەندەر نێژراون لە گۆڕەپانی جەنگەکەدا،بەڵام ئەگەر بێت و سوپای ئەسکەندەر کەمێک دڵنەرم بووبێتن و کوژراوەکانی دوژمنیشیان ناشتیبێت کەواتە ئێمە ئێستا دەبێت لە دوو گۆڕی بەکۆمەڵ بگەڕێین، و ئایا پاشماوەی ئەو دووگۆڕە چۆن دەدۆزرێتەوە ؟ ئەوە کارێکی ئەستەمە و زۆری دەوێت، بەڵام هەندێک سەرچاوە ئاماژە بەوەدەکەن کە ئەسکەندەر زوو هەولێری بەجێ هێشت لە بەر بۆنی کوژراوەکان(چونکە سەرەتای پایز بووە و پلەی گەرما لە هەولێر بەرزبووە)ئەگەر وابێت کوژراوەکانی دوژمنیش نەنێژراون و بۆگەنیان کردووە و ئاژەڵ و درندە خواردوونی و پاشماوەیەیان نەماوە.

بەهەرحاڵ دیاریکردنی شوێنەواری گۆڕەپانی ئەو جەنگە پێویستی بە توێژینەوەیەکی ورد هەیە کە دەبێت شوێنەوارناسان و مێژوونووسان و پسپۆڕانی بواری جوگرافیای مێژوویی و جوگرافیای سەربازی بەشداری بن بۆ ئەوەی بتوانرێت بە شێوەیەکی گشتی شوێنەواری جەنگەکە دیاری بکرێت،کە بێگومان دەتوانرێت بەراوردێک بکرێت لەنێوان گۆڕەپانی جەنگی ئیسۆس و گرانیکۆس کە لەو دوو جەنگەدا ئەسکەندەر بە سەر سوپای هاخامەنشی و داریوشدا لە وڵاتی ئەنادۆڵ پێش جەنگی ئەربێلا بە چەند ساڵێک سەرکەوت، جگە لەوەی پشکنین لە گردی شوێنەواری گۆمەل (نزیک رووباری گۆمەل لەوانەیە هەندێک زانیاری بەدەستەوە بدات چونکە زۆرێک لە پسپۆڕان بەراورد لە نێوان ناوی گۆمەل و گواکەمێلادەکەن)...

پێویستە بگوترێت کە جەنگی ئەربێلا دەروازەیەک بوو بۆ کۆمەڵێک گۆڕانکاری سیاسی و شارستانی کە تا ئێستاش کاریگەرییان لە سەر ناوچەکە و جیهان ماوە و دەتوانرێت بە کۆنترین نمونەی عەولەمە دابنرێت چونکە لە ئەنجامی ئەم جەنگە شارستانییەتی رۆژهەڵات و رۆژئاوا بۆ ماوەی چەند سەدەیەک تێکەڵ بوون و شارستانییەتێکی نوێ دروست بوو بە ناوی شارستانییەتی هلینستی، و ئەم جەنگەش شاری ئەربێلای بە هەموو جیهان ناساند.

# نەخشی چیای هەریر- باتاس

## «توێژینەوەیەکی مەیدانی بەراوردکارییە»

دڵشاد عەزیز زامووا
کۆلیژی ئاداب - زانکۆی سەلاحەددین

مەبەستمان لە نەخش واتە دیمەنێکی نەحتکراو لەسەر رووی شاخێک(بەردێک)ە کە لە عەرەبیدا پێی دەگوترێت (منحوتات صخرية) و بەرامبەرەکەشی نەخشی سەر بەردە و لە (فەرهەنگی خاڵ) و (هەنبانە بۆرینە)دا نەخش ئەو واتایە دەدات.

### شوێنی جوگرافی نەخشەکە:

دەکەوێتە باکووری خۆرهەڵاتی شاری هەولێر لە چیای هەریر، لە باکووری خۆرهەڵاتی شارۆچکەی هەریر، بەدووری تەنها چەند سەد مەترێک لەو شارۆچکەیەوە، نەخشێک دەبینرێت لە ناو چوارچێوەیەکی لایەکێشەیی قوڵدایە و نزیکەی (٥٠م) لە ئاستی رووی زەوییەوە بەرزە، و لە رووی شاخەکەدا هەڵکەندراوە.

### ناوەکەی:

دەربارەی ناوی نەخشەکە لە سەرچاوە جیاوازەکاندا بە چەند شێوەیەک ناوی هاتووە وەک:

١- نەخشی حەریر: دیارە ئەم ناوەش لە ناوی شارۆچکەی هەریرەوە هاتووە، کە پەیوەست دەکرێتەوە بە رێگای بەناوبانگی بازرگانی حەریر (طريق الحرير/Silk Road)لە سەردەمی رۆمانییەکاندا، بە پێی ئەم بۆچوونە رێگای بازرگانی حەریر بە کوردستاندا و بە دەشتی حەریردا تێپەڕیوە، بەڵام لە سەرچاوە مێخییەکاندا کە بۆ سێ هەزار ساڵ لەمەوبەر دەگەڕێتەوە ئاشورییەکان وڵاتێک داگیردەکەن و سەرانەی لێ دەستێنن پێی دەگوترێت وڵاتی(کیرووری)و هەندێک لە شوێنەوارناسان پێیان وایە ئەو وڵاتە لەناوچەی هەریر بووە و ناوی هەریریش لە ناوی کیرووریەوە هاتووە[٢] بەم شێوەیە(KIRRURI)گۆڕاوە بۆ (HARER) بەڵام ئێمە پێمان وایە کە ناوی کیروری لە ناوی ناحیەی (کۆڕێ)ی ئێستادا ماوەتەوە چونکە دەربەندی کۆڕێ سەرەتا و دەروازەی وڵاتی کیروری بوو کە شەقڵاوە و حەریر و دۆڵی ئالانەی دەگرتەوە، بەهەرحاڵ پێناچێت هیچ پەیوەندییەک هەبێت لە نێوان ناوی حەریر و نەخشەکەدا.



وێنەی ژمارە (١)



**وێنەی ژمارەی (٢) وێنەیەکی بەدەستکێشراو بۆ نەخشەکەی هەریر - باتاس[١]**

**٢- نەخشی باتاس:**

شوێنەوارناسە بیانییەکان لەسەرەتای سەدەی بیستی زایینیدا کاتێک سەردانی ئەم نەخشەیان کرد بە (نەخشی باتاس) ناویان برد، چونکە بەرامبەر دێی باتاس بوو کە گوندێکی بەناوبانگی دەشتی هەریرە و گردێکی شوێنەواری گرنگ لە نزیکی ئەم گوندەیە.

**گردی شوێنەواریی باتاس**

هەندێک سەرچاوە پێیان وایە باتاس بە زمانی میدی واتە فەرمانڕەوا و سەرکردە بەڵام تا ئێستا بەڵگەی زانستی نییە ئەوە بسەلمێنێت.

**وەسفی نەخشی هەریر- باتاس:**

ئەم نەخشە پێکهاتووە لە دیمەنی جەنگاوەرێک لە ناو چوارچێوەیەکی لاکێشەیی دا هەڵکەندراوە بەنەختی بارز کە قوڵییەکەی نزیکەی (٤٠سم) دەبێت، و بەرزی نەخشەکە نزیکەی (٢.٥م) دەبێت، وێنەی جەنگاوەرێک دەبینین کە لەسەر لا نەحت کراوە، و بە پێوە وەستاوە و رووی کردووەتە لای باشوور و قاچی چەپی بەرەو پێشەوە بردووە (هەنگاو بەرەو پێشەوە دەنێت)، و دەستی راستی بەرزکردۆتەوە بۆ پێشەوە و بۆ ئاستی سنگی (بۆ سڵاوکردن) و رمێکی درێژی بە دەستی چەپییەوە گرتووە و سەری رمەکە بۆ سەرەوەیە و شریتێکی پێوەیە و لە ئاستی سەری بەرزترە و کۆتایی رمەکەی لە زەوی چەقاندووە.

هەرچەندە لە ئێستادا روون نییە شێوەکەی چۆنە (چونکە شێوێندراوە)، بەڵام وەک لە وێنە کۆنەکانیدا دەردەکەوێت ئەم جەنگاوەرە ریشێکی درێژی هەیە و کڵاوێکی قوچەکی نوک تیژی لە سەردایە، کە بۆ دواوە لار بۆتەوە، بە پەتێک (شریتێک) بەستراوە و دوو لکی پێدا شۆڕ بۆتەوە بۆ دواوە کە دەگاتە سەر شان و پشتی، جلێکی درێژی لە بەردایە لە (کەوا) یەکی دێژ دەچێت و لەگەردنیدا بە پەتێک بەستراوە ئەو کەوایە پێشەکەی کراوەیە و دەگاتە ئەژنۆی (چونکە جەنگاوەرە لەناوچەیەکی شاخاویدا بۆ ئەوەی بە ئاسانی بجەنگێت و هەنگاوبنێت)، و لە ژێر کەواکەیەوە شەرواڵێکی تەسک و کورتی لەبەردایە، و بە پشتێنێک لە ناوقەدی بەستووە و بە شێک لە پشتێنەکە شۆڕبۆتەوە بۆ خوارەوە ،و لە ئێستادا روون نیە کە پێڵاوی چۆنە،



وێنەی (٣) گردی شوێنەواری باتاس



وێنەی ژمارە (٤ ) نەخشەکەی بەردەم دەروازەی ئامێدی.



وێنەی ژمارە (٥) نەخشی میرقولی لە شاخی پیرەمەگرون

چونکە ئەم پەیکەرە ئێستا زۆر شێوێندراوە.

شێوەی وەستان و کڵاو و جلوبەرگی نەخشەکەی حەریر تا ڕادەیەک لە نەخشەکەی (میرقوڵی و ڕەبەنە/لە شاخی پیرەمەگرون) و نەخشەکەی بەردەم دەروازەی شاری ئامێدی دەچێت[٣].

بە بەراوردکردنی نەخشەکەی هەریر بە نەخشە هاوشێوەکانی دیکەی شاخەکانی کوردستان، دەتوانین بە شێوەکی گشتی سەردەمەکی دیاری بکەین و گشت بۆچوونەکانی شوێنەوارناسان دەخەینەڕوو:

دیارە چەند بۆ چوونێکی جیاواز هەیە دەربارەی سەردەمی نەخشی حەریر:

١- (مارگریت ریشنایدر)[٤] کاتێک باس لە ئۆزارتییەکان دەکات، باس لە نەخشی(حەریر- باتاس)دەکات وەک پەیکەرێکی ئۆزارتی ناوی دەهێنێت، و وێنەیەکی کێشراوی نەخەشەکەی هەریر نیشاندەدات کە هەندێک هەڵەی تێدایە، و دیارە کە زۆر شارەزایی لەسەر نەخشی حەریر نییە هەر لەبەر ئەوە پێی وایە کە ئەوە بریتییە لە پەیکەرێکی شکاو لە ناوچەی حەریر دۆزراوەتەوە و نازانێت ئەوە مەنحوتەیەکە و لە ڕووی چیای هەریر هەڵکەندراوە.

٢- هەندێک نووسەری دیکە پێیان وایە کە پێدەچێت سەرکردەیەکی سکیثی بێت (گەلێکی کۆن هاوسەردەمی میدییەکان بوون و لەگەڵیاندا



وێنەی ژمارە (٦) - وێنەی نەخشەکەی هەریر بە پێی (مارگرێت ریشنایدر).



وێنەی ژمارە (٧) کۆنترین وێنەی فۆتۆگرافی هەریر لە لایەن ئەدمۆنزەوە گیراوە:
EDMONDS, C.J. , SOME ANCIENT MONUMENTS ON THE IRAQI- PERSIAN: BOUNDARY, IRAQ VOL. 28..

جەنگاون).

٣- سەردەمی یۆنانی (سەلوقی)یەکان (٣١٢-١٣٨پ.ز):

هەندێک پێیان وایە کە ئەم نەخشە بۆ سەردەمی یۆنانییەکان دەگەڕێتەوە، بەتایبەت بۆ سەردەمی (ئەنتیۆخس) چونکە چەند جەنگێک لە نێوان ئەم پاشا یۆنانییە و میتریدادی ئەشکانی دا لەم ناوچەیە روویداوە.

٤- سەردەمی ئەشکانی (١٣٨پ.ز- ٢٢٦ز): یەکێک لە کۆنترین بۆچوونەکان ئەوەیە کە ئەم نەخشە دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی ئەشکانییەکان(العصر الفرثي)، ئەم بۆچوونە لە لایەن هەندێک لە شوێنەوارناسانی بیانی و (تەها باقر و فوئاد سەفەر)ەوە باس کراوە[٢].

بێگومان ئەگەر ئەم بۆچوونە راست بێت، ئەوا دەبێت بگەڕێینەوە بۆ رووداوەکانی ئەو سەردەمە و دەبینین کە لەو سەردەمەدا ئەشکانییەکان حوکمی ئۆتۆنۆمییان دابووە میرنشینی ئەدیابین (مملکة حدياب) کە بۆ ماوەیەکی زۆر پایتەختەکەی لە قەڵای هەولێر بوو، هەروەها ناوچەی حەریریش دەکەوتە سنووری ئەم میرنشینەوە، بێگومان ئەم میرنشینە لە سنوورەکانی باکوور و رۆژئاواوە لە جەنگێکی بەردەوام دا بوو لەگەڵ یۆنانییەکان و پاشانیش لەگەڵ رۆمانییەکاندا، کەواتە ئەگەر ئەو بۆچوونە راست بێت ئەوا ئەم نەخشە دەگەڕێتەوە بۆ سەرکردەیەکی جەنگاوەر کە سەرکەوتنێکی بەدەست هێناوە لەو ناوچەیەدا و دوای جەنگەکە ئەم نەخشەی وەک یادگاری تۆمارکردنی سەرکەوتن بۆ هەڵکەندراوە لە رووی شاخەکە بۆ ئەوەی ببێتە یادگارییەک هەر(کەسێک بەوێدا تێپەڕێت دیمەنی ئەو سەرکردەیە ببینێت لە رووی شاخەکەدا)، ئەم جەنگاوەرە رمەکەی بەدەستی چەپییەوە گرتووە کە واتای تەواو بوون و کۆتایی هاتنی جەنگ دەدات، و بەدەستی راستی سڵاوی کردووە.

وەک لەسەرەوە دەرکەوت چەند بۆچوونێکی جیاواز هەیە دەربارەی سەردەمی نەخشەکە و ئێمە لێرەدا چەند تێبینییەک دەخەینە روو دەربارەی سەردەمی (نەخشی حەریر- باتاس):

١- دەتوانین بە شێوەیەکی گشتی بڵێین کە ئەم نەخشە دەگەڕێتەوە بۆ هەزارەی یەکەمی پ.ز یان سەرەتای هەزارەی یەکەمی زایینی.

٢- ئەو بۆ چوونەی کە مەنحوتەکە بۆ سەردەمی ئۆرارتی (١٣٠٠-٥٩٠پ.ز) دەگەڕێنێتەوە زانستی نییە، چونکە شێوازی جل و بەرگ و نەحتی ئۆراتییەکان بەو شێوەیە نییە، جگە لەوەی کە مارگرێت هیچ زانیارییەکی لە سەر نەخشەکە نییە و سەردانیشی نەکردووە بەهەڵە پێی دەڵێت پەیکەرێکی شکاو.

٣- دەربارەی یۆنانییەکان (٣١٢-١٣٨پ.ز) دیارە کە بە هەمان شێوە جل و بەرگ و شێوازی نەحتی یۆنانی جیاوازە و لە نەخەشەکەی هەریردا هیچ شێوازێکی لەو جۆرە بەرچاو ناکەوێت.

٤- دەربارەی سەردەمی ئەشکانی (فرثی) (١٣٨پ.ز-٢٢٦ز) بێگومان ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ شێوازی جل و بەرگ و وەستانی جەنگاوەرەکە دەبینین ئەم شێوازە هەمان شێوازە کە لە هەندێک لە مەنحوتەکانی دیکەی کوردستان دا هەیە و بۆ ئەم سەردەمە دەگەڕێنەوە هەروەک لە پێشەوە



**وێنەی ژمارە (٨) - وێنەیەکی دەستی نەخشەکەی هەریر، لە باقر طە وفؤاد سفر وەرگیراوە**
**المرشد إلي مواطن الاثار والحضارة، الرحلة الخامسة بغداد - اربيل، (بغداد-١٩٦٦).**

وێنەی ژمارە (٩) - نەخشەیەک بڵاوبوونەوەی نەخش و مەنحوتە شاخاوییەکانی کوردستان نیشان دەدات

باسمانکرد .

٥- هیچ نووسینێک یان هێمای خواوەندێک نابینین و ناشزانین ئەگەر هەبووبێت و سڕدرابێتەوە، یان هەر لەسەری هەڵنەکەندرابێت، لەبەر نەبوونی نووسین ناوی جەنگاوەرەکە و ئاین و نەتەوەکەی نازانین...

٦- ئەو کەسەی لە دیمەنەکەدا دەردەکەوێت سەرکردەیەکی جەنگاوەرە و رمێکی درێژی پێیە، و ئەگەر رم بەدەستی چەپەوە بوو ئەوا نیشانەی کۆتایی هاتنی جەنگ و بەدەستهێنانی سەرکەوتنە هەروەک لەم نەخشەدا دیارە.

٧- گردی شوێنەواری باتاس گەورەترین گردی ناوچەکەیە و بەرامبەر بە نەخشەکەیە، ئەگەر بێت و پشکنین لەو گردە بکرێت پێدەچێت شارێکی کۆن دەربکەوێت و زانیاری زیاترمان دەربارەی نەخشەکە دەست بکەوێت.

**سەرچاوەکان:**

(1) Huff: Dietrich. "Das Felsrelief von Qir", Archaeologische Mittelungen Aus Iran,Bands. 17. ,Berlin, 1984.

(٢) دلشاد عەزیز زاموا: «وڵاتی کیرووری)) گۆڤاری هەزارمێرد ، ژمارە ٢٦ڤن ٢٠٠٥.

(٣) دلشاد عزیز زاموا: ((المنحوتات الصخریه القدیمه فی مدینه (ئامێدی) العمادیه((دراسه تحلیلیه مقارنه))، مجله سوبارتو، العدد٢، ٢٠٠٨.

(٤) ریشنایدر: مارکریت، اورارتو،ترجمه: محمد وحید خیاطه، حلب - ١٩٩٣.

(٥) باقر:طه و فؤاد سفر، المرشد إلي مواطن الاثار والحضارة، الرحلة الخامسة بغداد -اربیل، (بغداد-١٩٦٦ ).

(6) EDMONDS, C.J."SOME ANCIENT MONUMENTS ON THE IRAQ I-PERSIAN"VOL 28.

تێبینی: ئەم بابەتە لە ژمارە(٣)ی ساڵی (٢٠٠٩)ی گۆڤاری سوبارتو وەرگیراوە.

# شوێنەواری قەڵای شیلە و پەرستگا زەردەشتییەکەی

«توێژینەوەیەکی مەیدانییە»

هێمن نعمان کاوێس
شوێنەوارناس- بنکەی شوێنەواری کۆیە

**شوێنی جوگرافی قەڵای شیلە:**

قەڵای شیلە دەکەوێتە ڕۆژهەڵاتی گوندی شیلە بەدووری ۱۰ کم لە باشووری کۆیە، و نزیکەی (٧٦کم) لە ڕۆژهەڵاتی شاری هەولێرەوە دوورە، قەڵای شیلە دەکەوێتە نێوان چەند گوندێکی ناوچەکە، لەوانە گوندەکانی (هەرمۆتە) لە باکوور (عەودالان) و (یارەمیش) لە خۆرهەڵات (قۆریتان)و (داربەڕوو) لە باشوور و (مام قلینج) لە خۆرئاوا[1] (نەخشەی ژمارە (۱)

قەڵای شیلە بریتییە لە دوو گردی نیمچە بازنەیی کە یەکەمیان ناسراوە بە گردی قەڵای شیلەی گەورەو درێژییەکەی (٤٥م)ە و پانییەکەی (٣٥م) لەلای ڕۆژهەڵاتی قەڵاکە لە بەشی خوارەوەی چەمی (کانی ڕێحانەی) پڕ ئاو و درەختی لێیە، بەرزی قەڵا (گردەکە) لەلای ڕۆژهەڵاتییەوە دەگاتە نزیکەی (٥٠م) کە زۆر لێژە، بەڵام لاکانی تری ئەم قەڵایە لێژی کەمە و شوێنەواری کێلان بە قەد پاڵی




نەخشەی ژمارە -۱-
ناوچە شوێنەوارییەکانی کۆیە، شوێنی قەڵای شیلە لە ناوەڕاستدا دیاری کراوە

گردەکەوە دیارە کە تا ئێستاش دەکێڵرێت و ئەمە بۆتە هۆی کەمبوونەوەی لێژییەکەی[2]. بڕوانە نەخشەی ژمارە (۲).

گرد (قەڵا)ی شیلەی گەورە لە بەشی باشووریدا درێژو نزم دەبێتەوە تادەگاتە گرد (قەڵا)ی شیلەی بچووک، دووری نێوانیان



(نەخشەی ژمار -٢-) سنووری شوێنەواری قەلا و گوندی شیلە.

لکاوە و لە هەندێک بەشی تریدا لێی جیابۆتەوە لەگەڵ چەند بەشێکی ناوەکی، لە گردی قەلای شیلەی گەورەدا لەسەر رووی زەویەکەی پاشماوەکانی سوالەتی و گڵێنەی سەردەمی ساسانییەکان و پێش ئەوان بەرچاو دەکەوێت، لەگردی شیلەی بچووکیش سوالەتی رەنگکراو و بەردە ئەستێ لە شێوەی ئامرازەکانی چاخی بەردینی نوێ و جۆرەکانی تری چاخی بەردینی ناوەڕاست لە جۆری (Microlithic)ی ئەشکەوتی زەرزی (١٥٠٠٠ - ١١٠٠٠ پ.ز) دۆزراونەتەوە، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە ئەم ناوچەیە لە چاخەکانی پێش مێژوودا ئاوەدان بووە و کۆنترە لە گردی قەلای شیلەی گەورە[٣].

بەشێوەیەکی گشتی ئەم گردە بەگەورەترین و بەرزترین گردی ناوچەکە دەژمێردرێت ئەم ناوچەیەش کەوتۆتە سەر رێگای ئەو هێڵەی کە کەرکوک بە کۆیە و دیوی رانیەو قەلادزە بەیەکەوە دەبەستێ، ئەمەش گوزارشت لە گرنگی شوێنی جوگرافی قەلاکە دەکات کە دەکەوێتە سەر رێگای بازرگانی کۆن[٤].

### ناوی قەلاکەو پەرستگاکەی:

زۆر جار لەناوچە جیاوازەکانی کوردستان بەگردی شوێنەواری دەگوترێت قەلا، بەهەمان شێوە لە شیلە دوو گردی گەورە هەن و پێیان دەوترێت قەلای شیلە، سەبارەت بەناوی قەلاکە لەناوی گوندی شیلەوە وەرگیراوە، رەنگە لە وشەی (چیلە)وە هاتبێت کە بەدیوارێک دەگاتە(١٠٠ م)، ئەم گردەی دواییش لە شێوەی لاکێشەییە و بەهەمان شێوەی گردی یەکەم کێلان کاری کردۆتە سەر، لەوە دەچێت لە کۆندا هەردووو گردەکە پێکەوە بووبن، بەلام بەهۆکاری سروشتی وەک بەفرو باران و هۆکاری مرۆیی وەک کێلان لە یەکتری جیا بوونەتەوە، بەلام پێدەچێت یەکێک لەم دوو گردە پەرستگاو قەلای فەرمانڕەواکەی بێت و گردی دووەم ئاوەدانی بووەو خەڵکی ئاسایی لێ ژیاوە، وەک دەردەکەوێت گردی گەورەی شیلە بۆ نیشتەجێبوون بووە لە لایەن خەڵکەوە و گردی شیلەی بچووک پەرستگاو قەلا بووە.

پێکهاتەکانی بیناکە بریتین لە شووورەی سەرەکی کە لە هەندێک شوێندا بە بەشەکانی تری پەرستگاکە

دەوتریت کە بە وشکە کەڵەک هەڵچنرابێت، وەک ئاشکراشە لەکۆنەوە تاکو ئێستاش زۆرێک خانووبەرەی کوردستان هەر بەم شێوەیە لە ناوچە شاخاوییەکان دروست کراوە[٦].

**گرنگی قەڵای شیلەو مێژووی ناساندنی وەک ناوچەیەکی شوێنەواری کۆن:**

بۆ یەکەم جار قەڵای شیلە لەلایەن چەند شوێنەوارناسێکی عێراقییەوە دۆزرایەوە کە بەتایبەتی بۆ تۆمارکردنی ئەو قەڵایە هاتبوون، ئەویش لە بەرواری (٢/١٠/١٩٥٣) کە لەراپۆرتەکەیاندا هاتووە، (قەڵای شیلە دەکەوێتە گوندی شیلە لە ناحیەی تەق تەقی سەر بەقەزای کۆیە لە رۆژهەڵاتی پارێزگای هەولێر، بەپێی لێکۆڵینەوەیەکی سەرەتایی کە ئاماژە بەوە دەکات، قەڵایەکی شوێنەواری کۆن دۆزراوەتەوە، هێندێ کەلوپەل و کەرەستەی کۆنی بەردی تێدایە کە دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی چاخی بەردینی کۆن، کە هاوکاتە لەگەڵ شوێنەواری بەردەبەلەکە لە رۆژهەڵاتی چەمچەماڵ مێژووەکەی بۆ سەد هەزار ساڵ پێش زاین دەگەڕێتەوە.)

بەڵام بەرەسمی لەبەرواری (٢٥/١/١٩٥٤) قەڵای شیلە وەک ناوچەیەکی شوێنەواری کۆن ناسێنرا، ژمارەی دۆسیە (رقم الاضبارة)ی تایبەتی بۆ دەرکرا کە ژمارە (٥٣٣) و لەم دۆسیەیە بە(١١-١٢) چینی شوێنەواری مەزندە کراوە.

لە راپۆرتێکی بەڕێوەبەرایەتی شوێنەواری کۆیەدا کە لەبەرواری (٢٠٠٣/٩/٢٧) ئامادە کراوە، وا دەردەکەوێت کە لەقەڵای شیلەی گەورەدا پاشماوەکانی گڵێنەی سەردەمی ساسانی بەرچاو دەکەوێت، هەروەها لە گردی شیلەی بچووک کە بە تەنیشتیەوەیەتی سواڵەتە رەنگکراوەکانی سەردەمەکانی (شارستانیەتی حەلەف (٤٩٠٠-٤٥٠٠پ.ز) و شارستانیەتی عوبێد (٤٥٠٠ - ٣٥٠٠ پ.ز) و شارستانیەتی وەرکا (٣٥٠٠-٣١٠٠ پ.ز) بەرچاو دەکەون، جگە لەمانەش بەردە ئەستێیەکانی چاخی بەردینی ناوەڕاست لە جۆری (Microlithic)ی ئەشکەوتی زەرزی) و چاخی بەردینی نوێ بەرچاو دەکەون، ئەمەش بەڵگەی ئاوەدانی گردی شیلەی بچووکە لە سەردەمی چاخە بەردینەکاندا[٨]

**بەشەکانی قەڵاکە:**

قەڵای شیلە بەپێی ئەو توێژینەوەیەی کە ئەنجاممان داوە دەرکەوت کە قەڵاکە لە شوورەیەکی نیمچە رووخاو و سێ بەشی تری بەیەکەوە لکاو پێکدێت کە زیاتر شێوەیەکی چوارگۆشەیی وەرگرتووە.

**بەشەکانی قەڵای شیلە بریتین لە:**

١- حەوشەی قەڵاکە.
٢- حەوشەی سەکۆ یان حەوشەی دووەم.
٣- ژوورو پاشکۆکانی تر لە قەڵای شیلە.

بەروانین لە پاشماوە شوێنەوارییەکانی قەڵای شیلە بۆمان دەردەکەوێت کە ئەم شوێنەوارە تووشی وێرانکارییەکی زۆر هاتووە بە هەردوو هۆکاری مرۆیی و سروشتی، بەتایبەتی شوورەی قەڵاکە کە تەنها بەردە رووخاوەکانی دیوارەکەی ماوەتەوە بێجگە لە دیواری رۆژهەڵاتی کە بەرزی دیوارەکانی دەگاتە (٢م)، بەڵام بەشەکانی تری شوورەکە رووخاوە و ناتوانرێت پانییەکەی دیاری بکرێت. بەشێوەیەکی گشتی درێژی ئەم شوورەیە نزیکەی (١٣٠م)ە لە هەموو لاکانییەوە، لەم شوورەیەدا دەتوانرێت (٣) دەروازە ببینرێت کە یەکەمیان لە دیواری باشووری شوورەی قەڵاکەیەو بەرامبەر بەگردی قەڵای شیلەی بچووکەو، ناتوانرێت پێوانەی ئەم دەروازەیە بزانرێت چونکە بەتەواوی رووخاوە و دوو دەروازەکەی تری قەڵاکە دەکەونە بەشی رۆژهەڵاتی شوورەی قەڵاکە.

لێرەدا دیواری رۆژهەڵاتی شوورەی قەڵا لەگەڵ بەشی سێیەمی قەڵاکە کە ژوور و پاشکۆکانی تری قەڵاکەیە وەردەگرین و باسی دەکەین، چونکە پەیوەندییەکی راستەوخۆیان بەیەکتریەوە هەیە، ئەم دیوارەش بەشێک لە پێکهاتەکانی بەشی سێهەمی قەڵاکە پێک دێنێت، ئەوەی لێرەدا پێویستە ئاماژەی بۆ بکرێت بوونی دوو بۆشایی شێوە بازنەییە، یەکەمیان لە گۆشەی دیواری باکووری رۆژئاوا و ئەوی تریان لەگۆشەی باشووری رۆژئاوا کە پێدەچێت قوللە (بورجی)ی چاودێری کردن بووبن (نەخشەی ژمارە ـ ٣).



نەخشەی ژمارە -٣-
بەشێک لە پاشماوەی شووراکە و قولەکانی و حەوشە و بەشەکانی قەڵای شیلە.

وەک لەسەرەوە ئاماژەمان پێدا بەهۆی رووخانی بەشێکی زۆری دیواری شوورەی قەڵاکە نەمانتوانی وەک بەشێکی تایبەت وەریبگرین و پێوانەکانی بەتەواوی دیاری بکەین وەک سێ بەشەکەی تر کە لە خوارەوە باسیان دەکەین.

**١- حەوشەی قەڵاکە:**

ئەم بەشەی قەڵاکە دەکەوێتە باشووری بیناکە و دەروازەیەکی تێدایە کە کەوتۆتە گۆشەی باشووری رۆژئاوای بیناکە لە ناوەوە (بڕوانە نەخشەی ژمارە ٤). درێژی دیواری باشووری ئەم بەشەی بیناکە (١٣م) و پانییەکەی (٩٥ سم)دەبێت و دووری ئەم دیوارە لە دیواری باشووری شوورەی قەڵاکە نزیکەی (٩ م) دەبێت، درێژی دەروازەکەی (٢م)ە و پانییەکەی (١.٧٠م)ە و پانییەکەی (١.٦٠م)ە، ئەم گۆشەیە بەدیوارێکەوە نووساوە کە لای خۆرئاوای لێ گرتووە و بەرەو ناوەوەی قەڵاکە دەڕوات کە درێژییەکەی (١٥.٩٠ م) و پانییەکەی (١م) دەبێت، و بەرزترین شوێن کە ماوەتەوە لە دیوارەکە (٥٠سم) بەرزە، ئەم دیوارە لەگەڵ دیوارێکی تر بەیەک دەگەن بەشی یەکەمی قەڵاکە کە حەوشەکەیەتی لە حەوشەی سەکۆ کە بەشی دووەمی قەڵاکەیە لێک جیا دەکەنەوە.لێرەدا پێویستە بەشەکانی ناوەوەی حەوشەی قەڵاکە باس بکەین کە چەندین کۆڵەکە و هەیوان (ایوان)ی تێدایە، ئەمەش یەکێکە لە تایبەتمەندییەکانی بیناسازی لە سەردەمی ساسانییەکاندا (٢٢٦-٦٣٩ ز) بەوە جیا دەکرێتەوە کە ژمارەیەکی زۆر کۆڵەکە و هەیوان لە یەک یەکەی نیشتەجێبووندا هەیە[٩].

لە دەروازەی ئەم بەشەدا و لەژوورەوەدا هەیوانێک بەدی دەکرێت، لەنێوان دیواری لای چەپی حەوشەی قەڵاو چوار کۆڵەکە، کە پانی هەیوانەکە (١.٦٠ م) و درێژییەکەی (١م) دەبێت ئەمە بە هەیوانی باشووری رۆژئاوا ناودەبرێت.

ئەم (پایانە) بەشێوەیەکی ئەندازەیی دروست کراون، یەکەمیان درێژییەکەی (١.٤٥م)ە، و پانییەکەی (١م) دەبێت و رووەو لای راستی گەڕاوەتەوە و گۆشەیەکی دروست کردووە (١٢٠ پلەیە) و دووری نێوان پایەکان هەرچواریان (١.٦٠ م) دەبێت، پایەی دووەم شێوەیەکی چوارگۆشەیی هەیەو درێژی لایەکی (١.١٠م)ە و بەرزییەکەی



نەخشەی ژمارە -٤-

(٥٠سم) دەبێت، پایەی سێیەم ئەویش شێوەیەکی چوار گۆشەیی هەیە و درێژی لایەکی (١،١٠م)ە بەرزییەکەی نزیکەی (٦٥سم) دەبێت، پایەی چوارەم کە شێوەکەی لە پیتی (L) ی ئینگلیزی دەچێت گۆشەیەکی وەستاوی دروست کردووە رووەو رۆژهەڵات، بەڵام لاکەی تری رووەو باشوورەو درێژییەکەی دەگاتە (٢،٢٠م) و پانییەکەی (١م) دەبێت.

لێرەدا ئەوەی پێویستە بگوترێ ئەو چوار پایەیە، دیواری لای چەپی حەوشەی قەڵا هەیوانی ژمارە (١) پێک دەهێنێت کە پێدەچێت سەربانەکەی گومەزی هەبووبێت بە بەردو گەچ دروست کرابێت هەروەک گومەز لە بەشی خوارەوەی بیناکەی دیکە دیارە.[١٠].

بەڵام ئەو پایەیەی کە لەشێوەی پیتی (L) کە پێشتر ئاماژەمان پێکرد لە بەرامبەری سێ کۆڵەکەی تر هەیە، درێژی ئەو لایەی پایەکە (٢،١٠م)ە و پانییەکەی (١م)دەبێت، و دووری نێوانیان (١،٤٠م) دەبێت، ئەویش شێوەی چوارگۆشەی وەرگرتووە کە درێژی لایەکی (١م) دەبێت، و دووری نێوانی پایەکەی یەکەم و دووەم (١،٥٥ م) دەبێت، پایەی دووەم شێوەی چوار گۆشەییە و درێژی لایەکی (١م) دەبێت، لەدواییدا پایەی سێیەم دێت کە دووری نێوانیان لەگەڵ کۆڵەکەی دووەم (٢،٣٠م)ە کە پشتی بەدیوارەکەوەیە و درێژی ئەم دیوارە (٢،١٠م) دەبێت، ئەم دیوارەش بەدیواری پشتەوەی لکاوە بەدیواری بەشی سێیەمی قەڵا و پاشکۆکانی قەڵا ناسراوە. ئەم کۆڵەکەیەش چوارگۆشەییەو درێژی لایەکی (١،٢٠م) دەبێت، و لە بەشی سەرەوەیدا پانییەکی شێوە بازنەیی هەیە کە تیرەکەی (١م) دەبێت، و بەرزی هەموو کۆڵەکەکان بەشێوەکی گشتی (١،٣٠م) دەبێت.

لەنێوان ئەو پایانەی کە لەبەشی سەرەوەدا باسمان کردن لەگەڵ دیواری باکووری حەوشەی قەڵاکە هەروەک لە پێشدا ئاماژەمان پێدا ئەم دیوارەی بەشی یەکەمی قەڵا لە بەشی دووەمی جیا دەکاتەوە هەیوانێک هەیە کە درێژییەکەی (١،٧٠م) دەبێت و پانییەکەی نزیکەی (٢م) دەبێت و ئەویش بریتییە لە هەیوانی دووەم.

دیواری رۆژهەڵاتی بەشی یەکەمی بیناکە (حەوشەی قەڵاکە) بریتییە لە دیواری پشتەوەی ژووری داگیرساندنی (ئاگری پیرۆز) کە لە پەرستگا زەردەشتییەکانی سەردەمی ساسانی و سەردەمەکانی پێشتردا هەبووە، ئەم دیوارە چەند دیوارێکی کورتی لێ هاتۆتە دەرەوە (طلعات و دخلات) چەند نێوانێکی لە شێوەی خانەی بچووک دروست کردووە.

دیواری یەکەم بەپشتی پایەی سێیەمی هەیوانی دووەمەوە لکاوە، درێژییەکەی (٢،١٠ م) دەبێت و پانییەکەی (٥٥سم) و خانەیەکی دروست کردووە کە پانییەکەی (١،٧٥م) دەبێت، دیواری دووەم کە پشتی بەدیواری هەمان ژووری داگیرساندنی ئاگری پەرستگاکەوەیە، درێژییەکەی (١،١٠م) دەبێت و پانییەکەی (٥٥سم) دەبێت و

بەرزییەکەشی (٧٠سم) دەبێت، لەگەڵ دیواری یەکەم خانەیەکی دروست کردووە کە پانییەکەی (٢,٥م) دەبێت، بەڵام دیواری سێیەم کە پشتی بەدیواری ژوورێکی تری بەشی سێیەمی بیناکە لکاوە، درێژییەکەی (١م) و پانییەکەی (٥٥سم)ە و بەرزییەکەی (٩٠سم) دەبێت و پانی نێوان دیواری دووەم و سێیەم (٢,٢٠م) دەبێت.

لە دوای ئەم دیوارەوە دەروازەیەک هەیە کە بەشی یەکەمی بیناکە بە بەشی سێیەمی بیناکە دەبەستێتەوە کە درێژییەکەی (١,٦٠م)و پانییەکەی (١م) دەبێت، دیواری رۆژهەڵاتی بەشی یەکەمی قەڵا (حەوشەی قەڵا) و بەشەکانی، هەروەک لەسەرەوە ئاماژەمان پێدا ناتوانین بە هەیوانێکی تەواو وەسفی بکەین، چونکە لەچەند بەشێکی بچووکی سەربەخۆ پێکدێت، لە دوای دەروازەکە پایەیەکی چوار گۆشەیی دێت، کە کەوتۆتە سەر تەواوکەری دیواری رۆژهەڵاتی بەشی یەکەمی بیناکە، ئەم دیوارەش بە دیواری باشووری ئەم بەشەی بیناکەوە لکاوە، لێرەدا هەیوانێکی تر دەست پێدەکات کە کەوتۆتە نێوان دیواری باشووری حەوشی قەڵاو چوار کوڵەکەوە کە درێژییەکەی نزیکەی (١٠م) دەبێت و پانییەکەشی (١,٦٥م) دەبێت.

دەربارەی پایەکان یەکەمیان چوار گۆشەیەو درێژی لایەکی نزیکەی (١,٢٠م) تیرەکەی (١م) دەبێت، دووری نێوان پایەی یەکەم و دووەم (١,٨٠م)ە، و پایەی دووەم بەهەمان شێوەی پایەی یەکەمە لە رووی شێوەو قەبارەوە، پایەی سێیەم وچوارەم بەهۆی هۆکاری سروشتی و مرۆیی شوێنەوارەکانیان بەباشی دیار نییە، و ناتوانین پێوەرێکی راستەقینەی کوڵەکە کەکان وەربگرین، ئەم هەیوانەش دەتوانین بەهەیوانی قەڵای ناوبەرین، ئەویش سەرەکەی گومەزێکی نیوە بازنەیی هەبووە[١١]، لەنێوان دیواری رۆژهەڵاتی حەوشەی قەڵا و هەیوانەکان گۆرەپانێکی گەورەی شێوە نیمچە چوارگۆشەیی هەیە کە درێژییەکەی (٨,٥٠م) دەبێت و پانییەکەی (٧,٦٠م) دەبێت، ئەم شێوازەش لە بیناسازیدا دەگەرێتەوە بۆ سەردەمی ساسانی[١٢].

لێرەدا بۆمان روون دەبێتەوە کە سەردەمی دروستکردنی ئەم بینایە دەگەرێتەوە بۆ سەردەمی ساسانی (٢٢٦-٦٣٩ز) بەهۆی ئەو رەگەزە بیناسازییانەی کە لەم سەردەمەدا بڵاو بوو و لەم قەڵایەدا هەیە.

### ٢- حەوشەی سەکۆ (حەوشەی دووەم):

ئەم بەشەی قەڵاکە لە ژوورێک یان لە حەوشەیەک پێکدێت کە چوار پایەو سەکۆیەک لە ناوەراستیدا لەخۆ دەگرێت (بروانە نەخشەی ژمارە (٥).

### بەشەکانی قەڵای شیلە:

ئەم بەشەی قەڵاکە دەتوانین بە بەشی دووەمیش ناوی ببەین کە کەوتۆتە باکووری قەڵای شیلەوە و لەرێگەی چەند دەروازەیەکەوە بەبەشەکانی تری قەڵای شیلە دەبەسترێتەوە، بەشی باشووری ژووری سەکۆ لە دیوارێک پێکهاتووە کە درێژییەکەی (٨,٧٥م)دەبێت، کە ئەم دیوارەش ژووری سەکۆی لە بەشی یەکەمی قەڵاکە جیا کردۆتەوە و دەتوانین لە دوو دەروازەوە کە لەم دیوارەدا هەن بگەین بە حەوشەی قەڵاکە، و درێژی یەکەمیان (١,٥٥م)دەبێت، و ئەوی دووەمیان (١م) دەبێت.پانی دەروازەکانیش هێندەی ئەستووری دیوارەکەیە کە (١م) دەبێت.

لە گۆشەی باشووری رۆژئاوای ئەم بەشەی بیناکە لە رووی دەرەوەی دیوارێکی تر بەئاراستەی رۆژئاوا رۆیشتووە و لەگەڵ دیواری رۆژئاوای هەمان بەشی بیناکە یەکیان گرتووە، و شێوەی پیتی (L) ی ئینگلیزی بەپێچەوانەی دروست کردووە، کە درێژییەکەی (٥,١٠م) دەبێت، و پانییەکەی (١م) دەبێت و بەرزییەکەی (٨٠سم) دەبێت، لەم دیوارەدا دەروازەیەکی تر هەیە کە حەوشەی قەڵا بە شووردی دەرەوەی پەرستگا دەبەستێتەوە کە درێژییەکەی (٨٥سم) و پانییەکەی (١م)دەبێت، لەبەردەم ئەو دەروازەیە رارەوێکی فەرشکراو بە بەردی نارێک هەیە کە هاوتەریبە لەگەڵ دیوارەکانی رۆژئاوا و باکووری بەشی دووەمی قەڵاکە کە تێکرای درێژییەکەی (٢٤م) و پانییەکەی (٩٠ سم) دەبێت.

لەدوای ئەو دیوارەی کە شێوەی پیتی (L) ی ئینگلیزی پێچەوانەی هەیە، دیواری رۆژئاوای بەشی دووەمی قەڵا (حەوشەی سەکۆ) دێت کە درێژییەکەی (٩,٣٠م) و پانییەکەی (١م) دەبێت، ئەم دیوارە




نەخشەی ژمارە -٥- سەکۆی دووەم

نزیکەی (١١,٥م)لە دیواری شوورەی رۆژئاوای بیناکەوە دوورە، و هیچ دەروازەیەکی تێدا نییە، ئەم دیوارە بەرەو باکوور درێژ دەبێتەوە تا دەگاتە بەدیواری باکووری بەشی حەوشەی سەکۆ، کە ئەویش رووەو رۆژهەڵات دەکشێ، و درێژییەکەی (١٠م) دەبێت، و لەگەڵ دیواری ژوورێکی بەشی سێیەمی قەڵاکە بەیەک دەگەن، ئەم دیوارە نزیکەی (١١م) لە دیواری باکووری شوورەی قەڵاوە دوورە، و سەبارەت بە بەشەکانی ناوەوەی ژووری سەکۆ، لە چوار کۆڵەکە و سەکۆیەک لە ناوەڕاستیاندا پێکهاتووە (بڕوانە وێنەی ژمارە ١).

لە بەشی خۆرئاوای سەکۆکە واتە بەشی دواوەی دوو کۆڵەکەی چوارگۆشەیی هەیە کە لە بەشی سەرەوەیاندا دوو پایەی لوولەیی هەیە، درێژی لایەکی پایە چوارگۆشەکان (١,٢٠م) و بەرزییەکەیان (٨٠سم) دەبێت، تیرەی دوو پایە لوولەییەکەی بەشی سەرەوە نزیکەی (١,١٠م) دەبێت، دووری ئەم دوو پایەیە لە دیواری خۆرئاوای ژووری سەکۆ (١,٧٠م) دەبێت، و دووری نێوانی سەکۆکە (٢,٦٠م) دەبێت، هەروەها ئەم دوو کۆڵەکەیە هەریەکەیان (٣٠سم) لە گۆشەی سەکۆکە دوورن و جگە لەوەش دووری بەشی دواوەی سەکۆکە نیوە بازنەییە لە دیواری رۆژئاوای هەمان ژوور کە (٢,٢٠م) دەبێت، ئەم سەکۆیە لەرووی زەوییەوە (٩٠سم) بەرزە و درێژی بەشی پێشەوەی (٢,٥م) دەبێت، و لەناوەڕاستی بەشی پێشەوەی سەکۆکە دوو دیواری باریکی بچووک بەرچاو دەکەون، کە پشتەوەی سەکۆکەی کردووە بە سێ بەشەوە درێژی ئەم دیوارانە (٨سم) دەبێت کە بۆ دەرەوە هاتوون و تاقێکیان لەناوەڕاستدا دروست کردووە کە (٢٠سم)پانە و (٨٥سم) درێژە.

لە رۆژهەڵاتی سەکۆکە کە هەردوو گۆشەی پێشەوەی سەکۆکە دەگرێتەوە دوو پایەی شێوە چوارگۆشە دەبینرێت، ئەم دوو پایەیە لەسەر یەک هێڵن لەبەرامبەر دوو پایەکەی رۆژئاوای سەکۆکە و دووری نێوانیان (٣م) دەبێت (بڕوانە وێنەی ژمارە ٢).

درێژی باڵێکی ئەم پایە چوارگۆشانە (١,١٠م) دەبێت و بەرزی ئەوەی لای باکووری (٤٠سم) دەبێت، پێدەچێت ئەم دوو پایەیەش بەهەمان شێوەی ئەوانی دواوە

لەبەشی سەرەوەیان پایەی لوولەیی هەبوویێت، دووری نێوان ئەم دوو پایەیە (٢.٦٠م) دەبێت و دوورییان لە سەکۆکە (١.١٠م) دەبێت دووانەکەی باکووریش نزیکەی (١.٦٠م) لە دیواری باکووری ژووری سەکۆوە دوورن.

بەشێوەیەکی گشتی دەتوانین بڵێین ئەم بەشەی قەڵا شێوەیەکی چوارگۆشەیی هەیە کە ئەمەش هاوشێوەی ژووری پەرستگا زەردەشتییەکانە وەک پەرستگای زەردەشتی لە ئەشکەوتی چوارستوون لە نزیک شاری دهۆک[١٣] (بڕوانە نەخشەی ژمارە -٦-)..

هەروەها ئەو چوار سەکۆیەش لە ئاینی زەردەشتیدا هێمایە بۆ پیرۆزی چوار رەگەزەکە (هەوا، ئاو، خۆڵ، ئاگر)[١٤].



(وێنەی ژمارە (١) سەکۆ و چوار پایەی پەرستگای زەردەشتی، چوار پایەکە هێمایە بۆ چوار رەگەزە پیرۆزەکە (هەوا، ئاو، خاک، ئاگر)

### ٣- ژوورو پاشکۆکانی تر لە پەرستگای قەڵای شیلە:

ئەم بەشە دەکەوێتە رۆژهەڵاتی بیناکە، لە ژووری ئاگری پیرۆزی پەرستگا و چەند ژوورێکی ترو شوورەی رۆژهەڵاتی بیناکە پێک دێت (نەخشەی ٣ -٧).

بۆ پێوانەکردنی پێکهاتەکانی ئەم بەشەی بیناکە لە گۆشەی باکووری رۆژهەڵاتەوە دەست پێدەکەین، سەرەتا لە دیواری رۆژهەڵاتی شوورەی قەڵاکەوە، ئەم بەشە پەیوەندییەکی راستەوخۆی بە بەشەکانی تردوە هەیە، سەرەتا لەو دوو دیوارەوە دەست پێدەکەین کە وەک راگرێک بۆ بەیەکەوە بەستنەوەی ئەو پلیکانانەی کە بۆ سەرکەوتن بۆ پەرستگا بەکاردەهات، کە درێژی



وێنەی ژمارە (٢)

پاشماوەی دیوارەکانی (١.٤٥م) و پانییەکەی (١م) دەبێت، بەداخەوە لێرەدا پاشماوەی پلیکانەکان دیارنییە، بەهۆی ئەوەی کە دزەکانی شوێنەوار خۆڵیان کردۆتە سەر و دەستکاری ئەو بەشەی قەڵایان کردبوو لە ساڵی (١٩٩٤ز)[١٥].

ئەم دوو دیوارە دەکەونە سەر دیواری شووردی رۆژهەڵاتی قەڵاکە درێژییەکەی (٧م) و پانییەکەی (١م) دەبێت، ئەم دیوارە لە هەندێک شوێندا بەبەرزی (٢م) ماوە، ئەم دیوارە لە گۆشەی باکووری رۆژهەڵاتەوە دەست پێدەکات و لە گۆشەی باشووری رۆژهەڵات کۆتایی پێدێت، لەم دوو دیوارەی کە لەپێشدا باسمان کرد دەگەین بە دەروازەیەک کە درێژییەکەی (٤٥سم)و پانییەکەی (٥٠سم) دەبێت. لەم دەروازەیەوە دەچینە سەر بۆشاییەک کە پانییەکەی (١.٦٠م)ە لەوێوە دەگەین بە بەرزاییەک کە پێدەچێت لە پێشدا پلیکانە بوو بێت، بەڵام شوێنەوارەکەی بەباشی روون نییە و بەهۆکاری سروشتی و مرۆیی وێران بووە.

لە بەرزاییەکە دەروازەیەک هەیە کە درێژییەکەی (٦٥سم) دەبێت دەمانگەیەنێتە سەر رێڕەوێک کە درێژ دەبێتەوە تا دەگاتە بەردەم ژووری ئاگری پیرۆزی پەرستگا، ئەم رێڕەوە دەکەوێتە نێوان دیواری دەرەوەی پەرستگاو رووی دەرەوەی دیواری ژووری ئاگرەکە و چەند ژوورێکی تر کە درێژییەکەی (١٧م) و پانییەکەی (١.٣٠م) دەبێت (بڕوانە وێنەی ژمارە ٣).




(نەخشەی ژمارە - ٦)
نەخشەی پەرستگا زەردەشتییەکەی ئەشکەوتی چوارستوون لە نزیک شاری دهۆک.



نەخشەی ژمارە-٧- ژمارەیەک لە ژوورەکانی بەشی رۆژهەڵاتی قەڵای شیلە

دیوارەکانی ناوەوەی ژوورەکە شوێنەواری سووتانیان پێوە دیارە، بەڵام (سەکۆی ئاگر)[*] ئاگردان کە لەم ژوورانەدا لە پەرستگا زەردەشتییەکان هەیە شوێنەواری دیارنییە و لەناوچووە.

لەبەشی باکووری ژوورەکە کونێک یاخود دەروازەیەک هەیە نزیکەی (١.٤م) درێژییەکەیەتی و پانییەکەشی (٤٨سم) دەبێت، کە دەڕوانێتە سەر حەوشەی سەکۆی پەرستگا، لە دیواری رۆژئاوای ژوورەکە کە دەکاتە دیواری پشتی هەمان ژوور کونێک هەیە تیرەکەی (١م) دەبێت لەوانەیە بۆ چوونە دەرەوەی دووکەڵی ئاگرەکە لەو ژوورە بەکاریان هێنابێت، و هۆی کردنەوەی ئاگریش لەم ژوورە ئەوەبوو کە نەدەبوایە تیشکی خۆر بەر ئاگرەکە بکەوێت، چونکە پەیڕەوکەرانی ئایینی زەردەشتی باوەڕیان وابوو کە تیشکی خۆر ئاگری پیرۆز پیس دەکات[١٦].بنمیچی (سەقفی) ئەم ژوورە شێوەیەکی کەوانەیی هەیە بەرزییەکەی نزیکەی (٢م) دەبێت کونێکی تێدایە کە لەوەدەچێت رووخابێت تیرەی ئەم کونە لە (١م) زیاترە، لەلای باکووری ژووری ئاگری پیرۆز دوو ژوور هەیە دیواری باشووری بریتییە لە رووی دەرەوەی دیواری باکووری ژووری ئاگری پیرۆز، درێژی دەروازەکەی (٥٠سم) و درێژی ژوورەکە (٢.٩٠سم) و پانییەکەی (٢.٢٠م) دەبێت، ئەم ژوورە کەمێک لە دیواری باکووری ماوە کە ئەستوورییەکەی (٩٠سم) دەبێت.



(وێنەی ژمارە ٣) دەروازەی دیواری رۆژهەڵاتی قەڵای شیلە.

دەروازەی باشووری رۆژهەڵات کە دەکەوێتە سەر شوورەی رۆژهەڵات و رێڕەوە درێژەکەو دەروازەکەی راستەوخۆ بەرامبەر دەروازەی ژووری ئاگرەکەیە کە دەروازەکەی (٢م)درێژەو پانییەکەی (١م) دەبێت، (بڕوانە وێنەی ژمارە ٤).

ژووری ئاگری پیرۆزی پەرستگاکە لە ناوەوە نارێکەو لەرووی دەرەوە شێوە لاکێشەیی وەرگرتووە (بڕوانە وێنەی ژمارە ٥).

دەروازەی ژوورەکە درێژییەکەی (٨٠ سم) دەبێت و درێژی ژوورەکە (٦.٨٠م) و پانییەکەی (٥.٧٠م) و



وێنەی ژمارە ٤ دەروازەی باشووری رۆژهەڵات.

لە باشووری ژووری ئاگری پیرۆز دوو ژوورو هەیوانێک یاخود ژوورێکی تر لەبەردەمیاندا هەیە، کە دیواری رۆژهەڵاتی دوو ژوورەکە بریتین لە بەشێکی دیواری خۆرهەڵاتی پەرستگای قەڵای شیلە پانییەکەی (١م) دەبێت، ژووری یەکەمیان کە دیواری باکووری لکاوە بەژووری ئاگرەکەو دیواری باشووریشی لکاوە بە ژووری دووەم، درێژی ئەم ژوورە (٤م) و پانییەکەشی (٢.١٠م) دەبێت، بەرزترین پاشماوەی دیوار لەم ژوورەدا (١.٣٠م) دەبێت بەڵام پانی دەروازەکەی کە دەکەوێتە ژوورەکەی بەردەمی (٥٠سم) دەبێت.

ژووری دووەم کە دیواری باکووری بەدیواری باشووری ژووری یەکەمەوەو دیواری باشووریشی بریتییە لە دیواری باشووری پەرستگای (قەڵای شیلە) درێژی ئەم ژوورە (٥.٥٠م)و پانییەکەی (٢.٥م) دەبێت لە لای رۆژئاوا و رۆژهەڵاتی تەسک دەبێتەوە بۆ (١.٨٠م)، و پانی ئەم دیوارەی کە ئەم دوو ژوورەی لێک جیاکردۆتەوە (٩٠سم) و دەروازەی ئەم دوو ژوورەش (٦٥سم) دەبێت، وە بەهەمان شێوە ژوورەکەی تر کەوتۆتە دیواری رۆژئاوای ژوورەکە، ئەم دوو ژوورە هەردووکیان دەڕوانە سەر ئەم هەیوانە یاخود ئەو ژوورەی بەردەمیان کە درێژییەکەی (٧.٢٠م) و پانییەکەی (١.٥٠م) دەبێت، هەروەها ئەم ژوورەش لە رێگەی دەروازەیەکەوە کە درێژییەکەی (١.٣٠م) دەبێت دەچێتەوە سەر (بەشی یەکەمی قەڵا) کە حەوشەی پەرستگای قەڵاکەیە.





(وێنەکانی ٥ بەشێک لە ژووری ئاگری پیرۆز).

ژووری دووەم تەنها دەتوانین شوێنەواری بناغەکەی ببینین کە درێژی و پانی ژوورەکەیان بۆ دیاری کردووین کە (٤م) بە (٣م) دەبێت و دیواری باکووری ئەم ژوورە بە دیواری باکووری حەوشەی سەکۆکەوە لکاوە

کە هەردووکیان نزیکەی (١١.٥٠م) لە شوورەی باکووری قەڵاکەوە دوورن، لەوە دەچێت ئەم دوو ژوورە لەلایەن دانیشتوانەکانی قەڵا بۆ هەڵگرتنی کەلوپەلەکان وحەسانەوە بەکارهاتبێ،

ئەم دوو ژوور و هەیوانە لە وانەیە لەلایەن دانیشتوانی پەرستگاکەوە بۆ مەبەستی هەڵگرتنی کەلوپەل و حەسانەوە بەکارهاتبێ. ئەوەی لێرەدا ماوە ئاماژەی پێبدەین لە بەشەکانی قەڵای شیلە بریتییە لە بوونی شوێنەواری ژوورێک یاخود دوو ژووری تر لەسەر بانی ئاگری پیرۆز، لەبەرئەوەی ئەم شوێنە تووشی وێرانکارییەکی زۆر بووە بۆیە ناتوانرێت بەتەواوی شێوەو پێوانەی ژوورەکان وەربگیرێت و نەخشەیەکی راستیان بۆ دابنرێت.

## کەرستەی بیناسازی بەکارهێنراو لە دروستکردنی قەڵای شیلەدا:

ئاشکرایە کە سروشت کاریگەری هەیە لەسەر شێوازی دروستکردن وبیناسازی، چونکە کاریگەری سروشت و شێوازی دروستکردنی قەڵاو پەرستگاو خانووبەرە جیاوازە لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر، بەهۆی کاریگەری سروشتی ناوچەکە ئەو کەرستە سروشتییانەی کە لە ناوچەکەدا هەیە وەک، بەرد و دارو جۆری گڵەکەو سەرچاوەی ئاو، ئەمانە کاریگەی راستەوخۆیان هەیە لە هەموو سەردەمەکان لە کاری بیناسازیدا[17].

لە سەردەمی ساسانییەکاندا خشتی قوڕو گەچ و قسڵ و بەرد وەک کەرستەی سەرەکی لە بیناسازی بەکارهاتوون، سەرەڕای ئەوەش گەچ وەک مادەیەکی پێکەوەلکێنەر بۆ دیوارەکان و هەروەها بۆ جوانکاری و زەخرەفەکردن بەکارهاتووە[18].

پێکهاتەکانی کەرستەی بیناسازی لە قەڵای شیلە بەردی رێک (مهندم) و بەردی نارێک و گەچ و قسڵ بووە، جێی باسە کە هەمان کەرستە بەکارهاتووە لە قەڵای بازیان، ئەمەش ئەوەمان بۆ روون دەکاتەوە کە کاریگەرییەکی راستەوخۆی ناوچەکە هەبووە لەسەر بەکارهێنانی ئەم کەرستانە لە بیناسازیدا[19].

رووی ناوەوەی دیوارەکانی پەرستگای قەڵای شیلە بە گەچ ماڵ کراوە، هەروەها بەشێکی کەمیش لە رووی دەرەوەی دیوارەکانی، سەبارەت بە دەرگاو پەنجەرەکانی ئەم بینایە هیچ زانیارییەکمان لەبەردەستدا نییە بەهۆی ئەوەی زۆربەی دیوارەکانی رووخاون و هەروەک ئاماژەمان پێدا بۆیە ناتوانین شێوەی دەرگاو پەنجەرەکان و ئەو کەلوپەلانەی لێی دروست کراوە دیاری بکەین، سەبارەت بە بنمیچ و بانی (سەقف)ی بیناکە هەروەک لە باسی پێکهاتەکانی تری بیناکە روونمان کردەوە لەوانەیە بەشێوەی گومەزی دروست کرابن کە ئەمەش لە تایبەتمەندییەکانی بیناسازی ساسانییە[20]، بەڵام لەبەر ئەوەی لەناوچووە نازانرێت چۆن بووە.

## کاریگەری ئاینی زەردەشتی لەسەر لایەنی بیناسازی:

ئاینی زەردەشتی بەردەوام بوو لە پەرسەندن و بلاوبوونەوە بە هەموو ناوچەکانی ئێران و هەموو ئەو ناوچانەی کە کەوتبوونە ژێر دەسەڵاتی ئیمپراتۆریەتی ئەخمینی(*) (٥٥٠ - ٣٣١ پ.ز) چونکە ئاینی زەردەشتی وەک ئاینی رەسمی دەوڵەت دانرا[21]، ئەم بارە بەردەوام بوو تا هێرشی ئەسکەندەری مەقدۆنی(**) بۆ سەر ناوچەکەو داگیری کرد، هەروەها کاتێک ساسانییەکان لە ساڵی ٢٢٦ زاینی دەسەڵاتیان گرتە دەست جارێکی تر ئاینی زەردەشتیان وەک ئاینی رەسمی دەوڵەت ناساند.

## مێژووی پەرستگاکەی قەڵای شیلە:

زەردەشتییەکان دوای بلاوبوونەوەی ئاینەکەیان لە زۆربەی شوێنەکاندا ئاتەشگەیان دروست کرد، کە لە ناوەوەی ئاگردانێکی تایبەتییان بۆ ئاگرکردنەوە هەبوو، چونکە ئاگر بەهێمای خۆر دادەنرێت خۆریش بەسەرچاوەی رووناکی و ژیان دادەنرێت و هەروەها هێمای خوداوەند ئاهورامەزدایە. ئەو کەسەی کە سەرپەرشتی ئاگرەکەی دەکرد پێی دەوترا (ئاترۆپان) کە بەمانای ئاگروان دێت، و بێجگە لەو کەسێکی تر بۆی نەبوو بچێتە ژووری ئاگرەکە، ئاگردانەکان هەمیشە بەبۆنی بخور و سووتەمەنییە بۆندارەکان بۆن خۆش بوون، و بەپارچە دارێک کە لە مەراسیمێکی تایبەتی خاوێن کرابۆوە ئەم دیو و ئەو دیویان بە ئاگرەکە دەکرد و چاودێرییان دەکرد، ئەم جۆرە دارانەیان بەزۆری لە جۆرە رووەکێک بەناوی (هژانە) آپنا ئامادە دەکرد[22].

ناوچەکانی کوردستان و ناوەراستی میسۆپۆتامیا چەندین پەرستگای زەردەشتی لێبوو، ئەویش بەهۆی بوونی دەسەڵاتی

ئیمپراتۆریەتی ساسانی کە ئاینی زەردەشتی ئاینی رەسمی دەوڵەت بوو وەک پەرستگای قەڵای شیلە لە گوندی شیلە و پەرستگای زەردەشتی بازیان و پەرستگا سەر والاکانی (المعابد المكشوفة) نەوێ لە شاخی سورێن لەناوچەی شارەزوور و پەرستگای چوارستوون لە دهۆک و بیناسێ لە شاری زاخۆ و چەندین پەرستگای تر لەناوچە جیاجیاکانی کوردستان.[23] و لەناوچەی ئەبوغرێب لە (تل العليمي) لە ناوەراستی میسۆپۆتامیا توانرا لە ئەنجامی کاری پشکنیندا شوێنەواری پەرستگایەکی زەردەشتی بدۆزرێتەوە[24]، پەرستگا زەردەشتییەکان لە دوای رووخانی ئیمپراتۆریەتی ساسانی لە ساڵی (٦٣٩ ز) زایینی و بڵاوبوونەوەی ئاینی ئیسلامیش لەناوچەکەدا هەر مابوون و تووشی سووتان وکاولکردن نەهاتبوون، چونکە هەروەک پێشتر ئاماژەمان پێدا موسوڵمانەکان پەیڕەوکەرانی ئاینی زەردەشتییان بە خاوەنی کتێب و ئاینی ئاسمانی لە قەڵەم دا، ئەم بارە بەردەوام بوو تاکو سەردەمی خەلافەتی عەباسییەکان، بەڵام خەلیفە مهدی* فەرمانی بە وێرانکرنی پەرستگا زەردەشتییەکانی سنووری دەسەڵاتی خەلافەتەکەی دا[25].

پێدەچێت کە پەرستگای زەردەشتی قەڵای شیلە یەکێک بووبێت لەو پەرستگایانەی کە بەر ئەم شالاوی سووتاندن و رووخاندنە کەوتوون، ئەوەی زیاتر پاڵپشتی ئەم باسەی سەرەوەمان دەکات، دۆزینەوەی پارچە دراوێکی زیوییە لە ئەنجامی کنەو پشکنینی شوێنەواری لە پەرستگای قەڵای شیلە، کە مێژووەکەی دەگەرێتەوە بۆ سەردەمی خەلیفە (ئەبوو جەعفەر مەنسور)[26]، دووەم خەلیفەی عەباسییەکان کە ماوەی دەسەڵاتی لەنێوان ساڵی (١٣٦-١٥٨ کۆچی بوو)[27] هەروەها چەند دراوێکی ئەمەوی و عەبباسی لەقەڵای بازیان دۆزراوەتەوە کە بۆ هەمان سەردەم دەگەرێتەوە.

کاری کنەو پشکنین (التنقيبات) لە شوێنەواری قەڵای شیلە تیمێک پێکهات لە بەرێوەبەرایەتی گشتی شوێنەوار بۆ کاری کنەو پشکنین لە شوێنەواری پەرستگای قەڵای شیلە، کاری کنەو پشکنین لە بەرواری ١٧ / ١٠ /١٩٩٨ لە گردی قەڵای شیلەی گەورە دەستی پێکرد و ماوەی دوو هەفتەی خایاند ئەمەش زیاتر چینە بەرزە دەرکەوتووەکەی ئەو دیوارانەی گرتەوە کە دەکەونە بەشی باکوورو خۆرهەڵاتی قەڵاکە[28]، کنەو پشکنینەکە رووبەرێکی (٢٦×٢٤) مەترەی گرتەوە کە توانرا پاشماوەی پەرستگایەکی زەردەشتی دەربخرێت لەگەڵ چەندین پارچە سواڵەتی جۆراوجۆر بدۆزرێتەوە[29].

**گرنگترین پارچە شوێنەوارە دۆزراوەکان لە قەڵای شیلە:**

١- مۆرێکی لوولەیی: لە بەردی مەرمەری سپی دروست کراوە و درێژییەکەی (٢.٥ سم)و پانییەکەی (٢.٥سم) دەبێت بەشی سەرەوەی شێوەی نیوە بازنەییە و دەمەکەی لە ناوەڕاستیدا کونێکی بازنەیی کچکەی تێدا هەڵکەندراوە، قووڵییەکەی (١.٥سم) دەبێت، ئەم مۆرە شێوەی چاوێکی لەسەر هەڵکەندراوە، ئەم مۆرە لەکاتی کنەو پشکنیندا لەدەرگای دەرەوەی حەوشەی پەرستگاکە لە قووڵایی (٤٠سم) دۆزرایەوە[30] ئەم مۆرە دەگەرێتەوە بۆ سەردەمی جەمدەت نەصر (٣١٠٠ - ٢٩٠٠ پ.ز).

٢- مۆرێکی نیمچە خڕ لە ناوەڕاستیدا کون کراوەو لە بەردێکی بەنرخ دروست کراوە و هەندێ نەخشی سروشتی لەسەرە.

٣- پارچە دراوێکی زیوی کۆن کە بۆ سەردەمی خەلیفە (ئەبو جەعفەری مەنصور)ی عەبباسی دەگەرێتەوە[31].

٤- چەقۆیەکی باریکی درێژکۆڵە ژەنگی پێوەیە لە ئاسن دروست کراوە، درێژی دەمەکەی (١٠سم) و درێژی دەسکەکەی (٦سم) دەبێت[32].

٥- بەردی بەردەقانی بریتییە لەو تۆپەڵە خڕانەی کە لەبەرد یان لە قوڕ دروست کراون و قەبارەیان جیاوازە زۆرتر بۆ شەڕکردن و هەندێک جاریش بۆ راوکردن بەکارهاتوون، شێوازی بەکارهێنانی بەجۆرێک بووە کە بەهۆی پارچە قوماشێک یاخود پارچە پێستێکەوە کە هەردوو سەرەکەی بەدەست دەگیرێت و بەردە خڕەکەی دەخرێتە ناوەڕاستی و بە ئاراستەی ئامانجی شەڕکەر دەهاوێژرێت[33]، ئەم جۆرە لە کۆندا بەشێوەیەکی بەربڵاو بەکارهاتووە و لەزۆربەی ئەو ناوچانەی کە مێژووەکەیان دەگەرێتەوە بۆ دوای چاخی بەردینی نوێ ئەم بەردە خڕانە بەرچاو دەکەون،

ســـــەبارەت بە پارچە پەڕۆ و پێستەکانیش کە وەک لە پێشدا باسمان کرد بۆ هاوێشتنی بەردە خــرەکــان بەکــارهاتوون لە هیچ ناوچەیەکی شوێنەواری نەدۆزراوەتەوە بەهۆی ئەوەی کــە لەمــادەی ئەندامی دروست کــراون و زوو دەفــەوتێن و بەرگەی هۆکاری سروشتی باران و گەرما و سەرما ناگرن و بەتێپەڕبوونی کــات دەفــەوتێن[٣٤]، ئەم بەردانە لەکــاتی کــاری کنەو پشکنین لەو شــوێنە لە ژووری ئاگــری پیــرۆزی پەرستگا لە قوولایی مەترێک لە ژێر گڵ دۆزراونەتەوە، کـــە پێـــدەچێت لەکــاتی کــاولکردن و ســووتاندنی پەرســـتگای قـــەڵای شـــیلە بەکارهاتبن[٣٥].

**٦ ـ بەردە کرێژنەی دەرگا:** لەکاتی کــاری کنەوپشکنین لە پەرســتگای قەڵای شیلە چەند بەردێکی رووپانی شـــێـــوە بازنەیی دۆزراونەتەوە کـــە لەناوەڕاستیاندا چاڵێکی بچووک هەیە بۆ ئەوەیە کـــە بتـــوانرێت بە ئاسانی جووڵە بە دەرگاکانی بیناکە بکرێت و بکرێتـــەوە کـــە ژێرەوەی دەرگاکانیان لەسەر دانراوە، ژمارەی ئەو بەردانە پێنج بەردە شـــێـــوەیان بازنەییەو قەبارەیان جیـــاوازە، و هەروەها پارچە خشتێکی سوورکراوە دۆزراوەتەوە کە شێوەیەکی لاکێشەیی هەیەو بۆ هەمـــان مـــەبەستی بەردە گرێژنەکان بەکارهاتووە[٣٦].

**٧- سواڵەت (گڵێنە):**

ژمارەیەکی زۆر لە سواڵەت لە قەڵای شیلە لەکاتی کنەوپشکنین لە بەشە جیاجیاکانی قەڵاکە دۆزراونەتەوە، بەڵام گـــــــــۆزەیەکی تەواو نەدۆزراوەتەوە.[٣٧] بەشـــێـــوەیەکی گشتی پارچە سواڵەتەکان لە دەم و قوڵف و بنکە و پارچەکانی تری گۆزە پێکدێت، سـەبارەت بە رەنگی ئەو قوڕەی کە سواڵەتەکانی لێ دروست کــراوە بریتین لە (ســوور، قــاوەیی، رەش، زەرد، سووری مەیلەو قاوەیی، زەردی مـــەیلەو ســـوور، قـــاوەیی رەشـــبـــاو)، و هەروەها ســـەبارەت بەنەخشی سەر سواڵەتەکان بەشێکی سواڵەتەکان سادەن و نەخشیان لەسەر نییە، تەنها چەند دانەیەکیان نەبێت کە نەخشـەکـانیـان بریتین لە چەند هێڵێکی وردو، هەروەها هەندێک لە سواڵەتەکان ژمارەی هێڵەکانی شێوە بازنەیین، و هەندێک لە هێـڵـەکـان شێوەی ژمارە هەشتی (٨) هەیە، کە پێـــدەچێت بە دەست و بە نینۆک نەخشەکانی دروست کرابن[٣٨]، لێرەدا هیچ وێنەیەکـمان بەکـارنەهێناوە، چونکە نە کەلوپەلەکانمان دەستکەوت نە وێنەکـانیشـمان دەستکەوت تا وێنەیان بگرین و بەشێوەیەکی باشتر لێی بکۆڵینەوە و سوودی لێ ببینین.

وا دەردەکـــەوێت کـــە لەکـــاتی کنەوپشکنین هیچ نووسراوێک لەسەر دیوارەکـــانی ئەم قـــەڵایە بەدی نەکرابێت، و پێدەچێت ئەم قەڵایە لە سـەردەمی ساسانییـەکـان دروست کرابێت یان نۆژەن کرابێتەوە، هەروەها بە بەراوردکــردن لەگــەڵ پەرســـتگا زەردەشتییەکانی تر کە لە کوردستاندا هەن، تارادەیەک بۆمان روون دەبێتەوە کـــە ئەم بینـایە بریتی بووە لە پەرستگایەکی زەردەشتی و لە هەمان


وێنەی ژمارە (٦)

کاتدا چەند بەشێک هەیە وەک قولە رووخاوەکانی شوورەی بیناکە کە بۆ مەبەستی سەربازی بەکارهاتوون، ئەمەش بۆ پاریزگاری و پاراستنی ئەو کـەلوپەلانەی کـە وەک قـوربانی و دیاری پێشکەش بە پەرستگا دەکران یاخود بۆ پارێزگاریکردن لە خودی پەرستگاکە و رێگا بازرگانییەکان. بڕوانە وێنەی ژمارە (٦).

لێـــرەدا هیـــواداریـن کـــە ئەم شوێنەوارە گرنگە کنەو پشکنینێکی تەواوی بۆ ئەنجـــام بدرێت، و هەوڵ بدرێت بناغـەکـەی دەربخـرێت و ئەو بەشانەی کە لەبیناکەدا ماون کـاری نۆژەنکردنەوە (صیـانە)ی بۆ بکرێت تاوەکو زیاتر لە ئێستا تووشی داڕمان و رووخـان نەبێت، بۆ ئەوەی ببێـتـە شوێنێکی شوێنەواری گەشتوگوزاری.

**لیستی سەرچاوەکان:**

١- عومەر لوقمان وسو، لێکۆڵینەوەیەکی زانستییە دەربارەی توانستە جوگرافییە گەشتوگوزارییەکانی قەزای کۆیە، ماستەرنامە، بلاو نەکراوەتەوە، کۆلێژی

پەروەردە- زانکۆی کۆیە، (کۆیە: ٢٠٠٦) لا١٤١.
٢- شوێنەوارناسێک: ئاگری زەردەشتی سپی لە قەڵای شیلە، گۆڤاری هەزارمێرد، ژمارە ٦، (سلێمانی: ١٩٩٨) لا٤٢.
٣- بەڕێوەبەرایەتی شوێنەواری کۆیە، راپۆرتی بەسەرکردنەوەو دۆزینەوەی شوێنەواری قەڵای شیلە، بەدەست نووسراوەو بلاو نەکراوەتەوە. (کۆیە - ٢٠٠٣).
٤- شوێنەوارناسێک: هەمان سەرچاوە: لا١٤٣.
٥- هەمان سەرچاوە: لا١٤٣.
٦- شێنەوارناسێک: هەمان سەرچاوە، لا١٤٣
٧- عومەر: هەمان سەرچاوە، لا١٥٢.
٨- بەڕێوەبەرایەتی شوێنەواری کۆیە: هەمان سەرچاوەی پێشوو.
بەگوێرەی ئەو سەردانانەی کە توێژەر لە بەروارەکانی (١٨/١/٢٠٠٧)و هەروەها لە ١١و ١٢و١٨ /٢/٢٠٠٧ ئەنجامی داوە بۆ ناوچەی لێکۆڵینەوەکە توانیمان ئەو زانیارییانەی سەرەوە تۆماربکەین.
٩- الصالحي: واثقي اسماعيل، العمارة قبيل الاسلام:حضارة العراق، (بغداد، ١٩٨٠) ج٣، ص٢٥١.
١٠- شوێنەوار ناسێک: هەمان سەرچاوە، لا١٤٥
١١- شوێنەوارناسێک: هەمان سەرچاوە لا١٤٧.
١٢- الصالحي: المصدر السابق، ص٢٥٠.

١٣- البرواري: حسن أحمد قاسم:، رموز الالهة في منطقة بادينان، دراسة حضارية، رسالة ماجستير غير منشورة، كلية الاداب، جامعة صلاح الدين / اربيل، (٢٠٠٢) ص٧٨.
١٤- نفس المصدر السابق.
١٥- بەڕێوەبەرایەتی شوێنەواری هەولێر، هەمان سەرچاوە.
* سەکۆی ئاگر یان ئاگردان لە هەموو پەرستگا زەردەشتییەکان هەبووە، و لەسەر دراوی ساسانییەکان وێنەکەی نەخشێنراوە، کە ئاگردانەکە لە ناوەڕاستە و دوو پاسەوانیش لە هەردوو لای ئاگردانەکەوە وەستاون، بڕوانە: ناهض عبدالرزاق، المسكوكات الاسلامية (الكويت، ١٩٧٨) ص١٥.)
١٦- ئابادانی: عبدالله مبلیخی، مێژووی ئاینی زەردەشت، وەرگێڕانی وریا قانع، (سلێمانی، ٢٠٠٤) چ٢، لا١٢١.
١٧- بقاعين: حنا، مجمع الغمارة (بغداد: ٢٠٠٣) ج١، ص١٤٣.
١٨- صالحي: المصدر السابق: ص٢٤٨.
١٩- رشيد: كمال، موقع بازيان ـ دراسة تحليلية لمخطط البناء والعناصر المعمارية، مجلة هزارميرد، عدد ١٩ (سليمانية: ٢٠٠٢) ص١٩٩.
٢٠ - صالحي: المصدر السابق: ص٣٥١.
٢١- توركاييف: المصدر السابق، ص٧٤.
* ئیمپراتۆریەتی ئەخمینی لەدوای رووخانی ئیمپراتۆریەتی میدی دەسەڵاتی گرتە دەست کە ماوەی دەسەڵاتەکەی لە نێوان (٥٥٠ - ٣٣١ پ.ز)، عامر سليمان، أحمد كامل فتيان، محاضرات في التارخ القديم، (الموصل: ١٩٧٨) ص٢١١.
* شوێنەوارەکانی دەربەندی بازیان، دەکەوێتە سەر رێگای شاری کەرکوک و سلێمانی بەدووری نزیکەی (٥٤ کم) لە سلێمانی کە دەکەوێتە دەربەندی بازیان.
٢٣- یوسف: عبدالرقیب: شوێنەوارەکانی نەوێ لە شاخی سوورێن، ١٩٩٤، لا١٦،١٨، ٢٢.
٢٤- الجنابي: كاظم. اكتشاف معبد النار تبر العليمي (سومر: م ٢٢) ١٩٦٦، ج ١و٢) ص٦٤.
* خەلیفە مهدی: سێهەم خەلیفەی عەبباسی بوو کە لەساڵی ١٥٨ ک / ٧٧٥ز دەسەڵاتی وەرگرت و لە ساڵی ١٦٩ک/ ٧٨٥ز لەرێگەی چوونی بۆ حەج وەفاتی کرد. بڕوانە فاروق عمر فوزي: الخلافة العباسية (الاردن، ٢٠٠٣)ج١، ص١١٧.
٢٥- ئابادانی: هەمان سەرچاوەی پێشوو، لا١٥١.
٢٦- شوێنەوارناسێک: هەمان سەرچاوە، لا١٥١.
٢٧- فوزي: المصدر السابق، ص٧١.
٢٨- شوێنەوار ناسێک: هەمان سەرچاوە، لا١٤٣، ١٥٨ی.
٢٩- هەمان سەرچاوەی پێشوو: لا١٤٤.
٣٠- هەمان سەرچاوەی پێشوو: لا١٥١.
٣١- شوێنەوارناسێک: هەمان سەرچاوە، لا١٥١.
٣٢- هەمان سەرچاوەی پێشوو: لا١٥١
٣٣- هەمان سەرچاوەی پێشوو: لا١٥١
٣٤- دراسات في تأريخ العراق وحضارته (الجيش والسلاح)، (بغداد: ١٩٨٨)، ج١، ص٣٨.
٣٥- نفس المصدر السابق: ص٣٩.
٣٦- شوێنەوار ناسێک: هەمان سەرچاوەی پێشوو: لا١٥٢
٣٧- هەمان سەرچاوەی پێشوو: لا١٥٥
٣٨- هەمان سەرچاوەی پێشوو: لا١٥٢
٣٨ـ شوێنەوار ناسێک: هەمان سەرچاوەی پێشوو، لا١٥٣ و ١٥٤.

**سەرچاوە:**

گۆڤاری سوبارتو /ژمارە ٢، پایزی ٢٠٠٨

# پشکنینی موگناتیسی بۆ شوێنگەی (گردی قسرا)

**فازیل عەلی غالب**

کاری دەستنیشان کردنی شوێنەوارە کۆنەکان، لەوانەیە کارێکی ئاسان بێت. ئەویش لە میانی سەرنجدان و سەیرکردنی ئەو شوێنانەی، کە لە سەر تەختایی زەوی دیارن و ئیشارەتی هەبوونی شوێنەواری دەدەن. هەروەها هەندێ بەڵگەی دیکە، کە بە سوودن لەو لایانانە: بە تایبەتی زانینی هەندێ زانیاری گرنگ لەبارەی وردەکاریی شاردراوە و دەستنیشان کردنی شوێنیان لە سەر رووی زەوی، لە کارێکی ورد و زەحمەتدا، کە پێویستی بە کاری هەڵکەندنی ورد و لەسەرخۆ هەیە.....

بە کارهێنانی شێواز و رێگەی (جیۆفیزیکی) لە وانەش: (رێگەی موگناتیسی)، کە لە سالانی رابردوودا، بوونە شێوازێکی باو لە کارەکانی دەستنیشان کردنی روخساری سەرەکی شوێنەوارەکان. هەروەها دەستنیشان کردنی چۆنیەتی بڵاوبوونەوەی جوگرافی ئەو دیاردانە لە ژێر زەوی، پێش دەست پێکردنی پرۆسەی هەڵکۆڵینی، کە ئەوەش کات و ماندووبوون و پارەیەکی زۆر دەگەڕێنێتەوە.

رێگەی جیۆفیزیکی بە شێوەیەکی گشتی، پشت بەوە دەبەستێ، کە شوێنەوارەکە لە باری ئێستای، وەکو کۆکردنەوەیەکی نارێک لە مادە و کەرستەی جۆراوجۆردا: (دیوارەکان، فرنییەکان، کەند و کەلێن و کەلەبەر، کە پڕن لە خۆڵ و گڵی نوێ). هەر مادەیەک وەکو (کەرپووچ و قوڕو بەردەکان) ئەوانە نیشانەی فیزیکی خۆی هەیە، کە جیاوازی هەیە لەگەڵ ئەوانی تر، شێوازی جیۆفیزیکی، پشت بەو جیاوازییانە دەبەستێ، کە لە سیفاتەکانیدا هەیە، بۆ ئەوەی سوودی لێ وەرگیرێ لە کاتی پرۆسەی دەرخستن و پشکنین، بە تایبەتی لە کاتی پوختکردنی ئەو سیفاتانەی کە پشتیان پێ بەستراوە، لە لایەنی هەستیاری موگناتیسی (لە رێگای موگناتیسییەکەی) و چڕی (ڕاکێشانی) و گەیاندنی کارەبایی (لە رێگای کارەبایی) و خێرایی شەپۆلەکانی دەنگی (لە رێگای زلزالییەکەی).

لەبارەی توێژینەوەی ئێستا، رێگای موگناتیسییەکەی بەکار هات، بەوەی کە ئەو کەرەستە و شتانەی شاردراونەوە، حەساسیەتی

جۆراوجۆری هەیە لە گەڵ ئەو موگناتیسە سروشتییەی لە ناو زەویدا هەیە. لە دواییش هەموو شتێ خاسیەتی موگناتیسی تێدا هەیە، بەڵام ڕێژەی لە ماددەیەک بۆ ماددەیەکی تر دەگۆڕێ. لە لایەنی ئاستی هێزی موگناتیسییەکەی، لە ڕێگای پێوانەکردنی ئەو ڕێژەیە، بە بەکارهێنانی دەزگای ورد و هەستیار و دانانی لە سەر ئەو شوێنانەی، کە کاری پشکنینی لێ دەکرێ، ئەلێرە زۆری و کەمی ڕێژەی موگناتیسییەکەی بە دیار دەکەوێ.

کەرپووچی بیناکردن، کە لە واقیعدا ماددەیەکە پێش زەمەنێکی دیارکراو سووتێندراوە، بەڵام دوای ساردکردنەوەی، هەندێ خاسیەتی موگناتیسی هەر تێدا دەمێنێ، لەگەڵ تێپەڕبوونی زەمەنێک، ئەو خاسیەتە هەر دەمێنێ، بەڵکو زیادبوونی ڕێژەکەی، بەوەش موگناتیسییەکەی بەرز و توند دەبێت و ئاسایی نابێت، هەروەها شوێنی فرنییەکان (سووتێنەرەکان) و پارچە ئاسنەکان و دیوارە بەردییەکان، کە جیاوازە لەگەڵ ئەو گڵ و خۆڵەی دەوروپشتی، کە حەساسیەتی موگناتیسی بەرزی هەیە (Althen، ١٩٧٤)، لەو دەرئەنجامانەی پشکنین و دۆزینەوەی شوێنەوارەکان لە ڕێگای موگناتیسی بەڵگەیەکە لە سەر قەبارە و قووڵی و بڵاوبوونەوەی ئەو کەرەستە شاردراوانە و پلەی موگناتیسییەکەی (Scollen، ١٩٧٢).

کاری پشکنینی موگناتیسی لە شوێنەوارێکی ناسراو ئەنجامدرا، ئەویش (تلە قصرا)یە، کە دەکەوێتە شارۆچکەی (عەنکاوا- لە پێش کلێسەی مار گۆرگیس) - (دیمەنی - ١-)، لە ساڵی ١٩٤٥ بۆ یەکەم جار لەوشوێنە، لە لایەن فەرمانگەی شوێنەواری کاری پشکنین کراوە، ئەنجامەکەشی ئەوە بوو، کە بۆ سەردەمی ئیمپراتۆریەتی ئاشوورییەکانیان گەڕاندەوە (٩١١- ٦١٢ پ.ز. (بەڵام کنەوپشکنینەکانی بەشی شوێنەواری زانکۆی سەلاحەدین (٢٠٠٤- ٢٠٠٥) دەریخست کە تل قەصر شوێنەوارەکەی بۆ سەردەمی وەرکا (سۆمەری کۆن) و خوری و میتانییەکان و ئاشوورییەکان دەگەڕێتەوە)*.

شوێنەکەش لە (بەرزاییەکی هێلکەیی) پێکدێت، بە بڕی (٦)م لەو زەوییەی دەوروپشتی بەرز دەبێتەوە، دەوروبەرەکەی نزیکەی (٢٠٠) مەترە، بەڵام ئەو دەوروبەرە لە کەمبوونەوەدایە، بەهۆی کارەکانی بنیادنان، بە تایبەتی لەو ساڵانەی دواییدا.

**بەجێهێنانی خانەیی:**

ئامێری پێوانەکردنی هێزی موگناتیسی (پرۆتونی) - بۆدیمەنی ٢ - بەکار هات، وردەکارییەکەی دەگاتە (خانەی گاما). ئەو وردییە لەگەڵ ئەو جۆرە کارانە دەگونجێ، تیایدا خاڵەکانی پێوانە، بە شێوەیەکی تۆڕی ڕێکوپێک دابەش کراوە. مەودایەک هەڵبژێردرا لە نێوان خاڵێک و خاڵێکی تر، ئەویش (٢) مەترە، کە مەودایەکی گونجاوە لەگەڵ لێکۆڵینەوەکانی شوێنەواری. هەروەها، یەکێک لەو خاڵانە هەڵبژێردرا، بۆ ئەوەی ببێتە وێستگەیەک، وەکو شوێنی گەڕانەوە یان سەرچاوە، بۆ جێبەجێکردنی پێوانە، بۆ چەندین جار، یەک لە دوای یەک بە درێژایی ماوەی کارکردن، بۆ سەلماندنی مەودای گۆڕانی بواری موگناتیسی لە یەک شوێندا، کە لە دوایی سوود لەو زانیارییانە وەردەگرن، هەر خاڵێک لەو خاڵانەی لە کاتی پێوانەکردنی، سێ خوێندنەوەی لێ وەرگیرا، بۆ ئەژمارکردنی تێکڕایی، بۆ ئەوەی بگەنە وردەکارییەکی باشتر، ژمارەی خاڵەکان (١٤٦) خاڵە، لە نێوانیان (وێستگەی گەڕانەوە).

**پرۆسەی چاککردنەوە:**

ڕووپێوکردنی جیۆفیزیکی گشتی، بە (٣) قۆناغدا تێدەپەڕێ. دەتوانرێ یەک لە دوای یەک کورت بکرێتەوە، ئامانجیش لەو کارە، هەڵبژاردنی ڕێگەی ڕووپێوی گونجاو و دانانی بەرنامەیەکە، لە دواییش کۆکردنەوەی زانیارییەکان و چاککردنەوەیان یان چارەسەرکردنیان بە شێوەیەک بەرەو قۆناغی کۆتایی بڕوات. پرۆسەی ڕاڤە و لێکدانەوەکە پشت بە چۆنیەتی دیارکردنی زانیارییەکان دەبەستێ.

لەبەرئەوەش، ئەو زانیارییە موگناتیسییانە، کە خوێندنەوەیان بۆ کرا لە قۆناغی پێش تۆمارکردنیان، پێویستە چارەسەر و چاککردنەوەیان بۆ بکرێ. بۆ تێگەیشتن لە پرۆسەی چاککردنەوە، دەبێ ئەوە بڵێین، کە بواری موگناتیسی ناو زەوی، بوارێکی ناجێگیرە و لە گۆڕاندایە لە گرنگی و هێزەکەی، بەدرێژایی زەمەنەکەی، واتە لە میانی چەند چرکە و خولەک و کاتژمێر و رۆژ و ساڵدا گۆڕانی بە سەر دێ، لەبەرئەوەش، دووبارەکردنەوەی خوێندنەوە لە وێستگەی گەڕانەوە، ئەوە پێودرێکە بەڵام، گۆڕان کاتەکانی پرۆسەی پێوانە، یان لە کاتی پرۆسەی چاککردنەوەی (رۆژانە)، لە رێگای رەسمکردنی چەماوە تایبەتییەکانی کە پێی دەڵێن (Siurnal Curve)، هیچ بوارێک نییە بۆ باسکردنی وردەکارییەکانی (دیمەنی - ٣ -)، ئەو چەماوانە، چاککردنەوەی تر هەیە، باسکردنیان سوودی نییە.

دەبێ ئیشارەت بە تێبینییەکی زۆر گرنگ بدەین، ئەویش پێوانەی موگناتیسی، دەبێ دوور بێ لە ناوچە شارستانییەکان، کە پڕن لە سیم و وایەرەکانی کارەبایی و کەرەستە ئاسنییەکان، کە لە کارەکانی بیناکردن و بۆرییە شاردراوەکان و ئۆتۆمبێلەکان، کە هەر هەموویان خاسیەتی موگناتیسیان تێدایە و دەبنە هۆی تەشویش و تێکدانی خوێندنەوەکان، بەڵام ئەو جۆرە تێکدان و تەشویش کردنە، بواری کردنەوەی نییە، لەبەرئەوەی ناوچەی خوێندنەوەی ئێستامان، دوور نییە لەو تەشویشانە، هەر لەبەر ئەوەش پێشبینی هەندێ هەڵەی هۆکاری دەکەن.

## پێشاندانی زانیارییەکان:

واتە چۆنییەتی دیارکردنی زانیارییەکانی (ژمارەی) چاککراو، بە شێوەیەک راڤەکردن و لێکدانەوەیان ئاسان بکات و بەستنەوەیان لەگەڵ ئەو بابەتەی لە ژێر خوێندنەوەدایە، رووپێوکردنە جیۆفیزییەکان (لەوانەش موگناتیسییەکان)، یان لە سەر رێژەی راست بێت (ئەلێرە زانیارییەکان دەبنە خوێندنەوەی موگناتیسی بەرامبەر دوورییەکەی)، لە سەر شێوەی پروفایل (Profile) رەسم دەکرێ، وەکو چەماوەیەکی رەسمکراو بە دیار دەکەوێ، لە دیمەنی - ٦ -، یان دەبێتە چەند وێستگەیەکی دابەشکراو لەسەرشێوەی تۆڕێک، هەروەکو لەو لێکۆڵینەوەی ئێمەدا هاتووە، لا بردنی زانیارییە چاککراوەکان کە لە سەر وێستگەکانن (واتە خاڵی پێودر کردن)، لە سەر شێوەی نەخشەی (کنتوربە) رەسم دەکرێ، لە روخسارە گشتییەکەی بە نەخشە تۆپۆگرافییەکەی دەچێ، هێڵە (کەنتورییەکەی)، کە بریتییە لە هێڵێکی یەکسانی بەهایەکەی (واتە بەهای موگناتیسی) ئەو نەخشەیە ئامادەیە بۆ لێکدانەوە لە لایەن کەسی پسپۆر.

## شیکردنەوەی زانیارییەکان:

پرۆسەی شیکردنەوە (Interpretation) ئەویش گۆڕینی ژمارەکان و نەخشەکان بۆ چەمکێک، کە لەگەڵ لێکۆڵینەوەکە بگونجێ، لێرەدا پرۆسەی دیارکردنی شوێنەکان و رەسمکردنیان بە شێوەیەکی روون و دیار دەست پێ دەکات. شیکردنەوەی زانیارییەکانی جیۆفیزیکی، گرنگترین قۆناغە، ئەوەش ئامانجی هەموو لێکۆڵینەوەیەکە و پێویستی بە لێکۆڵینەوە و شارەزایی و لۆژیک هەیە، کە لە لایەن کەسی ئاسایی (ناپسپۆر)، بریتییە لە کۆمەڵێک ژمارە و هێڵی جیاواز و شێوەی ئاراستەکان، کە گرنگییەکی زۆری هەیە لە لای خاوەنی مەسەلەکە.

لە میانی سەرنجدانمان بۆ (دیمەنی - ٤ -) ئەوەمان بۆ بە دیار دەکەوێ: کۆمەڵێک لە هێڵەکانی (کەنتوری) داخراو بەبەهای بەرز یان نزمترو کۆمەڵەکانی تر، هەر لە هێڵەکانی ناداخراو و ئاراستەکراو بۆ چەند لایەکی تر و جیاواز و چڕی گۆڕاوو نائاسایی هەندێ جار، شێوەکانی نائاسایی لە هێڵەکانی (کەنتوری) یان (لە چەماوەکانی پروفایل) کە بە (بۆن و روخساری موگناتیسی) ناسراوە، کە پەیوەندییەکی راستەوخۆی هەیە بە

گۆڕانکارییەکانی ژێر زەوی لەو ناوچەیەی کە پێوەرەکە دەیگرێتەوە.

شیکردنەوەی (الشذات المغناطیسیة - بۆن و روخساری موگناتیسی) و گەڕاندنەوەی بۆ هۆیە راستەقینە و زانستییەکانی، کە زۆر زەحمەتن. ئەو زەحمەتییەش لە تەن و شێوەی بواری موگناتیسییەکەی بە دیار دەکەوێ، کە دوو جەمسەرییە، کەواتە چۆنیەتی و وەزعی (تەنی موگناتیسەکە) بە نیسبەت بواری موگناتیسی زەوی، ئەوەش حاڵەتێکی گرنگە و ناسینەوەی زۆر زەحمەتە. بەتایبەتی بۆ تەنی شاردراوە و نادیار، مەگەر توێژەر بچێتە سەرچاوەی زانیاری دیکە، ئەلێرە دەبێ ئاگاداری ئەو مەسەلە بکەینەوە، تەنێک، توندی موگناتیسی نادات، مەگەر ئەوەی بەرامبەری ئەو توندییە موگناتیسییە بدات. ئەوەش لە سەر دووری شوێنەکە رادەوەستێ، لە بەر ئەوەی مەیلی بواری موگناتیسی زەوی، جیاوازە لە شوێنێک بۆ شوێنێکی دیکە.

لە کاتی گەڕانەوە بۆ دیمەنی -٤- دەبینین (٣) سێ ناوچەی جەمسەری گەرم و توندی موگناتیسی هەیە، واتە مادە و کەرەستەی زۆر هەستیاری موگناتیسی بە رێژەیەکی بەرز، زۆر جار وامان بۆ بە دیار دەکەوێ، کە هەندێ دیواری رووخاو و هەندێ کەرەستەی زۆر هەستیار و بواری موگناتیسیشی زۆر توند و گەرمە بنیات نراوە، وەکو (کەرپووچی سووتێندراو)، کە کەرەستەیەکی سەرەکی بیناکردن بووە لە سەردەمی ئاشوورییەکان، هەروەها (بەرد و تاوێر و تاشە بەرد)، لە لایەکی تر هەندێ ناوچە هەیە، کە بۆنیان و راکێشانیان ساردە، وەکو کەڵەکە و توێەڵە لە هەندێ کەرستە، کە هێزی موگناتیسییان نزمە و کەمە، بۆ نموونە، وەکو(قوڕی تازە).

لە لێکۆڵینەوە موگناتیسییەکاندا، شوێنی ئەو تەنەی شاردراوە لە ناو زەویدا دەستنیشان دەکرێ، بەتایبەتی لەو جێگایانەی کە تووشی هەڵگەڕان دەبێ، لە بۆنی گەرم و راکێشەر بۆ بۆنی سارد و نزم، بە هۆی دیاردەی دوانەی جەمسەری، بەتایبەتی ئەگەر پشتمان بەو گریمانە بەست، وەکو کاریگەری شارستانی بە سەر دەزگای موگناتیسی زۆر نزم و سنووردار بوو، قوڕو گڵ و خۆڵی نوێ و تازە، بواری موگناتیسییان نییە یان موگناتیسی ماوە، هەروەکو لە کەرپووچدا هەیە و هەستیاری بەرزی هەیە بۆ بواری موگناتیسی زەوی، کە لە (سفر) نزیک دەبێتەوە (١٩٧٦، Dolrin) دەتوانیت رەسمی نەخشەیەکی سادە و نزیک بێت بۆ شوێنەوارەکە، هەروەکو لە دیمەنی (٥)دا دیارە.

شیکردنەوەی زانیارییەکانی جیۆفیزیکی، بە دوو ئاراستەی یەک لە دوای یەک، یەکەمیان پێی دەڵێن: (شیکردنەوەی چۆنایەتی - quantitative Inter Pretation) ئەو شیکردنەوە دەگرێتەوە کە پێشتر ئاماژەی پێدرابوو، دووەمیان شیکردنەوەی چەندێتی، کە خەملاندن و ئەستووری و قەبارە و قووڵی تەنەکان دەگرێتەوە، کە دەبنە هۆی بۆن و راکێشان، ئەوەش بە بەکارهێنانی شێوازێک پەیڕەو کرا، لە (Parasnis ١٩٩)دا هاتووە، بە شیکردنەوەی بۆن و راکێشان لە سەر نەخشەی دیمەنی - ٤ - لە رێگەی پارچەی (AB)، بۆیان بەدیارکەوت، کە ئەو تەنەی، لەوانەیە دیوارێکی شاردراوە بێت، لە قووڵایی (٢/٥) مەتر لە رووی زەوی بێت.

**کۆتایی:**

رێگا جیۆفیزیکەکان لە پرۆسەی رووپێوکردنی (جیۆلۆجی و ئەندازیاری و شوێنەواری)، ئەویش بۆ دانی دووری سێیەم، کە قووڵاییە و رێگا جیۆفیزیکییەکەی یەکەمی، لە وانەیە چارەسەری زۆر سەرکەوتوو نەدات، بە تایبەتی ئەگەر زانیاری وردی بۆ دابین نەکرا لە سەر چاوەی دیکە، لە بەر ئەوەش، پێویستە پشت بە چەند رێگای جیۆفیزیکی یەکەیی ببەسترێ، بۆیە و لە بەر ئەوەی دەرئەنجامەکان هێشتا تەواو نییە و پێویستی بە لێکۆڵینەوەیەکی دیکە هەیە وەکو تەواوکەر، وەکو رێگای راکێشە یان کارەبایی.

* ئەم بابەتە لە گۆڤاری شانەدەر، ژمارە (٤) وەزارەتی رۆشنبیری - هەولێر بە زمانی عەرەبی بلاوبۆتەوە.

و. نەجات خۆشناو

# ڕێگای هەولێر - شانەدەر لە دیدی تەها باقر و فوئاد سەفەر

**ڕێگاکە:**

ڕێگایەکی قیرتاوکراو هەیە لە هەولێرەوە بەرەو ڕۆژهەلات دەڕوا، بە زنجیرە چیایەکی دلڕفێن تێدەپەڕێ تا دەگاتە حاجی ئۆمەران لەسەر سنووری عێراق- ئێران، درێژی ڕێگاکە ١٨٥ کم.

**سیفاتی ئەم ڕێگایە:**

پاش ١٨ کم لە هەولێر، ڕێگاکە بەزنجیرە چیایەکی نزم تێدەپەڕێ، پێی دەوترێ (خانزاد)، کۆمەڵە گردێکی پێکهاتووە لە چەو و لم. پاشان شێوەیەکی زوورگ وەردەگرێ بۆ مەودای (٥) کم پانتر لێژ دەبێتەوە بەدۆڵی (بەستۆڕە) تێدەپەڕێ، کە پێشتر لە پرۆژەی ئاودێری (هەولێر) سەنحاریب بۆ شاری هەولێر لەگوندی (قەلە مورتکە)، کە دەکەوێتە ئەم دۆڵە ئاماژەمان پێکرد. ئەوەشمان ڕاگەیاند ڕەنگە ناوی ئێستای (خانزاد) لەناوە کۆنەکەی چیای (خانی) هاتووە، لە نووسراوە مسمارییەکەی پاشای ئاشووری (سەنحاریب) لە بەستۆڕە باسکراوە.

**هاوینە هەواری (سەلاحەدین)**

پاش (١٠) کم دامێنی چیای سەلاحەدین دەردەکەوێ ڕێگاکە بەو دامێنە هەڵدەستێ بەشێوەیەکی پێچاوپێچ (لۆفە) پاش (٢)کم دەگاتە لووتکە. لەسەرووی لووتکە بیناکانی سەلاحەدین هەیە لەنێوانیان (ئوتێلی پیرمام، کە ناوە کۆنەکەی چیای سەلاحەدینە.

**شەقلاوە:**

مەودای نێوان (سەلاحەدین- شەقلاوە ٢١کم)ە. ڕێگاکە جارێکی دی لێژ دەبێتەوە پاشان بەدەشتێکدا تێدەپەڕێ و بە نێوان چیای سەلاحەدین و چیای سەفین بەگوندێکی گەورە گوزەر دەکات، ئەویش گوندی (کۆڕێ)یە. پاشتر هەڵدزێتە چیای سەفین بەرەو دۆڵی باکوور، کە شارۆچکەی (شەقلاوە)ی لێیە. پێش گەیشتن بە شەقلاوە لەڕاستی ڕێگاکە و لەدۆڵی ناوبراودا دەرگای ئەشکەوتێ دیارە لەچیای سەفین دەرگایەکی دی بەتەنیشتەوە هەیە پێی دەڵێن: (ئەشکەوتی کاوانیان). چەندین ئامرازی بەردین، کە دەگەڕێتەوە سەردەمی چاخی بەردین لەوێ دیترایەوە.

شەقڵاوە ناوی مەڵبەندی قەزایەکە لەدۆڵی (سەفین) کانی و کانیاوی زۆری لێیە. جۆگە و دار بەتایبەتی (سپیندار) و گوێز و سێو و خۆخ شارەکە دەڕازێنێتەوە.

وەک "یاقوتی حەمەوی" لە کتێبی (معجم البلدان) دا دەڵێ: "شەقڵاباز": گوندێکی گەورەیە لەپاومانی چیایەک دەڕوانێتە سەر هەولێر (اربيل) رەز و باخاتی زۆری هەیە، مەودای ڕێگاکە هەتا هەولێر هەشت (فەرسەخە) لەم گوندەدا (شەمعون شەقڵابازی) ژیاوە، کە کتێبێکی بەزمانی ئارامی لەکۆتایی سەدەی دوانزەهەمی زاینیدا داناوە. هەندێک دەڵێن ئەوەی بناغەی ئەم گوندەی داناوە، بەناوی خۆی ناوی لێناوە (شەقەلی بەگ کوڕی شاعەلی بەگ میری بەهرانە). لە سەردەمی سوڵتان (سلێمان قانوونی) ناوی ناوە (شاقلی نوە) بەمانای (شاقلی باز).

**هەریر- باتاس:**

ڕێگای نێوان شەقڵاوە- هەریر، بەدەشت و بەرزاییدا تێدەپەڕێ، پاشان بەدەشتێکی بەپیت و کشتوکاڵی پڕ لەئاو، کە دەشتی (هەریر) و (باتاس)ە، کە زنجیرە چیاکانی (هەریر) لە ڕۆژهەڵاتەوە دەڕوانێتە سەری. چەندین گردی شوێنەواری دێرین لەم دەشتەدا هەیە. پاش ٤٠ کم لە شەقڵاوەوە دەگەیتە (ناحیەی هەریر).

**نەخشی چیای هەریر:**

پاش ٢ کم لە هەریر، ڕێبواری ئەو ڕێگایە لە دەستە ڕاستی خۆی لەچیاکەدا نەخشێک بە بەرزی (٥٠) پێ دەبینێ، کە لەسەر تاشە بەردەکانی دامێن داتاشراوە. درێژی ئەم تاشراوە (٢.٥م) دەبێ کە وێنەی پیاوێکی ڕاوەستاوی تێدایە. وا مەزندە دەکرێ لە سەردەمی (ئەشکانییەکان)دا داتاشرابێ.

بەرامبەر ئەم داتاشراوە لەدیوی بەرامبەر ڕێگاکە گوندی باتاس هەیە، کە کاتی خۆی ناوەندی ناحیەی (باتاس) بووە. لەنزیکییەوە گردێکی دێرینی مەزن هەیە.

ئەم ڕێگایە لە (باتاس)ەوە بەردەوامە و زنجیرە چیاکەش وا لەدیوی ڕاستییەوە پاش (١٠ کم) لە شارۆچکەی باتاس ڕێگایەکی تەختکراو بەشێوەیەکی کۆن بەرەو چەپ دەبێتەوە، دەگاتە ئەو ئوتێلە ناسراوە بە (بێخمە) کە (زێی سەروو) پێدا تێدەپەڕێ. چەندین ئەشکەوتی بچووکتر لەم شوێنەدا هەیە چەندین کەرەسەی بەردینی چاخە کۆنەکانی تێدا بینراوەتەوە.

پاشان ڕێگاکە بەسەر (سپیلک)دا سەردەکەوێ، لە کۆتایی لۆفەکان ڕێگایەکی نوێ هەیە بە دەستی چەپدا دەگاتە شانەدەر ئەم چیایە درێژەی زنجیرە چیای هەریرە. لەم چیایە دار بەڕووی زۆری لێیە. پاش چەندین پێچ (لۆفە) و سووڕانەوە ڕێگا دەگاتە (لووتکە) پاشان جارێکی دی لێژ دەبێتەوە بەرەو (خەلیفان) کە (٢١ کم) لە هەریرەوە دوورە.

(خەلیفان) دەکەوێتە دۆڵێکی کەم تەختاییەوە، کە یەکێک لە لقەکانی زێی سەروو بەدووری (٢ کم) لە گەرووی بەناوبانگی (گەلی عەلی بەگ) تێدەپەڕێ. لێرەوە ڕێگایەک بەرەو دیوی چەپ دەبێتەوە بەرەو (شانەدەر) کە ئەشکەوتی شانەدەری لێیە. پاشان ئەم ڕێگایە درێژەی هەیە هەتا بەرەو گوندی (بلێ) بۆ مەودای (٨٠)کم.

**گەرووی گەلی عەلی بەگ:**

ئەم گەرووە خەرەندێکی سروشتییە درێژییەکەی (١٠)کم لەزنجیرە چیایەکەدا، بەشی باشووری کە ڕواندزی لێیە. پێی دەوترێ چیای ڕواندز، بەشی باکووری بەناوی چیای (برادۆست)ە ناوبانگە، هەردوو دیوی خەرەندەکە ستوونییە، سێ لقی زێی گەورە لەوێ تێدەپەڕێ: لقی خەلیفان، لقی ڕواندز، لقی دیانا. هەرسێکیان لەم گەرووە یەک دەگرن و دەبنە زێی (خالان) کە بەتێپەڕبوون لە چیاکان دەگاتە زێی گەورە، ئەم گەرووە لەبەر چڕی دارەکان و تاڤگە بەخوڕەکەی دڵڕفێنترین دیمەنی هەیە.

پاش کۆتایی هاتنی گەرووەکە چەندین ڕێگای لاوەکی لەڕێگای سەرەکی دەبنەوە، کە بەرەو (حاجی ئۆمەران)ە، لەوانە ڕێگایەک بەرەو دیوی چەپ بەرەو (هاودیان و بلێ) ڕێگای سەرەکی قیرتاوکراو بەدەشتی بچووکدا تێدەپەڕێ، کە دەشتی (دیانا)یە. پاش مەودایەکی کورت ڕێگایەک هەیە دووبارە بەرەو دیوی

چەپ دەگاتە (دیانا) و (تۆبزاوە) و (کێلەشین) و ڕێگای دیکە هەیە بەرەو دیوی ڕاست بەرەو (ڕواندز). پاشان ڕێگای سەرەکی بەگوندی (جوندیان)دا تێدەپەڕێ، کە دەکەوێتە گەرووی ڕایاتەوە، کە (١٥کم) لەخەلیفانەوە دوورە لێرەدا پردێک هەیە بۆ تێپەڕبوون لە ڕووباری (ڕایات).

پاش (جوندیان) ڕێگا بەدۆڵی (ڕایات)دا تێدەپەڕێ، لەم دۆڵەدا و لەنزیک گوندی (جوندیان) گوندێکی بچووک هەیە بەناوی (خەلەکان)دوە، لەوانەیە مێژوونووسی بەناوبانگ (ئیبن خەلەکان) لێرە لەدایک بووبێ.

پاش (٨ کم) لەجوندیانەوە دەگەینە گوندی (ڕازەنوک). لەوێ پردێک هەیە بۆ تێپەڕبوونی بەرەو ڕۆخی دووەمی زێی (ڕایات) پاشان گوندی (بەرسرینی) دێ لەدیوی چەپی (ڕایات) لەشوێنێکی بەرامبەر ئەم جێگەیە بە بەرزی (٥٠ م) ئەشکەوتێ هەیە بەناوی (کوسبی سپی) تێیدا پاشماوەی ئێسکی ئاژەڵی چاخە بەردینەکان دۆزرایەوە. ئەم ئەشکەوتە کۆتاییەکەی نادیارە.

پاش گوندی (بەرسرینی) بەماوەیەکی کەم، شوێنی لێکردنەوەی (مەڕمەڕ)ی جوان دێت. پاش (١٠ کم) لە (ڕازەنوک) گوندێکی دیکە هەیە بەناوی (ڕازان). پاشتر ڕێگایەک بەرەو چەپ دەبێتەوە بۆ ناحیەی (گەڵاڵە)، کە دەکەوێتە دامێنی چیای (گەڵاڵە)وە، شارۆچکەیەکی بچووکە ئاووهەوای سازگاری هەیە، چونکە دەکەوێتە سەر بڵندترین چیاکانەوە، ئەویش چیای (هەڵگورد)ە، کە بەرزترین لووتکەی زنجیرە چیای حەساروستە (١٢٠٠٠ پێ بڵندە). ناوی گەڵاڵە تەنها ناوێکی خۆجێیە بۆ بەشێک لەم زنجیرە چیایە.

ڕێگایەکی بچووک لەدیوی ڕاست دەبێتەوە بەرەو (ناوپردان) دەگاتە چیای بڵندی (سەکران)، کە لەهەموو وەرزەکانی ساڵ بەفر لووتکەی داپۆشیوە، پاش (٢٠کم) لەگوندی (ڕازان)ەوە ڕێگا دەگاتە مەخفەری پۆلیسی (ڕایات)، کە مەخفەری گومرگە. پاش ڕێگاکە لە حاجی ئۆمەران، کە لەبەرزایی ٤٧٠٠ پێیە کۆتایی پێ دێ. مەودای نێوان (جوندیان) بۆ (حاجی ئۆمەران) ساردترین هاوینە هەوارەکانی کوردستانە پلەی گەرمی لە ٢٣ پلەی سەدی تێ ناپەڕێ.

### خەلیفان- شانەدەر:

پێشتر ئاماژەمان بەوەکرد کە لەخەلیفانەوە ڕێگایەکی بچووک هەیە بەرەو (شانەدەر) و (بلێ)، کە دەکەوێتە ناوچەی بارزانەوە. ئەم ڕێگایە بەزنجیرە چیایەکدا سەردەکەوێ بەرامبەر چیاکانی برادۆست لەنزیک گوندێکی گەورە تێدەپەڕێ پێی دەڵێن (سرێشمە) کە (٦)کم لە خەلیفانەوە دوورە. پاش (١١)کم لەم گوندە، ڕێگاکە بەهۆی پردێکەوە لەزێی (خالان)، کە لقێکە لەزێی سەروو، کە وەکو پێشتر باسمان کرد لقەکانی (ڕەواندز و دیانا و خەلیفان) لەناوەندی گەلی عەلی بەگ پێکی دێن، تێدەپەڕێ ئەم ناوچەیە پێی دەوترێ (خالان-خەلان).

لە نزیکی پردی نوێی (خەلانەوە) پردێکی کۆن دیارە مێژووەکەی نادیارە. پاش (٣)کم لەم پردە گوندێکی بچووک و باغ و بوستان هەیە لەودیوە ئەشکەوتێ دیارە پێی دەڵێن (ئەشکەوتی خەلان) پاش ماوەیەکی کەم (گەرووی بێخمە) دێ، کە زێی سەرووی تێدا گوزەر دەکا لێرەوە ڕێگاکە بە دەشتێکی تەسکدا بەناوی دەشتی (شانەدەر) تێدەپەڕێ.

پاش (٢٦)کم لەپردی (خەلان) یان (٤٣)کم لە خەلیفانەوە دەگەیتە گوندی شانەدەر، پاش (٣٧)کم لێرەوە ڕێگا دەگاتە (بلێ) ناوەندی (ناحیەی بارزان).

### ئەشکەوتی (شانەدەر):

ئەم ئەشکەوتە دەکەوێتە چیاکانی (برادۆست)ەوە، کە ٢١٠٠ پێ لەڕووی دەریاوە بەرزە. نیو میل لەدیوی چەپی زێی سەرووەوەیە. پاش میل و نیوێک بەرەو باکووری ڕۆژئاوا سەر چیا دەکەوێ بۆ گەیشتن بەدەرکەی ئەشکەوتەکە کە ٩٠٠ پێ لەڕێگاکەوە بڵندە.. ڕووی دەرگەی ئەشکەوتەکە بەرەو باشوورە، بۆیە ڕۆژانە بۆ چەندین کاتژمێر بەبەر تیشکی ڕۆژ دەکەوێ، بەتایبەتی لەزستاندا، بۆیە باشترین جێگای

حەوانەوەی ئادەمیزاد بووە لەسەردەمی چاخە بەردینە کۆنەکان تاکو چەند ساڵێک لەمەوبەر، کە شوانەکان و رەوەندەکان پەنای بۆ دەبرد. ئەشکەوتەکە دەکەوێتە نزیکی چاوگی هەمیشەیی ئاوەوە. هەروەها تنۆکە ئاو لە بنمیچی ئەشکەوتەکەوە دلۆپە دەکات ئاوەکەش سازگارە و بۆ خواردنەوە دەشێ.

ئەم ئەشکەوتە بەرینترین ئەشکەوتەکانی کوردستانی عێراقە. لەشێوەی سێ گۆشەیە. پانی دەرگاکەی ٨٢ پێیە و بەرزییەکەی ٢٩ پێیە لەژوورەوە بەرینییەکەی دەگاتە ١٧٥ پێ لەناوەندا بەرزی بنمیچەکەی ٤٥ پێ بڵندە. پاش ١٣٥ پێ لەدەرگەی ئەشکەوتەکە کۆتایی پێ دێ. بەڵام لە پشکنینەکانی ساڵی ١٩٦٠ دەرکەوت لە کۆتایی ئەشکەوتەکە دەلاقەیەکی داخراو هەیە، کە ئەشکەوتەکە دەگەیەنێتە ئەشکەوتێکی دی، کە تا ئێستا پشکنینی تێدا نەکراوە.

پشکنین لەو ئەشکەوتە ساڵی ١٩٥١ لەلایەن بەرێوەبەرایەتی گشتی شوێنەوارەکان دەستی پێکرد. پاشان پەیمانگەی (سەمشونی ئەمریکی) لەژێر سەرکردایەتی (رالف سولیکی) لەچەند وەرزێکی جیاجیادا، کە دوا جاریان ساڵی ١٩٦٠ بوو پشکنینی لەم ئەشکەوتەدا ئەنجامداوە، لە ئاکامدا چینەکانی نیشتەجێبوون لە زەوی ئەشکەوتەکە دیترایەوە، لە تازەترین سەردەمەکانەوە بەرەو کۆنترین چاخەکانی جێنشین بوون، کە دەگەرێتەوە چاخی بەردینی کۆنی ناسراو بە (سەردەمی موستیری) پاشماوەی جێنشینبوون لەم ئەشکەوتە، دەگاتە قووڵایی ٤٣ پێ، کە ئەم سەردەمانەی بەخۆ گرتووە:

١- سەردەمی موستیری: کۆنترین سەردەمە. دەتوانرێ بە ٥٠ هەزار یان ٧٠ هەزار ساڵ بخەملێنرێ.

٢- پاش سەردەمی یەکەم چەند سەردەمێکی چاخە کۆنەکانی بەردینی کۆنی سەردوە هاتووە، وەکو: (سەردەمی ئورگەنشی)، کە بە ٣٠ هەزار ساڵ دەخەملێنرێ.

٣- سەردەمێک لە چاخە کۆنەکانی بەردینی کە ئامێرەکانی لە بەردی (صوان) بە وردی داتاشراوە، پێی دەڵێن (سەردەمی مایکرولیتی) بە سەردەمی بەردینی ناوەند ناسراوە (میسۆلیتی)، ئەمەش لەگەڵ دۆزراوەکانی ئەشکەوتی (زەرزی) لە ناحیەی سورداش هاوتایە. کە پێیان دەوت (سەردەمی زەرزی)، کە دەگەرێتەوە بۆ ١٢ هەزار ساڵ.

٤- لە چینی سەرەوەی ئەشکەوتەکە ئامێری صوان و شوێنەواری بەردینی وا دیترایەوە، کە دەگەرێتەوە سەرەتای چاخی بەردینی نوێی، واتا بۆ (١٠) هەزار ساڵ، ئەمەش لەگەڵ دۆزراوەکانی (زاوی چەمی)دا هاوتایە.

لەنێو چینە جیاجیاکانی ئەم ئەشکەوتە پەیکەری ئێسکی زۆر بەبایەخ دۆزراوەتەوە. بەتایبەتی ئەوەی دەگەرێتەوە (سەردەمی موستیری)، کە حەوت پەیکەری مرۆڤی - نیاندرتاڵ - دیترایەوە. کە جۆرێکی مرۆڤی لەناوچووە جیاوازە لە مرۆڤی نوێی ناسراو بە (هوموسابیان - بە مانای - مرۆڤی ژیر)، لە نێوانی پەیکەرە دۆزراوەکان پەیکەری منداڵێکی لەو چەشنە بووە. ئەمەش دێرینترین جۆری ئادەمیزادە، کە لە هەموو - عێراقدا - دیتراوەتەوە. هەرچەندە لە (بردەبەلەکە) کەرسەی بەردینی جۆرە مرۆڤێکی لەناوچووی (سەردەمی نەشولی) دۆزراوەتەوە، کە دەگەرێتەوە ١٠٠ ساڵ، بەڵام پەیکەری ئەو مرۆڤە نەبینراوەتەوە.

لە چینەکانی سەرەوە، ژمارەیەک پەیکەری ئێسک دیترایەوە، کە دەگەرێتەوە سەرەتای سەردەمی بەردینی نوێ، کە زۆر لە مرۆڤی (نیاندرتاڵ) جیاوازە، لێکۆڵینەوەکانی مێژووی جیۆلۆجی ئەم ئەشکەوتە دەریخست، کە ئاووهەوای عێراق لەم ناوچەیە جیاواز بووە لەوەی ئێستا. ماوەیەکی جیۆلۆجی تێپەریوە، رادەی شێ و گەرمی بەو پلە بووە، کە داری خورما

لەناوچەکەدا رواوە، بەهۆی تۆزی پەلکی دارخورما لەخاکی ئەشکەوتەکەدا دیتراوە.

**زاوی چەمی:**

لە رۆخی (زێی سەروو) لە نزیکی (مەخفەری شانەدەر) شوێنەوارێکی دێرین هەیە پێی دەوترێ (زاوی چەمی) (رەنگە ماناکەی: رۆخی زێ بێ) پشکنینەکانی (پشکنەرانی شانەدەر) وای پیشانداوە، کە کۆنترین شێوەی ژیانی ئادەمیزادی سەردەمی بەردینی نوێی تێدا بووە، بۆیە نموونەی دێرینترین نشینگەیە لەهەموو عێراق. لەراستیدا قۆناغی گواستنەوەیە لە کۆچەرایەتییەوە بەرەو جێنشینبوون و بەخێوکردنی ئاژەڵ، گواستنەوە لەکۆکردنەوەی خۆراکەوە بەرەو بەرهەمهێنانی خۆراک. ژمارەیەکی زۆری پەیکەری ئێسکی چەندین جۆری ئاژەڵی تێدا بینراوە، بەڵام هیچ گۆزەیەکی تێدا نەدیتراوە، لەم شوێنەوارە دەرکەوتووە، کە (بزن) یەکەمین جۆری ئاژەڵی کەوی کراوە (ماڵی کراو) لەلایەن مرۆڤەوە لە پاش (سەگ) پاشان (مەڕ) و (مانگا)یان کەوی کردووە.

**گەلی عەلی بەگ- مێرگەسوور:**

پاش خەلیفان بە (١٣)کم و پاش تێپەڕبوون بە گەلی عەلی بەگ رێگایەکی بچووک بەرەو دیوی چەپ لای گوندی بافستیان دەبێتەوە بەرەو باکووری رۆژئاوا بەرەو (مێرگەسوور- ناوەندی ناحیەی بارزان)، پاش (بافستیان) بە (هاودیان)، کە ئەشکەوتی گەورەی تێدایە تێدەپەڕێ، کە پەناگای شوانانە لەزستانان، لەدوورەوە دیارە، چەندین ئامێری بەردینی (صوان) دۆزراوەتەوە لەم ئەشکەوتە، کە دەگەڕێتەوە سەردەمی بەردینی ناوەند- ئامرازی ماکرولیث (michrolithis)- لە جێگەیەکە، کە چوار سەعات بە پێیان دوورە، ئێستا رێگای قیرتاوکراو هەیە بۆ بەردەم ئەشکەوتەکە، دوو ئەشکەوتی دی هەیە بەناوی (دیان) و (بەستون) پاشماوەی جێنشینبوونی سەردەمی بەردینی نوێی تێدا بینراوەتەوە (هینری فیلد) ساڵی ١٩٥١ پشکنینی لەم ئەشکەوتانە ئەنجامداوە.

ئەشکەوتێکی دی هەیە لەباکووری گوندی (هاودیان)، بەناوی (بێخاڵ)، نێردراوێکی زانکۆی- شیکاگو- ساڵی ١٩٥٥- پشکنینی تێدا کردووە. پاشماوەی جێنشینبوونی ئادەمیزادی لەدوو چینیدا دۆزییەوە کۆنترینیان (سەردەمی موستیری- ٥٠ هەزار ساڵ) پاشان (سەردەمی زەرزی- ١٢ هەزار ساڵ) بووە.

رێگا پاش (هاودیان)، بەگوندی (مەزن)، کە (١٧)کم لە (بافستیان) دوورە تێدەپەڕێ. پاش (٢٣)کم رێگا دەگاتە (مێرگەسوور) (مەڵبەندی ناحیەی بارزان)، پاش (٣٧)کم دەگاتە (شێروان مەزن)، کە لەسەر سنووری هاوبەشی - عێراق- تورکیایە.

**رێگای دیانا - کێلەشین**

پێش جوندیان رێگاکە لە دیوی چەپەوە بەرەو باکوور دەڕوات، پاش ٥کم دەگاتە گوندی دیانا، کە دەکەوێتە دەشتێکەوە بەو ناوە ناسراوە، لقێکی زێی سەروو بەوێدا تێدەپەڕێ، لە باشووری رۆژئاوای - دیانا- بە کیلۆمەترێک گردێکی دێرین هەیە بەناوی (گردبناهلک) ٥ مەتر بەرزە لە شێوەی هێلکەییە (١٥٩×١٠٠م) نێردراوێکی زانکۆی شیکاگۆ ساڵی ١٩٥٤ چەندین گۆزەی تێدا دیتەوە، کە دەگەڕێتەوە چاخی (حەلەف (٤٩٠٠- ٤٥٠٠پ.ز)

لە دەشتی دیانا گردێکی گەورە هەیە لە رێگای سەرەکییەوە دیارە، پێی دەڵێن گوندی مەزن، گۆزەی چاخی ئاشووری تێدا دیتراوە.

**تۆزاوە - تۆبزاوە**

لە شوێنەواری (تۆبزاوە و کێلەشین) دوو میل لە بەرد بە نووسینی بزمارییە زمانی ئاشووری و زمانی (ئورارتوو) خالیدی شتی لەسەر تۆمار کراوە.

پێشان دەگەیتە تۆبزاوە بە پیادە یان بە سواری پاشان بەرەو سیدەکان، پاش دوو کاتژمێر رۆیشتن رێگا سەردەکەوێ و پێچ دەکا لە ناوچەیەکی شاخاوی دەڕوانێتە سەر دۆڵێک، کە لووتکەی (سەری بەردی) بەسەرییەوەیە و مەخفەرێکی پۆلیسی لێیە - پاش سیدەکان بە ٢٠ خولەکێک دەگەیتە تۆبزاوە لە راستی زێی (بۆرا)، کە چەمی

تۆپزاوەشی پێدەڵێن، کە دەکەوێتە لای راستی رێگا بەرەو گوزەرگەی کێلەشین و لۆلان، (میلەکەی) تۆپزاوە لەسەر تەختاییەکە، کە دەروانێتە سەر دۆڵێکی بەرینەوە دار و درەختی زۆرە، لە رۆژهەڵاتی ئەم جێگایە بە درێژایی دۆڵەکە گوندی زۆری لێیە، لەوانە گوندی (مجیسر)، کە پەیکەری داتاشراوی زۆری تێدا دیتراوەتەوە، لەودیە ئەم میلانە، کە لە ناوچەکەدا دۆزراونەتەوە لەهەمان سەردەمی ئەو پەیکەرە داتاشراوانە بن (سەردەمی ئۆرارتی) بن.

میلەکەی تۆپزاوە لەلایەن خەڵکی ناوچەکە بە (کێلی گیاوران) بەناوبانگە، واتە (کێلی گاوران)، کە دەکەوێتە سەر رێگای گشتی سیدەکان و بە نووسینی بزماری و زمانی ئاشووری و زمانی ئۆراتی نووسراوە، ناوی پاشای خالیدی (رۆسا) پاشای ئۆرارتۆ، کە هاوچەرخی پاشای ئاشووری "سەرجون" ٧٢١ - ٧٠٥پ. ز. بووە، ناوی (رۆسا) لە هەواڵەکانی هەڵمەتی هەشتەمی (سەرجون شا) بۆ سەر وڵاتی ئۆرارتۆ هاتووە ساڵی (٧١٤پ. ز) باس لەوە دەکات پاشای ئەرمەنی (رۆسا) یارمەتی (ئورزانا)ی داوە دژ بە ئاشوورییەکان، ئەرزانا پاشای هەرێمێک بووە بەناوی (موحاسیر)، وا مەزەندە دەکرێ ئەم هەرێمە کەوتبێتە باکووری رۆژهەڵاتی وڵاتی ئاشوورییەوە یانی رۆژئاوای دەربەندی کێلەشین چەندین شاری تێدا بووە جگە لە (موحاسیر) درێژەی بووە تا رواندز.

(رۆلسن) شوێنەوارناسی بەریتانی بەناوبانگ بە شیکردنەوەی خەتی بزماری دەستێکی باڵای هەبووە لە دۆزینەوەی ئەم کێلە ساڵی ١٨٤١، پاش ئەویش شوێنەوارناسی بەناوبانگ (دی مۆرگن) ساڵی ١٨٩٤.

**کێلەشین**

رێگا شاخاوییەکە لە شوێن کێلەکەی (تۆپزاوە)وە دەگاتە گوندی (بنێ) پاشان بە دەشتی (ماوەتاوە) تێدەپەرێ بە دامێنی باکووری چیای (بربزین)دا سەردەکەوێ و دەروانێتە سەر دۆڵێکی بە پیت و فراوان بەناوی (بیرگە)، رێگا لێرەوە دەبێتە دوو بەشەوە، یەکێکیان شان بەشانی دامێنی چیای (بربزین) دەروات، سور دەخوا بەرەو دیوی رۆژهەڵات. لە خاڵێکدا لەسەر زێی رەوەندۆک دەوەستێ. لقەکەی تریش بەرەو دۆڵەکە لێژ دەبێتەوە تا دەگاتە گوندی (بیرگە) لەم گوندە سەربازە بەریتانییەکان لە جەنگی یەکەمدا پشوویان دەدا، چونکە هاوینەهەوارێکی خۆش بووە، رێگاکە لە گوندی (بیرگە)وە سەردەکەوێ بەرەو رۆژهەڵات تا دەگاتە (کێلەشین).

ئەم کێلە لە بەردی بازلت دروست کراوە، لە شێوەی لاکێشەیە سەرەوەی بازنەییە، درێژییەکەی ٢ مەترە و پانییەکەی ٦٠سم و ئەستوورییەکەی ٣٠سم، لەسەر بنکەیەکی چوارگۆشەیی دامەزراوە، ئەم کێلە بە نووسینی بزماری بە دوو زمانی (خالیدی - ئۆرارتی)، کە ٤١ دێرە و بە زمانی ئاشووری کە ٤٢ دێرە نووسراوەتەوە و هۆکاری ئاو و هەوا بەشێک لەم نووسینەی رەش کردووەتەوە.

لە نووسینەکەدا وا دیارە ئەم کێلە لەلایەن پاشای خالیدی (ئەشپۆنین) لە سەدەی هەشتەمی (پ. ز) بە بۆنەی سەرکەوتنی بەسەر ئاشوورییەکاندا تۆمارکراوە، هەروەها داپچڕاندنی بەشێک لە دەوڵەتی ئاشووری، ئەویش هەرێمی (موحاسیر) و (نائیری)یە، وا پێدەچێ ئەم پاشایە هاوسەردەمە پاشای ئاشووری (شەمس ئەدەد) بووە.

**تێبینی:** ئەم بابەتە لەساڵانی ١٩٦٠ تا ١٩٦٦ نووسراوە ئەوکات زۆرێک لەناوچەکان رێگایان بۆ نەچووە بەڵام ئێستا هەموو ناوچەکان رێگای قیرتاوکراویان بۆ چووە لەبەر ئەوە وەسفی رێگاکان و گەیشتن بەناوچەکان لەگەڵ ئێستادا جیاوازی هەیە.

سەرچاوە:

المرشد إلى مواطن الاثار والحضارة، بغداد، ١٩٦٦، ت: طه باقر وفؤاد سفر، الرحلة الخامسة.

*** ئەم بابەتە لە گۆڤاری شانەدەر، ژمارە ١١، ئایاری ٢٠٠٠ وەرگیراوە.**

**و: سەباح ئارام**



# منارەی چۆلی

زیاد محەمەد ئەحمەد
کۆلێژی ئاداب - زانکۆی سەلاحەدین

منارەی چۆلی یەکێکە لە شوێنەوارە دێرینەکانی شاری هەولێر، دەکەوێتە باشووری رۆژئاوای قەلا، لە رۆژنامەی (الوقائع العراقیة)ی ژمارە ١٤٦٥ لە ١٧/ ١٠/ ١٩٣٥) دا وەک شوێنەوارێک راگەیەنراوە، مێژوودکەی دەگەرێتەوە بۆ (٨٠٠) ساڵ بەر لەئێستا، لەلایەن فەرمانرەوای ئەو کاتی هەولێر (موزەفەرەدین کوکبری (٥٤٩-٦٣٠ک) دروست کراوە. وەک لە وێنەی ژمارە(١)دا دیارە

شاری هەولێر لەو سەردەمە گەورەترین پێشکەوتنی بەخۆیەوە بینیبوو، بەتایبەتی لە رووی فراوانی شارو زۆربوونی چڕی دانیشتوان، ئەمەش بەهۆی ئەنجامدانی چەندین پرۆژەی چاکسازی لەلایەن کوکبرییەوە، وەک دروستکردنی نەخۆشخانە، خوێندنگا، خانەی هەتیوان، شوێنی حەوانەوەی رێبواران، یەکێکیش لەو پرۆژانە دروستکردنی (منارەی چۆلی) یە لە پاڵ ئەو مزگەوتە گەورەیەی کە لە کنەو پشکنینەکانی ساڵی ١٩٦٠ ی



وێنەی ژمارە (١) دیمەنێک لە کنەو پشکنینەکانی ساڵی ١٩٦٠.

بەڕێوەبەرایەتی شوێنەواری عێراقی بناغەکەی دۆزرایەوە کە لە خشتی چوارگۆشە دروست کرابوو بە پێوانەکانی (٣٠ × ٣٠×٦سم) (٣١×٣١×٦سم).

مێژووی ئەم مزگەوتە دەگەڕێتەوە بۆ پێش دروستکردنی منارەکە بەیەک سەدە، هەروەها گەڕۆکەکانی وەک (نیبۆر) لە سەدەی هەژدە و (ریچ) لە سەرەتای سەدەی نۆزدە ئاماژە بە بوونی پاشماوەی ئەو مزگەوتە دەکەن لە پاڵ منارەی چۆلی دوور لە قەلا. بڕوانە وێنەی ژمارە(٢).

بە نەمانی دەسەلاتی ئەتابەکییەکان، شاری هەولێر تووشی بچووک بوونەوەیەک بوو بە جۆرێک خەلکی بەردو قەلاو دەوروبەری کۆچیان کرد، بۆیە هەندێک شوێن بە چۆلی مایەوە بەتایبەتی ئەو شوێنەی کە منارەکەی لێیە، هەر بۆیەش دواتر پێی وتراوە منارەی چۆلی چونکە دەوروبەرەکەی چۆل بووە لە دانیشتوان.بڕوانە وێنەی ژمارە(٣).

شایانی باسە بناغەی منارەکە لە بەردی رێک و بەشەکانی تری لە خشت و گەچ دروست کراوە بە پێوانەکانی (٢٤×٢٤×٥سم) (٢٤×٢٤×٧سم)(٢٥×٢٥×٥سم). بڕوانە وێنەی ژمارە(٤).

ئەگەر بێتوو وەسفی منارەکە بکەین بە گشتی لە دوو بەشی سەرەکی پێک هاتووە، بەشی یەکەم بنکەی منارەکە بەرزییەکەی (١٥م) بەشی دووەم لوولەی منارەکە بەرزییەکەی (٢٢.١٠م) کەواتە بەرزی تێکرای منارەکە (٣٧.١٠م)، بنکەکەی لە خوارەوە حەوت لاو لە



وێنەی ژمارە (٢)



وێنەی ژمارە (٣)




سەرەوە هەشت لا دەردەکەویت، لەوانەیە ئەمەش بە هۆی بوونی دیواری مزگەوتەکە سێ لای منارەکە بۆتە دوولا ئەوانیش لایەکانی رۆژئاوا درێژییەکەی (٥.٦م)ە،لای باکووری رۆژئاوا درێژییەکەی (٥م)، چونکە منارەکە دەکەوێتە گۆشەیەکی دوو دیواری مزگەوتەکە لەوانەیە بەرزی دیوارەکەش (٧م) بووبێت، لەبەر ئەوەی لە بەرزایی (٧م) زیاتر بنکەکە دەبێت بە هەشت لا.

یان رەنگە جیاوازی ژمارەی لایەکان و درێژییەکان بگەڕێتەوە بۆ کاری نۆژەنکردنەوە لەلایەن بەڕێوەبەرایەتی شوێنەواری عێراقی، بۆیە دەگونجێ لە بنەڕەتدا بنکەکەی هەشت لا بووبێت و هەر لایەی (٣م) بێت، هەربۆیەش پێنج لایەکەی تر درێژییەکەیان لە یەکتر نزیکن کە بریتین لە لای رۆژهەلات درێژییەکەی (٢.٩٦م)، لای باکووری رۆژهەلات درێژییەکەی (٣.٥ م)، لای باشووری رۆژئاوا درێژییەکەی (٣م)، هەردوو لای باشوورو باشووری رۆژهەلات درێژییەکەیان (٢.٩٥م)ە.بڕوانە وێنەی ژمارە(٥).

منارەی چۆلی دوو دەرگای هەیە یەکێکیان لە رۆژهەلات ئەوی تر لە رۆژئاوا، پێوانەی هەریەکەیان نزیکەی (١×٢م)ە، کۆتایی دێت بە کەوانەیەکی نیوە بازنەیی (عقد نصف دائري)، ئەو دوو دەرگایە لەسەر زەوی دەکرێنەوە بەهۆی دوو پلیکانەی مارپێچی (حلزوني) دەتوانیت بچیتە سەر لوتکەی منارەکە، ژمارەی هەریەکەیان (١٣٩) پلیکانەیە، پانی پلیکانەکان (٩٠سم)ە، دیواری منارەکەش (٦٠سم)، شایانی باسە ئەم دوو پلیکانە مارپێچیە لە یەکتر جیان بە شێوەیەک دوو کەس لە یەک کاتدا دەتوانن سەربکەون، یەکێک لەدەرگای رۆژهەلات ئەوی تر لە دەرگای رۆژئاوا، هەریەکەیان ئەوی تر نابینێت تا لووتکەی منارەکە. بڕوانە وێنەی ژمارە(٦).

دوای سەرکەوتن بە پلیکانەکانی دەرگای رۆژهەلات دوای (٢٣) پلیکان بە لای رۆژئاوا دا، پەنجەرەیەکی تێدا دەکرێتەوە پێوانەکەی (١.٥٠م × ٩٠سم)، و دوای (٥٣) پلیکان لە هەمان دەرگا



**وێنەی ژمارە (٥) بەدەستکێشراوی منارەی هەولێر لەلایەن (هێرزفیلد)ەوە.**



**وێنەی ژمارە (٦)**
**منارە پێش نۆژەنکردنەوە**

پەنجەرەی دووەم دەکرێتەوە بە لای باکوور لە سەرەتای لوولەی منارەکە واتە لە نێوان بنکەو لوولەکەی پێوانەکەی (١.٥٠م × ٧٠سم) بەڵام پەنجەرەی سێیەم بەهەمان شێوە و پێوانی پەنجەرەی دووەم لە پلیکانەکانی دەرگای رۆژئاوا دەکرێتەوە بە لای باشوور، دەتوانرێت لە پەنجەرەی دووەم و سێیەم بێیتە سەر تارمەیەک لە نێوان بنکەکەو سەرەتای لوولەکەی کە پانییەکەی (٥٠سم)ە.

بەشی یەکەمی منارەی چۆلی واتە بنکەکەی پێک هاتووە لە دوو ریز تاقی داخراو (حنايا صماء) لە سەر یەک ریز بوون، ریزی خوارەوە پێک دێت لە پێنج تاق، دابەش بوون بەسەر هەموو لایەکان جگە لەو دوولایەی کە بەر دیواری مزگەوتەکە دەکەوێت، پێوانی یەکێک لەو تاقانە نزیکەی (٢.٥-٣م × ١.٨٠م) کۆتاییان دێت بە کەوانەیەکی نیوە بازنەیی (عقد نصف دائري)یان نووک تیژ (عقد مدبب).

بەڵام بەشی دووەمی تاقەکان واتە ریزی سەرەوە لە بنکەی منارەکە پێک دێت لە هەشت تاقی داخراو بە هەمان شێوەی تاقەکانی خوارەوە جگە لە دوو تاقی رۆژئاوا و باکووری رۆژئاوا نەبێت کە بەرزییەکەیان کەمترەو پانییەکەیان فراوانترە.

هەروەها لە بەشی سەرەوەی بنکەکە کۆمەڵێک تاقی داخراوی بچووک بە شێوەیەک کە هەر چوار تاقێک لەلایەکی بنکە هەشت لایەکە ریزکراون، ناوەڕاستی سەر تاقەکان بۆ سەرەوە دەرچووە لە شێوەی بنکەی سێگۆشەیەکی سەر بەرەو خوار. بڕوانە وێنەی ژمارە(٧).

**نەخشەکانی سەر منارەی چۆلی:**

نەخشەکانی سەر منارەی چۆلی دەکرێن بە دووبەش:

**یەکەم:** نەخشی نووسین (الزخارف الكتابية): لە بەشی دووەمی منارەکە واتە لوولەکەی شریتێک لە نەخشی نووسینی لە دەوری لوولەی منارەکە سوڕاوەتەوە، نەخشە ئەندازەییەکان لە یەکتر جیا دەکاتەوە، نەخشەکەش بریتییە لە ناوی (محمد) دروودی خوای لێ بێت بە خەتی کوفی چوارگۆشە بە شێوەی ئاسایی راست و پێچەوانە (مقلوب) نووسراوە و چەند جارێک دووبارە بۆتەوە، ئەمەش بۆ پڕکردنەوەی بۆشاییەکان و لایەنی جوانییە.

شایانی باسە هەموو نەخشەکانی منارەی چۆلی بەخشتی شووشەیی رووپۆش کراو بەڕەنگی شین کراوە، بۆ جوانکاری و جیاکردنەوەی لە خشتەکانی تر.



**وێنەی ژمارە (٧)**
منارە لەکاتی نۆژەنکردنەوەدا

**دووەم:** نەخشی ئەندازەیی (الزخارف الهندسية): نەخشە ئەندازەییەکانی منارەی چۆلی دەکرێن بە چەند جۆرێک لەوانە/ ئەستێرەی چوارلا و پێنج لا و شەش لا، خاچ، سینی ئەستێرەیی (طبق نجمي)، کاس، تبل، بادمیە و لوزە. بروانە وێنەی ژمارە(٨،٩).

زۆربەی نەخشە ئەندازەییەکان لە یەکتر دەچن و بەشێکی کەمیان لێ ماوەتەوە، لەوانە تاقی رۆژهەلات شێوەکەی لاکێشەیی و بە چوارچێوەیەک دەورە دراوە کۆتایی دێت بە کەوانەیەکی مدبب، ناوەوەی تاقەکە بە خاچی شکاوە (الصليب المعقوف) پڕ کراوەتەوە، هەریەک لەو خاچانە لە ناو چوارگۆشەیەکدان. بەلام گۆشەکانی ئەو تاقە پڕکراوەتەوە بە ئەستێرەی پێنج لاو شێوەی ئەندازەیی شەش لا.

هەروەها تاقی باشووری رۆژئاوا هەمان شێوەی تاقی پێشووی هەیە بەلام نەخشەکانی ناوەوەی بریتییە لە شێوەی پیتی (T) ئینگلیزی، بەشێکی کەمی لێ ماوەتەوە. بروانە وێنەی ژمارە(١٠).

تاقەکانی بەشی سەرەوەی بنکەکە هەمان شێوەی تاقەکانی بەشی خوارەوەیە تەنها جۆری نەخشەکەیان جیاوازە، نەخشی دووانیان ماوەتەوە ئەوانیش بریتین لە تاقی رۆژهەلات نەخشەکەی ناوەوەی پێکدێت لە ئەستێرەیەک لە ناوەڕاست و کۆمەلێک شێوەی کاسە (کاس) لە دەوری بەشێوەی بازنەیی ریز بوون و ئەوانیش دەورەدراون بە شێوە بازنەییەکی گەورە، ئەو کۆمەلە نەخشە بەیەکەوە پێی دەوترێ سینی ئەستێرەیی.

هەر لەناوەوەی ئەو تاقە ئەستێرەی چوارلا لە ناو بازنەیەک دەردەکەون و لە لای راست و چەپی خاچی شکاوە هەیە سەرەکانیان درێژ بۆتەوە و بە یەک گەیەنراون، بەلام گۆشەکانی ئەو تاقە پڕکراوەتەوە بە ئەستێرەی شەش لاو لە ناوەڕاستی و نێوانەکانی شێوەی (التبل) هەیە، سەر ئەستێرەکانیش پڕکراوەتەوە بە شێوەی (بادمیە).

تاقی دووەم لە تاقەکانی بەشی سەرەوە بریتییە لە تاقی باکووری رۆژئاوا، نەخشەکەی پێکدێت لە سینییەکی ئەستێرەیی لەگەل ئەستێرەیەکی چوارلا چەند جارێک دووبارە بۆتەوە، لە نێوان (طبق نجمي)یە کە شێوەی (لوزە)ی هەیە. بەلام گۆشەکانی ئەو تاقە بەهەمان نەخشی گۆشەکانی تاقی یەکەم پڕکراوەتەوە بە شێوەی (تبل) (بادمیە).

لە کۆتایی سەرەوەی بنکەکەی ریزێک تاق هەیە کە بە شێوەی هەر چوار تاقێک لە لایەکی بنکە هەشت لایەکە ریزبوون، ناوەوەی ئەو تاقانە پڕکراوەتەوە بە ئەستێرەی چوارلا (چارلک).

**نەخشەکانی لوولەی منارەی چۆلی پێکدێت لە چوار جۆر**

**جۆری یەکەم:** نەخشی حەسیری



وێنەی ژمارە (٨)



وێنەی ژمارە (٩)



وێنەی ژمارە (١٠)

پێکدێت لە شێوەی لەبزینەیی (معین) سەرەکانیان درێژ بۆتەوە شێوەی معینی تری دروست کردووە.

**جۆری دووەم:** نەخشی شێوە پیتی (Z) کە هەردوو سەرەکەی درێژ بۆتەوە شێوەی معینی وەرگرتووە، نەخشەکانی جۆری یەکەم و دووەم جیادەکرێتەوە بە شریتێک شێوەی پیتی (X) لە نێوان هەر دوو پیتێک شێوەیەکی شەش لا هەیە.

بەڵام نەخشەکانی جۆری سێیەم و چوارەم تارادەیەکی زۆر لەیەکتر دەچن، کە پێکدێن لە شێوەی چەند چوار گۆشەیەکی گەورە لە هەر چوارسەرەکەی چوار چوارگۆشەی بچووکی پێوە لکاوە، لە ناودراستی لاکانی چوارگۆشە گەورەکە هێڵێک درێژ بۆتەوە لە شێوەی پیتی (T).

نەخشەکانی جۆری دووەم و سێیەم شریتێکی نووسین جیایان دەکاتەوە وەک لە پێشدا باسمان کرد، بەڵام بەشی سێیەم و چوارەم شریتێک لە شێوەی پیتی (X) جیایان دەکاتەوە، لەوانەیە لە کۆتایی منارەکە شریتێکی تر هەبووبێت بەڵام بەهۆی رووخانی لووتکەکەی دیار نەماوە.

سەرچاوەکان

- الاعظمي، خالد خليل حمودي: الزخارف الجدارية في اثار بغداد، بغداد ١٩٨٠.
- أمين، حسين: المدرسة المستنصرية، بغداد ١٩٦٠.
- الجنابي، كاظم: حول الزخارف الهندسية الاسلامية، سومر، العدد ٣٤، مجلد ١،٢، ١٩٧٨.
- حسين، كامل: التنقيب حول المئذنة المظفرية في أربيل، سومر، العدد ١٨، ١٩٦٢.
- حسين، محسن محمد: اربيل في عهد الاتابكي، بغداد ١٩٧٦
- حميد، عيسى سلمان وآخرون: العمارات العربية الاسلامية في العراق، بغداد ١٩٨٢
- حميد، محمد حسين: العناصر الزخرفية، سومر العدد ٤٥، مجلد الاول، ١٩٧٨
- الحيدري، عبدالباقي عبدالجبار: التجديد الحضري لقلعة أربيل، بغداد ١٩٨٣
- رزق، عاصم محمد: معجم مصطلحات العمارة والفنون الاسلامية،
- ريج، كلوديوس جيمس: رحلة ريج الى العراق سنة ١٨٢٠م، ت بهاءالدين نوري، بغداد ١٩٥١
- غالب، عبدالرحيم: موسوعة العمارة الاسلامية، بيروت ١٩٨٨
- القلقشندي، احمد بن علي: صبح الاعشى في صناعة الانشأ، سرحة وعلق عليه محمد حسين،بيروت ١٩٨٧
- قزاز، وداد علي: المنارة المظفرية في أربيل تاريخها ووصفها، سومر العدد ١٦، ١٩٦٠
- مديرية الاثار العامة، المواقع الاثرية في العراق، بغداد ١٩٧٠
- مديرية الاثار العامة، أضبارة المنارة المظفرية رقم ٣٦/٤٨
- نيبور، رحلة نيبور الى العراق في القرن الثامن عشر (١٧٦٦م)، ت: محمود حسين، بغداد ١٩٦٥

ئەم بابەتە لە گۆڤاری سوبارتو ژمارە ٢٠٠٧/١ بڵاوبۆتەوە.

# وەسفی منارەی چۆلی
# (موزەفەرییە)

**دکتۆر سەباح مەحمود ئەلقازی**
**مامۆستای وانەبێژ- بەشی شوێنەوار**
**زانکۆی سەلاحەدین**

منارە کەوتۆتە پشتی قەلاتی هەولێـــر لەلای ڕۆژئاوا[1] یەک کیلۆمەتر لە قەلا دوورە.[2] لە ڕێی ئەو لێکۆڵینەوە شوێنەوارییانەی لەسەر مزگەوتەکە ئەنجامدراوە، دەرکەوتووە کە منارەکە بەمزگەوتەکەوە نەلکاوە. تەنیا لە قوڕنەی باکووری ڕۆژئاوای دیواری دەرەوەی مزگەوتەکە نەبێ[3]، کە ئەمەش وای کردووە بەدرێژایی چاخەکان بەرزییەکەیەوە، چونکە هەندێک دەڵێن بەرزی ئەو منارەیە بەقەد منارەی حەدبا بووە کە لەموسڵە[5]. بەم شێوەیەی منارەی چۆلی بەوەی کە بەسەری هات، بەشی سەرووی ڕووخاوە. هەندێ بۆچوونی دیکە هەن دەڵێن: ئەو منارەیە موزەفەرەدین گوگبری، دواتر لەسەر مزگەوتێک دروستی کرد، کە پێش ئەو مزگەوتەکە دروست کرابوو[6].

لە ساڵی ١٩٦٠ز. دەستەیەکی پسپۆڕ لە بەڕێوەبەرایەتی شوێنەواری گشتی لەبەغدا بۆ چاککردنەوەی بناغەی ئەو منارەیەو بەشەکانی خواری لەگەڵ هەندێ لە نەخش و نیگارەکانی کە کەوتوونەتە خواردوە هاتنە هەولێر، بینییان ئەو منارەیە جگە لەبەشی ژێرەوەی بناغەکە، بەخشت و گەچ دروست کراوە، بەڵام بەشی ژێردوە لە بەردی چاککراو و گەچ دروست کراوە[7] بناغەی منارەکە لەچەند لایەکی پتەو دروست کراوەو درێژی هەر لایەک نۆ پێ و یانزە گرێیە، واتە نزیکەی (٣م)[8] واتە وەک بناغەی منارەی سنجار دروست کراوە[9] کە مێژووەکەی بۆ ٥٥٩ک دەگەڕێتەوە[10] کە بناغەکەی بەدوو پۆل ڕازێنراوەتەوە، هەروەکو لەوێنەکە دیارەو بەشی یەکەم بەبناغەی قوڕنەی باکووری ڕۆژئاوای مزگەوت لکێنراوە، ئەم بەشە لە حەوت لا پێکهاتووە، نەک هەشت لا. بەڵام بەشی دووەمی بناغەکە لە هەشت لا پێکهاتووە. لەبەر ئەوەی بەرزی دیواری مزگەوت لەگەڵ بەرزی بەشی یەکەمی بناغەکە کۆتایی دێت.

منارەکە لەبەشی یەکەم دوو دەرگای بەرامبەر یەکی هەیە، هەر یەکە بەکار دەهێندرێت و دەتگەیەنن بە پەیژەیەکی لوول پێچ، کە لەناو منارەکە لوول دراوە، کە دەسوورێتەوە بەبێ ئەوەی بەیەک بگەن[11]. پێدەچێ ئەو دوو پەیژەیە گەیشتبنە ناوەڕاستی منارەکە، یەکەم بۆ بناغە بەرز بووبایەوە ئەوی دیکە بۆ سەرووی منارەکە، کە بەشێکی ڕووخاوە[12]. هەر لایەک لەهەردوو بەشەکانی بناغەکە بەشێوەی لاکێشە ڕازێندرابوونەوە، کە لەناویاندا گرێی نووکدارو تیژ لەخۆ دەگرن، شریتێکی تەسکی نادیار تاڕادەیەک لە ژووروو سەرووی بناغەکە خوار دەبۆوە خۆی لە نووسینی کوفی دەکردو بۆ یادگاری بووە، کە ناوێکی تیادا تۆمار کرابوو، بریتی بووە لەناوی بنیاتنەری منارە و ساڵی دامەزراندنی. هەروەکو لەمنارەی سنجار دروست کراوە. هەروەها ئەو شێوەیە بەشریتێکی دیکە کە

لەشێوەی چوارگۆشە دروست کراوەو گرتێی کراوەی لەخۆ گرتووە، دووبارە بۆتەوە[13] و زۆر بەرزیش نین و ژمارەیان سی و دووەو، هەر چواریان لەلایەکە لەرووی بناغەکەوە، ئەو شریتە دامەزراوە، کە لەبەشی خوارەوەی دیوار لەدیواری حەوزی یەکەمی منارە دروست کراوە، گوزارشت لەوە دەکات، کە بەشی خوارەوەی منارەکەیە[14]. هەروەها دوو شریتی دیکە هەن لەبەرزاییەو وشەی (محەمەد) درووودی خوای لەسەر بێ بەخەتی کوفی دووبارە بۆتەوە، بەلام لەهەردوو پۆلی خوارەوەدا هەمان نووسین شێوەکەی ئاوەژوو بۆتەوە[15] (بڕوانە شریتی B لەهێلکاری منارە)، ئەم شریتە بە شریتێکی دیکە بەرز دەبێتەوە بەنەخش و نیگاری شەش لایی و، یەک ئەوی دیکە دەبڕێ، وەک پیتی (X).

بیناسازی موسڵمانەکان هەوڵ و کۆششێکی زۆریان کردووە بۆ جوانکردن و رازاندنەوەی بناغەی منارەی موزەفەرییە، تاگەیشتە ئەو ئاستەی هەر هەمووی نەخش و نیگار بەخۆوە ببینێ، کارە تێهەڵسووەکان کاریان تێیدا کردووە و نیگاری کەرپووچ بەجوانترین شێوە بەتێکەڵی بەکارهێنراوە[16] بەرەنگی شین کە زۆر بەوردی براوەو تارێژەیەکی بەرز هونەرکاری تیایدا کراوە، بەشێوەیەکی ئەوتۆ لە سەرووی ئاستەکان بێت بەنەخش و نیگاری



جوان و وردی ئیسلامی (لەسەر یەک دانانی ئەستێرەکان) کە بەشێوەی نەخش و نیگاری کەرپووچەکان دەکا کە تێکەڵ یەک نەبووبن و بناغەی منارەی سنجار پێی رازێندراوەتەوە. سەرەڕای ئەوەی هونەرکاری موسڵمان داهێنانی لەدانانی خشتەکانیش کردووە، کە لەو بناغەیە بەکارهاتووە، شایانی باسە بناغەی منارەی هەولێر بەگرنگترین و جوانترین بناغە دادەنرێت لەچاو بناغەی منارەکانی دیکەی عێراقدا[17].

بەلام قالبەکەی لوولەییەو هەرچەندە بەرز بییەوە شتەکان بچووک دەبنەوەو کەرپووچ و گەچ بەگەورەیی و رێکوپێکی دروست کراوە. بەشەکەی تریشی، کە زۆر بەرزە هەروەکو دەڵێن بەرزییەکەی بەقەد بەرزی منارەی (حەدبا)یە لەموسڵ، کە پێشتر باسمان کرد زۆر بەهونەری رازێندراوەتەوە. سەربانەکەی کە لەقالبەکەی ماوەتەوە بۆتە چوار بەش و هەر بەشەو لە بەشەکەی تر بەشریتێکی تەسکی رازێندراو بەنەخش و نیگاری خشتی سوور جیا دەبێتەوە[18]. یەکێ لەو شریتانە بەنووسینی خەتی کوفی رازێندراوەتەوە، بڕوانە شریتی -B- لە شریتەکانی قالبەکە ئەویش بە وشەی (محەمەد) درووودی خوای لەسەر بێ.

بەلام چواربەشی قالبەکە بەنەخش و نیگاری بەردی جوان لەسەر دوو ئاست رازێندراوەتەوە لەدەرەنجامی جیا جیای دانانی ریزی خشتەکان کە بەشێوەیەکی ئەندازییانەی چوار گۆشەیی و شەش گۆشەیی دووبارە بۆتەوەو بەخشتی رەنگی شین کارە ئەندازەییەکە ئەنجامدراوە، وەکو ئەوەی بازنەیەک دەوری چوار بەشی قالبی منارەکەی دابێ. سەرنج دەدەین لەشێوەی نەخش و نیگارو جوانکردنی هەردوو منارەی سنجارو حەدبا پێشکەوتووتر بووە. دیارە شێوەی نەخش و نیگارەکە لەچوار بەشەکەی قالبەکە کە لەیەک نەخش و نیگار بۆ ئەو چوار بەشە خۆی

دەبینێتەوەو بەیەکەوە لکێنراون لەسەر شێوەی چوارگۆشەی یەکتربڕ لەیەکچوو بوون[19]. جا ئەگەر سەرنجمان دا دەبینین نووسینەکان بەخەتی کوفی نووسراون و لەبەشی دووەمدا دەتوانین وشەی (محەمەد) دروودی خوای لەسەر بێ بخوێنینەوە. هەروەها دەشێ لە بەشی سێیەمی قالبەکە وشەی (صلوة)، (صلاة) بخوێنینەوە.

لەوەی کە باسمان کرد دەبینین کە هونەرکاری موسڵمان توانیوەیەتی هەموو شتێک لەو منارەدا کۆبکاتەوە، کە رووی هونەری نەخش و نیگاری ئەندازەی ئیسلامی پێی گەیشتووە، جا چ بەدانانی ئەستێرەکان بێ یان نووسینەکان کە خۆی بەمەتەڵێک نیشان دەدا، وەکو ئەوەی پێویست بکا هەڵی بێنی. دەخوازم کە سەرکەوتوو بووبم لە شیکردنەوەی هەندێکیدا.

لەگەڵ ئەوانە هەر هەمووی لەمنارەی موزەفەریە سەرنج دەدەین، کە بەقوناغێکی پێشکەوتوو گوزارشت دەکرێت لە دروستکردنی منارەی ئیسلامیداو لەوەی تێپەڕاند کە وەک منارە تازەکان بووبێ (سنجار- حەدبا- داقوق)، چونکە گەر خراپ نەبووایە لە بەشی سەرووی و هەندێ لە نەخش و نیگارەکانی پەرشوبڵاو نەبووبانەتەوە، کە لەجوانی لوولەییەکەی کەم کردۆتەوە، ئەوا خۆی راستییەکەی شی دەکردەوە.

شایانی باسە بەپێی بۆچوونەکان منارەی موزەفەریە لەکۆتایی چاخی شەشەم و دەستپێکی چاخی حەوتەمی کۆچی دروست کراوە، پاش ئەوەی میر موزەفەرەدین گوگبری حوکمڕانی گرتە دەست و خێرو بێری میرنشینەکەی زێدەی کرد، کە بووە هۆی ئەوەی بتوانێ ئەو مزگەوتە گەورەیەو ئەو منارە جوانە پێکبهێنێ و دروست بکات[20].

## سەرچاوەو پەراوێزەکان:


١- أبن خلكان، أبي العباس شمس الدين أحمد بن محمد بن أبي بكر، تحقيق أحسان عباس، مطبعة الغريب بيروت، لبنان ١٩٧١م، ج٤، ص١١.

٢- الباشا، حسن الفنون الاسلامية والوظائف على الاثار، مطبعة لجنة البيان العربي القاهرة ١٩٦٥-١٩٦٦.

٣- باقر وسفر، طه وفؤاد، المرشد إلى موطن الاثار والحضارة، الرحلة الخامسة ١٩٦١.

٤- حسين، محسن محمد، اربيل في العهد الاتابكي، مطبعة أسعد بغداد ١٩٧٦.

٥- حسين، كامل، التنقيب حول المئذنة المظفرية في أربيل، سومر المجلد ٢٢، لسنة ١٩٦٢م.

٦- حيدر، كامل، العمارة العربية الاسلامية، نشوء المدارس الاسلامية وخصائصها في العصر العباسي، دار الفكر اللبناني- بيروت ١٩٩٥م.

٧- ريج، كلوديوس جيمس، رحلة ريج في العراق عام ١٨٢٠م، مطبعة السكة الحديد بغداد ١٩٥١م.

٨- سليمان، عيسى، وآخرون العمارات العربية الاسلامية في العراق، بغداد ١٩٨٢.

٩- شافعي، فريد محمود، العمارة العربية الاسلامية ماضيها وحاضرها ومستقبلها، شركة الطباعة العربية السعودية، الرياض، ١٤٠٢/١٩٨٢م.

١٠- شبلي، أحمد، تاريخ التربية الاسلامية، مكتبة الانكلو المصرية، ١٩٦٠م.

١١- العزاوي، عباس، أل بكتكين، أمارة أربيل في عهدهم، مجلة المجمع العلمي العربي بدمشق، مجلد ٢٢ لسنة ١٩٤٦- ١٩٤٧.

١٢- العزاوي، عبدالستار جبار، العقود والاقبية العراقية في العصور الاسلامية، رسالة ماجستير غير منشورة. جامعة بغداد، كلية الاداب، ١٩٦٩م.

١٣- الغزالي، أبو حامد محمد بن محمد ت ٥٠٥هـ، أحياء علوم الدين، المطبعة الميمنية بمصر ١٣١٢هـ.

١٤- فكري، احمد، (التاثيرات الفنية الاسلامية العربية علي الفنون الاوربية) مجلة سومر، المجلد ٢٣ لسنة ١٩٦٧.

١٥- القزاز، وداد علي، المنارة المظفرية في أربيل تاريخها ووصفها، سومر، مجلد ٢٠ لسنة ١٩٦٠م.

١٦- محمد، غازي رجب، العمارة العربية في العصر الاسلامي في العراق، مطبعة التعليم العالي والبحث العلمي، ١٩٨٩م.

١٧- نيبور، كارستن، رحلة نيبور إلي العراق في القرن الثامن عشر، ترجمة محمود حسين الامين، بغداد ١٩٦٥م.

١٨- يوسف، شريف، تاريخ العمارة العراقية في مختلف العصور، دار الرشيد للنشر- ١٩٨٢م.



# دراوی ئەربل
# لە قەڵای هەولێردا

دکتۆر ناهز عەبدولرەزاق دەفتەر ئەلقەیسی
بەشی شوێنەوار - زانکۆی بەغدا

دەمەوێت سەبارەت بە دراوی ئەربل بدوێم، کە لە سەدەی شەشەمی کۆچی/ دوازدەمی زایینی دروست کراوە.

دراو بەڵگەنامەیەکە وەک بەڵگەنامەکانی دیکە خاوەن کات و شوێن و ئامانج و نیشانەی خۆیەتی.

سازکردنی دراوی زێڕ (دینار) و زیو (درهەم) و مس (فلووس) لەو کاتیدا گرنگی ئەم شارە دەردەخات.

هەولێری پایتەختی هەرێمی کوردستانی ئەمڕۆ، دەکەوێتە شوێنێک ٤١٤ مەتر لەسەر ئاستی دەریا بەرزە، دەکەوێتە خوارووی ڕۆژهەڵاتی مووسڵ و بە دووری ٨٧ کم.

هەولێر یەکێکە لەشارە مێژووییەکان، کە هەر لە هەزارەی شەشەمی پ.ز شارستانیەتی تێدا بووە، چەندان دێی کشتوکاڵی تێدا دۆزراوەتەوە.

لەساڵی ٦٤٢ی زایینی موسڵمانەکان شاری هەولێریان گرت، لەو ماوەیەدا بوو بە ناوەندێکی (زانستی و ڕۆشنبیری) تا سەردەمی دەوڵەتی عەباسی، دواتر دەوڵەتی ئەتابەکی، دەوڵەتی مەغۆلی و جەلائیری، ئەنجا کەوتە ژێر دەستەڵاتی دەوڵەتی قەرەقۆینلو، پاشان سەفەوییەکان و دەوڵەتی عوسمانی هەر لەساڵی ١٥٣٤ی زایینییەوە، لە سەردەمی سوڵتان سلێمانی قانونی و تا ساڵی ١٩١٨ زایینی بەردەوام بوو.[1]

### بنچی دراو

مرۆڤی کۆن لە ئەشکەوت و کەلێنان دەژیان ڕاوی ئاژەڵانی دەکردو بەروبوومی داروباری دەخوارد.

کەمرۆڤ دەگەیشتە مرۆڤێکی دیکە کێشەو ململانێ لەنێوانیاندا ڕووی دەدا و مانەوە بۆ بەهێزەکەیان دەبوو، ئەوەبووە یاسای جەنگەڵ.

لەدوا چاخی بەستەڵەکدا مرۆڤ ناچاربوو لە ئەشکەوتەکاندا بێتە دەرەوەو بەدوای شوێنێکی گەرمتردا بگەڕێت، ئەویش کەناری ڕووبارەکان بوو، کە جێگایەکی باش بوو بۆ پێکهێنانی نیشینگەکانی یەکەم پرۆسەی ئابووری لەو کاتەدا دەستی پێکرد، کە یەکێکیان بەرهەمی زێدەی دەبوو هەوڵی دەدا بەو شتە بیگۆڕێتەوە کە پێویستیەتی، بۆ ئەو مەبەستە بەرهەمە زێدەکەی دەبردە شوێنەکانی دیکەی نیشینگەکە، بۆ ئەوەی کەسێک بدۆزێتەوە پێداویستی ئەو دابین بکات.

ئەو ئاڵوگۆڕە واتە گۆڕینەوەی شت بەشت بەردەوام بوو تا چەندان گیروگرفتی تێکەوت، وەک: نەبوونی هاوئاهەنگی لەنێوان ویستی لایەنەکان، ئەوەی دانەوێڵەی هەیە بۆ نموونە هەوڵدەدات بەرۆنی بگۆڕێتەوە، بەڵام ئەوەی رۆنی هەیە پێویستی بەدانەوێڵە نییە، دەشێ پێویستی بەپێست بێت، لێرەدا هەوڵدەدەن کەسی سێیەم بدۆزنەوە پێستەی هەبێت و رازی بێت بەو شتانەی کە هەیە بیگۆڕێتەوە. ئەمەو چەندان گیرگرفتی دیکە وای کرد مرۆڤ کالایەکی دیکەی ناوەند بدۆزێتەوە، کە نرخی شتەکان بێت. ئەم کالا ناوەندییە لەولاتێکدا بۆ ولاتێکی دیکە دەگۆڕا، لەولاتی یۆناندا گا و چەک کالای ناوەندی بوون، لەچین بەلەم، لەعێراقی کۆن دانەوێڵە (جۆ) و کانزا (زیو) کالای ناوەندی و بنچینەی ئاڵوگۆڕکردن بوو، (شەیقەل)ی زیو یەکەیەکی سەنگ بوو. لەدەقە مسمارییەکان هەر لەهەزارەی سێیەمی پێش زایینییەوە لای ئەکەدییەکان و بابلییەکان و ئاشوورییەکان، لە چاخی ئاشووری نوێ لەسەردەمی پادشای ئاشووری سەنحاریب ٧٠٤- ٦٨١ پ.ز کە فەرمانی بەدروستکردنی (شەیقەل) دا، هەر لەو کاتەوە شەیقەل و نیو شەیقەل بوو بەیەکەیەکی ئاڵوگۆڕ پێکردن. دەتوانین بڵێین دراو هەر لەو کاتەوە دەرکەوتووە، واتە پێش ٢٣٠٠ ساڵ بەر لەئێستا، وشەی (شەیقەل) لەیاساو دەستوورەکانی عێراقی کۆندا هاتووە، وەک دەستووری حامورابی ١٧٩٢- ١٧٥٠ پ.ز.

ئەم یاساو دەستوورە کۆنانە دەقی ئابووری تێدایەو وشەی شەیقەل لەزۆر لەو دەقانەدا هاتووە.

شەیقەل دروستکردنی لە ئاشوورییەکانەوە گوازرایەوە بۆ لیدییەکان دانیشتوانی ولاتی ئەنادۆل- تورکیای ئەمڕۆ- لەوانەوە دراو دروستکردن بۆ هەموو ولاتانی دیکەو شارە گەورەکان بلاوبۆوەو هەر دەوڵەتێک یان شارێک دروشمێکی تایبەتی لەسەر دراوەکەی نەخشاند.

باری ئابووری پێش ئیسلام لە سێ سیستەمی دراو پێکهاتبوو: دراوی بێزەنتی، کە لە ولاتی شام و میسرو سەرووی ئەفەریقیا باو بوو، دراوی زیوینی ساسانی، لە عێراقدا باو بوو. سەردرای درهەمی یەمانی لە بازارەکانی عەرەب پێش ئیسلام وەک عوکاز و نەجران ئاڵوگۆڕیان بەدراوی زێڕو زیو دەکرد لەسەر کێش و پێوان بەرێگای قستاس.[2]

لەسەرەتای ئیسلامدا، باسی دینار لەقورئانی پیرۆزیشدا کراوە، وەک لەسوورەتی ئال عیمران: (بسم الله الرحمن الرحیم، ومنهم ان تأمنه بدینار لایؤده" صدق الله العظیم).

سەبارەت بەدرهەم لەسوورەتی یوسفدا هاتوو: بسم الله الرحمن الرحیم "وشروره بثمن بخس دراهم معدودة" صدق الله العظیم.

## دراوی ئەربلی لە چاخی ئەتابەگیدا

رۆڵی هەولێر لەدراو سازکردندا لە سەردەمی دەوڵەتی ئەتابەکی (٥٣٩- ٦٣٠) کۆچی/ (١١٤٤-١٢٣٢ز) دەرکەوت.

ئەم دەوڵەتە زەینەدین عەلی کوڕی بەکتەکین دایمەزراند و فەرمانڕەوایی لە موسڵ و شەنگارو حەران و تکریت و هەولێردا دەکرد، بەلام وازی لە هەموو شارەکان هێنا جگە لە هەولێر، دواتر زەینەدین یوسف ٥٦٣ -٥٨٦ کۆچی/ ١١٦٧- ١١٩٠ زایینی، فەرمانڕەوایی هەولێری کرد و دوای ئەویش مزەفەرەدین گوگبری ٥٨٦- ٦٣٩ کۆچی/ ١١٩٠-١٢٣٢ زایینی، کە ئەبو سەعید کوڕی حوسێن زەینەلعابدین عەلی کوڕی بەکتەکی کوڕی محەممەدی ناسراو بە پادشای مەزن (الملک المعظم) ئەویش خوشکی سەلاحەدین ئەیوبی خواست، هەولێر لەساڵی ٥٨١ه/ ١١٨٥ز کەوتبووە ژێر دەستەلاتی دەوڵەتی ئەیوبی، کە سەلاحەدین ئەیوبی دەستەلاتی بەسەر ناوچەکە رادەگەیشت.

هەڵبژاردنی شاری هەولێر، کە ئەو کاتەی تەنیا قەلات بوو، وەک بنکەیەکی دراو سازکردن بەڵگەیەکی گەورە بوو بۆ گرنگی هەولێر لە لایەنی رامیاری و ئابووری و کۆمەلایەتی، لە هەولێردا دراوی مسین و دیناری زێڕین لەچاخی ئەتابەکی لێدران.

لەوانەش دراوی مسین کە لەساڵی ٥٨٧ کۆچی لێدراوە و ئەمڕۆ لە مۆزەخانەی بەریتانی لە لەندەن پارێزراوە.

روو: وێنەیەکی نیوەیی کەسێک دیارە پرچی گروازەیە، بۆ لای راست دەڕوانێ و رووی لاوێکە ردێن و سمێڵی تراشاوە.

چێوە: لەسەری نووسراوە پادشا ناسر کوڕی یوسف گوگبری کوڕی عەلی.

پشت: (ناوەند): خودا ناسرەدین ئەمیری ئیماندارانی توێشووی دنیاو دین ئەبو محەممەد سەرخات.

چێوە: بەناوی خودا ئەم فلسە لە ئەربل (هەولێر) لە ساڵی (٥٨٧) کۆچی لێدراوە.[3]

هەمان دراو لەهەمانساڵدا ٥٨٧ كۆچی لە قاڵبێكی دیكەدا سازكرا.
روو چیـوە: وەك دراوی رابردوو بوو تەنیا جیاوازی لەپشتدا هەبوو وەك:
ناوەند: خودا ناسرەدین میـری ئیمانداران توێشووی ئایین ئەبو محەمەد سەربخات.
چیـوە: بەناوی خـودا.. ٥٨٧ سازكراوە [٤]، ئەم دراوە لەقاڵبێكی سێیەمدا سازكراو بەم شێوەیە:
ناوەندی روو: رووی لاوێك روو لە چەپە نەك راست.
ناوەندی پشت: خودا، ناسرەدین، میری ئیمانداران، توێشووی، دنیا و دین، (ئەبو محەمەد)
چیوە: بەناوی خودا، ئەم فلسە لە ئەربل ساڵی ٥٨٧ سازكراوە. [٥]
مۆزەخانەی ئەستەنبوول دراوی چوارەمی تێدایە لە دراوەكانی هەولێر و ئی هەمان ساڵ.
روو: وەك دراوی پێشوو وایە.
چیوە: پادشا ناسر یوسف، كوڕی ئەیوب گوگبری كوڕی عەلی.
ناوەندی پشت: (خودا ناسرەدین ئیمانداران توێشووی دنیاو دین میر ئەبو نەسر)
چیوە: بەناوی خودا ئەم فلسە لە ئەربل (هەولێر) سازكراوە لە ساڵی ٦٨٧[٦].

هەبوونی چوار قاڵبی جیـاوازی دراو لە ساڵێكدا واتە نزیكەی چوار سـەد هەزار دراو لەو ساڵـەدا سازكراوە. ئەوەشیان ئاماژەیەكە بۆ ژمارەی دانیشتوانی قەڵای هەولێر لەساڵی ٥٨٧ی كۆچیدا. هەروەها دەتوانین لێكۆڵینەوەیەك سەبارەت بە كرێ و حاڵەتی ئابووری گەشەسەندوو لەو كاتیدا بكەین، هەندێ لە دراوی (ئەربل)ی ساڵی ٥٩٠ كۆچی بەم شێوەیە:
روو: وێنەی مرۆڤێك لەسەر پشتی شێرێكدایە.
وێنەكـە چیـوەیەك نووسینی لەسەرە.
چیوە: ساڵی پێنجسەد (لەلای چەپ) و ساڵی نەوەد (لەلای راست) و (لە هەولێر سازكرا) لە خوارەوەی وێنەكەدا.
ناوەندی پشتەوەی: ناسری ئایینی خودا، میری ئیمانداران، پادشای میران، سەركەوتوو لە دنیاو دین گوگبری، عەلی، پەیامبەری خودا.
دواتر بایەخی هەولێر پەرەی سەند، تا بوو بەشوێنی سازكردنی دیناری زێڕ ئەوەیان دووبارە بایەخی ئەم شارە دەردەبڕێت.
دیناری زێڕ تەنیا لەپایتەخت و شارە گەورە و گرنگەكان ساز دەكرێت، لە دینارە زێڕییەكانی هەولێر كە لەساڵی ٦٠٩ كۆچی سازكراوە بەم شێوەیە:
روو: (بن علي، لا الا الله، وحده لاشريك له، الناصرالدين الله، امير المؤمنين)
یەكەم چیوە: (بسم الله ضرب هذا الدينار بأربيل سنه تسع وستمايه)
واتە: بەناوی خودا، ئەم دینارە لەساڵی (٦٠٩)ی كۆچی لە (ئەربل) هەولێر سازكراوە.
دووەم چیوە (لله الامر من قبل ومن بعد يفرح المؤمنين بنصر الله)
واتە: فەرمان خوایە لە پێشان و لە داهاتووش لەو رۆژیدا ئیمانداران بە سەركەوتنی خودای تەعالا كەیف خۆش دەبن.
بنكەی پشت: (الملك- العادل- محمد رسول الله، صلي الله عليه وسلم، ملك الامراء گوگبري- ابوبكر) واتە (پادشای دادپەروەر، محەمەد پەیامبەری خودا دروودی خودای لەسەر بێت پادشای میران گوگبری- ئەبوبەكر)
چیوە: محمد رسول الله أرسلة بالهدى ودين الحق ليظهره علي الدين كله ولو كره المشركون)
دەبینین دەقەكانی ئەم دینارە زێڕینەی، كە لە هەولێر ساڵی ٦٠٩ كۆچی سازكراوە، نازناوی خەلیفەی عەباسی ناسر لدين الله میری ئیمانداران (٥٧٥- ٦٢٢ كۆچی) لەسەرە ئەو خەلیفە عەباسییە، كە لە هەمووان فەرمانڕەوایی زیاتر بوو، خەلافەتەكەی ٤٧ ساڵی خایاند و نازناوی (ئەبو عەلی)، كە نازناوی میر مزەفەرەدین گوگبری، میری (ئەربل) هەولێری ئەو كاتییە.
كەچی لە دەقەكانی پشتدا نازناوی پادشای دادپەروەر و شكۆ ناوی (ئەبوبەكر)ی لەسەرە كە بۆ برای سەلاحەدینی ئەیوبی دەگەڕێتەوە، كە بوو بەپادشای میسرو سوریا لەماوەی ٥٩٦-٦١٥ كـۆچی و نازناوی (الملك العادل) پادشای دادپەروەری لێندرا.
لە دەقەكانی ئەم دینارەدا تێبینی زاڵبوونی ئەیوبییەكان دەكەین لە هەولێردا، دەقەكان هەندێ نازناوی نوێیان تێدایە وەك (ملك الامراء گوگبری) واتە (پادشای میران گوگبری) كە نازناوێكی نوێیە پلەوپایەی ئەم میرە لەو كاتیدا دیار دەكات.
- ئەم دینارە لە مۆزەخانەی بەریتانی لە لەندەن هەڵگیراوە، لینابول ج٩ ل ٣١٠-٣١١ بلاوی كردەوە، وادیارە سازكردنی دیناری (ئەربل)ی زێڕین بەردەوام بوو، لەساڵی ٦١٢ كۆچی دینارێكی زێڕ

سازكراوە، بەم شێوەی خوارەوە:

ناوەندی ڕوو: (عـدة الدنيـا- والدين لااله الا الله، وحده لاشريك له الناصر لدين الله، امير المؤمنين- ابو نصر).

چیوەی یەكەم: بسم الله ضرب هذا الدينار بأربل سنة احد وعشرين وستماية.

چیوەی دووەم: لله الامر من قبل ومن بعد يومئذ يفرح المؤمنين بنصر الله.

ناوەندی پشت: (الملك- الكامل، محمد رسول الله، صلى الله عليه وسلم، ملك الامراء گوگبرى- محمد)

چیوە: محمد رسول الله ارسله، بالهدي ودين الحق ليظهره على الدين كله ولوكره المشركون.

**دراوی (ئەربیل) هەولێر لە چاخی مەغۆلەكاندا:**

مەغۆلەكان لەبنجدا لەبانی مەنگۆلیای سەرووی بیابانی گولی ڕاهاتوون، ئەو بیابانەی پانتایی لە ناوەڕاستی ئاسیا لە خوارووی سیبیریا و سەرووی سین و ڕۆژئاوای مەنشووریا و ڕۆژهەڵاتی توركمانستان، لەنێوان چیای ئەلتای لە ڕۆژئاوا و چیای گەنگان لەڕۆژهەڵاتی داگرتووە.

مەغۆلەكان، چەندین هۆزی گەڕیدەن خەریكی شەڕو تاڵان بوون، جەنگیزخان (واتە مەزنترین فەرمانڕەوا) یان (ئیمپراتۆری مرۆڤایەتی) بەدامەزرێنەری دەوڵەتەكەیان دەژمێردرێت، دوای مردنی لەساڵی ٦٢٤ كۆچی- ١٢٢٧ زایینی، منداڵەكانی شانشینییەكەیان لەنێو خۆ دابەشكرد، بەڵام ئەوەندەی باوكیان لێهاتوو نەبوون.

هۆلاكۆی نەوە بوو بەدێوزمە و هێرشی بردە سەر دەوڵەتی عەباسی لە ساڵی (٦٥٦ھ/ ١٢٥٨ ز)، دواتر بەرەو باكوور بووەوە، لە هەولێردا دراوی سازكرد، هەر لەساڵی ٦٧٨ كۆچی لەو دراوانەش دراوێكی سینی مەغۆلی بەم شێوەیە

ڕوو: سەری دوو بازان

چیوە: لەهەولێر سازكراوە لەساڵی ٦٧٨.

ناوەندی پشتی: (قاأن، الاعظم، اباقا، ايلخان، المعظم)

چیوە: قل الله مالك الملك تؤتي الملك من تشاء وتنزع الملك ممن تشاء، وتعز من تشاء.[٨]

لە چاخی مەغۆلیدا لە هەولێر درهەمی زیو سازكرا لە ساڵی ٦٨٧ كۆچی.

ناوەندی ڕووەكەی: (لا اله الا الله محمد رسول الله)

(دەقەكەی لە نێو چوار گۆشەیەكدایە)

چیوە: لە هەولێر سازكرا ساڵی ٦٨٧.

ناوەندی پشتەكەی: بەخەتی ئیگۆری نووسراوە، وەرگێڕانەكەی:

(خانی مەزن- وەكیل- بریكار- ئەرغون- سازكراوە)(٩)

دراوی هەولێر لە سەردەمی سوڵتانی مەغولی غاران مەحموود ٦٩٤-٧٠٣ كۆچی.

ڕوو: (صلى الله، لا اله الا الله، محمد، ضرب اربل، رسول الله، عليه)

پشت: دەقی ئیگۆری وەرگێڕانەكەی:

(سوڵتان، مەزن، غازان مەحموود)

چیوە: لە هەولێر سازكراوە

لە دراوی زیوینی سەردەمی سوڵتانی مەغۆلی ئەبو سەعید كوڕی ئولگایتو ٧١٧-٧٣٦ كۆچی ناوەندی ڕوو: (لا اله الا، الله، محمد، رسول الله)، اربل

چیوە: ئەبوبەكر، عومەر، عوسمان، عەلی

ناوەندی پشت: لەڕۆژگاری، دەوڵەتی سوڵتانی مەزن، ئەبو سەعید بەدرخان، خودا پادشایەتی بەردەوام دەكات)

چیوە: ساڵی/ دوو/ بیست/ حەوت/ سەت[١٠]

لەدراوە مسییەكانی سوڵتان ئەبو سەعید بەهادرخان لەهەولێر هەر بەو شێوەی خوارەوەیە:

ناوەندی ڕوو: (لا اله الا الله، محمد، رسول الله)

ناوەندی پشت: (سلطان المعظم، اربل، ابو سعيد)

ئەم دراوە لەمۆزەخانەی عێراقی لەژێر ژمارەی ١٤٨٥ مسی پارێزراوە. لە درهەمە زیوینییەكانی مەغۆلی، كە لەئەربیل لێدراوە ساڵی ٧٨٥ كۆچی.

ناوەندی ڕوو: (علي- ابوبكر- لا اله الا الله، محمد، رسول الله، عثمان، عمر)

ناوەندی پشت: (السلطان الاعظم، ضرب، اربل سلطان احمد بهادر، خان خلد الله ملكه)

چیوە: سنه خمسه/ ثمانين/..

لەدراوە مسییەكانی هەولێر، كە شێوەی ئەستێرەی هەبێت لەسەرووی دەقەكانی ناوەندی ڕوو:

ناوەندی ڕوو: (لا اله الا، الله محمد، رسول الله)

ناوەندی پشت: (سلطان الاعضم، اربل، ابو سعيد)

لەدراوە مەغۆلییەكانی سەردەمی سوڵتان سلێمان خان ٧٤٠-٧٤٥

کۆچی.
روو: (لا اله الا الله، محمد، رسول الله، الله عفة)
چیوە: (ابوبکر عمر فاروق عثمان عفا علي مرض)
پشت: (السلطان العادل، کتابة، یغوریه، خله، الله ملکة، اربل)
دوای ئەوەی دەسەڵاتی مەغۆڵەکان کۆتایی هات دەسەڵاتی جەلائیری جێی گرتەوە، کە چەندان هۆزی رۆژهەڵاتی مەنگولیا بوون لە بنچدا مەغۆڵن یان تورک، حەوت فەرمانداری جەلائیری حوکمی عێراقیان کرد لە ساڵانی ٧٣٦-٨١٢ی کۆچی.
لە سەردەمی جەلائیرییەکاندا لە هەولێر دراو ساز کرا، واتە هەولێر بایەخی خۆی پاراستووە.
ناوەندی روو: (لا اله الا الله، ضرب، محمد اربل، رسول الله)
چیوە: (ابوبکر، عمر عثمان، علي)
ناوەندی پشت: (الله، یاحي، السلطان الاعظم)، شێخ ویس بهادرخان، خلد، الله ملکه)
چیوە: سڕاوەتەوە. ئەم دراوە لە مۆزەخانەی بەریتانی لە لەندەن پارێزراوە.
لە درهەمەکانی هەولێر ساڵی ٧٨٥ی کۆچی، بەم شێوەیە:
ناوەندی روو: (عمار- ابوکبر- لا اله الا الله، محمد، رسول الله، عثمان، علي)
ناوەندی پشت: (السلطان الاعظم، ضرب، سلطان احمد بهادر، أربل، خان خلد الله ملکه).
لەدراوەکانی سوڵتان ئەحمەد بهادرخان ٧٨٤-٨١٣ کۆچی لە هەولێردا.
ناوەندی روو: (الله، لا اله الا، محمد، رسول الله)
ناوەندی پشت: (السلطان الاعظم، ضرب، سلطان احمد بهادر، اربل، خان خلد ملکه)
دراوەکانی کوردستان لەسەردەمی عوسمانیدا: عوسمانییەکان لەساڵی (٩٤١ کۆچی/ ١٥٣٤) زایینی لەسەردەمی سوڵتانی عوسمانی سلێمان کوڕی سەلیم ناسراو بە (قانوونی) ٩٢٦- ٩٧٤ کۆچی/ ١٥٢٠-١٥٦٦ زایینی عێراقیان داگیرکرد، دوای ململانێیەکی زۆر لەنێوان عوسمانییەکان و سەفەوییەکاندا دراویان لەسەردەمی عوسمانی لە عێراقدا لەم شارانە سازکرد (بەغداد، بەسرە، مووسڵ، حله، کوردستان).
مۆزەخانەی بەریتانی لە لەندەن دراوێکی زێڕی پاراستووە، لە نیوەی خوارەوەیدا چیای تێدایە، چیایەکی کوردستان دەنوێنێت و لەسەرەوەی نووسراوە (کوردستان ساڵی ١٢٦٣ کۆچی) و لە لایەکی دیکەی وێنەی مۆری سوڵتانی عوسمانی عەبدولمەجید کوڕی مەحموودی یەکەم (١٢٥٥-١٢٧٧ کۆچی/ ١٨٣٩-١٨٦١ز) هەیە. دەقی مۆرەکە سوڵتان عەبدولمەجید کوڕی مەحموود مزەفەره)[١٥].
ئەم دراوە زێڕە دەشێ مەدالیایەک بێت یان دراوێکی یادکردنەوە بەڵام ناوی کوردستانی لەسەر نووسراوە، واتە پێش ١٦٢ ساڵ لەئێستا.
لەوەی رابرد بایەخ و گرنگی شاری هەولێرمان بۆ دەردەکەوێت. هەر لەساڵی ٥٨٧ی کۆچییەوە، دراوی زێڕو زیو و مسینی تێدا سازکراوە، کە نیشانەی بایەخی زۆریەتی.
شایانی باسە قەڵات ناوەندی ئاوەدانی بوو لە هەولێردا، واتە هەموو ئەم دراوە لەقەڵات سازکراوەو خانەی سازکردنی دراوی تێدابووە بەهەموو پێداویستییەکانی.

سەرچاوە و پەراوێز:

1- AL- MUFTI Kanaan Rashd: ERBEL. 1998 PP.2-3
٢- ئوستاد، د.ناهض عبدالرزاق القیسي: (النقود فی العراق)- بغداد ٢٠٠٢ ل٣٦.
٣- ئەم دراوە مسینە (لیپ بول) لە کەتەلۆکەکەی بەشی سێیەم لاپەرە ٢٣٢دا بلاوکردەوە.
٤- مۆزەخانەی بەریتانی- لەندەن بەشی ٣. ل٢٣٣.
٥- مۆزەخانەی بەریتانی- لەندەن بەشی ٣. ل٢٣٣.
٦- ئەم دینارە لەمۆزەخانەی بەریتانی لەلەندەن پارێزراوە، لین بول. بەشی ٩/ ل٣١١.
٧- ئەم دراوە لەمۆزەخانەی بەریتانییە لە لەندەن. لین بول ج٩ ٢٢.
٨- ئەم درهەمە لەمۆزەخانەی عێراقی لەژێر ژمارەی (٥٣ ٧٠ مس) پارێزراوە.
٩- ئەم درهەمە لەمۆزەخانەی عێراقی لەژێر ژمارەی ١٣٢٨ مسی/ پارێزراوە.
١٠- ئەم درهەمە لەمۆزەخانەی عێراقی لەژێر ژمارەی ١٤٨٥ مسی پارێزراوە.
١١- ئەم درهەمە لەمۆزەخانەی بەریتانی لە لەندەن پارێزراوە.
١٢- ئەم دراوە لەمۆزەخانەی عێراق لەژێر ژمارەی ٨٥٦٧ مسی پارێزراوە.
١٣- ئەم دراوە زێڕە دەگمەن و گرنگە لەمۆزەخانەی بەریتانی لە لەندەن پارێزراوە.



# دۆزینەوەی بەشێک لە شوورەی هەولێر

**عەبدولرەقیب یوسف**

رۆژی ٣١ تەمموزی ١٩٨٢ لەگەڵ برای نووسەر مومتاز حەیدەری چوومە لای خوالێخۆشبوو مامۆستا ناسیح عەبدوڵڵا حەیدەری تا هەندێ لە بیرەوەرییەکانی لەسەر شریتی کاسێت تۆماربکەم، کە تەمەنی مامۆستا ئەو کاتە دەوری ٨٥ ساڵ بوو و سینگی پڕ لە زانیاریی مێژوویی بوو، گەلێ شارەزا بوو، بیرەوەرییەکی زۆری هەبوو لەبارەی کوردستانەوە، بەتایبەتی رەچەڵەکزان (نساب)ی هەولێر بوو، مرۆڤێکی وا دەبا لەکەمەوە بۆ ماوەی دە سەعات دیدارم لەگەڵ کردبا، بەڵام خۆشبەختانە هەندێ لە بیرەوەرییەکانی خۆی لەگەڵ شیعرەکانی خۆی چاپ کردووە.

لە مامۆستام پرسی ئایا شوورەی هەولێرت دیبوو و شوورەکە چەند لە قەڵات دوور بوو، وتی: من دیواری پشتەوەی ئەم حەوشەی خانووم لەسەر شوورە داناوە، ئیتر زۆر کەیف خۆش بووم و چووم تەماشام کرد، بەڵام لەبەر ئەوەی شەو بوو، وێنەییم نەگرت.

لەبەر گرنگی شوێنەواری و مێژوویی ئەم پارچەیە لە شوورە کۆنەکەی شاری هەولێر لە چەند باس و وتارێکی خۆمدا ئیشارەتم بۆ کردووە، وەک ئەو باسە فراوانەم (دۆزینەوەی روانگەیێکی ستێرناسی کوردی لە گوندی گراو)، کە (٢٥) لاپەڕەیە و هەر ئەم مامۆستا گەوردیە بوو، کە لێم پرسی، ئایا حسابێکی ئەستێرەناسی کوردی لە ناوچەی هەولێر هەبوو؟ وتی بەڵێ حسابی گراو لەژێر شاخی سەری رەش هەیە[1].

رۆژی ٢٠٠٦/٣/١٤ وێنەی پارچە شوورەکەم گرت و پێوام کە (١٨.٥٠ م)ە بە بەرزایی (١.٥٠ م) لەژێر دیواری حەوشی خانووەکەدا لە

باكوورەوە ماوە، وەك دەبینن لەم وێنەیەدا چۆن بەڕێز عەبدولواحید نیعمەت ماوەرانی حەیدەری بەدەست ئیشارەت بۆ شوورەكە دەكات.بڕوانە وێنەی ژمارە (٤،٣،٢،١)

لە شێوەی هەڵكەوتنی زەوی لە باشوور و لە باكووری پارچە شوورەكە تێبینی دەكەم باكوور نزمتر بوو، واتە شوورە لەسەر قەراغی زەوییەكی نزم ئاواكراوە، نەك لە زەوییەكی راستە و راستدا یانی ئەو زەوییەی باشووری شوورە تا قەڵات بەرزترە.

دووری ئەم شوورەیە لە قەڵات بەلای باكوور و كەمێك بەلای رۆژهەڵاتەوە، دەوری (٢٧٠م)ە بە هێڵێكی هەوایی بە پێی ئەو نەخشەیەی پاشان باسی لێ دەكەین، شووری هەولێر لە باكوورەوە تەنگ و نزیكتری قەڵات بووە، بەڵام لە باشوورەوە شوورە لە دۆڵی بەستێ تێپەڕیوە تا نیزیكی گردی قالینج ئاغا و بەرەو هێڵی رۆژئاوا سووڕاوەتەوە تا گەیشتۆتە جێگەی وەستانی شەمەندەفەری جاران كە ئێستا بووەتە (زیندانی مەحەتە).

زۆر كەس لە خەڵكی هەولێر ئەمەیان دەزانی و لە هەشتاكانی سەدەی رابردووشدا كاك محەمەدی حاجی ساڵحی وێنەگر لە سلێمانی، كە لە منالییەوە زۆر لە هەولێر ماوە بەمنی وتووە لە پەنجاكاندا پارچەی شوورە مابوو لەلای (وێستگەی شەمەندەفەر)، من خۆم هەر لە هەشتاكاندا پارچەیەك لە بناغەی شوورەكەم دیوە لەسەر قەراغی باشووری بەستی بەرامبەر گۆڕستانی شێخەڵلا و وێنەییم گرتووە.

جێگەی مزگەوتە نوێیەكەی (صواف) لەنێوان (زیندانی مەحەتە) و منارەی سوڵتان موزەفەردا لەنێو شووەی شاردا بووە و دوورنییە شوورەكە تا شوێنی بینایەی پەرلەمان چووبێ، یانی منارە لەنێو شوورەدا بووە.[٢]

یاقووتی حەمەوی لە (معجم البلدان)دا لە باسی (اربل)دا نووسیویەتی: ئەربیل لەسەر گردێكی بڵندە و خەندەكێكی قووڵ و شوورەی هەیە. یاقووتیش چووەتە هەولێر و باسی (ابن المستوفی)شی كردووە و لە سالی (٦٢٦ ك/١٢٢٩ ز)دا كۆچی دوایی كردووە.

ناوی شوورەی هەولێر لە كتێبی خوالێخۆشبوو مێژوونووس زوبێر بیلالدا (اربيل في ادوارها التاريخية) ل١٨٦ و ١٨٩ و ١٩٠ و ١٩٣ هاتووە و هەروەها ناوی خەندەك (خندق)یش لە ل ١٨٦ و ١٨٥ دا ماموستا زوبێر لە ل ١٨٦ نووسیویەتی پاش كۆچی دوایی سوڵتان موزەفەری هەولێری لە ساڵی (٦٣٠ك=١٢٣٢ز)دا خەلیفەی عەباسی لەشكری نارد بۆ داگیركردنی هەولێر پاش ئەوەی كە (اقبال الشرابي) لە شوورەی رەت بوو و پاشان لە خەندەكەكەش رەت بوو شارەكەی داگیركرد، بەڵام هەر زوو شوورە و خەندەكەكەی چاك كردەوە (كە بەهۆی شەڕەوە زەرەریان لێ كەوتبوو).

لە ل ١٨٩ دا هاتووە لەشكری مەغۆل پەلاماری هەولێری دا لە ساڵی (٦٣٣ك/١٢٣٥ز)دا و بەشێك لە شوورەكەیان رووخاند و چوونە نێو شار، بەڵام خەڵكی شار و لەشكر خۆیان لە قەڵاتدا قایم كرد و مەغۆلییەكان كە بیستیان لەشكری بەغدا بەرەو هەولێر دێت، هەولێریان بەجێهێشت و بەرەو (تەبرێز) چوون، با ئەوەی بتوانن قەڵاتەكەی داگیر بكەن. لە ل١٩٠ دا نووسیویەتی (تاج الدين ابن الصلايا) (لە بەغدادەوە چووبووە هەولێر) و شوورەی نوێ كردەوە، هەروەها ئەو خانووانەی رووخابوون، ئەوەش لە ساڵی (٦٣٥ك/١٢٣٧ز)دا چاك كردەوە.


وێنەی (١)

لە ل١٩٣ مامۆستا زوبێر نووسیویەتی: لە ساڵی ١٢٥٨دا مەغۆل، کە ئابڵۆقەی هەولێریان دا و نەیانتوانی داگیری بکەن، لەبەر بەرگریکردنی خەڵکەکەی کشانەوە بۆ دواوە و هەولێریان تەسلیمی (بدرالدین لؤلؤ) کرد (کە میری موسڵ بوو) تا داگیری بکات، ئەویش شوورەکانی رووخاند و شارەکەی داگیر کرد.

رەنگە لە پاش ئەم رووخاندنەوەی شوورەکە جارێکی دیکە شوورەکە تەعمیر نەکرابێ. لەبارەی خەندەکی هەولێرەوە، کە مامۆستا زوبێر دووجار ناوی هێناوە لە پەراوێزی ١٨٥دا نووسیویەتی: ئێستا شوێنەواری خەندەکەکە نەماوە، بەڵام تا ئیمرۆ بە بەشی رۆژهەڵات لە خوارووی قەڵات دەوترێ (خەندەق).

شوێنی خەندەقیش ئێستا ئەو شەقامەی لە دەوری قەڵاتە و شۆستەکانی بەردەم دوکانەکانە، ئەگەر گۆڕانکاری لە دەوری قەڵات کرا و دوکان و بیناکان رووخێندران بەدەرخستنی خەندەقە گەورەکەی ئاسانە.

بەرێز دکتۆر موحسین محەمەد حوسێن لە کتێبەکەیدا (اربیل في العهد الاتابکي) ل٢٢٣ ناوی شوورەی هەولێری هێناوە، بەڵام بە هەڵە چووە، کە نووسیویەتی: شوورە لە باکووری قەڵات نەبووە و تەنیا لە رۆژهەڵات تا رۆژئاوای قەڵات هەبووە، یانی بە رای من نیوە شوورە هەبووە.

دکتۆر لەمانای عیبارەتی یاقووتدا بەهەڵە چووە کە یاقووت


وێنەی (٣)

نووسیویەتی: (وسور المدینة تنقطع في نصفها) یانی شوورەی شار لە نیوەیدا لەت دەبێت. مەبەستی یاقووتیش لەتبوونی شوورەدیە بە دۆڵی بەستێ، کە دووجار لە بەستێ تێپەڕبووە بە درێژی (٢٢٦٠م)ی هەوایی و هەردوو جار لەت بووە. ئەگەر شار تەنیا نیو شوورەی هەبێ، سوودی ئەو نیوەیە چییە: چونکە ئەگەر دوژمنێک بەهێز بێت بە ئاسانی داخلی شار دەبێت لەو نیوە مەسافەیەی بێ شوورەدیە پێشتر باسمان کرد لەشکری مەغۆل ساڵی (١٢٣٥ز) نەیتوانی داخلی شاری هەولێر ببێ پێش ئەوەی پارچەیەک لە شوورە بڕووخێنێ و ئەگەر نیوەی بێ شوورە با، داخلی شار دەبوون و هەر پێویستییان بە رووخاندنی پارچەیەک لە شوورە نەدەبوو و ئەو کاتەش بەسێ ساڵ پاش کۆچی دوایی سوڵتان موزەفەر گۆگبری بوو، پێش دەچێ ئەو کاتە شوورە قاییم بووە، چونکە وەک (یاقوت الحموي) نووسیویەتی سوڵتان موزەفەر شوورەی ئاواکردووە

یانی لە ماوەی حوکمڕانی خۆیدا کە (٤٣) ساڵ بوو (١١٩٠-١٢٣٣ز) لەبەر ئەوەی پێشتر شوورە هەبووە، دەبێ تەعمیری شوورەی کردبێ، یان نوێی کردبێتەوە، کە زۆر لە پێش ئەو وێران بووە. یان تەواو نەبووە.

دکتۆر لە ل٢٢٣ روونتر نووسیویەتی، شوورە تەنیا لە رۆژهەڵات تا رۆژئاوای شار هەبووە و لە باکووری قەڵات و بەرامبەر دەرگای عەینکاوە شوورە نەبووە.

ئەمەش بەپێچەوانەی نووسینەکەیەتی لە ل٢١٣، کە نووسیویەتی: ساڵی (١٢٣٣ز) کە لەشکری خەلیفەی عەباسی هات بۆ داگیرکردنی هەولێر دەرگاکانی شاریان گرتبوو و لە رۆژی سێیەمی شەڕدا، کە لە ٢٦/تەموز بوو (جمال الدین قشتمر) لە سەرکردەکانی لەشکر پاش سووتاندنی دەرگای عەینکاوە، چوو لەسەر خەندەقی شار وەستا، کە دەوردەکەی شوورە بووە، دکتۆر ئەمەشی لە (ابن العبري) وەرگرتووە.

ئاشکرایە لەوەی نووسراوەتەوە (باب عین کاوا) لە دەرگاکانی شوورە بوو و لە باکووری قەلات بووە بە بەرامبەر عەینکاوە. ئەمەش لە دەرگای عەینکاوەی قەلات جودایە یانی دوو دەرگا بەم ناوەوە لە راستی یەکتر و لە باکوور هەبووە، یەک لە قەلات و یەک لە شوورەدا، پاشان کە (جەمالەدین) دەرگای عەینکاوەی شوورەکەی سووتاند، لە شوورە تێپەڕ بوو و گەیشتە سەر خەندەقی ژێر قەلات.

یانی لە هێلی بەرگریکردنی یەکەم تێپەڕ بوو و گەیشتە هێلی بەرگری کردنی دووەم.

ئیتر لەم دەرگای شوورەی باکوورەوە شار داگیر کرا، کە گەورەتر بووە لە دەرگاکانی دیکەی شوورە، کە هێزەکانی خەلیفە دابەش کرابوون بەسەر دەرگاکانەوە.

جا ئەگەر لە باکووری قەلات شوورە نەبا و هەمووی کراوەبایە، بۆچی هێزەکانی نەیاندەتوانی لە هەرسێ رۆژەی شەڕدا بچنە نێو شار و داگیری بکەن بەبێ ئەوەی ئەو دەرگایەی باکوور بسووتێنن و چی پێویستییان بە سووتاندنەوەی هەبوو؟.

ئەگەر مەبەستی (یاقوت الحموی) ئەوە نەبێ شوورە لە نیوەیدا پچڕاوە بە دۆلی بەستێ، ئەوا هەلە کەوتۆتە نێو عیبارەتی کتێبەکەی (معجم البلدان) و دوورنییە پاش وشەی (فی نصفها) هەندێ وشەی کەوتبێ وەک وشەی (بواد...) و عیبارەتەکە وەهابێ (وسور المدینة تنقطع في نصفها بواد) بەپێی نەخشەیەک بۆ شوورە و خەندەک و قەلات و هەندێ شوێنی شار، کە لە سالی ١٩٥٩دا دانراوە سێ پارچە لە شوورەکە مابوو لە هێلی باشووری رۆژهەلاتدا هێلی باشووری رۆژئاوا ئەوەشی لە باشووری دۆلی بەستێ، کە شوورە لە دوو شوێن لە بەستێ تێپەڕ بووە یانی بەستێ لە سنووری شاردا کەوتبووە نێو شوورەکە، بەلام لە بەشەکانی دیکەی شاردا شوێنەواری شوورە لەسەر نەخشەکە نییە، بەلام هێلی تەخمینی بۆ شوورەکە هەمووی کێشراوە و یان تەنیا ئەساسەکەی لە ئەرزدا مابوو نەک بە بەرزی، لەگەل دەستنیشان کردنی شوێنی سێ دەرگای شوورە لە باشوور و لە باکووری رۆژهەلات لە نزیک (مزگەوتی پەنجە عەلی) و لە رۆژئاوا، بەلام دەرگای عەینکاوەی شوورە دەستنیشان نەکراوە، کە دەوری (٤٤٠م) لە باکووری قەلات بووە، کە لە سالی ١٢٣٣ زایینیدا


وێنەی (٤)


وێنەی (٣)




وێنەی (٥)

هەبووە.

ئەم نەخشەیە لەلایەن دەزگای دوقسیادس و دەستەی راوێژکاری ئەندازیاری عێراقییەوە دانراوە و لە ل٧٠دا هاتووە لە (التجدید الحضري لقلعة اربیل)، کە کتێبێکی بەنرخی (عەبدولباقی حەیدەری)یە و لەسەر نەخشەکە نووسراوە (رووونکردنەوەی شوێنی قەڵات بەنسبەت شارەوە لە ساڵی ١٢٣٣زایینیدا = "٦٣١ک") یانی بە ساڵێک پاش کۆچی دوایی سوڵتان موزەفەر، کە شار لە کاتی ئەودا گەیشتە پلەی هەرە پێشکەوتنەوەی.

بێ گومان ئەو رێکخراوە لەگەڵ دەستەی راوێژکاری عێراق لەسەر داوای دەزگای گشتی شوێنەواردکانی عێراق بووە و دەبێ هەندێ زانیاری مێژوویشیان پێدابێ.

لەبەر ئەوەی ئەو کاتە شاری هەولێر زۆر فراوان و پڕ نەبووە، توانیویانە شوێنی شوورە و سێ لە دەرگاکانی بدۆزنەوە و لەسەر نەخشە دەستنیشانی بکەن و ئەوکاتە وەک لەسەر نەخشە دیارە چوار پارچەی شوورە زۆر بە بەرچاو مابوو و دیویانە.

لە باشووری رۆژهەڵات تا رۆژئاوا یەکەم پارچە ٣٦٠م درێژ بووە و دووەم (٢.٢م) و سێیەم (١١٩.٢٦م) لە باکوور گومانیان لە بوونی پارچە شووردیەکیان کردووە، کە (٣٠٨م)و (٣٨سم) لە قەڵات دوور بووە و نازانین ئایا هەر ئەو پارچە شووردیەیە، کە دۆزیومانەتەوە یان نا؟

بەپێی نەخشەکە مزگەوتی خانەقا ئەمەی ئێستا نەبووە، بەڵکو لەگەڕەکی تەعجیلی ئێستادا بووە لە بەشی باکوورەکەی و بازاڕ لەم نەخشەیەدا رێک نییە لەگەڵ شوێنی بازاڕ لە نەخشە(٢)دا.

بڕوانە وێنەی نەخشەکە (وێنە ٥) برای مێژوونووس و شوێنەوار دۆست، ئەندازیار جەلال محەمەد ئەمین لە سلێمانی قیاساتی شوێنەکانی سەر هەمان نەخشەی بۆمان بە کۆمپیوتەر دیارکردووە، کە زۆر بە سوودمان زانی و ئەمەش وێنەکەیەتی (بنوارە وێنەی ٦).

لە ل٧ دا نەخشەیەکی دیکە هەیە بۆ دەستنیشان کردنی جێگەی قەڵات بەنیسبەت شارەوە. لە ساڵی (١٩١٦)دا، کە تەنیا ئیشارەتی یەک پارچە شوورە لەسەر ئەم نەخشەیەی هەیە لە باشووری رۆژهەڵاتی قەڵات لە بەستێوە تا رێگای کەرکوک، کە ئەو شەقامەی گشتی ئێستای باشووری قەڵاتە، هەمان دەزگای دووقسیادس و دەستەی راوێژکاری ئەندازەیی عێراقی ئەم نەخشەیەی داناوە، بە پێی ئەم نەخشەیە باکووری قەڵات تا رۆژهەڵاتەکەی هەموو شوێنەکەی نزم بووە و خانووی تێدا نەبووە، لەسەر ئەم نەخشەیە گەڕەکی خانەقا و گەڕەکی تەعجیل و بازاڕی شار و کەمێک لە گەڕەکی عاردەبان دەستنیشان کراوە. (بڕوانە وێنەی ٧).

بەنیسبەت ئەو سێ دەرگایەی

شوورەکە، کە لەسەر نەخشەی یەکەم شوێنیان دەستنیشان کراوە ئەوەی لە رۆژهەلات، یان باکووری رۆژهەلات لە نزیک (مزگەوتی پەنجە عەلی) ئەوە (دەرگای رەزی کەران) بووە، کە لە (تاریخ ابن المستوفی- القسم الاول ل٢٢٣)دا بەناوی (باب الفحامیة باللغة الكردية) ناوی هاتووە و نووسیویەتی ئەمە دەرگای شاری کۆن بووە و لە نزیکی ئەو باغێک هەبووە و قەبرستانی رۆژهەلاتیش لە رۆژهەلاتی دەرگا و شار بووە، کە قەبری شێخ حەسەن ئەزەلی (٣) لەو قەبرستانەدا بووە، دەتوانین بلێین شوێنی ئەم دەرگایە لەپشت بینای کتێبخانەی گشتی ئێستای هەولێر بووە و بە دووری (٢٠٠م) لە باشووری رۆژهەلاتی ئەم پارچە شوورەی دۆزیومانەوە و بە (٣٢٧.٥٩م) لە دەرگای رۆژهەلاتی قەلاتەوە دوورە.

بە قسەی (ابن المستوفی)، کە لە سالی (٦٣٧ک/١٢٣٩ز)دا وەفاتی کردووە، یانی بە حەوت سال پاش سولتان موزەفەر، کە نووسیویەتی دەرگای شاری کۆن بووە (باب المدينة القديمة) هەست دەکرێت ئەم دەرگایە زۆر لەپێش کاتی سولتان موزەفەر هەبووە و دوور نییە لە کاتی ساسانی و پێشتر لە کاتی حکومەتی کوردستانی باشوور (دولە ادیابین)دا هەبێت لە (سەدەی یەکەمی پێش زایین تا سەدەی یەکەمی زایینی) کاتێ هەولێر پایتەختی ئەم حکومەتە بووە.

بەنسبەت دەرگای رۆژئاوای شوورە، ئەوە (دەرگای موصل) بووە کە لە (تاریخ ابن المستوفی - القسم الاول) ل٣٧٤ دا بەناوی (باب الموصل)وە هاتووە، ئەوەش کە نووسیویەتی قەبری (الشيخ سعد البوازيجي) (ابو مسعود سعد بن عبدالعزيز) لە لای (باب الموصل)ە لە دەستە چەپ، کە مرۆڤ لە شارەوە بچێت بۆ دەرەوەی شار.

ئەم دەرگایەش لە رۆژئاوای منارەی سولتان موزەفەر بووە و نێوان هەردووان بە پێی نەخشەکە (٦٢٨.٣٦م) کەمێک بەلای باکوورە و بە پێوەری (٤٤) پلە.

ابن المستوفی ناوی (باب الفرج)یشی هێناوە لە دەرگاکانی شوورەی شار هەر لەم بەشەی مێژووەکەیدا ل٢١٤نووسیویەتی (خانكاه) یانی خانەقای کۆن نزیکی ئەم دەرگایە بووە و لەقسەکەی دەزانرێ ئەم ناوەی (باب الفرج) نوێیە، چونکە نووسیویەتی (باب الفرج الان) یانی (باب الفرج)ی ئێستا ئەگەر خانەقای کۆن ئەم خانەقای ئێستای ژێر قەلات و لەنزیک دەرگای باشووری قەلات بێ، کە هەندێ وا بۆی دەچن خانەقا زۆر کۆن بێ و لەسەدەی نۆزدەیەمدا نوێ کرابێ - ئەوا دەبێ (باب الفرج) ناوی دەرگای ئێستای باشووربێ لە قەلات بەرامبەر دەرگای عەینکاوە (باب عمكا -باب عينكاوا)، کە دەرگای ئێستای باکوورە لە قەلات، نەک دەرگای عەینکاوەی شوورەکە.

هەندێ دەلێن ئەم دەرگای باکوور لە قەلات نوێیە و ئەحمەد بەگی موتەسەریفی هەولێر لە بیستەکانی سەدەی رابردوودا کردوویەوە، بەلام دەرگای باکوور هەبووە و دوورنییە وەختێک گیرابێ و پاشان ئەحمەد بەگ کردبێتییەوە.

بەکورتی نازانین (باب الفرج) کام لە دەرگاکانی شوورە یان لە قەلاتە.

قەلات جگە لەو دوو دەرگایەی باسمان کرد دوو دەرگای دیکەشی هەبووە یەک لە رۆژهەلات و یەک لە رۆژئاوا وەک بە درێژیم نووسیوە لەم راپۆرتەمدا بۆ دەزگای گشتی شوێنەوارانی عێراق بەناونیشانی (اكتشاف الباب الشرقي و الباب الغربي لقلعة اربيل)، کە بەمێژووی


وێنەی (٦)




هەبووە. (بڕوانە وێنەی ٩).

مخابن کە ئێستا بەشێکی کەم لە مێژووی (ابن المستوفي) هەولێری دۆزراوەتەوە و (سامي السید خماس الصقار) بەو لێکۆڵینەوە نایابەوە بڵاوی کردووە و ئەگەر هەمووی کەوتبایە دەست زۆر لە شوێنەکانی شار و قەڵات بە هۆی ئەوەوە دەزانران.

هێڤیدارم ڕێزدار نێچیرڤان زۆر بایەخ بە پاراستنی شوێنەوار و کەلەپووری شارستانێتی کوردستان بدات، لەوانە بینا کەلەپوورییەکان و پاراستنی گەڕەکە کۆنەکانی شارەکان، ئومێدیشم هەیە شوێنی دەرگاکانی شووورەی شاریش بدۆزمەوە ئەوجا دەبێ نیچیرڤان ئەو خانووانەی لە شوێنیاندا ئاڤاکراون ئیستملاکیان بکات و بیانڕووخێنێ و دەرگاکان ئاوا بکەین و دەتوانین خەندەقیش لە دەوران دەوری قەڵات بە دەربێخین، کە فراوانی (١٨م) بووە، ئەم کارانەش دەبنە زیندوو کردنەوەیێکی شوێنەواریی مەزن لەنێو شاردا.

**پەراوێز:**

(١)- باسی ئەم شاکارەش لە بیرەوەرییەکانی ئەوم کردووە، کە لە گۆڤاری ڕۆشنبیری نوێ ژمارە (١٠٨) سالی ١٩٨٥دا بڵاوم کردەوە.

(٢)- بە پێچەوانەی ئەوەی نووسیومە لەم وتارەمدا (فەنەر لە کوردستاندا و فەنەری دەشتی هەولێر) کە لە گۆڤاری مێرگ ژمارە (٧)دا بڵاوبۆوە.

**سەرچاوە:**

١- عبدالباقي عبدالجبار الحیدري/ التجدید الحضري لقلعة اربیل ١٩٥٨.

٢- دەقی هەندێ لە نووسینی یاقوت الحموي (واربل قلعة حصینة ومدینة کبیرة في فضاء من الارض الواسع بسیط ولقلعتها خندق عمیق وهي في طرف المدینة وسور المدینة ینقطع في نصفها وهي علی تل عال من التراب عظیم واسع الراس وفي هذه القلعة اسواق ومنازل وجامع للصلاة وهي شبیهة بقلعة حلب الا انه اکبر واوسع رقعة... وفي ربض هذه القلعة في عصرنا هذه مدینة کبیرة عریضة طویلة قام بعمارتها وبناء سورها وعمارة اسواقها وقیصریاتها الامیر مظفر الدین کوکبري... واکثر اهلها اکراد قد استعربوا جمیع رساتیقها وفلاحیها وما یضاف الیها اکراد وینضم الي ولایتها عدة قلاع... ولیس حولها بساتین ولا فیها نهر جار علي وجه الارض واکثر زروعها علي القني المستنبطة تحت الارض وشربهم من أبارهم العذبة الطیبة المرئیة التي لافرق بینها وبین ماء دجلة في العذوبة والخفة...)

٣- شیخ حسن الازلی خەلکی ناوچەی قەزای میدیات بووە لە ولایەتی ماردین، چونکە چیای هەلز (جبل الازل) لە ڕۆژئاوای شاری میدیاتە.

٤- لەبارەی (دولة ادیابین)ەوە تەماشای ئەم باسەمان بکە (حکومة کردستان الجنوبیة- حکومة ادیابین) لە ڕۆژنامەی خەبات ژمارە (٦٤٦) ڕۆژی (٢١/١٠/١٩٩٢) و هەروەها ل٧١ و ٧٢ لە کتێبەکەمان (حدود الکردستان الجنوبیة تاریخیا و جغرافیا خلال خمسة الاف عام) چاپی دووەم.

* ئەم بابەتە لە گۆڤاری مێرگ ژمارە (١٣) سالی دووەم ٢٠٠٦ وەرگیراوە.



# بیناسازی و دام و دەزگاکانی هەولێر لە کتێبی ئیبن مستەوفی (تأریخ اربل)دا

**دکتۆر حوسامەدین نەقشبەندی**
**کۆلێژی زانستە مرۆڤایەتیەکان- زانکۆی سلێمانی**

**دەستپێک:**

پێگەی هەولێر پێگەیەکی نایاب بووە، شوێنی بەیەکگەیشتنی کاروانچییەکان بووە، بەتایبەتی ئەو دوو ڕێگایەی لەباکوورو ڕۆژهەڵاتەوە بۆی دەهاتن، کە لە ئازربایجانەوە دەستی پێدەکردو ڕێگاکە لێژایی و بەرزی و نزمیی ناوچە شاخاوییەکانیان دەبڕی. یەکێکیان بەرەو ڕواندز بە باکووری ڕۆژهەڵات تێدەپەڕی، ئەوی تریان بە کۆیە لە ڕۆژهەڵاتدا[1] هەروەها بازاڕێکی گەورە لە دەوروبەریەتی. بەهەرێمێکی بەپیت و دەوڵەمەند دادەنرێت. بریتییە لە بانێکی ڕاست و بەرز و نزمی تێدا نییە. باشی پێگەکەشی بەهۆی قەڵاتی هەولێردەوەیە و، شارەکەی پاراستووە، بەوەی بەردەوام ژیانی تێدا بووە و بە درێژایی چاخەکان تا ئەمڕۆکەش ناوە کۆنەکەی هەر ماوەتەوە[2].

لە سەرەتای ئیسلام هیچ شتێک دەرنەکەوتووە سەبارەت بە هەولێر. تەبەریش لەمێژووە درێژەکەی هیچ شتی لەم بارەوە باس لێوە نەکردووە، هەروەها وڵاتنامە عەرەبە کۆنەکانیش باسیان نەکردووە. تەنیا "ئیبن

خـورداذبە" (ت ٢٨٠ک/ ٨٩٧ز) و قـودامـەی کـوڕی جـەعـفـەر (ت ٣٢٠ک/ ٩٣٢ز) نەبێ[٣]. کــــە باسکردنەکـەی لە ئیبن خـورداذبە گـواسـتـۆتەوە، بەو گـوزارشـتـەی تەسـجـوجـەیەکـەو سـەربە کـوردی (حـەلوان) بووە[٤]. واتە ئەوکـات ناحـیـەیەکی بچـووک بووە و کاروبارەکەی سنووردار بووە. لە پاش ئەوەش ناوەکـەی هەر نەهاتووەو پشـتگوێیـان خسـتـووە. ئەمـەش دەلالەت لەسەر ئەوە دەکات تا نیوەی یەکـەمی سـەدەی پێنجـەمی کـۆچی شارەکـە بە پشـتگوێ خراوی و ونی مـاوەتەوە. جا کـاتێ میـرنشـینی هەزبانییەکان هاتە کایەوە و هەولێری کردە بنکەی خۆی، کە تا پاش سالّی (٥٢٠ک/ ١١٢٦ز) بەردەوام بوو. پاش ئەوە رۆڵی هەولێـر بەرز بۆوە و زێدەبوو. بەتایبـەت دوای ئەوەی زینەدین عـەلی کـوچک (واتە بچـووک) بن بەکتکین لەدەسـتپێکی سـالّـی (٥٦٣ک/ ١١٦٧ز) دەوڵەتێکی دامـەزراند و هەولێـری کردە شاری خۆی، بەڵام لەسـەردەمی میر موزەفەرەدین گوگبری کە لەسالّی (٦٣٠ک) کـۆچی دوایی کـردووە و (زاوای سـەلاحـەدینی ئەیوبی) بووە لەلوتکەی گەشـەسـەندندا بووە. بە رادەیەکی زۆر بەرچاو بەرفـراوان بووە- ئەو دەوڵەتە بچکۆڵەیە، کـە لەبراکـەی میـر زەینەدین لەسـالّی (٥٨٦ک/ ١١٩٠ز) بۆی مـایەوە. ئەمـەو ئەو لوتکەی گەشـەسـەندنە لەکـۆتایی سـەدەی شەشـەم و نیـوەی یەکـەمی سـەدەی حـەوتەمی کـۆچیـدا بووە[٥].

پێویستە لێرەدا بەر لەوەی باس لە هێلکاری شاری هەولێر بکەم، ئاماژە بەوە بدەم، کە هاوڕێم دکتۆر موحسین محەمەد حوسێن بەشێکی پڕ بەهای لەسـەر هێلکاری شـارەکـە لە نامـەی ماسـتەرەکەیدا نووسیوە و تێیدا باس لەقـەلات و گـومبـەتی مـوزەفـەریە و دامـودەزگـاکـانی ئاییـنی و زانسـتی دەکـات، وەک مـزگـەوت و خـانەقـا و خـانەی حـەدیس و قـوتابخـانەکـان. دکـتـۆر مـوحـسـین لەسـالّی ١٩٧٤ کۆتایی بەنامەی ماستەرەکەی هێناوە و لە ســـالّی ١٩٧٦ بەچاپی گـــەیاندووە. پێش ئەوەی بەشی دووەمی مـێـژووی ئیبن مسـتـەوفی بەدەرکەوێت، دکتۆر سامی بن سەید خەماس سەققار لێکۆڵینەوەی لەسەر هەمـان بەش کـردبوو، بە هەر دوو بەشـەکـەیەوەو لەسـالّی ١٩٨٠ بلاوی کردبوونەوە[٧]. بەڵام دکـتـۆر مـوحـسـین لەکاتی نووسینی نامەکەیدا چاوی بەو لێکۆڵینەوەی لەسـەر کـتـێـبی ئیبن مسـتـەوفی کـرابوو نەکەوتبوو. بۆیە بەشـێـوەیەکی سـەرەکی و بنچـینەیی پشتم بەستبوو بەهێنانەوەی هێلکاری هەولێـر، کـە لەو کـتـێـبـەدا هەیە. بەشـێـوەیەکی لاوەکـیـش بەسـەر سـەرچاوەکـانی دیکەدا. بەتاییـەت وەک "وفـیـات الاعـیـان"ی ئیبن خـەلەکـان. بەو واتایە ئەم لێکۆڵینەوەیەم دەبێتە دەرک پێکردن و تەواوکردنی لێکۆڵینەوەکەی دکتۆر مـوحـسـین بەبێ ئەوەی بچـینە ناو وردەکارییەکان، کە تێیدا هاتووە[٨].

١-قـەلات: قـەلاتی هەولێـر کـەوتۆتە سـەر گردێکی پان و بەرین، بەرزییـەکـەی لەسـەر رووی شـار نزیکەی (٢٦) مـەترە، رووبەرەکـەی بەنزیکـەی (١١٠) هەزار مـەتری چوارگۆشە خەملێندراوە[٩]. یاقوتی حەمەوی دەڵێت، هاوشێوەی قەلاتی حـەلەبە. بەڵام هەسـتی کـردووە کـە: "قـەلاتی هەولێـر گـەورەترو بەرفراوانترە لە قەلاتی حەلەب"[١٠]. بۆی هەیە شاری هەولێر لەسەرەتادا و بۆ مـاوەیەکی دوورو درێژ تەنهـا هەر قەلات بووە. لە سەردەمی یاقوتدا کە لەسالّی (٦٢٦ک/ ١١٢٩ز مردووە) بووە بەشـارێکی تەواو. خـانوو و بـازاڕی لـێ بـووە، چـوار دەوری بـە شووڕێکی قوولکراو پارێزراوە بەڵام یاقــوت ئەوەی باس نەکـــردووە، لەبەرچی بەم شێوەیە پاراستوویانە و قەلات قایم بووە، بەڵکو تەنیا باسی خەندەکەکەی کردووە. دەشێ بڵێین بۆیە بە هاوشـێـوەی قـەلاتی حـەلەبی داناوە، چونکە قـایمیـیـەکـەی بۆ ئەو دەرگــا و تـاوەر و دیوارە کــونکونە گـەڕاندۆتەوە، کـە لەدەوری قـەلات بەلووسی دروست کـرابوو (لەسـەر برشتی قـەلاتی حـەلەبدا)، بۆ ئەوەی هێـرشبـەرەکـان گـەر توانیـشـیـان لە خەندەکە قووڵەکە بپەڕنەوە[١٢]، بەڵام لەبەر بەرزی دیوارەکان ناتوانن هێرش بکەن.

قـەلات چەند دەرگـەیەکی هەبووە. دەرگـای سـەرەکی -لە باشـوور- کـە تائێستاش بەسەر مەیداندا دەڕوانێ، قەلات لەقەیسەری جیا دەکاتەوە، کە میـر موزەفـەرەدین گۆگبری دروستی کـردبوو. مـەیدان لەسـەردەمی ئەودا

بەپێی گوتەی ئیبن خەلەکان زۆر گەورە و بەرفراوان بووە[١٣]. بەڵام دەرگای دووەم -لەدەرگای یەکەم گەورەتر بووە- کەوتبووە بەرامبەر دەرگای سەرەکی باشوور کە رووەکەی لەگوندی عەنکاوەیە. خاوەنی کتێبی (الحوادث الجامعة) لەسەدەی حەوتەمی کۆچیدا ناوی نابوو (دەرگای عەمکا). بە گەورەترین دەرگای داناوە[١٤]. بەم شێوەیە بۆمان دەردەکەوێت کە قەلات زیتر لەدوو دەرگای هەبووە، بەڵام کەمتر گرنگی و بایەخیان پێدراوە، بارەگای فەرمی میر موزەفەرەدین لەقەلات بووە. خاوەنی کتێبی رووداوە کۆکراوەکان دەڵێت:"خانەی میرنشینییەکەی لەوێ بووە"[١٥]. لەنزیک دەرگای سەرەکی (باشووری) قەلات، ئێستاشی لەگەڵدا بێت ئەو گەڕەکە، هەر کەوتۆتە لای ئەو دەرگایە و بەگەڕەکی (سەرای) ناسراوە. جا گەر بێتوو بارەگای فەرمی میر لەقەلات بێت، ئەوا دەبێت میوانخانەکانیشی تێدا بێت. لەم بارەوە ئیبن مستەوفی دەڵێت دیوانی تێدا بووە[١٦]. بەڵام دیاری نەکردووە. لەگەڵ ئەوەش نموونەی دانیشتنی ئیبن تەیمییە دێنێتەوە[١٧]، کە موزەفەرەدین گوگبری لە دانیشتنەکەی ئامادە بووە، کە یەکێک بووە لە دواوێنە سەرەکییەکان لەدەولەتی ئەتابەگدا،کە زانا و فەقیهەکان تێیدا ئامادە دەبوون و بایەخیان بەنووسین دەدا. لەوانەیە دیوانی پەیام و دارشتن بووبێ، یان پێی وترابێ دیوانی نووسینگەکان، کە ئەرکەکەی زۆر ترسناک بووە لەنووسین و پێداچوونەوەی پەیامەکان و فەرمانە فەرمییەکان، کە لەدیوانی میردا وەڵام دەدرانەوە. بۆیە دارێژکار یاخود نووسەری دیوان یەکێک بوون لەوانەی لەلایەن خاوەنی دیوان متمانەیان پێکراوە. هەڵبەتە ئەوانەش لەو زاناو فەقیهانەی کە باڵادەست بوون لە نووسراوە فەرمییەکاندا. بۆیە ئیبن مستەوفیش کە خاوەنی کتێبی مێژووی هەولێرە، یەکێک بووە لەرێبەرانی ئەم دیوانە[١٨]. هەر بۆیە ئامادەبوونی ئیبن تەیمییە، کە زانایەکی پایە بەرز بووە، دانیشتنی لەگەڵ کردووە، ئەمەش کارێکەو ئەگەری دۆستایەتی دروستی هەیە. چونکە شیاو نییە لە دیوانی (باڵا) بۆ نموونە لەگەڵی دابنیشێت، کە کارەکەی سەرپەرشتیکردنی سەر داهاتەکانی زەوی و نرخاندنی دەسکەوتەکان بووە[١٩]. یان دیوانی (أهراء) کە بریتی بووە لە "کۆگایەکی پڕ لە دەغڵ ودان (غلات) هەر کارێک روویدابایە خەرجییەکەی لەوێوە بووە".[٢٠] ئەم دوو دیوانە لەرۆژانی موزەفەرەدین گوگبری هەبوون، وێڕای میوانخانەی پەیام و دارشتن. شیاوی باسە بارەگای دیوانی باڵا لەقەلات بووە[٢١].

لە قەلات مزگەوتێک هەبووە و پێی وتراوە مزگەوتی قەلات[٢٢]. بوونی مزگەوتەکە کارێکی سروشتی بووە مادامەکی بارەگای فەرمی میری تێدا بووبێ. جگە لەوە، شتی دیکەشی لێ بووە، وەک بەندیخانە، بەندیخانەی قەلات کە لەسەردەمی ئیبن مستەوفیدا پێی وتراوە (بەندیخانەی حەلەبی)[٢٣]، بەڵام باسی هۆکاری ئەم ناوەی نەکردووە، بۆچی ئەو ناوەی لێنراوە. وادیارە هەندێ لەدامودەزگا فەرمییەکان لەوانە خانەی میرنشین گوازراوەتەوە بۆ خوارێ و بە (خانەی دەسەڵاتدار) ناونراوە. ئەبو فیدا کە لەساڵی (٧٣٢ک مردووە) دەڵێت: یەکێ لەو دوو رێگایەی بۆ شارەکە دەهاتن، بەخانەی دەسەڵاتدار تێپەڕ دەبوو[٢٤]. ئەو گوێزرانەوەیە لەکۆتایی سەردەمی موزەفەرەدین روویدا، کە مردنەکەی لە ساڵی (٦٣٠ک/ ١٢٣٣ز) بووە لە ماڵەکەی خوارەوە بووە. پاشان تەرمەکەی گوێزراوەتەوە بۆ قەلاتی هەولێر و بەشێوەیەکی کاتی لەوێ نێژراوە[٢٥].

باشە لێرەوە باسی ئەوە بکەین، چونکە لەوانەیە قەلات تونێلی نهێنی تێیدا بووبێت و لەکاتی پێویستی کۆمەکیدا لەماوەی ئابڵوقە یان هەڵاتن لە قەلات بەکارهێنرابێت[٢٦].

بەر لەوەی کۆتایی بەهێلکاری قەلات بێنین، پێویستە باس لەو بیرە سەرفرازانە قووڵە بکەین (قووڵییەکەی بە بەرزی قەلاتە، واتە نزیکەی ٢٦ مەتر)، کە ئاوی دەگەیاندە گەرماوی قەلات کە کەوتۆتە ناوەراستی قەلات. وا مەزندە دەکرێت ئاوی بیرەکە لەرێگای (کارێز)ەوە دەگەیشتە گەرماوەکە، کە پێیەوە بەسترابۆوە. چونکە گەروا نەبوایە ئەوا دەبوا بیرەکە زۆر لەوە قووڵتر کرابایە تا دەگەیشتە ئاستی ئاوی ژێر زەوی، کە

لەدەوری قەڵات بووە.

٢- نیشتەجێبوون "ریچ": کاتێ قەڵات دانیشتوانی زۆر زیاد بوو، هەندێکیان گوێزرانەوە بۆ بەشی خوارەوەی شار. وادیارە کەوتبووە بەرامبەر دەرگای سەرەکی قەڵات بەلای باشووردا، کە لەرۆژئاوای قەڵات درێژ دەبۆوە تا دەگەیشتە بەشی رۆژهەڵاتی. ئەو گوێزرانەوەیەش لەسەردەمی میر زەینەدین عەلی کوچک، کە لەساڵی(٥٦ک/١١٦٧ز) مردووە یان پێش ئەو روویداوە. لەهەندێ سەرچاوە هاتووە، ئەو میرە لەدەوروبەری مزگەوتێکی کۆن لەناو شار نێژراوە[٢٧]. دکتۆر موحسین محەمەد حوسێن، بەڵگە دێنێتەوە لەسەر بەرفراوانبوونی خوارەوەی قەڵا بەلای باشوور و باشووری رۆژئاوادا. لەوانە منارەی موزەفەرییە بەشێک بووە لەمزگەوت، کە تائێستاش بەرزە و کەوتۆتە باشووری رۆژئاوای شاری هەولێر. هەڵبەتە مزگەوت دەبوا، کەوتبوایە ناوەراستی بەشێک لە ئاوەدانی خەڵکەکە[٢٨].

میر موزەفەرەدین شاری بەرفراوان کرد، سەرەرای ئەوەی ژمارەیەک شوێنی دووبارە نۆژەن کردەوە و بازاڕ و قەیسەرییەکەشی دروست کرد، تا وای لێهات لەسەردەمی یاقوتی حەمەویدا، کە لە (ساڵی ٦٢٦ک/ ١٢٢٩ز) مردووە، (بوو بەشارێکی گەورە و بەرفراوان)[٢٩].

**هێلکاری شار لە سەردەمی موزەفەرەدین گوگبریدا:**

**یەکەم: شورای شارو دەرگاکانی و خەندەکەکەی**

یاقوت حەمەوی کە وەسفی دیواری شاری هەولێر دەکات، بۆمان دەردەکەوێت، کە بە هەرچوار دەوری قەڵات نەسووڕاوەتەوە، بەڵکو تەنیا دەوری نیوەی قەڵای داوە و هاوکات باسی کردووە، کە "لەنیوەی قەڵات دەپچڕا"[٣٠]. دیوارەکە تەنیا لەدەوری ئەو ناوچانە بووە کە دانیشتوانی لێ بووە. بەڵگە بە ئیبن مستەوفی دێنێتەوە، کە وەسفی هەندێ شوێنی هەولێرمان بۆ دەکات، وەک بازاڕەکان و مزگەوتەکان و قوتابخانەکان و خانەقاکان. جا هەروەکو پێشتر باسمان کرد ناوچە نیشتەجێبووەکان لە "خوارەوەی"ی شار کەوتبووە بەرامبەر دەرگای سەرەکی قەڵات بەلای باشوور، کە درێژ دەبۆوە لە رۆژهەڵات بۆ رۆژئاوا.

بەڵام لایەنی باکووری رۆژهەڵات و باکووری رۆژئاوا لە قەڵات - واتە بەلای گوندی عەنکاوەدا- کە کەوتبووە دەرەوەی دیوار ئاوەدانی لێ نەبوو[٣١]. کاتێ (ریچ) لەساڵی (١٨٢٠ز) سەردانی هەولێری کردووە، پاشماوەی ئەو دیوارە و خەندەکەکە هەر مابۆوە. دەشڵێ: ئەو پاشماوانە زۆر ئاشکراو دیاربوون، بەتایبەتی لەولایەی کە ریچ چادرگەکەی لێدابوو. لە وێنەیەکی، کە بۆ شاری کێشاوە، خێوەتگاکە کەوتبووە بەرامبەر بەشی باشووری شار کە خەڵک تێیدا نیشتەجێ بوون، پاشماوەی دیوارو خەندەک، کە لەدەوری ئەو بەشە بووە، کەوتبووە بەرامبەر دەرگای باشووری قەڵات.

هەروەها باسی لەوە کردووە، کە شوێنەواری دیوار و خەندەک دەلالەت لە شاری کۆن دەکات، کە لەسەردەمی ئەودا زۆر گەورە و بەرفراوان بووە[٣٢]. (شترک) باس دەکات و دەڵێت: بەرزی دیوارەکە (٤٨) پێ بووە و کولانەکە و تاوەریشی تێدا بووە[٣٣]. کە ئاماژە بەکتێبی ریچ دەدات.

وادیارە دیوارەکە زۆر دەرگای هەبووە. لەم بارەوە ئیبن مستەوفی دەڵێت: دەرگای کۆنی شار کە پێی دەوترا "دەرگای رەژوو فرۆشان"، کەوتبووە نزیک مزگەوتی (مەشهەد کەف) لەرۆژهەڵاتی قەڵات. لە کۆی قسەکانی لەبارەی یەکێ لەسۆفییەکانی دەڵێت: کە لە بێستانەکی نزیک مەشهەد کەف کاری دەکرد، نزیک بووە لەدەرگای کۆنی شار، کە پێی دەوترا دەرگای رەژوو فرۆشان"[٣٤]. هەروەها ئیبن مستەوفی دەڵێت دەرگایەکی تر هەبوو، پێی دەوترا دەرگای رۆژهەڵات[٣٥]. بۆی هەیە هەمان دەرگای رەژوو فرۆشان بووبێت. هەروا ناوی دەرگایەکی تریشی هێناوە بەناوی دەرگای موسڵ[٣٦]. کەوتبووە لای رێگای گەشتیاران کە لەهەولێرەوە بەرەو موسڵ دەرۆیشت لەلای -رۆژئاوای- هەولێردا. دەرگای موسڵ دەرگای رۆژئاوای شار بووە، کە ئیبن مستەوفی بەم ناوە لە شوێنێکی دیکە ناوی دێنێت[٣٧].

سەرەڕای ئەوە، دەرگایەکی دیش هەبووە، پێی وتراوە دەرگای خۆشی،

خانەقاو تەکیەی سۆفییەکان کەوتبوونە نزیک ئەو دەرگایە[٣٨]. بەڵام باس لەشوێنی خانەقا ناکات، بۆیە ناتوانین شوێنی دەرگای ناوبراو دیاری بکەین. بەم شێوەیە بۆمان دەردەکەوێت کە دیوارەکە بەلایەنی کەم سێ دەرگای هەبووە.

## دووەم: دامودەزگاکانی ئایینی و خێرخوازی و کۆمەلایەتی و تەندروستی

### ١- جامیعەو مزگەوتەکان:

هەڵبەتە بوونی مزگەوت یان جامع لە هەر شارێکدا، دەلالەت لەسەر بایەخدان و بەرفراوانی شار دەکات، چونکە بنکەیەکی میرنشین بووە. میر نوێژی هەینی و هەردوو جەژنەکانی تێدا ئەنجامداوە. کە لە سەردەمە ئیسلامییەکاندا باو بووە، کە شاری ئیسلامی دەبێت مزگەوتی جامعێکی تێدا بێت. جا گەر لێی بێت، ئەوا دەلالەت لەسەر گەورەیی و بەرفراوانبوونی و چڕی دانیشتووانی دەکات. بەوەی کە نوێژکەرەکان تەنیا لەیەک جامعدا کۆببنەوە کە بەڵگەیە لەسەر یەک پارچەییان. ئەگەر شوێنییان نەبوو ئینجا ببنە دوو بەشەوە. ئەمەش لەسەر شاری هەولێر لە سەردەمی میرنشینی ئەتابەکە (٥٢٢ک/ ١٢٢٨ز-٦٣٠ک/ ١٣٣٣ز) جێبەجێ دەبێت. ئیبن مستەوفی لە مێژووی هەولێردا دەڵێت: دوو مزگەوت "جامع" لە هەولێر هەبوون. یەکێک لە قەلات بووە، دووەمیان لە نیشتەجێبوونی خوارووی قەلات[٣٩]. بەڵام جامعی قەلات لە کتێبەکەیدا لە زۆر شوێن باس کراوە، هەندێ جار پێی وتووە (مزگەوتی جامع قەلات) جاری تر (جامع قەلات)[٤٠].

ئیبن مستەوفی، لەساڵی (٥٦٤ک/ ١٢٦٩ز) لەدایک بوو و لە ساڵی (٦٣٧ک/ ١٣٣٩ز) کۆچی دوایی کردووە). هەر بەمنداڵی لە مزگەوت جامعە ئامادە بووە و گوێی لە زانایان و فەقیهەکان و قازییەکان گرتووە[٤١]، بەڵام بۆمان باس ناکات چۆن. تەنیا باس لە گۆشەی بستی دەکات" (کە دەگەڕێتەوە بۆ ئەبی عەبدوڵلا بستی، کە لە ساڵی ٥٨٤ک مردووە) کەوتۆتە لای رۆژئاوای جامعەکە[٤٢].

ئەو زانیارییانەی کە لەسەر مزگەوتی جامع، خوارووی شار بتوانین هەڵیبێنجین لە کتێبەکەی ئیبن مستەوفیدا لە زانیارییەکانی جامع قەلات زیاترە، کە پێی وتراوە مزگەوتی جامع لە زۆر شوێندا. لەهەندێ شوێنی تردا ناوی بردووە بە مزگەوتی جامع زەینی[٤٣]. "بۆیە وای پێ گوتووە بەخستنە پاڵی زەینەدین عەلی کوچک، خاوەنی هەولێر کە لە کۆتاییەکانی ساڵی ٥٦٣ک/ ١٢٦٨ز کۆچی دوایی کردووە. لەگەڵ ئەوە سەرنج دەدەین ئیبن خەلەکان بەناوی جامعی وتووە جامع عەتیق[٤٤] لەناو شاردا. بەڵام ئیبن مستەوفی پێی وتووە مزگەوتی عەتیق[٤٥]. ئەوەش دەڵێ: کە باوکی (ئەبو فەتح ئەحمەد بن مویارەک) گومبەتێکی بۆ ئەو مزگەوتە دروست کرد و هەروەها هەندێ لە زانایانیش لێی دادەبەزین[٤٦].

وادیارە مزگەوت یان جامع عەتیق هەمان مزگەوت جامع زەینی بووە. چونکە ئیبن مستەوفی لەشوێنی تردا باسی کردووە، کە ئەو گومبەتی باوکی دروستی کردووە کەوتۆتە باکووری مزگەوتی جامعی خوارەوە یان زەینی[٤٧]. کە میر زەینەدین عەلی کوچک لەوێ لەنزیک جامع عەتیق نێژراوە. واتە نزیک مزگەوتی زەینی کە کەوتۆتە ناو دیوی دیوارەکە.

ئیبن مستەوفی ئاماژەی بەشوێنی ئەو مزگەوتە جامیعە داوە و دەڵێت:"کەوتۆتە لای چەپی گۆڕستان، کە پێشتر لەلای بازاڕی کۆنی بەیتاڵەکان بوو"[٤٨]. بەڵام ئێمە ناتوانین شوێنی گۆڕستانی کۆن یان ئەو بازاڕە دیار بکەین زۆر بەڕوونی. کەچی لەوانەیە جامع عەتیق یان زەینی لەشوێنی منارەی موزەفەرییە بووبێت، کە تاکو ئێستاش هەر ماوە و دەگەڕێتەوە بۆ میر موزەفەرەدین گوگبری. وا مەزندە دەکرێت کە ئەو منارەیە لەسەردەمی ئەو دروست کرابێ و پاشگری جامیعەکەیە، کە پێشتر هەبووە. بناغەی ئەو جامعە کە لە منارەکە کۆنترە دۆزرایەوە، کە وامەزندە دەکرێت لە کۆتایی سەردەمی ئەمەوی و سەرەتای چاخی عەباسی دروست کرابێ. خشتیش دۆزراوەتەوە کە مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ هەردوو سەدەی چوارەم و پێنجەمی کۆچی[٤٩]. بۆیە زۆر ئەگەری وا لەئارادایە کە جامع عەتیق بێ.

کاتێ کە تەرمی زەینەدینی باوکی موزەفەرەدین لە هاوسێی جامع عەتیق نێژرابێ، واتە هاوسێی شوێنەواری جامع موزەفەرییە، ئەگەری ئەوە لەئارادا نییە، کە ببێت بەگۆڕەکەی. دکتۆر موحسین حوسێن، هەمان مەزندەی هەیە، کە خەڵکەکە بەهەڵە دەیخەنە پاڵ سوڵتان موزەفەرەدین گوگبری[٥٠]. چونکە مەزارگەکە زۆر لەمنارەی ئێستاکە دوورە. لەسەر ئەم بنەمایە لەوانەیە ئەو گۆڕە هی کەسێکی تر بێت، نەک هی زەینەدین یان هی کوڕەکەی موزەفەرەدین گوگبری بێت.

لێرە ئەوەمان بۆ روون دەبێتەوە کە مزگەوتی جامع لە شارەکەدا لەیەک گومبەت و یەک دەرگا زیاتری هەبووە. لەم بارەوە ئیبن مستەوفی دەڵێت: گومبەتی باکوور کەوتبووە لای چەپی دەرگای باکوور[٥١]. پێدەچێ جامع دوو دەرگە و دوو گومبەتی هەبووبێ. شیاوی وتنە ئەوەی پێویستە لێرە ئاماژەی بۆ بکەین، کە گەورەترین و کۆنترین مزگەوت لە هەولێر، کە تا ئێستاشی لەگەڵدابێت هەر ماوە، مزگەوتی حاجی داودە لەبازاڕی گەورە، کە خاوەنی چەندین گومبەتە.

زۆر کەس لەسەر منارەی موزەفەرەدینیان نووسیوە[٥٢]، شتێکی واش نەماوە بیخەینە سەر زانیارییەکان، تەنیا ئەوە نەبێت، کە هیچ نووسراوێک ئاماژەی بەوە نەداوە، کە بەدیار بخات، منارەکە کێ دروستی کردووە، کە من لەسەر پەنجەرەیەک بە بەرزی پانزە مەتر لەسەرووی دەرگای منارەی کەوتۆتە لای رۆژئاوا (واتە بەلای رێی موسڵ)دا بەرز دەبێتەوە، کە هەندێ لە نووسراوەکان کەوتوونەتە خوارێ و توانیومانە ئەوەی لێ بخوێنینەوە: کاری- (پاشان وشەیەکی نادیار لەوانەیە وەستابێت) دواتر وشەی مەسعود، پاشان دەستەواژەیەکی تر کە روون نییە و ناخوێندرێتەوە، نووسینەکەش بە شێوەی کوفی جوان نووسراوە.

هەولێر لە سەردەمی ئەتابەکیدا مزگەوتی زۆر بووە. ئیبن مستەوفی باس لە هەندێکیان دەکات و زۆریەکەشی دەلالەتە لەسەر ئەوەی ژمارەی دانیشتوانی شار بەهۆی سەقامگیری سیاسی گەورە بووە. بۆ باشترکردنی رەوشی ئابووریش لە سەردەمی ئەتابەکیدا قەرزی داوە بەخەڵکەکە. میر ئەبو مەنسور سەرفتکینی کوڕی عەبدوڵڵا زەینی جێگری خاوەنی هەولێر کە لەساڵی (٥٥٩ک/ ١١٦٣ز) مردووە، لە هەولێر ژمارەیەک مزگەوتی دروست کردووە[٥٣]. تەنها ئیبن مستەوفی ناوی سێ مزگەوتی هێناوە ناوی نەهێناوە، لەوانە مزگەوتی"الكف"وەکو گوتمان نزیک بوون لە دەرگای کۆنی شار. کە پێی دەوترا دەرگای رەژوو فرۆشان[٥٤]. ئەو دامەزراندنە جیهانی هەولێر و هێڵکارییەکانی سەردەمی ئەتابەکی روون دەکاتەوە، وەک دیارە تا ئێستاش خوارە[٥٥] کەوتۆتە باشووری رۆژهەڵاتی قەڵات. دەرگای لاچەپی باشووری قەڵات بە دووری (٥٠٠) مەتر خەڵکی دەچنە سەر مەزارگە، پێی دەڵێن پەنجە عەلی. لەکاتێکدا کە لەسەر دەرگای مەزارەکە نووسراوە (مەزارگەی ئیمام پێنج عەلی). مەزارگەی ئیمام عەلی پێنجەم (ع) نازانین ئەو ئیمامە کێیە؟ جا گەر ئەو ناوەی مەزارگەکە دروست بێ، مزگەوتی ئەسعەدە فەندی هەیە -کە ئێستا تێکچووە- و کەوتۆتە دەروازەی باشووری قەڵات لە لای دووەمی بەرامبەر باڵەخانەی بەڕێوەبەرایەتی شوێنەوار و کلتوور و ناسراوە بەمزگەوتی لەپ، (الكف) کە یەکێکە لە مزگەوتە کۆنەکانی قەلات[٥٦]. ئیبن مستەوفی باس لە مزگەوتێکی دیکە (مزگەوتی دووەم) دەکات بەناوی مزگەوتی (عومەر دەرزیجانی)[٥٧]، بەڵام ئاماژەی بەشوێنەکەی نەکردووە.

وێڕای ئەوە ئیبن مستەوفی مزگەوتی سێیەم، بەناوی مزگەوتی خەراتین ناو دەبات[٥٨]، دیارە گەڕاندنەوەی بۆ بازاڕێکی تایبەت کە بەخەرطی عود واتە لە گەڵاکان دەبیتاشن[٥٩]. لەبارەی شوێنەکەشی ئیبن مستەوفی دەڵێت کەوتۆتە (لای چەپی مزگەوت جامع خراطینی لێبووە)[٦٠]، واتە کەوتۆتە لای راستی کەسێک، کە رووەو مزگەوتی جامعە.

## ٢-خانەقاو رەبت و زوایا:

خانەقا لەرووی زمانەوە واتە شوێنی خانە، واتە ئەو شوێنەی گەشتیاران لێی دادەبەزن. دەبینین ئیبن مستەوفی لەشوێنێک دەڵێت

خانەقا، بەڵام لە شوێنێکی دیکە ناوی بە کاروانسەرا (رباط) دەبات، واتە هەردووکی بەیەک مانا بەکارهێناوە. کاروانسەرا، ئەو شوێنەیە کە سەربازە موجاهیدەکانی تێیدا نیشتەجێ بوون و کەوتبووە دەوروبەری دەوڵەتی ئیسلامی، پاشان پێشکەوت و ماناکەی بوو بەشوێنی دابەزین و مانەوەی ڕێنماییبەران و زاهیدەکان و سۆفیگەران و زانایان. دواتر خانەقاو رەبت و زوایا لە هەولێر لەسەردەمی ئەتابەکی بەو مەبەستانەی بەکاردەهێندران لەشار تەنیا پێگەی مانەوە و خواپەرستی نەبووە، بەڵکو گۆڕاو بوو بەشوێنی دەرس وتنەوە و بڵاوکردنەوەی زانست و، ئیبن خەلەکان ئاماژەی بەوە داوە کە موزەفەرەدین گوگبری (چوار خانەقای بۆ زانا و نابینایان دروست کرد و پڕی کردن لەو دوو دەستە)[61]. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت خانەقا تەنیا نیشتەجێی شاندی زاناکان و سۆفیگەران نەبووە کە هاتوون، یان شوێنی ڕێنماییبەرو فەرموودە زانەکان نەبووە، بەڵکو سەرەڕای ئەوە بوو بە شوێنی خەوتنی نەخۆشە درێژخایەنەکان و نابینایان، هەروەکو ئەو پەیمانگایانەی ئێستاکە بۆ داڵدەو چاودێریکردنی کەرولاڵ و پەککەوتووەکان هەن[62].

لای ئیبن مستەوفی ئاماژەی کردووە بەو دوو خانەقایەی موزەفەرەدین گوگبری لە هەولێر دروستی کردوون بۆ داڵدەی سۆفیگەران[63]. یەکەمیان: خانەقای جنینە بووە کە هەندێ جار ناوبراوە بە (رباط جنینة)[64]. ئەو خانەقایە داهاتێکی هەبوو پێی دەگەیشت. شێخی خانەقا یان رباط هاوکاری کرێگرتەکانی دەکرد بەگوێرەی ئەو پارە و داهاتەی لەسامان و زەوی و زارە کشتوکاڵییە وەقف کراوەکان بۆی کۆ دەکرایەوە[65]. بەڵام پێگەی خانەقای جنینە، ئیبن مستەوفی دەڵێت قوتابخانەیەکی هەژاران بووە- هەروەها بەقوتابخانەی قوڕ ناسرا بوو[66].

بەڵام خانەقای دووەم: کە موزەفەرەدین گوگبری دروستی کردووە، پێی دەوترا، خانەقای سۆفییان، کە سۆفییان تێیدا نیشتەجێ بوون. یەکەم کەس لە شێخەکان کە بەرپرسیارێتی خانەقای گرتبێتە ئەستۆ، ئەبو حەسەن بەغدادی بووە (٥٥٩-٦١٨ک). ئیبن مستەوفی شوێنەکەی دیار کردووە و ئاماژەی داوە کە کەوتۆتە نزیک دەرگای ئاسوودە کە یەکێکە لە دەرگاکانی دیواری هەولێر. شێخی ناوبراو بۆ ماوەیەک لە وەقفی خانەقا کاری کردووە، تا ئەو کاتەی تێکچوو و گەڕایەوە بۆ خانەقا یان رباط جنینة[67].

هەروەها ئیبن خەلەکان ئاماژەی بە (خانەقای لای مەیدان) داوە[68]. مەیدان بەرفراوان بوو، کەوتبووە خوارووی قەڵات بەرامبەر دەرگای سەرەکی باشوور. پێدەچێ مەبەستی لەو خانەقایە، خانەقای سۆفیگەرانی ناوبراو بووبێ. هەروەها پێدەچێ دیاریکردنی خانەقای ئێستاکە بووبێ کە زۆر لە دەرگای ئاسوودە یان دەرگای ڕۆژهەڵاتەوە دوور نییە.

ئیبن مستەوفی باسی لەپێگەی خانەقای دیکەی نەکردووە، کە پێی دەوترا خانەقای موجاهیدین کە ناوەکەی دەگەڕایەوە بۆ موجاهیدەدین قایماز جێگری زەینەدین عەلی حاکمی هەولێر. وادیارە هەر ئەو دروستی کردووەو هاوکات پشتگیریش لەوە دەکات. زیاتر لە دەقێک هاتووە کە دەڵێت: "لە هەولێر زیاتر لەخانەقا دروست کراون کە وەقف کرابوون"[69]. سەرنج دەدەین ئیبن مستەوفی ناوی خانەقای موجاهیدین لە شوێنێکی دیکەدا بە رباطی موجاهیدی ناوی دەبات. وادیارە ئەو خانەقایە حەنبەلییەکان تێیدا نیشتەجێ بووبن بە بەڵگەی ئەوەی شێخەکەیان شەریف عەباسی لەسەر ئەو مەزهەبە بووە[70].

ئیبن مستەوفی پێگەی رباطی دیارکردووە، کە ناوی بە رباط زاهید بردووە و گوتوویەتی: "لەژێر قەڵات بووە"[71]، واتە لای دەرگای باشوور کە بەسەر خوارووی شاردا دەڕوانێ.

ئەبو سەعید گوگبری کە بە پیاوەتی و ئایینپەروەری ناسرا بوو، ئامادەش دەبوو لەو دانیشتنانەی کە لە خانەقاو مزگەوتەکان لە لایەن زانایانەوە ئامۆژگاری خەڵک دەکرا. ئیبن تاڵەبانی (کە لە ٦٢٨ک/ ١٢٣١ز) مردووە، ئامادە بووە لەگەڵ ژمارەیەک زانایانی دیکە، کە ڕێبەرانی ئایینی بوون.

ئیبن مستەوفی لەو (ربطانە) زیاتر باس ناکات، کە باسمان کردن.

بەڵام گۆشەکان کە تاکەکەی (گۆشەیە) بەگۆشەی جامع یان مزگەوت یان (ربط) یان قوتابخانە دەوترا. وادیارە ناوی هەندێکیان هاتووە بەبێ ئەوەی سەر بەهیچ دەزگایەک لە دامودەزگاکان بن، وا دیارە بەشێوەیەکی تاک و سەربەخۆ دروست کراون. لەوانە گۆشەی ئەحمەد بن موزەفەرەدین خەرات، کە ئەبو سەعید گوگبری مکوڕ بوو لەسەر گەڕانەوەی[٧٣]. هەروا ئەو گۆشەیەی ئیبن مستەوفی باسی دەکات بە شوێنی ئەبیبەکری ئاوانی کە ناسرا بوو[٧٤]. هەروەها ئەو گۆشەیەی موزەفەرەدین گوگبری دروستی کرد، ئەو کەسانە لێی دادەبەزین، کە داوای خێریان لە موزەفەرەدین کردبایە. ئەو گۆشەیەش هەروەکو ئیبن مستەوفی باسی دەکات، بەگۆشەی ئەبو بەکر محەمەد بن حوسێن کوردی ناسرابوو، کە تێیدا نیشتەجێ بوو، پێگەشی دیار کردووە کە کەوتبووە کۆڵانی منارە[٧٥]. بەڵام ئێمە پشتگیری لەوە دەکەین کە دکتۆر موحسین محەمەد حوسێن بۆی چووە و دەڵێت: شێخ محەمەد کوردی دەکرێت هەمان ئەم (ئیمام) محەممەدە بێت، کە مەزارگەکەی چەند هەنگاوێک لەمنارەی موزەفەریە دوورە. دکتۆر موحسین دەڵێت: ئەو کۆڵانەیە دەگەڕێتەوە بۆ ئەو منارەیە (موزەفەریە خۆزیا شێخ محەمەد کوردی لەهەمان گۆشە نێژرابا، ئەو کات مەزارگەکە دەبووە مەزارگەی شێخ محەمەد. بەڵام ساڵی مردنی ئەو شێخەو مێژووی دامەزرانی ئەو مەزارگەی نەخستۆتە روو[٧٦]. ئێمە دەڵێین شێخ محەمەد کوردی هاوچەرخ بووە (٤٧١-٥٧٣ک/ ١٠٧٨-١١٧٨ز) کە یەکێک بووە لە نۆژەنکەرەوەکان و لە موسڵ پێی گەیشتووە[٧٧]. بەڵام کاتێ کوردی لەو گۆشەیە نیشتەجێ بوو، کە موزەفەرەدین گوگبری دروستی کرد (کە حوکمرانی هەولێری کرد لەساڵی ٥٦٣ تا ساڵی ٦٣٠ک) کە شێخ محەمەد کوردی لەماوەی ساڵانی (٥٦٣-٥٧٣ک / ١١٦٨-١١٧٨ک) لە ژیاندا بووە و گۆشەکەش لەپاش ساڵی ٥٦٣ک دروست کراوە.

شایانی باسە پێشتر باسمان لە گۆشەی قەڵات کرد، کە پێی دەوترا (گۆشەی بستی)، کە کەوتبووە لای رۆژئاوای مزگەوتی قەڵات.

**٣- حەشارگەو خانەی چاودێری:**

سەرەڕای ئەوەی زانرا کە موزەفەرەدین گوگبری بایەخی زۆری بەدروستکردنی خانەی خواپەرستی دەدا، لەوانە خانەقاو بەستەک و گۆشەکان، کە شوێنیان هەبوو بۆ دابەزین و مانەوەی شاندەکان کە بۆ هەولێر دەهاتن، ژمارەیەک لەو خانەقایانە شوێنی چاودێریکردنی نابینایان و پەککەوتووەکانی لێ بووە، هەروەک پێشتر باسمان لە خانەقا کرد تیشکمان خستە سەر. واتە بایەخێکی گەورەی بە چاودێری کۆمەڵایەتی دەدا. باڵی سۆزی بەسەر بێوەژنانیش راگەیشت و خانەیەکی بۆ ئەوانیش دروست کرد تەواوی خزمەتگوزارییەکانیشی بۆ دابین کردن[٧٨]. هەروەها خانەیەکیشی بۆ بێ سەرپەرشتیارانی (ئەو منداڵانە کە هەڵدەگیرێنەوە) بچووک دروست کرد کە بێ باوک بوون. خانەیەکی دیکە بۆ منداڵی بێکەس دروست کرد و ژمارەیەک شیردەری بۆ دامەزراندن. لەپاڵ ئەوەی خانەی میوانداریشی دروست کرد[٧٩]، کە هەموو خەڵکێک رووی تێ دەکرد، بۆ هیچ کەس قەدەغە نەبوو، کرابوو بەچوار بەش: شوێنی ئەمینداران و شوێنی نابینایان و شوێنی منداڵانی هەتیو و شوێنی هەژارەکان. (مووچەیەکی نەختینەیی) بۆ تەرخان کردن لەگەڵ جلوبەرگ. ئیبن مەلاعب کە لە (٦٠٤ک- ١٢٠٨ز) مردووە سەرپەرشتیاری ئەو خانەی گرتە ئەستۆ[٨٠]. دەتوانین موزەفەرەدین بەچاکسازیخوازی کۆمەڵایەتی لەبواری پێشکەشکردنی چاودێری کۆمەڵایەتی و خێرخوازی دابنێین.

**٤- بیمارستان (نەخۆشخانە):**

ئێستا پێی دەوترێت بنکەی تەندروستی یان نەخۆشخانە، لە هەولێر یەک نەخۆشخانە هەبوو ئەویش موزەفەرەدین دروستی کردبوو، هەروەک ئیبن مستەوفی لە دوو شوێن لە دوو رووداوی مردن لە ساڵانی (٦١٦ و ٦١٩ک) ئاماژەی پێدەدا، بەڵام شوێنەکەی دیار ناکات. نەخۆشخانەکەش گۆڕستانێکی تایبەت بەخۆی هەبووە[٨١].

## سێیەم: گەڕەک و بازاڕەکان

ئیبن مستەوفی تەنیا باسی

لەیەک گەڕەک کردووە، قسەکەی لەسەر زاری یەکێ لەفەقیهەکان دەڵێت: شوڕ دەبووەوە بۆ کۆڵانی منارە، وادیارە یەکێک بووە لە گەڕەکەکانی هەولێر، کەوتبووە گۆشەی شێخ ئیبن کوریدی[٨٢]. ئەو گەڕەکە کەوتبووە سەر ئەو ڕێگایەی بۆ منارەی کۆن دەچوو، کە زۆر گومان دەکرێت منارەی موزەفەرییە بێ. لەوانەیە کەوتبێتە ڕۆژئاوای ئێستای شار. دەکرێت گەڕەکی ناوبراو (گەڕەکی عارەبانی) ئێستاکە بووبێ، کە کەوتۆتە نێوان قەڵات و منارە. ئیبن خەلەکان دەڵێت: لە هەولێر گەڕەکێک هەبوو پێیان دەگوت گوندی جوبرەیل بە بچووک کراوەیی. ئیبن مستەوفی لە کتێبەکەیدا دەیگەڕێنێتەوە بۆ جوبرەیلی باپیری شاعیر عیسا کوڕی سەنجر کوڕی بەهرام کوڕی جوبرەیل حاجری[٨٣]. بەڵام بەشی دواتری مێژووی ئیبن مستەوفی لەسەر ئەو گەڕەکە هیچ بەرچاو ناکەوێ، تەنیا ئەوە نەبێت دەڵێت گوندەکە سەر بەهەولێرە و پێی دەوترێت (جبریلا باز)[٨٤].

بەڵام سەبارەت بەبازاڕەکان بەر لەوەی چڕی دانیشتوان بکەوێتە قەڵات بازاڕی لێ بوو، دواتر کە بەشێکی دانیشتوانەکەی گوازرایەوە بۆ خوارەوە بازاڕێکی لێ دامەزرا. بەڵام ئیبن مستەوفی باسی لە سەرجەم بازاڕەکانی شار نەکردووە. تەنیا ئاماژەی بە قەیسەری داوە، کە ئەبووسەعید گوگبری دروستی کردووە. یەکێکی بە کارگێڕ داناوە لە باڵەخانەکانی واتە لەسەر خاوێنکردنەوە و چاککردنەوەیدا، ئەمەش لەساڵی (٥٩٥ک/ ١١٩٩ز) بووە[٨٥]. ئەو قەیسەرییە کەوتۆتە بەرامبەر دەرگای سەرەکی (باشوور) واتە هەمان شوێنی قەیسەری ئێستاکە. یاقوت حەمەوی، ئاماژەی بە نۆژەنکردنەوەی بازاڕەکان و قەیسەری هەولێری داوە، کە لەلایەن میر موزەفەرەدین نۆژەن کراوەتەوە[٨٦]، بەڵام ئیبن مستەوفی تەنیا ئاماژەی بە یەک قەیسەری داوە.

ئیبن مستەوفی سەرەڕای ئەو قەیسەرییە، ناوی سێ بازاڕی هێناوە- بازاڕی سفرچییەکان، بازاڕی کۆنی بەیتاڵەکان، بازاڕی تەڵاشەکان. لەم بازاڕە مزگەوتێکی بەناوی مزگەوتی تەڵاشەکان دروست کراوە[٨٧]. هەروەک پێشتر لەناوی مزگەوتەکان باسمان کرد. لەناوهێنانی ناوی بازاڕەکان ئەوە دەردەکەوێت، هەر بازاڕە و تایبەت بووە بە پیشەیەکی دیاریکراو.

**چوارەم: گۆڕستانەکان**

لەسەردەمی ئیبن مستەوفیدا لەهەولێر یەک گۆڕستانی گشتی هەبوو کەوتبووە ڕۆژهەڵاتی شار، لە دەرەوەی شووردو زۆرجار پێی دەگوترا گۆڕستانی ڕۆژهەڵات. ئیبن مستەوفیش لەزۆر شوێن ئاماژەی پێداوە[٨٨].

گۆڕستانی دیکەش هەبووە، لەوانە گۆڕستانێک لە ڕۆژهەڵاتی هەولێر پێی وتراوە گۆڕستانی "مشهدکف"[٨٩]. وادیارە ئەو گۆڕستانە بەشێک بووە لەگۆڕرستانی گشتی لەڕۆژهەڵاتی شاردا. چونکە ئیبن شعار ئاماژەی بە ناشتنی یەکێ لەفوقەهاکان داوە لەو گۆڕستانەی (مەشهەد کەف) دا[٩٠]. ئیبن مستەوفیش ئاماژەی بەوە داوە کە ئەو فەقیهە لە گۆڕستانی گشتی لەڕۆژهەڵاتی هەولێر نێژراوە[٩١]. هەروەها ناوی گۆڕستانێک هاتووەو پێی وتراوە گۆڕستانی لەخواترس ئەحمەد کوردی زرزاری کە لەگۆڕستانی گشتی بووە، (واتە لە دەرەوەی) شار بووە بەلای ڕۆژهەڵاتدا[٩٢]. ئەو زاهیرە لەو گۆڕستانە گشتییە نێژراوە. دواتر وادیارە زۆر لە مردووی تر لە دەوروبەری گۆڕەکەی ئەو نێژراون هەروەکو دکتۆر موحسین دەڵێت:"[٩٣] شوێنەکەش بوو بەگۆڕستان و بەناوی ئەو زاهیرە ناوبرا."

ئیبن مستەوفی ئاماژە بە گۆڕستانێکی دیکە دەکات و دەڵێت لەمەیدان نزیک بووە، لە هەولێر بە گەردی زەتتی ناسراوە[٩٤]. "زطی" لەوانەیە هەمان گۆڕستان بێت (گۆڕستانی دەرگای مەیدان)، کە ئیبن خەلەکان ئاماژەی بۆ کردووە[٩٥] پێشدەچێ ئەو گۆڕستانە شوێنی گۆڕستانی گەورەی ئێستاکە بێت، کە کەوتۆتە پشت باڵەخانەی پێشووی هەردوو بەڕێوەبەرایەتی ئاو و کارەبا، نزیکیشە لە مەیدان کە کەوتۆتە خوارووی دەرگای باشووری قەڵات. ئەوەی لێرە جێی ئاماژە پێدانە، ئیبن خەلەکان ناوی یەکێ لە گۆڕستانەکانی هێناوە، کە کەوتۆتە

سەر (بەستێ)[96] کە تائێستاش بەو ناوە ناسراوە و بەناوەڕاستی شاردا دەڕوات. دکتۆر موحسین وا مەزەندە دەکات کە ئەو گۆڕستانە یان ئەو گۆڕستانەیە (لەبەردەم تەعجیل) کە بەسەر بەستێ دەڕوانێت، کەوتۆتە لای باشووری ڕۆژئاوای شار، یاخود ئەو گۆڕستانە گەورەی ئێستاکەیە کە کەوتۆتە باشووری قەڵات[97].

وێڕای ئەو گۆڕستانانە، ئاماژە بەگۆڕستانێکی دیکە دەدات، کە کەوتۆتە لای بازاڕی کۆنی بەیتاڵەکان[98] کە نزیکە لەمزگەوتی "جامع زەینی". هەروەها گۆڕستانی کەم ئەندام و نابینایان[99] کە لەخانەقا نزیکەو بە ناوەکەشی ناسراوە. گۆڕستانی نەخۆشخانەش لە هەولێر هەبووە[100]. وادیارە ئەوەی لەنەخۆشخانە مردبێ، لەو گۆڕستانەیان ناشتووە. لەکۆتاییدا ئیبن مستەوفی باس لە گۆڕستانی سۆفییەکان دەکات، کە یەکێ لە سۆفییەکانی سەدەی شەشەمی کۆچی لێ نێژراوە[101].

## پێنجەم: دامودەزگا فێرگەییەکان

هەڵبەتە دامودەزگاکانی ئایینی، وەک جامعەکان و مزگەوتەکان و خانەقا و بەستەک و گۆشەکان، تەنیا شوێنی خواپەرستی و زیندوو کردنەوەی موناجاتی ئایینی نەبووە، بەڵکو سەرەڕای ئەوە شوێنی وانە وتنەوە و خوێندنی زانستە جیاجیاکان بووە. واتە لەیەک کاتدا دامودەزگای ئایینی و فێرگەیی بووە. شایانی ئاماژە پێکردنە دامودەزگای فێرکردنی دیکەش هەبوونە وەک خانەکانی فەرموودە و قوتابخانەکان.

### ١- خانەی فەرموودە (حديث)

ئیبن مستەوفی لە زۆر شوێن لە کتێبەکەیدا ناوی خانەیەکی فەرموودەی لە هەولێر هێناوە ئەویش خانەی فەرموودەی موزەفەریەیە[102] کە موزەفەرەدین گوگبری دروستی کردووەو لەساڵی (٥٩ک/١١٩٨ز) کراوەتەوە. بۆتە شوێنی فەقیهەکان و زانایان و ئەو شاندانەی، کە ڕوویان لە هەولێر کردووە. تێیدا قورئانیان دەخوێند و گوێیان لە فەرموودە بەنرخەکانی پێغەمبەر (د.خ) دەگرت. سەرەڕای گوێگرتن لەئامۆژگاری و ڕێنمایی و ڕێبەری لە زاناو شارەزایانی خانەکە. هەروەها بووبووە شوێنێکی تایبەت بۆ وانە وتنەوەی زانستە جیاکان، لەوانە: (نەحو)[103]. سوڵتان ئەبو سەعید گوگبری لەگەڵ گەورە پیاوانی شارو پیاوماقووڵان لەو خانەیە ئامادە دەبوون بە بەردەوامی[104]. دکتۆر بەشار عەواد مەعروف ئەم خانەیە لە هەولێر لەگەڵ خانەی فەرموودەی موزەفەریە لە موسڵ، بە کۆنترین خانەی فەرموودە لەجیهانی ئیسلامی دادەنێن[105]. بەڵام سەعید دیوەجی وای دەبینێ، کە یەکەم خانەی فەرموودە کە لەجیهانی ئیسلامی هەبووبێ ئەو خانەی فەرموودەیەیە، کە نورەدین مەحموود کوڕی عیمادودین زەنکی لەموسڵ دروستی کرد[106]. ئێمە پشتگیری لەو بۆچوونەی دیوەجی دەکەین. چونکە موسڵ لەماوەی ساڵەکانی (٥٦٦-٥٦٩ک/ ١١٧٠-١١٧٣ز) سەر بەنورەدین بووە. جا بۆیە دەبێ ئەو خانەیە هەر لەو ماوەیەدا دروست کرابێ. چونکە موزەفەرەدین گوگبری لەپاش مردنی نورەدین مەحموود لەساڵی ٥٦٩ک پەنای بۆ موسڵ بردووە[107]. واتە خانەی فەرموودەی موزەفەریە لەموسڵ دەبێ لە پاش ئەو ساڵە دروست کرابێ. جا گەر خانەی فەرموودەی موزەفەریە لە هەولێر لەساڵی (٥٩٤/١١٩٨ز) کرابێتەوە هەروەکو پێشتر باسمان کرد، ئەوە ئەوەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە کە ئەو خانەی فەرموودەی نورەدین لەموسڵ دروستی کردووە، کۆنترە لە هەردوو خانەی فەرموودەی موزەفەریە لەهەردوو شاری هەولێرو موسڵدا. بەڵام ئیبن مستەوفی ئاماژەی بەوە نەداوە، کە بمانگەیێنێت بەشوێنی خانەی فەرموودەی موزەفەریە لە هەولێر.

### ٢- قوتابخانەکان

قوتابخانەکان لەسەردەمی میر موزەفەرەدیندا لەجامع و مزگەوتەکان لەناو هەولێر سەریان هەڵدا کە سەربەخۆ بوون. ئیبن مستەوفی ژمارەیەک قوتابخانەی ناو بردووە، لەوانە:

### ١- قوتابخانەی قەڵات

ئەم قوتابخانەیە پێی دەوترا قوتابخانەی عەقیلی، کە بۆ ئەبی عەباس خدر کوڕی نەسر کوڕی عەقیل کوڕی نەسر هەولێری

دەگەڕایەوە، کە فەقیهی شافیعی بوودو یەکەم کەس بووە، کە وانەی لە هەولێـر گـوتۆتەوە لەسـاڵی (٥٦٧ک/١١٧٢ز) کـۆچی دوایی کـردووە[١٠٩] سـەبارەت بە ئەو قـوتابخـانەیە، زوبێـر بیلال دەڵێت: قـوتابخـانەی قـەڵات کـە ئەبوبەکـر ئەفەندی ناسراو بەمەلافەندی وانەی تێدا وتووتەوە یەکێکە لەو قوتابخانە ماوەتەوە[١١٠].

## ٢- قوتابخانەی خدر کوڕی نەسر کوڕی عەقیل

قوتابخانەی خوارووی قەڵاتی پێ وتراوە. شایانی باسە ئیبن مستەوفی ناوی ئەو زاناو فەقیـهانەی هێناوە، کە لەهەردوو قـوتابخـانەی قـەڵات و قوتابخانەی خدر کوڕی نەسر کوڕی عەقیل وانەیان وتووتەوە.

## ٣- قوتابخانەی موجاهیدی

بۆیە ئەو ناوەی لێنراوە چونکە دەگەڕێتەوە بۆ موجاهیدودین قایماز جـێگری زینەدین عـەلی کـوچکی حـاکـمی هەولێـر. لەم بارەوە ئیبن خـەلەکـان دەڵێت: مـوجـاهیـدودین قـوتابخـانەیەکی دروست کـرد لەگـەڵ خـانەقـایەک و زۆر فـەقـیـهـە بووە و زیاتری لە هەولێـر وەقف و دروست کرد[١١٣].

## ٤- قـوتابخـانەی خـۆڵ یان قوتابخانەی هەژارەکان

پێدەچێ قـوتابخـانەی موزەفـەریە بووبێ کە بۆ مـوزەفـەرەدین گـوگـبری دەگـەڕێتـەوە، ئیبن مـسـتـەوفی لەرووداوەکـانی سـاڵی (٦١٥ک)ئامـاژەی بۆ کـردووە[١١٤]. ئەو قوتابخانەیە هەردوو مەزهەبی شافیعی و حەنەفی تێدا خوێندراوە. ئەمەش دەلالەت لەسەر ئەوە دەکات کە کوردو تورکمان لەو قوتابخانەیە ئامادەبوون. شـایانی ئامـاژە پێکردنە خـاوەنی هەولێـر بۆ خـۆی سەرپەرشـتیی ئەو قـوتابخـانەی کـردووە و نـاوە ناوەش سەردانی کردووە.

عـەبـاس عـەزاوی دەڵێت: ئەو قـوتابخـانەیە کـە پێی دەوترا قـوتابخانەی گوگبری کەوتبووە نێوان گـۆڕی مـوزەفـەرەدین و منارە، کـە لە گۆڕەپانە گەورەکەدایە[١١٥].

### پەراوێزەکان

١- دائرة المعارف الاسلامية، الطبعة العربيـة الجديدة ١٩٦٩: هارتمان ٥١٦/٢، سترك ٢/ ٥٢١.

٢- هەمـان سـەرچاوە، سـتـرك ٢/ ٥٢١، د. محـسن محـمد حسين أربيل في العهد الاتابكي، ٢٢١-٢٢٢.

٣- ابن خـرداذبة: المسالك والممالك ص٦/، قدامة بن جعفـر: الخرج وصنعـة الكتـابة شـرح وتعليق الدكتـور محمد حسين الزبيدي، دار الرشيد للنشر، سلسلة كتاب التراث، طبعة ١٩٨١، ص١٥٩.

٤- کورە بەپێی زاراوەکانی سـەردەمی ئیسلامی دابەش دەبێت (رستق)، رستـقیش بۆ چەند تەساسیجێک تەسیجیش بۆ چەند گوندێک. (المقدسي: احسن التـقـاسـيم في معـرفـة الاقـاليم، مطبعـة بريل ١٩٠٦، ص٤٧، ياقوت الحموي: معجم البلدان، ١/ ٣٩-٤٠).

کـورە بەرامـبـەر بە پارێزگـایە، رسـتـاقـیش: قـەزاو تەسـوجـیش: ناحیە (شارۆچکە) ئەمە لە زاراوە کارگێڕییەکانی عێراقی ئێستا.

٥- دائرة المعارف، سترك ٥١٧/٢، أربيل في العـهـد الاتابكي ص٢٩-٣٣.

٦- المعنونة: أربيل في العـهـد الاتابكي، مطبعة أسعد، بغداد ١٩٧٦.

٧- الكتـاب بقـسـميه من منشورات وزارة الثقافة والاعلام العراقية، دار الرشيد للنشر، من سلسلة كتب التراث (٩٩)، (١٠٠). وهو عبارة عن تراجم للشخصيات التي وردت الى أربل وعن الارابلة الذين برزوا في العلم والتـقي او احتلوا مـراكز مـهـمـة، علي غـرار كتاب تاريخ بغداد لابن الخطيب، وتاريخ دمـشـق لشـهـر اذار ١٢٤٤م، اي بعد اربع سنوات من وفاة المؤرخ (تاريخ أربل، القسم الاول ص١٠-١١). وكان الكتاب الاصلي في أربع مجلدات، لم يبق منه الا الجزء الثـاني (أربيل في العهد الاتابكي ص٢٧٧-٢٧٨).

٨-بڕوانە بەشی یەکـەم لە: البـاب الثـاني المعنون: خطط مـدينة اربيل، الصـفحـات ٢٢١-٢٣٧ والفصل الثاني: الحياة الثقافية، الصفحات ٢٤٥-٢٥٤.

٩- شيرين شيرزاد، القسم الثالث من اطروحتها حول تطوير قلعة اربيل، ترجمة عرفان سعيد، ص٣.

١٠- معجم البلدان١/ ١٣٨.

١١- هەمان سەرچاوە.

١٢- عن قلعة حلب ووصـفهـا، انظر مـقالة الدكتـور مـحسن مـحـمد حسين المعنونة: قلعتان عظيمتان في مجلة كاروان العدد (١١)، اب ١٩٨٣ ص١٤٨-١٥٢.

١٣-وفيات الاعيان تحقيق الدكتور احسان عباس، بيروت ١٩٦٩، ج٣/ ١١٨.
١٤- نسب الكتاب خطأ الى ابن الفوطي، تحقيق د.مصطفي جواد، مطبعة الفرات، بغداد ١٣٥١ه/ ١٩٣٢م،/ ص٤٦.
ويجدر ذكره هنا ان للقلعة بابا مواجهة للقيصرية باتجاه الجنوب، هدمت عام ١٩٦٠ والتي كانت قد شيدت عام ١٨٦٠، وبنيت بدلاً منها باب جديدة تختلف كلية عن طراز الباب القديم، وكان الاجدر اعادة بناء الباب على الطراز نفسه التي كانت عليه الباب القديمة. وفتحت اخرى في أواخر العهد العثماني من الجهة الشرقية، أما الباب الثالثة الشمالية والمواجهة لعينكاوة فتم فتحها في أوائل مايسمى بالحكم الوطني أيام المتصرف احمد عثمان وسميت بالاحمدية نسبة اليه.
انظر:
هادي رشيد الجاوشلي، تراث اربيل التاريخي ص٤٥.
١٥- الحوادث الجامعة والتجارب النافعة في المائة السابعة ص٤٨.
١٦- تاريخ أربل، ق١ ص٩٦، ابن الشعار: عقود الجمان ج٩ ورقة: ١٢٢ (انظر أربيل في العهد الاتابكي) ص٣١١.
١٧- وهو عبدالسلام مجدالدين ابن تيمية (٥٤٢-٦٢٢ه)، فقيه وعالم حنبلي، وهو جد الامام ابن تيمية (تقي الدين احمد) المشهور.
١٨- أربيل في العهد الاتابكي ص٣١٦ نقلا عن ابن الشعار، عقود الجمان ج/٦ ترجمة المبارك بن أبي البركات.
١٩- اربيل في العهد الاتابكي ص٣٢٣.
٢٠- هەمان سەرچاوی پێشوو ص٣٢٢.
٢١- هەمان سەرچاوی پێشوو ص٢٢٩ نقلا عن عقود الجمان ١٢٢/٩.
٢٢- تأريخ اربل ١ ص ص/ ٤٢،٨٩،٢٥١،٢٥٢،٣٣٨.
٢٣- هەمان سەرچاوەی پێشوو، ق١ ص١١٥.
بەندیخانە لە سەردەمی عوسمانییەکان و سەردتای حوکمڕانی نیشتمانی دەکەوتە لای ڕاستی دەرگای سەرەکی قەڵا (باشوور) بۆ ئەو کەسەی لە خوارەوە بۆ قەڵا دەچوو، بەندینخانەش بەشێک بوو لە سەرا.
٢٤- تقويم البلدان، طبعة باريس ١٨٤٠، دار الطباعة السلطانية ص٤١٣.
٢٥- ابن خلكان: وفيات الاعيان (ط ١٩٤٨) ج٣ ص٢٧٦.
٢٦- خەڵکی شار دەڵێن لە کاتی تێکدانی دوکانەکی چوار دەوری قەڵا تونێلێکی دۆزبوەتەوە، کەوا مندالآن بە هۆیەوە سەر دەکەوتنە لای سەرێ، هادی چاوشلی دەڵێ: من بیستوومە کە پەنجا ساڵ لەمەوبەر کون و زارێک لە قەڵا هەبوو، لە کتێبەکەی لە ساڵی (١٩٨٥) چاپیکردووە، ئەمەش لەوکاتەی کار و هەڵکەندنیان لە هەندێک لە دوکانەکانی قەڵا کردووە.
٢٧- وفيات الاعيان ٣/ ٢٧٠.
٢٨- بڕوانە: اربيل في العهد الاتابكي ص٢٢٣-٢٢٨.
٢٩- معجم البلدان، طبعة وستنفلد ١٨٦٦، المجلد الاول ص١٨٦.
٣٠- معجم البلدان ١٣٨/١.
٣١- بڕوانە: اربيل في العهد الاتابكي ص ص٢٢١-٢٢٣.
٣٢- رحلة ريج في العراق ١٨٢٠، تعريب بهاءالدين نوري، بغداد ١٩٥١، صص٢٤٤-٢٤٥.
٣٣- دائرة المعارف الاسلامية طبعة ١٩٦٩، ج٢ ص٥٢.
٣٤- تأريخ أربل ق١ ص٢١٣، ٢٢٣، ٢٦٤، القزويني: اثار البلاد ص١٩٢-١٩٣.
٣٥- تأريخ أربل ق١ ص١١٥.
٣٦- هەمان سەرچاوە ق١ ص٣٧٤.
٣٧- هەمان سەرچاوە ج١ ص١١٥.
٣٨- هەمان سەرچاوە ق١ ص٢١٤.
٣٩- هەمان سەرچاوە ق١ / ٨٦،١٢،٢٥١،٢٥٢،٣٣٨،١١٢ ،٤٢.
٤٠- هەمان سەرچاوە ق١ ص ص/ ٤٢،٨٦،٢٥١،٢٥٢،٣٣٨،
٤١- هەمان سەرچاوە ق١ ص٨٦.
٤٢- هەمان سەرچاوە ق١ ص١١٢.
باس لەوە دەکات، کەوا مزگەوتی قەڵا لە هەمان شوێنی خۆی تازە کراوەتەوە، کە ناودڕاستی قەڵایە، مزگەوتی گەورەی قەڵا یان مەلافەندی ناسراوە.
٤٣- المصدر نفسه ق١ ص ص/ ١٢١،٢٢١،٢٣٢،٣٠٤،٣٧٠.
٤٤-وفيات الاعيان ٣/ ٢٧٠.
٤٥- تأريخ اربل ق١ ص١١٧.
٤٦- هەمان سەرچاوە.
٤٧- هەمان سەرچاوە ق١ ص١١٢.
٤٨- هەمان سەرچاوە ق١ ص٢٢١.
بە پێویستی دەزانم کە باس لەوە بکەم، کە یەکێک لە بەساڵاچووانی شار، کە (سەید عەساف حوسێن)ە، لە دایکبووی (١٩٠٣) بوو، لە چاوپێکەوتنێک لە ڕێکەوتی ١٩٨٧/٨/١١ پێی گوتم: گۆڕەپانی بەیتەرە لە نزیک منارەی موزەفەرییە بوو.
٤٩- مجلة سومر المجلد ١٨ لسنة ١٩٦٢، مقالة كامل حسين: التنقيب حول المئذنة المظفرية في اربيل، ص٢٠٦-٢٠٧ أربيل في

العهد الاتابكي ص٢٣٢-٢٣٣.
٥٠- اربيل في العهد الاتابكي ج١ ص٢٠٨.
٥١- تأريخ اربل ق١ ص٣٧٠.
٥٢- بروانە نموونە: مجلة سومر، المجلد السادس عشر ١٣٨٠ه/ ١٩٦٠م، مقالة وداد علي القزاز: المنارة المظفرية في اربيل: تاريخها ووصفها، والمجلد ١٨ لسنة ١٩٦٢ مقالة كامل حسين: التنقيب حول المئذنة المظفرية في اربيل، زبير بلال اسماعيل: أربيل في ادوارها التأريخية، طبع سنة ١٩٧١، د.محسن محمد حسين: أربيل في العهد الاتابكي.
٥٣- وفيات الاعيان ٢/ ٢٣٩.
٥٤- تأريخ أربل ق١ ص/ ٢٦٤،٢٢٣،٢١٣ القزويني: آثار البلاد ص/ ١٩٢-١٩٣.
٥٥- أربيل في العهد الاتابكي ٢٢٣-٢٢٤، ج٥ ص٢٢٣/.
٥٦- زبير بلال اسماعيل: علماء ومدارس في أربيل، ص٢١.
٥٧- تأريخ أربل ق١ ص٣٦٧.
٥٨- هەمان سەرچاوە ق١ ص١٧٠.
٥٩- الرازي: مختار الصحاح، دار الرسالة، الكويت ١٩٨٣، ص١٧٢.
٦٠- تأريخ أربل ق١ ص١٧٠.
٦١- سعيد الديوهجي، التربية والتعليم في الاسلام، مطابع جامعة الموصل ١٩٨٢ ص٦٨.
٦٢- وفيات الاعيان ٤/ ١١٨ ابن المستوفي ق١ ص١٨٥/-٢٤١.
٦٣- تأريخ اربل/ ٣١٧.
٦٤- هەمان سەرچاوە ق١ ص٢٥٩/، ٢٦، ٢٦، ٢٦، ٢٨٦، ٢٩٩، ٣٠، ٣٢٧، ٣٥٠، ٣٨٧.
٦٥- هەمان سەرچاوە ق١ ص٣٠٤.
٦٦- هەمان سەرچاوە ق١ ص١٥٩.
٦٧- هەمان سەرچاوە ق١ ص٢١٤- ٣١٧.
٦٨- وفيات الاعيان (ظ ١٩٤٨): ٣/ ٢٧٤.
٦٩- سەرچاوەی پێشوو/ ٢٤٦، طبقات الاسنوي ١/ ٤٩٥.
٧٠- تأريخ اربل ق١ ص/ ٩٤، ١٦٩، ٣٢٨، ٣٨٧، ٥٥٠.
٧١- هەمان سەرچاوە ق١ ص٢٣٩.
٧٢- هەمان سەرچاوە ق١ ص٢٤٢- ٣٠٧.
٧٣- هەمان سەرچاوە ق١ ص١٧٩.
٧٤- هەمان سەرچاوە ق١ ص٥٥.
٧٥- هەمان سەرچاوە ق١ ص/ ٤١٢، ٣٧١، ٣٥٧.
٧٦- اربيل في العهد الاتابكي ص/ ٢٢٦ ج١.
٧٧- تأريخ اربل ق١ ص٣٧١/.
٧٨- ابن خلكان ٣/ ٢٧٢ (ط ١٩٤٨)، ابن أبي عذيبة: انسان العيون/ ٢٩٦، بڕوانە: اربيل في العهد الاتابكي ص٢٣٧/.
٧٩- ابن خلكان ٤/ ١١٨ (ط احسان عباس ١٩٦٩)، ابن المستوفي ق١ ص١٥٧-٣٨١، أربيل في العهد الاتابكي ص٢٣٧/.
٨٠- ابن المستوفي: ق١ ص١٥٧/، ق٢ ص٢٥٥/.
٨١- تأريخ اربل ق١ ص٢٤١/- ٢٤٥، بۆ زانیاری زیاتر بگەڕێوە بۆ: راجع: أربيل في العهد الاتابكي، ص٢٣٦/.
٨٢- تأريخ أربل ق١ ص٤١٢/.
٨٣- ابن خلكان ٣/ ١٧٢ (ط١٩٤٨).
٨٤- تأريخ أربل ق١ ص٣٦٥/.
٨٥ - تأريخ أربل ص١٧٩/.
٨٦- معجم البلدان ج١/ ١٨٦.
٨٧- تأريخ أربل ق١ ص/ ١٧٠، ٢٤٨، ٢٢١، ١٣٥.
٨٨- هەمان سەرچاوە ق١ ص ص/ ٣٨، ٤٦، ٨٢، ١٨٥، ٢٢٣، ٣٣٢.
٨٩- هەمان سەرچاوە ق١ ص/ ٢٣١.
٩٠- أربيل في العهد الاتابكي ص/ ٢٢٤ نقلا عن مخطوطة عقود الجمان ٤/ ١٩.
٩١- تأريخ أربل ق١ ص٥٣/.
٩٢- هەمان سەرچاوە ق١ ص/ ٣٨، ٣٩، ٤٦.
٩٣- أربيل في العهد الاتابكي ص/ ٢٨٩.
٩٤- تأريخ أربل ق١ ص/ ٢٣٩.
٩٥- وفيات الاعيان ٣/ ٥٠٤ (طبعة احسان عباس ١٩٧٠).
٩٦- هەمان سەرچاوە ٤/ ١٠٤ (طبعة ١٩٣٨).
٩٧- ربيل في العهد الاتابكي حاشية ٣ ص٢٢٨.
٩٨- تاريخ أربل ق١ ص٢٢١.
٩٩- هەمان سەرچاوە ق١ ص/ ١٨٥، ٢٤١.
١٠٠- هەمان سەرچاوە ق١ ص/ ٢٤١، ٢٤٥.
١٠١- هەمان سەرچاوە ق١ ص/ ١٢٢، بڕوانە حاشية ٣ ص٢٢٨/ من كتاب أربيل في العهد الاتابكي.
١٠٢- تاريخ أربل ق١ ص ص/ ١٧٥، ١٨٧، ٢٣٥، ٢٧٩، ٣٠٠، ٣١١، ٣١٣، ٣٥٠.
١٠٣- أربيل في العهد الاتابكي ص/ ٢٥٣ نقلا عن ابن قاضي شهبة: طبقات الناحة واللغويين، (مخطوط) ق١ ورقة (١٢١).
١٠٤- ابن المستوفي ق١ ص١٧٥.
١٠٥- المنذري ص١٢/، ابن المستوفي ق٢ ص١٩٦/ ملاحظة رقم ٣.
١٠٦- التربية والتعليم في الاسلام، مطبعة جامعة الموصل ١٩٨٢ ص٦٧.
١٠٧- أربيل في العهد الاتابكي ص/ ٦٦-٦٧.
١٠٨- ابن المستوفي ٢/ ٥٦٧.
١٠٩- ابن خلكان ٢/ ٢٣٧-٢٣٩.

طبـقـــات الاسنوي ١/ ١١٨، ١١٩.
١١٠- علمـــاء ومـــدارس فـي اربـيـل ص١٧/.
١١١- ابن المستوفي ق١ ص٣٦٦/.
١١٢- ابن خلكان٢/ ٢٣٨ (طـبـعـة احسان عباس).
١١٣- هەمان سەرچاوە ٣/ ٢٤٦.
١١٤- تـاريـخ اربـل ق١ ص/ ١٥٩، ٣٢٨.
١١٥- أربيل في مـختلف العـصـور اللواء والمدينة، طـبـعـــة ٢٠٠١ ص٧١.

**سەرچاوەكان:**


اولا: المصادر:
الاسنوي، أبو مـحـمـد جـمـال الدين بن الحسن بن علي الامـوي القـرشي (ت ٧٧٢ه/ ١٣٧١م).
١- طبقات الشافعية، تحقيق عبدالله الجبوري، مطبعة الارشاد، بغداد ١٣٩٠-١٣٩١ه/ ٧٠- ١٩٧١م، جزءان.
٢- الحـوادث الجـامـعـة والتـجـارب النافعة في المائة السابعة، نسب الي ابن الفوطي خطاء. تحقيق د. مصطفى جواد، مطبعة الفرات، بغـــداد ١٣٥١هـ/ ١٩٣٢م ابن خرداذبة، ابو القاسم بن عبيدالله بن عبدالله (ت ٢٨٠/ ٨٩٧م).
٣- المسالك والمالك، طبعة بريل ١٨٨٩م.
- ابن خلكان أبو العباس شمس الدين احمد بن محمد بن أبي بكر بن خلكان (ت ٦٨١ه/ ١٢٨١م).
٤- وفـيـات الاعـيـان وأنبـاء أنبـاء الزمان، بتحقيق د.احسان عباس، دار الثـقـافـة (١٩٦٨-١٩٧١). بمصر (١٩٤٨م)، وطبعة بيروت بتحقيق د.احسان عباس، دار الثقافة (١٩٦٨-١٩٧١). أبو الفداء، الملك المذيد اسماعيل بن علي عمادالدين الايوبي الشافعي صـــاحب حـــمـــاه (ت ٧٣٢ه/ ١٣٣١م).
٥- تقـويم البلدان، دار الطـبـاعـة السـلطانيـة باريس ١٨٤٠ مسيحية.
- قدامة بن جعفر أبو الفرج الكاتب البغدادي (ت ٣٢٠ه/ ٣٢م).
٦- الخـرج وصنعـة الكتـابة، شـرح وتعليق د.محمد حسين الزبيدي، دار الرشيد للنشر، سلسلة كتب التراث، بغداد ١٩٨١.
- القـزويني أبو عـبـدالله زكـريا بن مـحـمـد بن مـحـمـود (ت ٦٨٢ه/ ١٢٨٣م).
٧- أثار البلاد وأخبار العباد، دار صادر ودار بيروت ١٩٦٠م.
- ابن المســتـوفي، شـرف الدين أبي البركات المبارك بن احمد اللخمي الاربللي (ت ٦٣٧ه/ ١٢٣٩م).
٨- تاريخ أربل المسمي "نباهة البلد الخامل بمن وردة من الاماثل" حققه وعلق عليه سامي بن السيد خماس الصقار، الجزء الثاني: قســمــان، من منشـورات وزارة الثقافة والاعلام العراقية، دار الرشيد للنشر، ومن سلسلة كتب التراث (٩٩) و (١٠٠) بيروت ١٩٨٠.
- المقدسي، البشاري، ابو عبدالله شمس الدين محمد بن احمد (ت ٣٨٧ه/ ٩٩٧م)!- احـــســن التقاسيم في معرفة الاقاليم، ليدن مطبعة بريل ١٩٠٦م، اعادت طبعه بالاوفسيت مكتبة المثنى ببغداد.
المنذري، أبو مـحــمـــد زكي الدين عبدالعظيم بن عبد القوي (ت ٦٥٦ه/ ١٢٥٨م).
١٠- التكملة لوفيات النقلة، دراسة وتحقيق بشار عواد الاعظمي، رسالة ماجستير من جامعة بغداد ١٩٦٧م.
- ياقوت الحموي، ابو عبدالله شهاب الدين ياقوت بن عبدالله الحموي الرومي (٦٢٦ه/ ١٢٢٨م).
١١- معجم البلدان، طبعة وستنفلد، لايبزج ١٨٦٦م. الجاوشلي، هادي رشيد.
١٢- تراث أربيل التـــاريخي، من مطبوعات الامانة العامة للثقافة والشـبـاب، أربيل، طبع مطبعة جامعة الموصل ١٩٨٥.
١٣- دائرة المعارف الاسلامية، الطبعة العـــربيـــة الجـــديدة ١٩٦٩م. الديوەجي، سعيد.
١٤- التربية والتعليم في الاسلام، مطابع جامعة الموصل ١٩٨٢. ريج، كلوديوس جيمس..
١٥- رحلة ريج في العـــراق ١٨٢٠ تعريب بهاءالدين نوري، مطبعة السكك الحديدية، بغداد ١٩٥١. زبير بلال اسماعيل
١٦- أربيل في ادوارها التاريخية، مطبعة النعمان، النجف الاشرف ١٩٧١.
١٧- علمـــاء ومـــدارس في اربيل. شيرين شيرزاد
١٨- تطور قلعة اربيل (اطروحة)، القسم الثالث. ترجمة: عرفان سعيد (نسخة مصورة).
١٩- مجلة سومر، المجلد ١٦ لسنة ١٩٦٠ والمجلد ١٨ لسنة ١٩٦٢.
٢٠- مجلة كاروان، العدد ١١، اب ١٩٨٣م.(محسن محمد حسين الدكتور)
٢١- أربيل في العـــهـــد الاتابكي، مطبعة أسعد بغداد ١٩٧٦.
٢٢- موضوعان في التاريخ الكردي، كتاب شمس كردستان، مطبعة الحوادث بغداد ١٩٧٦.



# مزگەوتی گەورە و گەرماوی قەڵا

**کارزان حەیدەر**

دوای تێپەڕبوونی زەمەنێکی دوورودرێژ بەسەر دروستبوونی قەڵایەکی مێژوویی لەم پیرە هەولێرە، تا ئێستاش کۆمەڵێ شوێنەواری زۆر گرنگ و مێژوویی هەر ماون و لە لایەن بەڕێوەبەرایەتی گشتی شوێنەوارەوە پارێزراون، زۆریشیان دەستی نۆژەنکردنەوەیان گەیشتووەتێ بۆ ئەوەی لە لەناوچوون بپارێزرێن، هەر کەسێکی بێگانە ئەگەر ڕۆژێ لە ڕۆژان سەردانی ئەو شارەی کردبێ، بۆ ناسینی مێژووە دێرینەکەی، سەردانی قەڵای بەناوبانگ و مێژوویی هەولێری کردووە، بەتایبەت ئەو ڕۆژنامەنووسانەی بەدوای مێژووی گەلاندا دەگەڕێن لە هەموو دنیادا، هەروەک دەرکەوتووە هەولێر لە کۆنترین شارەکانی جیهانە.

قەڵای هەولێر تەمەنی بە قەد تەمەنی شارەکەیە و بە هەزاران ئەوەی لێ پەروەردە بووە و بە چەندان زەمەنیش بەسەر تەمەنی ئەو شارە تێپەڕیوە و گەلێ حاکم و دەسەڵاتداریش پێیدا تێپەڕبوون، جگە لە چەندین شەڕی گەورە، کە زۆربەیان تێکەڵ بە مێژووی ئەو شارە بوون.

لە نێو ئەو قەڵایە دێرینەدا، مزگەوتێکی گەورە و گەرماوێک وەکو شوێنەوارێکی مێژوویی ماونەتەوە، واش پێ دەچێت، کە گرنگییەکی تەواو بەم شوێنەوارانە دراوە و سەر لەنوێ نۆژەن کراونەتەوە و ئێستاش پارێزراون.

### مزگەوتی گەورەی قەڵا

بە پێی سەرچاوە مێژووییەکان لە خوارووی قەڵا و لە ساڵی

(١٢٩٤ک- ١٨٧٧ز) ژمارەی دانیشتوانی شاری هەولێر (١٠١١٢) دە هەزار و سەد و دوانزە کەس بوون (٩٥٦٧) یان موسڵمان بوون و (٣٣٠)یشیان مەسیحی بوون و (٢١٥)شیان جوولەکە بوون، هەر ئەو سەرچاوە مێژووییانە دەڵێن: مێژووی مزگەوتی گەورە و ناوداری قەڵا، کە تائێستاش ماوە و شوێنی زیکر و عیبادەتی خودای گەورەیە، هی ئەمیر (سرفتگین کوڕی مەنسوری کوڕی عەبدوڵڵای زینی)یە، کە لە ساڵی ٥٣٣ی کۆچی، ڕێکەوتی ١١٣٨ی زایینی لە ناوەراستی قەڵا بۆ زانا و ئایینپەروەری ناودار مەلا خدر (ابو العباس) بنیاتی ناوە، مزگەوتەکە کەوتۆتە تەنیشت گەرماوی قەڵا، هەروەک لە بەردێکی مێژوویی سەر مزگەوتەکەشدا دەرکەوتووە، دوای ئەو تەمەنە درێژە ساڵی ١٢٧٨ی زایینی نۆژەن کراوەتەوە، ئەگەر لەو شارەدا کۆمەڵێ مزگەوت و شوێنی ئایینی مێژوویی کۆن هەبن، بەڵام مزگەوتی گەورەی قەڵا بە شایەدی مێژوو و تێپەڕبوونی زەمەن و سەدەکان لەم شارە، بە کۆنترین مزگەوت و شوێنی پەرستنی خودای گەورە دادەنرێت، کە موسڵمانانی کەمی ئەو شارەی ساڵانێکی زوو لە خۆ گرتبێت، لە زۆربەی وێنە مێژووییەکانی پیرە قەڵاش، مزگەوتی گەورە و گەرماوەکە لە تەک یەکدا دەبیندرێن، گەلێ جاریش ئەو مزگەوتانە دەبوونە قوتابخانە و منداڵان لە وێوە فێری خوێندن و نووسین دەبوون.

مزگەوتی گەورەش پەیوەندییەکی توند و تۆڵی بەژیانی خەڵکییەوە هەبووە، هەموو جموجۆڵەکانی مزگەوتی گەورەش فراوان بووە، جگە لە خوتبەی ڕۆژی هەینی و هەر پێنج فەرزی نوێژ کردن، لە هەمان کاتدا بنکەیەکی کۆمەڵایەتی گرنگ بوو لە قەڵای هەولێردا، زانا ئایینییەکانی مزگەوت لە کەسایەتییە ناسراوەکانی نەک هەولێر، بەڵکو هەموو کوردستان بوون، لە مزگەوتدا شوێنی فێرکردنی قوتابیان و ژووری نوستنیان تێدابوو، کە وەکو بەشی ناوخۆی ئەمڕۆ بووە، خەڵکی گوند و شارۆچکەکان پێشبڕکێیان لەسەر دەرچوونی ئەم قوتابخانەیە دەکرد تا ڕوو لە گوند و شارۆچکەکان بکەن، چونکە لە زانا و ناودارەکان بوون، مزگەوت ناودارێکی وەکو مامۆستای مەقاماتی عیراقی، سەید مەردانی تێدا بوو، جگە لە گەورە مامۆستایانی تەجویدی قورئانی پیرۆز، لە کاتی ڕووداوە سروشتییەکانی وەکو مانگ و ڕۆژگیران و بوومەلەرزە و گێژەڵووکە، سورەتی (الدخان)ی تێدا دەخوێندرا و خەڵکیش دوعایان دەکرد تا بەڵاکەیان لەسەر لابچێت، ئینجا دوعای (الاستقساء) دەردەچوو، لە سەردەمە جیاجیا کانیشدا مەلیک و وەزیر و لێپرسراوان سەردانی مزگەوتیان دەکرد.



### گەرماوی قەڵا

ئەوانەی بە نووسینەوەی مێژووی ئەم شارە و قەڵاوە سەرقاڵن، دەڵێن: زۆربەی گەرماوەکانی قەڵا بە تەنیشت مزگەوتەکانەوە بوون، بە مەبەستی خاوێن بوونەوە و خوداپەرستی، ئەو کۆنە گەرماوەی کە ئێستا لە قەڵا بەرچاو دەکەوێ، لە لایەن بەڕێوەبەرایەتی گشتی شوێنەوارەوە نۆژەن کراوەتەوە و پارێزراوە، جگە لەوەی سالآنی (زووش) بۆ زانیاری ئەو گەرماوە نۆژەن کراوەتەوە، ئەوانەش کە ڕۆژانەی مێژوویی ئەم گەرماوە دەگێڕنەوە دەڵێن: سبەینان تا سەعات (١١) گەرماو بۆ ژنان بووە، ئێوارانیش بۆ پیاوان، زۆر جاریش لە نێو گەرماودا شوێنی تایبەت بۆ کەسایەتییەک یاخود بووک و زاوایەک تەرخان دەکرا، بە تایبەتی لە ناوەڕاستی گەرماودا، کە سەکۆیەکی بازنەیی دروست دەکرا پێیان دەگوت (بەردی زاوا)، ناو گەرماو لە چەند بەشێکی جیاجیادا پێک هاتووە لە سەردانێکماندا بۆ ئەو گەرماوە بینیمان، چەند حەوزێکی بەردینی بچووکی تێدایە، کە سەکۆیەکی بچووکی لە تەنیشتەوەدیە بۆ لەسەر دانیشتن، بنمێچی گەرماویش قووببەیەکی فراوانە.

### مێژووی گەرماوەکە

مامۆستا مەولود قادر بیخاڵی لە بەرگی دووەمی کتێبی (هەولێرم وادیوە و بیستووە)دا دەڵێت: دوای وەفاتی ئیسماعیل ئاغا، کوڕەکەی بوو بەجێگری کە تەنها کوڕێکی هەبووە، بەناوی (عەبدوڵلا ئاغا)، ئەم عەبدوڵلایەش دوای وەفاتی باوکی، ماوەیەک فەرماندەیی شاری هەولێری کردووە، لە سەدەی حەڤدەمیندا بنیاتی گەرماوە دێرینەکەی (قەڵا)ی کردووە. کە تا ئێستا شوێنەواری ئاوگرەکان و حەوزەکان و دیوارە ڕەنگینەکانی هەر ماون، چونکە لە ساڵی ١٧٧٥دا لەلایەن یەعقوب ئاغای گەورە بۆ تازەکردنەوەی دەستکاری کراوە.

### ئەوەی لە سەردانەکەدا بینیم!

ئەوەی لەو سەردانەدا بینیم، گەرماوەکە لە پێنج شوێنی خۆ شوشتن پێکهاتووە، دوو حەوزی ئاوی سارد و گەرمی تێدایە، جگە لە بەردی جەهەننەم، کە ئاگری لە کوورخانی گەرماوەکە بۆ هاتووە، بۆ ئەوە دروست کراوە، کە خەڵکی لەسەری دابنیشن و ئارەقە بکەن، بە پێی قسەی خەڵکی قەڵاش، گەرماوەکە تا ساڵانی هەشتاکان خەڵکی رووی تێ دەکرد و کاری دەکرد، بەڵام دوای ئەوە بوو بە شوێنێکی مێژوویی و ئێستا پارێزراوە. گەرماوەکە هۆڵێکی پشوودانی گەورەی لێیە، جگە لە هۆڵێکی پێشوازی کردن، بە زبڵ سووتاندنیش لە نێو کوورخانەکەدا ئاوی بۆ گەرماوەکە گەرم کردووە.

### بیرێکی یەکجار قووڵ

بیرێک بە قووڵی (٦٠) مەتر لێدراوە و زۆریش هەن، کە دەڵێن: سەرچاوەی ئەو ئاوە لە بەستۆڕەوەیە و کاتی خۆی (سەنحاریب) هێناویەتی، بۆ راکێشانی ئەو ئاوەش لەو بیرە، وڵاغێکیان تەرخان کردبوو، لەسەر گومبەتی گەرماوەکەش چەند پەنجەرەیەکی بچووک بۆ رووناکی دروست کراوە، هەر وەکو پاسەوانی گەرماوەکە بۆی روون کردینەوە، دەکرێ لە کۆن ئەو گەرماوە پەرستگایەک بووبێت، دواتر کرابێتە ئەو گەرماوەی، کە تاوەکو ئێستا بەو شێوەیە ماوەتەوە، هەر ئەو ئاوەی کە بۆ گەرماوەکە رادەکێشرا، لە هەمان کاتدا ئەو خەڵکە کە بۆ نوێژکردن روویان دەکردە مزگەوتی گەورە سوودیان لەم ئاوە وەردەگرت.

### جگە لە سەردانێکی مەیدانی

جگە لەو سەردانە مەیدانییەی، کە بۆ گەرماو و مزگەوتی گەورەی قەڵام کرد، سوودم لە کتێبی (هەولێرم وادیوە و بیستووە)ی مامۆستا مەولود قادر بێخاڵی و بابەتێکی بەڕێز عوسمان موفتی وەرگرتووە، کە بە نێو (ژیانی کۆمەڵایەتی قەڵای هەولێر لە سەدەی بیستەمدا) لە ژمارە (٢)ی گۆڤاری هەولێردا بڵاو کراوەتەوە.

*** ئەم بابەتە لە گۆڤاری (بارش) ژمار (٧) بڵاوبۆتەوە.**



# گەرماوی قەڵای هەولێر

محەمەد سەعید کوردە

ئەگەر کەمێک بۆ رابردوو بگەڕێینەوە و لاپەڕە گەش و پڕشنگدارەکانی مێژووی میللەتەکەمان هەڵدەینەوە، ئەوا دەگەینە ئەو هەقیقەتەی کە بەدەیان و بگرە بەسەدان شوێنی دێرین لەو پیرە هەولێرەدا هەیە، کە ئێمەی کورد هەمیشە شانازی پێوە دەکەین، یەکێک لەو شوێنەوارە دێرینانە گەرماوەکەی قەڵاتی هەولێرە و خاوەن مێژوویەکی کۆنە، بەپێی هەندێک لە سەرچاوەکانی مێژووی شوێنەوار لە ساڵی (١٧٧٥) ئەو شوێنە وەک گەرماوێک دروست کراوە، کەچی لە سەرچاوەیەکی دیکەی مێژووییدا ئاماژە بەوە دەکات، کە (قاسم ئاغای یەعقوب) نۆژەنی کردۆتەوە.

## پێکهاتەکانی گەرماوی قەڵات

گەرماوی قەڵات لە حەوشەیەکی گەورە پێکهاتووە، کە رووبەرەکەی (٣٠٠) مەتری چوارگۆشەیەو هۆڵەکانی ژوورەوەشی لەچوار هۆڵی سەرەکی پێکهاتووە، هۆڵی یەکەم سەرەتای چوونە ژوورەوەی گەرماوەکەیەو کە بۆ خۆگۆڕین بەکاردێت، هۆڵی دووەمیش بۆ هەمان مەبەست سوودی لێ بینراوە، بەڵام هۆڵی سێیەم بۆ خۆئامادەکردن و هۆڵی چوارەمیش بۆ خۆشوشتنە کە (٥) ژووری جیاجیای تێدایە و لەناوەڕاستی گەرماوەکەش سەکۆیەکی گەورە هەیە، کە پێی دەڵێن (بەردی

زاوا). ئەو ناوەش لەوەوە سەرچاوەی گرتووە، کە هەرکەسێک لە سەردەمی زووەوە ئەگەر ژنی بهێنابایە، ئەوا بەر لەوەی ژنەکەی بگوازتبایەوە لەگەڵ هەندێک لە برادەرە هەرە نزیکەکانی دەچووە ئەو گەرماوەو لەوێ لەسەر ئەو سەکۆیە زۆر جوان دەیانشوشت.

**زۆربەی خەڵکی هەولێر خۆی لەو گەرماوە دەشوشت**

بەڕێز (کەنعان موفتی) بەڕێوەبەری گشتی شوێنەوار لەوەزارەتی رۆشنبیری بۆی باس کردم ئەو گەرماوە تا سالی حەفتاکان بەیانیان و ئێواران لە خزمەتی خەڵکی، بەتایبەتی قەلات نشینەکان دابوو، بەلام کاتژمێر (١١)ی سەر لەبەیانی هەموو رۆژێک بۆ ئافرەتان بوو. پێم وابێ لەسالی شەستەکان خاوەنی ئەو گەرماوە (عەبدولرەحمان ئاغا قەساب) بوو، بەراستی ئەو گەرماوە یادگاری خۆش و بەلەزەتی هەیە، لەسەردەمی زوودا بەتایبەتی لە سالانی شەست و حەفتاکان زۆرینەی خەڵکی ئەو هەولێرە لەو گەرماوەی قەلات خۆیان دەشوشت، ئەوسا نرخی خۆشوشتن بە (١٠) عانە بوو، کە دەکاتە (٤٠) فلس، زۆر جاریش خەڵکانی وا هەبوون بەخۆڕایی خۆیان دەشوشت، یان هەندێ بنەماڵە رۆژێک بەتەواوی گەرماوەکەیان بۆ خۆیان بەکرێ دەگرت و پارەی ئەو رۆژەیان بەتەواوی دەدا.

**سەرپەرشتیارانی گەرماوی قەلات**

پیاوە بەتەمەن و ریش سپییەکانی قەلاتی هەولێر دەگێڕنەوە: سەردەمانێک خوالێخۆشبووان سەلیم قاقاو پایخ و مام یەحیا سەرپەرشتی ئەو گەرماوەیان دەکردو بەسەتڵ ئاویان بۆ ئەو خەڵکە دەهێنا، وەک داب و نەریتێکی فۆلکلۆریش ئەگەر یەکێک لە خۆشوشتن تەواو بوایە، ئەوا چەپڵەیەکی لێدەدا بۆ ئەوەی ناترەکە ئاگاداربێت و پەشتەماڵی بۆ بهێنێ، بۆ ئەوەی لەشی خۆی پێ وشک کاتەوە.

**بیرێکی گەورە لەناو گەرماوی قەلات هەڵکەنرابوو**

هەر لەناو گەرماوی قەلاتدا بیرێکی گەورە هەڵکەنراوە، کە قووڵاییەکەی نزیکەی (٦٠) مەترێک دەبێت و پێوانەی بازنەکەشی (٥) مەترە، کە بەکەرپووچ هەڵێنراودو کاتی خۆشی بە ولاغ ئاویان تێدا دەردەهێنا.

**ئەو گەرماوە بە نەفتی رەش و زبڵ گەرم دەکرا**

زۆربەی پیاوە بەتەمەن و ریش سپییەکان ئاماژەیان بەوە دەکرد، کە ئەو گەرماوە بە نەفتی رەش و زبڵ گەرم دەکرا و خەڵکی هەر زینەت بوو خۆی تێدا بشوات، ئێمە زۆربەمان لە ماڵەکەی خۆمان گەرماوی تایبەتیشمان هەبوو، بەلام ئەگەر هەفتانە خۆمان لە گەرماوی قەلات نەشوشتبا، ئەوا ئۆخەیمان نەدەکرد، چونکە ئەو کاتانە خەڵکی لە هەموو لایەکەوە روویان تێ دەکرد و دەتوانین بڵێین ئەوساکە بەناوبانگترین گەرماوی هەولێر بوو.

**گەرماوەکەی قەلات و ناوەندی رۆشنبیری سەردەم**

هەر بۆ مێژووش دەکرێ ئاماژە بەوە بکەین، کە سەردەمانێک ئەو گەرماوە لەلایەن چەند رۆشنبیرێکی شارەکە کرابووە بارەگایەکی رۆشنبیری بەناوی ناوەندی رۆشنبیری سەردەم، کە ماوەی چەند سالێک چەندین کۆڕو سیمینارو پێشانگای جۆراوجۆری هونەری رۆشنبیری و کلتووریان تێدا پێشکەش کرد، ئەو کۆمەڵە رۆشنبیرە مۆڵەتی فەرمییان لە وەزارەتی رۆشنبیری پێدرابوو، کە ئەو گەرماوە بەو شێوەیە بەکاربهێنن، بەلێ ئەوساکە ئەدیب و رۆشنبیر و شاعیران و فۆلکلۆرپەروەران و ئەوانی دیکە بەشەوقەوە روویان تێ دەکرد و بەجۆرێک کردبوویانە جێی ژوانی خۆیان.

ئەم بابەتە لە گۆڤاری (ئاسۆی فۆلکلۆر) ژمارە (١٣) سالی ٢٠٠٥ بلاوبۆتەوە.



# قەڵاکانی میرنشینی سۆران لە سنووری شاری هەولێر

زیاد ئەحمەد محەمەد
بەشی شوێنەوار- زانکۆی سەلاحەددین

**کورتە مێژوویەکی میرنشینەکە:**

زۆربەی مێژوونووسان یەک دەنگن لەسەر ئەوەی میرنشینی سۆران میرنشینێکی کوردیە و کەسایەتیەکی گوندی هاودیان بە ناوی "کەلۆس" دامەزراوە دوای کەلۆس عیسا کوڕە گەورەی کەناوێکی دەرکردبوو بە ژیرو بیرو ئازایەتی خۆشەویست بوو لە ناو خەڵکی ناوچەکە توانی رواندز پاک بکاتەوە لە هەندێک لە دزو ئاژاوەگێرو ڕێگرەکان و جڵەوی میرنشینێکی سەربەخۆ لەناو چەک بگرێتە دەست.

دوای کۆچی عیسا جڵەوی میرنشینەکە کەوتە دەستی عەلی بەگ کە میرنشینەکەی دابەش کرد بەسەر چوار کوڕەکەی بۆ ئەوەی دوای مردنی خۆی ناکۆکی نەکەوێتە نێوانیان، خۆی و کوڕە گەورەکە میر عیسا چوون بۆ حەریرو کردی بە پایتەختی میر نشینەکە.

دوای عەلی بەگ شەش میری تر دەسەڵاتی میرنشینەکەیان گرتە دەست، کە ماوەی فەرمانڕەوایەکانیان بە هێمنیەکی ناوخۆی و سەرتایەکی ناکۆبەکانی بوو لەگەڵ میرنشینی بابان.

میر کوردەکان رۆڵێکی باڵایان گێڕا لە سەرکەوتنەکەی سوڵتان سەلیمی عوسمانی بەسەر شا ئیسماعیلی سەفەوی لە شەڕی چالدێران لە ساڵی ٩٢٠ک/١٥١٤ز دوای ئەوەی کە پەیوەندیان بە سوپای عوسمانی کرد لە ئەنجامی ئەم شەڕە کوردستان دابەشکرا بەسەر هەردوو دەوڵەتی عوسمانی و سەفەوی، بەشی زۆری لە ژێر دەسەلاتی دەوڵەتی عوسمانی بوو.

لە سەدەی ١٦ز-١٠ک لەو ماوە، فەرمانڕەوای میر سولیمان کوڕی قولی بەگ کە لە ساڵی ٩٩٨ک/١٥٨٩ز کۆچی دوایی کردووە، چەندین شوێنەواری جێ هێشتووە وەک مزگەوت و قوتابخانە و قەڵا لەوانە مزگەوتی گەورەی حەریر و قەڵایەک لە حەریر نزیک ئەشکەوتی خراتان.

سەردەمی فەرمانڕەوای میر محەمەد ناسراوە بە پاشای گەورە بە بەهێزترین دەسەلاتی میرنشینی سۆران دا دەنرێت لە بوارەکانی سەربازی و رامیاری و بیناسازی دا کە لە ساڵی ١٢٢٨ک/١٨١٣ز جڵەوی فەرمانڕەوایی وەرگرت لەسەردەمی میر محەمەد میر نشینی شۆران گەیشتۆتە لوتکەی دەسەلاتی بەجۆرێک سنووری میرنشینەکە لە رۆژئاوا لە سنجار تاکو گوندە کوردیەکان ئازربیجان ئێران لە رۆژهەلات و لە باکوور لە قەڵای کیفا تاکو کۆتایی ناوچەکانی مخمور و گوێر و پردی.

پاشی گەورە زۆر بایەخی بە دروست کردنی قەلاو قوللەی سەربازی داوە لەوانە ئیچ قەلا یەکەم بوو میر محەمەد دروستی کرد لەسەر یەکێک لە گردەکانی بەرامبەر رواندز لە باکوور و دروست کردنی دوو قوللەی تر لەسەر گردێک لە رۆژئاوای رواندز و دروست کردنی قوللەیەکی تر لە رۆژهەلات لە نزیک قوللەی شەقام.

جگە لە دروست کردنی شورایەک لە دەرەوەی رواندز چەند قوللەی سەربازی لە ناو ئەو شورایە. وە دروست کردنی چەندین قەڵای تر لە دەرەوەی ناوچەی رواندز وەکو قەلاکانی دێری و دوین و بانەمان و سارتکەی و بۆگد بۆ بەرەنگاری بوونەوەی میر نشینە کوردیەکانی هاوسەردەمی خۆی لەوانە میرنشینی بابان.

لێرەدا هەوڵدەدەین کورتە باسێک لەسەر قەلاکانی میرنشینی سۆران "سنوری شاری هەولێر بخەینە روو بەگوێرەی میژووەکانیان کە لە نامەی ماستەری "قلاع الامارة السورانية في أربيل" من القرن "١٠-١٣ه/١٦-١٩م" دراسة ميدانية" بەدرێژی باسی لێوە کراوە.

### قەڵای خانزاد

قەلای خانزاد دەکەوێتە رۆژئاوا ئاوی ناحیەی حەریر بە دووری نزیکەی "٣کم" نزیک گوندی خراوتان، لەلای چەپی رێگای کۆنی نێوان هەولێر- رواندز کە بە حەریر تێپەڕ دەبێت و ناسراوە بەرێگای هاملتۆن.

قەلاکە لەسەر لوتکەی شاخێکی بەرز دروستکراوە کە جیا بۆتەوە لە زنجیرە چیای حەریر، بەهۆی بەرزیەکەیەوە بە ئاسانی ناتوانرێت سەربکەوین تەنها لەلای باشووری نەبێت. **وێنە(١)**

بەرزی شوێن بۆ دروست کردنی قەلاکان یەکێکە لە خاسیەتە سەرەکیەکانی بەرگری کردن بە تایبەتی لەسەردەمی ئیسلامیەکان.

هاملتۆن دەربارەی ئەم قەلایە دەڵی "لەسەر لوتکە شاخێکی زنجیرە


وێنە(١)


وێنە(٢)

چیای حەریر پاشماوەی قەڵایەکی کۆن هەیە بریتییە لە قەڵای میرزاد "خانزاد" مێژوونووسان ئەم قەڵایە دەگێڕنەوە بۆ سەدەی "١٠ک-١٦ز" لەو ماوەیەشدا هەریەک لە سولێمان بەگ کوڕی قولی بەگ و عەلی بەگ کوڕی سولیمان بەگ و میر خانزاد بەشێوەیەکی یەک لە دوای یەک فەرمانڕەواسەتیان تەواو کردووە.

دروست کردنی قەڵای خانزاد دەگێڕنەوە بۆ ماوەی فەرمانڕەوای سولیمان بەهۆی درێژی ماوەی فەرمانڕەوایەکەی لە میرنشینی سۆران وە بوونی حەریر بەپایتەختی میرنشینەکە لەم ماوەیە هەروەها بەهێز بوونی میرنشینی سۆران لە ماوەی فەرمانڕەوایی سولێمان بەگ.

لەگەڵ ئەوەی لەناو خەڵک باوە و موکریانی ئەم قەڵایە دگێڕیتەوە بۆ میر خانزادی خوشکی سولیمان بەگ بەڵام بە دوور دەزانرێت کەلە لەلایەن میر خانزاد ئەم قەڵایە دروست کرابێت لەگەڵ ئەوەی بەناوی ئەو ناونراوە چونکە ماوەی فەرمانڕەوایەکەی زۆر کورت بووەو لەو ماوەیەش میرنشینی سۆران بە قۆناغێکی لاواز تێپەڕیوو.

ئامانج لە دروست کردنی ئەم قەڵایە بەرگری کردنی ناوچەکە بەرپەچ دانەوەی هێرشی بابانیەکان.

قەڵای خانزاد شێوەیەکی نارێکی وەرگرتووە ئەمەش بەهۆی سروشتی هەڵکەوتەی لوتکە شاخەکەی قەڵایەکەی لەسەر دروست کراوە.

قەڵای خانزاد پێک هاتووە لە شورایەکی پچڕ پچڕ کە بەرزیەکەیان دەگاتە نێوان "٤-٦م" لەسەر لێواری لوتکە شاخەکە لەلای رۆژئاوا و رۆژهەڵات جگە لە هەندێک پارچە شورای تر لەلای باشوور، ئەستووری ئەو دیوارانە "٥٠سم" درێژیە هەموویان نزیکەی "٤٠م" جگە لەو پارچە بەردە گەورانەی دەکوێتە نێوان پارچە شوراکان. **وێنەی "٢"**

سەرەڕای بەرزو درێژ قەڵاکە پێنج قوللەی تێدایە کە دەکەونە لایەکانی باکوورو رۆژئاوا سی قوللەیان لە پاڵ یەکتری دان و دەکەونە سەر لوتکەی شاخەکە بەلای باکوور یەکێکیان قەبارەکەی گەورەیە و شێوەکەی لوولەییە دەرگایەکی شێوە لاکێشەیی هەیە. قوللەی دووەم شێوەکەی هێلکەیی و لە دوو نهۆم پێک دێت و سەقفەکەی بە شێوەی گومەزێکی تیژ گیراوە بەڵام قوللەی سێیەم شێوەکەی نیمچە لاکێشەیی و لەوانەیە سقفەکەی بە دار گیرابێت بەهۆی بوونی شوێنی دار. **وێنەی "٣"**

بەڵام دوو قوللەکەی تر ئەم قەڵا نووساون بە شورای لای رۆژئاوا


وێنە(٣)


وێنە(٤)

یەکێکیان قەبارەکەی گەورەیە و ئەویتر بچووکە و شێوەیان نیمچە لوولییە. **(وێنە ٤)**

شایانی باسە لە هەندێک بەشی شوراکە و هەموو قوللەکان چەندین کونە مەتەرێزی تێدایە شێوەکەی لاکێشەیی و لەناوەو فراوانە و لە دەرەوە بچوکە دووریەکانیان لە ناوەوە "٣٠×٥٠سم" لە دەرەوە "٢٠×٣٠".

هەموو بەشەکانی قەلاکە لە بەردی کلسی نارێک و گەچ دروست کراوە وەلای باشووری قەلاکە چەندین پلیکانە لە شاخەکە هەلکەندراوە بۆ سەرکەوتن بۆ سەرەوەی قەلاکە. هەروەها چەندین چالی گەورە هەلکەندراوە کە ژمارەیان نزیکەی "٢٥" دانەیە شێوەکە بازنەییەو بەکار هێنراوە. بۆ گلدانەوەی ئاو. **وێنەی "٥"**


وێنە(٥)

لەگەل چەند چالی بچووک لە هەمان لاو بەشێوەی تەریب لەگەل رێگای سەرکەوتنی قەلاکە. ئەمەش بەکار هێنراوە بۆ ئاگر کردنەوە بۆ رووناک کردنەوەی رێگاکە.

### قەلای دوین

قەلای دوین بە یەکێک لە گرنگترین قەلاکانی میرنشینی دادەنرێت بەهۆی شوێنەکەی کە دەروانێتە زۆرێک لەو رێگایانەی بۆ هەولێر دەرۆن، قەلاکە دەکەوێتە سەر چیای دوین کە درێژ کراوەی زنجیرەی چیای پیرمامە لە نزیک گوندی دوین و لەبەشی باکووری هەولێر، دووری نزیکەی "٥٠کم".

ناوچەی دوین و بابە جیجک بەگرنگترین رێگا سەرەکیەکانی نێوان هەولێرو رواندز و ئازربیجان دادەنرێت تاکو کۆتایی دەسەلاتی عوسمانیەکان و سەرەتایی دەسەلاتی ئینگلیز.

بەلام سەبارەت بە مێژووی قەلاکە دەگەرێتەوە بۆ سەردەمی میرنشینی سۆران بە بەلگەی مێژوویی و بیناسازی: ئەمین زکی لە کتێبی "مشاهد الكرد،ج٢" دەگێرێتەوە بۆ سەدەی "١٠ک-١٦ز" بە تایبەت ماوەی فەرمانرەوای عەلی بەگ کوری سولیمان بەگ، لەوانە لەبەر ئەوەبێت لەم ماوەیە ناوچەی دوین پایتەختی میرنشینی سۆران بووە، بەلام دوای هێرش بابانەکان گرتنی دوین عەلی بەگ پایتەکەی گواستەوە بۆ حەریر.

موکریانی لە کتێبی "مێژووی میرانی سۆران" دەلی:"ئۆغۆ بەگ



کوڕی عەلی بەگ باپیری میر محەمەد لە ساڵی ١٢٠٧ک/١٧٩٢ز کۆچی دوایی کردووە دوینی رزگار کردووە لە دەست بابانەکان و نۆژەنکردنیکردۆتەوە".

خەڵکی ناوچەی دوین دەگێڕنەوە کە دوین موڵکی رواندزەکان بووە تاکو نیوەی سەدەی بیستەم پاشان عەشیرەتی هەرکی ئەو ناوچەیان کڕیووە.

بەڵگەی دووەم بەراورد کردنی قەڵای دوینە لەگەڵ قەڵاکانی تری میرنشینی سۆران و قەڵای تری هاوسەردەمی خۆی لە رووی بیناسازی شوێنەوارییەوە.

دەبینین زۆر لە قەڵاکانی میرنشینی سۆران هاوشێوەیە لەگەڵ قەڵای دوین لە رووی هێڵکاری و شێوەی قوللەکان و کونە مەتەریزەکان.

وەک قەڵای خانزاد کە دەگەرێتەوە بۆ سەدەی ١٦ز، هەروەها قوللەکانی قەڵای دوین هاوشێوەن لەگەڵ قوللەکانی هەریەک لە قەڵاکانی بۆگدلو کۆیە سارنکە لە دوکان کە لە سەدەی ١٩ز لەلایەن میر محەمەد دروست کراون و هەروەها هاوشێوەن لەگەڵ قەڵای دێری لە گوندی دێری.

سەبارەت قەڵای تری جگە لە قەڵاکانی میرنشینی سۆران قەڵای دوین هاوشێوەیە لە رووی هێلکاری و بیناسازی شوراکە و قوللەکانی لەگەڵ قەڵای سروچک لە ناحیەی بەرزنجە کە بابانەکان دروستیان کردووە لە سەدەی ١٠ک- ١٦ز.

بەگوێرەی بەڵگە مێژوویی و بیناسازی شوێنەواری بۆمان روون دەبێتەوە کە قەڵای دوین دەگەرێتەوە بۆ سەدەی ١٠ک-١٦ز و بە یەکێک لە قەڵاکانی سۆران دادەنرێت. بەڵام واپێ دەچێ کە قوللەکانی لەلایەن میر محەمەد لە سەرەتای سەدەی ١٣ک-١٦ز نۆژەن کرابێتەوە لەبەر ئەوەی هاوشێوەیە لەگەڵ قوللەکانی ئەو قەڵایانەی لە ماوەی فەرمانڕەوای میر محەمەد دروست کروان.

شایانی باسە قەڵای دوین بەهەڵە ناسێندراوە لە ناو خەڵکی کوردستان و هەولێر بە تایبەتی کە گوایە قەڵای سەلاحەددینی ئەیوبی یە، ئەمەش لەبەر ناوی دوینە کە شێوێندراوە لەگەڵ دوینی ئازربایجان کە شوێنی رەسەنی بنەماڵەی سەلاحەددینە وەکو ئیبن خەلەکان لە کتێبی "وفیات الاعیان..." دەڵی "نەجمەددین کوڕی مەروان کوڕی شادی خەڵکی دوینە، کە ناوچەکە لە کۆتایی هەرێمی ئازربایجان لەبەشی باکوور" بۆیە بوونی ناوی هاوشێوەی یەکتر نابێتە بەڵگە لەسەر پەیوەند بوون بەیەکتری بۆ نموونە ناوی "فنک" دوو گوندی جیاواز لە هەریەک لە بۆتان و سەمەرقەند وە لە هەمان کاتدا ناوی قەڵایەکە لە قورتوبە لە ئەندەلوس.

سەرەڕای ئەو بەڵگانەی باسکراون پێویستە ئاماژە بەو گۆڕستان بکەین کە دەکەوێتە رۆژهەڵاتی قەڵای دوین کە پەیوەندیەکی پتەوی بە مێژووەکەی هەیە.

کێلەکانی ئەم گۆڕانە لەبەردن و بەرزیەکەیان نزیکەی "١.٥" دەبێت و چەندین وێنە و نەخشی لەسەر هەڵکەندراوە. کە هەندێکیان ئەمانەن

١- وێنەی رۆژ و مانگ: بەهەمان شێوە وێنەی رۆژومانگ لە گۆڕستانی گوندی سورداش دەگەرێتەوە سەردەمی میرنشینی بابانیەکان بەوەی کە مێژووەکەی لەسەر هەڵکەندراوە کە سەدەی "١١-١٣ک/١٧-١٩ز"

٢- وێنەی شمشێرو خەنجەر لەگەڵ کیفەکەی و هەروەها وێنەی چەک و دەمانچە و قوتووی بارود. لەوانە ئەو گۆڕانەی کەوێتە چەکیان لەسەرەهی سەر کردەکانی سوپا کەسایەتی سەربازی بن.

هەروەها وێنەی خەنجەرو رمم و زری هەڵکەندراوە لەسەر کێلی گۆڕەکانی گوندی جامرێز لە ناوچەی گەرمیان کە یەکێک لەم گۆڕانە مێژووە کە لەسەرە دەگەرێتەوە بۆ "١٢١٥ک-١٨٠١ز".

عەبدولرقیب یوسف پێی وایە کە هەموو گۆڕەکانی گۆڕستانی دوین دەگەرێتەوە یەک سەردەم ئەویش سەردەمی میرنشینی سۆرانە و پێی وایە کە گۆڕی پیاوە گەورەو میرەکانی سۆرانە لەگەڵ گۆڕی ئەوانەی کە لەو شوێنە نیشتەجێ بوون و پارێزگاریان لە قەڵای دوین کردووە.

دیزاینی بیناسازی قەڵاکە لەیەک نهۆم پێک هاتووە بەشێوەیەک دەورە دراوە ئەم شورانەش بە پێنج قوللە قایم کراوە قەڵاکە بە شێوەیەکی گشتی لە دوو بەش پێک دێت بەشی یەکەم پێک هاتووە لە حەوت ژوورو حەوشەیە کی فراوان کە بیرێکی ئاوی تێدایە.

بەڵام بەشی دووەم لە "١٠" دە ژوور پێک دێت و حەوشەیەک لە یەکتریان جیا دەکاتەوە.

زۆربەی شورای قەڵاکە رووخاوەو نەمــــاوە، درێژی شـــورای بەشی رۆژهەڵاتی "١٢,٩٥م" ئەســتووری دیوارەکەی "٧٠سم" دەکەوێتە نێوان دوو قوللە.

بەڵام شـــورای بەشی رۆژئاوای درێژییەکەی "٥٠م" لە نێوان دوو قوللە دایە هەمـووی رووخاوە تەنها بناغەکەی ماوە.

قوللەکانی ئەم قەڵایە شێوەی لولەیی و ناوەوەی بە تاڵە تیرەکەیان نزیکەی "٢م" بەرزیەکەیان جیاوازە بە هۆی هەڵکەوتەی شوێنەکەیان هەیانە "٨م" وە هەیانە"٢,٩٥م". چەندین کونە مەتەرێزی شێوەی لاکێشەیی لەو قوللانە دا هەیە لە ناوەوە پێوانەکەی "٢٠×١٠سم" بەڵام لە دەرەوە پێوانەی فراوانترە "٤٠×٣٠سم" و"٤". لە هەریەک لەم قوللانە نزیکەی "١٤" کونە مەتەرێز هەیە. لەگەڵ بوونی چەند چاڵی بچووک بە درێژایی رێگای نێوان قوللەکان ئەمەش بۆ ئاگر کردنەوە تێداو رووناک کردنەوە رێگاکان.

### قەڵای دێری

دەکەوێتە باکووری شاری هەولێر بە دووری "٤٠کم" لەلای چەپی رێگای نێوان هەولێرو گوندی دارە بزمارە، دەکەوێتە نزیک گوندی دێری بە لای باکووری رۆژئاوای بۆیە بەم ناوە ناسراوە.

قەڵاکە لەسەر گردێکی شوێنەوار فراوان دروست کراوە بەرزیەکەی نزیکەی "٣٠م" بەگوێرەی راپۆرتی پشکێنەری بەرێوەبەرایەتی گشتی شوێنەواری عێراقی دەگەڕێتەوە بۆ هەزارەی یەکەمی دوای زایین، بەڵام لە ئەنجامی سەردنی کردنم بۆ شوێنەکە و دۆزینــەوەی پارچەی بەردی شوێنەواری "شظایا الحجریة" مێژووەکەی بۆ چاخە کۆنەکانی پێش ئیسلام دەگەڕێتەوە.

بەڵام سەبارەت بە مێژووی قەڵاکە موکریانی دەگەڕێتەوە بۆ ماوەی فەرمانڕەوایی میر محەمەد بەڵام رووداوە سیاسییەکانی ئەو سەردەم وا نیشاندەدات کە پێش میر محەمەد دروست کرابێت، لەبەر ئەوەی قەڵای دێری شوێنی کۆبوونەوەی سوپای بابانیەکان بووە کاتێک میر محەمەد هێرشی کردنە سەرو قەڵاکەی گرت. بەڵام لەوانە لە سەردەمی باوکی میر محەمەد مستەفا بەگ دروست کرابێت چونکە بایەخی بە دروست کردنی قەلا داوە بە هۆی ئەو دژایەتیە درێژ خایەنەی لەگەڵ میرنشینی بابان هەیبوو.

قەڵای دێری شێوەیەکی شەش لای



نارێکی وەرگرتووە بەهۆی نارێکی سروشتی گردەکە و هەر لایەک پێوانەی خۆی هەیەو درێژترینیان لای باشووری رۆژئاوایە کە درێژیەکەی "١٥,٣٠م".

دیزاینی بیناسازی قەڵاکە پێک هاتووە لە شورایەک و بوونی قوللە لە هەریەک لە سوچەکانی، ئەم شورایە دەوری حەوشەیەکی فراوان و هۆڵێک و پێنج ژووری داوە، لەگەڵ بوونی برێکی ئاو لە حەوشەکەو دوو دەروازەی هاتنە ژوورەوە بۆ ناو قەڵاکە.

لەگەڵ رووخانی بەشی سەرەوەی شوراکە بەشێکی زۆری لی ماوەتەوە بەرزیەکەی "٥,٤٠" ئەستووری دیوارەکەی لەبەشی خوارەوەی "١,٤٠م".

قوللەکان لە شێوەی لولەیی دان و هەر شەش سوچی شوراکە دامەزراون بەرزی یەکێکیان "٦,٤٠م" هەریەکەیان پێنج کونە

مـەتەرێزی تێـدایە شـێـوەکـەیان لاکـیـشـەییـەو پێـوانەکـەی لە دەرەوە "١٠×٢٠سـم" لـە نـاوەوەش "٣٠×٤٠سم".

قەڵاکە حەوشێکی فراوانی هەیە پێوانەکەی "٢٣×٢١.٧٠م" بیرێکی ئاوی شێوە بازنەیی تێدایە تیرەکەی "١.٩٠م" بەگـوێرەی وتەی خـەڵکی ناوچەکە تا ساڵانی حەفتاکان ئاوی تێـدابوو، سـەرچاوەی ئاوەکـەش بە رێگای کارێز لە گوندی سەروکـانی هاتووە بۆ ناو قەڵاکە دەکەوێتە بەشە باشووری.

یەکە بیناسازیەکان قەڵاکە پێک دێت لە پێنج ژووری جـیـاوازی لە نێوانە و هۆڵێکی فراوان شێوەکەی لاکێشەییەو درێژی لایەکی"٢١م" ئەم هۆڵە بەم شێوە فراوانە بەکار هێنراوە بۆ راگرتنی ئاژەڵ بەتایبەتی ئەسپ کە ئەوکاتە تەنها هۆکاری گواستنەوە ئاژەڵ بووە، بۆ دڵنیابوون لەسەر ئەمە بوونی دەروازەیەکی سەربەخۆیە کە لە دەرەوە بۆ ناو هۆڵەکە دێت کە ئەمەش بۆ هاتووچۆی ئاژەڵ بووە تاکو بەناو قەڵاکە تێپەرنەبێت.

بەرامبەر ئەم دەروازەیە لە بەشی رۆژهەڵاتی قەڵاکە دەروازەی سەرەکی قـەڵاکـە هەیە کـە درێژ دەبێـتـەوە بۆ ناوەڕاستی حەوشەکە بەرێڕەوێکی بەرد درێژکـراوە درێژیەکـەی "٢٦.٧٠م".

دەروازە سەرەکییەی قەڵا رووخاوە بەڵام بەگـوێرەی وتەی تەمـەن گەورەکان شێوەکەی کەوانەیەکی نیوە بازنەیی بووە، لەوانە ئەو دەرگـا دارانەی کـە بە بزمـاری گـەورە رازێنراوەتەوە تێگیرابێت لەبەر بوونی بزمـارێکی لەم شـێـوەیە لە شـوێنی دەروازەکە.

هەموو بەشە بیناسازیەکانی قەڵای دێری لەبەردی کلسی نارێک و گـەچ دروست کـراوە، بەڵام سـقـفی قـەڵا بەتەواوی نەمـاوە ئەمـەش بە هۆی تەقـانەوەو رووخـاندنی لەلایەن حکومەتی عێراقی ئەوکات لە ساڵی ١٩٨٨ز لە هێـرشی بەناو ئەنفـال کەبووە هۆی رووخانی کە زۆرێک لە گوندەکانی کوردستانی و سڕینەوەی شوێنەوارە کوردیەکان و گۆڕینیان بۆ شـێـوەی تر وەک گـۆڕینی دەروازەی قەڵای هەولێر لە شێوازە رەسەنەکەی خۆی کە شێوەی کەوانەیەکی تیژە بۆ شێوەی دەروازەی عەشتار لەبابل.

پێـویـسـتـە ئامـاژە بە بوونی مـزگـەوتێک بکەین کـە دەکـەوێتـە دامێنی قەڵاکە بەڵای باشووری دا کە پێک هاتووە لە شـوێنی نوێژکـردنی زستانە بەشێوەیەکی لاکێشەی تەریب لەگـەڵ دیواری رووگـە پێـوانەکـەی "٦٥،٦ط٧،٠٠٤م" لەگـەڵ بوونی شوێنی نوێژکردنی هاوینە کە پێوانەی "٤٥،٤×٤٠،٧م".

### قەڵای ئاکۆیان

قـەڵای ئاکـۆیان دەکـەوێتـە رۆژهەڵاتی گـوندی ئاکـۆیان بۆیە بەم ناوە ناسـراوە هەروەها دەکـەوێتـە رۆژهەڵاتی شـارۆچکەی رواندز بە دووری "١٨کم" قـەڵاکـە لەسـەر لوتکەی شاخێکی بەرز دروست کراوە و بەرزیەکـە "٦٥م" دکـتـۆر روص سـەبارەت بەم قـەڵاتە دەڵێ: "قـەڵایەکی بچـووکـە لەسـەر لوتکە ئاخـێک دروست کـراوە بەرزیەکـەی "١٠٠"پێیە دەڕوانێتە سەر گوندی ئاکۆیان و شـوێنی نشـتـەجێ بوونی مستەفا بەگە".

مـێـژووەکـەی دەگـەڕێتـەوە بۆ مستەفا بەگی باوکی میر محەمەد لەساڵی ١٢٢٩ک- ١٨١٣ز کاتێک دەسەڵاتی میرنشـینەکەی دایە میر محـەمـەدی و خـۆی قـەڵای دروست کردوو تێدا نیشتەجێ بوو تا کۆتایی



ژیانی.

هێلکاری قەڵاکە شێوەی نارێکی وەرگـــــرتووە بەهۆی هەڵکەوتەی سروشتی لوتکە شاخەکەی قەڵاکەی لەسەر دروست کراوە.

بەڵام بە داخەوە قەڵاکە بە تەواوی رووخـاوەو نەمـاوە بەهۆی هێـرشـە سـەربازیەکـانی کـە دەکـرا سـەر ئەم ناوچەیە لە ساڵانی هەشتاکان لەلایەن حکومەتی عێراق ئەوکات.

ئەوەی ئێستا ماییتەوە بریتییە لە بناغەی دیوارک درێژیەکەی "١٦م" لە سوچەکـانی قـوللەی شـێوە لوولـەیی هەیە وەکو هەمان قوللەکانی قەڵاکانی میرنشـینی سۆران. هەروەها قەڵاکـە سـەردانێکی هەیە پێـوانەکـەی "٣،١٠×١٦،٥م" سەقفەکەی شێوەی گـومـەزی نیـمـچـە لوولـەیی هەیە، بەهۆی پلـیکـان بۆی دەچێت وەک سەردابی ئیچ قەڵا وایە لەگەڵ ئەوەی کـە قـەڵاکـە نەمـاوە بەڵام بەگـوێرەی وتەی خـەڵکی ناوچەکـە واپی دەچی کە قەڵاکە لە رووی شێوەو شێوازی بیناسازی هەمـان شـێوەی قـەڵاکـان دوین و خانزاد بێت.

کە وەسفی قەڵاکەیان کرد کەپێک هاتبوو لە چەند یەکـەیەکی بیناسازی کەبەقـوللەی لوولەیی قـایم کرابوون و لە بەردی کـلس و گـــــەچ دروست کـرابوو.سـەرچاوەی ئاوی ئەم قـەڵایە بریـتی بووە لە کـــاتێک لەبـەشی باشـووری قـەڵاکـە کـە بەشـێـوەی دیوارێکی بەردی بەبەرزی "٢،٥م" لە قەد شاخەکە بۆ قەڵاکە چووە.



## ئیچ قەڵا

ئـیچ قـەڵا لەسـەر گـردێکی فـراوان دروست کـراوە بەرزیەکـە "٥٠م" کـە دەکەوێتە باکووری شارۆچکەی رواندز و لـەلای چـوپـی رێـگـای نێـــــوان شـــــارۆچـکـەی ســـــۆران و رواندز. ئامـانجی سـەرەکی لە دروست کـردنی لەم جـۆرە قـــەڵایانە لەناو شـــار بۆ پاراسـتنی میر و خانەوادەکـەیەتی لە هەر مەترسیەکی ناوخۆیی و دەرەکی.

مـیر مـحـەمـەد لە دوای وەرگـرتنی دەســــەڵات لە ســــاڵی ١٢٢٨ک-١٨١٣ز هەســـتـا بە دروست کـردنی زۆرێک لە قایم کاری لە رواندز وەک دروست کــــردنی شــــوراو قــــوللەی چاودێری دروست کردنی ئیچ قەڵا لەم شوێنە بە ئامانجی دامرکاندنەوە ناو خۆیەکان پاراسـتنی کـارگە و کـوگای چەک و تەقــەمـــەنی و پاراســـتنی کۆشکی میر بەهۆی ستراتیژی شوێنی ئیچ قــەڵاکــە دەروانێــتــە ســەر ئەم شوێنانە.

هاملتـــۆن لە باسی ئەم قــەڵایە دەڵێ: "لە رواندز لەســـەر گـــردێکی شێـوە چیـایی بەرز قـەڵایەک دروست کراوە کە دەڵێن پاشای کۆرە دروستی کردووە فـەرمانرەوای رواندزو هەمـوو کوردستان. لەبەشی خوارەوەی قەڵاکە کۆگـایەکی گەوردی ئاو هەیە کـاتێک بینیم لە هاوین پڕ بوو لە ئاو".

هێلکاری قـەڵاکە بە شێـوە چوار گــۆشــەییــە درێژی هەر دوو قــەڵای باکوورو باشووری "١٦،٥٠م" درێژی هەر دوو لای رۆژهەڵات و رۆژئاوای "١٧،٥٠م" ئیـچ قـــــەڵا بە تەواوی رووخــــاوە جگە لە شـــورای بەشی بـاکـــووری و بناغــەی دیوارەکــــانی بەشەکانی قەڵاکە.

قەڵاکە لە دوو نهۆم پێک هاتووە بەشێوەیەکی چوارگۆشە دروست کراوە لە هەر گۆشەیەکی شێوە چوارگۆشە کە قوللەیەکی شێوە لوولەیی بە شوراکەی

قایم کراوە کە ناوەودیان بە تاڵە بەهۆی دەرگایەکی بچووک لە ناو قەڵاکە بۆی دەچیت.

ئەو بەشە شورایەی کە ماوە بەرزیەکەی نزیکەی "٥م" و لەوانە لەسەرەتادا بەرزتربێت و ئەستووری دیوارەکەی "١،٦٠م" بە هەمان شێوەی قەڵاکانی تری میرنشینی سۆران کونە مەتەریز هەیە لە شورای قەڵاکە و پێوانەکەی لە دەرەوە "١٠×٢٠سم" لە ناوەوە "٤٠×٤٠سم

قەڵایەک دەروازەی هەبوود دەکەوێتە بەشی باشووری قەڵاکە و لەبەشی رۆژهەڵاتی قەڵاکە سردانێکی گەورەی ئاوهەیە شێوەکەی لاکێشەیی و پێوانەکەی "١٤×٣،٥٠م" سەقفەکەی بەشێوەی گومەزی نیمچە لولەیی بە بەرد دروستکراوە.

سەرچاوەی ئاوی قەڵاکە بریتی بووە لە کانیەک لە چیای زۆزک بە دووری نزیکەی "٥٠٠م" لە بەشی باکووری قەڵاکە بەشێوەی بۆری گڵێنەیی راکێشراوە بۆ ناو سردایەکە.

قەڵاکە لە ناوەوە لە چەند یەکەیەکی بیناسازی پێک هاتووە لە هەردوو نهۆمی یەکەم و دووەم خۆی لە چەند هۆڵ و ژوورێک دەبینیتەوە.

قەڵای بانەمان دەکەوێتە باکووری شاری هەولێر بە دووری "٢٩کم" بەلای راستی رێگای گشتی نێوان هەولێر و سەڵاحەددین، وە دەکەوێتە نزیک گوندی بانەمان بەلای باشوریەوە هەر بۆیە بەم ناوە ناونراوە.

هاملتۆن سەبارەت بەو قەڵایەو سەرچاوەی ئاوەکەی دەڵی: "بۆیەکەمجار بە بەستورە تێپەریم و پاشان بەردەوام بۆ سەرەوە هەڵکشاین و بە پاشماوەی شورای قەڵایەکی کۆن رۆیشتین لە گوندی بانەمان وەکانیەکی ئاوی لی بوو".

بەڵام سەبارەت بە مێژووی قەڵاکە ئیچ بەڵگە یان نووسراوێکی شوێنەواری نیە بۆ ئاماژە پێکردنی مێژووەکەی، بەڵام موکریانی پێی وایە لە لایەن میر محەمەد لە کۆتایی ساڵی ١٨١٤ز دروست کراوە لەگەڵ کۆمەڵێک قەڵای تر لە دەرەوەی ناوچەی رواندز.

لە ئەنجامی لێکۆڵینەوەو بەراورد کردنی ئەم قەڵایە لە رووی هێڵکاری و رەگەزی بیناسازی بە قەڵای تر کە میر محەمەد دروست کردوون وەک قەڵای سارتکە لە دوکان بۆمان دەرکەوت کە لەلایەن میر محەمەد دروست کراوە.

قەڵای بانەمان شێوەیەکی لاکێشەیی وەرگرتووە لاکانی یەکسان نین بەهۆی سروشتی ئەو گردەی کە قەڵاکەی لەسەر دروست کراوە.

قەڵاکە لە دوو نهۆم پێک هاتووە بە بەردو گەچ دروست کراوە، دیواری دەرەوەی قەڵاکە بە شوراکەی دادەنرێت ئەستووریەکەی لە نهۆمی یەکەم "١،٦٥م" بەرزیەکەی "٣،٤٠م" ئەستووری دیوارەکە لە نهۆمی دووەم "٦٥سم" بەرزیەکەی "٤،٦٠م".

جیاوازی لە ئەستووری دیواری نهۆمی یەکەم و دووەم دەگەرێتەوە بۆ چەند سوودێک لەوانە کەم کردنەوەی قورسایی لەسەر دیواری نهۆمی یەکەم، کەم کردنەوەی کەرستەی بیناسازی، فراوان بوونی نهۆمی دووەم.

قەڵاکە یەک دەرگای هەیە دەکەوێتە بەشی رۆژئاوای شێوەکەی لاکێشەییە پێوانەکەی "٢،٢٥×١،٢٥م" کۆتاییەکەی کەوانێکی نیوە بازنەییە نهۆمی یەکەم پێک هاتووە لە رێرەوێک و دوو ژوور و هۆڵێک.

نهۆمی دووەمیش بەهەمان شێوەی نهۆمی یەکەم دوو ژوورو هۆڵێک لە خۆ دەگرێت و لەگەڵ بوونی چوار ئاگردان بۆیە دەتوانێت بڵێین کە نهۆمی دووەم لە قەڵای بانەمان بەکارهێنراوە بۆ نیشتەجی بوونی سەربازەکانی ئەم قەڵایە بە بەڵگەی بوونی ئاگروان تێدا.

بەڵام لەوانەیە هۆڵەکەی نهۆمی خوارەوە بەکار هێنرابێت بۆ راگرتنی ئاژەڵەکان بە بەڵگەی بوونی هەشت"٨" دەلاقە لە شێوەی ئاخوڕی ئاژەڵ هەروەها لە نهۆمی دووەم "١٤" کونەمەرێزی تێدایە "٥" یان دەکەوێتە لای رۆژهەڵات و "٥"ی تری لەلای رۆژئاواوە "٤" دانەی تریان بۆ هەریەک لەلای باکوورو باشوور.

چوار قوڵلەی هاوشێوەی لە شێوەو دیزاین دا چوار سوچی قەڵاکە دامەزراون شێوەکەیان نیمچە لوولەیی و بەرزیەکەیان "٥.٥م" تیرەکەیان "٥م" قوڵلەی پتەون تا بەرزی "٤م" لە نهۆمی دووەم بەهۆی دەزگایەکی بچووک دەچیتە ناو قوڵلەکان.

کۆتایی هەر قوڵلەیەکیشی بە زیادەک بەرز بۆتەوە کە پێی دەڵێن:

"شروفات" قەڵای بانەمان تووشی زۆرێک لە شێواندن تێدا بووە لەلایەن حکومەتی عێراقی ئەوکات و بەکارهێنانی کەرەستەی تازە وەک چیمەنتۆ و ئاسن لە ٢٠٠٥/٤/٥ لە لایەن تیمێکی بەڕێوەبەرایەتی گشتی شوێنەواری کوردستان دەست کرا بەکاری هەڵکۆڵین و نۆژەنکردنەوەی ئەم قەڵایە.

لە ئەنجامی هەڵکۆڵینەکە دەرکەوت کە گر دەکە سروشتیە هیچ پاشماوەیەکی شوێنەواری لێنە دۆزرایەوە.

کاری نۆژەنکردنەوەش بۆ تەواوی بەشەکانی قەڵاکە کران بە گوێرەی ئەو کەرەستانەی کە لەبەرد دروست بوون.



### قەڵای بۆگد

قەڵای بۆگد یەکێکە لە قەڵایانەی لە قەزای کۆیە دروست کراوە بە دووری "٣٢کم"لێیەوە بەلای باشووری رۆژهەڵات، قەڵاکە لەسەر گردێک دروست کراوە لە نزیک گوندی بۆگد بەلای باکوور، قەڵاکە دەکەوێتە لای راستی رێگای نێوان کۆیە و سلێمانی بە رێگای کلکە سماق ناسراوە.

سەبارەت بە مێژووی قەڵاکە لێک چوونێکی زۆر هەیە لە ئەو قەڵای سارتکە لە رووی هێلکاری و شێوەو شێوازی بیناسازی جگە لەوەی هەردووکیان لە یەکتریکن و دەکەونە سەریەک سنوور بۆیە مێژووەکەی هاوشێوەیە لەگەڵ قەڵای سارتکە.

مێژووی قەڵای سارتکەش دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ١٢٤٣ک- ١٨٢٨ز لەلایەن میر محەمەد دروست کراوە.

قەڵای بۆگد راگەیاندنی شوێنەواری بۆ کراوە لە رۆژنامەی وقائیحی عێراق ژمارە "٣٦٦٢" لە بەرواری ١٩٥٥/٧/١٦ بەناونیشانی قەڵای کۆرە واتە میر محەمەد.

ئامانج لە دروست کردنی هەر دوو قەڵای بۆگد و سارتکە پاراستنی سنووری میرنشینی سۆران و بابان بووە، لەگەڵ رێگای بازرگانی وشکانی و ئاوی چونکە قەڵاکان نزیکن لە زێی بچووک ئەمەش واتە زێی بچووک سنووری هەردوو میرنشینی ناوبراو بوون.

قەڵاکە لەسەر گردێکی فراوان دروست کراوە بەرزیەکەی "٤٠م" بە بەردو گەچ دروست کراوە.

قەڵا بۆگد وەک زۆرێک لە شوێنەوارەکانی کوردستان بەر شاڵاوی بەناو ئەنفال کەوت و لە ساڵی ١٩٨٨ لەلایەن حکومەتی عێراقی ئەوکات تقیندرایەوە، ئەوەی ئێستا لێی مابێتەوە بەشێک لە شوراکەی و بناغەی بەشەکانی تری قەڵایەکەیە.

قەڵاکە بەشێوەیەکی چوار گۆشەی تەواو دروست کراوە درێژی هەر دوولای باکووری رۆژهەڵات و باشووری رۆژئاوا "٢٢م" و درێژی هەردوو لای باکووری رۆژئاوا باشووری رۆژهەڵات "٢١م" لە دوو نهۆم پێک هاتووە چوار قوللەی شێوە لوولەیی لەهەر چوار سوچی قەڵاکە دامەزراوە و قەڵاکە یەک دەروازەی چوونە ژوورەوەی هەیە، دەکەوێتە بەشی باکووری رۆژئاوا بە گوێرەی ئەو بەشە شورایەی کەماوە بەرزیەکەی "٨م" ئەستووری دیوارەکەی "١,٤٠" و چەندین کونەمەتەرێز لەبەشی سەرەوەی شوراکە هەن یەکەکانی بیناسازی قەڵاکە پێک دێت لە

حەوشەیەکی چوارگۆشە بە پێوانی "١١×١١م" لە ناوەراستی قەلاکە و بوونی بیرێکی ئاو لە حەوشەکەدا لەگەل بیرێکی لە یەکێک لە هۆلەکانی قەلاکە.

قەلاکە لە دوو نهۆم پێک دێت لە نهۆمی یەکەم چوار هۆلی تێدایە هۆلی یەکەم و دووەم لە یەکتر دەچن و پێوانەکەیان "٣×٩م" بەلام هۆلی سێیەم فراوانترە پێوانەکەی "٣×١١م" و هۆلی چوارەم بچووکترە و پێوانەکەی "٣×٦م".

یەکەکانی بیناسازی نهۆمی دووەم بەگوێرەی بەراوورد کردن و وتەی خەلکی تەمەن گەورەی ناوچەکە بەهەمان شێوەی نهۆمی یەکەمە.

سەبارەت بە سەقفی قەلاکە بە شێوەی راست بووەو بە دار سەری گیراوە بە بەلگەی بوونی شوێنی سەری دارەکان لە دیواری قەلاکە.

### تۆپەکەی پاشای گەورە "میر محەمەد"

لە ئەنجامی بایەخدانی میر محەمەد بۆ پڕ چەک کردنی سوپاکەی لە سالی ١٢٣١ک-١٨١٥ز چەندێک کارگەی لە گەردکی کاولۆکان لە رواندز دروست کرد لەوانە کارگەی دروست کردنی تۆپ و گوللەکەی و کارگەی تفەنگ و شمشێرو خەنجەر لە شاری ورمی بۆ رواندز بەناوی خان کلدی، لە هەمان کاتدا لە رواندز پسپۆرێکی بواری دروست کردنی تۆپ هەبوو بەناوی وەستا رەجەب کە لەلایەن میرکرا بە سەرۆکی کارگەکانی چەک و خان و کلدی کرا بەجێگری میر محەمەد لەو



سەردەم زۆر جەختی لەسەر بایەخدان بە تۆ دەکرد ئەمەش بەهۆی ئەوەی کە ئەو چەکە کاریگەریەکی یەکلاکەرەوەی هەبوو لە شەرەکان لە سەردەمی نۆزدەی زانستی.

زنجیرە چیای برادۆست دەولەمەند بوو بە کانزاکان مس و رصاص بۆیە میر وەک کەرستەیەکی خام بەکاری دەهێنا لە دروست کردنی چەکەکانی لەماوەی فەرمانڕەوای میر محەمەد وەستا رەجەب توانی "٢٢٢" تۆپ دروست بکات بەشێوەی قەبارەی جیاوازو نەخشی ئایەتی قورئانی " نصر من الله وفتح قريب " لەسەر نووسیوە لەگەل وشەکانی "عمل أسط رجب صنع في رواندز سنه ١٢٤٤هـ، ماشاء الله" "و-١-٢-٣"

بەلام دوای سەرکەوتنی میر بەسەر بابانەکان لە ناوچەکانی حەریرو کۆیە رانیە میر فەرمانی دەرکرد بە دروست کردنی تۆ پێکر تازە و نەخش کردنی بە دەستەواژەی "نصر من الله و فتح قريب"، میر المنصور محەمەد بک متصرف رواندز و کۆیی و حریر. دژی ئەو دەستەواژەی لە لەلای بابانەکان باو بوو "مكام بابان في كويى و حرير".

لە سالی ١٩٢٦ز سی دانە لە تۆپەکانی وەستا رەجەب لە رووباری رواندز دۆزرانەوە، لە سالی ١٩٦٧ز دوو دانە لەو تۆپانە گواسترانەوە لە رواندز بۆ مۆزەخانەی سەربازی لە شاری بەغدا ئەوەیتریان ئێستاش لە رواندز ماوە.



# قشڵە و قەڵای کۆیە

زێدان برادۆستی
کۆلیژی ئاداب - زانکۆی سەلاحەدین

**قشڵەی کۆیە:**

شارۆچکەی کۆیە دەکەوێتە رۆژهەڵاتی شاری هەولێر و (٧٩کم) لێیەوە دوورە، قشڵەی کۆیە دەکەوێتە ناو سەنتەری شارۆچکەی کۆیە بەلای رۆژئاوایدا.

شارۆچکەی کۆیە یەکێکە لە شارۆچکەکانی کوردستان کە خاوەنی مێژوویەکی دێرین و چەندین شوێنەواری گرنگە، لەکاتی بلاوبوونەوەی ئاینی ئیسلام لە کوردستاندا کۆیە شار بووە، وە لە دوای سالی (١٦ ک) لەشکری ئیسلام لە دەربەندی گۆمەسپان بەرەو کۆیە هاتوون.

دوای ئەوەی لە شەڕی چالدیران لە سالی (١٥١٤ز) کوردستان لە نێوان ئیمپراتوریەتی عوسمانی و سەفەوی دابەش کرا، ئەم ناوچەیە کەوتە ژێردەستی عوسمانییەکان.

**کەی قشڵەی کۆیە دروست کرا؟**

چەندین سەرچاوەو بۆچوونی جیاواز هەیە دەربارەی سەردەمی دروستکردنی ئەم قەلایە، کە بەم شێوەیە باسی لێوەدەکەن:

یەکێک لەو بۆچوونانە مێژووی دروستکردنی دەگەرێنێتەوە بۆ سەردەمی مەمالیک، سەرچاوەیەکی تر مێژووی دروستکردنی دەگەرێنێتەوە بۆ نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدە لە سەردەمی والی عوسمانی (میدحەت پاشا) (١٨٦٩- ١٨٧٢ز) کە لە بەغدا والی عوسمانی بووە، گرنگی زۆری داوە بە دروستکردنی قەلاو قوتابخانەی سەربازی لە ناوچە شاخاوییەکانی کوردستان، بۆ ئەوەی بەرگرییەکی بەهێز بکات لە دژی سەفەوییەکان.

ئەم قەلایە بە شێوازێکی ئەندازیاری رێکوپێک دروست کراوە، هەر لایەک لەگەڵ لایەکانی تریدا لە رووی درێژی و پانی کەمێک جیاوازییان هەیە، چوار قولە (برج) ی هەیە کە هەریەکەیان بەشێوازێکی ئەندازیاری جیا دروست کراون، شوورە و قولەکان بەیەکەوە بەستراون. بناغەی قەلا (قشڵە) لەسەر کۆنە قەبران دروست کراوە و گۆڕستانەکە کۆنترە لە قەلا.

شێوەی پێشەوەی قەلای کۆیە واتە دەروازەکەی ئێستا و بەر لە نۆژەنکردنەوەش لە شێوەی دەروازەی یەکێک لە قشڵە سەربازییەکانی عوسمانی دەچێت لە شاری موسڵ.

شارۆچکەی کۆیە لە سێ شوێن

دروست کراوەتەوە، دوای ئەوەی کە بۆ چەند جارێک وێران کراوە، بەم شێوەیە:

١- کاولەکۆ: لە ئاشاناوە دەست پێدەکات تا سەروچاوەی ئاوی حەمامۆک کە دەکەوێتە ژووروی کۆیە.
٢- ئەسکی کۆیە: گوندێکە لەنزیک کۆیە کە دەکەوێتە رۆژهەڵاتییەوە لە نزیک سیوەسەن.
٣- فیتنەکۆ: کە شوێنی ئێستای کۆیەیە.

**ناوی شاری کۆیە و قەڵاکەی:**

ناوی قەڵا بەناوی شارەکە کراوە واتە پێی دەڵێن (قەڵا یان قشڵەی کۆیە)، چەند بیرورایەکی جیاواز هەیە دەربارەی ناوی کۆیە، گرنگترینیان ئەم دوو رایەیە:

* کۆی بە تورکی واتە (گوند) یان (ئاوەدانی)، (سنجەق)یش وشەیەکی تورکییە واتە (ئاڵا)، کۆیسنجەق واتە (لوای گوند) وە یان (گوندی بەیداخ).
* تاهیر ئەحمەد حەوێزی دەڵێت: کۆیە چەند گوندێکی لە دەوروبەر هەبووە، پیاوێکی گەورە لەم ناوچانە پەیدا دەبێت ئەمیش دەڵێت وەرن لە ترسی دوژمن یەک بگرین و کۆببینەوە، لەئەنجامی ئەم کۆبوونەوە پێی دەڵێن کۆیە.

**شیکردنەوەی ناوی قەڵا و قشڵە:**

(قەڵا) خانووی بنکەی سوپاو سەربازانە لە زمانی کوردیدا چەند ناوێکی جیاوازی هەیە کە (دەر، قەل، قەڵا، دژ، قەڵات، کەلات)ی پێدەڵێن، لە سەر کێو دروست دەکرێت، هەندێک کات بە ماڵی خان و ئاغا دەوترا قەڵا لەبەر گەورەیی و قایمی، زۆربەی کات لە شوێنە سەخت و بەرزەکان دروست دەکرا.

(قشڵە): وشەیەکی تورکییە لە فەرمانی (قاشلاغ) وەرگیراوە واتە (المشتی)، بە واتای ئەو بینایە دێت کە سەربازەکان لە وەرزی زستاندا لە ناویدا دەمێننەوە، پێی دەوترێت شوێنی سەربازەکان.

**بەشەکانی قەڵا:**

**أ- دیوارەکانی:**

قەڵای کۆیە شێوەیەکی لاکێشەیی نارێکی هەیە کە دیوارەکانی لە هەر چوارلا دەورەی داون، دیوارەکان لەهەر چوارلایەوە بەبرجەکان بەیەک دەگەن، و دیوارەکانی دەرەوەی قەڵا بەبەردی گەورە و بچووک و گەچ دروست کراون، بەم شێوەیە:

**١- دیواری رۆژهەڵات:**

ئەم دیوارە بە دیواری سەرەکی قەڵا دادەندرێت کە درێژییەکەی لە گۆشەی قولەی باکووری رۆژهەڵات بۆ گۆشەی قولەی باشووری رۆژهەڵات بریتییە لە (٨٦.٣٠م)، دەرگای سەرەکی قەڵا دەکەوێتە ناوەراستی ئەم لایە تۆزێک بە لای چەپ، لەبەر ئەم دەرگایە دیواری رۆژهەڵات دەبێتە دووبەش. لە گۆشەی دەرگا بەلای باکووریدا بۆ قولەی باکووری رۆژهەڵات بریتییە لە (٤٣.٣٠م).

لەلای زاویەی دەرگا بەلای باشووری بۆ قولەی باشووری رۆژهەڵات بریتییە لە (٣٨م) وێنەی ژمارە (٦). هەرلایەک لە دوو بەشە (١٢) پاڵپشتی هەیە کە بۆ بەهێزی دیوارەکە دروست کراون بۆ ئەوەی بتوانێت بەرگری لە رووخان و دارمان بکات، ئەم پاڵپشتانە پانییەکەیان نزیکەی (٨٠-٩٥سم)، لە نێوان پاڵپشتەکاندا پەنجەرە هەیە کە بەرزییان (١.١٠م) و پانیان (١٨سم)ە، لە بەشی خوارەوە دیواری رۆژهەڵات چەندین کونە مەتەرێز و پەنجەرە هەیە کە شێوەیان لاکێشەیی و چوارگۆشەیی و سێگوشەیین، بەڵام لە بەشی سەرەوەی دیواری رۆژهەڵاتدا (١١٨) کونە مەتەرێزی هەیە کە هەموویان لاکێشەیین بەشێوەی سێگۆشەیی دابەش کراون و بەرزی دیواری رۆژهەڵات لە ناوەراستیدا بریتییە لە (٧.٣٠م) و پانایی دیوارەکەش بریتییە لە (٧٥سم).

**٢- دیواری باشوور:**

درێژی ئەم دیوارە لە زاویەی قولەی باشووری رۆژهەڵات بۆ زاوییەی قولەی باشووری رۆژئاوا بریتییە لە (٨٧.١٠م) وێنە ژمارەی (٧، ٨)، بەرزی ئەم دیوارە بریتییە لە (٦.٢٠م)، لەم دیوارە پەنجەرەی شێوە بازنەیی هەیە کە پێوانەکەیان بریتییە لە (٦٦سم، ٥٢ سم)، چوار پەنجەرەی شێوەی چوارگۆشەی هەیە پێوانەکەی بریتییە لە (٥٨×٥٨سم)، لە بەشی خوارەوەی دیوارەکە (١٦) کونە مەتەرێزی هەیە کە پێوانەیان (٥٢×٢٠سم)ە، کونە مەتەرێزەکانی بەشی سەرەوە (١٣٥) کونە مەتەرێزن و، پانی دیواری باشوور بریتییە لە (١.٢٠م).

**٣- دیواری رۆژئاوا:**

درێژی ئەم دیوارە لە زاوییەی قولەی باشووری رۆژئاوا بۆ زاوییەی قولەی باکووری رۆژئاوا بریتییە لە (٨٦م) و بەرزیشی (٥.٢٠م)، لە بەشی خوارەوەی (٣١) کونە مەتەرێز هەیە بە

شێوەیەکی لاکێشەیین کە پێوانەیان (٤٠×٢٠سم)، بەڵام بەشی سەرەوەی (١٦٠) کونە مەتەرێزی هەیە کە شێوە لاکێشەیین و بە شێوەی سێ گۆشەیی دابەش کراون کە پێوانەکەیان (٣٥×٢٠ سم) وێنەی ژمارە (٩-١٠) پانی دیواری رۆژئاوا (١.١٥م)ە.

**٤- دیواری باکوور:**

درێژی ئەم دیوارە لە زاوییەی قوڵەی باکووری رۆژهەڵات بۆ زاوییەی قوڵەی باکووری رۆژئاوا بریتییە لە (٨١م)، بەرزیشی (٦.٢٥م)، و پانییشی لە کونە مەتەرێزەکان (٨٥سم) بەڵام لە سەرەوە پانی (٨٠سم)ە، دەرگایەکی تازە کراوەتەوە لەم دیوارە لە نزیک قوڵەی باکووری رۆژهەڵات وێنەی ژمارە (١١-١٢)، لەبەشی خوارەوەی ئەم دیوارە (٣٥) کونە مەتەرێزی هەیە کە (٧) شێوەی میحرابیان هەیە پێوانەکانیان (٨٠× ٦٥ سم)، ئەوانی تر شێوە لاکێشەیین (٢٠×١٢ سم)، پەنجەرەی شێوە میحرابییان هەیە.

بەڵام لە بەشی سەرەوەی (١٤٨) کونە مەتەرێزی هەیە کە شێوەیان لاکێشەیین و بەشێوەی سێ گۆشەیی دابەش کراون.

**قوڵەکان:**

قوڵە (برج) لە زاراوەی بیناسازی شوێنەواریدا واتە بینایەکی بەرزە لە شورای قەڵادا دروست دەکرێت و قوڵەکان بۆ پاڵپشتی و بەهێزکردنی شورا و دیوارەکان لەلایەک و لەلایەکی تر بۆ جوانکاری بەکارهاتوون.

**قەڵای کۆیە**

قوڵەکان و کونە مەتەرێزەکان زۆریان هەیە بۆ بەرگریکردن و کۆنترۆڵکردنی دەوروبەری قەڵاکە لە بەرزییەوە دژی هێرشبەردکانی دوژمن.

قەڵای کۆیە یەکێکە لەو قەڵایانەی قوڵەکانی بەشێوەیەکی ئەندازەیی دروست کراون، لە چوار برج پێک دێت کە هەر یەکێکیان دەکەوێتە گۆشەیەک لە دیوارەکانی دەرەوەی قەڵادا، ئەمەش بەم شێوەیە:-

**١- قوڵەی باشووری رۆژهەڵات:**

ئەم قوڵەیە دەکەوێتە گۆشەی نێوان دیواری رۆژهەڵات و باشوور، بەرزی ئەم قوڵەیە (٨.٢٠م) ە، لە سەرەوە شێوەی بازنەیە و تیرەکەی (٥.٨٠م) دەبێت، چوار شوێنی تۆپ هاوێشتنی هەیە.

لە نێوان هەر شوێنێک لەگەڵ شوێنێکی تری تۆپ هاوێشتن پێنج کونە مەتەرێزی هەیە کە سێ لە سەرەوەن شێوەی لاکێشەیین و دووەکانی تر کە لەخوارەوەن شێوە میحرابین، بەرزی ستارەی قوڵەکە (١.٥٥م)ە، پانایی دیواری برجەکە لەسەرەوە (١.٥م)، رێڕەوی چوونە ناو بازنەی قوڵەکە (٢.٤٥م)ە.

**٢- قوڵەی باکووری رۆژهەڵات:**

ئەم قوڵەیە دەکەوێتە نێوان زاوییەی دیواری رۆژهەڵات و باکووری (٧.٨٥م) بەرزە، بنکەی برجەکە لە خوارەوە (٢٠.٢٠م)، شێوەی سەرەوەی بازنەییە تیرەکەی (٦.٢٠م)ە، چوار شوێنی تۆپ هاوێشتنی هەیە لە نێوان هەر دوو شوێنی تۆپ هاوێشتن چەند کونە مەتەرێزێکی هەیە کە شێوەی لاکێشەیی و میحرابین وێنەی ژمارە (١٨)، وە کونە مەتەرێزە شێوە میحرابییەکان (٦٠سم) بەرزن و (٣٤سم) پانن، بەڵام شێوە لاکێشەکان (٢٦)سم بەرزن و (١٥) سم پانن،




تۆپێکی سەردەمی عوسمانی لە قشلەی کۆیە،

بەرزی ستارەی ئەم قولەیە (١.٨٦م)د،و پانی دیواری قولەکە لەسەردوە (٨٤سم)د.

**٣- قولەی باکووری رۆژئاوا:**

ئەم قولەیە دەکەوێتە زاوییەی نێوان دیواری باکوورو دیواری رۆژئاوا بەرزییەکەی (٧.٩٥م) بنکەی قولەکە (٢٠م) لەرووی دەرەوە، شێوەی سەرەوەی بازنەییە و تیرەکەی (٤.٤٨م)د.

رارەو (ممر)ی چوونە ناو قولەکە (١.٨٥م)د، ئەم قولەیە ئەستووری دیوارەکەی لەسەرەوە (٧٥سم) و چوار شوێنی تۆپ هاویشتنی هەیە کە پێوانەیان (٨٥×٨٥ سم) د، لە نێوان هەر شوێنێکی تۆپ هاویشتندا سێ کونە مەتەرێز هەیە کە یەکێکیان شێوە سێ گۆشەییە بەرزی (٢٢سم) و پانی (١٧سم)، دووەکەی تریان شێوە میحرابین کە بەرزییان (٥٨سم) و پانییان (٣٢سم) کە تەنها کونە مەتەرێزەکانی ئەم قولە جیاوازی لەگەڵ قولەکانی تر هەیە لە شێوەی دابەشبوونیان.

**٤- قولەی باشووری رۆژئاوا:**

ئەم قولەیە دەکەوێتە گۆشەی نێوان دیواری باشوور و دیواری رۆژئاوا بەرزییەکەی (٧.١٠م)د، بنکەی قولەکە (٢٨م) لە رووی دەرەوە، شێوەی سەرەوەی بازنەییە و تیرەکەی (٧م) د، رارەو (ممر)ی ناو قولەکە (٢.٧٠م)د، ئەم قولە ئەستووری دیوارەکەی لەسەرەوە (١.٢٥م) وە چوار شوێنی تۆپ هاویشتنی هەیە کە بەرزییان (٩٠سم) د، پانییان (٨٠سم)د، لە نێوان هەر شوێنێکیدا پێنج کونە مەتەرێزی هەیە کە سیانیان لاکێشەیین و بەرزییان (٢٥سم) و پانییان (١٧سم)ە، دووەکەی تریان شێوە میحرابین کە بەرزییان (٧٥سم) و پانییان (٤٠سم)د.

کە واتە هەرچوار قولەی ئەم قەڵایە لە شێوەی دروستکردندا لێک نزیکن و جیاوازی کەمیان هەیە لە نێوانیاندا، هەر چواریان لە شوورەی دەرەوەی قەڵا هاتوونەتە دەرەوە ئەمەش لێرەدا بۆ دوو هۆ دەگەڕێتەوە یەکەمیان بۆ ئەوەی بتوانن کۆنترۆڵی دەرەوەی قەڵا بکەن لە کاتی هێرشکردندا، دووەمیان چونکە ئەم شێوازەی هاتنە دەرەوەی قولەکان لایەنێکی جوانکاری بە قەڵا دەدات. هەر چوار قولەکان ناوەوەیان پڕکراوەتەوە، بۆ ئەوەی بەرگری هاویشتنی تۆپەکان بگرێت لەکاتی شەڕکردندا، و قولەکان بنکەکەیان پانترە لە بەشی سەرەوە ئەمەش بۆ بەهێزی و لایەنی جوانکاری بووە.

**دەروازە (المدخل):**

قەڵای کۆیە یەک دەروازەی هەیە دەکەوێتە ناوەڕاستی دیواری رۆژهەڵاتی کەمێک بەلای باشووریدا، سەرەتای دەروازەکە بە کەوانە (عقد)ێکی کراوەی نیوە بازنە دەست پێدەکات و بەرزییەکەی (٢.٣٠م)د، عەقدی دووەم



راستەوخۆ دەکەوێتە سەر دەرگای قەڵا وە ئەم عەقدەش بە هەمان شێوەی عەقدی یەکەمە بەڵام پانی دەروازەکە لەرووی دەرەوەدا (٥.٣٠م) ئەم دەروازەش بە درێژی (١.٩٠م) لە دیواری رۆژهەڵاتی هاتۆتە دەرەوە، درێژایی نێوان هەردوو عەقدەکە بریتییە لە (٣.٦٠م) و پانی (٣.٤٠م)ە، لە نێوان هەردوو عەقدەکەدا بەلای راست و چەپدا دوو تاقی کراوە هەیە کە دەڕوانن بەسەر دەرەوەی قەڵادا لەو بەشەی کە لە دیواری رۆژهەڵات هاتۆتە دەرەوە. ئەم شێوازە بە شێوازی سەردەمی عوسمانییەکان دادەندرێت.

**کونە مەتەرێزەکان (المزاغل):**

کونە مەتەرێز لە زاراوەی بیناسازی شوێنەواریدا کونێکی بچووکە لە شوورەی شار یان قەڵا یان قولە دروست دەکرێت بۆ هاویشتنی رم و تیر و هیتر...، لە هەمان کاتدا بۆ هەوا گۆڕکێ و چاودێریکردنی بە سەر ناوچەکەدا.

کونە مەتەرێز یەکێکە لە هۆکارە نوێیەکان، و نەناسرا بوو لە پێش کۆشکی (الاخیضر)، ئەمەش داهێنانێکی نوێی سەردەمی ئیسلامییە، لە کاتی شەڕی خاچ پەرستەکاندا گواستراوەتەوە بۆ ئەوروپا، شێوەی کونە مەتەرێزەکانی کۆشکی (الاخیضر) لە شێوەی کونە مەتەرێزەکانی قەڵای کۆیەن.

شێوەی کونە مەتەرێزەکانی قەڵا لە ناوەوە فراوانن و لە دەرەوە بچووک دەبنەوە، ئەمەش بۆ ئەوەیە کە شەڕکەر بتوانێت بە تەواوی دەوروبەری کۆنترۆڵ بکات، لەهەمان کاتدا خۆی بسووڕێنێتەوە بەلای راست و چەپدا بە شێوەی ئاسۆیی و ستوونی، و لەلایەکی تردا لە کاتی شەڕو هێرشکردندا دەبێتە بەربەست بەرامبەر گوللەی دوژمن، ئەمەش بە هۆی بچووکی کونە مەتەرێزەکان لە رووی دەرەوەدا. سەرجەمی کونە مەتەرێزەکانی قەڵای کۆیە (٧٥٠) کونە مەتەرێزە. کە ئەمەش نیشانەی گەورەیی و گرنگی قەڵاکەیە واتە لەیەک کاتدا ٧٥٠ سەرباز دەیتوانی شەڕبکات جگە لە سەربازەکانی دیکە کە یارمەتی ئەم سەربازانەیان دەدا.

**ئەیوان (الایوان)**

وشەیەکی فارسییە کە عەرەب وەریان گرتووە، بەوەرگرتنێکی شارستانییانە وە ناوی تەواوی (الایوان)ە، کۆنترین ئەیوان لە عیراقدا ئەیوانی پەرستگای رۆژە لە شاری (حضر)، ئەیوان بەزۆری لە هۆڵێک پێک دێت کە سێ دیواری هەیە و بەشێکی بەسەر حەوشەدا دەڕوانێت، سەقفی شێوە قوبەیە و چەند عەقدێکی



دەروازەی قشڵەی کۆیە پێش نۆژەنکردنەوە



دەروازەی قشڵە پاش نۆژەنکردنەوە.

هەیە، ئەمەش بەکاردێت بۆ پێشوازیکردنی میوانەکان و دانیشتن و کۆبوونەوە.

ئەیوانی قەلا بە ئەیوانی دەروازە (المدخل) دەناسرێت، درێژی (١٢م)ە، پانییەکەی (٣.٨٥م) ە، سێ کەوان (عقد)ی تیژی هەیە راستەوخۆ بەسەر حەوشەدا دەڕوانێت، دوو ژووری هەیە لەلای باکوور و باشووریدا کە پێوانەی دەرگای هەردوو ژوورەکە (١.٩٠م) بەرزن و پانییان (١م)ە، و پەنجەرەکانی بەسەر ئەیوانەکەدا دەڕوانن، و درێژییان (١.١٠م)ە، و پانییان (٥٧سم) ە، پێوانەی ژووری باکوور (٦م×٥.٢٠م)ە، چەند پەنجەرەیەکی شێوە لاکێشەیی و چوارگۆشەیی تێدایە، بەلام سەقفی ژوورەکە دوو قوبەی هەیە کەبە دوو عەقدی تیژ راوەستاوە و بەرزییان (٣.٢٠م) بەیارمەتی یەک دینگە راوەستاون، ئەم ژوورە دوو تاقی هەیە. وا دادەندرێت کە ئەم ژوورانە بۆ پاسەوانی کردنی سەربازەکان بەکارهاتبن.

**حەوشە (صحن):**

ئاووهەوای عێراق و ئەم ناوچەیە بەگشتی بە گەرمای زۆر و بارانی کەم ناسراوە، لەبەر ئەوەی لەم ناوچەیە مرۆڤ لەسەردەمە کۆنەکان حەوشەیان دروست کردووە کە دەوروبەریان کردووە بە ژوور و دیوارەکانیان بەشێوەیەکی داخراو بەرز کردۆتەوە.

حەوشەی قەلای کۆیە بەگەورەترین حەوشە دادەندرێت لە هەموو حەوشەی قەلایەکانی تر کە لە ناوچەکەدا هەن، شێوەیەکی لاکێشەیی نارێکی هەیە، و درێژی حەوشەکە لەلای رۆژهەلاتەوە (٨٣.٥م) لەلای باکووری (٧٨.٣٠م)ە، لەلای رۆژئاوا (٨٤م) بەلام لەلای باشووری (٧٥.٥٠م)ە.

ئەم حەوشەیە چەند تایبەتمەندییەکی هەبووە کە بۆ مەشق پێکردنی سەربازەکان بەکارهاتووە، بۆ کۆبوونەوەی سەربازەکان و لەکاتی پشوودانیشدا بە حەوشەدا دەسووڕانەوە،ئەم حەوشەیە لەلای باکووری رۆژهەلاتی دوو گۆڕی تێدایە، کە یەکێکیان گۆڕی (باپیر فەقێ ئەحمەد)ە ئەوەی تریان (مامۆستای باپیر فەقێ ئەحمەد)ە، ئەمانیش یەکێک بوون لە پیاوچاکەکانی ئەم ناوچەیە و لەلای رۆژئاواوە ژوورێکی تر دروست کراوە.

**بەشی رۆژهەلات لەناوەوە و ژوورەکانی:**

ژوورەکان بەدەوری حەوشەدا دروست کراون، زۆربەیان بە دوولایەوە دەڕوانن بە سەر حەوشەدا، ئەمەش هاوشێوەی بینایەکانی کوفە، بەسرا، کۆشکی (الاخیضر)ن.

ژوورەکانی لای رۆژهەلات لە هەر دوو لای ئەیوانی قەلادا دابەش کراون، ئەمەش لە شێوەی روخسار و پێوانەدا بەنزیکەیی هاوشێوەن لەلای باکوور و لەلای باشووری ئەیواندا چوار بەشی هەیە کە ئەمانەش لە پێوانە و شێوەدا لێک نزیکن. دەروازەی هەریەکێک لەم بەشانە بە کەوانێکی تیژ (عقد مدبب) دەست پێ دەکات کە بەرزییەکەی (٢.٤٠م)، درێژی مەدخەلەکە (٦.٥م)، و پانی (٢.٤٠م)، لە کۆتایی هەموو مەدخەلەکان تاقێک (حنیە) هەیە کە بە دیواری رۆژهەلاتەوە نووساوە و پانییەکەی (١.٧٥م) وە شێوەی لە کەوانێکی تیژ دەچێت و بەرزی (٧٧سم)ە، هەریەکەیان دوو کونە مەتەرێزی هەیە، هەموو ڕاڕەو (ممر)ەکان دوو ژووریان هەیە کە دەکەونە لای راست و چەپی ڕاڕەو (ممر)ەوە، کە تەنها ڕاڕەو(ممر)ی چوارەمی لای باشووری رۆژهەلات نەبێت کە یەک ژووری هەیە ئەمەش لەبەر ئەوەی لکاوە بە قولەی باشووری رۆژهەلاتەوە. ژوورەکان بەگشتی هەریەکە دەرگایەک و پەنجەرەیەک و



بورجی باشووری رۆژ ئاوا (کونە مەتەریزەکان)



چەند تاقێک و یەک یان دوو کونە مەتەرێزی تێدایە.

**بەشی باشوور لەناوەوە و ژوورەکانی:**

بەشی باشووری قەڵا ئەم ژوورانە لە خۆ دەگرێت، کە لە نزیک قولەی باشووری رۆژهەڵات دەست پێ دەکات، هۆڵە گەورەکەی باشوور، ئەم هۆڵە درێژییەکەی (٢٧.٨٠م) و پانییەکەی (٤.٦٠م) کە هەشت کەوانی کراوەی هەیە کە پانییەکانیان (٦٨سم)ە، و بەرزییەکانیان (٢.٧٠م). لە نێوان ئەم هەشت عەقدە (٩) تاق هەیە کە پانییان (٢.٠٥م)ە، و بەرزییان (١.٧٠م) و قووڵییان (١.١٠م)ە، کە هەر یەکەیان یەک کونە مەتەرێزی هەیە، هەموویان بەسەر دیواری دەرەوەی قەڵادا دەڕوانن. بەڵام دیواری باکووری ئەم هۆڵە بەسەر حەوشەی قەڵادا دەڕوانێت، هەشت پەنجەرەی هەیە کە (١م) لە سەر رووی زەوی بەرزن، بەڵام بەرزی پەنجەرەکان (١.٠٨م)ە، و پانییان (٦٠سم). دەرگای هۆڵەکە لە ناوەڕاستی دیواری باکووریدایە کە بەرزییەکەی (٢م)ە، و پانی (٩٠سم)ە، و قووڵاییشی (٩٣سم)ە، ناوەڕاستی ئەم هۆڵە لەسەردەمی رژێمی بەعسدا کرابووە دەرگایەکی لاوەکی بۆ هاتوچۆکردنی سەربازەکان، کە دەیڕوانی بەسەر دیواری دەردوەی قەڵادا لە بەشی باشووریدا، بەڵام لە کاتی نۆژەنکردنەوە و چاکردنەوەی وەکو خۆی لێ کراوەتەوە.

هۆڵی دووەم کە لە ناوەڕاستی دیواری باشوورە تارادەیەک شێوەی لە هۆڵی یەکەم دەچێت.

**مزگەوت:**

یەکەمین بینایە لە سەردەمی ئیسلامدا مزگەوت بووە، کە دەورێکی سەرەکی هەبووە لەکاتی پەیدابوونی ئیسلام و ئێستاشی لەگەڵ دابێت، لە فێرکردنی زانست و پەروەردەی ئیسلامی و کاروبارە کۆمەڵایەتییەکان و رامیارییەکاندا.

مزگەوتی قەڵای کۆیە دەکەوێتە گۆشەی باشووری بەڵای رۆژئاوادا، نزیک قولەی باشووری رۆژئاوا کە پێوانەکەی (٤.٥×٥.٨٠م)ە، ئەمەش لەبەر هۆکاری گەچکاری کردنەوەی دیوارەکانی نازاندرێت کە نووسین لە سەر دیوارەکانی هەبووە یان نا، بەڵگەی سەلماندنی کە ئەو ژوورە مزگەوت بێت تەنها شوێنی میحرابەکە ئاسەواری ماوە. وە دەرگای مزگەوت دەکەوێتە سەر حەوشەی قەڵا کە پێوانەکەی (١× ١.٢٥م) و کەوانێکی نیوە بازنەیی (عقد نصف دائري) هەیە.

**بەشی رۆژئاوا لە ناوەوە:**

لەلای رۆژئاوای هۆڵێکی هەیە لکاوە بە قولەی باکووری رۆژئاواوە کە درێژییەکەی (٨.٦٠م) و پانییەکەی (٢.٩٠م) و دوو کەوانی هەیە بەرزییەکەیان (٢.٢٠م). ئەم هۆڵە سێ تاقی هەیە لە دیواری رۆژئاوادا کە پێوانەی دووانیان بریتییە لە (١.٤٠× ٢م) ە، و تاقی سێیەم کە بە قولەکەیەوە لکاوە شێوەی میحرابییە، بەڵام تاقی چوارەم لەلای باکووریدایە بە قولەکەوە لکاوە، و لەلای رۆژهەڵات دوو تاقی هەیە وە دەرگای هۆڵەکە دەکەوێتە هەمان لایەوە.

لە هۆڵی ناوبراو تاکو قولەی باشووری رۆژئاوا کە ئەم دیوارە دەبێتە دووبەش، یەکەمیان بەشی خوارەوە کە (٢٥) تاقی هەیە کەوانێکی تیژی لەسەر کراوە کە پێوانەکەیان (٢×٢م)ە،و هەر یەکەیان دوو کونە مەتەرێزی هەیە، کە تەنها دوو کەوانیان نەبێت کە هەریەکە و یەک کونە مەتەرێزی هەیە و، قووڵاییان (١.٥م) شێوەی کونە مەتەرێزەکان لاکێشەیین.

هۆکاری دروستکردنی ئەم عەقدانە بۆ لایەنی ئابووری دەگەڕێتەوە کە لایەنی تێچوونی کەمتر دەکاتەوە، و شەرکەریش لەم شوێنانە دەتوانێت خۆی لە سەرما و گەرما بپارێزێت.

هەروەها بەشی سەرەوەی دیوارەکە شوێنی هاتوچۆ و شەڕکردنی هەیە کە بەرینی (١.٣٠م)ە و،بەرزی (١.١٠م) بەسەر کونە مەتەرێزەکانی بەشی سەرەوەدا دەڕوانێت.

**بەشی باکووری لە ناوەوە:**

لەلای باکووریدا شێوەکەی لە بەشی ناوەوە لای ڕۆژئاواوە نزیکە لە قولەی باکووری ڕۆژئاوا تاکو قولەی باکووری ڕۆژهەڵات، لە بەشی خوارەوە (١٨) تاقی هەیە کە هەر وەکو تاقەکانی ڕۆژئاوان، تەنها ئەوە نەبێت کە شێوەی کونە مەتەرێزەکان سێگۆشەیین و (٥) لە تاقەکانی لە جێگای کونە مەتەرێزەکان پەنجەرەیان هەیە. بەشێک لە دیوارەکانی لکاوە بە دیواری گومەزەکەوە. لە بەشی سەرەوەیدا شوێنی پێدا ڕۆیشتنی هەیە ئەمەش وەک ستارە وایە، پانییەکەی (١.٢٠م)ە، و بەرزییەکەی (١.٥٥م)ە.

**نهۆمی دووەمی قەڵا:**

ئەم نهۆمە لە بەشی سەرەوەی ناوەڕاستی دیواری ڕۆژهەڵاتە، لەناو حەوشەدا بە دوو پایە بۆ بەشی سەرەوەی قەڵا دەڕوات، لە پێش دەروازەکە بەیەک دەگەن کە پێوانەکەی (١.٧٥ × ٤.٨٠م)ە، و لەژێر ئەم پایانە دوو تاقی شێوە میحرابی هەیە کە پەنجەرەیان تێدایە بەرزییان (١.٥٥م) و پانییان (١.٤٠م) و قوولییان (١.٧٥م)، لە هەردوو ژوورەکەی وەکو ئەیوان وایە بە کەونێکی تیژ دەست پێدەکات کە بەرزی (٢.٨٠م)ە و، پانی (٣.٢٠م)ە، درێژی ئەیوانەکەی (٦.٤٠م)ە، سەقفەکەی شێوە قوبەی هەیە. سەرەتای ئەیوانەکە دوو ڕاڕەو (مر)ی بچووکی هەیە کە هەردووکیان بۆ سەربانی نهۆمی یەکەمی قەڵا دەڕۆن، و درێژی ڕاڕەوی باشوور (٤.٣٥م)ە، بەڵام ڕاڕەوی باکوور درێژییەکەی (٣.٣٥م)ە، و هەریەکەیان سێ پەنجەرەی هەیە کە بەسەر حەوشەی قەڵادا دەڕوانن وە پێوانەیان (١.٥م × ٥٥سم)ە، شێوەی بەشی سەرەوە کەوانێکی تیژی هەیە.

ئەم ئەیوانە دوو ژووری هەیە کە لەلای باکوور و باشووریدایە کە هەردووکیان یەک درێژییان هەیە کە (٥م)ە، و پانی ژووری باشوور (٣.٤٠م)ە، بەڵام ژووری باکوور (٢.٦٠م) و هەردووکیان سەربانێکی شێوە قوبەییان هەیە، و ژوورێکیان پێوانەی (١.٢٠م) ە، بەرزە،و (٧٠سم) پانە، و بەرزی ئەم تاقانە لە زەوی (٥٥سم)ە، هەردووکیان دوو پەنجەرەیان هەیە، کە بەرزییان (١.١٠سم)ە، و پانییان (٧٠سم)ە.

هەر لایە دوو ژووری تری هەیە کە لە پشت ئەم دوو ژوورەن درێژییان (٧م) زیاترە،و پانییان نزیکەی (٣م) دەبێت، و بەرزییان نزیکەی (٢.٧٥م) زیاترە، هەر ژوورێکیان سێ تاقی هەیە، لەلای ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا هەر یەکەو دوو پەنجەرەیان هەیە، و سەقفەکەیان شێوە قوبەییە.

**کەرستەی بیناسازی:**

شێوازی دروستکردنی قەڵا جیاوازی هەیە لە شوێنێک بۆ شوێنێکی تر، لەڕووی کەرەستەی بیناسازی بەهۆی کاریگەری سروشتی ناوچەکە و ئەو کەرەستە سروشتییانەی کە هەیە لە ناوچەکە وەکو بەرد، دار، جۆری گڵەکەی، سەرچاوەی ئاویش، ئەمانە کاریگەری ڕاستەوخۆ دەکەنە سەر بنیاتنانی قەڵا، هەروەها کات و سەردەم کاریگەرییان لە شێوەی کەرەستەی بیناسازیدا هەیە، ئەمەش لە کاتێک بۆ کاتێکی تر جیاوازی هەیە.

پێکهاتەکانی کەرەستەی بیناسازی قەڵای کۆبە پێکهاتووە لە بەردی ڕێک و گەچ. ئەمەش ئەو کەرەستانەیە کە زۆربەی قەڵاکانی تری پێ دروست کراوە. واتە بنیاتنانی ئەم قەڵایە بەم کەرەستانە ئەوەمان بۆ ڕوون دەکاتەوە کە ناوچەکە کاریگەری ڕاستەوخۆی هەبووە لەسەر ناچارکردنی مرۆڤ لە بەکارهێنانی ئەم کەرەستانە لە دروستکردنی قەڵاکەدا. کە بەشێوەیەکی گشتی لە ناوچەکانی ناوەڕاست و باکووری میسۆپۆتامیا زۆر بەکارهاتووە، سەرەڕای ئەمەش لە ناوچەکانی باکووردا بەردیش زۆر بەکارهێندراوە. لە (قصر الاخیضر)ی هاوشێوەی قەڵای کۆبە، بەرد و گەچ بەکارهاتووە.

لە کۆتاییدا هیوادارین کە ئەم قەڵایە ببێتە شوێنێکی گەشت وگوزاری، دوور لە مەبەستی سەربازی و ئیداری چونکە بە یەکێک لە قەڵا دەگمەنەکانی کوردستان دادەندرێت کە تائێستا ماوەتەوە.

سەرچاوە

گۆڤاری سوبارتو /ژمارە ١. پایزی ٢٠٠٨.



# نۆژەنکردنەوەی قشڵەی مەخمور

سابیر حەسەن
شوێنەوارناس لە بەڕێوەبەرایەتی
شوێنەواری هەولێر

قشڵەی مەخمور دەکەوێتە ناوەندی شارۆچکەی مەخمور کە سەر بە پارێزگای هەولێرە، مێژووی دروستکردنی ئەم قشڵەیە بۆ کۆتاییەکانی سەردەمی دەسەڵاتی عوسمانییەکان (۱۹۰۷ز) دەگەڕێتەوە کە بۆ مەبەستی سەربازی بەکاریان هێناوە.

ئەم قشڵەیە بە شێوەی لاکێشەیی بە رووبەری (۳۷×۲٤م) کە دەکاتە (۸۸۸م۲) بە بەرد و گەچ و قسڵ دروست کراوە، لە دوو نهۆم پێکهاتووە، دوو دەرگای هەیە (دەرگای باکوور و باشوور). دەرگای باشوور گەورەترە پێدەچێت کە دەرگای سەرەکی قشڵەکە بووبێت.

ئەگەر لە دەرگای باشوور بچینە ژوورەوە سەرەتا ڕاڕەو (ممر)ێک کە درێژییەکەی دەگاتە (۱۰م) لە هەردوو لای ڕاڕەوەکەش دوو ژوور هەیە. بەهۆی ئەم ڕاڕەوە دەچینە حەوشی قشڵە کە لە ناوەندی بیناکەیە واتا هەموو ژوورو هۆڵەکان (قاعەکان) دەوری ئەم حەوشەیەیان داوە، وە رووبەرەکەی (۱۸×۱۳م)، هەر لەلای ئەم ڕاڕەوە لە هەردوو لای دوو قادرمە هەیە کە سەردەکەوێ بۆ نهۆمی یەکەم، نهۆمی یەکەمیش لە دوو بەش پێک هاتووە: بەشی باشوور و بەشی باکوور کە بەشی باشوور هەر لەسەر شێوەی ڕاڕەوێک و ژوورەکانی خوارەوە دروست کراون، بەڵام بەشی باکوور لە سێ ژووری یەک لە ناو یەک پێک هاتوون.بڕوانە وێنەکانی ژمارە(۱،۲،۳).

لە بەشی باکووری حەوشەکە ڕاڕەوێکی تر هەیە کە درێژییەکەی (٦م) و دەرگای لە سەرەو لە دوو هۆڵی گەورە یەک لای ڕۆژهەڵات و ئەوی تریش لای باکووری پێک هاتووە و هۆڵەکان لە ناوەوە بەهۆی ناوبڕ بەشێوەی کەوانەی دابەش



وێنەی ژمارە (١)

وێنەی ژمارە (٢)



نهۆمی یەکەم

وێنەی ژمارە (٣)



لەدەرگای باشوور نهۆمی سەر زەوی:

دەکرێنە سەر سێ بەش، تەنها بەهۆی یەک پەنجەرەی بچووک رووناکی ئەم هۆلانە دابین دەکرێن.

جگە لەم دوو هۆڵە چوار ژووری ڕاڕەوێکی باشوور لە هەردوو لای رۆژهەڵات و رۆژئاوای قشڵەکە چوار هۆڵی گەورەو هاوشێوەی یەکتر بە رووبەری (٤×١٤م) هەیە.بڕوانە وێنەی ژمارە(٤).

یەکێک لە تایبەتمەندییەکانی ئەم قشڵەیە شێوازی سەقفەکەیەتی، کە بەبێ دار یان ئاسن یان شتێکی تر راگیراون. کە ئەویش شێوازی گومبەزی بوونیانە کە توانیویەتی قورسایی سەقفەکان بخاتە سەر دیوارە ئەستوورەکانی قشڵە (ئەستووری دیوارەکان ٧٥سم)ە.بڕوانە وێنەی ژمارە(٥).

بەڵام لە رووی سەرەوە (واتا سەربان) سەقفەکانی نهۆمی سەر زەوی راست دروست کراون، ئەویش دوای دروستکرانی گومەزەکان بۆشاییەکانیان بە خۆڵ پڕ کردوون و دوای راستکردن و کوتانی باش بە قسڵ چینەکیان لە سەر داناوە تاکو ئاوی باران سەر رێژ نەبێتەوە ناو ژوورەکان و ببێتە هۆی رووخانی سەقفەکان. بەڵام سەقفەکانی نهۆمی یەکەم لە رووی سەرەوە هەر بەشێوەی گومەزن.



وێنەی ژمارە (٥)

شێوازی دەرگاو پەنجەرەکان



وێنەی ژمارە (٤)



**وێنەی ژمارە (٦)**

بەشێوەی نیوە بازنەیی دروست کراون و چوارچێوەی دەرگاو پەنجەرەکان لە بەردی (رخـام) بە شـێـوەیەکی رێکوپێک و جـوان دانراون، تەنهـا نهـۆمی یەکـەم بەشی باکـوور بێ چوارچێوەن.

ئەم قـشـلـەیە لەلایەن بەڕێوەبەرایەتی شوێنەواری هەولێر لە هاوینی سـالی ٢٠٠٧ دا نۆژەن کرایەوە.

نۆژەنکردنەوەی شـوێنە شـوێنەوارییەکـان بە پێـچـەوانەی بیناکـانی تر کـارێکی سـەخت و دژوارە، چونکە دەبێ شێـوە و جۆری کـەرەسـتـەی بەکـارهاتوو وە تایبەتمەندییەکانی بیناکە لە کـاتی نۆژەنکردنەوە وەکو خـۆی بپارێزرێت یان هاوشـێـوەی مـادە و رەگـەزە بیناسازییە کۆنەکان بێت.

لە کاتی نۆژەنکردنەوەی قشـلـەی مەخمور سـەرەتا دەستـمان کـرد بە خـاوێنکردنەوەی ژوورو هۆڵەکـان لە پاشـان وێنەی هەمـوو رەگـەزە بیناسـازییەکانی قشـلـەکـەمان گرت پێش نۆژەنکردنەوە، چونکە وێنەگرتن یەکێکە لە گرنگترین قۆناغـەکانی دەستپێکردن بە نۆژەنکردنەوە چونکە لە کـاتی نۆژەنکردنەوە زۆر سـوود بەخشە.

هەر وەک لە سـەرەوە باسمان کرد نـۆژەنـکـردنـەوەی شـوێنە شوێنەوارییەکان کارێکی ئاسان نییە، هەر لەم روانگەیەش بۆ دروسـتـکردنی سـەقفی یەکێک لە ژوورەکـان کە بە تەواوی لە ناو چووبوو، لە بەر ئەوەی شـێـوازی گـومـەزی بوو، بۆیە دروسـتـکردنی کـارێکی ئاسـان نەبوو، ئەویش لە بەر نەبوونی وەسـتـا تاکـو بتـوانێت ئەم شـێـوازە وەک خـۆی دەربهـێنێت. بۆیە بە دروسـتـکردنی قـالب بەئاسن لەسـەر شـێـوەی ژوورەکانی تر کە هاوشێوەی سەقفی ئەم ژوورە بوون، لە ئەنجـامـدا توانیـمان تارادەیەکی باش شێـوازی سەقفەکە دروست بکەین.

هەروەها لەبەر ئەوەی کـە زۆربەی چوارچێـوەی دەرگـاو پەنجـەرەکـان لە بەردی (رخـام) دروست کـراون بەهۆی باران و کـاریگەری کـەش و هەواوە لەناوچووبوون. لە بەرئەوە دەسـتـمان کـرد بەگـۆڕینیـان، و لەبەرئەوەی ئەم جـۆرە بەردانە لە کـوردسـتـان نەبوون مـاوەیەکی زۆری خـایاند تا لە دەرەوەی هەرێم پێـمـان گـەیشت، هەروەها بۆ لەبغکردنی دیوارەکـانیش لەبەر نەبوونی مـادەی گـونجـاو و وەستای کارامە ناچار بووین کە گەچ بەکاربهێنین، ئەمە و چەندین گرفتی دیکە کـە توانیـمـان بەسـەریاندا زالبین. بڕوانە وێنەی ژمارە(٦).

لەگـەڵ ئەوەی پسـپـۆڕانی بواری نۆژەنکردنەوەمـان نیـیـە، بەڵام توانیـمـان بەو توانا سـادەیەی کـە هەمـانە و لەگـەڵ نەبوونی مـادەی بیناسـازی پێـویست بۆ ئەو جـۆرە کارانە کارەکان تەواو بکەین.

سـەرچاوە

گۆڤاری سوبارتو ژمارە ١، پایزی ٢٠٠٨



# شوێنەواری خانی قەیسەریان

مەهدی جەلال مستەفا
بەشی شوێنەوار - زانکۆی سەلاحەددین

یەکێک لەو شوێنەوارە گرنگانەی نزیک شاری کۆیە خانی قەیسەریانە، لەگەڵ ئەوەی کە هیچ نووسین و نەخش و زەخرەفەیەک لە سەر رووی ئەم خانە بە جێ نەماوە بەڵام دەتوانین ئەم شوێنەوارە بەیەکێک لە پاشماوەکانی هونەری بیناسازی کۆنی کوردی ناوچەکە دابنێین.

**شوێنی جوگرافی خانی قەیسەریان:**

ئەم خانە دەکەوێتە بەشی رۆژهەڵاتی گوندی قەیسەریان لە رۆژهەڵاتی گوندەکەوە، بەدووری ١٤کم لە باشووری رۆژهەڵاتی شاری کۆیە لەدامێنی زنجیرەچیای هەیبەت سوڵتان، ئەم خانە دەکەوێتە سەرەرێگای سەرەکی (کۆیە - کەڵکەسماق- دوکان - سلێمانی).

هەڵبژاردنی ئەم شوێنە مەبەستی خۆی هەبووە چونکە دەکەوێتە نێوان چەند گردێکی بەرز لەشێوەی دۆڵێکی بچوکدا دەردەکەوێت، کە جێگایەکی لەبارە لەرووی کەشوهەواوە، لە وەرزی زستان سەرماو بای بەهێز نای گرێتەوە، روو بەردو رۆژە، ئەم جۆرە جێگایانە لەلایەن ئاژەڵدارەکانەوە زۆرگرنگە، بەتایبەت لە وەرزی پایز و زستاندا، کەزۆرترین تیشکی رۆژی بەردەکەوێت.

**مێژووی دروستکردنی خانی قەیسەریان:**

وەک باس دەکرێت ئەم خانە لە دەوروبەری ساڵانی (١٨٤٥ - ١٨٤٦ )دا بنیاتنراوە، کە ئەم بەرواره هاوکاتە لەگەڵ دروست کردنی مزگەوتی گەورەی شاری کۆیە، کە لەسەردەستی وەستایانی شارەزایانی کوردستانی رۆژهەڵات دروست کراون، زۆرێک لە خانووە کەلەپورییەکانی ناوشاری کۆیە، چ وەک مزگەوتی گەوری کۆیە، خانی محمود ئاغا، خانووی حاجی تەها.....و زۆرێکی تر نووسینی فارسی بۆ نەخش و زەخرەفە و مێژووی بیناکە بەکارهێنراوە کە ئەم نووسینە دەتوانرێت زۆربەی کات سوودی لێ ببینرێت بۆ دیاری کردنی مێژووی بۆ دیاری کردنی بیناسازی خانووە کەلەپورییەکانی ناوچەکە.



### نەخشەسازی خانی قەیسەریان:

خانەکە شێوەیەکی لاکێشەیی درێژی هەیە، درێژییەکەی نزیکەی (١٦م)ە و پانییەکەی (٤.٥ م) دەبێت، بەرزی دیوارەکانی تا سەقفەکەی نزیکەی دوومەتردەبێت، بەرزییەکەی بەسەقفە قوببەییەکانییەوە( ٣م) دەبێت، ئەم خانە لەشێوەی هۆڵێکی درێژدایە و تەنها یەک نهۆمە، کە بۆشوێنی حەوانەوەی خاوەن ئاژەڵەکان بەکارهێنراوە، خانەکە دوو دەرگای هەیە، یەکەمیان دەکەوێتە دیواری باشوور لەبەشی خوارەوەی دیوارەکەدا، دەرگای دووەم دەکەوێتە دیواری باکوور لەبەشی سەرەوەیدا، بەڵام دەرگای سەرەکی خۆی دەکەوێتە دیواری رۆژ هەڵات، ئەم دەرگایە ئێستا دیوارکراوە و داخراوە، لەگەڵ ئەوەی کە بە تەواوەتی نازانرێت کەی ئەم دەرگایە داخراوە، بەڵام پێدەچێت لەکاتی نۆژەنکردنەوەی دا لەساڵی ٢٠٠٤ لەلایەن بنکەی شوێنەواری کۆیەوە ئەم کارە ئەنجامدرابێت، ئەم خانە لەناوەوە پێک دێت لەریزێک عەمودی بەردینی کورت، کە دەکەوێتە ناوەراستی ژوورەکەوە و بۆتە دوو بەش، ژمارەی ئەم عەمودانە پێنج دانەیە، بنکە (قائدە )کەیان لە بەرد دروست کراوە و شێوەی چوارگۆشەییە، بەدەنەکەی شێوە لاکێشەیی تارادەیەک رێکە، بەرزییەکانیان لەنێوان (١.٢٥ - ١.٣٠ م ) دەبێت.

و لەسەرئەم عەمودانە بەردێکی شێوە چوارگۆشەیی هەیە پێی دەگوترێت تەبلەی عەمود، هەر عەمودێک چوارلاکەوانەی کەوتۆتەسەر، ئەم شێوازە لەزاراوەی بیناسازیدا بەزمانی عەرەبی پێی دەگوترێت(بائکە)، واتە بەیەک گەیشتنی کۆتایی چوار کەوان بکەوێتە سەر یەک عەمود پێی ئەوترێت بائکە.

ژمارەی عەقدەکانی ناو خانەکە ١٦ عقدی شێوە نوک تیژ (مدبب)ن، گومەتەکان کەوتونەتە سەر عەقدەکان، ژمارەی گومەتەکانی خانەکە ١٠دانەیە لەدوو ریز پێک هاتوون، شێوەی گومەتەکان لەناوەوە نیوەبازنەییە ناوەکەی سواخ دراوە بەمادەی گەچ شێوەی ناوەوەی رێک ترو باشترە لەشێوەی دەرەوەی ، بەڵام قوبەکانی سەردیواری باشوورقوببەی ناوەندی شێوە قوچەکی دەردەکەوێت لەوانەیە وەک شوێنی دووکەڵکێش بەکارهاتبێت، و لە ناوەندی هەرقووبەیەک کونێکی بازنەیی بچووک هەیە بۆهاتنە ناوەوەی رووناکی و هەواگۆرکێ و لەناوخانەکەدا چە ند تاقێکی بچووکی چوارگۆشەیی هەیە بۆدانانی کەلوپەل ، و لە هەندێک لەعەمودەکان بەتایبەتی عەمودی



ناوەڕاست لێوارێکی بچووک دروست کراوە لەگەچ بۆ دانانی چرا و شتی وردەواڵە ، هەرقوببەیەک دەکەوێتە نێوان دوو عەقد لەبەشی ناوەوە ئەم عەقدانە سەقفی قوببەکانیان بەرزکردۆتەوە، وەستا زۆر بەشارەزاییانە بەردی بەکارهێناوە لەجێگەی دار بۆ ڕاگیرکردنی سقفەکەی، ئەم قوبانە لەناوەوە زۆربە شێوەیەکی ڕێک دروستکراون و بەگەچ سواخ کراوە، بەڵام لە دیووی دەرەوەی بە شێوەیەکی نا ئەندازەیی دەردەکەویت، شێوەکەی نیوە بازنەیی ڕێک نییە و ئەم گومەتانە لەدەرەوە بەچینێک لەخۆل داپۆشراون پاشان گەچ کراوە بەسەریدا داتا باشتر بەردەکان بەیەکترییەوە ببەستێتەوە و ئاوی باراناو نەچێتە ناوژورەکەوە.

هەروەها لەبەشی باشووری ئەم خانەدا کەدەکاتە بەردەمی خانەکە چەند کەلاوەیەک هەیە لەگەڵ دیوارێکی درێژ بەدەوریدا کە



پێدەچێت حەوشەی خانەکە بێت.

هۆڵی ئاژەڵەکان شێوەی لاکێشەیی درێژن بەرزی پاش ماوەی دیوارەکانی یەک مەتردەبێت، هۆڵەکە لەشێوەی پیتی (L)ی ئینگلیزی دەچێت، دووری ئەم هۆڵە زیاتر ١٠م لە خانەکەوە دوورەوە، لە دەوریان حەوشەیەکی کراوە هەیە دەوری ئەم هۆڵەی داوە، و ڕووبەرێکی فراوانی داگیرکردووە، پاش ماوەی دیواری حەوشەکە بەئاسانی دەبینرێت، کە بەکارهێنراوە بۆ پاراستنی مەڕوومالاَتەکان لەدڕندەکان.

**کەرستەی بیناسازی:**

گرنگترین کەرەستە سەرەکییەکان لەپێکهاتەی خانەکەدا، بریتییە لە بەرد، گەچ، قوڕ، یاخوود تێکەڵەی خۆڵ و گەچ پێی دەگوترێت (گڵ گەچ)، کە ئەم جۆرە ماددانەش لە ناوچەی کۆیە زۆرن و ئاسان دەست دەکەون، شایەنی باسە خەڵکی ناوچەکە باس لەوە دەکەن کە خاوەن مەڕوومالاَتەکان، کەپریان لەم جێگایەدا دروستکردوو ، گوایە چەند جار ئەم کەپرە تێکچووە و ڕووخاوە، دواتر خاوەن مەڕوومالاَتەکان بیریان لەوە کردۆتەوە کە لەجیاتی کەپر ئەم خانە و بەشەکانی دروستبکەن، و بۆ ئەم مەبەستەش سودیان لەو وەستایانە وەرگرتوە کە لەو کاتەدا خەریکی دروست کردنی مزگەوتی گەورەی کۆیە بوون.

**تێبینی:**

ئەم بابەتە لە ژمارە(٣)ی ساڵی (٢٠٠٩)ی گۆڤاری سوبارتو وەرگیراوە





# دەرگاکانی شوورەی کۆیە

**عەبدولڕەقیب یوسف**

هەبوونی شووره له چوار دەوری شاری کۆیه لەلای خەڵکی کۆیه مەعلومه و تا زۆر کەسیش شوێنی هەر چوار دەرگاکانی دەناسن، بەڵام مێژووی دروستکردنی شوورەکه نەزانراوه، ئەگەر چی له ساڵانی هەشتاکانی سەدەی رابردوودا به شوێنی دەرگاکانیم زانیوه، بەڵام به هەڵه شوێنی (دەرگای خۆشناوان)م نووسیبوو.

ساڵی ٢٠٠٦ هێڵی شوورەی شاری هەولێرم دۆزییەوه که حکوومەتی هەرێم بایەخی پێ داو بڕیاری زیندووکردنەوەی به رەسمی دەرکرد و لێژنەشمان پێکهێناوه بۆ ئاواکردن و زیندووکردنەوەی هەندێکی لەم ساڵەی ئێستادا. پاش ئەمە، هەر ساڵی پار وێنەی شوێنی هەر چوار دەرگاکانی شوورەی کۆیەم گرت تا هەوڵی زیندووکردنەوەیان بدەم و به مێژووی (١٨/ ١٠/ ٢٠٠٦) راپۆرتێکم لەم بارەوه نووسی بۆ بەڕێوەبەری گشتی شوێنەوارانی کوردستان که بەڕێز عەبدوڵڵا قەرەداغییه و داوام کرد لێژنەیەک بنێرێ بۆ کۆیه تا خۆشیان شوێنەکانیان ببینن و هەوڵی ئاواکردنیان بدەن، چونکه ئاواکردنیان زیندووکردنەوەی بەشێکه له مێژووی ئەم شاره گرنگەی کوردستان و جوانییەکیشی پێ دەبەخشێ. ئەمەش دەقی ئەو راپۆرتەمه لەگەڵ وێنەکانی شوێنی دەرگاکان و نەخشەیەک بۆ دیارکردنی شوێنەکانیان، ئەگەرچی نەخشەکه به پێی پێوان نییه، داواکارم حکومەتی هەرێمی کوردستان دەرگاکان و هەندێ له شوورەکەی زیندوو بکاتەوه لەو شوێنانەی ئاماژەم بۆیان کردووه شوێنی قەڵاته کۆنەی پێش سەدەی نۆزدەمه، ئێستا تانکی ئاو و بینایەی ئینحیساری تووتنه یان هەندێ له ئینحیسار وا قەڵای کۆنی کۆیه له سووچی باکووری رۆژئاوای شاردا بووه و دەرگای شوورەکه له

باشووری رۆژهەلاتی قەلات بووە و لە پێش مزگەوتی شێخ نەبی، كە ئەرز لەوێ نزم دەبێتەوە، گومانێكم لەم بارەوە هەیە، تاپۆی كۆنە قەلات لەلامە كە برای بەرێز سەلاحی مەلا ئەسعەد تێبینەر (ملاحظ)ی دائیرەی تاپۆی كۆیە بە رێكەوتی ۱۵/۸/۱۹۸۷ لەگەڵ تاپۆی قشلە و چەند بینایەكی دیكەی گرنگ بۆ منی ناردووە، ئەوەش بەهۆی خوالێخۆشبوو مامۆستا تاهیر ئەحمەد حەویزی مێژوونووسی كۆیە. بە پێی نووسینی مامۆستا تاهیر لە ب ۲ لە كتێبەكەی (مێژووی كۆیە) ل ٥۳ دوو دەرگای دیكەی شوورەكەش هەبووە، یەكێك لەلای مەرقەدی شێخ موسا (لە رۆژئاوای دەرگای كۆنگرە و یەكێكی دیكەی بچووك نە نزیك مزگەوتی ئەسعەد ئاغا).

**بەرێز بەرێوەبەری گشتی**
**شوێنەوار- هەولێر**

### ب- دەرگاكانی شوورەی شاری كۆیە

* شاری كۆیە (كۆیسنجەق) شوورەی هەبووە، بەلام شووره نەماوە، كەچی شوێنی هەرچوار دەرگای لەلای خەلكی كۆیە مەعلومە، وێنەی شوێنەكانیانم گرتووە و لەو بارەوەش لەگەڵ قایمقامی كۆیە بەرێز كوردە خانم قسەم كردووە، كە پێویستە هەر چوار دەرگا زیندوو بكرێنەوە و ببنە مێژوویەكی بەرچاوی ئەم شارەم.

**دەرگاكان ئەمانەن:**

۱- دەرگای خۆشناوان: لای دەمی كۆلانی تەنیشتی رۆژئاوای قوتابخانەی حاجی قادر بووە، بەرامبەر بنكەی تەندروستییە نوێیەكە لە بەشی باكووری شار.

۲- دەرگای كۆنە قەلات: لای ئینحیساری توتنە. دەكرێ لە دەمی كۆلانی تەنیشتی باشووری ئینحیساردا لە تەنیشت شەقامی گشتی دەرگا ئاوا بكرێت.

۳- دەرگای گەرووی سۆرك: بەرامبەر سووچی باكووری رۆژهەلاتی قوتابخانەی هەیبەت سولتان و نزیكی شارەوانی و قایمقامیەت و دەرگای باشوور بووە.

٤- دەرگای كۆنگرەی سەر شاخان، كە دەرگای رۆژهەلات بووە و شوێنەكەی شاخە بەردە خانوویەك لەسەر بەشە رۆژئاواكەی ئاوەدان كراوەتەوە، بەلام بەشی رۆژهەلاتەكەی ماوە و پێویستە بەردەكە بپارێزرێت، كە هەندێ كەس نیازیانە خانوو لە بەردەمی ئاوا بكەن و بیشكێنن، مەهێلن بەردەكە بشكێنرێت، كوردە خان لە مانگی ئەیلولی رابوردوودا ئەفسەرێكی پۆلیسی لەگەلا من نارد تا پیشانیان بدەم.

أ- دەوری ۱۰۰م بۆشایی لە شوێنی شوورەدا ماوە لەسەر شەقامی گشتی بەرامبەر بینایەی شارەوانی تا دەرگای باشوور (دەرگای گەرووی سۆرك) دەكرێ پارچەیەك لە شوورە لەوێ دروست بكرێت و ببەسترێت بەم دەرگایەوە.

ب- لە تەنیشتی دەستە چەپی بینایەی دادگا و بەرامبەر قایمقامیەت لە تەنیشتی شەقامی گشتی گەراجێك هەیە و ئەو شوێنە پێشتر (چایخانەی سەرشۆران) بووە و ئێستاش بە ناوی سەرشۆرانەوەیە، چونكە پارچەیەكی شوورە لەوێ بوو و دیواری پێشەوەی بینایەی مەحكەمەش لەسەر شوورە دانراوە، دەكرێ پارچەیەكی شوورە لێرەش زیندوو بكرێتەوە و ئەگەر بینایەكی نوێ بۆ مەحكەمە دروست كرا، دەبێ لە شوێنە كۆنەكەدا پارچەیەكی شوورەكە زیندوو بكرێتەوە.

تكایە لیژنەیەك بنێرە بۆ كۆیە بۆ ئامادەكردنی راپۆرتێك لە بارەی دەرگاكان و ئەو دوو پارچە بۆشاییەی لە شوێنی شوورەكەدا ماوە و با بچنە لای قایمقام، كە حەزی لە مێژووی شارەكەیەتی و هەستی مێژوو و كەلەپووریشی زۆر باشە.

با لێژنە برای نووسەر جەلال جۆبار ببینێ لەگەڵ بەرێز محەممەد سالحی حاجی گەورە، كە شارەزایە و هەروەها فوئادی وەستا عومەری عەبدولواحد.

### ئاشەكانی تۆپزاوە

لە تەنیشت سنووری رۆژئاوای شاری كۆیە، چەند ئاشێكی كۆن هەیە لە خوارووی دێی تۆپزاوە و (دێری مەربیشو) و لە نزیك خالی پشكنینی شار.

تكایە بە رەسمی نووسراوێك بنووسن بۆ پاراستنی ئەو ئاشانە و خاوەنەكانیان ئاگادار بكەنەوە، كە نابێ بیانرووخێنن.

لەگەڵ رێزمدا

**عەبدولرەقیب یوسف**

**۱۸/ ۱۰/ ۲۰۰٦**

* ئەم بابەتە لە گۆڤاری مێرگ ژمارە (۲۷)ی ئاب ۲۰۰۷ وەرگیراوە.

کەم دەرامەتی شارەکەی تێدا دەژیت، ئەمەش دەبێتە هۆکارێک بۆ مانەوە و پاراستنی ئەو شوێنەوارە بەنرخانە.

**حەساری قشڵەی سوارەی**

لە کۆتاییەکانی سەدەی (١٩) دروست کراوە. قشڵەی سوارەی، بەیەکێ لە شوێنەوارە دێرینەکانی هەولێر دەژمێردرێت، قشڵەی سوارەی سەردەمانێک بنکەی پۆلیسی خەیالە بوو، لەبەرئەوەی ئەوکات ئۆتۆمبێل کەم بوو هەموو کارەکانی پیاوانی پۆلیس لەسەر ئەسپ و هێستر بەڕێوە دەچوون، هەموو هێستر و ئەسپەکانیش هەر لە نێو ئەم قشڵەیەدا بەخێو دەکران، تائێستاش ئەم قشڵەیە وەکو حەسارێک هەر ماوەتەوە و خەڵکی هەژار و کەم دەرامەتی شاری تێدا دەژیت.

**کۆلانی عارەبان**

کۆلانی عارەبان بەیەکێ لە گەڕەکە هەرە کۆنەکانی کۆنە هەولێر دەژمێردرێت، کە بەر لە ساڵی (١٩٠٥) چەند کەسێک لەگەڕەکی عارەب خانوویان دروست کرد، بەزمانی عوسمانییەکان ئەوکاتەش بەم گەڕەکەیان دەگوت (یەنگی محەلە) واتە (گەڕەکی نوێ) دواتر لە ساڵی (١٩١٨) چەند ماڵە عارەبێک، کە کاریان نانەوایی بوو هاتنە ئەو گەڕەکە، بۆیە ئەو گەڕەکەش بەناوی ئەو عارەبانەوە ناونراو بوو بە کۆلانی عارەب. لە هەولێر، ئێستاش خانووی زۆر کۆنی لێ ماوە، کە بوونەتە شوێنەواری بەنرخ.

**قەیسەریی هەولێر**

بەپێی سەرچاوە مێژووییەکان دروستبوونی قەیسەری هەولێر دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی ساڵانی (١٢٢٠ز)، تاوەکو ساڵانی (١٩١٦)ش ئەو کۆنە قەیسەرییە هەر لەسەر شێوازی جارانی خۆی مابۆوە، یەک لە شوێنە هەرە کۆنەکانی نێو قەیسەری هەولێر، دەرگاکانییەتی، ئەوکاتەش دوو دەرگای سەرەکی هەبوون بۆ قەیسەری، کە بەڕۆژ دەکرانەوە و بەشەویش دادەخران، یەک لەو دەرگایانەش ڕێک دەکەوێتە نزیک چایخانەی (وەستا خەلیل) لەنێو قەیسەریدا، وەستا خەلیلیش زۆرجار لەمێژووی ئەو دەرگا کۆنە دەدوێت، کە پارێزەری هەموو دوکان و کەلوپەلەکانی نێو قەیسەری هەولێر بووە دەرگاکە لە سەردەمانێک، کە ترس لەهیچ کەردەیەکی دزی و ڕاورووتی نەدەکرا، دەرگایەکەش تا ئێستا ماوە، کە مێژووی دروستکردنی قەیسەری لەسەر تۆمار کراوە.

**دیوەخانەی ڕەشید ئاغا لە قەڵا**

لە ساڵانی سییەکان بەشێوەیەکی بیناسازی نایاب، کە کەم خانوو هەیە لە سەردەمی ئێستا وەکو ئەو خانووانە دروست بکرێت، دیوەخانەی ڕەشید ئاغا لە قەڵای هەولێر دروست کراوە، هونەری بیناسازییەکە لە تاق و کەوانەی پەنجەرەکان و بەکارهێنانی مەرمەڕە، بەشێوەیەک کە سەرنج ڕادەکێشێ.

**ماڵی عەلی پاشا**
**لە گەڕەکی سەرادا**

ماڵی عەلی پاشاش دەکەوێتە قەڵای هەولێر، ئەو ماڵە بەشوێنەوارێکی بەنرخی ئەمڕۆی شارەکە دەژمێردرێت، کە بەشێوازێکی یەکجار جوان دروست کراوە، ئەوەی زیاتر سەرنجی ئەو خەڵکە ڕادەکێشێت سەردانی ئەو ماڵە دەکات لەقەڵادا، دەرگای سەرەکی ماڵەکەیە، کە بەجوانترین شێوازی زەخرەفە و نووسین و هەڵکەندن دروست کراوە و تا ئەمڕۆکەش وەکو خۆی ماوەتەوە، دەرگاکە لەداری ئەبەنووس دروست کراوە و دیوارەکەش لە مەرمەڕ دروست کراوە.

**دەرگای قەڵا**

بەپێی قسەی بەڕێز کەنعان موفتی، بەڕێوەبەری گشتی شوێنەوار، ئەو دەرگایە بەو شێوە ئەندازەییە ڕێک و جوانە لەلایەن وەستا ئیسماعیل سنەیی دروست کراوە، ئەو ڕاستییەش وەستا شەهاب بەننا، کە شاگردی وەستا ئیسماعیل بووە سەلماندوویەتی، ئەوکاتەش وەستا ئیسماعیل لە سنەی ڕۆژهەڵاتی کوردستانەوە هاتۆتە هەولێر، ئەو کارە بیناسازییە جوانەی ئەنجام داوە و تا ئێستا بەو جوانی و ڕێکییەی خۆی هەر ماوە، لەگەڵ ئەوەی هیچ شارەزاییەکی لە ئەندازەی بیناسازیدا نەبووە.

* ئەم بابەتە لە گۆڤاری (بارش) ژمارە (١٠) وەرگیراوە.



# خانووە کەلتوورییەکانی قەڵاتی هەولێر

## لێکۆڵینەوەیەکی بەراوردکارییە لەگەڵ ماڵە کلتوورییەکانی سەرجەم عێراق

دکتۆر موئەیەد سەعید ئەلدامرچی

نموونەی ماڵ و خانووە کلتوورییەکان لە عێراق و لە هەولێر بەتایبەتی نموونەی باش و هەرە باڵان، هۆیەکەشی دەگەڕێتەوە بۆ:

**یەکەم:** ماڵی چینە دەوڵەمەندەکانە، لەبەر ئەوە بنیات و بناخەی پتەو و بەهێزن، بۆ ماوەیەکی درێژ بەرگەی هۆکاری رۆژگاری گرتووە، بە بەراورد لەگەڵ ئەو خانوو و ماڵانەی زوو وێران بوون.

**دووەم:** لەبەر ئەوەی نەخش و نیگاری زۆرە، زیاتر لە خانووەکانی دیکەی ئاستیان سەرنج راکێشترە و هەر لەبەر ئەم هۆیەش زۆر لە ئەندازیاران و شوێنەوارناسان و رۆشنبیران بەرگری لێ دەکەن و داوای پاراستن و بەدیکۆمێنتکردنی بەشێوازی زانستی دەکەن.

**سێیەم:** لەبەر ئەوەی شوێنەکەی لە گەڕەکە کۆنەکان و داخراوە یان لەسەر باڵەخانە بەرزەکانە، وەک قەڵات وای کردووە دوور بێت لەبیناسازی نوێ یان کردنەوەی رێگای گشتی و باڵەخانەی بەرز وەک لەگەڕەکە نوێیەکانی دەوروبەری قەڵا بەرچاو دەکەوێت. لەروانگەی کۆمەڵایەتی و ئابوورییەوە قەڵاتی هەولێر جێگای نیشتەجێبوونی پیاوماقووڵان و دەوڵەمەند و بازرگانەکانی شاری هەولێر بووە، بەڵام کارەکانیان لەبازاڕ و دوکان و قەیسەری و قوتابخانە و مزگەوتەکانی دەوروبەری قەڵات بووە، لەبەر ئەم هۆیە قەڵات شوێنێکی

تایبەت بووە بۆ دانیشتوانە رەسەنەکانی. کەم وابووە بێگانەیان تێکەڵ بێت، بەدەگمەن نەبێت گەر بتوانێ کەسێکیان بێت. کەوا لە خانە نزیکەکانی بازاڕ و کەلوپەلەکانیان دادەبەزێن و بازرگانییان دەکرد.

هەستکردن بەگۆڕینی شێوازی ئەندازەیی و نەخش و نیگاری خانووبەرە دەگەڕێتەوە بۆ تێکەڵاوی و وەرگرتن و زانین و جوانکاری و چێژ، کە لە ئاکامی خێرا هاتووچۆ و تێکەڵبوونی خەڵک لەشارە جیا جیاکان پەیدا دەبێت، بەڵام ئەگەر گۆڕانەکە لەسەرەخۆ بوو، ئەوا هۆیەکەی دەگەڕێتەوە بۆ کەمی تێکەڵاوی و ئاڵوگۆڕی ئەزموون و شارەزایی یاخود نەبوونی ئەم پەیوەندییە بۆ ماوەیەکی دوورو درێژو چەندین نەوە.

هەندێ جار دەکرێ ئەو گۆڕانە بخەینە پاڵ دەرکەوتنی شێوازێکی فەرمی (رەسمی) یان گشتیی باو و لە ماوەیەکی گۆڕانی سیاسیدا، کە دەشێ هەندێ جار ئەم گۆڕانە سیاسییە کاتێکی زۆر بخایەنێ.

دەشێت ئەم خانووانەی سەردەمی ئەتابەکی لە قەڵاتدا لە خانووەکانی سەردەمی عوسمانی جیاوازبن. هەر یەک لەم خانووانە تایبەتمەندیی خۆی هەیە. نەوەیەکی جیاوازمان نیشان دەدات، کە ئەوانیش جیان لە خانووەکانی ئەم رۆژگارە.

لەم روانگە گشتییەوە دەکرێ لە هۆکارەکانی جوداکاری و لێکچوون لە نێوان خانووە کلتوورییەکانی قەڵاتی هەولێر و کەرکوک و خانووەکانی بەغدا و موسڵ بکۆڵینەوە.

ئەم پێودەرەش بۆ فراوانکردنی دیدە گشتییەکەیە بۆ سەرجەم خانووە کلتوورییەکان لەسەرجەم عێراقدا. هەروەها بۆ دۆزینەوەی پێوەرێکی جۆرەکییە بۆ دیاریکردن و پێوانەی کلتووریی بوونی خانووەکان لە کوردستانی عێراقدا، لەرێگای هەڵهێنجان لە لێکۆڵینەوەکانی بەردەست سەبارەت بە مۆرفۆلۆجیای کلتووری بیناسازی لە عێراقدا. هەروەها دروستکردنی خشتەیەکی بەراوردکاری لەنێوان خانووە کلتوورییەکان لە شار و شارۆچکەکانی کوردستانی عێراق بەپێی بەچاکزانی و بەراوردکاری لە دیاریکردنی ئادگارەکانی کەلتووری بیناسازی لە قەڵای هەولێردا، دواتر بەراوردکردنی لەگەڵ ئەوەی، کە لە خانووە کەلەپوورییەکانی ئامێدی و دهۆک و کۆیە و سلێمانی و شوێنەکانی دیکەدا هەیە، لەبەر ئەوەی ئەم دەروازەیە خستنەروویەکی پوختە، وردەکاری تێدا نییە تا ببێتە تێزێکی تەواوی زانستی، هەر چەندە بەپێی بەرنامە و پێوەری زانستی نووسراوە، بەڵام گرنگی بە بەراوردکردن لە نێوان ئادگارە گشتییەکانی کلتووری بیناسازی دەدا. سەرەتا هێلکارییەکان و دواتر ئەو بیناسازییەی بەپێی ئەم هێلکارییانە دروست کراوە، لەگەڵ دۆزینەوەی ئەندازەی رووکاری دەرەوە و ناوەوە و پەیوەندییەکانی هاوسێیەتی ئەندازەیی، ئەگەر ئەم دەستەواژەیە راست بێت، سەبارەت بەتوێژی بیناسازی تەواو بێت، چ قەڵات بێت یان گەڕەکێکی کۆنی تەواو. لە دوایە بەراوردکردنیان لەگەڵ یەک وەک شارێکی تەواو، بەتایبەتی لەرووی ئاسایش و پاراستنی شارەکە.

### پەیماننامەی کۆمەڵایەتی لە شاری کلتووریدا:

سەرەتا دەڵێین هەمیشە پەیماننامەیەکی کۆمەڵایەتی لە نێوان دانیشتوانی شار یان ناوچەیەکی کلتووریدا هەیە، ئەم پەیماننامەیەش بەڵێنێکە لەنێوان خەڵک نەنووسراوە، تاکەکەسان پابەندن پێی و کاروباری خۆیانی پێ رێک دەخەن یاخود لەرێگای کەسانێک، کەوا ئەم رێکخستنەیان لەئەستۆدایە.

بنەمای لەئەستۆگرتن، لەئاکامدا بەرپرسیارێتی هەڵگرتنە، بەرپرسیار بوونە لەنێوان لایەنە سوودمەندەکان لەم پەیماننامەیەدا، دواتر نەوە دوای نەوە دەگوازرێتەوە لەرێگای کۆمەڵە داب و نەریتێک و خووڕەوشتی کۆمەڵایەتی هاوبەشدا، ئەم داب و نەریتانەش کار لە رەفتاری گشتی کۆمەڵگا دەکەن، وەک پەیوەندی هاوسێیەتی، هاوکاری کۆمەڵایەتی و کۆمەکی ئابووری و پاراستنی یەکدەستی لە پاراستنی ئاسایشدا.

ئالێرەدا کولتووری بیناسازی بە ئاشکرایی دەکەوێتە بەر کاریگەری پەیماننامەی کۆمەڵایەتی، کە بۆ دابینکردنی ئەمن و ئاسایشێکی سەقامگیر لەنێوان خەڵک بەستراوە.

دەبینین مرۆڤ رۆژانە کارڕایی بۆ پاراستنی کۆڵان و ماڵەکەی دەکات، لەنامۆ یان...، بەڵام پاراستنی بنەڕەتی لەو کاروبارە بیناسازییە و دروستکردنەدایە، کە بۆ پاراستنی خانووەکە دەکرێت... دەرگاکانی چوونە ناوماڵ کەم دەکاتەوە، لە دەرەوەدڕا و هاتوچۆ ئاڵۆز دەکات و پەنجەرەکانی چینی زەمینی، کە دەڕوانێتە دەرەوە کەم دەکاتەوە.

لەگەڵ ئەمەشدا هاوبەشە لەداخستنی گەڕەک یان ناوچەکە، (لێرەدا قەڵا)یە بە شوورەیەکی دەرەوەی لەرێگای دەرگای سەرەکی کە لەرێگای پاسەوان و چەکەوە کۆنترۆڵ دەکرێت.

ئەم شوورانە دەشێ بەچەندان قۆناغ دروست کرابن یان بە یەک قۆناغ وەک لە بەغدا و موسڵ یان قەڵای کەرکوک، بەڵام دەشێ شێوازێکی نوێ بگرێتەبەر، کەوا ئەندازەیەکی باڵا هەڵکەوتانە دەنوێنێت، لێرەدا پەیماننامەی کۆمەڵایەتییە لەنێوان دانیشتواندا.. ئەو ماڵانەی لەسەر بەدەنی قەڵات دیواری دەرەوەیان بەیەکەوە نووساون و بەیەک بەرزایی و دەشێ بەهەمان ئەستووری تا لە دوا کایە شوورەیەکی بەرگری تەواو پێک بێنێت و قەڵات لەدەرەوە بپارێزێت.

گیانی هاوکاری بۆ دابینکردنی ئاسایش لەنێو خەڵکی قەڵاتی هەولێردا وای کردووە سیستەمێکی بەرگری تەواو بۆ قەڵات دروست بێت و بەبێ ئەوەی چاوەڕوانی فەرمانڕەوایەک بکەن، بۆ ئەوەی شوورەیەکی سەربەخۆ و جیا لەماڵەکان دروست بکات و بیپارێزێت، بەڵکو ئامادەگی خاوەن ماڵی سەر بەندی قەڵات بۆ خۆبەختکردن نیشان دەدات زیاتر لەوەی لەناوەوەدیە، لەبەر ئەوەی ماڵەکەی هەموو دەکەوێتە بەر هێرشی دەرەوە.

لە بەرامبەر ئەوەشدا لەرووی ژینگەوە دانیشتووی ماڵی سەربەندنی سوودمەند بوو، لەبەر ئەوەی دەیتوانی پەنجەرەی نهۆمی سەرەوە و تا نهۆمی خوارەوەش بکاتەوە و چێژ لە دیمەنی لادێ و دەوروبەری قەڵا ببینێت و تارادەیەک لە دیمەنی چیا دوورەکان.

هەست بەژینگەکردن وای کردووە پرۆسەی گواستنەوەی کارگە پیشەییەکانی وەک ئاسنگەری و تواندنەوە و گۆزەگەری، کە تارادەیەک هۆی پیسکارییە بۆ خوار قەڵات، شتێکی ئاسایی بێت و لەتەک ئەویشدا قەیسەری و خانی وەک تەواوکار دروست کردووە، کەچی بەڕێوەبردن و بازرگانی بچووک و پیشەی رۆژانەی سادە لەناو قەڵات ماونەتەوە.

### پەیوەندی نێوان ئەندازەی بیناسازی و ژینگە

لە موسڵ و کەرکوک لەبەر ئەوەی لە شوێنە بەردەڵانەکان نزیکن،خانووەکان لەبەرد دروست کراون. کەچی لە بەغداو هەولێر لە کەرپووچ دروست کراون، هەندێ جار لە قوڕ، وەک لە ناوەند و خوارووی عێراق هەیە.

هۆی بەکارهێنانی کەرپووچ لە هەولێردا ئاشکرایە، بەردەڵانەکان (مقالع) دوورن و قوڕی باش لەو دەشت و دەوری قەڵات زۆرە، سەرەڕای ئەوەی هەر لە چەرخی ئەتابەکییەوە کەرپووچ لە بنیاتنان و نەخشاندندا بەکارهاتووە، قەڵاتیش هەروا سازکرا، بە بەکارهێنانی کەرپووچ، دووانەیەکی جوان لە نەخش و نیگاری دیوارەکان دروست کرا و سوود لە نەخش و نیگاری ئیسلامی کۆن وەرگیرا، کە هەر لە سەردەمی ئیلخانی و ئەتابەکییەوە برەوی هەبووە، دواتریش لە بەژنی منارەی موزەفەرییە (چۆلی) بەدەردەکەوێت، وەک چۆن لەسەر دیوارەکانی دەرەوەی هەندێ خانووەکانی قەڵات دەردەکەوێت، سەرەڕای نەخشەکانی سەردیواری شوورەی قەڵات.

ئەم نەخشکارییە لەشێوازی



ئەندازەیی سادە پشت بەشێوازی بڕین و کەرتکردنی کەرپووچ دەبەستێت بەپشت بەستن بەقەوارە بچووکەکەی، کەرپووچ یان بەشێکی وەک لەڕووی دەرەوەی ماڵی یەعقوبی یان خانووی فەتاح چەلەبی دەباغ بەرچاو دەکەون.

ئەوەش شێوازێکە بە ئاسانی لە بەرد دەستەبەر نابێت، لەبەر ئەوە لەقەڵای کەرکوک بەکار نەهاتووە، تەنیا لەبەژنی منارەی مزگەوتی نەبی دانیال نەبێت. لەبەر ئەوە منارەکە بە کەرپووچ دروست کراوە. هەروەها منارەی مزگەوتی گەورە لە موسڵ کە بەمنارەی حەدبا (کووڕ)ی بەناوبانگە.

بەشی دووەم لە تێکەڵکردنی بیناسازی، خۆی لە بەکارهێنانی نەخش و نیگار لە ناوەوەی ماڵدایە، کە شێوەکانی نەخشەکاری بەسادەیی لە شێوەکانی نەخشەکاری بەبەرد نزیک دەبێتەوە، بەتایبەتی لەماڵ و خانووی کەلتووری موسڵ، لە بەکارهێنانی چوارچێوەی دەرگاو پەنجەرەکانی داتاشراو لە بەردی موسڵ، کە بە مەرمەری موسڵ ناسراوە، بۆ دالانێ کە دەڕوانێتە حەوشی ناوەوەی ماڵان، لە خانووەکانی هەولێر و موسڵ بە کارهاتووە.

ئەوەی بەرچاوە لەخانووە کلتوورییەکانی قەڵای هەولێر، لەڕووی بەکاربردنەوە دەبینێت لە نەخشەی ئەندازەیی خانووەکاندا وەرزی هاوین لە بەرچاو گیراوە و ژێرزەمین (سرداب)ی بۆ دروست کراوە، بەڵام هەمووی لە ژێر زەوی نییە، بەڵکو کەمێک بەرزترە لە ئاستی گۆڕەپانی خانووەکە و دەڕوانێتە حەوشە لەرێگای چەند پەنجەرەیەکی بچووک، کە بۆ ڕووناککردنەوە و هەوا گۆڕین بەکاردێت.

ئەم بەرزاییە بۆ ئەوە بەکار هاتووە، دالان و ڕۆگە و هەیوان و تارمەی لەسەر بکرێت لەسەر ژێرزەمینەکە.

ئەم حاڵەتە لە موسڵ بەرچاوە و پێی دەوترێت (ڕاهرێ: الرهرە) موسلاوییەکان (سرداب) لە ڕاهرێ جیادەکەنەوە، بەوەی ژێرزەمین (سرداب) هەمووی کەوتۆتە ژێر ئاستی گۆڕەپانی خانووەکە، کەچی ڕاهرێ بەشێکی کەمێک بەرزترە لەئاستی زەمینەی گۆڕەپانەکە.

دروستکردنی ژێرزەمین کەوا کەمێک بەرزتر بێت وای کردووە چینی یەکەم بەرزتر بێت لە زەمینەی حەوشەکە.

ئەوەش وا پێویست دەکات بە پەیژە بۆی سەرکەون، یەک پلە یان سێ پلە یان زۆرتر، بۆ ئەوەی بگەنە ژوورەکان کە دوای ڕۆگە (مەمەڕ) یان بێرایی (شرفە)یێکی نزم کە باسمان کرد.

ئەوەی لە موسڵ و هەولێر دەبینرێن، لەبەغدا نییە. لەوێ ژێرزەمین (سرداب) بەتەواوی لەژێر ئاستی زەویدا بنیات دەنرێت و هیچ پەنجەرەو کونی هەوا گۆڕی تێدا نییە.. بەڵام چەندان نموونەی دواتر ئەم حاڵەتەیان تێدا دیارە و پەنجەرەکانی ژێرزەمین دەڕوانە دەرەوەی ماڵ، دوای ئەوەی بە باخچە دەوردران، وەک کۆمەڵە خانووەکانی (کەسرە)، لە ئەعزەمییە یان خانووەکانی شەقامی حەیفای کەلتووری (خانووی سوێدی و زاهیر و چەندانی دیکە). ئەوەشیان وای کردووە، ژووری چینی زەمینی لە ئاستی حەوشەی ناوەندی خانوودا بێت و لەنموونە نوێییەکەدا بووەتە هۆی بەرزبوونەوەی خانووەکە هەمووی و بە پەیژە بۆی سەرکەون، بەڵام لەدەرەوە و لە بەردەم دەرگای سەرەکی، ئەوەش لە هەولێر و موسڵدا نییە. تەنیا لە چەند نموونەیەکی زۆر نوێ نەبێت.

لە کەرکوکدا جێگەی ژێر زەمینەکە کار لەقەوارەی خانووەکە ناکات، بەڵکو لەژێر زەوی لاباڵێکی خانووی گەورە (بیوک إیو) بزر دەبێت، لێرەدا سەرداب بۆ هەڵگرتن و کۆگا بەکاردێت، کەچی لە بەغدا و موسڵ و هەولێر بۆ دانیشتنی هاوینە بەکاردێت، بەتایبەتی لە نیوەڕۆدا پێش ئەوەی کۆگا بێت هەر چەندە وەک کۆگا بەکاردێت.

سرداب، ئاسایی گومبەتی هەیە، کە لە کەرپووچ یان لەبەرد دروست کراوە، بەڵام سردابەکانی سییەکان لە بەغداد بنمیچی ڕاستی هەبوو و شێلمان و کەرپووچی تێدا بەکارهاتبوو، ئەو جۆرەیان نوێیە و لەگەڵ هاتنی کەرەستەی بیناسازی ئەورووپی نوێ بۆ عێراق پەیدابوو.

### بنمیچ و دیوارەکان

هەولێر و بەغدا هاوبەشن لەوەی، کە بنمیچەکانیان بەبەرگی دارین ڕازاوەتەوە و نەخش و نیگاری ئەندازەیی جێ لە دەر (بارز)ی هەیە. لە بەغدادا ئەم بنمیچانە بەیەک ڕەنگ ڕەنگ کرابوون، لەگەڵ چەند بەشێک کە بە ئاوێنە پۆشراوە،

نەخش- و نیگاری ورد و جوانی هەیە.

لە هەولێردا بنمیچەکان رەنگاورەنگ بوون، زۆر جێ لەدەرەکانی پڕ کردبۆوە.

دیوارەکان لە هەولێر و کەرکوک و موسڵ و کۆیە بەچەندین نەخشەکاریی رووەکانی شێن رازاوەتەوە، کە دیوارەکانی ژوورەکان و هەیوانەکانی رازاندۆتەوە. دەشێ هەندێ رەنگی زەرد یان زێرینی- لە هەندێ حاڵەتی تایبەتی بۆ زەرد دەکرا- وەک لە دیوەخانی رەشید ئاغا لە قەڵات. دیواری بینایە گشتییەکانی وەک مزگەوت و گەرماوەکان، ئەوا نەخشەکاری بەردینی جێ لە دەر و ئەندازەیی هەیە، وەک بلێتی راست یان بازنەیی نەخشێنراون.

دەرگە و پەنجەرەکان لە موسڵ و هەولێر چون یەکن و نەخشەکاری و شێوەکانیان سادەترن، بەڵام هەموویان لە بەرد دروست کراون و لە بنجی ئیسلامی کۆندا هاوبەشن، لە تەرزی کە بە ئەتابەکی (بەسادییەوە) ناسراوە، کە پەیوەستە بە بیناسازی ئەییوبی لە وڵاتی شام و میسر بڵاوبۆتەوە.

موسڵ و هەولێر هاوبەشن لەشێوەی کوڵەکەکان، کە زۆربەی جاران کەرتی چوارینەییە، کەچی کوڵەکەکان لە کەرکوک کەرتی لوولەیی بازنەیین و نزمترن، بەوەش پتەوییی پێ بەخشیوە، کەچی لە هەولێر و موسڵ بەهۆی بەرزییەکەی جوانییەکی پێ بەخشیون، هەندێ نموونەی کوڵەکە هەن لوولەیی بە گەچ داتاشراون، لە شێوەی نەخشەکاری رووەکی دەرەوەی تاجی داوە هەیە، گوێەکییە و دالآنی چینی سەرەوە دەرازێنێتەوە، وەک ماڵی شێخ جەلیل ئەفەندی، کە لە هونەرە دەگمەنەکانە لەبیناسازی خانووە کلتوورییەکان لەعێراقدا.

## هێلکاری بیناسازی

خانووەکانی هەولێر لە هێلکاریی بیناسازیدا لە ماڵەکانی موسڵ دەچێ، هەر چەندە تایبەتمەندی خۆی هەیە لە زۆر وردەکاریدا، بەنموونە هەیوان کە لەشێوەی بیناسازی موسڵ جیایە. لێرەدا وەک لە ماڵی شێخ جەمیلە ئەفەندی دیارە، رۆینگەیەک پێکدێنێت لە نێوان ژوورەکانی لای چەپ و راستی و بەرزی یەک نهۆم، کەچی لە موسڵدا وەک لە ماڵی توتنچی، کەوا بە بەرزی دوو چین بەرز دەبێتەوە و هەیوانی دانیشتن پێکدێنێت، کە دەڕوانێتە حەوشەی ماڵەکە، لە بەغدادا لە بری هەیوان تارمەی دوای ئەو، کە ئاسایی لەپێشەوەی گۆڕەپانی ماڵەکەدا دەبێت و هەندێ جار بەرامبەر دەروازەی ماڵەکە دەبێت، دەشێ دواتر بگاتە سردابەکەش.

ژووری خزمەتگوزاری و چێشتخانە و ژووری ئازووقە و ژوور و کۆگاش، کە لە خزمەتی ژیانی رۆژانەی ماڵەوەدان، لە دوای دەروازەی سەرەکییەوە دێت، کەوا لە رووی بیناسازییەوە وا دروست کراوە کەس نەتوانێت لە دەرەوە و، سەر بەسەریدا دابگرن لە وەشدا وەک خانووەکانی موسڵ وان و هەموویان لە ئاستی زەمینی گۆڕەپانی ناوەوەدان (حەوشە)، ژووری جێنشین و دانیشتن بەرزاییەکان لەسەر سردابەکە و بەچەند پایەیەک بەرزتر لە گۆڕەپانەکە.

لە کەرکوکدا سیستەمی یەکەی بیناسازی سێ بەش (ثری ثارتایت) پەیڕەو دەکرێت، کە لەبیناسازی ئیسلامیدا بەتەرزی (حیری) ناسراوە، کە ئاسایی باڵی سەرەکی پێکدێنێت لە گەورە ماڵێکدا (بیوک ئیو)، کە پێکدێت لە هەیوانێکی گەورەی گومبەتجار بەتەواوی وەک هەیوان نەکراوەتەوە بەسەر حەوشەدا، بەڵکو لەرێگای دەزگایەکی گەورەوە یان بچووکەوە پێوە بەستراوە کە دەگاتە والآییەکی لە پێشەوەدا هەیوانەکەی بەرانبەر، لە هەردوو لاشدا تەریب لەگەڵ هەیوانەکە چاوەی بچووک هەن باڵێکی تایبەت پێکدێنێت لەماڵدا، کەچی ژووری خزمەتگوزاری و کۆگاو ژووری پێشوازی فەرمی لەدەرەوەی ماڵی گەورەدا دەبن لە کەنار گۆڕەپانی ناوەڕاستەوە.

هەر چەندە وێرانبوون و تێکدانی خانووەکانی قەڵای هەولێری گرتۆتەوە و هۆیەکانی لای هەموان ئاشکران. هێشتا قەڵات پێکهاتەی کەلتووری خۆی پاراستووە، بە روون و ئاشکراتر گەر بەراوردی بکەین لەگەڵ کەرکوک، یان هەتا بەغدا و ووسڵیش. لەبەر ئەوە ئەرکی سەر شانمانە خێرا زانستییانە ئەم پێکهاتەیە بەدیکۆمێنت بکرێت و زانستییانەو بیناسازییانەو شوێنەوارناسییانەی ورد و خێرا، هەروەها پێوەری کەلتووری تیایدا دیاربکرێت و شێوازی بەکارهێنانی خانووەکانی دیاری بکرێت.

# هونەری تەلارسازی قەڵای هەولێر

سەنعان هاشم

ئەگەر بمانەوێت باس لە خاسیەت و تایبەتمەندی و جۆر و رەگەزە هونەرییەكانی بیناسازی هەولێر بكەین، ئەوا بێگومان سەرنج راكێشترین و گرنگترین نموونەی بۆچوونەكانمان قەڵای دێرینی هەولێر دەبێت... لەبەر ئەوەی (قەڵای هەولێر) بنەمایەكی زیندووی مێژوو و شارستانیەتی ئەم شارە پێك دەهێنێت، هەر لە باری ئابووری و سیاسی و ئایینی و كۆمەڵایەتییەوە تا دەگاتە باری هونەری و چۆنیەتی پێكهاتەكانی تەلارسازی ناوچەكە.

دەبێ ئەوەشمان لەیاد بێت كەوا بیناسازی بە یەكێك لە گرنگترین و زیندووترین شێوە و بەشەكانی هونەرە جوانەكان دەژمێردرێ و پەیوەندییەكی تۆكمە و هاوسۆزییەكی بەردەوامیشی لەگەڵ وێنەكێشان و پەیكەرسازیدا هەیە، ئەو پەیوەندییەش لە زۆربەی خاڵەكانی وەك (خەیاڵ و ئەندێشەی بەربڵاو) و (هەستی داهێنان و جوانسازی) و (یەكسانی لە بنیاتنان) و (هاوسەنگی) و (رەنگ و هێڵ و بۆشایی)دا بە روونی یەك دەگرێتەوە و دەقاودەق هیچ جیاوازییەكیان تێدا رەچاو ناكرێ.

بەڵام هەرچی بیناسازییە بە هەر چوار دەوروكەیەوە پەیوەستە، كە رەنگە ئەم خاسیەتە لە هونەرەكانی دیكەدا دووبارە نەبێتەوە. لە لایەكی دیكەوە و بە شێوەیەكی گشتی، پەیوەندی بە (دیزاین)، نەخشە رێژی، (تصمیم)ەوە هەیە و بیناسازی هەرگیز لەو نەخشەسازییە دانابڕێ، كە دەبێتە هۆی مەیسەركردنی سیما (جوانپۆشییەكەی)، جا ئەو جوانپۆشییەی هونەری بیناسازی پەیوەندی بە رەگەزە هەمە جۆرەكانی خودی هونەرەكەوە هەیە كە هونەری نەخشەسازی (بینا گەری)یە و ئەو رەگەزانەش هەریەكە و لە مەدار و رەهەندەكانی خۆیان گرنگی خۆیان هەیە و خاسییەت و ماهیەتی هونەری و جۆرایەتی خۆیان دەسەلمێنن، ئەم رەگەزانەش بریتین لە (هێڵ، روانگە، شێوە، بارستە، قەبارە، رووناكی، رەنگ)، ئەم حەوت بنەمایە، گرنگییەكانی بیناسازیمان بۆ روون دەكەنەوە، جا ئەوەی لێرەدا گرنگە و مەبەستمانە باسی بكەین، تیراز و چۆنیەتی جۆری دارشتنی نەخشەیە لە بیناسازی هەولێر بە گشتی و قەڵای هەولێر بە تایبەتی.

### گەرانەوەیەك بۆ مێژوو

بێگومان ئەگەر لە مێژووی هەولێر ورد ببینەوە (كە هەڵبەتە زیاتر سەرنج دەدەینە قەڵات)، ئەوا دەبینین بە درێژایی مێژوو چەندەها حوكمرانی و میرنشین و دەسەڵاتی بەخۆیەوە بینیوە، جا ئەم دەسەڵاتانەش هەریەكە و بە پێی مەزهەب و بیر و بۆچوونی خۆیان جۆری خانوو و نەخشەی جیاوازیان لەم قەڵایەدا دروست كردووە.

هەروەها ئەوەش جێگای ئاماژە كردنە، هەروەك لە پێشتریش گوتمان ئەم (قەڵا)یە كە لەسەر ئەم گردەیە و سەختی و تۆكمەیی خانوو و تەلارەكانیشی مایەی سەرنجە، هەروەك گەرۆكی ناسراو (قەزوینی)، كە زانایەكی سەردەمی (سەدەی حەوتەمی كۆچی و سێزدەمینی زایینە)، دەڵێت: "قەڵای هەولێر هێندە سەخت و خۆراگرە لەشكری تەتەرە مەغۆلەكانی رەت كردەوە و نەیانتوانی داگیری بكەن".

(شەمسەددین سامی) مێژوونووسیش دەڵێت: "كۆنترین سەنگەری سەختە". قەڵای هەولێر مەڵبەندی دامودەزگاكانی میرە

(ئەتابەکییەکان) بووە، سەرا و بەندیخانەشی تێدا بووە، بەندیخانەکەش بەناوبانگ بوو لە سالّی (٦٣٧ک - ١٢٣٩ز) زانای بەناوبانگی ئەم شارە (ئیبن ئەلمستەوفی) ئەم بەندیخانەیەی بە بەندیخانەی (حەلەبی - حلب) ناو دەبات... لە هەندێ نووسراویشدا ئەوەمان بۆ روون دەبێتەوە، کە (ژێر زەمین و مەغارە) لە ژێر خانووەکانی قەلآدا هەبووە، کە تاکو ئێستاش هەر ماوە و بۆ کاتی شەڕ و تەنگانە و بە جۆرەها مەبەست بەکاریان هێناوە، جگە لەم نووسراوانەش گەلێ لە تەمەنداران (بە ژن و پیاو) ئاماژە بۆ ئەم ژێر زەمین و مەغارە و نەخش و نیگاری خانووەکانی دەوڵەمەندەکانی گەڕەکی سەرای قەلآ دەکەن، کە زۆربەی هەرە زۆری ئەم نەخش و نیگارانە ئێستاش ماون، مایەی سەلماندنی ئەو رایانەی سەرەوەن... جا ئەم نەخش و نیگارانەش، کە لە بیناسازی (قەلآ)دا هەیە دەچێتە خانەی کلتووری شارستانی ئەم شارە و بە سەرچاوەیەکی گرنگی کەلەپووری نەتەوایەتی خەڵکەکەی لە قەڵەم دەدرێت.

**تایبەتمەندییەکانی**
**نەخشەی بیناسازی لە قەلآی هەولێر**

خانووی قەلآی هەولێر هەروەک سەرجەم خانوو و بیناسازی کوردی تایبەتمەندی خۆی هەیە و زۆربەی هەرە زۆری خانووەکانی قەلآی هەولێر بە خشتی قوری سوور کراوە، دروست کراوە و رێکخراوە، ئەم خشتانەی کە ئێمە باسی لێوە دەکەین لە رووی رەنگ و بارستە و

رووناکییەوە جوانییەکی تایبەتی هەیە و چێژێکی بەردەوامیش بە چاو دەبەخشێ... ئەمە جگە لەوەی کە رەنگەکەی بۆ شێوەکانی دەرگا و پەنجەرە و رەنگەکانی زۆر شیاوە و هێزێکی جوانسازی ئەوتۆ دەبەخشێت، کە مرۆڤ رۆحی تێ ئارام دەگرێ.

خانووەکانی قەلآت شێوەی چوارگۆشە و لاکێشەیان وەرگرتووە و هەندێکی دیکەش بەرەو سەرەوە درێژ بۆتەوە و سەقفەکانی بەرز و بنمیچی خانووەکان بە جۆرەها زەخرەفەی (ئەندازەیی و رووەکی) رازاوەتەوە، کە مرۆڤ سەرسام دەکات، فەزای قەلآی هەولێر لە لایەکی چیاکان و لە لاکەی دیکە ئاسمانی شین دەبن بە (باکگراوند) بۆی، ئەمەیان واتە فەزا و رەنگی خانووەکان زۆرجار هاوسەنگییەکی ئیستاتیکی وایان خولقاندووە کە لە ناخەوە هەستمانی بزواند، لێرەدا ئەوەشمان بۆ روون دەبێتەوە، کە خانووەکانی قەلآت وەکو کوتلەیەکی سەربەخۆ دەتوانێ پێناسەی خۆیان بۆ بسەلمێنێ... هاوسەنگی لە بیناسازی قەلآتدا یەکێکە لەو خاڵە گرنگ و سەرنجڕاکێشانەی لە بینینماندا دەبێ رەچاو بکرێ... دەرگا و پەنجەرە لە بیناسازی خانووەکانی قەلآدا گرنگی خۆی هەیە و تایبەتمەندی و خاسیەتی جیاوازی هەیە، بە بەراورد لەگەلآ خانووی شوێنەکانی دیکە... لە دەرگا و پەنجەرەی قەلآتدا گرنگی بە جۆرێک لە زەخرەفەی (رووەکی) دەدرێت، بەو سیفەتەی خۆی و دەوروبەری قەلآت گژوگیا و گەنم و

جۆی زۆری لێ راوە، خاکێکی کشتوکاڵی بە پیتی هەبووە.

لەسەر پەنجەرەکانی زەخرەفەیەکی بازنەیی و نیوە بازنەیی هەیە، کە بە شێوەی پیتی (S)ی ئینگلیزی یان دوو (قاز)ی رووبەڕوو لەگەلآ یەکدا خراوەتە سەر، هەندێک رایان وایە کە گوایە ئەوە دەلیل بۆ ئەوینداری و خۆشەویستییە، هەندێکیش باس لەوە دەکەن، کە گوایە ئەمە رووەکی لاولاوە و بەسەر پەنجەرەکاندا هاتووە.

لە زۆربەی بەشی سەرەوەی دەرگا و پەنجەرەکان وێنەی نیوە (رۆژ)ێک بە شێوە زەخرەفییەکەی نەخشێنراوە، کە رەنگە ئەویش بۆ سەردەمەکانی کۆن و مێژوویی شارستانییەتەکان و بیر و ئایینی ئەو دەسەلآتانە بگەڕێتەوە، کە حوکمڕانی ئەو شارەیان کردووە. بە هەر حالّ ئەم جۆرە تایبەتمەندییە سەرەکییانەی کە باسمان کرد کەمێکە لەو هەموو تیراز و جۆری خشت و بڕینی دارەکان و تایبەتمەندی زەخرەفە (ئەندازەیی و رووناکی و یەکسانی کوتلەکان) کە قەلآی شارستانی هەولێر پێک دەهێنن.

**سەرچاوەکان**

* هەولێرم وا دیوە و بیستووە/ بەرگی دووەم/ مەولود قادر بێخالّی/ ١٩٩٧.
* گۆڤاری رامان/ ژمارە ١، رەهەندەکانی گوزارشت لە بیناسازی کوردیدا/ محەمەد هاشم.
* مبادئ الفن والعمارة/ شيرين أحمد شيرزاد/ بغداد/ ١٩٨٦.



# سیمای جوانی خانووە کەلەپوورییەکانی قەڵای هەولێر

دکتۆر حەمید محەمەد حەسەن ئەلدەراجی

مێژووی شارستانییەت و نیشتەجێبوون لە قەڵای هەولێردا، دێرینترین سەردەمی مێژووییە. شوێنەوار ناسەکان بڕوایان وایە لەوانەیە لەسەر گردێکی دەستکرد، دروست کرابێ قەڵای هەولێر بەدرێژایی چەرخە مێژووییەکانەوە تاوەکو ئیمڕۆ، بەزیندوویی و ئاوەدانی ماوەتەوە، پێگەیەکی نیشتەجێی و قەڵایەکی بەرگری بووە. لووتکەی سەختی هەبووە، کە بەرامبەر بەهێرشی بێگانەکان بەتایبەتی مەغۆلییەکان وەستاوەتەوە،، درێژایی ئەو سەردەمانەی دوای داگیرکردنی مەغۆلییەکانیش ساڵی (١٢٥٨) هەر بەقەڵایەکی بەهێز ماوەتەوە و شیاوی بەرگری لەخۆکردن بووە. دوا هەواڵی بەرگریکردنی لەخۆی وەک پێگەیەکی بەرگری سەربازی، لەکاتی داگیرکردنی نادرشا بۆ هەولێر لە ساڵی (١٧٣٢)د، کە بۆ ماوەی ٦٠ ڕۆژ گەمارۆی دا پێش ئەوەی داگیری بکات. یەک لە گەشتیارە بیانییەکان

کە لە ساڵی (١٧٦٦) سەردانی هەولێر دەکات دەڵێت: لە گردێکی بەرز پێکهاتووەو لە ڕۆخەکەی و لەناوەوەی بەیەکگرتوویی، کۆمەڵێک خانووی کۆنی بەرز کۆبۆتەوە، کەس ناتوانێت بەناویاندا ڕەت ببێت و دزە بکات بۆ ناوەوەی ئەم قەڵایە، تەنیا لەدەرگا سەرەکییەکەی نەبێت.

بەم خانووە بەرزانە دەوترێت (سەربەدەن) ئەویش بەمەبەستی پاراستن و ڕێگرتن لە پەلاماردان و ڕێگانەدان بەدزەکردن بۆ ناو ئەم قەڵا بەرگریکارە سەختە. ئەم قەڵایە بەدوا هێڵی بەرگری دوژمێردرا، چونکە چاڵ و پشتێنەیەکی بەهێز لە دەوروبەری شار هەبوو، بەمەبەستی پاراستنی ئەو خەڵکەی لە بەشی خوارەوەی قەڵاکە دەژیان.

قەڵاو شاری هەولێر کەوتوونەتە ناوەڕاستی دەشتێکی پان و بەرین، چوون بۆ ناو قەڵاکە تەنیا بەڕێگای دوو دەرگای کۆنەوە دەکرێ، هەروەها لە ڕێگای دەرگای سێیەمەوە کە نزیکەی پێش (٤٠) ساڵ کراوەتەوەو کەوتۆتە لای باکوورەوە، دەرگای سەرەکی قەڵا کەوتۆتە لای خوارەوە، وەک دیدگایەکی مەزن وایە دیمەنێکی وا دەبەخشێت کە زۆر سەخت بێت. ماوەیەک وەک خانووی حکومەت و خوێندنگاو، نەخۆشخانەو، خانووی پەککەوتەکان، پێش دەوروبەری (٤٥) ساڵ لەبەر مەترسی داڕمانی رووخێندراوە[٣]. بەڵام دەرگا کۆنەکەی دیکەی کەوتۆتە لای ڕۆژهەڵاتەوە، لە ساڵی (١٩٧٩) دەرگایەکی دیکەی خوارووی نوێی بۆ دروست کراوە کە لەلایەن راوێژکاری عێراقییەوە



نەخشەی بۆ دارێژراوەو لە شوێن ئەو دەرگا کۆنەی خوارووی قەڵاکەی ساڵی (١٨٦٠) دروست کرابوو و لە ساڵی (١٩٦٠) رووخێنرا[٤].

ئێستا قەڵای هەولێر کەوتۆتە ناو جەرگەی شاری هەولێر، لە سێ گەڕەک پێکهاتووە کە بریتین لە: گەڕەکی (سەرا)، کە کەوتۆتە لای ڕۆژهەڵات، گەڕەکی (تۆپخانە) کەوتۆتە لای خوارووی ڕۆژئاوا، گەڕەکی (تەکیە) کەوتۆتە لای باکووری ڕۆژئاوا[٥].

قەڵا ئێستا لەکۆمەڵێک خانووی دێرین کە زۆربەیان داڕماون پێکهاتووە. بۆ ئەوەی کە شوێنپەنجە دێرینییەکەی قەڵا گەشەی پێبدرێت، دەزگای گشتی بۆ شوێنەوارو کەلتوور لە ساڵی (١٩٧٨ز)دوە خانوو لە قەڵای هەولێر بە موڵکداری (٣٢) کردووە، ئەم دەزگایە دەستی کردووە بەپینەو پارێزو چاککردنەوەی گەرماوی قەڵاو گەڕاندنەوەی بۆ سەر ئەو بارەی کە لەسەری بووە، چەندین خانووی دێرینی دیکەش، کە لەگەڕەکی (سەرای) گەڕەکە هەرە دێرینەکانی قەڵاش بەر ئەم هەڵمەتە کەوتووە. کارکردن لەم بوارەدا بەدرێژایی ساڵەکانی (١٩٨١، ١٩٨٢، ١٩٨٣) درێژەی هەبوو. لەساڵی (١٩٨٤)یش چەند خانوویەکی دیکە بەر ئەم هەڵمەتە کەوتن. خانووی سەید جەمیل ئەفەندی (بیت ئەلتیبان)، لەگەڵ چەند خانوویێکی بچووکی دیکە چاک کرایەوە. هەروەها دوو لا دیوار بۆ قەڵا تەواو کران، سەرەڕای ئەوەی ئەم دەزگایە چەند کارێکی چاککردنەوەی دیکەی ئەنجام دا، وەک نوێکردنەوەی شەقام لە قەڵاو کاری هەندێ نەخش و نیگار، کارکردن لە ساڵەکانی ١٩٨٥ و ١٩٨٦ بەردەوام بوو، ئەوە بوو دووبارە کەوانە روخامییەکان و داپۆشینی رووەکانی ژێر زەمینەکەی خانووی شەهاب چەلەبی تەواو کران. دیواری ژێر زەمینەکەی خانووی محەمەد فەتاح چەلەبی هەڵچندراو کۆڵەگەکانی خانووەکەش



دروستکرانەوە. هەڵکۆڵینی پێویست لە خانووەکەی یەعقوبی[٦] ئەنجامدرا. بۆ زانینیش کۆنترین خانووش لەم خانووانەی ئاماژەی بۆ کرا لە کۆتایی سەدەی ١٩ و سەرەتای سەدەی ٢٠ دروست کراون. کۆمەڵە خانوویێکی لەشێوازی دەستە خانوویێکی بازنەیی دروست کراون بەرزییەکانیان نزیکەی (٢٥ مەتر) لەسەر ئاستی زەوی دەوروبەریان و (٤١٥) مەتر لەسەر ئاستی رووی دەریا. ئەو رووبەرەی دەیانگرتەوە، بریتین لە: (١٩٠، ١٠٢ مەتر چوار گۆشە) تەنیشتەکانیان لار دەبنەوە بەشێوازێکی هونەری کەمێک لار و دەکەونە ناو جەرگەی شاری هەولێرو زۆربەی خانووە دێرینەکان شێوازێکی تەلارسازی دیاریان پێوەیە، کە لێک وەشاوەو شیاو و لێکچوون[٧].

خانووەکانی قەڵاتی هەولێر بەپێی نموونەیەکی بیناسازی کە لە میسۆپۆتامیا لەدێر زەمانەوە ناسراون دروست کراون. ئەم شێوازە هێڵی بنچینەییەکەی نیشتەجێی لەخۆوە دەگرێت کە پێکهاتووە لە هەیوانێک لە هەردوو لای چەپ و راستەوە بە بەرد هەڵچندراون و دەتوانرێت لەپێتر لەلایەک ئەم هەیوانە دووبارە دروست بکرێتەوە. ئەم ژوورو هەیوانانە بەسەر حەوشێکی واڵادا دەڕوانێت. ئەم شێوازە بەشێوازی (حیری و کەمێن) ناسراوە[٨]. ئەم شێوازە لەدروستکردن بۆ وڵاتانی دیکە لەجیهانی عەرەب و ئیسلامی بڵاوبۆتەوە. وادیارە ئەم



شێوازە لێوەشاوەی سروشتی ئەم ناوچەیە بووەو تائێستاش زۆر لە خانووی ئاسایی لە ناوەڕاست و خوارووی عێراق و کوردستانیش سەرەڕای جیاوازی ئەو کەرستانەی کە لە دروستکردنی بەکارهاتووە لەسەری دەڕۆن.

### رەگەزە جوانەکانی خانووەکانی قەڵای هەولێر:

ئەو رەگەزە جوانانەی لە جوانکاری و رازاندنەوەی خانووە دێرینەکانی قەڵای هەولێر بەکارهاتوون، درێژبۆوەی ئەو رەگەزە بنچینەییانەیە کە لە کۆشک و تەلاری رۆژهەڵاتی و عەرەبی ئیسلامی بەشێوەیەکی گشتی بەدی دەکرێت. بەتایبەتی خۆی دەدۆزێتەوە لە:

١- زەخرەفە بەشێوازە شینکایی و ئەندازەیی و کەسییەکانییەوە.
٢- رێنووسی عەرەبی لە جوانکاری رووەکانی پێشەوەو بەرزاییەکان و دیوارو داڵانەکان بەکارهاتووە.
٣- دینگە لە دار دروستکراوەکان بەنەخش و نیگارە رازاوەکانییەوە بەشێوازە زەخرەفەییە چین چینەکانی کە لەکۆڵەگە دارینە بەغدابییەکان (ئەلدەککات). پێکدەچن.
٤- ئەو نەخش و نیگارە دارین و گەچییانەی لە شوێنە تایبەتییەکانی خانووەکان بەمەبەستی جوانکاری و بیناسازی بەکارهاتوون.
٥- گرێ و کەوانە دێرینەکان لە قەڵای هەولێر جۆراو جۆرن.

روخام و گەچ وەک دوو پێکهێنی سەرەکی بەکار هاتوون.
٦- دالآن و هەیوانەکان زۆر بەکارهاتووەو لەزۆربەی ماڵەکاندا بەدی دەکرێن.
٧- ئەو گەچەی کە لەم خانووانەی قەڵاکە بەکار هاتووە، لە شوێنەکانی دیکەو شارەکانی دیکەی کوردستان جیایە. هۆکارەکەشی بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە ئەم گەچە بەکارهاتووە لە دەشتێکی خۆڵ نەرم بەدەست هاتووەو دەتوانرێت کەرپووچێکی ئەوتۆی لێ دروست بکرێت، کە بەشێوەیەکی سەرەکی لە کۆشک و خانووەکان بەکارهاتووە.
٨- بەکارهێنانی مەرمەڕ بۆ جوانکاری لە رووکەشەکانی خانووە دێرینەکان و بەکارهێنانی وەک چوارچێوەی دەرگاو پەنجەرەکان و دینگەی جۆراو جۆر
٩- خانووەکانی قەڵای هەولێر کە دینگەی لەدار دروستکراوی ناوقەد لوولەییان تێدا بەکارهاتووە، بەچینێک گەچ داپۆشراوەو بەبزماری ئاسنی داکوتراوەو شێوازی جۆراو جۆری وەرگرتووە. وەک چوارگۆشەو لاکێشەو لوولەیی. کاری زەخرەفی جۆراو جۆری لەسەر دروست کراوە. یان لەشێوەی پەڕی "ئەکانتس" سەرەنجام دینگەکان شێوەیەکی زۆر نایاب و شکۆداریان وەرگرتووە و ئەمەش سیمایەکی تایبەتی بەم خانووانە بەخشیوە.
ئەم جۆرە دینگانە نە لەباکوور و نە لەباشوور و نە لەناوەڕاستی عێراق بەدی نەکراوە. لەم بڕوایەداین کە ئەم کارە کاریگەری بێزنتییەکان بێت کە عوسمانییەکان بۆ میسۆپۆتامیایان بەتایبەتی، بۆ قەڵای هەولێر هاوردووە.

**تایبەتمەندییە دێرینەکانی خانووەکانی قەڵای هەولێر:**

١- خانووەکان بەکۆڵانی تەسک دەورەدراون، لێرەدا بەو رێگاو کۆڵانە تەسکانە دەچن، کە لە شارە دێرینەکانی رۆژهەڵات، بەتایبەتی شاری بەغدا بەدی دەکرێن. هۆکارەکەشی بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە ئامرازەکانی گواستنەوەی پشتی بەئاژەڵ و (عەرەبانە)ی بچووک دەبەست. هەروەها قەڵا لەبەر کەمی زەوی ماوەی ئەوە نادا جادە و کۆڵانی فراوان بێت.
٢- ئەو دەرگایانەی کە دەڕواننە سەر رێگاو کۆڵانەکانی ناو قەڵا بەپێی کۆنیی تەمەنیان لەسەر شێوازی جیا جیا لەدار دروست کراون، هەرد کۆنەکانیان بە بزماری کۆتاچەماوەکان رازاونەتەوە، کە بەمەبەستی جێگیرکردنی پارچە دارو رازاندنەوەیان بەکارهاتووە. نوێیەکانیان لەشێوەی دوو دەرییە.
٣- رووەکانی ناوەوەی خانوو لە گرنگیدان بەدەرەوەی پترە.
دیوارەکانی دەرەوە سادەیەو دوورە لە جوانکاری پێویست و پەنجەرەی زۆر کەمە. تەنیا چەند خانوویێکی مەزن نەبێت، کە لە نهۆمی سەرەوەیاندا چخمەیان بۆ دروست کردووە.
٤- لە ناوەڕاستی خانووەکان گۆڕەپانێکی گەورە هەیە کە ئەم شێوازە لە دروستکردن بۆ چەرخە هەرە کۆنەکان دەگەڕێتەوە. لەرێگای ئەم حەوشە گەورانەدا بەشەو و بەرۆژ ئاسمان دیارە. لە هەمان کاتدا تاکە رێگایە بۆ گەیشتنی هەواو رووناکی و رێکخەری پلەی گەرمایی ماڵەکەیە بەهاوین و بەزستان. دیارە کە ئەم نەخشەسازییە بەسەر نەخشەسازی ماڵان لەعێراق دا بووە بە باو[9]. تەواوی دەرگای ژوورەکان بەسەر حەوشەکەدا کراوەتەوە، سەرچاوەی رووناکی لە ژوورەکانی دەکات و هەواکەیان بەشێوەی سروشتی دەگۆڕێ[10].
حەوشەی ماڵ تەواوی کارە خزمەتگوزارییەکانی ماڵی تیا ئەنجامدەدرا[11].
ئەوەی پتر حەوشەی ماڵە کەلتوورییەکان جوان دەکات ئەو باخچە بچووکەیە، کە لەناوەڕاستی حەوشەکە بنیات دەنرا. ئەم جۆرە باخچانە شتێکی سروشتییە لە کوردستان. هەندێک جار لە ناوەڕاستی حەوشەکەدا حەوزێکی ئاو دروست دەکرا بە شێوەی جیا جیای وەک چوارگۆشە، بازنەیی، هێلکەیی، هەشت لا، بەئاوەڕۆی بەردین، ئاوی بۆ دابین دەکرا. هەندێ لەم خانووانە دوو حەوشەی هەبووە، یەکێکیان گەورە بووە.
٥- بەکارهێنانی دار بۆ داپۆشینی ساپیتەی ژوورەکان و دالانەکانی ماڵەکان و هەیوانەکان و

دروستکردنی دەرگاو پەنجەرەو دینگە داربنەکان. کە بە (کۆتەرە) ناسرابوو.

٦- بەکارهێنانی گەچ و (خشت) بۆ دروستکردنی خانوو و زەخرەفەکاری.

٧- بەکارهێنانی بەردی مەڕ مەڕ بۆ ڕووەکانی ناوەوەو کاری زەخرەفەی ڕووەکی و ئەندازەیی و هەڵێنانی ستوون و گرێی مەڕمەڕی بە شێوازی جیا جیاو قەبارەی جیا جیا. ئەم کەرەستانەش هەمووی لە کوردستان زۆرە و بە ئاسانی دەست دەکەوێ.

### شێوازی کوردستان و باکووری عێراق:

ئەم شێوازە بەتەلاری پەیڕەوکراو لە موسڵ و هەولێر کەرکوک و بەتایبەتی بەسەر تەواوی ناوچەی (کوردستان) دا زاڵە[١٢] گومان لەوەدا نییە، کە جیاوازی لە شێوازی کارکردن لەم هەرێمەدا لەوردەکارییەکان فراوانترە لەو جیاوازییەی کە بە شێوازی بەغدادی لەناوەڕاست و خوارووی عێراق کاری لەسەر کراوە، شێوازی لە گەچ دروستکراوی تەلارەکان کە لەبەرینایی باکووری فورات بەتایبەتی ناوچەی تکریت و سامەرا هەیە. ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ هۆکاری سروشتی و مێژوویی و شارستانی. دەتوانین بڵێین ئەو شێوازەی کە لە موسڵ کاری لەسەر کراوە شێوازی کاری (جیری) ڕەسەنە.

شێوازی کاری بیناسازی لە هەردوو قەڵای هەولێر و کەرکوک کار لێککردنیان بەشێوەیەکی کاراتر بووە لەگەڵ ئەو کاریگەرییانەی کە لە سەردەمی عوسمانییەکانەوە پەیڕەو کراون. بۆ نموونە زۆری ڕێژەی بەکارهێنانی خشتی بچووک و بەکارهێنانی بوارێکی ڕەنگی بەرفراوان لە زەخرەفەکاندا[١٣].

### تایبەتمەندییە جوانکارییەکان لە خانووە کەلەپوورییەکانی قەڵای هەولێری مێژوویدا:

#### ١- دیمەنی دەرەوە:

دیمەنی دەرەوەی خانووە کەلەپوورییەکان لەسەر بنەمای پارچە بیناسازی توندو تۆڵ پێکهاتوون، کە (خشت)ی تیا بەکاردێت. قورسایی ئەم پارچە بیناسازییانەی کە لەبەشی سەرەوەی خانووەکاندا دروست کراوە، بەهۆی ئەو زەخرەفە سازییەوەیە کە لەنێویدا هەڵکەندراوە. ئەو تاقانەی کە خانووەکانی بەیەکەوە گرێداوە، لەدوو لای کۆڵان و ڕێگاکان کەشێکی ئارامی و نەوایی بەخانووبەرەو دەوروبەری بەخشیوە.

#### ٢- داڵان و ڕێڕەوی ژوورەکان:

داڵان لە خانووە هەرە کۆنەکانەوە هەبووەو بەشێک بووە لە پێکهاتەی خانووەکان، بەپێی پێگەو فراوانی و ئەو ڕۆڵەی کە داڵانەکە جیاوازی هەبووە. هەروەها بەپێی ئەو کەرپووچ و پێکهاتەیەی کە خانووەکەی لێ دروست بووە جیاوازی هەبووە. ئینجا دۆخی سروشتی و پەیوەندیی کۆمەڵایەتی و هەڵکەوتەی خانووەکە سەرەڕای باری ئابووری خاوەنی خانووەکە ڕۆڵی خۆیان هەبووە[١٤].

داڵان لە خانووی شوێنەوارەکاندا لە کراوەیەک پێکهاتووە لە ناوەڕاستی یان لایەکی ڕووی دەرەوە. دەرگایەکی داری کۆن دایخستووەو (یەک دەرییە) و بەبزماری ئاسنینی گەورەی چەماوە ڕازاوەتەوەو بێ چوارچێوەیە، بابەتە نوێیەکانی ئەم داڵانانە (دووەدەری)ن و بەسەر کۆڵانەکاندا دەڕوانن. زۆرجاران ئەم دەرگایانە بەچەند گرێیەک بەرز بوونەتەوە یان نیو بازنەییەکی بەرزیان بەسەرەوەیە.

دەرگا توخمێکی سەرەکیی خانووە و دانیشتووی خانوو بەهۆی دەرگاوەیە کە دوای داخستنی دڵنیا دەبێ و ئۆقرە دەگرێ. دەرگاکە بە کلیلێکی دارین دادەخرێ و کەوتۆتە ناوەڕاستی لایەکی دەرگاکە، یان لەدوو کلیلی هاوچەشن پێکهاتووە کە یەکێکیان کەوتۆتە لای سەرەوەی دەرگاکەو ئەویدیکەش کەوتۆتە بەشی خوارەوەی یەک لەلایەکانی دەرگاکە. لە هەندێ لە خانووەکاندا لە ناوەڕاستی ئەم دوو کلیلەدا قوفڵێکی گەورەی لە ئاسن دروستکراو هەیە[١٥].

دوای دەرگا هەیوانێک دێت، (کەلەگی)یشی پێ دەوترێت، و بەدەروازەیەکی سەرەکی دەژمێردرێت کە دەرگا بەحەوشە دەبەستێتەوە. لەڕووی داڕشتن و هەڵکەوتنی جیاوازی هەیەو بەجیاوازی سەرپۆش دەکرێت، بەشێوەی چوارگۆشە، لاکێشە، هەشت لا، یان تەوەرەی ڕاستەییە. بەڵام زۆرترین و باوترینیان داڵانی شکاوەیە، کە پتر تەلاری عێراقی پێ ناسراوە.

#### ٣- (رواق) و چخمەکان:

ئەم بەشەی پێکهاتەی

خانووەکانی قەڵای هەولێر توخمێکی گرنگی ئەم خانووانەیە، لەپێشەوەی هەیوانی نهۆمی یەکەمی خانووەکان و ژوورەکانی نهۆمی دووەم و لە پێشەوەی (کەلەگی)یەکانی هەردوو نهۆمیشدایە. بەشێوەی ڕێڕەوێک یان چخمەیەکەو دوورایییەکان و شێوەو شێوازی جوانکاری ساپیتەکەی و توخمەکانی زەخرەفەکانی جیاوازن و یەک چەشن و شێواز نین. واتە لەخانوویێکەوە بۆ خانوویێکی دیکە وەکو یەک نین، هەندێکیان ساپیتەکانیان دارینەو کوڵەگەی دارین کە بەزەخرەفەی جۆراو جۆر هەڵکەندراون لە پێشەوەیاندا چەقاوە. لە هەندێ لەو ماڵانەدا کوڵەگە دارینەکان بەگەچ داپۆشراون لەسەر شێوازی حەلەزوونی یان لەسەر شێوازی هێڵی هەڵکەندراو و لاکەلە بەرزەکان هەندێ جاریش پشتیوانی لە خشت دروستکراو و ستوونی روخامی هەندێ دەرگاو پەنجەرە دەروانێت بەسەر چخمەکاندا کە بەهاوین لە تیشکی ڕۆژ ئەو ژوورانە دەپارێزێت و لە زستانیش لەبا و باران.

**٤- ژێر زەمین:**

ژێر زەمین یەک لە پێداویستییەکانی خانووەکان بووەو بەپێی دۆخی باوی کەشوهەوا کە لە کوردستان دروست کراوە. بەشێوازێک کە لە کوردستان لە کونی تایبەت کە بۆ ئەم مەبەستە دروست کراوە، بۆ هاتووە، لەرێگای هەندێ پەنجەرەوە رووناکی پێ بەخشراوە لەرێگای هەندێ کون و تیلە پەنجەرە کە لەگەڵ ڕۆخی ژوورەکانی خوارەوە یەکسانە.

ژێر زەمین لەو توخمە بیناسازییانەیە، کە دانیشتوانی میسۆپۆتامیا لە دێر زەمانەوە شارەزای بوون، بۆ زۆر مەبەست بەکارهاتووە. لە شارەکانی سۆمەری و بابلی و ئاشووریش دۆزراوەتەوە، کە تایبەت بووە بەشاردنەوەی مردووەکان[١٦]. خانووەکانی قەڵای هەولێر بەژێر زەمینەکانی دەوڵەمەندە. ساپیتەکانی بە خشت و بەشێوەی حەسیر رازاوەتەوەو بەکوڵەگەی لە خشت دروستکراو هەڵپەسێردراوە. لە هاویناندا بۆ نووستن بەکارهاتووە، هەروەها بۆ پاراستنی خۆراک لە تێکچوون. لە هەندێک لەماڵەکاندا وەک مەزار سەیر دەکرا بەهۆی ئەوەی کە گۆڕی (سەید) یان (وەلی)یەکی تێدا دەشاردرایەوە.

**٥- گومبەز:**

لە میسۆپۆتامیادا مێژوویێکی دێرین بەرچاو دەکەوێت. گومبەزو گومبەتی بەناوبانگیان لە تەلارەکانیاندا دروست کردووە، لە خانووە دێرینەکانی قەڵای هەولێر چەندین جۆر لەگومبەزو گومبەت دروست کراوە لە یەکێ لەم خانووانەدا گومبەزی خڕو ئەو گومبەزە خڕانەی کە بەشێوەی گرێیەک خۆی دەنوێنێ، گرێی نیو بازنەیی لە هەندێ گرێدا زنجیرە زەخرەفەیەک شۆڕ دەبێتەوە بەشێوەی هێشووە ترێ، کە ناودەی ئەم شێوێنەی دەرازاندەوە. لە (موسڵ)یش بە (قەندیلی موسڵی) ناسراوە.

**٦- یەکە زەخرەفییەکان:**

خانووە دێرینەکانی قەڵای هەولێر یەکەی زەخرەفی و جوانکاری سەرنجڕاکێشی زۆر تێدایە، کە بەشێوازێکی جوان دابەش کراوە. هەر وەکو لە خوارەوە ئاماژەی بۆ دەکەین:

**١- کارە روخامییەکان:**

ئەم کەرستە بیناسازییە گرنگە لە زۆربەی زەخرەفەی رووەکی و ئەندازەیی لە رووەکانی ناوەوەی ماڵ و دەورەدراو بەحەوشەی ناوەوە بەکارهاتووە. زۆرجار ئەم زەخرەفانە لەسەر دەرگاو پەنجەرەکان و بۆشاییەکانی نێوانیانەوە دروست کراون. زۆرجار یەکە رووەکییەکان بەیەکە ئەندازەییەکان تێکەڵ دەکرێن یان لەسەر یەکترن. هەروەها ئەم زەخرەفانە بەشێوازێکی ستوونی بەتەنیشت دەرگاو پەنجەرەکانەوە دروست کراون.

ئەم زەخرەفانە لە موسڵ و هەولێرو کەرکوکیش بە"باڵە مێش" ناسراون

**٢- کارە خشتییەکان (کەرپووچ):**

کەرستەی خشت بەشێوەیەکی بەربڵاو لە دروستکردنی خانووی کەفماری بەشی سەرەوەی کۆشکە دێرینەکان، بەتایبەتی لە قەڵای هەولێر بەکارهاتووە. لەبەرئەوەی شاری هەولێرو قەڵاکەی کەوتوونەتە ناوچەیەکی دەشتاییی. بەهاسانی خۆڵی ورد دەست دەکەوێت، کە دەشێت شێلدراوێکی ئەوتۆی لێ دروست بکرێت، کە خشت بەرهەم بێنێت.

**هۆی دروستکردنی کۆشک و تەلارو زەخرەفە لەم پێکهاتەیە:**



ا) نەرموشلی ئەم پێکهاتەیە بۆ دروستکردنی زەخرەفەو گرێی رووەکی و ئەندازەیی شیاو و لەبارە. وەستا دەتوانێت بە بەکارهێنانی ئەم پێکهاتەیە کارە راستەییەکان لەهەر شوێنێک بیەوێت بەرەو شێوازی کاری گۆشەیی و کەوانەو خوارکاری و پەنا و پەسێری ببات.

ب) گرێ هاوبەشەکان. پێویستی بە بەکارهێنانی بەردە و بۆ ئەم مەبەستە دەبێ بەکاری بهێنێت[١٧].

پ) ئەم پێکهاتەیە بەپێی سروشتی خۆی نەرمە و دەستکاری کردنی سووک و هاسانە. وەستا بەسووکی دەتوانێ چی مەبەست بێت دەربهێنێ و لێی دروست بکات. هەر ئەم هۆکاردش وای کردووە، کە لەکاری بیناکاری نوێشدا بەکار بێت[١٨].

**٣- کارە فلزییەکان:**

بەهۆی ئەوەی کە خانووە دێرینەکان لە هەرێمی کوردستان بە شێوەیەکی گشتی و قەڵای هەولێر بەتایبەتی بە بەراورد لەگەڵ ناوەڕاست و خوارووی عێراق دووچاری باران بارینێکی زۆر دەبنەوە، بۆ چارەسەری ئەم قورساییەی خانووبەرەکان، شێلمانی ئەستووری چەماوەی ئاسنین بەکارهاتووە بۆ دروستکردنی پەنجەرەو هەندێک لە دەرگاکان. سەرەڕای بەکارهێنانی ئەم ئاسن و شێلمانانە بۆ پەرژین و چخمەو بانێژەکان لەسەر شێوازی جیا جیا.

ئەم شێوازە لە دروستکردنی خانووی بەغدادی بەکارهاتووە، بەڵام لە بەشەکانی سەرەوە و پەرژینەکان، لەجیاتی ئاسن دار بەکارهاتووە. هەروەها هەندێ جۆر لە تەنەکەو پارچەی جۆراو جۆری تەنەکەیی بۆ رووی دەرەوەی چخمەو زەخرەفەکان بەکارهاتووە، کە لە (شانشینی-شەناشیلی) بەغدادی دەچێت، بەشێوەیەکی سادە، ئەم دیاردەیە لەبیناسازی، لە موسڵ پتر بەدیار دەکەوێت. شێوازی دروستکردنی خانووبەرە لە هەرێمەکاندا یەک لە تایبەتمەندییە دێرینەکانی ئەوەیە کە (شەربەسازی) بۆ دروست دەکرا. ئەم شەربەسازییە پێکهاتووە لەو نیو لوولەییە یان شەش پاڵووییە لەگەڵ درێژ بوونەوەی چخمەکە، لە شیشەی ئاسنی دروستکراوە. کووپەی (شەربە)ی تیادا دادەنرێت، کە بۆ ئاوی خواردنەوە بەکاردێت. ناوی شەربەسازی لە بەکارهێنانی ئەم (شەربە)یەوە هاتووە

**٤- کاری داری:**

شێوازی گشتی رووی سەرووی ژوورەکان لە ماڵەکانی قەڵای هەولێر چەماوەییەکەیەتی. لەگەڵ خشتەکانی نێو دیوارەکاندا تێکهەڵکێش کراوەو کاری (دار)ی تێدا ئەنجامدراوە. کە بەوردی و جوانی بەزەخرەفەی رووەکی و ئەندازەیی ئەم کارە ئەنجامدراوەو رەنگی نایابی تیا بەکارهاتووە. هەروەها دینگەی لەدار دروستکراو لەشوێنە جیا جیاکانی خانووەکان بەکارهاتووە. دەرگاکانی دەرەوەو ناوەوەی ژوورەکانی ئەم خانووانە لەدار دروست کراون. بەشێوازێکی بەکارهاتووی رەنگ و هەڵکەندراوی دەرەکی و خوارو لەسەر شێوازی رووەکی و ئەندازیاری رازاوەتەوە.

**٥- کاری شووشەیی:**

بەراورد لەگەڵ شێوازی کاری خانووی کەلتووری بەغدادی خانووەکانی قەڵای هەولێر کەمتر شووشەی رەنگاو رەنگی تێدا بەکارهاتووە. هۆکارەکەشی دوو بابەتە:

ا) گەرمایی تیشکی رۆژ لە هەرێمی کوردستان لە ناوەراست و خوارووی عێراق کەمترە.

ب) سروشتی کوردستان سەوزو نایاب و درەوشاوەترو مایەی سەرنجی بینەرە لەچاو ناوەراست و خوارووی عێراق. بینەر هەمیشە حەز دەکا تەماشای دەرەوە بکا. ئەم هۆکارە وا دەکات کە شووشەی سادە بەکاربێت نەک رەنگاو رەنگ[19].

## ٦- رووبەری رەنگاورەنگ و بۆیاغەکان:

تایبەتمەندییە دیارەکانی زەخرەفەی خانووەکانی قەلای هەولێر بەکارهێنانی بۆیاغە لە جێبەجێکردنی زەخرەفە رووەکی و ئەندازەیی و نووسینی رستەیی، بەتایبەتی پارانەوەی ئایینی بەشێوازێک لە شێوەکاری بەغدادی بەدی ناکرێت. ئەم بۆیاغانە لە ژووری میوانداری و هەیوان و دالانەکان بەکاردێت. پتر رەنگی نیلی و هەندێ جار قرمزی بەسەریدا زال دەبێت. یەک لە تایبەتمەندییەکانی قەلای هەولێر لەم بوارەدا ئەوەیە فراوانییەکی بەرچاوی رەنگاو رەنگ بەدی دەکرێت لەسەر دیوارەکان وێنەی کێشراوە لەناو ژوورەکاندا رەنگی نیلی و زەردو سپی و سوور بەکاردێت بۆ هێلکاری تەریبی، لە کۆتاییدا شێوەیەکی بازنەیی (لەولەبی) کە لە روخساری پەنجەرە ئاسنینەکان دەچێت دەنەخشێندرێت[20]. سەرەرای وێنەکردنی هەندێ شێوەی تەجریدی بەرەنگی جۆراوجۆر.

## ٧- گەچکاری:

خانووە دێرینەکانی قەلای هەولێر، لە بیناسازییە دەولەمەندەکانیدا گەچ بۆ جوانکاری بەکارهاتووە. ژوورەکانی میوانداری پتر جوانکارییەکانی پێوە دیارە، کە گەچکاریی کراوە. لە دیوارەکاندا چەندین جۆرە (تاق)ی لێ دروست کراوە، کە چرای لەگەل کەلوپەلی سووک و بچووک تێیدا دادەنرا. هەندێ جاریش هێلانەی سادە لە رۆخ ساپیتەکانی تێدا دروست دەکرا. ئەم هێلانانە بۆ راگرتنی پەلەوەر بەکار دەهات، یەکێکە لە سیمای جوانکاریی خانووەکانی قەلای هەولێر دەژمێردرێت.

### پەراوێزەکان:

١- الحيدري- عبدالباقي عبدالجبار أرمن. التجديد الحضري لقلعة أربيل، طبع بمطابع جامعة الموصل، الموصل ١٩٨٥. ل٦١٠.
٢- الحيدري- هـ.س. ل٦١.
٣- الحيدري- هـ.س. ل٦٣.
٤- الحيدري- هـ.س. ل٦٤.
٥- الجاوشلي، هادي رشيد. تراث اربيل التاريخي- مطبعة جامعة الموصل، الموصل ١٩٨٥- ل٤٣.
٦- صالح، قحطان رشيد: الكشاف الاثري في العراق، دار الحرية للطباعة، بغداد- ١٩٨٧ ل٢٢.
٧- الحيدري- هـ.س. ل٦٤.
٨- خضير، فريال داود. البيت العربي في العراق العصر الاسلامي- دار الحرية للطباعة- بغداد ١٩٨٣- ل٢٢.
٩- عبدالجواد، توفيق احمد، تأريخ العمارة والفنون الاسلامية، ج١. دار وهدان.
١٠- بهنسي عفيف. الشام لمحات آثارية وفنية- دار الحرية، بغداد. ١٩٨٠- ل٩٩.
١١- الاشعب خالص حسين. الاثر الوظيفي في طراز البيت العربي، مجلة الكتاب، العدد الثامن، السنة التاسعة، آب، مطبعة الجمهورية- بغداد- ل٧٤.
١٢- العطية، زهير، المعالم الجمالية في بيت شمال العراق، مجلة التراث العدد الرابع، ايلول، تشرين الاول، طبع مؤسسة رمزي ١٩٧٨- ل١٢.
١٣- العطية هـ.س. ل١٢.
١٤- حسن، حميد محمد. البيت العراقي في العصر العثماني، العناصر المعمارية والزخرفية، نامەیەکی ماستەرەو بلاونەکراوەتەوە. ١٩٨٢- ل٢٧٧.
١٥- حسن، هـ.س.
١٦- برستد، جيمس هنري، انتصار الحضارة، ترجمة احمد فخري، دار الجيل للطباعة- القاهرة ١٩٦٢- ل٢١٣.
١٧- مكية محمد، بغداد عرض تأريخي مصور، نقابة المهندسين العراقي، بغداد- ١٩٦٧ ل٢٣٤.
١٨- مكية- هـ.س. ل٢٣٤.
١٩- العطية- هـ.س. ل١٢.
٢٠- العطية- هـ.س. ل١٢.



# شێوازی بەدیکیۆمێنت کردنی خانووە کەلەپوورییەکان
## (قەڵای هەولێر بە نموونە)

دکتۆر سەلیمە عەبدولڕەسول عەبد

ئەم توێژینەوەیە پێشکەشی یەکەم کۆنگرەی زانستی نێودەوڵەتی بۆ ئاوەدانکردنەوەی قەڵای شارستانیی هەولێر کراوە.

**پێشەکییەکی مێژوویی**

هەولێر دەکەوێتە ناوچەیەکی دەوردراو بەدوو ڕووبار لەزەوییە دەشتاییەکانی لاپاڵی ڕۆژاوای چیای زاگرۆس، شاری هەولێر یەکێکە لەشارە کوردییە کۆنەکان کە لە سێ هەزار ساڵ پێش لەدایکبوونی مەسیحەوە تائێستاشی لەگەڵدابێت، ژیانی تێدا بەردەوامە. لێرەوەیە کە هەوڵی پاراستنی سیما شارستانییەکەی بەدەردەکەوێت. هەروەها هێشتا شارەکە ناوە کۆنەکەی پاراستووە.

بەهۆی گرنگی شارەکە لەڕووی بازرگانی و کشتوکاڵ، گرنگترین پرۆژەکانی ئاودێری کە پادشای ئاشووری (سەنحاریب) جێبەجێی کردووە تێدا دروست کراوە، کە ئاوی لەدۆڵی بەستووڕەوە بەهۆی بۆڕی بەردی بەژێر زەویدا هێناوە، شوێنەواری ئەم پرۆژەیە هێشتا زۆر بەجوانی ماوەتەوە لەنزیک گوندی مورتکە.[٢] شارەکەو دەوروبەری لە ڕووداوە مێژووییە گرنگەکانی کۆن بەدەر نەبووە.

هەولێر بووە پایتەختی مەملەکەتی حەدیاب کە لەماوەی نێوان سەدەی یەکەمی پ.ز، و

هەردوو سەدەی یەکەم و دووەمی دوای زایین بووژانەوەی بەخۆیەوە بینی و رووبەرووی چاوتێبڕینی فەرثییەکان و رۆمەکان بووە، لەخاکی هەولێر چەند شەڕێک لە نێوانیاندا رووی دا.

هەولێر لە سەردەمی ساسانییەکاندا ناوبانگێکی گەورەی بەدەست هێناوە، ئەسقەفیەی نەستوری تێدا دامەزراوە لە ساڵی ٥٠٠ز، هەروەها لەنێوان نەوەکانیدا چەند نووسەرێکی نەساری (النصاری) بەدەرکەوتوون، ئەم نێوبانگەی بەردەوام بوو هەتاکو سەردەمی عەرەبی ئیسلامی. زۆرێک لە شارناسەکانی ئەو سەردەم وەک یاقوتی حەمەوی بە (اربیل) ناوی دەبات، هەروەها لە سەردەمی سوڵتان موزەفەرەدین ئەتابەگی لە کۆتایی سەدەی شەشەمی کۆچی هەولێر منارەی مزگەوتی تێدا بیناکراوە کە بەمنارەی هەولێر ناسراوە.

قەڵای هەولێر ئێستا بەپاشماوەی نیشتەجێبوونی بەردەوامی خەڵکی دادەنرێت لە شارەکە هەر لەکۆنەوە تاکو ئێستا، ئەم شارە شێوەی خڕە، لە زەوییەکانی دەوروبەری بە ٢٥ مەتر بەرزترە. رووبەرەکەی (١١٠,٠٠٠)م٢ لاکانی بەشێوەیەکی پلە پلەیی بەرەو زەوییە دەشتاییەکان دێت، دروستکردنی خانووبەرەی بەشێوەی بەرفراوان تێدا کراوە وەک سەرجەم شارە عێراقیەکان لەسەردەمی سەدەی رابردوو، قەڵای هەولێر هەروەک گەڕەکێکی نوێی شارەکە مایەوە.

ئامانج و شێوازەکانی بەدیکیۆمێنت کردنی کەلەپووری لە قەڵای هەولێر بەڕێوەبەرایەتی کەلەپوور لە دامەزراوی گشتی شوێنەوارو سیاسەتی رووپێوکردن و بەدیکیۆمێنت کردنی بینایە، نیشانەکانی کەلەپوور لە تەواوی شارەکانی عێراق، سەرەتا کارەکانی لەو شوێنەوارانە دەست پێ دەکات کە رووبەرووی لەناوچوون دەبێتەوە، یان ئەو شوێنانەی کە بەتەمای گەشەپێدانیەتی وەک ئەوەی بۆ قەڵای هەولێر بڕیاردراوە.

بەهۆی لایەنی مێژوویی قەڵاو شوێنە دیارەکەی لەناو شارداو لەبەر ئەوەی زۆرێک لە بینایە لەخۆ دەگرێت کە خاوەن نەخشەو رەگەزی بیناسازی شارستانییەو لەبەر ئەوەی نزیکە لە مەڵبەندەکانی گەشتوگوزاریی کوردستان، هەوڵ و کۆششەکانی بەرەو ئەوە دێت کە روخسارەکانی بەدەربخرێت و پارێزگاری لێ بکرێت و لەسەر بنەمایەکی زانستی و تەکنیکی وا، کە گونجاو بێت لەگەڵ مێژووەکەی و کەلەپوورەکەی، پەرەی پێ بدرێت.

تیمی رووپێوی کەلەپووریی وێنەی شێوازەکانی بەدیکۆمێنت کردنی کێشاوەو هەوڵەکانی لە تۆمارکردنی ئەم دیاردانەی خوارەوە کورت کردۆتەوە:

١- لایەنی نەخشەسازی.
٢- لایەنی بیناسازی.
٣- لایەنی بونیادنانی گشتی.
٤- لایەنی کەرتە خزمەتگوزارییەکان.
٥- باری کۆمەڵایەتی شارەکە.

لە تۆمارکردنەکەدا ئەم حاڵەتانەی خوارەوە جەختی لەسەر دەکرێت:

أ- ژمارەی دانیشتووان.
ب- ژمارەی خێزانەکان.
ج- ژمارەی منداڵان.
د- کارو پیشەی دانیشتووانەکەی.

ئەو زانیارییانە لە ئامادەکردنی ئەم توێژینەوەیە پشتی پێ بەستراوە، هەروەک لە فۆرمە بەڵگەنامەییەکانیشدا جێگیر کراوە.

**لایەنی نەخشەسازیی بینایەکان:**

مەبەستمان لێی نەخشەسازی ستوونی لەگەڵ قاتەکانی بینایەکەیە، ئەگەر هەبێ لەگەڵ رێگای دابەشکردنی بەشە جیاوازەکانی و یەکە جۆراو جۆرەکانی و هۆکارەکانی جووڵانەوەو گەیاندن لە نێوان ئەو یەکانە لە چوارچێوەی یەک ساختماندا، بەگوێرەی ئەو پرەنسیپە لە نەخشەسازیدا دەتوانین بڵێین سەرجەم بیناکانی قەڵاکە بەبینایەی کەلەپووری دادەنرێت چونکە لە نەخشەکێشانیدا پشت بەچەمکەکانی نەخشەسازی کەلەپووری دەبەستێ. گرنگترین ئەو چەمکانەش بریتین لە:

أ- (گۆڕەپانی ناوەڕاست): گۆڕەپانی ناوەڕاستی خانووە کەلەپوورییەکان، بەچەقی خانووەکە دادەنرێت و دەبێتە شوێنی پەیوەندی و گەیاندن و بزاوتن بۆ سەرجەم یەکەکانی قاتی خوارەوە.

ب- پێگەی هۆدەکانی قاتی خوارەوە (سەر زەوی)، لە زۆربەی ئەو خانووانەدا هۆدەکانی سەر زەوی

بەگـــــــۆڕەپانێـک لـە سێ لاوە دەورەدراوە، وەک ئـــــەوەی لـــــە بینایەکـانی بەغـدادا هەیە، یاخـود لەدوولاوە وەک ئەوەی لە قـــەڵای هەولێـردا هەیە،دەورەدراوە. هۆدەکـان یەکـــــەر بەســـەر گـۆڕەپانەکـەدا دەڕوانێت یاخـود بەهۆی هەیوانێکی بەرز، کە بنمیچەکانی بەکۆڵەگەی دارین یا بەردین یا بەدروست کـراوی (وەک ئەوەی لە قـەڵای هەولێــردا هەیە)، یان هەندێ جـــار بەهۆی هەیوانی کـەوانەیی رازاوە، کـە - لەلایەکی بینایەک نەوەک لەهەمـوو لایەکی- بەرامبەر گۆڕەپانەکە کراوە بێت. گەلێک جاریش وادەبێت کە ئەو هەیوانە یا هۆدەیە لەپشـتەوەیدا بەرزتر دەبێت لەئاستی سەرجەم قاتی سەر زەوی.

ج- پێگەی دەروازەی ســەرەکی بینایەکـە راسـتەوخـۆ بەرامـبـەر گـۆڕەپانەکـە دەبێت و بەســەریدا دەڕوانێت بەهۆی ڕێڕەوێکەوە، تەنها لەحاڵەتی بینایەی رەشۆکی (عامە)دا نەبێت، دەروازە (دەرگا)کە راستەوخۆ بەرامبەر گۆڕەپانی ناوەڕاستیە.

د- نەخشەسازی قاتی سەر زەوی زۆربەی جار لە قاتی یەکەمدا دووبارە دەبێتەوە لەپاڵ بەکارهێنانی هەیوانی والا کە دەڕوانێتە سەر گۆڕەپانەکە، بەجۆرێک لەم قاتەدا سوود لە ئاسمان وەردەگـــیرێت بەدرێژکـردنەوەی هەیوانەکـان بەشـێـوەیەک دەبێـتـە رووبەرێکی زیادە بۆ ئەم قـاتە، ئەم درێژکـردنەوانەی قـاتی یەکـەم کـاتێ بەڕووی دەرەوە دادەکرێتەوە دەگوترێت (شناشیل) لە بینایەکانی ناوچەکانی ناوەڕاست بەتایبەتی لە بەغدا.

هـ- ژێر زەمین (سـرداب)، ئەویش بینایەیەکە لەژێر زەویدایە، سـوود لە دیوارەکـانی بناغـەی خـانووەکـە وەردەگرێت، نەخشـەی بۆ دانراوە لە قـــاتی ســـەر زەوی، ژێـر زەمین رووبەرەکەی بەقەد رووبەری خانووەکە جگە لە گـۆڕەپانەکـە نەبێت، هەندێ جـار بەیەکـەوە بەسـتـراون هەندێ جاریش دابەش کراون بۆ دوو ژێرزەمین یان زیاتر، پەنجـەرەکـانی بەســەر گـــۆڕپانەکـــەدا دەڕوانن یاخـــود بەئەســتــووری دیوارەکـانی دەگـەن بەڕووی خـانووەکە، ئەم پەنجـەرانەش بۆ مەبەستی هەوا گۆڕکێ سوودی لێ دەبینرێت.

**لایەنی بیناسازی**

لایەنەکانی بیناسازی لە بیناکانی قەلای هەولێری شارستانی خۆی لەم خالانەدا کورت دەکاتەوە:

**أ- رووی پێشـەوەی خـانووەکـە (الواجهة الامامية)**، هەوڵی زۆری بۆ دراوە کـە بەشـێـوەیەکی هونەری و بەجوانی بەدەربکەوێت، دەلاقەی هەوا گـۆڕکێ و رووناکی (پەنجـەرە) زۆر لەبەرچاو گـیـراوە. ئەم دەلاقــەو پەنجــەرانە لە دار بەشـێــوەیەکی ئەندازیاری جـوان رازێنراونەتەوە، هەندێ لەم پەنجـەرانە بەشـێـوەی کـەوانەیی بینا کـراون یاخـود لە کــــەرپووچ دارێـژراون. هەروەها پەنجەرەکانی بیناکانی قەلا بەدەرگا ئاسنینەکـانی دەناسـرێنەوە کـە بەشێوەیەکی ئەندازەیی رازێنراوەتەوە، بیناسازی کەلەپووری گرنگییەکی زۆر بە خـاوێنکردنەوەی کـەرپووچەکـان دەدات.

بۆ ئەوەی شـێـوەیەکی ئەندازەیی جوان وەربگرێت و لە جوانیی رووی پێشـەوەی خـانووەکـە زیاد بکات. دەروازە (مـــدخل) لەخـــانووە کـــەلەپوورییـــەکـــاندا لایەنێکی بیناســـازی و ئاوەدانی گـــرنگ وەردەگـرێت لەپاڵ دەرگـا دارینیـیـە رازێنراوەکـــان کـــە هەندێکیـــان نووســـراویان لەســـەرە. هەندێ لەو دەرگایانە بەکۆڵەگەی کەوانەیی دەورە دراون. مـــاوەی نێـــوان دەرگـــاکـــەو دەوروبەری کەوانەکان بەشێوەی جوان بەکەرپووچ و گەچ رازێنراوەتەوە.

**ب- هەیوانەکـانی قـاتی سـەر زەوی**

ئەم هەیوانانە زۆربەی کـات پشت بەکۆڵەگەی دارین یا بەردین دەبەستن کـــە بەجـــوانی رازێنراونەتەوە. ئامانجیش لە دروستکردنی ئەوەیە کە ببـێت بەپاڵپـشـتـێک بۆ ئەوەی هەیوانەکـە بەسـەر گـۆڕەپانەکـەدا فـراوانـتر بڕوانێت، ئەو کـۆڵەگـانە لە سەرەوەیاندا بەکەوانەی نیو بازنەیی کۆتاییان دێت لە زۆربەی کـات وەک پاڵپشتێک بۆ خانووەکە بەکاردێت.

زۆربەی جار ئەو هەیوانانە لەنێوان هۆدەکـــانی خـــانی ســـەر زەوی و گـــۆڕەپانەکـــەدا کـــۆتاییـــان دێت. هەندێک لەو هـەیوانانە شـــوورەی (پەرژین)ی ئاسنینیـــان هەیە کـــە لەشێوەی سپرینگ دەچێت و لەگەڵ شێوەی پەنجەرەکان گونجاوە.

ج- هۆدەکانی قاتی سەر زەوی

زۆربەی هۆدەکـــانی قـــاتی ســـەر زەوی هۆدەی ژیان و پێـــشـــوازی میوانن، بۆیە دەبینین گرنگییەکی زۆر بە رازاندنەوە و بەرزی دیوارەکـانی و

بنمیچەکانی و ڕەنگەکانی دەدرێت، ئەم شێوە هۆدانە بەئاشکرا لە خانووی ئەوانەی خۆشگوزەرانن دەبینرێت.

**کەلوپەلەکانی بیناکردن**

ئەمەش ڕەگەزێکی گرنگە لە ڕەگەزەکانی لێک جیاکردنەوەی بینایە کەلەپوورییەکاندا. هەروەها تایبەتمەندێتی بیناسازی میسۆپۆتامیا لەو سەردەمەدا دەردەخات بەگوێرەی پێگەی جوگرافی، لەکاتێکدا کە بەکارهێنانی کەرپووچ لەزۆربەی بینایە کەلەپوورییەکانی میسۆپۆتامیادا باوە، بەکارهێنانی بەرد لە بینایە کەلەپوورییەکانی کوردستاندا دووبارە دەبێتەوە. گرنگیی بەکارهێنانی دار (تەختە) لە بانەکان و پەنجەرەکان و دەرگاکان و کۆڵەگەکاندا بەدەردەکەوێت. هەندێ لەو خانووانە بەتەختە ڕازێندراوەتەوەو دیوارەکانی بەڕەنگ و شێواز یان نووسراوی هەمە چەشنە. ئەم دیوارانە زۆربەی جار ڕەنگی شین داپۆشیون.

گەچ و نوورەو قیر لە مادە سەرەکییەکانی بیناسازین، کەچی ئاسن لە چوارچێوەیەکی تەسک بەکاربراوەو لەناوخۆ دروست دەکرا بەشێوەی ئاسنی پەنجەرەکان. شەقام و کۆڵانەکانی قەڵا بەتوێژێکی قیری داپۆشراون کە لە هەردوولای بۆ ناوەڕاستی کۆڵانەکە هاتوون. لەوێشەوە ڕێگە بەئاوی پیس و ئاوی باران دەدات بڕوات. بێ گومان قیرتاوکردنەکەش پێ دەچێ لەو ماوانەی دوایی کرابێت.

پشکنینی باری بیناکاری قەڵاکە بەگشتی لەژێر ڕۆشنایی ڕووپێوی کۆمەڵایەتی ئەم کارانەی خوارەوەمان بۆ دەردەخات کە لە چاڵاکییەکی ڕووپێوی بەڵگەنامەییدا لەساڵی ١٩٨٠ ئەنجام دراوە:

- **ژمارەی خانووەکانی قەڵا بەگشتی: ٥٠٦**
- **ژمارەی ئەو خانووانەی کە خاوەندارێتی بۆ شارەوانی و بەڕێوەبەرایەتی شوێنەوار دەگەڕێتەوە: ١٤٠**
- **ژمارەی ئەو خانووانەی کە خاوەندارێتی بۆ کەسەکان (تایبەت) دەگەڕێتەوە: ٣٤٧**
- **ژمارەی ئەو خانووانەی کە خاوەندارێتی نادیارە: ١٩**
- **ڕووبەری سەرجەم خانووەکانی قەڵا ٦٠,٨٠٨م٢**
- **ژمارەی ئەو خێزانانەی کە لەناو خانووەکاندان: ٦٦٧**

ئەم ژمارانە ئەوەمان بۆ دەردەخات کە ئەو خانووانەی کە خەڵکی بەکاریدێنن بۆ نیشتەجێبوون بریتییە لە (٣٤٧+١٩=٣٦٦) خانوو سەرباری ڕووبەری ١٣.٦٢٩م٢ ئەمەش ڕووبەری ئەو بینایە وێرانانەیە کە خەڵکی بەکاری ناهێنن، ئەوەشمان بۆ دەردەکەوێت کە ژمارەی خانووەکان (٣٦٦) دەکەوێتە ناو چوارچێوەی ئەو ڕووبەرە گشتییەی کە نزیکەی (٤٣٧و ٧٤م٢) تەنها (٦٧٧) خێزان بەکاری دێنن، ئەمەش هیچ مەترسییەک لە بەکارهێنانی بۆ نیشتەجێبوونی ئەو ژمارەیە لەو ڕووبەرەدا پیشان نادات.

ئەمەی خوارەوە ئامارێکە لەبارەی بینایەکان و ئاستی بەکارهێنان:

- **ژمارەی خانووەکانی کە لەئاستێکی باشدا ماوە: ٢٩**
- **ژمارەی خانووەکانی کە لەبینایەکی ناوەنددایە: ١٦٠**
- **ژمارەی خانووەکانی کە لەبینایەکی خراپدایە: ٣١٧**
- **ژمارەی گشتی دانیشتووانی قەڵا: ٣٢٥٨**
- **تێکڕای گشتی ژمارەی ئەوانەی خانوویەک بەکاردێنن:٨**
- **تێکڕای گشتی هۆدەکانی خانووەکان: ٢٦٤**
- **ژمارەی ئەو خانووانەی کە لەلایەن زیاتر لە خێزانێک بەکاردەبرێن: ١٢٦**

بەڕوونی دەردەکەوێت تێکڕای ژمارەی دانیشتووانی قەڵا لەگەڵ تێکڕا ژمارەی هۆدەکانی خانوویێک و باری بینایەکەی خانووە کەلەپوورییەکان ناگونجێ. بەتایبەتی لەو خانووانەی کە ئامارەکە دەری دەخات، لەلایەن چەند خێزانێک بەکاردەهێنرێت کە ژمارەیان لە (٢٠) کەس زیاترە. بۆیە ڕازین لەسەر ئەو تێڕوانینانەی شارەوانیی دامەزراوەکان کە دەیانەوێت خانووی زیاتر پەیدا بکەن و دووبارە دابەش بکرێنەوە بەسەر دانیشتووانەکەی. ئەمەش دوای ئەوەی چاکسازی بۆ

دەکرێت و سیما کەلەپوورییەکەی دەپارێزرێت (بەشێوەیەک بگونجێ لەگەڵ قەبارەی ئەو خانووانەو توانای لەخۆگرتنەکەی لەپاڵ گرنگیدان بە ئاستی رۆشنبیری دانیشتوانەکەی).

هەروەها پێویستە تێبینی ئەو خانووانەش بکرێت کە خاوەندارێتی بۆ کەسەکان دەگەڕێتەوە، کە نابێت زیان بەخانوودکە بگەیەنن، رێ و شوێنی وا بگرێتەبەر کە کەلەپوورێتی خانوودکە بەردەوام بێت.

ئەوەی بەشێوەیەکی گشتی، پەیوەندییەکی توندی بەباری بیناکەوە هەیە، کەرتە خزمەتگوزارییەکانی قەڵایە. نەبوونی ئەو کەرتە خزمەتگوزارییانەو دواکەوتنیان، دەبێتە هۆی زیان گەیاندنێکی زۆر بەبینایە کەلەپوورییەکان. لەوانەش ئاوەڕۆ و تۆڕەکانی دابەشکردنی ئاو و کارەباو تەلەفۆن و شەقام و کۆڵانەکانی قەڵا و چەند شتی تر، کە لەو بڕوایەداین پێویستی بەتوێژینەوەی ئەم خاڵانە دەکات.

لاوازی و نەبوونی کەرتە خزمەتگوزارییەکان و پێکهاتە ژێرخانییەکان، زیانێکی زۆر بەبینایە کۆنەکان، بەتایبەتی ئاوەڕۆکان دەگەیەنێ.

### باری کۆمەڵایەتی قەڵای هەولێر

ئەم خاڵە کاریگەرییەکی گەورەی لەسەر بینایە کەلەپوورییەکانی قەڵا هەیە، بەتایبەتی لەسەر ئاراستەکردنی کارەکانی پەرەسەندن - ئەمەش بۆ دیاریکردنی ئەرکی ئەو بینایانە لەدوارۆژدا ئەگەری بەکارهێنانی- دەتوانین لەژێر رۆشنایی ئەو ئامارانەدا هەندێ تێبینی تۆمار بکەین و ئەو پێشنیارانە بەدەست بخەین:

- ژمارەی ئەو نێرانەی (ذكور) کە تەمەنیان لە سەرووی (٦) ساڵییەوە: ١٢١٥
- ژمارەی ئەو مێیانەی (اناث) کە تەمەنیان لە سەرووی (٦) ساڵییەوە: ١١٠٧
- ژمارەی ئەو منداڵانەی کە تەمەنیان لە خوار (٦) ساڵییەوەیە: ٩٥٧
- کۆی فەرمانبەرانی دانیشتوانی قەڵا: ٢٢٦٠
- کۆی کرێکارە تەکنیکییەکانی دانیشتوانی قەڵا: ٨٧

بەگوێرەی ئەو زانیارییە ئامارییانە، (٦٠٥) کەس لەدانیشتوانی قەڵا رۆژانە دەچن بۆ کار. لەهەمان کاتدا بیناکان لەلایەن ئەوانەی دەمێننەوە بەبەردەوامی ئاوەدانە. هەروەها دەبینین ژمارەی منداڵان بەرزە، ئەمەش مەترسی لەسەر بینایە کەلەپوورییەکاندا دادەنێن. بەتایبەتی دەبینین کە قەڵاکە باخچەی ساوایان و قوتابخانەی نییە.

بۆیە بەپێویستی دەزانین هەندێ لەو بینایانەی کە خاوەندارێتی بۆ حکومەت دەگەڕێتەوە، دوای چاکسازی کردنی و گونجاندنی، ئامادە بکرێت بۆ ئەوەی ببێتە مەڵبەندی کۆمەڵایەتی و خزمەتگوزاری و راگەیاندن، بۆ ئەوەی گەورەترین ژمارەی دانیشتوانی قەڵا لەخۆ بگرێت. هەروەها هەندێکیان بەباخچەی ساوایان یاخود دروستکردنی باخچەی ساوایان لەو ناوچانەی کە وێرانە بوون، بۆ ئەوەی ئەو منداڵانەی کە تەمەنیان لە (٦) ساڵ کەمترە لەخۆ بگرێت.

### پێشنیازەکانی پەرەسەندن و پارێزگاری کردنی کەلەپووری

١- پێویستە سەرجەم ئەو بینایانەی کە زیاد دەکرێن، لە دوارۆژدا لە شوێنە وێران و بۆشەکاندا گونجاو بێت لەگەڵ سروشتی کەلەپووری بینایەی قەڵاکە.

٢- پێویستە لە ناوچەکانی دەوروبەری قەڵا بینایەی ستوونی قەدەغە بکرێت تاکو روخساری قەڵا ون نەکات کە تاکە قەڵایە لە هەولێر.

٣- پێویستە زۆر ئاگامان لە دروستکردنی رێگای تازەی هۆیەکانی گواستنەوەی بارهەڵگری قورس بێت، نەکا قەڵاکە ببڕێت.

٤- پاراستنی دیمەنی قەڵا، وەک خۆی نابێت رووەکی رازاندنەوەو داری بەرز لەبەر دەرکەی خانووەکان بچێنرێت.

٥- دانانی پلانێکی ورد بۆ بەکارهێنانی بیناکانی قەڵا بەشێوەیەکی نموونەیی ئەمەش دوای چاککردنەوەی.

٦- پێویستە دامەزراوی گشتی شوێنەوار فەرمانی بەسەر هەموو کارەکانی چاککردنەوەو نۆژەنکردنەوەی قەڵادا بڕوات.



# قەڵای هەولێر
# لە فیکرو شارستانییەتدا

**هیشام ئەلمەدفەعی**

**بەرایی:**

شوێنەوارە مێژووییەکان گرنگییەکی گەورەیان لەپێکهاتنی بیری شارستانیدا هەیە. لەبەر ئەوەی شوێنەوارەکانی دۆڵی رافیدەین لەهەموو لایەکی عێراقدا بڵاوە، بۆیە دەست بەسەرداگرتنی بۆ ئەوەی بیرو رۆشنبیری نەوەکانی پێ دروست بێ، کارێکی خوازراوە و پێویستە ئاگامان لێی بێت.

گەشەکردنی بەردەوامی شاری هەولێر بەدەوری قەڵاکەی لە سەردەمانی زووەوە وای لەشارەکە کردووە خەسڵەتی بێ هاوتایی لەرووی نەخشەسازییەکەی هەبێت، دەستگرتن بەسەر ئەو تایبەتمەندییە (خەسڵەتە) لە گەشەسەندنی شارەکە، بەتەواوی ناچێتە خانەی ئەرکی شوێنەوارناسەکان بەتەنها، بەڵکو ئەرکی دەسەڵاتدارێتی شارەوانی حکومەتە خۆجێیەکان و ناوەندییەکان هاوکاری و یارمەتیدەری پیاوانی شوێنەوارناس بن لەم ئەرکەدا. پشتگوێ خستنی ئەم بابەتە بەکەمتەرخەمی دەسەڵات بەرامبەر دانیشتوانی شارەکەو کۆمەڵگای هەولێر بەشێوەیەکی گشتی لەقەڵەم دەدرێت. لەم سۆنگەیەوە ئەرکی دانیشتوانی شارەکە هاوکاری، یارمەتیدەر بن بەهەموو ئامرازێک بۆ بونیادنانەوەی قەڵاکەو گەشەسەندنی. چونکە ئەمە بە گەشەسەندنێک بۆ شارەکەیان دادەنرێت، کە نیشانە مێژووییەکانی شارەکە بەدەر دەخرێت، ئەمەش سوودی بۆ ئەوان و فیکری مرۆڤایەتی و کۆمەڵگەی عێراق بەگشتی هەیە.

ئامانج: لێرەوە یەکێ لەئامانجە سەرەکییەکانی قەڵاکە ئەوەیە، کە

شوێنەوارو کەلەپوورەکەی لە بەردێکی قسەنەکەر بگۆڕین، بۆ شوێنەوارێکی قسەکەر، کە دەربڕی مێژووی قەڵاو ئەو سەدانە بێت، کە پیایدا گوزەری کردووە، ئەمە جگە لەوەش دەتوانێ پێشاندەری نیشانە شارستانییەتەکانی وادی رافیدەین بێت بەشێوەیەکی کورت و بەشێوەیەکی درێژتریش مێژووی کوردستان و شاری هەولێر بێت و هەروەها پێشاندەری رووکارەکانی پێشکەوتنی ژیانی مرۆڤی کوردی و شارستانییەتەکەی و پەرەسەندنی چەمک و ئامێرەکانی ئەو شارستانییە بێت لەڕووی فیکری و زیندەگی و هۆیەکانی پێشکەوتنی.

ئەم ئامانجانەش کاریگەرییەکی گەورەی لەسەر پەرەسەندنی شارەکەو ئاوەدانکردنەوەی دەبێت، هەروەها کاریگەرییەکی گەورەی لە بونیادنانی فیکرو کەسایەتی تاکی کوردی و عێراقی بەشێوەیەکی گشتی دەبێت، چونکە ئێستە رێگەمان دا شوێنەوارەکانی قەڵای هەولێر تەعبیر لەخۆی و قەوارەکەی و بەشدارییەکانی لە فیکرو شارستانییەتی مرۆڤایەتی بکات.

نموونە جیهانییەکان: شتێکی نوێ نییە سوود لەو کارە شوێنەوارییەکان یا شوێنە کەلەپوورییەکانی جێگایەک بۆ جێگایەکی تر وەربگرین، یا سوود لە پەرەسەندنی نەخشەسازی شارستانییەتەکەی وەربگرین، بەڵام ئەوەی نوێیە ئەوەیە، کە ناوجەرگەی شارێکی کۆن، کە بەردەوام گەشەی کردووە وەک قەڵای هەولێر ئاوەدان بکرێتەوە. دنیای شارستانی و پێشکەوتوو زۆرێک نموونەی هەڵگرتووە، کە چۆن پارێزگارییان لە شوێنەوارەکانی و کەلەپوورەکانیان کردووە، ئەم گرنگیدانەش بە سەردانەکانی قەڵاکان وای کردووە شارەکە ئاوەدان و گەشەسەندوو بێت، هەروەها وای کردووە ئەوانەی سەردانی دەکەن بیرێکی روونیان لەمەڕ فیکری ئەو مرۆڤانەی، کە ئەو روخسارەیان بەجێ هێشتووە هەبێت.

هەندێ لەو شارانە کە دووبارە بونیات نرانەوەو شوێنەوارەکانی پاراستراوە پێشتر رووبەڕووی خاپوور بوونێکی تەواو هاتبوون، وەک شاری کۆنی (وارشۆ)، کە دوای دووبارە بونیاتنانەوەی، بووە مەڵبەندێکی شارستانی جوان، ئەم شارە شارستانییەت و تواناکانی ئەو گەلە بۆ گەشتیارانی بەدەردەخات، ئەمە حاڵی سەرجەم شارە کۆنەکانی تری رۆژهەڵات و ناوەڕاستی ئەورووپا و ئیتاڵیا و بەریتانیاو یابانی دوای جەنگی دووەمی جیهانە. دەسەڵاتدارانی ئەو شارانە ئەرکی بونیاتنانەوە و بەدەرخستنی سیما شارستانییە کۆنەکانیان گرتە ئەستۆی خۆیان، ئەو خەسڵەتە بیناسازییە بێ هاوتایەو سیماکانی و هەرچییەک لەفیکری ئادەمی هەیە بەکارخست، لەپێناو ورووژاندنی گرنگیدانی ئەوانەی سەردانی دەکەن، ئەمەش رۆڵێکی گرنگی گێڕا لەهێنانی توێژەرو ئەوانەی گرنگی و پەرەی پێ دەدەن.

دەتوانم نموونەیەکی تر بهێنمەوە لەمەڕ تەوزیفکردنی سیما کەلەپووری و شوێنەوارییەکان یان سیما شارستانییە نوێیەکان بۆ پێشخستنی شارەکان، ئەویش مەڵبەندی (بۆمبیدۆ)یە لە پاریس، ئەم مەڵبەندە رۆشنبیرییە گرنگە، لە حەفتاکانی سەدەی بیستەم بینا کراوە، کە زۆربەی چالاکییە هونەری و فیکری و رۆشنبیری و مۆسیقییەکان دادەپۆشێ. دەڵێم ئەم مەڵبەندە لە ناوچەیەکی ئاوەدانی خراپ لەڕووی بیناکانییەوە بونیات نراوە لە شاری پاریس. ئەم مەڵبەندە یارمەتی کۆبوونەوەی هونەرمەندان و نیگارکێشان و مۆسیقاژەنەکانی داوە لە پاڵ کۆکردنەوەی خاوەن پیشە دەستییەکان و نوێخوازەکان و بیریاران، بۆ ئەوەی چالاکییەکانی خۆیان لەسەر شانۆیەکی ناوەکی یا بەشێوەیەکی نافەرمی لەگۆڕەپانە دەرەکییەکان پیشان بدەن. هەموو ئەوانە وای کردووە، کە هەزارەها گەشتیارو ئەوانەی گرنگی دەدەن بەهونەرەکانی سەر شانۆو هۆڵەکانی، رۆژانە سەردانی ئەم مەڵبەندە بکەن، لەلایەکی تریشەوە هەزارانی تر رووی تێ دەکات بۆ ئەوەی خزمەتگوزاری جۆراوجۆری ئەم چالاکییانە بکەن و ئەوانەی حەز بەبینینی هونەرمەندان دەکەن.

دەسەڵاتدارانی شارەکە کاری جیدی دەکەن بۆ رێکخستن و پەرەسەندنی گەڕەکەکانی شارەکەو گرنگی بەکردنەوەی قاوەخانەو چێشتخانەو شوێنەکانی فرۆشتنی وێنەو کارە هونەرییەکان دەدەن کە مەڵبەندی، (بۆمبیدۆ)ی پێ دەناسرێتەوە.

هەموو ئەو چالاکییانەی دوای

چەند ساڵێکی کەم وای کرد ئەو ناوچەیەی، کە لەڕووی بیناسازی خراپ بوو گەشە بکات و بگۆڕێت بۆ مەڵبەندێکی رۆشنبیری جیاواز، بۆ ژینگەیەکی پەرەسەندوو لە بیناکانی و دانیشتوانەکەی ئەوانەی کاری هونەری دەکەن، ئەمەش وای کرد داهاتێکی زۆر لە شارەکانی خرپێتەوە.

**گەشەپێدانی قەڵای هەولێر بەدرێژایی مێژوودا:**

لەو بیرو بۆچوونانەی باس کراوە دەتوانم پرەنسیپە سەرەکییەکانی ئەو پێشنیازانەی بۆ گەشەسەندنی قەڵای هەولێر کراون ئەم ئامانجانەی هەیە:

١- گەشەسەندنی قەڵای هەولێرو گەڕانەوەی ژیان بۆی، بۆ ئەوەی ببێتە یەکێ لە سیما شارستانییەکانی ناوچەی کوردستان، بۆ ئەوەی ببێتە دەربڕی سیما مێژوویی و کەلەپوورییەکەی لەپاڵ گەشەسەندنی مێژوو، کەلەپووری گەلی کوردی.

٢- ئامانجەکانی کاری گەشەسەندنی ئەوەیە، کە دووبارە خەڵکی لە قەڵا نیشتەجێ بکرێت، بۆ ئەوە بەکاربهێنرێت تاکو ببێتە مەڵبەندی نیشتەجێبوون و چالاکی فیکری و هونەری کوردی، دەرگاکانی قەڵا بکرێنەوە بەڕووی گەشتیاران و زیادکردنی چالاکی گەشتیاری نێوخۆیی و دەرەکی، ئەمەش بۆ سوودی شاری هەولێرو کوردستانی عێراق.

ئەو ستراتیژییانەی، کە ئەم ئامانجانە دەستەبەر دەکات، بەوەی ژیان بۆ قەڵا بگەڕێتەوە، دوای چەند گفتوگۆیەک بەرجەستە دەبێت، لێرەشدا چەندین پێشنیازی بیناسازی هەیە، بەڵام من ئێستا ئەم پێشنیازانە دەخەمەڕوو:

**١- لەبابەت ئەوەی رێپێدراوەو ئامادەکارییە:**

* رووپێوێکی تۆپۆگرافی و ئاوەدانی بۆ قەڵا بکرێت، هەموو دامەزراوەکان و رێگاکانی و کۆڵانەکانی و گۆڕەپانەکانی تێدا روون کرابێتەوە.
* رووپێوێکی دانیشتوان بکرێت، بۆ ئەوەی تۆماری زەوی و خاوەندارێتی زەوییەکانی تێدابێت بۆ ئەوەی سوودی لێ وەربگیرێت لە کارەکانی داهاتوودا.
* رووپێوە کەلەپووری و شوێنەوارییەکان تەواو بکرێن و هەموو دامەزراوە کەلەپووری و شارستانییەکان بەبەڵگە بکرێن لەگەڵ وردەکارییەکانی و مێژووی دامەزراندنیان.
* دیاریکردنی ئەو دامەزراوانەی، کە شوێنەواری و کەلەپووری نین، بۆئەوەی مانەوەی چاکە بۆ بەکارهێنانی یان نەڕ.
* دانانی لیستی کاری کەلەپووری و شوێنەواری، کە پێویست دەکات ئەنجامی بدەین، بۆ ئەوەی قەبارەی کارەکانی نۆژەنکردنەوەو وەبەرهێنانی پێویست لەماوەی دیارکراو ئەنجام بدرێت.

**٢- لەبابەت نەخشەی بیناسازی و پێشنیازە تازەکان و پرۆگرامی کارکردن:**

* دانانی نەخشەی بیناسازی و ژینگەیی بۆ قەڵاکە واقعی هەموو دامەزراوەکان و بەکارهێنانیان و شەقام و کۆڵان و رێچکەکانی تێدا دیاری کرابێت، لەگەڵ دیارکردنی هۆکارەکانی گواستنەوەو ئامادەکردنی ئەو ئۆتۆمبێلانەی کە رێگەی هاتنە ناو قەڵایان پێ دەدرێت.
* دیاریکردنی شوێنەکانی نیشتەجێبوون و یەکەکانی نیشتەجێبوون لە قەڵا، هەروەها دیارکردنی ئەوەی پێویستە بپارێزرێت وەک بەشێک لە شوێنی نیشتەجێبوونی بەردەوام، لەگەڵ چەسپاندنی پێشنیازەکان و داواکارییەکانی دووبارە بونیاتنانەوەی.
* دیاریکردنی گەڕەکێک یا زیاترو، دانانی پرۆگرامی کارکردنی خێرا بۆ بووژاندنەوەی. ئەمەش بەهۆی دەستەبەرکردنی تۆڕە خزمەتگوزارییەکان و هەرچی شتێ، کە سیمای شارستانییەتی پێوەیە. بۆ ئەوەی سەرجەم شوێنە نیشتەجێکان بگەڕێتەوە بۆ ئەوا خێزانانەی دانیشتوانی سەرەکی قەڵان. یاخود خانوو بۆ هونەرمەندان و نووسەرانی تێدا دروست بکرێت یاچەند فرۆشگایەکی پیشەسازی.

کەلەپوورە دەستییەکانی شاری هەولێرو کوردستانی تێدا بێت و لەپاڵ پەرتووکخانەو کۆگای فرۆشتنی دیاری و (دائرة الاستعلامات) و شوێنەوارو کەلەپوور لەگەڵ چەند هوتێلێکی

بچووک و چەند چێشتخانەیەک، کە لەگەڵ ئاستی ئەوانەی سەردانی قەڵا دەکەن بگونجێ، هەروەها بازاڕێک و دائیرەیەکی بەریدو هەرچییەک کە ئەو ئامانجە دەیخوازێت هەیبێ.
* هەلومەرجێکی فراوان دیاری بکرێت بۆ دروستکردنی ناوەندێکی رۆشنبیری، کە چەندین هۆڵی کۆبوونەوەو جۆرەها چالاکی، وەک وێنەکێشان و پەیکەرتاشی و نواندن لەخۆ بگرێت، ئەمەش بۆ ئەوەی چالاکییە هونەرییەکانی دەوروبەر بۆ مەڵبەندەکە کێش بکات، ئەمەش وا دەکات سەرنجی گەشتیاران و رۆشنبیران و چالاکییە تاکە کەسییەکان بۆ خۆی کێش بکات.
* دیاریکردنی هەلومەرجێکی تر بۆ بونیاتنانی ناوەندێکی بازرگانی و بازاڕگای تایبەتمەند، کە نووسینگەی کۆمپانیاکانی وەک بازاڕی سەروەت و پێداویستییەکانی ماڵ و بازاڕی ئازاد لەخۆ بگرێت، بۆ فرۆشتنی شتی بەسوود تاکو بزاوتی بازرگانی و فرۆشتن بۆ قەڵا کێش بکات.
* بونیاتنانی مۆزەخانەیەک لەناو قەڵا، بۆ ئەوەی ژیانی مرۆڤی کوردی و کۆمەڵگەکەی بەدرێژایی سەدەکان بەدەربخات، کە هەموو ئەو کەلوپەل و ئامێرەکانی ناو ماڵ، کە مرۆڤ بەکاری هێناون بۆ پێشکەوتنی ژیانی خۆی و شارستانییەتەکەی لەخۆ بگرێت، هەروەها شێوەکانی پەرەسەندنی جل و بەرگی کوردی و پۆشتەنییەکانی و بڵاوبوونەوەی ئەو پۆشتەنییانە لە کوردستان لەناو هۆزە کوردییەکان و شارە کوردستانییەکان لەخۆ بگرێت، لەپاڵ نموونەی ئەو هونەرو زانست و ئەدەبانەی، کە مرۆڤ لەدوای خۆی جێی هێشتوون. بۆ ئەوەی ئەو مۆزەخانەیە ببێتە ئاوێنەی پەرەسەندنی بیری شارستانی و کوردی بەدرێژایی مێژوو.

### ٣- لەمەڕ بەکارهێنانی قەڵا:

* بەردەوامبوون لەکاری گەڕان و پشکنین بەدوای شوێنەوارەکان و پاراستنی کەلەپوورو رێگادان بەگەشتیاران بچنە ناو دام و دامەزراوە کەلەپووری و شوێنەوارییەکان، دوای ئەوەی بڕێک داهاتیان لێ دەسەندرێت بۆ درێژەدان بەکارەکان.
* هاندانی هاووڵاتیانی قەڵا، بۆ ئەوەی ماڵ و خانووەکانیان چاک بکەنەوە، بەباشترین شێوە ئاراستە بکرێن بۆ ئەو مەبەستە، بەگوێرەی پرەنسیپەکانی پاراستنی کەلەپوور، هەروەها هەندێ لەو خانووانە بەکرێ بدرێنە ئەو هاووڵاتییانەی حەز دەکەن تێیدا نیشتەجێ بن یا هونەرمەندان و خاوەن پیشە کەلەپوورییەکان.
* هاندانی بزاوتی هونەری و باشترکردنی چالاکییەکانیان لە ناوەندێکی رۆشنبیری لە بوارەکانی ئەدەبی کوردی و هۆنراوەو وێنەکێشان و پەیکەرتاشی و نواندن و هەموو هونەرە ئادەمییەکانی تر.
* هاندانی گەشتیاران بۆ ئەوەی سەردانی مەڵبەندی بازرگانی قەڵا بکەن، ئەو مەڵبەندەش کار بۆ چالاککردن و باشترکردنی پیشەسازییە دەستییەکان و بەرهەمەکانی تری کوردستان دەکات، کە دەبێتە دەستمایەکی باش بۆ دانیشتوانەکەی.

### ٤- لەبابەت یاسادانانەوە:

* بڕیارێکی شارەوانی دەربچێ و تێیدا ئەوە دیاری بکرێت، کە ناوچەی قەڵای هەولێر ناوچەیەکی ئاوەدانی تایبەتە، هەروەها لە بڕیارەکە شێوازەکانی کارکردن بەگوێرەی داخوازییەکانی ئاوەدانکردنەوەی قەڵای تێدا دیار کرابێت.
* دەرکردنی یاسایەک، کە هەموو ئەوانەی هەوڵدەدەن بەچاککردنی زەوییەک بەگوێرەی رێنماییەکانی دائیرەی شوێنەوارو کەلەپوور لە باج بۆ ماوەی دە ساڵ ببەخشرێت.
* پێویستە داهاتەکانی قەڵا لە بەخشین و داهاتەکانی بەکارهێنانی دام و دەزگاکانی قەڵاو مۆزەخانەکان و کرێی خانووەکان بۆ ئەو قەرزانەی ئاوەدانکردنەوەی قەڵاو بەڕێوەبردنی چاکسازییەکانی بێت.



# ڕێنیسانسی بیناسازی و ڕەنگدانەوەی لەسەر قەڵای هەولێر

نوعمان جومعە ئیبراهیم

قەڵای هەولێر تاکە گەواهیدەرە بۆ بوونی شارستانییە یەک لەدوای یەک و لەناوچوونەکانی شارەکە و دەشێ لێیانەوە تیشک بخەینە سەر قۆناغ و چاخ و ڕۆڵی ئەو شارستانییانە.

لێرەدوەیە کە قەڵا وەک ڕەمزی شوێنەواری قەوارەیەکی شارستانی، پێویستە بایەخی پێبدرێت، هەرچەندە ئامانجێکی زۆر سەخت و دژوارو ئاڵۆزە، لەهەمان کاتیشدا زۆر گرنگە. کەواتە قەڵا وەک بەشێک لەکلتووری ئەمری مرۆڤایەتی پێویستە سروشتی شوێنەواری و ناسنامەی مێژوویی بپارێزرێت. ئەگەرنا گرنگی خۆی لەرووی شوێنەواری لەدەست دەدات و بایەخی نامێنێت.

لەم توێژینەوەیەدا هەوڵ دەدەین هەندێ خاڵی بنچینەیی دەستنیشان بکەین کە دەشێ لەپرۆسەی پەرەپێدان و چاککردنەوەی قەڵا پشتی پێ ببەستین بۆ پاراستنی تایبەتمەندیی مێژوویی و بیناسازی، کە شێوەی ڕاستەقینەی مێژوویی قەڵا لەقۆناخە جیاکانیدا دەردەخات.

قەڵای هەولێر وەک بەشێک لە شارو دڵی شارەکە، ناوبانگێکی مێژوویی و شوێنەواریی گەورەی بەشارەکە بەخشیوە. هەموو ئەم لایەنانە نیشانەی ئەوەن کەوا بڵێین کۆنترین نشینگەیە لە ناوچەکە پەیدا بوویێت، لەگەڵ سەرەتای سەرهەڵدانی نشینگەکان و جێگیربوون لەشێوەی جێنشینی بەکۆمەڵ و دێی کشتوکاڵی نزیک لە هەزارەی شەشەمی پێش زایین.

بەڵگەکان ئاماژە دەکەن، قەڵای هەولێر لە سەردەمی ئاشووریدا بەتایبەتی سەنحاریب (٧٠٥-٦٨١پ.ز) گەشەی سەندووە و پیرۆز بووە. ئاشوورییەکان کردبوویانە بنکەیەکی ئایینی بۆ پەرستنی بتە بەناوبانگەکەیان (عشتار) تا ئەو ڕادەی ناو نرابوو بە (عشتار ئەربیلا). سەرەڕای ئەوەش ناوی پەرستگاکەی لەهەندێ دەقی بزماریدا هاتووە لەشێوەی (ئی- کشان- کلاما) کە واتای پەرستگای خانمی هەرێم دەگەیەنێت.لەو ڕاستییانە و لێکۆڵینەوە مێژووییەکان دەردەکەوێت کەوا قەڵای (هەولێر- ئەربیل) هاوبەش بوون لەزۆر کارلێکی شارستانی و ڕووداوی سیاسی. توێژدران ئەم کاریگەرییە دەگێڕنەوە بۆ پێگە ئایینییەکەی و بایەخە ئابوورییەکەی سەرەڕای شوێنە ستراتیژییەکەی لەسەر ڕێگای

کاروانی بازرگانی کۆندا.

گرنگترین رووداو کەوا مێژوو تۆماری کردووە لەم ناوچەیەدا جەنگە مێژووییە بەناوبانگەکەی نێوان فارسە ئەخمینییەکان و ئەسکەندەری مەقدۆنی بوو لەساڵی (۳۳۱-پ.ز) لەنزیک هەولێرو بەناوی ئەوەوە ناسراوەو دەوترێت جەنگی هەولێر-ئەربیلا یان کوکمیلا- هەولێر ئەو کاتی گەورەترین شار بوو لە ناوچەکەدا.

ئەمڕۆ قەلا بەشێکی هەرە گرنگی شاری هەولێرە، دەکەوێتە نێو پلاندانانی بنچینەیی ئێستای شار و لە نەخشەسازی گشتی شاردا کاریگەری هەیە و شێوەی بازنەیی بەدەوری قەلادا هەلکەوتووە.

تایبەتمەندییە جەوهەرییەکان و هەلاواردەی قەلا تەنیا لە شوێنەوارەکەیدا نییە کەوا گردێکی شوێنەوارییە، بەلکو لەو کلتوورە بیناسازییەدایە کە خۆی لە زۆر خانوو و بینایەی کلتووری دەنوێنێت. سەرەڕای مێژووی دێرینی، وێنەیەکی روون بەدەستەوە دەدات بۆ پشتگیریی راستییە مێژووییەکان و بەروالەتیی پێشکەوتنی کۆمەلایەتی و پێشکەوتنی بنیاتنان دەژمێردرێت.

ئەمڕۆ دەبینین قەلا و خانووە کلتوورییەکان تەنگەتاو کراون بەهۆی بالەخانە و پرۆژەی ئاوەدانی، لە ئاکامی فرەوانبوونی بنیاتنان و گەشەسەندنی ئابووری، کە شارەکە ئێستا بەخۆیەوە دەبینێت.

ئەم هۆکارانە کاریگەریی خراپیان دەبێ بۆ قەلاو خانووە کلتوورییەکان. بەتایبەتی دیاردەی دروستکردنی بالەخانەی گەورە و بەرز لەدەرەوەی قەلا و لەنزیک شارو لەدەروازەکانیدا بەشێوەیەک بەرزترن لەقەلا. ئەم دیاردەیەش کاردەکاتە سەر جوانکاریی بیناسازی قەلا و شێواندنی داپۆشینی ئادگارەکانی. بەواتایەکی وردتر، راپەڕینی بیناسازی کە شارەکە ئێستا بەخۆیەوە دەبینێت وای کردووە قەلا پشتگوێ بخرێت کە دەگەڕێتەوە بۆ کەمکردنەوەی بەهای مێژوویی و شوێنەواریی قەلاکە.

لەبەردەم ئەم راستییەدا پێویستە خێرا چارە و ئەلتەرناتیفی ئەم دیاردەیە بدۆزرێتەوە بۆ دانانی رێگا چارەی لەبار بۆ رزگارکردنی قەلا لەپشتگوێ خستن و پاراستنی تایبەتمەندییەکانی و نەریتە کلتوورییە رەسەنەکانی.

لەبەر رۆشنایی ئەوەی رابرد پێویستە کار بۆ ئەوە بکرێت کەوا رێگاچارەی شیاو دابندرێت بەپێی بنچینەی زانستی ورد بۆ وەستاندن و کەمکردنەوەو رادەدانان بۆ ئەو پرۆژانەی دەوری قەلا.

بەرای ئێمە پێویستیی بنچینەیی بۆ رووبەڕوو بوونەوەی ئەم گیروگرفتانە پلاندانان و بەرنامەی کاردانانە بۆ نۆژەنکردنەوەی قەلا و گێڕانەوەی شکۆمەندی و پاراستنی سروشتە شوێنەواری و مێژوویی و بیناسازییەکەی کە پێویستی بەچاکسازی ورد هەیە بۆ پاراستنی شوێنە داهێنراوەکان.

لەسەر ئەم بنچینەیە بەهای مێژوویی و بیناسازی وا پێویست دەکات پلانێکی چاکسازی و قۆناغ بەقۆناغی درێژ خایەن دابندرێت و پێویستە بەپێی پێوەرو بنەماگەلێک بێت لەگەل بایەخی شارستانی قەلا بگونجێت.

لەهەمان کات بنەمای بەرایی لەبەرچاو بگیرێت بۆ چاکسازی لەشوێنە زۆر زیان دیتەکان، واتە واباشترە کاری چاکسازی و پەرەپێدان لە قۆناغەکانی بەراییدا لەو شوێنانەوە، دەست پێبکات کە کەوتوونەتە بەر هەڕەشەی لەناوچوون. ئەو راستییەش پێویستە لەبەشە کۆنەکاندا و بۆ زۆربەی خانووە کلتوورییەکان لەبەرچاو بگیرێت، ئەوانەی وێران بوون و پشتگوێ خراون. هەروەها پێویستە سروشتی کاری چاکسازی دیاری بکرێت، بەپشت بەستن بەبنەمای دەستنیشانکردنی خانووەکانی، کە پێویستە چاکسازی بکرێن و هەلسەنگاندنیان لەسەر بکرێت پێش دەستکردن بەکاری چاکسازی.

هەندێ شت هەن پێویستە ئاماژەیان پێبکرێت سەبارەت بەئامانجی نۆژەنکردنەوە و چاکردنەوە بەتایبەتی ئەو خانووانەی کە مۆرکێکی کلتووری و نەریتییان هەیە. ئەویش هەولدانە بۆ بەردەوامبوونی کلتووری مێژوویی، سەرەڕای ئامانجی بنچینەیی ئەم کارانەش کە هێنانەدی و

دروستکردنی پەیوەستی بیناسازی و مێژوویی نێوان رابردوو و ئێستای خانووەکانە.

لەگەڵ ئەوەشدا هاوبەشیکردن لەچاککاری و زیندووکردنەوەی لایەنە مێژوویی و بیناسازییەکەی خانووە کلتوورییەکانی قەلا لەئاستی پێویستدا نییە.

بەگشتی زۆر گیروگرفت هەن رووبەرووی شوێنەوارناسان و سەرپەرشتکارانی چاکسازی دەبنەوە لە شوێنەوارە مێژووییەکان، بەتایبەتی لەلایەنی رواڵەتی بیناسازی و هونەری یان هەندێ بەشی دووبارە نۆژەنکراوە.

دەبینین زۆر جاران ئەم بەشانە هەندێکیان دەگۆڕێن یان دەشێوێن کە شێوەیەکی ساختە دەنوێنن و رووە راستەقینەکەی ون دەکەن. یەکێک لەو ئەرکانەی دەکەوێتە ئەستۆی بەرپرسانی چاکسازی وردەکاری کردنە لەم بوارەدا.

**پێشنیارەکان:**

گرنگترین ئەو پێشنیارانەش سەبارەت بەنۆژەنکردنەوە و پەرەپێدانی قەلای هەولێر ئەم خالانە دەگرێتەوە:

١- بۆ پاراستنی مۆرکی مێژوویی و کلتووری قەلا واباشە تەوەرەی گەیشتنە قەلا زێدە بکرێت. رێگای (قەلا- منارەی مزەفەرییە) بکرێتەوە.

٢- رێگە نەدان بەدروستکردنی باڵەخانە و بینایەی بەرزتر لەقەلا لەدەوروبەری قەلادا، لەهەمان کات دیارکردنی رێکخستنی بیناسازی بەشێوەیەک رێک بێت لەگەڵ مۆرکی کلتووری و بیناسازی قەلا.

٣- هەموو خاوەن دووکان و کۆگا و بینایەکانی سەر شەقامی دەوروبەری قەلا و ئەوانەی لەتەک قەلاوەن، پێویستە پابەند بکرێن بە چەشنی بیناسازی لەبار لەگەڵ پێکهاتەی بیناسازی قەلا.

٤- هەندێ خانووی کلتووری تەرخان بکرێت دوای چاککردنەوە و سوود لێوەرگرتنیان وەک بنکەی کردنەوەی خولی مەشقککاری تایبەت بەئامادەکردن و پێگەیاندنی کادیری تایبەتکار لە بواری چاککاریی شوێنەواری و مێژووی بۆ رەچاوکردنی پێویستیی کار لەم بوارەدا.

٥- روونکردنەوە و دیاریکردنی رێکخستنە تایبەتییەکانی کاری چاککاری لە خانووە شوێنەوارییەکان و پشتگیری کردنیان لەلایەنە پەیوەندیدارەکان.

٦- تەوەری بنچینەی زۆربەی لێکۆڵینەوە و پێشنیارەکانی رابردوو جەخت لەسەر چالاکی و کردار دەکاتەوە. ئێمە پێشنیار دەکەین ئەم چالاکی و کردارانە کەم بکرێنەوە و کاتیان دیاری بکرێت بۆ ئەوەی سەربەخۆیی ئەم چالاکییانە و بەهاکەی رابگرین.

٧- سوود وەرگرتن لەهەندێ خانووی کلتووری لەقەلادا بۆ مۆزەخانەی تایبەت بەجەنازە و پەیکەری هەندێ کەسایەتیی ئایینی و زانستی خاوەن هەڵوێستی نەتەوەیی و نیشتمانی لە هەولێردا.

٨- پێداچوونەوە بەپڕۆژە لێکۆڵینەوەکانی رابردوو بۆ دیارکردن و دەستنیشانکردنی خاڵی بێهێز، بەمەبەستی هەڵسەنگاندنی هۆکان و ئاکامەکان بۆ سوود لێ وەرگرتنیان بۆ بەرزکردنەوەی ئاستی چاککاری و چالاککردنی.

٩- دانانی بەرنامەیەکی زانستی دروست بۆ شاکارەکان لەبواری چاککاریدا بەتایبەتی لە خانووە کلتوورییەکانی قەلادا. لەهەمان کات، دیاریکردنی ئامانج و دابەشکردنی ئەو کارانە بۆ چەندان قۆناغ لەگەڵ دووپاتکردنەوەی جێبەجێکردنیان لەو شوێنانە بەدەستی گرنگی مێژوویی و بیناسازییان.

**سەرچاوەکان:**

١- باقر، طه، سفر، فؤاد، المرشد الي مواطن الاثار والحضارة الرحلة الرابعة، بغداد، ١٩٦٥.

٢- صالح، قحطان رشيد، الكشاف الاثري في العراق، بغداد، ١٩٨٧. ص٨٣.

٣- ساوث، ستانلي، دور الاثار في عملية الصيانة والحفظ، ترجمة عرفان سعيد، مجلة التراث والحضارة، العدد (٣) بغداد/ ١٩٨١، ص٣١.

٤- الاشعب، خالص، ابعاد الصيانة في المدينة العربية ومتطلباتها، ترجمة عرفان سعيد، مجلة التراث والحضارة، العدد (٦-٧) ١٩٨٥، ص٩.

٥- عبدالرسول، سليمة، المباني التراثية في بغداد، ص١٠-١٦.

# قەڵاتی هەولێر
# تێڕوانینێکی گەشتوگوزارییانە

**ئەم بابەتەی بەڕێز (دکتۆر ستان ماک جاهی) هەرچەندە وەکو بابەت باس لە داهاتووی (قەڵای گەشتیاری) دەکات، بەڵام، چونکە گرنگی قەڵا بە شێوەیەکی زانستییانە دەخاتە بەرچاو پێمان خۆش بوو بیخەینە نێو بابەتەکانی ئینسکلۆپیدیای هەولێر. (لیژنەی باڵای ئینسکلۆپیدیا).**

**ستان ماک جاهی**
**دکتۆرا لە گەشتیاری نێودەوڵەتی دا**

**١- گەشتوگوزار**

گەشتوگوزار بەشێوەیەکی بەرفراوان بەگەورەترین پیشەسازی لە جیهان دادەنرێت و سەرچاوەیەکی سەرەکی دەسکەوتیش پێکدەهێنێت. بەگەڕخستنی و دۆزینەوەی دەرفەتی کارو دەسکەوتی نەتەوەیی (لە باج...تاد) بۆ ژمارەیەک لەشارەکان و وڵاتان لە سەرتاسەری جیهاندا دروست دەکات. لەوانەیە شوێنە گەشتیارەکان سوودێکی باش بەدەوڵەتە تازە فەراژووەکان بگەیەنێت، چونکە سەرچاوەیەکی دراوی گرانبەها پێکدەهێنێت و گەشتیارانی گەشتوگوزاری نانیشتەجێ لەرووی ئابوورییەوە بەهاوردە گوزارشت دەکرێت، لەبەر ئەوەی دەتوانێ بەشێوەیەکی کاریگەر بەشداری لە هاوسەنگی مووچەی نیشتمانی بکات.

گەشتوگوزار بەپیشەسازییەکی ناسک گوزارشت دەکرێت، ساڵانێکی کەمی رابردوو کۆیەک کۆسپ و تەگەرەی هاتە پێش لەوانە نەخۆشییەکی درم ئەویش جەنگەکانە، کەچی لەگەڵ ئەوەش تا ئێستا هەر لە گەشەسەندندایە. رێکخراوی گەشتوگوزاری جیهانی، کە ئاژانسی نەتەوە یەکگرتووەکانە پێشبینی دەکات بەڕوودو گەشەسەندن لەسەر ئاستی جیهاندا بە بەردەوامبوونی ئەو گەشەسەندنە بۆ ماوەی چەند ساڵێک لە داهاتوودا. گەشتوگوزار لەرابردوو چالاکییەکی تەواوی هەبوو لەلایەن چینی دەوڵەمەندەکان پراکتیک دەکرا. کەچی بوو بە بەشێکی تەواو لەژیانی مرۆڤدا، سەرچاوەیەکی رێکخەریشە بۆ هاوسەنگی خێزان و تاک، بەبێ تێڕوانین لە چینە کۆمەڵایەتییەکاندا.

لەلایەکی دیکە گەشتوگوزار بەپێناوێکی ئاشتی و چالاکی ئابووری دادەندرێت، چونکە خەڵک لەسەر بنەمای بازرگانی بەیەکەوە دەبەستێتەوە. کاتێ هەر تاکێک دارایی دەبێ و بەشێکی دادەدرانەی بەردەکەوێت، ئەوسا هەموویان بەختەوەری روویان تێدەکات. وەک چالاکییەکی کۆمەڵایەتیش خەڵکەکان لەسەر بنەمای کەسێتی بەیەکەوە دەبەستێتەوە. هەروەکو نووسەری ئەمریکی بەناوبانگ مارک توین دەڵێت: (گەشت دەکوژێت و قین لەناو دەبات). گەشتوگوزار پێناوێکە بۆ عەولەمە، بەوەوە دەتوانیت گەشت بۆ شوێنەکانی جیهان بکەیت لەماوەی رۆژێک یان زیاتردا. هەروەها پێویستە ئەوەش بڵێین گەشتوگوزار لە بەهای شوێنە گەشتیارەکان کەم ناکەنەوە بۆ بەسانایی گەیشتنیان، بەڵکو ئەو شوێنانە لەماوەی دەرکەوتنی جیهانەکەیاندا، یان لەکاتی پێشوازیکردنی میواناندا کە لەوڵاتە دوورەکانەوە هاتوون، پیرۆزو پڕ بەهاتر دەکات.

بۆچوونی من لەو تایبەتمەندییە ئەوەیە (گەشت جیهان بچووک

دەکاتەوە، گەشتو گوزاریش گەورەتری دەکـــات، وێڕای ئەوەی دەتوانین سەردانی ئەو شوێنانە بکەین، کە خەونی پێوە دەبینین، کەچی لەگەڵ ئەوەش ناتوانین گەشت بۆ هەموو ئەو شوێنانە بکەین و سەرجەم ئەو شوێنانە ببینین. بۆ وەدیهێنانی ئەو ئامانجە رۆژێ لەرۆژان، گەشتوگوزار ژمارەیەک شوێن دەخەنە روو، زۆر لەشوێنە گەشتوگوزاریەکانیش وروژێنەرن. لەکاتی گەشتکردن فێردەبین کە تێبگەین. لە یەکتر قەبوڵ دەکەین بەڵکو رێز بۆ جیاوازەکانمان دادەنێین. ئەمەش بۆ هەر مەبەستێک لە جیهاندا تایبەتمەندییەکی دەبێ، کاتی لێ بەسەربەری، پارەو پولی لێ خەرج بکەی، مرۆڤایەتی لەسەردانەکە بەها بکەیت.

من پشتگیری لە گەشتوگوزار دەکەم، ئەمەش مانای ئەوە نییە کە پشتگیری لەهەموو گەشتوگوزارە جۆراو جۆرەکان لەهەر شوێنێکدا هەبن بکەم. من پشتگیری لەو جۆرە گەشتوگوزارانە دەکەم، کە سوود بەدانیشتوانە خۆجێیەکە دەگەیەنن، واتە لەسەر کۆمەڵگا پێویستە رۆڵێکی پێشەنگیان هەبێ و دەستپێشخەری بکەن لە هەڵسووڕاندنی گەشتوگوزارەکەدا، کە ئەمەش وێنەیەکی سیاسییانەی دروستی گەشتوگوزار لەخۆ دەگرێت لە نەخشەو پلاندانان، بەرزکردنەوەو بەرەوپێشبردنی، لەنواندنی چالاکییەکان. هەر توخمێک لەو توخمانە وەک ئەڵقەیەک وایە لە زنجیرەیەکی گەوهەری، کە زەروورەو پێویستە بۆ سەرکەوتنی پیشەسازی گەشتوگوزار رێکخرێ وەکو گوڵێکی جوان گەشە دەکات. بەڵام گەر ماوە درا هەروا بەبێ چاودێری دروست گەشە بکات، ئەوا وەک گیایەکی زەرەرمەند گەشە دەکات.

خاڵێکی ساکار لێرە هەیە، ئەویش ئەوەیە گەشتوگوزار هەر دەبێ جا ئێمە ئامادەباشیمان کردبێ یان نەکردبێ. بۆیە لێرەدا پێویستە یەکێ لەم کارانە هەڵبژێرین: یان ئەوەتا دەستپێشخەری پێشکەش بکەین و لەپەنای ئەوەوە سوودەکانی وەربگرین، یان پشتگوێی بخەین ئەوسا لەپەنای کەموکورتییەکانی بناڵێنین.

لێرە باس لە سادەترین کەموکورییەکانی گەشتوگوزار دەکەین، کە پێیەوە دەناڵێنین و ئەویش لەچوار کەرت پێکدێت:

١- گەیاندن و خزمەتگوزارییەکانی پەیوەندیدارن بەگەشت.
٢- پێگە گەشتوگوزارییەکان.
٣- شوێنەکانی پێشوودان (حەوانەوە).
٤- خزمەتگوزاری چێشتخانەکان.

لێرە پیشەسازی گەشتوگوزار ئەوە دەگەیەنێت، کە خزمەتگوزاری دەستەبەر کرابێ بۆ ئەو خەڵکانەی دەڕۆن بۆ شوێنێک بۆ ئەوەی لەشوێنێک نیشتەجێ بن، وەک خواردن و نووستن. ئەم دوو کەرتەی ئەم دواییە شوێنی حەوانەوەو خزمەتگوزاری چێشتخانەکان لەکەرتی میوانداری خۆیان دەگرنەوە. کەواتە مەسەلەکە زۆر سانایە. بەڵام بۆ هەر یەک لەم کەرتانە ژمارەیەک کەرتی لێ هەیە، کە وا لە گەشتوگوزار دەکات پیشەسازییەکەی زۆر ئاڵۆز بێ، ئەویش ئەوەیە چۆن ئەو کەرتانەی لێ بەشێوەیەکی هەماهەنگ کارو تۆکمەیی لەگەڵ یەکتر بەکاردەهێنێت.

رێگەیەکی دیکەش هەیە بۆ چاو پێخشاندنەوە بەم بابەتە، ئەویش ئەوەیە (زانیاری هەڵە، دەرەنجامی هەڵە) گەشتوگوزار پێویستی بەدەسهاتی پیشەیی هەیە بۆ وەدیهێنانی شوێنەکەی لەمیانەی دەرەنجامە پۆزەتیڤییەکان، یان بەخشینێکی کەم کە نایەت تەنیا لەکەمییەوە، نەبێت. بەستنی ئەو کۆنگرەیە سەرەتایەکی گەورە بوو بۆ چڕی خستنە سەر گەشەسەندنی ئابووری لەگەڵ قەڵاتی هەولێردا، وەک بەردی بناغە بۆ کۆنگرەکە. بۆ یەکەم جار لەسەر سایتێکی ئینتەرنێت قەڵاتی هەولێرم ناس کرد، بەوەی کە قەڵات لەسەر لیستی سەد شوێنەوارەکان ناو و شوێنی هاتووە، سەرەڕای وەسفکردنی قەڵات وەک کلتوورێکی زۆر گرینگ، کە پێگەکەی پێویستی بەچاککردنەوەو دەست تێوەردان هەیە.

قەڵاتی هەولێر بەمانای وشەوە پێگەیەکی گەشتوگوزاری جیهانییە. لەتوانایدا هەیە گەشتیاران لەشوێنە دوورە جیا جیاکانی وڵاتانی جیهان بۆ خۆی رابکێشێ. دەکرێ پێگەکانی گەشتوگوزار لەسەر سەرەکی بوون. مام ناوەندی بوون پۆلێن بکەین. کە گومان لەوەدا نییە قەڵاتی هەولێر بەپێگەی گەشتوگوزاری سەرەکی دادەنرێت بەوەی، کە خەڵک پانتاییەکی زۆر ببرن تەنیا بۆ بینینی. هەروەها دەکرێ پێگەکانی

گەشتوگوزار بۆ سروشت و کلتووری (لەوانە دەستکرد) دابەش بکرێت. قەلات پێگەیەکی گەشتیارییە یان کلتوورییە یان دەستکردە. قەلات سوودمەندە بەزیندوویی و چالاکییەکانی ئەو خەڵکەی تیایدا نیشتەجێن. بەدامو دەزگا بازرگانییەکان و ئەو شاندە گەشتیارانەی رۆژانە سەردانی دەکەن. ئەمەش خۆی لەخۆیدا ئەوە دەگەیەنێت، کە پێگەی قەلات رووت یان کەلاوەیەک یاخود مۆزەخانەیەک نییە. قەلات بەرەسەنایەتییە تایبەتییەکەی جیا دەکرێتەوە، چونکە تا ئێستاشی لەگەڵدا بێت بۆ مەبەستە ئاساییەکان لەلایەن دانیشتوانەکەیەوە بەکار دەهێندرێت. لەم رەوەندەوە گەشتیاران ئەو پێگە گەشتیارە رەسەنە بەباشتر دەزانن کە مێژووەکەی زیندوو بێ و بوو بێتە بەشێک لێی.

تاقیکردنەوە ناشێ گەشتیار لەیادی بکات گەر بۆ ماوەیەکی کەمیش بێت هەست دەکات، بەوەی یەکێکە لەدانیشتوانی خۆجێییەکە، تێکەڵ بەکەسایەتییان بووە، دەروانێتە ژیانیان، بەو ئاستەی کە خۆی یەکێکە لەوان. کە ئەمەش وا لە گەشتیاران دەکات هەست بەگەوهەری قەلاتی هەولێر بکەن لەماوەی گەڕان تیایداو بینینی چالاکی رۆژانەیان کە تیایدا پراکتیزەی دەکەن. لەوانەیە گەشتیاران لەناو قەلات بازاڕی بکەن هەتا ئەگەر بێت و کرینی یادگارێکی سادەش بێت. گەر دانیشتوانە خۆجێییەکە بەخۆشیان دروستیان کردبێ.

گەر خواردنێک لەلایەن خەڵکی خۆجێییەکە دروست بکرێ، لەوانەیە گەشتیاران ژەمێک لەو خواردنە بخۆن. یان پشوویەکی کەم وەربگرن و لەسەر تەختەیەک دابنیشن بۆ سەیرکردنی هاموشۆو بزاوتی خەڵکەکەو، یان خواردنەوەی شتێک، کە هەیە یان سەرنجراکێشانی لایەنێک گەر بۆ وتوێژێکی کورتیش بێت. سەرەڕای ئەوە مادامەکی دانیشتوانی خۆجێییەکە شەوانە ژیانی بەسەر دەبەن، لەوانەیە وا لەگەشتیاران بکات، ئەوانیش شەوێک لەوێ بەسەر ببەن. لەدەرەنجامی هەر هەمووی دەبێتە بەشێک لەکلتووری قەلاتی هەولێر.

قەلاتی هەولێر پێگەیەکی شانازییە بۆ ناوچەکە، هێمای شاری هەولێرە. هەروەک کولیسیۆم بۆ رۆماو کرێملنی بۆ روسیا. چونکە هەست بە بەهای بازاڕێکی گەورە دەکات، وەک هێمایەک بۆ شارەکە. هەروەها وێنەی قەلات لەسەر بلاوکراوە گەشتوگوزارییەکان دەردەکەوێت، هەروەها لەسەر بەرگی کتێب و ئەو وتارانەی لەسەر شاری هەولێر دەنووسرێت. لەدەرەنجامدا دەبێتە زۆر لە هەدیەی یادگاری، هەروەها دەشێ ببێتە هێما بۆ کوردستان وەک دیواری گەورەی چین، تاجی مەحەل لە هیندستان. بۆچی؟... چونکە قەلاتی هەولێر پشت بەکۆنییەکەی و هێزی گەلی کورد دەبەستێ. بەم شێوەیە هەر کاتێ خەڵک لەجیهان وێنەی قەلاتیان بینی هەر لەخۆیانەوە بیری هەولێرو کوردستانیان دێتە یاد. چونکە ناشێ بەهاکەی پێوانە بکرێت لەسەر هەردوو ئاستی بازرگانی و نەژادی. بۆیە پێویستە قەلات پارێزراو بێ و بەشێوەیەکی باش و بەردەوام چاک و نۆژەن بکرێتەوە، چونکە دیوارەکانی دەرەوەی بەتەواوی داڕماون و هەروەها ژێرخانێکی ئابووری باشیشی بۆ دەستەبەر بکرێت تاوەکو چالاکییە ئاساییە رۆژانییەکانی برەو پێبدرێ و، پێداویستی بۆ دەستەبەر بکرێت. بێگومان ئەوانە هەر هەمووی پێویستی بەتێچوونی پارەو کۆمەکی تەکنیکی دەبێت.

گەشتوگوزار توخمێکی کۆمەککار پێکدێنێت لەمیانەی دەستکەوت و باجدا. کارێکی باوە لەتەواوی جیهان باج بەسەر مانەوەی گەشتیارە نیشتەجێبوودکان لە ئوتێلەکان دەسەپێندرێت. ئەو باجەش لەلایەن ئوتێلەکەوە بەهاتنە سەری رێژەی سەدی کرێی ژوورەکە کۆ دەکرێتەوە. باشترین سیناریۆکەش لەوەدایە، کە باج تەنیا لەپرۆژەکانی سوود بەپیشەسازی گەشتوگوزارو ئابوورییەکەی دەگەیەنێت خەرج دەکرێت. هەروەها دەشێ رێژەیەکی دیاریکراو لەباجی مەبیتەکان بەشێوەیەکی هەمیشەیی بۆ پارێزگاریکردن لەقەلات تەرخان بکرێت. جاهەر چەند ژمارەی گەشتیارانی مانەوە لەهەولێر زێدە بکات، ئەوەندە زێتر سەندووقی دارایی دەتوانێ پارێزگاری لە قەلات بکات.

سەرچاوەی دیکەش هەن بۆ پەیداکردنی پارە لەلایەن پیشەسازی ناوخۆ بۆ گەشتوگوزار، کە ئەمانە لەخۆ دەگرێت باجی فرۆکەخانە، بەشێک لەکرێی رێپێدان لەلایەن هەندێ

بەشەکانی بازاڕی پیشەیی گەشتوگوزار، یان کرێی هاتنە سەر (باج) بۆ سەر کالاو شمەک و خزمەتگوزار، کە لەلایەن کارە بازرگانییەکانی دیکەی کە بەفەرمی لەلیستی خزمەتگوزارییەکان تۆمار کراوەو لەلایەن گەشتیاران پێشکەش دەکرێن. ئەمەی ئەم دواییە لەکارەکانی بازرگانی دەشێ دیاری بکەین لەمیانەی بوون بەئەندام لەکۆمەڵەی ناوخۆی گەشتوگوزاردا.

لەگەڵ ئەوە پێویستە لەکاتی دانان و سڵەمینەوە وریایی سەپاندنی باجەکان بێ لەسەر گەشتیاراندا، چونکە سەپاندنی باجی زۆر وا لەناوچەکە دەکات ناوێکی خراپ دەربکات. ئەمەش تەنیا کار ناکاتە سەر گرانی نرخ، بەڵکو هەوڵدان بۆ وەرگرتنی ئەو کرێیانەی مافیَ ئەوە نییە لەگەشتیاران وەربگیرێت، چونکە دوای ئەوە دەرەنجامەکە خەسارەتمەند دەبێ لەبازرگانی و تێکڕایی دەستکەوتدا. ئەو کارە لەژمارەیەک لەناوچە ناسراو و بەناوبانگەکان روویدا، لەبەر ئەوەی بارگرانی خستە سەر پیشەی گەشتوگوزار لەباجەکاندا.

سانا ترین رێگە بۆ کۆکردنەوەی پارە لەگەشتیاران، کە سەردانی شوێنە بەناوبانگەکان دەکەن، وەرگرتنی پسوولەی هاتنە ژوورەوەیە. لەگەڵ ئەوەش زۆر ئەستەمە لەهەندێ شوێندا کە هاتوچۆی بەلاشی بەسەرەوەیە. تاکە رێگەی شیاو بۆ ئەنجامدانی ئەم کارە ئەوەیە بەهای زیاتری بخرێتە سەر. باشترین پێناو بۆ چوونە ناو تاوەرێک، کە دیمەنەکەی جوان و رازاوەو گەورە بێت، یان ناو مۆزەخانەیەک، یان ماڵێکی بنەماڵەیەک، یان شوێنێکی دیکەی سنووردار، کە وا لە گەشتیاران دەکات پسوولەی چوونە ژوورەوە بکرن، بۆ ئەوەی بتوانن سەردانی ئەم شوێنەو چێژ بکەن و خۆشی لێ وەربگرن، لەوانە قەڵاتی هەولێریش دەگرێتەوە.

زۆری ئەو گەشتیارانەی لەدوورەوە دێن هۆگری شوێنە دێرینەکان دەبن بەشداری دەکەن لە پارەدان بۆ ئەو هەوڵانەی دەدرێن پارێزگاری لەو پێگەیەدا بکەن. بەتایبەت لەکاتێکدا گەر هاتوو دیارییەکیان پێ بدەن بۆ نموونە پەڕاوگە یان بەڵگەنامەیەکی رێزنان. لەواقیعدا هەندێ لە گەشتیاران کاتێ سەردانی پێگەیەکی دێرین دەکەن و دەبینن بەتەواوی بەسەریەکدا رووخاوە زۆر نیگەران دەبن. لێرە کۆهەوڵێک لەئارادا نابێ، کە خۆی لەخۆیدا بیبێتە هاندەر لەلایەن گەشتیاران تا ئەوانیش بەهای ئەو پێگەیە بنرخێنن. لە هەمان کاتدا لەوە سەرسام دەبن، کە بینینی فیلمێک (٥) دۆلار خەرجی بێت، کەچی سەردانێک بۆ پێگەیەکی جیهانی گەشتوگوزار تەنیا (٥٠) سەنت بێت.

بابەتەکانی تر کە نیگەرانی و بایەخدان دروست دەکەن، لێکدانەوەی پێگەیەکە لەپێگەکان بۆ نموونە قەڵاتی هەولێر، کە بەداخەوە نییە یان ناشیاوە، هەروەها بێ ئومێدیشی لێ دەکرێ، چونکە بەهەزاران میل دەبڕێت بەمەبەستی سەردانیکردنی پێگەیەکی رەنگین و بێ هاوتا، کەچی خزمەتگوزاری نییەو زانیاری تەواویش لەسەر روونکردنەوەی مێژوویی ئەو شوێنە نییە.

ئەمەش دوو سەرچاوەی دیکەن نیگەرانی دروست دەکەن. یەکەم: ئاماژە بەوە دەدات، کە کەمتەرخەمییەک هەیە لەوەی، کە هەست بەشانازی پێکردنی ئەو شوێنە بکرێت، لەکاتێکدا دەسەڵاتدارێتی ناوخۆی گەشتوگوزار ئامادەکاری و شێوەیەکی شیاو خۆش و دەروشاوەیی ببەخشێ نەکراوە، بۆ ئەوەی گەشتیاران لەمیانەی روونکردنەوەکان و لێکدانەوەی هونەری پێشکەشکراو لەلایەن توێژینەوەکاران، لەباوەش بگرێت.

**دووەم:** بەداخەوە، ئەو گەشتیارانەی سەردان دەکەن شارەزاییەکی باش پەیدا ناکەن، کە سەردانی شوێنەکەیان کردووە بەکەمتر بەسۆزو هەست جوولێنەر لای کەسانی دیکە باس دەکات، بۆچی؟.. چونکە دەرک بە بەهای راستەقینەی ئەو پێگە گەشتوگوزارییە ناکەن. دەشێ لێکدانەوەو روونکردنەوەکانی پێگەکە بخرێتە سەر لیستە خزمەتگوزارییەکان بە بەهای خستنە سەر بە لەخۆگرتنی پسوولەی چوونە ژوورەوە لەکاتی رێکخستنیدا. هەروەها دەشێ گەشتیاران بەهۆی کەسێک (رابەر) روونکردنەوەو لێکدانەوەی پێگەکان جێبەجێ بکات و ساناکردنی گەیشتن بۆ شوێنەکان لەکاتی گەرانیاندا. یان بۆ زنجیرەیەک ئەو شوێنانەی پەرژین کراون بە پەت، کە ژمارەیەک چیرۆکمان بۆ دەگێڕنەوەو ناگاتە گوێبیستی گەشتیارانی دیکە، کە لەدەرەوەی دیوارەکە وەستاون. لێرە پەرۆشییەکە لەرابەری پێگەکە زۆر

باشتر دەبێ و دەشێ لەبازاڕەکان لەسەر دیارییە یادگارییەکان بفرۆشرێت لە میانەی بابەتەکانی فێرکردن وەک کتێب و کاسێتی ڤیدیۆ.

- قەڵات هێمایەکە بۆ گەشتوگوزار لەشاری هەولێر، دەشێ بەلەنگەرێکی دابنێین بۆ گەشتیاران لەتەواوی کوردستاندا. وەک لەتەواوی کوردستاندا. وەک تەواوی پاککردنی و وێنەی نەخشەی پێگەی گەشتوگوزارەکاندا. هێڵی گەشتەکان پێکهاتەکی پێشەنگی هەمەجۆر بۆ پێگە گەشتوگوزارییەکان لە ناوچەکە پێکدەهێنێت. هەروەها دەتوانن چڕی بخەنە سەر یەک بابەت، وەک کلتوور، شوێنەوار، یان باڵەخانە دێرینەکان.. جا لەبەر ئەوەی جیهان ئێستا زۆر بەیەکەوە بەستراوەتەوە، ئێمە پێویستیمان بەوەیە بەشێوەیەکی باشتر یەکتر بناسین، هەروا ئێمە پێویستیمان بەوەیە لە ڕۆشنبیری و کلتووری یەکتر بگەین و لەهەمان کاتدا بەشێوەیەکی باشتریش بەرێگەی دیکە لەژیانی یەکتر نزیک بینەوە. سەرەڕای ئەوە حەز دەکەین بزانین چۆن کلتووری دیکە دامەزراون و تا ئەمڕۆکە پێی گەیشتووە. هەڵبەتە ئەم ئاراستەیە جۆرێکی تازەی لە گەشتوگوزاری خوڵقاندووە، کە پێی دەوترێت گەشتی شێوازی ژیان. لە گەشتی شێوازی ژیاندا هەڵدەستین بەسەردانیکردنی شوێنی جۆراوجۆر بەرادەبەدەر لە توانامان، بەئامانجی فێربوون و شارەزا پەیداکردن لە ئەزموونی ڕۆشنبیری بێ هاوتاو کەسایەتییە جۆر بەجۆرەکان. جا هەر چەندە ئەو ڕۆشنبیریانە هەمەجۆرترین ئەوەندە زێتر وروژێنتر دەبن. بەهەر حاڵ لەمیانەی ئەو پرۆسەیەدا دەردەکەوێت، کە چەندە لەیەکچووین بەرێژەی ئەوەندەش لەیەکجیاوازین. خەڵک زۆرجار بەمەبەستی سەردانیکردنی ژمارەیەک شوێنی گەشتوگوزار گەشت ئەنجام دەدات بۆ پراکتیزەکردنیەتی، چونکە ئارەزوو دەکەن بەشداری بکەن گەشتی پەیوەنددار بەبایەخدانی تایبەت، کە لەو میانەدا خەڵک سەردانی شوێنەکان دەکەن بەمەبەستی پراکتیزەکردنی بایەخدانێکی دیاریکراوی، یاخود ئارەزوو لەپشکنینی شوێنەوارەکان یان سەرکەوتنی سەر شاخەکان وەک زیارەتگایەکی ئایینی یان گەشتەکە دڵێرانەیە. کوردستان تێکەڵییەکی تەواوی لەپێگەکانی گەشتوگوزاری تیادایە، کە لەتوانایدا هەیە جۆراو جۆری گەشتیاران سەرنجڕاکێش بکات بۆ گەشتکردن بۆی، کە گومان لەوەدا نییە یەکێک لەوانە سەردانیکردنی قەڵاتی هەولێرە.

ئەو گەشتیارانەی دێن و سەردانی هەولێر دەکەن لەدوو ڕێی سەرەکییەوە دێن: لەناوخۆی عێراق و گەشتیارە بیانییەکان، کە لەژمارەیەک دەوڵەتەوە دێن. هەندێک لەوانە بەتەنیایی دێن، ئەوانی تر بەکۆمەڵ. لێرەدا بۆ سەرنجڕاکێشان و ڕازیکردنی هەردوو جۆر بارەکە پێویستی بەستراتیژیەتی جۆراو جۆر دەبێت.

دەکرێ سەرنجی گەشتیارانی بەکۆمەڵ ڕابکێشین لەمیانەی ڕێکخراوی گەشتیاران لەناو وڵاتەکەیاندا. بۆیە لەسەر دەسەڵاتدارێتی گەشتوگوزاری کوردی پێویستە ڕێگەیەک بدۆزێتەوە بۆ کردنەوەی پەیوەندی لەگەڵ ئەو کۆمپانیانەدا لەوانەش ئەو کۆمپانیانەی خزمەت بەبازاڕەکانی شیاو دەگەیەنن ئەمەش هەر هەمووی پێویستی بەکات و دارایی دەکات.

یەکێ لەرێگە کاریگەرییەکان پێشکەشکردنی گەشتی هۆگری بەڵاشە یاخود بەهەرزان بۆ ڕێکخراوەکانی گەشت و ڕاگەیاندن (هەموو بەکاربەرێک و جاڕدانی بازرگانی) لە وڵاتەکاندا، کە خودی توانایان زۆر باشە. دەشێ (گەشتەکانی هۆگر ڕێکبخەین لەسەر بوودجەیەکی بچووک گەر هاتوو ئامادەکاری گەشتوگوزارە ناوخۆییەکان خزمەتگوزارییان پێشکەش کرد، تەنیا تێچوون بەپێی جۆرە بۆ نموونە وەک: کورسی هێڵەکانی ئاسمانی، ژووری ئوتێلەکان، ژەمەکانی خواردن، گواستنەوەو ڕابەری گەڕان. دەشێ ئەم کارە بەشێوازێکی تایبەت بەرز بکرێتەوە. بۆ نموونە لەکاتێکدا گەر هاتوو کورسی هێڵەکانی ئاسمانی و ژووری ئوتێلەکان بەهەر بارێک بێ نەگیرابوو.

ڕێگەیەکی دیکەی کاریگەریش ئەوەیە نمایشێک لەنمایشەکانی گەشتی نێودەوڵەتی بخەینە ڕوو، هەرچەندە بەپارەیەکی گرانیش دەوەستێ. دەشێ بەدەرەنجامی گرینگی هوشیارکردنەوەو پەیوەندییە زەرووریەکان بۆ پێشخستنی پەیوەندییەکان و بازرگانی بیانوروژێنی. هەڵبژاردنێکی دیکەش لەئارادایە، کە

تێچوونی کەمترە ئەویش کردنەوەی پێگەیەکی گەشتوگوزاری فەرمییە لەسەر ئینتەرنێت. ئەویش پێویست دەکات چڕو پڕ بێ لەزانیاری، متمانە پێکراو و سانا لەسەر ئاستی بەکارهێنەر.

دووەم: دووبارە بەکارهێنانی گونجاندنە.

دووبارە بەکارهێنانی گونجاندن بریتییە لە پرۆسەیەکی گونجاندنی خانووبەرەکان بۆ بەکارهێنانێکی تازە بەمەبەستی پارێزگاریکردن لە سیما مێژووییەکەی. بەمەزەندەی من هەرەمێکی گرینگ و گەورە وەک قەلاتی هەولێر لێکۆڵینەوەیەکی گرینگە بۆ بابەتی دووبارە بەکارهێنانی گونجاندن. هەر چەندە چەندین سەدەیە بوونی هەیە، گومان لەوەدا نییە زۆر بەکارهێنانی هەمەچەشنەی بەخۆ گرتووە. کوردستان ئێستا پێ دەنێتە سەردەمێکی تازە لە گەشەسەندنی ئابووریدا، کە گەشتوگوزاریش دەگرێتە خۆ. پرسیارێک خۆی دێنێتە پێشەوە (چۆن دەکرێ قەلاتی هەولێر بۆ وەدیهێنانی ئامانجە تازەکانمان بەکاربهێنین)؟ کەواتە لێرەدا دەستبەجێ دوو پرسیار لە هزر خۆی دەنوێنێت:

یەکەم: چۆن دەتوانین ئەوە وەدەست بهێنین گەر ئێمە فریای ئەو زەرەرانە نەکەوین، کە بەر هێمای ئەو شارە دێرینە کەوتووە؟

دووەم: تەنیا ئەوە نییە چۆن بتوانین فریای ئەو زەرەرو زیانە بکەوین، بەڵکو چۆن بتوانین بایەخ بەو گرینگییە بدەین کە پێناوێکە بۆ لەخۆگرتنی پەیداکردنی دارایی بەئامانجی پارێزگاریکردن لێی؟

بابگەڕێینەوە بۆ ئەو وتووێژەی لەسەر چوار کەرتە سەرەکییەکەی گەشتوگوزار کردمان لەلایەن سەرنجەکانی تێڕوانینی گەشتوگوزاردا. یەکەم گواستنەوەو خزمەتگوزارییە پەیوەندارییەکانی بەگەشتەکان. ژمارەیەک لە گەشتیاران بەپاسەکان دەگەن، ئایا شوێنێکی شیاو بۆ وەستانی ئۆتۆمبێلەکان (لە دەرەوەی قەلات) بۆ ئەوەی بەسانایی بێنە ژوورەوەو هۆکارێکی زەحمەتکێشی نەیەتە پێشیان لەهاتوچۆدا، لەگەڵ گرفتی پیسبوونی ژینگە؟ ئایا رێگەی پیادە لەناو قەلات هەیە بۆ هاتوچۆی گەشتیاران. ئەی بۆ ئەو بەتەمەنانە چی دەکرێت، کە پەکیان کەوتووەو، دەگەڕێن و وا راهاتوون نازانن پارەی زۆر خەرج بکەن؟

ئەو خزمەتگوزاریانەی پەیوەندارن بەگەشتەکان لەهەمان پۆلینی گرنگین لە کەرتی گواستنەوەدا، چونکە کۆمەکی گەشتیاران دەکات بۆ (ئەوەی بچنە) هەر شوێنێک، کە ئارەزوو بکەن سەردانی بکەن. شتێکی رەوایە بنکەیەکی زانیارییەکانی گەشتوگوزار لەناو قەلات دابمەزرێ، چونکە کەوتۆتە ناو جەرگەی شار. کە پێگەیەکی سەرەکی گەشتوگوزارەو تەوەری چالاکی گەشتوگوزارییەکانە. کە بەزۆری بنکە زانیارییەکانی گەشتوگوزار لەو شارە زانیاری شوێنە کرێیەکان دەنێرن بۆ رێکخراو و ئاژانسە ناوخۆییە بۆ گەشتەکان. جا دەشێ رۆڵی خۆی ببینێ بەپێشکەشکردنی خزمەتگوزارییەکان وەک بنکەیەک بۆ کارگێڕی کارەکان، هەروەها بۆ پەیداکردنی داهات لەرێگەی رێکخستن و بەکرێدانی شوێنەکان.

خودی قەلاتی هەولێر پێگەیەکی گەشتوگوزارە لەکەرتەکانی پێگە گەشتوگوزارییەکاندا. بەوەی کە هەرەمێکی خاوەن زۆر دیاردەیە، کە لەهەموو لایەکەوە پێگەیەکی گەشتوگوزاری لێ پێکهاتووە. ئەمانە هەر هەمووی پێویستی بەناوەڕۆکە، نەخشەی تیایدا کێشراوە، لەمیانەی دووبارە بەکارهێنانی گونجاندنەوەی ئاستی بەرز دەبێتەوە رادەگیرێ. بازارەکان و دوکانە کۆنەکان توخمێکی نایاب پێکدەهێنن بۆ شێوازەکانی ژیان لەگەشتدا لەپێگە گەشتوگوزارییەکاندا.

هەروەها دەکرێ گەشە بەگەشتی بۆنەکان بدرێت لە قەلاتدا بەهاندانی زیندووکردنەوەی کەرنەڤالە جۆراو جۆرەکاندا و ئاهەنگێرانی بۆنە ئاینییەکان یان مێژوویی، یاخود ئاهەنگگێرانە رۆشنبیرییە کوردییەکان، دەشێ بەرنامە بۆ هەموو شتێک دابڕێژرێ هەر لەچالاکییە رێپێوانەکان و کارە هونەرییەکانەوە بگرە تا دەگاتە رۆژانەی بازاڕی و نمایشە ئاهەنگییەکان لەرێگەی فۆلکلۆری (میللی)یەکانەوە. کە لەوانە ژمارەیەکی زۆر لەو سات و کاتەدا بوونیان هەیە، کەواتە دەشێ ئەو کردنەوەیە بگونجێنین بۆ گەشتیاران.

چونکە پێگە گەشتیارییەکان پاڵنەرێکی بەهێزە بۆ گەشتوگوزار، وا لەخەڵک دەکات نیشتمانەکەیان جێبهێڵن روو لەشوێنەکانی دیکە

بکەن. بۆیە رۆڵێکی گەورەو سەرەکی دەبینێ لەدیارکردنی گەشەسەندنی گەشتوگوزاردا. هەروا پێویستە پێگەکانی گەشتوگوزار گونجاو بن لەگەڵ چوار وەرزەکانی ساڵ و کەش و هەوای جۆراو جۆردا. ئەویش بۆ خولقاندنی پیشەیی گەشتیاری نێودەوڵەتییە. بایەخدانی گەورەمان ئەوەیە کەش و هەوایەک بێتە پێشەوەو گەشتیاران ناچار بکات لەماڵەکان بمێننەوە جا یان لەبەر ئەوەیە کە هەواکەی زۆر گەرمە یاخود زۆر ساردە، یان لەبەر ئەوەی باران بەلێزمە دەبارێت...تاد. پێگەکانی گەشتوگوزاری سەر داخراو، یان بەلایەنی کەم ئەو پێگانەی گەشتیاران دەپارێزن لەگۆڕانی کەش و هەوادا. چونکە ئەمە بەزۆری کۆمەکدەرە بۆ هەڵقولانی گەشتوگوزار کاتی کەش و هەوا شیاوە لەگەڵ چالاکییەکانی دەوروبەردا. دەکرێ هەندێ لەو شوێنانە لەمیانەی دووبارە بەکارهێنانی گونجاندن دروست بێتەوە لەکاتێکدا گەر هاتوو قەلات لەو جۆرانە لەچاو شوێنە گەشتیارەکان هەژار بوو.

دەشێ زۆری باڵەکان بگۆڕێن بۆ شوێنەکانی دالدەدان، کە لە هوتێلی پوتیک بکات (ئوتێلەکان کۆگای بازرگانی لەخۆ بگرێت)، نووستن- ژەمی بەیانیان، شوێنی خێزان و ئوتێل. جیهان پڕە لەئوتێلی هاوشێوەو هەر هەموویان لەسەر هەمان شێواز بونیات نراون بەمەبەستی دەستەبەرکردنی ئەوەی گەشتیاران چاودێری دەکەن، بەلام سستە، بەتایبەت لەچاو شوێنێک دەوڵەمەند بێت بەمێژوو و کلتوور وەک کوردستان و گەشتیاران خۆشی تیایدا ببین، بەوەی لەدالدەی کوردیدا شێواز ببین. لەوانەشە دەشێ هەندێ لەباڵەکانی قەلات بەمەبەستی دالدە بەکار بهێندرێت.

گەشتیاران لە چی دەگەڕێن کە بیکەنە دالدەی خۆیان؟ لەشوێنێکی ئارام و لەبار دەگەڕێن بۆ ئەوەی شەوی تیادا بەسەربەرن. ئارەزوو دەکەن کە شوێنێکی ئارام و پڕ هەموو شتێک بێ، WC و شوێنی پاککەرەوە، شوێنێک دسکەوتی کاری کەسێتی و هەندێ سیمای ناوخۆی لێ بێ، بۆ پاڵپشتکردنی ئەو خاڵە ئەمریکییەکان رێز لە تەنەکەچییەکانیان دەگرن.

ئەمەی پەیوەندداریشە بەدوا کەرت، خزمەتگوزاری ژەمەکانی خواردنە. قەلات ئێستا یان لە داهاتوودا پڕ دەبێ لەتێکەڵی چێشتخانەو قاوەخانەو باشترین ژەمی خواردن و خواردنەوەی میللی لەنێوەندێکی وادا، کە لەبیر ناکرێ پێشکەش دەکات. وا باشە لێرەدا چالاکی ئاسوودەیی و خۆشی نەتەوەیی وەک مۆسیقاو گۆرانی و هەڵپەرکێی میللی پێشکەش بکەن. هەروا وا باشە ناوی لیستی خواردنەکان بۆ زمانە جیاکانی دیکە وەربگێردرێ. لەدامەزراندنی دووبارە بەکارهێنانی گونجاندنی چێشتخانە ژەمی خواردن پێشکەش بەکۆمەڵە گەرۆکەکان بکرێت. یان شوێنێک بدۆزنەوە بۆ بەخۆشبردنی کات بەشێوەیەک، کە لەسەر شانۆ نمایش بکرێ.

**سێیەم: دەستکەوتی سەرمایەو شارەزایانی جیهان**

لێرەدا زۆر سەرچاوەی پارەدارکردن هەیە بۆ دووبار، پرۆسەی نۆژەنکردنەوەی عێراق، لەوانەش کوردستان. راپۆرتەکان ئاماژە بەوە دەدەن، کە کوردستان بەتایبەت دەبێتە ناوچەیەکی نایاب بۆ وەبەرهێنانی کەرتی تایبەت. بەلام سەرجەم وەبەرهێنەرەکان لەسەر مەترسی و داهات بوونیات نراوە. کەمێ لەخۆبەخشەکان و وەبەرهێنەرە نێودەوڵەتییەکان تەنیا بەخشین لەسەر بیرۆکەی نوێ و نیازی باش دەبەخشن. ئەوان چاوەڕوانی داهات دەکەن جا چ لەسەر شێوەی سوودەکان یان کاری بازرگانی سەرکەوتووی بەردەوام بێ.

لەمیانەی وتووێژەکانماندا لەگەڵ کارمەندانی بانکی نێودەوڵەتی پێیان گوتم: هەڵوێستی فەرمی بانکی نێودەوڵەتی ئەوەیە بەرنامەیەکی وای بەدەستەوە نییە بایەخی تایبەتی بەگەشتوگوزار بدات.

لێرەدا دوو سەرچاوەی سەرەکی دەتوانن پارەداری وەبەرهەم هێنانی قەلاتی هەولێر بکەن ئەوەش دەزگای ئاغاخان ترست کە رۆشنبیرییەو، سەندووقی کلتووری جیهانییە. دەزگای ئاغاخان ترست بارەگاکەی لە جنێف/ سویسرایە. کۆمەکی پرۆژەی هاوشێوەی کردووە لەقەلاتی هەولێردا. لەزێمنی ئەوەش پارێزگا لەسەر قەلاتی سەلاحەدیندا لەسوریا. چاککردنەوەی دیواری شاری ئەییوبیە لەمیسر.. سەندووقی کلتووری جیهانی بارەگاکەی لە سان فرانسیسکۆ:

کالیفۆرنیایە، چالاکە لە چاککردنەوەی پێگەکان لەجیهاندا. لەوانە نەینەواو کۆشکەکانی نەمرود لە عێراق و، لەهەمان کاتدا لێکۆڵینەوە کردن لەسەر کوتال هویوک و پێگەی نیولیسیک لەناو جەرگەی تورکیا، کە مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ (٩٠٠٠) ساڵ.

لەچەند سەرچاوەیەکی دیکەی پارەدارکردندا کە پسپۆری پیشەن ئەویش (ڕێکخراوی UNESCO)، و سەندووقی دانانی یادگاری جیهانی و، ئەنجوومەنی نێودەوڵەتی بەپێگەکان و، دانانی پەیکەرو، پەیمانگەی جیتی بۆ پاراستن و، بنکەی نێودەوڵەتی تایبەت بەلێکۆڵینەوەی پاراستن و، چاککردنەوەی کەلوپەلە ڕۆشنبیرییەکان.

کەواتە پەیامی سەرەکی، کە پەیوەندداره بەپارەدار کردن دەبێت پابەندبێ بەداواکارییەکان جا چ وەک کەرتی تایبەت بەهاوبەشبوون یان بانکی بازرگانی.. لەپلانەکەتدا روون دەبێتەوە، کە پرۆژەکەت ئاراستەکەی بازرگانی دروستەو بەخستنە سەری سوودەکان بۆ کۆمەڵگەی ناوخۆ یان ئابووری نیشتمانی بەتەواوەتی. پێشبرکێی پارەدارکردنی جیهانی زۆر ئازا. بۆیە بەهەند وەرناگیرێت تەنیا ئەو پێشنیازانە نەبن، کە پابەندن بە بەندەکانی بەرنامەی (مەرجە سەرەکییەکان).

**کۆتایی**

قەلاتی هەولێر، پێگەیەکی گەشتوگوزاری جیهانی بە شاری هەولێرو، تەواوی بەشەکانی کوردستان و، سەرتانسەری عێراق بەخشیوە. دووبارە بەکارهێنانی گونجاندن پشت بەڕەهەندی باشترکردنی بەها گەشتوگوزارییەکەی دەبەستێت لەجۆری ویستراوی گەشتوگوزاردا لەلایەن هەموو دەسەلاتدارییەکانی دەسەلاتدارێتی قەزایی و پیشەییدا، کە بەرپرسیارییەت دەخەنە ئەستۆی خۆیان. هەروەها ئەمە کاریگەری دەخاتە سەر نیشتەجێبووەکانی ئێستاکەو کرێگرتەکان لە قەلاتدا. جا کاتێ ئەو پلانە دێتە جێبەجێ کردن دەبێ هەموو ئەو شتانە بەهەند وەربگیرێ، کە تایبەتمەندە بەخاوەن مافەکان لەوانە.

بەلام نیگەرانی گەورە لەو کۆنگرەیەدا، کاریگەری قەلات بوو لەسەر قەلات، بەوەی ئایا گەشتوگوزار لایەنێکی پێچەوانە بەنێگەتیڤی بەسەر دەخولقێنێت، کە ببێتە هۆکاری ئەوەی باری هەیکەلی ئێستاکە تێک بدات. یان وەک شوێنێکی گوزەری ژیان، یاخود وەک بنکەیەک بۆ شارو بۆ کورد. ئەم سەرچاوانە هەر هەمووی لەرووی یاسایی و ئاخاوتندا جێی نیگەرانین. بۆیە لەسەرەتادا پێویستە زۆر بەڕاست و دروستی و ڕاشکاوانە چارەسەری ئەو سەرچاوانە بکرێت.

بەمەزندەی من، دەشێ گەشتوگوزار هاوڕێیەکی خۆشەویست بێ بۆ قەلات. چونکە گەشتوگوزاری پارەدارکردن لەدایک دەبێت بۆ بەرژەوەندیەکانی پەیوەنددار بەقەلات و درێژەدان پێی بەشێوەیەکی بەردەوام، بۆ باشکردنی ژێرخان کە بەسوود گەیاندن دێت بۆ ئەو خەڵکەی تیایدا نیشتەجێن، لەپێناو زیادکردنی داهاتی خەزانەکاندا. هەروەها بۆ باشترکردنی بەرنامە کۆمەلایەتییەکانە، کە پێویستی بەباشترکردن هەیە. هەڵبەتە ناشێ ئەو هەموو شتانە وەک دەستکەوت بەدەست بهێندرێت تەنیا لەمیانەی دانانی پلانێکی تۆکمەوەو کارگێڕییەکی باش نەبێت، لەگەڵ وەدەستکەوتنی زانیاری زۆر لە دەزگاکانی پاراستن و شوێنەوار ناسەکان و کارمەندانی حکومەت و شارەزایانی پیشە گەشتوگوزارییەکان و ئەوانەی تیایدا نیشتەجێن.

کاتێ پیشەی گەشتوگوزاری ناوخۆ تایبەت بەگەشتوگوزار لە هەموو ڕوویێکەوە بەتەواوی کار دەکات، ئەوسا وەک بەشێکی تەواوکەر کار دەکات بۆ ئابووری، کە ڕۆڵی خۆی لە گەشەسەندندا دەبینێت.. بۆچی؟ چونکە گەشتوگوزار پارە لەدەرەوە دێنێت کە لەناوخۆ لەنێوان زۆر لەکارە بازرگانییەکانی دیکە خەرج دەکرێت. گەشتوگوزار کێبرکێ ناکات، بەڵکو بەمیوانێک بۆ کارە بازرگانییەکانی دیکە گوزارشت دەکرێت. سەرکەوتنی گەشتوگوزار لە هەولێردا پشت بەچۆنیەتی پارێزگاریکردن لەقەلات لەهەموو ڕوویێکەوە دەبەستێت. کە بەڕاستی گەشتوگوزار بێ پارەدارکردنی تیایدا دەستەبەر کرابێ بۆ پارێزگاریکردن لێی. جا کاتێ ئەوەیان ئەنجامدا، بەشدارییەک لەنێوان گەشتوگوزارو پاراستنی قەلات بەدوایەوە دێت بە گەشەسەندنێکی گەورە بۆ کوردستان و، شانازیکردن پێی، کە دەبێ (قەلات) هێمایەکە بۆ گەلی کورد.

*




# قەڵای هەولێر و گەشت و گوزاری

**نەسرەت سابیر شێخە خۆشناو**

**پێشەكی:**

لەبەر ئەوەی قەڵاتەكەی، نەك تەنیا لە ئاستی كوردستانی عێراق، بەڵكو لەئاستی جیهان بەگشتی نموونەیەكی دەگمەنە. بەهۆی شوێنەوارەكەی و بایەخی گەشت و گوزاریی شوێنەكە، پێویستە بەپێی پلانێكی زانستی ئامانجدار، گرنگی پێبدرێت و كار بۆ پەرەپێدانی بكرێت.

وەبەرهێنانی بینایی خۆی دەنوێنێت، سەرەڕای ئازادكردنی هەردوو كەرتی گشتی و تایبەت لەچالاكی و دامەزراندنی پرۆژەی گەشت و گوزار، سەرەڕای ئاسانكاری تایبەت بۆ وەبەرهێنەران، وەك لێبوردن لەباج و گومرگ لەداهاتی گەشت و گوزار. واباشە حكومەتی هەرێمی كوردستان هاوبەشی بكات لەم خزمەتگوزارییەی كە پێویستە بۆ پرۆژە گەشت و گوزارییە گشتییەكان، وەك هەمواركردنی رێگا و تۆڕی پێشكەوتوو و تایبەت بە ئاوو كارەبا و گەیاندن بۆ گەشت بوارەكان بەتایبەتی قەڵای هەولێر وەك ناوەندێكی شوێنەواری دێرین و رەسەن، نەك هەر لەسەر ئاستی هەولێر و عێراق، بەڵكو لەسەر ئاستی جیهان.

گەشت و گوزار كارسازێكی نوێیە، لە سەدەی بیستەم دروست بوو، و خێرا پەرەی سەند تا داهاتی گەشت و گوزار بوو بەسەرچاوەیەكی گەورە لە سەرچاوەكانی داهاتی نەتەوەیی هەندێ دەوڵەت.

بە مەبەستی پاراستنی ئادگارە ژینگەیی و كلتوورییەكەی، بێ ئەوەی كار لە بەهای بكات و كاری هەڵكۆڵینی شوێنەواری تێیدا، قەڵات شوێنێكی تۆبۆگرافی بەرچاوە لە هەولێردا، (٢٥ مەتر بەرزە و رووبەری ١١٠ هەزار مەتر دووجای داگیر كردووە).[١]

دیارە راستەوخۆ سەرنجی هەر كەسێكی بێتە هەولێر رادەكێشێت و ئەمڕۆ بارودۆخ زۆر لەبارە بۆ ئەوەی بەرنامەیەكی چڕو پڕ پەیڕەو بكەین بۆ زیندووكردنەوە و نۆژەنكردنەوەی قەڵات. پێویستە ئەوەشمان لەبەر چاو بێت كەوا نۆژەنكردنەوەكە بەمەبەستی بەردەوامبوون بێت لە خزمەتكردنی دانیشتوان وەك بنكەیەكی رۆشنبیری و گەشت و گوزاری.

دیارە قەلاّی هەولێر، دەکرێ ببێتە شوێنێکی جیهانی بۆ گەشت و گوزار- وەک شوێنێکی بەرچاوی شوێنەوارێشە. هەر چەندە شوێنکاری ئابووری و کۆمەلاّیەتی و سیاسی گەشت و گوزار سازی بە جۆرە جیاکانی و بە چالاکییە فرە لایەنەکانی زۆر وزە بەندەن، بەلاّم بەلّگەکان بەکردار و بە ئەزموونی دەولّەتان ئاماژە بەوە دەکەن کەوا گەشت و گوزار رۆلّێکی گەورە دەبینێت لە مەسەلەی گەشە پێدان بە چەمکە گشتییەکەی. ئەم بایەخدانە بەکەرتی گەشت و گوزار لەزۆر ولاّتی جیهاندا داهاتەکەی بەشێکی زۆر لەژمارەی ناردە نادیارەکانی پێک دێنێت کە یاریدەی هاوسەنگکردنی بودجەی بازرگانی دەکات و لەسەرووی ئەم لیستەشەوە ولاّتانی سویسرا و ئیتالیا و ئیسپانیا و ولاّتانی دیکە کە لەو هەولّەدان گەشت و گوزار بکەن بەئامرازی زیادکردنی داهاتی نەتەوەییان و بەرزکردنەوەی ئاستی گوزەرانی هاوولاّتیانیان.

تێبینی ئەو گۆرانکارییانە دەکرێت کە لە بواری گەشت و گوزار هاتۆتە دی، هەر لە کۆتاییەکانی سەدەی رابردوو، بەهۆی ئەم گۆرانکارییە کۆمەلاّیەتییانەی زۆربەی دەولّەتانی جیهانی گرتۆتەوە لە ئاکامی گەشەسەندنی ئابووری دەولّەتانی ئەورووپا و ئەمەریکا، لەدوای جەنگی جیهانی دووەم. ئەم گۆرانکارییانە بوونە هۆی دەرکەوتنی چینێکی نوێ لەخەلّک کە پێشتر بێ بەش بوون لە گەشت و گوزار، لە هەمان کاتدا چینی هەرە دەولّەمەند و ملیۆنێرەکان لە بەرچاو بگیرێت و بەپێی داهاتی ئەم چینە شوێنی کات بەسەربردن و میوانخانەکان دروست بکرێن[٢].

لەخوارەوە چەندان پێشنیار پێشکەش دەکەین بە مەبەستی سوود وەرگرتن لەم شوێنە گەشتیارییانە:

١- دۆزینەوەی شوێنەواری لەبار و بالاّ بۆ هەلّسوکەوت کردن لەگەلّ گەشتیار.

٢- پەرەدان بەقەلاّی هەولێر و دابینکردنی پێداویستییەکانی وەک ناوچەیەکی گەشتیاری بەدروستکردنی میوانخانەی بالاّ و شوێنە کلتوورییەکان بەشێوەیەک سوودی هەبێت بۆ تێیدا ژیانی گەشتیار، بە مەرجێک مۆرکی رەسەنی ئەو شوێنانە بزر نەبێت.

٣- داهێنانی شتی نوێی گەشتیاری کە بە (مۆدەی گەشتیاری) ناسراوە و سەرنجی گەشتیار رادەکێشێت و کۆمپانیا گەشتیارییەکان چاوی لێ بکەن و پەیرەوی بکەن.

٤- بلاّوکردنەوەی رۆشنبیریی شوێنەوارناسی لە کوردستان بەگشتی و گەران بەدوای شوێنەوار بەپێی رێچکەی زانستی و بایەخ پێدان و جوانکردنی و لە ئاستی جیهانیدا تۆمار بکرێت.

هاوکات دامەزراندنی مۆزەخانە و ئامۆژگاری تایبەت بەشوێنەوار بۆ هێنانەکایەی نەوەیێکی وشیار، بۆ ئەوەی لەپاشەرۆژدا ئەم ئەرکانەی پێ بسپێردرێت، پێشنیار دەکەم شوێنی قەلاّت بێت. لە هەمان کات سوودوەرگرتن لە راگەیاندنی بینراو و بیستراو و چاپەمەنی بۆ شوێنەوارەکان و دەست تێوەردان و بەیاسا بریاری چەندان سزا بسەپێندرێت بەرامبەر سەرپێچیکاران.

٥- پێویستە تۆرێک لەبنکەی کۆمپانیاکانی گەشت و گوزار لەدەرەوە و ناوخۆدا هەبێت بۆ هاوردنی گەشتیار و ئاسانکاری بۆ گەیشتنیان بەم کۆمپانیایانە لەولاّتی خۆیان.

٦- هاوکاری و گونجاندن لەنێوان دامودەزگاکانی پەیوەندیدار لە کاروباری گەشتوگوزار لە ناو هەرێمی کوردستان و گشت عێراقدا، وەک: کۆمپانیا گەشت و گوزارییەکان، بریکارانی گەشت، رێبەرانی گەشتوگوزار، بۆ ئامادەبوون لە بازاری جیهانی گەشت و گوزار لە بواری وەبەرهێنان، فراوانکردنی رۆلّی کەرتی تایبەت و پەرەپێدانی سیستەمەکانی گەشت و گوزار، لەبەر ئەوەی ئەم لایەنانە شارەزای دیدو هەلّکەوت و توانست و ئیمکانیاتی بواری گەشت و گوزارین.

٧- ئامادەکردنی کادیری بواری گەشت و گوزارسازی، بۆ ئەوەی بتوانن کاری خۆیان ئەنجام بدەن، لەرێگای مەشق پێکردنیان و فێرکردنی زمانی بیانی زیندوو و شێوازی هەلّسوکەوتی لەبار لەم کەرتەدا کەوا وەبەرهێنان لە بازاری گەشت و گوزاردا پەرە پێبدەن.

٨- دانانی لیستی هاندەر و ئەگەری پێویست بۆ ئەوەی کارامە و لێهاتووەکانی بواری گەشت و گوزار لە هەموو شوێنێک چالاکانە کار بکەن و دانانی لیستی سزاکان و برگەی سزادانی سەرپێچیکاران و سەرپێچیکردنی وەک بەرزکردنەوەی نرخ، پابەند بوون بەکات و ساتی شوێنگرتن، خراپ سوود وەرگرتن لە پایەو خزمەتی خراپ، پابەندبوون بەپاک و خاوێنی و دابینکردنی مەرجی سەلامەتی لە ئۆتۆمبێل و باڵەخانە گەشت و گوزارییەکان، بە مەرجێک بەشێوەیەکی خولەکی و ریکوپێک چاودێری بکرێت لەلایەن لایەنی پەیوەندیدارەوە.

٩- هاوکاری کردن لەگەڵ لایەنەکانی پەیوەندیدار بەگەشت و گوزار و شوێنەوار لەنێو عێراق و دەرەوەدا.

١٠- پەرەپێدانی سازگاریی گەشتیاریی پێشکەوتووی وا کە بتوانێت توانا و چاوییەکانی کوردستان بخاتە گەڕو، سوودیان لێ وەرگرێت.

١١- ناوە ناوە چاو بەتێچوونی کاری گەشت و گوزار بگێردرێتەوە بۆ ئەوەی لەگەڵ داهاتی توێژی گەشتکاران بگونجێت، و نرخ کەم بکرێتەوە تا نزمترین ئاست، کە دەشێ بگاتە کەمتر لەتێچووی، لەبەر ئەوەی لەتەک ئامانجی داهاتی گەشت و گوزار لە کوردستان ئامانجی دی رۆشنبیری و راگەیاندن و مرۆیی هەیە.

١٢- ئاسانکاری بۆ هاتنە ناوەوە و چوونە دەرەوەی گەشتکار و هاندانیان بۆ سەردانی کوردستان و کەمکردنەوەی کۆت و بەندی دارایی و گومرگی لە گەشتیاران و خاوەن دەزگا و میوانخانەی گەشت و گوزاری، بۆ یارمەتیدانیان بۆ ئەوەی خزمەتگوزاری بە کەمترین تێچوو پێشکەش بکەن.

١٣- پێویستە دەستەی گشتی گەشت و گوزار، گرنگیی ئاگاداری و ریکلام و بەرمێن کردنی گەشتیاری پێویست بزانێت، بۆ ئەوەی سەرنجی گەشتیاران بۆ ئەم بەرنامانەی گەشتیاری رابکێشێت و پێویستە دەستەی گەشت و گوزار هەڵمەتی ریکلامی و بەرمێن کردنی گەشتیاری کوردستان بکات، بەچڕوپڕی و سەرنجراکێش لە کەناڵەکانی راگەیاندن.

١٤- رێکهێنانی ئەرکە راگەیاندنەکییەکان و چالاکییە ریکلامییەکان لەناوەوە و دەرەوە، سەرپەرشتی کردنی سیاسەتەکانی بازاڕی کاری و بەرمێنکردن لە بازاڕەکانی جیهان و سوود وەرگرتن لە شارەزایانی جیهانی لێهاتوو، خاوەن زانیاری و ئەزموون لە بواری گەشت و گوزاردا.

١٥- سوود وەرگرتن لەهەندێ خانووی کلتووری، دوای نۆژەنکردنەوەیان، وەک شوێنی نیشتەجێبوونی کادیری گەشت و گوزار یان شوێنەوارناس و بەنرخێکی گونجاو بکەین بۆ ئەوەی هانبدرێن کە لەنزیک شوێنی کاریان نیشتەجێ بن، ئەوەشیان ئاسانکارییە بۆ گەیشتنە شوێنی کارو هاوکارییەکە لەرووی داراییەوە.

١٦- پێشنیاری دامەزراندنی وەزارەتێکی تایبەت دەکەم بۆ کاروباری گەشت و گوزار و شوێنەوار، بەناوی "وەزارەتی گەشت و گوزار وشوێنەوار"، لەبەر پەیوەندی پتەو و کاریگەری نێوان گەشت و گوزارو شوێنەوار.

١٧- سوود وەرگرتن لە سەرمایەی خۆماڵی و نیشتمانی، بۆ هاوبەشی کردنیان لە نۆژەنکردنەوەی شوێنە گەشتیارییەکان بەقەڵای هەولێریشەوە، چ لەرێگای هاوبەشیکردنی بەپشک یان بەتەواوی تێچوون بەم جۆرە.

دەرفەتێک پەیدا دەبێت بۆ کەمکردنەوەی رێژەی بێکاری لە کۆمەڵگەدا و دروستکردنی دەرفەتی کاری نوێ.

**سەرچاوەکان:**

١- شیرزاد. شیرین احسان. (تطویر قلعة اربیل) رسالة ماجستیر، ترجمة السید عرفان سعید.
٢- خوشناو، نصرة صابر، ٢٠٠٣. دراسة تحلیل مقومات النظام المحاسبي الفندقي بالتطبیق علي فندق چوارچرا في اربیل، رسالة ماجستیر، لكلیة الادارة والاقتصاد، جامعة صلاح الدین/ اربیل.
٣- الانصاري، اسیا محمد امام- عواد ابراهیم خالد ٢٠٠٢، ادارة المنشات السیاحیة، ط١، دار الصفا للنشر والتوزیع عمان.

# کەنیسەی کۆیە

## تاهیر ئەحمەد حەوێزی

وەختێ خۆی لە کۆیە تەنها یەک ماڵە دیانی لێ بووە، بە ناوی (خۆشاب کۆ = خۆشاوەکۆ). ئەوانی تر هەریەکەی لەلایەکەوە هاتوون، وەک: (هیران، شەقلاوە، دیانە، موسڵ) هەندێک لەوانەی لە کوشتاری ئەرمەنەکان لە تورکیا هەڵاتن و هاتنە ئەم شارانە.... نەیانوێراوە لە کۆیە کەنیسەیان بۆ بکەن، و لە هەرمۆتەیان داناوە. لە کۆیە کەنیسەیەکی بە قوڕ هەبوو، هەر ماڵێک بوو، کرابوو بە کەنیسە، لەپێش ساڵانی (١٩١٣) بەردیان کێشابوو، کە کەنیسەی پێ دروست بکەن، دەڵێن: (حکومەتی عوسمانی، کە ویستی بینای قوتابخانە دروست بکا، بەردەکەی کەنیسەشیان بردووە، بەناوی (تبرع) لە بینای قوتابخانەکەیان بەکارهێناوە.

لەبەرئەوەی مزگەوتی گەرموکی لە کەنیسەکەی نزیک بوو، نەدەبوایە کەنیسەکە ئەوەندە بڵندبێ، بەسەر مزگەوتەکەدا بنۆڕێ.

لەدوایە کە ئینگلیز کۆیەی خستە ژێر ئیدارەی خۆی، دیانەکان کەمێ سەربەستییان پەیاکرد. لە ساڵی (١٩٢٢) دەستیان بە تەعمیری کردەوە، بەڵام لەبەر بۆردومانی ئینگلیزی نەتواندرا، تەواوی بکەن.

(حاجی ساڵح ئەحمەد) گوتی: من و مام (مراد) سابلاغی لەبۆردومانی، بەردمان بۆ قەشەی دەکێشا، عەلە کەچەڵیش و عەبدوڵڵا کەچەڵی شیرینی و کەریمی فەقێ ئەحمەدی، بەردیان بۆ ماڵی (جەمیل ئاغا)ی دەکێشا، کووردەیەکی گێچیان بە شەریکی لەودیوی ماڵی (جەمیل ئاغا) دانابوو، (٥٠٠-٦٠٠) عەلبە گێچی دەگرت، لەبۆ کۆشکی (جەمیل ئاغا) و (کلیسە)ی دیانان، ئێمە بۆ بەردان دەچووینە هەوراز (زرێبار)ێ.

لە ساڵی (١٩٢٣) بە گێچ و بەرد و دارەڕێ تەواویان کرد، لەسەر حیسابی ئەهالی و مەتران و هەندێ پارەشیان لە کەرکوکەوە بۆ هاتبوو[1].

لە ساڵی (١٩١١) قەشە یۆحەنای موسلاوی لە کۆیە ئەمری خوای کرد، وەسیەتیشی کرد، کە خانووەکەی تەبەروعی کەنیسەی بکرێ، جێگای کەنیسەش ماڵێک بووە، بەرانبەری ماڵی (حاجی ساڵح)ە سووری قەساب. لەپاشان لەگەڵا ماڵی (ئیلیا)ی (سەلمان)ە سووری دەگۆڕنەوە. ماڵی ئەو دیانەی دەچێتە جێی کۆنە کەنیسەکەی بەرانبەر ماڵی (حاجی ساڵح)، لە ساڵی (١٩١٣) بەردی بۆ دەکێشن، بەو ناوەی نابێ بەسەر مزگەوتی (گەرموک)ی دابنۆڕی، بەردەکەی دەبەن و لە بینای مەکتەبی کۆیسنجەقی بەکاردێنن. ئەو ساڵی لە زەمانی عوسمانی خەریکی دروستکردنی بوون، لەبەرئەمە بینایەکەی کەنیسەی هەر بە قوڕی دەمێنێتەوە.

لە ساڵی (١٩٢٢) جێگاکەیان گۆڕی و لەجێی ئێستاکە بە گێچ و بەرد دروستیان کرد و گونبەتیان بۆ کرد، جێی ماڵی قەشە یوحەناشیان کردە قۆناغەکە، لەپێشان قۆناغی کەنیسە ماڵی (ئیلیا)ی (سەلمان)ە سووری بووە، کە نزیک بوو لە کەنیسە[2].

کەنیسەی کۆیە بە کەنیسەی (مار

جەرجیس) ناونراوە.

**ژیاندنی قەشە:** هەتا ساڵی (١٩٦٠) دەبوایە هەر ماڵە دیانەک (٣) جەمەی بە دەستی خۆیان بۆ قەشەی ببەنە قۆناغەکەی...... دوایی وایان کرد، قەشە بۆخۆی دەبوایە، (٣) جەمەی بچێتە ئەو ماڵەی کە سرەی بوو. ئەمەشیان واز لێ هێنا. لەجیاتی خواردن هەر ماڵە ساڵی برێک پارە دەدا، وەک معاش کۆی دەکەنەوە و دەیدەن بە قەشەکە: ئێستا مانگی چەند دینارێکی لە (پاپا)وە بۆ دێ".

دیانەکان لە ترسان لە (عەسر)ەوە دەچوونەوە ماڵ و نەدەهاتنەوە دەر، خۆیان بە یاری (کۆسانێ) دەخافلاند و خەریکی موتاویش دەبوون، کە ئینگلیز هات، بەو ناوەی مەسیحین، نەختێ ترسیان شکا و وازیان لەو یارییە هێنا.

کە ئینگلیز هاتە کۆیە (مەربێن) باوکی خواجە ئەبرەهای بەو ناوەی ئینگلیزیش مەسیحییە، هاتوچۆی حاکمەکەی دەکرد، گۆیا بووەتە برادەری. خەڵق پێیان دەگوت: (دەچییە کن حاکمی ئاگایەکت لێمان بی)، بە رۆژ ئینگلیزەکە دەسووڕاوە ئەگەر لەناو شاری مخالەفەیەکی بدیبا، جەزای دەنووسی، رۆژێکی دەچیتە ماڵی (خواجە مەربێن)، (٥٠) روپیەی جەزای دەنووسێ. خەڵقەکە پێیان گوت: (خۆ ئەوە جەزای تووشی نووسی؟) دەڵێ: (کوڕە ئەوە کافرە، لەسەر چ دینێکی نییە!).

**دیانەکان لە جێژنان:**

بەو مناسەبەتەی کە دیانەکانی (کۆیە) دەوڵەمەندتر بوون، هەرمۆتەییەکان کردبوویانە عادەت، لە رۆژانی جەژنی ئەوان دەهاتنە شاری و زیارەتی ماڵی قەشەیان دەکرد.

جارێکی (مەلا حەوێز ئاغا و حەمە زیاد ئاغا)ی (غەفووری) لە هەرمۆتە دەعوەت کرابوون، (مەلا حەوێز ئاغا) گوتی: (ئەنگۆ چیدیکە مەچنە کۆیە لە جەژنان)". ئەمنیش گوتم: "ئەوجا مەیەن"، (حەمە زیاد ئاغا) گوتی: "هەرمۆتەییەکان لەنگۆ دەوڵەمەندترن". ئیدی لەو وەختیەوە هەرمۆتەییەکان ئەو عادەتە کۆنینەیان تێکدا[٣].

جوو و دیان ئەگەر بهاتبانا مەجلیسی موسڵمانان، بەتایبەتی مەجلیسی: شێخ و مەلایان یا دیوەخانی ئاغا گەورەکان، بێدەنگ و بێ سەلام دەهاتنە ژوورێ، کە ڕێی دانیشتنیان بدرابا، یا بەخێرهاتنیان دەکرد، چونکو نەدەبوایە بەو ناوەی کە غەیرەدینن سەلامیان لێ بکرێ، یا جوابی سەلامیان بدرێتەوە[٤].

لەلایەن هێرش و پەلاماردانی (رۆم)ی (کاسۆلیک)، کەنیسەی کلدانی کۆن لەناوچوو، بەگێلیش وایان لێ کردن، کە کەنیسەی کۆن مل بۆ (پاپا)ی دابنوێنن.

ئەو وڵاتەی کە کەوتبووە نێوانی هەردوو زێیان: (زێی گەورە و زێی بچووک) بە مەترانیەتی (بیت قرنا) لە (ئاشور) دەژمێردرا.

لە زەمانی (مەغۆل)ەکان کەنیسەی (نەستوری) تووشی دەردەسەرییەکی کوشندە بوون. لە ساڵی (١٣٨٠)ی زایینی ئەو دیانانە تووشی زۆرداریییان بوون، ئەوەی رزگاری بوو، خۆی گەیاندە ناو شاخەکانی کوردەکان، کە (تەیمور)ی لەنگ بەهیچ چەشنێک نەیتوانی پەلاماریان بدا، یا دەستی بیانگاتێ[٥].

جوو و دیانەکانی کۆیە و ناو کوردستان، بە خۆشی یان بە ناخۆشی کە موسڵمان دەبوون، بە (بنجوو) یان (بندیان) دەناسران و نەوەیان دەبوونە کوردی تەواو.

**سەرچاوە و پەراوێزەکان**

١- لەبەر ئەمەی دارەڕێیە و بانەکەی داهاتووە و زستانان دڵۆپەی دەکا، ئێستا (١٩٧٥/٨/٩) سەرەکەیان هەڵگرتووە و چاکی دەکەنەوە.

٢- لە رۆژی دوو شەممەوو (١٩٧٧/٥/٣٠) لە (یلدا) کوڕی خواجە (ئەبرەها) کوڕی (مەربێن)م وەرگرت.

٣- لە رۆژی چوارشەممەوو (١٩٧٣/٧/٤) گۆگە (گۆرگیس) کوڕی (مەربێن) برای خواجە (ئەبرەها)ی بۆی گێڕامەوە.

٤- مەزهەب و شێوەی قسەکردنی دیانەکانی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست: ١- سریانی کۆن، ٢- نستوری،٣- کلدانی، ٤- پرۆتستان، (سریان کاتۆلیک)، (آرمن کاتۆلیک)، (آرمن ئەرتۆدۆکس).

٥- (رحلە متنکر) دانانی مێجەر (سۆن).

* ئەم بابەتە لە کتێبی (مێژووی کۆیە)ی تاهیر ئەحمەد حەوێزی، بەرگی یەکەم، چاپی دووەم، ٢٠٠٧ وەرگیراوە.



# حەوزی نێو قەبرستان

عەبدولڕەقیب یوسف

سـالی(٢٠٠٥) چەند حەوزێکی مەیلەو بچووکی بەردینم لە نێو قەبرستانی گەورەی شەقلاوە دیت، (قەبرستانی گردی زەیتوون لە بەشی ڕۆژئاوای شار لەسەر گردێک بوو و نەمزانی ئەو حەوزانە چین، بەڵام یەکێک بە منی وت کاتی ناشتنی مردوو، جار هەیە پێویستی بە ئاو دەبێت و ئەم حەوزانە بۆ ئەم مەبەستە دروست کـران)، منیش چووبووم، تا دیوارێک لە دەوری قەبری دارتاشی هونەرمەندی گەورە (وەستا مستۆی) هەولێری دروست بکەم تا بزر نەبێ، چونکە دەبێ قەبری ناودارانی کورد بدۆزینەوە و بیانپارێزین، کە پتر بوو لە بیست ساڵ هەوڵم دەدا تا قەبریم دۆزییەوە.

ڕۆژی (١٢/ ٣/ ٢٠٠٧) کە لەگەڵ بەڕێز سەلاح سەبع کە خەڵکی کۆیەیە، چووم بۆ نێو (قەبرستانی گردی کەکون)، لای قشڵەی کۆیە حەوزێکی گەوردم دیت لە بەرد هەڵقەنراوە، پێم وت ئەم حەوزە چییە؟ وتی بۆ ئاوە، بۆ پێویستی قەبرستان، کاتی ناشتنی مردووەکان پڕ ئاو دەکرێت بۆ ئەم مەبەستە، درێژیی بەردەکە (٢م) بوو، پانی (١٧٢سم)، بڵندی





(٧٠سم). حەوزەکە خۆیی ١٢٠سم درێژی ٩٠سم، پانی و قوولی ٩-٢٥سم.

وێنەی ئەم حەوزەم گرت وەک حەوزەکانی گردی زەیتوون، حەوزەکە نزیک قەبری ئامینێ کچی ئیسماعیل بوو، کە گۆرانی (ئامینێ تاقانەی دایە)ی پێ وتراوە کە وتارێکم لە بارەی بەسەرهاتی ئامینە نووسیوە. ڕەنگە حەوزەکانی قەبرستانی گردی زەیتوون هەموویان بۆ ئەو مەبەستەی سەرەوە نەبن، بەڵکو بۆ مەبەستێکی دیکە بن وەک لە یاداشتی خۆمدا نووسیومە.

* ئەم بابەتە لە گۆڤاری مێرگ ژمارە (٢٤)ی نایار ٢٠٠٧ لا١١٨-١١٩ بلاوبۆتەوە.



# گەلی مەنجەران

عەباس سلێمان سمایل

گەلی مەنجەڵان (گەری مەنجەران)، گەلییێکە لە گەلییەکانی چیای قەرەچووغ، لە تەنیشت گەلی سەنگەران بەرامبەر گوندی گەڕەسۆر، لە نێوان شارۆچکەی مەخموور و رووباری دیجلە بەڕووی دەشتی قەراجەوە هەڵکەوتووە.

دۆڵێکی سەختی پڕ لە دار و درەختە، بەڵام ئەو شوێنەی مرۆڤ بیگاتێ درەختەکانیان هەڵکەندووە، مەگەر بە دەگمەن درەختی تێدا مابێ، درەختەکانیش بریتین لە هەنجیرە کیویلکە، زڕهەنار، دارەبەن، بەلاڵووک و (تووترک و شەواشینک)یشی لێ دەڕوێت.

جاران پاوانی مەڕدارانی ناوچەکە بوو، کە بە هێندێک لە پارە یا بە چەند گیسک یا کاوڕێک، کە دەدرا ئاغای گوندی گەڕەسۆر لە بری مانەوەی مەڕدار لە وەرزی زستان لە گەلییەکە، هەروەها ئەم گەلییە و گەلییەکانی دیکە لە سییەکان و چلەکان پڕبووە لە ئاژەڵی کێوی وەک مامز، گورگ، سیخوڕ، ڕێوی و کەمتیار، بەڵام ئەمڕۆ بە دەگمەن دەبیندرێن.

دەستپێکی قڕکردنی ئاژەڵان بە تایبەتی مامز لەلایەنی ژمارەیەک لە عەرەبی بەغدا دەستی پێکرد، دواتر دانیشتوانی ناوچەکەش چاویان لێ کردن، دوابەدوای قڕکردنی مامزان، داربڕین دەستی پێکرد، بە تایبەتی دانیشتوانی شارۆچکەی مەخموور،

روویان لە گەلییەكانی بەری دەشتی قەراج كرد و كوڵكەشیان دەردێنا و ژمارەیەكی زۆریش لەو داركەرانە بووە پیشەیان و باری داریان بە عانەكی دەفرۆشت، دوای ئەوەی داروباری گەلییەكانیان قركرد، دەچوونە سەر چیا و بارە داریان لە سەرەوە فڕێ دەدا خوارەوە و ئینجا لە گوێدرێژیان بار دەكرد، دواتر بە فەرمانی میری، داربڕین قەدەغە كرا، بەڵام خەڵكەكە فێربوو وازی نەدەهێنا.

لە دوای هەشتاكان بە هۆی هەبوونی نەوت و غاز درەخت كەم دەبڕدرا، بە تایبەتی لە دوای ساڵی ١٩٨٧ و ئاوارەكردنی دانیشتوانەكە، درەختی قەرەچووغ دەبووژایەوە، بەڵام دوای ئازادبوونی عێراق ژمارەیەك لە گوندەكان وەك: (كەپەنكرەش) و (مەلاكاغا) دەستیان كردۆتەوە بە درەخت بڕین لە هەراشی خانووەكانیان بەكاری دێنن.

جا لە گەلییەكان بەتایبەتی لە گەلی مەنجەڵان ژمارەیەك ئەشكەوت دەبینرێن، كە شوێنەواری نیشتەجێبوونیان تیا دیارە، بە قسەی بە تەمەنەكانی ناوچەكە و دۆزینەوەی گۆزە و جۆنی و ئامرازی شەڕكردن و تاشینی هەندێ بەرد لە شێوەی كورسی، لە زۆر كۆنەوە خەڵك لەم ئەشكەوتانە نیشتەجێ بوو.

لە قووڵایی گەلییەكە كەپكە شاخێكی گەورە هەیە، ژێرەوەی كەپكە شاخەكە هەمیشە سێبەر و فێنكە، بەردەوام لە سێ شوێنی بنمیچی كەپكە شاخەكە، پێیان دەڵێن مێرگ، دڵۆپ دڵۆپ ئاوێكی شیرین و سازگار دێتە خوارەوە، جا بۆ ئەوەی ئاوەكە كۆبكەنەوە و سوودی لێ وەربگرن، لە ژێر هەر مێرگێك بەردێكیان كوڵیوە، كە پێی دەڵێن (مەنجەڵ)و دڵۆپە ئاوی مێرگەكانیان تیا كۆ دەبێتەوە، ساڵی بە بەفر و بارانیش زیاد دەبێ و هەمیشە مەنجەڵەكان ئاویان لەبەر دەڕوات، یەك لە مەنجەڵەكان لە دووەكەی دیكە گەورەترە و سێ كوندە ئاو دەگرێت و دووەكەی دیكەش هەریەكە دوو كوندە ئاو دەگرن.

جا بەهۆی هەبوونی ئەم مەنجەڵە لە بەرد دروستكراوانە لەم گەلییە، جێیەكەی بە گەلی مەنجەڕان دەناسرێت، لە شەستەكان و حەفتایەكان و هەشتایەكان شوێن و مۆڵگەی پێشمەرگان بووە، هەروەها لە هەشتاكان پەناگە بووە بۆ ئەو كەسانەی، كە لە گوندەكانی ناوچەكە لە سەربازی رایاندەكرد، جا بەهۆی ئەم ئەگەرانەوە دەنگۆیەك هەبوو، كە رژێم بەتەما بووە سەرچاوەی ئاوەكە وشك بكات.

بەهۆی سەختی دۆڵەكە مرۆڤ بەزەحمەت دەتوانی بگاتە مەنجەڵەكان، ئەگەر حكومەتی هەرێم رێگایەكی بۆ ناو قووڵایی گەلییەكەوە ببردبایە و درەختی لێ بڕواندبایەوە و بنكەی پۆلیسی دارستانی لە چیای قەرەچوغ دابنایە، ئەوا چیاكە دەبووژایەوە، جا بۆ ئەوەی گەلی مەنجەران ببێتە هاوینەهەوار و شوێنێكی گەشتیاری، پێویستە حكومەتی هەرێم چەند پرۆژەیەكی گەشتیاری لێ دروست بكات، سەرەڕای ئەوەی هاوینەهەوارێك بۆ دەشتی قەراج دێتە كایەوە و ئاو و هەوای ناوچەكە خۆشتر دەبێت و دەبێتە سەرچاوەیەكی ئابووری و بووژاندنەوەی شوێنەوارێكی گرنگی كوردستان و ئاشناكردنی بە خەڵك.

بەهۆی دڵڕفێنی و هەوا خۆشی گەلییەكەوە، حەیرانبێژان حەیرانیان بەسەردا هەڵگۆتووە و كاتی خۆی حەسەن حەیران دەچووە سەری چیا بەرامبەر بە گەلی مەنجەران حەیرانی دەگۆت و داركەرانی سەرسام دەكرد.

ئەمەش پارچە حەیرانێكی فۆلكلۆرییە لەسەر گەری مەنجەران:

**لە گەریان گەری مەنجەران،**
**حەوەت حوەتێ سواران،**
**نوسكەیێ تاژیان،**
**هاتە هاتێ راوكەران،**
**كیژ دەرێ تفەنگەكی برنۆ بوومایە لەسەر ملێ كورە لاوی لە هەموو سەفەران.**

تێبینی:
لە چیای دەماوەند گەلییەكی لەم جۆرە هەیە و پێنج مەنجەڵی تێدایە و مەنجەڵەكان لە مەنجەڵەكانی گەلی مەنجەڵانی چیای قەرەچووغ گەورەترن، لە داستانێكدا هاتووە گوایە رۆستەمی زاڵ ئاوی لەم مەنجەڵانە خواردۆتەوە.



# گەشتێک بەنێو مۆزەخانەی هەولێردا

ڕێبوار محەمەد

وەک بەڕێز نوعمان جومعە ئیبراهیم ئاماژەی بۆ دەکات هەموو مۆزەخانەیەک شێوازی تایبەتی و زانستی نمایشکردنی خۆی هەیە و مۆزەخانەی هەولێریش شێوازێکی تایبەت بەخۆی لە نمایشکردنی بەرهەمەکانی هەیە. سەرەتا لە یەکەمین هۆڵی نمایشکردندا ئەو پاشماوانە دەبینرێ، کە دەگەڕێتەوە بۆ ماوەی سالانی ٤٠-٥٠ هەزار ساڵی پێش زایین. لەم بەشەدا کۆمەڵێک پاشماوەی مرۆڤی نیاندەرتالا نمایش کراوە. لەگەڵا کۆمەڵێک پاشماوەی چەرخی بەردینی دێرین، کە سەرجەمی کەلوپەلەکان لە کوردستان و هەندێکیان لە ئەشکەوتی شانەدەر لە سنووری ناوچەی هەولێر دۆزراونەتەوە. ئەم پاشماوانە پاشماوەی سەردەمی بەر لە پەیدابوونی نووسین. لە بەشێکی دیکەدا پاشماوەکانی هەزارەی شەشەم، واتە شەش هەزار ساڵ بەر لە زاین نمایش کراون، کە پاشماوەکان لە ناوچەکانی خوارووی عیراق دۆزراونەتەوە پێکدێ لە کۆمەڵێک کەلوپەلی خواردن و خواردنەوە، کە بریتییە لە چەند دەفرێکی جۆراوجۆر.

پاشان پاشماوەی ساڵانی (٤) هەزاری پێش زایین نمایش دەكرێ و ئەم سەردەمە بە سەردەمی عوبێد ناوبراوە و لەم بەشەدا و لە بەرهەمە نمایشكراوەكاندا جوانكاری و كاری بۆباغی ورد بەسەر كەلوپەلەكانەوە دەبینرێ. دواتر پاشماوەی سەردەمی وەركا (٣٥٠٠ پ. ز) دەبینرێ، كە لێرەوە بەپێی سەرجەم سەرچاوە و لێكۆڵینەوەكان بۆ یەكەم جار نووسینی تێدا داهێنراوە.

دواتر بەرهەمەكانی سەردەمی بەردبەیانی بنەماڵە سۆمەرییەكان (فجر السلالات) دێت، كە ماوەی (٣٠٠٠ تا ٢٣٥٠ پ. ز) دەگرێتەوە. لەم سەردەمەدا دەسەڵاتی سیاسی و شێوازی حوكمڕانی پەیدابووە، ئیدی لێرەوە مێشكی مرۆڤ بە تەواوی گەشەی كردووە. لەپاش ئەم سەردەمە سەردەمی سۆمەری دێت كە ساڵانی ٢٠٥٠ پێش زایینە و لەم سەردەمەدا دركی مرۆڤ و ناسینی مرۆڤ بۆ خودا پەیدا بووە. پاش ئەم سەردەمەش لە مۆزەخانەی هەولێردا ئەو كەلوپەلانە دەبینرێن، كە لەپاش ئەم سەردەمە دۆزراونەتەوە و تایبەتن بە كەلوپەلەكانی جوانكاری و رازاندنەوەی ئافرەتان. هەر لە سەردەمی سۆمەریدا بۆ یەكەم جار مۆر دروست كراوە و لە مۆزەخانەی هەولێر چەندین مۆری هەڵكۆڵراوی ئەو سەردەمە دەبینرێ. دواتر هەر لە سەردەمی سۆمەریدا كۆمەڵێك نووسینی بزماری لەسەر كۆمەڵێك كەلوپەل دەبینرێن، كە نووسینەكان بریتین لە ناونیشان و كۆمەڵێك زانیاری لەسەر چەندین شتێك وەك دانانی بەردی بناغەی چەند پرۆژەیەك، دواتریش زەرف و نامەی قوڕین داهێنراوە، كە لە بەشێكی مۆزەخانەكەدا بەرچاو دەكەوێ، وەك كاغەزی دبلۆماسی و سیاسی و ئابووری، ئەمانە هەموویان لە قوڕ دروست كراون.

هەر لە درێژەی گەشتی ناو مۆزەخانەی شارستانی هەولێردا چاوت بە كۆمەڵێك پاشماوەی سەردەمی ئاشووری دەكەوێ. لەم سەردەمەدا، هەریەكێك حاڵەتێكی تەواوی ژیان نیشان دەدات و دواتریش كۆمەڵێك پاشماوەی خورییەكان ناوچەی دوكان و چەند ئاسەوارێكی ساڵانی ١٣٠٠ بۆ ١٠٠٠ی پێش زایین نمایش دەكرێ.

هەر لێرەدا بەشێكی دیكە دێت، كە بریتییە لە بەشێكی تایبەت بە ناوچەی لوڕستان و شارستانییەتی لوڕی، دوای ئەمەش شوێنەوارەكانی شاری حەضەر، دواتریش لە هۆڵێكی تایبەتدا ئەو پاشماوانە نمایش كراون، كە تایبەتن بە سەردەمی ئیسلامی و لەم پاشماوانەدا پارێزگاری و بایەخدان بە زەخرەفە و هونەری زەخرەفەكاری دەبینرێ، لە هۆڵێكی جیاوازیشدا ئەو كەلوپەلانە نمایش كراون، كە لەپاش ساڵانی راپەڕین دۆزراونەتەوە لەلایەن بەڕێوەبەرایەتی شوێنەوارناسی كوردستانەوە. لەم بەشەدا كۆمەڵێك ئاسەواری تایبەت بە گردی قالیچ ئاغا دەبینرێ، كە لە ساڵی ١٩٩٨ دۆزراونەتەوە و دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی وەركا، واتە ٣٥٠٠ پێش زایین. چونكە ئەم ئاسەوارانە هیچ نووسینێكیان لەسەر نییە، لەدوا وێستگەی سەردانی مرۆڤدا قەبر و تابووتی منداڵێك دەبینرێ، كە ئەمیش هەر دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی وەركا و لە گردی قالیچ ئاغا دۆزراوەتەوە.





# دروستکردنی مافوور لە هەولێر

سارا ئەولفەتاح
بەشی شوێنەوار- زانکۆی سەلاحەددین

شاری هەولێر یەکێکە لە شارە دێرین و گرنگەکانی کوردستان، کە مێژوویەکی دەوڵەمەندی هەیە لە رووی شوێنەواری و کەلەپوورییەوە، بەڵگە شوێنەوارییەکان ئەمەیان سەلماندووە شاری هەولێر کۆنترین شاری جیهانە کە تا ئێستا ژیانی تێدا بەردەوام بووە بەبێ بچڕان.

هونەری ڕستن و چنینی مافووردا لەم شارەدا مێژوویەکی دوور و درێژی هەیە، کە دانشتووانی دەشتی هەولێر چ هۆزە کۆچەرییەکان و چ نیشتەجێبووەکان بایەخی زۆریان بەم هونەرە داوە.

بێگومان بوونی ئەم جۆرە هونەرە لە سەردەمە کۆنەکاندا قۆناغ بە قۆناغ گەشەی سەندووە، کە ئەمەش گرنگییەکی زۆری هەبووە لە رووی ئابووری و جوانکارییەوە، مافوورەکان بۆ پێداویستی رۆژانە بەکارهاتوون و بە وێنەی ئاژەڵی و رووەکی و ئەندازەیی و مرۆیی رازاندراونەتەوە.

ئامانج لەم توێژینەوەیە باسکردن و نیشاندانی هونەری دەستییە لە هەولێر و دەوروبەری لەلایەن دانیشتوانی ناوچەکە و گوندەکانی سەر بە هەولێر کە بۆمان دەردەکەوێت خەڵکی ئەم ناوچانەیە گرنگییەکی زۆریان بەم هونەرە داوە، گرنگی ئەم توێژینەوەیە لەوەدا خۆی دەبینێتەوە کە هونەری رستن و چنین پێویستی بەباس کردن و توێژینەوەیەکی ورد هەیە تا لەم رێگایەوە بە هونەری دەست ڕەنگینی خەڵکی ئەم ناوچەیە ئاشنابین، بێگومان نووسینی توێژینەوەی لەم جۆرە بێ کەم و کوڕی نابێت، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا چەند سەرچاوەیەکی بەپێزم دەست کەوتن لەوانە (الحرف والصناعات اليدوية في العصر الاشوري المتأخر Carpets of the orient Anintroduction to Kurdish

**(Rugs and other weavings**
**مافوور و ناوەکانی:**

مافوور بریتییە لە چنراوێکی ئەستووری داوی گرێدار لە خوری و لۆکە و هەندێ جار لە مووی بزن و حوشتر بە ئامێری تەونکردنی (النول) تایبەتی دروست دەکرێت[1].

مافوور (السجاد) لە زمانی عەرەبی کۆمەڵێک ناوی تری لێنراوە کە بە پێی وڵاتەکان گۆڕاوە، لە هەندێک شوێن بە (الطنافس) دێت، هەروەها وشەی (البساط) بە کارهێنراوە، ئەم وشەیە بە واتای ئەوەی هەر شتێک لە سەری دانیشیت، خوای گەورەش زەوی بە (البساط) داناوە کە مرۆڤ لەسەری دەژی وەک دەفەرمووێت (والله جعل لکم الارض بساطا)[2] لە هەندێ شوێن بە (القطیف) یا (القطف) یان (القطیفة) هاتووە، لە وڵاتانی ڕۆژئاوای عەرەبی وشەی (الزرابي) بە کارهێناوە، لە قورئانی پیرۆزدا وشەی (الزرابي) هاتووە و خوای گەورە دەفەرمووێت [وجوه یومئذ ناعمة، لسعیها راضیة، في جنة عالیة، لاتسمع فیها لاغیة، فیها عین جاریة، فیها سرر مرفوعة، وأکواب موضوعة، ونمارق مصفوفة، وزرابي مبثوثة][3] [4].

وشەی (زرابی) وشەیەکی فارسییە پێکهاتووە لە (زر) بە واتای ئاڵتون و (اب)بە واتای ئاو دێت.

شوێنەوارناسەکان وشەی (السجاد)یان بەکارهێناوە بۆ ئەوەی جێگای وشەکانی تر بگرێتەوە[5].

لە کوردستان وشەی مافوور بەکارهێنراوە، و هەروەها لە هەندێک سەرچاوەدا وشەی (بەڕە) بە کارهێنراوە، هەرچەندە لە هەندێ شوێنی کوردستان بەڕە و مافوور جیاوازە لە یەک لە ڕوی کەرەسە و چۆنیەتی دروستکردنیانەوە، بەڵام زیاتر وشەی مافوورەکە بەکاردێت.

مێژووی دروست کردنی مافوور:

پیشەسازی ڕستن و چنین بە کۆنترین پیشەسازییەکان دادەنرێت کە دەرکەوتووە لەگەڵ مرۆڤ، بۆ خۆپاراستنی خۆی لە هۆکارە سروشتییەکان بەکاری هێناوە[6]، هەر لە دێر زەمانەوە مرۆڤ هەوڵی داوە لەگەڵ دەوروبەر خۆی رابێنێ و سوود لە مادەی سروشتی وەربگرێ لە بەرژەوەندی بەردەوام بوون ژیانیدا بەکاریان بێنێ[7].

پێش ئەوەی مرۆڤ مافوور (بەڕە) دروست بکات لە خوری و مادەکانی تر، پێویست بوو لەشی بپارێزێت و شتێک دروست بکات کە لەسەری دابنشێت یان بۆ خۆ پاراستن لە سەرمای وەرزی زستان بیپارێزێت، سادەترین جۆری ڕایەخ، لای نادەمیزادی سەرەتایی کۆکردنەوەی گژو گیا و گوڵە وەربوەکان بووە، دواتر لاسکی هەندێ گژو گیای بەیەکەوە ئاڵاندووە باشتر توانیویەتی لەسەری بحەوێتەوە[9]، پاشان مرۆڤ توانی شتی دیکە بهێنێتە ئاراوە ئەویش لەگەڵای(بردی)یان قامیش کە بە پارچەی درێژ دەبراو تێکەڵ بە یەکتر دەکرا بە شێوەی حەسیر دروست دەکرا[10]، دوای ئەوەی مرۆڤ ڕاوی ئاژەڵی دەکرد ئینجا پێستەکەی بە کاردەهێنا بۆ لە بەرکردن و هەر ئەو پێستەیەشی بەکاردەهێنا بۆ دانیشتن و خەوتن، بۆیە بیری کردەوە هەندێک لەو پێستانە وەکو ڕایەخ بەکاربهێنێت[11]، مرۆڤی سەرەتایی دوای ماڵی کردن(مەڕ و بزن و ئەسپ و حوشتر...)جگە لە گۆشت وشیرەکەی و پێستەکەی سوودی لە خوری و مووەکەشی وەرگرت[12].

پاشان مرۆڤ وازی لە ژیانی ئەشکەوت هێنا و توانی لە گوندی کشتوکاڵی نیشتەجێبێت، مرۆڤیش کشتوکاڵی کرد.

دەربارەی سەرەتای مێژووی یەکەمی و شوێنی دروستکردنی مافوور بە تەواوی دیاریکراو نییە هەتا ئێستاش هەروا ما وەتەوە[14]، لە گوندی چەرموو پارچە کەتانێک لە سەر قوڕ دۆزراوەتەوە ئەمەش بەڵگەیە کە لەو چنراوە یەکێک لە کەرەسەکان دەچێتە پیشەسازی ڕستن و چنینەوە و هەندی بەڵگەی تریش هەن کە ئاماژە بەوە دەدەن کە ڕستن لە هەزارەی شەشەمی پێش زایینەوە زانراوە[15].

بۆچوونی جیاواز هەیە لەسەر سەرەتای مێژووی دروستکردنی مافووری گرێچنی (السجاد الوبري المعقود) لە نێوان مێژوونووساندا بەڵام زۆربەیان کۆکن لەسەر ئەوەی ئاسیا وڵاتی یەکەمی دروست کردنی مافوورە، بە تایبەتی هۆزە کۆچەرەکانی ناوەڕاستی ئاسیا یەکەم کەس بوون ئەویش بەهۆی زۆری مادەی خوری لەو ناوچانەدا کە پێویستە بۆ ئەم پیشەسازییە[16]، بێجگە لەوەی کە سروشتی ژینگەکەیان زۆر ساردبوو لە زستاندا

کە پێویستیان بەم رستن و چنینە ئەستوورانە هەبووە بۆ خۆ گەرم کردنەوە[17]، هەندێ سەرچاوە رۆژئاوای ئاسیا بە شوێنی یەکەمی مافوور دروست کردن دادەنێن[18]، لە ناوچەکانی سنوری ولاتی چین لە رۆژهەلاتەوە درێژ دەبێتەوە هەتا ئاسیای بچووک کە ولاتی ئەنادۆلە لە رۆژئاوا[19]، مافوور لە سەردەمی فیرعەونەکان هەبووە لە میسر[20] بە پێی باسکردنی شوێنەوارناسەکان، بەلگەشیان بۆ ئەوە پارچەیەکە لە چنراوی گرێنچی ئەستوور کە لە گۆرستانی خێزانی یانزەهەم دۆزراوەتەوە[21].

ئاشورییەکان و بابلییەکان دروستکردنی مافووریان زانیوە بە شێوەیەکی باش، ئەم نموونانەی هەلکۆلراون بەلگەی روونن بۆ ئەوەی ئاشورییەکان مافووریان زانیوە جگە لە زینی ئەسپەکانیان کەدادەنرێت بە پارچەیەکی هونەری بێ هاوتا لە رووی نەخشەکان و شێوازی دروستکردنیانەوە[22]، جوانی نەخشەکانی سەر مافووری ئاشورییەکان یەکەیەکی جوانکاری گرنگ بووە بۆ رازاندنەوەی دیمەنەکان و دەرکەوتنیان بە شێوەیەکی گونجاو بە شوێنی رامیاری و شارستانیەتیان لە نێوان گەلەکانی تردا[23].

ئەو نەخشانەی کەلە سەر مافوورەکان دروست دەکران لەو کاتەدا گولی بەهار و مرواری کە زۆر باوبوو لە سەر جلوبەرگ و بیناکاندا لەسەر کەرپووچ شوشە کراوە، و گولی لۆتس و شێوەکانی گولی گولە بەرۆژە، نووسینە مێخییەکان باس لەجۆرەکانی مافوور دەکەن کە بەکارهێنراون لەلایەن گەلانی کۆنی میسۆپۆتامیاوە[24].

لە کۆشکەکانی شالمنیسەری دووەمدا وێنەی دوو مافووری دەردەکەوێت کە ریشووی درێژیان هەیە[24]. و هەروەها پارچەیەک لە مەرمەر دۆزراوەتەوە درێژییەکەی نزیکەی (٢م) و لە زەوی یەکێک لە دەرگاکانی شاری خورسباد لە ناوەراستی پارچە مەرمەرەکەدا نەخشی ئەندازەیی تێدایە لە بازنەی بەناویەکدا چوو لە دەوری گولی بەهار و مرواری پێکهاتووە لە دەوری ئەمانیش چوارچێوەیەکی تر هەیە گولی لۆتسی میسری تێدایە[25].

لە تابلۆ ئاشورییەکاندا وێنەی کۆمەلێک ئەسپ هەیە کە مافووری بچوک بە کارهێنراوە بۆ سەر زینی ئەسپەکانیان جوانکراوە بە نەخشی ئەندازەیی، مافوورەکە کۆتایی دێت لە هەردوولاکانی بە گولەنگ[26]. بەهەمان شێوە و شێوازی کە لە مافوورەکان دا کراوە، لە لای بابلیەکانیش دروستکردنی مافوور زۆر بلاوبووە، ئەم پیشەیە بە پێش کەوتوویی ماوەتەوە لە میسۆپۆتامیا هەتا هاتنی ئەسکەندەری مەکدۆنی لە نیوەی دووەمی سەدەی چوارەمی پ. ز. لە نووسینەکانی یۆنانی و رۆمانییەکاندا دەردەکەوێت کە ئەم مافوورانەیان پێ جوان بووە، بلینی مێژوونووس باس مافووری بابلی دەکات لە توندوتۆلی چنینیان و جوانی رەنگەکە و ئەو رێگەیەی کە دروستی دەکەن، و ناوی مافووری بابلی زۆر دەبیستین لە دەقە نووسراوەکانی رۆمانییەکاندا[27].

دەستەیەکی یابانی هەلکۆلینی شوێنەوارییان کرد لە گردی (الطار Altar-)کە دەکەوێتە(٣٥کم) باشووری رۆژئاوای کەربەلا نزیک دەریاچەی رەزازە کە تیایدا کۆمەلێکی زۆری مافووری بچووک و گەورەیان دۆزییەوە کە ژمارەیان نزیکەی (١٥٠٠) پارچەبوون کە لە چەند رۆژێکدا بوو لە شێوەی ئەشکەوت دروست کرابوو، باشی شوێنی ئەو مافوورانە کە دووربوون لە باو گەرمای هاوین و باران و شێی زستان وای کردبوو کە ئەم پارچانە بە باشی بمێننەوە بەشێوەی گرێی تورکی(عقدە جیوردس)ناوی شارێکی تورکیایە کە ناوبانگی هەبووە لە پیشەسازی دروستکردنی مافوور لە سەدەی (١٦ زاینی)دا، بۆیە ئەم رێگەیە ناونراوە بە گرێی جیوردس دروستکرابوون، رەنگیان سوور و زەرد بوون، و بابەتی نەخشەکانیان زۆر روون نییە بەهۆی بچووکی نەخشەکانەوە، بەلام زیاتر نەخشەی ئەندازەیی سادەن وەک خەتی شکاو و بازنە، و مێژووی ئەم مافوورە لە تاقیگەکانی زانکۆکانی تۆکیۆ لە یابان کراوە دەگەرێننەوە بۆ ماوەی نێوان سەدەی سێیەم و یەکەمی پێش زاین، ئەم مافوورانە ریشوودارە و لەدروستکراوی میسۆپۆتامیای کۆنە[28] لە سەردەمی پاشای فارسی(آحشویرش)کە ناسراوە بە کیسرای یەکەم (٤٨٦-٤٦٥ پ.م) ئاهەنگێکی گەورەی سازکرد لە سوسە کە پایتەختی عیلامییەکان بوو کە (١٨٠) رۆژی

خایاند، زۆر لە گەورە و پاشاکانی بانگهێشت کرد بۆ کۆشکەکەی لە باخچەکەیدا مافووری سپی و سەوز و ئەرخەوانی تیادابوو[29]، مێژووی مافوور بە شاراوەیی لە دوای جەنگی جیهانی دووەم[30] دۆزینەوەکی گرنگ روویدا لە مێژووی مافووردا[31] لەلایەن شوێنەواناسێکی رووسییەوە بەناوی(رۆدینکۆ-rudenko) لە هاوینی ساڵی(١٩٤٩ز)[32] لە هەندێ سەرچاوەی تردا لە هاوینی ساڵی(١٩٤٧ز)[33] لەناوچە شاخاوییەکانی (ئەلتای) لە کۆماری مەنشووریا دوو مافوور دۆزرانەوە، لە یەکێکیان لە لایەن گوندی بزریک (Bazyryk)کە دەکەوێتە سنووری چین، و دووەمیان لە ناوچەکانی بەخدار(Baachaadar) لە ناوەراستی مەنشووریا.

لەگەڵ ئەوەی (مافووری بەخادار) توندوتۆڵ تر دروستکراوە لە هەر ئینجێکی چوارگۆشەدا (٤٥٠) گرێی تێدایە، لە کاتێکدا (مافووری بزریک) (٣٢٠) گرێی تێدایە[34] لە هەندێ سەرچاوەی تردا (٤٠٠) گرێیە، شێوەکەی چوارگۆشەیە و پێوانەکەی (٢٠٠-١٨٢ سم)ە[35].

مافووری بزریک ناوبانگێکی جیهانی هەیە، هۆکاری ئەم ناوبانگە دەگەرێتەوە بۆ ئەوەی کە ئەم مافوورە تا رادەیەک بە تەواوی دۆزراوەتەوە، وێنەی گیانلەبەری نەخشی رووەکی و ئەندازەیی لە سەرکراوە، ئەم مافوورە لە گۆرستانی پاشایەتی تایبەتی بە گۆرستانی پاشایەتی تایبەت بە هەندێ هۆزدکانی (شیبیە)ی کۆچەری کەلە باشووری سیبیریا و رۆژئاوای ولاتی ترکستان دەگەرێنەوە، ئەم مافوورە لەگەڵ هەندێک پارچەی تر چەک و پێداویستی جیاواز لەگەڵ ژمارەیەکی زۆر ئێسکی ئەسپ[36] کە بە شێوەیەکی زۆر باش ماونەتەوە، چونکە بەهۆی ئەو چینە سەهۆڵ بەندانەی کە کە لەسەری کەڵەکە بووە ئەمە لە لایەک، لە لایەکی ترەوە گرنگی پێنەدراوە و لەلایەن دزەکانەوە نەبراوە[37]، ئەم مافوورە دەگەرێتەوە بۆ(٢٥٠٠)ساڵ لەمەوبەر لە مۆزەخانەی(ئەرمیتاج) لە(لینیگراد) لە رووسیا پارێزراوە[38].

ئەم مافوورە لە خووری دروست کراوە، رەنگەکانی سووری تۆخ و قاوەیی زەرد، هەرچەندە گۆرانکاری بەسەر رەنگەکەدا هاتووە بە هۆی ئەوەی کە لە ژێر زەویدا بۆ ماوەیەکی زۆر ماوەتەوە، ئەم مافوورە نەخشی ئەندازەیی و رووەکی سادە لەناوەراستی دایە و لە چەند چوارچێوەیەک پێکهاتووە، یەکێک لە چوارچێوەکانی بریتییە لە ریزەکی دریژ لە ئەسپ سوار و رمی درێژیان بە دەستەوەیە ژمارەیان (٢٨ ئەسپ سوارە) (دەرواندرێتە هێلکاری-٢-) پاشان چوارچێوەیەکی تر هەیە نەخشی رووەکییە، وێنەی ئاسکە کێوی لە چوارچێوەیەکی تر دروست کراوە کە ژمارەیان ٢٤ ئاسکە و بە پێچەوانەی ئەسپەکانەوە دەرۆن[39].

یەکێکی تر لە مافوورە بەناوبانگەکان کە مێژوونووسەکان باسی دەکەن کە موسڵمانەکان لەیەکێک دا کۆشکەکانی ساسانیەکاندا لە شاری مەدائین لە سەدەی حەوتەمی زاینی مافوورێکی جوانیان دەستکەوت[45]، ئەم مافوورە بە مافووری (بەهار کسری) ناسراوە بەواتای (بەهاری کیسرا)[46] لە هەندێ سەرچاوەی تردا بە مافووری (بەهارکۆ) یان مافووری (کەیخەسرەو)ناسراوە، موسوڵمانەکان لە شەری قادسییەدا لە ساڵی ٦٣٦ز دەستیان کەوت و حوکمی ساسانیەکان کۆتای هات[47].

تەبەری باس لەم مافوورە دەکات و بە مافووری (بەهار خسرۆ) ناوی بردووە لە کۆشکی تەیسەفون بووە کە درێژی (٤٥٠) پێ بەو پانی (٩٠) پێ دەبێت (٤٨)، لە هەندێ سەرچاوەی تر پێوانەکەی (٦٠×٦٠) پێ یە[49]، ئەم مافوورە وەک باخچەیەک وابووە پربووە لە دارو درەخت و گوڵی جۆراوجۆر بەرهەمی تیادا نەخشێنراوە[50].

شوێنەوارناسەکان کۆکن لەسەر ئەوەی کە رێگەی چنینەکەی گرێدارنییە بەڵگەشیان بۆ ئەوە دەزووی کانزایی و بەردی گرانبەهای پێوەیە، بە پێی بۆچوونی هەندێک بەرێگەی قەبەتی(تابستری-Tapestry) * چنراوە، و هەندێکی تریان دەڵێن بەرێگەی تەترێز(التگریز)** چنراوە، هەرچەندە نموونەی زۆرمان هەیە کە مافووری گرێدارە و نەخشی پێوە چنراوە بە رێگەی دیباج کە تاڵی کانزایی و گەوهەری پێوەیە، لە نەجەف و کەربەلا و کازمییە و مەشهەد هەیە کە لە سەردەمی سەفەویدا دروستکراوە[51].

مافوور دروست کردن بلاوبووە بە

شێوەیەکی تایبەتی لە ئێران و ئەنادۆڵ و شوێنەکانی دەوروبەریان، وەک ناوەراستی ئاسیا و قەوقاز، لە هەموو ناوچەکانی جیهانی ئیسلامی زانراو بوو وەک عێراق و میسر و سوریا و ولاتانی باکوری ئەفریقیا و ئەندەلوس و هیندستان[٥٢] و هەندێ ولاتانی تری وەک ئەفغانستان و پاکستان و چین[٥٣].

یەکێک لەو هۆکارانەی کە بووەتە هۆی پێشکەوتن و بلاوبوونەوەی پیشەسازی ڕستن و چنین ئەوەبوو کە بە دیاری دەنێران لە نێوان گەورەکان و دەسەلاتدارەکان لە بۆنە جیاوازەکاندا و هەروەها لەلایەن ئافرەتەکانەوە گرنگی پێدەدرا[٥٤]، چونکە مافوور بە یەکێک لە پێداویستییەکانی ڕازاندنەوەی مالەکان دادەنران بە تایبەتی مافووری دەستکرد کە شوێنێکی هونەری گرنگی هەبووە[٥٥].

عێراق یەکێکە لە ولاتەکانی رۆژهەلاتی ناوەڕاست کە بە ناوبانگە بە دروست کردنی مافوور و هەموو بابەتەکانی ڕستن و چنین لە سەردەمە کۆنەکانەوە هەتا سەردەمی ئیسلامی و دواتریش، لەو شارە گرنگانە موسڵ کە ناوبانگێکی زۆری هەبووە لە پیشەسازی ڕستن و چنیندا و بەرهەمەکانی بلاوبووەوە لە رۆژهەلات و رۆژئاوا و هەندێ لە هەرێمە ئیسلامییەکانی تر[٥٦]، شاری مەدائین و ئەنبار دەورێکی دیاریان هەبووە لەو پیشەسازییەدا وەک دەلێن لە جیاتی دانی باج و سەرانە بەرهەمی ڕستن و چنینیان دەدا لە جیاتی پارە.

شاری حیرە ناوبانگی هەبووە بە بەرهەمی ئاوریشم و کەتان، و شارەکانی (جەزیرە)[٥٧] و شاری (حەزە)* ی نزیک هەولێر بەناوبانگ بوون بە ڕستن و چنین، و یەکێک لە شارە هەرە گرنگەکانی تری عێراق سامەڕایە کە هاوشێوەی بە غدا بوو لە رووی پیشەسازی و هونەرەوە بە تایبەتی لە سەردەمی خەلیفە موتەوەکیل دا کۆمەلێک شوێنی تایبەت بەم پیشەسازیە هەبووە، ئافرەتی سامەڕایی دەورێکی گرنگی گێراوە لەم کاردا، زۆربەی ئەم ئافرەتانە وەک ئارەزوویەکی خۆیان ئەم کارەیان دەکرد، شاری نوعمانیە و شاری بەسرە ناوبانگیان هەبووە کە بەرهەمەکانی نوعمانییە هاوشێوەی بەرهەمەکانی شاری بەسرە بووە، ناوچە کوردییەکان ناوبانگی زۆریان هەبووە لە پیشەسازی ڕستن و چنین، هۆکارە سروشتییەکان یارمەتی ئەو پێشکەوتنەیان داوە کەرەستەی سەرەتایی و دەستی کارامە بۆ ئیشکردن لەم بوارەدا[٥٨].

## کەرستە خاوەکانی دروستکردنی مافوور:

بەشێوەیەکی گشتی خوری مەڕو بزن و حوشتر بەکارهێنراوە بۆ مافوور دروست کردن لەگەڵ تالی حەریر و لۆکە وکەتان[٥٩]، خوری یان حەریر بەکاردەهێنرێت بۆ ڕیشووەکان (الخمل) کەتان و لۆکە بۆ ئەو دەزووەی کە گرێ جیاوازەکانی لە سەر دەکرێت[٦٠]، بەلام زۆرترین مادەی سەرەتایی بەکارهێنرابێت لە پیشەسازی مافووردا خوری بووە ئەمەش بەهۆی ئاسانی ڕستن و چنینەوە، بەلام مووی بزن کەمتر بەکارهێنراوە.

لە دەشتی هەولێر بەزۆری خوری بەکارهێنراوە بۆ دروستکردنی مافوور، مووی حوشتر لە کوردستانی عێراق بەکارنەهێنراوە چونکە سروشتی ناوچەکە گونجانەبووە بۆ بەخێو کردنی حووشتر، بەلام لە ئێران و کوردەکانی قۆچان * کە سەر بە سنووری ئەفغانستانن مووی حوشتریان بەکاریان هێناوە[٦١].

مووی حوشتر جیاوازی هەیە بەپێی ئەو شوێنەی کەلێی بەخێو دەکرێت لە ولاتە عەرەبییەکان و تورکیا و تورکستان، مووی حوشتر لەم ناوچانەدا کورتن، بەلام مووی حوشتری ناوچەکانی رۆژهەلاتی ئێران و ئەفغانستان درێژە، مووی حوشتر بچووک و نەرمترە و بریقەدارە[٦٢].

گرنگترین ئەو کەرەستە خاوانەی کە بەکارهێنراون لە پیشەسازی مافووردا:

١- خوری: کۆنترین کەرەستەکانە کە مرۆڤ بەکاری هێناوە لە ڕستن و چنین دا لە سەردەمە کۆنەکانەوە، ناتوانین سەرەتای بەکارهێنانی دیاری بکەین، بەلام خەلکانی میسۆپۆتامیا لە کۆنەوە زانیویانە خوری بەکاربهێنن[٦٣]. خوری بە گرنگترین کەرەستە خاوەکانی ئاژەلی دادەنرێت و گرنگی گەورەی هەیە لە پیشەسازی ڕستن و چنیندا، دوو ڕێگا هەیە بۆ دەستکەوتنی خوری ئەوانیش:

یەکەم: ئەو خوریەی لە ڕێگەی برینەوەی مەڕو و مالاتەوە دەستمان دەکەوێت.

دووەم: لێکردنەوەی خورییەکە لە پێستەکە دوای سەر برینی ئاژەلەکە[٦٤].

ئەوانەی کە مافوور دروست دەکەن زانیارییەکی زۆریان هەیە لەسەر هەڵبژاردنی جۆری خورییەکە، خوری ئاژەڵ دابەش دەبێت بۆ چەند پلەیەک و جۆرێک[٦٥]، باشی خورییەکە دەکەوێتە سەر ئەو شوێنەی کە لێی دەبردرێت، باشترین خوری ئەوەیە کە لە سەرشانی ئاژەڵەکە دەبردرێت وەک لەوەی لە سکی و قاچەکانی دەبردرێت[٦٦]، و هەروەها خوری مەڕی بچووکی زیندوو[٦٧] باشترە لە خوری ئاژەڵی گەورە، چونکە هەتا گەورەتربێت خورییەکەی زبرترە، باشتر وایە ئەو خورییەی کە لە ئاژەڵەکە وەردەگیرێت تەمەنی لە نێوان (٨ بۆ ١٤) مانگدا بێت، خوری ئاژەڵی مردوو بریقەی سروشتی کەمترە بۆیەی سوور وەرناگرێت، لەبەرئەوە ئەو کەسەی کە خوریەکە ڕەنگ دەکات گیراوەی کلس لەگەڵ گیراوەی ترشی لیمۆ بەکاردەهێنێت بۆ چارەسەرکردنی ئەم حاڵەتە[٦٨]، بە خوری بەرخی بچووک دەڵێن (لوا) ئەم خوریە بەکارهێنراوە بە تێکەڵی لەگەڵ ئاوریشم بۆ مافوور دروست کردن بە تایبەتی لای دەوڵەمەندەکان ئەم مافوورە بۆ هەڵواسین بەکارهێنراوە[٦٩]، خوری مەڕی دەشتی هەولێر درێژە لە بەر ئەوەی جۆرەکەی باشە و تیسکی درێژە هەر خورییەکی بە قەدەر دوو خوری مەڕی ناوچەکانی تری کوردستان دەبێت[٧٠].

٢- ئاوریشم (الحرير):

وەک زانراوە نیشتمانی بنەڕەتی ئاوریشم وڵاتی چینە لە وێشەوە بڵاوبۆتەوە بۆ شوێنەکانی تری جیهان، هەر لە کۆنەوە وڵاتی میسۆپۆتامیا بازنەی گەیاندنی نێوان ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا بووە کە کاروانە بازرگانییەکانی ئاوریشمیان پیایدا تێپەڕیون، و هەروەها کەش و هەوای عێراق یارمەتی گەشەکردنی درەختی توو (التوت)ی داوە کە کرمی ئاوریشمی(القز) لەسەر دەژی کە ئاوریشمیان لێوە دەست دەکەوێت[٧١].

تاڵی ئەم ئاوریشمە درێژە و بەیەکەوە بەستراوە کە کرمەکە بە دەوری خۆی هەڵی دەپێچێت بۆ پێکهێنانی قۆزاخە (الشرنقە) قۆزاخە پارێزگاری کرمەکە دەکات هەتا گەشەدەکات، دوو جۆر کرمی ئاوریشم هەیە، ئەم جۆرە کرمە بەزۆری لە هندستان زۆرە[٧٢]، لای عەرەبەکان بە ئاوریشمیان دەگوت (القز) و دوای ڕستنی (الابریسم) ئەگەر ڕەنگ کرابا ئەوا پێیان دەگوت حەریر یان (الديباج)[٧٣].

٣- لۆکە:

لۆکە لە تاڵە ڕووەکییەکانە، تاڵی لۆکە زۆر کورت ترە لە تاڵەکانی تری کەرەستە خاوەکانن بەڵام پتەوە و بەرگری زیاترە، درەختی لۆکە لە خێزانی ڕووەکییەکانە کە بە (الخبازيات) ناودەبرێت و بەرهەمی ئەم درەختە پێک هاتووە لە پێچراوەیەک لە کاتی گەشەیدا دەکرێتەوە و لۆکەکە دێتە دەردەوە، ئەم ڕووەکە لە ئاو و هەوای گەرم و شێداردا گەشە دەکات و پێویستی بە هەتاو و شێ و خاکی نەرمە، قۆناغی یەکەمی ئامادەکردنی لۆکە بریتییە لە جیاکردنەوەی تاڵە لۆکە کە لە توێکڵەکەی، قۆناغی دووەمی تاڵەکانی لۆکە ڕێکدەخرێت، قۆناغی سێیەمی شانە دەکرێت و پاک دەکرێتەوە، قۆناغی کۆتاییش ڕەنگ کردنە[٧٤]، پیشەسازی لۆکە هێنراوەتەوە میسۆپۆتامیاوە لە سەردەمی ئاشووری نوێدا.

٤- کەتان:

یەکێکە لەو ڕووەکانەی لە ئاو و هەوای مام ناوەند و سارد دا گەشەدەکات لقێکی درێژی هەیە دەگاتە (٢٥ - ٣٠سم) و لە کۆتاییەکەیدا گوڵێکی هەڵگرتووە، لاسکی کەتانەکە دەبرێت پێش پێگەیشتنی پاشان پیای دەکێشرێت بەشێکی تایبەتی تاڵی کەتانەکە دێتە دەرەوە و ڕێک دەخرێت و پاشان لە بەر ڕۆژ دادەنرێت تا وشک ببێتەوە پاشان بۆ ماوەیەک دەخرێتە ناو ئاو، دیسان دەخرێتە بەر تیشکی ڕۆژ بە ئامێرێکی تایبەتی دارین دەکێشرێت بە تاڵەکانیدا بۆ ئەوەی بە تەواوی پاک بکرێتەوە لەو شتانەی کە پێوەیەتی و دووبارە شانە دەکرێت[٧٥].

جگە لەم کەرەستانەی سەرەوە کە باسمان کرد قوماشی کۆن(پەڕۆ)* لە دەشتی هەولێر بە کارهێنراوە بۆ دروستکردنی مافوور وەک لە سەردانێکمان بۆ لای خاتوو (ئەسمەر موحەممەد) لە گوندی شەمامک باسی ئەوەی کرد کە لە پەڕۆ مافووری (هەرچەندە ئەم جۆرە لە ناوچەی سلێمانی بەڕەی پێدەڵێن و جیاوازە لە مافوور) دروست کردووە تا ئێستاش دوو مافووری مابوو[٧٦].

**خوری شتنەوە:**

ئەو خاوەن مەڕومالاتانەی کە بە مێگەل مەڕیان هەیە لە کۆتایی

بەهاردا مەڕەکانیان دەبڕنەوە، جەو بڕ هەیە کە ئەم کارە ئەنجام دەدات[٧٧]، دوای بڕینی خورییەکە پاکدەکرێتەوە لەو شتانەی کە هەڵیگرتووە لە گژوگیا و چەوری، بە یارمەتی شانەی گەورەی لە دار یاخود لە بەرد یا لە ئاسن دروست کراوە کە بە (شانەی خوری) ناسراوە[٧٨]، خورییەکە بەتاید ئاو دەیان شۆردەوە یان دەچوونە سەر رووبارەکان و لەوێ دەیان شۆردەوە، لەسەر شۆڕتەکە بە دار لێیان ئەدا هەتا جوان خاوێن دەبوودوە سپی دەبوو هەتا ڕۆنی دەهات هەر ئاویان پێدەکرد، هەتا ئاوەکەی لێ بچۆرابایەوە لەسەر پارچە حەسیرێک کۆمەڵیان دەکرد[٧٩]، پاشان لە سەر بەردەکان دادەنران هەتا پیس نەبێت ئەگەر بەدارەوە هەڵبواسرێت ئەوا خوریەکە بەدارەکەوە دەنووسێت، ئەگەر لە سەر زەوی دابنرێت خۆڵاوی دەبێت پاشان ڕەنگیان دەکرد[٨٠].

### تەشی ڕستن:

مەبەست لە تەشی ڕستن گۆڕانی کەرستە خاوەکەیە بۆ دەزووی خاوێن، کە هیچ شتێکی بۆ نەبێت[٨١]، ڕستن هەر لە سەرەتاوە ناسراوە بە سادەترین جۆری ئیشی دەستی بۆ دابین کردنی دەزووی پێویست بۆ چنین[٨٢]، کرداری تەشی ڕستن دوای شۆردنی خورییەکە و شانەکردنی دەست پێدەکات، کاتێک خورییەکە وشک دەبێتەوە بە ئامێرێک پێی دەگوترێت (تەشی) دەیڕێسن، کە بریتی یە لە پارچە دارێکی لولەیی لە سەرەوە خڕە تەلێکی پێوەیە بۆ ڕاگرتنی خورییەکە



دیمەنی تەشی ڕستن لای ژنانی کورد( توفیق، سەرچاوەی پێشوو).

کە لە بنەوە دارێکی درێژی پێوە نووسێنراوە، تەشی درێژییەکەی لە(٢٥ بۆ ٤٥سم) دەبێت، هەندێک جار ڕەنگەکەی دەگۆڕێت بە پێی جۆری دارەکە، کاتێک خورییەکە دەڕێسرێت دەکرێت بە بەند پاشان گلۆبەند، ژنان دوای تەواوکردنی ڕستەکە دەیکەن بە کلافە بە شێوەیەک چوارمشقی دادەنیشین بە شێوەی بازنەیی لە ئەژنۆکانیان دەی ئالێنن تا دەیکەن بە کلافە بە مەش ئامادەیە بۆ چنین[٨٣].

ڕستنی خوری بە چەند قۆناغێک تێدەپەڕێت، سەرەتای ڕستن پێی دەوترێت (خاو)تەشی بۆ لای دەسوڕێتەوە، پاشان ئەو ڕستە خاوە دەکرێتەوە دوو قەد (جووتداو) ئەم جارە بەلای چەپ دەسوڕێتەوە و گرژدەبێت، بۆئەوەی خوری ڕستراو بە جوانی ڕەنگ بکرێت دەبێ ڕستراودکە بکرێتە ماشەر (ماشەڵ) پاشان

ئامادە دەکرێت بۆ ڕەنگ کردن، دوای ڕەنگکردن دەکرێتە (گلۆوە/گلۆڵە) یاخود(سەلک)[٨٤]، ئەو بەنەی بۆ (کلێوە ڕۆک) بەکاردەهات دەبوایە بابدرێتەوە، بەڵام ئەوانی تر بە تایبەتی بۆ(گوفک لێدان) مەرج نەبوو بابدرێتەوە بەڵکو هەر بە خاوی بە کاردەهێنرا[٨٥].

لە نیشانە سۆمەرییەکاندا ئیشارەت بە تەشی دارین دراوە بەشێوەیەک کە لە تەشی ئێستا دەچێت[٨٦]، لە تێکستە ئەکەدی و ئاشوورییەکاندا باس لە تەشی گڵێنە و کانزای لە پاڵ تەشی دارین دەکەن[٨٧]، هەروەها تەشی لە ئێسقان دروستکراوە[٨٨].

### ڕەنگەکان و ڕەنگکردن:

سەرەتا پێش ئەوەی باس لە ڕەنگەکان بکەین، کە بەکاردێت بۆ ڕەنگ کردنی کەرستە خاوەکانی

ڕستن و چنین پێویستە بزانین کە ڕەنگ کردن چییە؟ ڕەنگ کردن بە شێوەیەکی گشتی مادەیەکی ڕەنگا و ڕەنگە کە کەرەستە خاوەکە دەتوانێت هەڵی بمژێت لە گیراوە ئاوییەکاندا و پێی ڕەنگ دەکرێت بەڕێژەی جیاواز بە جیاوازی پلەی کاریگەری ڕەنگەکە و بە پێی جیاوازی توانای وەرگرتنی کەرەستە خاوەکە بە شێوەیەک کە پلەی کاریگەری ڕەنگەکە لە سەر کەرەستەخاوەکە هەمیشە زیاتر بێت لە گیراوە تواوەکەدا[٨٩].

ڕەنگەکان دەورێکی گرنگیان گێڕاوە لە پیشەسازی دروستکردنی مافووردا، مرۆڤ هەر لە دێر زەمانەوە توانیویەتی ئەو ڕەنگانە دروست بکات کە لە ژیانی ڕۆژانەیدا پێویستی بووە لە گەڵا و گوڵ و ڕەنگ و بەرهەمی ڕووەکەکان، و بەکارهێنانی مادە ئەندامییەکانی وەک کرمی ئاوریشمی (القز) و (الاشنە)بە کارهێنراوە، واتە سەرچاوەی بنەڕەتی سروشتیمان هەیە بۆ ڕەنگ کردن ئەوانیش (ڕووەکی و ئاژەڵی)ن لەگەڵ هەندێک سەرچاوەی کانزایی و لە دوایشدا ڕەنگە کیمیاویەکان هاتنە ئاراوە.

لە چنینی مافووردا ڕەنگکردن گرنگییەکی هاوتەریبی لەگەڵ شێوازی نەخشی مافووردا هەیە، و بەبێ بوونی ڕەنگ هیچ نەخشێک دروست نابێت، هونەری ڕەنگ کردن لە ڕابردوودا زۆر پێچاوپێچ بووە و نهێنی ڕەنگ کردن بە تەنها لەلای ئەو بنەماڵانە بوو کە ڕەنگیان کردووە، هەر کەسێک بۆ دروست کردنی ڕەنگ شێوازی تایبەتی هەبووە، و جۆری ڕەنگکردن یەکێکە لە هۆکارەکانی جیاکردنەوەی مافوور[٩٠].

گرنگترین ئەو ڕەنگانەی کە بەکارهێنراون لە دروستکردنی مافووردا :

**١- ڕەنگی نیلی (Indigo):**

لە گەڵای نیلەو گوڵی ڕەنگ شین دەردەهێنرێت ئەم ڕووەکە زیاتر بەکارهێنراوە لە پیشەسازی دروست کردنی مافووردا، گەڵاکە لێدەکرێتەوە لە ڕووەکە کە و دەکرێتە ناو دەفرێکەوە بۆ ماوەی (٨ تا ١٠) ڕۆژ تا دەترشێت و ڕەنگەکە ڕەش دەبێت، پاشان ئەم گیراوەیە دەخرێتە ناو دەفرێکی مس و تیایدا دەمێنێتەوە تا کاتی بە کارهێنانی، کە خوریەکەی دەخەینە ناو پاشان دەری دەهێنین ڕەنگێکی سەوزباوی هەیە، کە بەر هەوا دەکەوێت ڕەنگی شین دەبێت ئەمەش بە هۆی ئۆکسانەوە، ئەگەر بمانەوێت ڕەنگە شینەکە تۆخ تر بێت ئەوا زیاتر لە ناو دەفرە مسەکە دەیهێڵنەوە[٩١].

**٢- ڕەنگی سوور:**

جۆرەکانی ڕەنگی سوور وەک (الوردی، القرمزی) لە سەرچاوەی ڕووەکییەوە دەست دەکەوێت، ئەویش توێلکی درەختی بەڕوو و مازوو(عفص)[٩٢] و لە ڕەگی درەختی (الفوە) کە ڕەنگی سوورە دەردەهێنێت، ئەم ڕەنگە سوورە جیاوازە لە نێوان سووری کاڵ و سووری ژەنگی(صدئی)[٩٣]، هەروەها لە کرمی ئاوریشم (القزم)[٩٤]، مێینەی ئەو جۆرە کرمە لەسەر ئاگر دەسووتێنرێت و وشک دەکرێتەوە، پاشان دەکوترێت و ورد دەکرێت، و هەروەها لە (الاشنە) وەردەگیرێت کە لە سەر دیوارو بەردەکان گەشە دەکات[٩٤].

کرمی ئاوریشم بە پێی ئەو شوێنەی کە تێییدا گەشەی کردووە جیاوازە لە شێوەو قەبارەو پێکهاتەیدا، ناوچەکانی کوردستان باشترین شوێنە بۆ گەشەی ئەم جۆرە کرمانە، ڕەنگی سوور هەر لە کۆنەوە داواکاری زۆری لە سەر بووە گرنگی دەروونی و ئایینی خۆی هەبووە، لای گەلانی کۆن لە جیهان دا ڕەنگی سوور ڕوحی شەڕەنگێزی و نەخۆشی دروستدەکات[٩٥]، لە میانەی ئەو چاو پێکەوتنەی کە لەگەڵ خاتوو (هەدیە ئەحمەد) ئەنجامان دا کە یەکێکە لەو ئافرەتانەی کە مافووری چنیوە وتی" زۆربەی ڕەنگەکانمان بەکاردەهێنا بەڵام بۆ ناوەوەی مافوورەکە بە زۆری ڕەنگی سوور یان پرتقالی بە کاردەهێنرا"[٩٦].

**٣- ڕەنگی زەرد:**

سەرچاوەی ڕەنگی زەرد، لە ڕووەکی زەعفەران(٩٧) و توێکلی هەنار کە ڕەنگێکی زەردی مەیلەو سەوزمان دەداتێ، و ئەگەر (الشبرم) ی بۆی زیاد کرا ڕەنگێکی مەیلەو پرتەقاڵیمان لێی دەست دەکەوێت، بەڵام ڕەنگی زەردی کاڵ لە (توو) دەستمان دەکەوێت کە ڕەنگی مەیلەو سەوزە، و جگە لەوەی کە سوود لە توێکلی درەختی سماق و ڕووەکی (العلیق) وەردەگیرێت.

**٤- ڕەنگی پرتەقاڵی:**

ڕەنگی پرتەقاڵی دەردەهێنرێت لە ڕەگی (الکرکم) و زەعفەرانی

هیندی، هەروەها لە رووەكی خەنە و لە تێكەڵكردنی (كركم) و (الفوە) دروست دەكرێت[98].

**٥- ڕەنگی سەوز:**

ئەم رەنگە وەردەگیرێت لە تێكەڵاوییەك لەو مادانەی كە ڕەنگی زەردی لێ دروست دەكرێت لەگەڵ ماددەیەكی تر كە رەنگی شینی لێ وەردەگیرێت[99].

**٦-ڕەنگی بنەوشەیی:**

ئەم رەنگە لە (غدد) وەردەگیرێت، رووەكێكە لە كەنار رووبارەكانی لوبنان هەیە، بۆنەكەی لە بۆنی سیر دەچێت لە كاتی بەكارهێنانی بۆ ڕەنگ كردن دەدرێتە بەر تیشكی خۆر، و دەگۆرێت بۆ سەوز پاشان سوور ئینجا دەگۆرێت بۆ ڕەنگی بنەوشەیی[100].

**٧- ڕەنگی قاوەیی:**

ئەم ڕەنگە وەردەگیرێت لە رووەكی(مازوو)، هەروەها لە رووەكی خەنە[101]، ئەم ڕەنگە قاوەییە مەیلە و سوور دەبێت ئەوەی كە لە رووەكی مازووەكە وەردەگیرێت مەیلە و رەش دەبێت[102].

**٨- ڕەنگی سپی:**

هەندێ جار سوود لەڕەنگی سپی خۆی وەردەگیرێت.

**٩- ڕەنگی رەش:**

هەندێك جار ڕڕەنگی خوریەكە خۆی رەشە[103]، و هەروەها لە توێكڵی داری(دردار)تێكەڵ دەكرێت لەگەڵ سولفاتی ئاسن، بەڵام ئەم ئۆكسانە پەیدا دەبێت لە ئەنجامی كارلێكردنی ئۆكسیدی ئاسنی كیمیاوی كار دەكاتە سەر خوریەكە و هەڵیدەوەشێنێ بۆیە دەبینین لە



ئامێری تەونكردن

مافوورە كۆنەكان دا ڕەنگە رەشەكە زوو تێك دەچێت[104]، بۆ جێگیركردنی ڕەنگەكان لە چنراوەكان و مانەوەی لەكاتی شۆردندا مادەی جیاواز بەكارهێنراوە وەك (التنین-الترتر (الليموندوزی) -الشب)[105] و توێكڵی هەنار و خورمای هیندی[106].

(شوكریە شێخ موحەمەد شێر علی) ئافرەتێكی دەست ڕەنگینە و خەڵكی گوندی (زیارەتی مەلا زادە)و ئێستا لە (بەحركە) دەژی، ئەم ئافرەتە لە عەشیرەتی (هەركی)یە سەبارەت بە ڕەنگكردن وتی" بە زۆری ڕەنگی شینی تۆخ و سەوز و رەش و سپیمان بەكاردەهێنا ئەم ڕەنگانە لە بازاڕ دەستمان دەكەوتن لەگەڵ مادەیەكی تر كە پێی دەڵێن (شەب) ئەم مادەیە بەكاردەهات بۆ ئەوەی ئەم ڕەنگانە هەر بمێننەوە و تێك نەچن، ڕەنگ و شەب لەگەڵ ئاو لە ناو مەنجەڵێكدا تێكەڵمان دەكرد و بۆ ماوەیەك دەمان كوڵاند، دواتر دەرمان دەهێنا و لەبەر هەتاو دادەنرا هەتا وشك دەبووەوە و ڕەنگەكە جێگیر دەبوو)[107].

**ڕەنگە كیمیاوییەكان:**

ڕەنگە كیمیاوییەكان لە سەرەتا و ناوەڕاستی سەدەی نۆزدە لە بەریتانیا، و پاشان لە ئەڵمانیا دروست كراون، ئەم ڕڕەنگە كیمیاوییانە لە كۆتاییساڵانی پەنجاكان و سەرەتای شەستەكانی سەدەی بیست گەیشتوونەتە شارەكانی كوردستان، بەڵام هۆزە كوردییەكان بەدەوام بوون لە دروست كردنی ڕەنگە سروشتی و بەكارهێنانی، لە كۆتایی شەستەكان ڕەنگی سروشتی و كیمیاوی بەكاردەهێنران تا حەفتاكانیش هەر بەردەوام بوون، لە ساڵانی هەشتاكاندا ڕەنگی كیمیاوی بەتەواوەتی بەكاهێنرا.

پێویستە ئەوەش بزانین ئێستا لە ئێران و توركیا و هەندێ لە وڵاتانی تر قۆناغێكی نوێ دەستی پێكردووە ئەویش دروستكردنەوەی مافووری



**ئامێری تەونکردن و بەشێک لە پێداویستییەکانی**

کۆنە بە بەکارهێنانی ڕەنگی سروشتی ئەمەش تەنها بۆ پاراستنی میراتی نییە، بەڵکو ئەم جۆرە مافوورە کڕیاری زۆر بووە بۆیە لە زانکۆکانیان بەشی تایبەت هەیە بۆ ئیشە دەستییەکان[١٠٨]، ئەم ڕەنگە کیمیاوییانەی کاریگەری خراپیان بۆ مافوور هەیە چونکە (ئەنەلینی) تیادایە و پێکهاتەکەی کار لە خوریەکە دەکات، تووشی داخورانی دەکات لە هەمان کاتدا ڕەنگەکان زوو کاڵ دەبنەوە[١٠٩]، کەمبوونەوەی ڕەنگە سروشتییەکان لە هەولێر کاری زۆری کردە سەر مافوورەکانیان، و دەرچوونی جولەکە× بۆیە چییەکان لە ساڵی (١٩٤٧) لەوانەیە هۆکارێک بێت لە ئاستی کەم بوونەوەی مافوورەکاندا[١١٠].

**تەون و تەونکاری:**

پیشەی چنین لە کارە کۆنەکانە کە مرۆڤ لە دێر زەمانەوە لە بەر پێویستی فێری بووە و خۆی پێوە خەریک کردووە [١١١]، ئەم پیشەیە زیاتر تایبەت بووە بە خێلە کۆچەریەکاییەکان و مەڕداران، بەڵام هەندێ لە مێژوونووسان وای بۆ دەچن کە لەوانەیە وڵاتی چین مەڵبەندی سەرەکی تەونگری بووبێ (دەڕواندرێتەوێنەی -٣-).

**ئامێری تەونکردن**

ئافرەتی کورد لە سەرەتادا ڕایەخەکانی لە پێستی مەڕوماڵات دروست کردووە، دواتریش خوری مەڕ و مووی بزنی بەکارهێناوە، بە هونەر و دەست ڕەنگینییەکی بەرزەوە[١١٢]، ئافرەتان زۆر بەلێهاتوویی و چالاکییەو خوری ئەچنن[١١٣].

ئامێری تەون کردن (داروسمتک) بۆ دروست کردنی مافوور دوو جۆرە:

یەکەمیان: ئەو دارو کەرەستە و سمتکەیە کە لە سەر زەوی بە شێوەیەکی ئاسۆیی درێژ دەکرێت (النول الاضفقیه)، بەڵام ئەم جۆرەیان زۆر بەکارنییە، لەبەر ئەوەی ئەو کەسەی مافوورەکە دەچنێ پێویستە ڕۆژانە چەند جارێک داوی بەژن توند بکاتەوە.

دووەمیان: سمتکی بڵند[١١٤] (النول العمودی) پێکهاتووە لەداری درێژ کە هەریەکەیان (٢٨٠ سم) دەبێت بە شێوەیەکی تەریب و ستوونی لە زەوی دەچەقێنرێت کە پێیان دەڵێن (سمتک)× لە سەرەوە دارێکی درێژ هەیە پێی دەڵێن (سەرەتان) واتا (سەری - تان) کە درێژەکەی نزیکەی (٢م) دەبێت[١١٥]، لە خوارەوە لە نێوان هەردوو دارەکە دارێک هەبوو پێی دەوترا (بنەتان) واتا (بنکی تان) کە رایەڵی مافوورەکە لەم (سەرەتان و بنەتانە)×× دەپێچرا، دارێکیش لە ناوەڕاستی قایم دەکرا پێی دەوترێ (دارگورد)، زۆر جار تەونکەر زۆربەی گلۆڵەکانی لەم دار گوردە قایم دەکرد ئینجا سەری گلۆڵەکانی بۆ گوفک لێدان گرێدان رادەکێشا، هەروەها دارێکی درێژیش لە ناوەڕاستی رایەڵەکە دادەنرا کە تەونکەر دوای تەواوکردنی ریزەکانی گوفکێک ئەم دارەی نزم و بەرز دەکرد بۆ ئەوەی داوەکانی رایەڵەکە بەڕێکی ڕاوەستن[١١٦]، جگە لەو ئامرازانەی کە باسمان کرد لە ئامێری تەونکردندا چەند ئامرازێکی ترمان هەیە لەوانە:

-قولاپ:

لە دار گوێز یان لە شاخی بزن

دروست دەكـرێت، بۆ هێنان و بردنی داوەكـانی نێـوان (تان و پۆ)× كـە بەكـاردێ[١١٧] لەم دواییـانە لە ئاسن دروست دەكرا[١١٨].

- پیشك:

لە شـێـوەی پێی مـرۆڤـە، بەڵام پەنجەكانی (١٠-١٢) دەبن لە یەك نـزیـكن، لـەكــــاتـی تـەونـكـردنـی هەردەستێك رایەڵ و پشت قایم كردن بەهۆی پیـشـكەوە دەكـوترێت[١١٩]، پیشك یاخود(كەلكێت) زەنگۆڵەی بچـووكی پێوە بووە لەكـاتی كـوتاندا دەنگێكی خـۆشی لێـوە دێت بۆ وریاكردنەوە و چێژ لێوەرگرتنی خاتمە تەونكارەكە لەبارە[١٢٠].

لەكاتی گفتوگۆكردنم لەگەڵ(هەمین ئیبراهیم) ئافرەتێكی دەست رەنگینی ناوچەی(باڵەكـایەتی)بوو وتی"ئەم ئامێرە لەلای ئێمە پێی دەڵێن(هەپۆ) كە بۆ كوتانی مافوورەكە و توندوتۆڵ كـردنەوەی بەكـاردەهێنرێت" هەتا ئێستاش هەپۆكەی خۆی مابوو[١٢١].

ـ كر:

پارچە دارێكی سـافی بچـووكـە وەك قـــەڵەم وایە، كـــاتێـك تێـكهــەڵكێش ئاڵۆز دەبێت بۆ چاككردنەوەی بەكاردێت[١٢٢].

ـ قامیش:

دارێكی خـۆش كـراوە، بەقـەدەر بەرینی مافوورەكە دەبێت و لە تیرۆك ئەسـتـوورترە، لە كـاتی بڵندكـردن و نزمكردندا داوەكـانی بەژنی مـافـوور راست و چەپ دەكـات، شـوێنەكـەی دەكەوێتە سەر دارگورد[١٢٣].

ـ رنۆك :

ئاسنێكی دوو لقی كلك درێژە ئەویش بۆ رێكخـستنی داوەكـان و لێك جیـاكـردنەوەیان یان تەونەكـە بتوانێ بەئاسـانی تێوەدۆكە لەم سەرو ئەو سـەر بە پانایی تەونەكە بهێنێ و ببـات[١٢٤] لە هەندێك سـەرچاوەی تردا دەڵێن رنۆك لەسـەر شـێـوەی دەست و پەنجـەكـانی مـرۆڤـە سێ یان چوار پەنجەی هەیە، بۆ كوتینی پشتی مـافـوور بەكـاردێت، بەزۆری لە دار یاخود لە ئاسن دروست دەكرێت[١٢٥].

ـ شـانەی بچـووك لە كـەلكیت بچووكترە:

شـێـوەكـەی وەك دەسـتی منداڵ وایە بۆ كـوتان و توند كردنی مافـوور بەكـاردێت، بەڵام بەشـێـوەیەكی لەسەرخۆ بۆ رێكخستنی نەخشەكان و قۆناغی پێش سفت و توندكردن.

ـ پورگالە دار:

دوو پـارچـە داری رێـكـن، درێـژی هەر پارچەیەك نیـو مـەتر دەبێت هەر یەكـەیان بزمـارێكی لەسـەر رێك كـوتراوە و سەرەكـانی دیكەش بەیەك بەسـتـراونەتەوە بەمـەرجێـك جـەشنی بوردگـان سـەربەست بێت لە جووڵە و گـەورە و بچـووك كـردن، مـافـوورەكـە بەهۆی دوو جـەمـسـەرە بزمـارەكـەوە دەبەسترێت تا مافوورەكە شل و خاو دەرنەچێت[١٢٦].

ـ چەقۆ، مقەست، مووس:

بۆ برینی داوی زیادە و رێككردنی لێكردنەوەی مافووورەكە[١٢٧]، زۆربەی زۆری ئەو مـافــوورانە كــە دروست دەكــران دوو بـەر یان سێ بەر بوون، ئەم بەرانەش تەونكەر بە بستی خۆی دەیپێوا هەر بستە مافوورێكش نرخی دیاریكراوی خۆی هەبوو، تەونكەریش ئەگـەر بە دەسـەڵات و ئازابووایە ئەوا مافووری سێ بەركە زۆربەی جار(٢٠ تا ٢١) بست دەبوو بە بیست رۆژ تا مــــانگێـگ لـە داری دەبـری، و دەدرێتــەوە دەست خـــاوەنەكـــەی و دەكرێتەوە بەمەش دەست رەنگینی و هۆشـمـەندی زیرەكی ئافـرەتی كـورد بەسـەر كـەوتوویی لەم كـارەی رەنگی دەدایەوە، بەڵام لەم دواییـە لە جیاتی سمتەكی دار سمتەكی سەفەری واتە (ئـامـێـرەكـان هەمـوویان لە ئاسن دروست كـــرابوون) پەیدابوو، كـــە پێویستی بە لە زەوی گیركردن نەبوو ئەمـەو لەگـەڵ جیـاوازی لە دانشـتنی تەونكەر شـوێنی خـۆی بەرزكـاتەوە، ئەم شـوێنەش كـە بۆ ئەم مـەبەسـتـە بەكـــاردەهات پێی دەوترا(هەرازە)، بەڵام ئامـێـری نوێ پێـویسـتی بە هەرزارە نیــــیــــە، ئـامـــێـــری تەونكاری(النول) لـە ســــەردەمی سـۆمـەریەكـان هەبووە[١٢٨]، پاشـان لەسـەردەمـەكـانی بابلی و ئاشووری، زیاتر ئامێـری تەونكاری سـتـوونی (النول العمودی) بەكارهێنراوە[١٢٨].

بە شـێـوەیەكی گـشـتی سێ جـۆر گرێ بەكارهاتووە لە چنینی مافووردا:

یەكـــەم: گـــرێی جـــیـــورودوس (توركی): كـە تیـایدا داوێك بە دەوری دوو دەزووی ســــتـــــوونی دەدەپێچرێت لەسەرەوە ئەم دوو دەزووە دەگات بەیەك لەنێوان هەردوو دەزووە ستوونیەكە دێتە دەرەوە [١٢٩].

دووەم: گـرێی فـارسی: داوێك بە دەوری یـەك دەزووی (الســــدی) ستوونی دەروات، یەكێك لە لاكانی لەسـەر دەزووی سـتـوونی تەنیـشـتی وەلاكەی تری لە ژێرەوە.

سێیەم: گرێی ئیـسپانی: داوێك دەپێــچــرێت بە دەوری یەك دەزووی ســــتـــــوونی لە ســــەرەوەی دەردەكەوێت[١٣٠] [١٣١].

**مافوور لە دەشتی هەولێر:**

دەوروبەری شاری هەولێر لە دەشتێکی پان و بەرین و فراوان پێکهاتووە، ئەم دەشتەش لەچەند ناوچەیەک پێکهاتووە هەر ناوچەیەکیش ناوێکی تایبەتی خۆی هەیە، دەشتی هەولێر ئەو ناوچە و دەشتانەی خوارەوە دەگرێتەوە:

١- دەشتی بەرانەتی: دەکەوێتە باکور و باکوری رۆژئاوای شاری هەولێر هەتا دەگاتە سەر زێی گەورە (بادینان) بەزۆری دانیشتوانی ئەم ناوچەیە لە عەشیرەتی(گەردی و زراری و هەرکی)ن.

٢- دەشتی ملکیە(مرکیە): بە هەردوو بەشەکەیەوە (بەر ڕێی و پشتەرێ)یی سنووری ملکیەش لە رۆژهەڵاتەوە زنجیرە زوورگەکانی (کەسنەزان) و(زەرگەتە) و(دێدەوانە)لە رۆژئاواش دەشتی (شەمامک)ە، لە خوارووی شاری هەولێر دەست پێدەکات و درێژ دەبێتەوە تا دەگاتە زنجیرە زوورگاوەکانی (زوورگەزراو) لە خواروو[١٣٢].

٣-دەشتی شەمامک: ناوچەی (گوێر) و هەموو ئەو گوندانەی سەر بە ناحیەکان دەگرێتەوە، (دەشتی شەمامک) دەکەوێتە خوارووی رۆژئاوای شاری هەولێر سنورەکەی لە باکورەوە ناوچەی (بەرانەتیە)، لە رۆژهەڵاتیشیەوە مرکیەی (دەشتی درزەیی)یە لە خوارووی (چیای قەراغ) و(کلکەی بێجان) لە رۆژئاوای زێی گەورەیە.

٤- دەشتی کەندیناوە: دەکەوێتە نێوان زنجیرە چیای قەرەچوغ و زنجیرە زوورگی(زوورگەزراو) مەڵبەندی زنجیرەی ئەو ناوچەیەش شارۆچکەی (دیبەگەیە)، لە دووری (٤٢کم) لە خوارووی رۆژئاوای شاری هەولێر دایە.

٥- دەشتی قەراج و ناوچەی مەخموور: شارۆچکەی مەخموور دەکەوێتە دەشتی قەراج و لە خوارووی رۆژئاوای شاری هەولێرەوە، زۆربەی دانیشتوانی بە کشتوکاڵ و مەڕداری خەریکن[١٣٣].

گەلی کورد وەک گەلانی عەرەب و فارس گەلانی تر بەشێکی جێوار (نیشتەجێ) بەشێکی تریشی رەوەند (کۆچەر) بووە، دەشتی هەولێر یەکێکە لە هەوارەی گەرمیان رەوەند بووە، کە ژمارەیەکی زۆری هۆزانی کوردی مەڕداری تێدا نیشتەجێ بووە[١٣٤]، زۆربەی ئەو کۆچەرانە لە ناوچەکانی پارێزگای هەولێر دەژین لە سەرەتای وەرزی بەهار تا کاتی باران بارین لە پایزدا لە کوێستانەکانی سەر سنووری عێراق و ئێران و تورکیا دەمێننەوە[١٣٥]، ئەو کوردانەی کە بەتەواوی کۆچەرن تا رادەیەک ئەمرۆ نەماون، هەروەها نیوە کۆچەرن هەیە کە هەموویان خانووی هەمیشەییان هەیە لە دەشت و دۆڵەکاندا لە زستاندا دێنەوە ناوی، بەڵام هێشتا لە عێراق دا کۆچەر لە بەشی (بلباس) لە سلێمانی و(هەرکی) لە هەولێر و (سوورچی) لە ناوچەکانی ئاکرێ هەرماون[١٣٦].

ئەم هۆزانەی کەلە دەشتی هەولێرن زیاتر بە کۆچەر و نیشتەجێ ناسراون بریتین لە(دزەیی، گەردی، خۆشناو، هەرکی، سوورچی، باڵەک، باڵەکی، بلباس، زراری، ئاکۆ، سیان، سالەیی، هەرووتی، مەنتک، خەیلانی، ...هتد)[١٣٧].

بەهۆی زۆری مەڕ و ماڵات و بوونی خوری لای ئەم هۆزانە بەتایبەتی لای کۆچەرەکان توانیویانە پێداویستییەکانی خۆیان دابینبکەن، لەوانە (رەشماڵ، لباد، جاجم، شاڵ، هەگبە، پەستەک، کەپەنی شوان، جەواڵ، خەرار، کەژی، گۆرەوی، کلێتە، کڵاو، فانیلە، تورەگەی مناڵ، تورەگەی دیکە کەشتیان تێدا هەڵدەگرت)، لە پاڵ ئەمانەش دا هەر هۆزێکی کوردستان مافووری تایبەت بە خۆی هەبوو، کەلەڕووی چنین و نەخش و رەنگ لەگەڵ ناوچەکانی تردا جیاوازی هەبووە، دەکرێت لە رێگەی نەخش و رەنگ لەگەڵ ناوچەیەکی تر جیاوازی هەبوو، دەکرێت لە رێگای نەخش و رەنگ و بابەتی ناو مافوورەکە دەست نیشان بکرێت کە ئەو مافوورە لەچ ناوچەیەک و لەلایەن چ هۆزێکەوە دروست کراوە و چنراوە، تێکڕای هۆزەکانی کورد لە کوردستان مافووری چنراوی خۆیان بەتایبەتی ئەو هۆزانەی کە کۆچەرن کوێستان و گەرمیان دەکەن[١٣٨].

خانمە دەست رەنگینەکانی کورد، جگە لە کاری رۆژانەی ناو کێڵگەکان و یارمەتیدانی پیاوان لە بەخێوکردنی مەڕو ماڵات و کشتوکاڵکردندا، قورسایی بەرێوەبردنی کاری ماڵەوە و بەخێو کردنی منداڵانیشیان لە ئەستۆ بوو[١٣٩]، هەروەها کاری دەستییان ئەنجام دەدا رەشماڵەکان و ماڵەکانیان پێ رازاندۆتەوە، هەر لە کۆنەوە پیشەسازییە دەستیە هونەرییەکان لە هەولێر بە یەکێک لە داب و نەریت

دانراوە[140]، و هەروەها چنینی مافوور پێویستی بە وردەکاری و هێمنی و پشوو درێژی هەیە کە ئەمە زیاتر لە سەلیقەی ژناندا هەیە تا پیاوان هەر بۆیە لە کوردەواریدا چنینی مافوور زیاتر پیشەی ژنانە[141].

بیرو بۆچوونی رۆژهەلاتناسان و مێژوونووسانی بیانی گوزارشت لە بیروەری ئەو رۆژانە دەکەن کە بە ناوچەکانی کوردستان گوزەریان کردووە، و میوانی ماڵێکی کوردبوون سەرسامی دەست و پەنجەی خانمی کوردبوون لەو پیشەدەستیانەی کە پێشانگا ئاسا ماڵەکانیان پێ رازاندووەتەوە[142]، مافووری دەشتی هەولێر بە شێوەیەکی گشتی دەکرێت بە دوو بەشەوە:

یەکەمیان: بۆ نووستن بە کاردەهێنرێت کە بەشێوەیەکی گشتی پێوانەکەی لە(١×٢م)یان(١×٢.٥م) دەبێت.

دووەمیان: لاکێشە (سەرەناز) بەکاردەهێنرێت بۆ دانشتن و بە شێوەیەکی گشتی پێوانەکەی لە (٩٠سم×٤٠٠سم) دەبێت[143]، ئەمەش دەگەرێتەوە بۆ ئەوەی دەشتی هەولێر بە شێوەیەکی گشتی گەرمە و خانووەکانی گەورەبوون بۆیە درێژی ئەم سەرەنازانە زۆر بووە[144].

نەخش و نیگاری سەر مافوور لە سەرەتادا رەنگە سادە و ساکار بوو بێت لە چەند هێڵێک زیاتر تێنەپەرێت و لەچەند هێڵێکی ئەندازەیی راست و چەند گۆشەیەکی زیاتر نەبووە پاشان فیری نەخشی زیاتر بوون توانیویانە رەنگەکان لە



یەکێک لەو مافوورانەی خاتوو ئەسمەر موحەممەد دروستی کردووە

جێگای خۆیان دابنێن، هەروەها تێکەڵکردنی گیانداران و هێڵ و گۆشەی ئەندازەیی، وای کردووە دووربێت لە راستەوە ئەویش بە هۆی ئەوەی لە کوردستان گەیشتن و گواستنەوە لە سەرەتادا زۆر ئەستەم بووە بۆیە نەخش و زەخرەفەکانیش زۆر لێک جیاوازبوون، پاش تێکەڵاوبوونی کۆمەڵگای کوردەواری نەخشەکانی سەر مافوور گواسترایەوە تێکەڵاوبوونی یەکتری هونەری تازە فێربوون[145].

ئەگەر بەراوردێک بکرێت لە نێوان هۆزە کۆچەری و نیشتەجێبووەکان دەبینی جیاوازی هەیە لە نێوان مافوورەکان لە رووی نەخش ورەنگەکان، هۆزە کۆچەرییەکان رەنگی تۆخ (زەق) یان بەکارهێناوە ئەویش دەگەرێتەوە بۆ ئەو ژینگەیەی کە تێیدا ژیاون و بوونی گیای زۆر کە رەنگەکەیان لێ دروست کردووە، و

هەروەها نەخشیان زۆرە بۆیە مافوورەکانیان دوو تا سێ چوارچێوەی هەیە، بەڵام مافووری هۆزە نیشتەجێبووەکان رەنگیان کاڵترە و زیاتر بۆ مافوورەکانیان نەخشی گوڵیان بەکارهێناوە[146].

لە ساڵانی پێش حەفتاکان تا هەشتاکان کەمتر وێنەی ئەندازەیی بەکاردەهێنرا، بەڵام لە هەشتاکان نەخشەکان بە تەواوی ئەندازەییە و زۆر بەکەمی وێنەی گیانلەبەران دەبینرێت ئەویش بەهۆی هاتنی شەڕ و تێکەڵ بوون بە شارەکان و کاریگەری باری سیاسی و بەکارهێنانی شتی تازە[147]، مافوورەکانی دەشتی هەولێر کۆمەڵێک نەخشی لەسەرە کەلە هەمان نەخشی سەر کێڵی بەردەکانی قەلای دوین × دەچن بەتایبەتی نەخشە ئەندازەییەکانی (بازنە و سێگۆشە و مەعینی چوارگۆشە و لاکێشەیی و هێڵی بە ناویەکدا هاتووە)ئەمانەش بەمەبەستی پرکردنەوەی بۆشایی وجوانی بەکارهێنراون.

جگە لە نەخشی ئەندازەیی نەخشی گۆچان و چەک و مانگ و رۆژ چەند نەخشێکی تری تێدایە[148].

لە نەخشەکێشانی گشتی مافووردا جا ئەگەر وورد یاخود گەورە و سادەبێت یان لێکدراو زۆری ژمارەی نەخشەکان لە مافووردا دوو تایبەتمەندی باشی دەداتێ:

یەکەم : زیاتر مافوورەکە بەشەوق و دەرکەوتووتردەبێت و جوانییەکی سەرنج راکێشی دەداتێ.

دووەم : زیاتر دەری دەخات لە لایەنی نرخەوە، چونکە مافووری پڕ نەخش گەلێ بەنرخترە لە مافووری کەم نەخش[149].

**هەندێک لە ئافرەتە دەست رەنگینەکانی دەشتی هەولێر باس لە دروستکردنی مافوور دەکەن:**

بۆ زیاتر ناساندنی نەخشی سەر مافوورەکانی دەشتی هەولێر بە پێویستمان زانی سەردانی چەند ئافرەتێکی دەست رەنگینی ئەم شارە بکەین: -

خاتوو (ئەسمەر موحەمەد) دانشتووی گوندی شەمامکە و سەر بە عەشیرەتی سنجاو، تەمەنی (٤٥) ساڵ بوو لە ١٣ ساڵیدا دەستی کردووە بە مافوور چنین، سەبارەت بە مافوورچنین و نەخشەکانی وتی" ئەو ئامێرەی کە مافوورەکەم پێ دەچنی باوکم بۆی دروست کردبوم، مادەی خوری و قوماشی کۆنم بەرکادەهێنا بۆ دروستکردنی مافوور، بەڵام ئێمە خوری خۆمان نەبوو، خوری و رەنگەکەم لە بازاڕ دەکڕی، پێی دەوترا (حەوت ڕەنگ)، زیاتر رەنگی نارنجی و زەرد و سور و سەوزم بەکاردەهێنا".

لە درێژەی وتەکانیدا گوتی"ئەو نەخشانەی لەسەر مافوور دروستم دەکرد نەخشی(پێ مریشک) و (پێ گورگ) و(شانە و گوڵ) و(سپانە) و نەخشی (قادرمە و شەنە)و نەخشێکی تر کە شێوەی لە(پەپوولە) دەچوو و نەخشی (سەبیل) کە زیاتر بۆ لێوارەکان بەکارم دەهێنا، و هەروەها هەر نەخشێکی جوانم


وێنەی ئەو چەند مافوورەکانی خاتوو (هەمین ئیبراهیم مەولود)

ببینایە لەسەر قاپ یان لەسەر قوماش لەسەر مافوورەکە دروستم دەکردەوە، هەروەها ناوی ئەوکەسەی مافوورەکەم بۆ دروست دەکرد لەسەر داوای خۆی ناوەکەیم لەسەر مافوورەکە دەنووسی" ئەم ئافرەتە بە ماوەی بیست رۆژ مافوورێکی تەواو کردووە، مافووری زۆری چنیوە گەورەترینیان درێژی ٤ مەترو پانی ١ مەتر بووە، مافووری زیاتر بۆ عەرەبەکانی شەرگات چنیوە، تائێستاش دوو مافووری لەماڵەوە مابوو[150].

یەکێک لەو مافوورانەی خاتوو(ئەسمەر موحەمەد) دروستی کردووە.

یەکێکی تر لەو ئافرەتانە(شوکرییە شێخ موحەمەد شێر عەلی)یە کە خەڵکی گوندی(زیارەتی مەلا زادە) بوو ئێستا لە بەحرکە دەژی تەمەنی(٥٧) ساڵە، ئەم ئافرەتە سەر بەعەشیرەتی هەرکییە. سەبارەت بە رستن و چنین وتی"مادەی سەرەکی دروستکردنی مافوور خوری مەڕ و مووی بزن بوو، لە دوای برینی و شتنەوە و شانەکردنی دەرێسرا و ڕرەنگ دەکرا، رەنگی شینی تۆخ، سەوز، سور، رەش، سپی، پەمەیی بەکاردەهێنرا".

ئەو نەخشانەی کە ئەو ئافرەتە بەکاری هێنابوون بەپێی وتەی خۆی (نەخشی گوڵ و گوڵزار)و، (کەروێشک)، (مامز)بوون، هەروەها وتی کاتی زۆری دەویست و هەر نەخشێکم بە ماوەی دوو یان مانگ و نیوێک تەواو دەکرد.

هەروەها خاتوو شوکرییە وتی"ئەم کارە لە دایکم فێربووم کە بە منداڵی لەگەڵی بووم تەماشام دەکرد، دوایی بۆخۆم هەوڵم دا ئەم کارە بکەم تەنها بو جوانی بوو، لەکاتی ئێمەدا ئەوەبووە کەوا هەر ماڵێک یاخود ئافرەتێک مافوورێک یان بەڕەیەکی بۆخۆی دروست بکردایە پێ بەناوبانگ دەبوو شانازی بەکارەکەیەوە دەکرد"[151].

(هەمین ئیبراهیم مەولود) ئافرەتێکی دەست رەنگینی عەشیرەتی باڵەکایەتییە و تەمەنی (٦٧) ساڵە و لەکۆمەڵگای (پیرزین) نیشتەجێیە، ئەم ئافرەتە خوری بەکارهێناوە، رەنگەکانی سور، پرتەقاڵی، شین، زەرد، زیاتر لە مافوورەکانیدا بەکارهێناوە، نۆ مافووری گەورەی دروست کردووە لەگەڵ چەند مافوورێکی بچووکدا هەروەها (بەرماڵ)و (بەڕە) و(فانیلە)و چەند شتێکی تری دروست کردووە.

چنینی مافوور و نەخشەکانی لەلای ئافرەتێکی سەر بە عەشیرەتی

ناکۆی فێر بووە، پاشان خۆی هەردوو کچەکەی فێری چنینی مافوور کردووە، ئامێری تەونکردنەکەی لە ئاسن دروستکرابوو تا ئێستاش پارچەیەکی مابوو، یەکێک لەو مافوورانەی کە لای مابوو(١٥) ساڵ پێش ئێستا دروستی کردبوو، هەروەها ئامرازێکی تەونکردنی مابوو پێ دەوت (هەبۆ) بۆ کوتانی مافوورەکە بەکاری دەهێنا و بەڕەیەکیشی مابوو.

سەبارەت بەنەخشی سەر مافوورەکە زانیاری نەبوو وتی"من هەر دروستم دەکرد کە دەمبینی لە خەڵکەوە فێری بووم نەخشی ئەندازەیی و ڕووەکیم بەکارهێناوە"، لەو مافوورەی کە مابووی بۆ لێوارەکانی گوڵی بەکارهێنابوو[١٥٢].

بە گفتوگۆکردن لەگەڵ ئەم ئافرەتانە ئەوەمان بۆ دەرکەوت نەخشی سەر مافوورەکان زیاتر لە سروشت و دەوروبەر، یان لەسەر ئەو وێنانەی لەسەر قاپ و قوماشن وەریان گرتووە.

ئەگەر بە شێوەیەکی گشتی سەیری نەخشەکانی مافوور بکەین دەبینین کاریگەری شارستانیەتە کۆنەکانی لەسەرە وەک وێنە کردنەوەی ئاژەڵە ئەفسانەییەکان و خوداوەند عەشتار و بوونی شێوەکانی خاچ بە چەند جۆرێک، بەکارهێنانی خاچ لە مافووری کوردیدا دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کەئەم خاچە تەنها وەک نەخشێک بەکاهێنراوە، یاخود ئەو کەسەی مافوورەکەی دروست کردووە مەسیحی بووە.

بوونی نەخشێک یاخوود



هێمایەک یا نەخشێک بەڕەنگێکی تۆخ لەناو نەخشەکانی تری مافوورێکدا وەک هێمایەک بووە کە مافووری هۆزەکەی پێ بناسرێتەوە.

چەند نموونەیەک لە مافووری هۆزەکانی دەشتەکانی هەولێر:

**هۆزی هەرکی:**

ئەم هۆزە گەورەترین هۆزی کۆچەرین لە کوردستان دا، بەڵام لەوانەیە ئەمە شتێک بێت بەسەر چوویێت، هۆزی هەرکی لە عێراق بۆ دووبەشی سەرەکی دابەش دەکرێن بەشی هەولێر و بەشی موسڵ کە مەڵبەندەکەیان لە نزیک ئاکرێیە، لە هاویندا هەردوو هۆزەکە بە پێی داب و نەریت و ژیانی ئابووریان بەرەو لەوەڕگەکان یا بەرەو ناوچەکانی سنوری ئێران دەچوون[١٥٣].

ئەم مافوورە هەرکییەکان چنیویانە لە عێراق لە نێوان ساڵانی (١٩٤٠-١٩٥٠) درێژی ئەم مافوورە(٢.٦ مەتر) و پانییەکەی(١.٥ مەتر) دەبێت، شێوەکەی لاکێشەییە و لە خوری دروستکراوە، و ڕەنگی سووری تۆخ، پرتەقاڵی، بێجی، سەوزی کاڵ، نیلی، سوری کاڵیان بەکارهێناوە، و یەکێک لەلاکانی سەرەوەی ریشووی پێوەیە، ئەم مافوورە نەخشی ئەندازەیی، ڕووەکی، ئاژەڵی تێدا نەخشێنراوە، نەخشەکان لە مەعینی گەورە و بچووک و ئەستێرەیی و هێڵی لار و شکاو پێکهاتوون، نەخشە ڕووەکییەکان پێکهاتوون لە گوڵی سێبەر و قەدی درەخت کە بەشێوەیەکی داماڵراو لە سروشت وەرگیراوە، نەخشی کیسەڵی تێیدا نەخشێنراوە[١٥٤]، هەروەها لە بەشی سەرەوەی پیتی (T-S) ئینگلیزی دەبینرێت لە نەخشەکانی دا لە بەشی سەرەوە و خوارەوەی مافوورەکەدا بەتەنها دەبینرێت، ئەم مافوورە دوو چوارچێوەی هەیە یەکەمیان پانترە لە دووەمیان شێوەی قەدی ڕووەکی تێدایە، بەڵام بەشێوەیەکی دوور لە سرووشت، دووەمیان لە نەخشی ڕووەکی و ئەندازەیی بە تێکەڵاوی کە وێنەی گوڵ کراوە لە نێوان هێڵەکاندا، لای هۆزە کۆچەرییەکان نەخشی زۆر بەکارهێنراوە بۆیە لە مافوورەکانیاندا دەبینین دوو تا سێ چوارچێوەی هەیە.

بەشی ناوەوەی مافوورەکە (ناوەڕاستی) پێکهاتووە لە سێ مەعینی ئەندازەیی گەورە لەناو هەریەکێک لەو مەعینانە نەخشی ڕووەکی و ئەندازەیی و ئاژەڵی تیادایە، کە پێکهاتووە لە نەخشی

چوار کیسەڵ لە ناوەڕاستی ئەم چوار کیسەڵەدا وێنەی گوڵێک کراوە بە هەمان شێوەش هەردوو مەعینەکەی تر کراون لە نێوان ئەو مەعینە گەورانەدا لەدەرەوەی شێوەی گوڵی ئەستێرەیی و مەعینی و زگزاگی کراون.

سەبارەت بەواتای نەخشەکان لە لایەن هەر میللەتێک بە جۆرێک شی دەکرێتەوە و بۆ مەبەستی جیاواز بەکارهێنراون، بۆ نموونە گوڵی سێپەڕ لە(بەرماڵی) نوێژکردن لە ئاسیای بچووک و مەغریبدا بە کارهێنراوە[١٥٥] بەڵام پێدەچێت لە مافووری کورددواری تەنها بۆ جوانی بێت.

لەم مافوورەدا پیتی (T-S) نەخش کراوە هەروەها لەسەر مافوورەکانی چین و تورکمانستان رۆژهەڵاتی قەوقاز پیتی (T) دەبینرێت، و لە لێوارەکانی مافووری فارسە کۆنەکاندا پیتی (S) دەبینرێت کە هێمایە بۆ رووناکی و هەندێ جاریش وەک شێوەی مار بەکارهێنراوە، بەڵام لە مافووری کوردیدا پیتی(S)× بەمانای ئەوە دێت کە مرۆڤ تێکەڵاوی سروشتە[١٥٦].

زۆربەی ئەو مافوورانەی لەدیمەنی نەحتە بەردینانەکانی ئاشوورییەکاندا نەخشکراون، نیگاری ئەوتۆیان لەسەرە کە لە نەخش و نیگارەکانی مافووری کوردەکان دەچێت، و یەکێک لەو نەخشانەی کەلەسەری کراوە نەخشی کیسەڵە[١٥٧]، کیسەڵ یەکێکە لە چوار ئاژەڵەکەی جیهانی لاهوتی کە بەشێوەیەکی راستەقینە وێنەی دەکێشرێت لە نەخشی



نموونەیەک لە مافووری هۆزی گەردی لە مۆزەخانەی رستن و چنین وەرگیراوە

مافووری هیندیدا، و هەروەها لە چین نیشانەیە بۆ ژیانێکی درێژ[١٥٨].

### هۆزی گەردی:

یەکێک لە گەورەترین و بەناوبانگترین هۆزەکانی دەشتی هەولێر هۆزی گەردییە، ئەم هۆزە لەکوردستاندا بۆ دوو کۆمەڵە دابەش دەکرێن یەکێکیان لە باکووری هەولێرە و ئەوی تریان لە باشووری رۆژئاوای کۆیە یە[١٥٩].

و هەموویان دانیشتووی گوندن، ژمارەی گوندەکانیان نزیکەی هەشتا گوند دەبێت و مەڵبەندیان گوندی بەحرکەیە[١٦٠]، هۆزی گەردی مافووری گەورە و فراوانیان لە خوری چنیوە نەخشەکانی مافووری هۆزی گەردی لە نەخشەکانی مافووری کوردە قەوقازیەکان و نەخشی فارسی دەچن، هەروەها رەنگەکانیان لەگەڵ ڕەنگی مافووری دزەییەکان وەک یەکن، و رەنگەکانیشیان باشترن و بریسکەیان زیاترە[١٦١].

ئەم مافوورە لە نێوان ساڵانی (١٩٣٠-١٩٤٠)چنراوە شێوەکەی لاکێشەییە و لە خوری دروست کراوە، ئەم رەنگانەی کە لە مافووردا بەکارهاتوون ئەمانەن(رەش، پرتەقاڵی، بێجی، زەرد، نیلی، سوور) و ئەو نەخشانەی کە لە سەر ئەم مافوورانە کراون نەخشی رووەکی و ئەندازەیی و ئاژەڵی بوون[١٦٢].

ئەم مافوورە سێ چوارچێوەی (لێوار) هەیە، یەکەمیان لە نەخشی رووەکی پێکهاتووە، کە وێنەی چوار جۆرگوڵی تێدایە، و دووەمیان بە هەمان شێوە لە گوڵ پێکهاتووە بەڵام بەقەبارەی گەورەتر، و سێیەمیشیان بە هەمان شێوە پێکهاتووە لە نەخشی گوڵ بەڵام بە شێوەی پێکەوە بەستراو.

بەشی ناوەڕاستی مافوورەکە لە سێ نەخشی ئەندازەیی هەشت لای گەورە پێکهاتووە، لە بەشی سەرەوەی (١٠) شێوەی هەشت لای بچووک لە دوو ریز کراوە کە لە ناوەوەیاندا نەخشی تێدایە لە شێوەی پیتی (Y) ئینگلیزی لە هەشت لای ناوەڕاستدا شێوەی گوڵەئەستێرەی تێدایە لەگەڵ بوونی چوار شێوەی مەعینی بچووک، لە بەشی خوارەوەی مافوورەکە وێنەی دوو سەگ لەگەڵ وێنەی دوو باڵندە لەم لاو ئەو لای هەشت لاکەوەیە دەردەکەون، و لە نێوان ئەم هەشت لایانەشدا هەشت لای بچووکتر هەیە کە نەخشی پیتی (Y) تێدایە، لە هەموو بەشەکانی مافووردا شێوەی گوڵی جۆراوجۆر و بچووک و گەورەی تێدایە لەگەڵ شێوەی مەعینی بچووک[١٦٣]، سەگ لە سەر مافووری کۆچەرییەکان و فارسەکان بە

ڕێژەیەکی زۆر دەردەکەوێت، ئەمەش بەهۆی بە وەفایی و دڵسۆزی سەگەوەیە، هەروەها سەگ لەهەندێک شوێنی تردا بە مانای میللەتە نزمەکان دێت[١٦٤]، لەبەرئەوەی ئەو هۆزانە بە شوانکارەییەوە خەریک بوون و سەگیان بۆ پاسکردنی مەڕو ماڵات بەکارهێناوە لە بەرئەوە لە دیمەنی سەر مافوورەکانیشیاندا لە بیریان نەکردووە.

**هۆزی سورچی:**

هۆزێکی گەورەی بەناوبانگی کوردستانن دەکرێن بەدوو بەشی سەرەکییەوە، یەکێکیان بە(سورچی باتاس) ناسراوە و شوێنەکەیان دەکەوێتە باکووری ڕۆژهەڵاتی هەولێر، ئەوی تریان لە باکووری هەولێرن لە نزیک ئاکرێ، ئافرەتانی هۆزی سورچی جۆری و ڕەنگی مافوورەکانیان جیاوازیەکی زۆری نییە لە گەڵ هەرکییەکان[١٦٥].

شێوەکەی لاکێشەییە و درێژییەکەی (٢.٣٠م) و پانییەکەی (١م) دەبێت، ئەو ڕەنگانەی کە تێیدا بە کارهاتوون(پرتەقاڵی و ڕەش و زەردی کاڵ و سوری تۆخ، مۆری تۆخ، بێجی). ئەم مافوورە لە مادەی خوری دروست کراوە، نەخشەکانی ئەم مافوورانە بە زۆری ئەندازەیین نەخشی ڕووەکیشی بەکەمی تێدایە[١٦٦].

ئەم مافوورە چوارچێوەیەکی هەیە کە نەخشی شێوە خاچ لەگەڵ شێوەی پیتی (x) ئینگلیزی بە تێکەڵی تێدایە، پێدەچێت هەردوو نەخشەکە بۆ جوانی بوو بێت، چونکە لە ڕۆژهەڵاتدا هیچ مانایەکی نییە،



**نموونەیەک لە مافووری هۆزی سورچی لە مۆزەخانەی ڕستن و چنین وەرگیراوە، لە نێوان ساڵانی (١٩٦٠-١٩٧٠) بەرهەم هێنراوە**

بەڵام لە ئەرمینیا کە شێوەی خاچ کراوە هێمای مەسیحیەت بووە.

بەشی ناوەوەی مافوورەکە زۆرنەخشی تێکەڵاوی بە شێوەیەکی چروپڕ تێدا کراوە، و بوونی سێ نەخشی ئەندازەیی گەورە لە ناو ئەم سێ نەخشەدا نەخشی جۆراوجۆری تێدا دروستکراوە، لە بەشی سەرەوە و خوارەوە نەخشی تێدایە وەک قەدی درەخت وایە، و لە نێوان ئەم نەخشانەدا نەخشی شێوە مەعینی و چەند زەخرەفەیەکی وردتری تێدایە کە ڕوون نین و بوونی چوار شێوە لە پیتی(h)ی ئینگلیزی دەچێت، ئەم شێوە دارە لە لای چەند نەتەوەیەک بە درەختی ژیان ناسراوە، و لە لای هیندییەکان بە نیشانەی نەمری هاتووە، دار لە سەر مافووری ڕەوەندەکان لە ڕۆژئاوای تورکستان هێمای درەختی پتەوە دەنوێنێ[١٦٧].

بوونی سێگۆشە لە شێوەی پیتی(S)ی ئینگلیزی دایە، لە نەخشەکانی هیندوئەورووپییەکان بەمانای تێکەڵاو بوونی مرۆڤ و گیانداران دێت[١٦٨]. و لەهەندێ وڵاتدا هێمای خۆشییە، کە هێمایەکە بۆ دایکی زەوی و خوداوەندەکان لە سوریا و مەغریب دۆزراوەتەوە[١٦٩] و شێوەی ئەندازەیی ئاڵۆزی تێدایە بە مانای ڕۆژ دێت[١٧٠].

**هۆزی دزەیی:**

هۆزێکی گەورەی کوردستانن، لە سەدەی هەژدەدا ئاغا دزەییەکان بەرپرس بوون لە کۆکردنەوەی هۆزە غەیرە کوردییەکان کە بەردەوە دەشتی هەولێر گەشتیان کرد لە گەڵ خۆیان داب و نەریتی چنینیان هێنا، هەرچەندە ئەوان ئەمەیان لەگەڵ کاریگەری کوردستانی تورکیا تێکەڵکرد و بەرهەمی قەوقازییەکان[١٧١]، ئەم هۆزە لە بنەڕەتدا بۆ گوندی دزەیی ورمی دەگەڕێتەوە[١٧٢].

نموونەیەک لە مافوورەکانی دزەییەکان لە مۆزەخانەی ڕستن و چنینی هەولێر لە نێوان ساڵانی ١٩٥٠-١٩٦٠ دروستکراوە[١٧٣].

درێژی مافوورەکە (٢.١٨م) و پانییەکەی (١م)دەبێت، شێوەکەی لاکێشەییە و لە خوری دروست کراوە، ڕەنگەکانی (پرتەقاڵی، سوری تۆخ، سوری کاڵ، مۆری تۆخ، نیلی ڕەش)تێدابەکارهێنراوە، نەخشەکانی (ئەندازەیە، ڕووەکی و ئاژەڵی، مرۆیی) تێدانەخشێنراوە.

ئەم مافوورە لاکێشەییە دوو چوار چێوە لە خۆ دەگرێت، یەکەمیان نەخشی تێدایە کە پێکهاتووە لە گوڵی جوراو جۆر، دووەمیان

پێكهاتووە لە شێوەیەكی ئەندازەیی لە شێوەی لەنگەر دایە لەگەڵ بوونی چەند خاڵێك لە نێوانیاندا، بەشی ناوەوەی مافوورەكە پێكهاتووە لە پێنج شێوەی ئەندازەیی شەش لای گەورە، سەرەكانیان بەیەكەوە بەستراوە كە دەوری كۆمەڵێك نەخشی تری داوە، واتە لە ناوەڕاستی شەش لاكەدان لە ناوەڕاست چوار گۆشەیەك هەیە، كە وێنەی گوڵە ئەستێرەی تێدایە بە گەورەیی، بەشێوەیەكی گشتی ئەم شەش لایە چەند شێوەیەكی ئەندازەیی بچووكی تێدایە زیاتر بۆ پڕكردنەوەی ناو شەش لاكە بەكارهێنراون وەك سێگۆشە و مەعینی و چەند شێوەیەكی تر كە روون نین، لە دەوری ئەم شەش لایانەدا كۆمەڵێكی زۆر لە نەخشی رووەكی هەیە.

بونی وێنەی مرۆڤ بە شێوەیەكی سادە لە بەشی خوارەوە و سەرەوەی مافوورەكەدا، كە ژمارەیان چوار مرۆڤە دووانیان لە سەرەوە و دووانەكەی تریش لە خوارەوەن كە لەم لاو ئەو لای نەخشەكانن[١٧٤].

نەخشی گوڵە ئەستێرە لە هەندێ سەرچاوەدا ئەستێرەی جوولەكە (ئەستێرەی داود)×ی پێدەوترێت هێمای ئەستێرەی هەندێك لە وڵاتانی رۆژهەڵاتی ناوەڕاستە، زۆربەی ئەم هێمایانە لە سەر مافوورەكانی قەوقاز و سۆماك دۆزراونەتەوە.[١٧٥]

دروستكردنی وێنەی مرۆڤ لە ناو میللەتە ئیسلامییەكاندا زۆر گرنگی پێ نەدراوە، بەڵام وێنەی مرۆڤ هەیە لەسەر مافووری فارسەكان بە تایبەتی



نموونەیەك لە مافوورەكانی دزەییەكان لە مۆزەخانەی رستن و چنینی هەولێر لە نێوان ساڵانی ١٩٥٠-١٩٦٠ دروست كراوە[١٧٢]

ئەو مافوورانەی كە نەخش و نیگاری گرنگی تێدایە، لەگەڵ دارشتنی فراوان لە سەر ئەو مافوورانەی كە وێنەی راوكردنی تێدا دەبینرێت[١٧٦].

لە میانەی گفتوگۆكردنمان لەگەڵ خاتوو (ژیان دزەیی) سەبارەت بە مافووری دزەیی و نەخشەكانی وتی "ئەو ئافرەتانەی لە كۆندا مافووریان دروست كردووە نێستا نەماون، (حەلیم بادینی) و (شوشە) و (لەعلی) خان بوون، ئەو كاتە بە بیست رۆژ مافوورێكیان دروست

دەكرد و مادەی خوریان بەكارهێناوە، كەم جار مووی بزنیان بەكارهێناوە بۆ كەزی (پرچ)ی لێوارەكانی فەرشەكان، رەنگەكان لە یەمەن و هیندستان و سوریاوە دەهێنران، ئەو نەخشانەی كە بەكاردەهات نەخشی گوڵە چكلێتە كە شێوازی شێوازی شەپۆلی هەیە و بۆ لێوارەكانی مافوورەكان بە كارهێنراوە، نەخشی مەعینی بچووك (پاقلاوە) بە كارهێنراوە، ئەم نەخشانە بە زۆری لە كاغەزی چكلێتەوە وەرگیراون كە لە هیندستانەوە هێنراوە. هەروەها نەخشی گوڵە حەوز یان لەگەڵ نەخشەی (قەزمە نووشتی) بەكارهێنراوە، هەرشتێك سەرنجی راكێشابێتن وێنەیان كردووەتەوە[١٧٧].

لە ئەنجامی ئەم توێژینەوەیەدا لە سەر مافووری شاری هەولێر و دەوروبەری چەندین لایەنی گرنگمان بۆ روون بووەوە، شاری هەولێر هەر لە كۆنەوە شارێكی بەناوبانگ بووە لە دروست كردنی مافووردا، هەروەها ئەو هۆزانەی لە هەولێر و دەورو بەریدا نیشتەجێبوون لە رووی هونەرییەوە لەپیشە دەستكردەكانیاندا بە ئاشكرا رەنگی داوەتەوە، هەروەك لە نەخش و نیگارەكانی سەر مافوورەكاندا دەردەكەوێت، ئەمە سەرەڕای بوونی پەیوەندی بازرگانی و كۆمەڵایەتی لە نێوان ئەم هۆزە كوردیاندا كە ئەمەش بە شێوەیەكی ئاشكرا لەنەخشی سەر مافووردا رەنگی داوەتەوە، هونەری دروست كردنی مافوور هونەرێكی گرنگە بۆ نێمەی كورد، چونكە مۆركێكی

کوردانەی پێویە، هۆی سەرەکی داهێنانی مرۆڤ بۆ مافوور دەگەڕێتەوە بۆ خۆپاراستنی لە ژینگە، و پێویستی دایکی هەموو داهێنانەکانە واتە پێویستی مرۆڤەکان بۆ خۆ پاراستن وای کرد کە مرۆڤ ئەم جۆرە چنراوە دابهێنێت وەک رایەخێک، بەڵام بە تێپەڕبوونی کات گۆڕانکاری بەسەر داهات و پێشکەوتنی بەرچاوی بە خۆیەوە بینی کە بۆ مەبەستی رازاندنەوەی ماڵەکان و بازرگانی پێکردن لایەنێکی گرنگی ئابووری دانشتوانی دەشتی هەولێری پێکهێناوە، هەروەها لێکچوونێکی زۆر هەیە لە نێوان شێوەی دروست کردن و نەخشەکانی سەر مافوورەکاندا لە نێوان هۆزەکان دا، و کاریگەریان لەسەر یەکتری هەبووە، ئەمە سەرەڕای هەبوونی کاریگەری شارستانییەتە کۆنەکان و وڵاتانی دراوسێ لەسەر مافوورەکانی دەشتی هەولێر، سەرەڕای بوونی بۆچوونی جیاواز لەسەر نەخشی سەر مافوورەکان، بەڵام ڕەنگ هۆکاری سەرەکی بوونی ئەو نەخشانە دەگەڕێنێتەوە بۆ کاریگەری ئەو ژینگەیەی کە تێیدا ژیاون.

**لیستی سەرچاوەکان:**

(١) أبو هاشم، عبدالستار حسين: فن صناعة السجاد والكليم اليدوي، (القاهرة-٢٠٠٢) ص٣٢.
(٢) سورة نوح، الاية ١٩.
(٣) سورة الغاشية : الاية ١٣-١٦.
(٤) حميد، عبد العزيز: ((الطنافس صناعة عراقية قديمة))، مجلة آفاق عربية، العدد(٨)، (بغداد-١٩٨١)، ص٢٢٩.
(٥) محمد، سعاد ماهر: الفنون الاسلامية (مصر-٢٠٠٢) ط٢، ص٢٧٤.
(٦) الزبيدي، كاظم كاطع: محاضرات في مادة المنسوجات، قسم الاثار، ص١.
(٧) بابۆکی، عوسمان: (دروستکرنی مافوور لە کوردەواریدا)، گۆڤاری ئاسۆی فۆلکلۆر، ژمارە(٩) (هەولێر-١٩٩٦)، .
(9) Ghareb, Ako:Kurdish Rug (prenter), 2007, p1
(١٠) حميد: المصدر السابق، ص٢٢٩
(11) Gareb: Ibid, p1
(١٢) مزروق، محمد عبدالعزيز: الفنون الاسلامية في العصر العثماني (مصر-١٩٧٤) ص ١٢١-١٢٢.
(١٤) ساكز: هاري: عظمة بابل موجز حضارة بلاد وادي الرافدين القديمة، ترجمة: عامر سليمان، (موصل-١٩٧٩)، ص٣٠.
(١٥) محمد، سعاد ماهر: الفنون الاسلامية، ط١، (مصر-١٩٨٦)، ص١٦٩.
(١٦) العطار، مختار: آفاق الفن الاسلامي (القاهرة-ب.ت)، ص٥.
(١٧) دريج، دورثي : عمل السجاد، ترجمه: محمود النبوى الشال، (مصر-ب.ت)، ص٥.
(١٨) حميد: المصدر السابق، ص٢٢٩.
(١٩) زكي محمد حسن: فنون الاسلام، (بيروت-١٩٨١)، ص٣٤٥.
(٢٠) محمد: المصدر السابق، ط٢، ص٢٧٤.
(21) WWW.brob.org
(٢٢) الجادر، وليد: الحرف والصناعات اليدوية في العصر الاشوري المتأخر، (بغداد-١٩٧٢)، ص٣٢.
(23) WWW.brob.org
(٢٤) نصرى، منهج قبلى، ل ١.
(٢٤) الجادر: المرجع السابق، ص٣٢١.
(25) www.brob.org
(٢٦) الجادر: المرجع نفسه، ص. ٢٢٦
(٢٧) حميد: المصدر نفسه، ص ٢٣٦-٢٣٧.
(٢٨) الجادر: المصدر السابق، ٣٢٧
(٢٩) العطار، المختار: المصدر السابق، ص ٧٩
(30) www.al-sham.net
(31) Opie James, Tribal Rugs, p29 (London-1992).
(٣٢) نصري: فرش إيران، ل.١
(٣٣) حميد: الطنافس صناعة عراقية قديمة، ص٢٣٢
(34) www.al-sham.net
(٣٦) حميد، المصدر الساق، ص ٢٣٢.
(37) Opie: Ibid, p22
(٣٨) العطار: المصدر السابق، ص ٧٩.
٣٩) حميد: المصدر السابق، ص ٢٣٢.
(* گرێی سوماک : دوو دەزووی ئاسۆیی (پۆ) دەڕوات لەسەر چوار دەزووی ستوونی(تان) و دەگەڕێتەوە لە ژێر دەزوودا لەکاتی گۆڕانی ڕەنگ دەزووی(پۆ) ئاسۆییەکەی دەگۆڕێت و لە دواوە دەبڕێت ڕێگای سۆماک تەنها بۆ یەک روو دەبێت.www.al-sham.net
(٤٥) مختار: المصدر السابق، ص٨٣.
(٤٦) محمد: المصدر السابق، ط١، ص١٧٠.
(٤٧) تۆفیق: سەرچاوەی پێشوو، ل٥.
(٤٨) الطبرى: الإمام جعفر محمد بن جرير: تأريخ الامم والملوك، (القاهرة-١٩٣٩م) ج٤، ص٢٢.
(٤٩) محمد: المصدر السابق، ط٢، ص٢٧٥.
(٥٠) مختار: المصدر السابق، ص٨٣.
* ڕێگەی تابستری: ئەمەش یەکێکە لە ڕێگاکانی دروست کردنی مافوور کە دوو دەزووی پۆ (کمە) دەڕوات بە سەر چوار دەزووی تان (سدی)دا و دەگەڕێتەوە بۆ دوو دەزووی ژێری، لەکاتی گۆڕانی ڕەنگەکاندا لە دواوە دەردەچێت و دەبڕێت.www.al-sham.net
** ڕێگەی التطریز : ڕێگایەکی ترە بۆ دروستکردنی نەخش لە سەر مافوور ئەویش دروست کردنی نەخشەکانە بە دەزووی ڕەنگاوڕەنگ جیاواز لە قوماشەکە یاخود مافوورەکە، الزبیدی: المصدر السابق، ص١٢.
(٥١) محمد: المصدر السابق، ط٢، ص١٧٠.
(٥٢) الباشا: مدخل الى الاثار الاسلامية، (مصر-١٩٧٩)، ص ٣٣٧.
(53) www.al-sham.net

(٥٤) الخطيب، محمد: تاريخ الحضارة العربية، (سوريا-٢٠٠٧)، ص١١٧.
(٥٥) يوسف، حسين محمد و حسن حمورة القاضي: فن الاشكال الزخرفية و تطبيقاتها العلمية، (القاهرة- ب.ت) ص٢٢٧.
(٥٦) الجمعة، أحمد قاسم: المنسوجات والملابس، موسوعة الموصل الحضارية، (جامعة الموصل-١٩٩٢)مج٣، ص٣٧٩.
(٥٧) الزبيدي: المصدر السابق، ص٣١-١٤.
(٥٨) المختار، فريال داود: المنسوجات العراقية الاسلامية، (بغداد-١٩٧٧)، ص٤٨-١٠٤.
(٥٩) الجادر: المصدر السابق، ص٣٢٩.
(٦٠) مزروق، محمد عبد العزيز: الفن الاسلامي، (بغداد-١٩٦٥)، ص١٥٢.
(٦١) لۆلان مستەفا: چاوپێکەوتن، ٢٦-١-٢٠٠٧.
(٦٢) الجادر: المرجع السابق، ص٣٢٩.
(٦٣) الزبيدي: المرجع السابق، ص٤.
(٦٤) الشناق، فيصل وآخرون: المنسوجات (عمان -٢٠٠٤)، ص. ٤٥
(٦٥) محمد: المرجع السابق، ط٢، ص٢٨٥.
(٦٦) الباشا: المرجع السابق، ص٣٣٨.
(67) www.al-sham.net
(٦٨) محمد: المرجع السابق، ص٢٨٥.
(٦٩) رۆستەم، ئاغاله: چاوپێکەوتن، بەڕێوەبەری گەلەری زاموا، سلێمانی، ١٢ -٣-٢٠٠٨.
(٧٠) عەبدوڵلا، هۆشیار: (سەرەناز)، گۆڤاری هەرێمی کوردستان، ژ(٤٥٠)، (هەولێر-٢٠٠٨)، ل٧٥.
(٧١) الجمعة: المصدر السابق، ص٣٩٤.
(٧٢) الزبيدي، خلود مانع: فن النسيج اليدوي، (عمان-٢٠٠٧) ط١، ص.١٨
(٧٣) حميد، عبد العزيز: المنسوجات، موسوعة حضارة العراق، (بغداد- ١٩٨٥)، ج٩، ص٢٥٧
(٧٤) الجادر: المصدر السابق، ص٩٩-١٠٢.
(٧٥) الزبيدي: محاضرات، ص٦.
(٧٦) ئەسمەر، موحەمەد: چاوپێکەوتن، دانشتووی گوندی شەمامک، ٣-٣-٢٠٠٨.
(٧٧) دزەیی، ژیان : (خوری شوشتن)، گۆڤاری هەرێمی کوردستان، ژ ٤٥١، (هەولێر- ٢٠٠٨)، ل٧٢.
(٧٨) الزبيدي: محاضرات، ص٤.
(٧٩) دزەیی، سەرچاوەی پێشوو، ل٧٢.
(٨٠) تۆفیق: سەرچاوەی پێشوو، ل٩.
(٨١) الزبيدي: فن النسيج اليدوي، ص٧٨.
(٨٢) الجادر : المرجع السابق، ص٧٧.
(٨٣) تۆفیق : سەرچاوەی پێشوو، ل١٠.
(٨٤) بابۆکی: سەرچاوەی پێشوو، ل٥٨.
(٨٥) ئەحمەد، ماریا: تەون و تەونکاری، گۆڤاری ئاسۆی فۆلکلۆر، ژ(١)، (هەولێر-٢٠٠٠)، ل١١١.
(٨٦) الزبيدي: محاضرات، ص٨.
(٨٧) الجمعة: المرجع السابق، ص٣٩٥.
(٨٨) الجادر: المرجع السابق، ص٧٨.
(٨٩) الشناق وآخرون: المرجع السابق، ص١٩١.
(٩٠) نصيري : فرش إيران، ل١٧.
(91) www.al-sham.net
(٩٢) الزبيدي: محاضرات، ص١٠، وينظر: الجادر: المرجع السابق، ص١٨٧.
(93) www.al-sham.net
(٩٤) الجادر: المرجع السابق، ص١٨٢، و ينظر: مزروق: الفن الاسلامي، ص. ١٥٢
(٩٤) بابۆکی: سەرچوەی پێشوو، ل٥٨.
(٩٥) الجادر: المرجع السابق، ص١٨٢-١٨٩.
(٩٦) هەدیە ئەحمەد: چاوپێکەوتن، دانیشتووی هەولێر، ٨-٣-٢٠٠٨.
(٩٧) بابۆکی : هەمان سەرچاوە، ل٥٨.
(٩٨) محمد: المرجع السابق، ط٢، ص٢٨٦.
(٩٩) المختار: المرجع السابق، ص٢٣.
(١٠٠) الجادر: المرجع السابق، ص١٨٢-١٨٩.
(١٠١) مزروق: الفنون الاسلامية، ص١٢٣.
(١٠٢) مزروق: الفن الاسلامي، ص١٥٢.
(١٠٣) تۆفیق: هەمان سەرچاوە، ل٤.
(104) www.al-sham.net
(١٠٥) الباشا: المصدر السابق، ص٣٨٨. وينظر: الجادر: المصدرالسابق، ص١٦٥.
(١٠٦) مزروق: الفن الاسلامي، ص١٥٢.
(١٠٧) شوکریە شێخ موحەمەد شێر علی: چاو پێکەوتن، دانشتووی بەحرکە، ٢٩-٣-٢٠٠٨.
(١٠٨) لۆلان مستەفا: چاوپێکەوتن، بەڕێوەبەری مۆزەخانەی رستن و چنین، هەولێر، ٢٦-١-٢٠٠٨
(١٠٩) مرزوق: الفن الاسلامي، ص١٥٢-١٥٣
(110) Anin: Eagleton, William Troduction to Kurdish Rugs and other weavings, Newyourk, 1998, p77.
(١١١) موحەمەد، تۆفیق سعید: پیشە میللییەکان(بەرە)، گۆڤاری کەلەپووری کورد، ژ ٧، (سلێمانی-١٩٩٥)، ل٤٧.
(١١٢) عەبدوڵلا، ئالا: دەست رەنگینی ئافرەتی کورد، گۆڤاری ئاسۆی فۆلکلۆر، ١٢، (هەولێر-٢٠٠٠)، ل٢٠٥.
(١١٣) تۆما بوا، ژیانی کوردەواری، وەرگێڕ: ئەحمەد سەعید حەمە کەریم، (سلێمانی - ١٩٨٠) ل٧٤.
(١١٤) بابۆکی: سەرچاوەی پێشوو، ل٥٩.
(١١٥) عەبدوڵلا: دەست رەنگینی ئافرەتی کورد، ل٢٠٦.
(١١٦) ئەحمەد: سەرچاوەی پێشوو، ل١١٢
(١١٧) عەبدوڵلا: دەست رەنگینی ئافرەتی کورد، ل٢٠٦.
(١١٨) لۆلان مستەفا: چاوپێکەوتن، بەڕێوەبەری مۆزەخانەی رستن و چنین، هەولێر، ٢٦-١-٢٠٠٨
(١١٩) عەبدوڵلا: دەست رەنگینی ئافرەتی کورد، ل٢٠٦.
(١٢١) هەمین ئیبراهیم مەولود: چاوپێکەوتن، دانشتووی کۆمەڵگای پیرزین، ١٩-٢-٢٠٠٨ .
(١٢٢) موحەمەد: پیشە میللییەکان

(لاپەرە)، ل٥٢.
(١٢٣) بابۆکی: سەراوەکانی پێشوو، ل٥٩.
(١٢٤) ئەحمەد: سەرچاوەی پێشوو، ل١١٢.
(١٢٥) بابۆکی: سەرچاوەی پێشوو، ل٥٩.
(١٢٦) عەبدوڵلا: دەست رەنگینی ئافرەتی کورد، ل٢٠٦.
(١٢٧) ئەسمەر موحەمەد : چاوپێکەوتن، دانشتووی گوندی ششەمامک، ٣-٣-٢٠٠٨.
(١٢٨) مارف: د شاد عزيز، أختام اسطوانية غير منشورة في متحف السليمانية(دراسة تحليلية)، رسالة ماجستير غير منشورة، كلية الاداب جامعة صلاح الدين/أربيل(٢٠٠٧)، ص٣١-٣٢.
(١٢٨) الجمعة: المصدر السابق، ص٣٩٦.
(١٢٩) حميد: الطنافس صناعة عراقية عربية قديمة، ص٢٢٢.
(١٣٠) محمد: الفنون الاسلامية، ط٢، ص٢٨٨.
(١٣١) عەبدوڵلا، هۆشیار : دزەیی و ناوچەی دزەییاتی دەشتی هەولێر، ژ٧، (هەولێر-٢٠٠٠)، ل١٢٤-١٣٢.
(١٣٢) عەبدوڵلا، هۆشیار: دزەیی و ناوچەی دزایەتی دەشتی هەولێر، ژ٧، (هەولێر-٢٠٠٠)، ل١٢٤-١٣٢.
(١٣٣) عەبدوڵلا: هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل١٣٠-١٣٢.
(١٣٤) سلێمان، عەباس: کۆچەری و مەرداری لە دەشتی هەولێر و قەرەچەکانی شاری هەولێر، گۆڤاری هەولێر، ژ١٦، (هەولێر-٢٠٠٢)، ل٦٠.
(١٣٥) بێخالی، سەید مەولود سەید قادر: کۆچەری رەوەندایەتی لەناوچەی هەولێردا، گۆڤاری ئاسۆی فۆلکلۆر، ژ(١٩)، (هەولێر-٢٠٠٦)، ل٥٠.
(١٣٦) تۆما بوا: سەرچاوەی پێشوو، ل٥٢.
(١٣٧) العزاوي، عباس: أربل في مختلف العصور اللواء والمدينه، مراجعه: محمد القرداغي، (بغداد-٢٠٠١)ص١٢٦-١٢٧.
(١٣٨) مستەفا، لۆلان: بابەتێکی بلاونەکراوە، بەرەی کوردەواری، وەرگێر: سوداد رەحمان، clouds state university، ل٣-٤.
عەبدوڵلا: دەست رونگی ئافرەتی کورد، ل٢٠٤.
(١٣٩) عەبدوڵلا: دەست رەنگینی ئافرەتی کورد، ل٢٠٤.
(١٤٠) نيكيتين، باسيلي: الكرد دراسة سيسولوجية و تاريخية، ترجمة: نوري طالباني، ط٣، (سلێمانی-٢٠٠٧)، ص١١٤.
١مستەفا، لۆلان: سەرچاوەی پێشوو، ل٢.
(١٤١) مستەفا، لۆلان: سەرچاوەی پێشوو، ل٢.
(١٤٢) عەبدوڵلا: دەست رەنگینی ئافرەتی کورد، ل٢٠٤-٢٠٥
(١٤٣) لۆلان، مستەفا: (چاوپێکەتن) بەرێوەبەرایەتی مۆزەخانەی رستن و چنین لە هەولێر، ٢٠٠٨/١/٢٦.
(١٤٤) رۆستەم ئاغالە: (چاوپێکەوتن)، ١٢-٣-٢٠٠٨.
(١٤٥) بابۆکی: سەرچاوەی پێشوو، ل٦٠.
(١٤٦) لۆلان مستەفا : چاوپێکەوتن، ٢٦ت-١-٢٠٠٦.
(١٤٧) لۆلان مستەفا : چاوپێکەوتن، ٢٦ت-١-٢٠٠٦.
(١٤٨) محمد: المصدر نفسه، ص٦٤.
(١٤٩) شاهین، ئیسماعیل تەها: نەخش و نیگارا بەرکا کۆچەری، (هەولێر-٢٠٠٥)، ل١٨.
(١٥٠) ئەسمەر موحەمەد: چاوپێکەوتن، دانشتووی گوندی شەمامک، ٣-٣-٢٠٠٨.
(١٥١) شوکریە شێخ موحەمەد شێر علي : چاوپێکەوتن، دانشتووی ناحیەی بەحرکە، ٢٩-٣-٢٠٠٨.
(١٥٢) هەمین ئیبراهیم مەولود: چاوپێکەوتن، دانیشتووی کۆمەڵگای پیرزین، ١٩-٢-٢٠٠٨.
(153) Eaglaton, Ibid ,p29,
(١٥٤) ئەم مافوورە لە مۆزەخانەی رستن و چنین لە قەڵای هەولێر وەرگیراوە دوای توێژینەوە لەلایەن توێژەرەوە.
(154) Hamlyn, aul Carpe e Orient, Czechslovakia, 1969.p 18
(١٥٦) لۆلان مستەفا: چاوپێکەوتن، ٢٦-١-٢٠٠٨.
(١٥٧) ئیزەدی، میهرادی : چەند باسێک لە بارەی کوردانەوە، وەرگێڕ ئەمین شوان، (سلێمانی -٢٠٠٧)، ل٥٥٥
(158) Egleton: Ibid: p23
(159) Egleton: Ibid: p28
(١٦٠) اسماعيل: زبير، تاريخ (اربيل - ١٩٨٦) ص١٧.
(161) Egleton: Ibid :p77
(١٦٢) ئەم مافوورە لە مۆزەخانەی رستن و چنین لە قەڵای هەولێر وەرگیراوە دوای توێژینەوە لە لایەن توێژەر.
(١٦٣) توێژینەوەی مەیدانی.
(164) Hamlyn: Ibid, p22
(165) Egleton:Ibid: p20
(١٦٦) ئەم مافوورە لە مۆزەخانەی رستن و چنین لە قەڵای هەولێر وەرگیراوە دوای توێژینەوە لە لایەن توێژەر.
(167) Hamlyn: Ibid, p20
(١٦٨) لۆلان مستەفا: چاوپێکەوتن، بەرێوەبەری مۆزەخانەی رستن و چنین لە هەولێر، ٢٦-١-٢٠٠٨.
(169)Hamlyn: Ibid, p76
(١٧٠) لۆلان مستەفا: چاوپێکەوتن، بەرێوەبەری مۆزەخانەی رستن و چنین هەولێر، ٢٦-١-٢٠٠٨.
(171) Hamlyn: Ibid, p77
(١٧٢) سمايل، عباس سليمان : مێژووی دەشتی هەولێر(هەولێر-٢٠٠٤)، ل١٨.
(١٧٣) ئەم مافوورە لە مۆزەخانەی رستن و چنین لە قەڵای هەولێر وەرگیراوە دوای توێژینەوە لە لایەن توێژەر.
(١٧٤) توێژەر.
(١٧٥) مستەفا: سەرچاوەی پێشوو، ل٦.
(176) Hamlyn: Ibid, p23
(١٧٧) ژیان، دزەیی: چاوپێکەوتن، پسپۆر لە جل و بەرگی میللی دا، ٢٨-١-٢٠٠٨.

**تێبینی:**
**ئەم بابەتە لە ژمارە(٣)ی ساڵی (٢٠٠٩)ی گۆڤاری سوبارتو وەرگیراوە.**

هەولێر

لە ئینسکلۆپیدیا جیهانیەکاندا

# هەولێر لە فەرهەنگی "دیهخودا" دا



ئەربێل "اربل" شارێکە لە نزیک موسڵ" و.م. رەحیمی سورخی" قەڵایەکی قایمەو شارێکی مەزنە لە دەشتێکی بەربنداو خەندەکێکی قووڵی بە دەوردەیەو دیوارێکی بەدەوردیەو شارەکە لەسەر تەپۆڵکێکی خۆڵینەی بڵند هەڵکەوتووەو بازاڕ و ماڵی خەڵک و مزگەوتی جامیعی تێدایەو لە قەڵای "حەلەب" دەچێ و لەنێوان دوو رووباری زاب دا هەڵکەوتوودو سەر بە موسڵەو مەودای نێوان ئەربێل و موسڵ دوو رۆژ رێیەو "یاقوت" دەڵێ: لەبارەی دیواری ئەو قەڵایەوە کە لەسەردەمی ئێمەدا شارێکی مەزن و دوورودرێژە، کە ئەمیر موزەفەر گۆگبری بن زەینەدین و "حسک علی"دەستی کردووە بە نۆژەنکردنەوەی ئەو قەڵایەو رۆنانی دیوارەکەی و دروستکردنی بازاڕەکان و قەیسەرییەکان و لەوێ نیشتەجێ بوو و لەبەرامبەر پاشاکاندا خۆڕاگری کرد و پلەوپایەکی بەدەست هێناو غەریبەکان لە دەوری کۆبوونەوەدو زۆربەیان لەوێ مانەوەدو بەم جۆرە شارەکە گەورەبووەو دەستگەیەک لە ئەهلی زانست و حەدیس بەوی ناسراون. وەک"ابو احمد القاسم بن مظفر الشهرزوری الشیبانی الاربلی "معجم البلدان".

دیمەشقی دەڵێ: ئەربل، قەڵایەکی مەزنەو پێشتر سەر بە وڵاتی سیواد بوودو پاشان خراوەتە سەر موسڵ و دواتر سەربەخۆ و لەسەر پێی خۆی بووە. دیواری بڵندی هەیەو کوردەکان تێیدا نیشتەجێن و لەنێوان دوو "زاب"دا هەڵکەوتوود.

- فەرهەنگی دیهخودا، لا ٧-١٦٣٦.

- لغت نامە دهخدا، تألیف: علی اکبر دهخدا، مؤسسە انتشارات، تهران، چاپی دووەم، دورە جدید ١٣٧٧

# هەولێر و شەڕی ئەربێلا لە ئینسکلۆپیدیای بەریتانیدا

و. لە ئینگلیزییەوە: سەلام ناوخۆش

ئەربێلا (هەولێری ئێستا)، شارێکی مێژوویی گرنگە، لە ناوەڕاستی ئەم شارەدا گردێکی گەورە هەیە. ئەو شارە شێوە گردە، لە رووی جوگرافییەوە دەکەوێتە قەد چیایەک، کە ئەویش دەکەوێتە باکووری رۆژهەڵاتی میسۆپۆتامیا.

شاری نەینەوا (موسڵ)، دەکەوێتە رۆژئاوای ئەو شارە. لە سەردەمە کۆنەکاندا ئەربێلا - ئەربائیلۆ - یەکێک لە شارەکانی دەوڵەتی ئاشووری پێکدەهێنا.

شارەکانی ئاشوور لەو دەڤەرەدا چەند شارێکی دی وەک: ئاشوور و نەینەوا و نەمرووود بوون، هەموو ئەو شارانە لە نزیک یەک بوون، هەروەها هەندێ ژێدەری مێژوویی ئاماژە بەوە دەکەن، کە ئەربێلا زێدی باوکی سۆمەرییە کۆنەکانیش بووە، بەجۆرێ یەکێ لەو بتانەی کە ئەوان بە خوداوەندیان دەزانی، کە ناوی (ییێن لیل) بووە، بۆتە هاوڕێ و خێزانی بتە خوداوەندی ئاشوورییان.

ئەربێلا وڵاتێکی بەپیت و بەرەکەت بووە، چونکە لە رووی جوگرافییەوە هەم کەوتۆتە لێواری چیاکان هەروەها کەوتۆتە نێوان دوو زێی بچووک و گەورە.

ئەو شارە بەوە ناسراوە، کە دانەوێڵەیەکی زۆری لێ شین دەبێ، بەتایبەتی گەنم و جۆ، لە زۆر کات ئەو بەروبومە بۆ دەڤەرەکانی تر بازرگانی پێکراوە.

هەروەها بەحوکمی ئەوەی ئەو شارە کەوتۆتە سەر رێگای کاروانی نێوان بەغدا و موسڵ لەلایەک هەروەها موسڵ و رواندز لەلایەکی تر، ئەمە وای کردووە کە ئەو ناوچەیە هەمیشە جموجوڵی بازرگانی لێ نەبڕێ.

ئەمە و نزیکی ناوچەکە لە شاخ و کێو و نزیک بە ئاو - بە تایبەتی هەردوو زێی گەورە و بچووک - خاسیەتێکی گرنگی مانەوەی بەو شارە کۆنە بەخشیوە.

بەواتای ژیۆپۆلیتیکی ناوچەکە لە کاتی خۆیدا فاکتەرێکی گرنگی بەو شارە بەخشیوە، بۆ ئەوەی هەم بتوانێ بەرگری لە خۆی بکات و هەم بەدرێژایی مێژوو هەر بە ئاوەدانی بمێنێتەوە.

دانیشتوانی ئەو شارە وا مەزەندە دەکرێ (سالی ١٧٦٨) ژمارەیان بیست و پێنج هەزار کەس بووبێ، کە

لە رەگەزدا زۆربەی هەرە زۆریان کوردن.

ئەو شارە مێژووییە لە رووی میللیش بەوە دەناسرێ، کە شوێنی شەڕێکی یەکلاکەرەوە بوو لە مێژوودا، (ئەویش شەڕی ئەربێلا یان گاوگامێلایە، کە لە ساڵی ٣٣١ی پێش زایین لەنێوان سوپای ئەسکەندەری مەزن و دارا (داریوس)ی سێیەم پاشای ئێرانییەکان بەرپابووە.

**شەڕی ئەربێلا**

**ئۆکتۆبەری ٣٣١ ساڵ پێش زایین**

١- پێش ئەوەی شەڕەکە هەڵبگیرسێ: پاش ئەوەی دارای پاشای ئێرانی لە "Issas" تووشی شکست بوو، جارێکی تر لە شاری بابل سوپاکەی کۆکردەوە و هەروەها لەگەڵ کۆمەڵە پیاوێکی عەشائیری ناوچەکە کۆبوونەوەیەکی ساز کرد، لەوێش لە قەراغی چەپی زێی دیجلە پەڕییەوە و بەرەو باکوور چوو.

لە شاری ئەربێلا، شوێنی تایبەتی بۆ خێزان و دەست و پێوەندەکان و شوێنێکیش بۆ کەلوپەلەکان دابین کرا، لە ئەربێلاش بەرەو گاوگامێلا جوولا.

ئەو شوێنە تەنها (٣٢) میلێک لەبەری رۆژئاوای ئەربێلاوە دوورە، ئەسکەندەریش پاش ئەوەی توانی دەست بەسەر (میسر) دابگرێ، لە رێگای (فەلەستین) - کە دەکەوێتە باکووری نەینەوا - لە دیجلە پەڕییەوە. وەک لە سەرچاوە مێژووییەکاندا دەردەکەوێ هەردوو سوپا بەنیازی شەڕ بوون لەگەڵ یەکتر، هەر بۆیە گاڤێک سوپای ئەسکەندەر لە دیجلە پەڕییەوە لە هەوڵی ئەوە دابوو لە دەرفەتێکدا بە تەواوی چۆک بە سوپای ئێرانی دابدا و تەواوی ناوچەکە بخاتە ژێر کۆنترۆڵی خۆی، بەڵام بەر لەوەی ئەسکەندەر یەکسەر هێرش بەرێتە سەر سوپای ئێران، دەستی کرد بەزانیاری کۆکردنەوە لە بارەی چەندایەتی و چۆنیەتیِ سوپای ئێران و جێیان لە ناوچەی هەولێر.

پاش ئەوەی ئەسکەندەر زانیاری پێویستی لە بارەی سوپاکەی ئێران کۆکردەوە بۆ ماوەی چوار رۆژ سوپاکەی خۆی پشوو پێدا، لەو ماوەیەش هەر خەریکی زێتر مکومترکردنی سوپاکەی بوو، بۆ ئەوەی لەناکاو گورزێکی کوشندە بسرەوێنێتە سوپای ئێران.

هەرچی داریوس (دارا) بوو، ئەوا سوپاکەی خۆی لە دەشتەکانی گاوگامێلا بڵاوە پێکردبوو، بەجۆرێ پەرش و بڵاوی سوپاکەی تەواوی ئەو دەشتانەی کردبووە گۆڕەپانێکی تەختی سەربازی، ئەسکەندەریش لە شەوی چوارەمدا سوپاکەی بەرەو پێشەوە پێشڕەوی پێکرد، بەڵام کە ٣.٥ میل و نیوێک مابوو بگاتە سوپای دارا، جارێکی تر سوپاکەی راگرت و لەگەڵ گەورە ژەنەراڵەکانی کۆبوونەوەیەکی ساز کرد، لە کۆبوونەوەکەدا ژەنەراڵ پارمێنیۆ پێشنیازی کرد، کە بۆ ئەوەی تەواو سەرکەوتن مسۆگەر بکەن پێویستە لەو شوێنە سەربازگەیێ دابمەزرێن، چونکە لەو رێگا نزیکەوە دەتوانرێ زیاتر سانسۆری بزووتنەکانی سوپای دوژمن (ئێران) بکرێ، ئەسکەندەر ئەو پێشنیازەی پەسەند کرد و سەربازگەکەی لەوێ دانا و بەشەویش هەندێ لە هێزی سوارە بەرەو دەوروبەری شوێنەکە - گاوگامێلا - چوو، بۆ ئەوەی لەو وڵاتە بکۆڵنەوە، کە خەریکن لە ئاییندەیەکی نزیکدا شەڕی تێدا بکەن، لەکاتی گەڕانەوەیدا ئەسکەندەر جارێکی تر لەگەڵ سەربازەکانی کۆبووەوە و جەختی لەسەر ئەوە کردەوە، کە دەبێ لەکاتی شەڕدا فەرمانە سەربازییەکان دەستبەجێ جێبەجێ بکرێن، ئەمجارەش لە کاتێکدا سەربازەکان خەریکی پشوودان بوون، پارمێنیۆ خۆی کرد بە ژوورەکەی ئەسکەندەر و داوای لێ کرد، کە هەر ئەمشەو دەست بە هێرش بکەن، بەڵام ئەسکەندەر رازی نەبوو، چونکە ئەو چاک دەیزانی کە هێرشی بەشەوێ چەند دژوارە بۆ سوپا، هەروەها بە حوکمی ئەوەی ئەسکەندەر بەنیاز بوو گورزێکی کوشندە لە سوپاکەی دارا بدا، شەڕەکەی شەڕێکی یەکلاکەرەوە بێ، جا لە بریتی هێرشی شەوێ ئەسکەندەر خەریکی زێتر رێکوپێکتر کردنی سوپاکەی بوو، ئەسکەندەر

سوپاکەی بەشێوەیەکی نیزامی دابەش کرد: قۆڵی راست، قۆڵی چەپ، قۆڵی ناوەراست و لە پشت هەر قۆڵێکیش هێزێکی یەدەکی بۆ کاتی دیاریکراو دانا، ئەو جۆرە ئۆرگانییەی سوپا دەورێکی زۆر ئیجابی دەبینێ لەسەر دەروونی سوپا، بەڵام ئەسکەندەر روو بەرووی هەمان ئاریشە بوودوە، کە گەزنەفۆن لە شەری (پیمبرا) تووشی ببوو، لەگەڵ ئەوەشدا ئەسکەندەر توانی سوود لە تاکتیکە جەنگییەکانی شەری (پیمبرا) ببینێ، یەکێ لە تاکتیکەکانی ئەوەبوو، لە پێشەوەی هێزی سوارەدا تیرهاوێژ و رمبازەکانی دانابوو، بۆ ئەوەی بەربەست لە بەرامبەر پەیتوونەکانی هێزی ئێران دروست بکەن.

هێزەکەی ئەسکەندەر لە حەوت هەزار سوار و چل هەزار پیادە پێکهاتبوو، هەرچی هێزی دارا بوو پێنج ئەوەندەی سوپای ئەسکەندەر بەهێز بوو.

**٢- شەری ئەربێلا:**

پاش ئەوەی ئەسکەندەری مەزن تەواوی سوپاکەی خۆی رێکوپێک کرد، لە پڕ دەستی بە هێرش کرد، بەڵام هێرشەکە وەک تاکتیکێک رووبەرووی هێزی ناوەراستی سوپای دارا نەبوو، بەڵکو بەرەو قۆڵی چەپی سوپای دارا بوو، ئەمەش دارای پاشای ئێرانی ناچار کرد هێزی قۆڵی راست بۆ پاڵپشتی قۆڵی چەپی سوپاکەی بجووڵێنێ، ئەو جووڵە عەسکەرییە بۆشاییەکی گەورەی لە هێڵی بەرگری سوپای ئێراندا دروست کرد، ئەو کردەوە سەربازییەی ئەسکەندەر تاکتیک بوو بۆ ئەوەی بتوانێ کەلێنێک لە نێوان بەرەی سوپای ئێراندا دروست بکات، لەو نێوەش دارا ترسی ئەوەی لێ نیشت کە هێزی پەیتوونی دەستەوئەژنۆ بێ و هیچ دەورێکی نەبێ، هەر بۆیە دارا بریاری بە هێزی سوارەی قۆڵی چەپدادا، کە لە پشت قۆڵی راستی سوپای ئەسکەندەر بسوورێنەوە، هەر چ نەبێ بۆ ئەوەی گوشار لە هێزەکەیان کەم بکەنەوە.

ئەسکەندەر هەروەک بلێی هەستی بەمە کردبێ، هەر بۆیە بۆ ئەوەی بەرەنگاری ئەو هێزەی ئێرانیش ببێتەوە، ئەوا بەهێزێکی سوارە روو بەرووی سوپای ئێران بوودوە: لەو نێوە شەرێکی گەورە لە نێوان هەردوو سوپادا بەرپا بوو، هەروەها دارا فەرمانی بە هێزی پەیتوونەکانیشی کرد، کە هێرش بەرن، بەڵام هیچ کامیان نەگەرانەوە، چونکە کەوتنە بۆسەی هێزی پیادەی ئەسکەندەر، بەم جۆرە سوپای قۆڵی چەپی دارا بەتەواوی شپرزە بوون، لەو دەمەشدا کە ئەسکەندەر بینی وا کەلێنێکی گەورە لە نێوان سوپاکەی ئێراندا دروست بووە، هەر بۆیە هێرشی کردە ئەو شوێنە و هاوکات لەگەڵ ئەو هێرشەدا هێزی تیرهاوێژ و سوارەی قۆڵی چەپی سوپای ئەسکەندەر پاڵپشتی هێرشەکەی قۆڵی ناوەراستی سوپاکەیان کرد، لە بەرامبەر ئەو هێرشانەدا سوپای ئێران دەتۆقن، لە هەمان کاتدا هێزی سوارەی ئێرانییەکان - کە لە قۆڵی راستی ئەسکەندەر جێگیر ببوون - بینییان وا لە پشتەوە هەرەشەیان لێدەکرێ، هەر بۆیە بەر لە شەر لەو قۆڵەدا بە چۆکدا هاتن و هەڵاتن، سوپای ئەسکەندەریش بەدوایان کەوت و ئەوی بەردەستیان کەوت سەریان برین، هەروەها ئەو بۆشاییەی لە نێوان قۆڵی چەپ و سوپای ئێراندا دروست بوو، دەرفەتی بۆ هەندێ سوپای ئێران و هیندی رێکخست، کە بەرەو دواوە پاشرەوی بکەن، لە کاتێکدا، کە سوپای ئەسکەندەر هەر لە پێشرەوی دابوون، هێزی سوارەی قۆڵی دەستە راستی دارا لە پشتەوە هێرشیان کردە سەر قۆڵی چەپی سوپای ئەسکەندەر، پارمێنیۆ سەرکردایەتی ئەو قۆڵەی سوپای ئەسکەندەری دەکرد، لەو قۆڵەدا سوپای دارا توانی تەواو گەمارۆی هێزەکەی پارمێنیۆ بدات. هەر بۆیە پارمێنیۆ ناچار بوو بەپەلە نامەیەک بۆ ئەسکەندەر بنێرێ و رەوشی خراپی قۆڵەکەی خۆی بۆ بەیان بکات، لەکاتێکدا کە ئەسکەندەر ئەو نامەیەی بەدەست گەیشت هەر خەریکی راوەدوونانی پاشماوەی سوپای ئێران بوو، هەروەها

دەستبەجێش بە هانای پارمێنیۆ هات، بەوەی بەهێزی سوارە هێرشی کردە سەر سوپای قۆڵی راستی ئێران، کە گەمارۆی هێزەکەی پارمێنیۆیان دابوو، لە پاش ئەو هێرشەدا ئەوەندە سوپایەی ئێرانیش کەوتە نێوان دوو بەشی سوپای ئەسکەندەری، هەر بۆیە ئێرانییەکان زۆر بەدڵڕەقانە شەڕیان دەکرد تا دەکوژران یان ئەوەی بەرامبەر خۆیان دەکوشت، بەڵام لە ئاکامدا ئەسکەندەر توانی هەردەس بە سوپاکەی دارا بێنێ و لەو شەڕەدا هەروەک ئاریانی مێژوونووس دەنووسێ (لەو شەڕەدا ئێرانییەکان سێ سەد هەزار کەسیان لێ کوژرا، کەچی لە سوپاکەی ئەسکەندەر تەنها سەد کەس و هەزار ئەسپ). ئەو ژمارەیە جێگای گومانە!

لە پاش ئەو شەڕە پشت شکێنەدا، ئەسکەندەر رووبەرووی تەنیا چەند بەرەنگارییەکی کەم بووەوە تا لە ئاکام ئەسکەندەر توانی فەرمانڕەوایی ئیمپراتۆریەتی ئێرانیش بکات.

### ٣- شەڕی ئەربێلا:

شەڕی تاکتیک بوو، مێژوونووسان دەڵێن، شەڕی ئەربێلا شەڕی تاکتیک بوو، نەک شەڕی بردنەوە، سوپای ئێران لە رووی ژمارە و کەلوپەلی عەسکەرییەوە زۆر لە سوپای ئەسکەندەر بەهێزتر بوو، بەڵام بە حوکمی ئەوەی ئەسکەندەر سەرکردەیەکی سەربازی وشیار بوو، بەر لەوەی شەڕێکی رەمەکی و عەشوائی لە دژی سوپای زەبەلاحی ئێراندا بکات، چەند تاکتیکێکی عەسکەری بەکارهێنا، بۆ ئەوەی بتوانێ سەرکەوتن مسۆگەر بکات، **یەکێک** لە تاکتیکەکانی ئەسکەندەر ئەوەبوو گرنگی زۆری بە رێکخستنی سوپاکەی دەدا، ئەو دیاردەیەش رەوشتێکی دەروونی چاکی لای سەربازەکانی ئەسکەندەر خوڵقاندبوو.

**دووەم:** راوێژ، ئەسکەندەر زۆر راوێژی بە گەورە ژەنەراڵەکان دەکرد، بۆ ئەوەی هەر سەرکردەیە و هەست بە بوونی خۆی بکات.

**سێیەم:** لە رووی عەسکەرییەوە بەر لە هێرشکردن ماوەی چوار رۆژ سوپاکەی پشوودا، بۆ ئەوەی لە رووی دەروونییەوە ئەو رێگا دوورەی، کە بڕیویانە کاریگەریی سەلبی لەسەر پێشڕەویدا نەبێ.

**چوارەم:** گرنگیدان بە هێزی هەواڵگری لە سوپادا، مەسەلەی ئیستخبارات لە سوپادا فاکتەرێکی گرنگی مسۆگەر کردنی بردنەوەی شەڕی ئەربێلا بوو، ئەو هێزە توانی زانیاری پێویست لە بارەی چەندایەتی و چۆنیەتی سوپای ئێران کۆبکاتەوە، ئەو زانیارییانەش زۆر کاری عەسکەری دژواری بۆ سوپای ئەسکەندەر ئاسانا کرد.

**پێنجەم:** دابەشکردنی سوپا بۆ چەند قۆڵێک، هێرشکردن لەو قۆڵانەی، کە سەرکەوتن مسۆگەر دەکات هەروەها پشێوی دەخاتە ناو سوپای بەرامبەر، لەمەدا ئەسکەندەر زۆر زیرەکانە توانی پشێوی بخاتە نێو سوپای ئێران، بەتایبەتی پاش ئەوەی ئەسکەندەر وای کرد، کە هەردوو قۆڵی چەپ و راستی سوپای ئێران بۆشاییەکی گەورە دروست بکەن، ئەسکەندەر توانی ئەو بۆشاییە بقۆزێتەوە، بۆ ئەوەی زەبرێکی کوشندە و یەکلاکەرەوە لە سوپای ئێران بدات.

ئەو هەموو راستییانە وایان لە مێژوونووسان کردووە، کە شەڕی ئەربێلا بەیەک لە نموونە هەرە گەورەکانی شەڕی تاکتیکی لە مێژووی دێریندا دابنێن....

**سەرنج:** ئەو زانیارییانە بە زۆری لە ئینسکلۆپیدیای بەریتانی و ئەمریکی دەرهێنراون، وەک:

1- The Word1book Encyclopedia, Letter A P. 726.

2- Merit Students Encyclopedia, Vol.2, pp83 - 4

3- Encyclo3edia, International, letters D - E p.506.

4- Encyclopedia Britannic Vol. 2. P217.

5- Encyclopedia Britannica Vol. 10. PP71 - 3.

* ئەم بابەتە لە گۆڤاری هەولێر، ژمارە (٣) هاوینی (١٩٩٩) بڵاوبۆتەوە.



# ئەربیل
# لە ئینسیکلۆپیدیای ئیسلامدا

**نووسینی: م. سترێک**
**وەرگێڕانی لە فرانسییەوە: دکتۆر نەجاتی عەبدوڵڵا**

**پێشەکی**

"ئینسیکلۆپیدیای ئیسلام" یەکێکە لەو سەرچاوە ڕەسەنانەی کە، بۆ لێکۆڵینەوە و نووسینەوەی مێژووی جیهانی ئیسلام کارێکی زانستی کەم وێنەیە. ئەم سەرچاوە زانستییە کە لەوەتای ساڵی ١٩٢٤-ەوە نووسراودتەوە، ساڵ بە ساڵ پاکنووس و ڕاستکردنەوەی زیادەی بۆ دەکرێ، بووەتە یەکێک لەو سەرچاوە ڕەسەنانەی کە جێگەی پشت پێبەستنە. بەشی کورد لەم ئینسیکلۆپیدیایەدا زۆر بەرچاوە و کۆمەڵێک مەتریاڵ و کەرەسەی زۆر پڕ بایەخ لە ناو ئەم ئینسیکلۆپیدیایەدا لە باردی هۆز، شار، شارۆچکە، ئایین، ئایینزا کوردییەکان دەبینرێن کە هەق وایە تا ئەو کاتەی هەموو ئینسیکلۆپیدیایەکە بەسەر یەکەوە دەکرێتە کوردی هەر هیچ نەبێ ئەوەی تایبەتە بە کورد و کوردستان بکرێنە کوردی. حەزدەکەم سەرنجی خوێنەر بۆ ئەوە ڕابکێشم بۆ ئەوەی کەس لە دژی وشەی "ئەربیل" تووشی حەساسیەت نەبێ، ڕاستییەکەی ئەمە ناوی مێژوویی شارەکەیە لە بەردەبیانی مێژووە و- سترێک- بابەتەکەی خۆی هەر بە ناوی "ئەربیل" نووسیووە بۆیە هیچ ڕێگەمان بە خۆمان نەدا ئەم ناوە مێژووییە دەستکاری بکەین و بیگۆڕین بۆ هەولێر، (وەرگێر).

**ئەربیل**

ئەربیل: ناوی شارێکە لە ویلایەتی موسڵ، لە نزیکی )٨٠کم (لە ڕۆژهەڵاتی-باشووری مووسڵ لە ١٢ فەرسەخی باکووری ئالتوون کۆپری (v. I, 326 a) لەسەر هێڵی پانی؟ ١١ ٣٦ لە باکوور و هێڵی

درێژی ٢ ٢ ٤ لە ڕۆژهەڵاتەوە (Greenw) هەڵکەوتووە. ئەربیل (بە قسەی باوی خەڵکیی ئێربیل) بریتییە لە ئەربائیلۆErbil ی نووسراوە بابیلیArba-ilu ئاشوورییەکان کە بە نووسینی بزماری نووسراون، هەروەها هەمان ئەربیرا ی نووسینە هەڵکەنراوەArbira فارسییە کۆنەکانی بزمارییە. ئەم شارە کە لە بەڵگەنامە ئاشوورییەکاندا لە سەدەی نۆیەمی پێش زایینەوە ناوی هاتووە، هیچ ڕۆڵێکی سیاسیی تایبەتیی لە دەورانی کۆندا نەبینیوە. گرنگی سەرەکی زێتر دەگەڕێتەوە بۆ دەورانی پێش ئەخمینیەکان pr´e کە پەرستگەیەکیachménidé- بەناوبانگی خوا ژنە عەشتاری لێبووە. ئەربیلۆ Arbailu دولفی* Delphe،ی ئاشووری کۆن بووە بەڵام ئەم شارە گرنگی گەورەی لەوەدا بووە کە خاڵی بەیەکگەیشتنی ڕێگەی کاروانسەرایەکان بووە. ئەوە هەر بەتەواوی لەبەر ئەو ڕەوشە باشەی بووە کە دەبێ ئەربیلۆ وەکو ناوەندی سەرە ڕێگەی هاتوچۆ، تاقە شار بێ کە بوون و ناوەکەی بەدرێژایی سەدەکان بە تەواوی لەناو هەموو شارە بەناوبانگەکانی ئاشووریدا، تا ڕۆژی ئەمرۆ پارێزراو بێ.

ئەربیل بە نزیکەیی وەکو یەک لە هەردوو ڕووباری زابەوە دوورە، لە هەموو دەورانێکدا ناوی ئەو وڵاتە بووە کە لە باکوورەوە بۆ باشوور بەم دوو ڕووبارە سنووردار بووە. لە دەورانی کۆندا ئەم وڵاتە یا ئەوەتا بە ناوی پایتەختەکەی ئەربیلیتس Arbelitis، یا ئەوەتا بەگوێرەی دوو زابەکەوە، ناوی ئەدیابێن Adiabéne (حەدیەب Hédayab لای خەڵکی شام) ی لێنراوە. ڕاستییەکەی، ئەوە هەمان ئەو "وڵاتی (ارج) ئەربیل" ەی جوگرافیناسە عەرەبەکان دەگرێتەوە. وەک چۆن ئەربیلا، لەوەتای ڕووخانی نەینەوا، کە بە واتای وشەکە تاقە شاری بەرچاوی ئاشوورییەکان بووە کە دواتر (ئەمە لە وەتای دەورانی دیادۆکەکاندا**) بە واتەی جوگرافیی ناوی ئەربیلیتس بووە لە ئاشوور خۆیدا. ئادیەبێن Adiabéne دواتر ئەویش بەم واتا بەرفراوانەی بڵاو بوو بۆوە. لە نیوەی دووەمی سەدەی دووەمی پێش زاییندا، شانشینێکی چکۆڵە لەم شارەدا هەبووە کە لە ماوەی دەورانی پارتەکان Parthes، هەموو کات سەربەخۆیی خۆی پاراستووە. لەژێر دەسەڵاتی ساسانییەکاندا، ئەربیل بووەتە نشینگەی ئەو حاکمانەی کە تەواو سەربەستی گەورەی خۆیان پاراستبوو. یەکێک لەوانە ناوی " قەرەداغ" Karadagh بووە کە، لە کۆشکی مەلقی Melki (دەبێ مەبەست - ملکیە- مرکیە- کە ئێستا بە ناوچەی باشووری ڕۆژئاوای هەولێر دەگوترێ) ی.هـ) نزیک ئەربیل دا جێنشین بووە و لە دەورانی شاپووری دووەم لە ساڵی ٣٥٨ لە سۆنگەی بە مەسیحی بوونی شەهید کراوە.

لە دەورانی موسڵمانێتیدا ئەربیل تەنها لە دوا دواییەکەی دەوڵەتی عەباسیدا گرنگی هەبووە. تەبەری Tabari لە مێژووە گەورەکەی خۆیدا تاقە جارێکیش باسی ئەربیل ناکات. لە ناو جوگرافیناسە عەرەبە کۆنەکانیش، تەنها "ابن خردادبە" (سەدەی نۆیەم) و" قدامە"(سەدەی دەیەم) لەبارەی دابەشبوونی عێراقی عەرەبی، باسی ئەربیل دەکەن بەو پێیەی کە مەڵبەندی قەزای تاسوجی (tassudj) هەرێمی حەلوان Hulwán بووە بروانە[Bibl. geogr. arab., éd. de Goeje, VI, 6, 3, 235, 2] دواتر ئەربیل بووەتە بەشێک لە جەزیرە و بە ڕووێکی تایبەتیش بەشێک لە هەرێمی مووسڵ. ساڵی (٥٦٣ ک/١١٦٧ز)، زەینەدین کوڕی عەلی کوچک کوڕی بێکتکین دەوڵەتێکی چکۆڵەی دروست کرد و پایتەختەکەشی ئەربیل بوو. بەناوبانگترین حاکمی ئەم بنەماڵە کوردییە بێکتکینەکان،[v. l'article I, 706 b] موزەفەرەدین گوگبری، زاوای سەلاحەدین بوو. لە ژێر دەسەڵاتی ئەم میردا بوو کە ئەربیل لە هەموو سەدەکانی ناوەڕاستدا گەورەترین ئاوەدانی بەخۆوە بینی. گوگبری ئەو دەوڵەتەی کە ساڵی (٥٨٦ک/ ١١٩٠ز) لە براکەیەوە بۆ مایەوە بەرفراوان کرد و کەوتە هەوڵی ئەوەی میرنشینە چکۆڵەکانی دەوروبەریشی هێنایە ژێر دەسەڵاتی خۆیی و وڵاتی شارەزووریشی بەگەڵدا (بە کەرکووکیشەوە). ئاپۆرەیەکی زۆری بێگانە ئەوکاتە لە ئەربیل جێگیر بوون و بوو بە شارێکی گرنگ. لە ساڵدا چەند جاران گوگبری ئاهەنگێکی شکۆمەندی سازدەکرد کە لە هەموو لایەکەوە گەشتیارانی بۆ ڕادەکێشا، ئەوە بە تایبەت لە جەژنی ساڵانەی لە

دایکبوونی محەمەد ]د.خ[دا بوو کە ئاهەنگێکی پڕشکۆی بۆ دەگێڕدرا و هاوکات بازاڕێکی گرنگیشی لەگەڵدا بوو (بڕوانە ابن خلکان، Ibn Khallikán, éd. W stenfeld, VI, 66)

.. بەشی خوارووی شار کە کەوتبووە بناری ئەو چیایەی کە قەڵاکەی لەسەر بوو، دەبێ بنچینەکەی بگەڕێتەوە بۆ دەورانی ئەم میرە. گوگبری قوتابخانەیەکیشی دامەزراند کە بە ناوی ئەو ناونرا مەدرەسەی موزەفەرییە، کە باوکی مێژوونووسی بەناوبانگی عەرەب ابن خلکان کە لە ساڵی (٦٠٨ک/١٢١١ز) لە ئەربیل لە دایکبووە، تێیدا خوێندوویەتی. گوگبری لە ئەربیل تەکیەیەکیشی بۆ سۆفییەکان دروست کرد. ribat

وەختایەک لە ساڵی (٦٣٠ک /١١٣٢ز) گوگبری بە بێ ئەوەی هیچ منداڵێکی لەشوێن بەجێ بمێنێ، کۆچی دوایی کرد. ئیمپراتۆریاکەی بۆ خەلیفە موستەنسەر جێهێشت کە دەوڵەتەکەی زۆر لەبەریەک هەڵوەشاو بوو، ڕووبەرەکەی فراوان بۆوە. ڕاستییەکەی خەلیفە سەرەتا پەلاماری بردە بەر زەبری شمشێر بۆ دەست بەسەرداگرتنی ئەم میراتە، چونکە خەڵکی ئەربیل ڕەتیانکردەوە. دان بە سولتانی دەوڵەتی عەبباسیدا بنێن. ئیقبال ئەلشەرابی، سەرکردەی موستەنسەر توانی ئەم شارە شۆڕشگێڕە دوای گەمارۆدان داگیر بکات (بۆ ئەم باسە بڕوانە: ابن الطقطقی، الفخری، چاپی (Ahlwardt p. 37, 383, 12; Barhebraeus, Chron. Syriac. (éd. Bedjan), p. 466 suiv., et Weil, Gesch. der Chalifen, III, 468

، کەمێک دواتر مەغۆڵەکان لەدەرگەی ئەم شارەیان دا و هەر لە ساڵی ٦٢٨ (١٢٣٠ ی ز) لە سۆنگەی داگیرکارییەکانیان گەیشتنە قەراغی شار (بڕوانە ابن الاثیر، چاپی (Tornberg, XII, 328) لە ساڵی ٦٣٣ (١٢٣٥) لە کۆڵانەکانی شاردا دەستیان کرد بە ڕاووڕووت Barhebraeus, Ta'írkh mukhtasar, éd. Bairút p. 436, 9)

.. ساڵی دواتر (٦٣٤) ١٢٣٦ سەرلەنوێ وەدیارکەوتنەوە و بەشی خوارووی شاریان سووتاند و قەڵاکە جوامێرانە بەرگری کرد. شار گەمارۆ درا و دوای تێپەڕبوونی ٤٥ ڕۆژ لە بەرامبەر بڕە پارەیەکی زۆر کشانەوە (cf. Barhebraeus, Ta'írkh mukhtasar, p. 437, 12 suiv. et Wstenfled dans les Abh. Der Göttinger Ges. der Wissensch., XXVIII (1881), p.120 ; puis D'Ohsson, Histoire des Mongols, III, 69, 71, 73).

وەختایەک ساڵی (٦٥٦ ی کۆچی) ١٢٥٨ی.ز، هۆلاکۆ Húlág بەغدای داگیر کرد هەر هەمان کات یەکێک لە سەرکردەکانی خۆی بۆ داگیرکردنی ئەربیل هەنارد. بۆ ماوەی ساڵێک زیاتر کوردەکان بەرگرییەکی جوامێرانەیان لە قەڵاکە کرد. مەغۆلەکان نەیانتوانی دەست بەسەر قەڵاکەدا بگرن تەنها بە یاریدەی بەدرەددین لولوی حاکمی موسڵ توانییان دەست بەسەر ئەو شوێنە دا بگرن، بڕوانە:> (Rashíd al-Dín, Hist. des Mongols de la Perse (éd. Quatrémre), I (1836), p. 314 suiv.; Barhebrareus, Chronicon syriac., p. 506, 3 suiv.; Barhebraeus, Ta'ríkh mukhtasar, p. 472, et Weil, Gesch. der Chalifen, IV, 9; D'Ohsson, op. cit., III, 256-7)

.. ئەربیل دوای ئەوە تاڵاوی زۆری قێزەونی جەنگ و پەلامار و چەپاوڵی هۆزە کورد و عەرەبەکانی هاوسێی چەشت. دوایین دەورانی زەبر و زەنگ و گێژاو کە شارەکە پێیدا تێپەڕ بووبێ لە ماوەی لەشکرکێشییەکانی نادر شا بوو بۆ سەر تورکیا لە ساڵی ١٧٤٣کە دوای گەمارۆییەکی ٦٠ ڕۆژە، (شا)ی ئێران توانی سەرکەوتووانە بچێتە ناو شارەکەوە.

تا نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەهەم ئەربیل هەر سەر بە پاشالیکی گەورەی بەغدا بووە و وەک خاڵێکی سەربازی هەرە گرنگی ئەم ناوچەیە، ئۆردوویێکی ئینکیشاری بەهێزی لێ بووە. دواتر لەکاتی جیاکردنەوەی ویلایەتی موسڵ لە ویلایەتی بەغدا، ئەربیل خرایە سەر ویلایەتی مووسڵ.

بە مەسیحی کردنی وڵاتی ئەدیابین و ناوچە هاوسێیەکانی بەشێوەیەکی تایبەتی لە ئەربیلەوە دەستی پێکرد. لە دەورانی زۆر کۆندا ئەسقەفێک لە کورسییەکی ئەم شارەدا نیشتەجێ بووە. ئەم ئەسقەفە سەرەتا تەنها هەرێمە ئاپۆرەدراوەکانی نێوان هەردوو زابی

گرتۆتەوە و پاشان خەڵکی شام ناوی ئەسقەفیەی (حەدیەب) یان لێناوە، یا بەگوێرەی هەردوو ئەسقەفییە رەسمییەکە، ئەسقەفییەی ئەربیل یا حەززە Hazza (گوندێکی نزیک ئەربیلە) یان لێناوە. لە سەرەتای سەدەی پێنجەیەم، ئەربیل دەبێتە ئارشەڤێک و رەوەندی هەموو وڵاتی ئاشووری بە مانای وردی وشەکە رووی تێدەکەن. چەند ماوە دواتر ئارشەڤێکی نەینەوا (موسڵ) جیابۆوە بۆ ئەوەی ئەسقەفییێکی سەربەخۆ پێکبهێنێ. لەبارەی گرنگی ئەربیل لە مێژووی ئایینی سوریای پێش ئیسلام Syrie préislamique بروانە ئەو کرۆنیکەی -کە بێگومان لە لایەن ئەسقەفێکی ئەسقەفیەی ئەربیل نووسراوەتەوە- کە A. Mingana لە Sources syriaques, I) Leipzig, 1908( بڵاوی کردۆتەوە و ساخاو Sachau لە Akad. d. Abh. der Berl. Wissensch., 1915, n60 لێی کۆڵیوەتەوە. ئەم کرۆنیکە پێش هەموو شتێک مێژووی ئەسقەفیە و شەهیدانی ئەم ئەسقەفیە لە دەورانی نێوان ساڵەکانی ١٠٠ تاوەکو ٥٤٠ ی ز (٥٥١؟) ی زاینی باس دەکات. دوای J..Chr لەبۆ دواتر هەروەها بگەرێوە بۆ Labourt, le christianisme dans l'empire Perse (1904) بۆ چەند بابەتی هەمەچەشنە بروانە پێرست، لا: ٣٥٦).

ساڵی ١٢٦٨، کاتۆلیکی نەستووری بارەگاکەی خۆی لە بەغداوە گواستەوە بۆ ئەربیل. بەڵام لەوەتای ساڵی ١٢٧١، دەیگوازێتەوە بۆ شنۆ لە ئازەربایجان چونکە مەسیحییەکان لە سۆنگەی کردەوەی پیاوکوژەکان دەبوونە چاوگەی گومانی موسڵمانەکان و یەخەگیری زۆر سووکایەتی پێکردن دەبوونەوە.(cf. Barhebrareus, Chronic.ecclesiast. (éd.Abbeloos et Lamy), II, 439; du méme, Chron.syriac., p. 525, 10 suiv., 526, 21 suiv.; D'Ohsson, op. cit., III, 469-470).

لەژێر دەسەڵاتی جێگرەوەکانی هۆلاکۆ و بە تایبەتیش لەژێر دەسەڵاتی غازان Ghazan و ئۆلجاتوUldjaitu، رەوشی مەسیحییەکانی ئەربیل بە تەواوی خراپ بووە. کورد و عەرەب زۆربەی جار بەسەریاندا داون، تاڵانیان کردوون و کوشتوویانن، بەتایبەت ئەوەی لە ساڵەکانی ١٢٥٨ و ١٢٧٤ روویاندا. بروانە: (Barhebraeus, Chronic, syriac, 528-9, 557) و دواتر. لە ساڵی ١٢٩٥ بەو شێوەیەی کە لە یەکێک لە نەخشە ئاسوورییەکانی سەدەی پانزەهەمدا هاتووە کە ئێستەش لە دێرەی مار بەهنام هەر ماوە ئەوەمان بۆمان دەگێرێتەوە کە، ئیلخان بایدۆ Báidún Ilikhán ناوچەی ئەربیل تاڵان دەکات (بروانە H. Pognon, Inscript .sémit. (Paris, 1907) n .76, p. 135). لە ساڵی ١٢٩٦. بەگوێرەی بریارنامەیەکی سولتانی تەواوی کڵێسە مەسیحییەکانی شارەکە تێکدران (Barhebrareus, op., cit., p. 596, 18 suiv., et Hist. de Mar Jabalaha, éd. Bedjan, 1895, p. 113).

.. لە ساڵی ١٢٩٧، کوردەکان بۆ ماوەی چەندین مانگ مەسیحییە ئاوارەکانی بەشی سەرووی شاریان گەمارۆ دابوو. (Hist. de Mar Jabalaha p. 121-131.. ) لە... ساڵی ١٣١٠، لەژێر حوکمرانی ئۆلد جیتۆ، دوای ئەوەی ماوەی زیاتر لە سێ مانگ جوامێرانە بەرگرییان لە قەڵا کرد دژ بە عەرەب، کورد و مەغۆل کە گەمارۆیان دابوون، مەسیحییەکان تێکشکان و سەرلەبەریان تارومار کران. ئێمە گێرانەوەیەکی تەواوی ئەم رۆژانەمان لەبەر دەستە کە بە رەشترین ئەو رۆژانە دادەنرێ کە ئەربیل پێیدا تێپەریوە، گێرانەوەی بیۆگرافی کاتۆلیکیۆسی ئەم سەردەمە جابالاهای سێیەم jabalaha III بروانە Hist. de M. Jabalaha, p. 154-201) لەو دەمانەوە ئیدی ئەربیل چیتر شارێکی مەسیحییان نییە. هەروەها هەر لەو دەورانەیە کە شارەکە دادەرمێ. چەند هەڵکۆڵینی ئاشووری لەسەر دیوارەکانی بینایەک کە ئێستە بۆ ئۆردوو (قشڵە) بەکاردێت، هێشتا رۆژانی خەڵکی مەسیحیانی کۆنمان دەهێنێتەوە یاد، بروانە (Cuinet, op.cit, p.857). لە ئەربیل ئەمرۆ بەشێوەیەکی بەردەوام هیچ بنەماڵەیەکی مەسیحی لێ نییە. بەڵام بە پێچەوانەوە دەبینین (برێک لەو نەستوورییە یەکگرتووانەی کە پێیان دەڵێن کلدانی) لە ئاوایی عەینکاوە

دەژین (هەروەهاAinkawo بەشێوەی Ankowa, Ankawa, دش دەنووسرێ کە،Ainkeba بێگومان ئەو Ainkeba یە کە لە Hist. de Mar Jabalaha
،. دا ناوی هاتووە وp.192 ئەمکاباز-یە کە Amkábádh de Barhebraeus, Chronic Syriac. p557,11) ، باسی کردووە کە، ناوچەیەکی بچووکی ئەربیلە و خەڵکەکەی هەموویان هەر مەسیحین.

کورد بەتەک مەسیحییەکان، لە رووی ژمارەی دانیشتوانەوە لەسەدەکانی ناوەڕاست زۆرترین دانیشتوانی ئەم شارە بوون و لە سەدەی یانزدەهەمی زایینییەوە کوردەکانی هەزبانی Hadhabáni و حەکەمییە Hakamiya بە ڕوویێکی تایبەتی لە ئەربیل و دەوروبەری دا دەژین،(Ritter, Erdkunde, XI, 620 ; Quatremére dans Notices et extraits des manuscrits, t. XIII, 301, note I, 309-313 (extrait de l'ouvrage géographico-historique déal-Umarí, mort en 749=1348) ; G Hoffmann, Syrische Akte persisch. Mrtyrer (1881), p. 236, 272)..

.. زۆربەی جار سەرۆکەکانی ئەم دوو هۆزە کوردە کە لە هەرێمی ئەربیل دا ژمارەیەکی بەرفراوان قەڵا و قوولکەیان هەبووە، لەسەر سەرۆکایەتیکردنی ئەم شارە شەڕیان کردووە. هەر یەک لە "ابن خلدون" و "بدرالدين العين"ی باسی ئەم شەڕ و ئاژاوە ناوچەییانە دەگێڕنەوە کە لە دەوروبەری نێوەڕاستی سەدەی دیەمدا ڕوویانداوە.

(Tiesenhausen, dans les Mémoires présentés á l'Acad Impér. des Sciences de St. Pétersbourg, VIII (1859), p. 141, 160-1)

هەرچی دانیشتوانی هەولێرە وەک کیونێ Cuinet(١٨٩٢ز) دەڵێ ٣٢٦٠٠ کەس بووە، لەوانە ٤٩٧ یان غەیرە ئیسلام (جوولەکە) بوون. بەگوێرەی کیونێ ژمارەی ماڵەکانی شارەکە دەگاتە ١٨٢٢ ماڵ ( بێلك belck لۆهمان Lehmannو ساڵی ١٨٩٩ ئەو خانوانەی کە لە بەشی سەرووی شارەکەیە بە ٨٠٠ ماڵ دادەنێن) وێڕای سەرای والی تورک و دوو مزگەوت و دە تەکیە و شانزە قوتابخانە. بەگوێرەی دوایین دابەشکردنی ئیداری کە تورکەکان کردوویانە ئەربیل کراوەتە قەزایەک لە سنجاقی شارەزوور و دابەشی سەر دوو ناحیە کراوە کە ٣٣٠ ئاوایی بەخۆوە گرتووە کە ١٢٠٠٠ کەسی تێدا نیشتەجێ بووە.

شاری ئەربیل لە دوو بەش پێک دێت کە بریتین لە بەشی خواروو و بەشی سەروو کە دەوراندەوری قەڵایەکەی داوە، بەشی خوارەوەی (کە کیونێ ناوی ناوە "کوترەک"Kotrak) دەگەڕێتەوە سەردەمی گوگبری پاڵی بە تەنیشتی ڕۆژئاوا و باشووری ئەو گردەوە ناوە کە قەڵاکەی لەسەر دروستکراوە. بەشی خوارووی هەژارە و سەرنجی گەڕیدەکان ڕاناکێشێ و ئێستە زۆربەی تێک و پێک چووە. ئەم بەشە پێش ئەوە لەوە بەرفراوانتر بووە و ئەوە لەو خەندەقە بەدیار دەکەوێ کە پێشتر دەوراندەوری دابوو و ئێستە زۆر لەو ژمارە پەرت و بڵاوانەی ئەو ماڵانە دوورترە. ئەم بەشە ناوەندی بزووتنەی بازرگانییە و بازاڕ و هۆتێلی لێیە، بەشێوەیەکی تایبەتی لە ئەپارتومانەکانی ئەم شارە باسی کەلاوەی مزگەوتێک دەکەن کە منارەیەکی نایابی هەیە و بەرزییەکەی ٦٣ مەترە و چێوەکەی ١٥ مەترە (وەسفی ئەم منارەیە لای ریچ، بەرگی ٢، ١٥٨ و دواتر کراوە) نووسراوە هەڵکەندراوەکانی سەر مزگەوتەکە ئەوە بەدیار دەخەن کە میری گوگبری دروستی کردووە. لەوانەیە ئەم مزگەوتە هەمان ئەو مزگەوتی (الكف)ە بێت کە قەزوینی (لە کتێبەکەی پێشووی) باسی کردووە وگووتوویە بەردێکی لێیە کە شێوەی پەنجە دەستی مرۆیە، ئاشکرایە کەوا ئیشارە بۆ پەرستگایەک دەکات کە شوێن پەنجەی دەستی (کف، پەنجە) هەبێ و نموونەی ئەم مزگەوتانە لە عێراق و وڵاتی جەزیرە و ئێراندا هەیە (بۆ نموونەکان بڕوانەBerchem لە Herzfeld-Sarre, Archaeolog. Reise im Euphrat-und Tigrisgabiet, I, 24)

هەرچی بەشی سەرووی شارەکەیە بە قەڵاکەشەوە کەوتۆتە سەر قوچەکێکی شێوە بازنەیی کە بەرزییەکەی لە ٢٠ مەتر بەرزتر نییە و تەنیشتەکانیشی زۆر لێژن، بەرزاییەکەی دەستکردە و لەناودەویدا

دالآنی ژێر زەمینی زلی قوچەک و ژووری لێیە، قەلایەکی مەحکەمی لێیە کە شوورەیەکی بەدەوردەویە و بەرزییەکەی ١٥ مەترە. ئێستە برێکی تێکچووە و قولکە و شوورەکانی درزی تێ بووە. ئەم گردە زلە و قەلا سەیر و سەمەرەیە سەرنجی گەڕیدەکانی ڕاکێشاوە. مرۆ چەند سەعات لە دوورەوەڕا دەیبینێ. ئەم قەلایە، قەلای "حیمس" و "حەلەب" مان بیردەخاتەوە کە زۆربەی جار بەوان بەراورد دەکرێ، گەرچی ئەمانە وەکو ئەو مەزن نین. ماڵەکانی بە شوورەی قەلاکەوە نووساون، ئەربیل هێشتا هەڵکۆڵینی ڕێکوپێکی بۆ نەکراوە و هەروەک چۆن هیچ شتێک لەبارەی بەرچاوخستنی شوێنەوارەکانی نازانین.

گرنگی ئەربیل لە ئێستەدا دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی ئێستگەیەکی بازرگانی گرنگە و ناوەندی بزووتنەوەیەکی بازرگانی چالاکە، چەند ڕێگەی کاروانسەرای لەسەرە. پێویستە یەکەمجار باسی ڕێگە و بانە کۆنەکانی بکەین کە، لە بەغداوە دەست پێدەکات و بە کەرکووک و ئالتوون کۆپریدا دەچێتە ئەربیل و پاشان مووسڵ و جاران بابلی بە نەینەوا دەبەستییەوە. لە ئەربیلەوە دوو ڕێگە بەرەو ڕۆژهەلات و باکووردا دەڕۆن و بە ناو شیوی چیا سەختەکان تێپەڕ دەبن و لە ئازەربایجان کۆتاییان دێت. یەکەمیان لە باکووری ڕۆژهەلاتدا بە ڕەواندوز دا دەڕوات و ئەوی دیکەیان لە ڕۆژهەلاتدا بە کۆیسنجاقدا دەڕوات. هەرچی تایبەتە بەو ڕێگەو بانانەی کە لە ئەربیلەوە دەردەچن لەگەڵ دووربییەکانیان، بە شێوەیەکی تایبەتی بڕوانە ڕیچ، بەرگی ٢، لا: Jones, 296,297 لە Journ. of Roy. Asiat, Soc, XV (1855), p. 380; Cuniet, p. 793

و دواتر. ، وەسفی ئەو ڕێگەیە دەکات کە بە نێوان ئەربیل و مەراغە درێژ دەبێتەوە.

شاری ئەربیل کەوتۆتە ناو هەرێمێکی بە پیت و فەڕی دەوڵەمەند وەکو پێدەشتێکی پان و بەرین دێتە بەرچاو. بەرزییەکەی ٤٠٠ مەترە و (بەشی خوارووی شار بەرزییەکەی ٤١٠ مەترە لەسەر ئاستی زەریا). ئەم پێدەشتە هێڵی ئاو دابەشکەری نێوان هەردوو زابە. لەگەڵ ئەوەشدا کە دار و درەختی تێدا نییە کەچی زەوی وزارەکەی بۆ گەنم چاندن بەکەڵکە و کشتوکاڵی لۆکەی تێدا دەکرێ و لە شار مانیفاکتۆرەی ڕستنسازی تێدادەکرێ. جوگرافیناسی ئێرانی حەمدوڵلا مستەوفی لە کرۆنیکە جوگرافییەکەی خۆیدا "نزهە القلوب" کە دەوروبەری ساڵی (١٣٤٠ز) نووسیویەتی پەسنی لۆکەی شارەکە دەکات. زستانان لە پێدەشتی شارەکە چەندین ڕووبارۆچکەی پێدا دەڕوات، بەشێوەیەک کە هیچ ڕووبارێکی لێ نییە کە بە درێژایی ساڵ ئاوی پێدا بڕوات و بۆ کشتوکاڵ -تا ڕادەیەک- پشت بە ئاوی ژێر زەوی دەبەستێ. لە ناوچەی باکوور داوێنی چیایەکان کەوتوونەتە نزیکی شارەکە و لە ڕۆژئاوا شارەکە چیای: دەمیر داغی لێ هەڵکەوتووە کە بەرزییەکەی ٤٩٥ مەترە، چیای دەرەدەوان داغ (لە نزیکی ئالتوون کۆپری) ڕۆژهەلات و باکووری پێدەشتەکە دیاری دەکات. لە باشووردا زەرجزوان داغ و لە باشووری-ڕۆژئاوای پێدەشتی ئەربیل بە پێدەشتی شەمامک و کە دەگاتەوە کەناری زێی گەورە.

گوندە کوردییەکان لەسەر ئەو پێدەشتە بە پیتە بلاوبوونەتەوە، لە زستانان هۆزە کۆچەرەکان تێیدا دەمێننەوە و هەرچی لە هاوینانە کۆچ دەکەن بۆ چیایەکانی ڕەواندوز و هەواریان لێ دادەگرن. برێک لە ئاواییەکان لە نزیک تەموڵی هەڵکەوتوون، مرۆ ئەوە دەبینێ کە ئەگەر کۆمەڵەیەکی زۆر کەلاوە هەبێ ئەوا ئەوە نیشاندەدەن کە ئەم ناوچەیە بە دەورانێکی باشتر لەم سەردەمەدا تێپەڕیوە، ئەو کاتانەی کە ئەم ولاتە سروشت پیت و فەڕی پێ بەخشیوە لە ئێستەی شارستانیتر بووە.

## پەراوێزەکانی وەرگێڕ:

* دولفی **Delphe**: پەرستگەی ئایینی هاوبەشی هەموو شارەکانی گریک بوو لە دەورانی گریکی کۆندا.

** دەورانی دیادۆکەکان **Diadoques** (٣٢٣-٢٨١ی پێش زایین). وەک چۆن ئەلیکساندەری گەورە لە دوای خۆی هیچ جێگرەوەیەکی نەبوو کە بتوانی جڵەوی سیاسیی ولات بەڕێوە ببات، بۆیە ژەنەراڵە سەربازییەکانی هەڵمەتەکانی ئەلیکساندەری گەورە تا ساڵی ٢٨١ ی پێش زایین دەسەلاتی

وڵاتیان بەدەستەوە گرت. تێرمی دیادۆک لە دەورانی نوێ و هاوچەرخیشدا بە مانای میراتگری عەرشی یۆنان بەکارهاتووە.

## بیبلیۆگرافیا

Pour la période assyrienne cf. Fr. Delitzsch, Wo lag dans Paradics ?(1881), p. 124, 256, et Streck, Die Inschriften Assurbanipals (1916), III 711. Pour l'époque gréeco-romaine cf. Pauly-Wissowa, Realenzykl. der klass. Altertumswiss., II, 407-8(S. Fraenkel)et Supplem., I., 117(Streck). Pour l'époque islámique, il faut noter surtout, en dehors des sources susmentionnes: Yákút, Mu'djam(éd. Wüstenfeld), I, 186-189; Dimishkí, Kosmographie (éd. Mehren), p. 190; Kazwíní, Kosmographie (éd. Wstenfeld), p. 162-3; Marási al-Ittilá (éd. Juynboll), I, 42, IV, 75; Ibn al-Athír, Chronicon (éd. Tornberg), passim, vol. VII . XII (v.le volume-index, p. 675); Barhebraeus, Ta'ríkh mukhtasar al-Duwal (éd. Bairút 1890), passim (v. index); Barhebrareus, Chronicon syriacum (éd. Bedjan, Paris 1890), passim, en particulier, p.424, 432-7, 466, 506, 525-6, 528-9, 596-7; Hádjdjí Khalífa, Djihánnumá (versio latina de Norberg, Lund, 1818), II, 53-55. une histoire locale d'Irbil, en quatre volumes, composée par Abu'i-Barakát al-Mubárak al-Mustawfí (mort en l'an 637=1240), vizír de Kökbürí, est perdue. Yákút a reçu d'al-Mustawfí, qu'il connaissait personnellement, de nombreuses notes pour son dictionnaire géographique; cf. ,W|stenfled, Abh. Der Göttinger Ges. Der Wiss., XXVIII (1881), p. 119-120; F. J. Heer, Die hist. U. geogr. Quellen in Táqût's Geogr Wörterb. (1898), p. 36. Ibn Khallikán, lui aussi, qui fit ses premiéres études sous al-Mustawf. á Irbil. S'est beaucoup servi de la chronique de ce dernier pour son ouvrage biographique; cf. W|stenfled, loc.cit.- Parmi les relations des voyageurs européens mritent d'être cités: )Niebuhr (1766), Reisebeschreib. Nach Arabien und anderen umliegenden Ländern, II (Copenhague, 1778), p. 342-4; Olivier (1795), Voyage dans l'empire Othoman, IV (Paris, 1803), p. 292-6; J. S. Buckingham (1816), Travels in Mesopotamia (Londres, 1827), p.335-8; Cl. Rich (1820), Narrative of a residance in Koordistan (Londres, 1836), II, 14-18), 293-305; H. Southgate (1838), Narrative of a tour through Armenia, Koordistan (Londres, 1840), p. 214 suiv.; V. Place (1851), Lettre â M. Mohl sur une expédition faite en Arbéles (dans Journ. Asiat., 4e série, XX, 1852, p. 441 suiv. et 457-60; J. Oppert (1854), Expéd. Scientif. en Mésopotamie, I (1863), p. 281-6; H. Petermann's (1855), Reisen im Orient (Leipzig, 1861), II, 321; Czernik (1873), dans Petermann's Geogr. Mitt., Erg, H. n.· 45 (1876), p. 1-2; E. Sachau (1898), Am Euphrat und Tigris (Leipzig, 1900), p. III-3; L. Belck et C. F. Lehmann (1899), dans les Verh. Der Berl. Anthrop. Ges., 1899, p. 417; S. Guyer (1911)dans Petermann's Geogr. Mitteil., vol. 62 (1916), p.294. Cf. en outre: [Rousseau], Descript. Du Pachalik de Bagdad (Paris, 1809), p. 85; C. Ritter, Erdkunde, IX, 691-4, oú il est fait usage des relations de voyage de Neibuhr, Olivier, Rich, Dupré (1808), et Shiel (1836); V. Cuinet, La Turquie d'Asie, II (Paris, 1892), p. 847, 848, 856-8. Une bonne carte des environs d'Irbil nous est fournie par Czernik, loc. cit., . Lane-Poole, Catal. Of oriental coins in British Museum (Londres, 1875 etc.), vol. II, VI, IX, 1 et 2 (v. les index), et les remarques de v. Berchem dans v. Berchem-Streygowski, Amida 1910), p. 94, note4.

سەرچاوە:

M. Streck, "Irbil", In Encyclopédie de l'islam, publié avec le concours des principaux orientalistes, Tome II (E-K), Leyede & Paris, 1927, pp. 554-557.



# پارێزگای هەولێر لە (قاموسی ئەعلام)ی (شەمسەدین سامی)دا

فەیسەڵ نوورەددین دەباغ

بەرگی یەکەمی (قامووسی ئەعلام) لە ساڵی ١٣٠٦ی رۆمی، واتە ١٨٨٩ی زایینی چاپکراوە، دوا بەرگیشی کە بەرگی شەشەمە لە ١٣١٦ی رۆمی -١٨٩٩ی زایینی دەرچووە، دانەرەکەشی (شەمسەدین سامی) بە نەفەسێکی زانستییانە و دوور لە دەمارگیری نەتەوایەتی نووسیویەتی، بۆ نموونە کە دێتە سەر برگەی کەرکووک یەکسەر پێمان دەڵێ ٤/٣ی دانیشتوانی کوردن.

هەولێر سەر بەسنجەقی شارەزوور و ئەویش سەر بە ویلایەتی موسڵ بووە، سەرەڕای شارەزوور ئەم ویلایەتە دوو سنجەقی تریشی هەبووە کە یەکێکیان سنجەقی موسڵ و ئەویتریان سنجەقی سلێمانی بوون، بەپێی برگەی ویلایەتی موسڵیش، ژمارەی دانیشتوانی ویلایەتەکە بەم شێوەیە بووە.

١٥٩٦٨٠ ژمارەی دانیشتوانی سنجەقی موسڵ

٨٩٠٠٠ ژمارەی دانیشتوانی سنجەقی شارەزوور

٥١٦٠٠ ژمارەی دانیشتوانی سنجەقی سلێمانی

ئەم ژمارەیەش (واتە ٣٠٠٢٨٠ کەسە) کە بەپێی رەگەز و مەزهەب بەم شێوەیەی خوارەوە بووە:

| | |
|---|---|
| عەرەبی نیشتەجێ | ٨٠٠٠٠ |
| عەرەبی چادرنشین | ٩٣٠٠٠ |
| کورد | ٥٩٣٨٠ |
| تورکمان | ١٦٠٠٠ |
| کۆی موسڵمانەکان | ٢٤٨٣٨٠ |
| کلدانی | ١٨٠٠٠ |
| سریانی کاتولیکی | ٧٠٠٠ |
| یەعقوبی | ٥٠٠٠ |
| کۆی دیانەکان | ٣٠٠٠٠ |
| ئیسرائیلی | ٦٠٠٠ |
| ئێزدیە | ١٤٩٠٠ |
| مەزهەبی جۆراوجۆر | ١٠٠٠ |
| کۆی جوو و ئێزدی و مەزهەبی تر | ٢١٩٠٠ |

بەپێی قسەی (شەمسەدین سامی) ئێزدییەکان و مەزهەبەکانی تر راستە موسڵمان نین، بەڵام بە رەگەز کوردن، بۆیە ئەگەر ژمارەی ئێزدی و مەزهەبەکانی ترمان خستە سەر کورد ئەوا ژمارەیان دەگاتە ٧٥٢٨٠ کەس بەم شێوەیەی خوارەوە:

| | |
|---|---|
| ٥٩٣٨٠ | موسڵمان |
| ١٤٩٠٠ | ئێزەدیە |
| ١٠٠٠ | مەزهەبی تر |

ویلایەتی موسڵ هەروەکو گوتمان لە ٣ سنجەق و ١٨ قەزا و ٢٢ ناحیە و ٣٠٣١ گوند پێکهاتبوو، بەم شێوەیەی خوارەوە: بڕوانە خشتەی ژمارە (١)

ئەمەی خوارەوەش دەقی ئەو زانیارییەن، کە دەربارەی هەولێر (ئەربل) و باڵەک و برادۆست و رواندز و کۆیە و پردێ و زێبار و هەردوو زێی گەورە و بچووک نووسراون:

**هەولێر (ئەربل)**

مەڵبەندی قەزای (هەولێر -ئەربیل)ە و سەر بە سنجەقی شارەزوورە لە ویلایەتی موسڵدا، دەکەوێتە نێوان دوو زاب، زابی گەورە و زابی گچکە، واتە نێوان هێڵی پانی ١٢- ٣٦ە. هێڵی درێژی ٢٠- ٤١ە.

بەواتایەکی تر دەکەوێتە باکووری رۆژئاوای کەرکوک و ٧٥ کیلۆمەتر لێی دوورە، هەروەها دەکەوێتە رۆژهەڵاتی باشووری موسڵ و ٨٠ کیلۆمەتر لێی دوورە.

خوارو و سەرووی شارەکە لە دوو گەڕەکی گەورە پێکهاتووە، بەشی سەرەوەی دەکەوێتە سەر گردێکی گەورە و بە شوورەیەکی بڵند دەورە دراوە، کە پێی دەڵێن (قەڵا)، بەشی خوارووشی دوو سێ ئەوەندەی قەڵاکە دەبێ پێی دەڵێن (کورتەک)، کۆی دانیشتوانی قەڵاکە ١٦٠٠ خێزان دەبێ، واتە ٦٠٠٠ کەس، ئەمانە بەشێکی زۆریان تورکن و ئەوانیتریان کوردن.

قەڵاکەی شوێنەوارێکی کۆنە و بەشی خوارەوەشی لە سەردەمی خەلیفە عەباسییەکاندا لەلایەن میر موزەفەرەدین کوگبری بنیات نراوە، ئەربل (ئەربیل) ناوێکی زۆر کۆنە و بەو ناوەش هەر لەو شوێنەدا شارێکی کۆن هەبووە، کە لە دووروبەریدا ئەسکەندەری گەورە بەسەر دارای هاخامەنشی زاڵ بوو و ناویشی بەو واقیعەیەوە بەندە، شارە کۆنەکە لە شوێنی (ئەربل)ی ئێستا نەبوو، وای بۆ دەچین کە (٣) سەعات لە رۆژئاوای (ئەربل)ی ئێستادا بووبێ.

قەزای هەولێر دەکەوێتە باکووری سنجەقی شارەزوور، لە رۆژهەڵاتی باکوورەوە رواندز، لە رۆژئاوای باکوورییەوە سنجەقی موسڵ، لە باشووریشدا بە قەزای کەرکووک دەورە دراوە.

سوڵتانییە و قوشتەپە دوو ناحیەی ئەو قەزایەن، ژمارەی دانیشتوانی قەزاکە ١٦٢٧٩ کەس دەبێ، لەوانە ٣٦٠٠ دیانی تێدایە و ئەویتریان موسڵمانن، زۆربەی دانیشتوانی قەزاکە کوردن، لەو ژمارەیەش ٣٠٠٠ کەسیان کۆچەرن و ئەوی تریان نیشتەجێن.

**باڵەک:**

ناحیەیەکە سەر بە قەزای (رواندز)، کە ئەویش سەر بە سنجەقی شارەزوورە لە ویلایەتی موسڵدا، ئەم ناحیەیە دەکەوێتە باشووری رۆژهەڵاتی قەزاکە و لە ٦٠ گوند پێکهاتووە.

**برادۆست:**

ناحیەیەکە سەر بەقەزای (رواندز)، کە ئەویش سەر بە سنجەقی شارەزوور لە ویلایەتی موسڵدا، ئەم ناحیەیە دەکەوێتە ئەوپەری رۆژهەڵاتی باکووری ویلایەت و سنجەقەکە.

لە باکوورەوە بە سنجەقی هەکاری سەر بە ویلایەتی وان و لە رۆژهەڵاتیشەوە بە سنووری ئێران دەورە دراوە، شوێنێکی چیاییە، خەڵکەکەی کوردن و لە ٦٤ گوند پێکهاتووە.

**رواندز:**

مەڵبەندی قەزای (رواندز)ە و سەر بە سنجەقی شارەزوورە، ئەویش سەر بە ویلایەتی موسڵە، دەکەوێتە رۆژهەڵاتی باکووری موسڵ و ١٣٥ کیلۆمەتر لێی دوورە، ژمارەی دانیشتوانی ١٠٠٠٠ کەس دەبێ و خەریکی بازرگانین، ئەم مەڵبەندە بە چاندنی توتن بەناوبانگە و بەرهەمەکەشی بۆ ئێران رەوانە دەکرێ.

قەزای رواندز سێ ناحیەی هەیە بەناوی دێرە و باڵەک و برادۆست، هەر هەموویشیان خاوەنی ٢٨٣ گوندن و زۆربەی دانیشتوانیشیان کوردن.

**خشتەی ژمارە (١)**

| سنجەق | قەزا | ناحیە | ژمارەی گوند |
|---|---|---|---|
| موسڵ | موسڵ | شێخان | ٥٠٦ |
| | | عەشایری سەبعە | |
| | ئامێدی | – | – |
| | زاخۆ | سلیڤانی | ١٠٩ |
| | ئاکرێ | سوورچی | ١٣٢ |
| | زێبار | شێروان | ١٨٥ |
| | | مزووری باڵا | |
| | دهۆک | مزووری | ٢١٥ |
| | شنگار | تەلەعفەر | – |
| سلێمانی | گوڵعەنبەر | سروچك | ٤٧٣ |
| | | قزڵجە | |
| | | پشدەر | |
| | بازیان | قەڵای سێوکە | ١٥٩ |
| | مەعمورەی حەمید | سوورداش | ١٧٦ |
| | | پشدەر | |
| | شارباژێڕ | – | ١٢٥ |
| شارەزوور | کەرکووک | مەلحە | ٣٥٢ |
| | | دوزخورماتوو | |
| | | پردێ | |
| | | کیل | |
| | | شوان | |
| | رواندز | دێرە | ٢٨٣ |
| | | باڵەك | |
| | | برادۆست | |
| | کۆیە | شەقڵاوە | ١٢١ |
| | هەولێر (ئەربیل) | سوڵتانیە | ٣٣٠ |
| | | دزەیی | |
| | سەلاحییە | قەرەتەپە | ٩١ |
| | رانیە | قەرەتەپە | ٩٠ |

**کۆیە:**

مەڵبەندی قەزایەکە بەو ناوە و سەر بە سنجەقی شارەزووری سەر بەویلایەتی مووسڵە، دەکەوێتە باکووری کەرکووک و ۷۰ کیلۆمەتر لێی دوورە، ژمارەی دانیشتوانی ۱۰۰۰۰ کەس دەبێ و خاوەن قەڵایەکی کۆن و مزگەوتێکی گەورە و ۱۰ مزگەوتی بچووک و ۳ قوتابخانە و ٦ مەکتەبی منداڵان و ۳ تەکیە و ۳٤۰ دوکان و ۳ حەمام و ۱ فرن و ۱۸ ئاشی ئاوە، خەڵکەکەی هەر هەموویان کوردی موسڵمانن و ئاو و هەواشی تا رادەیەک خۆشە.

قەزای کۆیە، لە باشوورەوە کەرکووک و لە رۆژئاواوە هەولێر و لە باکوورەوە قەزای رواندز و لە رۆژهەڵاتیشەوە بە سنجەقی سلێمانی دەورە دراوە.

لەگەڵ ناحیەی (شەقڵاوە)دا ۲٥۲ گوندیان هەیە، ژمارەی دانیشتوانیشیان ۱۸۰۰۰ کەس دەبێ، لەوانە ٥۰۰ کلدانی واتە نەستوری و ٦۰ جووی تێدایە و ئەوانی تریشیان هەر هەموویان کوردی موسڵمانن.

خاکەکەی زۆر بە پیتە، بەروبوومەکەی بەشی هاووڵاتیانی خۆی دەکا، هەندێ ساڵیش تووشی نەهاتی دەبێ. لە بەروبوومەکانی: برنج و پەمۆ و توتن و پاقلە و جۆرەهای میوە.

لە نزیک شاری کۆیە و بەنیو سەعاتەرێ گوندێک هەیە پێی دەڵێن (ئارمودە) کە بەمیوەجات بەناوبانگە و ترێشی زۆرە.

مەڵبەندی ناحیەی شەقڵاوە هەر لە کۆنەوە بەترێ و شەراب دروستکردن بەناوبانگە، هەواکەی خۆشە و بۆ تەندروستی باشە، لەناو قەزاشدا هەندێ شوێنەواری کۆن هەیە.

**پردێ (ئاڵتون کۆپری):**

مەڵبەندی ناحیەیەکە لە قەزا و سنجەقی شارەزووری ویلایەتی موسڵدا، دەکەوێتە سەر ئەو شەقامە سەرەکییەی، کە بەغدا بە موسڵ دەبەستێتەوە، ئەم شارۆچکەیە دەکەوێتە سەر رووباری (کۆپری صو) و بە ٤۲ کیلۆمەتریش لە کەرکووک دوورە، بە ۱۰٥ کیلۆمەتریش لە شاری موسڵ.

دوو پردی تێدایە، ئەوەی بەشی باکوور بەر لە ۱۰۰ ساڵ دروست کراوە، لە دوو گەرەکی سەرەکیش پێکهاتووە، ژمارەی دانیشتوانیشی نزیکەی ۱۰۰۰۰ کەس دەبێ، هەر هەموویان زمانی تورکی دەزانن و بەکوردی و عەرەبیش قسە دەکەن. میوەجاتی چیاکانی کوردستان دێتە ئەو شارۆچکەیە و لەوێشەوە بە کەڵەک دەیبەنە بەغدا.

**زێبار:**

قەزایەکە کەوتۆتە رۆژهەڵاتی سنجەق و رۆژهەڵاتی باکووری ویلایەتی موسڵ، لە باشوورەوە سنجەقی شارەزوور، لە باکوورەوە سنجەقی هەکاری لە ویلایەتی وان، لە رۆژهەڵاتیشەوە بە سنووری ئێران دەورە دراوە.

(شێروان) و (مزووری باڵا) دوو ناحیەی ئەم قەزایەن و ۱۸٥ گوندیان هەیە، خاکەکەی چیاییە و خەڵکەکەشی هەر هەموویان کوردی موسڵمانن.

**زاب:**

ناوی دوو رووبارە، یەکێکیان گەورەیە پێی دەگوترێ زابی گەورە و ئەویتریان گچکەیە پێی دەگوترێ زابی گچکە.

**زابی گەورە:**

لە ویلایەتی وان، لە باشووری رۆژهەڵاتی چیای (ئەلیاق)ەوە هەڵدەقوڵێ، درێژی ئەم رووبارە ٤٥۰ کیلۆمەترە و لە پاش رووباری دیالا بە گەورەترین لقەکانی (دیجلە) دادەنرێ، لە هەردوو ویلایەتی وان و موسڵدا چەند لقێکی لێ دەکەوێتەوە و لە زستانانیشدا ئاوەکەی زۆر دەبێ و دەبێتە هۆی رووادنی لافاو، بۆیە عەرەب بەو رووبارە دەڵێن (الزاب المجنون).

**زابی بچووک:**

لە سنجەقی سلێمانی و لە چیاکانی سنووری ئێران هەڵدەقوڵێ و لە چەند لقێکی بچووک پێکدێت و بەرەو رۆژئاوای باشوور بەردەوام دەبێ تا دەگاتە پردێ، لەوێوەش بەدووری ۷۰ کیلۆمەتر لە باشووری بەغدا لەگەڵ (دیجلە)دا یەک دەگرنەوە.

# هەولێر لە ئینسكلۆپیدیای ئەڵمانیدا

وەرگێڕانی لە ئەڵمانییەوە: حوسام بەرزنجی

هەولێر - HEWLER [1]

هەولێر : بە عەرەبی (اربیل) بە ئاشووری (ARBIL) پایتەختی حوكومەتی هەرێمی كوردستانە لە عێراق. ناوە ئاشووریەكەی كە پێی دەڵێن ARBIL بە واتای چوار خواوەند VIER GOTTER- [2] دێ.



**ئاو و هەوا:**

بە شێوەیەكی گشتی، ئاو و هەوای (هەولێر) لە وەرزی هاویندا گەرم و وشكە. هەندێ جار لە پلەی گەرمی تا (٥٠c) پەنجای سەدیش هەڵدەكشێ.

زستانی خۆشە، پلەی گەرمی لە (١٠) دەی سەدی لەسەرەوەیە. گەلێ جار لەم وەرزەدا پلەی گەرمی بۆ (٠) سفری سەدی و كەمتریش دادەبەزێ.

**دانیشتوان:**

ژمارەی دانیشتوانی (هەولێر) دەگاتە (١.٣) ملیۆن كەس. (بەگوێرەی زانیاریەكانی فەرمانگەی باری كەسایەتی [3] زیاتر لە (٩٧٪)ی كوردن. ڕێژەكەی تریش كەمایەتیەكانی تر دەگرێتەوە.. زیاتر لە (٩٩٪) ی دانیشتوانەكەی ئیسلامن. كریستیانەكانیش هاوشان و هاودەم لەگەڵ ئەوانی تردا بێ تەنگوچەڵەمە دەژین و گوزەران دەكەن، ڕێژەیان دەگاتە (١٪) لە كۆی ژمارەی دانیشتوانی (هەولێر)دا.

**مێژوو:**

(هەولێر) كۆنترین شارە لە جیهانا كە هەر بە ئاوەدانی مابێتەوە. تەمەنی بە زیاتر لە (٤٠٠٠) چوار هەزار ساڵ مەزندە كراوە.[4].

كاتی خۆی (سۆمەریەكان) ناویان نا (ئوربیلیوم - VRBILLUM) كە ئەویش هەر لە زمانەكەی خۆیانەوە دایانڕشتبوو...

(ئەربا - ARBA) واتا (چوار - VIER) و (LLA) واتا (خواوەند - GOTT). ئاشووریەكانیش - ASSYRER) بە (ARBELO) ناویان هەڵدەدا.

(هەولێر) تا سەردەمێكی زۆر بوو بە پایتەخت و مەڵبەندێكی ئاینی بۆ خواوەندی (عەشتار)[5].

لە ساڵی (٣٣١)ی پێش زایین، لە جەنگی (گۆگەمیل - GOUGAMELA) دا (ئەلێكساندەری گەورە - ALEXANDER DER GROBE)، لێرەدا بەسەر شای فارسەكان (داریۆشی سێهەم - PERSERKONIG - DAREIOS) دا زاڵ بوو.[6].

(هەولێر) لە جەنگی یەكەمی كەنداودا گەلێ زیانی لێ نەكەوت[7] دانیشتوانەكەی تا ساڵی (١٩٩١ز) لەژێر حوكمڕانی (سەدام حوسێن)دا گیریان خواردبوو، دەچەوسێنرانەوە، بەڵام دوای كشانەوەی سوپای (سەدام) لە ساڵی (١٩٩٢ز) دا یەكەم پەرلەمانی سەربەخۆی كورد لە هەولێری پایتەختا هەڵبژێردرا. بەڵام لەبارەی چۆنیەتی كارگێڕی حوكومەتی هەرێمدا، هەردوو حیزبە زلهێزەكە (یەكێتی نیشتمانیی كوردستان - PUK) و (پارتی دیموكراتی كوردستان - KDP)، تا ساڵی (١٩٩٦ز) هەر لەكێشە و ململانێیەكی بەردەوامدا بوون.[8]

لەساڵی (١٩٩٦ز) دا هەولێر كەوتە ژێر دەسەڵاتی (پارتی دیموكراتی كوردستان) لە ٤/ حوزەیران /٢٠٠٥ دا بۆ یەكەم جار پەرلەمانێكی هاوبەش دامەزرا[9] لە ١٢/ حوزەیران /ی هەمان ساڵدا بەڕێز (مەسعود بارزانی) بە سەرۆكی هەرێمی كوردستان هەڵبژێردرا.

**ئابووری:**

بەهۆی سیاسەتە چەواشە و داپڵۆسینەرەكەی ڕژێمی (سەدام

حوسێن)، دواتریش بەرپابوونی (راپەڕین) ی دوای شەڕی دووەمی کەنداو[10] و هەروەها شەڕی ناوخۆی نێوان هەردوو فراکسیۆنی کورد، سەرەڕای جۆرەها جەنگی خوێناوی جینۆساید و سیاسەتی قڕکردن و کوشتوبڕیەوە، لەلایەن سوپای عێراق و سوپا و لەشکرکێشی تورکەوە ... (هەولێر) لەم ڕۆژگارانەدا و بەدرێژایی دەیان ساڵی پڕ لە مەینەتی و نووشستیەوە، لەرووی ڕەوشی ئابووریەوە، هیچ بایەخ و کاریگەریەکی ئەوتۆی نەبووە لەعێراقدا. بەڵام لەگەڵ بەرپابوونی شەڕی سێیەمی کەنداوەوە[11] کتوپڕ گۆڕانی خێرایی بەسەراهات. لەکاتێکا کە هەرێمەکانی تری عێراق جەنگی خوێناوی و تیرۆرکردن و تاوانی جینۆساید زیاتر پەرەی دەسەند... کە لەلایەن پاشماوەکانی بەعس و گروپە ئوسوولیەکانەوە پیادە دەکرا و ڕەشەکوژی و سیاسەتی پاکتاوکردن ببوو بەکارێکی ڕۆژانەی ئاسایی، ... کەچی (هەولێر) تا دەهات ڕەوشی ئاسایی زیاتری بەخۆوە دەدیت و دامودەزگا و پرۆژەی زیاتری لێ دادەمەزرا (١٢) بێگومان ئەم سەقامگیری و بووژانەوەیە بوو بەهۆی ئەنجامدانی جموجۆڵێکی بەلێشاوی ئابووری.

هەڵبەت ئەم فراژۆ بوون و پێشکەوتنە ئابووریە، لەسەر گەلێ شت تیشکی داوە، ... وەک بنیاتنان و ئاوەدانکردنەوە، هەروەها پلاندانان بۆ دروستکردنی ئۆتۆبان لەمیانەی (هەولێر - سەلاحەدین -[13] هەولێر - کەلەک، هەولێر - پردێ) و دامەزراندنی فڕۆکەخانەیەکی نێو دەوڵەتی لەژێر ناوی (فڕۆکەخانەی هەولێری نێودەوڵەتی- HEWLER AIRPORT INTERNATIONAL)[14] لەوێشدا هەردوای ماوەیەکی کورت لە کرانەوەیدا، فڕۆکەکان دەستیان بە گەشتی ئاسمانی کرد بۆ وڵاتانی ناوچەی کەنداو.... ئەم کۆمپانیای گواستنەوەیە، ناوی لێنرا (هێڵی ئاسمانی کوردستان- KURDISTAN AIRLINES) کە دەبوایە فڕۆکەکانی سەر بەم کۆمپانیایە، هەر بەم ناوەوە بۆ (ئەنقەرە) و (ئەستەمبوڵ)یش گەشت بکەن، کەچی لەسەرێنی هەڵوێستی دژواری حوکومەتی تورکیا ڕێگا نەدرا، کە لەسەر فڕۆکەکاندا (ئاڵای کوردستان) هەبێ و وشەی (کوردستان) یان (کورد)یان لەسەر نووسرابێ.... بۆیە هیچ گرێبەستێ لەژێر ناوی کۆمپانیای (هێڵی ئاسمانی کوردستان) لە نێوان (هەولێر) و ئەم شارانەی تورکیا ئەنجام نەدرا.

وەک یەکەم تۆڕی ترانسپۆرتی ئاسمانی ئەورووپی لە ١١/ دیسەمبەر /٢٠٠٦، یەکەم فڕۆکەی نەمساوی (هێڵی ئاسمانی نەمسا - AUSTRIAN AIRLINES) لە (ڤیەننا - WIEN)ەوە بۆ (هەولێر) حەفتەی دووجار دەستیان بەگەشتەکانی خۆیان کرد.

لە کۆتایی ساڵی (٢٠٠٥)یشدا، هێڵێکی ئاسمانی تورکی، بەڵام لەژێر ناوی (گەشتی ئاسمانی -FLY AIR) دا ڕێگای پێ درا... تا بۆ (هەولێر) و (سلێمانی) گەشتی خۆیان دەست پێ بکەن.

لە (٢٠/دیسەمبەری /٢٠٠٥) هەوڵی دامەزراندنی گەشتی ئاسمانی ڕاستەوخۆ (هەولێر - فرانکفۆرت) درا کە لەراستیدا لە (مارت / ٢٠٠٦) پلانی بۆ دانرا و دامەزرا. پرۆژەکانی تری (هەولێر) بریتییە لە دروستکردنی (فڕۆکەخانەی شار - AIRPORT CITY) کە مۆدێرنترین تەکنەلۆجیای لێ بەکاردێ، بەنوێترین شێواز و ستایل بنیات دەنرێ، لەگەڵ دابینکردن و دەستەبەر کردنی ناوچە و پارکێکی نوێ بۆ دروستکردنی گەردکێکی جوان و قەشەنگ - LUXUSVIERTEL بە ناوی (شاری خەون DREAM CITY) و هەروەها وێڕای ئەمانەش، پرۆگرامێکی تێروتەسەل لە ئارادایە بۆ نۆژەنکردنەوەی بەشە کۆنەکانی هەولێر، کە بە (پرۆژەی گەشەکردنی سێنتەری کۆنی شار - OLDCITY CENTER PROJECT DEVELOPMENT) ناوزەد کراوە.

هەر لەچوارچێوەی ئەم پرۆژانەوە، تا ئێستا (١٠) هێکتار لە زەوی تەرخان کراوە و مەڵبەندێکی بازرگانی بنیات نراوە، ئەمە بەیەکەم مەڵبەندی ئابووری دادەنرێ، نەک هەر لە کوردستان بەڵکو لە (عێراق)دا بەگشتی، هەروەها لەلایەکی تریشەوە بەهاوبەشیکردن و باربووکردنێکی گرنگ دادەنرێ بۆ هێمنی و سەقامگیر بوونی ڕەوشی عێراق و ڕەوشی کوردستان.

**پەراوێز:**

(١) هەولێر لە بەرواری ١٩١٩/١١/١ دا بوو بە (لیوا - لوار) و (متصرف - پارێزگار)ی بۆ دانرا. (وەرگێڕ).

(٢) (اربیل) یان (ئێربل)ەکەی عەرەبی و ئینگلیزی و تورکی و زمانەکانی تریش، هەر لەمەوە وەرگیراوە، کە کورتکراوەی دەستاوێژ، (ئەربائیلۆ) یە. (وەرگێڕ).

(٣) هەتا سەرژمێریێکی دروست و مۆدێرن نەکرێ، ژمارەی دانیشتوانی هەولێر و هیچ شارێکی تری کوردستان بە (کەرکوک) و (شەنگال) و (گەرمیان) و ناوچەکانی تری کوردستانیشەوە بەدیار ناکەوێ. (وەرگێڕ).

(٤) بەگوێرەی گەلێ سەرچاوە مێژوویەکان، تەمەنی زیاترە لە (٦٠) سەدە، واتا (٦٠٠٠) ساڵی زانراوە و لەمێژوودا یەکلا کراوەتەوە. بەڵام بۆ زانینی تەمەنی ڕاستەقینەی (هەولێر). بە شێوەیەکی زانستیانە، پێویستە

لێكۆڵینەوەیەكی جیۆلۆجی و ئاركیۆلۆجی لە پێكهاتەی خاكەكەیدا بكرێ.... بە تایبەتی لە چین و پاتەكانی قەڵا دێرینەكەیدا. (وەرگێر).

(٥) لەدوای ئەمانیشەوە بوو بە مەڵبەندێكی پیرۆزی زەردەشتییەكانیش لە قەڵا دێرینەكەیدا ئاتەشگایان لێ دامەزراندوە. (وەرگێر).

(٦) لەوانەیە ئەم زانیاریە زۆر ورد نەبێ. ئەمە باس لەو جەنگە دەكا كە كاتی خۆی كوردەكانی ئەم شارە لەقەڵاوە سوپای داگیركەریان تیر باران كرد و لەگەڵیانا كەوتنە شەڕی دەستەویەخە. ئەگەرچی ئەمە تەنانەت زانیاریەكی ئینسكلۆپیدیاییە، بەڵام دەبوایە ئاماژە بۆ ئەمەش بكرابوایە...! چونكە هەر چ نەبێ، دانیشتوانەكەی لەپێناوی بەرگریكردن لە خۆیان و لە شارەكەیان، هاوبەشییان لەم شەڕەدا كردووە و زۆر بە توندی و بەهێزێكی تووكمە و تەیارەوە دژی داگیركەر وەستاونەتەوە. (وەرگێر).

(٧) واتا جەنگی نێوان عێراق و ئێران (١٩٨٠-١٩٨٨)ز. (وەرگێر).

(٨) لەم ماوەیەدا دروشمە ئەنقەستەكەی (ففتی ففتی) (پەنجا بە پەنجا) .. پێڕەو كرا. كە لە ئەنجاما ماڵوێرانی كورد و كاولكردنی لێ كەوتەوە. (وەرگێر).

(٩) سەرەڕای دوو حزبە گەورەكە (pdk ، puk) حزبەكانی تریش هاوبەشییان لێ كرد و ئەندامیان هەبوو ... وەك حزبی (یەكگرتووی ئیسلامی، زەحمەتكێشان، شیوعی، سوشیالیست، .... هتد). (وەرگێر).

(١٠) ئەم جەنگەیە لەمیانەی هێزی هاوپەیمانان بە سەرۆكایەتی وڵاتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا و ڕژێمی بەعسی عێراقدا لە ئەنجامی داگیركردنی (كوێت) لەلایەن سوپای ڕژێمەوە بەرپا بوو. (وەرگێر).

(١١) جەنگی یەكلایی كەرەوەی نێوان هێزەكانی هاوپەیمانان و ڕژێمی سەدامی بوو. وەبوو (سەدام) پایتەختی جێهێشت و سەردەمێكی نوێ دەستی پێ كرد. (وەرگێر).

(١٢) شارەكانی تری كوردستانیش (سلێمانی، دهۆك) جگە لە (كەركوك) ... هەمان باری ئاسایی و پێشكەوتنی ئابووریان بەخۆوە دیوە. كە ئەم ڕەوشی سەقامگیری و بووژانەوەیە، بەم دواییە بوو بە هۆی پەناهێنانی زۆر لە خێزانە عەرەبەكان بۆ كوردستان. (وەرگێر).

(١٣) (سەلاحەدین) : تاكە هاوینەهەواری دانیشتوانی شاری هەولێرە كە لێیەوە نزیك بێ. ئەو هاوینەهەوارە سی چل ساڵ لەمەو پێش بەناوی (سەلاحەدینی ئەیوبی) كراوەتەوە، لەبەر ئەوەی نزیكە لە (دۆنی قەڵا) گوایە دەڵێن كە زێدی خانەوادەی ئەیوبیەكان بوو. پێشتریش پێی دەوترا (سەربەن)، بەڵام ئێستا بەناوی ئەو چیایەی كە لەسەری بنیات نراوە....، پێی دەوترێ (پیرمام). (وەرگێر).

(١٤) فرۆكەخانەی هەولێری نێودەوڵەتی :

١- لە سەردەمی ڕژێمی بەعس، لە هەشتاكانەوە بە بیانوی دامەزراندنی فرۆكەخانەیەكی سەربازی زۆر گەورە و فراوان لە (هەولێر) دا، ئەو گوندانەی كە لە دەوروبەری هەولێردا مابوون، وەك گوندەكانی ناوچەی بەرانەتی و شەمامك و سەنیە و مولكیەو پشتێ و بەرڕێ. ڕژێمی ڕەگەز پەرست دەیویست ئەوانیش خاپوور بكات، وەبوو گەلێ لەو گوندانەشی ویران كرد، بەڵام پێڕانەگەیشت ئەوانی تر چۆڵ بكات.

٢- لە هەولێردا لە ساڵانی چلەكانەوە، ڕێگای ئاسنی بۆ هات. كە هەموو ڕۆژێ لەناو هەر (٢٤) كاتژمێردا، شەمەندەفەرێك لە (هەولێر)ەوە دەچوو بۆ بەغدا و لەوێشەوە یەكی تر دەهات بۆ (هەولێر). بەڵام لە هەشتاكان ئەم ڕێگایە داخرا، تا وای لێ هات هێڵە ئاسنەكانیشیان هەڵگرت. (وەرگێر).

**سەرچاوەكان:**

١- سەرچاوەی بابەتە وەرگێردراوەكە (هەولێر - hewler). (wikipedia, der freien enzyklopodie).

٢- سەرچاوەی پەراوێزەكانی وەرگێر:

-lander lexicon ambros brucker , dr .peter gobel .. Etc.

Weltbild

Genehmigte liten zausgabe fur

Weltbild verlag gmbh. Augsburg 1989

Isbn 3-89350-211-4

-(unsere erde)

Realschule. Ausgabe 18

Brucker hausmann.

- (ماڵپەر)

**ئەڵمانیا / شاری ئاوگسبۆرگ**
**٢٠٠٧/١٠/٢٨**

# هەولێر لە سەرچاوە سریانییەکاندا

## «لێکۆڵینەوەیەکی شیکاریی رەخنەیی»

**دکتۆر فەرسەت مەرعی**
**زانکۆی دهۆک**

**پێشەکی:**

گرنگی سەرچاوە سریانییەکان دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی ماوەیەکی گرنگ لە مێژووی گەلی کورد پێش سەدەکانی (فەتح)ی ناوچە کوردییەکان لەلایەن ئیسلامەوە، تۆمار دەکەن، ئەمە جگە لە پێوەندیی کورد بەهەریەک لە دەوڵەتانی فارسی و ساسانی و بێزەنتییەوە، هەروەها رووداوەکان دەبەستنەوە بەگرێدانی کۆبوونەوە کەنیسەییەکان و، دروستکردنی ئەسقوفییە و کەنیسە و دێرەکانەوە لە ناوچە کوردییەکاندا، چونکە راستییەکەی ئەو ناوچەیە ناوچەی لەیەک جیاکردنەوەی ئیمارەتی روهایە (ئەدسا)[1] کە تیایدا لە کۆتایی سەدەی دووەمی زایینی مەسیحییەت بڵاو بووەوە، ئەمە لەلایەک، لەگەڵ دەوڵەتی فارسیش لەلایەکی ترەوە.[2].

راستییەکەی سەرچاوە سریانییەکان سەرچاوەی ئارامین، بەو پێیەی زمانی سریانی کە ئەو سەرچاوانەی پێ نووسراوەتەوە کە باس کران، یەکێکە لە زارەکانی ئارامی[3]. ئارامییەکانیش نەتەوەیەکی کۆنن لە نەتەوەکانی سامی کە لە دوورگەی عەرەبەوە کۆچیان کردووە و[4]، لە سەرچاوە مێژووییەکاندا لە سەدەی بیست و چوارەمی پێش زایینەوە لە سەردەمی پاشای ئەکەدی نرام سین (٢٢٦٠ - ٢٢٢٣ پ. ز)[5] باسیان کراوە، ئەگەرچی لێکۆڵیاران هەن پێیان وایە کۆچە مێژووییەکانیان لە دوورگەی عەرەبییەوە لە ماوەی نێوان هەردوو سەدەی چواردە و دوازدەی پێش زایین تێپەڕ ناکات[6].

زمانی ئارامی لە هەردوو سەدەی یەکەم و دووەمی زایینیدا بوو بە دوو بنەزمانی سەرەکی کە هەریەکەیان کۆمەڵێک زار لە خۆ دەگرن:

١- ئارامیی رۆژهەڵات: زارەکانی حەزەری (شاری بەناوبانگی حەزەر) و ئارامیی بابلی و ئارامیی روهایی (سریانییەکانی شاری روها) و زارەکانی سابیئی (مەندایی - زاری سابیئەی باشووری عێراق) و، زارەکانی ئاشووری (ئاشووری - زاری دانیشتوانی باکوری عێراق و باکوری رۆژئاوای ئێران و ناچەی هەکاری لە تورکیا لە خۆ دەگرێت)[7].

٢- ئارامیی رۆژئاوا: زارەکانی ئارامیی نەبەتی تەدموری (شاری بەناوبانگی تەدمور) و ئارامیی فەلەستینی و سووری و هی تر لە خۆ دەگرێت[8].

ئارامییەکان لە کۆتایی سەدەی سێزدەمدا توانییان چەند دەوڵەتۆکە و ئیمارەتێک لە ناوچەکانی فوراتی سەروو و ناوەڕاستدا دروست بکەن لەوانە: دەوڵەتی ئارام نەهرایم کە ناوی بەدەستەی ئارامیی نێوان دوو زێ هاتووە و، دەوڵەتۆکەی فدان (ئارام) کە ناوەندەکەی حەڕان بووە[9]، هەروەک لە تەوراتدا ناوی دەرکردووە بەوەی هەواری ئیبراهیم خەلیل (سڵاوی خوای لێ بێ) و ئەندامانی خێزانەکەی بووە لە ماوەی کۆچیان لە ئوری کلدانییەکانەوە لە رێگایاندا بەرەو وڵاتی کەنعانییەکان (فەلەستین)[10].

ئارامییەکان کاریگەرییەکی بەرفراوان و گەورەیان لەسەر مێژووی دێرینی رۆژهەڵاتی نزیک هەیە، لەرووی دانیشتوان و ژیار و زمانەوە و، تەنانەت ئارامی بووبوو بەزمانی نامە گۆڕینەوەی نێودەوڵەتی، وێڕای ئەوەی زۆربەی دانیشتوانی (هلال الخصیب) قسەیان پێ دەکرد، ئەمە جگە لەوەی زمانی مەسیح (سڵاوی

خـــــــــــــوای لـێ بـێ) و شوێنکەوتووەکانیەتی[11].

لە کــــۆتایی ســـەدەی دووەمی زایینیدا مەسیحییەت گەیشتە نێو وڵاتی ئارامییـەکـان لە روها کـە ئەمـــەش بووە هۆی ئەوەی ئەوانەی بروایان بە مەسیحییەت هێنا بوو نەفرەت لە ناوی کۆنی ئارامی بکەن کە لەلای جوولەکە مەسحییەکان هاوواتای بتپەرستییە و، وشەی سریانی لە جێگەی ئارامی بەکار بهێنن، ئەو ناوەی کە یۆنانییەکان کاتێ کە لە ساڵی ٣١٢ی پ. ز لە سەردەمی پاشا سلوقسی یەکەمدا (٣١١-٢٨١ پ. ز) وڵاتەکـــەیان داگیر کرد و ناوی ئارامییەکانیان بەباڵای شارە بتپەرستەکانی وەک حەران دابڕی[12].

ئیدی مەسیحییەت دەستی کرد بەپەلهاویشتن بۆ نێو هەرێمەکانی ئێران و لە نێویشیدا ناوچەی کورد لە کاتێکدا کە زەردەشتی[13] ئاینی رەسمی بوو لە دەوڵەتی ساسانیدا هەر لە سەردەمی دامەزرێنەرەکەی ئەردەشێری یەکەمەوە (٢٢٤-٢٤١ز) کـە بەگوێرەی گێڕانەوە فارسییەکان فەرمانی دا بەهەربەدان هربد تنسەر[14] دەقە جیاجیاکانی کتێبی پیرۆزی زەردەشتی (ئاڤێستا)ی ئەشکانی کۆ بکاتەوە و، یەک دەقی لێ بنووسێتەوە، ئەوە بوو مۆڵەت بەو دەقە درا و بەپیرۆز دانرا[15].

لەلایەکی دیکەوە گێڕانەوە مەسیحییە (سریانییەکان) سیمایەکی گرنگ دەبەخشن بەبڵاوبوونەوەی زووی مەسیحییەت لە ناوچەی حـــدیاب (ئەدیابین) Adiabaen[16] لە رێگەی ئەو کاری مژدەدەرییەی (مار ئەدی)[17] لە نێو هاووڵاتییانی دەوڵەتی ساسانی (لە کورد و سریان و هی تر) لە ناوچەی حزە (حدیاب) ئەنجامی دا، کە توانی پیاوێک بەناوی (فقیزا) لە نزیکەی ساڵی (٩٩ ز)دا بکا بە مەسیحی، کە لە بنەماڵەیەکی هەژار بوو لە هەولێر، کە لە دەست بنەماڵەکەی هەڵهاتبوو و پەنای بردبووە بەر (مار ئەدی) کە لە چیاکاندا لە میرنشینی حدیابدا ماوەی پێنج ساڵ بوو مژدەی ئینجیلی دەگەیاند. پاشان کردی بە قەشە و ساڵی (١٠٤ ز) رەوانەی هەولێری کردەوە. هەروەها مەتران ئەدی شێر باسی لیستی ناوی دە قەشە دەکات کە کورسیی قەشەییان لە شاری هەولێر لە ساڵی ١٠٤ تا (٣١٢ ز) وەرگرتووە[18].

## بڵاوبوونەوەی مەسیحییەت لە ئەربل (ئەربیل- هەولێر)

پاش هەڵکشانی مەسیح بەرەو ئاسمان مەسیحییەت بڵاو بووەوە و بڵاوبوونەوەکەش لە فەلەستینەوە بەرەو هەموو لایەکی گۆی زەوی دەستی پێ کرد. ئەوەی بەلای توێژینەوەکەی ئێمەوە گرنگە ئەوەیە کە پێشەنگەکانی مەسیحییەت بەگوێرەی رای کڵێسا و نووسەرانی، لە کۆتایی سەدەی یەکەم و دووەمی زایینی، گەیشتنە وڵاتی میزۆپۆتامیا و کوردستان و بانی ئێران و، بەگوێرەی رای رۆژهەڵاتناسان و زانا ئەوروپییەکانی پسپۆڕ لە (سریانیناسی)یش لە سەرەتای سەدەی سێیەم بووە.

بەپێی گێڕانەوەیەکی مەسیحی، مارئەدی یان ئەدای مژدەی مەسیحییەتی راگەیاندووە و توانیویەتی لە نزیکەی ساڵی (٩٩ ز)دا پیاوێک بەناوی فقیزاوە کە لە خێزانێکی هەژاری هەولێر بووە بکا بە مەسیحی. ئەم پیاوە خێزانەکەی خۆی جێ هێشتووە و پێوەندیی بە (مارئەدی)یەوە کردووە کە بۆ ماوەی پێنج ساڵ لە ئیمارەتی حدیاب (ئەدیابین)دا لە وڵاتی کوردان ئینجیلی بڵاو کردۆتەوە، پاشان ئەم پیاوەی کردووە بەقەشە و ساڵی ١٠٤ز رەوانەی هەولێری کردووە. مەتران ئەدی شێر (١) باسی لیستێکی دە کەسی کردووە کە قەشەن و لە ماوەی نێوان ساڵی ١٠٤ تا ٣١٢ ز کورسیی قەشەییان لە شاری هەولێر وەرگرتووە. ئەمەی خوارەوە زنجیرە و کاتی وەرگرتنی کورسیی قەشەییانە لە هەولێر:

بڕوانە خشتەی ژمارە (١)

هەر بەهەمان شێوە گێڕانەوە مەسیحییەکە دەڵێ (مارئەدی) و (مارماری)[3] یەکەمین دوو نێردراوی مژدەدەری مەسیحییەت بوون لە شاری کەرخ بێت سلوخ و ناوچەکانی دەوروبەری[4].

## مێژووی ئەربل دانراوی مشیحازخا لە نێوان راستی و ئەفسانەدا

ئەدی شێر لە گێڕانەوەکانیدا پشت بەمێژووی ئەربیلی مشیحازخا دەبەستێت. ئەم مێژووەش بۆ یەکەمین جار لە ساڵی ١٩٠٧دا لەسەر دەستی ئەلفۆنس منکنا[5] بەناونیشانی

| زنجیرە | ناو | ماوە و کاتی وەرگرتنی قەشەییان |
|---|---|---|
| ١ | بقیدا | ١٠ ساڵ (١٠٤-١١٤ز) |
| ٢ | شەمشون | ٣ ساڵ (١٢٠-١٢٣ز) |
| ٣ | ئیسحاق | ١٣ ساڵ (١٢٣-١٣٦ز) |
| ٤ | ئەبراهام | ١٥ ساڵ (١٥٠-١٦٥ز) |
| ٥ | نوح | ١٦ ساڵ (١٦٥-١٨١ز) |
| ٦ | هابیل | ٧ ساڵ (١٨٤-١٩١ز) |
| ٧ | عبیدمشیحا | ٢٥ ساڵ (١٩١-٢١٦ز) |
| ٨ | حەیران | ٢٣ ساڵ (٢١٦-٢٤٩ز) |
| ٩ | شحلوبا | ١٥ ساڵ (٢٤٩-٢٥٤ز) |
| ١٠ | نحادابوی | ١٨ ساڵ (٢٥٤-٢٧٢ز) [٢] |

**خشتەی ژمارە (١)**

مێژووی ئەربیل choroniquid Arbele بڵاو بووەوە، کە هەوڵیدا ناوی مشیحازخا وەک دانەری کتێبەکە لە خۆی بنێت. بەپێی قسەی مێژوونووسی سریانی عەبد یەشوع سۆبادی لە پێرستەکەیدا، مشیحازخا مێژوویەکی کڵێسەیی دروستی هەیە[٦]. ئەم کتێبە هەڵلایەکی گەورەی نایەوە لە ناوەندەکانی توێژەران و بایەخداران بەدەستنووس و سەرچاوە سریانییەکاندا، بەشێوەیەک ئەدوارد ساخاو Edward Sachav بەسەرچاوەیەکی گرنگی زانینی لاپەڕە نادیارەکانی مێژووی مەسیحییەت بەگشتی و کڵێسای ڕۆژهەڵاتی بەتایبەتی، داناوە و، لە ساڵی ١٩١٥دا وەریگێڕاوەتە سەر زمانی ئەڵمانی، کەچی فرانس زۆریل وەریگێڕاوەتە سەر لاتینی و، مەتران پوترس عەزیز وەریگێڕاوەتە سەر زمانی عەرەبی و لە گۆڤاری (النجم)دا، کە لە مووسڵ بەسەرپەرشتیی مەتران سولێمان ئەلسائیغ لە ساڵانی ١٩٢٩-١٩٣١ دەردەچوو، بڵاوی کردۆتەوە(٧).

بەڵام باوە پۆل پیترس گومان و نارەزاییەکانی خۆی سەبارەت بە بەهای مێژوویی دەقەکە و لاوازییەکەی خستۆتە ڕوو[٨] و، لەمەدا ئۆرتیزدی ئۆربینای یەسوعی پشتگیریی دەکا، کە لە منکنا و ئەو دەقەش کە بڵاوی کردۆتەوە نارازییە، کەچی مسینا کە یەسوعییەکی ترە بەرگریی لە منکنا کردووە[٩] و، بۆ دەرچوون لەم تەنگوچەڵەمەیەش زانای دەستنووسناس ئیسفالج دەستخەتی نێو دەستنووسەکەی تاقی کردۆتەوە، کە بابەتی توێژینەوەکەیە و، گەیشتۆتە ئەو ئەنجامەی کە دەستنووسەکە تازەیە. پاشان مێژوونووسی بەناوبانگی دۆمنیکی جان مۆریس فییە بابەتی توێژینەوەکەی یەکلا کردۆتەوە لە توێژینەوەیەکدا کە ساڵی ١٩٦٧ بڵاوی کردۆتەوەو بەرەنجامەکەی ئەمەیە: «ناکرێ پشت بەم دەقە ببەسترێ وەک سەرچاوەیەکی مێژوویی، چونکە ئێمە ناتوانین برگە ڕەسەن و دەسکاریکراوەکان بەبێ ساخکردنەوەیان لەبەر ڕۆشنایی سەرچاوەیەکی دیکە ساخ بکەینەوە، بۆیە وا باشترە دەستی لێ بەر بدرێ وەک ئەوەی هەر نییە»[١٠].

دەبێ ئاماژە بەوە بکرێ ئەو ڕەخنەگرانەی نارەزاییان هەیە لەسەر دەقە بڵاوکراوەکەی مێژووی مشیحازخا گەیشتوونەتە ئەوەی کە دەستنووسە ڕەسەنەکە کە منکنا ساڵی ١٩٢٧ بەبڕی ٣٥٠٠ فرەنک فرۆشتویەتییە کتێبخانەی بەرلین (و بە ژمارەی ٣١٢٦ تۆمار کراوە) کۆن نییە، بەڵکو تازەیە و قەشە ئۆراها شکوانا ئەلقۆشی (١٨٥١-١٩٣١) نووسیویەتی و هەوڵی داوە ساختەکاریی لەگەڵدا بکا بەوەی خستوویەتییە نێو تەنورێکی پڕ لە دووکەڵ، ئەمەش بپێی ئەو ئەنجامەی شارەزای دەستنووسەکان ئیسفالج پێی گەیشتووە. هەروەها قەشە ئۆراها شکوانا لای دۆستێکی خۆی دانی بەوەدا ناوە کە منکنا ئەو ڕێگایەی فێر کردووە کە چۆن وا بکات دەستنووسێک بە کۆنە نیشان بدات[١١].

بەپێی ئەو وردەکارییانەی کە مێژوونووسی کڵێسایی دۆمنیکی (فییە Fiey) کۆی کردۆتەوە هیچ کەسێک دەستنووسی کۆنی (ئیقرور)ی نەدۆزیوەتەوە کە منکنا

بانگەشەی ئەوەی دەکرد کە دەستی کەوتووە[١٢]. لێرەدا لێکۆڵیاری عێراقی یوسف حەبی دەپرسێت داخۆ بۆچی قەشە منکنا پەنای بردۆتە بەر ئەم تەڵەکەیە: پرۆسەی هەڵبەستن و دەسکاریکردنی دەقە رەسەنەکە؟ لە وەڵامەکەیدا جەخت لەسەر ئەوە دەکات کە رەخنەگران گەیشتوونەتە ئەوەی کە ئامانجی منکنا پارە نەبووە، بەقەد ئەوەی بەجێهێنانی بانگەشەکانی سریانچییە تازەکانە (مەبەستی رۆژهەڵاتناسەکانە)[١٣]، کە ئەو ئەفسانە و حیکایەتانەی سریانییەکانیان پووچەڵ کردەوە کە جەخت لەسەر بڵاوبوونەوەی زووی مەسیحییەت لە وڵاتی میزۆپۆتامیا و ئێران لەسەر دەستی نێردراوان و شاگردەکانیان دەکەن و، ئەو کارانەی دراونەتە پاڵ تۆما و مارئەدی و ماری هەر بەچیرۆک و حیکایەت لە قەڵەم دەدەن، نەک شایەتحاڵێکی مێژوویی.

بەڵام گەلێک لە لێکۆڵیاران و مێژووناسانی کورد پشتیان بەم سەرچاوە ساختەیە (مێژووی ئەربلی مشیحازخا) بەستووە بۆ نووسینەوەی مێژووی کورد و بەیەکەوە بەستنەوەی ئەڵقە ونەکانی ئەم مێژووە، لەوانەش د. جەمال رەشید لە گەلێ دانراویدا وای کردووە، هەر بۆنموونە لە (دراسات كردية في بلاد سوبارتو) و (تأريخ الكرد القديم) بەهاوبەشی لەگەڵ د. فەوزی رەشید، (ظهور الكرد في التأريخ). هەروەها مامۆستا عەبدولمونمین دەشتی کتێبی (مێژووی ئەربیل)ی لە ژێر ناونیشانی (کرۆنۆلۆژیای ئەربێلا) وە لە دانانی رۆژهەڵاتناسی ئەڵمانی ئیدوارد زاخاو وەرگێڕاوەتە سەر زمانی کوردی- زاری کرمانجی خواروو، وەک ئەوەی بەم کارانە خزمەتێکی گەورەی مێژووی کوردیان کردبێت وەک پرکردنەوەی کەلێنێکی بەرینی ئەم مێژووە، جگە لەوەی بانگەشەی زوو بڵاوبوونەوەی مەسیحییەتییان لە وڵاتی کوردان کردووە، وەک بڵێی ئاگاداری ئەوە نین کە پسپۆڕانی سریانییات چییان لەم بارەیەوە نووسیوە، بۆیە نووسینەکانیان ناتەواوە و بەدەرە لە میتۆدی زانستی کە راستییەکان دەخاتە ڕوو.

بۆ بەیەکەوە گونجاندنی ئەم بیروڕا ناکۆکانەی نێوان نووسەرانی کڵێسا و نێوان رۆژهەڵاتناسان، پێ دەچێ مەسیحییەت لە شاری روهاوە شۆڕ بووبێتەوە بۆ نێو وڵاتی میزۆپۆتامیا، کە پێشەنگەکەی گەیشتۆتە هەرێمی حدیاب (ئەدیابین) و بێت کرمای و پاشان گەیشتۆتە پشت شاخەکانی کوردستان (زاگرۆس) و، بەتێپەڕبوونی رۆژگار زۆر لە خەڵکی ئەم ناوچانە بوونەتە مەسیحی و کۆمەڵ و هەواری بچووکی مەسیحی دروستبوون لە کۆتایی دەوڵەتی برتی (ئەشکانی) و سەرەتای دەرکەوتنی دەوڵەتی ساسانی شتێکی ئەوتۆ نەبوون. رۆژهەڵاتناسی ئەڵمانی ئارسەر کریستنسن جەخت لەسەر ئەم لایەنە دەکاتەوە و دەڵێ: «ئەفسانە، سانت تۆما (مارتوما) لە پارثیا دەکا بە مژدەدەر و لە کارە هەڵبەستراوەکانی تۆماسدا دەبینین پەیامەکەی گەیاندۆتە هیندستان، بەڵام ئەم کارانەی لە ڕووی مێژوویەوە راست نین»[١٥] کاتێکیش باس لە گوایا رۆڵی سیاسیی مەسیحییەکان لە دەوڵەتی پارسیدا دەکا دەبینین دەڵێت: «مەسیحییەکان لە رۆژگاری ئەشکانییەکاندا هیچ رۆڵێکی سیاسییان نەبووە و... پلەی جاثلیق لە سەردەمی ئەشکانییەکاندا بوونی نەبووە»[١٦]، لە کاتێکدا مەتران ئەدی شێر ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە نێردراو ماری دەستی کردووە بە « گەڕان لە نێو وڵاتی حدیاب و کەرکوکدا... تا لە ساڵی ٨٢ ز دا لە مەداین مردووە». ناوبراو سی و سێ ساڵ لە رۆژهەڵاتدا ژیاوە و لەوێ کورسیی فترکیی لە مەداین (مەدائن- سەلمان پاک) دامەزراندووە و بۆتە یەکەمین قەشەی دانیشتوو لەسەر (کورسیی فترکی)[١٧].

## پایەی ئەبرشییەی حدیاب (ئەربل - ئەربیل) لە کڵێسای رۆژهەڵاتدا

پاش ئەوەی بەڕێوەبردنی هەرێمی حدیاب و پێکهاتە کڵێساییەکانی رێک خران، هەرێمەکە درێژ بووەوە تا گەیشتە باکوری ئازەربایجان و نەینەواش، ئیدی سنوورەکەی لە رووی کڵێساییەوە گەیشتە زێی بچووک تا زێی خازر، لە سنووری هەرێمی وان و دەوروبەری شاری ورمێوە تا زێی دجلە[١٨].

لە ساڵی (٣١٠ز) جاثلیق (بەتریارک) فافا کورسیی حدیابی بۆ پایەی مەترافۆلیتی بەرز کردەوە، کە ١٩ کورسیی لە ژێر دەسەڵاتدا بووە، کە ئەمانەن:

بڕوانە خشتەی ژمارە (٢)

## دۆخی مەسیحییەکانی کوردستان

مەسیحییەکانی ئێران و وڵاتی میزۆپۆتامیا و کوردستان بەئاشتی دەژیان تا ژمارەیان کەم بوو، بەڵام هەڵویستەکە لەسەرەتای سەدەی چوارەمی پێش زایین گۆڕا کاتێک کە ئیمپراتۆری رۆمانی قوستەنتین Costantin مەرسومی بەناوبانگی میلانی لە ساڵی (٣١٣) دا دەرکرد و دانی نا بەمەسیحییەت وەک ئەو ئاینانەی کە رێگەی پێ دراوە لە نێو ئیمپراتۆریەتی رۆمانیدا خەڵک هەڵگری بن[٢٠] چونکە مەسیحییەکانی نێو ئیمپراتۆریەتی ساسانیی فارسی دەبوو بەرگەی ئەم کارە بگرن لەبەرئەوەی دەوڵەتی ساسانی وەک بەکرێگیراو (تابووری پێنجەم)ی دەوڵەتی رۆمانی سەیری دەکردن [٢١]. ئەوەی ئەم گرفتەی گەورەتر کرد ئەوە بوو ئەرمینیا ،کە دەوڵەتێکی سنووری بوو، لە نێوان فارس و بێزەنتەدا بوو بەمەسیحی پاش ئەوەی پاشا تیریداتی سێیەم Tradt III لە ساڵی (٣٠١)یان (٣١٤ز) دا ڕاگەیاند کە ئەرمینیا بەرەسمی بوو بەمەسیحی[٢٢]، ئەوەی ئەم قسەیەش پشتڕاست دەکاتەوە ئەو نامەیەی شای فارسی شاپووری دووەمە (٣٠٩ - ٣٧٩ز) کە بۆ میرەکانی ئەرمەنی ناردووە و دەڵێ: "کاتێ کە بەم فەرمانەی ئێمەی خواوەندەکانی تر دەزانن کە لەو سندووقەدایە کە بۆتانمان نارد، ئەوا لەسەر تانە سیمۆن سەرۆکی نزارییەکان بگرن و ئازادی نەکەن تا ژمارە لەو بەڵگەنامەیە نەدات و رازی نەبێت دوو ئەوەندە جەزا و غەرامە

| کورسیی قەشەیی | ناوچەی جوگرافی |
|---|---|
| حبتون | دەکەوێتە رۆخی زێی گەورە (ناوچەی عەشیرەتی سورچی) |
| بیت بغاش | باکوری حبتون. ناوچەی مێرگەسور |
| برحبس | نەناسراوە |
| دبرنیوس | رەنگە گۆڕینی ناوی دیبۆر بێت کە دەکەوێتە لای سەرچاوەی زێی بچووک لە باشووری رۆژهەڵاتی رەواندوز |
| دبرغسان | رەنگە بەنانیس بێت ناوی ناوچەی دەرەوەی سالاخ (ناوچەی سیدەکان) |
| رامونین | نەناسراوە |
| بیت مهقرت | نەناسراوە |
| نەینەوا | ئەو کاتە گوندێکی بچووک بووە (نەبی یونس) |
| حدثا | دەکەوێتە کەناری خۆرئاوای زێی دجلە لە باشووری مووسڵ (حەمام علیل) |
| تیمنا | دەکەوێتە ناوچەی جزیرە لە نێوان سنجار و قەڵای شەرگات |
| بیت نوهدرا | قەزای زاخۆ و قەزای سمێل دەگرێتەوە |
| مالتا (معلثا- معلتا) | یەکێکە لە کەنارە رۆژئاواییەکانی دهۆک |
| حانیثا | دەکەوێتە باشووری قەندیل لەسەر کەناری رۆژهەڵاتی زێی گەورە |
| داسان | ئەو ناوچەیەی دەکەوێتە نێوان چیای گارە و سنووری عێراق - تورکیا (ناوچەی قەزای ئامێدی) |
| مرکا | ناوچەی مێرگی مووسڵ کە قەزای ئاکرێ و چەند ناوچەیەکی شێخان دەگرێتەوە |
| سالاخی ئاومەوە | باکووری مرکا (قەزای شەقلاوە) |
| پشتدر | شارۆچکەیەکی شاخاوییە لە نێوان رەواندزو کۆیسنجق |
| عەین سفنا | عەین سفنی (ئاوەندی قەزای شێخان) |
| ئازەربایجان | گرنگترین شارەکانی بریتین لە ورمێ، شنۆ، مەراغە و کەنزەك |

**خشتەی ژمارە (٢)**

نەدات و لە جیاتی هەموو نزارییەکان کە لە وڵاتی قەداسەتمان دەژین و لە خاکمان نیشتەجێن پشتگیریمان نەکات، چونکە ئێمەی خواوەندانی تر جگە لە هیلاکییەکانی جەنگ هیچی تر بەشمان نییە و ئەوانیش هیچیان نییە جگە لە ئاسوودەیی و خۆشی! ئەوان لە وڵاتەکەماندا نیشتەجێن و هەمان هەستی قەیسەری دوژمنمانیشیان هەیە[٢٣] ".

بەتێپەڕبوونی رۆژگار دانیشتوانی مەسیحی لە ناوچەکەدا زیادی کرد و بوون بەچەند کۆمەڵێکی دیاریکراوی نێو ئیمپراتۆریەتی ساسانی و، پەتای ناکۆکیی لاهوتی، کە لە نێو کڵێسا مەسیحییەکاندا هەبوو، گەیشتە ئەو کڵێسانەش، ئیدی مەزهەبی منوفستی بوو بەرکابەری نەستووریی باوی نێو خاکی ئیمپراتۆریەتی ساسانی.

ئەم رووداوانە بوون بە پێشەکیی یەکەمین چەوسانەوە کە لە مەسیحییەکان بەگشتی و کوردە مەسیحییەکان بەتایبەتی کرا، بەتایبەت لە ساڵی (٣٣٩ز)دوە تا مردنی پاشا شاپووری دووەم لە ساڵی (٣٧٩ز)دا، کە سەرچاوە سریانییەکان بە (چەوساندنەوەی چلە) ناوی دەبەن، ئەویش لەبەر زۆری و توندیی چەوساندنەوەکە و ئەو ماوەیەی خایاندوویەتی. باوە دکتۆر ئەلبیر ئەبونا ئاماژە بەم لایەنە دەکا و دەڵێ: "خامە پەکی دەکەوێ لە بەرامبەر ئەو ئازاردی

مەسیحییەكان چەشتوویانە لەو ماوە پڕ زەحمەت و قوربانییە گەورانەی داویانە لە پێناوی ئیمانیاندا. زۆریان مێژوو ناوی نەبردوون، زۆری دیكەش مێژوو تەنیا چمكێكی كەمی زانیاریی لەبارەیانەوە بۆ ڕاگواستووین".

ڕۆژهەڵاتناسێكی ئەڵمانی كە مامۆستایە لە زانكۆی كۆپنهاگنی دانمارك، جەخت لەسەر چەوسانەوەی سەر مەسیحییە كوردەكان دەكاتەوە و دەڵێ: " چەوسانەوە بەتایبەت لە هەرێمەكانی باكور و ڕۆژهەڵات و ناوچەكانی هاوسنووری ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانیا (كە مەبەست كوردستانی توركیایە) هەبووە. لەوێ كوشت و بڕ و دەربەدەركردن هەبووە. لە ساڵی (٣٦٢ ز)دا نۆ هەزار مەسیحی لەگەڵ قەشە هیلیۆدۆر لە قەڵای (فنك)ەوە[٢٤] دوە لە (بزابدە)ەوە بۆ (خوارەزم)[٢٥]، پاش شۆڕشێك دوور خرانەوە" [٢٦]

لەلایەكی دیكەوە سەرچاوە سریانییەكان باس لە گەلێ مەسیحیی كورد و غەیرە كورد دەكەن، لەوانەی لە ڕۆژگاری حوكمڕانیی فارسدا چەوساونەتەوە و، هەندێكیان ناوە كوردییەكانی خۆیان پاراستووە، سەرەڕای وەرگرتنی پۆستی باڵا لە پلەبەندی كاهینیی مەسیحیدا وەك جاثلیق[٢٧] شاهدۆست[٢٨] كە دیارە ناوە كوردییەكەی خۆی كە مانای دۆستی شایە پاراستووە. ناوبراو بە جاثلیق هەڵبژێردراوە، بەڵام كە ئاشكرا بوو فارسەكان لەگەڵ سەد و بیست و هەشت قەشە و ڕەبەندا گرتیانن و پێنج مانگ بەندیان كردن و لەو ماوەیەدا بەتوندترین جۆر ئازاریان دان، پاش ئەوەی وازیان لە باوەڕەكەیان نەهێنا، (مزربان )ی مەدائین) سەد و بیست كەسیانی كوشت و جاثلیق شاهدۆست و ئەوانی لەگەڵیدا مابوون، ڕەوانەی لای پاشا شاپووری دووەمی كردن. شاپوور بەنەرمی قسەی لەگەڵ كرد تا بیكا بەزەردەشتی، كە خۆی و هاوڕێیانی ڕەتیان كردەوە ببن بەزەردەشتی، لە ڕۆژی (٢٠)ی مانگی شوباتی ساڵی (٣٤٢ ز)دا كوژران[٢٩]. لە ساڵانی بەرایی فەرمانڕەوایی پاشای فارسی بەهرامی پێنجەمدا (٤٢٠ ز – ٤٣٨ز )دا میر شاپوور و فەیروز و یەعقوبی نووسەر[٣٠]، كوژران، بەڵام ئاثنیالی شارەزووری لە نوسەیبین دەیخوێند و گرنگیی بەلێكدانەوەی (تەفسیر) دا. ناوبراو لەلایەن پاشا كیسرای دووەمەوە (٥٩٠ – ٦٢٨ ز) شەش ساڵ پێش (٦٢٨ ز) بەند كرا، پاشان كوشتی،چونكە ئەو گرووپەی لە ژێر فەرمانیدا بوون سەركردەیەكی فارسیان بەبیانووی تێكدانی كڵێسایەكەوە، لە شارەكە دەركردبوو.[٣١] پێشتر پاشای فارسی شاپووری دووەم، فەرمانی كردبوو بە لەسێدارەدانی كاهین مار ئیشالا نوهەدری لە میرنشینیی (حدیاب)دا لە ساڵی (٣٥٨)ی ز پاش سووربوون لەسەر باوەڕەكەی خۆی، پاشان بۆ ڕێزلێنانی وەك نەمرێك لە ناوچەی نوهەدرای دهۆكدا دێرێك دروست كرا كە ئێستاش ماوە[٣٢].

نرسای ملفان پێش هەموو وتارێكی نووسی سەبارەت بەچەوسانەوەی كوردە مەسیحییەكان و هی تر لەسەر دەستی فارسە ساسانییەكان لە سەردەمی پاشا شاپووری دووەمدا، كە فەرمانڕەواییەكەی حەفتا ساڵی خایاند و تیایدا هەوڵی دا لە ناوچەی پاشانشینییەكەی خۆیدا ڕەگی مەسیحییەت دەربێنێ، كە ببوون بەمەترسییەكی گەورە بەسەر ئاگرپەرستیی زەردەشتییەوە. نرسای، سروودێكی كردووە بەپاشكۆی ئەو وتارە، كە گفتوگۆیەكە لە نێوان پاشا شاپووری دووەم و شەهیدە مەسیحییەكاندا[٣٣].

### ململانێی زەردەشتی مەسیحی و ڕەنگدانەوەی لەسەر بارودۆخ لە ناوچە كوردییەكاندا

گەلێ لە نووسەرانی ئەم سەردەمە ئاماژە بۆ ئەوە دەكەن كە زەردەشتی ئایینی ڕەسمیی هەرسێ ئیمپراتۆریەتی ئەخمینی و پارثی (ئەشكانی) و ساسانی بووە، كەچی مێژوونووسی ئێرانی حەسەن بیرنیاو مێژوونووسی ئەڵمانی كریستنسن ئاماژەیان بۆ ئەم لایەنە كردووە و دەڵێن ساسانییەكان زەردەشتییان كردووە بە ئایینی ڕەسمیی ئێران، كە ئەو كاتە ئایینی ڕەسمی نەبووە و گەلانی سەر بەئێران ئازاد بوون لەوەی هەر گەلێك چ ئاینێك هەڵدەبژێرێ[٣٤].

لەو كاتەوە كە ئەردەشێری یەكەم (٢٢٤-٢٤١) چووە سەر تەختی دەوڵەت فەرمانی بەهەربدان هربد تنسر كرد كە دەقە پەرش و بڵاوەكانی ئاڤێستای ئەشكانی كۆبكاتەوە، ئەگەرچی پێشتر پاشای ئەشكانی

ولگاشی یەکەم (٥١ -٧٨ ز)[٣٥] کۆی کردبوونەوە، بەڵام ئەو فەرمانی کرد یەک دەقیان لێ بنووسرێتەوە، پاشان ئەم دەقە رێگەی پێدرا و بەکتێبی پیرۆز دانرا[٣٦]. مەسەلەکە هەرچییەک بێت، ئەوا پاشاکانی ساسانی لە سەرەتادا گرنگییان بە ئایینی مەسیحی نەدا کە وردە وردە خۆی خزاندبووە نێو هەرێمەکانی ئێران، وەک پێشتریش باسمان کرد، بەڵام هەرکە پاشا شاپووری دووەم (٣٠٩- ٣٧٩ ز) داوای لە دەوڵەتی رۆمانی کرد ئەم هەرێمانە وەربگرێتەوە کە دەوڵەتی ساسانی لە سەردەمی (نرسی) پاشایدا (٢٩٣-٣٠٢ ز) خرابووە سەر ئەوان[٣٧]، شەڕ هەڵگیرسا و سیاسەتەکەی بەرامبەر هاووڵاتیانی خۆی، ئەوانەی مەسیحی بوون، گۆڕا و هەڵمەتی چەوساندنەوەکان، وەک روونمان کردەوە، دەستیان پێ کرد و، مەسیحییەکان بەردەوام بوون لەسەر بەرگری لەبەر ئیمانی بەهێزیان و دڵێرییان بۆ داکۆکیکردن لە باوەڕەکەیان و ملکەچنەکردنیان بۆ پەرستیارانی خۆر و ئاگر، ئەگەرچی ملکەچکردن دەبووە هۆی دەربازکردنیان لە ئازار و مردن. بارودۆخەکە بەم شێوەیە گوزەرا تا پاشای ساسانی یەزگوردی یەکەم (٣٩٩- ٤٢٠ ز) هات، کە بەشێوەیەکی جوامێرانە هەڵسوکەوتی لەگەڵ مەسیحییەکان کرد، بۆیە لەلای پیاوانی ئایینیی مەسیحی بەگوناهبار ناوی دەرکرد. ئەوە بوو لە سەردەمی ئەودا چەندین کڵێسا دروست کران و بنەماڵەیەکی زۆر بوون بەمەسیحی[٣٨]، بەڵام گرفتەکانی پێشوو هێشتا بەرەو رووی مەسیحییەکان دەبوونەوە، بەڵام پاش ئەوە پەلاماردانی پیاوانی مەسیحی پتر بووە، کریستنس ئەمە دەخاتە ئەستۆی مەسیحییەکان و دەڵێ: " ئەوان (واتە مەسیحییەکان) شێتگیربوون و تەحەدای رای گشتییان کرد، تەنانەت چار نەبوو ئەو شەڕنگێزییە بەهەمان چەشن وەڵام دەدرایەوە. لە شاری (هرمزد - ئەردەشێر)ی خوزستان (عەرەبستانی ئێستا)دا قەشەیەک کە ناوی (هاشو) بوو جورئەتی دایە خۆی و بەرووخسەت وەرگرتنی ئاشکرا یان بە دزی لە (ئەسقوف) عەبدا ئاتەشکەدەیەک، کە لە نزیک کڵێسایەکی مەسیحی بوو، برووخێنێ. قەشە و ئەسقوفەکە و هی تریش گیران و هەموویان رەوانەی مەدائین کران. پاشا خۆی لە(عەبدا)ی پرسی، رەتی کردەوە کە هیچ پێوەندییەکی بەکەتنەکەوە هەبێت، بەڵام (هاشو) دانی نا بەوەی کە ئەو ئاتەشکەدەکەی رووخاندووە، بەڵام لەگەڵ ئەم دان پێدانانەدا هەندێ قسەی دوژمنانەی دژ بەئایینی زەردەشتی بەکار هێنا، ئەو کاتە پاشا فەرمانی بە (عەبدا) کرد پەستگاکە دروست بکاتەوە، بەڵام ئەو بەتوندی فەرمانەکەی رەت کردەوە، بۆیە حوکم کرا و کوژرا، مێژوونووسی ئایینی تێۆدۆرت ئاماژەی بەرەوشتی ئەو ئەسقوفە کردووە کە سوور بووە لەسەر پلانەکەی خۆی، ئەگەرچی رووخاندنی پەستگاکەی بەکارێکی دوور لە دانایی داناوە "[٣٩].

تەواوی ئەو ململانێ فیکرییەی لە نێوان زەردەشتی و مەسیحییەتدا هەبوو بەرژەوەندییەکانی چینی فەرمانڕەوای ساسانی لەپشتییەوە بوون، ئەو چینەی کە چینێکی تر لە پیاوانی ئایینیی زەردەشتی لە موبدو موغان و هەربەزەکان پشتگیرییان لێ دەکردن، کە رێنماییەکانی ئایینی مەسیحی و ئایینەکانی تر و مەزهەبە بەرهەڵستکارەکانی وەک مانیزم و مەزدەکییان وەک رێگایەکی دەربازبوون لە دەسەڵاتدارێتیی چینە فەرمانڕەواکان و ستەمیان، دەدیت، بۆیە بەلایانەوە نەنگی نەبوو ئەگەر هەردوولایان (دەوڵەت و ئایین) هاوکاریی یەکتر بکەن دژی بەرهەڵستکاران، بەتایبەت کە ئەوان ( بەقسەی ئەردەشێر)ی دامەزرێنەری دەوڵەت، جمکن[٤٠]، بەڵام حوکمی رۆژگار و پەرەسەندن وەک مۆرانە لە زەردەشتی داو تێن و تاوی کەم کردەوە، کە ئەمەش بە ئاشکرا لە سەردەمی پاشا کیسرا ئەنۆشیروان (٥٣١-٥٧٩ز)دا دەرکەوت، کە لە سەرەتای فەرمانڕەواییەکەیدا زۆر دەمارگیر بوو بۆ زەردەشتی[٤١] بەڵام یەکێک بوو لە هاندەرەکانی مونازەرەی فیکری و ئایینی لە نێوان پیاوانی ئایینیی زەردەشتی و ئەسقوفە مەسیحییەکاندا. هەروەها لەلایەکی دیکەشەوە هاندەری پێشکەوتنی زانست و فەلسەفە بوو، تا کار گەیشتە لەقبوونی پێگەی زەردەشتی و، تەنانەت هەندێ لەپیاوە مەزنەکانی زەردەشتی، وەک موبدان موبد بزر جمهر، لێی هەڵگەڕانەوە. ئەوانەی وازیان لە

زەردەشتی هێنا تووشی ئاژاوە و دڵەڕاوکێ بوون کە بووە هۆی ئەوەی ڕێگایەکی ڕەشبینانە لە تێڕوانینیان بۆ ژیان و واقیع بگرنە بەر، ئەمەش بەروونی لە حاڵەتی فەیلەسووفی ئێرانی و پیاوی ئایینیی زەردەشتی (یەزوریێ)دا لەو دێرانەیدا دەردەکەوێ کە لەبارەی باری ئایینی زەردەشتی و ئەو پێگەیەی لە دەروونی ئەو بیرمەندانەدا گرتوویەتی: "کە ئەمە چووە دەروونمەوە ئایینەکەم لێ شێوا. کەچی شتێکم لە کتێبەکانی پزیشکیدا نەبینی کە ڕێگەم نیشان بدەن لەبارەی ئایینەکانەوە ڕێگام بۆ ڕاست بکەنەوە و بمخەنەوە سەر ڕێگای ڕاست.. بەڵام نەتەوەکان زۆرن کە سێ جۆرن، جۆرێکی نەتەوە ئایینیان لە باپیرانەوە بۆ بەجێ ماوە. جۆرێکی تر ناچار کراون بچنە سەر ئەو ئایینە و، جۆرەکەی تریش دەکەونە دوای دنیاوە. هەمووشیان خۆیان بەڕاست و دەستپێکەری ئایین و کۆتاییەکەی دادەنێن. جگە لەمەش هیچی تر نییە؟"[٤٢].

یەکێک لە ئاماژەکانی لاوازبوونی زەردەشتی لە کۆتایی ڕۆژانی دەوڵەتی ساسانی بڵاوبوونەوەی مەسیحییەت بوو لە ئێران و بووژاندنەوەی کڵێساکانی و ئەسقوفەکانی، تا گەیشتە ئەوەی پاشای فارس کیسرای دووەم ئەپەرویز (٥٩٠-٦٢٨ز) بە پاشای مەسیحی ناوی دەرکرد بەهۆی هاندانیان و بەتەواوی ئازادی پێ بەخشینیان[٤٣].

خەریک بوو مەسیحییەت لە سەردەمی پاشا کیسرا ئەپەرویزدا لە ئێران لە هەموو کاتێکی تر زیاتر سەربکەوێت. لەو سەردەمەدا ژمارەیەکی زۆر لە خزمەکانی پاشا، کە ئێرانیی پوخت بوون، بوونە مەسیحی. هەروەها کیسرا ئەپەرویز ناچار بوو پەنا بباتە بەر دوژمنە بەهێزەکەی، کە پاشای بێزەنتی مۆریکیوس بوو، ئەمەش دوای ئەوەی سەرکردەی بەناوبانگی ساسانی بەهرام چوبین کودەتای بەسەردا کرد. بەڵام پاشای بێزەنتی مۆریکیۆس توانیویەتی کیسرا ئەپەرویز بگێڕێتەوە سەر تەختەی، بۆیە دەڵێن مەیلی بەلای مەسیحیەتدا شکایەوە پاش ئەوەی چووە قوستەنتینیەی پایتەخت.

بەهەرحاڵ موبدەکان بەگەرانەوەی کیسرا خۆشحاڵ نەبوون، پاش ئەوەی شازادەی بێزەنتی خاتوو ماریای مارە کرد و عاشقی خاتوو شیرین بووبوو کە مەسیحییەکی یەعقوبی بوو و، پاشان بوو بەپاشای تەختی وڵات. بەڵام کیسرا ئەپەرویز تەدارەکی توندی گرتە بەر دژ بە مەسیحییەت، پاش ئەو سەرکەوتنانەی کەپاشای بێزەنتی هەرقل (٦١٠-٦٤١ز) بەدەستی هێنا و توانی پەرستگای ئاتەشکەدەی (ئازەرکشناسب) بگرێ و بیسووتێنێ و ئاگرەکەی کوێر بکاتەوە، ئەمەش وەک تۆڵەسەندنەوەیەک بەرامبەر بەوەی کە کیسرا ئەپەرویز خاچی پیرۆزی لە ماڵی پیرۆزدا لە ساڵی (٦١٤ز) دەرهێنا و ڕەوانەی پایتەختی کرد بۆ لای تەیسەفۆن[٤٥]. بەهەرحاڵ یەکێک لە مێژوونووسەکان دەگاتە ئەوەی کە بتوانین بڵێین ئەگەر ئیسلام نەگەیشتبایە ئێران ئەوا مەسیحییەت هەموو لایەکی ئەو وڵاتەی دەگرتەوە، بەڵام زەردەشتی لەسەر دەستی مەسیحییەتدا تێک شکا.

هەروەها هەردوو ئایینی مانیزم و مەزدەکی،کە لە ناوەڕاستی ئێراندا پەیدابوون، بەدوو دوژمنی سەرسەختی ئایینی زەردەشت دادەنران، هەر ئەوەش بوو وای کردبوو زەردەشتییەکان لە دڵەوە ڕقێکی ئەستووریان لە ئایینی زەردەشتی بێت، بۆیەش زەردەشتییەکان دووژمنایەتییان لەگەڵ مانییەکان و مەزدەکییەکاندا زیاترە لە موسڵمانەکان، زۆر جاریش لە مێژوودا دەبینین پیاوانی ئایینی زەردەشتی یارمەتیی موسڵمانەکان دەدەن دژ بەمانی و مەزدەکییەکان. لەلایەکی دیکەوە دەبینین مەسیحییەکان لە ئێران موسڵمانەکان دەخەنە پێش زەردەشتییەکانەوە، ئەمەش بەهۆی ئەو کوشت و بڕە هەمەلایەنەی لەسەر دەستی زەردەشتییەکاندا بەرەو ڕوویان بووەوە[٤٦].

**سەرچاوە ژێدەر و پەراوێزەکان:**

١. ئەدی شێر: یەکێکە لە ناودارانی کڵێساو ئەدیبێکی سریانییە. ساڵی (١٨٦٧ز) لە شەقڵاوە لەدایک بووە. ساڵی (١٨٨٩) لە مووسڵ لە پەیمانگای کاهینەکان دەرچووە. هەڵبژێردراوە وەک مەترانی ئەبرەشییەی سعرد لە کوردستانی تورکیادا. لە ١٧ی حوزەیرانی ١٩١٥ دا لەسەرەوەختی ڕووداوەکانی جەنگی یەکەمی

جیهاندا لەلایەن کوردەوە کوژراوە. بڕوانە: گۆڤاری الفکر المسیحي، الموصل، ژمارە (٢٦٧-٢٦٨) ی تشرینی یەکەمی ١٩٩١.

٢. تأريخ كلدو واثور، بيروت ١٩١٣، ج٢، ص١-١٤.

٣. مراد كامل: تأريخ الأدب السرياني من نشأتة حتى العهد الحاضر، القاهرة،ص٦٣.

٤. ئەلفۆنس منکا: منکنا لە ساڵی ١٨٧٨ لە گوندی شرانشی باڵا (باکوری شاری زاخۆ) لەدایک بووە. لە ساڵی ١٨٩١دا چۆتەپەیمانگای باوەکانی دۆمنیکان لە مووسڵ و، تیایدا چەندین زمان فێر بووە. بە بەڕێوەبەری دەزگای زمانە ڕۆژهەڵاتییەکان لە کتێبخانەی رایلاندز لە مانشستەر دامەزرێنراوە. لە ١٩٢٤-١٩٢٩ دا رووی لە رۆژهەڵات کردووە بۆ گرنگیدان بەو دەستنووسانەی لەوێ هەن. بە یەکێک لە گەورە کۆکەرەوەکانی دەستنووسی عەرەبی سریانی دادەنرێ. بەهۆی بڵاوکردنەوەی هەندێ دەستنووسەوە، یان مەیل داشکاندنی بەلایاندا مشتومڕ و هەرای ناوەتەوە و ناوی دەرکردووە، وەک وەعزەکانی (مایر) فرسانی و بەدیاریکراویش دەقی بەرحەد بشایا، یان (تاريخ أربل) لە چوارچێوەی سەرچاوە سریانییەکاندا ساڵی (١٩٠٧)، بەگواستنەوە لە کۆمەڵە سەرچاوەکەی منکناوە کە ساڵی ١٩٢٥ز ئەو بەڵگەنامەیەی دراوەتە پاڵ فیلیکسینۆس لە مەسبوق (منسج)ی بڵاو کردۆتەوە. بەڵام لێکۆڵەر پۆل بتیرز لە وتارێکی کوردتدا گومانی خستە سەر بەڵگەنامەکە و بەدروستکراوی دانا. بەڵام بەهەرحاڵ لە سەکۆ زانستییە ئەوروپییەکاندا حسێبێکی گەورەی بۆ دەکرا و، بەوپەڕی هێزەوە وەڵامی ڕۆژهەڵاتناسەکانی دەدایەوە. ناوبراو لە ساڵی ١٩٣٧ مردووە. بڕوانە: (الاب الفونس منكنا، فاتحة انتشار المسيحية في اواسط اسياو الشرق الاقصي، ترجمة: جرجيس فتح الله، السويد).

٥. يوسف حبي: التواريخ السريانية، مجلة المجتمع العلمي العراقي، هيئة اللغة السريانية، بغداد، ١٩٨١-١٩٨٢، المجلد السادس، ص ٤٢ -٤٣، الفونس منکنا، سەرچاوەی پێشوو، ل١١-١٢.

٦. ارثر كريستنسن: ايران في عهد الساسانيين، ترجمة يحيى الخشاب، القاهرة، مطبعة لجنة التأليف، ١٩٧٥، ص٦٨. يوسف حبي: التواريخ السريانية، ص٤٢.

٧. يوسف حبي: كنيسة المشرق، بغداد، ١٩٨٩، ص ١٠٣- ١٠٤.

٨. دەبێ بگوترێ پەتریارکی کلدانی مار عەمانوئێلی دووەم داوای لە باوەکانی دۆمنیکان کردووە چاپکردنی ئەم کتێبە لە ئەوروپا چاپ بکرێت بەو مەرجەی لە چاپی ڕۆژهەڵاتدا رستەی (پەتریارک هەراسان بوو) کە مەبەست لە (مار ماری)یە، لاببردرێ. بڕوانە: الفونس منکنا، سەرچاوەی پێشوو، ل١٣. لە هەمان کاتدا قەشە (کەپاشان بوو بە پەتریاک )پۆلس شێخۆ لە وتارێکدا لە گۆڤاری (النجم)ی مووسڵاویدا ژمارە (٨-٩) ی ساڵی ١٩٣٦ ستایشی کتێبەکە دەکات. بڕوانە: سامي بن خماس الصقار: امارة اربل في العصر العباسي ومؤرخها ابن المستوفي، الرياض، دار الشواف، ١٤١٢ ه- ١٩٩٢م، ص١٧٦.

٩. الآب الفونس منكنا، سەرچاوەی پێشوو،ل١٢.

١٠. حنا فيي، مصادر كنيسة المشرق قبل الأسلام، مجلة بين النهرين، الموصل، السنة الأولي، العدد الثاني، نيسان ١٩٧٣، ص١٥٥. يوسف حبي: كنيسة المشرق، ص١٠٤ -١٠٥.

١١. مەبەست ئەو زانا رەخنەگرانەیە کە گومانیان هەبووە لە بڵاوبوونەوەی مەسیحییەت لە سەدەی یەکەمدا، کە بریتیین لە (دوفال، لابورت، فیلیبس، لتنسیوس، تیکسرون... ) بڕوانە يوسف حبي: كنيسه المشرق، ص٨٩).

١٢. روها: یەکێکە لە شارەکانی جزیرەی فورات کە دەکەوێتە باکووری (وڵاتی میزۆپۆتامیا) و دەکەوێتە دووریی ٤٠ کم لە باکوری ڕۆژئاوای شاری حەڕان، ناوەکەی بە یونانی ئەدیسا (Edesa) یە و بە سریانی ئورهۆی Urhoi و مەسیحییەکان لە دانراوە سریانییەکاندا بە (شاری پیرۆز یان ئیماندار) ناوی دەبەن و، لە مەسیحییەتدا بە شارێکی پیرۆز دەزانرێت. لە سەدەی پازدەمەوە ناوەکەی کرا بە ئورفە و تا ئێستاش هەر ئەو ناوەی وەرگرتووە. لەم بارەیەوە بڕوانە: (أ. ولفنسون: تأريخ اللغات السامية، ص١٤٥-١٤٦، محمد عطية الابرشي:

الاداب السامية، ص٥٧. هامش "١").

١٣. کریستنسن: سەرچاوەی پێشوو، ل٢٧.

١٤. کریستنسن: هەمان سەرچاوە، ل٨٤.

١٥. ئەدی شێر، ج٢ ل٢. ئەدی شێر لەلایەن (یوسف حبی)یەوە رەخنەی لێ گیرا و، تۆمەتباری کرد بەوەی پشتی بەکتێبێکی ساختە بەستووە، کە کتێبی (تأريخ اربل)ە، جگە لە داشکاندنی بەلای نەستووریيە کلدانییەکاندا دژی یەعقوبییە سریانییەکان. بڕوانە (يوسف حبي: التواريخ السريانية، ص٦٢).

١٦. سعيد عبدالفتاح عاشور: اوروبا العصور الوسطى، مكتبة الانجلو المصرية، الطبعة السادسة، ١٩٧٥، ص٣٩.

١٧. کریستنسن: ايران في عهد الساسانيين، ص٥٤، طه باقر: تاريخ ايران القديم، جامعة بغداد، ١٩٨٠، ص١٣٢.

١٨. أدي شير، تأريخ كلدو واثور، ج٢، ص١٤.

١٩. مطرافوليط: وشەیەکی یونانییە واتە سەرۆکی ئەسقوفەکان، کە سەرۆکایەتیی ناوچەیەکی گەورەی کڵێسایی دەکات. بڕوانە: إسطيفان بابكا: أبرشية حدياب في التأريخ، مجلة بين النهرين، العدد ٣١، ١٩٨٠، ص٢٧٧.

٢٠. مروان المدور: الارمن عبرالتاريخ، ص٢٧٧، محمد امين زكي، خلاصة تأريخية لتأريخ الكرد وكردستان منذ اقدم العصور، بغداد، ص١٢١.

٢١. کریستنسن: سەرچاوەی پێشوو، ل٥٤.

٢٢. البير أبونا: شهدا و المشرق، بغداد، ١٩٨٥، ج١ ص٨٥.

٢٣. البير أبونا، هەمان سەرچاوە، ج١، هەمان لاپەڕە، الشابشتي: الديارات، تحقيق كوركيس عواد، بيروت، ١٩٨٦،ص٢٨. الهامش.

٢٤. قەڵای فنک: شارێکی کوردییە دەکەوێتە دووریی ١٢ میل لە باکووری جزیرەی ئیبن عومەر (ئەو شارە کوردەی دەکەوێتە کوردستانی تورکیاوە).

٢٥. خوارەزم: ناوچەیەکە دەکەوێتە باکوری رۆژهەڵاتی ئێران لەسەر کەناری رۆژهەڵاتی دەریای قەزوین، کە ئەورووپییەکان ناوی (هەرێمی بەکتریا)یان لێ ناوە، کە ئێستا دەکەوێتە ناو خاکی کۆماری تورکمانستانەوە.

٢٦. کریستنسن: سەرچاوەی پێشوو، ل٢٥٤- ٢٥٥.

٢٧. جاثلیق: وشەیەکی یۆنانییە مانای گشتی دەبەخشێ، مەبەست لێی سەرۆکی باڵای مەسیحییەکانە لە رۆژانی پاشا ساسانییەکاندا. بڕوانە: (ابو الفرج الاصفهاني: الديارات، تحقيق جليل العطية، لندن، دار رياض الريس، ص٢٦٢، ئێستا وشەی پەتریاک هاوواتایەتی).

٢٨. لەوانەیە شاهدۆست فارسی بێت، چونکە ماناکەی لە کوردی و فارسیدا هەمان مانایە، ئەمەش بەهۆی نزیکیی هەردوو زمانەکە لە یەکترەوە.

٢٩. مراد كامل، تأريخ الادب السرياني، ص٦٤.

٣٠. مراد کامل، هەمان سەرچاوە، ل١١٧.

٣١. مراد کامل، هەمان سەرچاوە، ل ٢١١.

٣٢. البير أبونا: شهدا و المشرق، ج١، ص٢٤٣- ٢٥٣، تا ئێستاش ئەم دێرە لە دەروازەی شاری دهۆکدا ماوە. ئێستا دەکەوێتە سەر تەپۆلکەیەک لەلای چەپی ئەو رێگایەی کە بۆ ناو دهۆک دەچێ، بەرامبەر بە تەلاری سەرۆکایەتیی زانکۆی دهۆک. ئەم دێرە جەژنێکی ساڵانەی هەیە، کە ناوی جەژنی (شێرە) و مەسیحییەکانی دهۆک و ناوچەکانی دەوروبەری رووی تێ دەکەن. بۆ زانیاریی پتر بڕوانە: ئەفرام فضيل البهرو: مار ايشالاها النوهدري، دهوك، مطبعة خبات، ٢٠٠٠ز.

٣٣. نرسای ملفان: لە ساڵی ٣٩٩ز لە گوندی عەین دولبی (دلبیی ئێستا)ی نزیک گوندی مالتا (لە سەرچاوە مەسیحی و ئیسلامییەکاندا (معلثا)یە)، کە دەکەوێتە دووریی چەند کیلۆمەترێک لە ناوەندی پارێزگای دهۆک لەدایک بووە و، پاش ئەوەی لە قوتابخانەیەکی نزیک گوندەکەیدا زانستی خوێند مامی، کە عەمما نوئێل بوو، رەوانەی روهای کرد تا لە قوتابخانە بەناوبانگەکانیدا بخوێنێ. ئەوە بوو پاشان کرا بە بەڕێوەبەری ئەو قوتابخانەیەی لێی دەخوێند لە جێگەی (قیورا) پاش ئەوەی مرد.

نرسای لە تەمەنی ١٠٤ ساڵیدا ساڵی ٥٠٣ ز کۆچی دوایی کرد. بڕوانە: (مراد کامل، تأريخ الأدب السرياني، ص١٥٨، بشير متي توما: مدرسة الرها، مجلة المجمع العلمي العراقي الهيئة السريانية، المجلد السادس ص٢٨٠، دەبێ بگوترێ ناوی نرسای لە ناوی پاشای فارسی نرسی (٢٩٣ - ٣٠٢ ز) دەچێ و مەبەست لێی سەگی نێرە، ئەم ناوەش وەک وەفا و هێز بەکار هاتووە.

٣٤. بشير توما: مدرسة الرها، مجلة المجمع العلمي العراقي الهيئة السريانية، ج٦، ص٢٨٢.

٣٥. حسن بيرنيا: تاريخ ايران القديم، ترجمة محمد نورالدين عبدالمنعم والسباعي محمد السباعي، العجالة، الطبعة الثانية، ١٤١٣هـ - ١٩٩٢م، ص٣١١، كريستنسن: سەرچاوەی پێشوو، ل ١٣٠.

٣٦. طه باقر، تاريخ ايران القديم، ص ١٠٥.

٣٧. كريستنسن، سەرچاوەی پێشوو، ل١٣٠.

٣٨. حسن بيرنيا: سەرچاوەی پێشوو، ل٣٢٢- ٣٢٣.

٣٩. هەمان سەرچاوە، ل٣٢٣.

٤٠. كريستنسن، هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٢٥٨.

٤١. شاعیری ئێرانی فیردەوسی لەم بارەیەوە دێرە شیعرێک لەسەر زمانی پاشا ئەردەشێر بە شاپووری کوڕی دەڵێ (کە وەرگێرانەکەی ئاوهایە):

دین و دەوڵەت وەک من دەیبینم
رەشماڵێکە بەستوندەگ ڕاگیراوە
نەدین بەبێ فەرمانڕەواییی دەمێنێ
نەفەرمانڕەواییش بەبێ دین لە وڵات دەمێنێ.

٤٢. طه باقر، تأريخ ايران القديم، ل ١٨٣.

٤٣. هەمان سەرچاوە، ل١٨٤.

٤٤. هەمان سەرچاوە، هەمان لاپەڕە.

٤٥. رشيد ياسمي: ايران در زمان ساسانيان ( بەفارسی)، ل٤٦٦.

٤٦. ا. ج. اريري: تراث فارس، ترجمة محمد كفافي و زملاؤه، مطبعة البابي الحلبي، ١٩٥٩، ص٥٠٠.

(١) یەکێکە لە شارەکانی جزیرەی فورات کە دەکەوێتە باکوری میزۆپۆتامیا لە دووریی ٤٠ کم لە باکوری رۆژئاوای شاری حەڕان و بەیۆنانی (Urhoi)ی پێ دەڵێن و مەسیحییەکان لە دانراوە سریانییەکاندا بە (شاری موبارەک یان شاری ئیماندار) ناوزەدی دەکەن و، لەلای مەسیحییەکاندا بەشارێکی پیرۆز لە قەڵەم دراوە و ناوەکەی لە سەدەی پازدەمدا گۆڕدرا و کرا بەئورفە کە ناوێکی تورکییە و تا ئێستاش هەر ئەو ناوەی هەیە. لەمبارەیەوە بڕوانە: أ. ولفستون: تاريخ اللغات السامية، بيروت،ص ١٤٥-١٤٦. محمد عطية الابراشي، الاداب السامية، ص ٥٧ پەراوێزی (١)، زاكيه محمد رشدي، السريانيه، نحوها وصرفها، ص١٠، پەراوێزی (٤).

(٢) مراد كامل: تاريخ الادب السرياني من نشأته حتى العصر الحاضر، القاهرة، ص٦٣، احمد هبو، المدخل الى السريانية وآدابها، حلب، ص ٣٧.

(٣) مراد كامل، تاريخ الادب السرياني، ص١١، زاكية محمد رشدي، السريانية، ص٩.

(٤) الابراشي: الاداب السامية، ص ٤٥.

(٥) أحمد فخري: دراسات في تأريخ الشرق، القاهرة، ص ١٠٢

(٦) طة باقر، مقدمة في تاريخ الحضارات القديمة، ص٤٩٢. انطوان مورتكارت، تاريخ الشرق الادني، ص٢٦٩.

(٧) طة باقر، سەرچاوەی پێشوو، ص٧٠، الابراشي: سەرچاوەی پێشوو، ص ٤٥ - ٤٦.

(٨) طه باقر، مقدمة في التاريخ الحضارات...، ص٧٠، مراد كامل: تاريخ الادب السرياني، ص ١٦ - ٣٠.

(٩) حەڕان: شارێکی دێرینە و تا ئێستاش هەر ئەو ناوەی هەیە، دەکەوێتە باکوری رۆژهەڵاتی وڵاتی میزۆپۆتامیاوە لەسەر سنووری ئێستای سووریا - تورکیا لای سەرچاوەکانی رووباری بلیخ کە یەکێکە لە لقەکانی رووباری فورات، ناوەندی یەکێک لە دەوڵەتۆکەکانی ئارامییەکان (فران ئارام) بووە کە چەقی رێگاکانی کاروانەکان بووە. ناوی شارەکە لە زمانی بابلییەوە لە (حرانو) وەرگیراوە کە مانای رێگا دەدا و ئەم ناوە لە تەوراتیشدا بەناوی (هاران)ەوە هاتووە، هەروەها

تەورات ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە پێغەمبەری خوا ئیسحاق کوڕی ئیبراهیم (سلاوی خوایان لێ بێ) (رفقە)ی کردووە بەهاوسەری خۆی کە حەڕانی بووە، طە باقر: مقدمە...، ص٤٣٩، احمد سوسە: ملامح من التاریخ القدیم لیهود العراق، ص٣١، پەراوێزی ٣٤، الکتاب المقدس: سفر التکوین، ٩٢٤:٢٤ .

(١٠) طە باقر، سەرچاوەی پێشوو، ٤٩٣ .

(١١) محمد بیومي بهران، تاریخ العرب القدیم، الاسکندریة، ص٤٩٦.

(١٢) أ.ولفستون، تاریخ اللغات السامیة، ص ١٤٥- ١٤٦، مراد کامل: تاریخ الادب السریاني، ص٦٧، هنري س.عبودي: معجم الحضارات السامیة، طرابلس، ص٤٧٥، أحمد هبو: المدخل الی اللغة السریانیة وادابها، ص ٣٨. زاکیة محمد رشدي: السریانیة، ص ٩ - ١٠

(١٣) زەردەشتی: مەبەست ڕێبازی زەردەشتە، کە پیاوێکە لە سەدەی حەفتەمی پ.ز لە ناوچەی ئازەربایجانی باکوری ڕۆژئاوای ئێران دەرکەوتووە، بەڵام ئەو ئایینەی هەوڵی دا بڵاوی بکاتەوە لە سەرەتا بە فراوانی بڵاو بووەوە لە ناوچە ڕۆژهەڵاتییەکانی ئێران لە شارۆچکەکانی بلخ (هەرێمی بەکتری: **Bactria**) کە زەردەشت بۆ ئەوێ کۆچی کرد. زەردەشت کتێبێکی پیرۆزی هەیە کە ناوی (ئاڤێستا)یە و راڤەیەکیشی هەیە پێی دەڵێن زەند ئاڤێستا. زەردەشتی لەسەر ئەوە دامەزراوە کە دوو خوداوەند هەن ئاهورامەزدا بۆ چاکە و ئەهریمەن بۆ خراپە. زەردەشتی وشەیەکی هاوتای هەیە کە ئاگرپەرست و بەعەرەبی (المجوس)ی پێ دەڵێن کە لە وشەی مکوسیای پەهلەوی وەرگیراوە و، لە زمانی ئاڤێستادا (مکاو)ە و، لە فارسیی نوێدا (موغ)ە، کە نازناوێک بووە بۆ پیاوانی ئایینیی کۆنی پێش زەردەشت و، دەستەیەک لەمانە بەجادووگەری و فالگرتنەوە ناویان دەرکردووە، بۆیە ئەم وشەیە چۆتە نێو زمانە ئەوروپییە نوێیەکانیشەوە بەمانای جادوو (**Magic - Magicen**). طە باقر، تاریخ ایران القدیم، جامعة بغداد، ص١٨١، أدوارد براون، تأریخ الادب في أیران، الکویت، ترجمة: أحمد کمال الدین حلمي، ص٧١ - ٨٥.

(١٤) نازناوێکە بەسەرۆکی پیاوانی ئایینی دەگوترێ کە لە پەرستگاکانی ئاگردا ئەرکە ئایینییەکانی ئاگرپەرستی جێبەجێ دەکەن، طە باقر، سەرچاوەی پێشوو، ص ٧٢.

(١٥) ارثر کریستنسن: ایران في عهد الساسانیین، ترجمة: یحیی الخشاب، ص١٣٠

(١٦) حدیاب: میرنشینییەکی بچووکە دەکەوێتە ئاشووری کۆنەوە (کە پارێزگای ئێستای ئەربیل دەگرێتەوە) لە ناوچەی نێوان هەردوو زێی گەورە و زێی بچووک لە ڕۆژهەڵاتی ڕووباری دیجلە، کە لە سەرچاوە ئیسلامییەکاندا بە (حزە) ناوی براوە. یاقوت: معجم البلدان، لە سیاسەتی گشتیدا سەر بەدەوڵەتی فرثی (ئەشکانی) (٢٤٧ - ٢٢٤ پ.ز) بووە، بنەماڵە پاشاییەکەی چوونەتە سەر ئایینی جوولەکە و، کەسانی سەر بەخێڵەکانی سکیث (ساکا)ن. لە پاشاکانیان مۆنۆ بازوسی دووەم و ئیزاتیسی دووەم، کە لە مەزارگاکانی پاشایانی ئۆرشەلیم (قودس)دا نێژراون، ناویان دەرکردووە. ئیمپراتۆری ڕۆمان تراجان ساڵی ١١٦ ز سەربەخۆیی میرنشینی حدیابی لەناو برد. بڕوانە: أحمد سوسة: ملامح من التاریخ القدیم لیهود العراق، ص ٣٩ - ٤٠، یوسف حبي: التواریخ السریانیة، گۆڤاری المجمع العلمي السریاني، ص٣٤، جمال رشید: تاریخ الکرد القدیم، جامعة صلاح الدین، ص١٢٧، کامل: تأریخ الادب السریاني، ٦٠ .

(١٧) مار ئەدی: یەکێک لە شاگردەکانی مەسیح (سلاوی خوای لێ بێ) کە چۆتە ڕۆژهەڵات بۆ بڵاوکردنەوەی مەسیحییەت، زۆربەی ئەو زانیارییانەی لەبارەیەوە بە دەستەوەن دەکەونە چوارچێوەی ئەفسانە کۆنەکانی سریانییەوە. بڕوانە کرافولسکی - دوروتیا: ثقافة السریان في القرون الوسطی، ترجمة: خلف الجراد، سوریا، ١٩٩٠، ص٢٦٩.

(١٨) آدی شیر: المطران: تأریخ کلدو اثور، بیروت، ١٩١٣ م، ج٢، ص١ - ١٤ .

و:حەسەن یاسین

# کرۆنۆلۆژیای ئەربێللا

ئیدوارد زاخاو
وەرگێڕانی لە ئەڵمانییەوە: عەبدولمونمین دەشتی

**لە پەراوێزی کرۆنۆلۆژیای ئەربێللا!!**

هەولێر بەو مێژووە کۆنەی کە هەیەتی، بەشێکی زۆر و گرنگی مێژووەکەی پەیوەستە بە مێژووی ئایینەکانەوە، لە باسی "کۆنترین ئایین" و دروستکردنی شاری هەولێردا، پێشتر نووسیومانە "هەولێر- ئوربل" هەر لە سەرەتاوە وەک شارێکی ئایینی دروست کراوە! بەو مێژووەش کە هەیەتی کۆنترین ئایین و زۆرترین ئایین رووی لەم شارە کردووە، بەداخەوە تا ئێستا هیچ یەک لە ئایینەکان، وەک ئایینی مەسیحی بەختیار نەبووە و لە سایەی کتێبی گرنگی وەک "کرۆنۆلۆژیای ئەربێللا" بەشێکی زۆر و گرنگی مێژووی مەسیحی لە هەولێر و مێژووی کەسایەتییەکانی ئەم ئایینە و مێژووی کلیساکانی وا بەوردی نەنووسراوەتەوە، ئەم کتێبە لە رووی دەرەوە و وەکو ناسراویشە هەر باسی مێژووی مەسیحییەت دەکات لە هەولێر، بەڵام بە خوێندنەوەیەکی ورد و باریک زۆر نهێنی تری گرنگی هەولێر و خەڵکەکەی و دەوروبەر و دەسەڵاتدارەکان و شەڕەکان باسکراون، هەندێک لەم باسکردنانە بۆ یەکەمین جارە لەم کتێبەدا باسکراون. هەندێکیش ئەگەر پێشتر باسیشکرابن ئەوا بەم شێوەیە نییە، کە لە کتێبی "کرۆنۆلۆژیای ئەربێللا"دا باسکراون.

لەباسی ئایینەکان، لەم کتێبەدا باسی زۆر جۆر ئایین کراوە، لە ئایینی "بت پەرست"ەوە تا رۆژپەرست و مانگ- زەردەشتی و مانی و جوو هەروەها مەسیحییەت! لە باسکردنی هەڵگرانی ئەم ئایینە شتی سەیر و باوەڕ نەکردنی دەگێڕێتەوە، هەرچەندە مێژووی جیهان و ناوچەکەش لەم جۆرە رووداوانە خاڵی نییە!

بۆ نموونە: دایک مارە کردن:

لە "کرۆنۆلۆژیای ئەرپێللا"دا هاتووە کە "ئەخاژا بوهی" (دوای ئەوە ئەخاژا بوهی هات پیاوێکی زیرەک و



خەباتکار بوو، کوڕی پریستای شاری ئەرپێللا بوو، ئەو پریستایە وەکو دەڵێن چوار کوڕی هەبووە و هەر چواریان پریستا بووینە. دایکیان لەتیرەی ماگییەکان بووە شووی بە کوڕە گەورەی خۆی کردۆتەوە، کە گەورەتر بووە لە ئەخاژا بوهی، هەر لەبەر هەندێش خەڵک بەو نازناوە بانگیان کردووە ئەخاژا بوهی، واتە "برای باوکی" واتە برای ئەوەیان کە دایکی مارە کردۆتەوە). ئەوەی لێرە گرنگە باس لە داک مارە کردنەوە دەکات: کە ئەمەش لە سەردەمی پێش زەردەشت و سەردەمی زەردەشت، لە سەرچاوەکان باسکراوە، هەتا یەکێ لە پاشاکانی ساسانی گوایە خوشکێکی خۆی مارە کردووە، ئەمەش لە مێژووی مرۆڤایەتی باسکراوە، کە بە سەردەمی "دایکخوازی" و "خوشکخوازی" ناسراوە و هەر تەنیا تایبەت نییە بە ناوچەیەک و دینێک، بەڵکە تا دەرەنگ رەوشتێکی باوبووە لە زۆر وڵات و لەنێو زۆر میللەت، بە نموونە فیرعەونەکان

لە میسر خوشکی خۆیان مارە دەکرد، هەر بۆیە ئێستاش لەنێو میسرییەکان باوە، کە ژن بە مێردەکەی دەڵێ: "یاخوی" واتە براکەم! ئەوەش بۆ ئەو سەردەمە دەگەڕێتەوە، کە خوشک دەبووە ژنی برای و دەتوانین بەم زەمەنە بڵێین "سەردەمی "برامێردی" و "خوشکخوازی".

**نموونەیەکی تر: منداڵ هاویشتنە ناو ئاگر:**

شەمسون کە یەکێ لە پیاوانی ئایینی مەسیحی بوو، لەنێو خەڵکدا دەگەڕاو ئامۆژگاری دەکردن. (لەو گوندانەی کە ئاگریان دەپەرست و خەریکی جەژنێکی گەورە بوون، کە پێیان دەگوت "شعرابجمبور- شەهرئابی جەمور" لە ئاهەنگەکە منداڵی ساوایان دەهاویشتە ناو ئاگر. ئابلی نووسەر لەبارەی ئەو جەژنە وا دەگێڕێتەوە: ئەو جەژنە دەکەوتە مانگی مایس. خەڵک لەهەموو لایەکەوە بەرەو کانیاوەکە خۆیان دەشووشت. لە تەنیشت کانیاوەکە دەمانەوە، چێشتیان لێدەنا و خۆراکیان دەدا بە بەندەکانی "عەبد" خۆیان، بەڵام خۆیان جارێ هیچیان لێ نەدەخوارد، تا یەکێک لە منداڵە بچووکەکانی خۆیان دەهاویشتە ناو ئاگر، جەرگ و گورچیلەی منداڵەکەیان دەردەهێناو وەکو نیشانەی جەژنەکەیان بەچڵی درەختێکی ئەوێیان هەڵدەواسی، پاشان وەکو بۆ خۆشی، تیرێکی زۆریان بۆ هەوا دەهاویشت. جا بەرەو ماڵ دەبوونەوە" ئەم باسە زۆر شتی نوێی تێدایە کە پێشتر باس نەکراوە.

١- منداڵ هاوێشتنە ناو ئاگر و جەرگ و گورچیلەی بە چڵەدار هەڵواسین.

٢- باسی بەندە "عەبد" دەکات.

لە بارەی منداڵ هاویشتنە نێو ئاگر، واتە قوربانی کردن لە جەژندا، ئەمە لە هەندێ زەمەن و لای هەندێ نەتەوە و لە هەندێک وڵات "مرۆڤ" کراوەتە قوربانی، بۆ نموونە سیکەکان ئەگەر پادشایەکیان دەمرد لە ساڵوەگەڕی مردنیدا، پەنجا سوار بە ئەسپەوە دەکرانە قوربانی. بۆ بەندە "عبد" لە سەرچاوان باسی "دیل"ی شەڕمان خوێندۆتەوە، بەڵام عەبد و بەشێوەی بەندایەتی لە ناوچەکە هەواڵێکی نوێیە.

**گفتوگۆی فەلسەفی لەبارەی ئایینەوە:**

سەردەمی ساسانییەکان زۆر دەوڵەمەندە بە سەرهەڵدانی ئایین و ئایینزاو شەڕی ئایینەکان و گفتوگۆی نێوان پیاوانی ئایینی، ئەگەرچی لە سەردەمی ساسانییەکان، هەندێ جار شەڕی مەسیحییەکان کراوە، بەڵام زۆر جاریش ئازاد بووینە و گفتوگۆی گەرمی نێوان ئایینەکان دەستی پێکردووە و هەریەکە هەوڵی داوە رەوایەتی ئایینی خۆی بسەلمێنێ، ئەوەتا لە "کرۆنۆلۆژیای ئەربێللا" باس لە گفتوگۆیەکی زۆر جدی دەکات (لەو سەردەمەدا کە پادشا دیانەکانی حوکمی دنیایان دەگێڕا، کاروباری کلێسا گەشابوونەوە، دۆزەخ و شاخەکانی خۆی بەرز کردەوە و زاری خراپگۆ کەوتە گەڕان و قسە ئەو قسانەی دوژمنی بڕوای راستەقینە بوون، ئاریۆسی خودانەناس بەکرێگیراوێکی درۆزنی دۆزییەوە، تاکو وانەکانی بۆ بڵاوبکاتەوە، بە ناسینی حورمەتی ئەو قسە لەبارەی شتی بێ باوەڕ دەکرا پایەی کوڕی خودای خولقێنەر، رزگارکەری ئێمە نزم دەکرایەوە نەهی دەکرد لە خودایەتی حەزرەتی مەسیح و بەدوای خەیاڵدا کەوتبوو، دەیگوت کە حەزرەتی مەسیح خالیق نییە، بەڵکو هەر ئافەریدەیە "مەخلووق"ە لە رووی سروشتەوە کوڕی خودا نییە، بەڵکو تەنها لە رووی مەجازییەوە بەهۆی ئەوەوە نا ئارامی سەرتاسەری زەوی گرتبۆوە، ٣١٨ قەشە لە شاری نیسیا کۆبوونەوە تا ئەو کابرایە بە مامۆستایەکی گومڕاکەر بدەنە قەڵەم، بە یارمەتی کۆنستانتین پاتشا، بۆچوونەکانی ئەو باوکە بەڕێزانە سەری گرت و توانرا ئاریۆس و ئەوانەی واتاکانی ئەویان بڵاودەکردەوە بخرێنە بەر نەفرەت و ئەوە ساغ بکەنەوە کە حەزرەتی مەسیحی کوڕی خودا لە هەمان سروشتی باوکێتی و لەگەڵ خودا هاوبوونە).

لەم پەرەگرافەدا بەدەر دەکەوێ، کە گفتوگۆ چەند جدی بووە و چەند فەلسەفی، پیاوانی ئایینی مەسیح بە پشتیوانی پاتشا توانیویانە "ئاریۆس" بخەنە بەر نەفرەت، واتە بەزۆر و بەدەسەڵات ئەوەیان کردووە، نەک بە لۆجیکی گفتوگۆ و بەڵگەی دروست، کە بەهۆی زۆری ژمارەی قەشەکان و دەسەڵاتی ئەستوور ئەوەیان ساغ کردۆتەوە! "کە مەسیح کوڕی خودایە" و ئاریۆس یان بەر نەفرەت خستووە، کە ئاریۆس رای وابووە (حەزرەتی مەسیح خالیق نییە، بەڵکو هەر ئافەریدەیە "مەخلوق" لەرووی سروشتەوە کوڕی خودا نییە، بەڵکو تەنها لەرووی مەجازییەوە) ئەمەش دەری دەخات کە ئاریۆس یانی وەک دەڵێ "ئاریۆسی

مامۆستا" خاوەن رایەکی یەکجار گرنگ بووە، کە بەرای من ئەو رایەی ئاریۆس تا ئەو وەختە واتە لە سەرهەڵدانی مەسیحییەتەوە، تا نووسینی کرۆنۆلۆژیای ئەربێللا رایەکەی گرنگە و گفتوگۆی ئاوا جدی لەگەڵ هەڵگرانی ئایینی مەسیحیدا نەکراوە، کە یەکسەرەو راستەوخۆ، رەخنە لە کرۆکی جەوهەری ئایینەکە بگرێ، هەرچەند مامە قەشە ئاریۆس بە "خودا نەناس و بەکرێگیراوێکی درۆزنی ناو دەبات"، بەڵام لە رایەکەیدا دیارە چەند خاوەن را و بۆچوونێکی دروست بووە.

**ساسانییەکان:**

کرۆنۆلۆژیای ئەربێللا کە ئابلی مامۆستا نووسیویەتی لە "٥٥٠ ز" نووسراوە، ئەم سەردەمەش سەردەمی دەسەڵاتی ساسانییەکانە، نووسەر زۆر باسی "پارپ"ەکان دەکات و ناوی "ئەردەوان" پاشای پارپەکانیش دەهێنێ، هێندە هەیە ناوی ئەردەوان بە "ئەرتابان **artaban** پادشای پارپەکان" دێنێ، هەروەها باسی ساسانییەکانیش دەکات، ئەوانیش بە پاشای فارسەکان ناودەبات، هەتا دەنووسێ "ساسانییە فارسەکان" ئەمە هەتا لە پێشەکیداو لە پێشەکی بەرێز "عەبدولمۆئمین دەشتی"یشدا وا نووسراوە.

پاشای ئێرانییەکان کە لە کتێبەکەدا مەبەست "پاشای ساسانییەکان"ە، ئەو لە تەکیا نووسیویەتی "پاتشای فارسەکان" کە ئەمەش لەگەڵ واقیعی ساسانییەکاندا ناگونجێ، "گبری" و زۆر نووسەر و مێژوونووسی تر باسی کوردبوونی ساسانییەکانیان کردووە، من وای بۆ دەچم، کە لە کرۆنۆلۆژیای ئەربێللا لە "فارس" مەبەست وڵاتی فارس بێ، نەک میللەتی فارس، چونکە ساسانییەکان خۆیان دانیشتووی هەرێمی فارس بوون، جگە لەوەش نووسەر زۆر باسی شەڕ و ململانێی نێوان "ساسانییەکان و پاشای ئەردەوانی ئەشکانی دەکات" لەوەشدا لەزۆر جێگا ساسانییەکان و مادەکان پێکەوە لەدژی "پارپەکان" لە شەڕدان، ئەمەش خاڵێکی بەهێزە بۆ یەک نەتەوەی "ماد و ساسانەکان" وەک نووسەر باسی دەکات ئەو شەڕ و ململانێیە پێشینەیەکی لەمێژینەی هەیە.

(ئەو دەنگ و باسەش زۆر بەنرخە کە باسی پێکدادانی پارپەکان بە سەرۆکایەتی فولوگیس چوارەم ١٩١-٢٠٨-٢٠٧ لە لایەک و فارس و "مەبەست ساسانەکانە" مادەکان یەکگرتووەکان لەلایەکی تر دەگێڕێتەوە ئەو جەنگە کە لە ئاکامدا کۆتایی بە دەسەڵاتی ئارشاکییەکان هێنا، کەچی تا ئێستا بەپێی سەرچاوە ناسراوەکان وا دەدانرا کە ئەو رووداوە مێژوو و جیهانییە لە ساتەوەختی کورت کۆتایی هاتووە، بەڵام وا تازە لە کرۆنۆلۆژیا فێردەبین نەخێر دەها ساڵ پێشتر فارس= ساسانی و مادەکان بۆ دەسەڵاتی ئەو ناوچەیە لە جەنگ و ململانێدا بوون، سەیریشە کە ئەو جەنگەش لە رۆژهەڵاتی ئیمپراتۆرییەتەکە بووە) ئەوە رای "مەشیخازیخانە" بە پشت بەستن بە کرۆنۆلۆژیا، لە راستیشدا هەروایە، مێژوو باسی ئەوە دەکات کە بابەک لە ساڵانی "٢٠٥و ٢٠٦ و ٢٠٧ و ٢٠٨ز" زۆر پێش ئەردەشێر شەڕ و ململانێ لەگەڵ پارپەکان هەبووە، هەتا پێش ئەردەشێری کوڕی بابەک، شاپووری برا گەورەی ئەردەشێر ئەویش بەشێک بووە لەو پاشا و ململانێیە، ئەوەی لێرە زۆر گرنگە کرۆنۆلۆژیا زۆر باسی پێکەوەیی و یەکگرتوویی ماد و ساسانییەکان دەکات، کە ئەو بە "فارسەکان" ناویان دەبات، هەرچەندە لە سەرەتای دەسەڵاتی ئەردەشێری بابکان ئەردەشێر شەڕی زۆر لەگەڵ مادەکان دەکات، دیارە دواجار رێککەوتوون و پێکەوە شەڕی پارپەکانیان کردووە.

(فۆلۆگوس لەشکرێکی لە سەدو بیست هەزار سەرباز دژی فارسەکان "ساسانییەکان" بەرێ خست، لەنزیک خوراسان گەیشتنە یەک، لە سەرەتا پارپەکان لەرووباری بچووک پەڕینەوە، دیتیان هەر چوار دەوریان بە لەشکری فارس و مادەکان گەمارۆ دراوە و دوای جەنگێکی گەرم پارپەکان شکان) وەکو دیارە پاشای پارپەکان بە لەشکرێکی "١٢٠" هەزار سەربازی دەچێتە شەڕی ماد و ساسانییەکان، کە کرۆنۆلۆژیا بە "فارس" ناویان دەبات و دواجار پارپەکان لە بەرامبەر مادو ساسانە یەکگرتووەکان شکست دێنێ، ئەوەی لێرە گرنگە وەک لە کرۆنۆلۆژیادا هاتووە، ئەم یەکگرتوویە درێژەی کێشاوە و زۆر شەڕیان پێکەوە کردووە، (لە سەردەمەکانی پێشووتر، فارسەکان هەوڵی ئەوەیاندا کە پارپەکان لەسەر کورسی دەسەڵات لابەرن، زۆرجار هێزی خۆیان لەشەڕدا تاقی کردبۆوە، کەچی بەرپەرچ درابوونەوە و دەسەڵاتی پارپەکانیان پێ نەگۆڕابوو، بەڵام ئەو پارپانەش لە ئاکامی ئەو شەڕ و ململانێیەکی زۆر تووشی ماندووبوون بوون، فارس=

ساسان. و مادەکانیش هەستیان بەمە کردبوو هاوپەیمانییان لەگەڵ شاهرات و شای ئەدیاباتە و دۆمیتیانۆس domitianus شای کەرکووک "کەراخ سیلوخ" بەست و لە بەهاردا دەستیان کرد بە جەنگێکی گەورە دژی پارپهکان، پارپهکان شکان و دەسەڵاتیان بۆ هەمیشە لەدەست چوو) ئەوە ئاشکرایە کە ئەوە ئەردەشێری بابکانەوە ئەردەوانی پارپ دەشکێنێ و هەر بەخۆی دەیکوژێ و وەک کرۆنۆلۆژیا دەنووسێ "بۆ هەمیشە" دەسەڵاتیان لە دەست دەردێنێ و لێرەوە دەسەڵاتی سەرکەوتووی ساسانەکان لەسەر دەستی ئەردەشێری بابکان پاشایەتی ساسانییەکان رادەگەیەنێ، ئەوەی لێرە نوێیە باسی ئەو یەکگرتن و هاوپەیمانەتییە لەنێوان پاشای شاری ئەدیاباتە و شاری کەرکووک و ئەردەشێردا هەبووە، لێرە زەن بۆ ئەوە دەچێ کە پادشای شاری ئەدیاباتە و کەرکووک لە مادەکان بووبن، بە پشت بەستن بە یەکگرتنەکانی پێشتر لەنێوان ماد و"فارس- ساسانییەکان" بۆیە بەدڵنیاییەوە دەنووسم ساسانی، چونکە هەر لە کرۆنۆلۆژیادا هاتووە، کە : پاش سەرکەوتنی ئەردەشێر دیانەکان ترسیان لێ دەنیشێ کە بیانکوژن، (ئەوساکە لەدوای ئەوەی فارسەکان- ساسانییەکان- دەسەڵاتی رۆژهەڵاتیان کەوتە دەست، دیانەکان کەمێک ترسیان لێ نیشت، لەوەی کە ئەوان بیانەوێ بەتیغی شمشێرەکانیان ئەوان "دیانەکان" لەناوبەرن، چونکە ئەوان بەسەر هەموو شایەکانی ولاتانی رۆژهەڵات زاڵ بوون، ماوپوت mauput "موبید" و مەرزەوانی داروودەستەی خۆیانیان لەجێگا دانابوون، یەکەمین شای فارسەکان؟! ساسانییەکان- ئەردەشێر پارێزگارێکی دەوڵەتی بەناوی "ئاژورزاهاد Adhorzahad (لەوانەیە ئاژەرزاد بێت "ع.د" نارد بۆ ئەدیاباتە) ئەوە دەرکەوت کە ئەو پادشایەی بەسەر پارپهکاندا سەردەکەوێ ئەردەشێری بابکانی ساسانی "کوردی لەنێو رەشماڵی کوردان گەورە بوو!"ە لەسەر قسەی ئەردەوان پاشا، وەک لە نامەکەیدا هاتووە، ئەو نامەیەی کە پڕ جوێن و گەف لێکردن بوو، بۆ ئەردەشێری ناردبوو، کە هێشتا لەسەر کورسی دەسەڵات بوو.

لە نامەکەدا نووسیویەتی وەک ئەوەی کە "طبری" گێراویەتیەوە (ئەی کوردی لەنێو رەشماڵی کوردان گەورە بوو، پات لە بەرەی خۆت بردووتە دەرەوە و خۆت مستەحەقی مردن کردووە، ئەوە چ کەسێ رێگای بە تۆ دا تاجی شاهی لەسەر بنێی و ولاتان داگیر بکەیت و خەڵک و پادشایان بکەیتە ژێردەستەی خۆت).

ئەوەی لەو نامەیەو لەوەی کرۆنۆلۆژیادا یەک دەگرنەوە زۆرن، دیارترینیان ئەوەیە کە لە نامەکەدا نووسراوە، ولاتان داگیر دەکەی و پاشاو خەڵک دەکەیە ژێردەستەی خۆت، لە کرۆنۆلۆژیاشدا هاتووە، بەسەر هەموو شایەکانی ولاتانی رۆژهەڵات زاڵ بوو، دیارە کە بەسەر شایەکاندا زاڵ بێ ئەوا خەڵکی ولاتەکەش دەکەونە ژێردەستی ئەو، دیسان لە کرۆنۆلۆژیا لەباسی ئەردەشێری بابکاندا دەنووسێ: (ئەو یەکەمین کەس بوو کە نازناوی شای شایان و خودای لەخۆ نا، واتە ئەردەشێر ئەو ولاتانەی داگیرکرد کە پاشایان هەبوو، ئەو بۆ خۆی حاکمی بۆ دانانەوە و ناویشی لەخۆ نا شای شایان، لەوەش کە بەخۆی گوتبێ خودا زێدەڕۆیی نووسەری مەسیحییە، بەڵام شتێک هەیە کە ئەردەشێر کە تاجی شاهی لەسەر دەنێ، لە مەراسیمی تاج لەسەر نان، پیرۆزی تاج لەسەرنان لە ئەناهیتای خوداوەند وەردەگرێ، ئەمەش لەو پەیکەرەدا دیارە کە وەک یادەوەری بۆ مەراسیمی تاج لەسەرنانەکەی کراوە!! ئەو فیکرەیەش کۆنە کە پاشاکان خۆیان بە خوداوەند زانیوە و خۆیان بە نەوەی خوداوەندان زانیوە و خۆیان بەنوێنەری خودا لەسەر زەوی زانیوە، ئێمە لە هیچ جێگایەک ئەو خۆ بە "خودا" زانینەمان لەبارەی ئەردەشێر نەخوێندۆتەوە.

کتێبی "کرۆنۆلۆژیای ئەربێللا" کتێبێکی زۆر گرنگ و پڕ زانیارییە بۆ مێژووی شاری هەولێر و ناوچەکە، کە دەکرێ لەزۆر رووەوە بخوێندرێتەوە، بە تایبەت بۆ ئێمەی کورد و مێژووی سەردەمێکی گرنگی شاری هەولێر، یان وەک کرۆنۆلۆژیا دەنووسێ "ئەربێللا" کە ئەمەش ئەوە دەردەخات، لەو سەردەمە شاری هەولێر ناوی بە شێوەی "ئەربێللا" هاتووە و ئەربێللای پێ گوتراوە، لای کەم مەسیحییەکان ئاوایان پێ گوتووە، هەر ئەمەشە بە کەمێک گۆڕانەوە لە سەرچاوە ئێرانییەکان هەولێر ناوی بە "ئەربێرا" هاتووە، کە هەر گۆڕانی "ئەربێللا"یە بە "ئەربێرا" و بەجێگۆڕکێی "ل" لام و "ر" رێ.

دواجار وەرگێڕانی ئەم کتێبە بەدەستی برای نووسەر "عەبدولمونمین دەشتی" کارێکی گرنگ و پیرۆزە و زۆر سەرکەوتووانە وەری گێڕاوە، بەڵام بەڕای ئێمە وەرگێڕانی ئەم کتێبە پێویستە یەکسەر لە زمانی نووسەرەوە بۆ زمانی

کوردی وەربگێڕدرێ، چونکە وەکو دیارەو لە دەقەکەدا هاتووە، ناوی کەس و شوێن بەزۆر شێوە هاتووە، کە ئەو ناوانە لە ناوچەکە و لەنێو خەڵکەکەدا باو بوونە، هەر بۆیە کوردی زانێکی شارەزا ئەگەر یەکسەر لە زمانی نووسەرەوە بیکاتە کوردی، دەتوانێ زۆر لەم ناوانە ساغ بکاتەوە، کە ئەمەش گرنگی خۆی هەیە، بۆ چاکتر ناسینی شوێن و کەس و رووداوەکان.

لێرە تەواوی دەقی "کۆنترین دەستنووس لەبارەی هەولێر" وەک ئەوەی کە برای نووسەر "عەبدولمۆئمین دەشتی" لە ئەڵمانییەوە وەریگێڕاوە. بڵاودەکەینەوە.

**دکتۆر مەولود ئیبراهیم حەسەن**

**وەرگێڕدراوی**

دەقی نووسینەکانی مەشیحا زێخا

**(سەرەتاکەی نەماوە)**

هەروەها تۆ زۆر جاران داوات لێ کردووم، ئاخ پینێهاس (Pinehas)ی خۆشەویست، من دەمەوێ بە نووسین هەموو قەشەکانی هوپارشییەکەمان، شەهیدەکان، ئەوانەی لە هەمان هوپارشیدا، لە پێناوی خۆشەویستی خواستەکانی حەزرەتی عیسا کوژران، هەروەها هەموو ئەوانەی لەم دنیاو لەو دنیادا ناوی خۆیان پیرۆز کرد، بۆ ئەوەی پاداشتی یەزدانیان بەر بکەوێت، کە ئەوانەش لە ئاسمان بۆ ئێمە دەبن بە دڵنیاییەکی باش (دووەمین نامەی پاولوس I.22 و ٥.٥ نامەی پاولوس بۆ ئیفیسەکان ١٤.I). چونکە تۆ دەزانیت، گێڕانەوەی باس و خواسی پێشەوایانی کڵێسا بە ئاسانی دەمانباتەوە بۆ لای دامەزرێنەری کڵێسا، واتە حەزرەتی عیسا، واگاهێنەری رەگەزی بوغزێنراوی ئێمە[1]، بەوەش ئێمە خۆشەویستی ئەومان دەکەوێتە دەروون. بێگومان پێویستە ئەوە ئامانجی بیرکردنەوەکانمان بێت و بە دوای خۆشەویستی ئەودا بچین. ئەگەر بێت و ئێمە ئەوە بکەین، ئەوا گیانی پیرۆز لە دەروونماندا نیشتەجێ دەبێت و دەبین بە پەرستگای "یەکێتی سێیینە"ی پیرۆز[2]. ئەو یەکێتییەی لە دەروونی هەمووماندا خانە دادەمەزرێنێ. هێزی ئەو "یەکێتی سێیینە"یە کە لە دەروونی هەمووماندا رەزێک دادەچێنێ، پەرژینێکمان بۆ بەدەوریدا دەکێشێت و کوشەرێکی[3] تێدا دەنێژێ. (ب.ئینجیل مەتتی: ٢١.٣٣، ئینجیل مارکوس: ١٢.١)، رەزێک چونکە ئێمە دەستکردی یەزدانین و ئەو ئێمەی چاندووە و ئێمە موڵکی ئەوین، ئاشکرایە کە ئەوەش هەر ئەو مانایە دەدات: "ئەو هاتە لای ئەوانەی خۆی"[4] (ئینجیل یوحەننا: ١١،١). بەڵام پەرژینەکە بۆ ئەوەیە کە ئێمە تێیدا هەست بە دڵنیایی بکەین و دز و جەردەی دوژمنە ئاشکراو نهێنییەکانمان نەتوانن یەخەمان بگرن. دواتریش زاراوەی "کوشەر"دکە نیشانەیەکە بۆ شەهیدان، ئەوانەی لە پێناوی خۆشەویستی حەزرەتی عیسا کوژران و پێکەوە بە چەشنی ترێ لە ژێر پێی جەللادە بێ بەزەییەکان کوژران و تلیشانەوە. خۆ حەزرەتی داودی خوداپەرست دەفەرموێت: "لە پێناوی تۆدا ئێمە هەموو رۆژێک وەکو مەڕ بۆ سەربڕین تەماشا دەکرێین" (پسالم: ٢٣،٤٤)[5].

کەواتە ئێمە دەمانەوێت بە هێزی یەزدانیی، دەنگ و باسی ڕابەران و شەهیدان بڵاوبکەینەوە. بە نوێژ و پەرستکاری یارمەتی لە خودای مەزن داوا دەکەین، تا ئەو بەبەزەیی و بەخشندەیی خۆی لە کەموکورتییەکانمان ببووریت و ڕێگامان بدات بەرامبەر تیشکی پیرۆزی نوورەکەی بوەستین. هەر ئەوە کە تا هەتا هەتایە شایستەی سوپاسگۆیی و پەرستنە.

**I.**

**پەکیڎا**

یەکەمین قەشەی وڵاتی حەڎیاب (ئەدیابانە)، وەکو مامۆستا ئابل دەڵێت، مار[6] پەکیڎا[7] بووە، ئەوەی کە (ئادای) لەسەر دەستی خۆی ئیجازەی قەشایەتی داوەتێ[8]. ئەوە کوڕی پیاوێکی هەژار بووە بە ناوی (بێری) کە خزمەتکاری ماگێک (مەجووسیک) بووە. بەڵام کە کوڕەکەی چاوی بە پەرجوویێکی (موعجیزە) ئادای دەکەوێت، کە چۆن ئادای مۆژدەدەر کیژۆڵەیەکی مردوو، کە بەرەو گۆڕستان دەبردرا، هەڵدەستێنێتەوە سەر پێیان بە دایک و باوکی دەبەخشێتەوە، ئەوا یەکسەر چاکیی گیانی پیرۆزی لە دەروونیدا دەبزوێت، ئەو گیانە پیرۆزەی لە ڕێگای حەزرەتی عیساوە بەسەر ئێمەدا پەخش کراوە، لە دڵی خۆیدا بڕیاری ئەوە دەدات کە ببێتە شاگردی

ئاددای. ئەو ئازاردان و ئەشکەنجەیەی کە لەلایەن باوکی و کەس و کارەکانی لەسەر ئەوە تووشی هات، بە هیچ زمانێک ناگێڕدرێتەوەو هیچ ئەقڵێک وەری ناگرێت. بەڵام لەگەڵ هەموو ئەوانە ئەو لەسەر بڕیاری خۆی هەر سوور دەبێت، دایک و باوکی دەیگرن و لە خانوویێکی تاریکی ئەنگوستەچاو بەندی دەکەن. لەم خانووەدا یارمەتیدەرێک دەدۆزێتەوەو ئەو دەرگایێکی بۆ دەکاتەوە و ڕادەکات. سەری خۆی هەڵدەگرێت و دەکەوێتە گەڕان بە دوای ئاددای. بەڵام ئاددای پێ نادۆزرێتەوە. کە پێی دەڵێن ئاددای بەرەو گوندە شاخاوییەکان چووە، یەکسەر ڕوو لەوێ دەکات. تا لەوەوە فێر ببێت و لەوەوە ڕێنمایی بکرێت. کە دوای ڕۆژانێکی زۆر دەگاتە لای ئاددای، مۆژدەدەری گیانپاک بە هاتنی زۆر دڵخۆش دەبێت، ئیتر دەستپێدەکات بۆ هەر جێگایێک دەچێت لەگەڵ خۆی دەبات. دەڵێن دوای پێنج ساڵان مۆژدەدەر ئیجازەی قەشایەتی دەداتێ و بۆ وڵاتی خۆی دەنێرێتەوە. ئەویش دەستدەکات بە ڕێنماییکردنی کۆمەڵانی خەڵک و پیشاندانی نیشان و پەرجووان. وەکو مۆژدەدەرێک توانی مەرێکی زۆر بهێنێتە ناو پەرژینی حەزرەتی عیسا، کە تێیدا خودا بە بەزەیی خۆی بەهێزی دەکردن. لە دوای دە ساڵان کۆچی دوایی دەکات و لە لایەن قوتابیەکانی، لە ماڵەکەی دایک و باوکی، کە ئەوسا ئەوانیش گۆڕابوون و بڕوایان پێهێنابوو، بە خاک دەسپێردرێت.

## II
## شەمشون (سیمسون)

دوای شەش ساڵان "مازرا Mazra"ی قەشەی "بێت-زابدای Beth-Zabhdai" لەگەڵ کاراونێک بەرەو وڵاتی ئەدیاباتە هات. هەر کە زانی کۆمەڵە دیانێک لێرە هەنە، بە نهێنی چووە لایان، دوای ئەوەی دیانەکان لێی دڵنیا بوون ڕێگەیان دا کە بچێتە ماڵەکەیان، بۆیان گێڕایەوە کە ئەوە شەش ساڵە ئەوان بێ ڕابەرن و داوایان لێ کرد کە دەستی خۆی بخاتە سەر سیمسونی خزمەتکار (دیاکون) و ئیجازەی قەشایەتی پێ ببەخشێت. ئەویش ئەو داخوازییەی پێ خۆش بوو، چونکە زانیبوویەوە، کە ئەو سیمسونە خزمەتکاری پەکیژا بووە.

بەم جۆرە سیمسون دەستی کرد بە بەڕێوەبردنی ئەو جڤاتەو ڕێنماییکردنیان بۆ سەر چیمەنێکی چڕ و گەش (پسالم ۲۳-۲). دەستی کرد بە گەڕان و سووڕان و ئامۆژگاریکردن لە سەرتاپای گوندەکان، ئەو گوندانەی کە ئاگریان دەپەرست و خەریکی گێڕانی جەژنێکی گەورە بوون کە پێیان دەگوت (شهرابجمور) (شەهر ئابی جەمور؟)[9]، لە ئاهەنگەکە منداڵی ساوایان دەهاویشتە ناو ئاگر، ئابلی نووسەر لەبارەی ئەو جەژنە وا دەگێڕێتەوە: "ئەو جەژنە دەکەوتە مانگی مایس (Ijar)[10]. خەڵک لە هەموو لایەکەوە بەرەو کانیاوێکی گەورە دەچوون، دوای ئەوەی هەموو لە کانیاوەکە خۆیان دەشووشت، لە تەنیشت کانیاوەکە دەمانەوە، چێشتیان لێ دەناو خۆراکیان دەدا بە بەندەکانی (عەبد) خۆیان، بەڵام خۆیان جارێ هیچیان لێ نەدەخوارد، تا یەکێک لە منداڵە بچووکەکانی خۆیان دەهاویشتە ناو ئاگر، جەرگ و گورچیلەی منداڵەکەیان دەردەهێناو وەکو نیشانەی جەژنەکەیان هەڵیاندەواسی بە لقی درەختێکی ئەوێ. پاشان وەکو بۆ خۆشیی، تیرێکی زۆریان بۆ هەوا دەهاویشت. جا بەرەو ماڵ دەگەڕانەوە."

لەوێ دوای ئەوەی سیمسون دوو ساڵان ڕێنمایی بۆ کردن، گەلێکیانی لە ئاو هەڵکێشا (تەعمید کرد)، بە هۆی کارە چاکەکانی وی باوەڕی عیسایی زۆر بڵاوبووەوە.

دوای ئەوەی مەسەلەکە گەیشتەوە گەورەکان و موگەکانی ئەوێ، گرتیان و دوای ئەشکەنجەدانێکی زۆر کوشتیان. ئابلی مامۆستا دەڵێت: "ئەوە حەوت ساڵان دوای بەزاندنی خوسرەوی پاشای ئەرشاکەکان لە لایەن تراژانی پاشای ڕۆمەکان، کە بۆ سەردانی وڵاتی ئەرشاکەکان هاتبووە پێش، ڕوویدا." ئەوەش دەکاتە ساڵی ۱۱٦. (ئەوە ئەو خوسرەوەیە کە ۱۰٦/۱۰۷ یان ۱۰۹/ ۱۱۰ تا ساڵی ۱۳۰ز حوکمی کردووە،).

سیمسون یەکەمین شەهیدی ناوچەکانی ئێمە بوو، هەڵکێشرا بۆ ئاسمان. خوا بۆ خاتری خواپەرستیەکانی ئەو یارمەتی ئێمەش بدات و کارێکی وا بکات، کە ئێمەش ڕێگەی ئەو بگرین، تا بتوانین لە بەختەوەرییەکانی ئەودا بەشدار بین.

من چی بڵێم و چی بگێڕمەوە لە بارەی ئەو مۆژدەدەرە بەختەوەرە، کە حەزرەتی عیسای کردە نموونەی خۆی و هەمیشە چاوەکانی لە دوای ئەودا بوون. وەرە با لە حەزرەتی عیسامان بپارێینەوە، کە ماوەی فەرموودەکانی

خۆی بە موژدە دەران و جێگرەکانیان ببەخشێت و هێز بداتە نزا و ئامۆژگارییەکانیان، بە شێوەیەک کە گەلە نەزان و بەربەرییەکان سەریان پێ سوڕ بمێنێت. بانگەوازی ئاوەها فەرموودەیەک لە هەموو جیهاندا گوێی دەدرێتێ، "ڕاگەیاندنەکانیان گەیشتە هەموو جیهان، فەرموودەکانیان گەیشتە بنی دنیا (پسالم ١٩-٥) ئەوەی کە هێزی بەوان بەخشی و لە ڕێگای ئەوانەوە کاریگەری خۆی گەیاندە هەموو لا، شایانی سوپاسگوزارییە لە هەموو کاتێک و تا هەتا هەتا.

ئای پینیتهاسی خۆشەویست، ئا ئەو جۆرە پیاوانە لە وڵاتی ئێمەدا سەریان هەڵدا، بە خوێنی خۆیان کێڵگەکانی ئەو ناوچانەیان ئاودا و تۆی کێڵگەکانیان ڕواند و فەریکی سی دانەیی، شەست دانەیی، سەد دانەییان بەخشی (مەتتی نیێ ١٣-٨). سیمسونی تەورات فیلستەکانی[11] ڕاونا و ملی پێ کەچ کردن، سیمسونی ئینجیلیش بە هۆی دەسەڵاتی خوای خۆی، بە هێزی ڕۆژووگرتن و پاکی خۆی ملی بە فلیستە کافرەکانی ڕۆژگاری خۆی کەچ کرد و خستنیە ژێر نیری خزمەتگوزاریی موژدەدەر، بۆیەشە نەیانتوانی کۆمەڵەکەی لە یەکتری بپچڕێنن. لە تەوراتدا ئەو هێزی یەزدانی پێشان دا، لە ئینجیلدا بەزەیی. ئیشاڵلا ئەو هێزەو ئەو بەزەییە لە هەموو ڕۆژگارێکدا لەگەڵماندا دەبێت.

### III
### ئیسحاق

لە دوای ئەو تێکۆشەرەی حەزرەتی مەسیح، لای گەلێک لە دیانەکان ئەوانەی لە (وڵاتەکەی ئێمەدا) هەبوون، مار ئیسحاق وەکو پێشەنگ تەماشا دەکرا، پیاوێکی چاڵاک و جوامێر بوو، دەتگوت قوربانییەکی زیندووە و بۆ خودا ڕەوانکراوە، ئیرادەی خودایی ڕێگەی ئەوەی نەدا کە نووکی تیری بەدکاران، تیری دوژمنانی هەموو پیرۆزییەکان، لەشی ئەو کونبەدەر بکات، ئەویش وەکو هاوڕێکانی بێ ماندوو بوون خزمەتی ئایینی عیسایی کرد.

لە ڕۆژگاری ئەودا پیاوێکی دیار و دەوڵەمەند هەبوو، خەڵک دەیانگوت کە پاشا ئەوی ڕاسپاردووە، بۆ ئەوەی ئەو ناوچەیە ببات بەڕێوە. ئەو پیاوە ناوی ڕاکبەخت (ڕامبەخت بوو)[12] بوو. ڕامبەخت کە بانگەوازی مار ئیسحاقی بیستەوە، هەستا چووە لای و لە بارەی ئایینەکەی پرسیاری لێ کرد، ئایینەکەی زۆر بە دڵ بوو، حەزی کرد بیکات بە ئایینی خۆی. دوای چەند ڕۆژێک ئیسحاق بە نهێنی لە ترسی ڤالکیش (فۆلوگیسی دووەم) پاشای پارپەکان (٧٨/٧٧ - ١٤٧/١٤٦ز) ئەو پیاوەی تەعمید کرد، ئیتر لە سایەی ئەو پیاوە، کونستانتی سەردەمی ئیسحاق، باوەڕی عیسایەتی لە هەموو گوندەکانی دەوروبەریان بڵاوبووەوە. ئەوسا موگە کافرەکانی ماگی (مەجوسی) سەریان بەرامبەر ئەو بەرزکردەوەو هەوڵیان دا لە باوەڕەکەی هەڵیبگەڕێننەوە، کە زانییان هەوڵدانەکەیان بێ سوودە، ڕێکەوتن کە بە ڕێگایەک بیکوژن. تا باوەڕی مەجوسایەتیان لە ژیاندا بۆ بمێنێتەوە. مامۆستا ئابل بەسەرهاتەکە ئاوا دەگێڕێتەوە:

"موگەکان فەرمانیان بۆ موگەکانی تری ئایینەکەیان نارد، ئەوانەی کە لە ناوچە شاخاوییەکانی تر دەژیان، کە گەرەکە جل و بەرگی خۆیان بگۆڕن و خۆیان لە بەرگی خان و پیاوماقووڵانی هەرێمە دوورەکان پێشان بدەن، بێن و بچن بۆ لای ئەو پیاوچاکەی خودا (ڕاکبەخت) و خۆ وەکو مووسافیران پیشان بدەن، کە ویستیان بگەڕێنەوە بچنە لای ئەو و تا درەنگی شەو لای بمێننەوەو لە کۆتایی شەودا بیکوژن و پاشان بەرەو وڵاتی خۆیان بگەڕێنەوە.

بەڵام ئەو دوژمنانەی خودا و دۆستانی ئەهریمەنی نەفرەت لێکراو، چەندیان بە خوانەناسی و بە نهێنی لە لایەن موگەکانی هاوڕێیان بۆ دانرابوو، چەندەها ئەوەندەی تریشیان خستە سەر. ئەوە بوو چەندەها نۆکەری خۆیان بەر لە خۆیان نارد، تا هەواڵ بۆ ڕاکبەخت ببەن، کەوا چەند کەسانێکی گەورەو دیاری وڵاتە دوورەکانی ڕۆم بە ڕێگاوەن و دێن و دەیانەوێ شەوێک لەلای ئەودا میوان بن. بۆیە ئەو وا جوانە کە ژەمێکی شایستە بۆ ئەو پیاوانە و دار و دەستەکانیان ئامادە بکات.

کە ڕاکبەختی پیاوچاکی خودا ئەوەی بیست بە پەلە نەخشەی هەموو پێویستییەکانی جێبەجێ کرد. گیانی ڕاکبەخت لە خۆشییان بۆ خودا لە خورپەدا بوو، بەوەی بەڵکو بتوانێت بەم بۆنە ئەم مرۆڤانەش بێنێتە سەر ڕێگای خودا، دامەزرێنەری زەمین و ئاسمان. کە هەموو شتێک ئامادە بوو ڕاسپاردراوەکانی ئەهریمەن بە سواری مایینی

رازاوە گەیشتن. بەڵام چونكە خودا هەر چاكەی دەوێت بۆ ئیسرائیل و مرۆڤە دڵپاكەكان (پسالم: ٧٣،١)، لێ نەگەڕا كە تیری بەدكاران، ئەو تیرەی كە ئەوان خستبوویانە سەر ژێی كەوان ئەو زامار بكات. بۆیەشە لە كاتێكدا كە ئەوان لەسەر نانخواردن بوون، نێردراوێك لە تسەیفونرا[١٣] هاتبوو تا راسپاردەی فولوگیسی پاشا بەو پیاوچاكەی خودا رابگەیەنێت، كە "ئەگەر حەز دەكات دەتوانێ بەبێ وەستان بەرەو تسەیفون بچێت تا بە هێزی هەردوو لا بتوانن گەلە یاخی و پەلاماردەرەكان دابمركێننەوە، ئەوانەی كە هێرش دەهێننە سەر ناوچە شاخاوییەكانی كاردۆ و تا ئێستا چەندەها شاریان وێران و تاڵان كردووە." ئەویش یەكسەر هەستایە سەرپێیان و مێوانە ئەهریمەنییەكانی بە برا كافرەكانی خۆی راسپارد و پێی گوت، كە دەیەوێت لەشكر تەیار بكات و هەر خۆشی لەشكرەكە بەرەو تسەیفون سەركردایەتی بكات. جا بێ وەستان لەگەڵ قاسیدو هەندێ لە كەس و كارەكانی كەوتە رێ. بەو جۆرە تۆری موغە ساختەچییەكان لێك هەڵزڕاو راكبەختی پشت بە خوا بەهێز رزگاری بوو (پسالم: ١٢٣،٧). ئیتر ئەوان هەموو رك و كینەی خۆیان بە رابەری پیاوچاكی خودا (ئیسحاق) دەركرد. دوو رۆژ دواتر هاتن و گرتیان و لە ژوورێكی تاریك بەندیان كرد، ویستیان بیكوژن، بەڵام لە ترسی توورەیی و وروژانی خەڵك لە لایێك و لە لایێكی تر لە ترسی راكبەختی سەرلەشكر نەوێران.

كە راكبەختی هەمیشە پشت بە خودا سەركەوتوو بەو هەواڵە ناخۆشەی زانی، لە تسەیفون را فەرمانی ناردەوە، ئەو بەندەیەی خودا (ئیسحاق) ئازاد بكەن، لە بەندیخانە دەری بهێنن و ئازادی تەواوی بدەنێ، زۆر سوێندی خوارد و هەڕەشەی كرد، كە هەر كەسێكی فەرمانەكەی بشكێنێ و دژی بووەستێ دەیكوژێت! بەمجۆرە پێغەمبەری خودا لە بەندیخانە ئازاد كرا.

بەڵام راكبەختی بەهێز و ئیرادە شازدە رۆژان لە تسەیفون مایەوە، لەوێرا ئەرشاك (ئەرساكیس)ی[١٤] سەر لەشكر سەربازێكی زۆری لە دەوری خۆی كۆكردەوە، نزیكەی بیست هەزار سەربازی پیادە، هێرشی كردە سەر ناوچەی یاخییەكان. هەر خوا بە خۆی دەزانێت لە مارشەكەیان تووشی چ دژوارییەك بوون و چەندەها رێگەی رژد و سەختی شاخاوییان بڕی. كە گەیشتنە یاخییەكان، چەند شەڕێكی بچووك لە نێوانی هەردوو ئۆردوگا روویدا، یاخییەكان لەو شەڕانەدا شكان، بەڵام لە كۆتایی جەنگەكە یەكێ لە سەركردەی یاخییەكان، كە ناوی كیزۆ بوو، لەشكری ئەرشاكەكانی راكێشا بۆ ناو دۆڵێكی میان شاخەكان و چوار دەوری گەمارۆدان. ئیتر سێ رۆژان زۆر بە گەرمی دژی یەكتر جەنگین، لە ئاكامدا سەربازەكانی ئەرشاك بە هۆی برسییەتییەكی زۆر، تووشی بێهێزی بوون، هیوایان بە سەركەوتن نەماو دەستیان پێكرد كە رابكەن. لەو كاتەدا راكبەختی ناودار لە ئۆردوگای سەربازان هاتە دەرەوەو بانگی پاسەوانە تایبەتییەكانی خۆی كرد بۆ لایێك. جا چۆن هەڵۆیێك بەسەر هێلانەكەیدا دەفڕێت، ئاوا بەسەر شاخێكدا هەڵگەڕا (Deut. ٣٢، ١١)[١٥] یاخیبووەكانی تووشی شكەستێكی گەورە كرد، رێگایێكی كردەوە، تا ئەرشاك و لەشكرەكەی پێیدا خۆ لە چنگی ئەو گورگە هارانە رزگار بكەن. ئیتر بۆبەش قارەمانی خودا كەوتە ناوەراستی ریزەكانی دوژمن. یەكێك لە دوژمنەكان لاتەنكێشێكی راكبەختی بە سەرەنێزەیەك كونبەدەر كرد، بەو هۆیە كەوتە سەر زەوی و هەروەكو "یوداس مەكابویس"[١٦] گیانی خۆی لە رێگای خودا پێشكەشی گەلەكەی خۆی كرد، چونكە ئەگەر ئەو ئاوای نەكردبایە ئەوا هەموو سەربازەكان لە دەست دەچوون.

كە یاخیبووەكان ئەوەیان زانی ویستیان تا دەشتاییەكان دابەزنە خوارەوەو هەموو شارەكانی ئەرشاك وێران بكەن، بەڵام هەواڵیان بۆ هات، كەوا قەومێكی تری بەربەری لە دەریاوە پەڕیونەتەوە ئەو بەرەوەو چەتە ئاسا هاتوونەتە پێش و خەریكن شارەكانیان وێران دەكەن و دەسووتێنن و سەروەت و سامانیان، بگرە تا ژنەكانیشیان بۆ خۆیان دەبەن. بۆیە بە پرە پڕ بۆ دواوە گەڕانەوە، تا بەهانای وڵاتەكەی خۆیانەوە بچن. كە گەیشتنە جێ دوو مانگی رەبەق خەریكی جەنگ بوون، تا توانییان بەسەر ئەو قەومەدا زاڵ بن و ئاودیوی ئەوبەری دەریایان بكەنەوە

ئای وڵاتەكەی ئێمە چەندە غەمبار بوو، كە پەیكی ماتەمئامێزی مەرگی راكبەختی بۆ هاتەوە. هیچ خامەیێك توانای دەربڕینی نییە. فرمێسكی دیانە راستینەكان زۆر رژایە خوارەوە، شینیان دەكرد وەكو شینی حەزرەتی داود بۆ یوناتان[١٧]، ئەو پاڵەوانە لە جەنگدا كوژرا! یوناتان، كوژراوەكان لەسەر گردەكانی تۆدا كەوتوون، من زۆر

خەفەتبارم، براکەم یوناتان، تۆ لای من زۆر خۆشەویست بوویت (II.Sam.I، ٢٦،٢٥). کێ دەتوانێ بزانێت، کە ئیسحاق چەندە بۆ مەرگی یارمەتیدەرەکەی خەفەتبار بوو! وا باشترە بۆ ئێمە هەر لێی بێ دەنگ بین، چونکە لە ڕۆژی قیامەتدا هەمووماں بە ڕۆشنی دەبینین کە هەقیقەت چۆن بووە.

### .IV
### ئەبرەهام

ئەوەندەی نەبرد، قەشە ئیسحاقی خۆشەویستی خوداش، دوای ئەوەی ١٣ ساڵان کورسی قەشایەتی بەڕێوەبرد کۆچی دوایی کرد. ئەو پیاوە خەمخۆرە، کە شەیدای ماڵی خودا دەروونی داخورپاندبوو (پسالم: ٦٩،١٠)، کڵێسایەکی گەورەی ڕێکوپێکی ئاوا کرد. ئەو کڵێسایە تا ئەمڕۆش هەر ماوەو بە ناوی خۆی ناو دەبرێ. دوای ئیسحاق مامۆستا ئەبراهام هات، کە کوڕی پیاوێکی زۆر چاک بوو بە ناوی (سالۆمۆ Salomo)، تیرەکەیان لە (حەردا Herda)وە، کە گوندێکی دەوروبەری قەڵاتی (هێبرییەر Hebraer)[18] سەری هەڵدا بوو، باپیرەی لە ئەربێللا نیشتەجێ بوو، کە ئەو هێشتا منداڵ دەبێت، دایک و باوکی لە سەردەمی قەشایەتی سیمسون دەبن بە مەسیحی. ئەوەش بەبێ ماندوو بوون و بێ ورە بەردان، بە دڵسۆزییەکی لە ڕادەبەدەر لە نێوان شاخە بەرزەکان، ماوەییەکی زۆر خەریکی خزمەتکردنی ئایینی عیسایی بوو، لە فێرکردن و خواپەرستی ڕاستەقینە و تەعمیدکردن بە ناوی باوک و کوڕ و گیانی پیرۆز (مەتتی:٢٨،١٩).

لەو کاتەی کە ئەو لە نێوان شاخە بەرزەکان ڕابەرایەتی خەڵکی دەکرد و باوەڕی عیسایەتی پێ دەناساندن، ماگییەکان دژی دیانەکانی وڵاتی ئێمە سەریان بەرز کردەوەو سەروەت و سامانیان لێ تاراج دەکردن و بێ بەزەییانە خراپەیان دەرهەق دەکردن. کە هەواڵی ئەوە گەیشتە مار ئەبرەهامی جوامێر، لە شاخەکان دابەزییە خوارەوە، بە هۆی پێشاندانی نیشان و پەرجووان، بە ژیری و تێگەیشتوویی خۆی توانی ڕێگە لەو گورگە دڕندانە بگرێت و نەهێڵێت هەموو لە خوا ترسەکان لە ناو بەرن، دوای ئەوەی ئەوانی ئارام کردەوە چووە خوار بەرەو تسەیفون.

فۆلوگیسی پاشای دووەم مرد. فۆلوگیسی سێهەم (١٤٨/١٤٧-١٩١) هاتە جێگەی. پیاوی خودا دیارییەکی زۆری لەگەڵ خۆ برد بۆ گەورەکانی پایتەخت، تا بەو هۆیەوە بتوانێت، دەفتەرچە (ناسنامە) بۆ دیانەکانی وڵاتەکەی لە پاشای کافر وەربگرێت، تا چیتر بەبێ هۆ ماگە خوانەناسەکان تەنگیان پێ هەڵنەچنن، بەڵام باری نائارامی ئیمپراتۆر ڕێگەی ئەوەی نەدا کە بگاتە ئەو ئاواتەی. چونکە لەوێ لە هەموو لایێکەوە لەشکر تەیار دەکراو دەیانویست هێرش بکەنە سەر وڵاتانی ڕۆم. بۆیە ئەو گەڕایەوە بەبێ ئەوەی هیچ دەفتەرچەیەک لەگەڵ خۆی بهێنێتەوە. بەڵام خودا نەیویست تەماعکارەکانی پاشا سەرکەوتن بەدەستبهێنن، بۆیە لە دوای پێکدادانێکی زۆر پارپەکان بەزین و لەلایەن لەشکری ڕۆمەکان ڕاونران، تا لەناو تسەیفونیان کردنەوە، خودا ویستی تۆڵە لە هەردوو لا بستێنێتەوە، بۆیە تاعوونێکی گەورەی هێنا سەریان، زۆریان بەو تاعوونە مردن، ڕۆمەکان بە ناچاری بەرەو وڵاتی خۆیان بە ڕاکردن گەڕانەوە، بەڵام بەوەش نەیانتوانی خۆیان دەرباز بکەن، تاعوونەکە بە دوایان کەوت و گەلێکی لێ لەناوبردن زۆر گەنجینەیان بۆ پارپەکان بەجێ هێشت، چونکە لە ترسان پێ ڕانەگەیشتن لەگەڵ خۆیانی بەرن، تاعوونکە سێ مانگی خایاند، گەلێک بنەماڵەی لە بنوبۆتکەوە براندەوە.

کە تاعوونەکە گەیشتە وڵاتی ئێمە، ئەبراهامی پیاوچاک بە هەموو هێزی خودایی دەروونی خۆی هەوڵی دا دڵی ئەو بروادارانە بداتەوەو یارمەتییان بدات، کە تووشی نەخۆشییەکە ببوون. پاشان خۆشی زۆر بە سەختی تووشی نەخۆشییەکە بوو، دەستی خۆی خستە سەر نووحی خزمەتکاری (دیاکۆن) و کۆچی دوایی کرد، تا پاداشی باشی کارە چاکەکانی لە دادگەری ڕۆژی دادپەروەری وەربگرێت. کەواتە ئەویش ١٥ ساڵ کورسی قەشایەتی بەڕێوەبرد.

### .V
### نووح

دایک و باوکی ئەو پیاوە ڕەوحانییە خەڵکی دەشتاییەکانی (ئەنبار)[19] بوون و بەرەو ئورشەلیم چووبوون. وەکو منداڵێک تێکەڵی دیانەکانی ئەوێ ببوو.

بە هێزی چاکەی خودایی تەعمید کرابوو. لە دوای ئەوەی دایک و باوکی بەرەو رۆژهەلات گەرابوونەوە، هاتبوونە ئەدیاباتە، چونکە ئەدیاباتە زۆری جوولەکە لێ بووە، لە لایێکی تر ترسابوون بگەرێنەوە کۆنە ولاتی خۆیان، چونکە ئەوێ تووشی شەرو شۆرو ناارامییێکی بێ کۆتایی هاتبوو. کە مندالەکە بیستی لێرەش دیان هەن، چووە لای ئەبرەهام و ئیتر دەستی پێکرد ژیانی خۆی بە هاتوچۆی لای ئەو ببـاتە سـەر، بە هۆی رۆژووگـرتن و نوێژی بەردەوام و شەونخوونییەکی بێ ژمار توانی بگاتە پلەیەکی بەرزی پیرۆزایەتی و وەرگرتنی شەرەفی دیدەنی تەماشاکردنی خودا، بە جۆرێک کە دەیتوانی زۆر نیشان و پەرجووان وەکو پەیامبەر نیشان بدات. کێ دەکارێت ئەو هەموو ئاتاجی و چەوساندنەوەی کە ئەو لە ئەنجامی ئەمە لە لایەن بێ بڕواکانەوە بە تایبەتی لە لایەن ماگەکان تووشی هات بژمێرێ! ئاوایە بەشە چاکەکەی کە دەدرێت بە پەیامبەران و لە رێگەی ئەوانیشەوە دەدرێت بە گشت کلێساکانی خودا. بیر لەو قسەیە بکەنەوە، ئەوەی کە من بە ئێوەم گوت: "بەندە لە خودانی خۆی گەورەتر نییە، ئەوان منیان چەوساندەوە، ئەوان ئێوەش دەچەوسێننەوە" (ئینجیل یوحەننا ١٥، ٢٠) دواتر من ئاوام بە ئێوە گوت: "تا ئێوە خۆتان دلپەست نەکەن" (ئینجیل یوحەننا ١٦،١). چونکە ئەوان دێن و لە کۆبوونەوەکانتان بە سەرتاندا دەدەن، وە ساتێکیش دێت، کە هەر کەسێکی لەوانەی ئێوە دەکوژێت، وا باوەر دەکات، کە قوربانییێک بۆ خودا دەدات (ئینجیل یوحەننا: ١٦،٢) کەواتە ئەوە کلێسایە ئیمپراتۆریەتی رۆحی خودا لەسەر زەوی بەلام ئەو ئیمپراتۆریەتە بە پیاو خراپ و نەهیکار ماگ و کافران دەورە گیراوەو هەموو کاتێک بەگژیدادەچن. ئێمە هیوای ئەوەمان هەیە کە هەمیشە لە درەوشانەوە و سەرکەوتن دابێت. چونکە خودای ئێمە گوتوویەتی: "من بە سەر جیهاندا زال بووم" (ئینجیل یوحەننا: ١٦،٣٣) دەروازەکانی دۆزەخ (کلێساکانم) نابێت بگەن بە ئێوە (ئینجیل مەتتی: ١٦،١٨.) ئەو دوژمنایەتیەی نێوان کلێساکانی خودا و دنیا هەرگیز کۆتایی نایێت، تا لە کۆتایی کاتدا، ئەو کاتە پووش و پەلاش لە گەنم جیا دەکرێنەوە، فرێ دەدرێنە ناو ئاگر و هەتا هەتا دەسووتێن (ئینجیل مەتتی ١٣، ٣٠). نووحی برۆادار ئەو هەموو پەیڤانەی لە یاد بوو، کاتێ پێنج جاران فرێیان دایە ناو بەندیخانە، دەریاکانی بەختەوەری بە سەریادا رژان، کاتێ دوازدە جاران خرایە ژێر دار و قامچی، بە شێوەیەک تا خوێنی لە بەر دەرۆیشت وەکو مەری بەر دەستی قەساب کپ دەبوو (Jes.٥٣، ٧).

تا لە ئاکامدا خودا ویستی بە خودی خۆی تۆلەی ئەو پیاوچاکەی خۆی بکاتەوەو لە دەستی بێ بڕواکان رزگاری بکات، بەوەش قسەکەی داود هاتە دی: "من لاو بووم و پیر بووم هەرگیز نەمدیت هەقدارەکان بخرێنە پشت گوێ" (پسالم ٣٧،٢٥). رۆژێک کوری پیاوێکی بەناوبانگ و دەولەمەند بە ناوی (رازشاه)[٢٠] لە گوندێکی ئەدیابانە لە سەربان کەوتە خوارەوە قاچی شکا و جومگەی ئانیشکی بریندار بوو. کە ئەمە رووی دا رازشاه لە مالەوە نەبوو، بە هۆی بازرگانییەوە چووبوو بۆ شاری ئەربێللا. بە دلتەنگی و بە گریان شاری بەجێهێشت تا بزانێت رووداوەکە گەیشتۆتە کوێ. لەو کاتەشدا بوو کە نووحی پیاوچاک لەو گوندە گەورەیەی زاب بوو، چونکە ئەو لە ژەهرەی ماگەکان هەلاتبوو، خۆی لەو گوندە حەشار دابوو، کە رازشاه گەیشتەوە جێ و دیتی کورە تاقانەکەی وا لە دەرگای مەرگ دەدات، لە تاوان هۆشی لەبەر خۆی نەماو خۆلەمێشی بە سەر خۆی و هەموو مالەکەیدا کرد. ئەوسا پیاوچاکی خودا لەوێ بەدیارکەوت و بەلێنی بە کەس و کاری مندالەکە دا، کە ئەگەر بێت و ئەوان بروا بە حەزرەتی عیسا بهێنن، ئەوا کورەکەیان بۆ چاک دەکاتەوە. ئەوانیش وتیان: "ئەگەر تۆ ژیانێکی نوێ بدەی بەو کورە خۆشەویستەمان، مەرج بێت هەرچی تۆ بخوازیت ئەوە دەکەین". ئیتر ئەو پیاوچاکە دەستی بە پارانەوە کرد لە خودا: "ئۆه خودایە، خودای باوکان، ئەی ئەوەی دەسەلاتی خۆت بە خەلک و بە گەلان پیشانداوە، تۆ ئەی ئەوەی لە رێگای حەزرەتی مووساوە نیشانەی لە رادەبەدەر گەورە گەورەت پیشانداوە و کورانی ئیسرائیلت بە قارەمانییێکی زۆر بەرەو رزگاری رانمایی کرد، تۆ! ئەی ئەوەی کە لە رێگای پێغەمبەرەکانت نیشانی هەموو مرۆڤایەتیت داوە، کە تۆ مەرگی گوناهباران ناخوازیت، بەلکو خوازیاری ئەوەیت کە ئەوان لە گوناهەکانیان پەشێمان ببنەوەو بژین (Ezech. ٢٣، ١١). تۆ ئەی ئەوەی (لازاروست)[٢١] لە خەوی مەرگ وەئاگا هێنا، دوای ئەوەی کە چوار رۆژ بوو خەوی لێ کەوتبوو (ئینجیل یوحەننا: ٤٥-١٧، ١١) تۆ ئەی ئەوەی کە

فەرمووتانە: "هەر کەسێک بڕوا بە من بهێنێت، دەتوانێت پتر لەمەش بکات، تۆ ئەی ئەوەی لە ڕێگای قارەمانکارییە مەزنەکانی پێغەمبەرەوە، ناوی تۆ گەیشتە هەموو شوێنێک و کڵێسای تۆ لەسەر تاشە بەردی نەبەزی "سیمون کەفاس"[٢٢] دامەزرا (ئینجیل مەتتی ١٨،١٦)، تۆ ئۆهـ خودای من! تەماشای ئەو بەندەیەی خۆت بکە، منداڵێکی ساوایە، لە چارەی پاکی ڕا دیارە کە بڕوای بە تۆ هەیە، کە هەر تۆ خودای راستەقینەی (ئینجیل یوحەننا ٣،١٧)، بە بەزەیی خۆت سەیری ئاپۆڕەی ئەو خەڵکە بکە کە لێرە کۆم بوونەتەوەو چاوەڕوانی بەزەیی تۆ دەکەن، گیان بێنەوە بەر ئەوە کە نەخش و نیگاری دەستی تۆیە، نەخۆشییەکانی لەشی چاک بکەرەوە!."

لەگەڵ دەربڕینی دوا وشەی نیشانەی خاچی بە سەر منداڵەکەدا کێشا، یەکسەر هەستایە سەرپێیان، ساغ و سەلامەت، بێ ئێش و ئازار، بێ هیچ کەم و کوڕییەک لە لەشی، خەڵکێکی زۆر هەواڵی ئەو پەرجووەی بیستەوە، هەرکەس لە ڕاستە خۆی سوپاسی خودای کرد، کە رووناکی خۆی لە ڕێگای ئافەریدەکانی خۆی بە دەردەخات. رازشاه و کەس و کارەکانی بەڵێنەکەی خۆیان هێنا دی، خۆیان تەعمید کرد و تا کۆتایی ژیانیان ژیانێکی پیرۆزانە ژیان.

نووحی پیاو چاکی خودا لەوێ هەر لە ماڵی رازشاه مایەوە، لە ترسی ماگەکان نەوێرا بگەڕێتەوە ئەربێللا، هەموو خەڵکی گوندەکەی هێنایە سەر ئەو باوەڕە راستە. بەرەو ناوچەکانی نەینەواش چوو ناوی خودای گەیاندە زۆر لەو گوندانەی، کە هێشتا ناوی خوایان نەبیستبوو. لە یەکێ لەو گوندانە کە ناوی (ڕێشی)[٢٣] بوو، دار قەزوانێکیان دەپەرست، خەڵکی هەموو گوندەکەش هاتنە سەر ئەو باوەڕی کە مەسیح، ئەوەی کە جوودەکان لە خاچیان دا، بەڕاستی ڕۆڵەی خودا بوو.

یەکێ لە یاسا ئایینییەکانی ئەو گوندە ئەوە بوو، کە نەدەبووایە خوێن لە دەوروبەری ئەو دارەدا بڕێژرێت، ڕۆژێک منداڵان لە نزیکی ئەو دارە گەمەیان دەکرد، دیتیان وا ماریکی ڕەش بە دارەکە هەڵدەگەڕێت، بە ویستی خودا منداڵەکان مارەکەیان دا بەر بەردان و کوشتیان، خوێنی مارەکە کەمێک لەوێ ڕژا، کە ئێوارە داهات خەڵکی گوندەکە هاتن بۆ پەرستنی دارەکە، هەموو سەریان سوڕما کە چاویان بە خوێنەکە کەوت، لە ترسی خواکەیان هەموو هەڵاتن، خەفەت دایگرتن، دیارە کە خودای پیرۆزیش خۆی لەوێ بوو، بە بەزەیی گیانی پیرۆز خودا نیشانەیەکی خاچی لە سەر دارەکە کێشاو، درەختەکە لەوێ گوم بوو. بەڵام دوای چەند ڕۆژێک خەڵکێکی زۆر درەختەکەیان لە شاری داقووق لە خوار کەرکوک، لەسەر ڕێگەی کەرکوک بەرەو بەغدا، بە چەقاوی دۆزییەوە. لە بەر هەندێ ئەو کافرانە نووحی پیاوچاکیان گرت و دەست و پێیان بەستەوەو ویستیان بیسووتێنن. چونکە وایانزانی سەرچاوەی ئەو هەموو بەڵایە لە سەرەتا تا دوایی ئەوە. کاتێ خەریکی ئەوە بوون ئاگریان لە دارەکان بەردەدا، دیتیان درەختەکە هاتەوەو لە جێگەی خۆی چەقییەوە، بەدکارەکان بە یەکتریان گوت: "بەڕاستی دیارە خوا حەز ناکات ئێمە ئەو پیاوە بکوژین، لە بەر هەندێش ویستمان دەست بە سووتانی بکەین، خواکەمان دیسان هاتەوە، ئەوە بە ئاشکرا دەیەوێت پێمان بڵێت کە ئێمە نابێت ئەو پیاوە بکوژین، ئێمە ناتوانین داخوازی خودامان ڕەت بکەینەوە، کە ئاوا ویستەکانی خۆی دەردەبڕێت، ئەو پیاوە وەکو گوڵە باخێک وایە کە بارانی بە سەردا دەبارێت دەگەشێتەوە، کە تیشکی ڕۆژیش لێی دەدا دەژاکێتەوە، بەڵام کە دیسان باران بە سەریدا دەبارێتەوە لە جاران گەورەتر دەبێت، ئەو نووحەش وەسایە، ئەو ژاکابووەوە، بەڵام خودای ئێمە ویستی لە دەست ئێمەدا ڕزگاری بکات و بارانی بە سەردا باراند، بۆیە ئێمە دەمانەوێت وازی لێ بهێنین و ئازادی پێ بەخشین. تا پێی قورسی خودامان نەکەوێتە سەر."

کە پیاوچاکی خودا دیتی ئەوان خەریکی ئەو باسانەن، دەستی کرد بەوەی بڕوای راستەقینەی عیسایەتییان پێشان بدات، زۆر لەوان بڕوایان پێهێنا، یەکێ لەوانە سەرۆکی گوندەکە بوو ناوی رازمەردۆخ بوو، لە ڕێگای شەیدایی ئەو پیاوە، ئەوەی خوای کرد بە بەرگی خۆی، پووش و پەڵاش و زیوانی ماگەکان لەو شوێنە بنبڕ بوون، باوەڕی حەزرەتی مەسیح باڵا دەست بوو بە سەریانداو لە شوێنەکەیاندا ڕووا. نووحی پیرۆز لە خوا ساختەکان بە دووری خستنەوە، لەوانەی کە گوێیان هەیە و نابیستن، دەمیان هەیە و قسە ناکەن، چاویان هەیە و نابینن (پسالم: ٦-٥، ١١٥).

لە ماوەی چەند مانگێکی کەم نووحی ڕەوحانی خەڵکی هەموو گوندەکەی تەعمید کرد و ساڵێکی تەواو ڕێنمایی کردن. پاشان بە نهێنی گەڕایەوە بۆ ئەربێللا و دوای ئەوەی دوو ساڵی تر لە ڕەزی یەزداندا خزمەتی کردو زۆر پریستا[٢٤] و دیاکۆنی پێگەیاند، بەرەو خوای خۆی

كۆچی دوایی كرد. تا پاداشتی خۆی لە خودا وەربگرێت، ئەو پاداشتەی كە بە كردەوە جوانەكانی، بە ناوبانگی چاكە و شەونخوونی و سەركەوتنەكانی، بە ژیانی پڕ نیشان و پەرجووی، شكۆدارانە بۆ خۆی مسۆگەری كرد، ئەو شازدە ساڵان زۆر دیانی هۆپارشییەكەی ئێمەی ڕێنمایی كرد، دوای مەرگی ئەو، كڵێساكان بێ شوان مانەوەو لە دەستی ركوكینەی بێبڕوا و ماگەكان سێوی بوون. ئەوسا براكانمان لەوپەڕی تەنگانەدا بوون، زۆریان لەوان كە تازە بوون و بڕوایان هێشتا لاواز بوو، دووبارە هەڵگەڕانەوەو بڕوایان بە شەیتانەكان هێنایەوە. چونكە دیتیان ماڵەكانیان تالان دەكرێ و، كوڕ و كچەكانیان دەفڕێندرێن و سەرەنگوم دەكرێن، خۆشیان لەلایەن شاگردانی دوژمنانی تیرەی مرۆڤ دڕندانە دەچەوسێندرێنەوە.

### VI.

### هابیل (ئابل)

چوار ساڵان دواتر دیانەكانی ناوچەكەمان بە بەشداری پریستا و دیاكۆنەكان كۆبوونەوە، بۆ ئەركەكانی قەشایەتی مار (هابیل)یان هەڵبژارد و ناردیانە (حینایتا Henaitha)، تا لەوێ قەشەی شاردكە (زێخائیشو) پیرۆزی بكات (ئیجازەی قەشایەتی بداتێ ع.د). بۆ ئەوەی بیرەوەری نووحی ڕەوحانی لە بیری بڕواداران نەكوژێتەوە، هەستان كڵێسایەكیان بە ناوی نووح ناواكرد، تا ئێستاش شوێنەوارەكەی دەناسرێتەوە، ڕۆژانە دیانەكان دەچنە زیارەتی و لە پەناكەی دادەنیشن و بۆ مرازەكانی خۆیان و خێزانەكانیان لێی دەپاڕێنەوە.

ئاخ پێنێهاسی خۆشەویست! پیاوانی ئاوا لە وڵاتەكەی ئێمەدا سەریان هەڵدا، بۆ ئێمە بوون بە نموونەی كردەوەی چاك و پیرۆزایەتی، بۆ ئەوەی ئێمەش وەكو ئەوانمان لێ بێت دەبێت هەمیشە تێبكۆشین.

مار هابیل كوڕی پیاوێكی دارتاش بوو (دارتاشی كەرەسەكانی خانووبەرە ع.د) لە گوندی (زایرا)[٢٥]. كە گەورە بوو باوكی كردی بە شوانی مەڕەكانی خۆیان، لە منداڵییەوە خاوەنی خووڕەوشتێكی جوان بوو، كەسایەتیەكی دیاری هەبوو، هەرچی چاوی پێبكەوتبایە حەیرانی دەبوو. یەكێك بوو لەو خەڵكە سادانەی كە پەیامە ئینجیلییە پیرۆزەكان باسی كردوون و مۆژدەی بەهەشتی پێداون: "مرۆڤە سادەكان گیانیان بەختەوەرە، چونكە خاوەنی سامانەكانی ئاسمانن (ئینجیل مەتتی٣.٥). بەهیچ شێوەیەك دڵی نەدەچووە سەر ماڵی دونیا، باوكیشی چاك لەوە گەیشتبوو، كە كوڕەكەی عەوداڵی گەنجینەكانی زەوی نییەو بەدوای شتێكی تردا دەگەڕێت. كە لەبارەی باس و خواسی دنیا قسەیان لەگەڵدا دەكرد، ئەو بایەخی زۆر پێ نەدەداو خۆی بۆ كۆكردنەوەی سامانی دونیا ماندوو نەدەكردو ئەگەر لە شتێكی كەم بایە، خۆی تەنگەتاو نەدەكرد و بەسەرە خۆیدا نەدەهێنا.

لەبەر هەندێش بوو زۆر جاران ئاگای لە مەڕەكانی نەدەماو بە تەنها لەلای سەگەكەی بەجێی دەهێشتن و خۆشی دوور دەكەوتەوەو دەچووە ناو ئەشكەوتێك و بیری لەو جیهانە دەكردەوە. هەر لەسەر ئەمەش بوو و كە باوكی خۆشی نەدەویست.

جارێكیان هابیل لەناو شاخەكان دوو مەڕی لێ ون بوو، ئیتر یەكسەر باوكی لەماڵەوە دەری كرد. بۆ ڕۆژی دوایی هەردوو مەڕەكە خۆیان سەربەخۆ گەڕانەوە بۆ ناو مێگەلەكە، ئەوسا باوكی لە بەدەرنانی كوڕەكەی زۆر پەشیمان بووەوە. بەڵام كوڕەكەی ڕووی خۆی لە ئەربێللا كردبوو، لەوێش بە ویستی خودا ڕێی كەوتبووە كڵێسای دیانەكان، ئەوانیش لە ڕاهی خودا خواردن و خواردنەودیان دایێ و یەكێكیش لەوان شەو لەلای خۆی دەینواند. دوای چەند ڕۆژێك منداڵەكە داوای لێ كردن كە تەعمیدی بكەن، دوای دوو ساڵان بۆ ماوەی شەش مانگان بووە خزمەتكاری[٢٦] مار ئەبرەهام. كە ئەبراهامی پیاو چاك و پیرۆز كۆچی دوایی كرد، هابیل خۆی لە نووحی بەهەشتی (جێگرەكەی ئەبرەهام) جودا نەكردەوەو وەكو باوكی خۆی خۆشی دەویست. هەروەكو لەسەرەوە گوتمان كە ئەو باوكە (ئابل) مرۆڤێكی بی گوناه و خاكی و هەژار بوو، بۆبەشە ئەو حورمەتەی پێ درا كە وڵاتەكە بە میرات وەربگرێت. " خاكییەكان خاوەنی سامانەكانی ئاسمانن، چونكە ئەوانن وڵاتەكە بە میرات وەردەگرن (ئینجیل مەتتی ٥،٥). ئەوەش وڵاتی ئاسمانە. بەهۆی پاكی خۆی، ئەو بەهرەیەی پەیدا كردبوو، كە بتوانێت تووڕەیی و جەنگی نێوان بڕوادار و كافرەكان دابمركێنێتەوە، دەیتوانی جڵەوی زمانی خۆی بگرێت، ئێمە بە زمان ناوی حەزرەت و باوك دەهێنین و هەر بە زمانیش نەفرەت لەو مرۆڤانە دەكەین، كە دروستكراوی نەخشی خودان" (یەعقوب: ٣. ٩). بۆیە

پێویست ناکات ئێمە بیری لێ بکەینەوە، کە ئەو زارۆکەکانی جیهانی خۆش دەوێت و خۆشی دەیانخاتە سەر رێگای خۆیان، چونکە پیاوچاکەکان تەواون (کامیل) و گیانی پیرۆزیان تێدایە، ئەوان هیچ خراپەیەک ناکەن و لایان ئاشکرایە، کە خۆشەویستی ئەو جیهانە وەکو دوژمنایەتییە لەگەڵ خودا (یەعقوب٤.٤).

لەو کاتەدا فۆلوگیسی چوارەم بوو بە پاشای پارپەکان، (١٩١-٢٠٨/٢٠٧)، دەسەڵاتێکی زۆری هەبوو، زۆر وڵاتی لە رۆمەکان سەندەوە. رووی لە وڵاتی فارسەکان کرد، ئەوانیش لە مێژ بوو هەر خۆیان چەکدار دەکرد، تا بەرامبەریان بوەستن و بێنە مەیدان. فۆلوگیس لەشکرێکی سەد و بیست هەزار سەربازی دژی فارسەکان بەرێخست. لە نزیک خوراسان گەیشتنە یەک، لە سەرەتا کە پارپەکان لە رووبارێکی بچووک پەرینەوە، دیتیان هەر چوار دەوریان بە لەشکری فارس و مادەکان گەمارۆ دراوە، دوای جەنگێکی گەرم پارپەکان شکان. دەستیان بە راکردن کرد، بە ریزی نارێک نارێک و بە پەرتوبڵاوی بەسەر شاخێکدا هەڵگەران و هەموو وڵاخەکانی سوارییان بۆ فارسەکان بەجێهێشت. بەڵام فارسەکان دوایان کەوتن و شاخەکەیان گەمارۆداو بێ ژمار لێیان کوشتن. پارپەکان دیتیان ئەگەر ئازایەتییەکی زۆر نەنوێنن و دەستێک نەوەشێنن، ئەوا مەرگ چاوەڕێیان دەکات، خۆیان کۆکردەوەو بە تەوژمێکی لە رادەبەدەر بۆ فارسەکان شۆڕبوونەوە خواردەوە، فارسەکانیان دەرپەڕاند و ئیتر ترسیان کەوتە سەر فارسەکان و فارسەکان هەڵاتن و ئەوان بە دوایان کەوتن تا دەریا، وەکو کلۆمەسکە[27] زۆر و زەوەند لاشەیان لێ بەردانەوە سەر زەوی. لە گەڕانەوەیان پارپەکان رووبەرووی ئەو فارسانە بوونەوە، کە لە لەشکرەکەی خۆیان دابرابوون، لە نێوان ئەوان و پارپەکان شەڕێکی نوێ بەرپابوو، شەڕەکە دوو رۆژی خایاند، شەوی سێیەم هەر دوو لایان لێی خەوتن، تا بۆ بەیانییەکەی بۆ رۆژی سێیەم درێژە بە جەنگەکەیان بدەن، بەڵام کە پارپەکان لە خەو هەستان دیتیان تاکە فارسێک لەوێ نەماوە، چونکە بەشەو هەموو رایان کردبوو، چووبوونە لای لەشکرەکەی خۆیان و یەکیان گرتبووەوە. بەو جۆرە پارپەکان بە سەرکەوتنێکی گەورە گەڕانەوە.

ئاخ پینێهاسی خۆشەویست، ئا لەو رۆژگارە لە هەموو لایێک هەر جەنگ بوو، لە هەموو جێگەیێک هەر هەواڵی ناخۆش دەگەیشت. ئەگەر خودا لە هەموو کاتێک لەگەڵ کڵێساکانی خۆیدا نەبێت، وەکو خۆی بەڵێنی داوە، هەموو وەختێک بناغەکانیان پتەو نەکات، گومانی تێدا نییە کە هەزاران جار نوغرۆ و تەفروتوونا دەبوون. ئێستا کە تەماشای وڵاتی رۆمەکان دەکەین، دەبینین لەوەتەی کڵێسا هەیە هەرگیز چەوساندنەوەی لەسەر لا نەکەوتووە، دەتوانین ئەوە لە کتێبی مێژوویی کڵێسایی[28] ئویزابیوسی قەیسەرییە فێربین، بۆیە هەرکەسێکی کە بیەوێت بزانێت، چۆن لە دوای ئاوەها دژوارییێک و ئەو هەموو جۆرە تەنگ پێهەڵچنینە، کڵێسا هەر لەناو نەچووە، چۆن یاسا و دەزگاکانیان هێشتان ژەنگیان هەڵنەهێناوەو لەناو نەبردراون، یەکسەر ئەو کەسە بڕوای تەواو بەوە دەهێنێ، کە کڵێساکان لە باوەشی خودادا، لە باوەشی باوکدا پارێزراون.

یەکەمین چەوسێنەری دیانەکان (نیرۆ)[29] بوو، ئەو گوناهبارە، تەنها بەوە وازی نەدەهێنا، کە دیانەکان ئازار بدات، بەڵکو هەوڵی ئەوەشی دەدا ئەوە بسەلمێنێ کە دیانەکان سەرچاوەی هەموو خراپەکارییەکی جیهانن. بۆیەشە بەشێکی زۆری شاری رۆمای ئاگر تێبەردا، پاشان جاری دا، کە ئەوە دیانەکانن، ئەو ئاگریان کردۆتەوەو فەرمانی دا کە دەبێت بێ بەزەیی پیاهاتنەوە لەناوببردرێن. ئەوساش ئەو بەدکارانە لە دوای بچووکترین بەهانە دەگەڕان، بۆ کوشتن و بنبڕکردنی براکانمان و ئازاردانیان بە هەموو جۆرێک. لەو چەوساندنەوە توندەدا، دوو پێشەوای ناوداری مزگێنیدەران کوژران. پەترۆسیان وەکو حەزرەتی عیسا لەخاچ دا و سەر بەرەو ژێر هەڵیان واسی، سەری پاولوسیان پەڕاند، لەو جێگایانەی کە ئەوانی لێ کوژرا، یەکسەر پنجە رووەکی رەنگاورەنگ لە زەوییەوە پشکووتن(٣٠)، وەکو بیرەوەری نەمریی ژیان و خەباتیان بۆ خودا، وەکو سکاڵایەکی شەرمەزارکەر دژی چەوسێنەرەکانیان، لە دوای نیرۆ هەندێ پاشای کافری تر سەریان بەرز کردەوە، هەموو جەللادە دۆزەخییەکان بە دوای دیانەکاندا دەگەڕان، بێ گومان ئەوە هەر شەیتان بوو، کە هەموو شتێکی خستبووە دڵیان و بە هەموو دەسەڵاتی خۆی یارمەتی دەدان، "دومیتیانوس مارکوس سیڤروس"[31] و زۆری تر وازیان نەدەهێنا و لە کوشتنی شاگردەکانی

حەزرەتی عیسا ماندوو نەدەبوون. دیانەکان لە هەموو لایەک خۆیان دەشاردەوەو بێ پشت و پەنا بوون. ڕایان دەکرد بۆ شاخەکان، بەڵام کافرەکان وەکو لیۆپارتی[٣٢] بە خوێن تێنوو بە دوایان دەکەوتن، ئەگەر لە ماڵەوەش بمابانایەوە، ئەوا لەگەڵ ژن و ماڵ و منداڵەکانیان وەکو بەرخ سەردەبڕدران، ئەگەر لە کوشتنیش بیان بەخشییان، ئەوا لە شاخەکان لە بەیانییەوە تا ئێوارە کاری سەختی بێگارییان پێ دەکردن.

بەڵێ ئاوا ببوونە کۆیلە، ئەوانەی حەزرەتی عیسای ڕۆڵەی خودایان بە ئازادی هەڵبژاردبوو، کردبوویان بە هاوڕێی خۆیان. ئای لەو ڕۆژە تاڵە پڕ لە ئازارەی کوێلایەتی کوڕانی خودا. ئەوانەی بە بێ ویستی خۆیان کرابوونە خزمەتکار و بەندی بتپەرستەکان (ڕۆمەکان: ٤.٤) (دۆمیتیانDomitian) دەریای تەوەزەلی و هیچ و پووچی و گەمەی منداڵانە و کانگای خراپەکاری، هەر کە بەدیار دەکەوت و لەگەڵ سوپاکەی خۆی چەکدار دەکرد، ئیتر ئەوەی بە دواوە کە دەقەوما هەمووی هەر کوشتوبڕی و چەوساندنەوەی دیانەکان بوو. ئەوە چۆن بوو ئەو دەستەی کە حوکمی یوحەننای مژدەدەری نووسییەوە، یەکسەر لە جوولە نەکەوت و گۆج نەبوو؟[٣٣] ئەدی ئەوە چۆن ڕوویدا، ئەو سزایەی کە ئەو لە سروشەکانی خۆی بۆ بەدکار و بێبڕواکان ڕایگەیاندووە، یەکسەر بەر دۆمیتیان نەکەوت و نەیخستە قوڵایی دۆزەخ؟ لەگەڵ هەموو ئەمانە، ئاخ پینێهاسی خۆشەویست! ئێمە باوەڕمان وەهایە، کە هەتا بەدبەختی پتر دەورمان بگرێت، ئەوە چاکەی ئێمەی پتر تێدایە، لەبەر هەندێش دوای ئەو هەموو دژوارییە دڵمان پڕە لە خۆشی. جووەکانیش بۆ کەمکردنەوەو سووککردنی ئازار و ژانەکانیان دەیانگوت: "لەسەر چەمەکانی بابل، لەوێ دانیشتووین و گریاوین" (پسالم: ١٣٧.١)، کاتێکیش کە ویستی خودا هاتەدی، لەسەردەمی خوسرەوی شا فارس، بە ئاوازی سوپاسگوزاری، سروودیان بۆ گەڕانەوەی خۆیان دەچڕی. ئێمەش هەر ئاوا، لەبەر ئەوەی "نارسای Narsai" پاشای ئەدیابانە، لەگەڵ پارپەکان نەچوو بۆ جەنگ، ئەو گورگە تاوانکارانە لە کینە و توورەییان هاروهاج بوون و دوای ئەوەی بە سەرکەوتوویی لەجەنگ گەڕانەوە، بەسەر وڵاتی ئێمەیان داداو شارەکانیان لێ تەخت و تاراج کردین، ئینجا گەڕانەوە بۆ ناوچەکانی خۆیان، بەڵام نارسای پاشایان لە ئاوی زاب خنکاند. بەو کوشتن و وێرانکارییە دیانەکانی وڵاتەکەمان زۆر ئازاریان چەشت و دەستی نزایان بۆ خوای زیندوو بەرزکردەوەو بەرامبەر ئەوی تاکو تەنها سروودی پەشیمانییان چڕی و وشەکانیان بەرەو ئەوی جاویدان بەرز کردەوە. ئەو کاتە ئابلی ڕابەری بەرخە زۆر لێکراوەکان بە هەموو گوندەکاندا دەگەڕا، هەروەکو لە کەسانی بڕوا پێکراو بیستوومانە، هێزی بە براکانی ئەوێ دەبەخشی، بۆ ئەوەی بتوانن بە بێباکی، لە پێناو خۆشەویستی داخوازییەکانی حەزرەتی مەسیح، بەرگەی ئەو تەنگپێهەڵچنینانە بگرن. ڕۆژێک کە ئەو لە یەکێ لە گوندەکان بە ناوی "ڕەحتا Rahta" دەبێت تایێکی گەرم دایدەگرێت، دوای ئەوە ئیبهیڤ - مەشیحای دیاکۆنی پیرۆز دەکات، لە شەوی ١٣ی ئەیلول کۆچی دوایی دەکات. خەفەتباری گەورەی دیانەکانی ئەو گوندە بۆ مەرگی ئەو لە باسکردن نایەت، پێنج مانگ دواتر حەشاماتێکی زۆری خەڵکی شاری ئەربێللا بە دوای تەرمی پاک و پیرۆزیدا دەچن، لاشەکەی کە هەروەکو خۆی مابووەوە، دەتگوت تازە مردووە، بە ڕێز و حورمەتێکی زۆر دەیهێننەوە بۆ کڵێسای شار. خودای گەورە بە پەرجوویێکی سەرنجڕاکێش کۆمەکی ڕێڕەوی دیانەکانی کرد، وەکو نیشانەیەک بۆ ڕەزامەندی خۆی لەو خزمەتانەی کە ئەوان بۆ بەندەکەی ئەویان کرد، ژنێک کوڕە بچووکەکەی لەگەڵ خۆی هێنابوو بۆ کڵێسا، بۆ بەشداری و دیدەنی پرسەکەی، ئەوەی کە بۆ بەندەکەی خودا داندرابوو، منداڵەکە تەمەنی سێ ساڵان بوو، کەڕ و لاڵ بوو، یەک وشەشی لە دەم نەهاتبووە دەر، بەڵام کە دایکی بە ئیرادەی گیانی پیرۆز، منداڵەکەی هێنا لای تەرمی ئەو پیاوچاکەو وای لە منداڵەکە گەیاند کە دەستی ڕاستی پیاوچاکەکە ماچ بکات، منداڵەکەش ماچی کرد، یەکسەر بەبێ هیچ دژوارییەک هاتە قسە، خەڵک تێکڕا سوپاسی خودایان کرد، کە دەسەڵاتی خۆی لە ڕێگای پیاوچاکانەوە بەدیاردەخات.

## VII

### ئیبهیڤ - مەشیحا Ebhedh-Mesiha

ئیبهیڤ - مەشیحا خەڵکی ئەربێللا بوو، بەڵام لە سەردەمی منداڵیدا، کاتێکی زۆر لە ئەنتوخیاو شام

ژیابوو، لەوێ ببوو بە خاوەنی باوەڕێکی راستەقینە. کە گەڕاوە، بوو بە خزمەتکاری کڵێسا و میللەت. ئەویش وەکو پێشینیەکانی خۆی زیرەکی و شەیدایێکی زۆری بۆ پەیامەکانی ئینجیل پێشاندا. ئاژاوە و دڵپیسی لە ناو دیانەکاندا بەدوورخستەوە. بە درێژایی کاتی قەشایەتی ئەو، خودا باڵی ئارامی و ئاشتی بەسەر هەموو شوێنێک داهێنابوو، بەو هۆیەش هەموو دێر و کڵێساکان[٣٤] بووژانەوەو ژمارەیان زۆر بوو، لە هەموو دەمێک مرۆڤ ئەو سروودانەی دەهاتە گوێ، کە بە پاداشتەکانی خودا هەڵدەگوتران.

لەو رۆژگارە کلیمێنیس ئەلکسەندەرینوس[٣٥] "Clemens Alexandrinus" لەناو رۆمەکاندا بە دەرس و وانە خوداییەکان ناوبانگی دابووەوە، هیچ کتێبێک نەبوو (کتێبە پیرۆزەکان)، کە ئەو وتارێکی لە بارە نەنووسێ، مرۆڤ دەتوانێت لە بارەی دانراوەکانی ئەو پیاوە قارەمانە، لە ئێکلاسیاستیکای ئویزابیوسی قەیسەرییە زانیاری وەربگرێت. دوای ئەوەی ئیبهیژ - مەشیحا ٣٥ ساڵان ئەرکی قەشایەتی خۆی بەرێوە برد، چوو بۆ بەهەشت بۆ لای هاورێکانی.

## VIII

## حایران Hairan

دوای ئیبهیژ - مەشیحای بەهەشتی حایران لە بابلەوە لە (بێت ئاراماییێ) هات، لە دەستپێکی قەشایەتی ئەودا شەڕ و شۆڕ و پشێوی هەموو لایێکی گرتەوە، بەری رۆژ تاریک هەڵگەڕا بوو، رۆژ نەیدەویست تیشکی خۆی پیشان بدات[٣٦]، ئەوەش نیشانەی تووڕەیی خودا بوو لە گەلی خراپەکار، بۆیەشە شەڕ و شۆڕێکی زۆر لە سەردەمی ئەودا لە نێوان رۆم و پارپەکان روویدا، ئەرتابان پاشای پارپەکان (٢١٣-٢٢٧) پەلاماری وڵاتەکانی رۆمی داو زۆر لە شارەکانی رۆژهەڵاتی سەرووی میزۆپۆتامیای سووتاند. شاهراتی پاشای ئەدیاباتەش لەمەدا بەشداربوو. کاتێ (ماسرینوس)ی پاشای رۆمەکان بەو هەواڵانەی زانی، بە هێزێکی زۆرەوە هێرشی کردە سەر (ئەرتابان؟). جەنگ لە نێوانیاندا درێژەی کێشا، تا لە کۆتاییدا هەردوو پاشا لە نێوان خۆیاندا رێکەوتن، کە کەسیان چیتر بەبێ هۆیەکی ناچاری نەبێت خوێن نەرێژێت. جا هەردوو لایان گەڕانەوە وڵاتی خۆیان. لەو رۆژگارەدا پارپەکان زۆر بەهێز بوون و جگە لە کوشتن و بڕین شتێکی تریان نەدەکرد. بەڵام خودا هەروەکو لە رێگای پێغەمبەرەکانی خۆیەوە بەڵێنی داوە: "ئەگەر تۆ وەکو هەڵۆیێک خۆت بەرز کەیتەوەو هێلانەکەت لە نێوان ئەستێرەکاندا چێ بکەیت، من لەوێوە تۆ دەهێنمەوە خوارەوە بۆ سەر زەوی" (عوبەدیا: ١.٤) ئەوانی گەڕاندەوەو بەریدانەوە سەر زەوی.

لە سەردەمەکانی پێشوتر، فارسەکان هەوڵی ئەوەیان دەدا، کە پارپەکان لەسەر کورسی دەسەڵات لابەرن، زۆر جاران هێزی خۆیان لە جەنگدا تاقی کردبووەوە، کەچی بەرپەرچ درابوونەوەو دەسەڵاتی پارپەکانیان پێ نەگۆڕا بوو، بەڵام ئەو پارپانەش لە ئاکامی جەنگ و ململانییێکی زۆر تووشی ماندووبوون ببوون، فارس و مادەکانیش هەستیان بەمە کردبوو، هاوپەیمانێتیان لەگەڵ شاهراتی شای ئەدیاباتە و دومیتیانوسی شای کەرکوک (کەرخ سیلوخ) بەست و لە بەهاردا دەستیان کرد بە جەنگێکی گەورە دژی پارپەکان. پارپەکان شکان و دەسەڵاتیان بۆ هەمیشە لەدەست چوو. ئەوانیش (سەرکەوتووەکان) لە سەرەتا هێرشیان بردە سەر میزۆپۆتامیا، پاشان بۆ سەر بابل و بێت زابدیجنەو ئارزانینە[٣٧]، لە ماوەی ئەو ساڵەدا توانییان تەواوی ئەو وڵاتە داگیربکەن، هەموو هەوڵێکی پارپەکان بێ سوود بوو، چونکە رۆژ و وادەیان هاتبوو، ئەوە بوو لە ئەنجامدا هەموو راپانکرد بۆ ناو شاخە بەرزەکان و هەموو وڵات و سەرتاپای سامانی پاشەکەوتکراوی ناو شارەکانیان بۆ فارسەکان بەجێهێشت. کوڕە گەورەکەی ئەرتابان کە ناوی ئەرساکس (ئەرشاک) بوو، بێبەزەییانە لەلایەن فارسەکان لە تسەیفون کوژرا. ئیتر فارسەکان لە تسەیفون لێیان دامەزراند و کردیان بە پایتەختی ئیمپراتۆریەتی خۆیان. ئەو رۆژەی کە دەسەڵاتی پارپەکان، کوڕانی ئەرشاکی هێزدار، کۆتایی هات، رۆژی چوارشەم بوو، رێکەوتی ٢٧ی نیسانی ٥٣٥ی ئیمپراتۆری یۆنانی بوو. (٣٨) لە سەرەتای دەسەڵاتی فارسەکان، دیانەکان لە بارێکی ئاسایشدا بوون، توانییان پشوویێک بدەن و پەرە بە خۆیان بدەن.

ئەو هەموو شتانە لە رۆژگاری حایراندا روویدا، ئەو بەهێز ببوو، هەمیشە بەهێزتریش دەبوو بەرامبەر تەنگانەییەکان، بە بەزەیی خودا، ئەو بەزەییەی کە

گەورەمان حەزرەتی عیسا بەسەر ئێمەیدا پەخش كردووە. بزانە، ئۆها! پینێهاسی خۆشەویست لەو ساڵەدا كە فارسەكان دەسەڵاتی سەرتاپای ڕۆژهەڵاتیان كەوتە دەست، دیانێكی یەگجار زۆر لە ڕۆژئاواو لە ڕۆژهەڵاتیش هەبوون، بەڵام چەوساندنەوە لە ڕۆژئاوادا چ جاران كۆتایی نەهاتووەو ڕۆژانە لە كووچەو و بازاڕان دیانەكان خوێنیان لەبەر ڕۆیشتووە، هەرگیز لەوێ ئاسایش و ئارامی بەرقەرار نەبووە (بۆ دیانەكان). بەرامبەر ئەوە لەلای ئێمە هیچ شتێكی ئاوا ڕووی نەداوە، ڕۆژانە پاشاكان خەریكی خەم و ماندووبوونی شەڕ و شۆڕ بوون، چەوساندنەوەی سەخت و دژوار هێشتان دژی ئێمە نەخرابووە كار، لە سۆنگەی ئەمەشدا پەیامەكانی ئینجیل پەلەكانی خۆیان تا دەریاو لقەكانیان تا ئەوبەری شەپۆلەكان ئاژوابوو (پسالم: ٢ . ٨٠). پتر لە بیست ناوچەی قەشایەتی هەبوون:

١- بێت - زابدای (زابدیجنە)- Beth-Zabhdal (Zabdicene)

٢- كەرخا د بێت سەلوخ dhe Beth-Selokh Karkha

٣- كاشكار Kashkar

٤- بێت - لاپات Beth-Lapat

٥- هوزمیرد ئەردەشێر Hormizd-Ardashir

٦- پیرات- مایشان Perath-Maishan

٧- حینایتا Henaitha

٨- هربات- گەلال Gharbath-Gelal

٩- ئارزون (ئارزانین) Arzon (Arzanene)

١٠- بێت - نیكاتور Beth-Nekator

١١-شەرقەرد Sharkard

١٢- بێت- مەسكەنی Beth-Meskene

١٣- حولڤان Hulvan

١٤- بێت- قەترایێ Beth-Katraje

١٥- بێت - حەززایێ Hazzaje-Beth

١٦- بێت دایلومایێ Beth-Dailomaje

١٧- شیگار Shiggar

هەروەكو لە شوێنەكانی تریش. بەڵام نیسیبیس (- نوسەیبین ع. د.) و شارەكان (مەبەست تسەیفون و سلوبسیایە) ئەو سەردەمە لە ترسی كافرەكان ناوچەی قەشایەتییان نەبوو، دوای ئەوەی كە دەسەڵاتی ئەرشاكەكانی پارپ كۆتایی پێ هات، دیانەكانی ئەوێش ویستیان بێن بە خاوەنی ناوچەی قەشایەتی خۆیان هەروەكو ئێمە، بە یارمەتی خودا لە جێگەی خۆیدا باسی لێوە دەكەین. لەو كاتەدا مامۆستای خوداپەرست و مێرخاس "ئوریگینیس Origenes" بە شارەزایی لە هەموو جۆرەكانی زانست ناوی دابووەوە، وەكو دەڵێن : گیانی پیرۆز هەموو شتێكی بۆ گوتن خستبووە سەر زار، ئویزابیوس لە بارەی ئەو دەڵێت، كە حەوت میرزا (دادنووس - كاتب عدل) یەك لە دوای یەك لە ژێر دەستی ئەو خەریكی نووسین بوون.[٣٩]

ئەو ساكە لە دوای ئەوەی فارسەكان دەسەڵاتی ڕۆژهەڵاتیان كەوتە دەست، دیانەكان كەمێك ترسیان لێ نیشت، لەوەی كە ئەوان بیانەوێ بە تیغی شمشێرەكانیان ئەوان (دیانەكان) لەناو بەرن. چونكە ئەوان بەسەر هەموو شایەكانی وڵاتانی ڕۆژهەڵاتدا زاڵ بوون و "ماوپوت Mauput" (موبید) و مەرزەوانی دارودەستەی خۆیانیان لە جێگا دانان. یەكەمین شای فارسەكان ئەردەشێر پارێزگارێكی دەوڵەتی بەناوی (ئاژورزاهاد Adhorzahad) (لەوانەیە ئاژەرزاد بێت. ع. د.) نارد بۆ ئەدیاباتە. بەڵام خودا كە هەمیشە چاوی لە كڵێساكانی خۆیەتی، تا شەپۆڵ و گەرداوەكان نغرۆیان نەكەن، دەرووێكی بەختەوەریی بۆ ئاوەڵاكردن. شا ئەردەشێر فەرمانی دابوو، كە بۆ ڕێزگرتن لە خواكان، ئاتەشگەیێكی نوێ دروست بكەن و بە بەرپاكردنی مەراسیمێكی خواپەرستی تایبەت، ڕێز و حورمەتی خۆیان بۆ خودای مەزنی "ڕۆژ"ی سەردەوەی هەموو شتێك دەربڕن. ئەو یەكەمین كەسیش بوو كە نازناوی "شای شایان" و "خودا"ی لە خۆ نا. واتە سەرەڕای خودانەناسی خۆی، ئەو كوفرە گەورەیەشی خستە سەر، بەوەی كە ویستی شەرەفی خودایەتی بداتە خۆی و خەڵكێكی زۆری ناچار كرد، ئەوانەی سەر بە ئایینەكانی تر بوون. كە ئاگر بپەرستن. بەڵام (حایران)ی قەشە هەموو هێزی خۆی لەوە خەرج كرد. كە گەلەكەی خۆی لە هەموو زیان و تۆڕێكی چندراوی دەستی شەیتان بپارێزێت، وەكو شوانێكی دڵسۆز خۆی پێشكەشی مەڕەكانی كرد.

هێزی شەیدایێكی ئاوا، توانی زۆر گیانان بۆ ناو پەرژینەكەی حەزرەتی مەسیح ڕێنمایی بكات، ئەو گیانانەی كە پێشتر كەوتبوونە داوی دوژمنە دێرینەكەی ناحەز بە هەموو مرۆڤایەتی. دوای ئەوەی بە بەهرەداری

روحیی خۆی ساڵانێکی زۆر، وەکو بۆ من دەردەکەوێ ٣٣ ساڵان خزمەتی کرد، لە تەمەنێکی گەورە کۆچی دوایی کرد و ئێستا تاجی سەرکەوتنی بۆ هەڵگیراوە، ئەوەی کە دادگەری رۆژی داد پێشکەشی دەکات.

.IX

**شاحلوفا Shahlupha**

دوای حایران کە پێشەوای پیاو چاکان بوو، شاحلوفا هات، شاحلوفا پیاوێکی شەیدا و لە خواترس بوو. ئەو باوکە رەوحانییەش هەر لە بابلەوە هاتبوو، هەر لە دەورانی منداڵی بە باوەڕی راستەقینە دەرس درابوو، ئێستاش دەستی بەوە کردبوو کە باوەڕەکەی بە خەبات و تێکۆشین دژی دوژمنە نهێنی و ئاشکراکانی بەرەو سەرکەوتن ببات.

لەو سەردەمەدا شاگردانی حەزرەتی عیسا لە وڵاتی رۆمەکاندا تووشی چەوساندنەوەو راونانێکی توند ببوونەوە، کە تێیدا (ماکسیمینوس Maximinus) (واتە ٢٣٨-٢٣٥ Maximinus C.Jul.Verus) بۆ لەناوبردن و بنەبڕکردنیان لەسەر رووی زەوی دەستی لە هیچ نەدەگێڕایەوە. ئاسمانیش بەو چەوساندنەوەدیە پڕ ببوو لە گیانە پاکەکان، ئەو گیانانەی کە لە خودا دەپاڕانەوە، بۆ ئەوەی ئەو رۆژە تاریک و لیلانەیان بۆ کورت بکاتەوەو بۆیان بگۆڕێ بۆ خۆشی.

بەڵام هەروەکو ئێمە وتمان، بەرامبەری ئەوە لە هەموو لایێکی رۆژهەڵاتدا بارودۆخ ئارام بوو، شاحلوفا رۆژ بە رۆژ لە شەیدایی و خۆشەویستی خودا دەسووتا، ئەو بوو کە گوندی (تەلنەجاحە Tel-Nejaha)ی بەرەو یەکێتی سینەی پیرۆز برد، ئەوەش بە رێگای پێشاندانی پەرجوویێک لەو پەرجووانەی کە خودامان دەیانکا بە هۆیێک، بۆ ئەوەی راستی قسەی بەندەکانی خۆی بێنێتە دی. یەکێک لە پیاو ماقووڵانی گوندەکە کە ناوی (نەخیحا Nekhiha) بوو، بە سەختی تووشی نەخۆشی زکچوویی (زەحیری) ببوو، چونکە رۆژ لە دوای رۆژ ئازاری زۆرتر دەبوو، کەسیش لە گوندەکەیان نەبوو بتوانێت چارەسەری بکات، دایک و باوکی بردیان بۆ شاری ئەربێللا. ئەو دەمە شاحلوفای پیرۆز بە ئیرادەی خودا بەوەی زانی، وەکو بەهەشتیی (ئەنانیاس Ananias) هەستا چوو بۆ لای (Acta Apst ٩.١٠ .ff)، کە کەسوکارەکانی ئەوانەی لەگەڵی هاتبوون، هەموو کۆبوونەوە، ئەو بەڵێنی پێدان ئەگەر هەرچی ئەو پێیان دەڵێت جێبەجێی بکەن، ئەوا نەخۆشەکەیان بە تەواوی بۆ چاک بکاتەوە. ئیتر دەستی پێ کرد کە باوەڕی عیسایەتییان بۆ رۆشن بکاتەوە، لە کتێبە خوداییەکان و لە خێرایی بڵاوبوونەوەی ئەو ئایینە بەسەر هەموو رووی زەویدا. بۆی رۆشن کردنەوە کە حەزرەتی عیسا، ئەو کەسەی کە جووەکان لە ئورشەلیم لەخاچیان دا، رۆڵەی خودا بووەو بە ئازادی خۆی رێگای چەوسانەوەی هەڵبژارد، بۆ ئەوەی ئێمە لە کۆتی بەندایەتی و شەیتانەکان رزگار بکات.

هەموو پێکەوە رەزامەندی خۆیان پێشانداو پەیمانیان دا کە ئەگەر راستی ئاخاوتنەکانی خۆی بە چاککردنەوەی نەخیحا بسەلمێنێت، ئەوا هەموویان باوەڕەکەی لێ وەردەگرن و خۆیان تەعمید دەکەن و دێنە ناو کۆشی پیرۆزی کڵێسا. ئەوسا شاحلوفەی پیرۆز دەستی کرد بە نوێژکردن و بە کێشانی نیشانەی خاچ و ئەو نەخۆشە بێ چارەیەی چاک کردەوە. چونکە هەموو شتێک بۆ خودا ئاسانە. زۆر کەس لە خەڵکی تەلنەجاح بڕوایان بە خوا هێنا و خۆیان تەعمید کرد.

لەو کاتەدا بوو کە ئەردەشێری شای فارسەکان (٢٢٦-٢٤١) مرد، دوای ئەو شاپوور هات (٢٤١-٢٧٢)، پیاوێکی تەبیعات توند بوو، هەر لە ساڵی یەکەم جەنگێکی دژی (خورازمییەکان Chorasmiern") و مادە چیاییەکان بەرپاکرد و لە شەڕێکی سەخت بەسەریاندا زاڵ بوو، لەوێوە لە هێرشەکانی بەردەوام بوو، توانی مل کەچ بکات بە (گیلەکان Gel) و (دایلیمیتەکان Dailemit) و (هورکانییەکان Hyrkan) کە لە ناوچە شاخاوییە دوورە دەستەکانی نزیک دوورترین دەریا نیشتەجێ بوون. هەموو دونیا لێی دەترسا. گەلێک جاریش شەڕی لە دژی رۆمەکان قەوماند.

لە ناو لەشکرەکەی شاپوور کابرایێکی دیانی دەوڵەمەند هەبوو، ناوی (گەنزەخان Ganzakan) بوو. کە ئەو پیاوە هات بۆ ئەدیاباتە و دیتی لەوێ و لە گوندەکانی ئەو وڵاتە ژمارەیێکی زۆر دیان هەن، تکای لە شاحلوفا کرد کە بچێت بۆ تسەیفون و سەر لەو کەمە دیانانە بدات کە لەوێ دەستیان پێ کردبوو کە خۆ پێشانبدەن، شاحلوفا لە خۆی ترسا کە بچێت بۆ ئەوێ، بەڵام دوای ئەوەی

گەنزەخان ئارامی كردەوەو دڵنیای كرد، شاحلوفای پشت ئەستوور بە خوای خۆی هەستا بەرێ كەوت بەرەو ئەوێ. نەخیحاو، ئەوەی كە لە نەخۆشی زەحیری چاكی كردبووەوە، دوو دیاكۆنی تری لەگەڵ خۆی برد. بە رێگاوە بوون تووشیان بوو بە تووشی ئیسماعیلییەكان (بەدەوییەكان)، بەدەوییەكان ئەوانیشیان لەگەڵ خۆ راپێچ كرد، چوار مانگی برد تا توانییان رابكەن، چوونە شاری دەوڵەمەندی تسەیفۆن[٤٠]. لەوێ هەموو براكانی خۆیان كۆكردەوەو هێز و توانایان پێ بەخشین. شاحلوفا پیاوێكی ئەوێی پیرۆز كرد و كردی بە پریستاو لەوێ دایەزراند. بە خۆی دوو ساڵان لەوێ مایەوە، ئەو كاتەش شاپوور پاشا گەڕابووەوە، ئەوسا ژمارەیەكی زۆر لە دیاكۆنان هەڵیان گرت و بەرێز و حورمەتێكی زۆر بەرەو ئەدیاباتە بەرێیان كردەوە. بەڵام دیانەكانی سلوبسیا و تسەیفون خەم و پەژارە دایگرتبوون و بە دوایدا دەگریان، وەكو ئەوەی سەركەوتنی حەزرەتی عیسا بۆ ئاسمان بە چاوی خۆیان ببینن، ئاوا.

دوای گەڕانەوەی بۆ وڵاتەكەی خۆی، زۆر كاروباری تری جێبەجێ كرد، لەوێش زۆر قەشە و دیاكۆنی پیرۆز كرد (دەستی خۆی لەسەر دانان بۆ ئیجازەی قەشایەتی ع.د.)، هەروەكو ئێمە لە كەسانی برواپێكراو بیستوومانە، قەشەی بێت - زابدای (شوبحا - لیشۆ Shubha-lisho) هاتۆتە سەردانی و ساڵانێكی رەبەق بە گونجاوی لەگەڵ یەكدا ژیاون و پێكەوە چوونە بۆ حەربەتگەلاڵ و (ریسۆنین) و (ریۆنین) و ئیجازەی قەشەیەكیشیان داوە. لەوێشەوە چوونە بۆ شەهرقەرد و چاویان بە چەند دیانێك كەوتووە، كە لە شوێنەكانی تردوە هاتبوون و بەوێدا تێپەڕ ببوون. ئیجازەی قەشایەتییەكیشیان بۆ ئەوێ دابوو، چونكە پێشتر قەشەكەی خۆیان مردبوو. پاشان هەردووكیان گەڕاونەتەوە بۆ ئەربێللا و ماڵئاواییان لە یەكتر كردووە. بە سەرسامییەوە لە نیزام و رێكوپێكی ناو كڵێساكان (ئەوانەی ئەدیابان) و ژمارەی زۆری دیانەكان، شوبحالیشۆ گەڕاوەتەوە بۆ وڵاتەكەی خۆی، ئیتر ئەویش دەستی پێكرد كە ئەو رێكوپێكییەی كە بەرچاوی كەوتبوو، لەوێی بهێنێتە دی، وە سوپاسی خودای كرد بۆ گەورەیی هوپارشی ئەدیابانە و رێكوپێكی دام و دەستووری ئایینی كڵێساكانی ئەوێ.

شاحلوفای هێز لە خودا وەرگرتوو چەند ساڵێكی تر خۆی ماندوو كرد و بۆ خاتری حەزرەتی عیسا خزمەتی كرد. جا ماڵئاوایی لەو جیهانە جەنجاڵە كرد و بۆ جیهانی ئاسوودەیی باری كرد و لە كڵێسا بچووكەكە ناشتیان، لەو كڵێسایەی كە لە كاتی دروستكردنیدا ناوی ئەو نووحەی لێندرابوو، كە پێشینەی ئەو بوو لەو پیشە پاداشدارەی بەرێوەبردنی مەڕەكانی حەزرەتی مەسیح. ئەو كورسی پایەبەرزی ئەدیابانەی ١٥ ساڵان بەرێوە برد.

### .X

### ئەخاژابوهی Akha-Dhabhuhi

دوای ئەو ئەخاژابوهی هات. پیاوێكی زیرەك و خەباتكار بوو، كوڕی پریستای شاری ئەربێللا بوو، ئەو پریستایە وەكو دەڵێن چوار كوڕی هەبووەو هەر چواریان پریستا بووینە. دایكیان لە تیرەی ماگییەكان بووە و شووی بە كوڕە گەورەكەی خۆی كردۆتەوە، كە گەورەتر بووە لە ئەخاژابوهی، هەر لەبەر هەندێش خەڵك بەو نازناوە بانگیان كردووە ئەخا ژا بوهی، واتە "برای باوكی"[٤١] واتە برای ئەوەیان كە دایكی مارەكردۆتەوە. ئەوە كە لە سەردەمی منداڵیدا لەسەر بروای ماگییەكان دەبێت و بە هۆی قەومانی شەڕ لەگەڵ رۆمەكان دەچێتە تسەیفون، لەوێوە دەگەڕێتەوە نیشتمانەكەی خۆی و بروا بە ئایینی عیسایی دێنێت. پەیوەندییەكی بەردەوام لەگەڵ قەشە حایراندا دەبەستێت تا رۆژی پیرۆزكردنی (واتە تا وەرگرتنی ئیجازەی قەشایەتی لە حایران)، جا ئەویش بە دەوری خۆی خەڵكێكی زۆر لە كافرەكان دێنێتە سەر رێی راست. لە رۆژگاری ئەودا (گوفراشناسپ)ی موبیدی ئەدیابانە، لە (ڤـــــەراهران Warahran) (بەهرام Behram)ی سێیەمی پاشای فارسەكان (٢٧٦-٢٩٣) تووڕە بوو، لە ناوچە شاخاوییەكان قەڵاتێكی بۆ خۆی دروست كرد[٤٢]، تا تێیدا خۆی لە پەلاماری دوژمن بپارێزێت. ژمارەیێكی زۆر تیراندازی لێزانی لە دەوری خۆی كۆكردەوە، كە بە پێی ئەو زانیارییانەی ساڵ دوای ساڵ گێردراونەتەوە ژمارەیان (٥٦٠) تیرانداز بووە. رۆژانە بە گرووپەی پەنجا شەست كەسی بەسەر رێگاو بانەكانیان دادەداو هەرچی وەگیریان كەوتووە راو و رووتیان كردووە. بە هۆی ئەو راو رووتە بە تەواوی پەیوەندی نێوان شار و گوندەكان پچڕاوە، خەڵكێكی زۆر لە دانیشتوانی

ئەدیابانە، ئەویّ بەجێدەهێڵن و بۆ وڵاتەکانی تر بار دەکەن، چەندەها گوند و ئاوەدانی گەشاوە چۆڵ و هۆڵ دەمێنێتەوە. کەس ناتوانێ کێڵگە و زەوییەکانی تۆ بکات، چونکە خاوەن زەوییەکان لە ترسی رێگرەکان نەدەوێران لە ماڵ بچنە دەرەوە. بێ ژمار خەڵکی دەوڵەمەند بەرەو پایتەخت دەچن، تا هەواڵی بارودۆخەکە بە ڤەراهرانی پاشا رابگەیەنن. ئەویش گوێی لە قسەی خەڵکەکە راگرت و سەربازێکی زۆری بێ ژماری بۆ ئەویێ هەنارد. ئەو سەربازانە بەرەو ئەویێ چوون، بە نیازی ئەوەی قەڵاتەکەی گوفراشناسب لە بناغەوە هەڵتەکێنن. بەڵام بەهۆی زۆری تیران، ئەو تیرانەی کە لەلایەن سەربازەکانی گوفراشناسب زۆر هونەرمەندانە دەهاوێژران، نەیانتوانی لە سنوورێکی دیاریکراو زیاتر خۆیان لە قەڵاتەکە نزیک بکەنەوە. بەڵام دوای دوو مانگی رەبەق هەوڵ و ماندوو بوون. بەبێ ئەوەی هیچ دەستکەوتێکیان هەبێت، هەواڵیان بۆ ڤەرەهران نارد، ئەویش لەگەڵ (زارهەسپ)ی سەرلەشکری ژیر و وریا، بێ ژمار سەربازی تری بۆ هەناردن. بەڵام ئەویش نەیتوانی چۆک بە قەڵا دابدات، چونکە قەڵاکە زۆر سەخت بوو. هەروەها سەربازە زۆرەکانی ناوی زۆر خورت بوون، تیرهاوێژە لێزانەکانیش ماوەی ئەوەیان نەدەدا کە بۆ تاوێکیش بەرامبەرەکەیان بێنە پێشەوە، بۆیە زارهەسپ پەنای بردە بەر فێڵ و فەرەج، بەڵکو بتوانێت داوێک دابنێتەوەو گوفراشناسبی پێوەبکات. هەستا کورەکەی خۆی لەگەڵ کۆمەڵە دیارییەکی بە نرخ نارده لای گوفراشناسب، کورەکەی راسپارد کە پێی بڵێت: "تەماشا بکە، پاشای پاشایان، لەوەتەی هەواڵی ئەو ئازایەتییەی تۆی بیستووە، ئارەزووی دۆستایەتیتان دەکات و حەز دەکات بتانکات بە پارێزگاری سەرتاپای وڵات. بۆیە من دەمەوێ بە تەنها قسەت لەگەڵدا بکەم. بێ ئەوەی هیچ سەربازێکمان لابێت، بۆیە تکایە واز لە شەر بێنەو تەنها خۆت وەرە خوارەوە بۆ جێگاییێک، تا بەتەنهاو دوو بە دوو لەگەڵ یەکتر بدوێین" ئەوە بوو گوفراشناسب بڕوای بەمە کرد، وە لەبەر ئەوەی ئەویش زۆر پێویستی بە بەستنی پەیمانی ئاشتی هەبوو، چونکە شەڕەکە زۆر درێژەی کێشابوو، لە ژیانی لەگەڵ سەربازەکانی بێزار ببوو، بۆیە چووە خوارەوە و بۆ شوێنێکی دامێن قەڵاکەو داوای لە زارهەسپ کرد کە بچێتە لای، تا دەست بە دانوستاندن بکەن. پێشتریش زارهەسپ فەرمانی دابوو، کە ژمارەیێکی زۆر پاسەوانی ئازا بێن و خۆیان لە نزیک ئەوان مەڵاس بدەن و کاتێک کە ئەوان دوو بە دوو گفتوگۆ دەکەن، بە سەریان دابدەن و گوفراشناسب بگرن. ئیتر بەم جۆرە بەهۆی ئەو فێڵە گوفراشناسب گیرا.

ڤەرەهران زۆر بە کارەکەی زارهەسپ دڵخۆش بوو، فەرمانی دا کە گوفراشناسب بە ئەشکەنجە و ئازار بکوژن و پێستەکەی بگوورن و لە قەڵاتی پاشایەتییەکی خۆیدا هەڵیبواسن، تا هەر کەسێک بیبینێت، ترس بیگرێت و چاک بزانێت کە ئەوە سزای تۆڵەی پاشای پاشایانە لەو کەسانەی کە بەرامبەر فەرمانەکانی سەرپێچی دەکەن. لەگەڵ ئەوەی کە ئەخاژابوهی ئازا، ئەو هەموو زۆرداری و درندەییەی بەچاو دەبینی، رێگای ئەوەی نەدا کە گیانە هێزدارەکەی شێلو بێت و تووشی ماندوویی ببێت. لەگەڵ ئەو هەموو چاوزەقکردنەوە و هەرەشە و گوڕەشەی کە لێی دەکرا، بە ئارامی و دانبەخۆگرتنێکی تەواو و بە خۆشەویستییەکی وا کە شیاوی شاگردانی حەزرەتی عیسا بێت، دەستی کرد بە گەڕان و سووڕان بە هەموو هیپارشییە گەورە و فراوانەکەی. ڕۆژێک قاسیدی بەدوادا هاتن، کە لە لایەن دیانەکانی تسەیفونەوە نێردرابوون، داوایان لێ کرد، کە ئەویش هەروەکو شاحلوفای پێشینەی بچێتە لایان و هانیان بدات و ڕێگای ڕاستییان پێشان بدات، هەندێک دڵنەواییان بکات و توانا و هێزیان پێ ببەخشێت[٤٣]. هەروەها ئەوان پێنج پیاوی بڕوادار و لە خواترسیان هەڵبژاردبوو، تا ئەو دەستیان بەسەردا بهێنێت و پیرۆزیان بکات. ئەویش وەکو بازرگانێکی زیرەک و لێزان، کە هەمیشە هەوڵی زۆرکردنی سەروەت و سامانی خۆی دەدات، پیاوەکانی پیرۆز کرد و لەگەڵ نێردراوەکان و زیخا - ئیشۆی حەربەتگەلال و (شابتا Shabtha) قەشەی بێت-زابدای بەرەو پایتەخت کەوتنە ڕێگا هەروەکو کە لە نووسراوەکان دەگێردرێتەوە، ئەوان نزیکەی ساڵێک لەوێ ماونەتەوەو هەموو گیروگرفتەکانیان بۆ چارەسەر کردوون.

ڕۆژێک لەناو ئاپۆرەیەکی فراوانی خەڵک، شابتا بەرز دەبێتەوەو دەستدەکات بە وتاردان و ئامۆژگاریکردنی خەڵکەکە، ئەوە ڕۆشن دەکاتەوە، کە نابێت لەو کەسە بترسێین، کە تەنها توانای خراپکردنی جەستەی هەیە، بەڵکو گەرەکە هەر لەوە بترسێین کە لاشە و گیان داوێتە

ناو ئاگری دۆزەخ (مەتتی: ۲۸.۱۰). بە حەماسەتێکی زۆرەوە باسی ئەوە دەکات، کە سەرکەوتنی خودامان بەڕاستی سەرکەوتنە، بەڵام سەرکەوتنی پاشای سەر زەوی، جگە لە لووت بەرزی و خۆبەگەورەزانین و خۆ گیف کردنەوەو ژان و خەم و خەفەت و مردن شتێکی دیکە نییە، خۆبەزلزانینێکی وا، کاتێ کە پاشایان تەنها سەرکەوتنێکی جەستەیی بەدەست دەهێنن، لووت بەرز دەکەنەوەو لە ڕادەبەدەر سنگ دەردەپەڕێنن و ئەوەیان لەبیر دەچێت، کە ئەوان بوونەوەرێکن لەناودەچن، تەنانەت پلە و پایەی خودایش دەدەن بە خۆیان، بەوەش گوناهەکانیان ئەوەندە زۆر دەبێت، کە ئاگری بێ کۆتایی وەکو سزایێک بۆ گوناهەکانیان وەردەگرن، ئازار دەچێژن، بەقەد ماندووبوونیان بۆ سەرکەوتنیان، ئەو ماندووبوونەی کە نایێتە ژمار، بەر لە هاتنی کاتی شەڕ، لەخەم و بیرکردنەوەیەکی بێ ئەندازەدن بۆ ئەو شەڕەی لە پێشیانە، کە ئایا سەردەکەون، یان دەبەزن. بۆیە بە ڕۆژ لە خەمدا دەبن و چەندەها شەویش خەو ناچێتە چاویانەوە. بە چاوی خۆیان مەرگ دەبینن، بە قەد ئەو مەرگانەی کە بێگومان لە هەردوو لایەنەوە زۆر ڕوو دەدەن، ئەوەشە سەرچاوەی ئازار و تلانەوەی باوکان و کەسوکاران و دەبێتە هۆی ڕژانی فرمێسکی.چاوی دایکان. چونکە شمشێرەکان لەشی کوڕە خۆشەویستەکانیان پارچە پارچە دەکات و نێزەکان لاتەنکیشی خۆشەویستەکانیان کونبەدەر دەکات.

بەڵام سەرکەوتنی مەسیح خۆشی و بەختەوەرییە بۆ هەموو کەس، تەنانەت بۆ دوژمنەکانیشی، بۆ جوولەکە و کافرەکان."

کە شابتا لەناو خەڵک ئەو وتارەی دا، یەکێک لە کافرەکان کە لەوێ ئامادە بوو، چوو ئەو هەواڵەی گەیاندە یەکێ لە گەورەکانی پاشا: "دیانەکان ئەوە فێری خەڵک دەکەن، کە پاشای پاشایان زۆردارەو لەناودەچێت و سەرکەوتنەکانی سەرکەوتن نین، بەڵکو یاخیبوون و زۆردارییە".

کە دیانەکان بەوەیان زانی شڵەژان و کەوتنە خەمێکی زۆر و خۆیان لە ماڵەکانیان شاردەوە، هەندێکیشیان ڕایانکرد بۆ بیابان. هەر لە هەمان شەویشدا شابتا هەستا و بێ بیرکردنەوەو بە شڵەژاوی ڕێگای گرتە بەر. چونکە زۆر لەوە دەترسا کە بگیرێت، وای نەکرد کەس بیناسێت، نزیکەی دوو ساڵان خۆی شاردەوە. بۆ ئەمە دیانەکانی تسەیفون هەستان دیارییان برد بۆ یەکێ لە گەورە پیاوەکان بە ناوی (ڕەدەگان Radagan)[٤٤]و تکایان لێ کرد، هەوڵی ئەوە بدات کە توورەیی پاشا خاوبکاتەوە، درۆزن و بوختانچییان بە ناڕەوا پاشایان لەو (شابتا) توورە کرد. خودا ئەوەی خستە گیانی ڕەدەگان و توانی ئەم کارە ڕێکبخات و توورەیی زۆری پاشای پاشایان دابمرکێنێتەوە، بەم جۆرە بە یارمەتی خودا، ئەوەی کە گەرداوان ئارام دەکاتەوەو ئاشتی دەخاتە جێگەی شەڕ و چەوسانەوەو ئاسن بە ڕووی ئاسندا دەدات، چاوگی ئەو بەڵایە لە ڕێگا لابردرا، ئەو بەڵایەی لەوانە بوو ببێت بە هۆی کوشتنی زۆر لە برایان، چونکە هێشتا وادەی چەوساندنەوەو کوشتار نەهاتبوو.

بەڵام ئەخاژابوهی شوێنی خۆی بەجێ نەهێشت، لەگەڵ ئەو هەموو مەترسی و پشێوییە، هەر هانی دیانەکانی دەدا کە پشت بە خودای هەمیشە زیندوو ببەستن، ئەو خودایەی کە دروستی کردوون. من وادەزانم، کەس ناتوانێ نەهی لەم ڕاستییە بکات، کە ئەو سەردەمە پڕ لە ئاسایش و ئارامییە، بەر و ئاکامی نوێژ و خواپەرستی ئەو بوو، کێ دەیتوانی تەماشای ئەو بکات و سەری سوڕ نەمێنێت، کاتێ کە ئەو لە نوێژکردندا کرنووشی بە دڵە شکاوەکەی خۆی دەبرد و چونکە خودا دڵێکی شکاو ناخاتە پشت گوێ (پسالم: ۵۱.۱۹).

دانیشتوانی تسەیفون داوایان لێ کرد کە قەشەیەکیان بۆ پیرۆز بکات، تا بۆ هەمیشە لە ناویاندا بمێنێتەوە، گوتیان: "ئەوە دیانێکی زۆر لێرەدا هەن، پێشەواو قەشەکانیش لە ئێمە دوورن ناتوانن هەموو دەمێک بۆ لای ئێمە بێن و خەم لە پێویستی و ئاتاجییەکانی ئێمە بخۆن و لە پرسە گیانی و جەستەییەکان ئێمە بخەنە سەر ڕێگای ڕاست". ئەویش بە خۆشحاڵییەوە داواکەی لێ وەرگرتن و ئارەزووەکەی بۆ جێبەجێکردن. هەواڵی بۆ (حایبێیل Haibeel)"ی قەشەی (سوسە) نارد[٤٥]، تا پێکەوە لەگەڵ ئەو، بە ڕەزامەندی تەواوی خۆیان و تەواوی هەموو خەڵکەکە (پاپا)ی ئارامییانیان بۆ ئەمە هەڵبژارد، کە پیاوێکی زانا و دنیا دیدە بوو. ئیتر هەریەکە لەوان گەڕایەوە بۆ نیشتمانی خۆی، بە سەرسوڕماوی لەوەی کە چۆن خودا هەمیشە لە خەمی کڵێساکانی خۆیەتی. چونکە

ئەو كلێسایانە بەو خوێنانە راسپێردراون، كە بە هۆی لایەنگیری لە خودا رژێنرانە سەر دارخاچەكان.

كە ئەخازابوهی بەرەو ئەربێللا هاتەوە، هەموو دیانەكان و زۆر لە ماگ و كافرەكانیش بەرەوپیری چوون و بە ئاهەنگ و خۆشی هێنایانەوە ناو شار، سەبارەت بە ژیانی پڕ لە ئاكاری جوان و قسەی شیرین و كردەوە باشەكانی. دوای سەركەوتنێكی زۆر، گیانی خۆی سپاردە دەستی خودای ئافەریدی، دوای ئەوەی هەژدە ساڵان خزمەتی كرد.

**شێریا Sheria**

دوای ئەخازابوهی كرێكاری ئازاو پریستای راستەقینە شێریا هاتە پێشەوە، بۆ رابەرایەتی گەلی خودا. ئەو پیاوە خەڵكی ئەربێللا بوو، كوڕی باوك و دایكێكی دیانی مەسیح - دۆست بوو. لە منداڵییەوە لە خزمەتی كلێسادا بوو، هەروەها هەموو ئەركە ئایینییەكانی جێبەجێ دەكرد. ئەوەش خەباتێكی زۆری كرد دژی شاگردانی شەیتان. ئۆها! پینێهاسی خودادۆست، لە رۆژگاری ئەودا كلێساكانی خودا چ سەركەوتنێكی مەزنیان بە دەست هێنا. دوای ئەوەی كلێساكان ٣٠٠ ساڵ چەوسێندرانەوەو ئاتاج ببوون و بناغەكانیان هەڵتەكابوون، بەهۆی (كونستانتین)[٤٦]ی هەمیشە سەركەوتوو، ئارامی و ئاسایش و سەركەوتن هەموو كونجێكی گرتەوە.

برێك بەر لە هاتنی ئەو (دیۆكلیتیان Diokletain) پاشای تاوانكار هەوڵی ئەوەی دەدا كە ناوی مەسیحییەت لەسەر رووی زەوی رەش بكاتەوە، شەو و رۆژ بۆ ئەو ئامانجە هەوڵی دەدا، ئەو فەرمانی ئەوەی دا كە كلێساكان برووخێنن و بێ بەزەیی پێداهاتنەوە دیانەكان بكوژن، چ ترس و لەرزێك، چۆن زندەقچوونێك سەرتاپای خەڵكی گرتەوە، كە ئەو فەرمانە بێ بەزەییەی دا! كافرەكان ئەوەیان بەس نەبوو كە دیانەكان تاكوتەرا بكوژن، بەڵكو خەڵكەكەیان بە كۆمەڵ دەكوشت و دەسووتاند، بەبێ ئەوەی بخرێنە بەردەم هیچ دادوەرێك. زۆر جاران دەدیترا كە باوك جەللادی كوڕەكەی خۆی بوو، برا جەللادی براكەی خۆی بوو، بە شێوەیەك كە ئاقاری خۆشەویستی لە ناوەڕاستیەوە شەقی بردبوو.

لە كاتێكدا كە پاشای رۆمەكان خەریكی ئەو تاوانكاریە بوو، هەوای كوشت و كوشتاری ئەوانی كەوتبووە كەللە، كەچی تاكە جارێكیش ئەوان بەهرەی ئەوەیان تێدا نەبوو، كە حوكمی گەل بەرێوەببەن. بۆیەشە كە پاشای فارسان (هورمیزد)[٤٧] دەركی بەو راستییە برد، بە لەشكرێكی زۆرەوە هێرشی بردنە سەر و چەندەها شاری لە رۆمەكان تەخت و تاراج كرد. بەڵام چونكە خودا بەخۆی ئەو هەموو تاوانكارییەی دیت، هاتە مەیدانەوە، دوژمنەكانی خودا پەرت و بڵاو بوونەوە، كینەدارەكان لە دەستیدا هەڵدەهاتن و وەكو دووكەڵ لە هەوادا گوم دەبوون و وەكو شەمێ دەتوانەوە (پسالم: ٦٨.١.٢). خودا دەسەڵاتی باڵادەستی دا بە كونستانتینی بەندەی خۆی و رۆژێك لەسەر رووی هەورەكان وێنەی خاچی نیشاندا، كە لە سەری نووسرابوو: "بەو وێنەیە تۆ سەردەكەویت". ئەویش وێنەی خاچی هەڵگرت و بەسەر هەموو لەشكرەكەیدا گەڕاند. لە ژێر سایەی وێنەی ئەو خاچەدا، سەربازە تاوانكار و بێبڕواكان وەكو مێشوولە لەبەریان هەڵدەهاتن. جا نیشانەی خاچ كە تا ئەو كاتە نیشانەی جنێو پێدان بوو، بوو بە نیشانەی سەركەوتن بۆ هەموو كەسێك، بۆ دەوڵەمەند و بۆ هەژاران، بۆ بەرز و بۆ نەوییان، بۆ خوێندەوار و نەخوێندەواران.

لە رۆژهەڵاتدا، پاپا قەشەی پایتەخت (تسەیفون)، ئەوەی كە لەمەوبەر باسمان كرد، لەبەر ئەوەی كە ئەو لە پایتەختدا دادەنیشت و، قەشەكانی تر بۆ بەرژەوەندی تری بیانیی[٤٨] پێویستییان بەو دەبوو، داوای ئەوەی كرد كە هەموو قەشەكان بكەونە ژێر دەسەڵاتی ئەو و، ئەو ببێتە تاكە گەورەی هەمووان، پریستاكانی پایتەخت و هەموو جڤاتەكان دژی ئەو داخوازییەی وەستان و، لەبەر ئەوەش داوایان كرد كە بڕیاری لابردنی بدرێت لەسەر كارەكەی. سەردیاكۆنەكەی خۆی (سیمیۆن) دژی ئەم نوێكارییە لە داخان هەڵمسابوو، هەواڵی ئەمەی گەیاندە میلسی سوسە و (ئیقەب - ئەلاها Ekebh Alaha)ی (كەرخا دی بێت سلوخ) و زۆر شوێنی تر. لەبەر ئەوە پاپا ترسێكی زۆری لێ نیشت. چونكە دایك و باوكی سیمیۆن لە نزیكانی پاشا بوون و لای هەموو كەسێك دیار و بەرچاو بوون. پاپا نامەی نووسی بۆ قەشەكانی رۆژئاوا و بە تایبەت بۆ قەشەی ئیدیسا (ئورفە) كە ناوی "سادا Sada" بوو. هەموو قەشەكان وەڵامیان بۆ نووسییەوە، چونكە ئەوان بروایان بەوە هەبوو كە پاپا پیاوێكی چاڵاك و لێهاتووە،

بەڵێنیان داپێ کە لەلایەن کونستانتین هەولی یارمەتی بۆ بدەن. لەبەر ئەوەی ئەوان ئەوەیان بە شتێکی جوان دەزانی کە قەشەی پایتەخت ببێتە لوتکەی دەسەلاتی هەموو قەشەکانی ڕۆژهەلات. نامەیەکی بەو مانایەیان بە ناوی خۆیان و هەموو نزیکەکانی پاشا و گەورەکانی گەلانی ڕۆژئاوا نووسی. بۆیان نووسی، کە چۆن لە ڕۆژئاوای ژێر دەسەلاتی ڕۆمەکان چەند پاتریارشێک هەیە لە ئەنتوخیا، لە ڕۆم، لە ئەسکەندەرین و لە قوستەنتین، ئاواش با لە ڕۆژهەلات لە ژێر دەسەلاتی فارسەکان پێویستە بەلای کەم پاتریارشێک هەبێت.

ئەوسا خودا، کە لەبەر گوناهی ئادەم، ڕۆڵە تاقانەکەی خۆی ڕەوانەی جیهان کرد، ئەوەی بە هۆی ئەو بەلایەکانە کە بەسەر میسری داهێنا، ئیسرائیلیەکانی ڕزگار کرد، ئەوەی وا دەکات کە درک بەر بدات، پنجە درک خونچەی سوورگوڵ بگرێت، ئەوەی هەموو کاتێک دەتوانێ خراپە بە چاکە بگۆڕێت، بە ئاماژەیێکی خودایی خۆی و بە هۆی فەرمانڕەوایی خۆی لە جیهان، کە شایانی پەرستنە، ڕێگەی ئەوەی خۆش کرد کە نەخشەکەی پاپا بەرەو سەرکەوتن بچێت، بەبێ ئەوەی کە خۆی ئاگادار بێت، دامەزرێنرا بە سەرۆکی گشتی هەموو قەشەو دیانەکانی ڕۆژهەلات. بەم جۆرە قەشەکان هەموو ڕەزامەندی خۆیان بۆ ئەم بڕیارە دەربڕی، کە ڕۆژئاواییەکان دابوویان، چونکە ئەوان لە قەشەکانی ئەوێ (ڕۆژئاوا) دەترسان، ئەوەک بیانخاتە نێوان دوژمنی خاوەن دەسەلات، پاشای مەسیحی ڕۆمەکان لە ڕۆژئاواو پاشای تاوانکاری فارسان لە ڕۆژهەلات. بەلام سیمیۆنی سەردیاکۆنی پاپا بە هیچ شێوەیەک نەیدەویست گوێی لەم بڕیارە ببێت و هیچی لە بارە بزانێت، هەولی ئەوەی دەدا کە بە ڕێگای باوک و دایکی بە ناوی پاشا ئەو بڕیارە هەلبوەشێنێتەوە. بەلام پاپا ڕێگایێکی دۆزییەوە کە بتوانێت باوکی سیمیۆن بۆ لای خۆی ڕابکێشێت، ئەویش بەوەی کە بەلێنی ئەوەی پێدا کە بۆ کاتەکانی دوای مەرگی خۆی، سیمیۆن وەکو جێنشینی خۆی دیاری بکات.

لەو ڕۆژگارەدا لە شاری سەر سنووری نسیبیس (نوسەیبین)، پیاوێکی لە خوا ترس بە ناوی یاقوب، ناوبانگی دەرکرد و وەکو موژدەدەرەکان (ئەپوستل) پەرجووی دەهاورد و وەکو پێغەمبەرەکان نیشانی بەدیار دەخست. ئەو پیاوە هەروەکو گەورەکەی خۆی زۆر جاران تەواوی شەوی بە خواپەرستی دەبردەسەر و شەونخوونی و ڕۆژووگرتنەکانی لە هەموو شوێنێ ناوی دابوودەو، چونکە ئەو مرۆڤێکی خودایی ڕاستەقینە بوو، دەمانەوێ لە دواتر (لە دەقی یۆحەننان) بە تایبەت باسی لێوە بکەین. شێریای ئێمەش کە لە ئەشقی خودا تواوبوودەو، زۆر جاران سەردانی ئەوی کرد، تا ئەو ڕانمایی بکات و هەروەها لەگەڵ یەکتریدا بدوێن.

دوای ڕەنج و خەباتێکی زۆری بێ کۆتایی، شێریا لە ڕۆژێکی هەینی هاوینی ٦٢٧ی یۆنانی خوداحافیزی کرد و لە ناو کلێسادا بە حورمەتێکی زۆرەوە نێژرا.

### XII.

### یوحەننان Johanna

دوای شێریاری شەیداو واگا یوحەننان هات، بەوەیان دەگوت "بار مریەم" (کوڕی مریەم)، چونکە مریەمەی ڕوحشادی یەکجار خۆش دەویست، ئەوەی ئەو کەسەی هێنا دونیا، کە جیهانی دووبارە زیندوو کردەوەو نوێی کردەوە. ئەوەش (شێریا) خەلکێکی زۆری لە کافر و جوودەکان گەڕاندەوە، بۆیەشە ڕق و کینەیەکی زۆری مەرگاوەریان لێ هەلگرتبوو. ئەوەبوو ناچاریان کرد لە ئەربێللا ڕابکات، دەست و پێوەندیان بە دوایدا نارد تا بیکوژن، بەلام ئەو خۆی شاردەوەو دەست و پێوەندەکان بە سەرلێشێواوی و بێ ئەنجام لە گوندەکان و ناوچە شاخاوییەکان بە دوایدا دەگەڕان. ئەشقی یوحەننان بۆ خودا ڕۆژ لە دوای ڕۆژ پتر بلێسەی دەسەند، ئەو بۆ ئەو ئەشقە پێگەیشتبوو، بۆیەشە توانی مەرێکی زۆر بێنێتە ناو پەرژینی حەزرەتی مەسیح.

لەو سەردەمەدا، کە پاشا دیانەکان حوکمی دنیایان دەگێڕا، کاروبارەکانی کلێسا گەشابوونەوە، دۆزەخ قۆچەکانی خۆی بەرزکردەوە، زاری بۆگەنی خۆی کردەوە بۆ ئەوەی قسەکان بکەونە گەڕ، ئەو قسانەی کە دوژمنایەتی باوەڕی ڕاستەقینەیان دەکرد، بەکرێگیراوێکی درۆزنی دۆزییەوە، تاکو وانەکانی بۆ بلاو بکاتەوە، کە (ئاریوس)ی توندڕەوی فێلبازی خودانەناس بوو. بە نەناسینی حورمەتی ئەو (پسالم: ٤٩.١٢)، بە فەرامۆشکردن و نرخ دانەنان بۆ ئەو باوەڕەی، کە کوڕەکەی خودای ئافەریدە، بۆ ڕزگارکردنی

ئێمە دابەزیوەتە خوارەوە، نەهی کرد لە خودایەتی حەزرەتی مەسیح و کەوتە دوای خەیاڵ، گوایە کە حەزرەتی مەسیح ئافەریدگار (خالیق) نییە، بەڵکو ئافەریدەیە (مەخلوق)و لە رووی سروشتەوە کوڕی خودا نییە، بەڵکو تەنها لە رووی مەجازیەوە. بە هۆی ئەوەوە نائارامی سەرتاسەری زەوی گرتبۆوە، ٣١٨ قەشە لە شاری نیسیا (Nicaa) کۆبوونەوە تا ئەو کابرایە بە مامۆستایەکی گومڕاکەر بدەنە قەڵەم، بە یارمەتی کونستانتینی پاشا، بۆچوونەکانی ئەو باوکە بەڕێزانە سەری گرت و توانرا ئاریوس و ئەوانەی وانەکانی ئەویان بڵاودەکردەوە بخرێنە بەر نەفرەت و، ئەوە ساغ بکەنەوە کە حەزرەتی مەسیحی کوڕی خودا لە هەمان سروشتی باوکێتی و، لەگەڵ خودا هاوبوونە.

لە هەمان کاتدا شاپووری دووەم پاشای فارسەکان (٣٠٩-٣٧٩) هێرشی بردە سەر وڵاتە شاخاوییەکان، تا ئەو دوژمنانە لەناوببات، کە لە شاخە بەرزەکانی نزیک دەریا دابەزیبوونە خوارەوەو زۆر گوندیان خاپوور کردبوو، هەروەها نیازی ئەوەی هەبوو کە زۆر لە شارە رۆمییەکان وێران بکات، ئەوەش روویدا هەروەکو دواتر دەیبینین. هەموو کەس دەیتوانی دەرک بەوە ببات، کە کاتی وێرانکردنی کڵێساکان و شکاندنی حورمەتی پیرۆزایەتییان هاتووە، بەڵام خودا، ئەوەی کە هەموو شتێک دەبینێت بەر لەوەی بێنە ئارا، سەیر دەکات و بێ دەنگ دەبێت و بە غەزەب و تووڕەیی خۆی وەڵامیان دەداتەوە. شاپووری دووەم کە نزیکەی حەفتا ساڵان، لە ساڵی ٦٢٠ دوە تا ٦٩٠ ی یۆنانی حوکمی کرد، کە زانی پاشا کونستانتینی هەمیشە سەرکەوتوو مرد، ئەوەی کە شاپوور لە ترسیدا دنیای لێ پڕ ببوو، کونستانتیوسی کوڕی بووە جێنشینی، ئەوەی بە هەل زانی و وای بیرکردەوە کە ئیتر بێ بەربەست دەتوانێ وڵاتانی مەسیحی داگیر بکات ئەوەبوو هێرشی بردە سەر شاری نیسیبیس سەر مەرز، نەیزانی کە ئەو شارە وەکو سوورگوڵێک بە تەنها جێگیر و پارێزراوی ژێر درکان نییە، بەڵکو بازووی خودای بەتوانا، پاشای پاشایان، ئەو شارە دەپارێزێ. خودا ئەوەی کە بە هۆی (یودیت) مێینەیەکی بێهێز لەشکر و ئازایی (هۆلۆفێرن)ی بەزاند و بە ئەرزی دادا، بە نزا و پاڕانەوەی (ئێستێر) ژنێکی خواپەرست، هامانی خوا نەناسی بردە بەرپەتی سێدارە[٤٩]، ئەوەی بە ڕێگای سیمسون هەزارەهای

لە فیلیستەکان لە ناو برد، هەر ئەو خودایەش ئێستا رێگا نادات شاپوور بەسەر شاری نیسبیس دابدات، ئەویش بە هۆی نزاو خواپەرستی قەشەی دیندار و بە ناوبانگ و نوورانی یاقووب.

واتە یاقووبی باوکی تیرەکان، کە دیتی منداڵەکان بەرەو هەموو لایێک پەرەوازە دەبن و، دەبن بە گاڵتەجاڕی کافرە چەپەڵەکان، هەستا وەکو مووسای هەڵبژاردەی خودا چووە سەرەوەی سەنگەرێکی پێشەوە، چووە سەر دیواری شار و دەستی کرد بە پاڕانەوە لە خودا، کە خودا ئەو بکوژێت یا گەلەکەی لە دەست کافرەکان لە مەرگ رزگار بکات، خودا نزاکەی لێ وەرگرت، دیتی لەشکرێک مێشوولە لە هەوادا پەیدابوون، هێرشیان بردە سەر لەشکرەکەی شاپوور. مێشوولەکان دەچوونە ناو کونی لووتی ئەسپەکانیان، ئەسپەکان شێت و ماخولیا دەبوون و مرۆڤەکانیان کوێر دەکرد، ئیتر هیچیان بۆ نەمابوو جگە لە هەڵاتن. چونکە لەوە دەترسان کە بەهۆی ئەو کوێربوونە ناسروشتییە، لەشکری رۆم بە سەریاندا بدات و هەموویان لەناوببات. کاتێک کە ئەوان خەریکی ئەو سەرلێشێواوییە بوون، چەند کەسێک هەواڵیان گەیاندە کونستانتیوس لە بارەی ئەو رووداوە، ئەویش سوپاسی خودای کرد بۆ ئەو چاکەیەی کە لەگەڵ یاقوبی بەندەی خۆی کردی[٥٠]. ئەوەبوو بە هەڕەشە و گوڕەشە پاشای فارسان بەرەو دوا کشایەوەو سوێندی خوارد کە لایەنگرانی رۆم لە وڵاتەکەی خۆیدا قربکات.

بەڵام یوحەننان قەشەی وڵاتەکەی ئێمە، ئەو کاتە لە ناو مەڕەکانی خۆیدا نەبوو، بەڵکو لە ساڵی ٦٤٠ی یونانییەوە لەگەڵ هەموو قەشەکانی تر چوو بوو بۆ پایتەخت (تسەیفون) تا پیاوێکی زاناو بڕوادار بۆ پێشەی پاتریارشی هەڵبژێرن، چونکە کورسی سلوسیا لە ئەنجامی مەرگی خەفەتباری مار پاپا، کە کەمێک لەمەوپێش روویدابوو، بێ پاتریاتیش مابووەوە. دەڵێن یوحەننان دوو ساڵان لە پایتەخت بووە پاشان بە هۆی کاروباری کڵێسا چووە بۆ سوسیانا. ئەو هەر لەوێ بوو، کاتێ فەرمانی بێ رەحمانە بۆ هەموو ماوپاتەکانی هەرێمەکە هات، کە پێویستە بێ دەستگێرانەوە هەموو دیانەکان بکوژن و کڵێساکان بڕووخێنن. لە شەشی نیسان، ئەو کاتەی کە پاشا لە سوسیانا بوو، لە سی و یەکەمین ساڵەی ئەو

گوناهبارە، ئەوەی کە هەرگیز لە ژیانی خۆیدا نەیزانیوە بەزەیی چییە، بێ هیچ دڵ پێ سووتانێک شمشێر دەستی بە توورەیی کرد و هەر کەسێکی وێرای دان بە باوەڕی خۆیدا بنێت کوژرا.

بەڵام یوحەننان قەشەی ئەربێللا، سوسیانەی بەجێهێشت و لە ناو مێگەلەکەی خۆی بەدیارکەوتەوە تا پارێزگاری لە بەرخ و مەڕەکانی خۆی بکات، ئەوانەی بۆ پاراستن بەو راسپێردرابوون، دڵی پڕ بوو لە خۆشی کە دیتی ئەو شمشێرەی کە دەبوو دیانەکانی ولاتەکەی ئێمە لە ناوبەرێت، هێشتان لە کالاندایە. چونکە پەگرەسپ ماوباتی (موبید) ولاتەکەمان، لەگەڵ گەورە پیاوانی شار لە سەر ئەوە رێککەوتبوون، کە لە مانگی ئەیلوول لە دوای کۆکردنەوەی بەر و بووم و عەمبارکردن دەست بە کوشتنی دیانەکان بکەن. دەڵێن پاشا لەو فەرمانە سەختەی کە بۆ قەتلوعامی دیانەکان دابووی پەشیمان ببووەوە، حەزی بە هەڵوەشاندنەوەی دەکرد. بەڵام جوودەکان و مانییەکان، دوژمنانی ناوی مەسیحییەت، هانی ماگیەکانیان دەداو پێیان دەگوتن، کە گەرەکە ئەوان رێگەی ئەوە نەدەن، کە پاشا ئەوە بکات (فەرمانەکە هەڵبوەشێنێتەوە) دەیانگوت: "کە دیانەکان هەموو سیخوڕ و جاسوسی رۆمەکانن، هیچ شتێک نییە کە لە ئیمپراتۆریەتی فارس رووبدات، ئەوان نەیگەیەننە رۆمەکانی هاوئایینیان، لە کاتێکدا پاشای پاشایان تووشی شەڕێکی سەختی دژوار بووە، ئەوان بەشداری شەڕ نابن و هەمووشیان دەوڵەمەندن و ژیانێکی ئاسوودە بەسەر دەبەن".

بەم جۆرە بەم درۆ و دەلەسەیە ماگییەکان بیری پاشایان گۆڕی و ئەوسا پاشا فەرمانی ئەوەی دەرکرد کە دەبێ دیانەکان دووقات سەرانە بدەن و جەختی لەسەر ئەوە کردەوە، کە پاشتر پێویستە بێ بەزەییانە هەموو بکوژرێن.

ئیتر ئێمە بووین بە گاڵتەجاڕی کافرە خودانەناسەکان، جوولەکەکان پەلاریان تێ دەگرتین و دەیانگوت: "کوا خواکەی ئێوە؟ ئێستا پێویستە عیساکەی ئێوە خۆی بەدەرخات، ئەوەی لێرە لە سەر گولکاپا (Golgatha) لە خاچ دراوە، پێویستە بێتە هاناتان و چەوسێنەرەوەکانتان نەهێڵێت، ئەدی ئەو بە ئێوەی نەگوتبوو: من لەگەڵ ئێوەدام، تا کۆتایی جیهان". بەڵام لە جوودەکانیش پتر مانییەکان گاڵتەیان پێدەکردین و دەیان بوغزاندین، وەکو کەمترینی خەڵک بە سووک تەماشایان دەکردین. شوانەکە لێی دراو مێگەلەکەی پەرت و بڵاو و پەرتەوازە بووەوە، چونکە دەمی تاریکی داهاتبوو، رووناکی راوکرابوو، کاتێکی وەها بوو کە مرۆڤ ناچاری ئەوە دەکرا بە توێژی بوونەوەری لە ناوچوو (فانی) لە جیاتی خودا بپەرستێت، لەلایەن مرۆڤ قوربانی پێشکێشی ئەو (رۆژ)ە دەکرا، کە خودا بۆ خزمەتی مرۆڤ دروستی کردووە. بۆ ئەو ئاگرەی کە بۆ ئاتاجی مرۆڤ خولقێندراوە، پەرستگای رۆناکی دروست دەکرا. ئاتەشگا بۆ دێوەکان (دیمۆن) دروست دەکران، تا کڵێسای ئاسمان بکەوێتە ناو کارکارەی تەنووری لە بیرچوونەوە. ئای لە بێخودایی، ئای لەوەی کە مرۆڤ توورەیی و سەنگی خۆی دەخاتە سەر دژایەتی ویستەکانی خودا.

هەروەها وەکو یەکێک کە بیەوێت، پنچکە گیایێک لەناوبەرێت، لە سەرەتادا تۆپەکانی لەناوببات، پاشان رەگ و ریشەکانی هەڵبکێشێت و تێی هەڵبدات، ئاوا ماگییە کافرەکان ویستیان شوان و دیانە دیار و بەرچاوەکان لە ناوبەرن. بەو شێوەیە هوروژمیان بردە سەر مار (سیمیۆن بار شەبایی) (سیمیۆنی کوڕی شەبایی)، کە بۆ ئەوە دیاری کرابوو کورسی پاتریارشی رۆژهەڵاتی بدرێتێ، لەگەڵ ئەو زۆر پریستاو دیاکۆنیشیان گرت و هەموویان برد بۆ لای پاشا، بەرەو کەرخادی لیدەن (Karkha dhe ledean)، لە دوای پرس و لێکۆڵینەوەیەکی زۆر، قارەمانی خوداو شوانە مەزنەکان بە گەڤ و هەڕەشە نەهەژان و ملیان کەچ نەکرد و کڕنووشیان بۆ (رۆژ)ی ئافەریدی خودا نەبرد، شاپوور ۱۰۲ هاوڕێکەی تەسلیمی ئەشکەنجەدەران کرد، بەڵام دوای ئەو هەموو خەباتە زۆرەی مەسیح، سەری سیمیونیان پەڕاند، ئەوەی بە درێژایی کاتی تێکۆشانی خۆی دڵنەوایی خەڵکی دەکرد و هێز و وردی دەدانێ.

ئەوە لە رۆژی هەینی رۆژی (ئازاری مەسیح)ی گەورە، روویدا، لێرەوە تا رۆژی یەکشەممە لە ئەلبیس (albis) (ئەو یەکشەممەی هەفتەی دوای جەژنی فیصحە) لە سەرتاسەری ولات شمشێر نەهەسایەوە، لە هەموو لایێک دیانەکانیان بە کۆمەڵ وەکو مەڕان بۆ کوشتن دەبردران، جگە لەوانە هەر لە شوێنی ژیانی خۆیاندا دەیانکوشتن.

دەڵێن لە ولاتەکەی ئێمە ئەدیابانە بە هۆی ئاگایی ماوباتی دڵ پڕ بەزەیی پەگرەسپ تەنها کەمێک خەڵک

کوژرا، ئێمە ناوەکانیان نازانین، بەرامبەر ئەوە لە ساڵەکانی دواتر دوای مەرگی پەگرەسپ و هاتنی (پیرۆز تەمشابۆر Tamshabor Peroz)، بۆ جێگەی ئەو، ڕژانی خوێنی دیانەکانی وڵاتەکەی ئێمەش بێ پسانەوە دەستی پێکرد، تاکو زەوی پڕ لە گوناهـ و خودانەناسی بەهۆی شاگردانی شەیتان ئەوانەی کە لە سەر زەوی دەژین، بە هۆی لافاوێک خوێنی پاک و بێ گوناهـ ئاو بدات، زەوی لە هەموو چڵک و لەکەیەک پاک کرایەوە، لە ڕاستیدا تاوەکو بۆ زاوای ئاسمان ببێت بە بووکێکی بە زریق و باق و ڕازاوە، بۆ ئەو زاوایەی کە ڕێگای خاچەکەی بە سەر گۆلگاپاوە[51] لە ژێر ئازار و ئەشکەنجەیەکی لە باس نەهاتوو، ئاهەنگی بۆ گێردرا، لەو کاتەدا ئەو بە شاگردان و ئەوانەی کە بە دوای ئەودا دێن، هەروەها بە هەموو کەس و کاری کڵێسای گوت: "ئێوە بەهەشتیین کاتێک گاڵتەتان پێدەکەن و دەتانچەوسێننەوەو لەبەر خاتری من لەگەڵ چەوساندنەوە قسەی خراپتان پێ دەڵێن، دڵشاد و خۆشحاڵ بن، پاداشتتان زۆرە لە ئاسمان، چونکە هەر بەو چەشنەش ئەوانە بەر لە ئێوە پێغەمبەرەکانیان چەوساندۆتەوە" (مەتتی: ١٢،١١.٥).

خۆشەویستەکەی من پینێهاس! ئێستا بۆ من کارێکی سەختە، یەک لە دوای یەک ناوی هەموو دیانەکانت بۆ بژمێرم ئەوانەی کە لە تەواوی ڕۆژهەڵات کوژران، خۆ لە ژمارەش نایێن، ئەو بەرخە پاکانە نایەنە ژماردن. ئەوانەی کە بە سیکاردی قەسابەکان وەکو قوربانییەکی زیندووی حورمەتداری ئیمارەتی ئاسمان کرانە قوربانی خودا، ئەگەر من تەنها هەر ئەوانەت بۆ بژمێرم، کە بە خوێنی خۆیان خاکی شار و پارێزگاکەی ئێمەیان ئاوداوە، چونکە هەر ئەوەشە ئەوەی کە تۆ داوای دەکەیت، ئەوا دەگەینە ئەوەی کە بزانیت چ جۆرە پیاوانێکی ڕاستەقینەی خودایی لە پێشەوەی تۆوە هاتوون و ڕابووردن و دەتوانیت بەبێ کۆسپ شوونپێیان هەڵبگریت. بەڵام ئەوان بۆ ئێمە سەرلەشکر بوون ڕابەری ڕێگەی پێگەیشتن (کامل- بوون) بوون. ئەو ڕێگایەی کە هەموویان بە جوانترین شێوە لە دەروونی خۆیاندا هەڵیانگرتبوو.

لە سی و پێنجەمین ساڵی شاپوور پاشا، بە فەرمانی پیرۆز تەمشابوور قەشە یوحەننان و پریستاکەی یاقوب، هێرشیان بردرایە سەر. لە سەرەتادا ماوپاتی بێ بەزەیی لە قەڵای بیدیغار (Bedhighar) (یان دیغار Dighar) بەندکردن. هەردووکیان ساڵێک لەوێ هێڵدرانەوە، کافرەکان زۆریان ئەشکەنجەدان، قارەمانانی حەزرەتی مەسیح بە جۆرێک دانیان بە خۆدا گرت کە باسی لێوە ناکرێت، ئەوان شاد و خۆشحاڵ بوون، بەوەی کە ئەو حورمەتەیان بەرکەوتبوو، کە لە پێناوی خۆشەویستی حەزرەتی عیسا تووشی ئەو ئەشکەنجەدانە ببوون.

لە هەمان ڕۆژدا پیاوان و ژنان و ڕەبەنەکان لە هەموو لایێک بە کۆمەڵ دەکوژران، پریستا نارسای (Narsei) و دیاکۆنەکانی کڵێسا (حەنەنیا) و (ڕێحیما) لە ناو ئەواندا بوون، لە دوای لێکۆڵینەوەو ئەشکەنجەیێکی زۆر، چونکە ئەهریمەن نەیتوانی هێزی سەرنجڕاکێشی بەرگریکردنیان بشکێنێ، لە خاچیاندان. لە هەمان شەودا لاشەکانیان لەلایەن دیانەکان دزراو ئێستا ئسێقانەکانیان کانیاوێکن، ڕەحمەتی خودایان لێ هەڵدەقوڵێ بۆ هەموو مرۆڤانی گوناهبار، ئەوانەی پەنایان بۆ دەبەن.

هەموو ڕۆژێک تا کۆتایی ساڵ شمشێر لە ناو خوێنی ئێمەدا خرجەی دەهات بێ ئەوەی تێر ببێت. ماگییەکان هەموو بۆ وڵاتەکەی ئێمە، دەتگوت قەسابن، کەچی بەوەش قەڵەو نەدەبوون، وەکو سەگی هار تنۆکەکانی خوێنی ئێمەیان دەلێستەوە، ئەو خوێنەی کە وەکو(؟) ڕەنگی جادە و مەیدانەکانی شاری سوور کردبوو، ڕۆژ لە دوای ڕۆژیش هارتر و خراپتر دەبوون.

## XIII.

### ئەبرەهام Abraham

دوای ئەوەی دیانەکان لەگەڵ یەکتری ڕێککەوتن و بەنهێنی ئەبرەهەمیان هەڵبژارد بۆ ئەوەی تا ئەو کاتەی یوحەننانی کرێکاری خودا لە گرتووخانەدا ئازاد دەبێت، کڵێسای خودا بەڕێوەببات. ماگەکان لە دژی ئەوەش زۆر هەوڵیان دا تا هێرش ببرێتە سەری، چونکە دیتیان کە دیانەکان بۆخۆیان ڕابەرێکی تریان هەڵبژارد و ئەوانیش بەمە زۆر نارەحەت بوون. لەبەر ئەوە ئەبرەهام ماوەی مانگێک خۆی لە ماڵی براوادارێک شاردەوەو خۆی لە کەڵبەی خوێناوی گورگە درندەکان ڕزگار کرد.

لەو ڕۆژانەی کە پاشا لە (بێت- لاپات) بوو بە ڕاسپێرێک فەرمانی بۆ ماوپات پیرۆز تەمشاپوور نارد، کە

بە زووترین کات بچنە لای. ئەویش تا دڵسۆزی و گوێڕایەڵی خۆی بۆ ڕاسپاردەکەی پاشای پاشایان پێشانبدات و خۆی لە تووڕەیی و هەڕەشەی ئەو بپارێزێ و دایبمرکێنێتەوە، یوحەننان و یاقووبی پریستای لەگەڵ خۆی برد. دوای گەیشتنیان بە بێت - لاپات زۆریان لێ کرا کە باوەڕ بە خۆدای ڕۆژ بهێنن، بەڵام چونکە ئەوان لێ نەگەڕان کە لەبەر خاتری مەخلوق سووکایەتی بە خالیق بکرێت و خالیق بە مەخلوقی خۆی بگۆڕدرێتەوە، بێ فەرمانی پاشا لە یەکی تشرینی دووەم ملیان پەڕێندرا. بیرەوەری ئەوان ڕەحمەتی خودامان بۆ دێنێت و کۆمەکمان دەکات لە خواپەرستی.

بەڵام پیرۆز تەمشاپووریش کە وای دەزانی بەمە دەتوانێت پاشا لە خۆی ڕازی بکات، لەلایەن پاشاوە لە کارەکەی دەرکراو شوێنەکەی درا بە یەکێکی تر بە ناوی (ئاژورپەرێ Adhorparre)، ئەوەی کە پێشتر سەرلەشکر بوو. لەوکاتەی کە سەربازێکی زۆر لە وڵاتەکەی ئێمە کۆکرایەوەو ویستیان جەنگێکی گەورە دژی ڕۆمەکان بەرپا بکەن، تا مەسیحایەتی و پریستایەتی و پاشایەتی ڕۆمەکان نەهێڵن، جا ئەو ماوپاتە کە لەوەی پێشتریش زۆردارتر بوو، ددانی خۆی لە تەماحی خوێن جیڕ کردبۆوەو سوێندی بۆ کوشتنکاری خواردبوو.

کە ئەبرەهام زانی ئەو شێرە دڕندەیە هاتۆتە پارێزگاکەی، یەکسەر ڕایکرد بۆ گوندی (تەلنەجاحا)، بەڵکو بتوانێت خۆی ڕزگاربکات، تا لە خوڕا نەبێتە ئامانج و نێچیری شێرە وەحشەتناکەکە، بەڵام ماوپات خەڵکێکی زۆری بە دوادا هەنارد. کاتێ لە ژێر ئەشکەنجەدانێکی بێ بەزەییانە زۆریان لێ کرد کە حاشایی لە حەزرەتی عیسا بکات، بەڵام ئەو لێدان و هەڕەشەکانیانی پشتگوێ خست، لەو گوندەدا، لەو شوێنەی کە پەنای بۆ هێنابوو لە پێنجی شوبات لە سەریان دا.

### XIV.

### مارانزێخا Maranzekha

دیسان بروادارەکان کۆبوونەوە بە نهێنی مارانزێخای پریستایان بۆ قەشەیی هەڵبژارد. ئەو ساڵانە ساڵانێکی پڕ ناخۆشی و ماندووبوون بوون. لە سەردەمی کۆندا کە هێشتا ژمارەی دیانەکان زۆر کەم بوو، خەڵک هەر بیست ساڵ، سی ساڵ جارێک کۆدەبوونەوە، تا شوانێک بۆ خۆیان هەڵببژێرن، بەڵام لەو کاتانەدا تاکە ساڵێکیش ڕانەدەبورد بەبێ هەڵلووشینی شوانێک لەلایەن گورگەکان. ئەوە بە ئاشکرا دیار بوو کە ئەوە ڕژانی تووڕەیی و غەزەبی خودا بوو، بۆ سزادانی ئێمە بە هۆی گوناه و خودانەناسیمان و لە تۆڵەی خوێنی خۆی، خوێنی حەزرەتی عیساو بە هۆی ئەو لاساری و تاوانانەی دژی ئەو کردمان. ئەو بە تووڕەیی خۆی سزای داین و ئێمەی بە هێزی خۆی ڕاهێناو، بەمەش ڕۆحمان زۆر داهێزراو و داتەکا بوو (پسالم: ٦.٤)، بۆیە بروادارەکان دەستیان پێکرد بەرامبەر زۆردارەکان بێ هیواو بێهێز بن. هەندێک لەوان بڕوایان بەوە هێنا کە خودا خەوی لێکەوتووە، قسەکەی داودیان دووبارە کردەوە: "واگا وەرەو مەخەوە ئۆهـ خودایە. بە بیر خۆتمان بهێنەوە لە یادمان مەکە". (پسالم: ٤٤.٢٤)

مارانزێخا وەکو شوانێکی وریا هەستایەوەو هانیدان و هیواداری کردن، کە ئیتر کۆتایی چەوساندنەوە نزیک بووەتەوە، ئەو باوەڕەی زیندوو کردەوە، ئەوەی کە لە بەرامبەر شمشێرەکان دەستی پێکردبوو کە بمرێت، ئازایەتی واگاهێنانەوە، ئەوەی خەریک بوو لە ناودەچوو، ئۆهـ پینێهاسی خۆشەویست! کێ دەتوانێ ئەو هەموو کوژراوانە بژمێرێ، ئەوانەی کە وڵاتەکەی ئێمە چوونە ژێر خاک؟ چەندەها بنەماڵە لە بنوبۆتکەوە بڕێندرانەوە، بێ ژمار لە ناو خێزانەکانی تریشدا، تا ئەمڕۆش کوڕی کوڕەکانیان فرمێسکیان بۆ هەڵدەڕێژن (بۆ خێزانەکانیان). شمشێر تا ساڵی ٦٦٢ (٣٥١) لە سەر گەردەنەکانیان مایەوە.

لەو ساڵەدا شاپووری پاشا سوپاکەی خۆی هەموو کۆکردەوە، بەرەو شار و بازێڕی ڕۆمەکان هەڵکشاو ئۆردوگای لە دەوروبەر دامەزراندن و خەڵکێکی زۆری لێ کوشتن و زۆر شوێنیشی تەخت و وێران کرد. چونکە نەیتوانی شاری نسیبیس داگیر بکات، لەشکرێکی زۆری لە پێش شاری نسیبیس و لە هەموو ناوچەکانی میزۆپۆتامیا جێگیر کردو بەخۆشی گەڕایەوە وڵاتەکەی خۆی، تا شارەکانی خۆی لە دەست ئەو میللەتە بەربەرییانە ڕزگار بکات کە لەو بەری دەریاوە هاتبوونە پێشەوە.

ئەو سەردەمە لە شاری ئەربێللا پریستایێکی کافرەکان هەبوو هی خوداوەندی (شاربێل Sharbel) ناوی (ئەیتیلاها Aitilaha) بوو، ئەو گرفتاری دەستی

خوێندانانێکی وەکو هی ژنان ببوو. رۆژێک لەو دەمەی کە ئەو لە پەرستگای خوداوەند لە دەست ئازاری گیانی خۆی بە هەموو دەنگی خۆی دەینالاند، دیانێک کە بە وێدا رەت دەبوو گوێی لە نالە نالّ و هاوارەکەی بوو، وای زانی ئەوە یەکێکە و گیان دەدات. چووە ناو پەرستگاکەو لە ئەیتیلاهای پرسی ئەوە چییە، کە ئاوا ئازاری دەدات؟ ئیتر کە زانی ئەو لە چ بارێکدایە، پێی گوت: "برۆ لای پیاوێک لە ناوچەی دیانەکان، ناوی مارانزێخایە، ئەو بە هێزی خودا چاکت دەکاتەوە" جا نەخۆشەکە هەستاو بەرەو لای ئەوان چوو، ئەو هێشتان لە کلێسا زۆر دوور بوو، خوێن بەربوونەکەی وەستاو چاک بووەوە، نزیکتر بۆوەو چووە ناو کلێسا بۆ لای قەشەو هەموو شاگردەکانی حەزرەتی مەسیح. ئەوان ترسێکی زۆریان لێ نیشت، چونکە دەیانزانی کە ئەو پیاوە پریستای خوداوەندی شاربێلە، بەلآم کە ئەیتیلاها داوای لێ کردن کە لێی دلّنیابن، هەموو بە قسەکانی ئارام بوونەوەو ترسیان رەوییەوە، ئیتر چی بەسەر هاتبوو بۆی گێرانەوە، چۆن ئەو بەر لە گەیشتنی بەوان لە دوورەوە لەلایەن خودای دیانەکان چاک کرایەوە. ئیتر هەموو سوپاسی خودایان کرد، کە لەو رۆژە تەنگانەدا دەسەلآتی خۆی پێشانی پریستای کافرەکان دا، ئەوانەی کە بێ پرینگانەوە دیانەکانیان دەکوشت.

ئەو چەند رۆژێک لای ئەوان مایەوە، ماگەکان بەمەیان زانی ویستیان هێرشی ببەنە سەر و دڕندانە بیکوژن، بەلآم ئەو لە هەمان شەودا هەلآت و چوو بۆ شەهرقەت (شارقات) بۆ لای قەشە (حەبیبها) بەلآم لە بەر ئەوەی لەوێش ترسی ماگەکانی هەبوو، پەنای بردە بەر برواداردکانی ماحوزا دێ ئەریوان (Mahoza dhe Arewan) لەوێش بە تەواوی شارەزای ئایینەکە بوو، ئەو ئایینەی کە دەبوو بەو زووانە لە پێناویدا خوێنی خۆی بکاتە قوربانی. لەوێ تەعمید کراو گەرایەوە بۆ ولآتەکەی خۆی تا لەوێ باوەڕ بە (تاکە خودای لە سێ کەسان) بلآوبکاتەوە. لە راستیدا ئەو پیاوە دەرکەوتەیەکی سەرسووڕهێن بوو، ئەمە (ساول Saul)ی دووەمین بوو، ئەوەی لە سەرەتادا هەولّی کوشتنی دیانەکانی دەدا، پاشان شارەزای ئایینەکەیان بوو، ئەوجا خوێنی خۆی بۆ هەمان ئایین رشت. چۆن خەلّک سەری لەم تازە کرێکارەی کارە چاکەکانی خودا سوڕمابوو، چونکە ئەو لە ئەشقی حەزرەتی عیسا گڕی گرتبوو، خزمەتی خاچی دەکرد، ئاوا ئەوەی کە هێزی لە هەموو شتێک بالآترە، ئەوەی لە نەبوونەوە شت دەئافرێنێ، دوو شتی لە سروشتدا دژ بەیەک، دەکات بە یەک.

دوای ئەوەی زۆر کەسی هێنا سەر رێگا، ماگەکان لەلایەن پیرۆز تەمشاپوور زمانیان لێ دا، ئەویش ناردی تا بیهێننە لای، هەموو دیانەکان ترسان و بە نهێنی دەستیان کرد بە راکردن، مارانزێخاش چووە ناو شاخە بەرزەکان و خۆی لە ناو کەڤر و ئەشکەوتەکان شاردەوە، تا لەو گەرداوە گەورە، کە لەلایەن شەیتانەکان دژی کلێسا هەلّکرابوو، رزگاریان ببێت، ئەیتیلاهاش ویستی خۆی رزگار بکات، بەلآم لە رێگا ناسرایەوەو گرتیان و بردیانە لای خزمەتکاری تاوانباری رۆژ. فەرمانی دا بە مەسیحییەک بە ناوی (میهرنارسی Mihrnarsi) کە نەهی لە بڕواکەی خۆی کردبوو، لە بڕواکەی خۆی هەلّگەڕابووەوە، گوێچکەی راستی ئەو بەندەیەی خودا ببڕێت. کە ئەوەی لەگەلّ (یوداس)ی گەورەی خۆی کرد، کە نەهی لێ کردبوو، دەستبەجێ کولّکێکی ترسناکی لێهات، ئەوە بوو بە نیشانەیەکی ترس بۆ هەموو ئەوانەی کە چاویان پێی دەکەوت، واتە حەزرەتی عیسا، خودای ئێمە تۆلّەی بەندەی خۆی کردەوە، تۆلّەی ئەوەی کە خۆی تەعمید کردبوو. بەلآم بەو نیشانە ئاشکرایەش پیرۆز تەمشاپووری بەندەی شەیتان هەر ئاقلّ نەبوو، ئەو دلّی وەکو فیرعەونی پاشا رەق بوو، گومانی تێدا نییە کە ئاگرێکی هەتا هەتایی گیانی ئەو دەسووتێنێت. بەلآم بەندەی خودا خرایە کونجی بەندیخانە.

دوای ئەوەی چەند رۆژێک بەندەی خودا لەوێ بوو، نەوازش و دلّدانەوە بۆ ژانەکانی پەیدا بوو، هاوڕێ و هاوئازارەکانیشی هێنرانە لای ئەو، (حەفسا)ی دیاکۆنی کلێسای (بێت ئەرباهایی) یەکێک بوو لەوان، هەردووکیان بردرانە لای سەرۆکی ماگەکان. بەلآم چونکە ئەوان نەهییان لە باوەڕەکەی خۆیان نەکرد، بڕیاریان دا کە بیان نێرنە لای پاشا لە بێت لاپات. لەوێش ئەهریمەنی نەفرەت لێکراو بە ئەشکەنجە و بەلّێنپێدان نەیتوانی بیر و باوەڕیان بگۆڕێت، بۆیە هەردووکیان لە سەریان درا. لاشەکانیشیان لە سەر زەوی مایەوە، گیانیشیان بەرەو پەروەردگاریان هەلّفڕین بۆ ئەو شوێنەی تێیدا ئاسوودەو

بەختەوەر دەبن، دژی جەللادەکانیان ئەوانەی تا هەتا هەتا بێ سنوور ئازار دەچێژن.

ئاخ پینێهاسی ئازیز، بۆچی من بە درێژایی هەواڵی ئەوانەت پێ رابگەیەنم، ئەو بەسەرهاتە پڕ خەفەتانەی ئازاری شەهیدانی یەزدانمانت بۆ بگێرمەوە؟ خۆ هیچ ژمارەیەک ناتوانێ هەمووان بگرێتە خۆی، هیچ خامەیەک ناتوانێت ئێش و ئازارەکانیان دەرببڕێت، لە هەموو سەردەمی حوکمڕانی شاپوور بە بەردەوامی خوێنی برایانی ئێمە ڕژێنرا. شمشێر نەلەرییەوە، تەور نەهەساپەوە.

دوای ئەوەی مارانزێخا بە ترس و لەرزێکی لە رادەبەدەر، ماوەیێکی زۆر لە ناو شاخەکان مایەوە، بەر لە شاپوور مرد. ئەو سەردەمێکی تژی لە چەوسانەوەدا، ٢٩ ساڵان کورسی ناوچەی قەشایەتی ئەربێللای بەرێوەبرد.

### XV.

### شوبحا- لیشۆ Subhha -Lisho

دایک و باوکی شوبحا - لیشۆ خەڵکی کەرخا دی سیلوخ (کەرکوک) بوون و لە شاری ئەربێللا نیشتەجێ ببوون. هەر لە سەردەمی منداڵیەوە دەبرێتە کڵێساو زۆر بە سەرکەوتوویی پلە بە پلە بەرز دەبێتەوە، تا دەگاتە ئەوەی شەرەفی سەرۆکایەتی گشتی سەرتاپای هۆپارشی ئەدیابانەی دەدرێتێ. وەک دەڵێن زۆر فەرمانبەری گەورە گەورەی دەوڵەتیی دەهاتنە سەردانی. لە ساڵی دەیەمینییەوە دەستی کردووە بە پیرۆزکردنی (ئیجازەدانی) پریستا و دیاکۆنان، چونکە لە ئەنجامی ڕاونان و کوشتن ژمارەیان زۆر کەم ببوو. تەنانەت لە زۆر شوێنان تاکە پریستاییێکیش نەبوو. بەڵام لە ماوەی چەند ساڵێکی کەم دووبارە لە وڵاتەکەی ئێمە باوەڕ وەکو سەردەمی پێشوو کەوتە گەشانەوە، بە جۆرێک هەموو ئەوانەی لەم سەردەمەدا ژیابوون، بەم گەشەیە تووشی سەرسامی بوون.

لە سەردەمی شوبحا - لیشۆ پیاوێکی خوداپەرستی راستەقینە هەبوو، بە ناوی (مار تیۆدۆروس)ی راڤکار (تەفسیرکار، یان رۆشنکەرەوە) لە بواری هەموو زانستەکان ناوی دابوودوە، ئەوە بە رێگاییێکی فەلسەفی رۆشن هەموو نهێنییە خوداییەکانی لە بارەی فەرمانڕەوایی جیهان و ئازارەکانی گەورەی ئێمەی روون کردبووەوەو راستی دوانەیی (دوئالیزمی) هەبوونی حەزرەتی عیسای بە خەڵکی دەناساند، ئەو یەکەمین مامۆستای نەستۆریاتی بوو. وە خوێنی خۆشی بۆ هەقیقەت بەرشتن دا.

بەڵام لای ئێمە ئاشتی و ئاسایشێکیی قووڵ هەموو لایێکی گرتبوودوە، رەگەکانی مەسیحایەتی بەرەو گەلە بیانییەکان بڵاو ببوونەوە و خۆیان توند قاییم چەسپاندبوو، شوبحا - لیشۆ یارمەتیدەری ئەو هەموو ئیش و کارە خوداییانە بوو، ئەو ئەشق و شەیدایێکی زۆری پێشانی خەڵک دا، بەشێوەیەک شەوانیش نەدەنووست، بەڵکو هەر بیری لە کاری بڵاوکردنەوەی راسپاردەکانی خودا دەکردەوە.

دوای هەوڵ و خەباتێکی زۆری لە باسکردن نەهاتوو، وەکو جڵەوبەدەستێکی ناوچەی قەشایەتی دوای ئەوەی ٣١ ساڵ رابەرایەتی بروادارەکانی کرد، کۆچی دوایی کرد و بە حورمەتێکی زۆرەوە نێژرا.

### XVI.

### دانیل Daniel

دوای ئەو دانیل هات کە پیاوێکی سادەو راستپەروەر دۆست بوو، حەزی بە خزمەتکردن دەکرد، ئەوە لە گوندی (تەحەل Tahal) (لە گەرامێیە) هاتبوو، باوکی کافر و دایکی دیان بوو. دانیل دوو ماگی و زۆر کافری هێنایە سەر رێگای راست و تەعمیدی کردن. بەڵام دیسان لە سەردەمی ئەودا هەروەکو سەردەمی مارانزێخا دووبارە چەوساندنەوەیەکی زۆر درندانە دژی دیانان گەڕایەوە، ئەویش لە ئاکامی لێدانی تەڵەکەبازانە لەلایەن هەردوو پاشای تاوانکار (یەزدیگیرد Jezdegird) و ڤەرەهران[٥٢] سەرلەنوێ زەوی نوقمی خوێن کرا. ئەوەش بووە هۆی هەڵگیرسانی جەنگ لە نێوان فارسە کافرەکان و رۆمە دیانەکان. لە ئەنجامی ئەو جەنگەدا هەردوو لا رێکەوتن لەسەر ئەوەی کە ئازادی هەڵبژاردنی بڕوا لە ناو ئیمپراتۆرییەکانیان بپارێزن (٤٢٢ز). لە ئەنجامی ئەو رێکەوتنە شمشێرانی بکوژانی ئێمە خرانەوە ناو کالانەکانیان و ئارام بوونەوە.

ئەو کاتە کە دیانەکان کەمێک لە ئاسایشیدا بوون، پاتریارش مار یابەلالا هەموو قەشەکانی بۆ لای خۆی بانگهێشتن کرد، تاکو کۆببنەوەو لە بارەی کاروبارەکانی کڵێسا بئاخافن. پێشتر لە سەردەمی مار ئیسحاق جارێکی تریش کۆببوونەوەو[٥٣] بڕیاری ئەوەیان دابوو کە ئەربێللا میترۆپۆلیتە و حوکمی زۆر لە شوێنەکانی

(ناوچەکانی قەشایەتی) تر دەگیرێت:
* بێت نوهاژرا
* بێت بیگاش
* بێت داسن
* ریمۆنین
* بێت بەهقەرت
* دابەرنا

بە هۆی نەخۆشی، مار دانیل نەیتوانی لەم کۆبوونەوە فراوانە ئامادە ببێت، بەڵام لە کۆبوونەوەیەکی فراوانی تر کە چوار ساڵان دواتر کرا، (مار دادهیشو) یادی بەخێر، تێیدا بەشدار بوو[٥٤]، لەم کۆبوونەوەیەدا باوکان بڕیاریان دا کە دەسەڵاتی باڵای پاتریارشی تسەیفون بکەوێتە سەرەوەی هەموو قەشەکان و، دەسەڵاتی (پێتروس) بکەوێتە سەر هەموو ئەپۆستلەکان.

لەو کاتەدا کە لە ڕۆژهەڵاتدا ئاشتی و ئاسایش و یەکێتییەکی گەورەی بیروباوەڕ بەرقەرار بوو، خۆشەویستییەکی لە ڕادە بەدەر هەموو دڵێکی گرتبووەوە، کەچی لە ڕۆژئاوادا، بە هۆی فیرعەونی دووەمی میسر (کوریلوس Cyrillus) ئەوەی کە بە بازووی پاشایی و بە هێزی دونیایی دژی ڕاستی وەستا بوو، (مار نێستۆریوس Nestorius)ی شاهیدی ڕاستەقینەو پاتریارشی "قوستەنتینیە"ی ڕاودەنا، ئاژاوەو سەرلێشێواوی بیروباوەڕ هەموو لایێکی گرتبووەوە، کە مار دانیل بەو هەواڵە دڵتەزێنەی زانی، دەڵێن ئەو پێشبینی ئەوەی کردووە، کە کاتی ئەوە هاتووە، تاریکی بەسەر ڕۆژئاوا دابێت و ڕۆناکی لە ڕۆژهەڵات هەڵبێت. ئیتر بەو ئازار و بەو بیرکردنەوانە لە ڕۆژی یەکشەممە لە "ئەلبیس" (ئەوەش دەکەوێتە هەفتەی دوای جەژنی فیصح) دوای ئەوەی بیست و چوار ساڵان گەلەکەی خۆی بە ئاوی ژیان ئاودا، کۆچی دوایی کرد.

## XVII .

### ڕێحیما Rehima

مار ڕیحیما، ئەو باوکە خەڵکی شاری ئەربێللا بوو، بەدەوییەکان کە هێرشیان هێنایە سەر وڵاتی ئەدیابانە، گرتیان و لەگەڵ خۆیان برد. وەکو دەگێڕنەوە ئەو ١٥ ساڵان لەوێ ماوەتەوە. پاشان بەتەنها ڕای کردووە، بە نەشارەزایی لەوێ بۆ ئەوێ، تا گەیشتۆتە وڵاتەکەی خۆی. ئەوسا چاکیی گیانی پیرۆز خۆی لە لەشی ئەودا پێشاندا و ئەوی هەڵبژارد بۆ کاری مەزنی ڕابەریی و پێشەوایی، ئەویش ڕەنجێکی زۆری دا لە پێناو گەڕاندنەوەی کافرەکان بۆ سەر ڕێگای ڕاست، زۆر ماندوو بوو بە پیرۆزکردنی (ئیجازەدانی) پریستا و دیاکۆنان و بۆ هەموو گوند و شارەکان. بانگەوازی نارد بۆ هەموو قەشەکانی هورپارشییەکەمان، تا پێکەوە شپرزەیی و نارێکییەکانیان ڕێکخستەوە، کەوتووەکانیان هەستاندەوە، وەستاوەکانیان بەهێزکرد و ڕاسترێکانیان تا کۆتایی ڕابەرایەتی کرد. لەو کاتەی کە ڕۆژهەڵات هەموو بە کاروباری بەڕێوەبردنی گەل و پاراستنی باوەڕ خەریک بوون، لە ڕۆژئاوادا باوکەکان لە کۆبوونەوەیەکی فراوانی (Synode) ئیفسیسیە گوناهبارەکان، هەموو کارە چاکەکانیان تێکوپێک دا، ئەوەش بە فەرمانی کوریلوسی گوناهکار، ئەوەی کە کفرە گەورەکەو نەهی کردنە کرێتەکەی بەسەردا سەپاندن، کە گوایە حەزرەتی مەسیح، ئەوەی کە ڕەگەزی ئێمەی دووبارە واگاهێنا، تەنها تاکە کەس و تاکە سروشتە. لەگەڵ ئەوەی مار نەستۆریوس و هەندێ قەشەی تر لەم کۆبوونەوەیەدا ئامادە نەبوون. بە درۆ و دەلەسە و بە فێڵ و فەرەجی دەسەڵاتدارانی میسر، لە پشتەوەڕا سووکایەتییان پێ کرد و لە کاروباری کڵێسایان دابڕاند. ئیتر بەم شێوە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا بەتەواوی لێکتر جودا کرانەوە. پاشان کوریلوس مرد. ئەوەی گەیشتە ئامانجی خراپی خۆی، توانی کە یەکێتی کڵێسایی و یەکێتیی نێوان دەستەی (تا ئەو کات) لە پارچەکردن نەهاتووی، ئاوا پارچە پارچە بکات. ئەو ئاگرێکی هەتا هەتایی وەکو سزای کارەکانی بۆ خۆی ئامادە کرد.

بەڵام مار ریحیما لە ساڵی شازدەمی ڤەراهران (دەکاتە ساڵی ٤٣٦) دەستی بە گەڕان و سووڕان کرد لە تەواوی سنووری ناوچەی قەشایەتی، ڕێگای ڕاستی پێشانی خەڵک دا. لەگەڵ گومڕایان قسەی دەکرد و ڕێگای ڕاستی عیسایەتی بۆ ڕۆشن دەکردنەوە، ئەو سەردەمە دووبەرەکی و دوژمنایەتی لەسەر هەق، لەسەر ماڵی خودا، دەستی پێکردبوو، خەریک بوو بناغەکانی بلەقێنرێت. لە ئیمپراتۆری ڕۆم دەرووخێندرا و لە ئیمپراتوری فارسدا بنیات دەنرا، ڕێحیما بە کاری ڕەوحانی خۆی کۆتایی بە ژیانی خۆی هێناو لە ساڵی دوازدەمی یەزدیگرد چووە لای

خودای خۆی (واتە لە سالی ٤٤٠).

### XVIII.
### ئەبوشتا Abushta

لە دوای ئەو ئەبوشتا هات، بنەماڵەی ئەو باوكە رەوحانییە خەڵكی گوندێكی ناو شاخەكان بوون بە ناوی (تێلپێنا Telpena) هەر لە منداڵییەوە ئەو لە نسیبیس نیشتەجێ بوو، پاشان هاتە ئەربێللا دەڵێن ئەو باوكە هەر لە دەسپێكی پێشەوایەتی خۆیدا ٢٥ كڵێسای دروستكرد، بۆ ئەمەش پارەی لە باوەڕداران و لە كافرەكانیش وەردەگرت، هەروەها هەموو كەسێك بە خۆڕایی كاری بۆ دەكرد.

لەو كاتەدا پیاوێكی تێگەیشتوو و پێگەیشتوو لە ئیدیسیا (ئورفە)وە ناوبانگی دەركردبوو، ئەوەش قەشە (مار هیبهای Mar Hibhai) بوو، كە بە ڕەنج و هەوڵی خۆی زۆر یارمەتی پێشكەش بە ئورتودوكسی كرد، ئەو بە دەستی شاگردانی گوناهبارانی دژ بە یەزدان تووشی چ ناخۆشی و چەرمەسەری و ئاتاجییەكی وا كرا، كە هیچ خامەیەك ناتوانێ باسی بكات. ئەو لە قوتابخانەی ئیدیسیا بە بەردەوامی خەڵكی فێری هەقناسی دەكرد و تا كۆتایی ژیانی خەریكی لەناوبردنی ناهەقی بوو. دوای مەرگی ئەو (٤٥٧ز) شاگردانی ڕێگای گومڕایی یەكیان گرت، بەمەش هێزدار بوون و توانییان هەموو قوتابییە ئێرانییەكان شاربەدەر بكەن، ئەوانیش گەڕانەوە نیشتمانەكەی خۆیان و لەوێ گەلێك قوتابخانەیان دامەزراند، تا لەلایەن شەیتان دووبارە هەڵنەخەڵەتێنرێنەوە. بەڵام (بارشەوما)ی نیسیبس ڕێگەی ئەوەی دا كە (نارسا)ی مامۆستای ناسراو لای ئەو نیشتەجێ بێت، وە قوتابخانەیەكی گەورەی دامەزراند تا برایان زانستە هەمەجۆرەكانی تیدا بخوێنن[٥٥]. بەبێ كۆڵدان منداڵی پەروەردە كردن و مامۆستای بەناوبانگی بۆ كاتۆلیكی پێگەیاند. لەوێ نارسای هەموو كتێبە خوداییەكانی لێكدایەوە. لە لێكدانەوەكانی بە هیچ شێوەیەك لای نەدابوو لە لێكدانەوەكانی تیۆدور فۆن موبسویستە (von Mopsueste Theodor). لە ناوچەكەنی ئێمەوە زۆر كەس دەچوون بۆ لای ئەو، وەكو من لە كەسانی باوەڕپێكراو زانیومە. یوسف یەكێك بوو لەو پیاوانەی ڕێگای حەق، ئەو كەسەی پاشان بووە قەشەی ئەدیابانە، هەروەكو دواتر بە دیاری دەخەین. ئەو سەردەمە كڵێسای خودا دابەش ببوو بۆ دوو پارچە، زاراوەی خودایەتییان بۆ شتی زۆر نزم نەوی دەكردەوە، كە لە خودا نەدەوەشایەوەو دژی سروشتی خودا بوون. ئەوە لە كاتێكدا كە ڕۆژهەلاتییەكان دوو سروشت و تاكە كەسێكیان ناس دەكرد.

بۆ ئەوەی باوەڕی مەسیحایەتی بلاوبكەنەوە، ئاگری خۆشەویستی شەهیدایەتی لە دڵی بڕواداران دابگیرسێنن، مار ئەبوشتا و یوحەننان، قەشەی كەرخا دی بێت سیلوخ، یەكیان گرت، هەواڵیان نارد بۆ (مار بابۆ)ی كاتولیكی، تا پێكەوە هەموو ساڵێك لەگەڵ هەموو قەشەكانی ناوچەی قەشایەتی گەرامێیە كۆببنەوەو بە حورمەتێكی زۆر و بە كەیف و خۆشی بۆ بیرەوەری هەموو شەهیدەكان، ئەوانەی لە سەردەمی یەزدیگێرد خوێنیان لە پێناوی حەزرەتی مەسیح سەرفرازانە ڕژێنرا، ئاهەنگ بگێرن. لەو ساڵەدا (٤٨٤ز) پاشای فارسان (پیرۆز) لە مانگی ئاب لە شەڕی دژ بە هوونەكان[٥٦] مرد. هەرچەندە ئەو پاشایە كافر بوو، بەڵام هەتا لە ژیان مابوو زۆر یارمەتی دیانەكانی دا و بە بەردەوامی بە پێی ڕاوێژ و ئامۆژگاریەكانی بارشەوما دەژیاو فەرمانڕەوایی دەكرد.

لە ساڵی دووەمی پاشای پاشایان والاش (٤٨٤ز) (ئاكاك)ی كاسۆلیك، بە پێی نەریتی گشتی خۆیان، هەموو قەشەكانی ڕۆژهەلاتی بۆ كۆبوونەوەیەكی فراوان، كە خۆی ئامادەی كردبوو، بانگهێشتن كرد، بەڵام مار ئەبوشتا نەیتوانی بۆ ئەو كۆبوونەوەیە بچێت، چونكە تووشی نەخۆشیەكی سەختی كتوپڕ بوو، زۆر كەس گومانی مەرگیان لێ پەیدا كرد. بەڵام خودا بە بەزەیی خۆیی و بە نزا و پاڕانەوەی ڕەبەنی (ڕاهیب) تەواو باوە مەشیحا ڕەحمێی یاد پیرۆز لە مەرگ ڕزگاری كرد. ئەو كڵێساكەی ئەربێللای نوێ كردەوە، ئەوەی كە تا ڕۆژگاری ئەمڕۆكەش هەر ماوە، بە هەموو جۆرە نەقش و نیگارێك ڕازاندیەوە، بەشێوەیەك هەر كەسێك چاوی پێدەكەوت سەری سوڕدەما و سوپاسی خودای دەكرد بۆ ئەو هەموو بەزەییەی كە بە سەر زەویدا باراندوویەتی.

لە دووەمین ساڵی پاشایەتی زاماسپ (زامئەسپ Zamasp) (٤٩٨ز) كاتێك مار بابهای كورس پاتریارشی

رۆژهەلاتی بەرێوەبرد، دەیەمین کۆبوونەوەی فراوان پێکهات، قەشەکان لە هەموو لایەکەوە بە لێشاو دەهاتن بۆ ئەو کۆبوونەوەیە. بەلام مار ئەبوشتا لە بەر پیری و کەنەفتی توانای ئەوەی نەبوو خۆی بچێت بۆ ئەوێ، بەلام لە جێگەی خۆیدا یوسفی (پریسبوتەر(٥٧))ەکەی خۆی و و سیدۆرا (ئیسیدۆروس) دادنووسی خۆی نارد، لەوێ بریاری ئەوە درا کە هەر چوار ساڵ جارێک هەموو قەشەکان لە کن پاتریارش کۆببنەوە، لە جیاتی دوو ساڵ جارێک، وەکو کە پێشتر وا باو بوو.

ساڵێک دوای ئەو کۆبوونەوە فراوانە مار ئەبوشتا لە تەمەنێکی حورمەتداردا کۆچی دوایی کرد، هەموو باوەڕدارەکان ماوەیێکی زۆر شین و گریانیان بۆ کرد.

بەر لە مردنی ژنێک ویستی کوڕەکەی خۆی بێنێتە لای ئەو پیاوە پیرۆزە تا ئەو بە هێزی خاچکێشان کوڕەکەی لە تایێکی زۆر گران بۆ رزگار بکات. کە منداڵەکەی لە باوەش کرد، لە ژوورێکی نهۆمی سەرەوە، منداڵەکەی لە دەست بەربووەوە، کەوتە سەر زەوی نهۆمی خوارەوە، دەستبەجێ منداڵەکە مرد، کە دایکی هاتە خوارەوە دیتی منداڵەکە مردووە، لە تاوان شڵەژاو دەستی کرد بە پاڕانەوە لە خودا کە لەبەر خاتری خوداپەرستی ئابوشتای بەندەی خۆی کوڕەکەی دووبارە بۆ زیندوو بکاتەوە. هێشتان نزاکەی تەواو نەببوو، دیتی کوڕەکەی هەستایەوە سەر پێیان، شاد و رووخۆش. سوپاسی خودای کرد و هەواڵی ئەو پەرجوودی بلاوکردەوە. هەموو مرۆڤەکان لە سوپاسگۆیی خودا وازیان نەدەهێنا، بەرامبەر ئەو میهرەبانییە و ئەو هەموو هێزی موعجیزەیە، کە خودا بە ئابوشتای بەندەی خۆی بەخشیبوو.

## XIX

## یوسف

ئەو باوکە خەڵکی گوندی تێلدەرا (Teldara) بوو (گوندێکی رۆخی زابی بچووک)، کە تەمەنی گەیشتە ٢١ ساڵان چوو بۆ قوتابخانەی نسیبیس و لەلای مامۆستا (نارسا)ی کتێبە پیرۆزەکان و دەرسەکانی مار تیۆدۆروسی خوێند. هەر لە منداڵیەوە نیشانەی میهرەبانی خودایی لێ بەدەرکەوت، ئەو میهرەبانییەی کە دەیویست جارێکی تریش ئەو بکاتەوە مرۆڤێکی نوێ. حەوت ساڵان لە نسیبیس مایەوە شیرە فیکرییەکەی ئەوێی هەڵمژی و شیرناوی ئۆرتۆدۆکسی ئەوێی نۆشی.

لەو کاتەدا جەنگێکی سەخت لە نێوان رۆمەکان و فارسەکاندا هەڵگیرسا، دوای ئەوەی (کاواد Kawad) بۆ جاری دووەم راپەڕی (٤٩٨ز) بە هێزێکی زۆر پەلاماری بردە سەر رۆمەکان. پاشای ئەو سەردەمەی رۆمەکان ناوی ئەناستازیوس بوو. فارسەکان زۆر شوێنی رۆمەکانیان داگیر کرد، (ئامید Amid) و (رێشاینا Reshaina)[٥٨] هەروەها نیازیان وابوو سەرلەنوێ دەست بە ئەشکەنجەدان و چەوساندنەوەی دیانەکان بکەنەوە. بەلام جەنگ هەر کۆتایی نەهات و فارسەکان ناچار کران کە بۆ دواوە بگەڕێنەوە، تا ولاتەکەیان لە تووڕەیی و وەحشەتناکی "هوونەکان" بپارێزن، کە دەستیان بە هێرشهێنان کردبوو، ئەو کاتە کە ئەو لەشکرە لە نیسیبیس بوو، مار نارسای کۆچی دوایی کرد. (ئێلیزا) کە لە (کوزیۆ)ی ولاتی (مەرگا Marga) هاتبوو، جێگەی گرتەوە، ئەویش رێگای مامۆستایەکەی خۆی گرت و بە رێبازی ئەو کلێساکانی تژی کرد لە نووسراو. هەر کەسێک نووسینەکانی ئەوی دەخوێندەوە بە راستی سەری سوڕ دەما لەو زانایییە خوداییەی کە ئەو ناوبانگی خۆی لە ناو خەڵکیدا پێ دەرکردبوو.

لەو کاتەدا مار یوسف داوای ئەوەی کرد کە بۆ خۆی بچێتە ناوچە شاخاوییەکان و لەوێ ببێتە چلەکێش (خەڵوەتنشین) و ژیانێکی ئارام بباتە سەر و خزمەتی خودایی خۆی بکات و بە خۆشەویستی خودا خەریک بێت، وەکو دەیفەرموو بە هەموو گیان و بە هەموو هێزی خۆی. لەبەر هەندێ بانگی هەموو پیر و دیاکۆنەکانی خۆی کرد و ئەو نەخشەیەی خۆی خستە بەرچاو، ئەوانیش بۆ جیابوونەوەی ئەو زۆر بە کوڵ دەستیان کرد بە گریان و هەوڵیاندا کە لەم بیرە پەشیمانی بکەنەوە، لەبەر خاتری گەل و بۆ بنیاتنانی کلێسا. بەلام لەبەر ئەوەی هەموو هەوڵ و تەقەلاکەیان بێ سوود بوو، تەواوی هوپارشی تووشی وروژان بوو، هەموو پێکەوە نامەیەکیان بۆ مار "شیلا (سیلاس) نووسی، کە ئەو کاتە کلیلی فەرمان بە دەست ئەو بوو، کلیلی خەزێنەی ئاسمانیی (واتە ئەو پاتریارش بوو ٥٠٥-٥٢٣). پاتریارشی گەورەمان بە وشەی خودا ئەوی بزواند تا بۆ کاروبارەکانی خۆی بگەڕێتەوە، ئەوەی خوارەوە دەقی ئەو نامەیەیە کە ئەو بۆ یوسفی نووسی:

"بۆ دۆستی حەزرەتی مەسیح، مار یوسف، قەشەی میترۆپولیتی ئەدیابانە، بە فەرمان و ئیرادەی خودا، قەشە پاتریارش، سیلاس، کە ڕێزی بۆ ئایینپەروەریتان هەیە و داواکاری دوعاتانە، سڵاو.

هەروەکو بەڕێزتان چاکتر لەمن دەزانن، خودا بە ڕێگای جۆراوجۆر، مرۆڤەکان بەرەو ئاسمان بەرز دەکاتەوەو گیانیان بە بەهەشت شاد دەکات، هەندێکیان بە هۆی چلەکێشی، بەوەی کە لە هەموو گێلەوەژە و نائارامی جیهان بەدووردەکەونەوە، هەندێکیان بە هۆی مانەوەیان لە ژیانی هاوسەری بە ڕێبازی ئینجیلی، کە تیایدا بە خۆشەویستی ژنەکانیان دەبەسترێنەوەو دەبن بە هاودڵی یەکتر و خۆیان بە منداڵەکانیان ماندوو دەکەن، تا بە ترسی خودایی پەروەردەیان بکەن. هەندێکی تر بە ڕێگای پێشەوایی و مامۆستایی (دەزگای قەشایەتی)، بەوەی کە گەلی خودا ڕێنمایی دەکەن، تا لەسەر ڕێگای هەق و ڕەوایەتی بڕۆن خۆیان لە چیمەنی هێز نزیک بکەنەوە. بەڵێ ئەوەیە پاداشە بەرز و ڕەنگینەکەی کە بەڵێنی بۆ دراوە. ئەوەی لە هەمان کاتدا خاوەنی کار و دەزگای فێرکردن بێت، ئەوە لە ئاسماندا بە مەزنی ناو دەبرێت، بە پێی فەرموودەکانی خودا، هەندێکی تریان دەگەیەنێتە بەهەشت بەهۆی سامانەکانیان، هەندێکی تر بە هۆی هەژاری و هەندێکی تریش بە ڕێگای جۆراو جۆری تر.

بەڕێزتان دەزانن. کە کاری چلەکێشی بۆ ئەوانەی هاوسەردارن، هەروەها بۆ پێشەوایان (قەشەکان) شتێکی نەگونجاوە. چونکە ئەوە دەبێتە هۆی ڕێگەگرتن لە جێبەجێکردنی ئەرکەکانی دەزگاکانیان، وەکو شیاو و پێویستە. بۆ تۆش ئێستاکە هەر وەسایە، ئۆهـ ئەی هەڵبژاردەی خودا، سەبارەت بەوەی کە تۆ خاوەنی هەر دە بەهرەی پێشەوایی، شتێکی نەگونجاوە بۆ تۆ. بە پێی فەرموودەکانی خودا، بچێتە خەڵوەتگا و خۆت لە ئەرکەکانی بەڕێوەبەرایەتی بکێشتەوە، ئەوەش بێنەوە بیری خۆت، ئۆهـ ئایینپەروەرەکە، کە ئەوە ئیرادەی خوای، خۆی لەوە پێشانی تۆ دەدات، کە گەلەکەی ژێر فەرمانتان هەموو بە هاودەنگییەکی گشتی خۆشەویستیی داوای ئەوە دەکەن، کە تۆ ببیت بە ڕابەر و قەشەیان. تۆ دەزانیت، ئەگەر تۆ ئەوە نەکەیت سەرلێشێواوی دەکەویتە نێوان گەل و تۆش بە پێچەوانەی ویستی خودا دەجووڵێیتەوە. دیارە کە ئەوەش شتێکی کرێتە. چونکە سەرلێشێواوی و ڕەفتاری دژ بە ویستی خودا لە هەمووماندا قەدەغە کراوە. کێ دەزانێت، ئەگەریش بیرکردنەوەکانی من زۆر لەمە بە دوور بن، کە ئەو بیرەی تۆ لە ئەمیرەکانی تاریکایی (واتە ئەهریمەنییەکان ع. د.) سەری هەڵنەداوە. چونکە ئەو دوژمنانە دژ بە هەموو مرۆڤایەتی هەوڵی ئەوە دەدەن، کە پیاوانی خودا بە بیرکردنەوەی ڕاستیش لە ڕێگای ڕاست لابدەن، ئەو بیرکردنەوانەی کە زیان لە تەواوکردنی ژیان و ڕێبازی عیسایەتی دەدەن. ئەدی ئەوەتە ئێمە نابینین، هەموو ڕۆژێک ئەوان بێ ژمار مرۆڤایەتی خودا بەرەو گەلی میشالیانەی[٥٩] (Meshalliane) نەفرەت لێکراو ڕاپێچ دەکەن تووشی گومڕاییان دەکات؟ سەبارەت بەمە و بەهۆی تری لەو بابەتە، ئێمە ناوی خوای لێ دەهێنین و بڕیاری ئەوە دەدەین، کە تۆ بۆ بەڕێوەبەرایەتییەکەی خۆت بگەڕێیتەوەو بە جڤاتەکەی خۆت شاد ببیتەوەو جڤاتەکەش بە هۆی تۆوە خۆشحاڵ ببێت.

دوعا بۆ بێ هێزی لاوازییەکانم بکە،í تا خودا لە کەم و کوڕییەکانم ببوورێت، هەروەها بە گەشی بمێننەوە لە خۆشەویستی خودامان."

جا چونکە مار یوسف پیاوێکی دیندار بوو، گوێڕایەڵی بۆ یاساکانی خودا و فەرمانی گەورەکانی خۆشتر دەویست لە قوربانی، بۆیە فەرمانەکانی پاتریارشی وەرگرت و بەرەو ئەربێللا گەڕایەوە. چ خۆشییەک دڵ و دەروونی هەموو بڕوادارەکان و بە تایبەت پریستاو دیاکۆنەکانی گرتەوە، کە دووبارە بە دیدەنی باوکەکەیان شاد بوونەوە، ئەوە هیچ خامەیەک ناتوانێ دەری ببڕێت. بەڵام ئەو بەختەوەرییە زۆر درێژەی نەکێشاو زۆر نەمایەوە، چونکە وادەی دیاریکراوی مار یوسف هاتبوو، ئەو تاجەی خرایە سەری کە هەر لە منداڵییەوە ببوو بە هیوای، چونکە ئەو لە چواری ئەیلول، لە دوازدەمین ساڵی دووەمین حکومەتی کاوادی پاشا (٥١٠ز) کۆچی دوایی کرد.

### .XX

### حێنانا Henana

ئەو باوکەش یەکێک بوو لە شاگردانی مامۆستا نارسای. ئەو لە قوتابخانەی نیسیبیس خوێندبووی، دایک و باوکی لە گوندی تەل نەجاحا-وە هاتبوون، کە قوتابخانەی بەجێهێشت، ئەو لێکۆڵینەوە بە سوودەی

نووسی، ئەوەی کە ئێمە هەموو بە خۆشی و بە سەرسوڕمانەوە دەیخوێنینەوە.

لەو ڕۆژانە ئێلیزای کوزبۆ بەڕێوەبەری قوتابخانە، کۆچی دوایی کرد، لە جێگەی ئەو پیاوێکی شەیدا هەستایەوە، کارکەرێکی بە هێز، شارەزایی زانستەکانی لە خوا ترسیی، لێکۆڵەرەوەیەکی کتێبە خوداییەکان، مار ئەبرەهام، کە برادەرێکی مار نارسای بوو، ئەوەیان زۆر بە ڕێکوپێکی قوتابخانەکەی بەڕێوە برد، شایانی ئەوەیە کە لە خودا بپاڕێینەوەو داوای ئەوەی لێ بکەین، ئۆھ پینێهاسی ئازیز، تا زۆران مامۆستای ئاوا تەواو پێگەیشتووی تری وەکو ئەمانە (نارسای و ئەبرەهام) لە کلێساکانی خودا بێنێتە ئارا، چونکە داهات زۆرە و کارکەران کەم (لوق: ٢.١٢). بەڵام بۆ ئەوەی مرۆڤ خۆی لێ نەگۆڕرێت و خۆی لێ زیرەکتر نەیەتە بەرچاو لەوەی کە هەیەو لووتی بەرزنەبێتەوە و سینگ دەرنەپەڕێنێت، دیارە کە لووتبەرزی و خۆبەزلزانینیش تەنها سەرچاوەی زیانبەخشینە، بە شپرزەیی مامۆستایانی قوتابخانە، هی ئینجیلزانی و ڕێزمان کۆبوونەوە، لەو کۆبوونەوەیەدا بڕیارێک لە بارەی دارایی قوتابخانە درا، یوحەننانی (بێت ڕەبان) سەبارەت بە لاوێتی تەمەنی، وەکو یارمەتیدەری ئەبرەهام دەستنیشان کرا. چونکە نائارامی کەوتبووە ناو قوتابخانە، بە هۆی خراپی بەڕێوەبردنی داراییە دنیاییەکانی قوتابخانە. کە مار حێنانا هەواڵی ئەو نائارامییەی پێگەیشت، خەمی ماڵی خودای کەوتە بەر و بەرەو نیسیبیس کەوتە ڕێ. بە هۆی ئەقڵ و ژیری ئەو، ئەو هەرا گەورەیە ئارام کرایەوە. کەشتی کلێسا هێور بۆوەو خرایە سەر ڕێئاوێکی ئارام. دوای گەڕانەوەی ئەو (حێنانا) دەستی کرد بە سووڕانەوە بە هەموو لایێکی هیپارشیەکەی، ئاگاداری کردنەوەو تێبینی و فەرمانی پێدان، پاشان دوای دوو ساڵ گەڕایەوە شارە ئەرشاکییەکەی خۆی (ئەوەش ئەربێللایە).

لەو سەردەمەدا کلێسا تووشی تەنگەتاوییێکی زۆر کرا بوو، نەک لە دەرەوە ڕا، بەڵکو لە ناوەخۆ، نەک لە لایەن بێگانەوە، بەڵکو لەلایەن خەڵکی خۆیەوە. چونکە شەیتان دوژمنی ڕەگەزی مرۆڤایەتیمان، دیتی کە بە شمشێر و سیکارد دەرەقەتی کاسۆلیک نایەت، نەیتوانی بە ڕێگای پاشا کافرەکانەوە کانیاوی برەو و گەشەسەندنی لێ بگرێت، جا هیچ ڕێگایێکی تری بۆ نەمایەوە، جگە لە تێکبەردانی ڕۆڵەکانی کلێسا دژی یەکتر و نانەوەی ئاژاوە و نائارامی لە نێوانی ڕابەرانی. لە دوای مەرگی پاتریارش شیلا (Shila) دوو کۆبوونەوەی قەشەکان پێکهات و دوو پاتریارش، نارسای و ئێلیزا، دژی هەموو دەستوورەکانی کلێسا هەڵبژێردران. هەریەک لەوانە مافی پێشەوایەتی بە هی خۆی دەزانی. لەو سەردەمانە ناحەزانی کلێسا لە خۆشیدا نقووم ببوون و دۆستانیش خەفەتبار، دۆزەخ لە ناخەوە خۆشحاڵ بوو، ئاسمانیش لەو بەرزاییەوە کەوتبووە ئامێزی خەفەت، ئەو نائارامی و پشێویەش ساڵانێکی زۆری خایاند.

ئەمەش مار حینانای زۆر دڵتەنگ کردبوو، دەستی بەوە کرد کە دڵنیایی بخاتە دڵی بچووکان و بێهێزان هێزدار بکات، چوو بۆ نیسیبیس سەرچاوەی هەموو زانستەکان، لەوێش زۆر کەلەبەری پڕکردەوە وای کرد کە مار باولوسی (بێت نوحاژرا) بێت بۆ ئەربێللا، تا لە هەموو کاتەکانی ئامادەنەبوونی ئەو، کورسی میترۆپولیتی هیپارشیەکەی بەڕێوەببات. ئەو قەشەیەش یادی بەخێر لە مەوپێش نارسای بۆ کاروباری پاتریارشی هەڵبژاردبوو، لە بەر ئەوەش بوو نائارامی کەوتە جڤاتەکەی. مار ئەبرەهامی موفەسیر مار حینانا باولوسی وەکو مامۆستای ئینجیلزانی دیاری کرد، تا لە ولاتی ئەدیابانەدا قوتابخانەیەک بۆ منداڵانی کلێسا دابمەزرێنێ و لە ڕووی فیکر و باوەڕەوە پەروەردەیان بکات و ئایینەکەیان لە شاڵاوی هێرەتیکەکان و مێشالیانەکان (حەرامزادە/ ع. د.) بپارێزێت[٦٠]. ئەو پاولوسە ٣٠ ساڵان لەلای ئێمە مایەوە، زۆر بە ڕوحسووکی و بە لە خواترسی بەڕێوەبەرایەتیەکەی بەڕێوەبرد، ئەو لەلایەن بەڕێوەبەرانی کلێسا بڕوایی تەواوی پێدرابوو، تەنها بە فەرمانی مار ئابها[٦١] توانی دەست لە کارەکەی خۆی بکێشێتەوە، بە پێی فەرموودەکانی خودا ناچار کرا، کە بچێتە نیسیبیس، ئەوەش ڕوویدا لە دوای گەڕانەوەی (هی پاتریارش) لە سوسیانە، هەروەکو لە دواتر دەیبینین.

(کۆتایی دەقەکە نەماوە)

**پەراوێزەکان:**

(١) پێ دەچێت، کە ئەو پەیڤانە لە ژێر کاریگەری چەوساندنەوەکانی سەردەمی نیوەی یەکەمی فەرمانڕەوایی خوسرەو ئەنەوشیروان نووسرابن، بە تایبەت لە ساڵەکانی ٥٤٢ ٢ ٥٤٤.

یەکێتیی سێیینە لە ئاینی عیسایی‌دا واتە خوداو حەزرەتی عیساو گیانی پیرۆز ع. د.٢

(٣) کوشەر: ئامێری کوشینی ترێ بۆ بەرهەمهێنانی شەربەت و شەراب. ع. د.

(٤) ئەو بەراوردکردنانە لەگەڵ ئایەتەکانی کتێبی پیرۆز بە شێودیەکی گشتی لەلایەن پرۆفیسۆر مینگانا جێبەجێکراوە.

(٥) پسالم وشەیێکی گریکییە واتە دووزەلەکان (المزامیر)، بریتین لە کۆمەڵێک سروودی کتێبی پیرۆزی دەوری کۆن (تەورات). لە نوێژ و خوداپەرستی دیانەکان شوێنێکی بالآیان هەیە. ئەو سروودانە دەگەڕێندرێنەوە بۆ حەزرەتی داود (د.خ) کە دووەمین پاتشای جوولەکەکان بوودو بووە بە پێغەمبەر، یەکێک بووە لە باپیرانی حەزرەتی عیسا. پیرەمێردی نەمر لە شیعرێکدا ئاماژە بۆ ئەو سروودانە دەکات و دەفەرموێت: "لاوکی کوردی دەنگی زەبوورە، جەنەتولمەئوا لە شارەزوورە". ع. د.

(٦) مار: نازناوێکە دراوەتە پیاوە ئایینییە بەرزەکانی کلێسای کاسۆلیکی، واتە جەناب یان مەزن. ع.د.

(٧) ناوی پەکیژا لە فایلی ٣٤٥ی شەهیدان (Bedjan II ٣٤٥) هاتووە. هەروەها قەشەیەکی ئێدیسا (ئورفە) (٤٠٠/٤٠٩ز) ناوی پەکیژا بووە. ئەو ناوە لە تەوراتی پیرۆزەوە سەری هەڵداوە.

(٨) وەرگێڕانی وشە بە وشە: "ئەوەی کە ئاددای خۆی دەستی خۆی خستۆتە سەری" واتە قەشەکان توانیویانە بە دەستبەسەرداهێنان پیرۆزایەتی قەشایەتی ببەخشنەوە. ع.د.

(٩) ئەودش یەکێکە لەو وشانەی کە پرۆفیسۆر زاخاو هەر بە پیتی عیبری و کلدانی نووسیویەتی، من هەوڵم داو ئاوام خوێنددوە، ئەو ناوە بە گوێی کوردی و فارسیزانان ئاشنایەو هەبێ و نەبێ ئەو ئاهەنگە پەیوندی بە توانەوەی بەفری سەرشاخەکان و زۆربوونی ئاوی رووبار و کانیاوەکان هەبووە، ناوی جەژنەکەش دەبێ وشەی ئاو (ئاب) مانگ (شەهر) و ئاوهڵناوی (جەموور)ی لەگەڵدا بێت. کێ دەڵێت ئەم ئاهەنگە پێشینەی هەمان ئاهەنگی نەورۆز نەبوود. ع.د.

(١٠) من باوەڕی تەواوم بەوە هەیە، کە ناوی ئەو مانگە لە لایەن پرۆفیسۆر زاخاو بە هەڵە خوێندراوەتەود، ئەمە ئایار نییەو ئادارە (مارت)، ئادار و ئایار دوو وشەی هاوئاواز و هاوشێوەن و بە ئاسانی جێگۆڕکێ ددکەن. ع.د.

(١١) فیللستەکان: گەلێکی کۆنینە بوون، کە ناوی وڵاتی فەلەستین لەوانەوە سەری هەڵداوە، لە سەدەی ١٣ی بەر لەزایین لە ناوچەکانی کیلیکییەو کریتەوە هاتوونەتە پێش و لە کەنارەکانی نێوان عەسقەلان و غەززە کەنعانییەکانیان بەدەرناوەو نیشتەجێ بوون. بەنی ئیسرائیل بەربەرەکانێی کردوون و لە سەدەی دەیەمی بەر لە زایین بەزێنراون. ع.د.

(١٢) زاخاو لە پەراوێز پیتە ئارامییەکان بەراورد دەکات دەنووسێت، نابێت ئەم ناوە راکبەخت بێت، بەڵکو دەبێت رامبەخت بێت، واتە (رۆژی لەدایکبوونی رام) ئەوەش دەکاتە ٢١ مانگی زەردەشتی. دەنووسێت: ئەوە بەراورد بکە لەگەڵ ناوی (رامبەهەشت)ی ناوی ژنان و ئەو ناوانەی کە بە "رام" دەستپێدەکەن لە کتێبی (Nldke, Geschichte der Perser und AraberÖusw. Index S497) رامگوشناسپ، رامیار، رامبوزین لە (Just, Iranisches Namenbuch S258).

(١٣) تسیفۆن (Ktcsiphon) شاری سەلمانپاکی ئێستا، کە پاشماوەی تاقی کیسرای لێیە، ٤٠ کم لە خوارووی بەغدا هەڵکەوتووە، لەسەر کەناری دجلە، لە سەدەی دووەمی بەر لە زایین لە لایەن پاریەکان ئاواکراوە. جێگەی دانیشتنی پاتشاکانی پارپ و ساسانییەکان بووە، لە ساڵی ٦٧٣ز عەرەبەکان داگیریان کردوودو وردە وردە وێرانیان کردووە. ع. د.

١٤) ) مەبەست لەو ئەرشاکە، کە لێرە وەکو سەرلەشکر باسی دەکرێت، دەبێت پاشای پاریەکان بێت، نەک ئەمیرێکی بنەماڵەی پاریەکان، هەروەکو لە خوارەوە دەردەکەوێت. لەوە بەدیاردەکەوێت کە ئەو پاتشایە کە دەقی ئیسحاق باسی کراوەو ناوی بە "ڤالگێشی دووەم" بەڕاستی هاتووەو لێرەش وەکو سەرلەشکری ئەرشاک دووبارە ناوی دێتەوە، ئەوەش بۆ من نیشانەیێکە بۆ جیاوازی سەرچاوە لێ وەرگیراوەکانی. ناوبردنی بە پاتشا ڤالگێشی دووەم لە خودی مەشیحا زێخاوەو بە سەرلەشکر لە ئابلی پێشینی سەرچاوەیان گرتووە.

(١٥) (Deuteronomium) پێنجەمین کتێبی حەزرەتی موسا. ع.د.

(١٦) (Judas Makkb us) سەرکردەیێکی جوولەکەکان بووە لە ١٦٥-١٦٠ پێش زاین، دژی (Antiochos IV Ephane)ی پادشای سووری لە ساڵی ١٦٥ ئورشەلیمی رزگارکردووەو لە ١٦٠ کوژراوە. ع.د.

(١٧) یۆناتان کوڕی سالوسی پاتشا بوو، هاوڕێی حەزرەتی داود بوو، لەگەڵ باوکی لە جەنگی دژی فیلیستەکان لە ١٠١٠ پێش زایین کوژران. حەزرەتی داود باوکی حەزرەتی سلێمان و

دووەم پاتشای یەهوودیەکان و لە باپیرانی حەزرەتی عیسا بووە، ١٠١٠ تا ٩٧٠ ی پێش زایین ژیاوە. ع.د.

(١٨) قهلاتی هێبرێیەر لەوانەیە لە ناو یان لە دەوروبەری کەلاوەکانی ئەینەوا هەڵکەوتبێت سەیری (Budge, Book of governos II، ٣٣٧، ٤٦١) جێگای حەردا (لە دەربڕینی ناوەکەی دڵنیا نیم) نەزانراوە، یاقوتی حەمەوی باسی گوندێکی کردووە بەم ناوە.

(١٩) ئەنبار لە زەمانی فارسەکان بە (پیرۆزشابور) ناوبراوە، دەکەوێتە رۆژئاوای بابل، لە بەری رۆژهەڵاتی فورات، لە قەڵای فەللوجە دوور نییە. ماوەیەکی زۆر هەوارگەی خەلیفەکانی عەباسی بووە (یاقوت I. ٣٦٧)

(٢٠) رازشاه لەگەڵ رازمەردوخ لە پێش کۆتایی ئەو دەقە (دەقی نووح) لە رووی ئیتمولۆگییەوە دوو ناوی سەرچاوە نەزانراون.

(٢١) بە پێی مێتۆلۆژیای کریستیی، لاتزاروس (لیعازەر Lazarws) چوار رۆژان لە گۆردا نێژراوە، پاشان حەزرەتی عیسا لە یەزدان پاڕاوەتەوەو زیندووی کردۆتەوە.

(٢٢) سیمۆن کەفاس (Kephas Simon) سیمۆن (بە گریکی)، پێترۆس یان کەفاس (بە ئارامی) واتە تاشە بەرد (کەڤر)، ناوی موژدەدەرێک بووە کە لە نێوان ٦٤/٦٧ لە رۆم کۆچی دوایی کردووە. کوڕی یۆنای ماسیگر بووە. لەگەڵ براکەی ئەندریاس چوونەتە لای حەزرەتی عیسا (د.خ.)، ئەویش نازناوی پەترۆسی پێ بەخشیوە، ئەوسا ئەو باوەڕی بە حەزرەتی عیسا نەهێناوە، بەڵام دواتر دەبێتە مەسیحی و دێتە رۆم و لەوێ لە ئەنتۆخیا کاریگەرییەکی زۆر لە بڵاوبوونەوەی ئەم ئاینە دەکات، تا سەردەمی نیرۆ، لە رووداوەکانی کوشتاری دیانەکان شەهید دەبێت. گۆڕەکەی لە باخچەی کلێسای پیتەرە لە فاتیکان. ع. د.

(٢٣) رێشی (Reshi) شوێنێکی نەناسراوە، (Hofmann ٢٠، ١٥٠ a.a. O.S. Amm.) باسی دوو شوێنی بەم ناوە کردووە. بەڵام ناکرێت ئەمانە لەگەڵ رێشی ئەینەوا یەکتر بگرنەوە. زاخاو. (پێم وایە ئەوە هەمان ریشێی ئێستایە لە ناوچەی بارزان؟ وەک دەزانرێت ئێستاش لە نێوان دانیشتوانی ئەو ناوچەیە ماری رەش پیرۆز تەماشا دەکرێت و کوشتنی ماری رەش بە گوناه دەزانرێت. ع. د.)

(٢٤) هەتا ئەو جێگەیە رابەر و پێشەوایانی جڤاتی دیانەکان بە دیاکۆن و قەشە ناویان هاتووە، لێرە ئەوە یەکەمین جارە کە زاراوەی پریستا دێتە پێشەوە.

(٢٥) (Zaira) شوێن و زاراوەیەکی نەناسراوە

(٢٦) واتە دیاکۆن

کلۆمسکە: شاڵاوی کلۆ (کوللە). (٢٧)

(٢٨) EKKLHCIACTIKH

(٢٩) (Nero Cladius ٣٧-٦٨) نیرۆ کلادیوس لە ساڵی ٥٤ بووە قەیسەری رۆم، بە زۆرداری ناسرا بوو، سووتاندنی رۆمای خستە ملی جوولەکەو دیانەکان، یەکەمین هێرشی لەناوبردنی دیانەکانی لە ساڵی ٦٤ دەستپێکرد، لەلایەن زیناتەوە خۆشەویست نەبوو، لە ساڵی ٦٨ خۆی کوشت. ع.د.

(٣٠) بەو درێژییە لە ئەکتەکانی پاولی باسیان لێ نەکراوە.

(٣١) سەرچاوەی ئەو باسانەی چەوساندنەوەی دیانەکان لە ئیمپراتۆریەتی رۆمەکان ئۆیزابیوسە (Kirchengeschichte) لێرە مەبەست لە (Markus,Ulpin, Nerva,Trajanus,Markus)ە.

(٣٢) بە لاتینی پانپەر (Panther) جۆرە پشیلەیەکی شێوەپڵنگی دڕندەیە. ع.د.

(٣٣) حوکمی یۆحەننا بە دەستی دۆمیتیان نوسرا (تەمەشای ئوزابیوس بکە)

(٣٤) ئەوەی دانەر لێرە لە بارەی بووژانەوەی دێر (کلۆستا) باسی دەکا، شتێکی نەگونجاوە لەگەڵ مێژوو، چونکە لە سەردەمی ئیبەیژمەشێحا، واتە ساڵی ٢٠٠ ز ناکرێ قسە لە بارەی کلۆستا بکرێت.

(٣٥) (Alexendrinns Clemens) دەوروبەری ساڵی ١٥٠ تا ٢١٥ ژیاوە، زانایێکی مەسیحی گریکی بووە، بەڕێوەبەری قوتابخانەی ئەسکەندەرییە بووە. ع.د.

(٣٦) بە پێی ئەو زانیارییەی باشانەی کە لە هاوکاری بەڕێزم ستروڤە () پێم راگەیاندرا، لە ٢١٨.١٠.٠٧ ز لە شاری ئەربێلا رۆژگیرانێکی فۆرم بازنەیی بە گەورەیی ٥/٦ ی تیرەی رۆژ روویداوە.

(٣٧) (Arzon)Beth Zabhadai, Arzanene

(٣٨) لە بارەی کۆتایی دەسەڵاتی بنەماڵەی ئەرشاکەکان بەراوردی () بکە. بە پێی نووسینەکانی نوێلدکە لە بارەی مێژووی ئێران لاپەڕە ٨٩ ئەرتابان لە ٢٢٤.٤.٢٨ ز کوژراوە.

(٣٩) Kirchengeschichte VI، ١.٢٣

(٤٠) ئەمە یەکەمین پەیوەندی ناوچەی قەشایەتی ئەربێلا بووە لەگەڵ شاری پایتەخت، کە ئەو کاتە هیچ قەشەی لێ نەبووە.

(٤١) لە دەقە ئەڵمانییەکەدا نووسراوە "برای برای"، وا بزانم "برای باوکی" راستەکەیە. پێم وایە کە ئەمە ئەحابی عیبرییە کە ماناکەی باوک دێت. (بڕوانە جەمال نەبەز، سەرنجدانێک لە میتۆلۆژیای کورد، ل.١٢، بلاوکراوەی ئاکادیمیای کوردی بۆ زانست و هونەر) ستۆکهۆلم، ١٩٨٦. ع. د.

(٤٢) بەوەی کە ماوەیەکی زۆر داروودەستەو چەکدارەکانی لەناو قەڵاتەکە ماونەتەوەو شەڕیان بەرامبەر لەشکرێکی چەندان هەزارکەسی کردووە، خواردن و خواردنەوەیان مسۆگەر بووە، دەبێت ئەو قەڵاتە هەر کۆنە قەڵاتەکەی ئێستای هەولێر بووبێت، کە دیارە هە ولێر لە چاو ناوچەکانی تسەیفون (سەلمانپاک) کەوتۆتە ناوچەیەکی شاخاوی، بەلام ناکرێت قەڵاتێکی ئاوا لە ناکاو لە دوای تووڕەبوون و هەڵچوونێک بۆ خۆحەشاردان هاتبێتە دروستکردن، دەبێت ئەو قەڵاتە زۆر لە پێشتریش لەلایەن فەرمانڕەوایانی ئەو شارە، لەوانەیە لە سەردەمی پارییەکان بناغەی بۆ دانرابێت و کاری تێدا کرابێت، رێی تێ دەچێت، کە لەسەردەمی گوفراشناسب شووراو پێویستییە سەربازییەکانی تری بۆ زیاد کرابێت. ع. د.

(٤٣) ئەوە دووەمین پەیوەندی نێوان قەشەی ئەربێللاو دیانەکانی پایتەخت بوو.

(٤٤) وەکو رەزاخان دێتە مەزەندەی خوێنەر ع. د.

(٤٥) لەوانەیە ئەمە هەڵوێستی میلس (Miels) دژی بەرزبوونەوەی پلەی قەشە پاپا بۆ پایەی پاتریارشی رۆشن بکاتەوە، سەبارەت بەوەی پاپا لەسەر دەستی پێشینەکەی ئەو لە سوسە یان یەکێک لە پێشینەکانی بووە بە قەشە، جگە لەوەی جڤاتی دیانەکان لە سوسە کۆنتر بووە لە هی پایتەخت (تسەیفون)، بۆیە ئەمەی بە ڕەوا نەزانیوە. (بڕوانە کۆتایی دەقی ئەبرەهام.)

(٤٦) پێم وایە هەر (قوستەنتین)ی عەرەبییە. ع. د.

(٤٧) (Hormizd) وەک پێ دەچێت ئەو شەڕە لە دژی رۆمەکان بە سەرکردایەتی هورمیزدی دووەم (٣٠٣-٣٠٩) لە هیچ چاوگێکی تر باسی نەکرابێت.

واتە بۆ بەرژەوەندی ئەو جڤاتانەی کە دەکەونە دەرەوەی پایتەخت. (٤٨)

(٤٨) هۆلۆفێرن (Holoferen) جەنگاوەرێکی ئاسووری بووەو لە سوپاکەی نەبوخەزنەسر سەرلەشکر بووە. بە دژایەتی خوودا ناسراو بووە. ناوی لە تەوراتیش هاتووە. یودیت (Juditz) ژنێکی ژیر ئازا بووە، بە هۆی نەخشەیەکی زیرەکانەی خۆی هۆلۆفێرن بە کوشتن دەدات و جوولەکەکان بەسەر ئاسوورییە بە ژمارە زۆرەکان زاڵ دەکات. ئێستێر (Esther) لە تەورات ناوی هاتووە، ناوێکی ئێرانییەو لە وشەی ئەستێرە، یان ستێرە هاتووە، ژنێکی جوولەکە بووە، ئامۆزای موردەخای و پاڵەوانی کتێبی ئێستێرە، دەسگیرانی ئەردەشێری یەکەم پاشای هەخامەنشییەکان بوو. لەبەر ئەوەی هامان (Haman) ناوێک لە دەرباری پاشا نەخشەی قەتلوعامی جوولەکەکان رێکدەخات، شابانوو ئەستێر کارێک دەکات کە هامان بەدەستی ئەردەشێر بەکوشتن بچێت و جوولەکەکانی هاوباوەڕی خۆی رزگار دەکات. مەزندە دەکرێت کە کتێبی ئێستێر لە نێوانی ٣٠٠ تا ٨٠ی پێش زایین نووسرابێت. ع. د.

(٥٠) رێکەوت سەیرە، لە کاتی وەرگێرانی ئەو کتێبە، لە بازاڕ لە ناو کتێبە هەراجکراوەکاندا ئەم کتێبەم بەرچاوکەوت و کڕیم: گەڕان بەدوای کەشتی نوح (Die Charles Berlitz, Suche nach der Arche Noah, München، Knaur-Verlag ١٩٩١)، ئەم کتێبە لە ئەمەریکا بە ئینگلیزی بلاوکراوەتەوەو وەرگێردراوەتە سەر زمانی ئەڵمانی. لە لاپەڕە ١٨-٢٠ دا دوو تێبینم کەوتە بەرچاو کە بۆ مێژووی وڵاتەکەمان گرنگەو پەیوەندییان بەو کەسایەتییەی ئەم کرۆنۆلۆژیایەمان هەیە، بۆیە بە باشم زانی کە وەکو خۆیان لەم پەراوێزەدا بیاننووسم: یەکەم: "هەر ئاواش ئیپیفانیوسی سالامیس (Salamis Epiphanius-) رای خۆی دەردەبڕێت: "ئەوە ئێوە بە راستیتانە، کە وا دەزانن ئێمە ناتوانین ڕاست دەربڕینەکانی خۆمان بسەلمێنین؟! ئەوەتە خۆ تا رۆژگاری ئەمڕۆش، هێشتان کەشتی نوح لە وڵاتی کورداندا دیارە" ئەو ئاماژەیە کە دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی چوارەمی زایینی، ئەوە دەداتە دەست کە ئەوسا لەم سەردەمیش کوردەکان پێکەوە لەگەڵ ئەرمەنییەکان دانیشتووانی ئەو ناوچەیەی ئارارات بووینە. بەلام ئەرمەنییەکان چیتر لەوێ نەماون و ئێستا بە زۆری لە ئەرمەنستانی کۆماری سۆسیالیستی سۆڤیەت و جڤاتەکانی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا دەژین. بەلام کوردەکان هێشتان هەر ماون و ناوە ناوە شەڕی بچووک لەگەڵ حکومەتەکانی ناوچەکەیان دەکەن...(کۆتایی گێڕانەوەی کتێبەکە) (کەواتە

لەسەدەی چوارەم وشەی كورد یان كرمانج بەكارهێنراوە. ع.د.)
دووەم: "گێڕانەوە پشتاوپشت هاتووەكان دەڵێن سەرۆكی دێرێكی بێزەنتی هەولی دەدا بەسەر شاخی ئارارات (گودی) بكەوێت و تەماشای كەشتی نوح بكات. مەبەست (یاقووبی میدیزپین Medizpin)ە كە پاشان بوو بە قەشەی نوسەیبین، وە دواتریش چووە ڕیزی پیاوچاكە پیرۆزەكان، دوای نوێژ و پاڕانەوەیەكی زۆر لە خودا، تا ڕێگای بدات سەیری كەشتی نوح بكات (چونكە سەیركردنی كەشتی نوح بە گوناه زانراوەو قەدەغە بووە/ ع. د.) ڕێگای دوور و درێژی دەستەچەپی شاخەكەی گرتەبەر. پاشان ماندوو و شەكەت دەبێت و لە پەلوپۆ دەكەوێت. بۆیە لێی پاڵدەكەوێت و خەوی لێ دەكەوێت، كە واگا دێت، دەبینێت وەك موعجیزەیەك كانیاوێك لە ژێر پێیدا هەڵقوڵیوە. ئەم كانیاوەش تا ئێستا هەر ماوەو بە (كانی یاقووب) بە ناوبانگەو وەكو نیشانەیەك بۆ هاتوچۆ بەكاردێت. پاشان یاقووبی میدزپین دەستی كردەوە بە شاخەكە هەڵبگەڕێت، بەڵام دەدیدیت كە لە دوای هەر هیلاك بوون و خەولێكەوتنێك، دیارە لەلایەن فریشتەكانەوە بووە، هەڵدەگیراو دەهێنرایەوە خوارەوە، كە واگا دەهات، خۆی لە هەمان ئەو جێگایە دەدۆزییەوە كە لێی بەڕێكەوتبوو. تا لە ئاكامدا خودا وهەلامی پاڕانەوەكانی دایەوەو فریشتەیەكی نارده لای. فریشتەكە فەرمانی بە یاقووب دا، كە واز لە هەولی سەركەوتنی سەر شاخەكە بهێنێت و پارچەیەك داری كەشتییەكەی دایێ و پاشان فریشتەكە پێی دەڵێت، كە هیچ مرۆڤێك بۆی نییە لە دوای شوێنگەی كەشتی نوح بگەڕێت، تا ئەو ڕۆژەی خودا بە خۆی كەشتی نوح ئاشكرا دەكات...
(كۆتایی گێڕانەوەی ناو كتێبەكە). ئەو مۆتۆسەش بەڵگەیەكی تری بوون و گەورەیی ئەو پیاوچاكە بووە، لە كوردستانی ئەو سەردەم. ع. د.

(٥١) گۆلگاپا (Golgatha): گردێكی نەناسراوی دەوروبەری شاری ئورشەلیمە (قودس)، كە حەزرەتی عیسای لەسەر لەخاچدراوە. ع. د.

(٥٢) چەوساندنەوەی دیانەكان لە سەردەمی یەزدێگیردی یەكەم (٣٩٩-٤٢٠) نەزانراوە، بەڵام لە سەردەمی بەهرامی پێنجەم (٤٢٠-٤٣٨) زانراوە. لەبارەی حوكمدانی قەشە ئابهای لە سەردەمی یەزدێگیرد بڕوانە (Labourt, a.a.O.S.105,106).

(٥٣) بۆ فایلەكانی (كارەكانی) ئەو دوو كۆبوونەوە تەماشای (Chabot, Synodicon orientale S.253 ff.) بكە.

(٥٤) لە لایەن كۆبوونەوەكە پشتراست كراوە، تەماشای Chabot a.a. O.S ٢٨٥ بكە.

(٥٥) د بارەی ئەو قوتابخانەی نوسەیبین (J. Guidi in Giornala della sociata Asiatica Italiana IV, 1890, S 165 ff und Chabot, Jornal Asiatique 1898 Bnd8, S43ff.) لەگەڵ یكتر بەراورد بكە.

(٥٦) هوونەكان یان خوونەكان گەلێكی سوارەو كۆچەری ئاسیای ناوەڕاست بووینەو لە سەدەی دووەمەوە لەو هەرێمانە ژیاون. تەمەشای:
Namens#http://de.wikipedia.org/wiki/Hunnen) herkunft-und-verwendung). ع. د.

(٥٧) پریسبوتەر: بە تەمەنترین كەس لە جڤات، وشەی پریستاش لەمەوە هاتووە ع. د.

(٥٨) بە پێی كرۆنۆلۆژیای (Pseudo-Jusua Stylites) ئامێد لەلایەن فارسەكان گیرا، بەڵام ڕێشاینا نەگیرا.

(٥٩) كاتی خۆی مانای ئەو پەیڤەم نەزانی، بەڵام وا لە سایەی ئینتەرنێت سەرەداوێكم دۆزییەوە. لەوانەیە مەبەست لەمە (گەلی حەرامزادە) بێت. چونكە پەیڤی (Mesalliance) كە لە (msalliance) ی فرەنسی هاتووە، بە واتای (ژن و مێردایەتی نارێك) و ناپاسایی. (ع. د. لە كاتی پێداچوونەوە بۆ جاپی دووەم/ ٢٠٠٩. تەمەشای: http://de.wikipedia.org/wiki/Mesalliance) بكە.

(٦٠) هیراتیەكەكان: ئەو كەسانەی كە لایەنگری ئەو باوەڕانە بوون كە دژی ئایینی عیسایی وەستاون. ع.د.

(٦١) ژیاننامەی پڕ پەندو دەرسی ئەو پیاوە گرنگە لە لایەن (Jabalaha, de tros Bedjan, Histore de Mar) وەرگێردراوەو لێكۆڵینەوەی لەسەر كراوە. هەروەها ئەمە بەراورد بكە لەگەڵ نووسراوەكەی من (Syrischen Rechtsb|cher III, Berlin 1914, Einleitung S XX!! ff).

تێبینی: سكێچی نەخشەكان: دەشتاییەكانی دجلە، بەحرەین، دورگەی موحەرەك، بە سوپاسەوە لە بەڕێز (W.Hildebrandt) وەرمگرتوون، هەر بۆ ئەوەیە كە یارمەتی خوێنەر بدات بۆ زانینی تۆپۆگرافی شوێنە باسكراوەكان.

*